١٤٨/ 3287- **ئەرزیابی کـردن، پێش بینـی کـردن، لـە قەڵـەمدان:** فەرحانی‌یەکی رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر لە ساڵەکانی ئایندە دا پێشرِینی دەکرێ.

١٤٩/ 160- **ئـەرزیابی کـردن، هەڵـسەنگاندن، تـەخمین لێـدان:** مەئموورەکانی مالیات/ زەریبە، قازانجی ساڵانەی کابرایان لە ماوەی سێ ساڵاندا ٣ هەزار پۆند هەڵسەنگاند.

ئەرزشی شتێك لەنێو بردن ← بێ‌بایەخ کردن، ئەرزشـی... زانین ← ئافەرین گوتن بە.

١٥٠/ 3844- **ئەسپاردن بە:** پـارە لـە کـوێ پـەیدا بکـەم؟، نازانم. ئەو کارە بە تەواوی بە خۆت دەسپێرم.

١٥١/ 6170- **ئەسپاردن بە:** چاوەروانی ئەوە مەبن کە خێرا ئەم دەزگایە وەکار خەم - هەر ئێستاو کـورتەو پـڕ پێتـان ئەسپاردووم.

١٥٢/ 2192- **ئەسپاردن بـە، دابـەش کـردن بەسـەر...دا، دابەشـین بەسەر...دا:** ئەوە خـەریکن منداڵەکـەتان بـەو ژنـە ئێسـك گرانە دەسپێرن؟

١٥٣/ 996- **ئەسپاردن بـە، دانەدەسـتی کەسـێك:** راگرتنـی ٢٠٠ کەس لە دیلەکانی شەڕ بۆ پشتی بەرەی شەڕیان بـە ئەفـسەرێکی لاو ئەسپارد.

١٥٤/ 2695- **ئەسپاردن بە، سەرپەرشتیی کەسێك بـە کەسـێکی دیکـە ئەسپاردن:** کـاتێك ژنەکـە زانـی کـە دەبـێ سەرپەرشـتیی منداڵەکان بدا بە مێردەکەی، لە وەرگرتنی تەڵاق پەژیوان بووە.

١٥٥/ 1667- **ئەسپاردن بـە، دانەدەسـتی:** یـەکێك لـە لایەنـە هەرە باشەکانی رێبـەرێکی کارامـە ئامـادەیی ئـەوە بـۆ ئەسپاردنی بەشێك لە کاروباری بڕیاردان بە هاوکارەکانی.

← مەئمووریـەتدان بە.

١٥٦/ 2045- **ئەسپاردن بە کەسـێك، متمانـە پێکـردن:** بەداخـەوە دەبێ بڵێم کە خدر لەو جۆرە کەسانە نیە کە بکرێ پـووڵو پارەی پێ‌سـپێری یان نهێنی‌یەکانی لەلا بدرکێنی.

ئەسپاردن بە ← دانان بۆ، دانەدەسـتی، بەجێ‌هێشـتن بـۆ، دانەدەستی کەسێك، حەواڵە کردن. ئەسپاردن بە بـەختەو شانس ← بە بەختەو شانس ئەسپاردن.

١٥٧/ 7179- **ئەسپاردنی کـارێك بـە کەسـێك:** هەڵـسووڕاندنو بەڕێوەبردنی کاری رۆژانەیان بە کابرایەکی ئەسپاردووە کە سەربە شەریکە نیە.

ئەسپاردن بە ← دران بە، ئەستاندن ← پارە لێوەرگرتن.

١٥٨/ 5265- **ئەستاندنەوە، وەرگرتنـەوە، دەرهێنانـەوە لـە دەستی:** ئـەو دووڕگەیـە پـاش شـەڕێکی چکۆلـە لـە سـەدەی هەژدەهەمدا لە فەرانسە ئەستێندرایەوە.

١٥٩/ 1058- **ئەسـتاندنەوە، لێ‌پچڕینـەوە، لێدەرهێنانـەوە، دەرهێنانەوە، لێهەڵگرتنەوە.**

١٦٠/ 7393- **ئەسـتاندنەوە، دووبـارە گرتنـەوە:** لـە ئاکـامی شەڕکانی ١٩١٨-١٩١٤دا، فەرانسـە ناوچـەی ئـالزاس‌و لۆرێنی گرتەوە.

١٦١/ 4287- **ئەسترینەوە، خـاوێن کردنـەوە بـە پـەڕۆ:** ئـەو تەرایی‌یانەی کە بە هـێزی دلۆپـەوە کۆببوونـەوە بـە پـەڕۆ خاوێنی کردنەوە.

١٦٢/ -

١٦٣/ 7422- **ئەسترینەوە( بـە پەڕۆیـەك)، پاککردنـەوە:** پێـش ئەوەی مامۆستا بـێ، ئـەو رەسـە لەسـەر تەختـە رەشـە بسترەوە.

١٦٤/ 7431- **ئەسترینەوە:** مەهێڵـە ئەرشـەکە قاوەکـەی هەڵمژێ؛ بە پەڕۆیەکی بێ‌ئەسترەوە.

← وشك کردنەوە(ی قاپی شۆراو)، پاککردنەوە.

ئەستوور بوون ← هەڵـسان،

← ئەشکەنجە کردن ←لێدان.

١٦٥/ 6076- **ئەغیار کردنەوە، ئالۆز کردن، وەخەبەر هێنان:** سـەری وەبەر شـێرەی ئـاوێ دەن، ئـەغیاری دەکەنـەوە/ دێتـەوە سەرەخۆ.

١٦٦/ 1313- **ئەگەر ناچار بین، ئەگەر هیچ رێگایەك نەبێ:** ئەگـەر چارە نەماو ناچاربووین هەموو شتەکان بفرۆشین، دەتـوانم بگەڕێمەوە سەر کاری پێشووم.

ئەڵغام دانانەوە ← بۆمب دانانەوە.

ئەنبارکردن ←کۆکردنەوە(ی بەرهەم).

١٦٧/ 2398- **ئەمری خودا بەجێ هێنان، ئەمری خـودا کـردن، مـردن:** ئەم چەند دێڕەت بۆ دەنووسم بۆ ئـەوەی ئاگـادار بـی کـە دۆسـتی لە مێژینەمان، جاناتـان، دوای ماوەیـەکی دووروو درێژ ئەخۆشی، ئەمری خودای بەجێ‌هێنایەوە.

←خودا عافوو کردن.

ئەم کەلەکەو ئەو کەلەکەکردن ← هەڵگەڕانەوە.

١٦٨/ 6641- **ئەمن چون دەناسـی! چۆنم دەناسی؛ پێتوایـە ئـەمن چیم!:** بێگومـان ئـەتۆو منداڵـەکان بـەجێ‌ناهێڵم. ئەرێ بەراستی ئەتۆ ئەمن چۆن دەناسی؟

١٦٩/ 5673- **ئەمنیەتی جێگایەك دابین کـردن، تەئمینیـەت کـردن:** ئەمنییەتی ماڵەکەیان لەبەرامبەر مەترسیی هاتنەژوور لە

قاتی یەکەمو دووهەمدا دابین کرد./ ماڵەکەیان لە بەرامبەر مەترسیی هاتنەژووری خەڵك لە ڕێگای قاتی یەك و دووەوە تەقوییەت کرد.

/١٧٠ 929- **ئەنجامدان، کردن:** پێش ئەوەی ئەم شێوە (دەرمان کردنە) لەسەر ئینسان تاقی بکرێتەوە، دوکتور دانا بۆ ماوەی دووساڵان لەسەر ٣٠٠ سەگان ئەنجامی دابوو.

/١٧١ 4142- **(زۆر باش/ خراپ) ئەنجامدان:** زۆر ماشێن هەن کە دەشۆن، دەخوروسێنن، وشك دەکەنەوە- بەڵام مۆدێلی تازەی... هەموو ئەو کارانە زۆر باش ئەنجام دەدا.

/١٧٢ 2586- **ئەنجامدان (و ڕزگار بوون لە دەستی ...)، تەواو کردن:** زۆر خۆشحاڵ دەبم ڕۆژێك ئەم کارە تەواو کەین ( ولە دەستی ڕزگار بین).

/١٧٣ 2740- **ئەنجامدان، پێڕاگەیشتن:** لە حاڵێکدا هەموو ڕۆژێ لە بێلفاست بۆمب دەتەقێنەوە، کابانەکان بە کاری ماڵەکانیان ڕادەگەیشتن.

/١٧٤ 6666- **(بە هاسانی) ئەنجامدان یان قبووڵ کردن:** واوێدەچوو کە پێی خۆش نەبێ مێرد بە کابرایەکی کرێکاری کارخانە بکا، بەڵام، زۆر سەیر بوو کە بە هاسانی قیبوڵی کرد.

/١٧٥ 2950- **ئەنجامدان، بەجێگەیاندن:** تامو سارا ساڵانێك بوو کە بە یەکەوە دەژیانو سەرەنجام بۆ خاتری منداڵەکانیان ڕێو ڕەسمی ژیانی هاوبەشیان بەجێگەیاند.

/١٧٦ 2952- **ئەنجامدران، جێبەجێبوون، تەواو بوون (زیاتر بەسەرکەوتنەوە):** هەرکە تەڵاقوەرگرتنی جۆ (بە سەرکەوتنەوە) جێبەجێ بێ، دەیەوێ لەگەڵ ئالیس ژیانی هاوبەش پێك بێنێ.

تێبینی: لەرۆژئاوا پیاویش تەڵاق وەردەگرێ!

-وەرگێر-

/١٧٧ 7037- **(بەکورتی یان سەرسەری) ئەنجامدان، لێکۆڵینەوە:** هەواڵنووسەکەتان تەنیا لەدەوروبەری مەسەلەکەی کۆڵیبووە (نەك مەسەلەکە خۆی).

ئەنجامدان (ی کارێك بە لێزانییەوە)← (بە لێزانییەوە) کارێك ئەنجامدان. ئەنجامدان ←کردن، بەڕێوەچوون، جێبەجێ کردن.

/١٧٨ 2854- **ئەنجامدان، بەڕێوەچوون، جێبەجێ بوون:** کۆبوونەوەکە چۆن بەڕێوەچوو؟ ئایا ئەو هەڵاو بگەڕەی چاوەڕوانی دەکرا ڕوویدا؟ یان هەموو شتێك بە لەسەرەخۆیی چووە پێش؟

← بەڕێوەچوون.

ئەنجنین← ورد ورد کردن.

/١٧٩ 5948- **ئەندام بوون:** ژمارەیەك لە زانایانو مامۆستایانی بەناوبانگ ئەندامی کۆمیتەیەك بوون کە گەشە پێدانی دەرس خوێندن لە ڕادەی بەرزیان ڕاسپاردە دەکرد.

/١٨٠ 5741- **ئەندام بوون:** سەرجان ئەندامی کۆڕی بەڕێوەبەریی چەند شیرکەتانە ← سەر بە...بوون.

/١٨١ 4074- **ئەندام لە دەستدان:** پزیشکەکان هەرچی لە دەستیان هات کردیان، بەڵام سەرەنجام هەر دوو لاقی لە دەست دا.

ئەندازە گرتن ← پێوان

/١٨٢ 3258- **ئەنگاوتن، لە خاڵە ڕەشەکە دان:** لە ڕاپۆرتەکەدا باسی دەورەیەك کرابوو کە لەو دا بەڵێنییەکان جێبەجێ نەکرابوونو، بەجۆرە ڕاست لە خاڵە ڕەشەکەی دابوو.

/١٨٣ 2193- **ئەنگوست یان قامکدانان لەسەر، پەنجە ڕاکێشان بۆ:** شووڕای دیفاع پەنجەی بۆ ئەو خاڵە لاوازەی بەڵگەهێنانەوەکە ڕاکێشا.

ئەنگیزە هەبوون ← هۆکاربوون.

/١٨٤ 4127- **ئەوپەڕی کۆششی خۆ کردن، ئەوپەڕی بەهرە لێوەرگرتن:** ئەو بەداخ بوو لەوە زیاتر لیاقەتو ئیستعدادی نیە، بەڵام گوتیشی ئامادەیە ئەوپەڕی بەهرەی لێوەرگرێ. ❊ دەبێ بەوپەڕی تواناوە تێبکۆشین کە لەو کانگا سروشتییە کەمانەی هەمانن بەهرە وەرگرین.

/١٨٥ 5049- **ئەوپەڕی کەڵك وەرگرتن لە:** تیپی سێ، بێگومان لەو زستانەی بۆ پەروەردەکردنی سەربازەکانی ئەوپەڕی کەڵکی وەرگرتبوو.

ئەودیو کردن ← قووت دان.

ئیجارە کردنەوە ← بەکرێگرتنەوە.

ئیجازەدان ← مەرەخەس کردن، ڕێگا دان بە.

ئیحتیات وەلانان ← شەرمە حوزووری وەلانان.

ئیختار پێکردن← لۆمە کردن (زۆر بە توندی).

ئیدارە کردن ←بەڕێوە بردن.

/١٨٦ 4740- **ئیددیعا کردن، هەبوون:** ئەو ئیددیعا دەکا توانایی لە زۆر کاران دا هەیە، بەڵام ، لە ڕاستیدا، نیتی.

/١٨٧ 4181- **ئیددیعا کردن، پێوابوون، وانیشان دان:** ئەمە تەنیا ڕێگای چارەبوو کە هەموویان پێیان وابوو. ❊ ئەوان زۆر لەوە خۆیان هەژارتر نیشان دەدا کە هەن.

١٨٨/ 3794- **ئیدیعا کردن، خۆ هەڵکێشان:** ئەسڵەن ئیدیعا ناکەم/ خۆ هەڵناکێشم و بڵێم زانیارییەکی پسپۆرانەم لەسەر بازاری بورس هەیە، بەڵام، چالاکیەکانی ئەو شیرکەتانە دەرید ەخەن کە زۆر باش بەرەو هەڵدان و گەشەکردن دەڕۆن.

ئێرەو ئەوێ کردن ← هاتوچۆ کردن

ئیزدواج کردن لەگەڵ غەیرەدین ← لەگەڵ غەیرە دین ئیزدواج کردن.

١٨٩/ 4247- **ئیزدواج کردن لەگەڵ غەیری هاوشانی خۆ:** باوکی چیا هەڕەشەی لێکرد کە ئەگەر لەگەڵ هاوشانی خۆی ئیزدواج نەکا/ ئەگەر لەگەڵ کەسێك خوارتر لە خۆی ئیزدواج بکا، بێبەری دەکا.

١٩٠/ 4246- **ئیزدواج کردن لەگەڵ کەسێکی دەوڵەمەندتر لە خۆ:** ئەوانەی لەگەڵ کەسانێك ئیزدواج دەکەن کە لەباری کۆمەڵایەتییەوە لە خۆیان بەرزترن دووچاری هەر ئەو گیروگرفتانە دەبن کە تووشی کەسانێك دەبێ کە لەگەڵ غەیرە دین یان نەتەوەیەکی دیکە ئیزدواج دەکەن.

ئیزۆلە کردن ← جیا کردنەوە (لە) (بە).

١٩١/ 1312- **ئێستا کە ئەتۆ هێناتە گۆڕێ، ئێستا کە باس لەوە دەکۆڕێ دنیە:** دانی بەوەدا هێنا کە هەرگیز نەچۆتە کوکتێل پارتی. پۆپ- یش گوتی: "ئێستا کە باس لەوە هاتەگۆڕێ، دەبێ بڵێم ئەمنیش هەرگیز نەچووم".

ئیستدلال کردن ← دەلیل هێنانەوە.

١٩٢/ 3161- **ئیستعدادی... هەبوون، زەوقی... هەبوون:** "ئایا لە فێربوونی تیرئەندازیدا هیچ گیروگرفتێکت هەبوو؟"، "نەخێر ئاغا، ئیستعدادێکی باشی بۆ تیرئەندازی هەیە."

١٩٣/ 3357- **ئیستعدادی... هەبوون، زۆرتر بە لای... دابوون:** تەواوی دەلیلەکانتم بۆ ئازاد کردنی کابرا بیست، بەڵام، بەداخەوە، سەرەڕای هەموو ئەو قسانە ئەمن زۆرتر بەلایەکەی دیکە دادەم. دەبێ بۆ ماوەی سێ مانگان بچێتە زیندان. ◆ ئەگەر ئیستعدادی قەڵەو بوونی نەبووایە، زۆر جوان دەبوو.

١٩٤/ 6339- **ئیستیقالە کردن، ئیستیعفادان، خۆکێشانەوە:** ئەو دەمی کە ئەمن سەرۆکی ئیدارە بووم، ئەگەر بە جیددی موخالەفەیان کردبام، بێ سێ‌ودوو لێکردن ئیستیقالەم دەدا.

← بەجێ هێشتن، خۆکێشانەوە لە.

١٩٥/ 4200- **ئیسفالت کردن:** ئیوەی جادەکانی ئەم مولکە دەبێ ئیسفالت بکرێ.

ئیسکۆرت کردن ← حیمایە کردن.

١٩٦/ 1706- **ئیشتیا لێبوون (بەکەیف و زۆر)، مردن بۆ، مووی چوون، مووی بۆ هاڵتنەوە:** بڕۆ قاوەکەی سازکە. ئەوە دەمرم بۆ فنجانێکی ←تینووی... بوون.

١٩٧/ 2627- **ئیشتیای خۆ ساف کردن، کردنەوە:** ماری چوو بە سواری کەمێك بگەڕێ بۆ ئەوەی ئیشتیای ساف بێ/ بکرێتەوە (بۆ نان خواردن).

١٩٨/ 2210- **ئیشتیای شتێك هەبوون، حەوسەڵە هەبوون:** ئیشتیای لە خواردنی هیچ شتێك نەبوو.

ئیشتیای کەسێك کوێر کردنەوە ← لە دڵدان. ئیشغاڵ کردن ← دەست بەسەر داگرتن.

ئیشك بوون ← وشك بوون.

ئێشکچی ← نیگابان.

١٩٩/ 2970- **"افراط" و "تفریط" کردن:** حەوتووی رابردوو دەتگوت هەرچی زووتر مێرد بەو کابرایە دەکەی، ئێستا دەڵێی ئەگەر تەنیا پیاوی زیندوو ماوی سەر ئەم گۆیەی زەوی بێ، هێشتا مێردی پێناکەی. بەراستی "افراط" و "تفریط" دەکەی، وانیە؟

٢٠٠/ 3365- **ئیفقا کردن، لێیا پێك هێنان:** دەنگی لەسەرەخۆی موسیقاو چرا کەم نوورەکان، هەستێکی خۆشیان دە ژن و مێردە لاوەکەدا پێك هێنابوو؛ جینو ویسکیش ئەوەندەی دی ئەو هەستەی بزاوتبوون.

٢٠١/ 4577- **(لە یاری کریکێت دا) (بە هێزایی) ئیمتیاز وەدەست هێنان:** کاتێك تۆپەکەیان کەوتەوە دەستی، لە ئیمتیاز وەرگرتن دا پسانەوەیەك نەهاتە گۆڕێ: جانو والفرێد هەروا ئیمتیازیان وەردەگرت.

٢٠٢/ 5114- **ئیمتیاز کردن، هەبوون/ گرتن:** ئەوانی بە تەمەنتر لە زیاتر هاتنە خواری ستانداردی ژیانیان بە توندی ئیعتیرازیان هەبوو.

← راوەستان لە بەرامبەر...دا.

ئیعتیراز گرتن ← دژایەتیی خۆ راگەیاندن.

٢٠٣/ 5125- **ئیعتیرازێك هەبوون، پێخۆش نەبوون:** ئەگەر پێت خۆش نەبێ دەچم شامپاینەکە دەکرم، باشە؟

٢٠٤/ 4131- **ئیعتیراف کردن، هەموو شتێك درکاندن/ گوتن:** ئەگەر بە تەواوی ئیعتیراف نەکەی، ناچار دەبم زانیارییەکانیان بدەمێ.

ئیعتیماد کردن بە ← متمانە کردن بە

ئیقدام کردن ← هەنگاو هەڵگرتن.

٢٠٥/ 3335- **ئیلهام پێدران:** زانای راستەقینە کەسێکە کە بۆ دیتنەوەی شتێکی تازە دەربارەی ئینسانو ژینگەکەی ئیلهامی پێدەدرێ.

٢٠٦/ 3167- **ئیمان هەبوون بە، بڕوا هەبوون/ کردن بە:** ئەم جۆرە پیاوانە دەبێ ئیمانیان بە خودای هەبێو دەبێ لە پێوەندی دەگەڵ مەسەلە مەعنەویو ئەخلاقیەکان دروست بیر بکەنەوە. ✱ دوای ئەو هەموو ناهۆمێدییە زۆر دژوارە تازە بڕوایەکی بە دوکتوران مابێ.

←بڕوا هەبوون بە.

٢٠٧/ 3702- **ئیمتیاز/ پووان وەدەست هێنان:** سەرەنجام، کاپیتان فورمی خۆی پەیدا کردەوەو، باشترین پووانی وەرز، واتە ٧٠ ئیمتیازی بێهەڵەی وەدەست هێنا.

٢٠٨/ 5924- **ئیمزا کردن (بە ئیشارەی نووسین لە جێگایەك):** ئەمشەو لە زانکۆ نان ناخۆم. دەکرێ لە پێش ناوەکەم ئیمزام بۆ بکەی (کە وەدەرکەوتووم)؟.

٢٠٩/ -

٢١٠/ 5923- **ئیمزایان واژۆ کردن:** "ئێستاش کاکە، ئەگەر لەسەر ئوختە چینەکەی واژۆ بکەی، ماشینەکە دەبێتە هی خۆت.

٢١١/ 5224- **(لە جیاتی کەسێك) ئیمزا/ واژۆ کردنی دەفتەری چوونەدەر:** پاش دەورەیەکی سەرەکیی بارهێنان، سەربازەکانیان ئیجازەدا ڕۆژەکانی پشوودانی حەوتوو بچنەوە ماڵی خۆیان بەو مەرجە کە دەفتەری چوونەدەر واژۆ کەن.

٢١٢/ 5038- **(لە جیاتی کەسێك) ئیمزا/ واژە کردنی دەفتەری چوونەدەر:** ئەمشەو لە زانکۆ نان ناخۆم. تکایە دەفتەری چوونەدەر لە جیاتی من واژەکە. ✱ پاش دەورەیەکی سەرەکیی بارهێنان، سەربازەکانیان ئیجازەدا ڕۆژەکانی پشوودانی حەوتوو بچنەوە ماڵی خۆیان بەم مەرجە کە دەفتەری چوونەدەر واژە کەن.

ئیملا پێکوتن ←بە دیکتە پێکوتن.

ئیهانە کردن ← لە دم دانەوە.

٢١٣/ 3223- **بابەتی قسە بە کەسێك گۆڕین:** هەستانو دانیشتن دەگەڵ ئەو بابە گەورەیە هاسانتر بوو، چونکە ئیمکانی ئەوە هەبوو کە جارجار واداری کەین بابەتی قسەکانی بگۆڕێ.

٢١٤/ 539- **باتێکردن، با کردن، هەڵمساندن:** چەرخێکم پەنچەرە. دەبێ گاراژێك ببینمەوە، تەعمیری کەمو بای لێدەم/ تێکەم.

٢١٥/ 4492- **باج دان بە:** دەڵێن خاوەن مەیخانەکان باجیان دەدا بە تاقمێك لە تێرۆریستەکان بۆ ئەوەی نەهێڵن مەیخانەکانیان بە دەستی تاقمە تێرۆریستەکانی دیکە بتەقێندرێنەوە.

باران دەست پێکردن ← دەست پێکردن.

٢١٦/ 5898- **بارانی ... بەسەردا ڕشتن:** لەو کاتەوە کە وەژوورکەوتین بارانی میوانداریی پڕ لە خۆشەویستییان بەسەردار ڕشتین.

٢١٧/ 2162- **بارانی رادیو ئەکتیو:** ئیدیعایەکی کە سەبارەت بە پەناگاکانی رادیو ئەکتیو هاتۆتە گۆڕێ ئەوەیە کە ئەو پەناگایانە خەڵك لە بارانی رادیو ئەکتیو دەپارێزن.

٢١٨/ 3979- **(زیاتر لە ئەندازە) بارکردن:** وانێتەکەیان ئەوەندە زیاتر لە ئەندازە لە شتومەکی ماڵێ هەتا ئاخرین پرۆشکە بار کردبوو کە وەتاغەکەی بە فەنەرەکانییەوە نووساندبوو.

٢١٩/ 3980- **(تەواو) بارکردن، قەڵاپەچن کردن:** رادیارە وانێتەکەیان تەواو قەڵاقەچن کردووە.

٢٢٠/ 7227- **بار کردن، دە مل پەستاوتن، بەسەردابڕین:** هەمیشە لە ئیداران کەسێك هەیە کارە ناخۆشەکانی دەملی پەستێون.

← سوار کردن یان بوون، هێنانەوە.

٢٢١/ 3088- **بارهێنان بە، خوو گرتن بە:** ئەو بە ژیانی سەڵتی/ رەبەنی خووی گرتبوو. ✱ وای بارهێنابوو کە زۆر زوو بڕیار بدا.

٢٢٢/ 7057- **بارهێنان، پەروەردە کردن:** ناتوانن جێنشینەکانی خۆیان لە ستانداردی خۆیان بەرزتر پەروەردە کەن.

٢٢٣/ 4724- **بارهێنان:** رەفتاری توندوتیژی باوکی دەگەڵ ئەو، وای بارهێنابوو کە لە ژیانی ئایندەدا دژی دەسەڵاتخوازی بێ.

٢٢٤/ 1384- **بارهێنان بە، راهێنان بە:** منداڵێك کە بە ژیانی شار ڕاهاتبێ، بۆی هەیە لە جێگای دیکە نارەحەت بێ.

← دەرهێنان وەك پۆڵای

٢٢٥/ 750- **بارهێنان، گەورە کردن (بە بیروبڕوایەك):** کورەکانیان وەها بارهێنابوو کە بتوانن لەسەر پێی خۆیان راوەستن.

←کردن بە.

باری خەمو پەژارە سووك کردن لە لای ← دەردی دڵ کردن لە لای.

٢٢٦/ 6832- **(بەرەو لایەك) باریك كردنەوە:** درووشـاخەكەی بـە ئەسكەنە كەمێك باریك كەوە بۆ ئەوەی دەكونەكەوە بچێ.

٢٢٧/ 2007- **باری كەسێك قورس كردن، دەستو باڵی كەسێك بەستن:** پیاو نابێ لـە سـەرەتای ماڵدانانیدا بـە دانـەوەی قیستی ئەو شتانەی بەكرێی گرتـوون بـاری خـۆی قـورس بكا.

٢٢٨/ 5601- **باری كەسێك كردن، دەعل پەسـتاوتن، لەسەر كەسێك دانـان، خستنە ئەسـتۆی كەسێك، دە ملـی كەسـێك پەسـتاوتن، بەسەرەدابڕین:** هەمیشـە كـاری / ئـەركی زیـادیم دەملـی دەپەسـتێرن.

٢٢٩/ 5119- **بارین، بەسەرەدا رژان، بەسـەردا وەرین، وەریـن:** وردە گێچ لە میچی ڕا بەسەرمان دا باریو سەرو چاومان پڕبوو لە گێچ.

←تێك رووخان.

٢٣٠/ 4712- **بارین وەك گوزەی سەرەوژێر:** بـاران بەبێ‌پسـانەوە، وەك گۆزەی سەرەوژێر دەباری.

٢٣١/ 5852- **بـارین (وەك گـوزەی سـەرەو ژێـر)؛** لـە تەنیشـت پەنجەرەی هوتێل دانیشتبووینو باراڵان چاو لێدەكـرد كـە وەك گۆزەی سەرەوژێر دەهاتە خوار.

٢٣٢/ 3019- **بازجوویی (زۆرتـر بە لێدانـەوە)، لێـدان، لێهەڵدان:** پۆلیس كابرای گومان لێكراوی بۆ ماوەیەكی دوورو درێـژ بازجوویی كرد (بە لێدانەوە)، بەڵام نەیتوانی هیچ شتێكی لێدەربكێشێ. • كاتێك كابرای پەریان بێهۆش لە شـەقام دا دیتەوە، بە روونی دیار بوو كە بە چەند كەسان زۆر باشیان لێداوە.

باز خەرید كردن ← كڕینەوە.

٢٣٣/ 5541 -**بازداشت كردن، گـیران، دەسـتگیر كـران؛** ئـالفرێد بـە تاوانی خەتەرناك ماشێن لێخوڕین لـە شـەوی شـەمۆ دا، بازداشت كرا.

٢٣٤/ 673- **بازداشت كردن، گرتن، بردنە پاسگای پۆلیـس:** ئەگـەر كەسـێكت دی لەبـەر دەرگـای بـانك دێو دەچــێ/ دەخولێتەوە، بیگرە/ بازداشتی كە.

← گرتن.

بازدان بەسـەر شتێك دا ← هەرپاكردنە سەر

٢٣٥/ 4093- **بازدانە پێش:** دزەكـە بـە چەقۆوە بازدیدایـە پێشـەوە، ئـالفرێدیش بـۆ بـەرەنگار بوونـەوە پڕیدایـە جانتایەكی پیاوانە.

٢٣٦/ 3990- **بازداشتگە، ئەزاوە:** گومـــان لێكراوەكانیـــان شەوانە لە بازداشتگە/ دەس بەسـەر راگرت.

٢٣٧/ 4038- **بازرسیی كـردن، پشكنین، سەردان لـە. چـاولێكردن:** ئیجازەمـان وەرگـرت سـەر لـە كارخانـە تـازە دروسـت كراوەكـەیان بدەیـن كـە لـە نزیـك شـاری كاونتری‌یـە. • بازرسـەكە دوای ماوەیەك بۆ بازرسـێكی تـەواوو كـەماڵ دیتەوە.

٢٣٨/ 5359- **بازنشسته بـوون، تـەقاعود بـوون، خـۆ لـە كـار كێشانەوە:** لە فكری ئەوەدایە كە چەند سـاڵ پێـش تەمـەنی تەقاعود، خۆی بازنشـستە كا.

٢٣٩/ 4521- **بازنشسـتە كـردن، تـەقاعود كـردن، وەلانـان، هەڵپەسـاردن:** دەزانم دەورەی مـام پـۆلا بەسـەر چـووەو بێگومـان چیـدی پلـەو پایـەی ناچێتـە سـەر، بـەلام بـۆ بازنشـستە كردنی كەمێك زووە.

بازی بە كەلیمان كردن ← یاری بە وشان كردن.

٢٤٠/ 339- **بـازی كـردن، لەسـەر بـەرزەك بـوون (لـە شـانۆ/ لـە ئۆپێرادا):** رۆڵێكی/ نەخشێكی یەكجار دژوارە، بـۆ بەشـی زۆری پەردەی دووهەم دەبێ لەسەر بەرزەك بێ.

٢٤١/ 112- **بـاس كردن، موناقەشـە/ دەمەتەقـە كـردن، (لەسـەر):** ئەرێ ئێوە دوو نەفەر لەسـەر چی موناقەشە دەكەن؟

٢٤٢/ 1419- **بـاس كـردن دەگـەڵ:** قـەرارە نوێنـەری گشـتی، سەناتۆر مورفی، سەبارەت بە پاشماوەی دەسـەڵات لەسـەر ئۆستراليا دەگەڵ دەولەتی بریتانیا باس بكا.

٢٤٣/ 5296- **بـاس كـردن دەگـەڵ، دەم بـە دەمـە كـردن دەگـەڵ:** سەبارەت بەدرەفتاری دەگەڵ منداڵەكانی زۆر بە توندی دەم بـە دەمـیان دەگـەڵ كـرد/ سـەریان خـستە سـەری• سەرخستنەسەر ئالفرێد كارێكی خۆراییە. گـوێ ناداتـە قـەی كەس.

← قسە كردن دەگەڵ، هێنانەگۆڕ، هێنانەگۆڕ دەگەڵ.

٢٤٤/ 6817- **بـاس كردن لەسەر...:** ڕێگایـەكت پـێ پێشـنیار دەكەم كە رەنگـە لوتـف بكـەیو بـەری لێبكەیـەوەو لـە چاوپێكـەوتنێكی دیكـەدا باسـی لەسـەر بكـەین ← پێداچوونەوە، قسە لە شتێك كردن.

٢٤٥/ 3547- **بـاس نـەكردن، وەلانـان:** بـە موافەقـەتی هـەر دوولا، وتووێژكەران مەسـەلەی ئایینی‌یـان وەلانـاو هاتنـە سەر باسـی ناكۆكی‌یەكانیان لە پێوەنـدی دەگـەڵ مەسـەلە ئابووریو سیاسی‌یەكان.← ئەدركاندن.

باسـك لـێ‌هەڵكردن ←دەسـت بـەكار بـوون. باسـك لـێ‌هەڵماڵین ← لێبڕاوانە دەست بەكار بوون.

باسـی... كردن ← سـەروكار هەبوون دەگەڵ، قسەكردن لە.

٢٤٦/ 6958- **(هەروا لە خۆوە) باسی شتێك هێنانەگۆڕ، قسە لە شتێك كردن:** كاتێك ئاخرین جار دیتم هەروا باسی هاتنە پێشی قەیرانێكی خەتەرناكی ئابووری دەكرد.

٢٤٧/ 4459- **باسی شتێكی دیكە كردن، چوونە پێش و باسی ... كردن، چوونە سەر باسێكی دیكە:** ئەگەر لەم بارەوە باسێك نەماوە، با بچینە سەر بابەتێكی دیكە/ بچینە پێش.

٢٤٨/ 4355- **باسێك لە ... نەهێنانەگۆڕ، باسی شتێك نەكردن، ناوێك لە ... نەبردن:** وەزیری دارایی بە وردبینییەوە تێدەكۆشا باسێك لە كەمبوونەوەی پاشەكەوتی زێڕ نەهێنێتە گۆڕێ.

٢٤٩/ 353- **باسی كەسێك كردن (بە خراپی)، غەیبەتی كەسێك كردن:** ئەو فێڵبازانەی دایكت باسیان دەكا هیچ خۆشم ناوێن.
باسی كەسێك كردن (پشت ملە) ← غەیبەتی كەسێك كردن.

٢٥٠/ 333- **(وەزعییەت) باش بوون، تێروتەسەل بوون:** بنەماڵەكەم وەزعی باش نییە. لەباری پوولو پارەوە وەزعت چۆنە؟ لەباری خواردنو خواردنەوە وەزعی زۆر باشە/ تێروتەسەلە.

٢٥١/ 157- **باش بوون، ئەكامی باش لێ چاوەڕوان كردن. شوێنەواری باش دانان لەسەر) (بەرامبەریە):** بەداخەوە، ئازایەتییەكەی لەبەرامبەر هێزی یەكجار زۆری نەیارەكانیدا شوێنەوارێكی نابێ.
باش بەخێو كردن ← تێر كردن.

٢٥٢/ 7197- **(لە بازرگانی و ماڵیدا) باشتر بوون، چوونەسەر، زیادبوون:** سەرمایەدانان خەریكە زۆر بە خێرایی دەچێتە سەر... .

٢٥٣/ 3679- **باشتر بوون لە، وەپێش كەوتنەوە:** كاتێك مەسەلەی زمان فێربوون دێتە گۆڕێ، كچان لە كوڕان زۆر باشترن.

٢٥٤/ 3351- **باشتر كردن، بوون:** ئەو كچە بە بڕینی ئەو فاسیلەیە بە مەلە لە كەمتر لە دەقیقەیەكدا ڕێكۆردی ڕابردووی خۆی باشتر كرد.

٢٥٥ 775- **باشتر كردن، بەرز كردن، دەمەزەرد كردنەوە(ی زمانێك):** پێش ئەوەی بۆ دیتنەوەی كرێاران بچێتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، زمانی عەرەبییەكەی بە پەلە دەمەزەرد كردەوە/ باشتر كرد.

٢٥٦/ 2143- **باشترین ... وەگیر كەوتن، تووشی باشترین ... بوون:** نەنە زارا هەمیشە ئامادەیە یارمەتیتان بدا. بەراستی شانسی باشتان هێناوە تووشی كەسێكی ئاوا باش بوون.

٢٥٧/ 1792- **باش ڕەفتار كردن دەگەڵ، جوان بزووتنەوە دەگەڵ:** كۆمەڵێكی ئینسانی هەمیشە دەگەڵ كەسانی بە ساڵداچوو دا جوان دەجووڵێتەوە.

٢٥٨/ 2519- **باش یان خراپ دەست پێكردن، بە ڕێگای باش دابردن یان وەسەر كاری خراپ پەڕاندن:** مودیری بازار دیتنەوە زەحمەتێكی زۆری كێشا بوو، بۆ ئەوەی چالاكیەكەی بە ڕێگایەكی باشدا بەرێ/ بخاتەسەر ڕێگایەكی باش.

٢٥٩/ 3572- **باڵادەستیی خۆپاراستن:** سەرۆك وەزیران باڵادەستیی خۆی لە بەرامبەر ئۆپۆزیسیۆندا پاراستووە، زۆرتر بە هۆی بێكارەیی ئەوان هەتا كارامەیی و لێهاتوویی خۆی.

٢٦٠/ 520- **بالق بوون، خۆناسین، (پێ) گەیشتن:** دەزانم، كچەكەم بالق بووە/ خۆی ناسیوە.
← خۆ ناسین.

٢٦١/ 1217- **بالق بوون، خۆناسین، گەیشتنە تەمەنی هەژدەسالی (لە بریتانیا):** ئەگەر خۆی ناسی دەتوانێ بەو پووڵو پارەیەی باوكی (وەك میرات) بۆی بەجێ هێشتووە، دەتوانێ هەر كارێكی پێی خۆش بوو بیكا.

٢٦٢/ 4836- **با كردن، با لێدان:** پێش ئەوەی بگەیە جاددەی چەرخەكانت با لێدە.
با لێبوونەوە ← ترین.

٢٦٣/ 752- **بانگ كران بۆ (دادگا):** بە هۆی بێ ئەدەبی و پێش گرتن بە پۆلیس، بانگیان كردوونە دادگا.
← ڕەكێش كردن.

٢٦٤/ 886- **(بە دەنگی بەرز) بانگ كردن، سڵاو كردن، داوا كردن:** ئەگەر ویستت شتێك لە بۆفیە/ كومەرد دەربێنی، بانگم كە.

٢٦٥/ 888- **بانگ كردن، قسە كردن (بە دەنگی بەرز):** "جان، چەند جارت پێ بڵێم بە دەنگی بەرز/ بەرزەوە قسان مەكە"؟.

٢٦٦/ 5276- **بانگ كردن، پێكوتن:** ئەو دۆستە نێسك گرانەی ئێمە كاتێك بە ناوی وەزیری داد بانگی دەكەین كەیفی ساز دەبێ.

٢٦٧/ 877- **بانگ كردنە پێش:** كاپیتانی تیمی سەركەوتوویان بانگ كردە پێش كە جامی سەركەوتن وەرگرێ.

٢٦٨/ 6611- **بانگ كردنە قەراغێك یان گۆشەیەك (بۆ ئەوەی خەڵك گوێیان لە قسەكان نەبێ):** ناچارم لەم ڕۆژانەدا ئەو كوڕە

بانگ کەمە گۆشمیەکەو سەبارەت بەو دۆستانەی هەنی وشیاری کەمەوە.

۲٦۹/ 881- **بانگ کردنەوە، لێدەر کردن (سەگ لە کەسێک)**: بۆ کاری خۆت ناکەی؟ خۆ هیچت لێنەهاتوە. ئەو خانەی لەوێ راوەستاوە، سەگەکەی لێدەر کردی.

۲۷۰/ 5201- **بانگ کردنەوە، گەڕاندنەوە، بانگ هێشتنەوە**: نوێنەری بەرزی وڵاتانی قازانج هاوبەشیان لە لەندەن ڕا بانگ کردەوە.

۲۷۱/ 1403- **بانگ کردنەوەی (رووح)، رووح حازر کردن**: ژنە جادووگەرەکان مشتەرییەکانی خۆیان دێنا سەر ئەم بروایە کە دەتوانن رووحی بابەو باپیرانیان بانگ کەنو پیشانیان بدەن.

۲۷۲/ 56- **بانگەشە کردن (بۆ)**: پێش ئەوەی کە ژنان بتوانن مافی دەنگدان وەدەست بێنن، ناچار بوون ساڵها بانگەشە (تەبلیغ)ی بۆ بکەن.

۲۷۳/ 2290- **بانگ هێشتن (بۆ ملاقاتی، موناقەشە)**: حیزب رقەبەرە سیاسییەکانی بۆ دەمتەقییەکی تەلەڤیزیۆنی بانگ هێشتن کردوە.

۲۷٤/ 3151- **بانگ هێشتن، لێگێڕانەوە**: کابرا گوتی: لەم چەند رۆژەدا چەند کەسێک بۆ بەرەخواردنەوە بانگهێشتن دەکەم.

۲۷٤٫۱/ 1748- **بڕین، قەتع کردن**: پێش ئەوەی پشتی تەلویزیونەکە بکەیەوە، دەبێ لەوە ئەرخەیان بی کە کارەباکەت قەتع کردوە.

۲۷۵/ 3442- **بانگ کردنە ژوور**: ماری، لەبەر دەرگاکە رامەوەستەو قسان مەکە. دۆستەکانت بانگ کە ژوورێ.

۲۷٦/ 129- **بانگ هێشتن (بۆ چوونەدەر بۆ سەیران)**: کوڕەکەی دراوسێمان بانگی کردووم بۆ نانی شەوێ بچینە دەرێ. کاتێك خانمی هاگز پێی زانی مێردەکەی سکرتێرەکەی بۆ نانی شەوێ بردۆتە دەرێ، یەکجار تووڕە بوو.

۲۷۷/ 6526- **بانگ هێشتنەوە، بانگ کردنەوە**: بالوێزەکانیان بە پەلە بۆ وڵاتەکانیان بانگ کردوونەتەوە.

۲۷۸/ 900- **بانگی شەیتان کردن، داوای هاتنی شەیتان کردن**: کۆڕی جادووگەرانی ناوچە بەوە تاوانبار کرابوون کە داوا لە شەیتان دەکەن (بێتە خوارو) لە کارە شەیتانییەکانیاندا یارمەتییان بدا.

۲۷۹/ 890- **بانگ یان داوای کەسێک کردن (بۆ هێنور کردنەوەی وەزعییەتێک)**: کابرایەکی تۆشە گروشی / سامیعەی تەلیفونی هەڵگرتو داوای تاقمی ئاور کووژاندنەوەی کرد.

۲۸۰/ 275- **باو بوون، مۆدبوون**: ئێستا چەرم باوە (= مۆدی چەرمێ) پلاستیك لە مۆد کەوتووە (= لە باو کەوتووە، باوی نەماوە).

باو نەمان ← لە باو کەوتن.

۲۸۱/ 2677- **باوەڕ پێکردن، بروا کردن بە**: زۆر دژوارە و پیاو بروا بکا کە گۆیا لە مەرگی بێئەملاو ئەولا رزگاری بوو بێت.

۲۸۲/ 496- **باوەڕ پێکردن، ئەرخەیان بوون لە، خاترجەم بوون لە**: دەتوانی لێی ئەرخەیان بی هەرگیز ناهۆمێدت ناکا.

← بروا پێکردن.

بایخ پێدان ← لەبەرچاو گرتن.

۲۸۳/ 5902- **بایخ پێنەدان، بە سووکی چاولێکردن، بە چاوی سووکەوە تێڕوانین**: عادەتی وابوو بە سووکی چاو لەو رەخنانە بکا کە لێیدەگرن، هەروەك تۆ بڵێیی ئەوجۆرە شتانە زۆر خوارتر لە کەسایەتیی خۆی دەبینێ.

۲۸٤/ 4084- **بایخ پێنەدان، پێنەزانین، تێنەگەیشتن، لەبەرچاو ونبوون**: 'وەکوو ئەوەیە کە تەلەڤیزیۆنێکت هەبێو هەرگیز چاوی لێنەکەی.' ئالفرێد کە تەلەڤیزیۆنی نەبوو، لەو تەشبیهە نەگەیشت. ● نومایشی هێزی هەوایی رۆژئاوا شتێك نەبوو کە رووسەکان نەیبینن/ تێی نەگەن.

۲۸۵/ 4438- **بایخ پێنەدان، دووری لێکردن، خۆلادان**: هەستی بەوە دەکرد کە دۆستەکانی دووری لێدەکەن.

← چاو لێنەکردن.

۲۸٦/ 3163- **بایخ پێنەدان بۆ، بە هێند نەگرتن**: سەرهەنگەکە ئەو ئەفسەرانەی بە هێند نەدەگرت کە لە پلەو پایەی دەرەجەدارانەوە هاتبوونەسەر ← بە هێند نەگرتن.

۲۸۷/ 3857- **بای ... خالی/ بەتاڵ کردن**: تۆشەیەك بای چەرخەکانی (تایەرەکانی) پشتەوەی ماشینەکەی خالی کردووە!.

بایخی کەسێك زانین ← ئافەرین گوتن بە.

بایخێك بۆ دانەنران ← بێفایدە بوون.

بایگانی کردن ← هەڵگرتن، فایل کردن.

۲۸۸/ 1950- **بڕان، تەواو بوون، لێبڕان**: لەوە دەترسان هێزی داهێنەریان تەواو بێ.

← داخران.

۲۸۹/ 326- **بڕان، قەتع بوون، هەڵبڕان**: کاتێك بێن لوولەی سەرەکی چاك کەنەوە، گاز(ەکەمان) قەتع دەبێ.

۲۹۰/ 597- بران، تێکچوون، تێک چوون، هەڵوەشانەوە: یەکگرتنی دیمۆکرات- مەسیحی‌یەکان‌و لیبراڵەکان هەڵوەشاوەتەوە. * ناتوانی بڵێی پیاو چ حاڵێکی دەبێ کاتێک دەبینێ هەموو نەخشەکانی بۆ داهاتوو هەڵوەشاونەتەوە.

۲۹۱/ 612- بڕان، تەواو بوون، کۆتایی هاتن، پسان: پۆلیس بەرنامەی راوانی (کابرای) کۆتایی پێ‌هێنا. *بە هۆی ناکۆکی لەسەر نرخەکان، پێوەندیی بازرگانی‌مان پساوە/ تەواو بووە.

۲۹۲/ 6626- بڕانە لای، رەکێش کردن بۆ لای: جێگرانی مامۆستاکان دەیانتوانی بە هەڵەی چکۆلەی قوتابیەکان رابگەن، بەڵام ئەوانەی تاوانی گەورەیان دەهاتەوە پێی بۆ لای مودیری قوتابخانە رەکێش دەکران.

۲۹۳/ 7284-بردن، هەڵگرتن‌و بردن (بە ئەنقەست یان بە هەڵە): ئەمە بارانیی من نیە، دەبێ کەرە پیاوێک دەگەڵ خۆی بردبێ/ هەڵیگرتبێ.

۲۹٤/ 4694- بردن، هێنان (بە پەلە): تەنیا ئەم نامەیە بە پەلە دەبەمە پۆستخانەی. ئەگەر دەقیقەیەکە دەرفەت هەبێ، ئەنتیجەکان خێرا دێنم.

۲۹٥/ 3398-بردن/ چوون دەمێشکی کەسێکەوە، بەرە بەرە وانێکەیاندن: دایکو بابم زۆر دەمارگرژ بوون‌و لە خوا ترسان‌و لەخۆبوردوویيان بردبوو دەمێشکمەوە. * بیروبروایەکی ئەوتۆ چووبوو دەمێشکی شازادە گەنجەکەوە کە پێی وابوو مەوجوودێکی نیوە خودایی‌و لە سەرووی هەموو کەسێکەوەیە.

۲۹٦/ 6715- بردن، دەگەڵ خۆبردن: یەکێک لە ئەفسەرە پۆلیسەکان بۆ لێپرسینەوە دەگەڵ خۆی بردی.

۲۹۷/ 4798- بردن (بۆ پاسگای پۆلیس) جەلب کردن بۆ: دوو کورە چکۆلەیان کە لە نزیک سوپێر مارکێتیک دەخولانەوە، بردە پاسگای پۆلیس.
→ رەکێش کران.

۲۹۸/ 6758- بردن (بۆ ئەوبەری شاری، چۆمی): بیرم لەوە دەکردەوە کە منداڵەکان بۆ پشوودانی ئاخری حەوتووی بەرمە لای دایکم.

۲۹۹/ 3142- بردن بۆ دادگا: ئەمە دووهەمین جارە کە ماتێوی بە هۆی خەتەرناک لێخوڕینی ماشێن دەبەنە دادگایە.
بردن بە رێگای باش دا → باش دەست پێکردن.

۳۰۰/ 1943- بردن دەمێشکی کەسێکەوە، بە گوێدا خوێندن: لە سەردەمی منداڵی‌یەوە ترس لە خودای براوە دەمێشکی‌یەوە.

۳۰۱/ 4831- بردن دە مێشکی کەسێکەوە، دەمێشکی کەسێک رۆبردن: فاکت و عەدەدان لە مێشکی قوتابیی بێ‌عەلاقە رۆکردن/ فاکتو عەدەدان بردن دە مێشکی قوتابیانی بێ‌عەلاقەوە کارێکی دژوارە.
بردنە پاسگای پولیس → بازداشت کردن.
بردنە پێش → قبووڵاندن.

۳۰۲/ 6627- بردنە خوار (لە عەرشەی کەشتی بۆ هۆدە چکۆلەکانی ژێر عەرشە): دەریانەوەردە رزگار کراوەکانیان بردە خوارێ‌و کەمێکیان چێشتی گەرم‌و جلکی وشک دانێ.
→ چوونە خوار لە.

۳۰۳/ 1067- بردنەدەر (لە هۆدە)، کۆکردنەوەو بردنەدەر: ئەم قاپانە کۆ دەکەمەوە (و دەیانبەمە دەرێ)و ئەوجار دەتوانین لەسەر میزەکە کار بکەین.
→ دەگەڵ خۆ بردنەدەر، وەدەرنان، دوور کردنەوە لە.

۳۰٤/ 2959- بردنە سەر، بە ئەنجام گەیاندن: هەرچی کاتی هاتنی میوانەکان نزیک دەبووە، خانمی وایت دەیگوت بریا بانگم نەکردبان، بەڵام دەشیزانی دەبێ ئەو کارە هەر بە ئەنجام بگەیەنێ.

۳۰٥/ 1991- بردنەسەر(ی پلەو پایەی کەسێک): هەر کات سیاسەتمەدارێک بۆ حیزبەکەی خۆی دەردەسەرێک پێک بێنێ(= لێی ببێتە سوێی بن هەنگڵێ) دەری دەپەڕێننە قاتی سەرێ، واتە پلەو پایەی دەبەنە سەرێ‌و دەیکەن بە ئەندانی مەجلیسی لۆردان.

۳۰٦/ 2339- بردنەسەر، زیاد کردن: بردنە سەری حەقدەستی کارمەندان‌و کرێکارانی شەریکەی خەتی نێوشار دەبێتە هۆی زیاد بوونی کرێی سوار بوون.

۳۰۷/ 3892- بردنەسەر(ی چۆنایەتیی ژیانی هەژاران): بۆ ئەوەی کە ئەوپەری یەکسانی وەدەست بێنین، دەبێ ئیستانداردی قوتابخانە تازەکان بەرینە سەر - ئیستانداردی قوتابخانە گرامێریەکان نەهێنینەخوار.

۳۰۸/ 4979-بردنەسەر، زیاد کردن(ی نرخی شتێک): هەنگاوەکانی ئەم دواییانەیان چەند تەنێک/ چەند دینارێک خەرجی خواردنی حەفتانەیان دەباتە سەرێ.

۳۰۹/ 801- بردنە سەر، زیاد کردن: بانکەکان زەخیرەی خۆیان تا رادەی پێویست زیاد کردووە بۆ ئەوەی بتوانن لەبەرامبەر قەیراندا خۆ راگرن.

→ زیاد کردن.

٣/٢١٠ 5733- **بردنە سەر**: زیاد بوونی هەزینەی بەرهەم هێنان نرخەکان دەباتە سەر.

→ یارمەتیدان بە، زیاد کردن.

٣/٢١١ 807- **بردنە سەر، چوونەسەر، زیاد کردن یان بوون**: لە بەرەبەری داخرانی بازاردا، بە هۆی هاتنە پێشی چەند ئاڵوگۆڕێك لە یاسای مالیاتدا کە تەئسیر دەکاتە سەر داهاتی خەڵك، نرخی شتومەك چوۆسەرێ.

٣/٢١٢ 4827- **بردنەسەر، باشتر کردن**: نەرمەی وەرەقەی جوغرافیاکەی چەند پلەی بردە سەرێ.

٣/٢١٣ 5070- **بردنەسەر، زیاد کردن**: هەر جارەی کە کرێگرتەیەکی تازە ئەو ئاپارتمانە/ شوقەیە بە کرێ دەگرێ، کرێیەکەی کەمێك دەباتە سەر/ زیاد دەکا.

٣/٢١٤ 4866- **بردنە سەر، زیاد کردن**: زیاد بوونی حەقدەستەکان، نرخی کارەبایان بڕیسانەوە بردۆتە سەر.

٣/٢١٥ 2551- **بردنەسەر(بێ)...، گوزەران کردن (بێ)...**: ئاغای ئاندرێ چۆن دەتوانێ بێ کابان گوزەران بکا؟ هەرگیز بە تەنیا نەژیاوە.

٣/٢١٦ 4242- **بردنەسەر، نرخی شتێك گران کردن**: خاوەن دەواجینەکان لەو دواییانەدا شکایەتیان کردووە کە عومدە فرۆشەکانو قەسابەکان نرخی قەلەموونەی کریسمەسیان تا رادەی لەسەدا سەد بردۆتە سەر.

٣/٢١٧ 5231- **بردنە سەربازی، دامەزراندن، لەسەر کاردانان**: لە سەردەمی شەڕدا، ژمارەیەك لە لاوەکانیان لەژێر ناوی کورانی ئەوین لە کانگا ژێر زەوییەکان لەسەر کاردانا. دەوڵەتی سەردەمی شەڕ لە پێشدا ئەو کەسانەی بردە سەربازی کە لە سەنعەتە غەیرە ئەساسییەکاندا کاریان دەکرد.

٣/٢١٨ 897- **بردنە سەربازی، بوون بە سەرباز، چوونە ئیجباری**: راست دەگەڵ دەست پێکردنی شەڕ بردیانە سەربازی/ بردیان بۆ سەربازی.

٣/٢١٩ 5479- **بردنە سەری نرخی کالایەك و راست کردنی نرخەکەی.**

٣/٢٢٠ 5598- **(بە پەلە) بردنە نەخۆشخانە**: دوو کەس لە موسافیرەکانیان کە زۆر خراپ سەریان بریندار ببوو بە پەلە بردنە نەخۆشخانە.

بردنە نێو → ڕێنوێنی کردن بۆ نێو.

٣/٢٢١ 233- **بردنەوە، گێرانەوە، هێنانەوە**: سەعاتی بابە گەورەیان بردبۆوە سەر جێگای جارانی. * پێش ئەوەی بنووی بزانە سەگەکانیان هێناوەتەوە نێو کونەکەیان.

٣/٢٢٢ 5522- **(بە هاسانی) بردنەوە، سەرکەوتن**: تیپی برێزیل لە یەکەمین پێشبڕکێدا بە هاسانی سەرکەوت.

٣/٢٢٣ 7299- **(بەهاسانی) بردنەوە**: لە ڕۆژەکانی کۆتایی حەوتوودا، کینیاییەکان میداڵیای زێڕی پێنج هەزار میترو ئەسب سواریی دەوری وڵاتیان بردەوە.

٣/٢٢٤ 5458- **بردنەوە، سەرکەوتن (بەهاسانی)**: شاز (ئەسپی هەڵبژێراوی زۆربەی خەڵك) بە چەند هەنگاو زۆر بە هاسانی سەرکەوت.

٣/٢٢٥ 6622- **بردنەوە (بۆ جێگایەك)، گەیاندنەوە**: کاتی قوتابخانەی پاش نوێژانە. مارگرێت، دەکرێ منداڵەکان بە ماشێنی خۆت بەریەوە/ بگەیەنیەوە.

٣/٢٢٦ 1342- **بردنەوە (یانسیب، بەخت ئازمایی)**: یەکێك لە کارتەکانم لە دەوری ئاخردا هاتەسەرو ئەمنیش ٢٥ پوند جایزەکەم بردوە.

→ (بە سانایی) سەرکەوتن.

٣/٢٢٧ 920- **بردنەوە**: تیپی میوان گشت میداڵەکانی بردەوە.

٣/٢٢٨ 6667- **بردنەوە بۆ ماڵی خۆ**: هێندێك لە ماڵەکانی ناوچە، خوێندکارە بیانییەکان، بۆ شەوی کریسمەس دەبەنەوە ماڵی خۆیان.

٣/٢٢٩ 4850- **بردنەوە بۆ پشتەوە**: کچەکە زوو زوو ئەو لیسپە موونەی دەرژانە سەردەمو چاوی بە دەست لای دەدان (دەیبردنەوە پشتەوە).

٣/٢٣٠ 5349- **بردنەوە سەرکاری خۆ، کاری خۆ پێدانەوە**: ئەو کارمەندانەی بە دوای لێبووردنی گشتی دا ئازاد کران بردوویانەوە سەر کاری خۆیان.

٣/٢٣١ 7394- **بردنەوە لە**: سەعاتێکی زێڕی لە کابرایەکی بردوە کە لە یانەی/ لە باشگای دیبووی.

٣/٢٣٢ 7141- **بردنەوەو دانەوە**: حەوتوویەکی دیکە دەرفەت دەدەم بەم مزگایە بۆ ئەوەی باش وەکار بکەوێ، دەنا دەیبەمەوەو یەکێکی دیکە دێنمەوە.

٣/٢٣٣ 1512- **برژاندنەوە، گەرم کردنەوە، بۆدانەوە**: ئەم گوڵە دانانە خاو بوونەوە، ئەگەر لەسەر ئاوریان دانێیەوەو گەرمیان کەیەوە، زۆر خۆش دەبن.

برست لێبرین → لە پێخستن، خنکاندن، بە چۆك داهێنان، بێهێز کردن.

برست لێبران → لە لاق کەوتن، ڕەجل لێبران.

برسیایەتی شکاندن → کوڵ کردن.

٣٢٤ 6290- **برسی کردن و به چۆك داهێنان:** پێیان وایه به داخستنی بەندەرەکانمان دەتوانن برسیمان بکەن و بە چۆکمان دابێنن.

٣٢٥ 6292- **برسی کردن و دەرپەڕاندن:** دوژمن که نەیتوانیبوو بە بۆمباران خەڵکەکە لە پەناگاکان دەربپەڕێنێ، دەستی دایە برسی کردن و دەرپەڕاندنیان.

٣٢٦ 5512- **برۆ، بە دوڵا:** کچی باش بە، برۆ، بابە کاری هەیە.

٣٢٧/ 1984- **برۆ، لەبەرچاوم لاچۆ، جەهەننەم بە، بە دۆڵا:** سەردەستەی جینایەتکارەکان لە یەکێك لە تەماشاچییەکان چوو پێشێ و پێی گوت: ئەگەر ناتەوێ بەڵایەکت بەسەر بێ، جەهەننەم بە.

٣٢٨/ 2828- **برۆ ئەرخەیان بە:** لە بەوت ئەچێ ئێمە هەمووومان لەسەر تۆین. کەوابوو برۆ ئەرخەیان بە.

٣٢٩/ 2881- برۆ بابە! بەڵێ! وەڵڵا بابە خراپ نیە! دەگەڵ ئیم:

"عومرت چەند دەبێ؟ چل ساڵم"

"برۆ بابە !" بە خوا رۆژێك لە سی ساڵ زیاتر نابێ"

٣٤٠/ 2898- **برۆبابە!:** چاوێکی لێدا گرتم و لە حاڵێکدا بەلاتاوەوە قسەی دەکرد گوتی: "برۆ بابە! ئاغای دوکتور!".

٣٤١/ 2759- **برۆ بابە! وەرەخوار!:** ساڵێ دووهەزار پوند؟ برۆ بابە! خوات لێرازی بێ ئەو کارە ١٥٠٠ پوندیش هەڵناگرێ ← لێمان گەڕێ!.

٣٤٢/ 4946- **بروا پێکردن، بەڕا پێکردن، متمانە پێکردن:** بروایان بەو زانیارییانە نەدەکرد کە لە رێگای کارمەندانی کۆنەکار و کارامەی ئەرتەشی بریتانیاوە بەدەستیان گەیشتبوون.

٣٤٣/ 6727- **بروا پێکردن، باوەر پێکردن، بەڕا پێکردن:** ناچاری هەرچی ئەو دەیڵێ باوەری پێبکەی.

٣٤٤/ 497- **بروا کردن بە هەبوونی...:** بەراستی پیاو ناتوانێ بروا بکا کە شەوەو سەرهەڵقەنەو شتی لەم بابەتە هەبن.

← باوەر پێکردن.

٣٤٥/ 6616- **بروا کردن یان متمانە کردن بە قسەی کەسێك:** بۆ بە قسەکانی باوەر نەکەین و کارەکەشمان هەر لە سەر ئەم بناخە جێبەجێ نەکەین؟ ئەو کەنگێ بەڵگەیەکی داوەتە دەستت کە لێی بەگومان بی؟

← متمانە کردن بە.

٣٤٦/ 3167- **بروا هەبوون بە، ئیمان هەبوون بە:** ئەو پیاوانە دەبێ ئیمانیان بە خودای هەبێ و دەبێ لە پێوەندی دەگەڵ ئەو مەسەلە مەعنەوییانەدا دروست بیربکەنەوە.

← ئیمان هەبوون بە.

٣٤٧/ 5632- **برۆس لێدان و پاك کردنەوە:** بۆ ئەوەی ژەنگ/ غەوری کالسیۆم لە بنی مەنجەڵەکان بکەنەوە، دەبێ برۆسیان لێدەن.

٣٤٨/ 2241- **بڕیاردان بە قازانجی، حوکم دان بە قازانجی:** کاتێك کێشەیەك کە بۆ جاری دووهەم هاتەوەگۆڕێ، کۆڕی ئینساف بە قازانجی کابرای گومان لێکراو بڕیاری دا.

٣٤٩/ 1153- **بڕیاردان بە قازانج یان بە زیانی، دەسەڵات بەکار هێنان:** سەرۆك وەزیران بە قازانجی من بڕیاریدا و سکرتێری مۆستەعمەرات دەرکرا.

٣٥٠/ 1652- **بڕیاردان بۆ ئەنجامدانی کارێك:** بڕیارمان داوە ئەمساڵ بۆ شەوی کریسمەس کۆبوونەوەیەکی گەورەی بنەماڵەیی پێك ئەهێنین. ← رێککەوتن لەسەر.

٣٥١/ 1653- **بڕیاردان بە قازانجی:** پێم وانیە هیچ دادگایەك لە سەرانسەری وڵات بە قازانجی ئەو بڕیار بدا.

٣٥٢/ 500- **بڕیاردان، پێداگرتن (لەسەر ئەنجامدانی کارێك):** بەهۆیە کە دەیەویست بەیانی زوو وەرێکەوێ/ بڕیاری دابوو بەیانی زوو وەرێکەوێ، بانگ هێشتنەکەی ئێمەی قبووڵ نەکرد.

٣٥٣/ 4211- **بڕیاردان:** چاو، بڕیارم داوە میوانییەك لێرە بەرێوەبەرم.

٣٥٤/ 1651- **بڕیاردان لە دژی:** دادگا لە کێشەکەدا لەدژی بنەماڵەی پاشایەتی بڕیاریدا.

٣٥٥/ 5334- **بڕیاردان (لەسەر):** بۆ ئەستاندنەوەی ناوچە داگیرکراوەکە، ژێنراڵ بڕیاریدا شەوانە پێشڕەوی بکرێ.

بڕیار لەسەر دران ← پەسند کران

بڕیار لەسەردان لە مەجلیس ← کردن بە یاسا

بڕیار گۆڕین ← رێگا، یان بڕیاری خۆ گۆڕین.

٣٥٦/ 1412- **بریتی بوون لە، بە واتای .. بوون، بە مانای ...بوون:** نیشتمانپەروەریی راستەقینە بە مانای ئەوەیە کە قاوانج و بەرژەوەندییەکانی وڵات لە سەرووی هەموو شتێك، یەك لەوان لە سەرووی گیانی خۆشمانی دابنێین.

← دابەشکران بە.

٣٥٧/ 1413- **بریتی بوون لە، پێکهاتن لە:** ئەو سێتە بریتییە لە ٧٢ پەرداخ، واتە هەر دوو جینەی لە ٦ جۆری جیاواز.

٣٥٨/ 2720- بریقە بریق کردن، تروسکانەوە، بریسکانەوە: چاوەکانی کوڕە هەژارەکە بە فرمێسکان دەبریسکانەوە.
← بریسکانەوە، بریقانەوە.

٣٥٩/ 1576- بڕین، لەتلەت کردن: کەشتیکی جەنگی خۆی لەژێر دەریاییەك داو دوو لەتی کرد.

٣٦٠/ 3250- بڕین(ی دار بە بیور): ڕەدیفێك سپیداریان بڕی بۆ ئەوەی کە جێگا بۆ یەك سێری دوکانی دزێو بکەنەوە.

٣٦١/ 2583- بڕین(ی ڕێگا): کابرای پالەوان ئەمێوانی مەوداکە لە کەمترین ماوەدا بڕی، بۆ ئەوەی بگاتە فینالی.

٣٦٢/ 5986- بڕین(ی کوتێك/ پارچەیەك/ بەشێك لە شتێك): لەتکێکی گەورەی لە نانەکە بڕی‌و وەبەر قەپالانیدا.

٣٦٣/ 1579- بڕین، پەڕاندن: قامکێکی کابرای کرێکار بەو دەزگایەی کاری پێدەکرد پەڕی. بە چرکەیەك ناگا لە خۆ نەبوون، هەموو شتێك تەواو بوو.
←هەڵپەرتاوتن، هەرس کردن.
←ئالۆز کردن.

٣٦٤/ 1583- بڕین(ی وتوویژی تەلەفیوونی)، قەتع بوون: ڕاست لەو کاتەدا کە گەیشتبووینە خۆش ترین جێگای بەسەرهاتەکە، تەلەفوون قەتع بوو.

٣٦٥/ 1598- بڕین(و دەرهێنان): منداڵەکان هەموو ئەو ڕەسمانەی کە لە گۆڤارانیان دەرهێنابوون، نیشانی مامۆستاکەیان دان.

٣٦٦/ 623- بڕین، کون کردن: بۆ ئەوەی دەستیان بە سندووقە پۆلاکە ڕابگا، دزەکان دیوارەکەو حایلیکی پۆلایان بڕیبوو.

٣٦٧/ 5907- بڕین، هەڵبڕین: چەند ڕۆژە حەمامم نەکردووە. ناوە گەرمەکەیان هەڵبڕیوە.

٣٦٨/ 5612- بڕین، بڕینەوە(بە مشار): ناچار بوون هێندێك لە دارەکان بە مشار ببڕنەوەو بۆ خاتری تەختە بە نرخەکانیان بیانفرۆشن.

٣٦٩/ 4421- بڕین، هەڵگرتن(بە چەقۆ): بۆ ئەوەی دەست بگاتە میوەکان، ئەو ئەردە تەختەیەی بە چەقۆیەکی تیژ بڕیەوە. * جەراحانی پلاستیك تێکنیکی پێست هەڵگرتن‌و پێوەند کردنی لە جێگایەکی دیکەی بەدەنیان باشتر کردووە.

٣٧٠/ 3830- بڕین، لێکردنەوە: باران هێشتا لێی نەکردبووە* نیچیروان قەمەکانی لەسەر شەریکە بڕی.

٣٧١/ 1032- بڕین، بڕینەوە: دەمهەوێ هێندێك لەو دارە سێوانە ببڕم؛ وادیارە چیدی بەرناهێنن.

٣٧٢/ 508- بڕین، قەتع کردن/ بڕین(ی بەرنامەی تەلەفزیۆن)؛ کوژانەوە: چەند چرکەیەك دوای دەست پێکردنی بەرنامە، تەلەفزیۆنی لەندەن قەتع بوو/ کوژاوە.

٣٧٣/ 1564- بڕین(و لە ئەرزی دان): کاتێك سەرێکم لە ماڵەکەی سەردەمی منداڵیمدا زۆرم پێناخۆش بوو کە دیتم دارسێوەکانیان بڕیون.

٣٧٤/ 1573- بڕین(ی قسەی کەسێك): هەرکە ماری زاری لێك کردەوە بۆ ئەوەی حرکەی لەپێشدا ئامادەکراوەکە ڕابگەیەنێ، ڕابێرت لەبڕ قسەکەی لێبڕی.

٣٧٥/ 1148- برینداربوون، داڕووشان(بەهەڵکەوت): چۆن بوو ڕوومەتت داڕووشا؟

٣٧٦/ 1606- برینداربوون، داڕووشان: هەموو سەرنشینەکانی دوو ماشێنەکە لە تسادەفەکەدا بە توندی بریندار بوون.

٣٧٧/ 4237- بریندار کردن بە چەشنێك کە بۆ هەمیشە جێگاکەی دیاربێ: ئەگەر جارێکی دیکە لەلای خوشکم بتبینم، برینێکی وەهات تێدەکەم کە هەمیشە جێگاکەی بێنێ.
←هەڵبڕین.

٣٧٨/ 3089- بڕین‌و خستن: کرێکاران خەریکی بڕینی پەرژینە دارینە قەدیمیەکە بوون بۆ ئەوە ڕێگا بۆ چقاندنی پەرژینێکی مۆدێرن بکەنەوە.

٣٧٩/ 6857- بڕین‌و دەرهێنان، لێکردنەوە: دیوارەکانیان بەو ڕەسمانە ڕازاندبووە کە لە گۆڤاری ڕەنگین دەریان هێنابوون.
←دەرهێنان.

٣٨٠/ 4062- بڕینەوە، پەڕاندن، هەڵپەرتاوتن(بە شتێکی تیژ): لقە داری هەڵپەرتاو لە سەرانسەری زەویەکە بڵاو ببووە.
* باسکیان لە ئانیشکی ڕا بڕیوەتەوە.

٣٨١/ 3821- بڕینەوە، دەست هەڵگرتن، تەواو کردن: بیمەکەرەکان حازر نەبوون زیانی لەدەست چوونی داهاتی بۆ قەرەبوو کەنەوە. بۆیە ناچار بوو دەست هەڵگرێ. * بە پەرۆشەوە پێم گوت: وانیە، ئەمن بە ڕاستی خۆشم دەویستی، بەڵام با لێرە تەواوی کەین.
←کۆتایی هێنان بە.

٣٨٢/ 6692- بڕینەوە: لارشە (خۆرکە)کەی زۆری داگرتبوو، دەبوو لاقی لەسەرەوەی چۆکی ڕا ببڕنەوە.

٣٨٣/ 5614- بڕینەوە بە مشار: ئەگەر چارەگێك لە پایەکانی ئەم مێزە مشار کەی/ بە مشار ببڕیەوە، دەتوانی تەلەفزیۆنەکەی لەسەر انێی.

٣٨٤/ 5613- **برینەوە بە مشاری میکانیکی (= لێنت)**: دارەکان سپی دەکەنو دوایە بە مشاری کارەبایی/ بە لێنت لەتلەتیان دەکەن.
←برینی قسەی ... هاتنە نێو قسەی...

٣٨٥/ 4326- **بزمار کوت کردن**: دەرگای ماڵی چۆڵ تەختە بەندو بزمار کوت دەکەن بۆ ئەوەی منداڵان نەچنە ژوور.
←داکوتانەوە (بە بزمار).

٣٨٦/ 4321- **بزمار لێدان، بە بزمار قایم کردن**: ئەگەر قونیچکی فەرشەکە هەڵدەگەڕێتەوە بە بزماری لە عەرزی دایکوتە.

٣٨٧/ 4327 - **بزمار لێدانو هەڵواسین**: تابلۆیەکی لەسەر دەرگاکە بە بزماری هەڵواسیبوو کە لێی نووسرابوو: 'هاتنە ژوور قەدەغەیە'.

٣٨٨/ 6593- **بزمار یان پونیس لێدان**: واباشترە لێوارەکانی ئەم فەرشە بە بزماری لە ئەرزی داکوتی: خەڵك هەروا تێی هەڵدەنگوون.

٣٨٩/ 3373- **بزواندن، تێنا پێك هێنان**: ڕێبەری تاقمەکە ئەم توانایی یەی هەبوو کە لە دوو دلـترین ئەندامەکانی دا هەستی تونلوتیژ ببزوێنێ.

٣٩٠/ 6052- **بزە پێهاتن (بە مەسخەرەوە)**: پیاو لەوە زۆر نارەحەت دەبێ کە هەمیشە پێی پێبکەنن/ بزەیان پێی بێتێ.
←بژاردن بەرەو خوار/ بەرەو خوار بژاردن.

٣٩١/ 1464- **بژاردن (ی داوەر لە ملاملانەی مشتەکۆلەدا کاتێك کە یەکێك لە پالەوانەکان دەکەوێ)**: بەستەزمانە لە یەکەم خولدا (دە ژمارمیان بۆ بژارد) و ناك ئووت بوو.

٣٩٢/ 1460- **بژاردن هەتا ...**: زۆربەی منداڵانی پێنج ساڵان لە بژاردن هەتا سەد مورشکیلەیەکیان نیە.

٣٩٣/ 1466- **بژاردنی ئەندامانی حازر لە مەجلیس (و بە هۆی کەبوونی ژمارەی حازرەکان) کۆبوونەوەکە وەدواخستن**: لەو رۆژەوە کە لە کاتی وتووێژ لەسەر بابەتێکی گرنگ لە یاسادانان کۆبوونەوەی مەجلیس وەدواخرا ساڵەها تێدەپەڕێ.
بژاردن یەك بە یەك ← یەك بە یەك بژاردن.
بژیوی خۆ (بە هەرجۆرێك بێ) پەیدا کردن.
← لەسەر پێی خۆ ڕاوەستان.
← چوونە چۆمی یان دەریا.

٣٩٤/ 5836- **بڵاوبوونەوە، لێك دوورکەوتنەوە**: ئەو شێوەی کە بەتالیونەکەتان بڵاوبووە جوانترین شێوەی ڕاهێنان بوو کە ئەمن بە عومری خۆم دیومە.

٣٩٥/ 5111- **(لە ناوەندێکدا) بڵاوبوونەوە**: زۆربەی زۆری جادەکانی بریتانیا لە لەندەن ڕا بەرەو ناوچەکان بڵاو دەبنەوە.

٣٩٦/ 4340- **بڵاوبوونەوە، ڕاگەیاندران**: هەواڵی وەلانرانی/ لەسەر کار لابردنی لە دایرەکەدا بڵاوببووە.
←ڕاگەیاندران، دەرکەوتن.

٣٩٧/ 2190- **بڵاوبوونەوە، (لە دایرەیەك دا) لێك دوور کەوتنەوە**: پۆلیسەکان دەگەڵ سەگە شوێنهەڵگرەکانیان لە دەشتەکەدا بڵاوببوونەوە.

٣٩٨/ 199- **بڵاوبوونەوە، لێرەو لەوێو لە هەموو جێگایەك هەبوون**: خۆتان زۆر باش داپۆشن: ئانفلوانزا بڵاو بۆتەوە* زۆر لە سەرەخۆ لێبخوڕە: لە زۆر جێگایان لەسەر جادەی سەهۆڵ هەیە.

٣٩٩/ 2944- **بڵاوبوونەوە، گەڕان بە دووی ... دا**

٤٠٠/ 7385- **بڵاوبوونەوە (بە سرتەو خوورت)**: ماوەیەکی ئەوتۆ ناکێشێ کە ڕووداوی لەو چەشنە بە سرتەو خوورت لەم دەورو بەرە بڵاو بێتەوە.

٤٠١/ 6165- **بڵاوبوونەوە (بۆ)**: بۆ پێشگری کردن لە بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشی یە بۆ وڵاتانی دیکە دەتوانین چ بکەین؟

٤٠٢/ 6163- **بڵاوبوونەوە، بە پەرشو بڵاوی ڕۆیشتن**: لە حاڵێك دا ماشێنەکە لە نێوەراستێ دەڕۆیشت، جووتیارەکان بە سواری ئەسپی و بە پەرشو بڵاوی دەهاتن.

٤٠٣/ 5018- **بڵاوبوونەوە (لە ڕادیۆ/ تەلەفزیۆن)**: هەمرویان لە دەوری ڕادیۆکە کۆببوونەوەو گوێیان دابووە هەواڵی هێرشەکە کە لە بی‌بی‌سی بڵاو دەبۆوە. ← ڕاگەیەندران، ئاشکرابوون.

٤٠٤/ 2738- **بڵاوبوونەوە، کەوتنە سەر زارو زمانان، لەسەر زاران بوون**: دەنگۆیەك بڵاو بۆتەوە کە گۆیا خدر فاتێ دەخوازێ. ← ئاشکرا بوون.

٤٠٥/ 1252- **بڵاوبوونەوە، هاتنەدەر**: گوڵی پرسیاری کرد و گوتی: داخوا ناوێکت بۆ کتێبەکەت هەڵبژاردووە؟ کەنگێ بڵاو دەبێتەوە؟
← بۆ فرۆش داندران.

٤٠٦/ 410- **بڵاو بوونەوە (ی دەنگۆ)**: ئەرێ لە پێوەندی دەگەڵ فەردینو ئەو کچەی هەژدەی تایپ هیچت نەبیستووە؟ لەسەرانسەری ئیدارە دا بڵاو بۆتەوە.

٤٠٧ 2410- بڵاوبوونەوە، بە گوێی خەڵك گەیشتن: وابــڵاو بـبـووە كــە نــاوەندی بریتانیــا، ماموستــایەكی زورتــر بــۆ قوتابخانەكانی دادەمەزرێنێ * نازانم ئـەم دەنگۆیـە چـۆن بڵاو بۆتەوە.
← دەركەوتن.
٤٠٨/ 2413- بڵاوبوونەوە: گەلە هــەواڵێك بـڵاو ببـۆوە كـە "صدراعظم" لەسەر هێندێك شتومەك باج/ مالیات كەم دەكاتەوە.
٤٠٩/ 4508- (لـە هێزی هـەواییدا) بڵاوبوونـەوەو، سـەربـەخۆ چالاكی كردن: هەركـە نارایشـی فرۆكـە بۆمبھاوێژەكـانی دوژمن بیندرا، فەرماندەری سكادران فەرمانی بڵاوبـوونەو سەربەخۆ چالاكی كردنی دا.
٤١٠/ 5574- بڵاوبوونەوە لـە نێـو، داگرتـن: پرتـەو بۆڵەیـەكی توندوتیژ بە خێرایی خەڵكەكەی داگرت (لە نێو خەڵكەكـە دا بڵاو بووە).
← هەڵایسان.
٤١١/ 5016- بڵاوكردنەوە: ئیدارەی "تأمین اجتمـاعی" بـە مەبەسـتی روونكردنـەوەی رادەی یارمـەتیی مانگانـــەی بازنشـەستان/ تەقاعودان، نامیلكەیەكی بڵاو كردۆتەوە.
٤١٢/ 5017- بڵاوكردنـــەوە لـــە نێـــو، دان بـــە، دران بـــە: موشەخەساتی وردی كابرای هـەڵاتوو درابـوو بـە هـەموو گەشتیەكان.
٤١٣/ 4869- بڵاوكردنەوە (ی دەنگۆ)، خستنە سەر زاران، دەنگـۆ ساز كردن: یەكێك دەنگۆیەكی ساز كردووە/ وایـبڵاو كردۆتـەوە كە گۆیا دایرەی فێر كردن دادەخرێ.
٤١٤/ 3819- بـڵاو كردنـەوە، لـێرەو لـەوێ فرێـدان: ئەسـباب بازیەكانت لێرەو لەوێ فرێ مەدە. هەمیشە پێیانێدەنێم.
٤١٥/ 3595- بڵاوەلێكردنەوە، تەدركاندن، لە لای خۆ راگرتـن، لـەكن خۆ بوون، بەهیچ كەس نەگوتن: مــن و مــاری دەمانــەوێ بیینــە ژن و مێرد، بەڵام، تكایە هەتا بە دایك و باوكی دەڵێین هەر لەكنە خۆت بێ.
بڵاوكردنەوەی كا لە ژێر پێی حەیوانان ← كـا لـە ژێـر پێی... بڵاو كردنەوە.
بڵاو كردنەوە ← هێنانـە بـازار، دروسـت كـردن، ئاشـكرا كردن، دابەش كردن، تێرشتن، پەرەپێدان.
٤١٦/ 5622- بڵاو كردنەوە یان بوونەوە: دەزانم منداڵەكان لـێرە كایەیان كردووە. ئەسباب بازیەكانیان بە هەموو وڵاتی دا بڵاو بوونەتەوە.
٤١٧/ 631- بڵاوەپێكردن، تێكدان: مەترسیی ئەوە هەبوو كـە خۆپیشاندانەكە لە كۆنترۆڵ دەرچێ. بۆیە پۆلیسەكان ناچار بوون تێكی دەن/ بڵاوە بە خەڵك بكەن.
٤١٨/ 4293- بڵاوە پێكردن: كابرای پۆلیـس گوتـی: 'باشـە، ئیدی ئێستا لوتف بكەن و بڵاوەی لێبكەن.
٤١٩/ 630- بڵاوە لێكردن، هەركەسە بۆ لایەك چـوون، بـڵاوە كـردن، پەرش و بڵاو بوون، هەڵوەشان: هەر لە یەكەم كۆبوونـەوەدا، كـە زۆریش گرنگ بوو، دەمانزانی حزب لێك هەڵدەوەشێ.
← لێك دابڕان.
٤٢٠/ 778- بڵقەبڵق كردن، قوڵت دان، مێرووله كردن: گازی گـەرم بە بڵقە بڵق (لە ئاوەكە) دەهاتەدەر.
← بڵیند بوون وەدەر كەوتن.
٤٢١/ 6778- بڵیند كـردن، هـەڵێنان: ئـەندازیاری كارەبـا (موهەندیسی بەرق) ناچار بوو تەختەكانی دەوری دیـواری كە لە نزیك ئەرزی بوون بڵیندكا بۆ ئەوەی بتوانـێ سـیمی تازەی كارەبا وەسـڵ كا.
← بە لۆسەی (چكۆڵە) هەڵێنان، جەك لێدان.
٤٢٢/ 3508- بلیند لـەكردن، هێنانـە خـوار، بەرەڵاكـردن: كـاتێك دەمەویست برۆمەوە لای یەكانەكەم، ئـەوە قسـەی بـاوكم بوو: 'سەری خۆت بەردەوەو چاوت بكەوە.' * بڕیارە ئێوە دوو ئەفەر دەنگتان بێننە خوارێ؛ ناتوانم گوێم لـە دەنگـی فكرەكانم بێ!.
بنە نەهاتن ← بەش كردن.
بۆ بروا كردن نەبوون ← سەیرو سەمەرە.
٤٢٣/ 3306- بۆ بڵاو كردنـەوەی هاوكـاتی بەرنامەیـەك، رایەڵكـەی رادیۆو تەلەفزیۆنیان لـە سەرانسـەری وڵات وەگـەڕ خسـتن: بـۆ بـڵاو كردنـەوەی پـەیامی سـەرۆك كۆمـار تـەواوی رادیۆكـان/ تەلەفزیۆنەكان هاركات وەگەڕ خران.
بۆ بوون ← جێگا بوونەوە.
بۆ بەجێمان ← بە دەست گەیشتن.
بۆ جوانی لـێزیاد كردن ← رازاندنەوە.
٤٢٤/ 426- بۆ جێگایەكی گرینگ چوون، لـە شـارێكی گرینـگ بـوون: ئایـا بنەماڵەكـەت لـە ئیدیتـبرۆن؟ نـا، دوو- سـێ رۆژ لەمەوپێش گەڕانەوە. * كوڕەكەم بۆ ماوەی چەند سـاڵان دەچێتە كێمبریج.
٤٢٥/ 1329- بۆ چوون، بەرخورد كردن دەگـەڵ: زانـا لاوەكـە بـە فكرو بیرێكی تازەو ئامادەوە بۆ مەسەلەكە چوو.

بۆخچەی دڵی خۆ بۆ کەسێك کردنەوە ← دەردی دڵ کردن لە لای، دەرکاندن.

/٤٢٦ 6762- **بۆ خوێندنەوە، دووپات کردنەوە، مومارەسە کردن یان تەمرین کردن (لە شانۆگەریدا)**: دەمەوێ ئەو بەشەی دەگەڵ شیلا دووپات کەمەوە. یەك دوو جێگای دروست نیە.

بۆ دانەوە ← برژاندنەوە.

بۆ دروست کردن ← بۆ ساز کردن.

بۆ دەرکەوتن ← تێگەیشتن.

/٤٢٧ -

/٤٢٨ 6119- **بورس بازیی کردن، مامەڵەی قوماریی کردن، بە سەڵەم کرین**: بە کڕین و فرۆشتنەوەی سەهامی قەڵایی پووڵو پارەیەکی زۆری وەچنگ کەوتو هەمووشی لە سەڵەم کردنی کاکائۆدا لە دەست داوە.

/٤٢٩ 7099- **بۆ سازکرن، بۆ دروست کردن، دەستکرد، سازکراو**: ئەو کەسانەی گومانیان لەسەر بوو کە لە پیلانەکەدا بەشدار بوون، بە تاوانی دەستکرد گیران.

بۆ ساغ بوونەوە ← تێگەیشتن لە.

بۆ سەربازی بردن ← ناونووسین (بۆ سەربازی)،

بۆ سەری کەسێك لێدان ← بە دوای کەسێکەوە بوون.

بۆ سەرگەرمی هەڵبژاردن ← یاری کردن.

بۆ غزاندن ← قین لێبوون.

/٤٣٠ 366- **بۆ فرۆش دانران، بڵاوبوونەوە (ی کتێب)، هاتنەدەر، وەدەرکەوتن**: بۆ ژنی گەنج و بە زەوق، گۆڤارێکی تازە دەرکەوتووە/ بڵاو بۆتەوە.

/٤٣١ 873- **(غەزەبی خودا) بۆ کەسێك داوا کردن**: ئەوە کە دابنیشی و دوعا بکەی خودا غەزەب لە دوژمن بگری کافی نیە؛ زۆر کاری دیکە پێویستن: بۆ ئەوەی بتوانی شکستی بدەی.

بۆ کەوتن ← هەڵگرتن.

/٤٣٢ 2592- **بۆگوتران، گوتن**: قوتابیە چینییەکانی زمانی ئینگلیزی لە گوتنی هێندێك وشەی ئینگلیزیدا موشکیلەیان هەیە.

/٤٣٣ 327- **بۆگەنیو بوون، خراپ بوون**: ئەو ماسییەی دەمێکە بۆگەنیوە/ بۆگەنیو بووە.

/٤٣٤ 6386- **بۆگەنیو دنیای هەڵگرتووە، هیچ ولاتی نەهێشتووە**: بێگومان پشیلەکان لە دیوە چکۆڵەکەی خەوتن پیسایییان کردووە؛ بۆگەنیو هەموو ولاتی پڕ کردووە.

/٤٣٥ 4431- **(شاگرد رانەمێنە بە موسافیرەکان) بۆ لای پێشەوە رۆیشتن، چوونە خوار**: جا، تکایە یەکراست بەرەو پێشەوە برۆن/ بچنە پێش.

/٤٣٦ 3217- **بۆ لای خۆ راکێشان، دڵی کەسێك بردن، شیفتەی خۆ کردن**: تەنانەت ئەو کاتیش کە تازە لاوێك زیاتر نەبوو، دڵی ئەو ژنەی بردبوو؛ هەموو ژنێکی گەڕاوەوەی شیفتەی خۆی دەکرد.

بۆ لوور بوون ← خۆ پێدادان.

/٤٣٧ 4319- **بۆڵە بۆڵ کردن لەسەر**: بێ پسانەوە بۆڵە بۆڵی لەسەر دەکا بۆ ئەوەی چیمەنەکە ببڕێتەوە.

/٤٣٨ 3076- **بۆڵە بۆڵ کردن لەسەر کەسێك سەبارەت بە شتێك**: بۆڵە بۆڵ کردنت لەسەر من سەبارەت بە عەمەل کرانت لە نەخۆشخانە بێفایدەیە. نامەیەك بۆ کۆڕی بەڕێوەبەری بنووسە.

/٤٣٩ 6046- **بۆڵە بۆڵ (لەسەر) کردن، پرتە و بۆڵە کردن**: عادەتم نەکردووە بۆڵە بۆڵم لەسەر بکەن؛ هەواکەی بگۆڕە.

/٤٤٠ 4538- **بۆڵە بۆڵ لەسەر کردن، رەخنە لێگرتن**: دەست لەو منداڵەی هەڵگرە: هەمیشە بۆڵە بۆڵی لەسەر دەکەی.

/٤٤١ 560- **بۆمب داناندنەوە، بۆمب گوزاری کردن، مین داناندنەوە لە ...دا**: کاتێك کە ئەفسەراتەکان خەریك بوون لەسەر عەمەلییاتەکە روون دەکرانەوە، فڕۆکەکانیان لێ بۆمب گوزاری کردن.

بۆ ناردنەوە ← دانەوە.

/٤٤٢ 4342- **بۆن کردن و دیتنەوە، (دوای لێگەڕانێکی زۆر) دیتنەوە، دۆزینەوە**: سەگەکە بە بۆن کردن لە ژێر کۆمایەك رۆژنامە مشکێکی دیتەوە.

← (پێ) زانین.

/٤٤٣ 5982- **بۆ نوستن، لەسەر... نوستن**: گەڕامەوە شوقەکەی/ ئاپارتمانەکەی خۆم لە شەقامی... دانیشتم و نامەیەکم بۆ ژانێت نووسی و بۆی نوستم. سبەینێ نامەکەم دڕاند و یەکێکی دیکەم نووسی، دیسانیش بۆی نووستمەوە و دووسبەی ئەویشم دڕاند و جا ئەوجار بۆ سێیەم جار نووسیمەوە.

/٤٤٤ 251- **بۆ نەبوون، قابیلی... نەبوون**: لایەکی ماشێنەکە بۆ چاك کردنەوە نەدەبوو؛ گلگیرێکی پشتەوەشی پچکرابوو.

/٤٤٥ 1799- **بۆ نیشتن، پاروو نە رۆلی کەوتن، قوڕ پێوەدان، بەسەردا رژان**: ئێستا وەختی ئەوەیە کە حیسابدارەکان قوڕی پێوە دەن.

٤٤٦/ 359- **بۆنیشتن، بۆ هاتن:** زۆر چاکی بۆ نیشتووه کارێك بە یارمەتیی مانگانەیەکی زۆرو بێپایەخو ماڵێکی بێکرێ!

← شانس هێنان.

٤٤٧/ 6835- **بۆنی شتێك لێهاتن/ دان:** ئەم بەستەنییە بۆنی سابوونی دەدا (لێدێ).

٤٤٨/ 6017- **بۆنی شتێك لێهاتن:** هەرگیز نەدەچوومە پێشبرکێی ئەسپ سواران، چونکە هەمیشە بوونی دەوڵەمەندانی ئەوەزەلی لێوە دەهات. * بە بڕوای من، پێشنیارەکەی بۆنی فێڵبازیی لێدێ.

٤٤٩/ 6024- **بۆنی شتێك لێهاتن:** تاس‌کەبابەکە بۆنی پیوازو گیای بۆن خۆشی لێدەهات.

٤٥٠/ 6025- **بۆنی شتێك لێهاتن:** ئەگەر لەجیاتی تۆ بام، بێ سێو دوو لێکردن پێشنیارەکەم ڕەت دەکردەوە، چونکە یەکجار زۆر بۆنی شلەو گومانی لێدێ.

٤٥١/ 6027- **بۆنێکی زۆر پیس لێهاتن، بۆنی نادروستی یا بێئەمەکی لێهاتن:** ئاخرین جار کە قەفەزی تووتییەکەت خاوێن کردەوە، کەنگێ بوو؟

بۆ درنێکی پیسی لێدێ.

← لێدەرکەوتن.

٤٥٢/ 5013- **بۆنێو (دەریا) وەرێکەوتن، چوونە نێو...:** دەگەڵ ناوهەستانی بەرەبەیانی بۆ نێو دەریا وەرێکەوتین.

٤٥٣/ 5400- **بووکی ئیشفاڵ لێهاتن، ئیشفاڵبوون، خەت ئیشفاڵ بوون/ گیران:** ئەلۆ، کاکە، ئەو ژمارەیەی دەتەوێ ئیشفالە، (هەڵوێستەیەك)و بەداخەوە وەڵام ناداتەوە/ نادەنەوە..دەکرێ دوایە تەلەفوون بکەیەوە؟.

٤٥٤/ 1281- **بوون، هەست پێکردن:** هەر بیرم لەمەو لەو دەکردەوە هەتا وام لێهات کە هەستم کرد هۆشم لە خۆم براوە.

(منداڵ) بوون ← هێنانەسەر دنیا.

بوون بە ناواڵ (هەواڵ)← دۆست بوون دەگەڵ.

٤٥٥/ 3063-**بوون بە (بە هۆی تێپەڕبوونی زەمان):** ئاخرین جار کە چاوم پێی‌کەوت دووساڵ لەمەوبەر بوو. لەو ماوەیەدا لە مێرمنداڵێکی کورتە باڵاوە ببوو بە پیاوێك بە ١٨٠ سانتی میتر قەدو باڵاو ٢٢٠ پوند وەزنەوە.

٤٥٦/ 1223- **بوون بە، هاتنەوە:** تا ئەو جێگایەی بۆت دەکرێ لە گێرە کردن دەگەڵ ئەوانەی لە خۆت گەورەترن خۆت بپارێزە. ئەمە حەوتوویەکە کە زۆر وێدەچێ تێیدا ئەفەری دووهەم بێیمەوە.

٤٥٧/ 2011- **بوون بە، سەر دەرهێنان لە، گەیشتن بە، لێدەرهاتن:** لەو دەنکە تۆیانە ڕۆن دەگرن کە دوایە دەبێتە ڕۆنی مارگارین. * ئەو سندووقە تەقەمەنییانە بە لەسەرەخۆیی هەڵگرن دەنا سەر لە دیاری مەرگ دەردێنین (= هەموومان دەکووژرێین).

٤٥٨/ 78- **بوون بە، خۆلە... دان:** قەرزەی نەتەوایەتیی بریتانیا خۆ لە میلیاردەها پوندە دەدا.

٤٥٩/ 5207- **بوون بە، قبووڵ بوون وەك (ئەندامی دامەزراوێکی ئایینی):** پۆلا زۆر درەنگ مەزهەبەکەی گۆڕی؛ تەواو پیر ببوو کە بە ئەندامەتیی کلیسای کاتۆلیك وەرگیرا.

٤٦٠/ 2010- **بوون بە، لێساخ بوونەوە:** کاتێك گشت هەوڵو تێکۆشانی لیبراڵەکان بۆ باشتر کردنی وەزعی خۆیان لە مەجلیس، تەنیا دوو کورسی لێساخ بووە، بە تەواوی ناهومێد بوون.

٤٦١/ 4448- **بوون بە بەشێك لە شتێك (بە هۆی گرینگ بوون یان بەدێنیو بوون):** قسەکانی ویلیام... کە بریتین لە:" خەتی سووروو باریك و لە پێوەندی دەگەڵ هەنگی ٩٣دا گرتوونی، بوونەتە بەشێك لە مێژوو".

٤٦٢/ 1077- **بوون بە تاووساو، ڕوون کردن، کردن بە تاووساو:** ئەمڕۆ سەر لەبەیانی هەوا زۆر ناخۆش بوو، بەڵام لە پێش سەعاتی ١٠ بەملاوە کردی بە تاووساو (خۆشی کرد).

٤٦٣/ 3739- **بوون بە دۆستی کەسێك، بوون بە ئەندامی...، بە وردی گوێڕاگرتن لە، گوێ دانە...:** کاتێك کە پیاوێك (لەلایەن ژنێکەوە) دەنگ دەدرێ/ وەلادەنرێ، بۆی هەیە دەگەڵ کچێك ببێتە دۆست کە زۆریش جوان نەبێ. * کاتێك فکرە ئاڵۆزەکانم لە مێشکی چوونەدەر، بە وردی گوێمدا قسەکانیان.

← ڕێك کەوتن دەگەڵ.

٤٦٤/ 4134- **بوون بە پەندی عالەمێ، خەڵك پێ چاوترسێن کردن:** لە یەکێك لە نامەکاندا هاتبوو: داخوا ئێستا باشترین کات نیە بۆ ئەوەی ئەو لاتەو چەقۆکێشانە وەها سزا بدرێن کە ببنە عیبرەتی خەڵك؟

٤٦٥/ 5862- **بوون بە کرێکاری کەشتیی:** هێندێك پیاوی خەڵکی بەندەرەکانی نیوئینگلاند بوون بە کرێکاری ئەو کەشتییانەی کە وەرێدەکەوتن.

٤٦٦/ 5927- **بوون بە زەلکاو یان زەلەق:** ئەو جێگایانەی کە لە سەردەمی ڕۆمییەکان/ ڕۆمانەکاندا بەندەر بوون، زۆر لەمەوپێش بوون بە باتلاقو ئێستا لە دەریا دوورن.

٤٦٧/ 5847- **بوون بە شەریك، بەشی ...بان:** لە قاوەخواردنەوەكەدا دەگەڵ براكە و خوشكەكەت شەریك بە. • ئایا دەكرێ دەگەڵ میوانێكی دیكە لە هۆدەیەكی خەوتن شەریك بین؟

٤٦٨/ 1145- **بوون بە كۆسپ لەسەر رێگای، مانیع بوون، پێش گرتن بە:** نایەڵم مەسەلەیەكی ئاوا چكۆڵە خەوەكەم لێتێكدا/ مانیعی خەوەكەم بێ.

← پێش گرتن بە.

٤٦٩/ 6228- **بوون بە كۆسپ لەسەر رێگای كەسێك، كۆسپی سەر رێگای كەسێك بوون، بوون بە دژووی مەموزینی لە ئێوان:** تەنیا دوو كەس لە نێوان ئەوو بەرپرسایەتییەك لە كۆڕی بەرێوەبەریدا ببوونە كۆسپ.

بوون بە بلقی سەر ئاو ← لە نێو چوون.

← بە بادان.

بوون بە ملكی ← كەوتنە دەستی.

بوون بە ملۆزم لە كەسێك ← مزاجیی كەسێك بوون.

بوون بە... ← دەرهاتن بە شكلی شتێك، گەیشتنە، هاتنەوە، كێشان بۆ لای، (بە پێی وەسیەت) دران بە.

٤٧٠/ 1173- **بوون بە مۆد، بوون بە باو:** دەزانی كلاوگیس كەنگێ لەم وڵاتە بوو بە مۆد؟

بوون بە هاوڕێیان دەگەڵ ← هەڵوێستی یەكسان گرتن دەگەڵ.

٤٧١/ 696- **بوون بە هۆی:** بە هۆی گۆرانیەكە دڵی وەهای لێدا كە حاڵی تێك چوو.

٤٧٢/ 2657- **بوون بە هۆی ...، سازكردن، وەرئێخستن؛ شەوێ،** وەزعی ئەم خانمە پیرە زۆر خراپ بوو ئەمڕۆ وەزعەكەی بۆتە هۆی نیگەرانیمان.

٤٧٣/ 5803- **بوون بە هۆی، دروست بوون، پێك هاتن:** سیغاركێشان دەبێتە هۆی تەحریك بوونی كاناڵەكانی نەفەس كێشانو گەروو.

٤٧٤/ 717- **بوون بە هۆی چاك بوونەوە یان زیندوو مانی، نەجاتدان:** زۆر پیس بریندار ببوو، تەنیا دەرمان كردنێكی وردو باش دەیتوانی نەجاتی بدا.

٤٧٥/ 2682- **بوون بە هۆی...:** سیاسەتی ئابووریی دەوڵەت بوو بە هۆی چوونەسەری رادەی بێكاری. ← وەرێخستن.

٤٧٦/ 5354- **بوون بە هۆی...:** وتووێژەكان بوونەتە هۆی كەم بوونەوەی لێك بە گومان بوونەكان/ لێك بە گومان بوونی دوو لایەنەكە.

← بەدواوە بوون.

٤٧٧/ 3469- **بوون بە یەك، یەكگرتنەوە، چوونە باڵ یەك:** هێزی كۆماندۆو سەربازەكانی هەوابورد لە نزیك پردی داگیركراو یەكیان گرتەوە.

← یەككرتن.

٤٧٨/ 3943- **بوون بە یەك، یەكگرتنەوە، چوونە باڵ یەك، پەیوەندیی ئامەزرانلن لە ئێوانیدا، وەسڵ كردنەوە بە ...:** تاقمی تایبەتیی ئەرتەش دەگەڵ هێزی دراگون دەبن بە یەك. • ئەو دوو واحیدە یەك دەگرن. • هەتائەو جێگایەی بگوێن دەبێ لە نێوان ئەو دوو دورگەیەدا پێوەندی دابمەزرێ. • تەرتیباتی پێویست بۆ وەسڵ كردنی ئەو جاددە تازەلێدراوە دەگەڵ جادەی لاوەكیی لانكاستێر زۆرباش چۆتە پێش.

٤٧٩/ 2923- **بوون دەگەڵ، بوون لە لای:** ئێمە هەموومان دڵمان دەگەڵ قوربانییەكانی بوومەلەرزەی یوگوسلاوییە.

٤٨٠/ 2148- **بوون لە، كەوتنە ...:** ئەمساڵ، جێژنی لە دایك بوونی دەكەوێتە رۆژی یەك شەممۆ. • كریسمەس دەكەوێتە چ رۆژێكی؟

٤٨١/ 6117- **بوونە پسپۆر لە شتێك دا، شارەزایی پەیدا كردن یان وەدەست هێنان:** لە دووهەمین ساڵی دەورەی باكالوریدا، دەبێ یەكێك لەم چوار رستانە هەڵبژێرن بۆ ئەوەی لێی پسپۆڕبن/ شارەزایی تێدا وەدەست بێنن.

٤٨٢/ 1459- **بوونەوە بە:** كاتێك حیسابی دراو دێتە گۆڕێ، هەموو رادەو بەڵێنییەكانی دۆستەكانی دەبێتەوە هیچ.

٤٨٣/ 5373- **بوونەوە بە:** ئەو زەوییانەی كشتوكاڵ ناتوانن بەرهەمێكی ئەوتۆیان هەبێ، لێیان دەگەرێن ببنەوە بە بەیار.

٤٨٤/ 1199- **بوونە مۆد، رەواج پەیدا كردن، داكەوتن:** لە دەیەكانی ١٩٢٠، لە وەختێكی ئەوتۆ دابوو كە كورت كردنەوەی مووی سەرو داوێنی كورت ببوون بە مۆد.

٤٨٥/ 5024- **بوونە هۆی هاتنە پێشی هەڵەیەك، هەڵە كردن:** وردبینی نەكردن لە ئەندازە گرتنی لوولەكان/ بەلووعەكان، دەبێ لە حیساب كردنەكانی ئەو دا نزیكە مایلێك هەڵەی هێنابێتە پێش.

← شوێنەواری خراپ دانان لەسەر.

٤٨٦/ 659- **بوونە هۆی لەسەر حوكم وەلاچوونی دەوڵەت:** جیابوونەوەی ژمارەیەكی زۆر لە نوێنەرانی مەجلیس بوو بە هۆی لەسەركار/ لەسەر دەسەڵات وەلاچوونی دەوڵەت.

بوونەوە بە هیچ ← مەسرەف بوون.
بۆ هاتن ← بۆ نیشتن، هاتن.
بۆ هاتنە پێش ← روودان بۆ.
بۆ هەبوون ← تێدا هەبوون.

٤٨٧/ 5287- **(بە گاڵتە) بۆ هەڵگرتن، لە کۆڵ کردنەوە بە واتای لێدزین)**: دزێکی تەردەست کیفی پووڵەکەی بۆ هەڵگرت/ لەکۆڵ کردەوە.

٤٨٨/ 1294- **بۆ پارەمتەپدانی یان لە جاتی کەسێک چوون**: مەئموورانی ئاگر کووژاندنەوە بۆ نەجاتدانی کابرایەک هاتن کە لە قاتی سەرەوەی ساختومانێک گیری کردبوو کە ئاوری گرتبوو.
بۆی دەرچوون ← هەڵاتن، فیزمالکەدان، (لە سزادان) ئازاد کران.

٤٨٩/ 6009- **بۆی دەرچوون، هەڵاتن بە دزی، فیزمالکەدان**: پێت وانەبێ چونکە پشتم تێتە، دەتوانی فیزمالکی دەیەی/ بۆی دەرچی/ بە دزی هەڵێی.

٤٩٠/ 5966- **بۆی دەرچوون، فیزمالکێکدان**: ئەرخەیان بە ئەو پیاوانە فیزمالکی دەدەنێ و بۆ خاوێن کردنەوەی ماڵەکە بە تەنیا بەجێمان دێڵن.

٤٩١/ 5725- **(نامەو شتی لەم بابەتە) بە ئادرێسی یان عینوانی تازەی کەسێک ناردن**: دەکرێ لوتف بکەن و نامەکانم بە ئادرێسی تازەم بۆ بنێرن؟

٤٩٢/ 732- **بە ئاکام گەیاندن**: ساڵها کاری لەسەرەخۆ، سەرەنجام هەموو نەخشەکانی بە ئاکام گەیاند.
← جێبەجێ کردن.
بە ناکامی چاوەروان کراو گەیشتن ← لە هەدەفدان.
بە ناکامێک گەیشتن ← واتێگەیشتن.
بە ئاگاداریی خەڵک گەیاندن ← ئاشکرا کردن.

٤٩٣/ 724- **بە ئاگاداری ... گەیاندن**: پێیان راگەیاندووم کە هێندێک لە کورە گەورەکان دەچنە شوێنە گشتییەکان.

٤٩٤/ 5866- **(زاراوەیەک لە ئەرتەشدا)، بە ئاگری تۆپخانە پشتیوانی لێکردن**: لەو شەڕەدا، لە تانکەکانیان وەک تۆپخانەیەکی گەڕۆک بۆ پشتیوانی کردن لە هێزی پیادە کەڵک وەرگرت.

٤٩٥/ 4312- **( بێ نەخشە و بەرنامە ) بە ئامانجی خۆ گەیشتن، لە خۆڕا سەرکەوتن**: پەنجا ساڵ لەمەوپێش حزبی کرێکار تیئۆرییەکی بۆ خۆی هەبوو، بەڵام ئێستا ئەو تیئۆرییە کەڵکێکی بۆیان نەماوە. بۆیە ئێستا هیوادارن بەڵکوو هەروا لەخۆڕا سەرکەون.

٤٩٦/ 3322- **بە ئاوات خواستن، ئارەزوو کردن بۆ**: ئەو ئامانەی کە زۆری بە ئاوات دەخواستن هەروا کەم دەبوونەوەو کەم دەبوونەوە هەتا بە یەکجاری بڕان.

٤٩٧/ 4001- **بە ئاوات خواستن، ئارەزوو کردن**: پیاو ئارەزووی باشووری فەرانسە دەکا. * ئاڵوگۆڕێکی کە یەکجار زۆر ئاواتی خەڵک بوو زۆر بە کوندی ئەنجام دەدرێ. * ئەو ئارامیشەی ئاواتی بوو هەرگیز پێی نەگەیشت.
← ئارەزووی شتێک کردن. خوازیاربوون، چاوەروانی شتێک بوون.
← نەبوونی شتێک بە ئاوات خواستن.
←حەسرەتی شتێک خواردن.

٤٩٨/ 213- **بە ئەزموون بوون، لێزانین**: باربارا ئێستا کچێکی بە ئەزموونە، بەڵام رەنگە لەو تیپە کچانە نەبێ کە بکرێ بۆ دیتنی دایک و باوکت دەگەڵ خۆت بیبەیەوە ماڵێ.

٤٩٩/ 3393- **بە ئەسپایی چوونە پێش، نزیک بوونەوە لە**: پشیلەکە بە ئاسایی لە گەنجەی خواردەمەنی نزیک بۆوەو کوتە گۆشتێکی گەورەی خوارد. * کارمەندەکان چاویان لێبوو کە چۆن تایپیستە تازەکە خۆی لە سەرۆکی ئیدارە نزیک دەکاتەوەو هەموویان لەژێرەوە پێی پێدەکەنین.
بە ئەستۆوە بوون ← گیر کردن بە دەستی کارێکەوە.
بە ئەستۆی کەسێک دابڕین ← بەسەردا بڕین.

٥٠٠/ 5858- **بە ئەستۆی خەڵک داهێنان، بەسەر خەڵک داهێنان**: کاتێک نەخشەکانی نایگرن، هەمیشە لە کەسانێک دەگەڕێ کە شکستەکەی خۆی بەسەر ئەوان دابێنێ.

٥٠١/ 3850- **بە ئەمانەتدان، وێندن، بە قەرزدان**: بۆم گرینگ نیە ئەم رۆژنامانەت وێدەم (= بە ئەمانەت بتدەمێ)، بەڵام، بێگومان دەبێ بیانهێنیەوە. * ئەنجومەنەکانی خانووسازی پاشەکەوتەکانی (پارەی خەڵک) بە نرخی بەهرەیەکی دیاریکراو بە قەرز وەردەگرن، سەرمایەیەکی کە بەم شێوەیە کۆ دەبێتەوە بە نرخێکی بەهرەی زیاتر دەیدەن بەو کەسانەی دەیانهەوێ خانوو بکڕن.

٥٠٢/ 2044- **بە ئەمانەت (لای کەسێک دانان)**: پێت دەڵێم هیچ شتێکی بە قیمەت لە لای میرزا خدری بە ئەمانەت دامەنێ.

٥٠٣/ 5036- **بە ئەنجام گەیاندن، بە ئاکام گەیاندن، بەڕێوە بردن**: لە حاڵی حازردا/ وێستا خەریکین هەوڵ دەدەین بەرنامەی خوێندنی گشتی بەڕێوەبەرین.

٥٠٤/ 7466- **بە ئەندازەی ... بوون**: پارەمەتیی خالیسی حەوتروانە/ ئەو پارەمەتییەی کە حەوتروانە بە دەستی دەگا، (بە ئەندازەی) ٢٦ پاوندە.

٥٠٥/ 1353- بە ئەندازەی پێویست ... بوون، بەجێهێنان: بۆ تاقیکاریی ئاخری ساڵ، بە ئەندازەی پێویست ئامادە نەبوون.

بە ئیجارەدان ← بەکرێگرتن، بەکرێدان.

٥٠٦/ 4290- بە ئیشارەی دەست وەلابردن/ کشاندنەوە: کابرای کارمەند بە ئیشارەی دەستی ئێمەی کشاندەوە.

٥٠٧/ 4354- بە ئیشتیاوە چاولێکردن: ئەو بە ئیشتیاوە چاو لە هەموو کچە سکرتێرەکانی ئیدارە دەکا.

٥٠٨/ 3684- بە بادان، لەناوبردن، بوون/ کردن بە بلقی سەر ئاو: چوونە سەری نرخی ماشێن هەموو ئارەزووەکانی ئێمەی بۆ کڕینی ماشێنێکی تازە لەم ساڵەدا بە بادا.

٥٠٩/ 4352- (زاراوەی ئایینی)، بە بارگای خودا پێشکەش کردن، نەزری خودا کردن: کەشیش/ قەشە مریشکێکی سەر براوی نەزری خودا کرد.

٥١٠/ 5689- بە باشترین شێوە لە ئەنجامدان و بە ئاکامێکی باش گەیاندن: هەموو ئەندامانی تیمەکە ئەم کارە بە باشترین شێوە ئەنجام دەدەن و بە سەرەنجامێکی باشی دەگەیەنن.

٥١١/ 4132- بە باشترین شێوە کەڵک وەرگرتن لە ...: لەو بارمەتیانەی لە ئەمریکا ڕا هاتبوون بە باشترین شێوە کەڵک وەرگیرا.

٥١٢/ 6074- بە بانگەو سەڵا گریان: کاتێک بیستی مێردەکەی بەجێی دێڵێ، بە بانگەو سەڵا دەستی بە گریانێ کرد.

٥١٣/ 4324- بە بزمار شتێک لە شتێکی دیکە دان: تەختەکانی تەنیشتی چوارچێوەکە بە بزماری لە دیواری مەدەن؛ پێچیان لێدە.

٥١٤/ 220- بە بنبەست گەیشتن: لە قۆناخێک دا لێکۆڵینەوە گەیشتە بنبەست و، ئەویش نەیدەزانی چۆن بچێتە پێش.

٥١٥/ 1301- بە بنبەست گەیشتن: سەرمان سووڕمابوو؛ واوێدەچوو کە بە بنبەست گەیشتبین.

٥١٦/ 728- بە بنبەست گەیاندن: خۆ پاراستنی خەڵکی ناوچەکە لە قسە کردن، لێکۆڵینەوەکەی بە بنبەست گەیاند.

٥١٧/ 6026- بە بۆن (کردن) دیتنەوە: دەگەڵ سەگە شوێنهەڵگرەکە وەپێش کەوت؛ ئەو بە بۆن (کردن) زۆر زوو کابرای دەدۆزێتەوە.

٥١٨/ 3839- بە بەخت و شانس ئەسپاردن: نیلسون لەبەرامبەر هەر چەشنە ڕووداوێکدا خۆی ئامادە دەکرد، بەڵام بەشێکیشی بە بەخت و شانس دەسپارد.

٥١٩/ 4233- بە بەردەمی ئەفسەرێکی گەورەدا ڕێژە ڕۆیشتن: گوردان/ فەوجەکە لە بەردەمی ئەفسەری فەرماندە ڕێژە ڕۆیشت.

٥٢٠/ 793- بە بەری خانووێکەوە زیاد کردن، لە تەنیشت خانووبەرەیەکدا خۆدی زیادی دروست کردن: چەند هۆدەیەکی دیکەیان بە بەرخانووبەرە ئەسڵییەکەوە ساز کرد.

بە بۆشی ڕۆیشتن ← بە ڕاحەتی ڕۆیشتن.

٥٢١/ 559- بە بۆمب خراپ کردن، لە بۆمبارانێدا خراپ بوون: ئەو خەڵکەی لە بۆمبارانێدا ماڵەکانیان خراپ ببوو لە پەناگا گشتییەکاندا کۆ ببوونەوە.

٥٢٢/ 1866- بە پارێزەوە بۆ شتێک چوون، چوونەوە دە قاپێلکی خۆ: بە چوونە سەری سوودی بانک، شەریکە خانووسازییەکان چوونەوە دە قاپێلکی خۆیان.

٥٢٣/ 5917- بە پارێزەوە لە نزیک بوونەوە: کابرایەکی خرکەڵە بە پارێزەوە لێی نزیک بووەو کوتە کاغەزێکی دە دەستی نا.

٥٢٤/ 5961- بە پارێزەوە بۆ کاران چوون، خۆ لە کاران دان و لەدان: ئەو کابرایەکی پارێزکارەو لەبەر گیروگرفتان هەڵدێ و خۆ لە کاران دەدا و نادا و هەرگیز ناچێ دە قووڵایی کارەکانەوە.

٥٢٥/ 3585- بە پاکداوێنی ژیان بردنەسەر: کاتێک بیستم خێزانی جانسون بە هۆی ژنبازی/ وەدوای ژنان کەوتنەوە تەڵاقی لێوەرگرتووە سەرم سووڕما، چونکە هەمیشە پێموابوو ئەو کابرایە بە پاکداوێنی دەژی.

٥٢٦/ 5712- بە پۆست دا پاوبەرێکردن: ئەو بە پۆستیدا پوولی بەرێکرد بۆ بلاوکێکی ڕۆژانە بۆ ئەوەی ساڵنامەیەکی ڕاوچیان/ ماسیگرانی بۆ بنێرن.

٥٢٧/ 4833- بە پۆمپ بە تاڵ کردن، پۆمپاژ کردن بۆ دەرێ: دوو پێشنیار هەبوون: یەکیان ئەوە کە ئەوتەکە بۆ دەرێ پۆمپاژ کەن و، ئەوی دیش وەسەرناو خستنەوەی ئەرتکێشەکە.

٥٢٨/ 5649- بە پەردە (یان هەر شتێکی‌تر) جیا کردنەوە: دەچوو وە پشت مێزەکەی کە بە قەفەزەیەکی قورسی کتێبان لە باقی هۆدەکە جیا کرا بووە. * پەردەی لەسەر جێگاکەی دادەوەو خاترجەم بە کەس موزاحیمی نابێ.

٥٢٩/ 2217- بە پەرژین جیا کردنەوە: منداڵەکان ناتوانن لە حەوشەی پێش ماڵێ کایە بکەن، مەگەر حەوشەکە بە پەرژین لە شەقام جیا کەینەوە.

به پەرۆش ← غەمگین.
به پەرۆش بوون بۆ ← خەم خواردن بۆ.
به پەژارە بوون بۆ کەسێك ← خۆ نارەحەت کردن بۆ.

٥٣٠/ 7518- **به پەککەوتە زانین:** ئەو هێشتا هەر گەنجە و بۆیە هیچ دەلیلێك نیە کە خۆی بە پەککەوتە بزانێ.

به پەلە تێپەڕین بە... دا ← دەرپەڕین.
به پەلە خواردن ← قووت دان.

٥٣١/ 5650- **بە پێچ و مۆرە قایم کردن:** پاش ئەوە کە خەڵکەکە ئاخرین ڕێزیان لێگرت (لە کابرای مردوو)، بەرپرسی بە خاك ئەسپاردنی پێچ و مۆرەی سەر قەپاغی تابووتەکە قایم دەکا.

٥٣٢/ 5652- **بە پێچ و مۆرە وەسڵکردن، لێدان:** دارتاشەکە هات و پلێتێکی بریقەداری برۆنزی بە پێچ و مۆرە لێدا.

٥٣٣/ 2748- **بە پێچەوانەی شتێك بوون، نەخوێندنەوە لەگەڵ، نەهاتنەوە لەگەڵ:** ئەوەکە دەیەوێ فێڵ لە مەئموورەکانی مالیاتی داهات (زەریبەی داهات) بکا، دەگەڵ پرەنسیپەکانی ئەدەهاتەوە. هەستی بەرپرسایەتیی بەرامبەر بە کۆمەڵ لەوەدا زۆر بە هێزە.

٥٣٤/ 6249- **بە پێچەوانە نیشاندان:** لێرەدا، هەروەك زۆر لایەنی دیکە، تێلەپاتی و روونا کبینی بە رواڵەت مەبەستیان ئەوەیە کە ڕێگای ساکار، قبووڵ کراو و روونی سروشت بەپێچەوانە نیشان بدەن.

٥٣٥/ 2750- **بە پێچەوانەی ویستی دڵ بوون، بە دڵ نەبوون:** سەرەنجام منداڵەکان چوون و لیباسە تەڕەکانیان گۆڕی. ئەگەرچی ئەو کارەیان بە دڵ نەبوو.

بە پەی (= بە پێل) کەسێکەوە چوون ← (بە گوورەو تا رادەیەك بەشێوەیەکی ناحەز). بە پەی (بە پێل) کەسێکەوە چوون.

٥٣٦/ 5428- **بە پێشوازی شتێکەوە چوون:** خۆ دەمەترسیی هاویشتن یان وەدوای دەردەسەر کەوتن مەسەلەیەك بوو کە هەمیشە بە پێشوازییەوە دەچوو.

بە پێشوازی کارەساتێکەوە چوون ← پێشوازی لە کارەساتێك کردن.

٥٣٧/ 3743- **بە پێکەنین چارەسەر کردن:** ' دەزانم پیاوێکی نازای، بەڵام ددان ئێشە بە پێکەنین چارەی نایە/ ناکرێ. دەبێ بچی بۆ لای پزیشکێکی ددانان.'

٥٣٨/ 3749- **بە پێکەنین و گاڵتە پێکردن پەکێك وەدرۆ خستنەوە:** چیرۆکێکی درۆ و دوور لە راستی بوو _ خەڵکی گوندیش به پێکەنین و گاڵتە پێکردن بەرپەرچیان دایەوە/ وەدرۆیان خستنەوە.

بە پێلاقان (شکاندن و) کردنەوە ← شکاندن و کردنەوە.

٥٣٩/ 3627- **بە پێلاقە لە پلیکانان خستنە خوار، هێنانە خواری پەلە و پەیە:** کابرای توورە کەڵەگای ژنەکەی گرت و بە پێلاقان لە پلیکانان فڕێیدا خوارێ. *بەستەزمانە پیرەتە پیریان هێناوەتە خوار و کارێکی چکۆڵەی حیسابداریان پێ ئەسپاردووە.

٥٤٠/ 6924- **بە پێی ڕێسا هەڵس و کەوت یان رەفتار دەگەڵ کردن:** ئەگەر بێت و جارێکی‌تر بە بێ‌راوێژکاریی دەگەڵ خۆم زیاتر لە ٥٠ پوندان لەو حیسابە خەرج کەی، بە پێی ڕێسا رەفتارت دەگەڵ دەکەم.

٥٤١/ 7471- **بە پێی ڕێسا کار کردن یان هەڵس و کەوت کردن:** کۆڕی بەڕێوەبەریی نەتەوایەتیی یەکیەتی(ی کرێکاران) بە ئەندامانی خۆی دەستوور داوە بە پێی ڕێسا بجووڵێنەوە.

٥٤٢/ 4644- **بە تاڵ بوون، پووچەڵ بوون، هیچ پێنەمان:** ئەو ئیدی ئەو نووسەرە نیە کە جاران بوو. خەڵك وردە وردە دەڵێن بە تاڵ بووە (هیچی پێنەماوە).

٥٤٣/ 7166- **بەتاڵ کردن، خاڵی کردن، هەڵڕشتن (ی... بۆ بێتەوەی شتێکی دیکە):** بیتاقەکان/ بلیتەکان هەر دەبێ بە خۆت بن. جارێکی دیکە گیرفانەکانت هەڵڕێژە.

٥٤٤/ 5625- **بە تاڵ کردن، هەڵکەندن، دەرهێنان بە بێڵ و...:** کەمێك لە گڵەکەی بە پێمەرەی (ئێو قووڵ) دەرێنا لە حاڵێك دا هەوڵی دەدا هیچ شتێك لەژێر زەوییەکە نەشێوێنێ.

٥٤٥/ 5551- **بەتاڵ کردن، خاڵی کردن:** رۆنی کارتێلەکەت زۆر پیسە. بیدە لە تەعمیرگا/ گاراج بە تاڵی بکەن.

٥٤٦/ 2003- **بە تاڵکردن، هەڵڕشتن:** ساکەکە دڕا بوو و هەرچی تێیدا بوو لەسەر جاددەی هەڵڕژابوو.

← هەڵێنجان، خاڵی کردن، ڕۆکردن، کردنەوە.

٥٤٧/ 173- **بەتاڵ کردن (لە و لە... بە سەتڵان):** ئەو چەند کەسەی مابوونەوە ئاوی بەلەمی نەجاتیان (بەسەتڵان) بەتاڵ کرد (= خاڵی کرد، هەڵێنجا).

٥٤٨/ 2240- **بە تاوانبار ناسین، حوکم دان لە دژی کەسێك:** دادگا بە تاوانباری ناسیەو و دەبێ خەرجەکەی کە ١٠٠ پوندە بیدا.

بە تام بوون ← لە زار دا توانەوە.

٥٤٩/ 482- **بە تەپڵ ئاهەنگێك لێدان:** کورێکی چکۆلە بە قوتوویەکی تەنەکە ئاهەنگێکی لێدەدا.

٥٥٠/ 4536- **بە تەلیفوون گوتن، راگەیاندن:** لە بینەرانی سەرێز داوا دەکەین پرسیارەکانیان بە تەلیفوون بە... ڕابگەیەنن.

بە تەناف دا دان ← هەڵخستن.

٥٥١/ 3642- **بە تیرێك دوو نیشانە ئەنگاوتن:** کاتێك سەفەری داهاتوو هاتی بۆ ئێدینبۆرو، بۆ نایەی سەبارەت بە ڕۆلنگەی خۆت قسان بکەی؟ زۆر باشە، دەبێ حەوتووی داهاتوو ڕاوێژکاری یاسا ببینمو هەر بۆیەش دەمتوانی سەرێکت لێبدەم. زۆر چاکە بە تیرێك دوو نیشانان بنگێوە.

٥٥٢/ 1317- **بە جێگایەك نەگەیشتن، بە هیچ جێگایەك نەگەیشتن، هیچ لەنجام نەبوونەوە:** بۆ وەدەست هێنانی دراوێکی زۆر، ئەو دوو پیاوانە گەلاڵەی زۆر نازایانەیان هەبوو، بەڵام بە هیچ کوێ نەگەیشتن. ← سەرکەوتن، چوونە پێش.

٥٥٣/ 2615- **بەجێگەیاندن، فێربوون:** بابە، ئێستا خەڵك بەم شێوەیە هەڵنایەرن. بۆ ناچی کەمێك هەڵپەرکێی باش ببینی؟ هەوڵ بدە فێری بی.

← جێبەجێ کردن، ئەنجامدان.

٥٥٤/ 238- **بەجێمان (لە کارێك دا، لە چالاکییەك دا)، وەدواکەوتن:** لە زەمینەی بەرهەم هێنانی "مواد قابل انشقاق (اتمی)" تەنانەت لە نزیکترین رقیبەرەکانیان زۆر وەدواکەوتوون.

٥٥٥/ 1932- **بەجێمان، وەدواکەوتن:** دیتمان کە سێ دەزگا لە لۆرییە حیمایەکان بە هۆی لەکار کەوتن بەجێماون.

← وەپاش کەوتن، وەدواکەوتن.

بەجێمان ← پێبەپێی کەسێك چوونە پێش.

بەجێ نەهێشتن ← بەرنەدان.

٥٥٦/ 6968- **بەجێ هێشتن، دەست هەڵگرتن لە، ئیستیقالە (ئیستعفا) دان لە:** ژیلوان کارێکی ژیرانەی کرد کە لە شوغلەکەی خۆی لە ئیدارەی بازرەسیی مالیات (پشکێنەری زەریبە) دەستی هەڵگرت.

٥٥٧/ 3823- **بەجێهێشتن:** هێندێك لە فەرمانڕەوایان هیچ چەشنە یادگارێکی درێژخایەن لە پاش خۆیان بەجێناهێڵن. * گۆیا لە پاش خۆی شوێنەوارێکی دوورودرێژی لە وێرانی بەجێهێشتبوو.

٥٥٨/ 3822- **بەجێهێشتن، نەهێنان:** ڕۆژێکی خۆشە. دەتوانی بارانیەکەت نەهێنی. *لە کاتی پاشەکشەدا، ناچار بوون شترمەکە قورسەکان بەجێبێڵن.

٥٥٩/ 3831- **بەجێ هێشتن، دانان، دەست لێنەدان:** کلیلەکانت لی کوێ داناوە؟. لەسەر مێزی نووسین. دەست لە سفرەکە مەدە. دەمەوێ بۆ ناخواردن سفرە بچنم.

٥٦٠/ 2692- **بەجێهێشتن، دەست هەڵگرتن لە، دەست کێشانەوە لە:** بێ هیچ هۆکارێکی روون، کامران دەستی لە کارە پڕ لە قازانجەکەی هەڵگرت.

٥٦١/ 7288- **بەجێهێشتن، چوونەدەر لە، وەدەرکەوتن لە:** پاش ئەوە کە نوێنەرانی یەکیەتی کۆبوونەوەکەی دوێنێیان بەجێهێشت، وەزیری کار هەوڵ دەدا کۆبوونەوەیەکی تازە پێك بێنێ.

٥٦٢/ 1039- **بەجێهێشتن، دەست لێهەڵگرتن:** ئەمڕۆ، جان کارەکەی لە کارخانە بەجێهێشتو گوتی: تازە هەرگیز لێرە کار ناکەم.

← دەست هەڵگرتن لە.

٥٦٣/ 945- **بەجێهێشتن، پشت تێکردن، فڕێدان:** هەر کە لە ژنێك ماندوو بوو، وەك لیباسێك فڕێی دەدا/ پشتی تێدەکا.

← ڕۆیشتن لە لای کەسێك، پشت تێکردن. ڕۆیشتنو کەسێك بەجێهێشتن.

← دەست هەڵگرتن لە، سەرلەسەر هەڵگرتن، لە جێگایەك ڕۆیشتن.

٥٦٤/ 2673- **بەجێهێشتن بۆ، ئەسپاردن بە، دانە دەستی ...:** فەرماندە دڵڕەقەکان شارەکەیان دایە دەستی پیاوەکانیانو ئەوانیش بێبەروا دەستیان دایە تاڵانو برۆ.

← تەسلیم کردن.

٥٦٥/ 3833- **بەجێهێشتن لە دەرێ، دانان لە دەرێ:** ئەگەر دووچەرخەکەت لە دەرێ دانێی، زۆر زوو دەگەڵ گیروگرفتی ژەنگ هێنان بەرەوروو دەبی.

٥٦٦/ 1072- **بەجێ هێشتنی ماڵو بنەماڵە (بۆ هەمیشە):** لەو هەمووە وابکەو وامەکەیە جارز بووم؛ ئەوە ئەم ماڵە بەجێدێڵمو دەڕۆم. خوداحافیز!.

٥٦٧/ 3840- **بەجێهێشتنی کەسێك بۆ لە ئەنجامدانی کارێك، لێگەڕان:** ڕێنوێنیی پێویستیدا بە خزمەتکارەکانو بەجێیهێشتن بۆ ئەوەی لێیان گەڕێ بۆ خۆیان کارەکە بکەن.

← رزیشتن.

٥٦٨/ 5805- **(لە وەرزش دا) بەجێهێشتن یان وەدەست هێنان (ی ڕیکۆردێکی تازە)**: ستروارت لە یاریەکانی وڵاتانی قازانج هاوبەشدا لە غاردانی/ دەوی دەهەزار میتردا ڕیکۆردێکی تازەی بەدەست هێنا/ لەخۆی بەجێهێشت.

بەجێهێنان ← بە ئەندازەی پێویست... بوون.

٥٦٩/ 4752- **بە چاپکراوی دانەدەر (لە پێوەندی دەگەڵ کامپیوتێردا)**: لە کۆتایی کاری ڕۆژانەدا بەرنامەیەك دەدرێ بە کامپیوتێر هەتاکوو لێکدانەوەیەك لەو شتانەی داواکراون و بەرێکراون و هەروەها لەو شتومەکەی لە ئەنباردا ماوەتەوە بە چاپکراوی بداتەدەر.

٥٧٠/ 5486- **بە چاو دادانەوە، بەخۆدا شکاندنەوە**: دەزانم لە پێوەندی دەگەڵ ئامادە کردنی میوانیەکەت دا، بووم بە هۆی خەجاڵەتیتان، بەڵام داواتان لێدەکەم لە لای ڕەفیقەکانم بە چاوم دا مەدەنەوە.

٥٧١/ 6939- **بە چاودادانەوە**: ئەوەی کە هەرگیز حازر نایم بیکەم ئەوەیە کە ڕابردووی کەسێکی بە چاوی دادەمەوە، مەگەر کابرا پیاوێکی بێشەرمەو دووڕوو بێ.

٥٧٢/ 6934- **بەچاو دادانەوە، سەرکۆنە کردن**: بۆ دەبێ زیاد لە هەموو کەس ئەتۆ بە چاوم دابدەیەوە؟ ئاخر کاتێك ئەو بڕیارەدا، ئەتۆش دەگەڵم هاوبیر بووی.

٥٧٣/ 5679- **بە چاوێکی جیاوازەوە لە شتێك ڕوانین**: ئێستا هەموومان بە جۆرێك لەژێر فشاری رووحی داین، بەڵام سبەینێ بەیانی، ڕەنگە بە چاوێکی بە تەواوی جیاوازەوە بڕوانینە هەموو شتێك.

٥٧٤/ 2712- **بە چاوی سووکەوە چاولێکردن**: کاتێك کەڵانتەری شارەوانی بە یازدە ڕۆژ زیندان مەحکووم کرا، لاوەکان بە تەحقیرەوە چاویان لێدەکرد.

← بایخ پێنەدان.

٥٧٥/ 2365- **بە چاوی سووکەوە ڕەفتار کردن دەگەڵ کەسێك، کەرانە ڕەفتار کردن دەگەڵ کەسێك، خراپ بزووتنەوە دەگەڵ**: وا خراپ دەگەڵم مەبزووێنەوە. هاتوومە ئێرە بۆ ئەوەی باش پێمڕابگەن، نەك ئەوەی شتوومەکی خراپم بەسەردا بدەن.

٥٧٦/ 4015- **بە چاوی سووکەوە تەماشا کردن**: هەرگیز بە تەحقیرەوە چاو لە ژنی قەڵەو مەکەن.

٥٧٧/ 1171- **بە چاوی گریارەوە لێڕوانین**: سۆنیا بە چاوێکی وەها گریارانەوە تێیڕوانیم کە لە شەرمان وەك پتی‌خوێن سوور هەڵگەڕام.

٥٧٨/ 4102- **بە چاوی گریارانە، یان بە نیشتیاوە چاو لە ... کردن**: ماری، بەسە، چیدی بە نیشتیاوە چاو لە خزمەتکارەکە مەکە: نانەکەمان زووتر بۆ ناهێنێ.

٥٧٩/ 6981- **بە چرکە چرك یان بە چرتەچرت تێپەڕبوونی کات یان زیاد بوونی ژمارەی شتێك ڕاگەیاندن، یان نیشاندان**: کاتژمێری دیواریی بابە گەورە لە ساڵۆنەکە بە چرتەچرت تێپەڕبوونی زەمانی نیشان دەدا.

٥٨٠/ 3895- **بە چلپە، چلپ خواردنەوە، لێستنەوە**: ئەو شیرە ڕژاوەی بە پەرۆی خاوێن مەکەوە؛ پشیلەکە دەیلێسێتەوە.

٥٨١/ 2662- **بە چۆکدادان، تەسلیم بوون لەبەرامبەر ...دا**: یاخیەکان ناچار بوون لەبەرامبەر هێزی گەورەتری سەڵتەنەتخوازەکاندا تەسلیم بن.

← چۆکدادان.

٥٨٢/ 484- **بە چۆك داهێنان، بڕست لێبڕین**: گوشاری کاسبی لە تەمەنی میانساڵیدا بڕستی لێبڕیبوو.

← تەسلیم کردن.

٥٨٣/ - **بە چەتر (پەرەشووت) خۆ فڕێدان لە فڕۆکە**: کاتێك زانی بۆ نەجاتدانی فڕۆکەکە کارێکی بۆ ناکرێ، بە چەتر خۆی فڕێدا دەرێ.

٥٨٤/ 4477- **بە چەسپ لە جێگایەك دان (بڵاوکراوە لە بەرزایی ڕانان)**: لەسەرانسەری شار پۆستێری گابازیان لە دیواران دابوو.

٥٨٥/ 3094- **بە چەکوچان قایم کردن (بۆ ئەمیە بزماریشی لێبدری)**: سەرپۆشەکە، کە لەپێشدا چاك نەچوو بوە جێگای خۆی، بە چەکوچان بردیانە خوار.

٥٨٦/ 2609- **بە چە پێیەی یان ترووکەی شتێك گەیشتن**: هەر لە سەرەتای ژیانیەوە، پیاو دەیتوانی بزانێ کە ئەو کوڕە بە تروکی سەرکەوتن دەگا.

٥٨٧/ -

٥٨٨/ 3957- (زاراوەیەکی شۆخیە و لە پێوەندی دەگەڵ ئەو ژن و پیاوانە بە کار دێ کە لێك مارە نەکراون)، **بە حەرامی بەیەکەوە ژیان**: لەم سەردەمەدا دەوڵەت بە حەرامی بەیەکەوە ژیانی بۆ خەڵك هەرزان کردووە.

٥٨٩/ 5164- **بە حەماسەتێکی کەرانەوە قسە کردن دەربارەی**: بە حەماسەتێکی کەرانەوە تاریفی بەرگدرووەکەی دەکرد کە گۆیا بە حەقدەستێکی یەکجار کەم وەك کۆدیلی پاریس بەرگ دەدروێ.

٥٩٠/ 6756- **بە حەوسەڵەو لەسەرەخۆ کارکردن لەسەر**: بە حەوسەڵەو لەسەرەخۆ لەسەر ئەم کتێبە کارم کردو ناکامەکەی بوو بە ئەوە کە چۆنم دەویست ئاوا دەرهات.

٥٩١/ 4913- **بە حیساب گرتن، لەسەر حیسابی کەسێك نووسین**: دەتوانی پارەی ئاخواردنەکە بە حیسابی من بگری/ لەسەر حیسابی منی بنووسی.

← دەگەڵ خستن، نووسران لەسەر.

٥٩٢/ 3359- **بە حیساب هێنان، نووسران دەگەڵ، دەگەڵ خستن**: ناوی دوو کەس لە دۆستەکانم دەگەڵ ناوی ئەو کەسانە نووسرابوو کە لە هێرش کردنە سەر خەتی پشتی جەبهەی دوژمندا ون ببوون.

٥٩٣/ 4914- **بە حیسابی شتێك گرتن، پێوابوون**: بەراستی زانیم کە حاڵت باش نیە، بەڵام پێموابوو هی مەشرووب خواردنەوەیە.

٥٩٤/ 1647- **بە حیسابی قەرزی کەسێك نووسین یان دانان**: داخوادەکرێ بۆم روون کەنەوە کە لەبەرچی ئەو پارە زۆرە بە حیسابی قەرزی من نووسراوە/ دانراوە؟

٥٩٥/ 336- **بە حیسابی من، لەسەرمن** : بخۆوەو کارت بە پارەکەی نەبێ؛ پوولەکان لەسەر من!

٥٩٦/ 1411- **بە خاك ئەسپاردن، ناشتن، تەحویل دان بە زیندان**: لە رێورەسمێکی سادە دا تەرمی چوار مەلەوانەکەیان ناشت.

٥٩٧/ 3795- **بە خاك ئەسپاردن، ناشتن**: لە رێورەسمێکی سادەدا، قوربانییەکانی کارەساتەکەیان لە گۆرستانی کلیسا بەخاك ئەسپارد.

٥٩٨/ 3405- **بە خاك ئەسپاردن، ناشتن**: کابرا پێوە گوتی دڵی دەیهەوێ لە گۆرستانی بنەماڵەکەی بیەنێژن.

بەخت روو تێکردن ← شانس هێنان.

بەخت گڕکردن ← شانس هێنان.

٥٩٩/ 2604- **بە خزمەتی کەسێك گەیشتن، دەردی کەسێك خواردن**: با بە خزمەتی ئەو هەتیوە زۆڵە بگەم (= دەستێکی لێدەم/ بکوتم) کە تەنانەت دایکیشی نەیناسیتەوە.

٦٠٠/ 1644- **بە خزمەت گەیشتن (= تەمبێ کردن)**: با لە ئیدارە بگەڕێمەوە، بە خزمەتت دەگەم. * بە باوکم دەڵێم بە خزمەتت بگا.

٦٠١/ 2253- **بە خزمەتی کەسێك گەیشتن، لێدان، تێهەڵدان، کوتەك لێدان**: پێش ئەوەی تێهەڵدانەکەت تەواو کەم، مردنی خۆت بە ئاوات دەخوازی.

← تەمبێ کردن.

٦٠٢/ 4418- **بەخشین، چاوپۆشی لێکردن، لێبووردن**: تکایە، بۆ ئەوە کە زووتر نەهاتووم، ببەخشە.

بەخشین(ی کەسێك) ← لە گوناهی کەسێك بووردن یان خۆش بوون، فیدا کردن، خەرج کردن، لێبووردن، بە خۆڕایی دان.

٦٠٣/ 957- **بەخۆدا شکاندنەوە**: دەمویست بە پرسیار کردنی زۆر ورد بەخۆم دا بشکێنیتەوە.

٦٠٤/ 5629- **بەخۆدا شکاندنەوە، لەدەم دانەوە**: ئەگەر دەمویست خۆشناو بە خۆیدا بشکێنیتەوە، رێگای زۆر باشتر لەوە هەبوو.

٦٠٥/ 5843- **بەخۆدا شکاندنەوە، شەرمەسارکردن، خەجاڵەت کردنەوە**: ماری ئەوەندە بە توندی چاوی دە کابرای بڕی کە سەرەنجام خەجاڵەتی کردەوە کە جێگای خۆی بدا بە پیرێژنەکە.

٦٠٦/ 6749- **بەخۆدا شکاندنەوە، لەدەمدانەوە، پووچاندنەوەی کەسێك**: بە قسەکانی کچەکە بە خۆیدا شکاوە، بەڵام ئەو خۆی خڕکردەوەو پرسیاری کرد: دەتوانم پێت بڵێم ئەمە؟

← پێش بە کەسێك گرتن، بەچاو دادانەوە، پڕینگاندنەوە.

٦٠٧/ 5837-**بەخۆدا هاتنەوە**: لە ناکامی ئەو بەخۆ داهاتنەوە بەدناوەی کە لە زەمینەی بەڕێوەبەری و هێزی کار لە ساڵی یەکەمی دەوڵەتی ئیدوارد هێز ئەنجام درا، بەشی هەرە زۆری سەنعەتە بەرهەم هێنەرەکان لە بەراورد دەگەڵ چەند ساڵ پێشتر، وەزعێکی زۆر باشتریان هەیە.

٦٠٨/ 6018- **بەخۆ راگەیشتن، جلکی جوان لەبەر کردن، خۆشیك کردن**: ئەگەر کەمێك بە خۆت رانەگەی، دەبێ هەموو پاشماوەی تەمەنت لە کارگەی بەستنی سازیدا کار بکەی. * لە ئاخرین جارەوە کە دیومە، بە شێوەیەکی بەرچاو شیك بووە.

٦٠٩/ 2646- **بە خۆڕایی دان، هەرزانفرۆش کردن، بەخشین**: پیاوە گەنجەکە هەرچی ماڵو سەروەتی هەبوو بە خۆڕاییدای بە خەڵكو چوو لە دوورگەیەك بۆی بژی.

← بە فیڕۆ دان.

٦١٠/ 2726- **بەخۆنازین، فەخر فرۆشتن**: یەکێك لە ئاکتەرەکان بەوە دەنازێ کە لە ئەخشی لۆرد- جەللادی گەورەدا یاری دەکا.

بەخۆوە خەریك کردن ← نازاردان.

٦١١/ 6720- **بە خۆوە گرتن، پەیدا کردن**: ئێستا پرچەکانی بریقەیەکی ساغی و سلامەتییان پەیدا کردووە.

٦١٢/ 3604- **به خەبەر راگرتن، لە نوستنی کەسێك پێشگری کردن:** "پەکرو! دەکرێ بڵێین نیو سەعات لە نیوەشەوێ لای داوە. هیوادارم مزاحیمی خەوەکەتان نەبووم." * نابێ میوانەکانتان هەتا بەیانی بە قسان راگرن و رێگایان نەدەن بخەون، مەمکینە، بۆ خەوێ کەلەلا بن.

٦١٣/ 6415- **بەخەبەر مانەوە، دەرمنگ خەوتن:** بۆ گوێ راگرتن لە هەواڵەکانی نیوە شەوێ، نەنوستین.

٦١٤/ 5102- **بە خەت راوەستان، بە خەت بوون، نۆبە گرتنەوە، سەرە گرتن، بۆ وەرگرتنی نۆبە لە سەف دا راوەستان:** بۆ چوونە ژووری دووکانەکە سەرەی گرتو دوایەش لە ژووری بۆ کرینی سەوزی و بۆ نۆبە گرتنەوە لە سەفەکەدا راوەستا.

٦١٥/ 2346- **بە خەت بوون، بە سەف راوەستان:** بەتالیونەکە بەشێوەی دەستە دەستە بە خەت راوەستان.

٦١٦/ 2123- **بە خەت کردن، لە خەتێك دا راگرتن:** گرووپانەکان تاقمە سەربازەکانیان لە گۆڕەپی بەر ئاسایشگا بە خەت کرد.

← بەسەف راگرتن.

٦١٧/ 3932- **بە خەت کردن، بە سەف راگرتن یان راوەستان:** سەرگرووپان تاقمەکەی خۆی لە مەیدانی سانو ڕێژە بەخەت کرد. * لۆریەکان بەخەت ببوون و ئامادەی وەرێکەوتن بوون.

٦١٨/ 3935-**بە خەت کردن، راگرتن لەبەرابەر تاقمی تیرەباران دا:** پێنج کەس لە مەدەنییەکانیان بە رەکێش رەکێش هێنایە دەرو بەخەتیان کردن و تیرەبارانیان کردن.

٦١٩/ 7218- **بە خەیاڵدا نەهاتن، بە فکری کەس نەگەیشتن:** کاتێك بۆ یەکەم جار هاتمە نێو ئەو شەریکەیە سەرمایەگوزاریەکی بەو رادەیە گەورە بە فکری هیچ کەس دانەدەهات.

٦٢٠/ 7230- **بە خەیاڵدا نەهاتن:** لە زەمانی ویکتوریا دا هەر بە خەیاڵدا نەدەهات کە کچێکی بنەماڵەیەکی مام ناوەندی وەدوای کاردیتنەوە بکەوێ، مەگەر بیویستبایە ببێ بە مودیری قوتابخانە یان مامۆستای سەر ماڵێ.

٦٢١/ 1896- **بە خەیاڵدا نەهاتن، بیرلێنەکردنەوە، بە خەونیش نەدیتن:** هیچ دایك و باوکێکی تێگەیشتووی چینی مام ناوەندی هەر بە خەیاڵیان دانایە منداڵەکانیان ئیجازە بدەن لە تەمەنی ١٥ ساڵی‌دا دەست لە خوێندن هەڵگرن.

← شوێن لەسەر دانەنان.

بە خەڵك راگەیاندن ← لەقاودان.

بە خەونیش نەدیتن ← بە خەیاڵدانەهاتن.

٦٢٢/ 7367- **بەخێرهاتن کردن، پێشوازی کردن لە:** بۆ بەخێرهاتن کردنی میوانەکان، زاوا لەبەر درگا راوەستا بوو.

٦٢٣/ 749- **بەخێو کردن، گەورە کردن:** نێرسەکە/ سیستەرەکە زگی بە پەرویز دەسوتا، وەك کوڕی خۆی قبوڵی کردو گەورەی کرد.

٦٢٤/ 2205- **بەخێو کردن، نان (ی خواردەمەنی بە کەسێك):** بەڵێ منداڵەکان لەباری خواردەمەنییەوە وەزعێکی باشیان نیە. دایکیان ناتوانێ هەموو رۆژێ بە گۆشت و ماسی بەخێویان بکا.

بەخێو کردن (باش) ← باش بەخێو کردن.

٦٢٥/ 3521- **بەخێو کردن:** گۆرانی‌بێژەکەی موسیقای پاپ شانازی بەوراستی‌یە دەکرد کە دایك و خوشکەکەی بەشێوەیەکی پڕلە تەجەمول بەخێو دەکا.

بە داخ بوون بۆ ← گریان بۆ

بە دڵبوون ← خۆش ویستن.

٦٢٦/ 6125- **بەد خەرجی کردن:** "لە فکری ئەوە دابووم کەمێك بەد خەرجی بکەم". "زۆر باشە، حەقتە، زۆرت زەحمەت پێوە کێشاوە."

٦٢٧/ 6637- **بە دروست زانین، پەندروست بوون، شتێکی ئاسایی بوون:** لە پێوەندیە نێو نەتەوەییەکان دا هێندێك پێوەرەو پێوانەی پێشکەوتووانە هەن بۆ رەفتار کردن دەگەڵ خەڵك کە هەموو کەس بە دروستیان دەزانن.

٦٢٨/ 2957- **بە درۆ کارێك لە نجامدان:** مێردەکەی بە درۆ دەستی کرد بە بەخێر هێنانی میوانەکانی، بەڵام، لە یەکەم دەرفەت دا لە دیوەکە وەدەرکەوت.

بەدرەقە کردن ← بەرێکردن.

٦٢٩/ 6326- **بە دزی رۆیشتن، بە سەبرایییەکی رۆیشتن، بێ دەرچوون، فیزماڵکێکدان:** لە حاڵێك دا خەڵکەکە خەریکی کارێکی دیکە بوون، لە جێگاکەی را کە لە پشتەوە بوو فیزماڵکێکی دایەو رۆیشت.

٦٣٠/ 4510- **بە دزی و بە شەرمەوە چاولێکردن:** غەوارەکان هەستیان بەوە دەکرد کە لە پشت پەردەتۆرەکانی ماڵانەوە بە دزی و بە شەرمەوە چاویان لێدەکەن.

بە دزییەوە گوێ‌راگرتن لە ← گوێ هەڵخستن لە.

بەد شانسی هێنان ← خراپ هێنان.

٦٢١/ 2132- **بەد عەمەل کردن، کردەوەی خراپ فێربوون:** دەبوایە چاوەڕوانی ئەوە بین کە لاوێکی ئەوتۆ بە دایکو بابێکی سەرسەری‌و هەبوونی ئیمکاناتی بەرچاوەوە دەگەڵ کەسانی خراپ ببێتە هاوبەش‌و فێری کردەوەی دزێو بێ.

← زیان دیتن.

٦٢٢/ 5087- **بەد عەمەل کردن، بە ڕێگای خوار، یان خراپ دابردن، فێری کاری خراپ کردن، کاری خراپ وەبەرنان:** دەیەوێ لە دانی‌مالیات خۆ بدزێتەوە. کەسێك ئەو کارە خراپەی وەبەرناوە.

← بە ڕێی خراپ دا بردن.

٦٢٣/ 4267- **بەدفەڕی کردن، جرپەو جۆڕ کردن، خولانەوە:** بە منداڵەکان بڵێ لە قاتی سەرێ دەست لە جرپەو جۆڕێ هەڵگرن: دەمەوێ کار بکەم. *ڕۆژەکانی ئاخری حەوتوو بە ماشینێ دەخولێتەوە.

٦٢٤/ 4285- **بەدفەڕی کردن:** بەدفەڕی کردن لە کارگایان کارێکی خەتەرناکە.

←مزاحیم بوون.

٦٢٥/ 2209- **بە دڵداهاتن:** بە دڵم داهات کە کاوە زۆڵمی لێدەکاو، دەمەویست، لەو بارەوە ئەرخەیان بم.

← بە فکر گەیشتن.

بە دڵ نەبوون ← بە پێچەوانەی ویستی دڵ بوون.

٦٢٦/ 4959- **بە دڵ‌وگیان، تێکۆشان، هەوڵدان:** ئەگەر لە پێشبڕکێی ئایندەدا هەمووەمان بە دڵو بە گیان تێ‌بکۆشین، هیچ شتێك ناتوانێ پێشمان پێ‌بگرێ.

٦٢٧/ 2172- **بە دڵەوە تێکۆشان:** شەریکە ئەوتی‌یەکان بە دڵەوە تێدەکۆشان کەلە ئیمتیازێك لە دەوڵەت وەرگرن.

٦٢٨/ 3164- **بە دڵەوە خۆش ویستن، پێخۆش بوون:** ئەو هەمیشە بە دڵەوە خۆشی ویستبووی. * خەڵك بە دڵەوە مەشروباتی ئەلکولیان پێخۆشە.

بە دڵەوە کار کردن ← (بە شۆق‌و زۆقەوە) کردن، (بە دڵو بە گیان) کارکردن.

٦٢٩/ 84- **بەدەمداهاتنەوە، جوابە جەنگی کردن:** کاتێك دایکت لۆمەت دەکا، نابێ جوابەجەنگی بکەی.

← پێش بە کەسێك گرتن.

٦٤٠/ 1547- **بە دەم گریانەوە خەو لێکەوتن:** لە حالێك دا دایکو بابەکە بە قسەیەکی قۆڕی تەلەفزیۆن لەخۆ ببوونەوە، کوڕە دڵشکاوەکەیان لەنێو جێگادا ئەوەندە گریا هەتا خەوی لێ‌کەوت.

بەدەمەوە کەوتن ← بەرەودەم بەربوونەوە

بەدناو کردن ← ئابروو بردن.

٦٤١/ 6121- **بە دواوەوە بوون، دەگەڵبوون، بوون بە هۆی:** داندرانی سەرۆکی تازەی قوتابخانەکە بۆ هەموو ئەو قوتابی‌یانەی کە هیوادار بوون زۆر بە هاسانی لە دورەی 'ڕاهنمایی' تێپەڕ بن، بوو بە هۆی ناهومێدی.

٦٤٢/ 1386- **بەدواوە بوون:** خێزانداربوونێکی لە ڕادەبەدەر ژیانێکی ئاسوودەی بە دواوە نابێ (= ئەو بنەماڵانەی کە خێزانێکی لە ڕادەبەدەر زۆریان هەیە ناتوانن ژیانێکی ئاسوودەیان هەبێ)

← بەسەر داهاتن.

٦٤٣/ 7119- **بە دوای خۆدا کێشان:** ئەگەر ناچار بێ دوو منداڵان بە دوای خۆت دا ڕاکێشی، ڕۆژێك لە شار بە سەر بردن هیچ خۆش نیە.

٦٤٤/ 4772- **بە دوای شکاردا گەڕان:** کتکە سانەکان (شێر و پڵینگو...) لە دەشتە بێ‌دارو دەوەنەکان دا بە دوای شکار دا دەگەڕێن.

بە دوای شتێکەوە بوون ← ئاگادار بوون.

٦٤٥/ 3325- **بە دوای شتێك دا گەڕان:** لە نێو بەڵگەکانی سەردەمی ئیلیزابێت دا بە دوای ڕادەی خەرجی ماڵان دا دەگەڕێ.

← گەڕان لە، گەڕان بە شوێن شتێك دا، بە وردی لە شتێك گەڕان.

٦٤٦/ 1117- **بە دوای ...دا هاتن، یەك لە دوای یەك هاتن:** "ب" دوای "ئەلف"و "ج" دوای "ب" دێ.

٦٤٧/ 380- **بە دوای ...وە بوون، وەدوای... کەوتن:** ئەم خەباتە بۆخاتری پارە نیە، بەڵکوو بە دوای بیروباوەڕێکی زۆر بەرزەوەیە.

← بە شوێن...دا گەڕان.

٦٤٨/ 3085- **بە دوای کەسێکەوە بوون، بۆ سەری کەسێك ئێدان:** پێویستە پێت بڵێم لە ماوەی چەند حەوتووی ئایندەدا دەبێ زۆر ئاگات لە خۆت بێ. بەکرەی کۆنەکار بەدواتەوەیە (دەیەوێ بۆ سەرت لێ‌بدا). بە دوای بیانوویەك دا دەگرێ بۆ ئەوەی لەلای سەرۆکی ئیدارە ڕاپۆرتت لێ‌بدا.

بە دژدا ← ڕۆیشتن، بڕۆ ون بە!.

بەدوور بوون لە ← بەرزتر بوون لە.

٦٤٨٠١/ 206- **بەدوای کەسێکەوە بوون، گەڕان لە:** هێشتاش هەر لەو کابرایە دەگەڕێین/ بە دوای ئەو کەسەوەین کە دوێنێ دوکانەکەتی بڕیوە.

٦٤٩/ 5881- **بە زۆر شتێك دە مێشکی کەسێك ڕاکردن:** هەر هەفتەی بۆ ماوەی پێنج سەعاتان دەرسی فەرانسەیان بە زۆر دە مێشکی ڕاکردبوو، بۆیە سەیر نەبوو کە نەفرەتی لەو زمانە هەبێ.

٦٥٠/ 5035- **بە دوور نەزانین لە:** لە خەری بە دوور نازانم کە پارەی ئەنکی بدزێ.

بە دەردێك خواردن ← بەکاری... هاتن.

٦٥١/ 5342- **بە دەست کەسێك بوون:** ئەوە کە ئایا وتووێژەکان بە سەرکەوتنەوە دەچنە پێش/ سەردەکەون یان نا، بە دەست چەند کەس لە شەخسییەتەکانە.

← لە سەلاحییەتی کەسێك دابوون.

٦٥٢/ 1180- **بە دەست گەیشتن:** لە پێوەندیی دەگەڵ بەرپوونەوەی فڕۆکەیەك لە ئۆقیانووسی ئەتڵەس هەر ئێستا هەواڵێکمان بە دەست گەیشتووە.

٦٥٣/ 4442- **بە دەست گەیشتن، بۆ بە جێمان، پێگەیشتن:** ئەو زەبەردەستیە لە کاردا لە چوارتووڕەمە لەمەوپێشەوە بە دەستیان گەیوە/ بۆیان بەجێماوە.

٦٥٤/ 3104- **بە دەست وەلادان، پاڵ پێوەنان:** سیت پالی بە فوول بەکەکەوە ناو بە توندی بەرەو ئالای گۆشەکە هەلات.

٦٥٥/ 1140- **بە دەستەوە بوون (بەلگەی پێویست):** ئەگەر لە کاتی کڕینی ئەو دەزگایە، هێندێك وردە کاران نەکەی - وەك دانی ناوو ڕێکەوتی کڕین و نادرێس و ...- ئەوەدەمی ئەگەر دەزگاکە خراپ بێ، هیچت بەدەستەوە نابێ.

٦٥٦/ 291- **بەدەستەوە بوون:** پێداچوونەوە بە دەستخەتەکە بە دەستمانەوەیە.

بە دەستەوەدان ← تەسلیم کردن، تەحویلدان.

بە دەستە کوتە لە شتێك گەڕان ←گەڕان بۆ.

٦٥٧/ 6658 - **بە دەستەوە گرتن، دەست پێکردن، قبووڵ کردن:** هەر ئێستا پرۆژەیەکی گەورە بۆ ئاوەدان کردنەوەی شارەکەمان بەدەستەوە گرتووە/ دەست پێکردوە ← پەنا بردن بۆ، وەئەستۆ گرتن.

٦٥٨/ 6753- **بە دەستەوە گرتن (شەریکەیەك):** یەکێك لە خاوەن چاپەمەنییەکانی لەندەن هەوڵ دەدا بەڕێوەبەریی شەریکەیەك بەدەستەوە بگرێ.

٦٥٩/ 6375- **بەدەستەوە نووسان، پاشقول دان، دزین:** یەك میلیون پوندی بە فیڕۆداو چل هەزار پوندیشی بە دەستیەوە نووسا.

٦٦٠/ 3682- **بە دەستی لە تۆپ دان، بەرەوپێشەوەو بە پێچەوانەی ڕێسای یاری (لە ڕەگبیدا).**

٦٦١/ 298- **بە دەسەلات گەیشتن، دەسەلات (ی سیاسی) بەدەستەوە گرتن:** لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا دەوڵەتێکی "ائتلافی" لە بریتانیا دەسەلاتی بەدەستەوە بوو (=لەسەرکار بوو).

← دەسەلات بەدەستەوە گرتن.

٦٦٢/ 1206- **بە دەسەلات گەیشتن، دەسەلاتی سیاسی بەدەستەوە گرتن، هاتنە سەر حوکم:** ئەو دەوڵەتە پارەکە هاتە سەر حوکم.

٦٦٣/ 4962- **بە دەسەلات (دەوڵەت) گەیاندن، هێنانە سەرکار:** سەرکەوتنێکی یەکجار گەورە حیزبی کرێکاری لە ساڵی ١٩٤٥دا هێنایەسەر کار/ بە دەسەلات گەیاند.

بە دەندە خەلاسی ڕۆیشتن ← بە ڕاحەتی ڕۆیشتن.

٦٦٤/ 5570- **بە دەنگی بلیند خوێندنەوە:** پێش دەست پێکردنی تەمرین/ مومارەسە، ئەو چەند خەتەم بە دەنگی بلیند بۆ بخوێنەوە.

٦٦٥/ 5184- **(بە بەتێك) بە دەنگی بلیند خوێندنەوە:** دایە، ئەگەر نامەی تروسکەیە، (بە دەنگی بەرز) بۆمانی بخوێنەوە.

← بە دیکتە پێکوتن.

٦٦٦/ 1946- **بە دەنگی ئە پلان خەلك دەنگدان، دەنگ کۆ کردنەوە لە ڕێگەی بانگەشە بۆ هەلبژاردن:** بە دەنگی تەپڵ سەربازە تازەکانیان لە جەنگەلێکی نزیك وێ بانگ کردەوەو کۆیان کردنەوە.

بەدەن نەرما ← تەنك.

٦٦٧/ 1701- **بە دیکتە گوتن، بە دەنگی بەرز خوێندنەوە، ئیملا پێکوتن:** ئەو برگەیەی بە دیکتە پێم گوتن لە رووی بنووسنەوە.

٦٦٨/ 4584- **بە دیوارێك یان دارێکەوە نووساندنی کەسێك:** کوڕێکی دوو هێندەی خۆی بە پەرژینەکەیەوە نووساندبوو، نەیدەتوانی نەفەس بکێشێ.

٦٦٩/ 1328- **بەرامبەر بوون، یەکسان بوون، هەر یەك بوون:** چ ویکی بخۆیەوەو چ بیرە، هەر یەك شتە چونکە بەشی زۆری دراوێکی پێی دەدەی دەچێ دەگیرفانی دەوڵەتەوە.

٦٧٠/ 1450- **بەرامبەربوون، وەك يەك بوون:** فەوجێكی پيادە دەگەڵ دەستەيەك هێزی سوارە وەك يەك وان.
← دەگەڵ يەكتر هاتنەوە.
٦٧١/ 5156- **بەراورد كردن:** وزەی ئەو ماتۆرە چەند بەراورد دەكەی؟ دوازدە ئەسپی هەڵم/ بوخار.
٦٧٢/ 4877- **بەراورد كردن، هەڵسەنگاندن، حەدس ليدان، ئەرزيابی كردن، تەخمين ليدان:** ئەمن وزنی ئەو پازدە پوند بەراورد دەكەم.
٦٧٣/ 133- **بەراورد كردن، هەڵسەنگاندن، نرخاندن:** لێكۆڵينەوەی مالياتی (زەريبەی) داهات بۆ ساڵی ٥-١٩٧٤، سێهەزار پوندی بەراورد كردووە.
٦٧٤/ 6674- **بەراورد كردن، پێش بينی كردن:** داخوا ئاڵوگۆڕ لە رادەی داواكاری (بۆ كاڵا)تان پێش بينی كردووە.
٦٧٥/ 1361- **بەراورد كردن دەگەڵ، لەبەريەك راگرتن، هەڵسەنگاندن دەگەڵ:** ئەگەر ژمارەی جينايەتەكانی ئەمساڵ دەگەڵ هی پارەكە بەراورد بكەين، بۆمان دەردەكەوێ كە هی ئەمساڵ يەكجار زياترە.
٦٧٦/ 7149- **بەراوەژووكردنەوە، سەنگەر شووژن دان، (بە تەواوی) پشكنين:** ئەگەر ئەو بەلگەيەی دەمانەوێ نەماندەنێ، ماڵەكەتان سەنگەر شووژن دەدەين.
بەربوون ←ئازاد بوون.
٦٧٧/ 2937- **بەربوونەوە لە كەشتی، لە كەشتيڕا كەوتنە نێو دەريا:** لە ماوەی گژە بايەكەدا بارێكی زۆر لە عەرشەكە ڕا كەوتە نێو دەريا. ● "كەشتييەكە بۆ راوەستاوە؟". "پێمواية كەسێك بەربۆتەوە (نێو دەريا).
٦٧٨/ 2169- **بەربوونەوە، كەوتن (زياتر بە هۆی هەڵخليسكان يان هەڵتەنگوتن):** خۆشناو پێی لە پێستی مۆزێكی نا، هەڵخليسكاو بەربۆوە.
٦٧٩/ 321- **بەربوونەوە، كەوتنە خوار (لە ئەسپ، دووچەرخە، وەلاغ):** دەتوانی خۆی راگرێ؟ ." نا بەربۆوە".
٦٨٠/ 1496- **بەربوونەوە (زۆرتر بەشێوەيەكی خەتەرناك)، كەوتن:** كاتێك سورعەتی با گەيشتە ٨٠ مايل، دارەكان يەك لە دوای يەك (هەڵكەندراو) كەوتن.
٦٨١/ 658- **بەربوونەوە، كەوتن، بەربانەوە، خستن، (بە پێوە بەرپێدان، يان بە فيل):** سانتر فورواردی ئێمە بە هۆی ئەوە پێيان وەبەر پێیدا لە "مەوطە"ی پێناڵتیدا كەوت.
← كەوتن، كەوتنە خوار.
٦٨٢/ 2303- **بەربوونەوە نێو، يان بەربوونەوە لەسەر:** لە پاش كاری رۆژانە، تەنيا شتێكی پێیخۆشە بيكا پانبوونەوە لەسەر قەنەفەيەكو تەماشا كردنی تەلەڤزيۆنە.

بەربەرەكانی كردن دەگەڵ ← بەشەر هاتن دەگەڵ.
٦٨٣/ 511- **بەرپرسايەتيی (بۆ خراپ بوونی كارێك)، خستنە ئەستۆی...:** ئەگەر شكستەكەتان لە پێشبڕكێدا بخەنە ئەستۆی هەوا، كارێكی بێهوودەيە.
٦٨٤/ 2159- **بەرپرسايەتيی شتێك كەوتنە ئەستۆی يان سەر شانی كەسێك:** بەرپرسايەتيی كردنەوە(ی رێوڕەسمەكەو...) كەوتە سەرشانی من.
٦٨٥/ 6742- **بەرپرسايەتيی كارێك لە كەسێك وەرگرتنەوە:** ناچارم راپۆرتێك / گوزارشتێك بۆ ئيدارە بنووسم. جا ئەگەر هاوكاريم نەكەن، بەرپرسايەتييەكەم لێدەستێننەوە.
٦٨٦/ 308- **بەرپرسايەتيی كارێك لە ئەستۆ بوون/ وەئەستۆ گرتن، بەدەستەوە گرتن:** كاتێك سەرۆكی ئيدارە لە مەرەخەسی بوو، خوسرەو بەرپرسايەتيی تەواوی لە ئەستۆ بوو.
٦٨٧/ 3758- **بەرپرسايەتيی... خستنە ئەستۆی كەسێك، كەسێك تاوانبار كردن بە، بە كەسێكەوە نووساندن:** گوناحی ئەو دەعمانە/ تەسادوفانە دەبێ بخرێتە ئەستۆی رانەندە كەمتەرخەمەكان.
٦٨٨/ 4002- **بەرپرسايەتيی... لە ئەستۆ بوون، پێراگەيشتن، ئاگا لە... بوون:** پێمواية ئەو پەرستارە/ سيستەرە ئاگای لێت دەبێ. ● ديار بوو چاكيان ئاگا لێی بوو. ● شوورا بەرپرسی ئەو بەشە لە ئامادەكردنی كارەكەتە.
٦٨٩/ 87- **بەرپرسايەتيی كەسێك وەئەستۆ گرتن، زەمانەتی كەسێك كردن:** بە بڕوای من ئەتۆ بۆ ئەو كارە باشترين كەسی، بەڵام ناتوانم لە پێوەندیی دەگەڵ باقیئەندامانی كۆميتە هيچ زەمانەتێك بدەم.
٦٩٠/ 86- **بەرپرسيار بوون سەبارەت بە، وەڵامدەر بوون سەبارەت بە:** لەبيرت نەچێ، دەبێ رۆژێك، رۆژگارێك سەبارەت بەو كردەوە نالەبارەت وەڵامدەر بی.
بەرپرسيار بوون لە بەرامبەر كەسێك دا ← وەڵامدەر بوون لە بەرامبەر كەسێك دا، جوابگۆ بوون لە بەرامبەر.
بەرپەرچ دانەوە ←پشت تێكردن، قبووڵ نەكردن.
٦٩١/ 5678- **بەرپێ يان بەرلووتی خۆ نەديتن، ئەری خۆو گيزەر لێك نەكردنەوە:** بەشێوەيەكی زۆر خراپ دەگەڵی دەبزوويەوە، راست بە هۆی ئەوە كە ناتوانی بەرلووتی ناحەزو ئێسك گرانی خۆت ببينی./ كە ناتوانی گوێی خۆت وگيزەری لێك كەيەوە.
٦٩٢/ 5351- **بەرتەسك كردنەوە، مەحدوود كردنەوە:** دوكتور سيغاركێشانەكەمی بە رۆژی دە دانە بەرتەسك كردۆتەوە. (گوتوويەتی نابێ دەيان زياتر بكێشی) _ وەرگێڕ.

٦٩٣/ 3619- بەرتەسك كردنەوە لە چوارچێوەیەكی دیاریكراودا، سنوور بۆ دانان: دەوڵەت دەڵێ هەوڵ دەدا بۆ چوونەسەری نرخەكان سنوورێك دابنێ .
← كەم كردنەوە، مەحدوود كردنەوە.

٦٩٤/ 6946- بەرجەستە هاتنە بەرچاو، دیار بوون: بانی ماڵەكانی شار لە بەرامبەر ئاسمانی كاتی نزیكی شێوان دا بەرجەستە دەهاتنە بەرچاو.

٦٩٤/١/ 521- بەرچاو تاریك كردن، بەرچاو گرتن: باو باسریشك ئاسمانیان تاریك كرد. * نەیدەتوانی نووسراوەكە بخوێنێتەوە، چونكە هەر كە فكری دەپەڕیە سەر ئەو، لەبەر چاوی زاهیر دەبوو.

٦٩٥/ 3220- بەرچاو تاریك بوون: هەركات كەسێك ناوی بەری، بەرچاوی تاریك دەبێ.
بەرچاوی...گرتن ←بەرچاو تاریك كردن.
بەرخورد دەگەڵ ← بۆچوون.
بەرداشت كردن ← دەرهێنان لە، هەڵگرتن (لە حیسابی بانك).

٦٩٦/ 4494- (دست لی) بەردان: تەقەمەنی‌یەكەی لەسەر كورسی‌یەك داناو تێلەكەی بەردا.
← دەست هەڵگرتن.

٦٩٧/ 656- بەردانەوە، هێنانەخوار: چەند فەرمەند فرۆكەیان دەگیر خستو بەریان دانەوە.

٦٩٨/ 5865- بەردانەوە، بەربوونەوە: سێ فەرمەند لە هەشت فرۆكەكان لەنێو گری ئاوردا بەردرانەوە.
← لە ئەرزی‌دان.

٦٩٩/ 3508- بەردانەوە، هەڵنەهێنان، بەرز نەكردنەوە، دانواندن: كاتێك دەمەویست بگەڕێمەوە بۆ لای یەكانەكەی خۆم قسەكانی باوكم ئەوانە بوون: سەرت بەردەوەو چاوەكانت بكەوە.
بەرد تێگرتن ← سەنگ ئەرش كردن.

٧٠٠/ 5593- بەردیكی كەمرێك دەچالاوێی باوێژی، بەسەد ئاڵان دەرنایەتەوە: سەرەڕای هەموو هوشیار كردنەوەكانمان، ڕۆیشتو لەو كارە پڕمەترسییەی كارخانەكەی كەتری سازیدا سەرمایەگوزاری كرد. بە بڕوای من تەواو قالبی خۆیەتی ئەگەر بڵێین "بەردێكی كەمرێك دەچالاوێی باوێژێ بە سەد عاقڵان دەرنایەتەوە".

٧٠١/ 2100- (كەم كەم) بەرز بوونەوە، چوونەسەر، بەرەو زیادبوون ڕۆیشتن: پێ بە پێی كەم بوونەوەی دەنگی موسیقای نێوان بەرنامەكە، دەنگی قسە كردنی تاقمێك كە لە دەوری مێزێك دانیشتبوون وردە وردە بەرز بووە.

٧٠٢/ 537- بەرز بوونەوە، كەیشتنە لووتكەی تەوپەڕی هەڵاو بگر، شەڕو كێشە): یەكێك لەو هەڵاو كێشە نەحەقانیەی نێو بنەماڵە بوو كە گەیشتە ئەوپەڕی خۆی‌و هەموانی وەها تووڕە كردبوو كە لە حەیفان دەلەرزین.

٧٠٣/ 5399- بەرز بوونەوەی دەنگ): لە پڕ دەنگێك هات، ڕاست وەك ڕیپ لێدانی نیگرزۆزی ماشێن .
← سەربەرز كردنەوە.

٧٠٤/ 5422- بەرزتر بوون، بەدوور بوون لە، بەری بوون لە، دوور بوون: ئێمە بێ‌گومان لەو چەشنە وردە حەسوودی‌یانە/ بەخیلی‌یانە بەدوورین.

٧٠٥/ 203- بەرزتر بوون لە، پاكتر بوون لە: غەمێ مەخۆ، بابم زۆر لەوە بەرزترە كە بیهەوێ لە بڕیاری تۆ لەو مەسەلەدا تەداخول بكا. * هێندێك لەو كارمەندانە (لە باری شەخسییەتەوە) ئەوەندە بەرز نین كە دەست دە سندووقی پووڵی نەنێن.

٧٠٦/ 5262- بەرز كردنەوەی ناوی كەسێك یان شتێك: سەركەوتنی ئەو چارێكەوتنە ناوی هەموو بەشدارانی یەكجار زۆر بەرز كردۆتەوە.
← یارمەتی‌دان بە، ڕاوەشاندن.
بەرق كێشان بۆ ← وایەر كێشان.

٧٠٧/ 4691- بەرق پێهەڵێنان، وەبریقەبرێق خستن، دروشانەوە، بریقانەوە، بریقەدار كردن: ئەو قاپە برۆنزە كۆنانە زۆر جوان دەدرەوشێنەوە.

٧٠٨/ 1641- بەرقەرار كردن، هێنانەگۆڕ، هێنانە كایەوە، بەڕێوەبردن: شارەكەی سەرسنوور جۆرە دادگایەكی سەرەتایی پێك هێنابوو كە بەشێوەیەكی تایبەتی عەدالەتی بەڕێوە دەبرد.

٧٠٩/ 6364- بەرگری كردن: كاربەدەستانی پەروەردەو فێركردن دەیانەویست قوتابخانەكە بگوێزنەوە خانووبەرە تازەكە، بەڵام منداڵەكانو دایكو بابەكانیان بە توندی بەرگرییان دەكرد.

٧١٠/ 4337- بەرگری كردن لە شتێك هەر لە سەرەتاوە: بە جۆرێك دانیشتبوو كە دەتگوت هەر لە سەرەتاوە بەرگری لە شتێكی خراپو خەتەرناك كردووە.
بەر لە هەموو شتێك ← لەپێش دا.
بەرماو ← مانەوە (ی بەشێك لە شتێك).

بەرنامە دارشتن ← نەخشە دانان.

۷۱۱ 2895- **بەرنامەی کارگۆڕین:** کۆڕی بەڕێوەبەرایەتیی بەردە رەژی رایگەیاندوە ئەگەر دیسانیش فرۆشی رەژی کەم بێتەوە، دەبێ چەند کانگای دیکە بەرنامەی کاریان بگۆڕن و بەشێوەی نیوە رۆژ کار بکەن یان بە یەکجاری دابخرێن.

۷۱۲ 5025- **بەرنامەی کەسێک تێکدان، لێ تێکدان:** هیوادارم کتوپڕ هێنانەوەی سێ کەس بە میوانی بەرنامەی کابانی ماڵێی تێک نەدابێ.

۷۱۳ 3185- **بەرنامەیەک، کارێک، گرفتارییەک) هەبوون:** داخوا ئەمڕۆ ئێوارە هیچ بەرنامەیەکت هەیە؟ بەڵێ، یەک دوو چاوپێکەوتنی کورت.

۷۱۴ 3577- **بەرنەدان، بەجێنەهێشتن، لانەدان:** زۆرمان هەوڵدا کە ڕانندەکانی بەشدار لە پێشبڕکێکەدا جادەکە بەرنەدەن، بەڵام هێندێکیان هەر لایان دا. *ئاغای هاشمی، ئەگەر لەبابەتی ئەسڵی لانەدەی، زۆر سوپاست دەکەین.
← دەست لێ هەڵنەگرتن.
← بە ڕوونی دەرخستن، بە ڕوونی نیشاندان.
← تێگەیاندن، جەخت دانان لەسەر، وەدەرخستن.

۷۱۵ 1347- **بەرەوڕوو بوون دەگەڵ، دەگەڵ دژایەتیی کەسێک بەرەوڕووبوون:** ئەمە یەکەم جار نەبوو کە بیووروانگەکانی دەگەڵ دژایەتیی بیووروانگەکەی مێردەکەی بەرەوڕوو دەبوو.
بەرە بەرە واتێگەیاندن ← بردن دەمێشکی کەسێکەوە.
بەرەدان (لە چنینی گۆرەوی و ...دا) ← داگیرساندن.

۷۱۶ 5219- **(وەک ...) بە ڕەسمییەت ناسین:** وێناچێ دەربار ئەو کابرایەی (وەک جێنشینی ڕاستەقینەی باوکی) بە ڕەسمییەت بناسێ.

۷۱۷ 4622- **بەرەڵا بوون، بەرەڵاکردن:** کاتی ئەوە هاتووە دەست لە بەرەڵایی هەڵگری و ژیان جیددی بگری.
← سەرگەردان بوون.

۷۱۸ 1843- **بەرەڵاکردن، بەرەڵا بارهێنان:** بە منداڵەکانیان ئیجازە دەدەن لە شەقامەکان دا بخولێنەوە و هەر جۆرێکی پێیان خۆش بێ، بێن و بچن -بە کورتی بەرەڵلایان کردوون- (بێ‌سزادان) ئازاد کردن.

۷۱۹ 1344- **بە رەنجی شان و ئارەقەی نێوچاوان بە ... گەیشتن:** بە ڕەنجی شان و ئارەقەی نێوچاوان بەم جێگایە گەیشتووم. پێش ئەوەی لە دایک بم، باوکم مردبوو لە تەمەنی دوازدە ساڵان ڕا ناچار بووم دەست لە دەرس خوێندن هەڵگرم.

۷۲۰ 4618- **بە ڕەندە لێدان (ڕەنگ و لووس کردن):** ئەو جێگایانە لە مێزەکە کە لە کاتی بەستەبەندیدا ڕنداربوون یان داڕووشان دەکرێ بە ڕەندە لێدان ساف بکرێنەوە/ لێکەو لووس بکرێنەوە.

۷۲۱ -

۷۲۲ 6243- **بەرەو نیشکانی وەرێکەوتن:** وادانرابوو کە کەشتیی نیم.تی.بی (ئەژدەرهاوێژ) دوو سەعاتان لەوێ ڕاوەستێ و، دوایەش بە ڕێگایەکی دیاریکراودا بەرەو شاری... وەڕێکەوێ.

۷۲۳ 4052- **بەرەو باشتر بوون ڕۆیشتن:** ڕوانگەی کەسبو کار بۆ ئەو کەسانەی خانووسازی دەکەن بەرەو باشتر بوون دەڕوا. *بەهاری ئاینده دەبێ بازاری فرۆشی ماتۆڕ بەرەو باشی بڕوا.

۷۲۴ 6702- **بەرەو باشتر بوون ڕۆیشتن، وەقازانج کەوتن، کەوتنە سەرقازانج:** ئێستا کە ئابووری خەریکە دەگاتە قۆناخی قازانج کردن، دەوڵەت بە ئاشکرا پێی ناخۆشە پێشی گەشە و بەرەپێدانی بگرێ.
← هاتنە پێش.

۷۲۵ 1026- **بەرەو پاش بردنەوە، پێشگرتن، خواردنەوە:** کاتێک وەزعی ئالەباری منداڵەکانی چاوپێکەوت، زۆر بە زەحمەت توانی پێشی فرمێسکەکانی بگرێ.

۷۲۶ 712- **بەرەو پشت (-دوا) گەڕانەوە یان گەڕاندنەوە:** بەرەوسوورانێکی بە خێرایی، کەشتییەکەیان باداوە و گەڕانەوە.
بەرەو پیری (پیلی) کەسێکەوە چوون ← کڕنۆش بردن، پێشوازی لێکردن.
بەرەوپێش بردن ← پاڵ پێوەنان.

۷۲۷ 465- **(بە خێرایی و بەشێوەیەکی ترسێنەر) بەرەو... پێشڕەوی کردن، چوونە پێش، هێرش کردن بۆ:** باڵندەکە بە خێرایی ۲۰ مایل لە سەعات دا هێرشی بۆ دێنایێن.

۷۲۸ 4298- **بەرەو پێشتر بەریکردن، دەرکردن:** دەمانەویست ماشینەکە لە بەردەمی بانک پارک کەین، بەڵام ئیگابانی ماشینان بەرەوپێشتر بەرێی کردین. * پێش ئەوەی حەشیمەتەکە ئەوەندە زۆر بێ کە ببێتە هۆی تێکدانی وەزعەکە، پۆلیس لەو نوختەیە وەدەری نان.

٧٢٩ 5731- **بەرەو پێشوازی مەرگ نساردن، بە کوشتندان:** بیناتریس گوتی: ''زۆر خۆشحاڵ دیاری، ئایا هیچ ئەوە بە خەیاڵت دادێ کە خەریکی پیاوێك بە کوشت بدەی؟

٧٣٠ 3221- **بەرەو جێگایەك وەرێکەوتن، چوون بۆ جێگایەك :** بەرەو تورکیە وەرێکەوتن. *ئەگەر دەگەڵ ئەو کورە درێژەی بدەی، بەرەو فاجیعە دەچن.

بەرەو جێگایەك کرانەوە ← روانینە سەر.

٧٣١ 5229- **بەرەو چاك بوونەوە چوون:** هێشتاش هەر خەریکە لە نەخۆشیی ئانفلوئانزا بەرەو چاك بوونەوە دەچێ.

٧٣٢ 6881- **بەرەو ...چوون:** تا ئەو جێگایەی پێوەندی بە فرۆشگە گەورەکانەوە هەیە، بەرەو فرۆشگەی زۆر گەورەتر لە دەوروبەری شارەکان دەچین.

٧٣٣ 2134- **بەرەو خراپ بوون رۆیشتن، بەرەو فەساد رۆیشتن:** لە سەردەمی دوورو درێژی کەسادیی ئابووریدا، ئەنبارەکانو بارئەندازەکانیان بەجێ‌هێشتبوو کە بۆ خۆیان وردە وردە بەرەو رووخان برۆن.

بەرەوخوار بژاردن ← پێچەوانە بژاردن.

٧٣٤ 6258- **بەرەو دەریا وەرێکەوتن:** ناوشکێنێك (کەشتیی جەنگی) کە بێ‌گومان سەربە هێزی دەریایی ناوچەکە بوو، بەرەو قووڵایی دەریا وەرێکەوت.

٧٣٥ 2151- **بەرەودەم بەربوونەوە، بە دەمەوەکەوتن، دەمەورو وەئەرزی کەوتن، بەسەرچاوان دا وەئەرزی کەوتن:** خۆی هەڵاویشتو لە پڕ بەدەمەوە وەئەرزی کەوت.

٧٣٦ 2097- **(نازایانە) بەرەوروو بوون دەگەڵ، (نازایانە) قبووڵ کردن:** ناکرێ لە دەست راستی‌یەکان هەڵێین؛ دەبێ ئەوەی راستە، (نازایانە) قبووڵی کەین.

٧٣٧ 6721- **بەرەورووبوون دەگەڵ، دەرگیربوون:** یەکێك لە ئەندامانی کۆڕی بەرێوەبەریی یەکیەتی دەیگوت کە دەوڵەت بە دەرگیربوون دەگەڵ کرێکارانی کانگا ژێر زەوییەکان تووشی یەکێك لە توندو تیژترین تێك هەڵچوونەکان بوو کە لە ماوەی قەیرانی ئابووریی ئەم سەردەمەدا بۆی هاتۆتە پێش.

٧٣٨ 4263- **بەرەوروو بوون دەگەڵ:** هەر هەوڵو کۆششێك کە بۆ رزگار کردنی تاقمە گرفتار بووەکە دەکرا دەگەڵ بەدشانسی‌یەك بەرەوروو دەبوو.

٧٣٩ 5592- **بەرەوروو بوون دەگەڵ:** کاتێك کە ئاخرین جار دەمانەویست ئیقداماتەکەمان ئەنجام بدەین، راست دەگەڵ ئەم چەشنە دژایەتی‌یانە بەرەوروو بووین.

٧٤٠ 1347- **بەرەوروو بوون دەگەڵ:** ئەوە یەکەم جار نیە کە ویستو داخوازی ئەو ژنە دەگەڵ دژایەتیی ویستو داخوازی مێردەکەی بەرەوروو دەبێ (= ویستو داخوازیان یەك ناگرنەوە).

٧٤١ 439- **بەرەوروو بوون دەگەڵ (دژایەتی‌یەك):** ئەم کۆبوونەوەیە دەبێ هێندێك چاودێریی کامران بکا- دەگەڵ دژایەتیی هێندێك کەس بەرەوروو بووە.

٧٤٢ 4262- **بەرەوروو بوون دەگەڵ:** دەگەڵ بەرگرییەکی (مەرقاوەمەتێکی) سەرسەختانە بەرەوروو بوون.

← تووش بوون، دەرگیر بوون، بەگژ داهاتن.

٧٤٣ 1398- **بەرەوروو کردن:** کاتێك کابرای تاوانبار دەگەڵ دە دوازدە کەس شایەد بەرەوروو کرا، تێکرووخاو هەموو شتێکی درکاند.

٧٤٤ 758- **بەرەوروو کردن دەگەڵ:** کارکردن لە کۆمەڵێکی پێکهاتوو لە رەگەزە جۆراو جۆرەکان دەگەڵ دیاردەی دەمارگرژیو نەحاوانەوە دەگەڵ یەکتر بەرەورووی کردبوو.

٧٤٥ 745- **بەرەوروو کردن دەگەڵ:** خزمەت کردنی لە وڵاتێکی پەرەنەستێن دا دەگەڵ گیروگرفتی خەڵکی هەژار بەرەو رووی کردبوو.

بەرەورووی یەك بوونەوە ← ململانە.

بەرەو زیاد بوون رۆیشتن ← (کەم کەم) بەرزبوونەوە.

بەرەوژوور رۆیشتن ← وەسەرکەوتن.

بەرەو شتێك هاتن ← هاتن بەرەو...

بەرەو کزبوون رۆیشتن ← زەعیف بوون، کەم بوونەوە، دابەزین.

٧٤٦ 2135- **بەرەو لاواز بوون رۆیشتن:** رقەبەریی توندوتیژ لەلایەن وڵاتانی ئاسیایی‌یەوە بوو بە هۆی ئەوە کە سەنعەتی قوماش دروست کردن بەرەو لاواز بوون بروا.

٧٤٧ 2967- **بەرەو لاوازی رۆیشتن، بێ‌هێزتر بوون، خراپتربوون:** لە شێوەی قسەکردنی هێندێك لە خەڵك، پیاو دێتەسەر ئەم باوەڕە کە لە ماوەی پەنجا ساڵی رابردوودا وەزعی ئەو وڵاتە هەروا بەرەو خراپتر بوون رۆیشتوە.

٧٤٨ 4107- **(خێرا) بەرەو لایەك چوون بە مەبەستی هەڵاتن):** گوتی: چیدی ناتوانم گوێ بۆ ئەو قسە قۆڕانە راگرم. خێرا بەرەو دەرگاکە چوو (کە هەڵێ).

٧٤٩ 1179- **بەرەو وشکانی هاتنە پێش:** لەسەر تاشە بەردەکان زۆر راوەستن، ئاوی دەریا زۆر بە خێرایی هەڵدەستێو بەرەو وشکانی دێو، بۆی هەیە بکەونە گەمارۆی ئاوەوە.

بەرەو یەکـانی ڕۆیشتن ← ڕاست ڕۆیشتن یان هەڵفڕین.
بەرهەڵدان ← (بێ‌سزادان) ئازاد کردن، تووڕهەڵدان.
بەرهەم هێنان، بێ‌ڕاوەستان ← درێژەدان بە.
بەرێوەچوون ← هەڵوەشانەوە.

٧٥٠ 5875- **بەرهەڵیخ کردن یان بۆ کردن:** گۆمبایەکی تونـد دەتوانێ ئەو خانووە وێران بکا. ناچارین بەرهەڵیخی بۆ دروست بکەین.

بەرێ‌چوون (بە هەرجۆرێك بێ) ← سەری خۆ ڕاگرتن.
بەرێوەچوون ← ئەنجام دران، هاتنەکایەوە، گرتنەوە، پابەند بوون.

٧٥١ 4056- **بەرێزەوە چاو لێکردن، ڕێز لێگرتن:** ئـەو هێشـتاش یەکێك لە ئەندامانی پایەبەرزی ڕێبەرایەتیی ڕێکخراوەکەی ناوچەی خۆیان بوو، بۆ خاتری ئەوە کە ئەزموونێکی زۆری لە شەڕی دەریاییدا هەبوو، هەموو کەس بەرێزەوە چاویان لێدەکرد.

٧٥٢ 1338- **بەڕێ کران بۆ بەرەی جەنگ:** هەموو ئەداروکاتەکەمان دەبێ بە یەك قەتار بۆ بەرەی جەنگ بەرێ بکرێ.

٧٥٣ 2513- **بەرێکردن (بە پۆستە، رادیو ...):** دەبێ خێرا تێلێگرامێکی بۆ بەرێکەین.

٧٥٤ 7068- **بەرێکردن، گەیاندن، دان بە، ناردن، گرتنەوە:** ماتۆرێکی تایبەتی بۆ هەموو بەشەکانی کارخانە کارەبا بەرێ دەکا.

٧٥٥ 5723- **بەرێکردن (بۆ مەبەستێك):** ئەمساڵ قوتابخانەکەمان ژمارەیەك لە کوڕە گەورەکان بۆ دەورەی... بەرێ دەکاتەدەرێ.

٧٥٦ 4391- **بەرێکردن، ناردن:** بە یادداشتێکەوە بۆ نەخۆشخانەیەکی باشم بەرێکردن. * کاتێك منداڵەکان لە درگای ماڵی چیایان داو داوای پێنییەك پوولیان کرد، بە دڵ شکاوی بەرێی کردنەوە.

٧٥٧ 2052- **بەرێکردن هەتا ...، دەگەڵ چوون هەتا ...:** وەزیری کاروباری دەرەوە هەتا نزیك فڕۆکەکە دەگەڵ بالوێزی چوو/ هەتا نزیك فڕۆکەکە بالوێزی بەرێ کرد.

٧٥٨ 5720- **بەرێکردن، بەدرەقە کردن:** کاتێك کە دەرزیشت بۆ ئەمریکا زۆر جوانیان بەرێ کرد/ بەدرەقەیەکی جوانیان لێ‌کرد.

٧٥٩ 5682- **بەرێکردن، بەدرەقە کردن:** هێندێك لە دۆستو لایەنگرانی هاتبوونە فڕۆکەخانە بۆ ئەوەی بەرێی کەن.

٧٦٠ 5684- **بەرێ کردن هەتا دەرەوەی ماڵێ:** 'خانمی جونز هەتا دەرەوەی ماڵێ (دەگەڵت دێو) بەرێت دەکا.'

بەرێ کردن ← ناردن، بە پۆست دا پووڵ بەرێکردن، ناردن (بۆ بەرەی شەڕ)، لە پێش دا ناردن.
بەرێ کردنەوە ← (لە ڕێگای بانکەوە) ناردنەوە بە ڕێكوپێکی ڕاگرتن ← ڕاگرتن بە ڕێكو پێکی.
بە ڕێگادا ڕۆیشتن ← هەنگاو هەڵێنانەوە.
بە ڕێگای باش دا بردن ← باش، یان خراپ، دەست پێکردن.

٧٦١ 1828- **بە ڕێگای خۆدا گەڕانەوە:** لە نێوەڕاستی لێرەوارەکە ڕێویەکمیان لێوون بوو؛ زۆر وێدەچێ بە ڕێگای خۆیدا گەڕابێتەوە.

٧٦٢ 584- **بە ڕێگای فەرعیدا ڕۆیشتن:** وەکو کردوون، دەبێ زۆر پێشتر چووین دە جادەی فەرعییەوە.

٧٦٣ 4359- **بەرین بوونەوە، بڵاوبوونەوە:** ئەو چۆمە لە نزیك دەریایە لەپڕ بەرین دەبێتەوە.
← بڵاو بوونەوە.

٧٦٤ 3371- **بەرێوەبردن لە دژی، بەرێوەچوون لە دژی، لێنان:** لەو ڕۆژەوە کە بۆ ئاخرین جار حوکمی مەرگ لە دژی کەسێك بەرێوە چووە،ساڵها تێدەپەڕێ. * مارشال مونتوگومری لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە دەبێ هێزێکی یەکجار گەورە کۆ بکرێتەوەو زەربەیەکی مەرگ هێنەر لە دوژمن بدرێ. * ئەمڕۆ خۆت بەسەردا ناسەپێنم (= موزاحیمت نابم)، دەبینم زۆر لەوە گرفتارتری کە گوێ بدەیە گلەییو گازندەکانم.

٧٦٥ 926- **بەرێوەبردن. ئەنجامدان:** زۆر هەڵسو کەوتی بازرگانیی گومان لێکراو لە ڕێگای ستوونی ڕاگەیەندراوەکانی گرنگترین ڕۆژنامەکانی جیهانەوە بەرێوە دەچن.

٧٦٦ 683- **بەرێوە بردنی (یاسا/ قانوون/ ڕێسا)، هێنانەکایەوە:** ئەگەر ئەو ڕێسا نێوخۆییە بەکار نایە هی تازە بێننە کایەوە.

٧٦٧ 928- **بەرێوەبردن، جێبەجێ کردن:** ئەو دەستوورەی بە هێزی زرێهی درابوو شتێکی نامۆ بوو، بەڵام بڕیار وابوو بە تەواوی بەرێوەی بەرم.

٧٦٨ 4958- **بەرێوە بردن:** فشاریان/ گوشاریان بۆ دەوڵەت هێناوە بۆ ئەوەی کە ڕێسای تازەی دراو (پووڵی/ دراوی) بەرێوەبەرێ.

٧٦٩ 6679- **بەرێوەبردن، ئیدارە کردن، کۆنترۆڵ کردن:** بەڕێوەبردنی پۆلێك منداڵی ساوا کارێکی هاسان نیە.

٧٧٠ 3603- **بەرێوەبردن، رێزگرتن لە داب و نەریتێك، مومارەسە کردن:** هەر چەند منداڵەکان هەموو شتێکیان دەربارەی بابە کریسمەس دەزانی، دیسانیش بۆ رێزگرتن لە رێورەسمەکانی کریسمەس تێدەکۆشان.

٧٧١ 5577- **بەرێوەبردن، ئیجرا کردن:** لە سەعاتی ١١ هەموو داستانەکە ئیجرا دەکرێ (وەك نمایش).

٧٧٢ 4633- **بەرێوەبردنی رێو رەسمی سالی نوێ:** جیمی شاند، کە لە بەرێوەبردنی رێو رەسمی سالی نوێدا زۆر کارامەیە، دەگەڵ تیپی موسیقاکەی ئاهەنگی هەلپەرکێ لە شاری... دەگێڕێ.

بەرێوەبردن بە زەبرو زەنگ ← بە ملهوڕی و سەرەرۆیی فەرمانڕەوایی کردن، بەرقەرار کردن، پەیرەوی کردن لە، پێبەند بوون بە، بە ئەنجام گەیاندن.

٧٧٣ 1221- **بەرێوەچوون، سەرگرتن، جێبەجێ بوون:** ژن هێنانی دوستەکەم سەری نەگرت؛ دەزگیرانەکەی لە ئاخرین دەقیقەدا تێکیدا.

٧٧٤ 341- **بەرێوەچوون (ی دادگایەك)، پێراگەیشتن:** مەسەلەی تۆ لە سالۆنی دادگای ژمارە ٣، لە ئاخیری ئەم داڵانە، بەدەستەوەیە/ پێی رادەگەن.

٧٧٥ 5553- **بەرێوەچوون، ئەنجام دران:** پێشبڕکێی پێنج هەزار میتر لە گەرمایەکی بتاوێن دا بەرێوەچوو.

٧٧٦ 1198- **بەرێوەچوون:** کەم بوونەوەی مالیات/ باج لەسەر داهات هەتا مانگی ئاگوست بەرێوە ناچێ.

٧٧٧ 4856- **بەرێوەچوون، بەرێوە بردن (بە زۆرە ملی):** بەربەرەکانیەکە زۆر سەرسەختانە بوو، هێرشەکەش بە کەلك وەرگرتن لە هەموو وەحشیگەرییەك بەرێوە چوو.

٧٧٨ 4735- **بەرێوەچوون، بەرێوەبردن:** سەرەڕای مووقاوەمەتێکی سەرسەختانە، هێرشەکان بە هەموو تواناوە بەرێوە چوون.

٧٧٩ 4451- **بەرێوەچوون، تەواو بوون، کۆتایی هاتن:** خۆپیشاندانەکە چۆن بەرێوە چوو؟

بەرێوە چوون لە دژی ← بە سەردا سەپاندن.

بەرێوە نەچوون ← بەکار نەهاتن.

٧٨٠ 3801- **بەرێی خراپدا بردن، وەسەر کاری خراپ پەراندن، بە لارێدابردن، بەدئەمەل کردن:** بە زمان لووسی و جەززابییەتی رواڵەتی خۆی زۆر کچی فاسید کردبوون.

بە زار داهاتن، بە زیان داهاتن ← گوتن، گوتران، بە زبان گوتن ← لە چوارچێوەی وشان دا بەیان کردن.

بە زیانی کەسێك زانین ← ناسین و لێتێگەیشتن (بە زۆر) پێدان ← بەسەردا سەپاندن.

٧٨١ 2223- **بە زەحمەت گەڕانەوە، وەچنگ هێنانەوە:** دوای چەند جار شکست خواردن، بە هەر جۆرێك بێ توانیان کورسیەکەی خۆیان لە کۆڕی بەرێوەبەریدا وەچنگ بێننەوە.

٧٨٢ 172- **بە زەمانەت ئازاد کردن (هەتا رۆژی دادگا):** پیاوێکی خێرخوا بەندیەکانی بە زەمانەت ئازاد کرد.

بەزەیی بە کەسێك دا هاتن ← زگ بە کەسێك سووتان.

٧٨٣ 1456- **بە زیان نووسران یان تەواو بوون:** دەرەنگ هاتنەکانی بۆ سەر کارێ، لە کاتی هێنانە گۆڕی داخوازەکەی بۆ چوونەسەری پلە و پایەی بە زیانی تەواو بوو.

٧٨٤ 3622- **بە زیانی خۆ بڕیاردان، کار کردن، لەقە لە بەختی خۆدان:** ' ناچمەوە ئەو مەدرەسەی؛ نا، لێی بێزارم، بێزار!' . ' چاو گیانە! لەقە لە بەختی خۆت مەدە، کارێکی باش نیە، هەموو کەس دەبێ هەتا تەمەنی شازدە سالی بچێتە قوتابخانە. ئەتۆش ناچاری بە لەسەرەخۆیی تەحەمولی بکەی و هیچ نەڵێی.'

٧٨٥ 209- **بە زیانی ... بوون، بە پێچەوانەی ... بوون:** چوونیان بۆ نێو "اتحادیه عوفاعی" بە زیانی ئێمە تەواو دەبێ.

٧٨٦ 6869- **بە زیانی ... تەواو بوون:** مارتین خووی بەوە گرتووە کە هەمیشە لەژێر تەئسیری ئەنگیزەی کتوپڕ و بێ راوێژکاری دەگەڵ ئەوانی سەروو کار بکاو، ئەم شێوە کار کردنەش لە شیرکەتێکی کۆنەپەرست دا کە هەموو شتێك بەپێی یاسا و رێسا بەرێوەدەچێ، بە زیانی تەواو دەبێ.

← تەواو بوون بە زیانی کەسێك.

٧٨٧ 7446- **بە زیانی شتێك تەواو بوون، شوێنی خراپ لەسەر شتێك دانان:** نەبوونی سەرمایەگوزاری/ سەرمایەدانان بۆ کڕینی ئامرازی نوێ بۆ کارخانەکان شوێنی خراپی لەسەر چوونە سەری/ زیاد بوونی بەرهەم داناوە.

٧٨٨ 7354- **بە زیانی یان زەرەری کەسێك تەواو بوون:** 'شایەدی دانی ژنی خاوەن ماڵەکە یەکجار زۆر بە زیانی تەواو دەبێ.'

٧٨٩/ 3187- **بە زیانی یان لە دژی (کەسێك یان شتێك) بەدەستەوە بوون:** ژیلوان نەیدەزانی مەئمورانی پۆلیس چ شتێکیان لە دژی ئەو بەدەستەوەیە، بەڵام هەر ئەوەکە پێیوابوو شتێکیان دە دەست دایە بەس بوو بۆ ئەوەی کە شار بەجێ بێڵێ.

٧٩٠/ 4078- **بەزین و لە مەیدان چوونەدەر:** لە کاتی بەرەوروو بوون دەگەڵ رقەبەریی شەریکە گەورەکان، دوکانە چکۆلەکانی دەوروبەری شارەکان دەبەزن و لە مەیدان دەچنە دەر.
← دەست هەڵگرتن لە.

٧٩١/ 2439- **بەسالدا دەرچوون، ساغ دەرچوون:** بەو رواڵەتە بەستەزمانانەوە و بەو لێو بە پێکەنینەوە تەنانەت ئەگەر پیاویش بکوژێ، ساغ بۆی دەردەچێ.

٧٩٢/ 1680- **بەسترانەوەبە، پێوەندی هەبوون بە:** مەسەلەکە هەتا رادەیەکی زۆر بەستراوەتەوە بە وەڵامێکە دەوڵەت دەیداتەوە.
← گرێدران بە، پێوەندی هەبوون بە...؟

٧٩٣/ 3118- **بەسترانەوە بە ...، پێوەندی هەبوون بە:** مانەوەی دەوڵەت بە دەنگ وەرگرتنە حەسابەکەی ئەمشەو بەستراوەتەوە. * ئایندەی ئێمە وەك ئەتەوەیەکی بازرگان بە توانای ئێمە بۆ بەربەرەکانی کردن لە بازارە سەختەکان دا بەستراوەتەوە.

٧٩٤/ 6487- **بەستن، گرتن (ی کونێك):** بۆ ئەوەی نەهێڵین دووکەڵ بێتەژوور، هەواکێشەکانمان بەستن.

٧٩٥/ 6430- **بەستن (بە شریتی) لە:** سەربازەکان پاڵتۆ زەلامەکانیان بە شریتی لە کۆڵەپشتییەکانیان بەستوون.

٧٩٦/ 3720- **بەستن بە قەیتانی و هەلدە:** ژاکێتی مەلەی ئەو کوڕە لە هەردووك لای بەدەنی بە قەیتانی بەستراوەتەوە.
* پۆتینەکانی بە قەیتانی دادەخرێن.

٧٩٧/ 1812- **بەستن، کێشان:** کراس و پانتۆڵی دەبەرکردبوو دەیهەویست دۆخینەکەی ببەستێ.

٧٩٨/ 4394- **بەستن (ساك، جانتا، چەمەدان)، لەنێو ساك یان جانتاناان:** چەند شتورمەکێکی کە هەیبوو لەنێو ساکی ناو رۆیشت.

٧٩٩/ 2354- **بەستن:** لە زستانی سەختی ١٩٤٦دا تەنانەت دەریاش بەستبووی.

٨٠٠/ 6999- **بەستن بە:** فلچەکان زۆر باش ببەستە و بە جوانی هەڵیان گرە.

٨٠١/ 6992- **(خڕ کردنەوە) بەستن، داخستن:** کچەکە دای مووەکانی لە پشت سەری خڕکەنەودو بەشێوەی کلکە کەروێشکی بۆی ببەستن.

٨٠٢/ 7206- **بەستن بە:** دارێکی حەیزەرانیان لە تەنیشت دارە گێلاسەکە دە ئەرزی ڕۆ کردو هەردووکیان بە جەگەنی لێك بەستن.

٨٠٣/ 518- **بەستن (رێگا بۆ جێگایەك):** پۆلیس هەموو ئەو شەقامە لاوەکییانەی کە دەچنەوە سەر جێگای رێ و رەسمەکە بەستووە. *جەگە هاتووە/ کێو جەگەی داوەو رێگای هاتووچۆی ماشێنی بەستووە.

٨٠٤/ 1388- **بەستن (ی رێگا) گرتن (ی رێگا):** خەریکن پارچەیەکی دوو مایلی لە جادەدەی... چاك دەکەنەوە. مەئمورانی پۆلیس جاددە سەریەکەیان بەستووە.
بەستن، بە دیوار کێشان ← گرتن (ی کونێك) .

٨٠٥/ 1447- **بەستن یان گرتنی زارکی بوتری (بە چێوپەمۆو ...):** 'دەزانی چی یە؟ هەتا ئەو کاتەی شەراب بە تەواوی دەگا، گرتنی زارکی بوتریەکان کارێکی خەتەرناکە.

٨٠٦/ 6993- **بەستنەوە:** گژەبایەکی وەها توند هات کە ناچار بووین کاروانە سەفەریەکەمان لە ئەرزی ببەستینەوە بۆ ئەوەی با وەری نەگێڕێ.

٨٠٧/ 6998- **بەستنەوە بە:** پێڵاوەکانی / کەوشەکانی بە لەتکە قەیتانی کون بەستبووە.
بەستنەوە ← هەوسار کردن، دەستۆ باڵ بەستن، زنجیر کردن، کووژاندنەوە.

٨٠٨/ 7533- **بەستن یان داخستن (بە زیپ)، زیپی شتێك کێشان یان داخستن:** کتێبەکانی دە جانتاکەی ناو زیپەکەی داخست.

٨٠٩/ 7490- **بەستەبەندی کردن، تێوە پێچان، دە کاغەزەوە پێچان:** دایکم شەوی کریسمەس دیاری بۆ منداڵەکانی لە کاغەزەوە پێچا.
← قەد کردن.

٨١٠/ 7100- **بەستنی دەست و لاقی کەسێك یان باڵەکانی مریشکێك (بە سەربڕاوی و پاك کراوی بۆ ئەوەی لێنانی/ برژاندنی هاسانتر بێ):** دەستو لاقی دیلەکانیان بەستبوو دە لۆرییەکانیان بەستاوتبوون.

٨١١/ 1446- **بەستنی رێگا، گرتنی دەوری جێگایەك:** هەتا شێرە هەڵاتووەکە دەگرنەوە، سەرانسەری ئەو ناوچەیە دەوری گیراوە.
← رێگای شوێنێك بەستن.

٨١٢/ 4417- بەستەبەندیی کردن: هێندێك بووکــە شووشــەو نەبابی بازیان بەستەبەندی کــرد بــۆ ئــەوەی لــە شــەوی کریــسمس دا بیانبەین بۆ باخچەی منداڵان.

٨١٣/ 1343- بە سزای خۆ گەیشتن، سزای خۆ دیتن: لــە شــانۆکانی قەدیم دا، ئەو بازیگەرەی لە نەخشی ئینســانێکی خــاوەن مولکەو بازرگانێکی زۆر خراپ دا یاری نەکا، سەرەنجام لە پەردەی سێهەم دا دەستی خودا (یــان تــەقدیر) بــە ســزای خۆی دەگەیەنێ.

٨١٤/ 3678- (زاراوەی لاتــی) بــەش کــردن، دەست هــەڵگرتن لـــە، خەڵاس کردن، ویکشان: چیا، دەکرێ لوتفێکمان دەگەڵ بکــەی؟ لە بەیانییەوە خەریکی بە فیتووی ئەو ئاهەنگە لێدەدەی، دەوێکی نێ!.

← بێدەنگ بوون.

٨١٥/ 5385- بــە سلامەتی دەرچــوون لــە: ئایـــا بەلەمەکــەی ئەومندە قایم هەیە کە بتوانێ لە تۆفانەکانی "کەیپ" بــە سلامەت دەرچێ؟

بە ســلامەتیی کەســێك خواردنــەوە ← پــەرداخی خــۆ بــە سلامەتیی کەسێك هەڵێنان/ هەڵگرتن.

٨١٦/ 4589- بــە سنجاغ یــان بــە دەرزیــی لــە ... دان: رەســمی هونەرمەندە خۆشەویستەکانی خەڵك لە سەرەوەی جێگــای کاترین بە سنجاغ لە دیوار درابوون.

بە سووکی چاو لێکردن ← بە کەم گرتن.

بایەخ پێنەدان، کەپۆ لێهەڵقرچاندن.

بەسێتی ← بەسە.

٨١٧/ 6731- بەسەر ئەعسابی خــۆ دا زاڵبــوون، خــۆ کــۆنتــرۆڵ کــردن: خانمی مورفی خۆی کونترۆڵ کردو تێدەکۆشا بیر بکاتەوە...

٨١٨/ 3121- بەســەر بــردن، بــوون لــە جێگایــەك، پــاتۆق: ئــەوێ گوتت دەتهــەوێ چ بکــەی؟ راســتی، لــە کــوێ دەژی؟ * ئەگــەر لــە جیــاتی تۆبــام لــە باشــگای/ یانــەی جــاز لێیدەگەڕام. جێگای هاتووچۆیەکی باشە بۆ خوێندکاران.

بەسەر چاوان دا وەشەرزی کەوتن ← بەرەودەم بەربوونەوە.

بەسەر چوون ← رابردن، تێپەڕین، گوزەران.

٨١٩/ 4666- بەسەر ترسی خۆ دا زاڵبوون، جورئەت وەبــەر خــۆ نــان: سەرەنجام، جراڵد غیرەتی هێنایەوە بەرخۆو گوتی: ' خانمی سالاد، بــە بــڕوای مــن خــانمی داڵــی هیــچ ئــاڵوگۆڕێکی بەسەردانەهاتووە.

٨٢٠/ 1829- بەسەر خــۆیدا قــەد کردنــەوە یــان نووشــتاندنەوە: کــاتێك جێگــا رادەخــەی، دەبــێ لێــواری لای ســەرێی مەلافەکە بەسەر لێفەکان دا قەت کەیەوە.

بەسەر خەڵك دا هێنان ← بە ئەستۆی خەڵك دا هێنان.

٨٢١/ 5120- بەسەردا بارین، کەسێك دە شتێك گرتن: ئــەدەکرا لــە پێراگەیشتنەکە گلەیی و گازندەیەکمان هەبێ، چونکە هەر لەو کاتەوە کە وەژوور کەوتین دە خــواردن و خواردنــەوەیان گرتین.

٨٢٢/ 4465- بەسەردا بلاوبان: کاتێك پۆســتە گرینگــەکانیان دیاری دەکــرد، بــە قــازانجی کارمــەندێکی گــەنج بەســەر خۆشناویان دا بازدا.

٨٢٣/ 4463- بەســەردا بــازدان، لەبــەرچاو نــەگرتن: ئەگــەر بابــەتێك لــێرەدا هەیــە کــە دەبــێ لەبــەر چــاوی بگــرم، ئەرخەیان بە بەسەرێدا باز نادەم.

← لەبەرچاو نەگرتن.

٨٢٤/ 4408- بەســەردابڕین، دەرخــواردەدان: کــابرای فرۆشــیار دەیەویست چەند تەختە مەلافەی تۆزگرتوومــان بەسەردا ببڕێ.

٨٢٥/ 7437- بەســەردابڕین، دەســـل پەســـتاوتن: ئیــدارەی پــەروەردەو فــێرکردن دە منداڵــی چکۆلــەی دیکــەی ژێــر حەوت ساڵی بەسەر ئەو قوتابخانەیەدا بڕیوە.

٨٢٦/ 4089- بەســەردابڕین، حەواڵــەی کەســێکی دیکــە کــردن، بــە ئەستۆی کەسێك دابڕیــن: هــەموو ســاڵێ بــۆ مــاوەی دوو حەوتووان پوورە زڵەخامان بەسەر دادەبڕێ.

← بارکردن، دە ئەستۆ پەستاوتن، باری کەسێك کردن.

بەسەردا تێپەڕین ← بە کەم گرتن.

٨٢٧/ 4446- بەسەردا چوونەوە، ئامادە کردن بۆ، خستنەوە بەرچاو: لە وتارەکەی خۆی بۆ کۆڕی بەڕێوەبەر، سەرۆکی شــیرکەت بەسەر یەك یــەکی رووداوە گرینگــە بازرگانییــەکانی یــەك ساڵی رابردوودا چۆوە.

← پێداچوونەوە، فکر لێکردنەوە.

بەسەردادان ← پێدادان.

بەسەردا رژان ← بۆنیشتن، داپۆشین.

٨٢٨/ 6042- بەســەردا رووخــان، خــواردن، تــووڕە بــوون لـــە: لێیمەپرســە بۆ دیــان دەرمنگ هاتۆتەوە. دەتخــوا (= لێــت تووڕە دەبێ).

٨٢٩/ 535- بەسەردا رووخان، تووڕە بوون: زۆر بــەداخم کــە ئەمڕۆ بەیانی لێت تووڕە بووم.

٨٢٠/ 2281- **بەسەردا رووخان، هەڵچوون (لەپڕ)**: لە پڕ بەسەر مارتین دا رووخاو گوتی: پێت وایە هیچ کەس نازانێ ئەو ماستە بێ‌موو نیە؟
← مەحکووم کردن (بە توندی)، هێرش کردنەسەر (بە قسە یان بە کردەوە)، سەرکۆنە کردن.

٨٢١/ 504- **بەسەر (کەسێک) دا رووخان، زۆر بە توندیی لێ‌تووڕە بوون (و رەخنە گرتن)**: دەبێ خۆی لێ‌لادەم، ئامەوێ بۆ چووکترین شت بەسەرم دا برووخێ.

٨٢٢/ 5476- **بەسەر (کەسێک) دا رووخان**: ئیستانلی تووڕە ببوو، بە توندی بەسەر کوڕەکەی‌دا رووخاو گوتی: 'دوێنێ شەوێ بۆچی وا درەنگ هاتوویەوە؟'.

٨٢٣/ 1600- **بەسەردا زاڵبوون، وەلانان**: هەر ئەندامێکی تازە هەڵبژێراوی شوورای شار سوێند دەخوا تەشریفاتی زیادی ئیداری وەلانێ، بەڵام هیچ کەس هەرگیز سەرنەکەوتووە.

٨٢٤/ 2424- **بەسەردا زاڵبوون، لەسەر رێ‌وەلابردن**: دوای ئەوە کە زیندانیەکان بەرەو دەرەوەی زیندان ٢٠ یارد ئەغەمیان لێدابوو، گەیشتنە دیوارێکی کۆنکرێت کە قووڵ چووبووە خوارێ. لێرە دابوو کە زانیان بۆ لەسەر رێ وەلابردنی ئەو موشکیلەیە هیچیان پێ‌ناکرێ.

٨٢٥/ 5523- **بەسەر (کەسێک) دا زاڵبوون، کەوتنە ژێر تەئسیری...وە**: ئەتۆ رێگا دەدەی ئیحساسات بەسەرت دا زاڵ بێ.

٨٢٦/ 4737- **بەسەردا سەپاندن، بەزۆر پێدان**: خەڵکەکە بە زۆرەملی خواردەمەنی و مەشرووبیان دەدا بە سەربازەکانی رزگاریدەر. *بریا لە داسەپاندنی بیروبڕوای سیاسیی خۆی بەسەر خوێندکاران دا دەستی هەڵدەگرت.

٨٢٧/ 3345- **بەسەردا سەپاندن، لەسەردانان**: دەوڵەت ناوێرێ لەسەر شتی زۆر پێویست وەك نان و شیر مالیات دانێ. * زۆر بە داخم لەوە کە هەر دوا بە دوای ئەخۆشی‌یەکەت ناچاربووم ئەم کارەت بەسەردابسەپێنم، بەڵام هیچ کەسی دیکە نیە کە لێهاتوویی ئەنجامدانی ئەو کارەی هەبێ.

٨٢٨/ 2338- **بەسەردا سەپاندن، پێفرۆشتن**: وڵاتی ئێمە شەڕی نەدەویست، بەڵام ئەو هێزانەی پێویستیان بە ئەوتۆ بەردەرەژی ئێمە هەبوو، شەڕیان بەسەردا سەپاندین.

٨٢٩/ 2337- **بەسەردا سەپاندن، بە زۆرەملی پێسەلماندن**: ناچارین بە وردی بچینەپێش و رێگەی خۆمان بەسەر هەموو لایەك دا نەسەپێنین.

٨٤٠/ 6491- **بەسەردا کەوتن، (بە هەڵکەوت) تووش بوون یان بینینەوە**: کارول بە هەڵکەوت بەسەر خەتێکی تەلیفوون داکەوت و یەك سێری چارپێکەوتنی زۆر بە کەڵکی جێبەجێ کرد.
← (بە هەڵکەوت) تووش بوون،(بە هەڵکەوت) دۆزینەوە.

٨٤١/ 3195- **بەسەردا مانەوە**: یەکی دیکە لە ئوجاق گازەکانم بەسەردا ماوەتەوە. ئەرێ لێم ناکڕی؟
بەسەردا وەرین ← بارین.

٨٤٢/ 1244- **بەسەرداهاتن، بەدواوە بوون، روو تێکردن**: ئەو نارەحەتی‌یەی کە دوای دەمەقاڵە دەگەڵ کامران و ژیلوان رووی تێ‌کرد. شتێك نەبوو بۆی تەحەممول بکرێ.

٨٤٣/ 1280- **بەسەردا هاتن، کارلێکردن**: حاڵەتێکی سەرسەختانەی بەسەردا هات و ئیدی ئامادە نەبوو چیدی خۆی دەگەڵ گەلاڵەکە ماندوو بکا.

٨٤٤/ 1507- **بەسەردا هاتن، تووشی حاڵەتێك بوون**: لەبەر بەدگومانی‌یەکی بەسەرداهات کە لە پێش دا روون نەبووو وردە وردە بە تەواوی روون بووەو پێی‌وابوو بە ئەنقەست دەرمانداویان کردوە.
← گرتن.

٨٤٥/ 3431- **بەسەرداهاتن، بە فکردا هاتن، بە مێشك داهاتن، بەسەپاندن**: لەبیر ئەم فکرە بە مێشکم داهات کە بەقەرا مامۆستاکەم لە مەسەلەکە دەزانم. * ئەو کابرایە هەمیشە دەیەوێ بیروبڕوای خۆی بەسەر خەڵك دابسەپێنێ. بۆیە جێگای خۆیەتی نازناوی موزاحیمی لەسەر دابنرێ.

٨٤٦/ 6328- **بەسەرداهاتن (ی حاڵەتێك)**: هەستێکی خۆ بە زیادی زانین خەریك بوو بەسەری دا دەهات.

٨٤٧/ 3122- **بەسەرداهاتن (ی حاڵەتێك)**: ژیلوان تێدەکۆشا بە چەند قسەی خۆش ئەو حاڵەتە ناخۆشەی بەسەر هاوکارەکانی داهاتبوو وەلابەرێ، بەڵام، قسەکانی تەئسیرێکی ئەوتۆی نەکرد.

٨٤٨/ 2489- **بەسەرداهاتن، چوون دە کەڵیشەی کەسێکەوە، لەسەردان**: ئەماندەزانی بۆچی ئەو منداڵە ئەوەندە دێزەیە؛ دەبێ شتێك چووبێ دەکەڵیشەیەوە.

٨٤٩/ 1246- **بەسەرداهاتن، رووتێکردن**: لەو زستانە سارد و سەختەدا بەدبەختی‌یەکی زۆر رووی تێکردین.

٨٥٠/ 2841- **بەسەرداهاتن (ی وەزعێك، حاڵەتێك)، کەوتنە حاڵەتێکەوە/ وەزعێکەوە**: کاتێك پیرە مارتا مرد، مێردەکەی کەوتە حاڵەتێکی خراپەوە؛ دوای مانگێك ئەویش مرد.

بەسەرداهاتن ← نزیك بوونەوە لە (بە ئەسپایی).
بەسەرداهاتن‌و ڕابردن ← تێپەر کردن.
بەسەردا هاتنەوە ← گەڕانەوە بۆ.

٨٥١/ 1572- **بەسەردا هەڵوەستان، لەسەر زیاد کردن:** ڕاست ئەو کاتەی دەمەویست پێشنیاری کڕینی مەزراکە بێنمە گۆڕێ، کابرایەکی دراوسێ بە پێشنیار کردنی مەبلەغێك کە دەتوانای من دا نەبوو، بەسەر سەوداکەم دا هەڵوەستا.

٨٥٢/ 1232- **( لە کاتی لاواندنەوەی کەسێك دا ) بەسە، بەس بێ، خۆت ناڕەحەت مەکە:** دوای ئەوەکە ژنەکە بۆ ماوەی زیاتر لە سەعاتێك فرمێسکی ڕشتبوو، مێردەکەی زۆر بە لەسەرەخۆیی گوتی: ''بەسە، گیانە! تەحەمولت بێ. خۆ دنیا خراپ نەبووە''.

٨٥٣/ 1596- **بەسە، تەواوی کەن، دەست هەڵگرن، بیبڕنەوە، بیبڕێنەوە، بەسیەتی:** دەست لەو کێشەیە هەڵگرن، مەگەر نابینن دەمەوێ هۆش‌و بیرم بدەمە سەر ئەم کارە؟

٨٥٤/ 4467- **بەسەر شتێك دا چوونەوە، خستنەوەبەرچاو:** بۆ ئەوەی وەبیرتان بێنمەوە، بە کورتی ڕووداوەکانی دوێنێ شەوێ دەخەمەوە بەرچاوتان/ بەسەر ڕووداوەکانی دوێنێ شەوێدا دەچمەوە.

بەسەر کەسێك دا خوێندن ← خۆ هەڵدانەوە.

٨٥٥/ 2127- **بەسەر کەسێك دا کەوتن، تێهەڵکەوتن، پەککرتنەوە، تووشی کەسێك بوون:** بەسەر تاقمێك چادرنشین دا کەوتین کە لە کەنار بیرێك هەڵیان دابوو.

٨٥٦/ 743- **بەسەرکەوتن گەیاندن:** هەر بێتوو بەرەی دووهەم لە باکووری ڕۆژئاوای ئورووپا بکرێتەوە، دەتوانین دەبێ بتوانین شەڕەکە بە ناکامێکی سەرکەوتووانە بگەیەنین.

٨٥٧/ 4141- **بەسەرکەوتن گەیاندن:** بۆچی بە سەرکەوتنمان نەگەیاند؟ خۆشەویستیەکەمان چی بەسەر هات؟

٨٥٨/ 6269- **(لە تاقیکاری) بە سەرکەوتوویی هاتنەدەر:** تەنانەت ئەگەر ئەو ئیحتمالەش لە لێکۆڵینەوەیەکی ورد دا سەرکەوتوو نەبێ، دیسانیش تیئۆریی پاولوف هەروا بە دروستی لە جێگای خۆی دەمێنێتەوە.

٨٥٩/ 1890- **بەسەف کردن، لەسەفێك دا ڕاگرتن، بە خەت کردن:** زیاتر لە هەزار پیاویان لە گۆڕەپانێکی چۆڵ دا بە خەت کردبوو.

← بە خەت بوون.

٨٦٠/ 3725- **(زاراوەی لاتی) بەسەرە نەهامیکی خراپ گەیاندن، لە وەزعییەتێکی خراپ دا بەجێهێشتن:** چاو ئێمەت لە چ وەزعێکی شپرزەو شپرێودا بەجێهێشتووە! ✱ ئەتۆ باش دەزانی کە جارێکی دیکە لە کوێمان بەجێ دێڵێ؟ لە زیندان.

بەسەرەوە خۆ دەناو هاویشتن ← شیرجە لێدان.

٨٦١/ 7025- **بەسەرەوەنان، پێناکردن:** هەرگیز هیچ کەسم نەدیبوو ئاوا یەك لە دوای یەك پەرداخی مەشرووبی بەسەریەوە نێ.

٨٦٢/ 5990- **بەسەرەوەنان، هەڵدان، پێناکردن، خواردنەوە:** پەرداخێك ئاوێکی سەوزو خەستیان دایە دەستی‌و، هەڵیدا (= بە ڕاحەتی خواردیەوە).

← پێدا کردن.

٨٦٣/ 3338- **بەسەری دارێکەوە کردن، هەڵاوەسین:** دوای گەڕانەوەی ڕێژیمی پاشایەتی، سەری کردو مریلیان بە دارێکەوە کرد بۆ تەماشا کردنی خەڵك. ✱ لە کایەی ''شای مێشان'' دا، منداڵان سەری بەرازێکیان بە نێزەیەوە دەکرد.

٨٦٤/ 5046- **بە شاهید گرتن، دەلیل هێنانەوە:** خودای خۆم بە شاهید دەگرم کە ''موکل''ەکەم لەو کاتە دا لە نزیك بیرك نەبووە.

٨٦٥/ 5291- **بەش بۆ دانان لە وەسییەتنامەدا:** هیوادارم مامەیەوە لە وەسییەتنامەکەی‌دا بۆ هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەی بەش دابنێ.

٨٦٦/ 7229- **بەش بۆ دانەنان، (لە میرات) بێبەش کردن:** لە وەسییەتنامەکەدا بۆ دوو خوشکە ڕەبەنەکەی بەشێك دانەندرابوو.

٨٦٧/ 3176- **بەش بە شتێکەوە هەبوون:** لە دامەزراوە ئابووریەکانی ناوچەیی‌دا سەرمایەگوزاری کرابوو، بەپێچەوانەی بازرگانە ئوورووپاییەکانی دیکە، بەشێکی تەواوی بە وڵاتەکەی خۆیەوە هەبوو.

بەشتێکەوەبوون ← گرفتار بوون.
بەشتێکەوە دان ← هەڵاوسین.
بە شتێکەوە نووسان ← کەوتنە سەر.

٨٦٨/ 296- **بەشداربوون، دەست تێدابوون:** زۆر هێزی مەزن لە خولی ئێستای وتووێژەکان دا بەشدارن.

٨٦٩/ 310- **بەشدارکردن، دەگەڵ بوون/ خستن:** زۆربەی کارمەندەکان دەیانەوێ لە تەرحی تازەی مافی تەقاعود/ بازنشستەیی‌دا بەشدار بکرێن ( ئەو تەرحە ئەوانیش بگرێتەوە).

٨٧٠/ 676- **بەشدارکردن، ئاگادارکردن لە:** شوورا هەموو دوکاندارەکانی تووڕە کردبوو چونکە لە گەورە کردنەوەو باشتر کردنی ناوەندی شار ئاگاداری نەکردبوون.

٨٧١/ 5465- **بەشدار کردن، هێنانەنێو، تێکەڵی ... کـردن، پێـی ... هێنانە نێو:** هـەوڵی دەدا ئـەمنیش لـەو کلاوبەرداریـیەدا/ ساختەچێتی‌یەدا بەشدار با.

٨٧٢/ -

٨٧٣/ 4458- **بەشدار کردن، دانەوە بە، گەڕاندنەوە بـۆ:** شـەرکەتە هەوایی‌یەکان سالانە ٧٠ میلیون پوند زیادی دێننەوە کـە لـە ڕێگـای هـەرزان کردنـی بلیت/ بیتاقـەوە بەشـێکی دەدەنەوە بە خەڵك.

٨٧٤/ 2016- **بەشداری کردن، چوونە نێو:** ئەگەر لـە سیاسـەتی ناوچەکەدا بەشداری بکەی، ناتوانی چـاوەڕوانی ئـەوە بـی دەرفەتی ئەوەت هەبێ بە بنەماڵەکەت ڕابگەی.
← چوونە باڵ.

٨٧٥/ 2832- **بەشـداریکردن لـە ...دا:** لـــە زۆر ڕووداوی وەرزشی‌دا بەشداری دەکرد، هەربۆیەش لە هیچ کامیان دا سەرنەکەوت.

٨٧٦/ 4428- **بەشـداریکردن، خۆتێـوەردان:** شـووڕای شــار بڕیاری‌دا لە مەسەلەی دابین کردنی بودجە بۆ نیـستەخری/ حەوزی تازەی مەلە کردن بەشـداری نـەکاو دابـین کردنـی بوودجە بە تەواوەتی بەسـەرمایەگوزارەکان دەسپێرێ.

٨٧٧/ 6663- **بەشداریکردن لە:** یەکیەتی(یە کرێکاری‌یـەکان) بڕیاریان دا بە هەموو شاگرد دوکاندارەکان هوشدار بـدەن کە لە مانگرتنە غەیرە ڕەسمی‌یەکان دا بەشداری نەکەن.

٨٧٨/ 305- **بەشداریکردن لە ...دا:** لە پێشبڕکێی سـەد میـترو ''پرش ارتفاع''دا بەشدارم/ بەشداریم کردووە.

٨٧٩/ 5945- **بەشداریکردن لە تاقیکاری‌دا:** حـەوتووی ڕابـردوو تاقمێك لەوانەی پۆلی شەشیان تەواو کردبوو بۆ بەشـداری کردن لە تاقیکاری‌دا هاتبوون.

٨٨٠/ 4426- **بەشـداریکردن لـە ...دا:** تیمـەیان بـۆ بەشـداری کردن لە هەفتەبازارە چکۆلەکەیان بانگ بانگ کرد.
بەشداری نەکردن (لە بڕیاردان دا) ← خۆ کێشانەوە.
بەشداری نەکردن ( لە کۆبوونەوەیەك دا) ← نـەچوون بـۆ جێگایەك.

٨٨١/ 3737- **بەش کردن، تەواو نـەبوون، بنـە نـەهاتن:** تـا ئـەو کاتەی تەقەمەنیمان تەواو نەبووە، دەتوانین ئەم سـەنگەرە بپارێزین. ✱ دەبێ بەنزینەکەمان هەتا گوندەکـەی دیکـە بەش بکا.

٨٨٢/ 2942- **بەش کردن:** ژنـە خانەخۆیەکـە نـەیدەزانی چ بکا، چونکە ئەوەندەی نانو چێشت نەبوو کە بەشـی ئـەو هەمووە میوانانە بکا.

٨٨٢/ 7513- **بە شکست خـواردوو زانـین یـان دانـان:** دەگـەڵ هـەر کەسێك قسـەت کردبا، ئەو ''ازدواج''ەی هەر لە پێـش دا بە شکست خواردوو دەزانی.

٨٨٤/ 7151- **بە شکڵی ... دەرهێنان (موو)، کـردن (موو) بـە:** قـاتی سەرتی بە شێوەی کاتی کردووە بە دیـوی منـداڵو دیـوی خەوتن. ✱ (وودمـی) جادووەکـە وەك بـۆقو مشـکەکانی کردەوە بە ئینسـان.

٨٨٥/ 5844- **بە شکڵی شتێك دەرهێنان:** قـورە سـووری لەسـەر چوارچێوە بە تێل تەنراوەکە دەشـێلنو دوایـە بـە شـکڵی حەیوانێك دەری دێنن.

٨٨٦/ 2983- **بە شۆقو زەوقەوە کار کردن، بە دڵـەوە کـار کـردن:** لـە پێوەندی دەگەڵ هۆدەی/ وەتـاغی نـالێن بـە دڵـەوە کـار دەکا. پێش هەموو شـتێك دڵـی پێویسـتیی بـە پـەردە هەیە.

٨٨٧/ 206- **بە شوێن ... گەڕان، بە دوای کەسـێکەوە بـوون:** هێشـتا لەو کابرایە دەگەڕێن کە دوێنێ شەوێ دوکانەکەتی بڕیوە.

٨٨٨/ 5748- **بەشەڕدان، تێك بەردان:** ڕەقیبەری لەسـەر خـۆش ویـستنی ژنێك، زۆر جار دوو دۆسـتان بەشەڕ دەدا.
← تێك بەردان.

٨٨٩/ 3753- **بەشـەڕهاتن دەگـەڵ، بـەگژداهاتن، مل دەبـەر ملـی کەسێك نان:** بە دەستەکەی تـری کـە ئـازاد بـوو لێی‌چـووە پێشو ملی دەبەر ملی نا. ✱ نامەوێ بە هۆی ئەوە کە لە ئەخۆشخانە دەریان کردووی بەگژیان دابێی؟

٨٩٠/ 6472- **بەشەڕ هاتن دەگەڵ، بەربەرەکانیی کـردن دەگـەڵ:** بـۆ ئـەوەی کەشـتی‌یەکە بگەڕێننـە لەنگەرگایـەکی بــاش، مەلەوانـەکان دەگـەڵ تۆفـانو هەسـتانی ئـاوی دەریایـە بەربەرەکانیان دەکرد.
بە شەق فڕێدانەخوار ← تێهەڵدانو فڕێدانە خوار.

٨٩١/ 5582- **بەشی شتێك کردن، تێ‌بوون، توانـای شـتێك هـەبوون:** بوودجەکە بەشی شامپاینیش ناکا. ✱ بەداخەوە نـاتوانین ئەمیرکوندیشن بۆ هەموو هۆدەکان دابنێین.
← دابین کردن.

٨٩٢/ 53- **بەشێك بوون (لە)، سـەر بـە ... بـوون:** ئـەو زانکۆیـە سەر بە زانـستگەی لەندەنە.

٨٩٣/ 3009- **بەشێك لە شتێك بـوون، پێکـەوە هـاتن، دەگـەڵ یـەك هاتن:** کاتێك زانیمان کە بـاخێکی گـەورەی پـڕ شـاخیش دەگەڵ خانووبەرەکەیە زۆر خۆشحاڵ بووین. ✱ وا نیە کـە هەژاریو جینایەت هەمیشـە پێکەوە بێن. دەوڵەمـەندیش جینایەتکار دەبن.

٨٩٤/ 2345- **بەشێك لە شتێك پێك هێنــان، كـردن بـە بەشـێك لـە:** باسـەكە لەسەر ئەوەیـە كـە ئایـا ئـەو دیپارتمانـە ببێتـە بەشێك لە زانكۆی هونەرەكان یان نا.

٨٩٥/ 4460- **بەشینەوە، دابـەش كـردن (بـە سـەخاوەتەوە):** هەر كات لـە یارییـەكانی ئەسـپ سـواریدا دەیباتـەوە، بەسەخاوەتەوە دەسـت دەكا بە بەشینەوەی سیغارو بیرەی.

← دابەش كردن.

٨٩٦/ 1249- **بەشـێوەی رەسمـی هاتنـە نێـو كۆمەڵـەوە:** خوشـكی گەورەم لە وەرزی ئـاینده دا لـە میوانییـان دا بەشـداری دەكا.

٨٩٧/ 1430- **بەشـێوەی یارمـەتیی دان بـە، بـۆ یارمـەتییدان بـە:** دراوێكـی یـەكجار زۆر لەلایـەن كۆمـــەڵانی خەڵكـــەوە بەشـێوەی یارمـــەتی درابـــە ســـندوقی لێقـــەوماوانی بەنگلادێش.

٨٩٨/ 5855- **بەشـێوەیەكی مولایـم داكشـان بـەرەوخوار:** لـــێرەوە شاخە سپییەكان بەشێوەیەكی مولایـم هـەتا سـەر لێـوی دەریا دادەكێشن.

٨٩٩/ 28- **بەشێوەیەكی نالەبار جوولانـەوە:** كـەمێك پەریشـان دیاری، یارەكەت نارەحـــەتی كـردووی؟/ ناحـەز دەگـەڵت جوولاوەتەوە؟

بە فشە گرتن ← گاڵتە پێكردن، بە گاڵتە گرتـن، جیـددی نەگرتن.

بە فكردا هاتن ← بەسەردا هاتن.

بە فكری كەسێك نەگەیشتن ← بە خەیاڵدا نەهاتن.

٩٠٠/ 1638- **بە فكر گەیشتن، بە فكردا هاتن:** بە دڵیان دا هـات كە رەنگە بكەونە گەمارۆی هەستانی ناوی دەریاوە.

٩٠١/ 6063- **بە فووی كووژاندنەوە. سەركوت كـردن:** شـەمەكانی/ مۆمەكانی سەر مێزە درێژەكەیان (بە فووی) كووژاندەوە.

٩٠٢/ 2987- **بـەفیڕۆدان، خەســار كـردن، خەســار بــوون:** چـۆن دەتوانی رێگا بدەی ئەو هـەمووە خواردەمەنییـە خەسـار بێ لە حاڵێك دا ئەو هەمووە خەڵكە برسییە لە جیهان دا هەن.

٩٠٣/ 2361- **بە فیڕۆدان، بەهـەدەردان، بـە خۆرایـی لـە دەست دان:** نەمدەویسـت لەسـەر شـتهایەكی بـە فـیڕۆی بدەیـن كـە پێویسـتمان نین.

٩٠٤/ 1036- **بـەفیڕۆدان، شەخسـیەتی خـۆ زایـە كـردن بـە:** زۆر نەفامی كردووە كە كەسایەتیی خۆی لەسەر دۆستایەتیی دەگەڵ ئەو ژنە زایە كردووە.

← بە فیڕۆدان، (بە) هەرزان فرۆشتن.

٩٠٥/ 1035- **بەفیڕۆدان، لەدەسـت دان (بـەخۆرایی):** لـەو سـەرو بەندە دا، پووڵو پارەكەی بە فیڕۆ دەدا زۆر كەسی دەگـەڵ بوو، بەڵام كـاتێك نـابووت بـوو كـەمتر كەسـێك هـەبوو دەستی بگرێ.

٩٠٦/ 6929- **بە فیڕۆدان، هەدەردان، بەخۆرایی لەدەسـتدان:** باش فكری لـێ بكەوە. نیمكـانی هەیـە پاشـەكەوتەكانت بـە كڕینی سەهامێك بە فیڕۆ بدەی كە بۆیان هەیە دوای چەند سـاڵێك بایەخێكیان نەمێنێ.

← لە دەست دان، پارەی خۆ بە فیڕۆدان، خواردن.

٩٠٧/ 6562- **بـە فـیزو نیفـادەوە هاتنـەژوور یـان وەژوور كـەوتن:** پیتێر بە فیزو نیفادەوە وەژوور كەوت.

٩٠٨/ 3087- **بە فیزو هەوابوون، خۆ هەڵنانـەوە:** "بریـا دایكـم لە پێوەندیی دەگـەڵ ئـەو سـەركەوتنە چكۆلـەی ژیلوانـی ئەوەندەش بەفیزو هەوا نەبوویا.

بەفیزەوە رەفتار كردن.

← ژێست گرتن، وەدەركـەوتن، یـا چوونـەدەر (بـە فـیزو نیفادەوە)، سەر هەڵێنان (بە لەخۆبایی بوونەوە).

٩٠٩/ 3080- **بە فێڵو تەڵەكە لێئەستاندن، لێدەرهێنـان، لـە چنـگ دەرهێنان:** كابرای ساختەچی بە فێڵو تەڵەكە هەرچی پووڵی كابرای بوو لێی ئەستاند.

٩١٠/ 543- **بە فێڵو تەڵەكە خۆ رزگار كردن/ خۆ لە شـتێك دزینـەوە/ كێشانەوە:** ژنەكە رووی لە ئەفسەرەكان كـردو گوتـی: ئـەو كابرایە دەیەوێ بە فێڵو تەڵەكە خۆ لە ژێر بـاری هـەموو شتێك رزگار بكا.

٩١١/ 7081- **بە فێـڵو تەڵەكـە كـارێك بـە كەسـێك كـردن، وەسـەر پەراندن:** بە فێڵو تەڵەكــە واداریـان كـرد بـە كابرایـەكی گەنجو زۆر جوان، بەڵام سەرسەریو جرشێت، مێرد بكا.

٩١٢/ 6037- **بە قاچاخی بردنەدەر:** بۆ ئەو كەسانەی لە كاتی بردنەدەری ئەسكیناس بە قاچاخی لە وڵات دەگیرێن سزای قورس دیاری كراوە.

٩١٣/ 6036- **بـە قاچـاخی هێنـان:** زۆر بـە توندی لەســـەر هەستێن كە "مواد مخدر" بە قاچاخی نەهێنن.

٩١٤/ 7190- **بە قازانج تەواو بوون:** كابرای وەزیر دەیزانی كـە كێشـەی نێوان دوو كەس لـە هاوكـارە پایەبـەرزەكانی بـە قازانجی خۆی تەواو دەبێ.

٩١٥/ 4760- **بـە قـازانج ... تـەواو بـوون، قـازانج كــردن:** ئــەو سێ‌ساڵەی لە زانستگە بوو زۆر بە قازانجی تەواو بوو.

٩١٦/ 6240- **بە قازانج تەواوبوون، بە دەردی شتێك خواردن:** بوون دەگەڵ ئەم تاقمە لە خەڵك زۆر زیاتر لەوە کە دەگەڵ هاواڵە گەنجەکانی بوو بە قازانجی تەواو بوو.

بەفیڕۆدان ← (بە) هەرزان فرۆشتن.

٩١٧/ 4636- **بە قازانجی کەسێك کار کردن:** لە هەڵبژاردنی جاددەیەکی رژدو سەختی کوێستان خۆمان لەوە پاراست کە بە قازانجی دوژمن کار بکەین. (ئەگەر بەوێدا ئەڕۆیشتباین بە قازانجی دوژمن تەواو دەبوو و دەیتوانی زەربەمان لێدا-وەرگێڕ-).

٩١٨/ 4188- **بە قازانجی خۆ کەڵك وەرگرتن لە:** رۆژنامەکان لە قسە "بی ملاحظە"کانی لەسەر تەلەڤیزیۆن بە قازانجی خۆیان کەڵکیان وەرگرتووە.

بەقا کردن بە، بەقا پێکردن ← بڕوا پێکردن.

٩١٩/ 6217- **بە قالبسان دروست کردن:** قەدیم میداڵ/ میدالیایان بە دەستی دروست دەکرد، بەڵام ئێستا بە قالبان سازی دەکەن.

٩٢٠/ 6615- **بە قسەی کەسێك کردن:** بۆ بە قسەی نەکەین و چۆن دڵی رابکەین؟

←گوێدان بە، فەرمان بەڕێوە بردن.

بە قسەی گەوران نەکردن ← بێئەزمیی کردن.

٩٢١/ 3305- **بە قولاپ/ بە گیرە داخستن:** کراسەکەی میوانیانی دەبوو لە پشتەوەڕا بە قولاپی دابخەن، ئەویش لە بەراورد دەگەڵ داخستن بە زیپی کارێکی دژوارە.

بە قووەت بوون ← هەڵدان.

٩٢٢/ 1427- **بە قەباڵ، یان بە مەقتە هەڵگرتن، قونتەرات بەستن دەگەڵ:** بۆ کارەکانی نەجاری لەنێو قەیاغە تازەکان دا دەگەڵ کابرایەکی دارتاش قونتەراتمان بەست (= کارەکەمان بە قەباڵدا بە کابرای دارتاش).

بە قەرز دان ← بە ئەمانەت دان.

بە قەستی کوشتن لێدان ← (زاراوەی لاتی) یەکجار زۆر لێدان.

٩٢٢-١/3965- **بەقین داچوون لە، قین هەڵگرتن لە، بە بوغز داچوون، بوغز هەڵگرتن لە:** کاوە هێندە بازداشت کرابوو کە خەریك بوو دەهاتە سەر ئەو بڕوایە کە مودیری فوورم (دەورەی سەرەتایی) لێی بە قین دا چووە.

٩٢٣/ 2141- **بەکار نەهاتن، بەرێوەنەچوون، لە مۆد کەوتن، کەڵك لێوەرنەگیران، هەڵگیران، نەمان:** ئەو وشانەی کە چیدی بەکار نابرێن، بۆیان هەیە رۆژێکی زیندوو ببنەوە، بە مانایەکی دیکە بەکار ببرێن.

٩٢٤/ 6131- **بەکارهێنان، کەڵك لێوەرگرتن:** سنعەتە دیفاعیو فەزاییەکان، بە هۆی پێشکەوتوویییان لەباری تێکنۆلۆژییەوە، باشترین جێگان بۆ کەڵك وەرگرتن لەو سیستەم/ شێوە کارەی.

← کەڵك لێوەرگرتن.

٩٢٥/ 1875- **بەکارهێنان، کەڵك وەرگرتن لە:** بۆ بەشی زۆری چیرۆکەکانی، لە بیرەوەرییەکانی منداڵییی خۆی کەڵکی وەردەگرت.

٩٢٦/ 99- **بەکارهێنان، بەکار بردن، تێهەڵسوون:** پێش ئەوەی برینەکە بە تەواوی خاوێن دەکەنەوە، پۆمادەکەی تێهەڵدەسوون.

٩٢٧/ 2948- **بەکارهێنان و تەواو کردن، کەڵك لێوەرگرتن و تەواو کردن:** ئایا دەتوێ بڵێی هەموو ئەو پاکەتانەی/ زەرفانەی حەوتووی رابردوو کڕیمانن (بە کارتان هێناونو) تەواوتان کردوون؟

٩٢٨/ 6377- **بەکاری خۆوە نووسان، کاری خۆ کردن:** خۆت بەو کارانەوە خەریك مەکە کە بە راستی لێیان شارەزانی. کاری خۆت بکە.

٩٢٩/ 1183- **بەکاری ... هاتن، بە دەردێك خواردن:** ئەو کورپەڵە کۆنانە فڕێ مەدە؛ رۆژێك بەکارت دێن.

٩٣٠/ 1789- **بەکاری شتێك هاتن، بە دەردی شتێك خواردن، بۆ شتێك بوون:** ئەو خشتانە فڕێ مەدە؛ بە کاری قەفەزەی کتێبەکانم دێن.

٩٣١/ 153- **بە کاری کەسێکی دی دانان/ زانین:** شانۆکانی شکسپیر زۆر جار بە کاری کەسانی دیکە، بەتایبەت بە هی بیکن زانراون.

٩٣٢/ 574- **بەکڕنۆش بردنەبەر میوان، بە پێشوازییەوە چوون:** ژمارەیەکی زۆر لە کارمەندانی پلە نزمی ئیدارە لەبەر دەرگا چاوەڕوان بوون میوانەکان بگەنیو بە کڕنۆش بردنەو ڕێزلێنانەوە بیانهێننە ژوور.

٩٣٣/ 3254- **بەکرێدان، بە ئیجارەدان:** ئەو قەیاغانە بە سەعات بەکرێ دەدرێن.

٩٣٤/ 3874- **بە کرێدان، بەکرێ گرتن، بە ئیجارەدان:** سێ قاتی ئەو خانووبەرەیە دورەی ویکتوریا بەشێوەی جیاجیا بەکرێ چوون. ‌*ئاژانسەکە نایەوێ هۆدەکان جیاجیاو هەریەکەی بە پووڵێکی کەم بەکرێ بدا؛ دەیەوێ کرێگرتەیەك پەیدا بێ هەموو خانووبەرەکەی لێبەکرێ بگرێ.

٩٣٥/ 3884- **بەکرێدان:** ئامرازەکانی کشتوکاڵ بە حەفتە بە کرێ دەدرێن.

٩٣٦/ 3818- **بەکرێگرتنەوە، ئیجارە کردنەوە:** سەرۆکی شیرکەت بە کۆڕی بەڕێوەبەری پێشنیار کرد کە باشترین ڕێگا بۆ وەدەست هێنانی سەرمایە ئەوەیە کە خانووبەرەی نەسلیی شەریکە بە دامەزراوێکی ماڵی بفرۆشن و سەرلەنوێ بەکرێی بگرنەوە.

٩٣٧/ 6523- **بە کورتی گێڕانەوە، کورت کردنەوە، کورتەی باسێک گوتنەوە:** دوای ئەو باسە دوورودرێژە زۆر زەحمەتە بتوانم بابەتەکان بە کورتی بڵێمەوە/ خولاسەیان بکەمەوە.

٩٣٨/ 1797- **بە کوشت دان، فرکردن:** لە ڕۆژی یەکەم دا زۆرمان لێ کوژرا؛ ژێنراڵ بەو گەلاڵەیە کە بۆ هێرش دایناوبوو، هێندەی نەمابوو هەمووومان بە کوشت بدا.
← بەرەو پێشوازی مەرگ ناردن.

٩٣٩/ 4136- **بە کەر زانین، کڵاو لەسەرنان، فێڵ لێکردن:** ئەو چەرچییە کڵاوی لەسەر هەمووومان نا/ هەمووومانی بە کەر زانی. * ئەو کچە هەتا ئێستا کڵاوی لەسەر یەک دوو پیاوان ناوە.
← فریودان.

٩٤٠/ 7243- **(بوغز، قین) بە کەسێک دەرکردن:** ئاواتی ئەوە بوو هەموو ئەو قین و بوغزەی کە لە هاوکارەکانی پێشووی هەیبوو بە جورجی دەرکا. ← پێدەرکردن.
بە کەسێکەوە نووسان ← پێوە نووسان.
بە کەڵەگایی لێ ئەستاندن ← لێ ئەستاندن.

٩٤١/ 1941- **بە کەمترین ڕادەی فرۆکەیشتنی نرخەکان:** داخوا سەهمەکانی خۆت ئەوەندە ڕادەگری کە نرخیان بە کەمترین ڕادەی خۆی بگا؟

٩٤٢/ 6809- **بە کەم گرتن، بە سووکی چاو لێکردن:** خوێندکارانی زانستگە زانیاریان لە هەر ڕادەیەک دابێ، دیسانیش ئەزموونی بە کردەوەیان زۆرە. بۆیە ئەگەر بە کەمیان بگرن نارەحەت دەبن.

٩٤٣/ 4464- **بە کەم گرتن، بایەخ نەدان، بەسەردا تێپەڕین:** ناتوانن ئەو سەرچاوانەی ناکۆکی و چەند بەرەکی بە کەم بگرن و هیوادار بن بۆ خۆیان لەنێو بچن.
← بە هێند نەگرتن، بە گرنگ نەزانین/ دانەنان.

٩٤٤/ 2211- **بە کەیف بوون، وەک گوێزی ئازا بوون، لەسەر حاڵ بوون:** "ژیلوان، زۆر سست و بێحاڵ دیاری". "بێحاڵ نیم، زۆریش بە کەیفم".

٩٤٥/ 5664- **بە کێشە هاتن دەگەڵ، بەشەڕ هاتن دەگەڵ، دەستە و یەخەبوون دەگەڵ:** یەک دوو کەسی چەنەوەڕ لە نێو خەڵکەکەدا دەگەڵ سەرپەرشتەکان بەکێشە هاتن.

← دەمەقاڵە کردن، تێک چوون دەگەڵ کەسێک.

٩٤٦/ 3745- **بە گاڵتە گرتن، بە فشە گرتن، بە فشە بەسەر...دا بازدان، بەفشە خۆ لێبواردن/ خۆ لێ لادان:** ئەوە هەڵەیە کە ناکرێ بە گاڵتە بەسەریدا تێپەڕی. * باشە، دەبێ شتێکت پێ بڵێم کەمتەرخەمیی تۆ بوو بە هۆی ئەوە کە پڕۆژەکە مانگێک وەدوا کەوێ و، ئێستاش مەسەلەکە هەروا بە فشە بگرە!.
بە گرتن دان ← ڕاپۆرت لێدان.

٩٤٧/ 4890- **(لە هەموو شتێک) بە گرنگتر زانین، دانان، پێش هەموو شتێک دانان، وەپێش هەموو شتێک خستن:** دەبێ دروست کردنەوەی شارە رووخاوەکان وەپێش هەموو شتێک بخەین.

٩٤٨/ 6906- **بە گرنگ دانان یان زانین:** بۆی هەبوو کە پیاو لەو پووڵ و پارە زۆر و زەوەندەی کە ڕادەگوێزرا یەکجار زۆر بە گومان بێ، بەڵام هاوکارەکانی بە گرنگیان دانەدەنا.

٩٤٩/ 3742- **بە گرنگ نەزانین، گرنگیی پێنەدان، ترشوکە هاتن بە، جیددی نەگرتن، بەکەم گرتن:** ئەو هیچ گیروگرفتێک بە گرنگ نازانێ، چونکە ئەو گیروگرفتانە دەبنە هۆی هاندانی بۆ تێکۆشانێکی زیاتر. * ئەو بە ڕێنوێنییەکانی دایکی ترشوکەی دێتێ (= پێکەنینی دێ).

٩٥٠/ 6073- **بە گریانەوە شتێک گێڕانەوە:** لە حاڵێک دا بە گریانەوە بەسەرهاتە دڵتەزێنەکەی دەگێڕایەوە، هەموومان بە هەستی هاودەردیەوە گریمان دابوویە.

٩٥١/ 6040- **بەگژدا هاتن:** هیچ کام لە کارمەندە پایەنزمەکان نەیاندەوێرا نەهێڵن بچێتە نێو پەرژینەکان، بە گژیان دا دەهات.
بە گژدا چوون (ەوە) ← نازایانە دەگەڵ کارێک/ کەسێک بەرەوروو بوون، تێکچوون دەگەڵ کەسێک، دەرگیربوون دەگەڵ.

٩٥٢/ 3219- **بەگژدا هاتن، خراپ پێکردن، قسە لێک هەڵبەزینەوە، قسە پێگوتن:** ئەگەر جارێکی دیکە دەست لە کامێراکەم دەی، خراپت پێ دەکەم.

٩٥٣/ 3485- **بە گژدا هاتن، بەرەوروو بوون دەگەڵ:** کاتێک وادەهاتەبەرچاو کە لایەنی ویرجینیای گرتووە، ژنەکەی بەگژی داهات.
← بەشەر هاتن، لە زەوقی کەسێک دان.
بە گژ یەکداچوون ← قسە لێک هەڵبەزینەوە، دەست پێکردن (بەشەڕ).

٩٥٤/ 5794- **به گورج و گۆلی دەست بەکار کردن، چوونە سەرکار، هەلکوتانە سەر خواردنێ:** گورج و گۆڵ بۆ ئەنجام دانی کارەکانی ماڵێ دەست بەکار بووە. ●بە جووت هەڵیانکوتایە سەر خواردنی کولیچەی گۆشت بەرازەکەو هەر زوو هەڵیان هاویشت.

٩٥٥/ 3734- **بە گوریسی بەستن، گوریس پێچ کردن:** چادرێکی گەورەیان بەسەر گیشە/ قوزی‌یەك دا دابوو و شریت پێچیان کردبوو بۆ ئەوەی بانەیبا.

٩٥٦/ 6196- **بە گوشین لێهێنانەدەر، لێهێنان:** ئەم لیمۆیە وشك دیارە؛ بەڵام رەنگە بتوانی چەند دڵۆپێکی لێبێنی.

٩٥٧/ 3144- **بە گومان بوون لە، دڕدۆنگ بوون لە:** ئەوانە هەمیشە لە جورج بە گومان بوون.

٩٥٨/ 1833- **بە گومان بوون لە، پێولەبوون:** کاری سەرمایەدانانەکە لە بناخەوە خراپ دەستی پێکرد. پێمان وانەبوو باش بچێتەپێش.

٩٥٩/ 6534- **بە گومان بوون لە:** ئێمە لەو کابرایەی بەگومانین کە سندوقی پارەکەی هەلگرتبێ.
← دوو دڵ بوون.

٩٦٠/ 7221- **بە گومان نەکردن، نەبوونە هۆی بەگومان بوونی...:** هەبوونی هێزە هێرشکەرەکان لەسەر سنوور، بۆ ماوەی چەند مانگان نەبوو بە هۆی بەدگومانیی هیچ کەس/ کەسی بەدگومان نەکردبوو.

٩٦١/ 2038- **بەگوێرەی پێویست رەفتار کردن:** هەتا ئەو کاتەی لە مانای راستەو دروستی کریسمەس نەگەیشتبوو، جورج نەیدەتوانی بە گوێرەی پێویست دەگەڵ کریسمەس رەفتار بکا.

٩٦٢/ 3609- **بەگوێرەی توانایی ... کار کردن، وەکار خستن:** ئەمڕۆ دەبێ لە سەرپەرستاری ئەو نەخۆشخانەیە ئەرخەیان بێ کە هەموو سیستەرەکان/ پەرستارەکان بە گوێرەی تواناییان وەکار دەخا.
به گوێدا خوێندن ← بردن دەمێشکی کەسێکەوە.
به گوێرەی ← بەلەبەرچاو گرتنی.
← بەگوێی خەڵك گەیشتن، بڵاوبوونەوە.

٩٦٣/ 6773- **بە گەرمی پێشوازی لێکردن، خۆشەویستی نیشاندان:** کاتێك کاندیدای (= پالێوراوی) لیبراڵەکان دەربارەی گیروگرفتەکانی ناوچەکە دەستی بە قسان کرد، ئەویش بە زمانێك کە جووتیارەکان تێی دەگەیشتن، جووتیارەکان بە گەرمی پێشوازیان لێکرد/ خۆشیان ویست.

به گەردی کەسێك نەگەیشتن ← لە پلەیەکی خوارتر بوون.
بە گێچ گرتن ← گەچ لێدان.

٩٦٤/ 6208- **بەلادا هاتن، قۆزتدان:** بە هۆی شەپلە لێدان، بێ ئەوەی بزانی بۆ کوێ دەچی، هەروا قۆزتی دەبرد.

٩٦٥/ 7441- **بەلادا هاتن:** جان پەیدا بوو لە حاڵێك دا سواری دووچەرخەیەکی کۆنە ببوو و هەروا بەلادادەهات.

٩٦٦/ 1728- **بە لاڕێدا بردنی زەینی کەسێك:** کاتێك قوتابی بووین، بۆ بەلاڕێدا بردنی زەینی مامۆستای مێژوومان، زۆرمان فێڵ دەزانی.
بە لاڕێدا بردن (ی ژنێك) ← کەڵکی خراپ وەرگرتن لە.
بە لاڕێدا بردن ← بە رێی خراپ دا بردن.

٩٦٧/ 3630- **بە لاقی فڕێدان:** نەعلەکانی بە لاقی توورهەڵداو خۆی هەڵاویشتە سەر تەختەکەی.
بە لایەك دا خوار بوونەوە ← لاسەنگ بوون.

٩٦٨/ 6107- **بەڵگەی حاشا هەڵنەگربوون بۆ:** 'زۆربەیان لەو کچانە بوون کە لەباری ئەخلاقی‌یەوە بێ‌خەوشن. هەموو مێردیان هەبوو'. 'ئەوە بۆ مێردەکانیان بەڵگەی‌حاشا هەڵنەگرە'.

٩٦٩/ 1140- **بەڵگەی زەمانەت:** کاتێك ئەو دەزگایە دەکڕی، ئەگەر بێتوو ئەو وردەکاری‌یانە (وەك رێکەوت، ناو، ئادرێس) کەمپێرپستن، نەیاندەی، کاتێك دەزگاکەت شکا هیچ بەڵگەیەکی زەمانەتت بەدەستەوە نابێ.

٩٧٠/ 5925- **بەڵگەی فڕۆشی ... واژۆ/ ئیمزا کردن:** یەکێك لە بەرپرسانی پایە بەرز بە نوێنەرایەتیی شیرکەتەکە بەڵگەی تەحویل دانی شەش (فەرووەند) فڕۆکەی واژۆ کرد.

٩٧١/ 7010- **بەلۆسەدای چکۆلە) هەڵێنان، بلیند کردن:** زۆربەی تێئاتر سینەماکان جۆرە کورسیەکیان هەیە کە بە لۆسەیەکی چکۆلە بلیند دەکرێن.

٩٧٢/ 2299- **بە لووزەو هاتن:** لەو کاتەوە کە داوای یارمەتی لە خەڵك لەسەر رادیۆ بڵاو بووە، یارمەتیەکان بە لووزەو دێن.

٩٧٣/ 7448- **بە لەسەرەخۆیی دەست بۆ کارێك بردن:** هەتا ئەو دێی‌و بەو هەموو لەسەرەخۆییەوە داوای چوونەسەری یارمەتیەکەی دەکا، زۆر درەنگ دەبێ.

٩٧٤/ 1955- **بەلەم، لۆتکە:** لەسەرانسەری ناوچەی دیلتای نێجیر بەلەمە دارەکان گرنگترین ئامرازی هەڵگرتنی خەڵکو بارن.

٩٧٥/ 3476- **بەلەبەرچاوگرتنی، بەگوێرەی، بەپێی:** بەگوێرەی شایەدیی ئەو پسپۆڕانە، کابرای مردوو هەتا سەعاتی ٣ زیندوو بووە.

٩٧٦/ 5195- **بەلێکدانەوە بە ئاکامێک گەیشتن:** ئەفسەرانی پۆلیس بە لێکدانەوە بەم ئاکامە گەیشتن کە ئەگەر پیاوەکان سواری قەتاری نیوەڕۆیە بووبن، دەزگیر کردنیان لە تێرمینال کارێکی هاسان دەبێ.

بە لێشاو بەسەردا ڕژان ← هاتن .

٩٧٧/ 501- **(بە نووسراوە) بەڵێنیدان (بۆ حازر بوونەوە لە دادگادا):** پاش پێداچوونەوە بە دۆسیەی کابرای تاوانبارکراودا، بەڵێنییەکی شەش مانگەیان لێوەرگرت.

٩٨٠/ 6552- **بەڵێنیدان، بڕیاردان بۆ دەست هەڵگرتن لە کارێک:** "نا، سیغاری ناکێشم. لەسەر ڕێنوێنیی دوکتور بڕیارم داوە نەکێشم".

← سوێندخواردن.

بە مانای... بوون ← بریتی بوون لە.

٩٨١/ 4708- **بە دەست لە شتێک دان، بە دەستان شتێک داگرتن:** ئەرێ بۆ ئەوەی ئەزموی خۆی بسەلمێنێ دەبێ هەموو جارێ بە دەستان میزەکەی داگرێ؟.

٩٨٢/ 3448- **بە دەست لێدان، هەڕەشە لێکردن بە شتێکی تووک تیژەوە:** هەروا بە دەستی چەپ (بە دەستان) لێی دە... ● بەو قامکەت هەڕەشەم لێمەکە. دادگاییم ناکەی ئەتۆش دادستان نی!

بە مل دا هاتن ← چوونەژێر بارێ...

٩٨٣/ 5504- **بە ملهوڕیو سەروەریی فەرمانڕەوایی کردن، بە توندوتیژی بەڕێوەبردن:** ئەو ژنە دایرەکەی چۆن بەڕێوەدەبا؟ بەوپەڕی توندوتیژییەوە.

بە مەختە هەڵگرتن ← بە قەباڵ، یان بە مەختە هەڵگرتن.

٩٨٤/ 3381- **بە مەرەکەب نووسین، مەرەکەب لێدان، بە مەرەکەب بەسەردا هاتنەوە:** ڕەسمەکەت جوانتر دەبوو ئەگەر بێتوو بە مەرەکەب لایەنی چەپی ناشەکەت ڕەش کردبایەوە، یان هێندێک دەوەنو کێوی دوورت لێزیاد کردبا.

بە مەزات دانان ← هەراج کردن.

بە مەسرەف گەیاندن ← تەواو کردن.

٩٨٥/ 6458- **بە مەودایەکی دیاریکراوو دوور لە یەکتر ڕاوەستان:** کابرای ئەفسەر سەربازەکانی لەپانایی زەوییەک داو بە مەودایەکی دیاریکراوو دوور لەیەکتر ڕاگرتن/ دامەزراندن.

٩٨٦/ 1193- **بە میرات پێگەیشتن:** دوای مردنی مامی دراوێکی زۆری بە میرات پێگەیشت.

← دران بە.

٩٨٧/ 4249- **بە مێرد دان، مێرد کردن:** کاتێک ئاخرین کچی بەرەزایەتەوە بە مێرد بدا، دەتوانێ خەیاڵی ئاسوودە بێ.

٩٨٨/ 6093- بە میزان کردنو ڕێکو پێک کردنی ماتۆڕی ماشینێک، کارەکەی باشتر کردن (= باشتر وەگەڕ خستن).

بە مێشک ئەسپاردن ← لەبەر کردن.

بە مێشک دا هاتن ← بەسەرداهاتن، بە دڵدا هاتن.

٩٨٩/ 1896- **بە مێشک دا نەهاتن:** لەو تەمەنە (١٥ ساڵان)دا هیچ دایکو باوکێک بە حورمەتی ئەوە کە سەربە توێژی مام ناوەندین بە مێشکیان دا نایە کە ڕێگا بدەن کوڕەکەیان دەست لە خوێندن هەڵگرێ.

←لە فکری، یان لەبیری، شتێک دا نەبوون.

٩٩٠/ 4745- **بە ناچاری بازار بەجێهێشتن، بێکرپیار مانەوە:** ئەگەر نرخەکەی کەمێک نەهێنییە خوارێ، ناچار دەبێ بازار بەجێبێڵێ/ لەبازار بڕوێ.

٩٩١/ 1745- **بە ناحەز لەقەڵەمدان، خۆش نەهاتن لە:** پێش وتووێژەکە، خۆشناو ڕیشی تاشی، چونکە دەیزانی خاوەن کارەکەخۆشی لە مووی دەموچاو نایە.

٩٩٢/ 2994- **بە ناوی ... ناسران، خۆ وەک ... ناساندن:** یەکێک لە دزەکان خۆی وەک کڕیارێکی بەوەجی شتومەکی عەنتیکە ناساندبوو.

٩٩٣/ 91- **بە ناوێک وەڵامدانەوە، پێگوتران:** پەرە بزنێکیان هەبوو کە بەناوی سێڵی وەڵامی دەداوە/ پێیان دەگوت سێڵی (= بۆگەنیو- وەرگێڕ-).

بە نەسیب بوون ← پێگەیشتن.

بە نۆبە کارێک ئەنجام دان ← نۆبە کردن.

بە نۆتێل هەڵێنان ← بلیند (ونەوی) کردن

بە نۆبە دانان ← پێشگری کردن لە.

٩٩٤/ 6915- **بە ناو ...دا تێپەڕبوون یان ڕۆیشتن← ڕێگای خۆ کردنەوە بە نێو ...دا:** لە حاڵێک دا سەگەکەم بەدواوە بوو، ڕێگای خۆم بە نێو حەشیمەتەکەدا کردەوە/ بەنێو خەڵکەکەدا تێپەڕ بووم.

٩٩٥/ 39- **بە واتای ... بوون، بە مانای ... بوون:** واتای قسەکانت ئەوەیە کە یارمەتیت بە کوژرانی پیرێژنەکە داوە.

← بریتی بوون لە.

۹۹۶/ 727- **بەوپەڕی خۆگەیاندن یان گەیشتن، گەیشتنە یان گەیاندنە ئەوپەڕی خۆی:** کاتێك ڕێبەری یاخی‌یەکان هاتە سەر بەرزەك، "هیجان"ی تەماشاچی‌یەکان بەوپەڕی خۆی گەیشت.

۹۹۶۰۱/ 1299- **بەوپەڕی خۆگەیشتن، گەیشتنە چلە پۆپە:** باسەکەیان شەودرەنگانێکی بەوپەڕی هەلاهەلایە گەیشت.
← بەوپەڕی توندوتیژی گەیشتن، گەیشتنە ئەوپەڕی خۆ.

۹۹۷/ 7195- **بەوجۆرە هاتن، هاتنە پێش:** لە باکوور (ی بریتانیا) مایەوە بەم هیوایە کە گرشایشێك/ فەرحانیەك لە سەنعەتی قوماش سازکردن دا بێتەپێش.

۹۹۸/ 7169- **بەوجۆرەی کە (دوایە) دەرکەوت/ دەرکەوت بوو:** بەم جۆرە کە دوایە دەرکەوت، ئەوە مار نەبوون کە ترقاندیانێن.
بە هارات تێ‌کردن ← چاشنی لێدان.
بەهاسانی ← وەك ئاوی خواردنەوەی.

۹۹۹/ 1322- **بە هاواری کەسێکەوە چوون، یارمەتی‌دان بە:** کاتێك کە بریتانیا دووچاری تەنگەو چەڵەمەی ماڵی ببوو، سندووقی نێونەتەوەیی دراو بە هاواری گەیشت/ هاتە یارمەتی‌دانی.
بەهاواری کەسێکەوە نەچوون ← خۆ تێ‌نەگەیاندن.

۱۰۰۰/ 933- **بەهرەمەند بوون لە پشتیوانیی کەسێك:** لە هەڵبژاردنی گشتی لەساڵی ۱۹۷۲دا، وادیاربوو کە ڕقەبەری نیکسۆن لە پشتیوانیی تەواو کەماڵی تۆرەمەی لاو بەهرەمەند بێ.

۱۰۰۱/ 5096- **بەهرەمەند کردن لە مافێك، ماف پێدان:** بەداخەوە ئەم گەواهینامەیە/ شەهادەیە لە مافی وەرگیران (لە زانکۆ) بەهرەمەندت ناکا.

۱۰۰۲/ 4156- **بەهرەوەرگرتن لە ...:** هەتا دەتوانن لە ژیانتان بەهرە وەرگرن- چونکە ژیان پشوودانو سەیرانێکە لە جیهانی تاریکی مردووان دا.
بە هەدەر دان ← بە فیڕۆ دان.

۱۰۰۳/ 443- **بە هەراج فرۆشتن، هەراج کردن:** کۆلێکسیۆنێکی بێ‌وێنە لە دیزەو گۆزەی وڵاتی چین حەوتووی داهاتوو هەراج دەکرێ.

۱۰۰۴/ 2043- **بە هەڵە بردن، لە ڕێ دەرخستن، هەڵفریواندن:** بە هەڵە بردنی پارتیزانی بە ئەزموون بۆ ئەوەی حەشارگەکانیان ئاشکرا بکەن، کارێکی هاسان نیە.

۱۰۰۵/ 7092- **بە هەڵە بردن، دەرکاندن، دۆڕاندن:** شاهیدە کە لە کاتی "استنطاق"/ بازجویی/ پرسیار لێ‌کران دا زۆر خرابی دۆڕاند/ زۆر خراپ شتەکانی دەرکاند.
← وەسەر (هەڵە) پەراندن، هەتڵە کردن، شوێنە ونکە کردن.

۱۰۰۶/ 5524- **بە هەڵە بیروباوەڕێك قبووڵ کردن:** هەرگیز نابێ بە هەڵە بچی‌و ئەم بیروباوەڕە قبووڵ بکەی کە گۆیا نابووت بوون شتێکی گاڵتەیە.

۱۰۰۷/ 372- **بە هەڵە چوون، لە هەڵەدابوون:** داهاتوو ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو تا چ ڕادەیەك لە تێگەیشتن لە نەخۆشی‌یەکە دا بە هەڵە چووە پێش بینی ئەو سەبارەت بە پەرەئەستاندنی بەشی تایبەتی لە سنعەت تا ڕادەیەك هەڵە بوو.

۱۰۰۸/ 1649- **بە هەڵە چوون لە پێوەندیی دەگەڵ کەسێك:** لە پێوەندیی دەگەڵ کامران دا بە هەڵە چووم، چونکە ڕەفتارێکی زۆر پیاوانەی هەیە، بەڵام نە خاوەنی بڕیاری خۆیەتی‌و نە دەتوانێ بیر بکاتەوە.

۱۰۰۹/ 5999- **بە هەڵە چوون:** لە ڕاپۆرتەکەی تۆدا، دەبێ کەسێك بە هەڵە چووبێ. وادێتەبەرچاو کە ناوی... ئەو کچەیان لە قەڵەم خستبێ.

۱۰۱۰/ 3719- **بە هەڵە چوون، ڕێگا ونکردن:** ئەیارە سیاسی‌یەکانمان بەهۆی ئەم باوەڕە چەوتە کە گۆیا ڕادەی پشتیوانیی لە سیاسەتەکانمان کەم بۆتەوە، بە هەڵەدا چوون.

۱۰۱۱/ 6054- **بە هیچ دانەنان، پێ‌هیچ بوون:** نابێ ئەم دەرفەتە/ هەلە بە هیچ دابنێین - بۆی هەیە کە هەلێکی ئەوتۆی دیکەت بۆنەیەتەوە پێش.
← بە هێند نەگرتن.

۱۰۱۲/ 2271- **بە هیچ کوێ یان بە هیچ جێگایەك نەگەیشتن:** ڕەخنەو ئیعترازەکەی بە هیچ کوێ نەگەیشت.
← هەڵوەشانەوە.
بە هیچ کەس نەگوتن ← بڵاونەکردنەوە.

۱۰۱۳/ 1395- **بەهێزتر کردن، تەقویەت کردن:** ئەوشتانەی دەربارەی ئاغای بلاگز پێت گوتم، شکو گومانی بەهێزتر کردووە کە لە ژنەکەی دەدا.
← یارمەتی دان بە.

۱۰۱۴/ 7475- **بەهێزتر کردن، ژمارەی ... بردنە سەر، زیاد کردن:** ڕێکخراوە ناوچەیی‌یەکان تێدەکۆشن ژمارەی لایەنگرانی حیزب پێش لە هەڵبژاردنی گشتی بەرنەسەر.

١٠١٥/ 557- بەهێز كردن: پارەی ئێمــە بـۆ بـەهێزتر كردنـی ڕێژەیە دزێوو بەدناوەكان خەرج كراوە.
← تەقویەت كردن.
١٠١٦/ 2347- بـەهێز كـردن، سـەنگەری قـایم لـــێدروستكردن: بەشەكانی پێشەوەی بـەرەی شـەڕیان بـە دروسـت كردنـی سـەنگەری خۆراگر لە بەرامبەر تـاوری تۆپخانـەدا بـەهێز كردوون.
١٠١٧/ 2683- بـەهێز كـردن: ئەگـەر ئەغومـەنی چاپەمـەنی دەسـەڵاتێكی زیاتری بایە، ئەوڕۆ بە كـەڵكتر دەبـوو. بـۆ بەهێزكردنی هێندێك هەنگاوی تازە پێویستن.
١٠١٨/ 6060- بە هۆی بلوێنی بەفر وەدوا كەوتن، هەڵوەشانەوە: چەند دانە لە یارییەكانی لیگ بە هۆی بەفربارین هەڵوەشانەوە/ وەدواخران.
١٠١٩/ 3434- بە هۆی پیریی و نەخۆشی بەرێكرانـەوە بـۆ وڵاتـی خـۆ: بالوێز بڕیاری دا بێسیمچییە نەخۆشەكەی بەرێكاتەوە بـۆ وڵات.
١٠٢٠/ 152- بـە هـۆی... زانـین، وەرگرتـن... لـە، پێگەیشـتن: بلیمەتیەكەی لە باوكیو سەرسەری بوونەكەی لـە دایكـی وەرگرتووە.
١٠٢١/ 4248- بە هۆی ژن و ژنخوازییەوە بوون بـە ئـەندامی گروهێكـی كۆمەڵایەتی: ئەو لەباری بنەماڵەییەوە خانزادە نـەبوو. لـە ئاكامی مێردكردن بە كوڕە خانزادەیەك بوو بـە ئـەندامی ئەو بنەماڵەیە.
١٠٢٢/ 7514- بە هێندنەگرتن، بە كـەم دانـان، گرنگیـی پێنـەدان، وەلانان، خەتبەسەرداكێشان، بایەخێك بـۆ دانـەنان، بـە هیـچ دانـان: چونكە پیاوێكی ناسایی و دوورە پەرێزە، ناكرێ بایەخێكی بۆ دانەنێن/ خەتی بەسەردا بكێشن.
← بایەخ دانەنان بۆ.
١٠٢٣/ 6053- بە هێند نەگرتن، بە هیچ دانەنان، بـایەخ بـۆ دانـەنان: جیا دەڵێ ئەو كارە ساڵانە ٥٠٠ پۆند داهاتمان دەباتە سەر. ئەوە پارەیەكی باشە، بێگومان شتێك نیە كـە بـایەخی بـۆ دانەنرێ.
١٠٢٤/ 705- بەیان كردن، بە ڕوونی: مانای/ واتای ئەو شـیعرە بە جوانی بەیان كرابوو.
١٠٢٥/ 4586- بەیان كردن، تاریف كردن: ئەمـە بەشـێكە، كـە ناتوانم لە چوارچێوەی وشاندا/ بە قسە بەیانی بكەم.
بەیداخ هەڵكردن ← سینگ هێنانە پێش بۆ شەڕ.
بۆ یەك بوون ← موناسب بوون بۆ
بە یەكتر خواردن ← (باش) جێگیر بوون
بە یەكەوە سازان ← نێوان خۆش بوون
١٠٢٦/ 5828- بە یەكەوە ژیان (بە بێ مارەكردن لە یـەكتر): دایـك و بابم شێت دەبن ئەگەر بزانن كچە خۆشەویستەكەیان دەگەڵ شاعیرێكی ڕیش درێژ بە یەكەوە دەژین.
١٠٢٧/ 3971- بەیەكەوە ژیان (ئـەك وەك ژن و مێرد): ئـەو كچـەی كە دوو ساڵ بوو دەگەڵی دەژیا لە پڕ جانتاكـانی بەسـتو ڕۆیشت.
١٠٢٨/ 5811- بــە یەكــەوە مــاڵ پێكــەوە نــان/ ژیــان: ژنــە ئەرتەشییەكان ڕێگایان پێ نەدەدرا دەگەڵ مێردەكانیان لە ماڵێكدا بژین، واتە نەیاندەتوانی بە یەكەوە ماڵ دانێن.
١٠٢٩/ 3948- (لە پێوەندی دەگەڵ ژن و مێردان)، بە یەكـەوە نـەژیان، جیا لە یەكتر ژیان: پاش پێنج ساڵ كێشـەو هـەڵلا، فیلیـپ و ماری بڕیاریان دا جیا لە یەكتر بژین.
بێئەرزیش كردن ← بێبایخ كردن.
بێئەقڵ بوون ← گێلۆكە بوون.
١٠٣٠/ 3014- بێئـەم لاو ئـەو لا، نابـێ قسـەی لێ بكـەی: كـاتێك بێیە ئینگلیستان، بێ ئەم لاو ئەو لا میوانی خۆم دەبی.
بێ ئیعتیبار بوون ← سیقە لە دەست دان.
١٠٣١/ 6861- بێئیعتیبار ڕاگەیاندن: لایەنەكـەی دیكـە پێـی وانیە كە ناچارە ئەم ڕێككەوتننامانە بەڕێوە بـەرێ، بۆیـە هەركات بیەوێ دەتوانێ بێئیعتیباری ڕابگەیەنێ.
١٠٣٢/ 1610- بـێ بـایەخ بـوون، هیـچ/ قسـەیەك/ قرانێـك نـەهێنان: گشت ئەو ئامارانەی دەوڵەت لـە پێوەنـدی دەگـەڵ بردنـە سەری حەقدەستەكاندا بڵاویان دەكاتەوە، بـە لای منـەوە فلسێك ناهێنن.
١٠٣٣/ 245- بێ بایەخ بوون لە ...: بێگومان، ئەو مەسـەلەیە كە پارەی جەمە ئانێكیتر لە كوێوە دابـین دەكـرێ، لـەوە بێبایەختر، كە سەرنجی ئێوە بـۆ لای خـۆی ڕاكێشـێ/ هـەر باسی بكەن.
١٠٣٤/ 4158- بێ بایەخ كردن، بێ ئەرزیش كردن، ئەرزیشی ... لە نێو بردن: ئەو گوزاریشانەی كە لە جێگای ڕووداوەكەوە هـاتن، ڕاگەیەندراوە ڕەسمییەكەیان بێ ئەرزیش كرد.
١٠٣٥/ 5240- بـێ بـایەخ كـردن، كـەم كردنـەوە لـە بـایەخی شـتێك، هێنانە خواری بایەخی ...: پارێزەرێكی/ مەحامییەكی بە توانـا ئیدیعانامەی دادستانی دەكرێ بڵێین بە تەواوی بێ بـایەخ كرد.
بڕیتەوە ← بەسە.

بی‌برنەوە ← بەسە.

١٠٣٦/ 3692- **بێ بناغە بوونی قسەیەك دەرخستن:** شایەدی دانی چاوەروان نەکراوی رێبوارێك بێ بناغە بوونی قسەکانی لاوەکەی دەرخست کە دەیگوت لە کاتی روودانی جینایەتەکەدا لەو نزیکانە نەبووە.

بێبەری کردن ← بێ‌بەش کردن لە میرات.

بێبەری نەکردن ← بەشدار کردن لە میرات.

١٠٣٧/ 3013- **بێ بەش بوون:** میلیۆنەها ئاوارە خواردەمەنی‌یان پێ دەدرا، بەڵام هەزاران کەسیان بێ‌بەش مانەوەو لە برسان مردن.

١٠٣٨/ 6387- **بێبەش بوون، کەم هەبوون، دەستکورت بوون لە:** لەو سەردەمەدا پووڵو پارە کەم بوو، ئەو بنەماڵەیەش لە هەموو ئەو شتانە بێ‌بەش بوو کە دەبنە هۆی راحەتی‌و خۆشیی ژیان.

١٠٣٩/ 1002- **بێبەش بوون پاش کران، لە دەست چوون، پەسان دان:** بە هۆی جریوە جریوی دایکەو بابەی جووچکەڵەکە، پشیلەکە راوەکەی لە دەست چوو.

١٠٤٠/ 1784- **بێبەش کردن، دەست کێشانەوە لە، وەلانان، بێ بەهرە کردن، لەدەستاندن، لێهەستاندنەوە:** کاتێك کە جۆرج لە نێو چینی کرێکاردا دەژیا، سەرەرای ئەوە کە هەوڵی دەدا لە کەسایەتیی خۆی وەك ئەندامێکی دەرەبەگایەتی دەست هەڵگرێ سەر نەدەکەوت،

١٠٤١/ 1682- **بێبەش کردن لە:** مەترسیی ئەوە هەیە کە یاسا تازەکان بەشێکی زۆر لە خەڵك لە سەرەتایی‌ترین (مافی) ئازادی‌یەکان بێ‌بەش بکەن.

١٠٤٢/ 1588- **بێبەش کردن لە میرات، بێبەری کردن:** کابراپیرە لەبەرامبەر کورە گەورەکەی چیدی حەوسەڵەی نەماو دەکرێ بڵێین بێ‌بەری کرد.

← بەش بۆ دانەنان، دەم لە پرووش کردن.

١٠٤٣/ 5555- **بێبەندو باوانە ژیان بەسەر بردن:** لەو رۆژەوە کچەکەی چۆتە زانکۆی هونەرە جوانەکان، زۆر بێ‌بەندو بار دەژی. لیباسی وەك قەرەچیان دەبەردەکاو هەر رۆژەی لە کاتەو ساتێك دا دێتەوە ماڵێ.

١٠٤٤/ 4275- **بێبەهرە مانەوە، بێنەسیب مانەوە:** تەنیا میوانێکی بەرێز دەتوانێ چاوەروانی ئەو چەشنە پێراگەیشتنە بێ‌و تازە ئەویش ئەگەر زۆر خۆی بە زل بزانێ لێی بێ‌نەسیب دەبێ.

١٠٤٥/ 3781- **بێ پێچ‌و پەنا بوون، راست‌و دروست بوون، دڵپاکی بە خەرج دان:** چیا لە کوێ دەیزانی کە خۆشناو لە متمانە پێکردنی ئەو کەڵکی خراپ وەرناگرێ؟ ئەوەندە نەفام بوو کە بە دڵێکی پاکەوە هاتبووە پێش.

١٠٤٦/ 4413- **بێتاقیی کردن، سوێ چوون:** ئەگەر سەرانسەری رۆژێ لە مەزرایە کارت دەکرد، ئێستا بۆ چۆرێك مەشرووبی فێنك سوێت دەچوو.

١٠٤٧/ 7480- **بێتام کردن، لە رادە بردنەدەر، شوو لێهەڵکێشان:** کاتێك دیتم شووی لێهەڵدەکێشێ، لەپڕ بە دڵمدا هات کە هەستمە سەرێ‌و بگورێنم.

← شوو لێ‌هەڵکێشان.

١٠٤٨/ 22- **بێتاوان ناسین:** پاش دادگاییەکی چەند رۆژە "هیات منصفه" کابرایان بێ‌تاوان ناسی (لە پێوەندیی دەگەڵ پیاو کوشتن دا).

١٠٤٩/ 1068- **بێتاوان ناسین:** کابرای کرێکاری قەتار لە هەر چەشنە بەرپرسایەتی‌یەك لە پێوەندی دەگەڵ دەعمی قەتارەکەدا بێ‌تاوان ناسرا ← بێ‌گوناە ناسین.

بێ‌جێ‌بوون ← نابەجێ‌بوون، رێك‌نەکەوتن.

١٠٥٠/ 4085- **بێچارە بوون، پەککەوتن، هیچ بۆ نەکران:** ژیانی ماری بە پێی بەرنامە دەچوە پێش. بێ‌سەعاتەکەی بە تەواوی پەکی دەکەوت.

بێچارە کردن ← زاڵ بوون بەسەردا، ناهومێد کردن.

١٠٥١/ 1836- **بێحاڵ بوون، دڵ لە خۆ بوونەوە، دەبوورەوە چوون:** ناتوانێ لەو گەرما تاقەت پرووکێنەدا خۆراگرێ. بەراستی بێحاڵی دەکا.

بێخود بوون← خەولێکەوتن.

بێ‌دو کێنە ← دەی بیلێ.

١٠٥٢/ 3525- **بێ‌خەبەر راگرتن/ هێشتنەوە، لە تاریکییدا راگرتن:** ئیجازەم بدە پێت بڵێم لە پێوەندی دەگەڵ ئەو مەسەلانەی کە بە ئەندازەی کچەکەم بە منیش مەربووتە، پێم خۆش نیە بێ‌خەبەرم بێڵنەوە (= لە تاریکی‌دا رامگرن).

١٠٥٣/ 6075- **بێدەنگ بوون، ئاقڵ بوون، ئەمین بوون:** هەمووتان بێدەنگ بن؛ هەواڵی گرینگم بۆتان هەیە.

١٠٥٤/ 2099- **(وردە وردە) بێدەنگ بوون:** کاتێك رادیۆیەکی ترانزیستۆری هەڵدەکەی، زۆر زوو دەنگی دێ، بەڵام کاتێك دەی‌کووژێنی‌یەوە، وردە وردە بێدەنگ دەبێ.

١٠٥٥/ 1952- **بێدەنگ بوون، وێکەنان:** ئێستا من بێدەنگ دەبم؛ با یەکی دیکە قسان بکا.

١٠٥٦/ 613- **بێدەنگ بوون، قسەی خۆ تەواو نەکردن، قسەی خۆ برین:** جورج هەستا سەرێ‌و گوتی: "بەڵام لە پێوەندیی

دەگەڵ خۆم..." وەلی کاتێك کریستین لە هۆدەکە وەدەرکەوت قسەکەی بڕی‌و بێدەنگ بوو.

١٠٥٧/ 7147- **بێدەنگ بوون، بەس کردن، وڕەک لێنان، دەست هەڵگرتن:** خۆشناو بێدەنگ بە/ وڕکی نێ، مەگەر نابینی ئەو خەڵکە تۆسقاڵێك ئەو شتانەیان پێخۆش نیە.

١٠٥٨/ 7054- **بێدەنگ بوون:** 'بە هەڵکەوت ناشتیش بووەو دەیەوێ...' لێرەدا بێدەنگ بوو.

١٠٥٩/ 5911- **بێدەنگ بوون، وڕەک نان:** 'بیکە بۆ خاتری خودا بێدەنگی کە؛ هەتا ئێستا بە ئەندازەی پێویست ڕستوویە'.
← دەست کێشانەوە.

١٠٦٠/ 4592- **بێدەنگ بە:** 'ئەرێ هاتووی ماری ببینی؟'، ' نا، بێدەنگ بە کەرە، نابێ هیچ کەس لەم بارەوە شتێك بزانێ'.

١٠٦١/ 7489- **بێدەنگ بە، وەست بە، وڕکی لێ، دەست هەڵگرە:** بێدەنگ بە، بابە، قوڕنی خۆت دەدڕێنی.

١٠٦٢/ 5105- **بێدەنگ کردن، وسکوت کردن:** ئەو منداڵە بێدەنگ کە؛ گوێم لە دەنگی خۆم نابێ.
بێدەنگ کردن (دەنگی موسیقا و...) ← کوژاندنەوە، زار بەستن، داپۆشین (ی دەنگێك بە دەنگێکی بەهێزتر).

١٠٦٣/ 5052- **(بە دانانی قامك لەسەر لێو) بێدەنگ کردن:** هۆگر لە دوایە بوو، لاسای دەنگی ورچی دەکردەوە. ئاوڕم داوەو بە دانانی قامکم لەسەر لێوم بێدەنگم کرد.
بێزار کردن (ی زانستێك) ← باشتر کردن، لێدان.

١٠٦٤/ 5260- **بیر کردنەوە لە، فکر کردنەوە لە:** لەسەر ئاکامە ئیحتمالیەکانی ئەم شێوە لە چالاکیەکان فکری دەکردەوە.

١٠٦٥/ 7363- **بیر کردنەوە لە، فکر کردنەوە لە، هەڵسەنگاندن:** فکری لەوە دەکردەوە کە ئایا لەلای ئێمە بێنێتەوە یان نا.

١٠٦٦/ 4693- **بیر کردنەوە لە، فکر لێ کردنەوە، فکر کردنەوە لە، لە فکری ...دا بوون:** برێژیت لە فکری ئەو شتانە دانەبوو. بەیانەکەی زۆر لەوە جوانتر بوو کە بیر لە گیرو گرفتەکان بکاتەوەو خەمیان بۆ بخوا.

١٠٦٧/ 1377- **بیر کردنەوە لە، هێنانە بەرچاو:** منداڵانی ئەم سەردەمە زەحمەتە بتوانن سەردەمێك بێننە بەرچاویان کە لەودا رادیۆو تەلەفزیۆن نەبوون.

١٠٦٨/ 6893- **بیر کردنەوە لە، فکر کردنەوە لە، لە فکری شتێك دابوون:** هە ئێستا بیرم لە دەچوزم کەوتنی ئالفرێدە پێوە دەکردەوە.

١٠٦٩/ 570- **بیر کردنەوە لە شتێك، سەری خۆ پێوە... ئێشاندن:** ئەوە کە لەوسەری دنیایە چ روو دەدا/ دەقەومێ، بۆ دەبێ سەری خۆتی پێوە بێشینی؟.

١٠٧٠/ 4013- **بیر لە ئاینده کردنەوە:** هەوڵ بدە لە وەزعییەتی ناڵەباری ئێستات دا بیر لە ئاینده بکەیەوە.
← لە فکری شتێك دابوون.

١٠٧١/ 5005- **(بە وردی) بیر لە... کردنەوە:** پێش ئەوە کە وەڵامێکت دەمەوە، ناچارم بە وردی بیری/ فکری لێبکەمەوە.

١٠٧٢/ 1018- **بیر لێکردنەوە:** دەرفەتێکی تەواوت هەبوو کە بیر لە مەسەلەکە بکەیەوە؛ هەر ئێستا وەڵامەکەم لێت دەوێ.
← فکر لێکردنەوە.

١٠٧٣/ 1958- **(زۆر) بیر لێکردنەوە، خۆ پێوە ماندوو کردن، زۆر لەسەر ڕۆیشتن، زۆر لەسەر نووسین:** زۆر بیر کردنەوە لە کەموکوڕیەکان هیچ ئاکامێکی نیە.

١٠٧٤/ 1614- **بیر لێکردنەوەو گنخاندن، کایە کردن بە:** کۆڕی بەڕێوەبەری کارەبا زۆریان لە مەسەلەی دروست کردنی نیزگەیەکی وزە لێرە بیر کردۆتەوەو گنخاندوویانە، بەڵام ئەمن پێم وانیە هیچی لێ‌ساغ بێتەوە.

١٠٧٥/ 1763- **بیر لێنەکردنەوە، فەرامۆش کردن:** "بێگومان دڵم شکاندوون". "قسەی قۆڕ، مەیەڵە ئەم مەسەلە نارەحەتت بکا، فەرامۆشی کە".
← بە خەیاڵدا نەهاتن.

١٠٧٦/ 6109- **بیروبڕوای خۆ دەربڕین، ئەزەری خۆ گوتن و کار بە کاری کەس نەبوون:** ئەمن ئەزەری خۆم دەڵێم‌و کارم بە کەس نیە: پێم وایە ئەتۆ لە مەترسیی بە هاسان گرتنی مەسەلەکان کەوتووی.

١٠٧٧/ 82- **بیروڕا دەربڕین لەسەر، وردە فەرمایش هەبوون لەسەر:** سیرجان مڵۆزمێکی بێ‌ئەملاو ئەولایە. زەحمەتە بابەتێك بێتە گۆڕێ‌و ئەو وردە فەرمایشی لەسەری نەبێ.
بیروڕا گۆڕینەوە دەگەڵ ← پرس کردن بە.

١٠٧٨/ 6115- **بیروڕوانگەی خۆ دەربڕین لەسەر:** ئاغای ئالفرێد، بابەتی دیکەمان لەسەر جێگای ژیانی خوێندکارانە. دەکرێ داواتان لێبکەین لەم بارەوە بیرو روانگەی خۆتان بڵێن/ بفەرموون؟.

١٠٧٩/ 3563- **بیرو هۆشی خۆ خستنە سەر...:** بە زەحمەت دەمتوانی بیرو هۆشی خۆم بخەمە سەر قسەکانی سەرهەنگی.

١٠٨٠/ 2760- **بیرەو بەوێدا گەڕان، چوونە لای ئەمو ئەمو:** ئەتۆ ناتوانی بچی بۆ لای ئەمو ئەمو بڵێی لەلایەن کەسانێکەوە هێرشت کراوەتەسەر کە هەر وجوودیان نیە.

١٠٨١/ 5835- **بیرەوەریی ... لە بیرخۆ بردنەوە یان فەرامۆش کردن، بە فەرامۆشی ئەسپاردن:** هێندەی نەکێشا کە بردیانم بۆ سەربازی‌و ئەمنیش هەموو بیرەوەرییەکانی ناخۆشی قوتابخانەم بۆ هەمیشە بە فەرامۆشی ئەسپارد.

١٠٨٢/ 1844- **بیرەوەرییەکی ناخۆش زیندوو کردنەوە یان هێنانەوەگۆڕێ:** چ شتێك بوو بە هۆی ئەوە کە ئەو بیرەوەرییە تاڵەی ژیانی رابردووی من زیندوو بکەیەوە/ بێنیەوەگۆڕێ؟

١٠٨٣/ 6898- **بیر یان فکر لە رابردوو(ان) کردنەوە، وەبیادی یان وەبیری رابردوو کەوتنەوە:** 'وەبیرت دێ کەنگێ یەکەم جار یەکترمان دی؟'، 'ئەمە بەم لە رابردووی دوور کردنەوەیە'.

١٠٨٤/ 6894- **بیر یان فکر لێکردنەوە:** پێم خۆشە ماڵەکەت لێبکڕم، بەڵام، پێش ئەوەی بڕیار بدەم، دەبێ کەمێك زیاتر بیری لێبکەمەوە.

١٠٨٥/ 217- **بێزار بوون لە، لەبەرچاو کەوتن:** لەو کاتەوە کە زانیومە سیگارو شێرپەنجە پێوەندییان بەیەکەوە هەیە، لە سیگار بێزار بووم.

١٠٨٦/ 5376- **بێزار بوون لە، بێزاریی دەربڕین سەبارەت بە:** رووحم لەو شێوە کار کردنە بێزارە. ئەوەشم بە روونی راگەیاندبوو. ◆ خەڵکی بە رووحم لە بەرامبەر کارکێشان لە منداڵان لە کانگا ژێرزەوییەکاندا بێزاریی خۆیان دەردەبڕی.

١٠٨٧/ 5915- **بێزار بوون لە، بێزهەستان لە؛** دوای چەند حەوتوو کە کارم بۆ کرد لە شێوەی کار کردنەکەی بێزار بووم.
← جاڕز بوون لە.

١٠٨٨/ 1554- **بێزار کردن، بێزهەستاندن:** رەفتاری ریاکارانەی لە بەرامبەر سەرۆکی ئیدارەدا بێزم هەڵدەستێنێ.

١٠٨٩/ 2298- **بێزار کردن، بێزهەستاندن، بێزار بوون:** مەسەلەی پێویست بوونی ''سادرات یان مەرگ'' ئەوەندە بە گوێی خاوەن سەنعەتەکاندا چرپاوە کە ئێستا ئەو مەسەلەگرنگە بۆتە شتێکی بێزراو.
← لە دڵدان، تاراندن.

١٠٩٠/ 4767- **بێزاریی خۆ دەربڕین لە دژی، رەخنە گرتن لە، ئیعتیراز کردن لە دژی:** حەشیمەتێك لە خوێندکارانی زانستگە لە خۆپێشاندانێکدا لە دژی چوونە سەری پارەی ناونووسی ئیعتیرازیان کرد.

بێز هەستاندن ← بێزار کردن.
بێز هەستان لە ← بێزار بوون لە.
بێزهێنەر← پڕوپووچ.
بیستران ← هاتنە گوێ.
بیستن ←گوێ لێ بوون.

١٠٩١/ 1184- **بێ سێ‌ودوو لێ کردن، بێ راوەستان؛** ماری پرسی: نازانم ئیلین ماڵی لە کوێیە؟ و خوشکە پێنج ساڵەکەی هەر بێ مەحتەل بوون وەڵامی دایەوەو گوتی: لە خانووی ژمارە ۲۳ی رۆژگاردوون.

١٠٩٢/ 2118- **بێ سێ‌و دوو لێ کردن قبووڵ کردن:** کابرای خاوەن کاراژ گوتی خاوەنی پێشووی ماشێنەکە زۆر بە پارێزەوە لێی خوڕیوە، ئەمنیش بێ سێ‌و دوو لێکردن قبووڵم کرد.
← (بە خێرایی) قبووڵ کردن.

١٠٩٣/ 2815- **بێ قەیمە بوون، بایەخێکی ئەوتۆ بۆ دانەندران:** کاتێك شەریکە گەورەکەی ... شیرکەتەکەی کڕیەوە، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکەکە بێکار بوون. وەفاداری‌و کۆنەوەرییەکانیان بایەخێکی بۆ دانەندرا.

١٠٩٤/ 3333- **بێکار بوون، دەست بۆ هیچ کارێك نەبردن، دەست لە رەش‌و سپی نەدان:** ژیلوان پیاوێکی یەکجار بە کاربوو، ئەو کەسانەی خۆش نەدەویست کە لە جیاتی ئەوە کارێك بکەن، یان سەرگەرمێکی باش بۆ خۆیان بدۆزنەوە، دەستیان لە رەش‌و سپی نەدەدا.

١٠٩٥/ 3198- **(تەمەڵ‌بوون) بێکاربوون، کارێکی ئەوتۆ نەبوون:** ئەوە هەر لێرەی؟ پێم وابێ وەختێکی زۆرت بەسەرداماوەتەوە (کارێکی ئەوتۆت نەبێ).

١٠٩٦/ 386- **بێکار بوون (بێ شوغڵ بوون):** بۆ بێکاربوونی خۆشی هیچ دەلیلێکی بە دەستەوە نەبوو.

١٠٩٧/ 4307- **بێکار بێکار خولانەوە:** بریا لەو خولانەوەیە دەستی هەڵگرتبا و کارێکی جیددی دەست پێکردبا.

١٠٩٨/ 6011- **بێکار بێکار خولانەوە:** بریا ئەم هەتیوە لەو بێکار بێکار خولانەوەو دەست دەگێڕفان نانە دەستی هەڵدەگرت.

١٠٩٩/ 4286- **بێکار خولانەوە:** شوکور بۆ خوا، ئیدی بێکار بێکار لە ... ناخولێتەوە.

١١٠٠/ 4086- **بێکار دانیشتن، پاڵدانەوە، پاڵبوونەوە:** ئەرێ پێت وانیە کە لە جیاتی ئەوەی بێکار بێکار پاڵدەیەوە، باشترە بێرو بۆ شۆردنی قاپەکان یاریدەیەکم بدەی؟

١١٠١/ 5939- **بێکار دانیشتن:** دیسپلین لە قوتابخانەکان شل بۆتەوە، پیاو دەتوانێ بێکار دابنیشێ‌و گوێ بداتە دەنگۆ یان/ باس‌و خواسان.
← بێکار کردن یان بوون ، وەلانان، دەرکردن (ی کرێکاران لە کاتی کسادیی ئابووریدا)

١١٠٢/ 2076- **بێگوناح ناسین، بێ تاوان ناسین، تەبرئە کردن:** پاش لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژ، سەرەنجام مودیری نێوخۆیی‌یان لە تاوانی کەمتەرخەمی‌و لە هەرچەشنە مەسئولییەتێك لەم بارەوە بێ گوناح ناسی.

١١٠٣/ 6229- **بێ لایەن یان بێ خەیاڵ دانیشتن، دەست لە سەر دەست دانان و هیچ نەکردن:** ناتوانین بێ خەیاڵ دانیشین، لە حاڵێکدا منداڵەکان برسین.

١١٠٤/ 2422- **بێ ... لە کارێکدا سەرکەوتن، بێ ... توانین:** نازانم سەرگوڵ چۆن دەتوانێ بێ یاریدەدەرێك کاروباری ماڵێکی ئاوا گەورە هەڵسووڕێنێ.

١١٠٥/ 1476- **بیمە کردن:** ئایا شەریکەکانی بیمەی کۆمەڵایەتی تێدەکۆشن ژن‌و مێردە لاوەکان وادار بکەن لە بەرامبەر نەخۆشی‌و مەرگدا خۆیان بیمە بکەن.

١١٠٦/ 3402- **بیمە کردن لە بەرامبەر، پاراستن لە بەرامبەر:** هەر پیاوێك دەبێ بۆ خاتری ژن‌و منداڵەکانی لە بەرامبەر مەرگی چاوەڕوان نەکراوو نەخۆشیی درێژخایەندا خۆی بیمە کا. ● دەبێ کارێك بکەن کە لە بەرامبەر هەموو ڕووداوێکی پێشبینی نەکراودا خۆتان بپارێزن.
بێ نسیب مانەوە ←بێ بەهرەمانەوە.
بێ نیاز کردن لە ← ئازاد کردن

١١٠٧/ 3633- **بێ ئەمری کردن، بە قسەی گەورەتر لە خۆ (بەتایبەت دایك‌و باب) نەکردن:** دەگەڵ ئەو پیرە پیاوە (باوکم) نەدەهاتمەوە؟ بە قسەم نەکردو لەو دەمەوە هەتا ئێستا لە شانۆگەری‌و سیرکدا کار دەکەم.
بێ‌وزە بوون ← شەکەت بوون.
بینینەوە ← دۆزینەوە (بە هەڵکەوت)
بێ‌نێو بڕ قسەکردن ← یەك پشوو قسە کردن.
بێزار بوون ←دڵتەنگ بوون.
بێ‌وزە بوون ← شەکەت بوون.

١١٠٨/ 1764- **بێ‌نیاز بوون لە:** ڕەنگە پێت خۆش نەبێ چیدی موحتاجی ئەو بی: بەڵام ماوەیەکی دیکە دەکێشێ بۆ ئەوەی لە یارمەتی‌یەکانی ئەو بێ نیاز بێ.

١١٠٩/ 2131- **بێهۆش بوون، دڵ لە خۆ بوونەوە، خەوێکی قورس لێ کەوتن:** دەرزی‌یەکیان لە کابرای نەخۆش داو دوای ماوەیەکی کورت چووە دەخەوێکی قورسەوە.

١١١٠/ 4462- **بێهۆش بوون، دڵ لە خۆ بوونەوە:** "ئەی هاوار، ئەتۆ مەڵێ دوێنێ شەوێ کابرا دز بووە. ئەگەر بمزانیبا دزە لە ترسان دڵم لە خۆ دەبۆوە."
← لە هۆش چوون، خەو لێکەوتن.

١١١١/ 3789- **( بە زەربە لێدان ) بێهۆش کردن، ناك ئەوت کردن:** یەکێکیانم بە مستێکی بێهۆش کردو قوڕقوڕاچکەی ئەوی دیکەشیانم گرتبوو. ● ئەگەر زوڵمم لێ دەی، خودا دەزانێ بە زەربەیەکی بێهۆشت دەکەم.

١١١٢/ 5021- **بێهۆش کردن:** مۆرێك لەو دەرمانە لە ماوەی چەند چرکەدا بێهۆشت دەکا.

١١١٣/ 5529- **بێ هێز کردن، زەعیف کردن:** ئەگەر سەرانسەری شەوێ چراکان هەڵکەی/ نەکووژێنی‌یەوە، باتری‌یەکەی زەعیف دەکەی.

١١١٤/ 3799- **بێ هێز کردن، بڕست لێبڕین:** نەخۆشیی مالاریا/ گرانەتا بۆ ماوەی چەند حەوتووان بڕستی لێ‌بڕیبووم.
بێ یارمەتیی کەسێك لە عۆدەی کارێك هاتنە دەر ← هەڵ کردن.

١١١٥/ 2568- **پابڕین، دامان، تێمان:** خۆشناو لە قوتابخانە لە کیمیادا زۆر باش بوو، بەڵام کاتێك چوو بۆ زانستگە بە تەواوی تێمابوو.

١١١٦/ 3292- **پابەند بوون، پابەند کردن:** یەکێك لەو بەڵێنی‌یانەی کە دەبێ پابەندی بن ئەوەیە کە لەمەودوا هیچ زیادە خەرجێك لە ئارادا نامێنێ.

١١١٧/ 3578- **پابەند بوون بە، لەبەرچاوگرتن، بەڕێوەچوون:** سەرکەوتنی سەرمایەگوزاری‌یەکەمان پێوەندیی بەمەوە هەبوو کە هەمووومان پابەندی بەرنامەکە بین. ● تێبکۆشە ئەرخەیان بی لەوە کە بەرنامەکە بە وردی بەڕێوە دەچێ یان نا.

١١١٨/ 4587- **پابەند بە وادەو بەڵێنی کردن:** زەحمەتە کەس بتوانێ ئەو کابرایەی پابەند بە وادەو بەڵێنی‌یەکانی بکا. وادیارە لەوە کەیفی ساز دەبێ کە بە هەموو هەوایەکی هەڵپەڕێ.

١١١٩/ 6996- **پابەند کردن بە:** لە ماوەی سەفەری پێش هەڵبژاردندا، کابرای هاوکاری پاڵێوراوە کە/ کاندیداکە بە هیچ چەشنێك نەیدەتوانی پابەندی بەڕێوەبردنی بەرنامەیەکی بکا کە لە پێشدا دایانرشتبوو.

← پاپووش دروست کردن بۆ.
← پیلانگێڕان لە دژی.

١١٢٠/ 1108- پاپۆکە خواردنەوە، خۆ گرۆشم هەڵێنان: مارەکە خزیە ژێر بەردێکەو لەوێدا پاپۆکەی خواردەوە. * لە پەنا کورسی‌یەک هەڵکرووشاو دەستی کرد بە کتێب خوێندنەوە.

١١٢١/ 4837- پاچاندنەوە، کوتانەوە: پێش ئەوەی هەر قەرشێک یان مشەمایەک ڕاخەی، دەبێ هەرچی بزمارە کۆنو پێچە کۆنە بیانپاچێنی‌یەوە.

١١٢٢/ 5378- پاداش دانەوە: کرێکارانی کانگا ژێرزەوی‌یەکان پێیان وایە لە بەرامبەر ئەو کارە خەتەرناکەی دەیکەن، پاداشێکی کەمیان دەدەنەوە.

١١٢٣/ 5224- پاداش دانەوە، قەرەبوو کردنەوە: بۆ ئەو پشتیوانی‌یە وەفادارانەیەتان بە باشترین شێوە پاداشتان دەدرێتەوە.

١١٢٤/ 7493- پاراستن (وەک چاوی خۆ): ئەو ژنە منداڵەکانی لە هەموو چەشنە مەترسی‌یەک دەپارێزێ/ وەک چاوی خۆی دەپارێزێ.

١١٢٥/ 7332- پاراستن: ئاسایشی موسافیرانی ئەو ڕێگایانەی کە بۆ بە بارمتەگران لە بارن دەبێ بپارێزرێ.

١١٢٦/ 5357- پاراستن، هەروا راگرتن: ژێنەراڵەکان هەولیان دەدا کونترۆڵی خۆیان بەسەر شەرە پڕ لە جەوجۆڵەکەدا هەروا ڕاگرن/ بپارێزن.

١١٢٧/ 6777- پاراستن، وەژێر (وەبەن) باڵی خۆدان: بانیوێنەکان دانیشتووی پورتەغال بوونو وادیار بوو کە میرچینتەکانیان (بازرگاکانیان) وەژێر باڵی خۆیان داوە.

١١٢٨/ 5606- پاراستن، راگرتن: جان توانیبووی شتهایەکی زۆر کەم ـی مەعنەوی- دوای تێکچوونی دەگەڵ ژنەکەی بپارێزێو ڕایانگرێ.
← خۆ پاراستن لە، ڕاگرتن لە پلەیەکی بەرزدا.

١١٢٩/ 4766- پاراستن لە: مەتالێکی زرێهی ڕانەندە کە لە هەموو شتێک، بێجگە لە زەربەی ڕاستەوخۆ، دەپارێزێ.

١١٣٠/ 5854- پاراستن لە: میچەکەمان بە خۆڵو بەرد ئەوەندە ئەستوور داپۆشی کە لە ئاوری تۆپخانە بمانپارێزێ.
← بیمە کردن لە بەرامبەر ... دا.

١١٣١/ 1663 - پاراستن لە بەرامبەر، پشتیوانی کردن لە بەرامبەر ...دا: لێرە لە بەرامبەر هێرشی لە نەکاودا زۆر باش دەپارێزرێن. * ئەو یەکیەتی‌یە بۆ ئەوە دروست بووە کە لە بەرامبەر فرۆشیارانی بێوێژداندا لە کرێکاران پشتیوانی بکا.

١١٣٢/ 5856- پاراستن لە بەرامبەر ...دا: زستانان دەبێ چاوتان لە بەرامبەر ئەو تیشکەی کە لە بەفری را دەگەڕێتەوە بپارێزن.

١١٣٣/ 5648- پاراستن لە بەرامبەر ...دا: بۆ ئەوەی لێنزی کامێراکەت لە تیشکی تاوێ بپارێزی سەرپۆشێکی بۆ دانێ.

١١٣٤/ 5609- پاراستن لە بەرامبەر ...دا: دەبێ لە بەرامبەر ناکامی کەرتی‌یەکانی خۆیدا بیپارێزن/ بپارێزرێ.

١١٣٥/ 3572- پاراستن (ی دەسەڵات بە سەر کەسانێکدا): سەرۆک دەیزانی دەسەڵاتی خۆی هەروا بەسەر ئەمیارەکانیدا بپارێزێ، زیاتر بە هۆی بێکارەیی ئەوان هەتا ئیرادەی خۆی.

١١٣٦/ 3605- پاراستن (ی ڕواڵەتی مەسەلەیەک): ئەو کاتی کە کچ بووم، هەموو کەس پاکو پاکداوێن بوون، بەڵام ئێستا، کچ بە واتای ڕاستەقینەی خۆی هەر نەماوەو وەک پەری دەریایی وەچنگ ناکەوێ. بەو حاڵەش، ئەمن هێشتاش بۆ پاراستنی ڕواڵەتی مەسەلەکە لیباسی سپی (وەک دیاری‌یەک بۆ نۆبووکان) دەیاندەمێ.

پارانەوە لە بەر (خودا)،(کەسێک) ← دوعا کردن، دەستەوداوێنی کەسێک بوون.
پارچە پارچە بوون ← لێک بلاوبوون، لەتلەت بوون.

١١٣٧/ 5777- پارسەنگی شتێک ڕاگرتن، لە تەنیشت یەک دانانو هەڵسەنگاندن: ئێوە دەتوانن بە چوونە سەری بارمەتیی مانگانەتان پارسەنگی خەرجەکانتان ڕاگرن. * بەڵێ، جارجار پیاوێکی سەختگیرە. بەڵام ئەمە لە تەنیشت ئەو میهرەبانی‌یە لە ڕادە بەدەری دابنێین کە دەگەڵ بنەماڵەکانی کرد، بەتایبەت لە کاتێکدا کە پێویستیمان بە یارمەتی هەبوو.

١١٣٨/ 3761- پارکینگی کەنار جادە: ماشێنەکەمان لە پارکینگی کەنار جادە پارک کردو نەهارێکی پیکنیکیمان خوارد.

پاروو دە ڕۆنی کەوتن ← بۆنیشتن
پاروو لە زاری خۆ گەورەتر هەڵگرتن ← زیاتر لە توانایی خۆ کارێک وەئەستۆ گرتن

١١٣٩/ 4487- پارە بە شتێک دان، پولێک ... خەرجی ... کردن: پوولێکی/ پارەیەکی باشم بەم دووچەرخەیە داوە. ئیدی ناگات لێیێ.

پاره پەیدا کردن ← پووڵ پەیدا کردن

پاره چوون ← خەرج هەڵگرتن

پارەدان ← (پەنا بە ولیەوە) پووڵ دان، حیساب کردن، پووڵ دان.

پارەدانو رۆیشتن ← پووڵ دانو رۆیشتن.

۱۱۴۰/ 1098- **پارە کۆ کردنەوە لە نێوخۆیا:** هەموو ئەندامانی تیپەکە/ ئورکێسترەکە لە نێوخۆیاندا پارەیان کۆ کردەوە بۆ ئەوەی بە بۆنەی شەستەمین ساڵی لەدایك بوونی رێبەری تیپە موسیقاکەیان گۆچانێکی زێری بۆ بکرن.

۱۱۴۱/ 5653- **(بە زۆرە ملی) پارە لە خەڵك ئەستاندن/ دەرکێشان، وەرگرتن و دەرهێنان:** ئەوەندە بێرەحمە کە تەنانەت لە بێوەژنێکیش هەتا ئاخرین پێنی بە زۆرە ملی دەستێنن.

۱۱۴۲/ 992- **پارە لێوەرگرتن، حیساب کردن، ئەستاندن:** بۆ شوشتنی ماشێن چەندی وەردەگرن/ چەندی دەستێنن.

۱۱۴۲۰۱/3995- **پارەی خۆ لە جۆرە چالاکییەك دا سەرمایەگوزاری کردن کە ئەکرێ بە ئاسانی وەربگیرێتەوە:** بەشی زۆری ئەو دراوەی کە لە ساڵانی پڕ لە قازانجی رابردوو وەچەنگی کەوتبوو لە بەرنامەکانی ئاوەدانکردنەوەو خانوو دروست کردن، سەرمایەگوزاری کردبوو، بۆ دراوی ئەغد ناچار بوو لە بانك قەرز وەرگرێ.

۱۱۴۳/ 4075- **پارەیەکی زۆر لە دەست چوون:** کاوە لەو، ماوەیەدا پارەیەکی زۆری لە دەستدا.

۱۱۴۴/ 4496- **پارەیەکی لە رادەبەدەر دان بە ...:** لە دەستی ئەو هەموو پووڵ دانە بۆ شەهرییەی قوتابخانەو ئونیفۆرم جارز بووە.

۱۱۴۵/ 2894- **پارێز کردن، رێژیم گرتن:** دوکتور پێی گوتووم دەبێ زۆر بە چاکی رێژیم بکرم.

۱۱۴۶/ 3546- **پارێز کردن لە، خۆ پاراستن لە خواردنی/ خواردنەوەی/ کێشانی:** تەنیا رێگای کەم کردنەوەی وەزن ئەوەیە کە دەبێ لە خواردنی چێشتی چەور خۆ بپارێزیو خواردنەوەی مەشروباتی ئەلکولی بە یەکجاری وەلانێی.

۱۱۴۷/ 2727- **پاساودان:** ئەگەر پێویست بێ، دەبێ خەڵك لە کردەوە دزێوەکانی سیاسەتمەداران ئاگادار کەن نەك ئەوە کە پاساویان بدەن.

۱۱۴۸/ 3489- **پاساودان (تەوجیهکردن):** بە پێویست نازانم رەفتاری خۆم دەگەڵ تۆ پاساودەم.

۱۱۴۹/ 4457- **پاسدان، تەحویلدانی شتێك بە کەسێك بۆ رزگاربوون لە دەستی ئەو شتە:** ئەگەر بۆ خۆت ناتوانی ئەو کارە بکەی، تەحویلی ئەو کەسەی بدە کە دەتوانێ (وخۆت رزگار کە).

پاشقوڵدان ← بە دەستەوە نووسان

پاشماوە ← مانەوە (ی بەشێك لە شتێك)

۱۱۵۰/ 6624- **پاشگەز بوونەوە، قسەی خۆ خواردنەوە:** لێم ویستی داوام لێبکەی مێردت پێ بکەم/ بمخوازی، ئەتۆش بە قسەت کردم. ئێستاش ئەگەر پێت خۆشە پاشگەز بەوە.

۱۱۵۱/ 2772- **پاشگەز بوونەوە:** بەڵێنیم پێدای پارەتیت بدەم. باشە، لە بەڵێنیی خۆم پاشگەز نابمەوە.

← پەشیمان بوونەوە لە، لە ژێر قەولی خۆ دان.

۱۱۵۲/ 2225- **پاشەکشە پێکردن، کشاندنەوە:** هەموو هێرشە هەوایییەکان، دوای زەرەرو زیانێکی زۆر پاشەکشەیان پێکرا.

۱۱۵۳/ 478- **پاشەکشە پێکردن، تێکشکاندن:** هەموو هەوڵو تەقەللای دوژمنمان بۆ پێشرەوی تێکشکاند.

۱۱۵۴/ 5322- **پاشەکشە پێکردن، کشاندنەوە، دەرپەراندن:** دوژمن خەتی پێشەوەی بەرەی شەری شکاند بەڵام هێزی سواران/ سوارە نیزام لە بەرزایییەکان پاشەکشەیان پێکرد.

← کشاندنەوە.

۱۱۵۵/ 5252- **(تێك هاویشتن و) پاشەکشە کردن:** دوو ئەرتەشی دیکە بەرپەری نارێکوپێکی/ بە تێك هاویشتنەوە پاشەکشەیان کرد.

۱۱۵۶/ 1080- **پاشەکشە کردن، دان پێداهێنان (بە هەڵەی خۆدا):** کاتێك بە هاتنی شایەدی تازە مسۆگەر بوو کە بە هەڵە داچووە، ناچار بوو پاشەکشە بکاو ئەوە قبووڵ بکا کە بە هەڵە داچووە.

۱۱۵۷/ 1869- **پاشەکشە کردن، کشانەوە:** هەر کە هێزی بە تواناتری خۆمان نیشان دا، دوژمن پاشەکشەی کرد.

۱۱۵۸/ 591- **پاشەکشە کردن بۆ تێکدانی دیفاعی لایەنەکەی دیکە:** سانترهافبەك لە پڕ بۆ پشتی فوورواردەکان پاشەکشەی کرد.

۱۱۵۹/ 4812- **پاشەکشە کردن، کشانەوە، خۆکێشانەوە لە، دەست کێشانەوە لە:** لە نێو گیای راکشابووم و بە بێدەسەڵاتییەوە چاوم لێ بوو کە لە خوارەوەی من دوژمن خەریکە پاشەکشە دەکا.

۱۱۶۰/ 5362- **پاشەکشە کردن (لە ترسی تێکشکان):** ئەو سەنگەرانەی دوژمن پاشەکشەی لێ کردبوون/ بەجێی هێشتبوون، زۆربەیان بە مین چاندرابوون/ مینگوزاری کرابوون.

١١٦١/ 165- **پاشەکشە کردن لە، کشانەوە، (خۆ لێ) دوور کردنەوە:** کاتێك پیاوەکانی پشت باری ریستوران دەستیان بۆ چەك برد، تەماشاچی‌یەکان کشانەوە. * تەنانەت پیاوی زۆر رێکو پێکیش لە رێچارد دووری دەکەن کاتێك پێکەنینە ناحەزەکەی دەبینن.

١١٦٢/ 4791- **پاشەکشە کردن:** گوردانەکە/ فەوجەکە دوو مایل پاشەکشەی کرد و لە سەنگەرە ئامادەکراوەکاندا دامەزرا.

١١٦٣/ 5360- **پاشەکشە کردن بۆ (بە شێوەیەکی رێکو پێك):** بۆ سەنگەرە ئامادە کراوەکانی تەنیشت چۆمی پاشەکشەمان کرد.

١١٦٤/ 5221- **پاشەکشە کردن لە، کشانەوە لە، سازگار نەبوون لەگەڵ، نەهاتنەوە لەگەڵ:** فەوجەکانی پێشەوە لە ترسی ئاوری دوو لایەنەی تۆپخانە خێرا (بەرەو دواوە) کشانەوە. * هەر شتێکی کە ببێتە هۆی ئێشو ئازار دەگەڵ سروشتی ئەو سازگار نیە/ نایەتەوە.

١١٦٥/ 7438- **پاشەکشە کردن لە، کشانەوە لە:** سەربازەکانی ئێمە لەو سەنگەرانە پاشەکشەیان کرد کە بە هۆی تۆپبارانی خەست نەدەکرا بیانپارێزن.

١١٦٦/ 4875- **پاشەکەوت کردن، هەڵگرتن بۆ:** هێندێك پارەم بۆ رۆژی لێقەومان هەڵگرتوە.

١١٦٧/ 3797- **پاشەکەوت کردن، داخستن، زەخیرە کردن، هەڵگرتن بۆ:** ئەمسالیش زستانەکە وەك پار سەخت بێ؛ دەبێ رادەیەکی باش تفاقو خواردەمەنی پاشەکەوت کەین.

١١٦٨/ 6393- **پاشەکەوت کردن، داخستن، زەخیرە کردن:** کاتێك هەواڵی کەمبوونی پرتەقاڵ بڵاو بۆوە، کابانەکان/ کەیبانووەکان دەستیان کرد بە پاشەکەوت کردنی.

١١٦٩/ 6418- **پاشەکەوت کردن:** دایکم ئەوەندەی خواردەمەنی پاشەکەوت کردبوو کە بەشی گەمارۆیەکی درێژخایەن بکا.

١١٧٠/ 4881- **پاشەکەوت کردن، پەس‌ئەنداز کردن:** دەبێ بۆ وەختی بازنشستەییم/ تەقاعود بوونم شتێك پاشەکەوت کەم.

١١٧١/ 4896- **پاشەکەوت کردن، وەلانان:** زۆر چاکە گیانەکەم. کەمێکم پارە پاشەکەوت کردووە.

١١٧٢/ 5610- **پاشەکەوت کردن:** پرسی ئەتۆ بەم تەمەنەت چۆن دەتوانی ئیزدواج بکەی؟
وەڵامم داوە: سەرانسەری ژیانم پوولم بۆ پاشەکەوت کردووە.

١١٧٣/ 6417- **پاشەکەوت کردن، داخستن:** سمۆرە گوێزی لە هێلانەکەیدا پاشەکەوت دەکا/ دادەخا.
← راگرتن (بە دزی)، هەڵگرتن، وەلانان.

١١٧٤/ 167- **پاشەو پاش کشانەوەیان لێفەوڕین:** پاشەو پاش دەکشاوەو، ماشێنە تازەکەی لە داری کارەبای کوتا.

١١٧٥/ 1546- **پاڵی چەووان هیچ ناکری:** گوێ بدە. هەرچی زووتر بزانی دراوەکەت لە دەست داوە باشترە. پاش چەووانیش ئاخ هەڵکێشانی ناوێ.

پاقژ کردن ← خاوێن کردنەوە.

پاك کردنەوە ← کاڵ بوونەوە، لێ‌بوونەوە.

١١٧٦/ 385- **پاك بوونەوە، خاوێن بوونەوە:** باشە پەڵەکە نەماوە (پاك بۆتەوە). بێگومان زۆرتان سرووەتەوە.

پالفتر بوون لە ← بەرزتر بوون لە.

١١٧٧/ 4288- **پاکسازی کردن (ی پاشماوەی هێزەکانی دوژمن):** هێشتا ژمارەیەك لە هێزەکانی دوژمن ماون کە خەریکن پاکسازی‌یان دەکەن.

١١٧٨/ 4507- **پاك کردن، سپی کردن:** چەقۆم پێویست نیە. دەتوانم بە نینۆك سپی کەم.

١١٧٩/ 4841- **پاك کردنەوە:** پاش ئەوەی هەموو شتێکی درکاندبوو، هەستی بەوە دەکرد کە لە هەموو گوناحان پاك بۆتەوە.

١١٨٠/ 1064- **پاك کردنەوە (لە دوژمن):** ئەبەردی نۆرماندی لە رۆژی ١٩ی مانگی ئووت تەواو بوو. لەو رۆژەدا پاشماوەکانی دوژمنمان، کە لە بارێکەی... دەداو کەوتبوون، بە تەواوی پاك کردەوە.

١١٨١/ 7420- **پاك کردنەوە، ئەستڕینەوە، خاوێن کردنەوە:** بە پشتی دەستی ئارەقەی سەربرۆکانی پاك کردەوە/ ئەستڕیوە.

١١٨٢/ 5489- **پاك کردنەوە، ئەستڕینەوە:** پێش ئەوەی مامۆستا بێ، ئەو وشانە لەسەر تەختە رەشە بسترنەوە.

١١٨٣/ 772- **پاك کردنەوە (بە فلچە، برۆس، ماهوت پاك کەر)** ناتوانم ئەو پەڵەیە بە برۆس پاك کەمەوە (= بە برۆس پاك نابێتەوە).

١١٨٤/ 5639- **پاك کردنەوە، لێ کردنەوە (بە شتێکی تیژ) کرانن:** ئەو پەڵە هێلمانە لە شووشەی پەنجەرەکە بکرێنە.

١١٨٥/ 5494- **پاك کردنەوەو رەنگ پێ هەڵێنان:** ئەگەر دەستێك بەو کورسی‌یانە دابێنی‌و رەنگیان پێ‌هەڵێنی، زۆر جوان دەبن.

←له بەین بردن.

١١٨٦/ 5297- **پاك كردنەوە، خاوێن كردنەوە**: بەن سێ و دوو لێ‌كردن ئەم پەڵانە لەو پارچەیە/ قوماشە پاك كەنەوە.

← وەلاتان، لە لیستەی خواردەمەنی دا نەمان، وەلا بردن، نەسترینەوە.

١١٨٧/ 5660- **پاك كردنەوە، شووشتنەوە (بە ئاوو سابوون)**: كاتێك مەرەكەب بەسەر فەرشان دابرژێ، دەبێ زوو خاوێنی بكەنەوە، دەنا دوایە پاك نابێتەوە.

١١٨٨/ 4365- **پاك كردنەوەی زەوییەك لە دارو درەخت، كردنەوەی دەرگای خەیاڵاتو**...: دەوڵەت ناوچەیەكی تازەی بۆ خانوو دروست كردن بۆ جوتیاران پاك كردۆتەوە. • چیرۆكەكانی دەرگای جیهانێكی تازە لە خەیاڵات لەبەرچاوی مرۆڤ دەكەنەوە.

١١٨٩/ 7520- **پاكنووس كردن**: بۆ مەشقی ئەمرۆت ئەو یادداشتانە پاكنووس كەوە كە لە قوتابخانە بە پەلە هەڵت گرتوون.

١١٩٠/ 5483- **پاك بوون خاوێن كردنەوە (بە سووتنەوە)، دامالین**: رەنگی دەستەكانی ئەو كورسییە پاك بۆتەوە (بە سوان). • بۆ لەبەین بردنی ئێشو ئازارەكەت پێویستیت بە دەورمیەك دامالین هەیە.

١١٩١/ 6429- **پالاوتن، چۆڕاندنەوە**: كاتێك كەلەمەكەتان كوڵاند، لە سووزەمیەكدا بی‌پالێون.

پاڵ بە سینگی كەسێكەوە نان ← دەرگا لەسەر كەسێك بە توندی پێوەدانەوە.

پاڵپشت بوون ← لەسەر پشتیوانیی كەسێك، حیساب كردن.

١١٩٢/ 7371- **پاڵ پێوە نان**: خزمەتكارێك میزێكی چكۆلەی چەرخداری كە چاییەكانی لەسەر دانابوو بە پاڵ پێوە نان هێنایە ژوور.

١١٩٣/ 1873- **پاڵ پێوە نان، بەرەوپێش بردن**: هیوادار بوون بەوە كە وەزعی كۆمەڵایەتیی خۆیو بنەماڵەكەی باشتر بكا، بۆ پێشەوە پاڵی پێوەدەنا.

١١٩٤/ 5882- **پاڵ پێوە نان بە بەلەمێكەوە بە دارێكی كە لە لێواری دەریایەی دەدەن، وەرێكەوتن، رۆیشتن**: 'هەموو بە باشی سوار بوون؟ زۆر باشە، پالی پێوە نێ.'

پاڵ پێوە نان ← وەرێكەوتن.

١١٩٤٠١/ 5340- **پاڵدانەوە (بە دەستكەوتی، شانازیی رابردوو)**: پاڵدانەوە بە شانازییەكانی رابردوو كارێكی ژیرانە نیە. دەگەڵ گیروگرفتی زۆر دژوار بەرەو روو دەبێ.

١١٩٥/ 4000- **پاڵدانەوە، تلەوور بوون**: پیاوەكە لەسەر كورسییەكی دەسكدار پاڵی داوەتەوەو، ئەویش (ژنەكە) خەریكی قاپ شووشتنە.

١١٩٦/ 5812- **پاڵدانەوە**: چراكان كز بوون، پەردەكە هەڵكشاو، ئێمەش بۆ ئەوەی كەیف لە شانۆكە وەرگرین، پاڵمان لێ‌داوەتەوە.

١١٩٧/ 3900- **پاڵدانەوە**: لەسەر كورسییەكی/ سەندەلییەكی دەسكدار پاڵی دابووە.

١١٩٨/ 5941- **پاڵدانەوە**: دوای رێ بڕینێكی دوورودرێژ، پەرداخێك مەشرووبت پێ بێ و پاڵی لێ‌بدەیەوەو چاو لە دیمەنی دەرێ بكەی، یەكجار خۆشە.

← بێكار دانیشتن.

١١٩٩/ 3810- **پاڵوێدان، وەك پاڵپشت بوون بۆ**: سەرۆكی ئیدارە لە رۆژەكانی هاتوو نەهاتدا پێی خۆشە زیاتر پاڵ وە ئەندامانی سەرووی ئیدارەكەی بدا. • هەبوونی كەسێك كە بتوانێ بۆ ماوەیەك وەك پاڵپشتی خۆی پاڵی وێدا، ببووە هێزی دڵگەرمییەكەی .

١٢٠٠/ 6065- **پاڵوێكدان، پاڵ بە كەسێكەوە دان**: منداڵەكان لە جێگا تازەكەدا پاڵیان وێكدابوو. • لە تاریكایی سینەمادا كچە پاڵی وە دۆستەكەی دابوو.

١٢٠١/ 1093- **پاڵوێكدان**: سەربازەكان كە بە خەت دەرۆیشتن، ناچار بوون پاڵ وێكدەن بۆ ئەوەی رێگا بدەن كاروانەكە بروا.

١٢٠٢/ 4333- **پاڵ وێكدان و راكشان**: منداڵەكان لە جێگایدا پالیان وێك دابوو و خەویان لێ‌كەوتبوو.

١٢٠٣/ 1548- **پاڵوێكدان (لە جێگادا)**: دووانەكان پالیان وێك دابوو، خەویان لێ‌كەوتبوو.

← جوان دانیشتن.

پاڵەو پەستۆدان دان ← دەر كردن.

١٢٠٤/ 6156- **پان بوونەوە، تلانەوە، قوێن تلەوور كردن، تلیسانەوە**: بریا بتوانیبا منداڵەكان فێركەم لەسەر قەنەفەكان/ مۆبلەكان پان نەبنەوە.

← بێكار دانیشتن، بەربوونەوە نێو.

١٢٠٥/ 6651- **پانسیون كردن، میوان بە پارە راگرتن**: زۆربەی ماڵەكانی دەوروبەری زانستگەكان لە رێگای پانسیۆن كردنی خوێندكاران داهاتی خۆیان دەبەنە سەر.

١٢٠٦/ 5988- **پان كردنەوە**: مووەكانی لاجانگی (لاجانگی) لەسەر بەشی رووتاوەی تۆقی سەری پان كردبۆوە (= پێی داپۆشیبوو).

← شێلان.

١٢٠٧/ 5452- **پان کردنەوە:** کەمێك شارد لەسەر مێزەکە رژکەنو نەنگوتکەکەی لەسەر پان کەنەوە.

پانکردنەوە بۆ ← زمانلووسی کردن بۆ.

١٢٠٨/ 1536- **پانکردنەوەو کوشتن، تێك شکاندن و کوشتن:** هەمیشە مەترسی ئەوە هەیە ژمارەیەك وەبن پێیان کەونو بمرن.

١٢٠٩/ 3042- **پان و فلچ کردنەوە، پێ ڕێنخستن، گوشارا - فشار دان:** رەسەکەی فرێ دا ئەرزیو بۆ نیشاندانی رقی خۆی لە یاری ژنەکەی پێی رێنخست.

پانە پانە کردن لە بەرامبەر← زمان لووسی کردن بۆ.

١٢١٠/ 4210- **(لە قۆماردا) پای چوارەم بوون:** لە ئاغای سیت بپرسە داخوا حازرە وەك پای چوارەم یاری بکا/ ببێتە پای چوارەم.

پچران (= پچکران) ← دڕان.

١٢١١/ 2283- **پتە لێدان، بە قامکی دەست خاوێن کردنەوە:** گارسۆنە ژنەکە بە پتەی ورکە نانەکانی لەسەر مێزەکەی فرێ دار، پەرداخەکانو دەورییەکانی هێنا.

١٢١٢/ 763- **پڕ پڕ بوون لە:** بەشی یەکەم، کە پڕ پڕە لە ناوی جۆراوجۆر، لە بناخەوە مێژوویەکی ڕێکو پێك کراوی زانستییە لەسەر پرۆژەی پلوتونیوم.

← پەنگاو خواردنەوە.

١٢١٣/ 7021- **پڕ پڕ کردن، لیپاو لیپ کردن:** ئیجازە هەیە پێکەکەت بۆ پڕپڕ بکەم؟

١٢١٤/ 3722- **پڕ پڕ لە، ئاخندراو لە، ئوقمی ... بوون:** بەو جۆرەی رەسمە کۆنەکانی ئینگلیسی نیشان دەدەن، مێزێکی ئاخندراو لە خواردەمەنیو مەشرووب بەشێك لە ڕێو رەسمەکانی کریسمسیان بووەو هەیە.

١٢١٥/ 6049- **پڕپانە شتێك، رفاندن و بردن:** کابرایەك لە دەرگایەك دەرپەڕیو جانتاکەی رفاند.

← لوور بوون بۆ، گرتن، رفاندن.

پڕ پێداکردن ← گرتن، هەلکوتانە سەر.

١٢١٦/ 2316- **پردی هەوایی:** لە هەر جێگایەك جاددەی ماشێن بکەوێتە سەر خەتی قەتار، پردی هەوایی یان ڕێگای ژێرزەوی دروست دەکەین.

١٢١٧/
_

١٢١٨/ 2430- **پرتە و بۆلە کردن لەسەر، رەخنە گرتن لە: گرتن،** هەمیشە لەسەر مێردەکەی پرتەو بۆلەیەتی چونکە باخچەکەی خاوێن راناگرێ.

١٢١٩/ 355- **پرتە و بۆلە کردن بەسەر ...دا:** ژنەکەی شەوو ڕۆژ پرتەو بۆلەی لەسەر دەکا بۆ ئەوەی فکرێك بۆ حالی پەرژینەکە بکاتەوە.

١٢٢٠/ 911- **پرتە و بۆلە کردن، بۆلە بۆل کردن:** بۆلە بۆل کردن سەبارەت بە تەمبەلی ئەوان بە خۆرایییە- بڕۆ دەگەل خۆیان قسە بکە.

← بۆلە بۆل (لەسەر) کردن.

١٢٢١/ 640- **پڕ بوون، لێوڕژان:** کورەکان فەرغوونەکەیان وەها پڕ کردبوو کە لێیدەرژا.

١٢٢٢/ 2238- **پڕ بوون:** بە هۆی بارانی قورس، تانکیرەکانی ئاو پڕ ببوون.

١٢٢٣/ 995- **پڕ بوون لە، پڕکردن (لە):** وەزعەکە ئالۆزو پڕ لە ترسو خۆف بوو.

١٢٢٤/ 641- **پڕ بوون لە:** هونەرمەندە لاوەکە پڕپڕ لە ئیدەی نوێ بوو.

١٢٢٥/ 1500- **پڕبوون لە:** لیباسەکانی منداڵە بەرەڵلاکە پڕ بوو لە ئەسپێ. * مەزرا پڕن لە مشکە کوێرەو دەعبای خراپ.

١٢٢٦/ 1490- **پڕ بوون لە، پڕ کردن لە:** ئەو فەرهەنگە پڕە لە زانیاریی سەرانسەری دونیا.

١٢٢٧/ 4393- **پڕ بوون لە، پڕ کردن لە:** بۆ یەکەمین کۆنسێرتی هینوهین، سالۆنی فستیوال لە حەشیمەت پڕ ببوو.

١٢٢٨/ 7369- **(هاتنە سەرو) پڕ بوون لە، بلیندتر بوون:** لە پڕ چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك.

١٢٢٩/ 5250- **پڕ بوون لە بۆنی ناخۆشی ...، بۆنی ناخۆش لێهاتن:** پەنجەرەیەکی بکەوە؛ ژوورەکە پڕ بووە لە بۆنی دووکەڵی سیغاری.

١٢٣٠/ 2- **پڕ بوون لە، هەبوون (لە رادەیەکی زۆردا):** لە سەنعەتە مۆدێرنەکاندا دەرفەتی زۆر هەن بۆ لاوانی بلیمەت. * ئەو زەمانە بۆ قوتابیانی بیانی پڕ لە گیروگرفتە. * ئەو ناوچەیە پڕە لە هەموو چەشنە پەلەوەرێکی کێوی.

پڕ بوون (لە رادە بەدەر) ← لیپاو لیپ بوون، داپۆشران لە ، هەبوون (وەك خۆڵی) بوون.

پڕ بە پێست بوون ← دروان بۆ.

١٢٣١/ 1390- **پرس کردن بە، هاوفکری کردن دەگەل، بیروڕا گۆڕینەوە دەگەل:** پێش دەربڕینی هەر چەشنە بیروبڕوایەك سەبارەت بە گەڕانەوەی ئەندامانی یەکیەتی بۆ سەر کار، ناچارم پرس بە کۆمیتەی بەڕێوەبەری بکەم.

پرووبی کردن ← دم هێنانە پێش.

پڕژاندن ← شێواندن.

**١٢٣٢/ 1418- پرس پێکردن، مشوورەت کردن دەگەڵ:** پێش ئەوەی لە ناو و هەوایەکی یەکجار گەرمی وڵاتێکی وەك کونگو کارێك وەئەستۆ بگری، واباشترە لە پێشدا پرس بە دوکتور بکەی.

**١٢٣٣/ 5103- پرسیار(ی قۆرو بێ مانا) کردن، کایە بە وشە کردن، لاتاو پێدان:** ئەمن لەسەر داواکارییەکەت لە پێوەندی دەگەڵ خەرجی سەفەرەکەتدا قسەیەکم نیە. خەرجەکەت ئەوەندە کەمە کە بایەی/ ئەرزشی ئەوەی نیە لە بارەیەوە پرسیاری قۆڕو بێ مانا بکرێ.

**١٢٣٤/ 5874- پرسیارکردن لەمەو لەو:** پێش ئەوەی بریار بدەی چ ماشێنێکی بکڕی، بە قازانجە لەمەو لەو پرسیار بکەی.

**١٢٣٥/ 3386- پرسیارکردن، کەسێك ویستن:** کاتێك لە دەرێ بووی، کابرایەکی جحێڵ تەلەفوونی کردو ئەتۆی دەویست. ● ئەگەر ئەمڕۆ بەیانی بە کن عەینەك سازەکەدا رابردی، تکایە سەرێکی لێ هەڵێنەو سەبارەت بە عەینەکە تازەکەم پرسیارێکی بکە.

**١٢٣٦/ 3384- پرسیارکردن:** چەند دەقیقە لەمەو پێش خانمێك هاتبوو سەبارەت بە کارەکەری ماڵان پرسیاری دەکرد. پێم‌گوت خۆ ئێمە ئاژانسی کار دیتنەوە نین.

**١٢٣٧/ 5100- پرسیارکردن لە، کەسێ تەکلیف کردن لە:** لەوە ئەرخەیان نیم کە بتوانم بە پاڵپشتی ئەم بەڵگەیە ناڵوگۆرێك لە بەرپرسایەتی‌یەکاندا پێك بێنم. ناچارم لە سەرەوە پرسیار بکەم.

**١٢٣٨/ 3388- پرسیارکردن لە، پرسین لە:** ئەگەر دەتەوێ بۆ سەفەرکردن بۆ تایلەند ویزا وەرگری، پرسیار کردنت لە دۆستەکانی خەڵکی کەس نەکێڵ و بەردە رەقانت کارێکی بێهودەیە. نامەیەکی بۆ سەفیر یان کونسوولی تایلەند بنووسە.

**١٢٣٩/ 7097- پرسین، داوا کردن (ئەم زاراوەیە زیاتر لە رستەی پرسیاری دا بەکار دێ):** دەکرێ بفەرمووی سەعات چەندە؟ وادیارە سەعاتەکەی خۆم نووستوە.

← هێنانە گۆر دەگەڵ.

**١٢٤٠/ 2239- پرکردن، لیپاو لیپ کردن:** (لە پۆمپی بەنزین) "لیپاولیپی کە".

**١٢٤١/ 7022- پڕ کردن (چاوەکانی باتری/ موتور لە ئاو یان رۆن و ...):** چاوەکانی باتری دەبێ لە ئاوێ "مقطر" پر بکرێن.

**١٢٤٢/ 3733- (وتاری خۆ لە وشە و زاراوەی زەلام) پڕ کردن، ئێو ئاخن کردن:** وتارەکەی لە ئاماژەکردنی پەیتاپەیتا بە گرینگیی خۆی لە مەسەلە ناوچەییی‌یەکاندا ئێوئاخن کردبوو. ● زاراوەی مەلەوانانی کەشتی پڕە لە سوێند خواردن.

**١٢٤٣/ 6414- پڕکردنەوە، گرتن:** ناچاری لە پێشدا ئەو کونانەی لە تەختەی قەراغ دیواریت کردوون پڕیان بکەیەوەو، جا ئەوجار رەنگی بکەی.

**١٢٤٤/ 2232- پڕکردنەوە(ی ئۆتکەیەك):** ئەگەر ئەم جێ سۆیە دیوارییە پڕ بکەینەوە، بۆ قەفەزەی کتێبەکان ئازاد دەبێ.

**١٢٤٥/ 2235- پڕ کردنەوە(ی فۆرم و فستی چاپکراو):** لە ئاغای چالتونمان پرسی کە داخوا فۆرمەکانی پڕ کردوونەتەوە یان نا.

**١٢٤٦/ 2233- پڕکردنەوەی کاتی بێکاری:** ئەو کچانەی زۆر کاریان پێیان نابێ، بە کارکردن لە فرۆشگە گەورەکان، یان لە قاوەخانەکان، کاتی بێکاریی خۆیان پڕ دەکەنەوە.

**١٢٤٦٠١/ 6385- پڕ لە بۆگەنیو کردن، ئاگلاندن:** خەریکی ئەم ماڵە پڕ دەکەی لە بۆگەنیو. ئەتۆیان بۆ ماڵێکی ئاوا خۆش دروست نەکردووە.

**١٢٤٧/ 246- پڕو پووچ، بێزهێنەر:** تۆسقاڵێك رێزی لە لام نەماوە، رەخنەکانی لە پاشایەتی بێزهێنەر بوون.

**١٢٤٨/ 4774- پرووشە کردن:** لە بەرامبەر نووری توندی خۆرەتاودا چاوەکانی پرووشە کردبوو.

پرووێ لێبوونەوە ← لە رێسمە چوون.

پرێس کردن ← پەستاوتن.

**١٢٤٩/ 5030- پرینگاندنەوە، لە دەناندنەوە، حالی کەسێك گرتن، رووی کەسێك کەم کردنەوە، بە دەم داداندنەوە، بە خۆ داشکاندنەوە:** ئەمجارە کە بۆ پارە وەرگرتن (تیغ لێدان) بێ، پێی دەڵێم کە پێنج پۆندمان پێ قەرز داوە. بەم جۆرە لە دەمی دەدرێتەوە/ حالی دەگیرێ/ رووی کەم دەکرێتەوە.

← کشانەوە.

(هەر بەینابەینێك) پسان، بڕان، قەتع بوون ← (لێرەو لەوێ) بڵاو بوونەوە.

**١٢٥٠/ 637- پساندن(ی پێوەندیی دۆستانە/ خزمایەتی):** جان پێوەندیی خۆی دەگەڵ بنەماڵەکەی پساندووە، چونکە ناتوانن لەسەر ئەو ژنەی دەیەوێ بیهێنێ رێك کەون.

← پێوەندیی خۆ دەگەڵ کەسێك پساندن.

١٢٥١/ 2468- **پسپۆڕ بوون لە، بوون بە پسپۆڕ لە ...دا**: کاتێك کە دەبێ قاپەکان بشوا، ھەرگیز ھەمیشە دەتوانێ کارێکی بەپەلە بۆ خۆی بدۆزێتەوە، وەك مەشق نووسینەوە، مومارەسەی موسیقا، یان ڕاگەیشتن بە سەگو پشیلەکەی. بەراستی لەم بارەوە پسپۆڕە.

١٢٥١٠١/ 3101- **پشتاو پشت ھاتنە خوار (ڕەنگھەیشتن)**: ئەو ڕێو ڕەسمانە بە درێژایی سەدەکانی ڕابردوو، پشتاوپشت ھاتوونە خوارو بە کردەوەش ھیچ ناڵو گۆڕێکیان بەسەر دانەھاتووە.

١٢٥٢/ 6012- **پشت تێکردن، وەلانان، دەست بەرداان لە، خۆ تێنەگەیاندن**: ھەموو وردە کارو گیروگرفتە چکۆلەکانی ماڵو کارەکەی وەلا نابوو.

١٢٥٣/ 7159- **پشت تێکردن، ڕەتکردنەوە، بە کەم دانان یا گرتن، گرینگی پێنەدان، بەرپەرچ دانەوە**: یەکیەتی‌یە کرێکاری‌یەکان سیاسەتی داھاتەکانی دەوڵەتیان بە توندی بەرپەرچ داوەتەوە/ ڕەتکردوتەوە. * بریتانیا نابێ پشت دە ئورووپا بکا.

١٢٥٤/ 7063- **پشت دە کەسێك کردنو پابەندی یان دڵبەستەی کەسێکی دیکە بوون، ڕاگوێزتن لە**: ژنەکەی لەوە بە گومانە کە پشتی تێ‌کردبێ‌و دڵبەستەی کەسێکی دیکە بووبێ.

١٢٥٥/ 2777- **پشت سەری کەسێك قسە کردن**: مەن‌و تۆ لە ھەموو شتێکدا ھاوڕێین. بەڵام پێم وابوو دەتوانم متمانەت پێ بکەم‌و گیروگرفتەکانم بە ڕاشکاوی دەگەڵت بێنمە گۆڕێ، نە ئەوە کە بچی بۆ لای سەرۆکی دایرەو لە پشت سەرم قسان بکەی.

١٢٥٦/ 5567- **پشت تێکردن، بەجێ ھێشتن**: یارمەتی‌یەکە لە ڕێکەوتی بەڵێنی دراودا نەگەیشتو، ئەو ھەستە ناخۆشەی دە ئێمە دابزواند کە نەکا پشتیان تێکردبێ.

پشت گرتن ← یارمەتی دان.

پشتگری کردن لە کەسێك ← پشتیوانی کردن لە.

پشت ملە باسی کەسێك کردن ← غەیبەتی کەسێك کردن.

١٢٥٧/ 6557- **پشتی خۆ شکاندن بۆ، قووڵی خۆ دڕاندن بۆ، خۆ ھیلاكو شەکەت کردن بۆ**: 'بۆچی دەبێ بۆ حەوتووی دوازدە پۆندان قوونی خۆم بدڕێنم؟'.

پشتی سەری یەکتر ڕۆیشتن ← لە یەك خەتدا ڕۆیشتن.

١٢٥٨/ 6231- **پشتی کەسێك گرتن، لە پشتی کەسێك ڕاوەستان، یارمەتی‌دان، پشتیوانیی کردن**: ئەو لەو جۆرە دۆستانەیە کە لە ڕۆژی ھاتو نەھاتدا پشتی پیاوی دەگرن.

← لە دەوری کەسێك کۆبوونەوە، پشتیوانیی کردن لە، لایەنگری کردن لە.

١٢٥٩/ 6000- **پشتی لیباسێك کەمێك دادڕین (کردنەوە)**: پشتەوەی ژاکێتەکەی کەمێك دادڕیوە بۆ ئەوەی لە کاتی ئەسپ سواری‌دا ڕاحەت بێ.

١٢٦٠/ 171- **پشتیوانیی لێکردن، لایەنی ... گرتن**: چیا وەك ھەمیشە بە دڵەوە پشتیوانی لێ کردم. * چنوور لەوە گلەیی دەکا کە کاتێك کەسێك پێشی پێ دەگرێ (= مزاحیمی دەبێ) کەسێك نیە پشتیوانی لێ‌بکا. (= بە ھاواری‌یەوە بێ، لەسەری وەجواب بێ).

١٢٦١/ 3937- **پشتیوانی کردن لە، لە پشتی کەسێك ڕاوەستان، پشتی کەسێك گرتن، پشتگریی کردن لە کەسێك**: زۆربەی ئەندامانی خوارووی حیزب خۆشحاڵن لەوە کە لە ڕێبەرایەتیی تازە پشتیوانی بکەن.

١٢٦٢/ 1266- **پشتیوانیی کردن لە**: لیبراڵەکان کە پارسەنگی ھێزیان لە نێو مەجلیس بە دەستەوە بوو، پشتیوانیان لە دەوڵەت کرد.

١٢٦٣/ 4599- **پشتیوانیی کردن لە**: کاسبکارەکانی مەحەللی لەو پێشنیارە پشتیوانیان کرد کە پێوەندی بە دابین کردنی خەرجی تەبلیغاتەوە ھەبوو.

١٢٦٤/ 3851- **(لەباری ماددی‌و مەعنەوی‌یەوە) پشتیوانی کردن لە**: بۆ دروست کردنی ناوەندی سنعەتی لە ناوچەکانی دوور لە ناوەندە سنعەتی‌یە گەورەکانی ئێستا، گەلە پێشنیارێك دراون. دەوڵەت لەو چەشنە کارانە بە تەواوی پشتیوانی دەکا.

پشتیوانی کردن لە ← جێبەجێ کردن، تەئیید کردن، دەگەڵ کەسێك بوون یان کەوتن، لایەنگری کردن لە، پشتی کەسێك گرتن.

١٢٦٥/ 6267- **پشتیوانیی لە کەسێك کردن، لایەنی کەسێك گرتن**: ھەرچەند چیای خۆش نەدەویست، بەڵام ئەگەر لە قوتابخانە، کوڕێك ھێرشی کردبا سەری، پشتی چیای دەگرت.

پشتیوانی لێ‌کردن لە بەرامبەر ← پاراستن لە بەرامبەر، یارمەتی دان، پشتی کەسێك گرتن.

١٢٦٦/ 3273- **پشتیوانیی نەکردن لە، ڕگ پێ نەسووتان، ھاودەردی نەکردن دەگەڵ، دڵ بۆ نەسووتان**: سەرت سوور نەمێنێ. دەزانی چیە؟ ئەمن قەت دڵم بۆ ئەو کەسانە ناسووتێ کە بیروباوەڕی توند ڕەوانەمیان ھەیە.

١٢٦٧/ 6173- **پشتیوانیی یان داکۆکی کردن لە:** ژنی دەلالی سەهامی شیرکەتان زۆر خێرا بۆ داکۆکی کردن لە مێردەکەی هەستا سەر پێ.

١٢٦٨/ 5461- **پشتیوانیی یان پشتگریی کردن لە (زۆر بە گەرمی):** لە ناخرین هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماردا، لاوان، روناکبیرانو کەمایەتییە رەگەزییەکان/ نەژادییەکان زۆر بە گەرمی پشتیرانیان لە مەك گاون دەکرد.

١٢٦٩/ 1266- **پشتی کەسێك گرتن، پشتیوانیی کردن:** لە لیبرالەکان کە لە پارلمان پارسەنگی هێزیان بە دەستەوە بوو، پشتی دەوڵەتیان گرت.

← یەککرتن.

١٢٧٠/ 3126- **پشتی یەکتر گرتن، دەست دانە دەستی یەکتر:** راباشتر بوو پشتی یەکتر بگرین نە ئەوە کە هەر کەسە بە تەنێ کار بکا. ● دەتوانین بەسەر هەموو قەیرانێکدا سەرکەوین ئەگەر پشتی یەکتر بگرین.

١٢٧١/ -

١٢٧٢/ 7289- **پشت تێکردن، بەجێ هێشتن، دەست لێهەڵگرتن:** لەو پیاوەی منداڵێکت هەیەو، تەنیا بە هۆی ئەوە کە باش دەگەڵ بنەماڵەکەت ناگونجێ. ناتوانێ بە جێی بێڵێ.

١٢٧٣/ 5668- **پشکنین، گەڕان بە دوای ... دا:** پۆلیسەکانو سەگە شوێنهەڵگرەکان هەموو مێشەکانیان بۆ دیتنەوەی کوڕەو بنورەکە پشکنی.

١٢٧٤/ 2928- **پشکنین:** ئەفسەرێکی پۆلیسی ژن لە تۆقی سەری را هەتا بەری پێی کچەکەی پشکنی بەڵام نەیگوت لە چی دەگەڕێ.

١٢٧٥/ 2949- **پشکنین، گەڕان:** ژنەکە هەموو کەوشەکانی کۆمزدەکەی گەرا، بەڵام زێوەکەی نەدۆزیوە.

١٢٧٦/ 5129- **پشکنین، گەڕان بۆ:** سەرانسەری دوای نیوەڕۆیە، لە هۆدەی ژێر شیروانی لە چەند رەحسی بنەماڵەکەیان ددگەرا.

١٢٧٧/ 1673- **پشکنین، کۆڵینەوە:** سەرگەرمی لێکۆڵینەوە لە کاروباری رۆژانەی خەڵك لە سەدەی ١٦ دایە.

١٢٧٨/ 938- **پشکنین، گەڕان لە:** مێشکی خۆی دەپشکنی بۆ ئەوەی بەشکوو بیانوویەکی باش بدۆزێتەوە کە بۆچی نەچۆتە کۆبوونەوە.

←گەران لە، بازرەسی کردن، بەراوەژوو کردنەوە.

١٢٧٩/ 679- **پشکواندن:** هەوای خۆشی سەرەتای بەهار یارمەتیدا بە پشکووتنی داری بەری.

← یارمەتیدان بە هەڵدان، پشکووتن، پشکوواندن.

١٢٨٠/ 364- **پشکووتن، گوڵ کردن:** ئەگەر ئەم هەوا خۆشە درێژەی هەبێ، سونبولەکانم دەپشکوێن.

← لە گوڵێ دابوون، کرانەوە.

١٢٨١/ 614- **پشوودان، حەسانەوە:** هەموو هونەرمەندەکان لە خۆ راهێنان دا دەستیان لەکار هەڵگرتو چوون قاوەی بخۆنەوە.

← حەسانەوە.

١٢٨٢/ 4778- **پشوو لێبڕین:** وەسەرکەوتن لەو پلیکانە زۆرانەی کە دەگەیشتنە نووسینگەی کابرای پشووی لێبڕیم.

← تەواو کردن.

١٢٨٣/ 6001- **(لە رادەبەدەر) پێی پشی پێکردن، رووداں بە:** کاتێك دەبینم ناوا لە رادە بەدەر روودەدا بەو منداڵانە پێی سەخلەت دەبم.

١٢٨٤/ 3638- **پلەو پایەی کەسێك بردنەسەر (بە یارمەتی و رێزێکی زیاتر و دەسەڵاتی کەمترەوە):** تەنیا رێگای رزگاریان ئەوەیە کە پلەو پایەی ناغای سمیت بەرینەسەرو دوایەش ناغای براون بێنینە سەرکارو گیانێکی تازە وەبەر کارەکەمان بنێین.

پووت چەند کیلۆیە ←تەمبێ کردن.

پۆز لێدان ← ژێست گرتن.

پۆست کردن ← ناردن.

١٢٨٥/ 150- **پۆشین، دەبەرەبوون (ی جلو بەرگی تایبەتی):** لە رێورەسمی کردنەوەی پارلمان، لۆردەکان جلو بەرگی تایبەتیی تەشریفاتیان پۆشیبوو.

١٢٨٦/ 2843- **پۆشین، دەبەرکردن:** لەم سەردەمەدا ئیدی ئێمە لیباسی تازیە ناپۆشین، ئەوە بەشێکە لە ویستی خۆمان کە دەمانەوێ مردن لە بیر خۆمان بەرینەوە.

١٢٨٧/ 2523- **پۆشین، دەبەرکردن:** هەر ئێستا لیباسەکانم دەبەر دەکەمو دەچین بۆ پیاسەیەکی کورت.

← دەبەرکردن لەسەر.

١٢٨٨/ 2976- **پۆلیس ئاگادار کردن:** کابرای باجگیر بە قوربانییەکەی خۆی گوت: " ئەگەر پۆلیس ئاگادار بکەی، پەشیمان دەبیوە".

١٢٨٩/ 4830- **پۆمپاژ کردن بۆ نێو:** بە میلیون تۆن ئۆکسیژێنی ناویان بۆ نێو ئەوتکێشەکان پۆمپاژ کرد.

← بە پۆمپ بەتاڵ کردن.

١٢٩٠/ 1529- **پووچاندنەوە، گلۆلە بوون:** ماشێنێکی چکۆلەی سواری لە تەسادوف کردن دەگەڵ لۆرییەک دا بە تەواوی بەسەر یەک دا پووچایەوە.

١٢٩١/ 1091- **پووچاندنەوە، وێک هاڵاتن:** ئەو گۆڵانە بە شەو دەپووچێنەوە.

← بەخۆدا شکانەوە، لە دم دان.

١٢٩٢/ 908- **پووچەڵ کردنەوە، خونسا کردنەوە:** سەرەنجام، ئەو دوو تاقمە فاکتۆرانە یەکتر پووچەڵ دەکەنەوە.

١٢٩٣/ 1152- **پووڵ، پارەیەک پێشکەش کردن:** راست ئەو کاتەی داماببووم و نەمدەزانی قەرزەکانم چۆن بدەمەوە، پوورە پیرەکەم بە ناردنی چەکێک سەد پوندی پێشکەش کردم.

١٢٩٤/ 5032- **پووڵ بە سووت دان، پووڵ بە قەرز دان بە کەسێک:** ئەنجومەنەکانی خانووسازی پەسەندازی/ پاشەکەوتی سەرمایەگوزاران (بە سووت) وەردەگرن و ئەو پوولانەی کە بەم جۆرە کۆ دەبێتەوە بە نرخێکی زیاتر بەو کەسانە دەدەنەوە بە سووت کە دەیانەوێ خانوو بکڕن.

١٢٩٥/ 1065- **پووڵ پەیدا کردن:** داهێنانەکەی هەر یەکجار زوو سەرکەوت و لە ماوەی کەمتر لە ساڵێک دەهەزار پوندی بۆ پەیدا کرد.

١٢٩٦/ 1008- **پووڵ دان و رۆیشتن:** داخوا کاک چیا رۆیشتووە؟ بەڵێ، پێنج دەقیقە لەمەوپێش پوولی داو رۆیشت.

١٢٩٧/ 6494- **پووڵ دان:** ئەتۆ تووشی گیروگرفت دەبیی و ئەمنیش ناچار دەبم پوولی جەریمەکەت بۆ بدەم.

١٢٩٨/ 2342- **(بەنابەدڵییەوە) پووڵ دان، پارەدان:** ئاغای براون لە حاڵێک دا بە نابەدڵییەوە پارەکەی دەدا گوتی "بگرە، ئەمەش ٢٥ پێنی دیکە!.

١٢٩٩/ 6151- **پووڵ و پارە لە کەسێک دەرهێنان، ئەستاندن، لێ لێنان، لێدەرکێشان، لێدەرفرتاندن:** لە لەندەن دەیتوانی بچێتە ماڵە دۆستێکی و جارو باریش پارەی ناخواردنێکی لێدەربێنێ.

پووڵ و پارە وەسەریەک نان (بە کەڵك وەرگرتن لە کار و کۆششی خەڵکی دیکە) ← کەڵك (ی خراپ) وەرگرتن لە.

١٣٠٠/ 5934- **پووڵ و پارەی خۆ بە کڕینی ... خستنە مەترسییەوە:** پووڵ و پارەیەکی زۆریان بۆ کڕینی سەهم لە شەریکەیەکی کانگای ژێر زەوی خستبووە مەترسییەوە کە زۆر کەس پێی گوتبوون وا مەکەن.

١٣٠١/ 6144- **پووڵ و پارەی خۆ بە فیڕۆدان:** پێش ئەوەی بۆ کڕینی کتێب و سەفحەی موسیقا پارەکەت بە فیڕۆ بدەی، ئەو قایانەت لەبیر بێ کە دەبێ بیاندەی.

١٣٠٢/ 6920- **پووڵ و پارەی خۆ بە فیڕۆدان، دە ئاوێ کردن:** نادییەکە/ کافە کە پڕ لە پیاوی گەنج و هەرزەکار و خۆش گوزەران بوو کە پێیان خۆشە پارەی خۆیان بە فیڕۆ بدەن.

١٣٠٣/ 3065- **پووڵ هەڵتەرژاوە:** ناتوانم بۆ سەفەری لەندەن دە پوندت دەمێ گۆڵی. دەزانی چییە؟ پووڵ هەڵتەرژاوە!.

١٣٠٤/ 4338- **پەڕاندن، لێکردنەوە بە خێرایی، هەڵپەرتاوتن:** پەلە زیادییەکانی گوڵە شەمعدانییەکانی بە خێرایی هەڵدەپەرتاوت.

١٣٠٥/ 6578- **پەڕاندن، هەڵپەرتاوتن (بە گۆچانێک/ داردەستێک لە حاڵێک دا داردەستەکە/ گۆچانەکە وزەی لێ هەڵدەستێ):** بە گۆچانەکەی زۆر بە جوانی و بە سورعەت نووکی گیایەکانی دەپەڕاند (و گۆچانەکەی وزەی لێدەهات).

١٣٠٦/ 6928- (لە شانۆگەری/تەلەفزیۆن) **پەڕاندن یان هاویشتن (ی قسەیەک بۆ ئەوەی شوێنێکی باشتر دابنێ):** ئەو چەند دێڕانە دەتوانن تەئسیرێکی تایبەتییان هەبێ. بەڵام، گەورەیان مەکەنەوە و هەروا بە شێوەیەکی غەیرە جیددی بیانهاوێن.

١٣٠٧/ 6448- **پەڕاندن:** بە داردەستەکەی، سەری گوڵە گەزیزەکەی پەڕاند.

← بڕین، هەڵپەتاوتن، بڕینەوە.

١٣٠٨/ 6605- **پەڕاندنەوە:** دەبێ کەسێک لێرە بێ کە بەیانان منداڵەکان بپەڕێنێتەوە.

پەرتاب کران ← تێژهاویشتن.

١٣٠٩/ 5123- **پەرداخی خۆ بە سلامەتی کەسێک هەڵێنان (و خواردنەوە) بە سلامەتی کەسێک خواردنەوە:** ئاغای چارلتون، پێموایە دەبێ بە سلامەتیی میوانەکانمان بخۆینەوە.

١٣١٠/ 6848- **پەردە لەسەر ... وەلادان، وەلانان:** ئەگەر ئەو شێوە رەفتارە نەجیبانەیە وەلابنێ کە دەگەڵ هەموو کەس لە خۆی نیشان دەدا/ئەگەر پەردە لەسەر ئەم شێوە رەفتارە نەجیبانە وەلابەرێ کە لە بەرامبەر هەموو کەس لە خۆی نیشان دەدا، بۆت دەردەکەوێ کە شتێکی ئەوتۆی دەباراندا نیە.

← شی کردنەوە، تێکدانی نەخشەی کەسێک.

١٣١١/ 1557- **پەردە لێنان، پەردە کێشان، بە پەردە جیاکردنەوە:** گۆشەیەکی هۆدەکەیان بە پەردەیەک جیا کردبۆوە و وەک دیوی لیباسان کەڵکیان لێوەردەگرت.

١٢١١/ 5393- **پەرە هەڵدانەوە یان داورانەوە:** کاتێك پاش تەواو بوونی بەشی یەکەمی شانۆ پەردەکە دادرایەوە، تەماشیچیەکان زۆر بە حەماسەتەوە چەپڵەیان لێدا.

١٢١٢/ 2215- **پەرژین لێدان، لەرە لێدان، یان کێشان:** هەزاران دۆنم زەوی بەراوەڵەیان پەرژین لێدابوو بۆ ئەوە کە ....

١٢١٤/ 5115- **پەرژین لێدان، لەرە لێدان، دەوری ... بە لەرە گرتن:** بۆ پێشگیری لە گاور گۆل/ لە گاران، بەشێك لە لەوەرگەکەیان پەرژین لێدا.

١٢١٥/ 3238- **پەرژین لێدان، پەرژین کران:** ئەو زەوییانە لە زەمانی باپیرەدا پەرژین کراون.

١٢١٦/ 5116- **پەرژین لێدان، بە پەرژین گرتن:** بۆ پێشگیری کردن لە بەرەڵلا بوونی منداڵەکان لەسەر جاددەکە، بنەبانی باخەکەیان بە پەرژین گرت.

← دیوار کێشان لە دەوری.

١٢١٧/ 5455- **پەرش/ پرش و بڵاو کردن:** ئەگەر بتوانین گرووهانێکمان لە جیناحی لاوازی دوژمن دابمەزرێنین بێئەوەی هێزی سەرەکیمان واریدی عەمەلیات بکەین دەتوانین هەموو سەنگەرەکانی دوژمن پرش و بڵاو بکەین.

١٢١٨/ 3946- **پەرش/ پرش و بڵاوکردن، فڕێدان، فڕێدان لێرمولەوێ، بە پرش و بڵاوی بەجێ هێشتن:** ئامرازەکانی لێرمولەوێ فڕێ دەدا- بۆیە هەرگیز هیچ شتێکی نابینێتەوە. ● پەرە کاغەز بەو پەری تێکەڵ پێکەڵیەوە لە هۆدەی موتاڵا بڵاو ببۆوە.

پرش و بڵاو بوون ← بڵاوە لێکردن.

پەرواز کردن ← هەڵفڕین.

١٢١٩/ 3060- **پەروەردە کردن، چەقاندن و بارهێنان:** ئەو تەماتانەی منت پێ چۆنن؟ بۆخۆم چەقاندوومن و پەروەردەم کردوون.

← بارهێنان، کردن بە، دروست کردن.

١٢٢٠/ 7430- **پەرۆیەك پێدا هێنان:** ئەوەندەمان وەخت نەبوو کە شووشەی پەنجەرەکان باش خاوێن بکەینەوە. تەنیا گوڵی پەرۆیەکی تەری پێداهێنان.

١٢٢١/ 585- **پەرە ئەستاندن، لقی تازە هێنان، پێشکەوتن:** دەبینم کچەکەم هەروا دەچێتە پێش و رۆژ بە رۆژ پێشکەوتنی تازە وەدەست دێنێ.

١٢٢٢/ 2077- **پەرەپێدان، پەرەئەستاندن:** بی‌بی‌سی بڕیاری داوە بەرنامەی بازاری هاوبەش پەرەپێبداو بیکاتە وتووێژی ئازاد.

١٢٢٣/ 2678- **پەرەپێدان، بڵاوکردنەوە، رەواج پێدان:** هەر رۆژنامەیەکی راپۆرتی ناوا گەورەو بە درۆ بڵاوکاتەوە، دەبێ دادگایی بکرێ.

١٢٢٤/ 1697- **پەرەپێدان، هەڵدان، پەرەئەستاندن، گەورە بوونەوە:** ئەو دامەزراوە سەنعەتییە مەزنە لە شتێکی چکۆلەدا پەرەی ئەستاند/ گەورە بووە.

١٢٢٥/ 681- **پەرەپێدان، مۆد کردن، کردنە باو:** پرێستیژی رۆژ لە رۆژ زیاتری داهێنەرانی مۆد لە بریتانیا لە پەرەپێدانی/ کردنە مۆدی مینی‌ژووپ/ داوێنی کورت دا ئەخشێکی کاریگەری هەبوو.

١٢٢٦/ 7359- **پەرێشان بوون(ی فکر)، ناڕەحەت بوون:** مرزاحیمی بابت مەبە؛ فکری زۆر پەرێشانە.

← غەمگین.

١٢٢٧/ 6951- **پەرێشان کردن، تێکچوون:** بە بیستنی ئەو هەواڵە کە شوغڵەکەیان داوە بە کەسێکی دیکە زۆر پیس تێکچوو.

پەڕین ← ئاوا بوون.

١٢٢٨/ 3429- **پەڕینە نێو ...، "ئاخواڵە" هاتنەنێو ...:** بێ‌یەك کەلیمە داوای لێبووردن کردن و، بێئەوەی لێی‌یان ویستبێ، پەڕییە نێو قسەکانمان.

١٢٢٩/ 1020- **پەڕینە نێو قسان، بەشداریکردن لە قسان دا:** داخوا دەتوانی رێگایەگ بدۆزییەوە بۆ ئەوەی هێندە نە پەڕێتە نێو قسەکانمان؟

١٢٣٠/ 852- **پەڕینە نێو قسان، قسەی کەسێك بڕین:** بریا هێندە نەهاتبایە نێو قسەکانمان کاتێك کە خەریکی وتووێژین.

١٢٣١/ 4921- **پەڕینەوە نێو قسەی کەسێك، قسەی کەسێك بڕین:** کامران بەپێداگرتنەوە دەیگوت: 'ئێستا کاتی شیرکەتەکەیە'. منیش پەڕیمە نێو قسەکانی و گوتم: 'خەریکی تاقیکارین'.

١٢٣٢/ 1022- **پەڕینە نێو قسان، هاتنە نێوقسان، قسەی کەسێك بڕین:** کێ لێی ویستی بپەڕییە نێو قسانو عەقیدەی خۆت بڵێی؟

← قسەی کەسێك بڕین.

١٢٣٣/ 2933- **پەڕینەوە لە (دەریایەك/ چۆمێك):** حەوتووی جارێك لۆتکەیەك/ قەیاغێك لە دەریا دەپەڕێتەوەو پۆستو خواردەمەنی دەبا بۆ ئەو دوورگەیە.

← تێپەڕبوون.

١٢٣٤/ 3245- **پەزیرایی لیکردن:** بە میقدارێکی زۆری دیکە سەوزی پەزیرایی‌یان لێکرا. (میقدارێکی زۆرتریان سەوزی دانێ بیخۆن).

← خزمەت کردن بە، خزمەتی میوانان کردن.

١٢٣٥/ 3038- **پەژارەی شتێك داگرتن، خەمی شتێك خواردن، خەمبار بوون بۆ، خەفەتبار بوون بۆ، خەفەتی شتێك خواردن:** خەمی "رۆژگارانی خۆشی رابردوو" خواردن بێ‌فایدەیە. دەزانی، ئەو رۆژانەی رابردوون، بەڵام، راستی خۆشیش بوون؟

١٢٣٦/ 6815- **پەژیوان یان پەشیمان کردنەوە:** ئەمە بەتەواوی بڕیاری خۆمە. لە راستی‌دا، ئەو هەر ئێستا هەوڵی‌دەدا بە قسان پەشیمانم کاتەوە.

پەسەنداز کردن ← پاشەکەوت کردن.

١٢٣٧/ 1372- **پەستاوتن، کەپەس کردن، پرێس کردن:** تەلاش‌و خاکە مشاری دەتوانن بۆ دروست کردنی قەنەفان کەپەس بکەن.

١٢٣٨/ 2596- **پەسەند کران، بڕیار لەسەردران:** دەوڵەت بۆ بە پەسەند گەیاندنی بودجەی ساڵانە زۆر کەم راهەیە دەگەڵ گیروگرفتێك بەرەوروو بێ.

١٢٣٩/ 107- **پەسەند کردن، خۆش ویستن:** 'باوەژنی/ زڕدایکی خۆشی ناوێ، دەمانا؟'.

١٢٤٠/ 7258- **پەسەندکردن، پەسەند کران:** لایەکە بێ‌وەدوا کەوتن لە هەردووك مەجلیسان پەسەند کرا.

١٢٤١/ 2247- **پەسەند کردن، وەبەردڵ کەوتن:** بە رواڵەت پێشنیارێکی باش بوو، بەڵام وەبەردڵی پیاوەکان نەکەوت.

١٢٤٢/ 5596- **پەسەند کردن یان بە پەسەند کردن گەیاندن ( بە پەلە ):** مەجلیس یاسایەکی بە پەلە پەسەند کردوە کە بە پێی ئەو هەڵگرتنی چەك تاوانێکی قورس دەژمێردرێ.

پەسەند کردن ← خۆش ویستن، دەنگ بە قازانجی...دان، پێخۆش بوون، قبووڵ کردن.

١٢٤٣/ 4502- **پەسن گوتن، ستایش کردن، پێهەڵگوتن:** لەو دەرفەتە باشە کەڵك وەردەگرم‌و لە لای ئەو خەڵکە ستایشی دەکەم.

← پێ‌هەڵگوتن، تاریف کردن.

١٢٤٤/ 1541- **پەشیمان بوونەوە لە، پەژیوان بوونەوە لە، پاشگەزبوونەوەلە** : تەنیا شەوێك لە مانگی نوامبر بوو کە تەم‌و مژ بوو، چیا دەیەویست لە چوون بۆ میوانی‌یەکە پاشگەز بێتەوە، بەڵام کاوە بە هەر جۆرێك بێ، بردی.

١٢٤٥/ 5307- **پەشیمان بوونەوە لە** : ئەو بەتەواوی لە کردەوە کەرانە/ نالەبارەکەی خۆی پەژیوان بێتەوە.

پەشیمان کردنەوە ← هەڵفریواندن.

پەك خستن ← وەدوا خستن.

١٢٤٦/ 2139- **پەككەوتن، خراپ بوون:** بەردەکانی دیواری بورجەکە وردە وردە دەهاتە خوارو سەعاتە گەورەکەش پەکی کەوتبوو.

← لەکار کەوتن، بێچارەبوون، لەرێسەچوون.

پەلاماردان ← هێرش کردنە سەر.

١٢٤٧/ 2282- **پەڵە پەڵە بوون:** گیاوگژی بن دارەکان پەڵەپەڵە تاویان لێ‌درابوو.

١٢٤٨/ 2538- **پەلە کردن، خێرا جووڵانەوە:** ئەگەر دەتانەوێ دۆستەکانتان لە ئێزگەی قەتار ببینن، دەبێ پەلەی بکەن/ خێرابن، چونکە قەتار هەتا پێنج دەقیقەی دیکە دەگاتێ.

١٢٤٩/ 3327- **پەلە کردن، زوو هاتن، زوو کردن، زوو وەرێخستن:** 'بریا پاسەکە زوو هاتبا؛ چەند سەعاتە لێرە چاوەڕوانم'.

● 'منداڵەکان زوو وەرێخە'.

١٢٥٠/ 4920- **پەلە کردن، خێرا بوون:** ئەگەر دەتەوێ پێش تاریك بوون بگەیەوە ماڵێ، دەبێ پەلەی بکەی.

١٢٥١/ 780- **پەلە کردن، زوو کردن:** زووکە، چیا، قوتابخانەکەت درەنگ دەبێ.

← لە داوەری‌دا پەلە کردن.

پەلە کردن لە داوەری دا ← لە داوەری دا پەلە کردن.

پەلە نەکردن ← دەست راگرتن.

١٢٥٢/ 6665- **پەنابردن بۆ، بەدەستەوە گرتن:** ئەو ئەفسانەیە کە گۆیا ' ئاژاوەگێری بیانی (بێگانە) هەن کە دەیانەوێ وڵات تێك دەن، بیانوویەك بووە کە زۆر لە دەوڵەتان بە دەستەوەیان گرتووە.

١٢٥٣/ 2108- **پەنا بردن بۆ، گەڕانەوە سەر:** ئەگەر گەڵاڵەکە سەر نەکەوت، نەخشەی وەزیری نێوخۆ هەیە کە هەمیشە دەتوانین پەنای بۆ بەرین.

١٢٥٤/ 952- **پەنا بردن بۆ هەموو شتێك ( بۆ خۆ رزگار کردن، گیان دەربردن ):** ناو بردوو/ کەسێك کە لە مەترسیی خنکان دابێ، دەست بە هەر پووش و پەڵاشێك دەگرێ.

١٢٥٥/ 1915- **(سەرلەنوێ) پەنابردنەوە بۆ:** سیغارم نەمابوو سیغارەکانی کامرانیش دیار نەبوون. بۆیە ناچار بووم پەنا بۆ پیپەکەم بەرمەوە.

١٢٥٦/ 6397- **پەنا بۆ هەموو شتێك بردن، خۆ بە ئاوو ئاگردادان یان داگرتن:** بۆ ئەوەی نەخشێکی گەورەی لەو شانۆیەدا هەبێ، خۆ بە ئاوو ئاگردا دەکا/ دادەدا.

۱۲۵۷/ 3033- **پەنا بۆ هەموو شتێك بردن بۆ رزگاركردنی خۆ:** هەروەك ناو بردوویەك كە دەست بە هەموو چرپەو چاڵێك دەگرێ بۆ نەجاتی خۆی، كابرای دزیش دەی هەویست بەزەیی خەڵكەكە بۆ لای خۆی راكێشێ.

پەنا بردن بۆ ← دەست دانە كارێك، چوونە لای كەسێك بۆ داواكارییەك، روودەجێگایەك كردن، دەست بردن بۆ.

۱۲۵۸/ 1954- **پەناگا، حەشارگە:** كاتی بۆمباران سەربازەكان دەچن دەپەناگاوە.

پەنجە راكێشان بۆ ← ئامـاژەكردن بـۆ، ئەنگوست، یـان قامك لەسەر دانان.

۱۲۵۹/ 4759- **پەند گرتوو بوون لە، عیبرەت وەرگرتن لە:** دەبێ لە هەڵەكانمان پەند گرتوو بین. (عیبرەت وەرگرین).

۱۲۶۰/ 3816- **پەند وەرگرتن لە، فێر بوون لە، تێتۆڵینەوە لە:** سەرگۆڵ گرتی: ئینسان لە سن و ساڵی من دا دەبێ لە ئەزموونی خەڵكی دیكە پەند وەرگرێ. * 'ئاخر ئێچیر، تۆ هێشتا منداڵی. بۆچی لە هەڵەكانی من پەند وەرناگری؟'.

۱۲۶۱/ 2732- **پەنگاو( پێ) خواردنەوە، پڕوپڕ بوون، مڕبوون، هەڵخنینەوە، تێناخنینەوە:** بازار لە سێرك پەنگاوی خواردۆتەوە. * منداڵەكان هەتا مڕبوون لەو تووترکانەیان خوارد كە لە باخی دراوسێیەكەیان دزیبوو.

۱۲۶۲/ 3845- **پەیام بەجێهێشتن لە لای كەسێك:** لە سكرتێرەكە دەگەڕام كە ئالفرێد سەبارەت بە رۆیشتنەكەی پەیامێكی لەلای ئەو بەجێهێشتبوو. * لە لای یەكێك لە دراوسێیەكان پەیامێكمان بەجێهێشتبوو كە زوو دەگەڕێینەوە.

۱۲۶۳/ 5151- **پەیام ناردن بە شێوەی مۆرس:** زیندانییەكان بە قامكی لە لوولەی ئاویان دەداو بەم جۆرە بەیەكەوە پێوەندییان دەگرت.

۱۲۶۴/ 5968- (زاراوەیەك لە یاری كریكێت دا) پەیتا پەیتا یاری زانەكانیان وەدەرنان.

(لەپڕ، كوتوو پڕ) پەیدابوون ←هاتن، هەبوون، هاتنەپێش، وەژوور كەوتن.

۱۲۶۵/ 3777- **پەیدا كردن، جێبەجێ كردن، ئامادە كردن:** بۆ سبەینێ، ماشێنێك ئامادە دەكەم و دەتانبەمە لەندەن.

۱۲۶۶/ 935- **پەیدا كردن یا هەڵبژاردن (ی كارێك، ئیشێك):** بە هەر جۆرێك بوو كاری هونەرپیشەیی/ فەننانی بۆ خۆی هەڵبژارد، هەر چەند لەسەرەتا دا بە زەحمەت دەیتوانی بژێوی خۆی دابین بكا.

۱۲۶۷/ 1356- **پەیدا كردن، دۆزینەوە:** زانایان دەبێ بۆ بردنەسەری رادەی خواردەمەنی لە جیهان دا ڕێگای تازە بدۆزنەوە.

← وەدەست هێنان، (ڕێگا چارەیەك، یان وەڵامێك). دیتنەوە بۆ، بەخۆوە گرتن.

۱۲۶۸/ 1- **پەیڕەوی كردن لە، لەبەرچاوگرتن، قبووڵ كردن، بەرێوەبردن:** هەر دووك پیاو رازی بوون بڕیاری نێوبژیوان قبووڵ بكەن. * مەگەم ڕێسای نێوخۆیی یانەكە (باشگا) قبووڵ بكەن، دەنا دەبێ بڕۆن.

۱۲۶۹/ 3029- **پەیوەند لێدان:** پڕپرچەی قامكی كوڕەیان بە چەشنێك پەیوەند كردبوو كە دوای چوار حەوتووان دەیتوانی بە جوانی قامكی بجوڵێنێ. * كابرای باخەوان دەیتوانی لە ماوەی سەعاتێك دا ۲۰ دانە پەلان لە لقی گوڵی رەشتی پەیوەند بكا.

پیادە بوون ← دابەزین.

۱۲۷۰/ 3665- **پیادە كردن، دابەزاندن (ی قەتەعاتی ماشێن و ...بۆ ئەوەی هاسانتر رابگوێزرێن):** لە زۆربەی وڵاتانی ئاسیایی بۆ دروست كردنی ماشێن، كارخانەی مونتاژ دامەزراون، ئەو ماشێنانەی كە بە شێوەی پیادە كراو لە ئورووپاو ژاپۆنەوە دێن.

۱۲۷۱/ 6632- **پیادە كردن ( ماشێن و دەزگاو ... )، كردنەوەو لێك جیا كردنەوە، لێكردنەوە:** دەروازە زینەتییەكانیان لێكردنەوەو وەك وردە ئاسن فرۆشتیانن.

۱۲۷۲/ 6464- **پیادە كردن، دامەزراندن (ی ماتۆڕ):** ئامرازە جۆراو جۆرەكانی ماتۆڕێكی پیادە كراویان لەسەر كورسییەكی درێژ دانابوو.

← دابەزاندن، خاڵی كردن.

پیاسە كردن ← هاتو چۆ كردن، خولانەوە.

۱۲۷۳/ 4704- **پێئەسپاردن (ی بەرپرسایەتی بە كەسێك)، كار بە كەسێك دان، بەرپرسایەتیدان بە:** 'لە كوێ كاریان پێئەسپاردوە؟' ، ' لە جێگایەك لە رۆژهەڵاتی دوور.'

۱۲۷۴/ 3440- **پێئەسپاردن( بەرپرسایەتییەك )، پێشكەش كردن، پێبەخشین، دان:** كاتێك فەرماندەری ئەرتەش برینـدار بـوو، بەرپرسایەتییەكەیان بە جێگرەكەی ئەسپارد. * شاژن میداڵیای كارلێهاتوویی دا بە نووسەرە بەناوبانگەكە.

۱۲۷۵/ 5601- **پێئەسپاردن (ی كارێكی دژوار):** هەمیشە بەرپرسایەتیی زیادیم پێدەسپێرن.

۱۲۷۶/ 3145- **پێبوون (ی شتێك):** '' جگەرەت ناوێ؟'' ،''پێم وایە پێمە''.

١٢٧٧/ 3618- **پێنەپێی ... چوونە پێش:** گەڵاڵە دارشتن دەبێ پێبەپێی داهێنانە سنعەتی‌یەکان بچێتە پێش.

١٢٧٨/ 3494- **پێنەپێی ... چوونە پێش، لە جەریانی رووداوەکان دابوون:** کاتێك بایەکی توند دەستی پێکرد، بەلەمەکە بە سەر ناوەکەدا دەخزاو پێ‌بەپێی موتۆر لەنجێك دەچووە پێش. * لە جیهانی زانستدا، ئەوەندە روو داوە دێتە پێش کە پیاو بە زەحمەت دەتوانێ لە ئاخرین رووداوەکان ئاگادار بێ/ پێ‌بەپێی رووداوەکان بچێتە پێش.

١٢٧٩/ 6296- **پێنەپێی کەسێك چوونە پێش، بەجێ نەمان لە، لە جەریانی ئاخرین رووداوەکاندابوون:** لە پێنج خولی یەکەمدا، ئالفرید شان بە شانی دەوەند بلۆیکی‌یەکە دەهات.

١٢٨٠/ 1389- **پێ بەخشین:** نازناوی سەرپەرشتی بەندەرەکانی سینك بە وینستون چرچیل بەخشرا.

← تەیار کردن.

١٢٨١/ 6374- **پێبەند بوون بە، لەبەرچاو گرتن، بەرێوە بردن:** کاتێك بەرنامەکەمان تەرتیب دا، وەرن بیکەین بۆ خاتری خودای با بەرێوەی بەرین.

← وەفادار بوون، یان مانەوە بە.

پێبەند کردن بە ← وادار کردن بە.

١٢٨٢/ 3689- **پیپ (سەبیلە)ی خۆ خاوێن کردنەوە، بە فوو بەتاڵ کردن:** کابرا پیرە خوار بۆوەو سەبیلەکەی خاوێن کردەوە بۆ نێو سۆبە دیواری‌یەکە.

١٢٨٣/ 3744- **پێ پێکەنین:** کاتێك بۆ دانەوەی قەرزەکە داوای مۆڵەتێکی زیاترم لێکرد، پێم پێکەنی.

← پێت وایە ئەمن چم؟ ئەمن چۆن دەناسی.

١٢٨٤/ 4626- **(ئەمە زاراوەیەکە کە لە کاتی تووڕە بوون لە کردارو هەڵس‌وکەوتی کەسێك دەیڵێن):** 'پێت وایە گاڵتە بە چی دەکەی، زەلام؟'.

پێ‌تەرك کردن ← گێڕانەوە لە.

پێ‌تەڵقین کردن ← دەمێشك بردن.

١٢٨٥/ 5770- **پێ تێنان، پێ لە جێگایەك نان، چوونە ...:** هێشتا گوڵی بە تەواوی پێی لە ژووری نەنابوو/ بە تەواوی نەچووبووە ژووری کە هەستی بەوە کرد نەورۆزی دایکی خەریکە وردە وردە دڵی دەروونی دادەگرێ.

پێ‌جوان بوون ← خۆش ویستن

پێچان لە ←لێهاڵاندن.

١٢٨٦/ 4206- **پێچانەوە(ی نوسخە لە دەرمانخانە):** پزیشك نوسخەت بۆ دەنووسێ و لە دەرمانخانە نووسخەکەت بۆ دەپێچنەوە.

١٢٨٧/ 5654- **پێچانەوە لە نێو دەست دا:** لە وەرەزی‌یان هاوارێکی کردو دووهەمین نوسخەی پاکنویس کراوی نامەکەی بۆ بانکی نووسیبوو لە نێو دەستی‌دا پێچایەوەو هاویشتی‌یە نێو سەتڵی ئاشغاڵەوە.

١٢٨٨/ 2326- **پێچانەوە، قەد کردن، کۆکردنەوە، تاکردن:** سفرەکەیان زۆر جوان قەد کردو هەڵیان‌گرت. * دەکرێ کورسی‌یەکانی حەوشە کۆ کەیەوەو بیانبەیە هۆدەی پاش ماڵێ؟

← قەد کردن، لوولە کردن.

١٢٨٩/ 3941- **(زۆر) پێوەبوون، وەختێکی زۆر بە شتێکەوە گرتن، زۆر پێوە بوون بە شتێکەوە، درێژ کردنەوە:** بەرچا خواردنەکەت زۆر درێژ کردۆتەوە/ زۆر بە نانوچا خواردنەکەتەوە بووی. تەواوی کە هەتا پێنج دەقیقەی دیکە دەڕۆین.

١٢٩٠/ 176- **پێ چەقاندن، جەنە گرتن، پرینگانەوە، قبوول نەکردن، سڵەمینەوە:** ئەسپەکە لە کۆسپی سەر ناوەکە سڵەمی‌یەوەو بازدی نەدا.

← هەراسان کردن.

١٢٩١/ 1458- **پێچەوانە بژاردن، بەرەوخوار بژاردن:** بە میلیون کەس بە پێچەوانە بژاردن بۆ ئاپۆلۆ ١٠یان لەسەر تەلەفزیۆن چاو لێکرد.

١٢٩٢/ 2506- **پێچەوانە تێگەیشتن، یان خوێندنەوە:** 'ئەگەر پێنج پۆند بە کامران قەرزداری بۆ دەست لەو باسە هەڵناگری‌و پارەکەی نادەیەوە؟'، 'ئەمن پارە بدەم بەو؟ کاکە گیان، ئەتۆ پێچەوانە حاڵی بووی ئەوە کامرانە کە پێنج پۆند بە من قەرزدارە.'

١٢٩٣/ 3131- **(پەکچەلر)پێخۆش بوون، دڵ کورکاندن بۆ:** لە ئەوعی خۆی‌دا گۆڤارێکی زۆر گرنگ بوو، بەڵام ئەو دڵی بۆ گۆڤاری فلیت ستریت دەی‌کورکاند.

١٢٩٤/ 3300- **پێخۆش بوون، مواڤق بوون یان نەبوون:** ئەمن ئەو هەموو قسە شۆرشگێرانەیانەم پێخۆش نیە. * ئەگەر پێت خۆش نەبوو بۆچی بەشداریت کرد.

١٢٩٥/ 2812- **پێخۆش بوون، پەسند کردن:** ئەمن فیلمی وەحشتناکم پێخۆش نیە. نازانم چلۆن هێندێك کەس پێیان‌خۆشە،

١٢٩٦/ 1669- **پێخۆش بوون، کەیف ساز بوون:** وادیارە کە خەر نارەحەتیی کەسانی دیکەی پێخۆشە.

١٢٩٧/ 1770- **پێخۆش بوون، مواڤیق بوون:** وا دێتە بەرچاو خوێندکارەکان پێیان‌خۆشە جێگای ژیانیان لە نزیك زانستگە بێ.

١٣٩٨/ 6661- **پێخۆش بوون، خۆش لە شتێك هاتن، عەلاقە پەیدا کردن بە:** ئێوە هەرگیز بەو کارانەی ئەو دەیکا عەلاقەتان پەیدا نەکرد.

← کەیف ساز بوون، کەیف کردن بە، خۆشحاڵ بوون، خۆش ویستن.

١٣٩٩/ 4423- **پێخەرج کردن، چاوپۆشی کردن:** ناکرێ بە هاسانی پووڵی پێخەرج کەی. * زەحمەتە بتوانین واداری کەین لە پووڵەکەی چاوپۆشی بکا/ دڵی لە پارەکەی بێتەوە.

١٤٠٠/ 2844 - **پێداچوونەوە، لەسەر شتێك باس کردن، چوون دە ... وە:** تکایە بە باس کردن لەسەر ئەو وردە شتانە وەختێکی زۆر مەگرە.

١٤٠١/ 1007- **پێداچوونەوە، کۆنتڕۆڵ کردن:** کاتێك وەك هەمیشە گشت دەزگاکانی فڕۆکەکە کۆنتڕۆڵ کران، فڕۆکەوان عەلامەتی دا کە حازرە هەڵفڕێ.

١٤٠٢/ 5576- **پێداچوونەوە، بەسەرداچوونەوە، چاو لێ کردنەوە، چاوپێداخشاندنەوە:** وەرن با سەرلە نوێ چاوێك لە خاڵە سەرەکییەکانی بودجە بکەینەوە/ بە خاڵە سەرەکییەکانی بودجەدا بچینەوە.

١٤٠٣/ 2929- **پێداچوونەوە، موومارەسە کردن، تەمرین کردن:** ئەمڕۆ ناتوانم بێمە دەر. لە شانۆی زانکۆ نەخشیان پێ ئەسپاردووم/ لە شانۆی زانکۆدام و دەبێ بە نووسراوەکانی بەشی خۆمدا بچمەوە (= بیانڵێمەوە).

١٤٠٤/ 1983- **پێداچوونەوە، خەت بەسەرداکێشان، دەرهاویشتن:** هەتا ئەم دواییانە، لەو نووسراوانەی کە لە رادیۆ بڵاو دەبوونەوە، قسەی سووکیان دەرداویشت.

١٤٠٥/ 1009- **پێداچوونەوە، چاوپێداخشاندنەوە:** سکرتێر، پێش ئەوەی نامەکان لەسەر میزی سەرۆکی ئیدارە دانێ، زۆر باش چاویان لێدەکاتەوە.

١٤٠٦/ 563- **پێداچوونەوە(بەیەکی وردە):** ئەگەر بمانەوێ بۆ حەوتوویەك پشوودان بچینە دەرەوەی وڵات، دەبێ بە وردی بەسەر زمانی ئیتالیاییەکەدا بچمەوە.

١٤٠٧/ 4315- **(بە وردی) پێداچوونەوە:** ئەو دەرفەتێکی باشی دەویست بۆ ئەوەی بەسەر ئەو ئەزمەرەدا بچێتەوە کە لەسەر ئەو کورە قۆشمەیان دابوو.

← چاوپێداخشاندنەوە، چاولێکردن، چێك کردن.

١٤٠٨/ 6923- **پێدادان، لێدان، رێهاڵاندن:** لە خزێنشاندانەکەدا خشتێکیان لێدا: زەربەی مێشکی دیوە/ مێشکی تێك چووە.

١٤٠٩/ 7118- **پێدادان، داپۆشین:** گوڵی ئەوی لە جێگاکەیدا داپۆشی و بەجێی هێشت خەوی لێبکەوێ.

١٤١٠/ 6161- **پێدادان، راخستن لەسەر:** بە پەتوویەکی کە قەراخەکانی بە گوڵە باتوون چنرابوون، بەسەر قەنەفەکەیان دادابوو.

١٤١١/ 3326- **پێدادان، بەسەردادان:** شەقامەکان پڕ بوون لە بەردو بوتری کە بە سەربازەکانیان دادابوون.

← داپۆشین.

١٤١٢/ 1569- **پێداشکاندن:** کابرای گەریدە نرخی گوڵدانەکەی بە کابرای دەست فرۆش داشکاندو هێنایە سەر چوار پۆندان، بەڵام نەیدەزانی کە هێشتا چوارسەد لە سەدی دا قازانجی پێ گەیاندوە.

← هێنانە خوار، داشکاندن.

١٤١٣/ 3659- **پێداکردن، خواردنەوە، لێدان، هەڵدان:** کابرای غەریبە دوو پێکی ئارەق ویستو لە ماوەی سێ چرکاندا هەڵیدان.

١٤١٤/ 1907- **پێداکردن، بەسەرەوە نان، بەیەك قلپ خواردنەوە:** مەشروویەکەم بەیەکەو قلپ خواردەوە؛ هەموو گەرووم سووتا.

← بەسەرەوە نان، پێهەڵپڕژاندن.

١٤١٥/ 1713- **پێداگرتن لەسەر، دەست بەردار نەبوون:** بەڵام کاتێك مەسەلەی لێك جیابوونەوە هاتە گۆڕێ ژنەکەی دەست بەردار نەبوو.

١٤١٦/ 3394- **پێداگرتن لەسەر:** وەك ژن و مێرد بە یەکەوە دەژیان، بەڵام ژنەکە لەسەر ئەوە پێی دادەگرت کە دەبێ کرێ خانوو لە یارمەتیی مانگانەی خۆی بدا.

١٤١٧/ 4529- **پێداگرتن لەسەر:** هەرکەس ویستی قسان بکاو ئەتۆش لەسەر لاتاو پێدادان پێدابگری، دەدەم دەرت کەن.

١٤١٨/ 6372- **پێداگرتن لەسەر:** کرێکارەکان لەسەر حاڵەتی درێژەدان بە خەبات مانەوەو، لەسەر داخوازی خۆیان سەبارەت بە حەقدەستی بێکەم و زیاد پێیان داگرتووە.

١٤١٩/ 6255- **پێداگرتن لەسەر:** خوێندکارەکان لەسەر بەرنامەو پەیڕەوی ئێرخۆی زانستگە پێیان داگرتوە.

← گیرە کردن لەسەر.

١٤٢٠/ 3441- **(گرنگی، رێزو حورمەت) پێدان، دان :** هەمبوونی جێگری وەزیری دارایی گرنگییەکی زۆری دابوو بە کارەکەو، ئەگەر ئەو نەهاتبا ئەو گرنگییەی نەدەبوو.

١٤٢١/ 3227- **پێدان، پێهەڵگوتن:** رۆژێك پێیان هەڵدەگوت و رۆژێك دواتر جنێویان پێدەدا.

← پێراگەیشتن، هەڵگرتن.

۱۴۲۲/ 4406- **پێدادەهێزان، داهێزاندن:** کاتێك بۆ دووهەمین جار چیڕۆکەکانی دەگێڕێتەوە بیسەرانی پێیان دادەهێزێن.

پێدران ← هەڵگرتن.

۱۴۲۳/ 6750- **پێدەرکردن، بە کەسێك دەرکردن:** دەزانم چەند بەرەحمتی، بەڵام نابێ تووڕەیی خۆت بە من دەرکەی.

۱۴۲۴/ 5742- **پێراگەیاندن، پێدان:** 'احضاریە' یەکیان پێداوە کە لە کۆبوونەوەی داهاتووی دادگادا حازر بێ.

۱۴۲۵/ 5355- **پێراگەیاندن، گوتن بە:** لێکۆڵینەوەکان دەریان خست کە یەکێك لە موودیرە پایە بەرزەکانی شیرکەت نهێنی‌یە سنعەتی‌یەکانی بە شیرکەتێکی نەیار راگەیاندوە.

۱۴۲۶/ 6437- **پێراگەیاندن:** نازانم چۆن دەتوانم ئەوەندە پارەیە هەتا ئاخری مانگێ پێرابگەیەنم(= کارێك بکەم بەش بکا).

← ئاگادار کردن، درێژ کردنەوە.

۱۴۲۷/ 1643- **پێراگەیشتن:** هەرچەشنە سکاڵایەك سەبارەت بە چلۆنایەتی شتومەکی ئێمە هەبێ، لەە ناوچەیی‌یەکانمان پێی رادەگەن.

۱۴۲۸/ 5690- **پێراگەیشتن:** 'ئالفرید، بڕۆ بە قاوەکەت رابگە'.

۱۴۲۹/ 4140- **پێراگەیشتن، وەرگرتن، میوانداریی لێکردن:** لە لایەن کۆمیتەی بەخێرهاتنەوە زۆر بە باشی وەرگیران. * لە رادە بەدەر پێیان راگەیشتین. سیغارو چایی‌یەکی زۆرمان دانێ.

۱۴۳۰/ 4025- **پێراگەیشتن، کۆڵینەوە لە ...:** مەئموورانی پۆلیس لە ونبوونی میقدارێك جەواهیراتی ئەتاشراو دەکۆڵنەوە. * رەنگە بتوانی لە جیاتی من بەم مەسەلەیە رابگەی.

پێراگەیشتن ← ئاگا لە کەسێك بوون، لێکۆڵینەوە، بەرێوەچوون(ی دادگایەك)، ئاگا لە کەسێك بوون، خزمەت کردن بە، ئاگا لێبوون، ئەنجامدان.

پێر بوون ← دەرەنگ بوون.

۱۴۳۱/ 5007- **پێر کردن، پێر نیشان دان:** رووداوە پڕ لە ترس‌و خۆفەکانی ئەو چەند مانگە پیری کردووە. * بێدەنگ بە، دەتەوێ بەو قسانە پیرم کەی؟!

۱۴۳۲/ 1400- **پیرۆزبایی گوتن (بە بۆنەی):** بە مەبەستی گوتنی پیرۆزبایی بە بۆنەی هەڵبژێرانت بە سەرۆکی قوتابخانەی سەرەتایی ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم.

۱۴۳۳/ 1401- **پیرۆزبایی بە خۆ گوتن یان لە خۆ کردن:** دەبێ پیرۆزبایی بە خۆتان بڵێن؛ بەراستی موعجیزەیەك بووە کە توانیوتانە لە ئاخرین دەرفەتدا هەڵێن‌و بە زیندوویی نەسووتاون.

۱۴۳۴/ 6214- **پێ رێخستن، وەبەر پێلاقان دان، وسکووت کردن:** لە ڤیان/ لە تووڕەیی‌یان کاغەزەکانی فڕێدا سەر عەرزی‌و پێی رێخستن.

← پان‌و فلیچ کردنەوە.

۱۴۳۵/ 1296- **پێزانین، پێگەیشتن:** پێی زانیبوو کە چەندین جار ژنەکەیان دەگەڵ پیاوێکی غەریبە دیوە.

← ئاگادار بوون لە.

۱۴۳۶/ 2608- **پێزانین، سەر لێدەرهێنان، دیتنەوەی هۆی شتێك، تێگەیشتن لە:** بڕیارم دا هۆی بڵاو بوونەوەی ئەو دەنگۆ پڕ لە شوورەیی‌یە ببینمەوە.

۱۴۳۷/ 267- **(هێرا) پێزانین، زوو دیتنەوە:** کۆڕی ئەزموونکاران زۆر زوو هەڵەکەیان دیتەوە.

۱۴۳۸/ 4318- **پیس کردن:** نامەوێ لەو هەوزە چکۆڵە تۆزاوی‌یەدا بێم‌وبچەمو لیباسە تازەکانم پیس کەم. * دەستت لابە، مووکانم پیس دەکەی.

۱۴۳۹/ 3368- **پیس کردن، ئالوودە کردن:** هێندێك لە ئاوارەکان نەخۆشی وەبایان هەبوو، هێندەی پێنەچوو ئاوی خواردنەوەشیان ئالوودە کرد.

← داپۆشین.

۱۴۴۰/ 1437- **پێ سەلماندن:** چۆن دەتوانم مەترسیی کێشانی ''مراد عَلَر'' بە تۆ بسەلمێنم؟.

۱۴۴۱/ 5140- **پێ‌سەلماندن:** لە دەست چوونی هەموو دارایی‌یەکانی پێی‌سەلماند کە دەبێ لەبەرامبەر دزی‌و ئاور تێبەربوونی ماڵەکەی خۆی بیمە بکا/ خۆی تەئمین بکا.

← بەسەر دا سەپاندن، پێ‌قبووڵاندن.

۱۴۴۲/ 7444- **پێ‌سەیرو سەمەرە بوون:** نابێ پێت سەیر بێ کە ئەو کابرایە بیەوێ شتەکانی وەپێچێ‌و بڕوا.

۱۴۴۳/ 3487- **(زاراوەی سەربازی) پێش، یاڵلا:** دەمەوێ لە سێ خەتان دا لەبەر دیوار راوەستن، یاڵلا زوو!

پێشاندان ←دانان بۆ تەماشا کردن .

پێشاندەری... بوون ← نیشاندان.

۱۴۴۴/ 829- **پێشبڕکێ لەنێوان ماتۆر سەوارە لاوەکان دا:** لە نێوان دوو خولی پێشبڕکێی ماتۆر سەواریی لاوەکان، لە قاوەخانەیەکی لارێ بۆ قاوەخواردنەوە لادەدەن.

١٤٤٥/ 3484- **پێشبڕکێی کۆتایی ئەنجام دان:** چوار تیمی ڕقەبەرەکان دەوری یەکەمیان جوان تەواو کرد، ئەمڕۆ ئێواری پێشبڕکێی کۆتایی ئەنجام دەدەن.

١٤٤٦/ 509- **پێش بە بڵاوبوونەوەی ... گرتن، نهێنی ڕاگرتن:** پێشی بڵاوبوونەوەی هەر چەشنە زانیارییەکیان بە تەواوی گرتبوو. یەکەمین بڕیارێك کە دایان ئەوە بوو کە باسەکەی ئەو ڕۆژە نهێنی ڕاگرن.

١٤٤٧/ 1580- **پێش بە ڕۆیشتنی شتێك گرتن:** وڵاتانی خاوەن ئەوت هەڕەشەیان کردبوو کە ئەگەر پێشنیارەکانیان قبووڵ نەکەن، پێشی چوونی ئەوت بۆ ئەورووپا دەگرن.

١٤٤٨/ 4826- **پێش بە کەسێك گرتن، قسەی کەسێك بەرپەرچ دانەوە، بە خۆدا شکاندنەوە، بەدەمداهاتنەوە:** بە هۆی پێداگرتنی لە ڕادە بەدەری لەسەر ڕوانگە نادروستەکانی، تەنانەت خێزانیشی ناچار بوو بەدەمیدابێتەوە.

← ڕاگرتن.

١٤٤٩/ 6897- **پێش بینی کردن:** هێندێك کارم دەکردن کە لەکاتی خۆیدا بۆ ئیحتیات دەم کردن، واتە پێش بینیم دەکرد.

١٤٥٠/ 5677- **پێش بینی کردن:** ئەو کابرایە لەو کەسانە نیە بتوانێ بیکەیە بەرپرسی تەداروکاتی خواردەمەنی. ناتوانێ پێش بینی ئەوە بکا کە بۆ جەمی داهاتوو خواردەمەنیی لەکوێڕا دێ.

١٤٥١/ 4770- **(لە پاسدا) پێش بینی کردن بۆ:** لەو لایەنیەدا خودگەردانیی مەشرووت بۆ هەرێمەکە پێش بینی کراوە.

١٤٥٢/ 4769- **پێش بینی کردن بۆ:** بۆ هاتنەپێشی هەرچەشنە کەم و کوورییەك لە سیستمی کاروباری دەزگاکەدا پێش بینی پێویست کراوە، بۆ ئەو مەبەستە مەداریکی کارەبای دووانە دانراوە.

← بەراورد کردن، ئەرزیابی کردن، لەبەرچاوگیران.

١٤٥٣/ 3524- **پێش پێگرتن:** کاربەدەستانی هێندی زۆر بە خێرایی پێشیان بە بڵاوبوونەوەی زیاتری ئاهۆی تیفۆئید گرت. * سێلاو پێشی هاتنەپێشی دوژمنی گرت، سێلاوێك کە ناوچەکەی والی کردبوو کە هێزی زرێهی نەیدەتوانی لێی تێپەڕێ.

١٤٥٤/ 1516- **پێش پێگرتن، موخالەفە کردن، گیروگرفت بۆ پێك هێنان:** هەتا ئەو کاتەی موخالەفەتت نەکردووە، پیاوێکی میهرەبانە. *کامران چی لێقەوماوە؟ دەتوانم بڵێم دەگەڵ یارەکەی هێندێك گیروگرفتی بۆپێك هاتوون.

١٤٥٥/ 6241- **پێش پێگرتن، ڕێگا بە کەسێك گرتن، چەمت لە کاری کەسێك خستن:** ئەگەر دەتەوێ بۆ دەرس گوتنەوە بچی بۆ هەندەران پێشت پێناگرن.

پێش پێگرتن ←دەگیر کەوتن، ئەهێشتن، پێشەبڕەلێدان،گوشارخستنەسەر،پێشگری‌کردن ... لە.

١٤٥٦/ 2774- **پێشتر ژیان، پێش مردن:** هەوڵمان داوە بە ڕێو ڕەسمی ئەو کەسانە وەفادار بین کە لە پێش ئێمەدا ژیاون.

پێشتێك نەبوون ← دوو دڵ نەبوون.

١٤٥٧/ 937- **پێشدەستی کردن، کەڵك وەرگرتن لە دەرفەت:** گیروگرفتی گەورەمان ئەوەیە کە پێش ئەوەی بەرهەمە تازەکانمان بەرینە بازاری، ئەبێەڵێن کەسانی دیکە پێش دەستی بکەن.

١٤٥٨/ 2474- **پێشدەستی کردن، هاتنە پێش:** شەریکەی ماشێنی دەربەست بەکرێدان، یەکەم شەریکە بوو کە بە پێشنیار کردنی کرێی ٥٠ پوند بۆ موسافیر بردن بۆ کارائیبو هێنانەوەی پێشدەستی کرد.

١٤٥٩/ 6327- **پێشدەستی کردن لە:** هیچ کامتان ناتانەوێ دابنرێنن کە ئەوی دیکە پێشدەستی لێکردووە.

١٤٦٠/ 4299- **پێشرەفت کردن، چوونە پێش، چوونەسەر (لە کاروباردا):** پێنج ساڵە لەسەر ئەم کارەم، وەختی ئەوە هاتووە کارێکی سەرتر وەرگرم.

← چوونە پێش.

١٤٦١/ 4844- **پێشڕەوی کردن، چوونە پێش:** لە منیان ویست پێشڕەوی بکەم و یاریدەی ئەرتەشی پێنجەم بدەوم.

← چوونە پێش.

١٤٦٢/ 4296- **پێشڕەوی کردن بۆ لای:** تانکەکان پێشڕەوییان کرد بۆ ئەوەی تەك تیرئەندازەکان لە پەناگاکانیان دەربەرێنن.

١٤٦٣/ 50- **پێشڕەوی کردن بۆ لای ...، چوونە پێش لە ...:** فەرمانیان داینێ کە لە تاریکیی شەوێدا بەرەو سەنگەرەکانی دوژمن بچینەپێش.

١٤٦٤/ 236- **پێش سەردەمی ... بوون:** هەڵبەت، ئەوە پێش سەردەمی ئێوە بووە. *مامۆستا فەرانسەوییە بەزیقە زیقەکەت لەبیرە؟ بەڵام، پێم وایە ئەوە پێش سەردەمی (دەرس خوێندنی) ئێوە بووە؟

١٤٦٥/ 2650- **پێشکەش کردن(ی بووك بە زاوا):** لەبەر ئەوە کە باوکی بووکێ زۆر نەخۆش بوو، نەیتوانیوە لە ڕێوڕەسمەکەدا بەشداری بکا؛ بۆیە مامی بووکێ پێشکەش بە زاوا کرد.

١٤٦٦/ 674- **پێشکەش کردن(ی لایحەیەك بە پەرلەمان):** بڕیاری داچوونەوە بەسەر یاسای سەربووت بە پیاوکوشتن، پڕۆژەیەکی نوێ پێشکەش بە پارلمان دەکرێ.
← دران بە.

١٤٦٧/ 1142- **پێشکەش کران بە (بۆ پێداچوونەوە)، دران بە:** داخوازەکەم سبەینێ دەدرێ بە دادگا.

١٤٦٨/ 3759- **پێشکەش کردن بە، دان بە:** پێشنیارەکانی دران بە کۆمیتەیەکی هەڵبژێراو لە ئەندامان. *ئەوە پێش نووسی گەڵاڵەیەکە کە دەمەوێ پێشکەش بە پارلمانی بکا.

١٤٦٩/ 5302- **پێشکەش کردن بە، کردن بە:** سوپاسی خودا کردن بۆ رەحمەتەکانی. *کرێکارانی لاوو داوتەڵەب خزمەتێکی بە نرخ بە کۆمەڵەکەیان دەکەن.

١٤٧٠/ 1659- **پێشکەش کران بە:** بیترفێن لە سەرەتادا سەمفونی نۆیەمی پێشکەش بە ناپلیۆن کرد، بەڵام لەرقان لاپەرەی سپیی سەرەتای نووسراوەکەی دڕاند.

١٤٧١/ 4728- **پێشکەش کردن، وەك دیاری پێدران:** کلیلی شاریان پێشکەش کرد. * لە رۆژی تەقاعودبوونی دا سەعاتێکی زێڕیان بە دیاری/ وەك هەدیە دایە.
← نەزر کردن، تەسلیم کردن، دان بە، پێ ئەسپاردن(ی بەرپرسایەتی یەك) بە.

١٤٧٢/ 5255- **پێشکەش کردنەوە:** داخوازنامەکەم بۆ مەرەخەسی/ پشوودان پێشکەش بە زانستگە کردۆتەوە.

١٤٧٣/ 1582- **پێش گرتن بە، رێگا بەستن لە، رێگا گرتن لە:** هەر چەند رێگای پاشەکشەیان لێ گیرابوو، سەربازەکان هەتا ئاخری شەڕیان کرد.

١٤٧٤/ 3411- **پێش گرتن بە، بوون بە کۆسپ لەسەر رێگای ...، لەسەر رێگای ... کۆسپ و تەگەرە دروست کردن:** نابێ هیچ شتێك ببێتە کۆسپی سەررێگای دۆزینەوەی راستی یەکان.
← بەرەو پاش بردنەوە، بوون بە کۆسپ لەسەر رێگای ...
.

١٤٧٥/ 5671- **پێشگیری کردن لە:** مەسەلەی گرینگ ئەمەیە کە لە جیابوونەوەی ئۆستانە/ پارێزگا دەوڵەمەندەکان لە فیدراسیون، کە بەشی زۆری فەقیرن، پێشگری بکەین.

١٤٧٦/ 5350- **پێشگری کردن لە:** پۆلیسەکان بۆ پێشگری کردن لە هێرشی حەشیمەتەکە/ خەڵکەکە بۆ نێو زەویی (فوتبال) دەگەڵ گیروگرفتێکی زۆر بەرەو روو بوون.

١٤٧٧/ 5502- **پێشگری کردن لە، لەبەر چاو نەگرتن، گوێ نەدان بە، بەنەبوو دانان:** ناتوانی ئەو ئیمکانە بە نەبوو دابنێی/ رەت بکەیەوە کە چاك بوونەوەکەی بەستراوەتەوە بە نەبوونی شەکەتی و ماندوویەتی. * گومانم لەوەدا نیە کە دوکتور گریگۆری لەم چاوپێکەوتنە پێشگری دەکا چونکە بۆ نەخۆشەکەی بە زیانبار دەزانێ.

١٤٧٨/ 4723- **پێشگری کردن لە، بوون بە کۆسپی سەر رێگای/ لەسەر رێگای کەسێك، کۆسپ و تەگەرە خستنە سەر رێگای کەسێك:** ئاڵوگۆڕێکی کتوپڕ لە وەزعییەتەکەدا بوو بە کۆسپ لەسەر رێگای بەشداری کردنی لە دەوڵەت دا.

١٤٧٩/ 3276- **پێشگری کردن لە، پێش پێگرتن، "مهار کردن"، راگرتن:** سەرەنجام نەیانتوانی پێش بە هەڵچوونی ئیحساساتی خەڵك بگرن. لە هەموو جێگایەك ئاژاوە ساز بوو.

١٤٨٠/ 3376- **پێشگری کردن لە، رێگا پێنەدان:** پەروەردەکرانی بەشێوەیەکی سەختگیرانە ئەوی لە هێنانەگۆڕی هەر چەشنە پرسیارێك دەگێڕایەوە/ پێشگری لەوە دەکرد کە پرسیار بکا. ناکامەکەشی ئەوە بوو کە لە هەر چەشنە باسێکی جیددی وەلابنرێ.
← دەسەڵات بە کارهێنان. پێش لێ گرتن دوور کردنەوە لە خۆ، خۆپاراستن لە.
پێشگری کردن لە چوونەسەری... ← نزم راگرتن.
پێش لە کەسێك گرتن ← دەستو باڵی کەسێك بەستن.

١٤٨١/ 3267- **پێش لێگرتن، پێشگری کردن لە:** جان پێی وابوو چونکە لەباری کۆمەڵایەتی یەوە سەر بە چینی کرێکار بووە لە چوونەسەری پلەو پایەی پێشگری دەکەن. * ئێستا کە مەسەلەکە بەرەو تەواو بوون دەروا، هیچ شتێك ناتوانێ پێش بەو پیاوە بگرێ.

١٤٨٢/ 4917- **پێشنیار کردن، هێنانەگۆڕ:** ئەندامێکی ئاڵمانی بەشێوەی رەفتاری ئەو فەزانەوەردانەی دەگەنە ئەستێرەی تازە رێسایەکی پێشنیار کرد.

١٤٨٣/ 4950- **پێشنیار کردن(ی کەسێك بۆ کارێك):** ئەویان بۆ شوغڵێك لە بەشی ئیداری(ی ئەرتەش)دا پێشنیار کردووە.

١٤٨٤/ 4918- **پێشنیار کردن:** ناوی ئەویشیان بۆ نووسران لە لیستەی سەربەرزاندا پێشنیار کردبوو.

١٤٨٥/ 5083- **پێشنیار کردن، نامزەد کردن، پاڵاوتن (بۆ هەڵبژاردن):** ئەوان پێیان خۆشە (بۆ هەڵبژاردن) پێشنیاری بکەن. بەڵام ئەو پێی خۆش نیە نامزەد بکرێ.

١٤٨٦/ 411- **(بە گوێرەوە تا رادەیەك بەشێوەیەکی ناحەز) پێشوازی لە.. کردن، بە پیر/ پیل کەسێکەوە چوون:** هێشتا لە دەرکەی

نەهاتبورەمە ژوور کە خزمەتکارە زەبەلاحەکەیان بە گورەگور بە پیرەمەوە هات.

١٤٨٧/ 5384- **پێشوازیی لە کارەساتێك کردن، بە پێشوازیی کارەساتێکەوە چوون**: لە زۆر بەدفەرییان رزگاری بووە. بەڵام ئەمجارە کەرەتی ئاخری دەبێ: دەیەوێ بە پێشوازیی کارەساتەوە بچێ.

١٤٨٨/ 7366- **پێشوازیی کردن(ەوە) لە**: بۆ پێشوازیی کردنەوە لە تیمی میللیی فوتباڵ، حەشیمەتێکی گەورە لە فرۆکەخانە کۆ ببووە.

١٤٨٩/ 3037- **پێشوازیی لێکردن، بە پیلەوە چوون، بە پیرەوە چوون**: کاتێك میوانە بەرێزەکە پێی دە ساڵۆنی نا، ئوتابیی یەکان بە هەڵلاو بگرێکی زۆرەوە پێشوازییان لێکرد.
← بەخێر هاتن کردن.

١٤٩٠/ 1141- **پێش... هاتن، بەر لە... بوون**: "ئەلف" پێش "ب" و"ب"ش پێش "ج" دێ، ... .

١٤٩١/ 3222- **پێشەبڕە لێدانەوە، پێش پێگرتن**: یەکەمین کارێکی دەبوو کردبایان پێشەبڕدانەوە لە دوژمن بوو بۆ ئەوەی دەستی بە ناوچە حەساس و بێدیفاعەکان رانەگا.
پێشەکی ← دەست پێکردن (بەرنامە).

١٤٩٢/ 2470- **پێش هەموان گەیشتنە کۆتایی خەت**: ئەسپەکەم لەبۆزێك پێشتر لەوانی دیکە گەیشتە ئاخری خەتێ.

١٤٩٣/ 6289- **پێش هەموو شتێك (دەبێ بڵێین)**: پێش هەموو شتێك، ئەو بیرە لە مێشکت دەربارێژە کە گۆیا دەتوانی لە رێگای دەرس گوتنەوە پووڵ پەیدا بکەی.

١٤٩٤/ 495- **پێش هەموو شتێك، هەر لە سەرەتاوە**: پێش هەموو شتێك، دەبێ بزانی کە پارەم زۆر کەمە/ پارەیەکی وام/ ئەوتۆم نیە.
← لەپێش دا.

١٤٩٥/ 6297- **پێشەنگ بوونی خۆ پاراستن**: پێش هەموو شتێك دەبێ بڵێین کە مەسەلە ئەوە نیە کە دەبێ لە پێشەوەبوونی خۆمان لە پێوەندیی دەگەڵ ئەیارە ئورووپایی یەکان بپارێزین... .

١٤٩٦/ 3496- **پێشەنگ بوونی خۆ راگرتن**: ئەگەر بتەوێ لە بەرامبەر ئەیارەکانت دا هەروا پێشەنگ بوونی خۆت راگری، ناچار دەبێ زۆر سەخت تێبکۆشی.
پێشی بڵاوبوونەوەی... گرتن ← "مهار کردن".
پێشی جموجۆڵی، یان رۆیشتنی... گرتن ← راگرتن.
پێشی دەربڕینی... گرتن ← دەمکوت کردن.

پێشی زیانی خۆ گرتن ← گێرانەوەی قسەیەك کە نابێ بگوترێ.
پێشی زیادبوونی بوونەوەرێك گرتن ← لەنێو بردن.

١٤٩٧/ 3520- **پێشی شتێك گرتن، کونترۆڵ کردن، زاڵ بوون بەسەر...دا**: خەڵك پۆلیسەکەیان تووڕە کردبوو، بەڵام بە هەر جۆرێك بێ پێشی تووڕە بوونی خۆی گرتبووو، بە لەسەرەخۆیی و کارامەیی دەگەڵ وەزعییەتەکە هەڵسوکەوتی دەکرد.
← کونترۆڵ کردن، زاڵ بوون بەسەر...دا، کۆتایی هێنان بە.

١٤٩٨/ 4407- **پێ قالب کردن، دەرخوارد دان، بەسەردا بڕین**: ئەو کالایانەی لەبەریێکردنی شتومەك بۆ دەرەوەی وڵات زیادی دەمێننەوە، دەکرێ لە بازاری کەنار شەقامەکان بە خەڵکی قالب کەن (=بە فێڵ و تەڵەکە پێیان بفرۆشن). * ئەو کابرایە لەو جۆرە مامەڵەچییانەیە کە دەکرێ هەموو شتێکی دەرخوارد دەی (بە فێڵ و تەڵەکە پێی بفرۆشی).
← بەسەردا سەپاندن.

١٤٩٩/ 3350- **پێ قبووڵاندن**: سەرۆکی ئیدارەی گرینگیی راگرتنی رۆژ بە رۆژی موازەنەی حیسابەکانی بە کابرای حیسابدار قبووڵاندبوو.

١٥٠٠/ 4530- **پێ قبووڵاندن، پێ سەلماندن**: ئەو توانی عەمەلی بوونی پرۆژەکە/ ئەخشە کە بە ئێمە بسەلمێنێ و، ئێستاش ئێمە دەبێ بە سەرۆکی بسەلمێنین.
← شوێن دانان لەسەر.

١٥٠١/ 6369- **پێ قبووڵ کردن، قبووڵ کردن**: سوێندی خوارد هەتا ئەوکاتەی کە کارێکی باش پەیدا دەکا، بێکاری دەکێشی و قبوولیشی دەکا.

١٥٠٢/ 6239- **پێ قبووڵ (نە) کران، تەحەممول کردن**: ئەگەر شتێك هەبێ کە ئەمن پێم قبووڵ نەکرێ، ئەوەیە کە وەك بەردەستی/ نۆکەری ئیدارە چاوم لێبکرێ.

١٥٠٣/ 4566- **پێکاب، وانێت بار**: لوولەکێش و ئێلێکتریکی و بەننای کونتراتچی بۆ راگوێزتنی ئامرازو "کەرەستە"کانیان زۆرتر لە وانێت بار کەڵك وەردەگرن.

١٥٠٤/ 1837- **(بە زۆر) پێکردن، هێنانەگۆڕێ**: هەرچی پێت خۆش بوو دەتوانی لەسەر من بینووسی، بەڵام ناوی خێزانم مەهێنە گۆڕێ. ( = مەبە)؛ ئەوی دەگەڵ مەخە.
← هێنانەگۆڕێ .

١٥٠٥/ 5317- **پێکردن، پێ هەبوونی متمانە، باوەڕ...**: ئێمە متمانەیەکی تەواومان هەیە بە توانایی ئەو بۆ بەڕێوەبردنی وتووێژەکان.

١٥٠٦/ 5117- **پێکردن، وادارکردن، ناچارکردن:** جـان، واباشـتره باس لەسەر مەسەلەی فرۆشتن وەلابنێی. ناتوانی ناچارم بکەی دەگەڵ شـیرکەتێك بکەوم کە رابردوویەکی نیوە تاریکو داهاتوویەکی زۆر جێگای گومانتری هەیە.
← بە زۆر پێکردن.

١٥٠٧/ 1195- **پێکهاتن، دروست بوون:** دەزانـی پارلـمان کـەنگێ دروست بوو؟.

١٥٠٨/ 4203- **پێکهاتن، پان پێکهێنان، دروست بوون لە:** ئـەو خورو خدانەوی کە لەسـەر یەکو بەشێوەیەکی نیدەنال شەخسییەتی هەر مرۆڤێك پێك دێنن کامانەن؟.

١٥٠٩/ 1371- **پێکهاتن لـە:** کـۆڕی داوەران بـە تـەواوی لـە پیاوان پێکهاتبوو.
← بریتی‌بوون لە، دابەش کران بە.

١٥١٠/ 57- **پێکهاتن لەسەر، ڕێککەوتن:** واوێدەچـوو کـە دوو لایەنەکە بە تەواو کردنی شەڕو کێشەکەیان هەرگیز پێـك نایەن.

١٥١١/ 800- **پێکهێنان، لەندروست بوون:** وردە وردە ئـەو کتێبانە کۆ دەبنەوەو سەرەنجام کتێبخانەیەکی گەورە پێك دێنێن/ گەورەیان لـێ‌پێك دێ.

١٥١٢/ 5801- **پێکهێنان، دامەزراندن:** وزیـری بازرگـانی بـۆ ئەرخەیان بوون لەوە کە نانی خەڵك بەرێك و پێکـی دابـین بکرێ، ئەمرۆ کۆمیتەیەکی تەواری/ نۆرژانـی پێکهێنا.

١٥١٣/ 799- **پێکهێنان، دروست کردن:** وێدەچێ کـە یاخیـیەکان لە فکری ئەوەدابن کە بە یارمـەتیی دەرەوە ئەرتەشـێکی ئەوتۆ دروست بکەن.

١٥١٤/ 678- **پێکهێنان، دروست کردن:** بە هێنانی چەند تیپ لـە بەرەیەکی دیکەرا، ئەرتەشێکی تازەیان پێك هێنا.
← ساز کردن، هێنانەگۆڕێ.
پێك هێنانـەوە ← ناشـت کردنـەوە، پێکـهێنانی بەشـێك لەشتێك ← بەشێك لە شتێك پێکهێنان.

١٥١٥/ 3740- **پێکەنین، پێکـەنین گرتـن، وەپێکـەنین کـەوتن:** بەشێوەی بەسەریەك داگلانی نیشکە ڕنـەکان بـە کەوشـە زەلامەکانیانەوە پێدەکەنی.

١٥١٦/ 3039- **پێکەنین، زاردا چـەقاندن و پێکـەنین:** "دەکـرێ بفەرمووی چ شتێکت پێ‌سەیرە؟ ئەوە ماوەی دە دەقیقەیە لەوێ دانیشتوویو پێدەکەنی!".

١٥١٧/ 3750- **(لە ژێرەوە، لە بنەوە، بە دزی) پێکـەنین بـە ...:** دەمیزانی کە هاوکارەکانی پێشووی بـەوە کـە لەسـەر کـار وەلاندراوە پێی پێدەکەنن.

← دڕان لە پێکەنین.

١٥١٨/ 60- **پێکـەوتن، سـازگار بـوون دەگـەڵ دەروون، سـلامەتی):** حاڵم باش نیە ئەو کولیچەیەم پێ‌نەکەوتووە.

١٥١٩/ 5482- **پێکەوە سـازان، بـاش بەیەکـەوە راهـاتن، بـاش بەیەکەوە ژیان، ڕێککەوتن:** وەك هەمیشە سـازگارن/ بـاش بـە یەکەوە دەژین.

١٥٢٠/ 7026- **پێکەوەنان:** لـەو نیشـەدا پێکـەوەنانی چـەند ڕستەی جوانو دەربڕینیان کافی نیە. ئەم کارە پێویـستیبی بەبیر لـێ‌کردنەوەو تێگەیشتنە.
← لەسەر یەك دانان.

١٥٢١/ 2990- **پێکـەوە هـاتن، بـە یەکـەوە بـوون (وەك هـەژاری و نەخۆشـی، تـاو و سـلامەتی، سـەروەتو لـە خۆشیدا بوون):** چـار نەترسانو ترسەنۆکی پێکەوە دێن.
← بەشێك لە شتێك بوون.

١٥٢٢/ 4255- **پێکەوە هاتنـەوە، هاوئاهـەنگ بـوون، لێك هـاتن:** دیوتە، ئەو بلووزە چەند جـوان دەگـەڵ کراسـە درێژەکـەم دێتەوە؟ * هەموو لیباسەکانم زۆر جوان پێکەوە دێنەوە.
پێکوتران ← ناوبردن.
پێکوتن (ی شتێك بـە کەسـێك) ← (متمانـە کـردن بـە کەسێك و شتێك) دانە دەستی یان لە ئیختیاری نان.

١٥٢٣/ 5042- **پێگوتن، پێراگەیاندن:** پێشـنیارەکانیان زۆر بـە کورتی‌و لێبڕاوانە پێراگەیاندین.
← ئاگادار کردن، فێر کردن، ڕوون کردنەوە.
پێگەیشتنەوە ← وەرگرتنەوە.

١٥٢٤/ 5491- **پێگەیشتن، بە نەسیب بوون، وەبەرکـەوتن:** ماوەیـەك لەلای ئەو بێنەوە، بەڵکوو بەشێك لەو شانازییەت وەبـەر کەوێ.
← بەدەست گەیشتن.

١٥٢٥/ 1161- **پێگەیشتن، (وەك میراتێك) بەدەست گەیشتن:** ئـەو چیرۆکانە لەبابو باپیرانمان ڕا پێمان گەیشتوون.

١٥٢٦/ 1416- **پیلانگێڕان دژی:** چەند کەسێك بـە پیلانگێڕان دژی دەوڵەتی هەڵبژێراو تاوانبار کران.

١٥٢٧/ 3423- **پیلانگێڕان لەدژی/ بـە دژی، پیلان دارشتن بـە دژی، دەست دانە دەستی یەکتر بـە دژی:** تـاقمێکی چکۆلـە لـە ئەفسەرەکان پیلانێکیان بـە دژی دەوڵـەت دارشـتو، لـە ڕۆژی دیاریکراو دا دەسـەڵاتیان بەدەستەوە گرت.

١٥٢٨/ 2349- **پیلانگێڕان لەدژی، کلکەوبرالـە کـردن، پـاپووش دروست کردن بـۆ:** پـاپووش دروسـت کـردن بـۆ تـۆ کـارێکی دژوارە.

پێ لە بەرەی خۆ زیاتر راکێشان ← سنووری دەسەڵاتی خۆ بەزاندن.
پێ‌لە جێگایەك نان ← پێ تێنان.

١٥٢٩/ 7073- **پێ‌لەسەر... دانان، پێ‌لێنان:** جان هەر پێی لەسەر گەسکەکەی دانا، دەسکەکەی راست بوومەوەو وەدەمو چاوی کەوت.

١٥٣٠/ 7075- **پێ لەسەر کلکی کەسێك دانان، تووڕە کردن:** کابرایەك پێی لەسەر کلکی داناویو ئەتۆش ناتەوێ لەمەودوا قسەی دەگەڵ بکەی.

١٥٣١/ 6348- **پێ‌لەسەر کلکی خەڵك دانان، دڵی خەڵك ئێشاندن یان شکاندن:** ئەمن وەك کابرایەکی تازە وارید هەوڵ دەدەم پێ لەسەر کلکی کەس دانەنێم/ دڵی کەس نارەحەت نەکەم، بەڵام بە بڕوای مــن دەبێ بۆ بەرگری لەو زەرەروزیانە گەورەی کە بە هۆی دزیو فزیـیــەوە دێنە پێش کارێك بکەین.

١٥٣٢/ 7061- **پێ‌لێنان، پێشێل کردن:** لەســەعاتە قەرەباڵغەکانی رۆژدا خۆ لە میترۆی/ ئەندەرغراوندی لەندەن مەدەن، چونکە پاڵەپەستۆ دەدرێنو پێتان لە لاقی دەنێن.
← دان پێ‌داهێنان، پێ‌شێل کردن.
پێ‌مردن ← مردن بە هۆی.
پێ‌نانە نێو ← گەیشتنە نێو.
پێ‌نەزانین ←بایخ پێ‌نەدان.

١٥٣٣/ 4480- **پینەکردن، بەشێوەیەکی کاتی تەعمیر کردن:** چەند شووشەیان بە کاغەزی قاوەیی کەمرەنگ پینە کردبوو.

١٥٣٤/ 1742- **پینەکەوتن، شوێنی خراپ دانان لەسەر:** حاڵی باش نیە؛ ئەو شتەی خواردوویەتی پێی نەکەوتووە.
پێ‌نەهێشتن ← لێبڕین.
پێوابوون ← وانیشان دان، بە حیسابی شتێك گرتن، کەسێك لە جیاتی کەسێکی دیکە گرتن، ئیدیعا کردن.

١٥٣٥/ 4382- **پێوان، ئەندازە گرتن:** لە تەنیشت ساباتەکەوە نزیکەی چواریێ‌یان بپێوو سینگێکی داکوتن. پاشان هەر بەو مەودایە بڕێونو دەور لێ‌بدەن هەتا دەگەڕێنەوە ئێرە.

١٥٣٦/ 4383- **پێوان بە هەنگاو، هەنگاو کردن:** پانایی‌و درێژایی هۆدەکەی بە هەنگاو پێوان/ هەنگاو کردو دیتی کە بۆ مەبەستەکەی دەبێ.

١٥٣٧/ 6796- **پێوەبوون دەگەڵ کەسێك، دەگەڵ کەسێك کەوتن، وەدوای کەسێك کەوتن:** دایکو باوکەکەی، کە زۆر پێبەندی دابو نەریتان بوون، زۆریان پێ‌ناخۆش بوو کە پێیان زانی کورەکەیان دەگەڵ تاقمی ئانارشیستی ریش درێژ کەوتووە.
← تووشی دەردەسەر بوون، لەگیر کەوتن.
(زۆر) پێوە بوون ← (زۆر) پێ‌چوون.

١٥٣٨/ 5973- **پێوەدان لەسەر (زۆر بە توندی):** دەرفەتم نەکرد قسەی دەگەڵ بکەم- دەرگاکەی بە توندی لەسەر پێوەدامەوە.
پێوە بەستن ← دانان لەسەر.
پێوەدان ← لێ‌دروون.
پەیوەست بوون بە ← هاتنەنێو.
پێوە لکاندن ← زیادکردن لە.

١٥٣٩/ 7509- **پێوە لکاندن، زیاد کردن لە:** بۆ دابین کردنی مانگانەی بازنشستەیی/ تەقاعود زەمانەت نامەیەك لە قەراردادەکە زیاد کرلوە.

١٥٤٠/ 83- **پێوە لکاندنی ئاوچەیەك بە وڵاتێکەوە، خستنە سەر:** راست پێش دەست پێ‌کردنی شەڕ لە ساڵی ١٩٣٩دا، هیتلێر توانی چەند بەشێك لە ئورووپا بخاتە سەر خاکی ئاڵمان.

١٥٤١/ 3718- **پێوە ناڵین، لە دەستی شتێك رەنج کێشان:** رێژیمی تازە زۆربەی ئەو بێعەدالەتیانەی لەنێو برد کە خەڵك پێیانەوە دەناڵین.

١٥٤٢/ 3445- **پێوەندیی بڕین دەگەڵ، لە خەڵك جیا کردنەوەو دوور راگرتن، دوورە پەرێزی کردن:** دوای ساڵها کاری دژوار لە لەندەن، بڕیاریدا بچێ‌و لە دووڕگەیەکی چۆلی باکووری سکۆتلەند بژی‌و لە هەموو دۆستانی خۆی دوورە پەرێزی بکا.

١٥٤٣/ 6963- **(زیاتر لە پێوەندیی دەگەڵ حەز لێکردوویدا) پێوەندیی بڕین دەگەڵ، بەجێ‌هێشتن:** ئەو مارییە کەم تەمەنە فریوی‌داو فێری ئارەق خواردنەوەی کردو، دوایەش پێوەندیی دەگەڵ پساند. (بەجێی هێشت).

١٥٤٤/ 4034- **پێوەندی بە خودی... وە هەبوون، بەرپرسایەتییەکەی دەگەڕێتەوە بۆلای...:** ئەوە کە دەردەچی یان دەکەوی بە خۆت مەربووتە/ پێوەندی بە خۆتەوە هەیە. * ئەگەر ناتوانێ خۆی زەحمەت بداو نامە بنووسێ‌و، لە ناکام دا ئەو دەرفەتە لە دەست بدا، بەرپرسایەتییەکەی دەگەڕێتەوە سەرشانی خۆی.

١٥٤٥/ 7158- **پێوەندیی بە... هەبوون**: مەسەلەی وەدواخستنی سزادان رەنگە پێوەندیی بە تەمەنی قوربانی‌یەکەوە هەبێ.

١٥٤٦/ 1381- **پێوەندیی بە ...وە هەبوون**: ئەفسەرانی پۆلیس هەوڵ دەدەن لە هەر کەسێك کە پێوەندیی بە رووداوی دوێنێ شەوەوە هەیە پرسیار بکەن.

١٥٤٧/ 4034- **پێوەندیی بە خۆوە هەبوون**: ئەوە کە (لە تاقیکاری) دەردەچێ یان نا پێوەندیی بەخۆتەوە هەیە.

١٥٤٨/ 2251- **پێوەندیی پسانن دەگەڵ**: پێوەندییم دەگەڵ خواروبار فرۆشەکەمان بۆ هەمیشە پساندووە. ئەوە سێهەمین جارە باقی‌یەکەم کەم دەداتەوە.

پێوەندی دامەزراندن لەنێوان ← بوون بە یەك.

پێوەندیی دەگەڵ کەسێك پساندن ← رۆیشتن لە لای کەسێك.

١٥٤٩/ 318- **پێوەندیی گرتن دەگەڵ، لە تەماس دابوون دەگەڵ**، ئاخرین جار کە دەگەڵ دایکو باوکی خێزانت پێوەندیت گرتووە کەنگێ بوو؟.

١٥٥٠/ 5278- **پێوەندیی گرتن دەگەڵ، تێکەڵاوبوون دەگەڵ**: ئەو کچە بۆی سەختە بتوانێ دەگەڵ مامۆستای رێنوێنی‌و خوێندکارە هاوپۆلەکانی پێوەندیی دۆستانە بگرێ/ دامەزرێنێ.

١٥٥١/ 2069- **پێوەندیی هەبوون دەگەڵ**: لە بریتانیا ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە خەڵك دراوسێکانی خۆیان ناناسن. پێم شەرمە بڵێم کە لە کریسمسی رابردووە هەتا ئێستا پێوەندیەیەکەم دەگەڵ ئەو کابرایەی دراوسێمان نەبووە.

١٥٥٢/ 316 - **پێوەندیی هەبوون (دەگەڵ)، لە تەماس دابوون (دەگەڵ)**: دەگەڵ یەکێك لە دەڵاڵەکانی لەندەن، کە دەیەوێ جێگامان بۆ رێزبڕو بکا لە تەماس دام.

١٥٥٣/ 3252- **پێوەندیی هەبوون بە، بەستراوە بە**: سەرکەوتنی کۆنفرانس بەستراوەتەوە بە بڕیاری دەوڵەت کە ها ئێستا، ها تاوێکی، دێ دەبێ دەرچێ.

١٥٥٤/ 3942- **پێوەندیی هەبوون بە...**: نابێ پێمان وابێ کە مردنی ئەو کچە پێوەندیی بە بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی خورووێکەوە هەیە.

١٥٥٥/ 4531- **پێوەندیی هەبوون بە، هی کەسێك بوون، دارایی کەسێك بوون، ماڵی کەسێك بوون**: جووتیارەکان دەبێ لە پێوەندیی دەگەڵ کەڵك وەرگرتن لە لەوەڕگەکان دا کە دارایی گشتین، مافی خەڵك بپارێزن.

١٥٥٦/ 1645- **پێوەندیی هەبوون بە، سەربووت بوون بە. دەربارەی شتێك بوون**: یەکەمین وتاری پێوەندیی بە فریاگوزاری‌و ئاوەرۆ دەرکردنەوە بوو. ئەم حەوتووەش لەسەر باران قسان دەکا.

١٥٥٧/ 137- **پێوەندیی هەبوون دەگەڵ**: لە مێشکی منداڵان دا، پزیشك دەگەڵ دەرزی‌لێدان‌و ئێش‌و ژان پێوەندی هەیە.

پێوەندیی هەبوون ← رەبت دان، لەبەرپرسایەتیی کەسێك دابوون، تەئسیر دانان لەسەر، بەسترانەوە بە، تایبەت بە.

١٥٥٨/ 5983- **پێوەندیی جینسی هەبوون دەگەڵ**: ئەو کچە زۆر وشك بار هاتووە‌و زۆر لەوە بەگومانم کە دەگەڵ یارەکەی پێوەندیی جینسی هەبێ.

١٥٥٩/ 6283- **پێوەندیی خۆ بەشێوەیەکی باش یان خراپ دامەزراندن، هەنگاوی یەکەم باش یان خراپ هەڵێنانەوە**: پێم خۆشە ئەو کچە پێوەندیەیەکی ئوسوولی دەگەڵ براکەم دامەزرێنێ. ✱ ئەگەر چوویە لای سەرۆك سیفار دامەگرسێنە، چونکە بەم جۆرە هەنگاوی یەکەم ناحەز هەڵدەگری.

١٥٦٠/ 589- **پێوەندیی خۆ دەگەڵ ... پساندن**: پێوەندیی خۆی دەگەڵ بنەماڵەکەی بە گشت مەسەلەکانیەوە پساندووە‌و رۆیشتووە بۆ ئۆستralیا.

١٥٦١/ 4082- **پێوەندیی خۆ دەگەڵ کەسێك پساندن، تەماس دەگەڵ... قەتع بوون/ برین**: تەماس دەگەڵ کەشتی فانووس دارەکە پساوە، بەڵام زۆر زوو دادەمەزرێتەوە. ✱ هەرکەس ئاڵفرێد مامۆستای بووبێ، رێناچێ هەرگیزپێوەندیی خۆی دەگەڵ بپسێنێ.

١٥٦٢/ 3614- **پێوەندیی خۆ راگرتن، لە پساندن دەگەڵ**: هەتا چەند ساڵ دوای تەقاعود بوونی، پێوەندیی خۆی دەگەڵ ژمارەیەك لە هاوکارەکانی نەپساند، بەڵام بە تێپەڕبوونی زەمان، وردە وردە دەستی لێبەردان.

١٥٦٣/ -

١٥٦٤/ 6271- **پێوەندیی دۆستانە یان باش هەبوون دەگەڵ**: قۆناغی دووهەمی بەرنامەکەمیان سەرمایەیەکی زیاتری پێویستە‌و، ئەوە کە داخوا ئەو یارمەتی‌یەی کە پێویستیانە دەتوانن وەچنگی خەن، بەوەوە بەستراوەتەوە کە دەگەڵ پشتیوانەکانیان لە هەندەران تا چ رادەیەك پێوەندیی دۆستانەیان هەیە.

١٥٦٥/ 1581- **پێوەندیی کەسێك دەگەڵ... برین، گەمارۆدان، کەوتنە گەمارۆی...وە**: بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێك، گوندەکە کەوتبووە گەمارۆی بەفرەوە.

١٥٦٦/ 3215- **پێوەندیی نامەشروع هەبوون لەگەڵ، حەز لێکردن (کە لای کەم لایەنێکیان مێرد یان ژنی هەبێ)، کەین و بەین هەبوون:** دوای ئاشکرا بوونی پێوەندیی نامەشرووعی ژنەکەی دەگەڵ دۆستێکی کۆنی خۆی، دژکردەوەی پاول لە جیاتی ئەوە کە شۆکە بوون بێ، سەرلێشێوان بوو.

١٥٦٧/ 248- **پێوەندییەک بە... وە نەبوون:** ئەوە کە ژیلوان یان نێچیر تەسجیلەکەی ون کردووە، پێوەندییەکی بە مەسەلەکەوە نیە.

١٥٦٨/ 2540- **پێوەندییەکی نالەبار پەیدا کردن لەگەڵ، نێوان ناخۆش بوون لەگەڵ:** ئەو کچە بەستەزمانە بە قبووڵ نەکردنی چەند پەردەی کۆن کە خەسووی بۆی هێنابوو، هەر لە سەرەتاوە پێوەندییەکی خراپی دەگەڵ خەسووی پەیدا کرد.

١٥٦٩/ 6925- **پێوەنووسان (بە پیاوێکەوە بەمەبەستی مێرد پێکردن)، لێوسانەوە:** نەتتوانی خۆت راگری، دەنا نا؟ هەر یەکەم پیاوت چاوپێکەوت، پێیەوە نووسای، مەگەر نا؟.

١٥٧٠/ 2731- **پێوە نووسان (بە واتای مەجازی):** نیوەی خەڵکی وڵات بە تەلەوڤزیۆنەوە نووسابوون و پێشبڕکێی شازادە خانمی جوانیی جیهانیان چاو لێدەکرد.

١٥٧١/ 144- **پێوەنووسان، بە کەسێکەوە نووسان، وەدوای کەسێک کەوتن:** خەریک بووم پیاسەم دەکرد کە سەگێکی بەرەڵا وەدوام کەوتبوو و دەستی لێهەڵنەدەگرتم.

١٥٧٢/ 2502- **پێوەنووسان، دەست بەکار بوون بە هەموو توانایەوە:** کارە تازەکەم پێخۆش نیە، شتێکی وای تێدا نیە کە پێیەوە بنووسێم.

١٥٧٣/ 3848- **پێوە نووسان (وەک زەروو):** ئەو کچە (وەک زەروو) بە ژیلوانەوە نووساوە. ئەویش ناتوانێ فڕێیدا.

١٥٧٤/ 3082- **پێوەنووساندن، چەسپاندن:** تەمبرەکەیان باش بە بەستەکەوە نەنووساندبوو و لێبووەوە. بۆیە ناچارین بۆ جارێکی دیکەش هەزینەی پۆستییەکەی بدەینەوە.

١٥٧٥/ 1081- **پێوەنووسان، گرتنی شتێک بە دەست:** هێندێک لە قوربانییەکانی ئاورتێبەربوونی عیمارەتەکە، لە دیوەکان دەردەپەڕین، چەند دەقیقەیەک خۆیان بە چوارچێوەی پەنجەرەکانەوە هەڵدەواسی (= چوارچێوەکانیان دەگرت) و دوایەش بەرەو مەرگێک بەردەبوونەوە کە سەدمیتر لە خوارتر چاوەڕوانیان بوو.

← دەست لێهەڵنەگرتن، خۆ تێهەڵقوتاندن، گرتن.

١٥٧٦/ 6366- **پێوەنووسان، چەسپاندن، لێدان:** ئەگەر دەتەوێ خەڵک وابزانن ئەم جانتایەت زۆر سەفەری هەندەرانی پێکراوە. هێندێک ئێتیکێتی/ بیتاقەی بیانی لێدە.

← چەسپاندن، لێدان.

١٥٧٧/ 875- **پێویست هەبوون بە:** دیتنەوەی گرووپی خوێن و مەرەکەبێکی بەڵگەی تەزویری پێنووسرا بێ، پێویستیی بە لێزانییەکی تەواو هەیە.

← چاوەڕوانی کردن.

١٥٧٨/ 1820- **پێویستیی بە شتێک نەبوون:** بێگومان، هیچ پێویستییەکمان بە جان نیە کە هەر ٥ دەقیقە بە ٥ دەقیقە لەبۆزی بێنێتە پێشێ.

← نابەجێ بوون.

١٥٧٩/ 1814- **پێویستیی هەبوون بە:** ئێستا پێویستیم بە دوو حەوتوو پشوودان و رزگار بوون لە دەستی قاپ شوشتن هەیە.

١٥٨٠/ 7302- **پێویستیی هەبوون بە، موحتاجی... بوون:** منداڵەکانی موحتاجی هیچ شتێکی نین.

← زۆر چاک دابین کراون.

١٥٨١/ 6291- **پێویستیی هەبوون بە، کەمبوود هەبوون لە:** قەتارەکان یەکجار زۆر پێویستیان بە پسپۆڕی دەرەجەیەک هەیە.

پێ هاسان بوون ← دوو دڵ بوون.

١٥٨٢/ 3197- **پێهەبوون (ی شتێک)، بە خۆوە بوون:** پێم وایە پووڵی/ پارەی مەشرووب خواردنەوەیەکەت پێنەبێ. ● داخوا کلیلی مێزەکەی بەردەستانت پێیە؟.

١٥٨٣/ 6143- **پێهەڵپاشین:** بەلەمێکی ماتۆڕیی ئاوی بەسەر عەرشەی قەیاغەکەمان هەڵپاشی.

١٥٨٤/ 1632- **پێهەڵپرژاندن، پەنداگرتن:** ماشێنێک کە رادەبرد قوڕاوەکەی بە لیباسەکانم هەڵپرژاند.

١٥٨٥/ 6100- **پێهەڵپرژاندن:** لۆرییەک کە رادەبرد قوڕ و چڵپاوی بە باڵتۆ تازەکەم هەڵپرژاند.

پێ هەڵچوون ← وەسەرکەوتن.

١٥٨٦/ 3275- **پێهەڵگوتن بە دوور و درێژی:** پەولا کابرای دارتاشی ناساندو جا ئەوجار دەستی کرد بە هەڵگوتن بە هێز و توانا و کەسایەتی و تێگەیشتوویی خۆی.

١٥٨٧/ 1488- **پێهەڵگوتن، پەسن گوتن، تاریف کردن:** خلیسکێنی سەر ئاوێ بەو جوورەش نیە کە پێی هەڵدەڵێن.

← تاریف کردن.

١٥٨٨/ 6352- **پێهەڵێنانەوە بەسەر... دا:** بۆ ئەوەی بگەینە جێگاکانمان لە ستادیوم، ناچار بووین بە سەر ریزی قاچ و قولی درێژکراودا پێهەڵێنینەوە.

پێی کەسێك گرتنەوە ← ناکامی کارێك/ کردەوەیەك (ی خراپ) گەڕانەوە بۆلای خاوەنەکەی، داوێنی کەسێك گرتنەوە.

١٥٨٩/ 4967- **تاراندن، ڕەواندن، دوورکردنەوە، بێزار کردن لە:** دەیتوانی ببێتە فرۆشیارێکی/ فرووشەندەیەکی باش، بەڵام شێوەی ڕەفتارەکەی/ هەڵسو کەوت کردنەکەی مشتەرییەکانی دەتارێنێ.
← دڵسارد کردنەوە.

تار هەڵگەڕان ← داپۆشران لە (تۆز، مژ، فرمێسك و ...).

تاریف کردن ← پێهەڵگوتن، ڕوونکردنەوە، بەیان کردن.

١٥٩٠/ 798- **تاریف کردن، پەسن گوتن، پێهەڵگوتن:** زۆرم تاریف مەکە/ زۆرم پێهەڵمەڵێ. بە ڕاستی ئەوەندەش بلیمەت نیم.

١٥٩١/ 4675- **تاریك داهێنان، نوقمی تاریکی کردن یان بوون:** بە کوژانەوەی کارەبا، لەنەکاو ماڵەکە نوقمی تاریکی بوو.

١٥٩٢/ 5908- **تاریك داهێنان:** پەنجەرەکە کرابووە، بەڵام باران هەروەك پەردەیەك هەوای تاریك داهێنابوو.

١٥٩٣/ 453- **تازە، مۆدێرن، مۆد بوون:** جلو بەرگەکانی ئاخرین مۆد بوو. *ڕاپۆرتەکانی لە پێوەندیی دەگەڵ ئەفریقا دا تازەی تازەن (هی ئاخرین دەقیقەن).

تاسە کردن ← چاوەڕوانی کردن، ئارەزوو یان تاسەی کەسێك کردن.

١٥٩٤/ 5848- **تاشین، لێدان:** پێش ئەوەی کە بۆ وتووێژ بچی بۆ لەندەن، واباشترە ریشەکەت بتاشی.

١٥٩٥/ 7387- **تاشین، داتاشین:** کەمێك ئەم دووشاخەی کارەبایەم بۆ چکۆلە کەوە، بەڵام ئاگات لێبێ دارەکەی زۆر نەتاشی.

١٥٩٦/ 4419- **تاشین، داتاشین:** ملە پەیکەرەکەیان بە ئەسکەنەو چەکوچی هەتا خواری داتاشی بۆ ئەوەی کزو لاواز دیار بێ.
←هەڵپەرتاوتن.

تاقەت دانە بەرخۆ ← خۆ ئامادە کردن.

تاقەت لێبڕین ← لەپێخستن.

تاقەت هەبوون ← خۆ ئامادە کردن.

١٥٩٧/ 2062- **تاقی کردنەوە:** هەرتووی رابردوو کورەکەمیان لە بەشی یارمەتییە سەرەتاییەکانی پزیشکیدا تاقی کردەوە.

١٥٩٨/ 2063- **تاقی کردنەوە:** هەر کام لە خوێندکارەکانیان لە پێوەندیی دەگەڵ یەکێك لە لایەنەکانی سیستمی "عصبی" تاقی کردەوە.

١٥٩٩/ 7108- **تاقی کردنەوە:** ئەرێ ئەو قەڵەمەی دامێی باش کار دەکا؟ نازانم، وانەهاتۆتە پێش کە تاقی بکەمەوە.

١٦٠٠/ 6885- **تاقی کردنەوە، خستنە ژێر تاقیکاری:** ئێستا کە وەك ڕاوێژکاری زانستی بۆ هێزی هەوایی دامەزراوە، دەتوانێ تیئۆرییەکانی لە هەلو مەرجی دژواری شەڕدا تاقی بکاتەوە/ بخاتە ژێر تاقیکارییەوە.

١٦٠١/ 2083- **تاقی کردنەوە:** ڕۆژگارێکی بوو کە وڵاتی نۆروگۆنە بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کە دەیەوێ هەموو جۆرە دەوڵەتێك تاقی بکاتەوە. (واتە هەر جارەی جۆرە دەوڵەتێك بێنێتە سەرکار- وەرگێڕ).

١٦٠٢/ 7110- **تاقی کردنەوە لەسەر:** ئەم مارگارینە (ڕۆن نەباتییە) تازەیە لەلایەن کابانی ماڵان تاقی کراوەتەوە.

١٦٠٣/ 2082- **تاقی کردنەوە لەسەر:** خێزانم، پێش ئەوەی چێشتێکی تازە لە پێش میوانان دانێ، لە سەر من تاقی دەکاتەوەو، ناوی ئەم کارەشی ناوە "تاقیکاری لەسەر سەگ".

١٦٠٤/ 7109- **تاقی کردنەوە(ی کەسێك):** دەتوانی ئەم مەسەلەیە حەل کەی؟، هەتا تاقیم نەکەیەوە، دەرناکەوێ.
← ورد بوونەوە لە، هەڵسەنگاندن.

١٦٠٥/ 4739- **تاقی کردنەوەی... کەسێك لە رادەبەدەر:** کارێکی عاقڵانە نابێ ئەگەر بێتوو تەحەمولی ئەو خەڵکە لە رادەبەدەر تاقی بکەنەوە.

١٦٠٦/ 6380- **(خەڵك دەست بەسەر کردن و) تاڵان کردن:** باندێکی چەکداری جینایەتکاران قەتاری هەڵگری شمشی زێڕیان تاڵان کرد.

١٦٠٧/ 2436- **تاڵان کردن و هەڵاتن، دزین و هەڵاتن:** تاقمێك دز کە دەموچاویان بە گۆرەوی داپۆشیبوو بانکی...یان تاڵان کردو هەڵاتن.

تام خۆش بوون ← لە زاردا توانەوە.

تا ملان خواردن ← زۆر خواردن.

١٦٠٨/ 2573- **تام لێکردن، لەزەت بردن لە:** شامپاینم هیچ پێخۆش نیە، بەڵام لە تۆ لەزەت دەبەم.

تانە و توانج لێدان ← لاتاو پێدادان.

١٦٠٩/ 510- **تاوانبار كردن، گوناهی شتێك خستنە ئەستۆی كەسێك:** وەزعی خراپی بەدەنیی یاریزانــە باشـەكان تــا رادەیـەكی بەرچاو هێزی دەســت پێكردنـی یـەكجار خراپـی رێورەسمـی رۆژی یەكەم بوو.

١٦١٠/ 994- **تاوانبار كردن بە:** پۆلیس كـابرای بـەوە تاوانبـار دەكرد كە بە مەستی ماشێنی لێخوڕیوە.

١٦١١/ 17- **تاوانبار كردن بە:** مامۆستاكەی نێچری تاوانبـاری كرد كە لە تاقیكاری دا گزەی كردووە.

١٦١٢/ 6837- **تاوانبار كردن بە، تاوان وەپاڵنان:** لەوە بە گومـان بووم كە ماڵی قەڵبی پێفرۆشتووم، بەڵام كاتێك تاوانێكی ئەوتۆم وەپاڵ نا، زۆر بە توندی رەتی كردەوە.

تاوانبار كردن(ی كەسێك) ← بەرپرسایەتیی كارێك خستنە ئەستۆی كەسێك، تاوانێك خستنە ئەستۆی كەسێك.

١٦١٣/ 4947 - **تاوانبار ناسـاندن، نیشـاندان، تـاوانی... بـە ناروا خستنە ئەستۆی كەسێك:** هەمیشـە هـەوڵیداوە ئـەمن تاوانبار نیشان بدا بۆ ئەوەی لەو رێگایەوە پێوەندیی نێوان منو خوێندكارەكانی زانستگە تێك بدا.

١٦١٤/ 644- **تاوانێك خستنە ئەستۆی كەسێك، پـان وەپـاڵ كەسێك نان، تاوانبار كردن:** ئەگەر پاش تاریك بوونی هەوا ببینن كـە كابرایەك لەبەر دەرگـای ماڵەكـەتان دەخولێتـەوە دەكـرێ حەق بە خۆتان بدەن تاوانباری بكەن.

١٦١٥/ 5858- **تـاوانێك خستنە ئەستۆی خەڵكی دی:** هـەر كـات ئەخشەكانی پووچەڵ دەبنەوە، هەمیشە لە یەكێك دەگەڕێ كە تاوانەكەی بخاتە ئەستۆی.

١٦١٦/ 477- **تاو لێدان:** تاو لە سەرو گوێلاكی دەداین.

١٦١٧/ 96- **تایبەت بە، پێوەندیی هەبوون بە:** ئـەركو دەسـەڵاتی سەرپەرشتی قوتابیـاتی زانسـتگە هـەرگیز بەشـێوەیەكی رەسمی دیاری نەكراوە.

١٦١٨/ _

١٦١٩/ _

١٦٢٠/ 7212- **تـایپ كـردن لـە رووی:** ئـاخرین پێشنووسـی تێزەكـەی لەلایـەن سـەرپەرشتەكەیەوە پەسـند كـراوەو، وێستاش دەبێ بڕیا لە رووی تایپ كەنو بەرگی كەن.

١٦٢١/ 7211- **(راستەو خۆ) تـایپ كـردن (پێش ئـەوەی لـە پێش دا نووسرابێ):** ئەگەر دەقیقەیـەك راوەسـتی رەسـیدەكەت بـۆ تایپ دەكەم.

١٦٢٢/ 7210- **تـایپ كـردن (دەنێو، لەسەر):** خـۆت زەحمـەت مەدەو راگەیەندراوەكە تایپ مەكەوە. دەترانی ئەو ئـاوەی لە قەڵەم كەوتووە لە سەرەوەی دێرەكە تایپی بكەی.

١٦٢٣/ 3211- **ترسان، زەندەق چوون:** لە سـواری فڕۆكـە بـوون باكم نیە، بەڵام هەموو جارێ كە فڕۆكەكە هەڵدەستێ یـان دەنیشێ، زەندەقم دەچێ.

١٦٢٤/ 618- **ترسان، داخورپان:** پێی وابوو گوێی لـە دەنگێـك بووو داخورپاو نارەقەیەكی ساردی كرد.

١٦٢٥/ 2632- **ترسـان، داخورپـان:** كـاتێك لـە دەرگایـان داو پرسیاریان كرد داخوا فیلیپ لە ماڵە، ژۆزێـف زۆر ترسـا؛ پێیوابوو پۆلیسن.

١٦٢٦/ 5082- **ترساندن:** 'خـانمی بـاتی، بڕیـا لـە ترسـاندنی ویرجینیا دەستت هەڵگرتبا'.

١٦٢٧/ 1484- **ترساندن، ترسانو تەسلیم بـوون:** ئـەو لـەو جـۆرە پیاوانە نیە كە بترسێو تەسلیم بێ/ لە ترسان تەسلیم بێ.

١٦٢٨/ 6447- **ترساندن، زراو بردوو كـردن، تۆقـاندن:** بـۆ یەكـەم جار چوونەسەر پۆلێكی پڕ لە قوتابیی بەدفـەر لـە شـاری لەندەن، زۆر مامۆستای زراوبردوو كردوون.

١٦٢٩/ 4955- **ترساندن (زۆر بە توندی) زراوبردوو كـردن، تۆقـاندن، زەندەق بردن:** گرووپانی مەیدانی مەشق بە زراوچوو كردنـی/ تۆقـاندنی هـەر سـەربازێكی تـازە، كـاری خـۆی دەسـت پێدەكا.

١٦٣٠/ 6884- **ترسـاندنو كـارێك پێكردن:** فكـری ئـەوە كـە وێدەچوو منداڵـەكانی بكەونـە مەترسـییەوە ترسـاندیو ناچاری كرد كلیلەكانی سندووقە پۆڵاكە بەدەستەوە بدا.

١٦٣١/ 2358- **ترساندنو دوورخستنەوە:** ئەو كـارە نایترسـێنێ؛ منداڵی خۆش دەوێنو ئەگەر وانەبا ئێستا لێرە نەدەبوو. ← چاوترسێن كردن.

١٦٣٢/ 5093- **ترساندن لە، نیگـەران بـوون لـە:** ئیمكـانی ئـەوە هەبوو كە دوای بازنشســتە/ تـەقاعود بوونـی هاریسـون، جینكینز جێگای بگرێتەوە. ئەوەش روانگەیـەك بـوو كـە زۆری لێدەترساین.

١٦٣٣/ 3147- **ترسان لە، ناخۆش ویستن:** ئـەو كچـە هەمیشـە پیاوی ردێنداری ناخۆش ویستووە... .

١٦٣٤/ 3162- **ترسو خۆف پێك ئـەهێنان:** مەترسـیی نەناسـراو/ ئەو مەترسییانەی كە نازانین چنو لە كوێراو كەنگێ دێن نابێ ببنە هۆی پێك هاتنی ترسو خۆف.

ترشان ← هەڵگەران.

ترشوكە هاتن بە ← بە گرنگ نەزانین .

ترلێبەربوون ← ترپین.

ترووسكانەوە ← بریقەبریق كردن، روون بوونەوە.

ترەکین ← هێنانەسەر دنیا.

تری خۆو گێژەر لێك نەکردنەوە ← بەریین، یان بەر لووتی خۆ نەدیتن.

١٦٣٥/ 3873- تریین، تەر لێبەربوون، بالێیوولەوە: ئەگەر لە هەزدەی دانیشتن دا ترێکم لێبەرین، دەمنێرێتە نەخۆشخانەی ریعۆڵەکانم دەرێنن.

١٦٣٦/ 6137- تف کردنەوە: قورمێکی لە شەرابەکەداو زوو تفی کردەوەو' گوتی:' بۆ سرکە/ خەل'.

١٦٣٧/ 6135- تف لێکردن، تف لە دەم چاوی کەسێك کردن: ئەو خەلکەی کە پێشتر پشتیوانی‌یان لێکردبوو، تفیان لێدەکردو جنێویان پێ‌دەدا.

تفەنگ پێرەنان ← تیرئەندازی لێکردن.

تلانەوە ← پان بوونەوە.

تللور بوون ← پاڵدانەوە..

تلیسانەوە ← پان بوونەوە..

١٦٣٨/ 1739- توانایی خۆ وەگەر خستن بۆ: کاتێك لەسەر کار بوو، هەموو هێزو توانای خۆی بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتی نەژادە جۆراوجۆرەکان وەگەر خستبوو.

توانایی لە دەست دان ← هێزی کارێك نەمان.

١٦٣٩/ 3170- توانایی هەبوون، لێهاتوویی هەبوون: دەبینی کە ئەگەر لێهاتوویت هەبێ، دەتوانی زۆر باش ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنی. * هەرگیز لەوە خاترجەم نەبوو کە ئەو توانایی‌یەی هەیە کەسێکی خۆش بوێ، دەتوانی بۆ لای خۆی راکێشێ.

١٦٤٠/ 454- توانایی یان هێزی بەجێ گەیاندنی کارێك هەبوون، نەبوون، ئامادەی کردنی ... بوون: بەداخەوە ئەو توانایی بەرێوەبردنی ئەرکی سەرۆك کۆماری نییە. * لەو تۆفانەدا، هیچ کامان ئامادە نەبووین بچینە شار/ بۆچوونە شار ئامادەیی‌مان نەبوو.

← رقەبەری کردن.

١٦٤١/ 7282- تواندنەوە، کەم کردنەوە لە: ناچار دەبم زیاتر لە شاری وەدەرکەوم‌و بە گەڕان کەمێك لەم بەزە کەم کەمەوە/ بتوێنمەوە.

١٦٤٢/ 4265- تواندنەوە: دەبێ لە شەشە زێرەکان نیشانەی تایبەتی بدەن‌و پێش ئەوەی دزەکان بتوانن خۆیان لە دەستیان رزگار بکەن، بیانتوێننەوە.

١٦٤٣/ 5300- تواندنەوە، قاڵ کردن: چەوریی بەدەنی ئەهەنگ دەتوێننەوە بۆ ئەوەی بیکەن بە رۆن.

تواندنەوە یان توانەوە لە نێو... دا ← وەك یەك لێکردن.

توانەوە ← گەرم بوونەوە.

توپاندن ← کوشتن.

١٦٤٤/ 4266- (لە زاردا) توانەوە، ئەم خۆش بوون: ئەو کێکەی رۆژی لە دایك بوون هەر لە زاری‌دا دەتوێتەوە.

١٦٤٥/ 4884- توپاندن، کوشتن: سەگەکەمان، بیلی، دەهات بتوپێ‌و، لە مانگی سێپتامبەردا توپاندمان.

١٦٤٥-١/ 561- تۆپ باران کردن، دانەبەر رەهێڵەی تۆپان...: سەنگەرەکانی وڵاتە هاوپەیمانەکان کەوتە بەر تۆپ بارانی هەموو چەشنە تۆپخانەیەك.

١٦٤٦/ 4640- (لە یاری کریکێت دا) تۆپ بۆ لای گۆڵی خۆ لێدان.

١٦٤٧/ 4445- (لە یاری رەگبی‌دا)، تۆپ پاس دان بۆ پێشەوە: ئەگەر تۆپەکان بۆ پێشەوە پاس بدەن، داوەر دەستووری سکرام دەدا.

١٦٤٨/ 6863- (لە یاری گولف، فوتبال دا)، تۆپەکە لە جێگایەکی باش دانان‌و لێدان: رەختی ئەوەت نیە تۆپەکەت خۆش گەی‌و لێی‌دەی/ شووتی کەی.

١٦٤٩/ 4600- (لە یاری کریکێت دا)، تۆپەکە لە نزیکترین نوختەی "باتسمن" دان.

تۆران ← دڵسارد بوونەوە.

تورەز کردن لەنەکاو ← (لەنەکاو) ستوپ کردن.

تۆزی کەسێك نەشکاندن ← لە پلەیەکی خوارتردا بوون.

١٦٥٠/ 2557- تووڕە بوون، هەڵچوون: کامران، هەرجارێ کە زیبا کەمێك درەنگ دێتەوە، پێویست ناکا تووڕە بێ‌و کچی چاکەو دەبێ لێی ئەرخەیان بێ.

١٦٥١/ 432- تووڕە بوون، رەگی مل هەستان، خوێن (لە ...) پەیدا بوون: ئەشکەنجەگەران بە بڕیسانەوە نیهانەتیان دەکردو سەرەنجام ئەویش رەگی ملی هەستا....

١٦٥٢/ 5112- (زۆر بە توندی) تووڕە بوون، دەمەری بوونی قەڵس بوون لە: لە کەم ئەندامەتیی خۆی‌لە بۆتە هۆی ئەسیر بوونی بە دەستی کورسی‌یە/ سەندەلی‌یە چەرخدارەکەی یەکجار تووڕە بوو.

١٦٥٣/ 3249- تووڕە بوون، جاڕز بوون، وەڕەز بوون: وادیار بوو کە باوکم لەسەر مەسەلەیەك کە یەك شەمۆی رابردوو بۆی هاتۆتە پێش، یەکجار تووڕە بوو.

١٦٥٤/ 7479- تووڕە بوون، قەڵس بوون، هەڵچوون' لەوو گرانتر لەسەر شتێك کە بە هاسانی جێبەجێ دەبێ هێندە تووڕە مەبە.

١٦٥٥/ 2314- **تووڕه بوون، قەلس بوون:** منداڵەكە لەبیر قەڵس بوور، ئامرازەكانی كایە كردنی توڕ هەڵدا.

١٦٥٦/ 2319- **تووڕه بوون، هەڵچوون:** كاتێك بە خەریان گوت منداڵەكان سەوزییەكانیان شێلاوە، یەكجار تووڕه بوو.

١٦٥٧/ 555- **تووڕه بوون:** جان یەكجار تووڕه بوو. زووش دەركەوت بۆ، چونكە هیچ كەس پێی نەگوتبوو دەمانەوێ ماڵەكە بگۆڕین.

١٦٥٨/ 1030- **تووڕه بوون، دەرهەڵبوون:** باش دەزانی كە لە وەختی ئاوادا چۆن دەرهەڵدەبێ.

١٦٥٩/ 2369- **تووڕه بوون لە:** لەو كچە گارسۆنانە كە نیو سەعات رایان دەگرتینو دوایەش سووپی نیوە ساردیان دەداینێ، یەكجار تووڕه بووین.

١٦٦٠/ 536- **(یەكجار) تووڕه بوون لە كەسێك، بەسەر ... دا رووخان:** مامۆستای تازەمان بە هۆی ئەوە كە بۆ رێز گرتن لەو كڵاوەكەم لەسەرم دانەگرتبوو، بەسەرم دا رووخا.

١٦٦١/ 7522- **تووڕه بوون، هەڵچوون:** لەسەر خۆ بە، خەریكی لەسەر هیچ هەڵدەچی.

← بەسەر دا رووخان، گڕ گرتن.

١٦٦٢/ 4771- **تووڕه كردن، دڵەدان، كەلەر كردن:** هەر چەشنە لاتاو پێدادانێك لە پێرمندیی دەگەڵ كەم بوونی یارمەتی مانگانەكەی یەكجار زۆر تووڕەی دەكا، بە چەشنێك كە دژ كردەوەی توندو تیژ لە خۆی نیشان دەدا.

١٦٦٣/ 4873- **تووڕه كردن، هەڵوروژاندن:** ئەو كاتی گوتم كە هەرگیز نەمدەزانی خزمەتەكانیان تا ئەو رادە خەتەرناكە كەم كردۆتەوە. ئەو مەسەلەیە لە راستیدا خەڵكی یەكجار زۆر تووڕه كر دەبوو.

١٦٦٤/ 2537- **تووڕه كردن، هەراسان كردن، ناڕەحەت كردن، سەخڵەت كردن:** گرمەگرمی فرۆكان هەموو كەس ناڕەحەت دەكا.

١٦٦٥/ 2629- **تووڕه كردن، شێت كردن، كەلەر كردن:** رەفتاری ناحەزی وەها تووڕەی كردم كە دەمەویست بۆ خاتری دوو دەرزییان مستێكی لەبەر دەمی بدەم.

١٦٦٦/ 2628- **تووڕه كردن، ناڕەحەت كردن:** بۆ دەبێ داخوازێكی چووكە تووڕەت بكا؟

← پێ لەسەر كلكی كەسێك دانان، شێت كردن، دڵئێشاندن.

١٦٦٧/ 3562- **تووڕه نەبوون، رەگی مل هەڵنەستان:** ئەگەر ئاوا ئاگات لە دووچەرخەكەم بێ، لەمەودوا قەتت وێنادەم. رەگی ملت هەڵنەستێ! بۆت چاك دەكەمەوە.

١٦٦٨/ 4494- **تووڕ هەڵدان، دەست لێهەڵگرتن، بەرهەڵدان:** دوای ئەوە كە شریتەكەی لە بەردێكی گرێدا، بەرەو تاریكایی بەری هەڵدا.

← فڕێدانەوە.

١٦٦٩/ 1862- **تووڕەیی كەسێك بۆ لای خۆ راكێشان:** قاچت لەسەر میزی ناخودا (= فەرماندەی كەشتی) دامەنێ. غەزەبی خودا بۆلای خۆت رادەكێشی.

١٦٧٠/ 2862- **تووڕەیی نیشان دان، ئیزهاری گرژی كردن، هەڵاهەڵا كردن:** ... كوڕه بەرڵاكەی هاتەوە. دوو حەوتوو بوو نەهاتبوەوە ماڵێ. دایكی دەستی كرد بە هەڵاهەڵایەك خودا بزانێ.

١٦٧١/ 307- **تووش بوون (= هاتن)، بەرەورووبوون:** وادیار بوو/ وێدەچوو كە سەرمایەكی سەختمان لەپێش بێ.

١٦٧٢/ 3133- **بە هەڵكەوت تووش بوون، بەسەرداكەوتن، تێهەڵكەوتن:** 'ئەو بەردە بە قیمەتانەت لە كوێ وەدەست كەوتووە؟'. ' لە دووكانێكی جەواهیر فرۆشی لەشاری زنگیار بەسەریان دا كەوتم.

← چاوپێكەوتن، لەپێش بوون.

١٦٧٣/ 55- **تووش (ی نەخۆشی) بوون، لە ئازار دان، وێزروین:** بەستەزمانە تووشی نەخۆشیی شەكر بووە. بریا بەوهەموو پرتەو بۆڵەیەت ئەوەندە جارزت نەكر دبام.

تووشی باشترین... بوون← باشترین ... وەگیر كەوتن.

١٦٧٤/ 1300- **تووشی چارەنووسێكی خراپ بوون:** سڵاوی من بە كارلوس بگەیەنەو پێی بڵێ جۆرج تووشی چارەنووسێكی باش نەبووە.

← گەیاندن بە سەرەنجامێكی ناخۆش.

تووشی دەمەقاڵە بوون ← قسە لێك هەڵبەزینەوە.

١٦٧٥/ 2495- **تووشی دەردەسەر بوون، گرفتار بوون، پێوەبوون:** پێش ئەوەی شەریكەكەمان بە سەركەوتنەوە وەگەڕ كەوێ، واباشترە باسێك لە پێك هێنانی شەریكەی دووهەم نەكەین. دەنا تووشی دەردەسەر دەبین.

١٦٧٦/ 5547- **(بە هەڵكەوت) تووشی كەسێك بوون، چاو بە كەسێك كەوتن، تێهەڵكەوتن:** لە سكاتلەندێ بووم، بە هەڵكەوت چاوم بە مامۆستا پیرەكەی ئینگلیسیم كەوت.

← بەسەر كەسێك دا كەوتن، دیتن.

١٦٧٧/ 2360- **تۆقاندن، زراو بردوو كردن، زراو بردن:** كە جاروبار ژنەكەی ناچار دەبێ بە فرۆكە سەفەر بكا' زراوی دەچێ.

١٦٧٨/ 5621- **تۆقاندن، زراوبردوو كردن:** بە شەو بە گۆڕستان دا رامەبرن. كچان زراوبردوو دەكا.

١٦٧٩/ 5620- **تۆقاندن، زۆر ترساندن، زۆر ترساندن و دەر پەڕاندن:** غەوارە/ غەریبە هاتوچۆی ئەو ماڵە ناکەن. پێم وایە بولداگەکەیان (ئەوعە سەگێکە) دەیان ترسێنێ و هەڵیان دەکا.

١٦٨٠/ 2392- **تۆقـاندن، زراو بـردن:** بێ ڕەحمی یـەکی لـە قسەکانی ڕا دیار بوو کە پیاوی دەتۆقاند.
ترساندن (زۆر بە توندی).

١٦٨١/ 2982- **تۆو کردن:** زۆر حەیف بوو لێیان گەڕای ئەو کەلەمانە تۆوی بکەن، ئێستا ئیدی بەکاری هیچ نایەن.

١٦٨٢/ 5358- **تۆڵە (لێ) ئەستاندنەوە، تۆڵە (لـێ) کردنـەوە:** هێزەکانی ئەرتەش تۆڵەی ئەو عەمەلییاتانە دەستێننەوە کە پارتیزانەکان لەوبەری سنوور ڕا دێن و دەیکەن.

١٦٨٣/ 5370- **تۆڵە ئەستاندنەوە (لە کەسێك):** لە هێندێـك لـەو وڵاتانەدا، تۆڵە ئەستاندنەوە لە کەسێك کە بە یـەکێك لـە ئەندامانی بنەماڵەیـەکی ئیهانـەی کـردووە شـانازی بـە حیسێب دێ.

١٦٨٤/ 159- **تۆڵە ئەستاندنەوە (لە کەسێك)، تۆڵە کردنـەوە:** ئـەو کابرایەی کە تۆڵەی لێکردەوە، بـە تـەواوی لـەو تاوانـەی وەپاڵی درابوو، بێ گوناح بوو.

١٦٨٥/ 6729- **تۆڵـە ئەسـتاندنەوە یـان کردنـەوە:** تۆڵـە ئەستاندنەوە لەبەرامبەر تۆڵە کردنەوەیەکی رابـردوودا بـە واتای بڵاوکردنەوەی هەرچی زیاتری تـرس و خـوفـەو ئـاوی عەدالەت بەڕێوەبردن لەسەری دانانە.

١٦٨٦/ 1471- **تۆڵە ئەستاندنەوە یان کردنەوە:** هەمیشە ئـەو مەترسی یە هەبوو کە ئەگـەر لەسـەر ئـەرزی گوشارێکی زۆرمان بۆ دوژمن هێنابا، بۆی هەبوو بە هێرشی هـەوایی زۆر قورس تۆڵە بستێنێتەوە.

١٦٨٧/ 6136- **''تـو لـە رووت'' بـە کەسێك گوتـن:** راسـت بـرۆ ژوورو، لەو جێگایە دانیشە کە هەمیشە دەگەڵ ئەو لێـی دادەنیشتەو پێی بڵێ: تف لە رووت.

١٦٨٨/ 2445- **تۆڵـە کردنـەوە، تۆڵـە لێ ئەستاندنەوە:** مـارگرێت عادەتی وابوو کە لەبـەرچاوی خـەڵك، پارەکـەی بـەخۆدا بشـکێنێتەوە: رەنگـە ئـەوە رێگایـەك بـێ بـۆ تۆڵـە ئەستاندنەوە لەو کابرایە کە کاتێك بە تەنیا دەبـوون، بـە تەواوی بەسـەری دا زاڵ بوو.

١٦٨٩/ 2446- **تۆڵە لێکردنەوە:** کابرای دوکاندار حـازر نـەبوو رادیۆ خراپەکەی وەرگرێتەوە، بەو دەلیلە کە کـاتێك پێـی فرۆشتووم ساخ بووە. بۆیە بڕیارم دا لە رێگای نامەنووسین بۆ رۆژنامەکانی شار تۆڵەی لـێ بکەمەوە.

١٦٩٠/ 4485- **تۆڵـە لێکردنـەوە:** رەنگـە پێـت وابـێ کـە کەمتەرخەمی کردنەکەت لە بەرامبەر بەرپرسـایەتی یەکان دا هـەروا دەڕوا، بـەڵام ڕووداوەکـانی داهـاتوو تۆڵـەت لێدەکەنەوە.

١٦٩١/ 5823- **تۆڵە لێکردنەوە یان لـێ ئەستاندنەوە، حیسـاب دەگـەڵ کەسێك رێك کردن:** ئەو پێی وایە شکستی داوین، بەڵام، پێش تەواوبوونی حەوتوو حیسابی دەگەڵ رێك دەکەم.

١٦٩٢/ 4497- **تۆڵـە لێکردنـەوە:** ئەگـەر هـەروا خـەڵکی بڕەنجێنی، یەکێك دەبێ تۆڵەت لـێ بکاتەوە.
← حیساب پاك کردن دەگەڵ، مست لێدان.

١٦٩٣/ 3117- **توند گرتـن، خـۆ قـایم راگرتـن، موقاوەمەت کـردن:** باشترین کارێکی کـە لـە دەستمان دێ ئەمەیـە کـە لـە جێگای خۆمان ئەبزووین و، ئەگەر پـەناگاکانمان هەڵکـەنین دەتوانین موقاوەمەت بکەین.

١٦٩٤/ 4268- **توندو تیژ بوون دەگەڵ، بە توندوتیـژی رەفتـار کـردن دەگەڵ، هـەڵس و کـەوت کـردن دەگـەڵ بەشێوەیەکی ناڵـەبار:** ئەگـەر خۆشی دەویستی، ئەتدەتوانی دەگـەڵی میـهرەبان تربـی؟ ئەتۆ نابێ دەگەڵ کەسانی وەك کامران ئاوا بە توندو تیژی بجووڵێیەوە.

١٦٩٥/ 802- **توندو تیژتـر بـوون یـان کـردن:** ئـەو چەشـنە هەنگاوانـە گـێرەو کێشـەی کۆمەڵایـەتی تونـدو تیژتـر دەکەن.
← خۆش کردنی ئاوری دژایەتی یەك.

١٦٩٦/ 4782- **توندو تیـژ جووڵانـەوە دەگـەڵ، خـراپ رەفتـار کـردن دەگەڵ، خراپ جووڵانـەوە دەگـەڵ:** ئەگـەر ئـاوا ناحـەز دەگـەڵم بجووڵێیەوە، وادەقیژێنم کە میچەکە بێتەخوارێ.

١٦٩٧/ 1485- **توندو تیژی بە خـەرج دان:** هەمیشـە لـە هـێزی پۆلیسیان دەوێ لەبەرامبەر ''معتادان'' دا توندو تیژی بە خەرج بدا.

١٦٩٨/ 3349- **تەئسیر دانان لەسەر:** کچەکـە بـە ڕووخۆشـی و قسەخۆشەکانی تەئسیری لەسـەر پێرەمێـردی خـۆی دەگـەڵ دەزگیرانەکەی دانابوو.

١٦٩٩/ 3199- **تەئسیر دانان لەسەر، پێوەندی هـەبوون دەگـەڵ:** ئـەو خاڵانەی باسیان دەکەی پێوەندی یان بەو کێشەوە هەیە کـە لە دادگادا پێی ڕا دەگەن.

١٧٠٠/ 467- **تەئسیر دانان لەسەر...، شـوێن دانـان لەسـەر:** ئەوانـە کۆمەڵە بڕیارێك بوون کە لەسـەر خۆشبەختی هەموو کەس شوێنەواریان هەبوو (تەئسـیریان هەبوو).

← شوێن لەسەر دانان، کار کردن لە، قسە ڕۆیشتن.
تەئکید کردن لەسەر ← جەخت دانان لەسەر، جەخت کردن، یان دانان لەسەر.

١٧٠١/ 469- **تەئییدکردن، دروستیی ... نیشان دان:** ئەو فاکتۆرانەی بەدەستەوەن دروستیی ئەو "فرضیە" نیشان دەدەن.

١٧٠٢/ 108- **تەئییدکردن، پشتیوانی کردن لە، قبووڵ کردن:** ئەگەر نەخشەکەم لەلایەن کۆمیتەوە تەئیید نەکرێ، تەواو ڕەنج بەخەسار دەبم.

تەبرەئە کردن ← بێ‌گوناح ناسین.
تەبعید کردن ← دوور خستنەوە.
تەبلیغ کردن بۆ ← بانگەشە کردن بۆ.
تەپ کران ← وەلانران.
← تەپ کردن، وەدەرنان لە یاری، حەزف کردن، دەنگدان.

١٧٠٣/ 579- **تەپ کردن، وەلانان، لە کایە دەرکردن، وەدەرنان:** پێش نیوەڕۆیە، نیوەی یاریزانەکان تەپ کران.

١٧٠٤/ 1944- **تەپڵ پێهەڵدان، کوتان، داگرتن:** خوڕەی باران لەسەربانی ئاسنینی دیوەکەم نەیهێشت هەتا بەیانی خەوم لێ بکەوێ.

١٧٠٥/ 599- **تەجزیە کردن، جیا کردنەوە، تەرکیبی شیمیایی ... گۆڕین.**

تەعتیل کردن ← هەڵوەشاندنەوە.

١٧٠٦/ 3355- **تەحریک کردن:** لە هەموو وڵاتان ئەو کەسانەی خەڵک تەحریک دەکەن بە ڕاپەڕین، خیانەتکار بە حیسێب دێن.

١٧٠٧/ 3015- **تەحریک کردن، دنەدان:** سەربازەکان زۆر باش پەروەردە کرابوون و سەرەڕای دنەدرانیان، لە هێرش بردنەسەر خۆپیشاندەرە کوڕو کچە لاوەکان کە هەڵایان ساز کردبوو بەردەبارانیان دەکردن خۆیان پاراست.

١٧٠٨/ 2353- **تەحریم کردن:** شیرکەتە گەورەکان هێندێک لە شیرکەتە چکۆلەکانیان تەحریم کردووە.

١٧٠٩/ 1793- **تەحقیر کردن، شکاندنەوە، شکاندن:** ناکرێ پیاو باوەڕ بکا چەندە سپڵە و پێ‌نەزان و بێ‌شەرمەن؛ شەو و ڕۆژ خەریکن یەکتر تەحقیر دەکەن.

١٧١٠/ 5533- **تەحقیر کردن:** هەمیشە لەبەرچاوی خەڵکی مێردەکەی تەحقیر دەکا. سەرم لێ سووڕماوە، چۆن دەتوانێ لێی قبووڵ بکا.

تەحلیف ← سوێند خواردن.

١٧١١/ 7180- **تەحویل دان، بە دەستەوەدان، دان بە:** چۆن دەزانی پۆلیس لێی دەگەڕێ؟، بۆ دەبێ لێی بگەڕێن؟، ئەگەر پۆلیس لێی بگەڕێ، دەبێ بە دەستەوەی بدەین/ تەحویلی بدەین.

١٧١٢/ 7143- **تەحویل دان، دانە دەستی ...:** دەزانم پێت وایە، بۆ ئەم سزایە ئەشێم، بەڵام تکایە تەحویلم مەدەوە/ بە دەستەوەم مەدە، تکات لێدەکەم!.

١٧١٣/ 2696- **تەحویل دان، دانە دەستی ...:** کچۆلەکە ئاشقی کابرای جاسووس ببوو، بەڵێنیی پێدابوو کە لە دیوی ژێر شیروانی بیشارێتەوە و هەرگیز نەیداتە دەستی پۆلیسان.

← دان بە
← دانەوە.

١٧١٤/ 6558- **تەحەممول بە خەرج دان، خۆ ڕاگرتن:** کارەکەت بەجێ مەهێڵە. ماوەیەکی دیکەش تەحەممول بە خەرج بدە.

١٧١٥/ 5088- **تەحەممول کردن، هەڵکردن لەگەڵ:** زۆر مەسەلە هەن کە پیاو ناتوانێ تەحەممولیان بکا. دەم هێنانە پێشەکەی یەکێک لەوانە.

١٧١٦/ 5944- **تەحەممول کردن، قبووڵ کردن:** ئەو پیاوێکی لەسەرەخۆو بوردبارە، بەڵام نەک هەتا ئەو رادەیە کە تەنانەت ئەو جۆرە تەحریکاتە/ دنەدانە قبووڵ کا.

تەحسین کردن ← ئافەرین گوتن بە.

١٧١٧/ 546- **(دەرگاو ...) تەختە کردن، بەستن:** پەنجەرەکانی خوارێ تەختەکران، زۆرتر بۆ ئەوەی کە منداڵەکان پێیان هەڵنەڕۆسکێن و مزاحیم نەبن.

تەخفیف دان ← ئارام کردنەوە.
تەخمین لێدان ← هەڵسەنگاندن و داوەری کردن، بەراوەرد کردن، نەرزیابی کردن.

١٧١٨/ 3430- **(بەناحەق) تەداخول کردن، لە خۆڕا خۆ دەشتێک هەڵقورتاندن:** زۆر بەداخم کە لە خۆڕا لە گرفتارییەکەت دا تەداخول دەکەم، بەڵام ئەمە مەسەلەیەکە کە پێویستیی بە وردبینییەکی تەواو لە لایەن خۆتەوە هەیە.

١٧١٩/ 853- **تەداخول کردن، دەست تێوەردان:** نامەوێ لە بواری تێکنیکییەوە تەداخول بکەم.

١٧٢٠/ 3408- **تەداخول کردن لە ...دا، دە تێوەردان دەست تێوەردان، خۆتێوەردان لە:** بە قەم دەکەی خۆ لە کارێک وەرمەدە کە لێی نازانی یان بە هەر حاڵ پێوەندییەکی بە تۆوە نیە.

تەدریب ← مومارەسە کردن.
تەڕبوون ← خووسان.

١٧٢١/ 3453- تەرتیب دان، جێبەجێ کردن: لەچوونە پشوودانەکەت چ خەبەر؟ ئایا هەموو شتێکت بە باشی جێبەجێ کردووە؟. * پێویست نەبوو نیگەرانی بیتاقەو جێگای مانەوەمان بین؛ بەشی سەفەر کردن، هەموو کارەکانی بۆ جێبەجێ کردبووین.

١٧٢٢/ 122- تەرتیب دان، کارێکی واکردن: کارێکی وادەکەم کە سبەینێ پێش هەموو شتێک ئەم بەستەیە بەرێ کرێ.

١٧٢٣/ 2267- تەرتیب دان، جێبەجێ کردن، سازمان دان: بۆ سەفەرەکەم بۆ مادرید هیچم نەکردووە. بۆ بە یەکێك لەو شەریکە موسافیربەرییانە ناڵێی بۆت جێبەجێ بکا؟

← رێکو پێك کردن، سازمان دان، جێبەجێ کردن بۆ، رێك خستن.

١٧٢٤/ 5692- تەرتیبداکی کارێك: مارتین کارەکەی وا تەرتیب داوە کە نێرسەکان (سیستەرەکان) تەنیا بە ئەرکی رۆژانەیان هەستن/ تەنیا ئەرکی رۆژانەیان جێبەجێ بکەن.

١٧٢٥/ 7065- تەرجومە کردن، وەرگێران: ئەو وەرگێرانەی کە رێکخراوە نێو نەتەوەییەکان دایاندەمەزرێنن دەبێ بتوانن هاوکات لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە وەرگێرن/ تەرجومە بکەن.

← وەرگێرانە سەر.

١٧٢٦/ 2674- تەرخانکران بۆ: بەشی زۆری توانایی بەرهەم هێنانمان بۆ مۆدێلی تازە تەرخان کراوە.

١٧٢٧/ 4923- تەرخان کردن بۆ: چەند سەعاتێك بۆ بڕوار تەرخان بکەن، جا ئەویش کەیفی ساز دەبێ!.

← هەڵگرتن بۆ ، هەوسار کران.

١٧٢٨/ 2562- تەرخ کردن، نەهێشتن، لە دەست دان: دوای دوو ساڵ بەسەر بردن لە هوتێل، توانایی بەخۆڕا گەیشتنم لەدەست دابوو. * ئەگەر بتوانیبا ئەو سیغارکێشانەت تەرخ بکەی، زۆر زوو چاك دەبوویەوە.

١٧٢٩/ 3773- تەرخ کردن، دانان، وەلانان، دەست هەڵگرتن لە: ئەگەر بتوانم رەفتاری خراپی خۆم باشتر بکەم، ئەوانیش لە بەکار هێنانی زۆر دەست هەڵدەگرن.

← وەلانان.

١٧٣٠/ 5608- (تەواو) تەر کردن: نیسفەنجەکە دەنێرو ناوەکە رۆکەن هەتا تەواو تەڕ دەبێ.

١٧٣١/ 1592- تەرك کردن، فڕێدان: بۆ ئەوەی وەزعی بەدەنی وەك تاقی لاوەتی لێبکاتەوە، خواردنی مەوادی قەندی بە تەواوی تەرخ کرد، دیارە بۆ ماوەی هەوتوویەك.

← گەورە بوونو تەرخ کردنی عادەتێك.

١٧٣٢/ 6962- تەڕو وشك بە یەکەوە سووتاندن: ئێمە دەبێ ورد بین نابێ تەڕو وشك پێکەوە بسووتێنین. ئەرکی دژواری ئێمە کونترۆڵ کردنی تێکنۆلۆژییە نەك پشت تێ کردنی.

تەریق بوونەوە ← خەجاڵەت بوونەوە.

١٧٣٣/ 4832- تەزریق کردن (ی پوول) لە ...: ئەوە کە بۆ دەبێ دەوڵەت پووڵ لە گەلە سنعەتێك تەزریق بکا کە لە باری نابوورییەوە ناتوانن گەشە بکەن، رەنگە هۆکاری گەورەی کۆمەڵایەتی هەبێ.

١٧٣٤/ 3378- تەزریق کردن، لێدان: سیستەرەکان دەبێ وشیار بن کە نەکا هەوا لە رەگی نەخۆشەکان تەزریق بکەن.

تەسادوف کردن ← رێك کەوتن.

١٧٣٥/ 5228- تەسجیل کردن، زەبت کردن: توانیمان تەواوی کونسێرتەکە لە کاتی بڵاوکرانەوەی راستەو خۆی لە رادیۆوە تەسجیل بکەین.

١٧٣٦/ 3715- تەسلیم بوون، دەست هەڵگرتن (لە): سەرەرای وتووێژێکی یەکجار زۆر، قوتابییە/ خوێندکارە سەرکێیەکان حازر نەبوون تەسلیم بنو هەروا دەستیان بەسەر هۆدەی جێگری سەرۆکی زانستگەدا گرتبوو.

١٧٣٧/ 3765- تەسلیم بوون، چەك دانان: زۆربەی سەربازەکانیان بە هاسانی تەسلیم بوون.

١٧٣٨/ 6532- تەسلیم بوون: ئەفسەرێکی ئاڵمانی بە هۆی دیلماجێکەوە تێدەکۆشا وادارمان کا تەسلیمی ئەرتەشی قارەمانی ئاڵمان بینو... .

← بە چۆك داهاتن.

١٧٣٩/ 6511- تەسلیم بوون لە بەرامبەر: ئەگەر خاوەن سنعەتەکان ئەم گشتە پارەیە خەرجی بانگەشە دەکەن، دەتوانن بەو هۆیە بێ کە دەزانن خەڵك لەبەرامبەر دنەدانی راگەینە گشتییەکان دا تەسلیم دەبن.

١٧٤٠/ 7527- تەسلیم بوون لە بەرامبەر، قبووڵ کردن: ئەگەر لەبەرامبەر ئەقڵو مەنتیق دا تەسلیم نەبن، دەبێ شێوەی دیکە بەکار بێنین.

١٧٤١/ 6499- تەسلیم بوون لە بەرامبەر ... دا: لە بەرامبەر ئەو جۆرە گوشارانەدا ئێمە تەسلیم نابین.

١٧٤٢/ 1534- تەسلیم کردن، بە چۆك داهێنان: ئەو بەرهەڵستکارییانەی لێرەو لەوێ درێژەیان هەبوو لە بەرامبەر ئەرتەشی سەرکەوتوو لە شەڕدا بێبەزەییانە تێك شکانو تەسلیم بوون.

١٧٤٣/ 3103- **تەسلیم کردن، پێشکەش کردن:** وەزیرەکە بە هۆی نارەزایەتیی لە سیاسەتی نوورووپایی دەوڵەت خۆکێشانەوەی لە بەرپرسایەتیی بە نووسراوە پێشکەش کرد.

١٧٤٤/ 5303- **تەسلیم کردن، بەدەستەوەدان:** پاش گەمارۆیەکی دوورو درێژ، شاریان تەسلیمی راپەڕیوەکان کرد.

١٧٤٥/ 2691- **تەسلیم کردن، بەجێهێشتن بۆ:** ژێنراڵی فەرماندە حازر بوو چەند مایلێك لە دەشتەکە بۆ دوژمن بەجێبێڵێ‌و هێزەکەی بۆ خەتێکی قایم ترو قابیلی پاراستن پاشەکشە پێبکا.

١٧٤٦/ 736- **تەسلیم کردن، گرتن (ی ناوچەیەك)، خستنە ژێر دەسەڵاتەوە:** گرتنەوەی ناوچەیەکی هەڵبڕاو، بە حەشیمەتێکی چەند میلیۆنییەوە، کارێکی هەروا هاسان نیە.

١٧٤٧/ 7528- **تەسلیم کردن، بەدەستەوەدان:** شارەکە تەنیا کاتێك بەدەستەوە دەدرا کە پاشەکەوتی تەقەمەنی‌و خواردەمەنی تەواو بوویا.

← دانەدەست.

١٧٤٨/ 3927- **تەشبیهە کردن، وەك یەك لە قەڵەم دان:** کابرایەك دەنگی وی وەك وەڕە وەڕی سەگی بولداگ لە قەڵەم داوو، گوتی وەك وەڕەی سەگی بولداگ دێچی.

تەشخیس دان ← لێك جیا کردنەوە.

تەشویق کردن ← دڵگەرم کردن، یارمەتیدان.

تەشەککور کردن لە ← سوپاس کردن لە.

تەعلیق لێدان ← لاتاو پێدادان.

١٧٤٩/ 1584- **تەفاوەت، جیاوازی:** لە نێوان کرێکارانی بە ئەزموون‌و بێ‌ئەزموون جیاوازییەکی بەرچاو نیە. * پیاو ناتوانێ بڵێ زۆر گەرمەو لە رادە بەدەر گەرم چ جیاوازییەکیان هەیە.

١٧٥٠/ 7242- **تەفاوەت کردن لە ... هەتا:** مەسرەفی نەوتی مانگانەیماڵێ لە ١٥٠ گالۆن لە زستانێ هەتا هیچ لە هاوینێ‌دا تەفاوەت دەکا.

١٧٥١/ 5144- **تەفاوەت کردن لە ... هەتا، گرتنەوە، لە ...را هەتا ... بوون:** یارمەتیی ئیجباری لە سێ پێنێ را هەتا پوندێکە.

١٧٥٢/ 1602- **تەفروتوونا بوون:** پاشەکشە بوو بە هەڵات هەڵاتەو ئەوانەی کە دەبوو هێرشیان کردبا، دوژمن تەفروتوونای کردن، دوژمنێك کە تەنگی پێ‌هەڵچنین.

← لێك بڵاوبوون.

تەقاعود کردن ← بازنشستە کردن.

١٧٥٣/ 5774- **تەقاندنەوە:** چکۆلەترین پریشکێکی ئاگر دەتوانێ ئەم تەقەمەنییەی لێرە لە ئەمبارداییە بتەقێنێتەوە.

← هاویشتن.

تەقڵە لێدان ← وەرگەڕان.

١٧٥٤/ 4764- **تەقوییەت کردن:** کابرای وەزیر گوتی تەقوییەت کردنی ئەو شەریکانەی بەرەو نابووتی دەچن ئەرکی سەرشانی هیچ دەوڵەتێك نیە، هەر چەندیش ناوو ناوبانگێکی باشیان هەبێ.

١٧٥٥/ 4692- **تەقوییەت کردن، پێداچوونەوە، بەهێز کردن، بەسەر شتێك داچوونەوە:** ناچار دەبم هێندێك بەسەر زمانی ئیتالیایی‌دا بچمەوە، خەریکە لەبیرم دەچێتەوە.

١٧٥٦/ 6392- **تەقەڵ لێدان، درووتەوە:** ناچار بوون برینە قوولەکەی قامکی بدروونەوە.

١٧٥٧/ 5873- **تەقەی هەوایی کردن‌و شار یان گوند فەرتاندن:** هیچ کەس ناتوانێ پێشیان بگرێ. دێهانیش دەگەڕێنەوەو، هەر بە گاڵتە دەست دەکەنەوە بە تەونەندازی‌و وەزعەکە دەشێوێنن.

تەقین ( لە حەیفان) ← وەزگدان.

١٧٥٨/ 6097- **تەقینەوە:** بە هۆی پاژنەی ئاسنی کەوشی کابرایەك کە وەبەردی ئەرزەکە کەوت تەقەمەنییەکە/ مینەکە تەقیەوە.

١٧٥٩/ 4697- **تەقینەوە:** شتێکی زۆر نوورانی راست لەسەر سەرمان تەقیەوە.

١٧٦٠/ 538- **تەقینەوە یان لەتکەت بوون:** بۆمبەکە بە گرمەیەکی وەها تەقیەوە کە گوێی پیاوی کەڕ دەکرد. * دوژمن ماڵەکەی دیکەی تەقاندیەوە. * بە کەنار پردە تەقێنراوەکان دا رابردین.

١٧٦١/ 7034- **تەقینەوە، تەقاندنەوە:** ئەم تەقەمەنییە دەبێ زۆر بە لەسەرەخۆیی هەڵیگیرێ، چونکە هەر بە ئەسپایەك بجووڵێتەوە دەتەقێتەوە.

← لە نێو چوون، دەنگ بەرز بوونەوە.

١٧٦٢/ 1957- **تەکاندن، خاوێن کردنەوە (ی کەسێك):** کامران هەموو گیانی رەڵەو چیمەنتۆ بوو؛ هەڵمان ئەستاندەوە سەرپێ‌و تەکاندمان.

١٧٦٣/ 5449- **تەکسیر کردن، نوسخە لێهەلگرتن، کۆپیە کردن:** دەتوانن نوسخەی زیادی دیکە زۆر بە خێرایی بە ماشێنی پۆلی‌کۆپی تەکسیر بکەن.

١٧٦٤/ 5552- **تەکسیر کردن، نوسخە لێهەلگرتن:** ناچارم بە دەزگای پۆلی کۆپی چەند نوسخەیەکی لێ‌تەکسیر بکەم.
← تەکمیش کردن، هەرەس کردن، هەڵپەرتاوتن.

١٧٦٥/ 5051- **تەکمیل کردن، تەواو کردن:** ئیچێروان خەرێك بوو ئاخرین وردە کاری‌یەکانی راپۆرتەکەی/ گوزاریشەکەی تەواو دەکردن.

١٧٦٦/ 5477- **تەکمیل کردن:** چیرۆکەکەت کەمێك لاوازە. بۆ ئەوەی تەکمیلی بکەی دەبێ رووداوەکان وردتر باس بکەی.
← تێروتەسەل کردن، تەواو کردن.
تەکو تەنیا ← کەشتی لێ‌شکاو.

١٧٦٧/ 2302- **تەکە تەکە کردن، تلپە تلپ گرتنەوە:** دایە گەورە لە حالێك دا جووتێك نەعلی/ دەمپێی سەرفەرشانی دەپێدا بوو، بە تەکەتەك دەهاتە دەچوو.

١٧٦٨/ 4961- **تەلقین کردن بە، لە مێشکی خەڵکی‌یەوە بردن:** بیرەو بەوێ دا دەگەرێو بە خەڵکی تەلقین دەکا/ئەوە دەبا دەمێشکی خەڵکی‌یەوە کە ئوتوپیا (بە هەشتی خەیاڵی) چەند هەنگاو زیاتر لێ‌یان دوور نیە.
← فێر کردن.

١٧٦٩/ 6689- **تەلەفات لێدان، زیان پێگەیاندن. زەرەر لێدان:** ئێستا ئیدی دوژمن لەنێو چووە: بە هۆی عەمەلیاتی زەمینی‌و هەوایی، تەلەفاتێکی یەکجار زۆری وێکەوتووە.

١٧٧٠/ 5877- **(زاراوەیەکی ئەرتەش) تەلەفات وێکەوتن:** هەنگی جان لە ئاخرین هێرش دا تەلەفاتێکی قورسی وێکەوتووە. قەرارە جێگای مەئموورییەتی بگۆرن.

١٧٧١/ 5041- **تەلیفوون کردن، زەنگ بۆ لێدان:** زۆرت مەحتەل ناکەم، دوو سێ تەلیفوون هەن کە دەبێ بیانکەم.

١٧٧٢/ 5390- **تەلیفوون کردن بۆ لەم و ئەو:** پێش ئەوە کە بۆ دەزگای گەرم داهێنەری ناوەندیی ئەوت بکرێ، بۆ ئەو کەسانەی ئەوت دەفرۆشن تەلیفوون بکەو بزانە کامیان مەرجی باشتر پێشنیار دەکەن؟

١٧٧٣/ 5391- **تەلیفوون کردنەوە، زەنگ لێدانەوە:** بەداخەوە ئاغای تامپسون جارێ تەشریفیان نیە. داخوا دەکرێ ئەمرۆ بەیانی کەمێك درەنگ تر تەلیفوون بکەیەوە؟

١٧٧٤/ 5392- **(سەر لە نوێ) تەلیفوون کردنەوە (پاش جارێك قسە کردن):** ئێستا هەموو ورد شتەکانم پێ‌نیە. دەکرێ پاش دە دەقیقەی دیکە تەلیفوونت لێ‌بکەمەوە؟
←سەرلەنوێ تەلیفوون کردنەوە.

١٧٧٥/ 5404- **تەلیفوون لێکردن، زەنگ بۆ لێدان:** بریا ئەو عادەتەی تەرك کردبایە کە لەسەر ناغواردن تەلیفوونم بۆ نەکا.

١٧٧٦/ 1213- **تەماس پەیدا کردن دەگەڵ، وێککەوتن، کەوتنە سەریەك، بینن، تەماس گرتن دەگەڵ، سەروکار هەبوون دەگەڵ:** کاتێك ئەو پارچە ئاسنە دەگەڵ وایەرەکان تەماس پەیدا بکا/ وێك کەون، مەداری کارەبا تەکمیل دەبێ. * لە کارەکەی خۆیدا وەك کارمەندی پێوەندی‌یە گشتی‌یەکان دەگەڵ زۆر کەس سەروکاری دەبێ.
← چاوپێکەوتن، وەدەست هێنان.

١٧٧٧/ 896- **تەماس گرتن یان قسە کردن دەگەڵ کەسێك بە تەلیفوون:** دوێنێ شەوێ، ویستم بە تەلیفوون قسەت دەگەڵ بکەم، بەڵام کەس جوابی نەداوە.

١٧٧٨/ 421- **تەماس گرتن (دەگەڵ کەسێك) بە تەلیفوون:** پاش ٢٠ دەقیقە چاوەروانیی لە کریسکی تەلیفوون دا تەماسم بۆگیرا/ بۆیان گرتم.

١٧٧٩/ 2543- **تەماس گرتن دەگەڵ (بە تەلیفوون/ بە نامە):** ئەگەر خێرا دەگەڵ دایرەی ئاگر کووژاندنەوە تەماسیان گرتبا، ئیمکانی هەبوو هۆتێلەکەیان نەجات دابا.

١٧٨٠/ 2600- **تەماس گرتن دەگەڵ (بە تەلیفوون و ...):** تەلیفوونچی پێی‌گوتم هەموو خەتەکان گیراون، بۆیە نەمتوانی تەماست دەگەڵ بگرم.

١٧٨١/ 1290- **تەماس گرتن دەگەڵ (بە تەلیفوون و ...)، وەرگیران یان وەرگرتن (لە رێگای ...وە) گەیشتن(ی پەیام):** راست ئەودەمەی دەمەویست لە دایرە وەدەرکەوم، رابێرت لە لەندەنەوە بە تەلیفوون تەماسی دەگەڵ گرتم.

١٧٨٢/ 5171- **تەماس گرتن دەگەڵ، تێکەڵاوبوون دەگەڵ:** حیزبێك کە دەگەڵ کۆمەڵانی خوارووی خەڵك دا تێکەڵاوی نەبێ‌و لە هەستو داخوازەکانیان ئاگادار نەبێ، وەك سەری بێ‌بەدەن وایە.
← ئاشنا بوون دەگەڵ.

١٧٨٣/ 3540- **تەماس هەبوون، تەماس گرتن دەگەڵ:** زۆر حەیف کە دەچی بۆ ئۆستراڵیا. بەڵام بە هەر حاڵ وەرە با بەیەکەوە تەماسمان هەبێ، باشە؟

١٧٨٤/ 4026- **تەماشاچی بوون:** زۆربەی کۆمەڵانی خەڵك بەورادەیە بەهێز نین کە بتوانن لە یاریی دەرەجە یەکەکان دا بەشداری بکەن، بۆیە ناچارن بە تەماشاچی بوونی خۆیان رازی بن.

١٧٨٥/ 4730- **تەماشاچیی بێدەسەڵات بوون:** دەوڵەتە یەك لە دوای یەکەکانی پاش شەڕی دووهەم لە پێوەندی دەگەڵ لێك هەڵوەشانی ئیمپراتۆریی بریتانیا تەنیا تەماشاچیی بێدەسەڵات بوون.

١٧٨٦/ 4044- **تەماشا کردن، چاو لێکردن:** لە هۆدەی دانیشتنەوە چاوی لە باخچەکە دەکرد کە بە بارانەی تەواو خووسابوو. ● ئەو پەنجەرەیەی کە لێیەوە دەیڕوانی لەبەری میچیو راست لەسەر پلیکانەکان هەڵکەوتووە.

تەماح تێکردن ← خۆش ویستن.

١٧٨٧/ 274- **تەمبێ کردن، بە خزمەت گەیشتن:** راوەستە، بابت بێتەوە! بە خزمەتت دەگا (= پێت دەڵێ پووت چەند کیلۆیە!).

١٧٨٨/ 1757- **تەمبێ کردن، نارەحەت کردن:** ئەمنیش دەتوانم زیان بە خەڵك بگەیەنم. هەروەك هەموو کەس منیش دەتوانم خەڵکی نارەحەت بکەم.

١٧٨٩/ 6085- **تەمبێ کردن، لۆمە کردن، بە خزمەت گەیشتن (= لێدان):** ئەگەر ئەو هەرا هەرایەی تەواو نەکەن، دێمە ژوورو بە خزمەتتان دەگەم.

١٧٩٠/ 5216- **تەمبێ کردن:** هەر کەس فەرمانی حکوومەتی نیزامی بەڕێوە نەبا، دەبێ چاوەڕوانی تەمبێ کردن بێ.

← سزادان، (زۆر خراپ شکست) دان.

تەمرین پێکردن، راهێنان.

تەمرین کردن (لە شانۆگەری دا) ← بۆ خوێندنەوە، مومارەسە کردن، پێداچوونەوە، بەڕێوەبردن.

١٧٩١/ 5332- **تەمکین کردن لە بەرامبەر ...دا، سەرداخواندن لەبەرامبەر:** کەس ناتوانێ لە دەست مردن رزگار بێ، سەرەنجام بەرۆکت دەگرێ. کۆتایی کاری منیش راست لێرەو هەر ئێستاشەو ئێستاش لە بەرامبەریدا سەردادەنوێنم.

١٧٩٢/ 5466- **تەناف لێدان، بە تەناف گرتن:** ئەسپەکان لە زەوییەکی بە تەناف گیراودا بە خەت دەڕۆیشتن.

تەندوورە کێشان ← چوونەسەر بە مارپێچ.

١٧٩٣/ 5806- **تەنزیم، ساختن، سازمان:** ساختاری ئەو دامەزراوە ئابوورییە بەشێوەی سەرۆكو ژێردەست/ پلە بە پلە بوو. ( هەموو کارێك دەبوو پلە بە پلە بچێتە سەرو دوای بڕیاردان پلە بە پلە بێتەوە خوار).

١٧٩٤/ 5686- **تەنکە، بەدەن نوما:** بارسارا بلووزێکی تەنکی بەدەن نومای دەبەر کردبوو. لە راستیدا بەدەنی وەها تێیدا دیار بوو کە هەر لە ئەساس دا پێویست نەبوو ئەوەش دەبەر کا.

١٧٩٥/ 1920- **تەنگ پێهەڵچنین:** بە هێنانەگۆڕی فاکتۆ حیسابی وردو دەقیق زۆر زوو تەنگیان پێهەڵچنی.

١٧٩٦/ 6653- **تەنگ کردنەوە:** ئەم کراسە ئەندازەکەی خراپ نیە، بەڵام لەلای نێو قەدی دەبێ کەمێك تەنگ بکرێتەوە.

١٧٩٧/ 954- **تەنگ کردنەوە، وێك هێنان:** ئەو کراسە کەمێك فشە، پێویستە لە نێو قەدیدا کەمێك تەنگ بکرێتەوە.

١٧٩٨/ 5878- **تەنە لێدان، شان لێکوتان:** پیاوێکی لوزمندەر لە فرۆشگاکە دەرپەڕیو هەر کەسی لەسەر رێیە با تەنەی لێدەدا.

١٧٩٩/ 5352- **تەنیا هێندێك کەس لە شتێك ئاگادار بوون/ بیتن:** ئەو زانیارییانەی کە لەم پەرتووکە چکۆلەدا هەیە، تەنیا دەبێ ئەرتەشی لێی ئاگادار بن.

١٨٠٠/ 5475- **تەواو بوون، کۆتایی (پێ) هاتن:** مەسەلەکە بە بڕیارێك لەسەر سوپاس کردن لە یەکتر کۆتایی پێهات.

١٨٠١/ 5565- **تەواو بوون، خەڵاس بوون، ئەمان:** دەبێ لە پۆمپەکەی دیکە راوەستن، بەنزینمان تەواو بووە.

١٨٠٢/ 5561- **تەواو بوون، کۆتایی هاتن:** ئەگەر برینجی تەواو بووبێ، دەچێتە دوکانی برینج فرۆشان ( بۆ کڕین).

١٨٠٣/ 2124- **تەواو بوون، کۆتایی هاتن:** بە کۆتایی هاتنی ماوەی ئیجازەی ئەو خانووە کۆنانە، دەیانڕووخێنن، بۆ ئەوەی جێگا بۆ دروست کردنی خانووبەرەی دەوڵەتی بکرێتەوە.

١٨٠٤/ 371- **تەواو بوون، کۆتایی هاتن:** پێش تەواو بوونی ساڵ، هێندێك ئاڵوگۆڕ لە قوتابخانەدا پێك دێ.

١٨٠٥/ 221- **تەواو بوون، کۆتایی هاتن:** رێبەرەکان لەسەر ئەو بڕوایەن کە ناکۆکیی جیددی لەسەر ئەو مەسەلەیە لەنێو لایەنگرانیان دا تەواو بووە. ● دەبێ پێت بڵێم، سەبرو حەوسەلەم تەواو بووە.

١٨٠٦/ 406- **تەواو بوون:** ئەوە ئاخرین پەنجەرە بوو کە دەبوو جێبەجێی بکا. بەڵام لەبەر ئەوە کە بەیانیی شەممۆ بوو، وەختی کارکردن تەواو ببوو پشوودانی حەوتوویی دەستی پێدەکرد.

١٨٠٧/ 427- **تەواو بوون، كۆتایی هاتن (پشوودان، وەخت، حەوتوو)**: وەختی تەواو ببوو، ناچار بوو كارەكەی بە كەسێكی گەنج بسپێرێ. ● پشوودانی ساڵانەم تەواو بوو.

١٨٠٨/ 433- **تەواو بوون (ی وەدوای كەسێك كەوتن)**: ئەوانەی كە بەدوایەوە بوون وەچنگیان هێنابوو/ گرتبوویانو بۆ كابراش ئیدی بەرنامەكە كۆتایی پێهاتبوو/ تەواو ببوو.

١٨٠٩/ 1886- **تەواو بوون، كۆتایی هاتن**: سەرەنجام ماوەی مانەوەم لە پاریس تەواو بوو.

١٨١٠/ 1302- **تەواو بوون، كۆتایی هاتن**: وارێدەچێ كە مانگرتنە یەك مانگی‌یەكە بەرەو تەواوبوون بێ.

١٨١١/ 2668- **تەواو بوون، قوتار بوون**: ترس و خۆفەكەمان خەریك بوو وەراست دەگەڕا: بەنزینەكەمان خەریك بوو تەواو دەبوو.

١٨١٢/ 2785- **تەواو بوون، ڕابردن، تێپەڕبوون**: پێ‌یەپێی تێپەڕبوونی حەوتوو مانگان، لادێیی‌یەكان وردە وردە خوویان بە كابرای غەوارە دەگرت.

١٨١٣/ 2902- **تەواو بوون، كۆتایی هاتن، ڕۆیشتن**: مانگی مارس وەك بەرخۆلەیەك دێو وەك شێرێك دەڕوا.

١٨١٤/ 2749- **تەواو بوون بە زیانی...**: بەپێی ئەوە كە بۆی هەیە جەنگ بە زیانی ئەوان تەواو بێ هەرگیز بە مێشكیان دا نەدەهات.

تەواو بوون ← (بۆ جارێكو بۆ هەمیشە) كۆتایی هاتن، لە هەتەری چاو دەرچوون)، ڕزگار بوون لە، بڕان، خەرج هەڵگرتن، چارەسەر كردن، لە بەین چوون، بەڕێوەچوون، نەمان ← هەڵگرتن، بەش كردن، دامركانەوە، جیا بوونەوە.

(وردە وردە) تەواو بوون ← كەم بوونەوە (و تەواو بوون)، دامركانەوە.

١٨١٥/ 7402- **تەواو بوونی قورمیشی سەعات**: ئەو سەعاتە دیواری‌یە یەك ڕۆژمیە، واتە قورمیشەكەی بە ٢٤ سەعاتان تەواو دەبێ.

١٨١٦/ 6274- **تەواو ڕوون بوون**: بۆ هەر كەسێك كە لە پێویستی‌یە ئابووری‌یەكانی ئەو وڵاتە ئاگادار بێ، ئەومەنتیقە شتێكی بە تەواوی ڕوونە.

١٨١٧/ 2603- **تەواو كردن، تەكمیل كردن**: هەركە كاری دژواری دیكۆراسیونی ماڵەكەمان تەواو كرد، لوولەی ئاوی ژووری ژێر شیروانی تۆقی و هەموو شتەكەی لێ‌خراپ كردین.

١٨١٨/ 2587- **تەواو كردن، بڕین(ی ڕێگا)**: خۆشناو ئەو دەرسەی بە ٦٥ نومرە، واتە ٥ نومرە كەمتر لە ڕادەی دیاریكراو تەواو كرد.

١٨١٩/ 2255- **تەواو كردن(ی تەحقیق)، هێنانەگۆڕ(ی پرسیار)، دان(ی جنێو)**: بەو تۆرباره ناتوانی بێ‌ڕاوەستان دوو خەشاباز تەواوكەی. لوولەكەی یەكجار گەرم دەبێ. ● ئەگەر هەموو پرسیارەكانتان هێناونەتەگۆڕێ، با وتەبێژ پشوویەك بدا.

١٨٢٠/ 7000- **تەواو كردن، ئامادە كردن**: پێم خۆشە هەموو ئەو تەرتیباتەی كە بۆ چەند ڕۆژ پشوودانەكەمان پێویستن، مانگێك پێشتر ئامادەكەم.

١٨٢١/ 5920- **تەواو كردن، كۆتایی پێهێنان**: ئەمن دی.جی. بەرپرسی ئەم بەشە، بەرنامەكە بە لێدانی ئارمی كۆتایی تەواو دەكەم.

١٨٢٢/ 4209- **تەواو كردن(- تەكمیل كردن)**: كابرای خێرخوازمان بە چەكێكی هەزار پوندی كارەكەی بۆ تەواو كردین.

١٨٢٣/ 4390- **تەواو كردن، دەست هەڵگرتن، وێكشان**: بەو قیژە قیژەت خانووەكەمان بەسەردا دەڕووخێنی. بەسە ئیدی وێكی نێ.

١٨٢٤/ 7469- **تەواو كردن**: خەریك بوو یەك دانە ستێكی (گۆشتی ڕاستەی) زۆر گەورەی تەواو دەكرد.

١٨٢٥/ 6034- **(بەجۆرێك) تەواو كردن**: دەمەقاڵێیەكی توندیان بوو و چیاش لە تەنیشتیان ڕاوەستابوو، خەریك بوو بە هەر جۆرێك بێ كێشەكە تەواو بكا.

١٨٢٦/ 856- **تەواو كردن، تەواو بوون**: هەتا ئێستا هیچم نەگوتووەو هیچیش ناڵێم هەتا ئەو كاتەی هەموو شتێك تەواو دەبێ.

١٨٢٧/ 7232- **تەواو كردن، مەسرەف كردن، بە مەسرەف گەیاندن، لەنێو بردن**: بەو دژە هێرشانەی لە بەهارێدا بەڕێوەی برد، هەموو سەربازە زەخیرەكانی لەنێو بردن.

١٨٢٨/ 388- **تەواو كردن، لێبڕان، لە نەفەس كەوتن**: هەورازێكی توند بوو؛ نەفەسم لێ‌بڕاوە. ● سیغارەكانمان تەواو بوون، دەچم هێندێكی دیكە لەو دوكانەی سەر شەقام بكڕم.

١٨٢٩/ 2248- **تەواو كردن، بە خێرایی، كوشتن، لەنێو بردن**: سەرەنجام گوتم ئێمە دەبێ شەڕی ئیتالیا خێرا تەواو كەین. ● ئەم شەڕكەرە بە هۆی زەربەیەكی كە وەسەری كەوتووە، تەواو بووە (= كووژراوە).

۱۸۲۰/ 4397- **تەواو کردن، دەست هەڵگرتن (لە کارێکی ناخۆش):** منداڵەکان قیژە قیژێکی خراپیان وەڕێخستبوو و پێم گوتن دەست هەڵگرن.

۱۸۲۱/ 4689- **تەواو کردن(ی نان خواردن، نووسین و ...):** دەتوانم هەر زۆر زوو تایپ کردنەکە تەواوکەم.

۱۸۲۲/ 2250- **تەواو کردن بە، کۆتایی پێهێنان بە:** تاقمی کۆڕە گۆرانی بێژەکان بە سروودێکی بەرز بەرنامەکەیان تەواو کرد.

۱۸۲۳/ 2252- **تەواو کردن، کار پێهێنان:** داخوا کارت بە ماشێنەکەی چیمەن بڕینەوە ماوە؟ بۆ خۆمان ڕۆژی هەینی کارمان پێیەتی.

← جێبەجێ کردن، کۆتایی هێنان بە، بڕینەوە، تەکمیل کردن، دەست هەڵگرتن، ئەنجام دان (و ڕزگار بوون لە دەستی...).

۱۸۲۴/ 264- **تەواو کردنی خوێندن (بەتایبەتی لە دوو زانستگەی ئاکسفورد و کیمبریج):** کوڕەکەیان، دوای وەرگرتنی زانستنامە لە ڕشتەی کیمیادا، لە زانستگەی ئاکسفورد خوێندنی تەواو کرد.

۱۸۲۵/ 4461- **(لە ئەرتەش دا) تەواو کردنی دەورە و لە ڕێوڕەسمی تایبەتیدا بەشداری کردن:** قەرارە لە مانگی دیسامبردا ژمارەیەك لە خوێندکارانی هەڵبژێراوی زانکۆی ئەفسەری دەورەیان تەواو بێ و لە ڕێوڕەسمی تایبەتیدا بەشداری بکەن.

۱۸۲۶/ 5397- **تەواو کردنی قسە لەسەر تەلیفوون:** ناچارم قسەکانم تەواو بکەم. دەبێ بگەمە قەتاری.

تەواوی بکەن ← بەسە.

تەوجێ کردن بۆ ← یارمەتی کۆ کردنەوە بۆ.

تەوزیع دان ← ڕوون کردنەوە.

تەوسییە کردن ← ناساندن.

۱۸۲۷/ 3754- **تەوەزەل و بێکارە(ی خراپ)، بێکارە و تەوەزەل:** پیاوێکی خراپ، بێکارو تەوەزەلە و لە ژیانیدا ڕۆژێکی کار نەکردووە.

تەوهین کردن بە ← لەدەدانەوە.

تەهجیر کردن ← دوور خستنەوە.

۱۸۲۸/ 3648- **تەیار کردن:** پێش ئەوەی بەرەو مەئموورییەتی تازەیان وەڕێکەون، لە گریف خۆیان باش تەیار کردو، پسپۆڕەکان جلکی ناوچەی گەرمەسێریان دەبەرکرد.

۱۸۲۹/ 2264- **تەیار کردن (بە):**ماڵە تازەکەی بە مۆدێرنترین ئامرازی نێوماڵ تەیار کردووە.

۱۸۴۰/ 2262- **تەیار کردن، ئامادە کردن:** ئەوە خەریکن کەشتیی دیسکاوێری تەیار دەکەن بۆ سەفەرێکی زانستی بۆ قوتبی شیمال.

۱۸۴۱/ 2048- **تەیار کردن:** ئایا شووڕا دەتوانێ ئیدیعا بکا کە کرێکارەکانی ڕێگایان بۆ ئەو هەلومەرجە پڕ لە مەترسییەی کە حەوتووی ڕابردوو بە هۆی تۆفانەکەوە هاتەپێش ئامادە کردبوو؟

۱۸۴۲/ 2049- **تەیار کردن بە، دان بە، پێبەخشین:** سروشت دوو دەستی دابوو بەو کوڕە، بەڵام وادیاربوو مێشکێکی ئەوتۆی نەدابوویە باش کەڵکیان لێوەرگرێ.

۱۸۴۳/ 7019- **تەیار کردنەوە بە ئامرازی تازە:** هەزینەی ماشێن سازی هی نەخشە و کەرەستەی خاو نیە، بەڵکوو زیاتر هی تەیار کردنی کارخانەکان بە ئامرازی تازەیە.

تێئاخنین ← پەنگاو (پێ) خواردنەوە، لەخۆ دوور کردنەوە، تێپەستاوتن.

تێئاڵقاندن ←تێهاڵاندن.

۱۸۴۴/ 6890- **تێئۆری بافی کردن، بە قسە ڕابواردن:** نابێ بە خۆمان ڕێگا بدەین بە فیسەو ئیفادە و بە سانایی لە پێوەندیی دەگەڵ بەرپرسانی ناوەندەکانی شار تێئۆری بافی بکەین/ هەر بە قسە ڕای‌بوێرین؛ هەلومەرجەکە ناچارمان دەکا بڕیاری بەکردەوە بدەین.

۱۸۴۵/ 2730- **تێبڕین، پێوەنووساندن، چەسپاندن:** کاتێك هۆرەکانت دە کورسییەکە بڕین، دوو دانە پێچیشی لێدە بۆ ئەوەی قایمتر بێ.

تێبوون ← بەشی شتێك کردن.

۱۸۴۶/ 7226- **تێپەڕبوون، خۆپێدادان، هەرا کردنە سەر، دە گیانی کەسێك بەربوون:** ئەگەر قەرارێ ئەو سەگە زەلامە/ ئەو بوولداگە زەلامە تێم بەربێ، هەرگیز حازر نیم بچمە بەردەرگای ماڵیان.

۱۸۴۷/ 5780- **تێبەردان، دە کەسێك بەردان:** هەر کەس لە ماڵەکەی نزیك بێتەوە، سەگەکەی تێبەردەدا.

۱۸۴۸/ 2745- **تێپەڕبوون، پەڕینەوە:** زەلکاوەکەیان لە پانایی‌دا تەختەبەند کردبوو بۆ ئەوەی لادێییەکان بتوانن پێی‌دا بپەڕنەوە.

← تەواو بوون، تێپەڕین.

۱۸۴۹/ 5997- **(بە دزی)(بە تەنیشت ...دا) تێپەڕبوون:** بە یەك دوو کاری شوێن ونکەرانە، دوو کەس لە زیندانییەکان توانیان بە تەنیشت پیاوەکانی بەردەرگادا تێپەڕین.

تێپەڕبوون بە تەنیشت... دا← بە تەنیشت...دا رابردن.
تێپەڕبوون بە جێگایەك دا ← رابردن بە جێگایەك دا.

١٨٥٠/ 6982- **تێپەڕبوون بە چرکە چرکی یا چرکە چرکی کاتژمێر:** -دەقیقەکان بە چرکەچرکی کاتژمێر تێپەر دەبوون.

١٨٥١/ 5037- **تێپەڕبوون لە، تێ پەڕین لـە:** پێش ئـەوەی کـە ئەم پێشنیارانە بینە ڕێسا، دەبێ لە چەندین کۆمیتەدا تێپەرن.

١٨٥٢/ 6979- **تێپەڕبوون یان ڕۆیشتن (بە گرمە گرم):** تاقمێك فڕۆکەی جێت بە گرمە گرم تێپەرین.

١٨٥٣/ 4473- **تێپەڕ کردن، بەسەربردن و رابردن، رابواردن:** دوای ئەوە کە کابرا ژن هێنانەکەی لێ تێکچوو، جـان دەورەیەکی زۆر دژواری تێپەڕ کرد، بەڵام دوای ساڵێك، کەمتر یان زیاتر، وەزعی بەدەنی و ڕووحی یەکەی بەرەو باشتر بوونەوە ڕۆیشت.

١٨٥٤/ 4583- **تێپەڕ کردن لـە قۆناخـە جۆراوجۆرەکانی یاسا:** ناغای ناشـلی لایحەی کارمەندانی بەشی تایبەتی بە سەرکەوتنەوە لە قۆناخە جۆراوجۆرەکانی یاسا تێپەڕاند/ تێپەڕ کرد.

١٨٥٥/ 2525- **تێپەڕ کردن، هاتنەدەر، وەدەرکەوتن، دەرچوون:** لە تاقیکارییە شفاهییەکانت چۆن دەرچووی؟.
← قبووڵ بوون.

١٨٥٦/ 1146- **تێپەڕین، تێپەڕبوون:** ماشێنەکەم لەسەر ڕێگاکە دوور خستەوە بۆ ئەوەی لۆرییەکی زەلام (کە بەرەو رووم دەهات) تێپەڕێ.

١٨٥٧/ 7342- **تێپەڕین، بەرەوکۆتایی ڕۆیشتن، گوزەران، بەسەرچوون:** پاش نیوەڕۆ ناخۆشەکە کەم کەم بەسەر دەچوو.

١٨٥٨/ 2452- **پەڕین، تێپەڕبوون، ڕەد بوون:** بەر دەرکانەکە بە ئەندازەیەك قەرەباڵغ بوو کە کابرا جحێڵەکە بە عارەبانەی منداڵەکەیەوە نەیدەتوانی تێپەڕێ.

١٨٥٩/ 5445- **تێپەڕین، یەك لە دوای یەك تێپەڕ بوون، رابردن:** مانگەو ساڵ، یەك لە دوای یەك، رابردن و سەرەنجام خۆشبین ترین زیندانییەکانیش هومێدی بەربوونیان لەدەست دا.

١٨٦٠/ 2781- **تێپەڕین، تێپەڕکردن:** دەمانزانی کە ناغای... بڕیارەکەی ئێمەی پێ خۆش نیە، بەڵام تووڕەبوونەکەی لە حەدو ئەندازە تێپەڕی.

١٨٦١/ 1345- **تێپەڕین بەسەر...دا:** هەتا ئێستا سێ جاران لە حەزلێکردوویی دا شکستی خواردووە، بەڵام هەموو جارێ بە ڕوویەکی خۆشەوە بەسەر مەسەلەکەدا تێپەڕیوە.

← رابردن.

١٨٦٢/ 3887- **تێپەڕین لە، چاوپۆشـی کـردن لـە:** زۆربـەی ئەندامانی ئاڵمەکە بێ هیچ پشکنینێك لە گومرگ تێپەڕبوون. ● لـە نوسخە ئامادەکراوەکان دا لـە چەند هەڵەیەك چاوپۆشیان کرد.

١٨٦٣/ 2578- **تێپەڕین لـە، ئاوابوون، وەسەرکەوتن، پەڕینەوە:** "مێگەلەکە چۆن لە جادەی پەڕیوە؟". ● بە سەلامەت لە پەرژینەکە تێپەڕبووین.

١٨٦٤/ 2414- **تێپەڕین، تێپەڕبوون لە:** تەنیا نیـوەی سەربازەکانی گرووهانەکە لـە پردەکە پەڕیبوونەوە کە تەقاندیانەوە.
← سەرکەوتن.

١٨٦٥/ 1532- **(خۆ) تێ پەستاوتن، (خۆ) تێ ناخنین، خۆ تێ ڕۆکردن:** هەر کە قەتار راوەستا، نزیکەی دوو سەد کەس هەوڵیان دەدا خۆی تێ ناخنن.

١٨٦٦/ 1489- **تێ پەستاوتن، تێناخنین، تێ تەپاندن، پڕکردن لە، کۆکردنەوە، کـووت کردنەوە لە ...دا:** منداڵان کاتێك ئـانی دەخۆن، خواردەمەنییەکی زۆر دەمزاریان داخنن. ● دوو دڵدارەکە دەیانەویست هەموو خۆشییەکانی ژیان لە شەش مانگان دا کۆ کەنەوە (و، چێژی لێوەرگرن).

١٨٦٧/ 1441- **تێ پەستاوتن، تێناخنین:** زیاتر لە دە دەقیقەی دیکە خۆم دێرە ناپەستێوم، تەنانەت ئەگەر دایکە ئەگبەتەکەت بۆسەی بۆدانابێەوە.

١٨٦٨/ 4389- **تێ پەستاوتن:** لە بیرت ماوە کە چلۆن خەڵکمان لە سینەمای "الحمراء" دەپەستاوت؟.

١٨٦٩/ 4572- **تێ پەستاوتن، تێناخنین:** هەموو پێنج کەسەکەمانیان لە ماشێنی ئالفرێد پەستاوتەو گەڕاندیانینەوە بۆ ئاپارتمانەکە/ شۆقەکە.

١٨٧٠/ 6195- **تێ پەستاوتن، تێناخنین:** ئەگەر لەمە زیاتر خەڵك دەپشتی ماشێنەکە بپەستێوی، پۆلیس ڕاتدەگرێ.

١٨٧١/ 6192- **تێ پەستاوتن، تێناخنین:** هەروەك ماسیی نێو قوتووی، دەکوویەی/ کابینی قەتاریان پەستاوتبووین.

١٨٧٢/ 6486- **تێ پەستاوتن، تێناخنین:** هەموو جۆرە ئامرازێکیان لە جانتاکانیان ئاخنی بوو.

١٨٧٣/ 3454- **تێ پەستاوتن، تێناخنین، جێکردنەوە:** لە رادە بەدەر لیباسی تێ ماناخنە؛ دەرگاکەی داناخرێ.
تیتۆڵێك دادرین ← پەند وەرگرتن لە.
تێتەپاندن ← تێپەستاوتن.

تێتەقاندن ← هەڵاتن.
تێچوون ← گەیشتنە... .
تێچەقاندن ← تێرۆکردن.
تێچەقین ← دەگیر کەوتن.
تێخستن ← تێهاویشتن.
تێخستنەوە ← لەسەر جێگای خۆدانانەوە.
تێدا بوون ← لەسەر رێگا بوون.

١٨٧٤/ 761- **تێدابوونی ئاخرین زانیاری، لە ئاخرین هەواڵو زانیاری ئاگادارکردن:** تەنیا چەند فاکتێك ماون لێی زیاد بکەم بۆ ئەوەی راپۆرتەکە ئاخرین زانیارییەکانی تێدابێ.

تێدا پێکهێنان ← "القاء" کردن، بزواندن.
تێداچوون ← لەنێو چوون.

١٨٧٥/ 6509- **تێدا سەرکەوتن:** هەر کارێکی بیەو هۆشی بداتەسەر، تێیدا سەردەکەوێ.

١٨٧٦/ 5146- **تێدالێونجان، گرتنەوە، تێدابوون:** وتارەکەی زۆر بابەتی تێدابوون.

١٨٧٧/ 3854- **تێداهەبوون، بۆ هەبوون:** هەر چەشنە سیستێکی مالیاتی ئەم لایەنەی تێدا هەیە کە لەلایەن کەسانی وشیارو دەست پیسەوە دەستکاری بکرێ.

١٨٧٨/ 1025- **تێراخوڕین:** پیاوەکان خەریك بوون لە تێراخوڕینەکانی سەرگرووپان/ رەئیس عورەفا جارز دەبوون. هەر چەند وایان نیشان دەدا کە بە توندی سەرگەرمی کارکردنن، لە راستیدا کارەکە رۆژ لەگەڵ رۆژ کەمتر دەچووە پێش.

١٨٧٩/ 2407- **تێراخوڕین و هەچە یان هەیها گوتن بە (گوێ درێژ، ئەسپ بۆ خێراتر رۆیشتن یان وەرێکەوتن):** کوڕە چکۆلەکە دە ئەسپەکەی ڕاخوڕیو گوتی: "هەیها دەی"و ئەسپەکەش بە وێرغەیەکی جوان وەرێکەوت.

← قەمچی لێدان.

١٨٨٠/ 499- **تێرامین:** دەڵێی‌کە ئەو کابرایە لە تەمەنی چلو پێنج ساڵان دا دیسانیش خەودا منداڵێکی دیکەی دەداتێ؟ ئەمن هەرگیز وای‌تێ‌رانابینم؟.

١٨٨١/ 1503- **تێرامین:** کێ لە پیرە پیاوێکی وەك هارولدی رادەدی، ئەویش لەو تەمەنەیدا، کە بتوانێ بازداتە نێو پاسێکی لە حالی رۆیشتن دا؟

تێرا کردن ← دەبەر کردن.
تێرامان ← رامان لە.

١٨٨٢/ 2266- **تێرامان، لێ‌خوربوونەوە، چاو تێبڕین:** لە سەرانسەری رێو رەسمەکەدا چاوی دە سوارێکی بڕیبوو کە لەبەر عیمارەتەکە بوو.

١٨٨٣/ 4357- **تێرئەندازی لێکردن، تفەنگ پێوەنان، دەسرێژ لێکردن:** ئەگەر لە پەنجەرەی سەرێوە دەسرێژیان لێکردبایین، پێم سەیر نەبوو.
← دەسرێژ لێکردن.

١٨٨٤/ 6057- **(لە بۆسەوە) تیر ئەندازی لێکردن، هێرش کردنەسەر یان گرانەسەر:** کاتێك لەنەکاو رۆژنامەنووسان هێرشی دەکەنەسەر، زۆر کەم واهەیە قەلس بێ.

١٨٨٥/ 6126- **تێرشتن، تێکردن، بڵاو کردنەوە:** چەندین چۆم لە چۆمەکانی ئەم وڵاتە بە هۆی ئەوە کە کارخانەکان چڵکاوی خۆیانی دەرێژنە ناویان، پیس بوون.

تێروانین ← چاو لێکردن .
تێرو تەسەل بوون ← (وەزعییەت) باش بوون.

١٨٨٦/ 2237- **تێرو تەسەل کردن، تەکمیل کردن:** سەرنووسەر نووسیبووی نوسخە خەتی‌یەکە دەتوانێ بە کەڵك بێ، بەڵام ئەگەر نووسەرەکەی بتوانێ تێرو تەسەل تری بکا، باشتر سەردەکەوێ.

١٨٨٧/ 6976- **تێرۆچوون (بە ترپە ترپ):** پارچە ئاسنی تۆپان بە ترپە ترپ لەو تەپۆلکە گلانە رۆدەچوون/ دەچوونە خوار کە لە بەردەمی سەنگەرەکانیان هەڵدرابوونەوە.

١٨٨٨/ 3425- **تێرۆ کردن:** لوولەیەکی باریکی وەك دەرزییان دە زگی کابرای نەخۆش راکردو هێندێکیان ئاو لێ‌دەرکێشا.

١٨٨٩/ 1781- **(دەست) تێرۆ کردن:** خێرا دەستی دەگیرفانی ژاکێتەکەی رۆ کرد بۆ ئەوەی ئەرخەیان بێ پارەکەی لەوێ دایە یان نا.

١٨٩٠/ 1919- **تێرۆ کردن، داکوتان:** کۆڵەکەیەکیان داکوتا.
← تێهاویشتن، چوونە خوار لە.

١٨٩١/ 1997- **تێرۆ کردن، تێچەقاندن:** شمشێرەکەیان وەها لە بەردی رۆ کردبوو کە هیچ کەس نەیدەتوانی بیجوولێنێتەوە.

١٨٩١+١/ 7452- **تێرۆکردن (بە لەسەرەخۆیی):** کلیلەکەی (بە لەسەرەخۆیی) تێرۆکردو درگای کلاسەکەی کردەوە.

١٨٩٢/ 2206- **تێر کردن، باش بەخێو کردن، تێرو تەسەل کردن:** بە بڕوای من ئەو کوڕە ژەم مردووە؛ پێویستیی بە تێرکردن هەیە. هەر ئێستا ماسی‌یەکی دووڕی گەورەی بۆ دێنمەوە.

١٨٩٣/ 2367- **تێڕپان، خراپ کردن:** گرتی نایەوێ کوڕێکی دەست ڕۆناوی دە ماتۆرەکەی بڕی/ ماتۆرەکەی لێ خراپ بکا.
(زاراوەی لاتی) خراپ کردن ← ناحەز کردن.
١٨٩٤/ 3916- **تێژهەستان، پەرتاب کردن، هەڵدان، ئەحەوا کردن:** پاش ٢٠ دەقیقەی دیکە مووشەکەکەی پەرتاب دەکەن.
تیغ لێدان ← پووڵو پارە لە کەسێك دەرهێنان یان ئەستاندن.
١٨٩٤٠١/ 1894- **تێژراوەستان، ڕەپ ڕاوەستان:** مامۆستا بۆ ماوەیەك بێئەزمیی لە قوتابییەکان قبووڵ کردو لەپڕ تیژ ڕاوەستاو بەسەر پۆلەکەیدا گوڕپاند.
١٨٩٥/ 4039- **تێفکرین، چاوتێبڕین، لێڕوانین:** لەژێر مژۆڵە خۆڵاوییەکانییەوە چاوە شینەکانی تێبڕیبوون.
← چاوتێبڕین.
١٨٩٦/ 4638- **تێك بەردان:** یەکێك لەو ڕێگایانەی بۆ پاراستنی بازاڕی تازە پێویستە ئەوەیە کە ئەیارە سەرەکییەکانمان تێك بەردەین.
١٨٩٧/ 725- **تێك بەردان، بەشەڕدان:** ئەوە کە ج کەسێك دەبێ لە تەنیشت شامیران دابنیشێ، دوو کەسیانی بەشەڕدا.
← بەشەڕدان.
تێك تەپین ← لەبەر یەك هەڵتەکان.
١٨٩٨/ 7196- **تێکچوون، شێوان، ناڕەحەت بوون، دڵگوشران:** هەر بە بیرکردنەوە لە سواری فڕۆکە بوون حاڵم تێك دەچێ. ✽ کە بیری لەوە دەکردەوە کە منداڵەکان عەزاب دەکێشن، وڕێك دەهات.
١٨٩٩/ 1096- **تێکچوون:** کاتێك هەواڵی دەعەم کردنی دۆستەکەی بیست، تێك چوو.
← شێت بوون، ناڕەحەت بوون، لەنێو چوون، (کاری کەسێك) تەواو بوون.
١٩٠٠/ 2165- **تێکچوون دەگەڵ کەسێك، تێوان ناخۆش بوون، دەعقالە کردن دەگەڵ، کێشە کردن دەگەڵ، بەکێشە هاتن، تێکدان (ی پێوەندی)، بەگژدا چوون:** ئیستعدادی ئەوەی هەیە دەگەڵ هەموو کەس بە کێشە بێ.
تێك چوونەوە ← هەڵوەشانەوە.
تێك خستن ← لێك بەستن.
تێك خستنەوە ← کۆ کردنەوە، بە پەلە.
١٩٠١/ 634- **تێکدان، هەڵوەشاندن، کۆتایی هێنان بە:** بەڵێ، ئەو ژنە ژیانی بنەماڵەکەی لێ تێك دا. هەتا پێش هاتنی ئەو ژنە، کابرا ژیانێکی بەختەوەرانەی هەبوو.
١٩٠٢/ 848- **تێکدان، خراپ کردن:** منو جان نێوانمان زۆر خۆش بوو، بەڵام ئەو ژنە هات لێی تێك داین.
١٩٠٣/ 6944- **تێکدان، ئاڵۆز کردن، شێواندن:** ئەو ئاڵوگۆڕە کوتوپڕە وەزعییەتی هەموو کەسی تێك دا.
١٩٠٤/ 3635- **تێکدان، خراپ کردن، پێ تێکدان و هەستاندن:** ژنە کارکەرەکە هەر فەرشەکانی ڕێكو پێك دەکردو منداڵەکان تێکیان دەدانەوە. ✽ کابرایەك لە قوژبنی ساڵۆنەکە دانیشتبوو بە وەرەزییەوە لاقی دە ئەرزی دەکوتاو تۆزو خۆڵی هەڵدەستاند.
١٩٠٥/ 419- **تێکدان (ی دۆستایەتی) لێك دابڕان:** چیدی ناتوانم بەدقەولی ئەو کابرایە قبووڵ کەم، هی منو ئەو بۆ هەمیشە تەواو بووە.
← تێك چوون دەگەڵ کەسێك، خراپ کردن، بڵاوە پێکردن.
١٩٠٦/ 2652- **تێکدانی نەخشەی کەسێك، لەقاودان، ئاشکرا کردن، پەردە لەسەر لادان:** دەمانەویست بە دزیی منداڵەکان بچینە دەرێ، بەڵام خێزانم سەعاتی وەرێکەوتنی پاسەکانی لێپرسیەو بەم جۆرە هەموو شتێکی لەقاو دا.
تێك دانەوە ← هەڵوەشاندنەوە.
تێك دا ون بوون ← دەگەڵ یەگ تێکەڵ بوون.
١٩٠٧/ 33- **تێکردن، لێزیاد کردن:** ئەرێ ناولیمۆکەی پێش لێکدانی ناردو شەکرەکەی لێزیاد دەکەی یان پاشان؟
١٩٠٨/ 5744- **تێکردن (ی چێشتو ...)، سفرە ڕاخستن، بڵاو بوونەوەی (بۆنو ...) لە (ئەنفزین):** کاتێك گەیشتمەوە ماڵێ، دایکم چێشتی تێدەکرد/ سفرەی ڕادەخست.
١٩٠٩/ -
١٩١٠/ 4776- **تێکردن، ڕژاندنە نێو:** دووکەڵ کێشی کارخانەکان، چڵەدووکەڵێکی زۆر دەرێژنە نێو هەوای.
١٩١١/ 4717- **تێکردن:** لاتی کەم ڕێگام بدە چایەکەی تێکەم.
١٩١٢/ 5744- **تێکردن، دانان، پەزیرایی کردن:** کە وەژوور کەوتم، دایکم چێشتەکەی تێدەکرد.
١٩١٣/ 33- **تێکردن، لێزیاد کردن، لێدان:** ئەرێ دەبێ پێش تێکەڵ کردنو لێکدانی شەکرو ناردەکە ئاوی لیمۆکەی تێکەی؟
١٩١٤/ 1758- **تێکردن (ی چێشت)، دە قاپان کردن، کێشان:** هەر ئێستا دەمەویست چێشتەکەی تێکەم.
١٩١٥/ 6153- **تێکردن (ی چێشت) بە ئەسکوێ:** ژنەکە چەند کەوچك برینجی دە هەرکام لە دەورییەکان کرد.
١٩١٦/ -

← رشتن نیو، تیرشتن.

١٩١٧/ 2122- **تیکرووخان، تیکترمان**: میچی تونیله تازەکە باش دروست نەکراوە، نیشانەی تیك رووخانی پیوە دیارە/ وادیارە دەیهەوێ تیك برووخێ.

١٩١٨/ 971- **تیکرووخان**: میچی کانگاکە بە هۆی تەقینەوە تیکرووخا.

١٩١٩/ 1149- **تیکرووخان، هاتنەخوار، باریین (بەفر)**: تەنیا یەك پێچم دەرهێناو تەواوی شتەکە تیك رووخا. ● بەفرێکی قورس دەهاتە خوار/ دەباری (= کرێوەیەکی زۆر تووندی دەکرد).

١٩٢٠/ 2651- **تیکرووخان**: ئەرزی ژووری لیباسان لەژێر قورسایی قاتە قەڵەوێدا تیکرووخا.

← لەبەریەك هەڵتەکان، وێران بوون، کەوتن، لە کارکەوتن.

١٩٢١/ 6021- **تیکرووخان، وێران بوون، دەعمی زۆر خەتەرناك**: ئەو ماڵە بە هۆی هێرشی هەواییەوە زۆر خراپ وێران ببوو. ● تەسادوفێکی زۆر خەتەرناك لەسەر جادە رووی دابوو کە لەودا تانکێرێك لەو سێ ماشێن خۆیان پێك دادابوو.

تیك رووخان ← رووخان.

١٩٢٢/ 1487- **تیکشکان، لەبەریەك هەڵتەکان، خراپ بوون، نابووت بوون**: لە نەکاوو، بێئەوەی هوشدارێك درابێ، فرۆکەکە لە کاتی هەستان دا خراپ بوو. ● نابووت بوونی شەریکەی رولزرویس بوو بە هۆی سەرسووڕمانو نیگەرانیی خەڵك.

١٩٢٣/ 2328- **تیکشکان، ورد بوون، کۆکرانەوە، داخرانی (شەریکەو...)**: لە ماوەی دە ساڵی رابردوودا، چەند رۆژنامەی میللی داخراون (بە هۆی نابووت بوونەوە).

١٩٢٤/ 1530- **تیکشکان، لەبەریەك هەڵتەکان، ورد بوون**: کاتێك تانکەکان هاتنە مەیدانێ، بەرهەڵستکاریی سازماندراو بە تەواوی لەبەریەك هەڵتەکا. ● رۆژێك ئاغای مورتۆن ساخو سلامەت بوو، رۆژی دواتر پیرو بێهێز، لەراستیدا ورد ببوو/ شکا بۆوە.

← ورد بوون (لەباری رووحییەوە).

١٩٢٥/ 7292- **تیکشکان، وردوخاش کردن**: یارییە دووپاتکراوەکە لەراستیدا ململانە نەبوو. لیڤەرپوول وردوخاشی کردن.

١٩٢٦/ 464- **تیکشکاندن**: دوای شەڕێکی توندو تیژ، سەرەنجام هێزەکانمان توانیان هەموو بەرهەڵستکارییەك تیك بشکێنن.

تیك شکاندن ← فشار هێنان بۆ خۆ، سەرکەوتن بەسەردا، لەباری رووحییەوە ماندوو کردن، زۆر خراپ شکست دان، پاشەکشە پێکردن، لەکار خستن.

تیکترمان ← تیکرووخان.

تیکنان ← یەکگرتن.

١٩٢٧/ 1005- **تیك کردن، (بە نیشانەی کونترۆڵ یان دروست بوون) خەتێك، نیشانەیەك لێدان**: تکایە پێش بەرێکردنی ئەم بەستانە، نیشانەی کونترۆڵ کرانیان لێدەن.

١٩٢٨/ 6983- **تیك کردن، سەح کردن، نیشانە لێدان**: ئەم دوو نیشە تیك کە/ سەح کە، چونکە کردوومن.

تیکوتان ← لێدان، لەشتێك کوتان.

١٩٢٩/ 7105- **تیکۆشان بۆ (وەدەست هێنانی ...)**: لە یارییەکانی ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆدا، دوو دەوەندەی ئۆڵگاندایی بۆ وەدەست هێنانی پاڵەوانەتیی دەوی پێنج هەزار میتر تێدەکۆشن.

١٩٣٠/ 2256- **تیکۆشان، هەوڵدان (زۆرتر ناراستەوخۆ)**: فریوی جوانییەکەی نەخۆی، هەوڵ دەدا بۆ میوانییە گەورەکەی بانگ بکرێ.

١٩٣١/ 7472- **تیکۆشان بۆ گەیشتن بە مەبەستێك**: ئێمە بۆ وەدەست هێنانی بنەمایەکی نوێ بۆ حەقدەستی کرێکارانی سنعەتی تێدەکۆشاوین.

تیکۆشان ← هەوڵدان (بۆ).

تیکوەمەکان دان ← لەگرێژنە چوون.

تیکوەردان ← لێکدان.

١٩٣٢/ 6388- **تیك وەردان، تیکدان**: قوتوویەك رووبی تەماتەی لە تیکەڵاوەکە زیاد کەنو زۆر باش تیکیوەردەن.

١٩٣٣/ 4688- **تیك وەردانی ئاورێکو خۆش کردنی**: بە ئاورکێش بەردە زوخاڵەکانی تیك ورداو گڕی لە ئاورەکە هەستاند.

١٩٣٤/ 2032- **تیکەڵاوبوون دەگەڵ کەسێك، گیروەدە بوون، لێك هاڵان**: ئەو گیایانە بە چەشنێك دەگەڵ گوڵەکان تیك هاڵاون کە ناکرێ بژاریان بکەیو گوڵەکان خراپ نەبن. ● خۆشناو گیرۆدەی ژنێك بووە کە بە دایکی دەشێ.

تیکەڵاوبوون دەگەڵ ← پێوەندی گرتن دەگەڵ، ناشنا بوون دەگەڵ، تەماس گرتن دەگەڵ، تیکەڵاوبوون.

١٩٣٥/ 4309- **تیکەڵاوی خەڵك بوون، نزیك بوونەوە لە خەڵك**: ئەو گورگی تەنیایەو هەرگیز تیکەڵاوی خەڵك نابێ.

← هاونشینی کردن دەگەڵ.

١٩٣٦/ 4313- **تیکەڵ بوون، لێکدران**: نامەکانم دەگەڵ بەستەیەك بڵاوکراوە لێکدرابوون. ● تەمرەکان لە کەشمرێك / چەکمەجەیەك دا لێك درابوون.

١٩٣٧/ 5586- تێکەڵ بوون یان کردن: نابێ ئەو دوو کراسانە پێکەوە بشۆم، دەنا ڕەنگەکانیان تێکەڵ دەبن. * نێچیر، چەنەوەری بەسە؛ کاتێك قسەکانت تێکەڵ دەکەی، نازانم دەڵێی چی.

١٩٣٨/ 3415- تێکەڵ بوون، تێکەڵاو بوون: چەند کەس لە مەئمورەکانی پۆلیس بۆ بەشداری لە ڕێو ڕەسمەکەدا لیباسی زۆر جوانیان دەبەر کردبوو دەگەڵ قوماربازەکان خۆیان تێکەڵ کردبوو چاوەڕوانی هاتنی ئەو "مواد مخدر" فرۆشانە بوون کە دەگوترا لەو باشگایە دا چالاکیان هەیە. * وەرزشکارانی سەد وڵاتی جیهان لە یارییەکانی ئۆلەمپیك دا تێکەڵ ببوون.

← دەگەڵ کەوتن.

١٩٣٩/ 77- تێکەڵ بوونەوە، پەککەوتن: ئەگەر ئەو دوو شیرکەتە یەك بگرن، گەورەترین سازمانی کەشتیسازی لە بریتانیا پێك دێنن.

تێکەڵ پێکەڵ کردن ← خراپ کردن، ئاڵۆز بوون، گرێ خواردن.

١٩٤٠/ 2325- تێکەڵ کردن، تێکەڵاو کردن: جا ئەوجار باقی شەکرو چاشنییەکەشی تێکەڵ کەن.

١٩٤١/ 7349- تێکەڵ کردن، تێکدان: لە دارشتنی نەخشەی ئەو کەنیسەیە، نەخشەی سوننەتیو شێوەی مۆدێرن تێکەڵاو کراون.

١٩٤٢/ 4282- تێکەڵ کردن: کابرای بارەبەر چەمەدانەکانی/ جانتاکانی تێکەڵ کردبێن. هێندەی نەمابوو جانتای کابرایەکی دیکە هەڵگرم.

١٩٤٣/ 3480- تێکەڵ کردن، تێکدان، شێواندن: ئێستا کە کراواتەکانو گۆرەوییەکانم بۆ شۆرشتووی، تێکەڵیان مەکەوە. *ڕووداوەکانی ئەم دواییانە دەگەڵ بیرەوەرییەکانی ڕابردووی لە مێشکیدا تێکەڵاو ببوون.

١٩٤٤/ 3412- تێکەڵ کردن دەگەڵ/بە، هێنانەکەوە: بەراستی زۆر سەیرە کە سەرنووسەرو نووسەرانی دیکەی ڕۆژنامەکان زۆر بە سانایی گەلە بابەتێك لە سەروتارەکانیان دا دێننەگۆڕێ کە ئەدەکرا چل ساڵ لەمەوپێش باوەڕیان پێبکرێ. *سەرۆکی کۆبوونەوە بەراشکاوی و ڕیاکارانە قسەکانی خۆی دەگەڵ پێهەڵگوتن بەسەرو گەنێلاکی ئەوو ئەو تێکەڵ کرد.

تێکەڵ کردن (بە جوانی) ← هاوئاهەنگ کردن، چەقاندن، کردن بە یەك، کامیل کردن.

١٩٤٥/ 2126- تێکەوتن، کەوتنەنێو: ئەم ڕووداوە کورتیکی خەپەتۆڵەی وەبیر هێنامەوە کە بە سەرەوە کەوتە نێو چاڵەقورتێکییەوە.

تێکهاڵانەوە دوور کەوتنەوە ← دوورکەوتنەوە.

تێکهاوێشتن ← خولانەوە.

١٩٤٦/ 2018- تێکهەڵپوون، دەرگیر بوون، لێك گیر بوون: بڕیارمان دا بەری بەیانی دەگەڵ دوژمن دەرگیر بین، مەگەم شەوێ پاشەکشەی بکا. *ئەگەر چەرخی گەورە لە چکۆلەکە گیر نەبێ، سەعاتەکە دەوەستێ.

١٩٤٧/ 4126- تێکشکان، لێ حاڵی بوون، بۆ ساغ بوونەوە: لە خەتە ناخۆشەکەی نێو دەفتەرەکانی هیچ تێنەگەیشتین.

*ئەری ئەتۆ لەو پەیڤینەی چت لێحاڵی بوو؟

تێگرتن یان دەشتێك گرتن ← بەسەردا بارین.

١٩٤٨/ 332- (زوو) تێگەیشتن، ئاگادار بوون، پێزانین: ناگات لە هاوکارە بەرچاو تەنگەکانت بێ. هێندێکیان هەر زوو پێدەزانن.

١٩٤٩/ 1452- تێگەیشتن، لێحاڵی بوون، پێزانین: وادیارە کۆمەڵانی خەڵك کەمێك درەنگتر لە مانای یاسای تازەی زەریبە دەگەن.

١٩٥٠/ 2581- تێگەیشتن (بە تەواوی)، باوەڕ کردن بە: دە بێچارە ڕوویی ئەو ژنە ناگەم. شەش مانگ لەمەوپێش کراسێکی لێکڕیبوونو هەموو ڕۆژێ دێو دەست دەکا بە سکاڵا کردن.

١٩٥١/ 2195- تێگەیشتن، زانین: دەتوانم سوێندێ بخۆم کلیلەکانم لەسەر مێزەکەم بەجێ هێشتبوو. نازانم چییان لێهاتوە.

١٩٥٢/ 2228- تێگەیشتن، حیساب کردن: تێناگەین لەبەرچی ئاوا سەیرو سەمەرە دەجوولێتەوە. *خەرجی ئەم چالاکییە دەبێ زۆر بە وردی حیساب بکرێ.

١٩٥٣/ 4184- تێگەیشتن: هەرگیز تێنەگەیشتم کە ئایا ئەوانە یارمەتیی ئێمەیان دەویست یان نا؟. *دەو کابرایەی ناگەم کە بۆچی کەمێك لە پووڵەکانی نادا بە ماشێنێك کە هێندە لە کارنەکەوێ.

١٩٥٤/ 842- تێگەیشتن، لێحاڵی بوون: لەپڕ لە ڕاستیی ئەو ئەفسانانە حاڵی بوو کە ژنەکەی دەیگوتن.

١٩٥٥/ 6656- تێگەیشتن، وەرگرتن، فێر بوون: ئیزانیل نەیدەزانی لەو شتانەی دەگوترێن، ماری چەندیان تێدەگا/ وەردەگرێ.

١٩٥٦/ 5933- **تێگەیشتن (بە تەواوی)**: هیچی نەدەگوتەو، نەشدەجوولاوە، لە حاڵێك دا بە تەواوی دە هەواڵەکان دەگەیشت.

١٩٥٧/ 2243- **تێگەیشتن، زانین، سەردەرهێنان لە**: کاتێك ناتوانی حیسابەکانت روون بکەیەوە، ئایا پێویستە بزانی ئەو پارانەت چ لێکردووە؟

١٩٥٨/ 955- **تێگەیشتن، لێحاڵیبوون**: بۆ ماوەیەك هەروا گوێی دابووە قسەکان، بەڵام وردە وردە رەنگی گۆڕا؛ وادیار بوو خەریکە تێدەگا.

١٩٥٩/ 6872- **تێگەیشتن، لێحاڵیبوون، بۆدەرکەوتن**: هەر چاو لە چاوی بکەی دەتوانی تێبگەی کە پیاوێکی ناتێنەگەیشتوو نیە.

١٩٦٠/ 2504- **تێگەیشتن، لێحاڵی بوون، سەرەودەرە لێکردن، سەرلێدەرهێنان**: وتارەکەی لە رادەی زانیاریی من سەرتربوو؛ نەمتوانی سەرەودەرە لە قسەکانی بکەم/ دە قسەکانی بگەم.

١٩٦١/ 1660- **تێگەیشتن**: لە هەبوونی کەسانێك لە تۆرەمەی ئاسیایی لە ئەمریکا رەنگە تێبگەین کە رۆژنامەو، رۆژگارێك ئەو دوو قاررانە پێکەوە نووسابن.

١٩٦٢/ 2497- **تێگەیشتن، حاڵی بوون**: بریا یەکجار و بۆ هەمیشە لێت حاڵیبا کە لە پارە/ پووڵ دروست نەکراوم.

١٩٦٣/ 3149- **تێگەیشتن، هەست پێکردن، لێحاڵی بوون**: هیچ لێت حاڵی نیم کە دەتەوێ بڵێی چی./ چ پێشنیار دەکەی؟

١٩٦٤/ 163- **تێگەیشتن لە؛ تێگەیاندن لە، وشیار بوونەوە، وشیار کردنەوە**: کاتی ئەوەهاتووە کە لە راستیەکان بگەی.

١٩٦٥/ 2394- **تێگەیشتن لە، خوێندنەوە لە، بۆ دەرکەوتن، هاتنەدەستی**: لە کوێ قسەکانی کاوە بۆم دەرکەوت کە لە هاوینێ را کارەکەی لە دەست دەدا.

١٩٦٦/ 7121- **تێگەیشتن لە، سەرەودەرە لێکردن، حاڵی بوون لە**: وابزانم کابرایەکی زۆر بە هۆش نەبم؛ نەتۆ لەو تەلیفوونە گەیشتی، مەگەر نا؟

١٩٦٧/ 7123- **تێگەیشتن لە**: ئەو ئیستیعدادی ئەوەی نیە کە لە ویستی دەروونیی کەسانی دیکە بگا.

١٩٦٨/ 4164- **تێگەیشتن لە، سەرەودەرە لێکردن**: هەرگیز لە قسەکانی ئەو کابرایەی ناگەم.

١٩٦٩/ 7434- **تێگەیشتن لە، سەردەرهێنان لە**: پۆلیسی نهێنیی دوکانان بە خێرایی لە شێوەی کاری دزی دوکانەکان گەیشت.

١٩٧٠/ 5687- **تێگەیشتن لە (سروشتی کەسێك)**: ئەو فێر ببوو کە لە رواڵەتی لەسەرەخۆی ئەو کابرایە، شەخسیەتی راستەقینەی تێبگا.

١٩٧١/ 2545- **تێگەیشتن لە، حاڵی بوون لە، سەردەرهێنان لە**: کاتێك ماری هۆی راستەو دروستیی ''مانەوەی مێردەکەی لە دایرە هەتا درەنگ وختانێك''ی بۆی دەرکەوت، هێندەی پێنەچوو مەسەلەکە بە تەواوی ئاشکرا بوو.

١٩٧٢/ 267- **تێگەیشتن و قامك لەسەر دانان**: مامۆستاکانی تاقیکاری هەر زۆر زوو لە هەڵەکەی گەیشتنو قامکیان لەسەر دانا.

تێگەیشتن ← پێزانین، دەرخستن، لێحاڵی بوون، حاڵی بوون لە کەسێك، وەدەست هێنان.

تێگیران ← لە قوڕ چەقین.

١٩٧٣/ 2471- **تێگەیاندن، گەیاندن، لە هەستدان**: سیاسەتمەداران لە راگەیاندنی بیروبروای خۆیان بە خەڵك، تەنانەت ئەگەر نەیارەکانیان پەیتا پەیتاش قسەکانیان بڕن، زۆر کارامەن.

١٩٧٤/ 2416- **تێگەیاندن، گەیاندن**: کابرای کۆمیدیەن/ قۆشمە وانەدەهاتە بەرچاو کە بتوانێ نوکتەکانی بە خەڵکەکە بگەیەنێ. هیچ کام لە نوکتەکانی نەیانگرت.

١٩٧٥/ 4871- **تێگەیاندن، حاڵی کردن، هێنانەگۆ بەگەڵ**: رەنگە توێژەرێکی باش بێ، بەڵام تێگەیاندنی قوتابیەکان لە بابەتەکانی زۆر لاوازە.

١٩٧٦/ 669- **تێگەیاندن، لێحاڵی کردن، بە روونی نیشان دان**: ئەم بەرنامانە بۆ حاڵی کردنی خەڵك لە مەترسیەکانی سیغارکێشان، نەخشێکی گەورە دەگێڕن.

١٩٧٧/ 2602- **تێگەیاندن، پێوەندی گرتن لەگەڵ، قسە کردن لەگەڵ**: ئەو کورە بەراستی کەرە؛ ناتوانم بە هیچ چەشنێك تێی بگەیەنم تەنانەت... .

١٩٧٨/ 6424- **تێگەیاندن، روون کردنەوە، حاڵی کردن**: لە هێندێك لایەنی نەخشەکەمان باش نەگەیشتووە. پێم خۆشە ئەوانەی بۆ روون کەمەوە.

← روون کردنەوە.

١٩٧٩/ 961- **تێگیرسان، دەشتێك گیرسان، گیر کردن**: ئەو کورە بەستەزمانە/ قەڵەندەرە داوێنی کۆتەکەی لە زنجیری دووچەرخەکەی داگیری کردبوو، هەر ئەوش ببووە هۆی تەسادوف کردنەکەی.

١٩٨٠/ 7023- **تێهەڵ لەسەر دوورییانێکی ژیان**: لەسەر دووریانێکی جیاواز تێ‌ماوی. لەلایەك پێت خۆشە پڕ بە دڵی خۆت خۆشی بگوزەرێنی‌و لە لایەکی دیکەشەوە بە ئەندازەی بەرەی خۆت پێ ڕاکێشی.

١٩٨١/ 7115- **تێهەڵئەوە**: کراسەکەت هاتۆتەدەر؛ تێی‌نێوە.
← دانان،

١٩٨٢/ 4647- **(زاراوەی عامیانەی منداڵان) تێ دان**: منداڵەکان، تینی بدەنێ.
← وەگەڕ خستن.

١٩٨٣/ 6911- **تینووی... بوون (یەکجار زۆر) تینوی شتێك بوون**: وەحشیان دەورەیان دابوو کە زۆریان تینیشتیا لە خوێنەکەی بوو/ کە تینووی خوێنەکەی بوون.

١٩٨٤/ 7443- **تێنەگەیشتن، نەزانین، لەخۆ پرسیار کردن و نەزانین**: کەوابوو چیا لە نەخۆشخانەیە؟ لە خۆم دەپرسی‌و نەمدەزانی (لە کوێیە).
تێنەگەیشتن ← بایخ پێ‌نەدان.
تێوە بردن ← تێخستن.
تێوەپێچان ← بەستەبەندی کردن.

١٩٨٥/ 2046- **تێوە پێچان، داپڵۆسین**: ئەو کابرایەی دەیەویست خۆفڕێداتە نێو ئاوەکە هاواری کرد و گوتی: ئێستا پڕمەترسی‌ترین خۆ فڕێدان بۆ نێو ئاوەکە ئەنجام دەدەم، ئاور دەخۆم بەردەدەمو خۆ داوێمە نێو ئاوەکە.

١٩٨٦/ 4676- **تێوەچوون، گرفتار بوون لە**: وڵات گرفتاری دژایەتی‌و کێشەیەکی ئاشکرا دەگەڵ دراوسێکان بوو. ✱ بە هۆی هەوڵی تەجزیەتەلەبانەی ئوستانەکانی ڕۆژهەڵات گرفتاری شەڕێکی نێوخۆیی بووین.
← تێوەردان.

١٩٨٧/ 2594- **تێوەچوون، دەجێگایەکەوە چوون**: سەرت سوور دەمێنێ ئەگەر بڵێم حەیوانێکی ئاوا زەبەلاح دە کونێکی ئاوا چکۆلەوە چووە.
← جێگابوونەوە.

١٩٨٨/ 2947- **تێوە چوون دە شتێکەوە (بەو واتایە کە بە کاربردنی هێز پێویستە)**: ئەو تەنافە/ شریتە زۆر لەوە ئەستوورترە کە دەم کونەوە بچێ.

١٩٨٨٠١/ 3443- **تێوەردان، تێوەچوون (دەکارێکەوە)، گرفتار بوون یان کردن، دەرگیر بوون یان کردن**: بە هەر جۆرێك بێ، ژمارەیەك لە دۆستەکانی لە گەورگرفتی خۆی دەگەڵ خێزانی وەردابوو.

١٩٨٩/ 3426- **تێوەردان (ی کەسێك لە کارێك)، هێنانەگۆڕ**: ئەتۆ حەقت نەبوو نێوی من لەو باسە دا بێنی‌یە گۆڕێ. زۆرباش دەزانی کە ئەمن دەمەویست نەیەمە نێو کێشەی تۆوە باوکتەوە.
تێوەردران ← تێوەگلان.
تێوەژاندن (بە مامزەی) ← هاندان بۆ خۆ دەکارێك وەردان.

١٩٩٠/ 1999- **تێوە گلان، تێوەردران**: ئەندامی سەربەخۆی... گوتی نایەوێ خۆی‌لە کێشەی نێوخۆیی حیزب لەسەر بنەماڵەی پاشایەتی وەردا.

١٩٩١/ 2031- **تێهاڵاندن، گیرکردن، تێهاڵقاندن**: ئەوێ ئالیس چۆن توانیبووی ئاوا پرچی لەو دروانە بالێنێ؟ دەگەڵ براکەی خۆ شاردنەوەکێنی دەکرد.

١٩٩٢/ 3302- **تێهاویشتن، تێخستن**: کوڕە جحێڵەیەك هیچ دەلیلێك نابینێ کە بۆ نەتوانێ تۆپێك بهاتە نێو قولکەکەو...

١٩٩٣/ 3392- **تێهاویشتن، تێرز کردن**: سکەیەکی پێنج پێنی لە کونەکەی بارێزەو گورشی‌یەکە/ لاقیتەکەی هەلگرە. ✱ هەر کە کابرای دز لۆسەکەی دەبن پەنجەرەکە ڕۆ کرد، پۆلیسەکان دەریەڕینو دزمیان گرت.

١٩٩٤/ 185- **تێهاویشتن (سۆیە، گووزە بە چەشنێك کە ماوەیەکی زۆر بکێشێ)**: لەبیرت نەچێ پێش ئەوەی بێیەسەرێ، سۆیەکەی تێ‌هاوێی.
تێهەڵپێچان ← سەر لەسەر کەسێك هەڵنەگرتن.

١٩٩٥/ 3627- **تێهەڵدان و فڕێدانە خوار لە پلیکانان، فڕێدانە خوار بە شەق**: کابرای تووڕە یاری ژنەکەی خۆی بە شەق لە پلیکانان فڕێدا خوارێ.
← بە خزمەتی کەسێك گەیشتن. لێدان، بازجوویی.

١٩٩٦/ 3626- **تێهەڵدانەوە، دژکردنەوە لەخۆ نیشان دان**: 'بابە، بیلی تێم هەڵدەدا'، 'ئەتۆش تێی‌هەڵدەوە'. ✱ لە بەرامبەر ئەو هەموو دەنگۆ ناجوامێرانەیەی کە سەبارەت بە هەبوونی فەساد لە ڕێکخراوەکەمان دا بڵاو دەکرێتەوە، دەبێ دژ کردەوە لە خۆمان نیشان بدەین.

١٩٩٧/ 4055- **تێهەڵڕوانین**: لە حاڵێك دا دەستی لەسەر سمتی دانابوون، بە چاوێکێ ڕێزەوە بەڵام بە گاڵتەوە دە ژیلوانی هەڵدەڕوانی.

١٩٩٨/ 1634- **(خراپ) تێهەڵسوون**: منداڵەکانیان هان دەدان کە بە کەیفی خۆیان ڕەنگەکەی تێ‌هەڵسوون.

١٩٩٩/ 5487- **تێهەڵسوون:** کەمێك لەو کرێمە لە پێستی بەدەنت هەڵسوو بۆ ئەوەی لە بەرامبەر تیشکی تاوێدا بیپارێزی.

٢٠٠٠/ 1635- **تێهەڵسوون:** ماری (چکۆلە) مربەبار شوکەلاتی لە هەموو بەروانکەکەی هەڵسوو بوو.

تێنان ← لەخۆ دوور کردنەوە، تێخستن.

٢٠٠١/ -

٢٠٠٢/ 6022- **تێهەڵسوون:** پێش ئەوەی کە ڕەنگە ڕۆنەکەی لێدەی، هێندێك لەو کرێمە دە دەموچاوت هەڵسوو.

← لێدان، یان تێهەڵسوون، ( بە لێزانی‌یەوە) بە کارهێنان، لێدان.

تێهەڵکردن (ی گۆرانی) ← لە فرقەی پێکەنین دان.

٢٠٠٣/ 7091- **تێهەڵەنگوتن، سەر سەقلن:** ئەرێ دەکرێ لوتف بکەیو ئەو سەگە لەسەر ڕێگا لابەری؟ ئەوە دوو جارە تێیهەڵدەنگرێتەو هێندەی نامێنێ بکەوم.

٢٠٠٤/ 5507- **تێهەڵەنگوتن، کوتوپڕ هیتن یان چاو پێکەوتن:** لەو سەفەرەی کە چووەمە لەندەن، دە یەکێك لە هاوکارەکانی پێشووم هەڵەنگوتم/ کتوپڕ چاوم پێی‌کەوت.

تێهەڵەنگوتن ← بەهەڵکەوت تووش بوون، بەسەر کەسێك دا کەوتن، دۆزینەوە (بە هەلکەوت)، (بە هەڵکەوت) تووشی کەسێك بوون، دیتن.

٢٠٠٥/ 963- **تێهەڵهێنانەوە، قەرەبوو کردنەوە:** سکرتێر بۆ قەرەبووکردنەوەی کاری لەبیرچووی بایەگانی کردنی نامەکان، ناچار بوو لە کاتی نانخواردنیش دا کار بکا.

٢٠٠٦/ 4198- **تێهەڵهێنانەوە:** زانکۆ هەموو جوانی‌و خۆشی‌یەکانی خۆی نابووە بەردەستی؛ دەنگوت دەیەوێ هەموو ئەو شتانەی کە لە ڕابردوودا دریغی لێکردووە. ئێستا بۆی هەڵبێنێتەوە.

← قەرەبوو کردنەوە.

٢٠٠٧/ 6564- **جلوو کردن، بە تەواوی بە قەناعەت گەیاندن، بوولای خۆ ڕاکێشان، شێتو شەیدا کردن:** دوای جارێك چاوپێکەوتن، کچەتیو شێتەو شەیدا ببوو.

٢٠٠٨/ 7012- **جاڕز بوون، وەگیان هاتن:** سەرەنجام لەوە کە دەبوو سەرانسەری ڕۆژێ لە ئیدارەی دابنیشێ، جاڕز ببوو/ وەگیان هاتبوو. ئاواتی ژیانێکی بە جموجۆڵتری دەخواست.

٢٠٠٩/ 4596- **(زاراوەیەکی بێئەدەبانە) جاڕز بوون، وەزاڵە هاتن:** تا پێش ئەو ڕۆژە چیا لە شوغڵەکەی وەزاڵە هاتبوو لە ڕێگایەك دەگەڕا بۆی هەڵێ.

٢٠١٠/ 2200- **جاڕز بوون لە، بێزار بوون لە:** هەتا پێش ئەو ڕۆژە، تا ڕادەیەك لێی بێزار ببوون. بۆیەش نامەیەکی تونلوتیژیان بۆ نووسی.

← ماندووبوون لە، وەگیان هاتن، تووڕە بوون.

٢٠١١/ 4616- **(بە پرسیاران) جاڕز کردن:** هەموو ساڵێ ئەم وەختانە ئیدارەکانی وەرگری خوێندکار بۆ زانستگەکان بە هۆی پرسیار کردن لەلایەن داوتەڵەبانی نیگەرانەوە جاڕز دەکرێن.

٢٠١٢/ 4532- **جاڕز کردن، حەوسەڵەی کەسێك بردن:** ئەو منداڵانەی واژۆ کۆ دەکەنەوە، ئەو یاریزانانەیان کە لە ستادیوم دەهاتنەدەر بە تەواوی جاڕز کرد بوو.

٢٠١٣/ 2735- **جاڕز کردن، مێشکی سەربردن، لە گیان بێزار کردن، عەزابدان:** ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ئەو هەستە عەزابی دەدا کە بە تاوانی جینایەتی کەسێکی دیکە سزا دراوە.

← حەوسەڵەی کەسێك بردن، نارەحەت کردن.

٢٠١٤/ 3526- **جاروبار تەمرین کردن، خۆ ڕاهێنان:** ئێستا وەختێکی ئەوتۆم بۆ یاری کردن لە... دا نیە، بەڵام ڕۆژەکانی پشوودانی حەوتوو هەوڵ دەدەم تەدریب بکەم.

٢٠١٥/ 2897- **جارێ بەسە، بۆ ئێستا بەسە:** ئێستا ناتوانم هەموو پارەکەت بدەمێ. دەتوانم هێندێکت بدەمێ بەشی ئێستات بکا. پێنج پوند بەسە؟

٢٠١٦/ 6183- **جاسووسی کردن لەسەر:** پۆلیس پارەی دەداتێ بۆ ئەوەی لەسەر باقی خوێندکارەکان جاسووسی بکا.

٢٠١٧/ 3159- **جالب بوون بۆ، سەرنج ڕاکێش بوون بۆ، ڕاکێشان بۆ لای خۆ:** وادەهاتەبەرچاو کە بابەتەکە بۆ ئەو سەرنج ڕاکێشە. * بۆ من شێعرەکانی کیتس هەمیشە جالب بوون.

جرپەجوپ کردن ← ڕەفتاری ناشایست لەخۆ نیشان دان، بەدفەری کردن.

٢٠١٨/ 7168- **جلکی جوان، لیباسی جوان دەبەر (کەسێك) کردن:** هەمیشە جلکی جوان دەبەر منداڵەکانی دەکا.

٢٠١٩/ 7015- **جل و بەرگی خاوێن دەبەر کردن:** ئەگەر بینا لەسەر ئەوەی بێ کە تەنیا ژاکەتێکی جوان دەبەرکەم، حازر نیم بێمە ئەو میوانی‌یە.

٢٠٢٠/ 4366- **جموجۆڵێکی زیاتر پەیدا کردن، بەخۆوە گرتن:** لە نیوەی دووهەم دا، یارییەکە جموجۆڵێکی زیاتری پەیدا کردو چەند پاسکاریی زۆر جوان بەڕێوە چوو.

٢٠٢١/ 6548- **جنێودان بە، قسەی سووك گوتن بە:** 'پێویست ناکا جنێوم پێبدەی، پێشی زمانی خۆت بگرە'.

جواب دانەوە ← وەڵامدانەوە.

جواب کردن ← دەنگدان.

۲۰۲۲/ 4966- جواب کردن، ڕیگانەدان بە: ڕەنگە زۆر جاران کــە ویستوویە قسەی دەگەڵ بکا، جوابی کردبێ.

۲۰۲۳/ 14- جوابگــۆ بـــوون، بەرپرســیاربوون لەبەرامبـــەر...: بەرپرســانی ئاســایش دوو کــەس لــە تــەجاوزکارانیان بەرپرسیار زانی.

۲۰۲٤/ 16- جوابگۆ بـوون لەبەرامبـەر، وەڵامدەربـوون لەبەرامبـــەر، بەرپرسیاربوون لەبەرامبەر: هەتا ئەو کاتەی ئەو کچــە دەگـەڵ تۆیە، هــەرچی بەســەری بــێ، دەبــێ لەبەرامبــەر مــن دا وەڵامدەر بی.

جوابە جەنگی کردن ← بەدەمداهاتنەوە.

۲۰۲٥/ 6714- جوانتر کردنەوە: هەرگیز نــەمدەزانی ژیــان لــە هەوای ئازاد داتا ئەو رادەیە بۆ پیاوی بە قازانجــە. ســاڵها ئەو کابرایەی جوانتر کردۆتەوە.

۲۰۲٦/ 5776- جوانــتر نیشــان دان، بەرجەســتەتر کــردن: جــلو بەرگەکــەی مــروە سوورەترشــی‌یەکانی ئــەوەندەی دیکــە جوانتر نیشان دەدا.

۲۰۲۷/ 5496- جوان جووڵانەوە دەگەڵ، دەست بەسەرداهێنان: هــەوڵی دەدا دەگــەڵ ئــاڵفرێد جــوان بجووڵێتــەوەو، پێــی دەگــوت خزمەتەکانی بە باشگا/ یانە یەکجار بەنرخ بوونو، شــتی لەم بابەتە.

۲۰۲۸/ 1966- جــوان دانیشــتن، پــاڵدوەکدان، لێک نزیـک دانیشـــتن: دەکرێ کەمێك لێــك نزیــك تــر دانیــش؟ چــەند کەســێك جێگایان نیە دانیشن.

جوان دیتران ← روون هاتنەبەرچاو.

۲۰۲۹/ 4741- جوان کردن: لێرە چەندین کۆخی سادە هــەبوون کە جوانیان کردبوون بۆ فرۆشتن بە دەڵاڵــەکانی ســەهامی شیرکەتەمان.

← رازنەنەوە.

۲۰۳۰/ 6212- جودا کردنەوە یان نیشانە کردن بە سینگان: خەریکــە لە بنــەبانی دۆڵــێ کرتــە زەوی‌یــەکی بــە ســینگان جــودا دەکاتەوە.

۲۰۳۱/ 6630- جورئەت بەخۆدان، ئازایــەتی کــردن، ئــازا بــوون: بــە راوەســتان لێرە ئەو یارمەتی‌یە ماڵی‌یە پێویســتەت وەچنگ ناکەوێ. جورئەت بە خۆت بدەو بچۆ لای ســەرۆکی بانك.

۲۰۳۲/ 5658- جورئــەت بــەخۆدان، ورە وجبــەرخۆ ئــان: لــەوێ رامەوەســتە، جورئەت بە خۆت بدەو بازدە.

← بەســەر ترسی خۆدا زاڵ بوون.

۲۰۳۳/ 6371- جورئــەت وجبــەرخۆدان و گوتــن، داکۆکــی کــردن لــە: جورئەت بە خۆم دەدەمو دەڵێم ڕێگا چارەی جانی دروستە.

جورمەزی ("جور مزدی") کردن ← کار بۆ خــەڵك کــردن (بە حەقدەستەو لە ماڵی خۆ).

جزماڵ کردن ← لەژێر ناو هێنانەدەر.

۲۰۳٤/ 3637- جووتە هاوبەشێن: هەر کە ئەسپە بۆریان بــەردا، دەســتی کــرد بــە جووتــە هاوێشــتنو هــەڵاتن بـــۆ لای ئەسپەکانی دیکە کە لە نزیك جۆبارەکە بوون.

۲۰۳٥/ 4403- جووت جــووت دەگــەڵ یەککــەوتن، دوو کــەس دوو کــەس دەگــەڵ یــەك کــەوتن: پێشــمەنگەکان دوو دوو دەگـــەڵ یـــەك کەوتنو دەستیان بە گەشت لێدان بە ناوچەکەیان داکرد.

← نێوان خۆش بوون.

جووران ← گەندەڵ بوون.

۲۰۳٦/ 3458- جوور نەهاتنەوە، یەك نەگرتنــەوە، دژایــەتی هــەبوون دەگــەڵ، وەك یــەك نەهاتنــەوە: خەتــەکانی ســەر کراواتەکــەی دەگــەڵ خاڵــەکانی ســەر ژاکەتەکــەی جـــوور نایەنــەوە. *هەرچی دەیگوت دەگەڵ بیروباوەری فرۆڵی ئێمە دژایەتی هەبوو.

← نەهاتنەوە دەگەڵ.

۲۰۳۷/ 3462- جوور نەهاتنەوە دەگەڵ، خوێندنەوە دەگــەڵ، هاتنــەوە دەگەڵ، یەکگرتنەوە: ئەوەی ئەو دەیڵێ کە چ شــتێك روو دەدا دەگەڵ ئەوەی ئەمن نووسیومە بە تەواوی یەك دەگرنــەوە. * ئەو بەراوەردە خۆشبینانەی ســەرۆکی شــەریکە دەگــەڵ کارکردی شەریکە یەك ناگرنەوە.

۲۰۳۸/ 6997- جوور هاتنەوە دەگەڵ، وەك یەك هاتنــەوە، خوێندنــەوە دەگەڵ: ئەو بەڵگەیە دەگەڵ ئــەو رەوتــە دەخوێنێتــەوە کــە پۆلیــسی نهێنی وەدەستیان کەوتووە.

← یەکگرتنەوە، هاوئاهەنگ بوون، هاتنەوە دەگەڵ.

۲۰۳۹/ 6088- جــوور هاتنــەوە یــان نەهاتنــەوە، یەکگرتنــەوە یـــان نەگرتنــەوە، خوێندنــەوە یــان نەخوێندنــەوە دەگــەڵ، هاتنـــەوە یـــان نەهاتنەوە دەگەڵ: کارو کردەوەکانی دەگەڵ ئیدیعاکانی کــە گۆیا قارەمــانی داکۆکــی کــردن لــە چەوســاوەکانە یــەك ناگرنەوە.

۲۰٤۰/ 1823- (خــراپ) جووڵــەوە دەگــەڵ، رەفتــار کــردن دەگەڵ، هەڵس و کەوت کردن دەگەڵ، زوڵم کردن: ئەو هەمیشــە ئیدیعــای دەکرد کە زوڵمی لێدەکەن/ خــراپ دەگــەڵی دەجووڵێنــەوە، بەڵام،...

٢/٢٠٤١ 2734- **جوون، کللۆر کردن:** وادیار بوو کە نەمامەکان لەلایەن هێندێك دەعباوە کللۆر کراون/ بە هۆی هێندێك دەعباوە کللۆر بوون.

٢/٢٠٤٢ 4684- **جەخت داناﻥ لەسەر بە ئاشکرا نیشاندان، بە روونی دەرخستن:** چوونەسەری ئەم دواییانەی حەقدەستەکان جیاوازیی نێوان دەوڵەتی ئێستا و ئەوی رابردوو بە روونی دەردەخا.

٢/٢٠٤٣ 4226- **جەخت داناﻥ لەسەر، بەشێوەیەکی قاتوقرانە باسی لێوە کردن، تەئکید لەسەر کردن:** سەرۆك وەزیران لەسەر جیاوزییەکی زۆر کە لە نێوان ئۆپۆزیسیونی دواکەوتووو بەوبڕوای پێشکەوتووانەی پارێزگاران دا هەیە جەختی دانا.

٢/٢٠٤٤ 4157- **جەخت داناﻥ لەسەر، تەئکید کردن لەسەر:** لە بنەماڵەی ئێمەدا هەمیشە لەسەر غاردانو هەڵاتن تەئکید دەکەن، بەتایبەت هەڵاتن لە دەستی پۆلیس.

٢/٢٠٤٥ 3782- **جەخت کردن یان داناﻥ لەسەر، گرنگی پێدان:** رۆژنامەی فیگارۆ لەسەر گەشەپێدانو زیاد کردنی ناوەندەکانی پەروەردە کردنی سیستەر/ پەرستار، لەو جێگایانە کە لەباری پەروەردەو فێرکردنەوە دەبێ زیاتر چاوەدێری بکرێن، بەتایبەتی تەئکیدی کردووە. ● لەسەر مەسەلەی پاراستنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەشێوەی ئێستا، لە کاتی شارسازیدا، تەئکیدێکی ئەوتۆ نەکراوە.

← تەئکید کردن لەسەر.

٢/٢٠٤٦ 4649- **جەخت لەسەر داناﻥ، تەئکید کردن لەسەر:** بە تەئکید کردنی ئەو لەسەر نەخشی تەواو کەمالی بۆ گەیشتن بە رێگا چارەیەك باوەڕتان هەبێ.

جەرگ بۆ کەسێك سووتان ← زگ بە کەسێك سووتان.

جەرەس لێدان ← زەنگ لێدان.

٢/٢٠٤٧ 3451- **جەك لێدان، بلیند کردن، هەڵێنان بە جەك:** ماشێنێکی جەك لێدراو لە کەنار پیادەرەو راوەستابوو، رانندەکەی خەریکی گۆڕینی چەرخێکی بوو. ● کەمێکی دیکە (بە جەك) هەڵیهێنە؛ چەرخەکانی هێشتا دەگەنە ئەرزی.

٢/٢٠٤٨ 7240- **جەك لێدان، لاك نەلکوولێدان:** رەنگە کۆنەکەی بکرێنن، بە سەعاتەی رێلەو لووسی کەن، جا ئەوجار جەلای لێدەن.

جەنگ کردن ← شەڕ کردن.

٢/٢٠٤٩ 3289- **جەلە گرتن:** پیاوە پیاوێکی کەللەکەرو سەرسەختە؛ تا رادەیەك بە هۆی عاتیفییەوەو تا رادەیەکیش بە هۆی خۆپەرستی، جەنەی گرتبوو.

← گوە کردن لەسەر، پێ چەقاندن.

٢/٢٠٥٠ 2973- **جەهەننەم بە، جەهەننەمت لێ بڕوێ، بە دۆزەخ:** "لە دەستی ئەو ئیدارەیە جارز بووم، دەمەوێ بڕۆم". باشە، ئەگەر ئاغای جیمس ویستی بتبینێ، چی پێ بڵێم؟، "پێی بڵێ جەهەننەم بێ"!.

← (تەوهین ئامیز) ون بە!، بڕۆ، گۆڕی خۆ ونکردن.

٢/٢٠٥١ 633- **جیابوونەوە، تەواو بوون، کۆتایی هاتن:** وەك ژنو مێرد نەماون/ لێك جیابوونەتەوە، زۆر کەم بە یەکەوە دەبینرێن.

٢/٢٠٥٢ 6146- **جیابوونەوە، لێبوونەوە:** مەسەلەکە ئەوەیە کە دەیانەوێ پێشی جیابوونەوەی ئەندامە توندڕەوەکان لە سازمانی رەسمیی یەکیەتی بگرن.

٢/٢٠٥٣ 2763- **جیابوونەوە، دوور کەوتنەوە:** دوو پارێزەرە کە لە خەلکەکە جیابوونەوە بۆ ئەوەی دەربارەی پێشنیاری پارێزراوەکەیان بە یەکەوە راوتەگبیر بکەن.

٢/٢٠٥٤ 1855- **جیابوونەوە، دوورکەوتنەوە لە:** تاقمێکی چکۆلە لەوانی دیکە جیابوونەوەو بە ئەسپایی چوونە نێو جەنگەڵێ. ● لە پێرەندیی دەگەڵ جانو لیز دەگەڵ خۆشبینییەکەت شەریك نیم. چونکە نەك هەر لێك دوورناکەونەوە، بگرە (رۆژ بە رۆژ) لێك نزیك دەبنەوە.

٢/٢٠٥٥ 3263- **جیا بوونەوە لە:** ساڵی داهاتوو، بەشی بیۆشیمی جیا دەبێتەوەو دەبێتە دیپارتمانێکی سەربەخۆ.

٢/٢٠٥٦ 590- **جیابوونەوە لە:** بۆی هەیە بەشێك لە دەوڵەتی فیدراڵ جیابێتەوەو سەربەخۆیی رابگەیەنێ.

٢/٢٠٥٧ 4425- **جیابوونەوە لە، رێگای خۆ جیا کردنەوە، لەسەر یەك بیروباوەڕ نەبوون، هاوفکر نەبوون، جیاوازیی روانگە هەبوون:** لە کۆتایی مەنزڵی یەکەمی سەرکەوتن دا، بە داخەوە رێگای خۆم لە رێگای هاوڕێ شاخەوانەکانم جیا کردەوە. ●لەسەر مەسەلەی یەکگرتنی بریتانیا دەگەڵ ئورووپا دەگەڵ ئەو هاوفکرنیم/ منو ئەو هاوفکر نین.

← لە تاقمێك جیابوونەوە… .

٢/٢٠٥٨ 3401- **جیا کردنەوە (لە) (بە)، ئیزۆلە کردن، عایق کردن:** جیا کردنەوەی سۆبەکە لە هەر چەشنە ئامرازێکی تەختەیی بە خشتە لۆکەی ئەسووز یەکجار گرنگە. ● ستردیزی تەسجیل دەبێ لە بەرامبەر هەر چەشنە سەرچاوەیەکی دەنگەو هەرا عایق بکرێ.

**۲۰۵۹/ 4429- جیا کردنەوە (بە دیوار لێدان، تیغە کێشان):** هۆدە گەورەکانیان تیغەلێدان (و هۆدەی چکۆلەیان لێ دروست کردن). ● حەمامێکی چکۆلەیان بە تیغە لە ناشپەزخانە سەرەکی‌یەکە جیا کردۆتەوە.

**۲۰۶۰/ 1755- جیا کردنەوە، دەرکێشان، دەست خستن یان هێنان، دەست نیشان کردن:** لەو زنجیرە رووداوە تێکەڵ پێکەڵانە دەتوانین دوو رەوتی گرینگ جیا بکەینەوە/ دەست نیشان بکەین.

جوڵانەوە بەشێوەیەکی نالەبار ← بەشێوەیەکی نالەبار جوڵانەوە.

**۲۰۶۱/ 5501- (بە خەت کێشان) جیا کردنەوە:** رەقەمەکان لە ستوونێك دا بنووسەو خەتێکیان لەژێر بکێشە بۆ ئەوەی کۆیەکەیان لە ژێرەوە بنووسی.

**۲۰۶۲/ 5750- جیا کردنەوە:** ئیستیعدادە بێ‌هاوتاکانی ئەوی لە باقی پەیکەرتاشانی هاوچەرخی خۆی جیا کردۆتەوە.

**۲۰۶۳/ 6209- جیا کردنەوە بە سینگان:** بەشێکی چکۆلەیان بۆ یاری کردنی منداڵەکان دیاری کردبوو، بە سینگان جودایان کردبووە.

**۲۰۶۴/ 4430- (دوو کەس) جیا کردنەوە:** ژنی خانەخوێ ژنو پیاوەکانی بۆ بەرنامەی هەڵپەرکێ دوو کەس دوو کەس جیا کردنەوەو دەگەڵ یەکی خستن.

جیا کردنەوە بە پەرژین ← بە پەرژین جیا کردنەوە، دابەشکردن، هەڵبژاردن.

**۲۰۶۵/ 4239- جیا کردنەوەی بەشێك لە شتێك بە خەتێك/ سنوورێك:** لە ئاخری زەوی‌یەك بەشێکیان بە خەتێك جیا کردبووە بۆ مەیدانی کایە کردن لە داهاتوودا.

**۲۰۶۶/ 5738- جیا کردنەوە (لە):** بڕیار تەرتیبێك بدە مزراحیەکان جیا بکەنەوەو کاری تایبەتی‌یان بدەنێ بیکەن.

← هەڵاواردن.

**۲۰۶۷/ 1787- جیا کردنەوە لە:** دەریای سوور ئەفریقای لە ئاسیا جیا کردۆتەوە.

**۲۰۶۸/ 1692- جیا کردنەوە لە، جیا کرانەوە لە، وەلابردن لە:** لە یورگ، دوو واگۆن لە قەتاری ویدنیورگ جیا کرانەوە.

**۲۰۶۹/ 1776- جیا کردنەوە لە، لە سەرووی ... دانان:** ئاقڵو هۆشی زیاترو توانای قسەکردن ئینسانی لە سەرووی هەموو گیانلەبەرێکی مەمکدار داناوە.

**۲۰۷۰/ 1711- جیاواز بوون لە، لەسەریەك بیرو بڕوا نەبوون:** ئەو دوو حیزبە لەسەر ئەو مەسەلە کە کام رێگا چارە هەڵبژێرن جیاوازیی بیرو باوەڕیان هەیە.

جیاوازی ← تەفاوەت.

**۲۰۷۱/ 1750- جیاوازی دانان، فەرق دانان، زوڵم لێکردن:** بەڵگەی روون بەدەستەوەیە کە هێندێك لە خاوەنکارەکان زوڵم لەو ژنانەنە دەکەن کە خوازیاری کار پەیدا کردنن.

**۲۰۷۲/ 6871- جیاوازی دیتن:** دایکی دوانەکان پێی گوتم کە ستیفان مووی رەشترە، بەڵام لە هەموو ژیانم دا جیاوازیی نێوان ئەو دوانەم نەزانی چی‌یە.

**۲۰۷۳/ 6870- جیاوازی دیتن لە نێوان، لێك (جیا) کردنەوەی شتێك لە شتێکی دیکە:** هەموو رۆژێك وەك رۆژی پێشتر دەچێ‌و، هیچ جیاوازی‌یەکیان لە نێوان دا نابینم.

**۲۰۷۴/ 1743- جیاوازیی بیروبڕوا هەبوون دەگەڵ:** کابرای خاوەن ماڵ لەسەر ئەوەکە کۆخەکەی دەبێ لە کوێ دروست بکرێ، جیاوازی بیروبڕوای هەبوو (= رێك نەکەوت).

**۲۰۷۵/ 1751- جیاوازیی نێوان دوو شتان زانین:** زەحمەتە بتوانم جیاوازیی نێوان ئەو دوو ئامرازە دەقیقانە بزانم/ تێبگەم.

**۲۰۷۶/ 5749- جیاوازیی نێوان دوو شتان لەبەرچاو گرتن، حیساب کردن:** دەزانم کرێی خانوو لە بە کرێگرتنەکەی زۆرتر هەڵدەگرێ، بەڵام دەبێ تەفاوەتی ئەو راستی‌یەشمان لەبەر چاو بێ کە پوولێکی بەم جۆرە دەیدەم دەمکاتە خاوەنی خانوویەر میەك.

**۲۰۷۷/ 3710- جیاوازیی نێوان دوو شتان دەدیتن:** 'خاڵی ماری دەناسی. مەگەرنا؟' . 'خاڵی ماری؟ ئەم ناوەم ئاشنا دێتەبەر چاو، بەڵام لە نێوان ئەوو قەلەرەشەدا جیاوازی‌یەك نابینم.'

**۲۰۷۸/ 1265- جێبەجێ بوون:** دەست لەسەر دەست دانان و بە بێکاری رۆژگار تێپەر کردن بەو هیوایە کە هەموو شتێك جێبەجێ دەبێ مۆتە بلو.

**۲۰۷۹/ 931- (بە تەواوی) جێبەجێ بوون، بەجێ گەیاندن:** ئەم مەبەستانە بە تەواوی جێبەجێ دەبن.

**۲۰۸۰/ 6086- جێبەجێ بوون، هاتنەوە سەرەخۆ، گەڕانەوە سەر وەزعی ئاسایی:** پاڵدانەوەو، دەست لەسەر دەست دانان بۆ ئەوەی هەموو شتێك لەخۆڕا جێبەجێ بێ، کارێکی خۆرایی‌یە.

**۲۰۸۱/ 7465- جێبەجێ بوون:** ئەو کارانە رێگای تایبەتیی خۆیان هەیە کە لە کاتی خۆیان دا جێبەجێ بێن.

۲۰۸۲/ 7488- جێبەجێ کـردن، لـە ئەنجامدان، تـەواو کـردن، بەجێگەیاندن: تاقمی فرۆشیارەکان سـەعاتی دە لـە فرۆکـە دابەزین و هەتا پێش نانی نیوەڕۆیە چەند مامەڵەیـەکیان/ دانوستانێکیان تەواو کردو بـە فرۆکـەی پـاش نیوەڕۆیـە گەڕانەوە بۆ شتوتگارت.

۲۰۸۳/ 6914- جێبەجێ کردن، حەلکردن، بـە ئەنجـام گـەیاندن: دەتوانین بەشی دووهەم بە ئـەوان بـسپێرین و ئاخرەکەشـی کورتەی باسەکەمان بە ناکام بگەیەنین.

۲۰۸٤/ 4223- جێبەجێ کردن، ڕاکێشانی بە کاریگە: نابینی زیانـان دەرکێشاوە؟ بە مەشرووبەکەی ڕابگە.

۲۰۸٥/ 4957- جێبەجێ کـردن، بـە کـردەوە، لـە ئەنجام دان: نەخشەیەکی دەرەجە یەکەو ئـەویش تـەنیا کەسێکە کـە دەتوانێ بەکردەوە جێبەجێی بکا.

۲۰۸٦/ 2128- جێبەجێ کردن، بەجێگەیاندن، پشـتیوانی کـردن لـە: دەمیگوت چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەیە کـە داخوازەکـەی ژیلـوان جێبەجێ بکا.

۲۰۸۷/ 2269- جێبەجێ کردن (ی شتێك دەگـەڵ کەسـێك): زیندانیـت ناکەن؛ جێبەجێم کردووە. ٭ ئـەمڕۆ دەتوانـن زووتـر لـە قوتابخانە دەرکەون، دەگەڵ مودیر جێبەجێم کردووە.

۲۰۸۸/ 2418- جێبەجێ کـردن، چـووڵـە پـێ‌ڵ: چـۆن دەتوانـی بێ‌ئەوەی کەسێك یارمەتیت بدا کارەکانت بەڕێوەبەری؟ بە هەرجۆرێك بێ، جێبەجێی دەکەم.

۲۰۸۹/ 2739- جێبەجێ کردن، چارەسەر کردن، بـە کـارێك ڕاکێشان: خاڵـە گزشـتنەیەکم لـە روومـەتی هـاتووە، نـازانم چـۆن چارەسـەری بکەم.

۲۰۹۰/ 921- جێبەجێ کـردن، چارەسـەر کـردن: رادیـار بـوو قسەکانی من نارەحەتی کردبوو، بۆیە هەوڵم دەدا بە هـەر جۆرێك بێ مەسـەلەکە چارەسەر بکەم.

۲۰۹۱/ 120- جێبەجێکردن (بۆ)، تەرتیب دان بۆ: تـەلیفوون بکـە بۆ پزیشکی ددان و مولاقاتێکم دەگەڵ ئـەو بـۆ جێبـەجێ بکە. ٭ کـاتێك دەگەیـە ئـەو شـوێنە، دەبینـی هـەموو شتێکت بۆ جێبەجێ کراوە.

۲۰۹۲/ 2268- جێبەجێ کردن بۆ: ئاپارتمانێکی زۆر جوانـی لـە کەنار دەریا بۆ خۆی جێبەجێ کردووە.

جێبەجێ کردن ← لە عـوهدە هاتنـەدەر، چارەسـەر کـردن، پەیدا کـردن، سـازمان دان، لەسـەر ڕێگـا وەلابـردن یـان هەڵگرتن، تەرتیب دان، وەچنگ خستن، کردن.

۲۰۹۳/ 2783- جێلەی بوون، لە شۆخی دەرچوون: گاڵتـە کردن بـەو کچە تایپیستە تازەکارە لە رادەی شـۆخی دەرچـووەو بـە بڕوای من دەبێ دەستی لـێ‌هەڵگری.
← شۆخی هەڵنەگرتن.

۲۰۹٤/ 4625- جێلەی نـەگرتن، بـە فشـە گرتـن: کـاری ئیـداری شتێکە کە هەمیشە بە فشەی دەگرێ، تەنیا شـتێکی کـە پێی‌خۆشە یاریی گۆڵفە.
← سـەرسەری گرتن، بە گرنگ نەزانین.
جەوەبەندی کردن ← دابەش کردن.

۲۰۹٥/ 5396- جێژنی تەواو بوونی ساڵی کۆنەو دەست پێکردنی ساڵی تـازە بـەبۆنەبوونی بەرتێلێکـی دیکـەم ویـسکی کـڕی و خـەمو پەژارەم لە دڵ و دەروونی خۆ دەرهاویشت. جێژنی کۆتـایی ساڵی کۆنەو سەرەتای ساڵی تازەم بەڕێوە برد.

۲۰۹٦/ 3397- جێکردنەوە، ئامـادەکردنی دەزگایـەك، وەکـو خسـتن، جێگای خـۆ کردنـەوە، ئینشان (ی دەزگایـەك لـە دیـوارو ...)؛ کابـانی ماڵـێ دوو نەفـەر ناوارەکـەی لـە هـۆدە زیادییەکـە دا جـێ‌کردەوە. ٭لـە بـوت ئـەمێ سـبەینێ بـەیانی بـۆ وەکارخـستنی یەخچاڵەکە لە ئاشپەزخانەی، کرێکار دێن.
← جێگا کردنەوە، تێیەسـتاوتن.

۲۰۹۷/ 2825- جێگا بوونەوە، بۆبوون، تێوە چـوون: ئـەو پیانۆیـە زۆر گەورەیە؛ لەم هۆدەدا جێگای نابێتەوە.

۲۰۹۸/ 4118- جێگا دیتنەوە بۆ، وەخت دیتنەوە بۆ: بە هەر جۆرێـك بێ دەبێ بۆ منداڵە زیادییەکان جێگا بدۆزینەوە. ٭ 'پێم وایە هەموو هۆدەکان لە جاسـووس پڕن'. 'ئێمە هەمیشـە دەتوانین بە کوشتنی چەند کەسێك، جێگـا بـۆ نەفـەرێکی تازە بکەینەوە.

۲۰۹۹/ 2258- جێگا کردنەوە، دانـان، جێکردنـەوە: نـازانم چاـۆن چەند کورسی دیکە جێگا بکەینەوە.

۲۱۰۰/ 987- (لـە وەرزش دا) جێگـا گۆڕیـن، زەوی گۆڕیـن، جێگۆڕکـێ کردن: پاشی چـەند پرانێـك/ چـەند خـاڵێك، یاریزانـەکان جێگایان گۆڕییەوە بۆ ئەوەی هیچ کامیان بـە نـارەوا لـە باو تیشکی هەتاو بە قاوانجی خۆیان کەڵك وەرنەگرن.

۲۱۰۱/ 6543- جێگـا گۆڕینـەوە، جێگۆڕکـێ کـردن دەگـەڵ: زووکـە، جێگاکەت دەگەڵ ماری بگـۆڕەوە. بـا ئـەو لـە تەنیشـتم دابنیشێ.

۲۱۰۲/ 990- جێگـا گۆڕینـەوە، جێگۆڕکـێ کـردن: فـەرموو جێگاکانمان بگۆڕینەوە بۆ ئەوەی لە سۆیەکە نزیکـتر بـی، دەزانم زۆرت سـەرمایە!

← جێ‌گۆڕکێ کردن.

٢١٠٣/ 566- جێگا تەنگ‌بوونەوە: ئاغا: زۆر بەداخەوە ناتوانین تەنانەت لە هەمیوانیش جێگایەکتان بدەینێ: هیچ جێگایەکمان نەماوە.

٢١٠٤/ 2687- جێگای خۆ دان بە: هەورە بۆرە چلکنەکان کەم کەم بڵاوبوونەو جێگای خۆیان دا بە ئاسمانی شین.

٢١٠٥/ 2681- جێگای خۆ دان بە، گۆڕان: بە راگەیەندرانی ئاگربەس، ناهومێدی جێگای خۆی‌دا بە هومێدەواری.

٢١٠٦/ 956- جێگای خۆ کردنەوە، لایەنگر بۆ پەیدا بوون یان پەیدا کردن، گرتن: روانگەی سەرۆک لە پێوەندی دەگەڵ "ئاگربارانی خێرا" لە کۆنگرە دا لایەنگری پەیدا نەکرد/ نەی‌گرت.

← جێ‌کردنەوە.

جێگای خۆ نەبوون ← نابەجێ بوون.

٢١٠٧/ 1325- جێگای سەرسوڕمان بوون: جێگای سەرسوڕمانە کە کرێکاران پێشنیاری زیاد کردنی چاردە لە سەدی یارمەتی‌یەکانیان قبووڵ ناکەن.

جێگای شتێك پڕکردنەوە ← قەرەبوو کردنەوە.

٢١٠٨/ 6510- جێگای کەسێك گرتنەوە: دوای مەرگی باوکی جێگای گرتەوەو بوو بە شاژن.

٢١٠٩/ 6757- جێگای کەسێك گرتنەوە یان پڕکردنەوە: یەکێك لە هاوکارەکانمان لەبەر نەخۆش کەوتووەو ناچارم جێگای بگرمەوە.

← لە جیاتی کەسێك کار کردن.

جێگای رشك ددان بوون ← خوڕسان.

٢١١٠/ 46- جێگای ... هێشتنەوە، رێگای ... هێشتنەوە: گیروگرفتەکانی هیچ رێگاچارەیەکیان نەهێشتبوو/ هیچ رێگا چارەیەك بۆ گیروگرفتەکانی نەمابوو.

جێ‌گرتنەوە ← رێزێرو کردن.

٢١١١/ 986- جێ‌گۆڕکێ کردن، جێگا گۆڕینەوە: پێم بۆ چوونە نێو شاری بیرمینگام واباشترە ئەمن لێی‌بخوڕم. کەوابوو دەکرێ لە پارکینگەکەی‌تر رایگری بۆ ئەوەی جێ‌گۆڕکێ بکەین/ جێگامان بگۆڕینەوە.

٢١١٢/ 1834- (باش) جێگیر بوون، بە یەکتر خواردن، میزان بوون، هاتنەوە دەگەڵ: لایەنەکانی ئەو قوتووە سیغارە باش بە یەکتر دەخۆن (= جووت دەبن). • پێشنیارەکانت باشن، بەڵام دەگەڵ باقی نەخشەکە نایەنەوە.

← لە جێگای خۆ چەقین، ریشە داکوتان، دامەزران لە جێگایەك.

جێگیربوونەوە ← دامەزراندنەوە.

٢١١٣/ 6201- جێنگڵ دان: قسەکانی ئەومندە ناعادڵانە بو کە لە شەرمان جێنگڵم دەدان.

← هەڵگەرانەوە.

جیهاد کردن ← (بە دڵ و بە گیان) شەڕ کردن.

٢١١٤/ 2953- چاپ کردن: کتێبەکەی هەر یەکجار زۆ سەرکەوتنی وەدەست هێناو تەنیا لە ماوەی ساڵێك ، دەجار چاپ کرایەوە.

٢١١٥/ 4750- چاپ کردن: لە تاقمی زەماوەندەکە چەند نوسخەیان بۆ چاپ کەین؟

٢١١٦/ 4751- چاپ کردن (ی کتێب و ...): لەو پلاکانەی کـ هەن، دە هەزار نوسخەیان چاپ کرد.

٢١١٧/ 6215- چاپ کردن لەسەر: دەزگایەك ناو و ناونیشانی کڕیارەکان لەسەر پاکەتەکان چاپ دەکا.

٢١١٨/ 854- چاپلووسی کردن بۆ، کەسەکێشان بۆ، لاسە لاسە کردن بۆ: بریا لە چاپلووسی کردن بۆ من دەست هەڵگرتبا.

← زمانلووسی کردن.

٢١١٩/ 5595- چاپ و بڵاو کردنەوە، بە پەلە: ئەمن زۆر بەداخ لە نووسەرانی ئەو بەنلو مێژووی نیزامی‌یە لەلایە کەسانێکەوە کە بۆ داگیر کردنی بازارێکی تازە بە پەلە چاپ و بڵاویان کردۆتەوە.

٢١٢٠/ 905- چادر، یان رەشماڵ لێدان یان هەڵدان: ناتوانین بە هیچ میوانێکی دیکە جێی حەسانەوە پەیدا بکەین. باشە ناکرێ چادریان بۆ هەڵدەین؟.

٢١٢١/ 6423- چارەسەر کردن، حەل کردن، تەواو بوون، جێبەجێ کردن: کێشەی نێوانیان بە رۆژێك دوو رۆژان تەواو نابێ.

٢١٢٢/ 6083- چارەسەر کردن، تەرتیب دان، پێڕاگەیشتن: باشە وایە کەسێك بنێری بە وەزعەکە رابگا.

٢١٢٣/ 5799- (هەموو گیروگرفتەکانی جیهان) چارەسەر کردن گوتی: تۆخوا وەرە با کەمێك باسی رابردوومان بکەین. لێرەدا حیلکەیەکی کرد و درێژەی‌دا: 'و هەموو گیرو گرفتەکانی جیهانیش چارەسەر بکەین'.

٢١٢٤/ 7464- چارەسەر کردن، حەل کردن: بریا دایك و باییار لێیان گەڕابان بۆ ئەوەی بۆ خۆیان گیرو گرفتەکانیا چارەسەر بکەن.

٢١٢٥/ 5675- چارە کردن، رێگا چارەیەك دۆزینەوە بۆ: لالە، ئەتۆ زۆر جوانی، حەیفە کە سەبارەت بە بۆنی زلوت کەمتەرخەمی دەکەی. بۆ چارەی ناکەی؟

چارەسەر کردن ← جێبەجێ کردن، حەل کردن (ی کێشەیەك)، تۆتۆو لێدان/ کردن، حەل کردن، زاڵ بوون بەسەر...دا.

چارەنووسی خۆ دەگەڵ... گرێدان ← دەگەڵ ... کەوتن.

٣/١٢٦ 6127- **چاشنی لێدان، بەهارات تێکردن:** ساڵادێکیان دەخوارد کە سەور بیبارێکی زۆریان (وەك چاشنی) لێدابوو.

٣/١٢٧ 5348- **چاك بوونەوە (لە نەخۆشی):** دوای مرعالیجەیەکی زۆر سەخت، ئێستا هەست بەوە دەکا کە چاك بۆتەوە.

٣/١٢٨ 572- **چاك بوونەوە، هاتنەوەپێش، وەپێش کەوتنەوە، چوونەوەسەر:** نرخی سەهمان لە بازاری لەندەن چۆتەوە سەرێ.

٣/١٢٩ 2530- **چاك بوونەوە، هەستانەوە، خۆ گرتنەوە:** دوای ناثارامی‌یەکانی ئەم دوایی‌یانە، سنعەتی ماشێن سازی ماوەیەکی دەوێ بۆ ئەوەی هەستێتەوە/ خۆ بگرێتەوە.

٣/١٣٠ 4558- **چاك بوونەوە:** دوای یەك دوو ڕۆژ لە جێگادا کەوتن، چاك دەبێوە.

٣/١٣١ 3225- **چاك بوونەوە، قەڵەو بوون:** لە ماوەی چەند حەوتووان دا قاچەکانیان بە تەواوی چاك بوونەوەو ئیدی هیچ نارەحەتی‌یەکیان بۆ نەهاتەپێش.

٣/١٣٢ 3224- **چاك بوونەوە، ساڕێژ بوونەوە، هێور بوونەوە:** ئەو برینە قووڵەی باسکی زۆری پێدەوێ ساڕێژ بێتەوە. ● پێ‌بەپێی تێپەربوونی ڕۆژگار، ناکۆکیی نێوان ئەو دوو وڵاتە وردە وردە هێور بووەوە.

٣/١٣٣ 438- **چاك بوونەوە، هەستانەوە لە نەخۆشی:** خاڵی داودی، هیچ نیگەرانی مێردەکەت مەبە: بەم زووانە بە تەواوی چاك دەبێتەوە (و هەڵدەستێتەوە).

٣/١٣٤ 5619- **چاك بوونەوە (ی برین):** ئەو برینەی قامکی چاك دەبێتەوەو ناسەوارێك لە خۆی بەجێ‌دێڵێ.

٣/١٣٥ 1289- **چاك بوونەوە، لە دەست مەرگ هەڵاتن یان ڕزگار بوون، زیندووماندەوە، گیان دەربردن:** دەمزانی شتێکم هەیە کە دەبێ بە پزیشکەکەی بڵێم، بۆ ئەوەی ئەرخەیانی کەم کە چاك بوومەتەوە. ● ئەو کابرایە خۆی بە خۆشبەخت دەزانی چونکە دوو شەڕی جیهانی دیوەو زیندوو ماوەتەوە.

٣/١٣٦ 4817- **چاك بوونەوە، پەلان گرتنەوە:** ئەو نەخۆشە شانسێکی زۆر باشی هەیە بۆ چاك بوونەوە.

← خۆ ڕزگار کردن، هاتنە پێش.

٣/١٣٧ 1551- **چاك کردنەوە لە (نەخۆشی)، ڕزگار کردن لە دەستی:** پێش دیترانەوەی ئانتی بیۆتیك چاك کردنەوەی خەڵك لە ئازارە باریکە کارێکی یەکجار دژوار بوو.

← دەرمان کردن.

٣/١٣٨ 1270- **چاك یان خراپ هاتنەدەس بە ئەنجامێکی باش یان خراپ گەیشتن:** کاتێك ئەو دوو ژنەیان لەبەریەك دانا، ئیزائیل بە زەحمەت پوانێکی باشی هێنا.

چاکەیەك دەگەڵ کردن ← لوتف کردن.

٣/١٣٩ 2406- **چالاکیی خۆ ئەوەندەی یان تووندوتیژتر کردن:** ڕێکخراوەکانی حیزبی ئامادەن چالاکی‌یەکانی خۆیان توندوتیژتر بکەن بۆ هەڵبژاردنی گشتی.

٣/١٤٠ 212- **چالاکی هەبوون، هەڵسووڕان (لە کارێك دا، لە شوێنێك دا):** ئەو بیتێلانە هەتا چەند ساڵی دیکەش - لانی کەم بەشێوەی هونەرمەندی تاکەکەسی- هەروا چالاکی‌یان دەبێ.

٣/١٤١ 1640- **چالاکی هەبوون لە پیشەیەك دا، کاسبی کردن لە ...دا:** نیدارە چکۆلەکەی پۆستە لەو گۆشەیە، بێجگە لە فرۆشتنی پوول (تەمر)و بەجێ‌گەیاندنی کارەکانی پۆست لە زۆرکاری دیکەش دا چالاکی هەیە (= کاسبی دەکا).

٣/١٤٢ 6287- **چالاکی‌یەك دەست پێکردن:** دوو جار پارەی پێویستی دابین کردبوو، کاری ئەندازیاری دەست پێ‌کردبوو..

چاران دەگەڵ ← ڕێککەوتن دەگەڵ.

٣/١٤٣ 6275- **چاو برکێنە کردن دەگەڵ، چاو نەچاوی کەسێك برین.**

← چاو لە کەسێك برین، چاوتێبڕین.

٣/١٤٤ 2156- **چاو بەشتێك کەوتن، هاتنە بەرچاو:** چاوی بە تاقمێك چیاو کەوت کە دەداوێنی کێوەکەدا دەڕۆیشتن.

چاو بە کەسێك کەوتن ← (بە هەڵکەوت) تووشی کەسێك بوون.

چاو بەسەرداخشاندن ← چاولێکردن.

چاو بە کەسێك کەوتن ← دۆزینەوە (بە هەڵکەوت).

٣/١٤٥ 7417- **چاوپۆشی لێکردن، خۆ گێل کردن لە:** لە زیادەڕەوی/ زیادە خەرجی‌یەکانی هەمیشە چاوپۆشی دەکرێ: مێردەکەی لەسەر ئەو بڕوایەیە کە بەم جۆرە ژیانێکی ئارامو بێ‌شەڕوهەڵلای بۆ خۆی پێك هێناوە.

٣/١٤٦ 1408- **چاو پۆشی لێکردن:** حیسابدار حازر نەبوو لە کابرای مشتەری چاوپۆشی بکا کە دەیەویست کڵاو لەسەر بەرپرسانی زەریبە (= مالیات) دانێ.

/٢١٤٧ 5663- **چاوپۆشی لێکردن، وەلانان، لەبەرچاو نەگرتن:** لێرەدا دەڵێ کابرای خوازیار دەبێ سێ ساڵ ئەزموونی لەو کارەدا هەبێ. بەڵام ئەمن پێم وایە دەکرێ لەوە چاوپۆشی بکەین.

/٢١٤٨ 5909- **چاو پۆشی لێکردن، خۆ لێگێل کردن:** ئەگەر لەبەر خەرجی قورسی پێشگری کردن لە وردە دزییەکانیش بووین، شوکەمتەکە ناچارە چاوپۆشیان لێبکا.

چاوپۆشی نەکردن لە ← نەگۆڕین.

/٢١٤٩ 7162- **چاوپۆشی لێکردن، لێبووردن:** لیبراییەکان لە قاچاخی ئەلماسیان چاوپۆشی دەکرد.

← تێپەڕین لە، خەرج کردن، لەبەر چاو نەگرتن، فەرامۆش کردن، لێبووردن، بەخشین.

/٢١٥٠ 4045- **چاوپێداخشاندن:** پێش ئەوەی سەرخەنرانییەکەی دەست پێبکا، چاوێکی بە یادداشتەکانیدا خشاند. ● پێش بەرچایی، چاوێك بە ڕۆژنامەکان دا دەخشێنێ.

/٢١٥١ 2709- **چاوپێداخشاندن:** پێت وایە دەتوانی بە خێرایی چاوێك بەو یادداشتانەی ئاخرین کۆبوونەوەمان دا بخشێنی پێش ئەوەی بیاندەم تایپیان بکەن؟

/٢١٥٢ 2951- **چاوپێداخشاندنەوە، پێداچوونەوە:** بۆ ئەوەی ئەرخەیان بێ کە ئیمکانی سەرنەکەوتنێك نەمێنێ، چەند جارێك بەسەر نەخشەکەدا چوونەوە.

← پێداچوونەوە.

/٢١٥٣ 2925- **چاوپێداگێڕان، چاو لێکردن:** کرێگرتەکانی داهاتوو چاویان لە وەزعی ماڵەکە کردو بێجگە لە سوپاس کردن لە خاوەن پیرەکە بۆ ئەو زەحمەتانەی کێشابووی هیچ ئەزمرێکی دیکەیان نەدا.

/٢١٥٤ 6655- **چاو پێداگێڕان، چاو لێکردن:** ئالفرێد بە چاوە زەعیفەکانییەوە لە گۆڕەپانەکە بە دوای ڕەفیقەکەی دا چاوی دەگێڕا.

/٢١٥٥ 4567- **چاو پێکەوتن، ئاشنا بوون لەگەڵ:** لە مەیخانەی دەگەڵ هەر کەس ئاشنا بێ دەگەڵ خۆی دەیهێنێتەوە ماڵێ.

/٢١٥٦ 4261- **چاو پێکەوتن، دیتن (زیاتر بە هەڵکەوت):** هەتا پێش ساڵی ١٩٥٤، کە بە هەڵکەوت چاومان پێی کەوت، شەش سکرتێری هەبوو کە کاریان بۆ دەکرد. ● چەند ساڵی کێشا هەتا چاویان بە یەکتر کەوتەوە.

/٢١٥٧ 3783- **چاو پێکەوتن، دیتن:** 'ئایا ئەتۆ ئەوە ڕەت دەکەیەوە/ حاشا لەوەی دەکەی کە لەو ڕۆژەدا کە باسی لێرە دەکرێ دەگەڵ شاهیدەکە قسەت کردووە؟'. 'بەڵێ. ئاغا. ڕوونی دەکەمەوە. ئەمن هەرگیز ئەو کابرایە نەدیوە.

/٢١٥٨ 1245- **چاوپێکەوتن، تێهەڵنەگوتن، تووش بوون:** هەر کە لەسەر پێچی شەقامەکە وەرسووڕاینەوە، تووشی تاقمێك پیاو بووین کە چاوەڕوانی کرانەوەی دەرگای مەیخانەکە بوون.

/٢١٥٩ 2483- **چاوپێکەوتن، ئەمەس لەگەڵ گرتن:** ماوەیەکە دەمەوێ سەبارەت بە کردنەوەی دوکانێکی چکۆلەو وەك کارێکی لاوەکی چاوم پێتان بکەوێ.

/٢١٦٠ 5680- **چاوپێکەوتن، دیتن:** شەش مانگ بوو هیچ کەس چاوی پێی نەکەوتبوو لەبەر لە ئاپارتمانەکەمان شرقەکەمان قوت بووە.

/٢١٦١ 2403- **چاوپێکەوتن، دیتن:** هەرگیز لە ژیانیدا دیمەنێکی ئاوا جوانی نەدیبوو.

← دیتن، تێ‌هەڵنگوتن.

/٢١٦٢ 5026- **ناڕەحەت، دڵئێشان، دڵشکاندن:** خالی ماری هێلەر گوتی: 'وەرە ئەمڕۆ نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین'. کابراش چاوپێکەوتنێکی بەپەلەی کردە بیانوو قبووڵی نەکرد ژنەکە وەها ناڕەحەت بوو کە کابرا زانی بێ‌ئەدەبانە جووڵاوەتەوە.

چاو پێنەکەوتن ← نەدیتن.

/٢١٦٣ 3809- **(زاراوەی جینایەتکاران) چاوترسێن کردن، هێنانەڕێ ڕێگە:** ئەم هەراوهوریایە بۆ خۆ پاراستنە. پیاوکوژەکانی تەنیا دەبێ وردەکاسبکارەکان چاوترسێن بکەن و ئیدی بە هاسانی دەکرێ لێیان دەرکێشی.

/٢١٦٤ 3421- **چاوترسێن کرد، ترساندن و کارێك پێکردن، هەڕەشە لێکردن** بە جوانی دیارە کە دەیانەوێ هەڕەشە لە شاهیدەکە بکەن و بێدەنگی بکەن.... ● ناتوانن ئەم کوڕە بۆ کردەوەی دزی یاسا سەرکۆنە بکەن، چونکە باوکی ترساندوویەتی و پێی کردووە.

/٢١٦٥ 5431- **چاوتێبڕین، هۆش دانەسەر:** چاوی لە دەرگایەك بڕیبوو قەراربوو دەستەی ڕێزەرمەندەکان لەوێ دەرکەون.

/٢١٦٦ 4512- **چاوتێبڕین، ئەزروانین، تێفکرین:** زۆر بە وردی تێی‌دەفکری. دەتگوت باوەڕ ناکا بۆ خۆی بێ.

/٢١٦٧ 5439- **چاوتێبڕین و ئەسیتن، چاوتێبڕین، چاوبڕکێ کرد لەگەڵ:** لە چاوبڕکێنە دەگەڵ هەر پیاوێکی جوان کە دیتی زۆر دەست هەڵگرە.

٢/٢١٦٨ 4047- چاوتێبڕین و لەدیتن: ئەتۆ دەبێ وەك چەكچەكی كوێر بی. لە فاسیلەی دە یاردیت ڕاوەستا بووەو ئەتۆش ڕاست چاوت تێبڕیبووم، بەڵام نەتدەدیتم.

٢/٢١٦٩ 2729- چاوتێبڕین، لێفەوتبوونەوە: كوڕەكە نەیدەویست بڕوا، لەبەر دەرگا ڕاوەستاو چاوی دە شەپۆلی بڕیبوو.
← تێڕامان، ڕامان، تێفكرین.

٢/٢١٧٠ 5526- چاوخشاندن بە ڕابردوودا، هێنانەوە بەرچاو: ئەگەر چاوێك لە وەرزی ڕابردوو(ی وەرزش) بكەی، تاقە یارییەك نابینی كە ئەو تێیدا خراپ یاری كردبێ.

٢/٢١٧١ 4104- چاوداگرتن بە مەبەستی حەز لێكردن پیان بە زەماوەن پێكوتن: ئەگەر بێتوو بیەوێ حەزت لێبكا، ملی وورد دەكەم.
چاو دە زاری كەسێك بڕین ← بە وردی گوێ دانە كەسێك.
چاو دە چاوی كەسێك بڕین ← چاوبڕكێنە كردن دەگەڵ.

٢/٢١٧٢ 6257- چاودەرپەڕین: 'دوو دانە پێكی دووبلەی بدەمێ.' وەختابوو چاوم دەرپەڕێ، چونكە هەتا ئەو كاتە هەرگیز لێوم لە ویسكی نەدابوو.

٢/٢١٧٣ 5647- چاودەرهێنان (بۆ هەڕەشە كردن بەكاردێ): 'هاری، ئاگات لەخۆ بێ، ئەگەر ئاوا چاو لە ژنێكی دیكە بكەی، چاوت دەردێنم.'
← ریشەی كەسێك دەرهێنان.

٢/٢١٧٤ 2401- (بە سەرسووڕمانەوە) چاوگێڕان: لە حاڵێك دا نەیدەتوانی بڕوا بە بەختی خۆی بكا، بە سەرسووڕمانەوە چاوی بەسەر ئەو دیارییانەدا دەگێڕا كە دۆستەكانی بە لووزەو بۆیان هێنابوو.

٢/٢١٧٥ 6200- چاو لەبەر هەڵنەهاتن: لە ژوورەكەی هاتەسەر پلیكانەكانو بە چاوی نیوە هەڵاتووەوە لە ڕۆژی دەڕوانی.

٢/٢١٧٦ 4042- (بە وردی) چاو لە دەوروپشتی ... كردن: دەرگاكە نیوە كراوە بوو، منیش بە وردی دەوروپشتیم چاو لێكرد/ پشكنی.

٢/٢١٧٧ 4043- چاو لە پشتەوە كردن، لاوڕدانەوە: خشپەخشپێكم كردو خانمێك كە لە پێشەوەم بوو بە توورەییەوە ئاوڕی داوە. * ئێستا كە ماشێنی پۆلیسمان بە دواوەیە، ئاوڕ مەدەوە.

٢/٢١٧٨ 6273- چاو لە چاوی كەسێك بڕین، چاوبڕكێنە كردن لەگەڵ كەسێك: كوڕێكی چكۆلە لە گۆشەیەكی كوپەی قەتارەوە چاوی لە ئێمە دەكرد. كوڕە گەورەكەم هەروەك ئەو، چاوی دە چاوی بڕی‌و سەرەنجام بەزاندی.

٢/٢١٧٩ 4021- چاو لە چاوی كەسێك كردنو خەجاڵەتی لێنەهێنان: 'درۆزنانی! دەوێری چاو لە چاوم بكەی‌و خەجاڵەتێ نەكێشی؟'. * كاتێك كونتراتەكەم واژۆ كرد، ئەمدەوێرا چیدی چاو لە چاوی هۆگۆ بكەم.
چاو لە خوارێ كردن ← سەر بەردانەوە.

٢/٢١٨٠ 3192- چاو لە دوای كەسێك بوون: چاوێكم بەم لاو ئەولا داگێڕا. ئەمدەزانی كە جەنابی لورد چاوی لە دوای كام یەك لە كیژۆڵەكانە.

٢/٢١٨١ 4036- چاو لە دەرێ كردن: پەردەكەی لاداو چاوی لە دەرێ كرد.

٢/٢١٨٢ 4004- چاو لە دەوروبەری خۆ كردن، بە دەوروبەری خۆدا چاو گێڕان: لەنێو ئامفی‌تێئاترە پڕ لە خەڵكەكەدا چاوم گێڕا بۆ ئەوەی بزانم جێگایەكی بەتاڵ نابینمەوە.

٢/٢١٨٣ 4022- چاو لە دداتی ئەسپی پێشكەشی نەكەن: یەكێك لە پەندە ئەخلاقییەكانی دایكم ئەوە بوو كە دەیگوت چاو لە دداتی ئەسپی پێشكەشی ناكەن.

٢/٢١٨٤ 4009- چاو لە ڕواڵەتی فێڵنێك كردن: ئەگەر چاو لە ڕواڵەتی بكەی، پێت وا نیە لەم دواییانەدا شكستێكی گەورەی خواردوە.

٢/٢١٨٥ 4010- چاو لەسەر لابردن، ڕوو لەولا كردن: شەبەقی تاوێ لەسە ئاوەكە ئەوەندە توند بوو كە پیاو ناچار دەبوو سەری وەرسووڕێنێ. * كچە لە شەرمان ڕووی لەولای كرد.

٢/٢١٨٦ 4051- چاو لەسەرێ كردن، سەرهەڵێنان: كە هاتەژوور، سەری لەسەر ڕۆژنامەكە هەڵنەهێنا/ هەڵنەگرت.

٢/٢١٨٧ 7416- چاو لێداگرتن: كچی، ئەجیب پێی‌خۆش نیە چاوی لێداگرن.

٢/٢١٨٨ 4102- چاو لێداگرتن: چاو لە گارسۆنەكە دامەگرە، سەیران. ئانو چێشتەكەمان زووتر بۆ نایەنێ.

٢/٢١٨٩ 3018- چاولێكردن، چاوتێبڕین (بە ئیشتیهاوە): كوڕەكان لە قەراخ دەریا دانیشتبوونو چاویان بە ئیشتیاوە لەو كچانە دەكرد كە بەرەو دەریا هەڵدەهاتن.

٢/٢١٩٠ 5210- چاو لێكردن: ئەو كارە وەك مەسەلەیەكی یەكجار گرنگ بۆ قازانجی نەتەوایەتی چاو لێناكەین.

٢/٢١٩١ 3849- چاو لێكردن بە ئیشتیهاوە، چاو لێ سوور كردنەوە: كچەكە دەیدی بە بزێسانەوەو بە ئیشتیاوە چاوی لێدەكەن، جاڕز ببوو.

٢/٢١٩٢ 4006- چاو لێكردن، بە وردی: ناتوانم بڵێم چەندی دێنێ. بیدە بە كابرایەكی پسپۆڕ چاوی لێبكا.

٢١٩٣/ 5267- **چاو لێکردن، تێڕوانین، وەرگرتن:** ئەوان هەرگیز ئێمەی منداڵ بە چاوی کاتولیک چاو لێناکەن، چونکە باوکمان پرۆتستانە.

٢١٩٤/ 4701- **چاو لێکردن، تەماشا کردن، بە ورەیی:** بۆ مارمێیەکی دووور درێژو بە ووردی نەخشەکەمان چاولێکرد.

٢١٩٥/ 5268- **چاو لێکردن، وەرگرتن:** ئەگەر لوتف بکەیو داخوازنامەیەك بنووسی، گومانم نیە بە چاوی مرافەقەتەوە وەریدەگرن.

٢١٩٦/ 5571- **چاو (یەك) لێکردن:** چاوێك لەو فرماشانە/ پارچانە بکەنو بزانە هیچ کامێکت بە دڵە.

٢١٩٧/ 5685- **چاو (یەك) لێکردن یان پێداگێڕان:** پێش ئەوەی هیچ پێشنیارێکت پێبکەم، دەبێ بێمەو چاوێك لە خانووەکەو زەوییەکان بکەم.

٢١٩٨/ 6325- **چاو لێکردن بە دزییەوە:** خێزانی کابرای، کە خەریکی چەنەوەری بوو، جارجاریش بە دزی چاوێکی لە ژیلوان دەکرد.

٢١٩٩/ 6613- **چاو لێکردن، پێداچوونەوە:** بە خێرایی بەسەر یادداشتەکانیدا چۆوە.

٢٢٠٠/ 7071- **چاو لێکردن، لێروانین (یەك بە یەك)، چاو بەسەردا خشاندن:** چاوی بەسەر یەك یەکی ریزی ئەو قیافانەدا دەخشاند کە لە بەرامبەری دانیشتبوون.

٢٢٠١/ 2723- **(بە خۆشحاڵی و تەماحکارانەوە) چاو لێکردن:** کابرای پیسکە (= چرووك) هەموو شەوێ هەگبەی زێڕەکانی لە سندووقە پۆڵاکە دەردێناو تەماحکارانەو بە خۆشحاڵییەوە چاوی لێ دەکردن.

٢٢٠٢/ 2388- **(بەسەرسووڕمانەوە)، چاو لێکردن:** خەڵکی گوندەکە لە دیتنی ماشێنێکی رولزرویس وەها سەریان سووڕمابوو کە تێکرا بە زاری داپچڕاوەوە چاویان لێدەکرد.

٢٢٠٣/ 2711- **(بە توورەییەوە) چاو لێکردن، لێمۆڕبوونەوە، چاو لێدەرپەڕاندن:** دوو پیاوی مەست چاویان لێك دەرپەڕاندبوو، خەڵکەکەش تێیان پێدەکەنن.

٢٢٠٤/ 4016- **(بە سۆزەوە) چاو لێکردن:** دایکو باب بۆ دابین کردنی ژیان زەحمەتێکی زۆر دەکێشنو زۆر فیداکاری دەکەن، بەڵام منداڵەکان بە تەحقیرەوە چاویان لێدەکەن.

٢٢٠٥/ 4509- **(بە خێرایی) چاو لێکردن:** زۆر بە خێرایی چاوێکی لە منداڵە خەوتووەکە کرد.

٢٢٠٦/ 5209- **چاو لێکردن وەك، داناون لە ریزی ...، حیساب لەسەر کردن وەك:** ئەو وەك یەکێك لە باشترین سەربازە تازەکان چاو لێدەکەن.

٢٢٠٧/ 5208- **چاو لێکردن وەك، داناون وەك:** خۆشم ناوێ، بەڵام وەك دوژمن چاوی لێناکەم (= لە ریزی دوژمنەکانی دانانێم).

چاو لێکردن بە دزی ← بە دزیو بە شەرمەوە چاو لێکردن.

چاو لێکردن بە سەرسووڕمانەوە ← بەسەرسووڕمانەوە چاو لێکردن.

چاو چاو لێکردنەوە ← پێداچوونەوە.

چاو لێکردن بە ئیشتیاوە ← بەئیشتیاوە چاو چاو لێکردن.

چاو چاو لێکردن بە توورەییەوە ← بە توورەییەوە چاو چاو لێکردن.

چاو چاو لێکردن ← مەعاینە کردن، چاولێگێڕان، بازرسی کردن، رەفتار کردن، لاسا کردنەوە، چێك کردن.

چاو لێدەرپەڕاندن ← بە توورەییەوە چاو چاو لێکردن.

٢٢٠٨/ 5258- **چاو لێکردنەوە لە:** هەموو نوسخەکانی دەستنووسەکەم داوە بە ئێوە، بەڵام هەتا تەواو بوونی تەمرینی/ مومارەسەی حەوتووی یەکەم، پێویست ناکا چاوی لێ بکەنەوە.

٢٢٠٩/ 3615- **چاولێکەری کردن لەگەڵ، لاسا کردنەوە، مەلالی کردن لەگەڵ:** لاسا کردنەوەی بنەماڵەی جونز شتێکەو، لاسا کردنەوەی بنەماڵەی لۆرد جونز شتێکی دیکەیە.

٢٢١٠/ 4008- **چاولێکەکردن، بەپێی بۆ ناڵەشتن:** تەنانەت چاوشیان لە پێشنیارەکەمان نەکرد.

٢٢١١/ 1625- **(بە دزی) چاوێك لێکردن:** لە ژێرەوە چاوێکی کریارانەی لە کوڕە گەنجە رێلەو پێکەکە کرد.

٢٢١٢/ 5655- **چاو وێکنان، چاو تەنگ کردنەوە:** سەرەڕای لێواری پانی کڵاوەکەم، ناچار بووم لە بەرامبەر تیشکە یەکجار بەهێزەکەدا چاوەکانم تەنگ کەمەوە.

٢٢١٣/ 3280- **چاوەڕوان بوون، دەست ڕاگرتن، راوەستان، سەبر کردن، هەڵوێستەیەك کردن:** تکایە، چرکەیەك راوەستە بۆ ئەوەی پشووم بێتەوە سەرەخۆ. ● پێی بڵێ دەقیقەیەك سەبر بکا؛ هێشتا وشەیەکم لە قسەکانی یادداشت نەکردووە.

٢٢١٤/ 187- **چاوەڕوان بوون، چاوەڕوانی کردن:** بە راستی چاوەڕوانی ئەوە نەبووین کە ئاوا لە نەکاو بێتەوە. ●

کاتێك چیا بۆ دووهەمین جار ژنی هێنا، زۆر زیاتر لەوە کە چاوەڕوانی دەکرد، دەسکەوتی هەبوو.

٢٢١٥/ 7273- **چاوەڕوان دانیشتن یان مانەوە:** لە دامرکانەوەی ترفەو گڕە بایەکە هیچ نیشانەیەك دیار نەبوو، بۆیە ناچار بووین راوەستینو چاوەڕوانی تەواوبوونی بین.

٢٢١٦/ 7266- **چاوەڕوان راگرتن، هێشتنەوە، مائل کردن:** زۆرت لێ قەڵسم/ کافرت کردووم، سەعاتێکی بێ کەمو زیادە لێرە چاوەڕوان راتگرتووم.

٢٢١٧/ 7228- **چاوەڕوان لەکراو، چاوەڕوانی لەتێك کردن:** پێشرازی‌یەکە یەکجار خۆش بوو، چونکە بە تەواوی چاوەڕوان نەکراو بوو.

٢٢١٨/ 7269- **چاوەڕوانی ... بوون:** خەڵکێکی زۆر کە بە خەت ببوون/ بە سەف راوەستابوون چاوەڕوانی ئاخرین پاس بوون.

٢٢١٩/ 3911- **چاوەڕوانی پێراگەیشتن بوون:** چەند بابەتی گرینگ لە حەوتووی رابردوو ماونەتەوە کە چاوەڕوانی پێراگەیشتنن (= دەمێ پێیان رابگەین).

٢٢٢٠/ 3309- **چاوەڕوانی شتێك بوون، ئارەزوو کردن، بە ئاوات خواستن:** موسافیران چاوەڕوانی جێبەجێ بوونی هەرچی زۆرتری موشکیلەی رێگای ئاسنن.

٢٢٢١/ 3112- **(دەست لەسەر دەست دانانو) چاوەڕوانی شتێك بوون، خولانەوە بە بێکاری:** شێرزاد چەند حەوتوویەك لەدەوروبەری گاراژ بێکار دەخولایەوە، دەگەڵ باندی قاچاخچی‌یەکان ئاشنا دەبوو.

٢٢٢٢/ 6355- **چاوەڕوانی شتێك بوون:** ناتوانم لێرە بەو چاوەڕوانی تەقینەوەی بۆمبەکە بم.

٢٢٢٣/ 4019- **(بە دڵەوە) چاوەڕوانی شتێك بوون:** بە دڵەوە چاوەڕوانی ئەوە بوو کە نەخۆشخانە بەجێ‌بێڵێ‌و بۆ پشوودانێك بچێتە... .

٢٢٢٤/ 3447- **چاوەڕوانی کردن، ئاسە کردن، ئارەزوو کردن:** بە روونی دیار بوو کە کوڵی زۆر بێ‌سەبرانە چاوەڕوانی ئەمەیە کە چیا بێتە لای‌و پڕ بە دڵی خۆی قسەی دەگەڵ بکا. ● لە تەنیشت پەنجەرەی راوەستابوو، چاوەڕوانی هاتنی پۆستچی بوو و هومێدەوار بوو وەڵامێکی باش بۆ پێشنیاری خوازبێنی‌کردنەکەی وەرگرێتەوە.

٢٢٢٥/ 1674- **چاوەڕوانی کردن لە، پێویست بەشتێك هەبوون:** ئایا هیچ دەزانی کە کارێکی تەواو وەختی سیاسی پێویستیی بە چی هەیە؟

٢٢٢٦/ 7386- **(بە خۆبایی) چاوەڕوانیی کردن بۆ شتێك:** جان دوو کتێبی بە ئەمانەت لێوەرگرتەو، هەتا ئەو جێگایەی بیناسم، ناتوانم چاوەڕوانی وەرگرتنەوەیان بم.

٢٢٢٧/ 128- **چاوەڕوانی کردنی شتێك لە کەسێك:** ناتوانی لەو کابرایەت بوێ حەوت رۆژان کارت بۆ بکا. ئەم چاوەڕوانی‌یە زۆر لەوە زیاترە کە بتوانی لە کەسێکت هەبێ.

٢٢٢٨/ 5324- **چاوەڕوانی هەبوون لە:** چاوەڕوانی‌یەکی کە ئەو لە قوتابی‌یەکانی هەیە ئەمەیە کە پاقژ، کاتناس‌و گوێڕاگر بن.

٢٢٢٩/ 2658- **چاوەڕوانی هەبوون لە، حیساب لەسەر کردن:** رەفتارو کرداری هانری پیشاندەری نەوادەیەك بوو کە چاوەڕوانیم لێ‌نەدەکرد.

٢٢٣٠/ 7101- **چاوەڕوانی لێکردن، لێ‌هەبوون:** لە حاڵێك دا وەرگرتنی ئیجازەی خانووبەرە دروست کردن کارێکی یەکجار دژوار بوو، چیا لەسەر را خانووەکەی دروست کردەوە. بەڵێ دەکرێ کاری ئاوا (دژوار) لەو کابرایە چاوەڕوان بکرێ.

← هیوا پێ‌بوون.

٢٢٣١/ 6706- **چاو هەڵگرتن لەسەر:** ئەو کچەت دیوە لەو قوژبنەی؟ یەکجار جوانە. ناتوانم چاوی لەسەر هەڵگرم.

٢٢٣٢/ 3548- **چاوهەڵنەگرتن لە:** سەربازە لاوەکە نەیدەتوانی چاو لە دەستەکانی ژنێك هەڵگرێ کە لە قەتاردا لە رووبەڕووی دانیشتبوو. ژنە بەلایی زیاتر لە هەزار پوند ئەنگوستیلەی دە قامکان دابوو.

٢٢٣٣/ 3191- **چاوی لە‌ماح تێبڕین:** دەتوانم ئەرخەیانت بکەم کە بە هیچ چەشنێك چاوی تێ‌ماحم لە کارەکەی نێچەو نەبڕیوە.

٢٢٣٤/ 2710- **چاوێك بە دەوروبەری خۆدا گێڕان:** وەڕزوورکەوت؛ چاوێکی بە دەوروبەری خۆی داگێڕا/ خشاندو کاتێك دیتی هیچ ئاشنایەکی خۆی لێ‌نیە، بێ سێ‌ودوو لێکردن گەڕاوە.

٢٢٣٥/ 4469- **چاوێك پێداخشاندن:** ناتوانم بڵێم بە وردی بە بەڵگەکەی‌دا چوومەوە. هەر ئەوەندەم دەرفەت هەبوو کە چاوێکی پێدابخشێنم.

٢٢٣٦/ 5965- **چاوێك پێداخشاندن، خوێندنەوە (خێرا):** دەقیقەیەکم دەرفەت بدەنێ هەتاکوو پێش کۆبوونەوەکە خێرا چاوێك بەم یادداشتانەدا بخشێنم.

← سەرسەری چاو لێکردن.

۲۲۳۷/ 3557- **چاوێک لە ... بوون**: کارێکی هاسان نیە کە پیاو چاوێکی هەر لە منداڵێکی بێ کە بەبێ راوەستان لە دەوروبەرت بێتەو بچێو ئەویش بتەوێ هۆشت بەمیە سەر کارەکەت.

۲۲۳۸/ 3193- **چاوێک لە شتێک بوون، برین**: تاقی کردنەوەیەکی دەقیق بوو. لە سەرانسەری تاقی کردنەوەکەدا چاوێکی هەر لە گەرماسەنجەکە بوو.

۲۲۳۹/ 2679- **چاوێک لێبوون، گوێیەک بۆ راگرتن**: دەچمەدەر، چاوێکت لە سۆبەکە بێ. ● ناتوانم بچمەدەر مەگەر کەسێک گوێی لە تەلیفوونەکە بێ.

۲۲۴۰/ 5864- **چاوێک لێکردن ( بە خێرایی)**: ئەو چاوەی کە لە ژێر برۆ سپییە ئاڵۆزەکانییەوە لە ژیلوانی کرد، زۆرتر لە هەموو شتێک چاوچنۆکانە بوو/ چاوێکی بەخیلانە بوو.

۲۲۴۱/ 2707- **چاوێک لێکردن**: چاوێکم لە سەعاتەکەم کردو کە دیتم نزیک نیوەشەوە زۆرم پێسەیر بوو.

۲۲۴۲/ 4506- **چاوێک لێکردن، زۆربە کورتی**: شتێکی رامان نەدی، چونکە ئەوەندەمان دەرفەت هەبوو کە زۆر بە کورتی چاوێک لە رووداوەکە بکەین.

۲۲۴۳/ 2277- **چاوێک لێکردن**: دایکەکە بە بزەیەکی دڵنەوازانەوە چاوی لە منداڵەکەی کرد.

۲۲۴۴/ 949- **چاوێک لێکردن، چاوپێدا خشاندن**: دەکرێ چاوێک بەم حیسابانەدا بخشێنیو بزانی هەڵەیان تێدایە یان نا؟

۲۲۴۵/ 1817- **چ بکەین، چ بکەن، چ بکا لەگەڵ**: دەگەڵ ئەو هەموو کەرەستەیە کە لەژێرزەمینەکە دایە چ بکەین؟

۲۲۴۶/ 1818- **چ بکەین، چ بکەن، چ بکا لەگەڵ ...**: منداڵەکان لە پشوودان دا چ بکەن؟.

۲۲۴۷/ 1816- **چت لێکرد؟، چت بەسەر هێنا؟**: دۆسییەی/ فایلی یەکیەتیی سیمانت چ لێکردوە؟.

۲۲۴۸/ 3922- **چراخان کردن**: خانووبەرە دەوڵەتییەکانیان بەبۆنەی رێو رەسمی سەرکەوتنەوە چراخان کردبوو.

چرچ بوون ← سیس بوون.

۲۲۴۹/ 1197- **چرا دەرکردن**: گوڵە رۆزەکان درەنگتر لە هەمیشە چرایان دەرکرد.

۲۲۵۰/ 286- **چرۆ کردن، پەل دەرکردن**: ئەم ساڵ گوڵە رۆژەکان زۆر زوو چرۆیان دەرکردوە.

چکۆلە بوونەوە ← رێزو خۆشەویستی لەدەست دان.

۲۲۵۱/ 3100- **چکۆلە کردنەوە بۆ**: لە بنەماڵە هەژارەکان دا، بۆی هەیە جلکی منداڵە گەورەکان بۆ ئەوانی لە خوارتر چکۆلەکەنەوە. ● ئازاد دەستێک لیباسی چکۆلە کراوەی براکەی دەبەر دابوو.

۲۲۵۲/ 4630- **چکۆلە کردنەوە، کەم بەبایەخ نیشاندان**: دەیەویست نەخشی ئەو چکۆلە کاتەوەو، نەخشی خۆی گەورە نیشان بدا.

۲۲۵۳/ 4149- **چکۆلە کردنەوەی رووداوێک**: ئەو مەینەتبەشییانەی کە لە زیندان دەبێ دیتبێتی لە قسەکردن دەگەڵ رۆژنامەنووسان دا چکۆلەی نیشان دەدان.

۲۲۵۴/ 6401- **چکۆلە یان تەنگ کردنەوە**: تارەمەڵترووە، ناچاری دیافراگمەکەت کەمێک چکۆلە بکەیەوە.

۲۲۵۵/ 6256- **چلۆنایەتییەکی بەرز هەبوون**: لەنێو زانستگەکان، هێندێکیان چلۆنایەتییەکی زۆر بەرزو جەززابیەتێکی تایبەتیان هەیە.

۲۲۵۶/ 7348- **چنین**: هیچ ماشەرێکم نەماوە، هەموو چنیون.

۲۲۵۷/ 3652- **چنین**: ترووسکە لە دروومانیدا یەکجار کارامە بوو؛ دەیتوانی بە نیوە رۆژێک کەوایەکی منداڵ بچنێ.

۲۲۵۸/ 7347- **چنین لە**: پەردەکانیان لە لۆکەی ناوچەکەو ب ماشێنێکی دەستی چنیوە.

۲۲۵۹/ 6187- **چوارگۆشە کردن، لاپەرەیەک یان زەوییەک بە خەت لێدانو بەشێوەی چوارگۆشە دابەش کردن**: لە رابردوودا، سەربازار تەختەیان دە کۆڵەپشتییەکانیان دەنا، بۆ ئەوەی چوارگۆشەبێو لە کاتی تەفتیش دا جوان بن.

چوڕاندنەوە ← پاڵاوتن.

چۆرت لێدان ← وڕێنگ دان، خەونووچکە بردنەوە.

۲۲۶۰/ 3650- **چۆک دادان، لەسەر چۆک دانیشتن**: ماری لە تەنیشت رانەکە چۆکی دادابوو، لە حاڵێک دا بە دەستێک منداڵەکەی راگرتبوو، بە دەستەکەی دیکەی دەیشووشت.

۲۲۶۱/ 2153- **چۆک دادان (بۆ پاڕانەوە)**: زیندانییەکان چۆکیان دادابوو داوای لێبووردنیان دەکرد.

۲۲۶۲/ 2801- **چۆک دادان، بە چۆکدا هاتن**: کچە چکۆلە چۆکی دادا بۆ ئەوەی بووکەکەی لە لانکێ بنێ. ● ئەگەر پاش سەعاتی ۹ بتەوێ لەو ریستورانە نان بخۆی، دەبێ چۆک دابدەیو وەک سواڵکەران داوایان لێبکەی.

چۆنم دەناسی؟ ← ئەمن چۆن دەناسی؟

٢٢٦٣/ 492- **چوون بۆ:** بەلەبەر چاوگرتنی ئەو هەڕەشانەی دەت کردن، هەموومان پێمان وابوو چووی بۆ ئافریقا. ● منداڵەکان، بۆ ناچنە حەوشەو کایەی خۆتان بکەن؟

٢٢٦٤/ 4758- **(لە قوناغێکی زانستکەوە) چوون بۆ، یان بەشداری کردن (لە قوناغێکی سەرتردا):** ئەو کەسانەی دەورەی باکالۆرییان تەواو کردوە، ئەگەر بیانەوێ دەتوانن بەدانی پارەی نێونووسینو "شەهریە" بچنە دەورەی ئیم ئیسی (بخوێنن).

٢٢٦٥/ 5- **(لە چوون بۆ جێگایەک) خۆ پاراستن، لە چوون بۆ جێگایەک، غایب بوون لە جێگایەک، بەشداری نەکردن لە کۆبوونەوەیەکدا:** سەرۆکی کۆمیتەی خانووسازی بە ئەنقەست لە کۆبوونەوەدا بەشداری نەکرد، چونکە دەیزانی ناتوانێ دەگەڵ رەخنەی نەیارەکانی بەرەوڕووبێ.

٢٢٦٦/ 235- **چوون بۆ دادگا، لە دادگا ئامادەبوون:** ئەمە سێهەمین جارە کە کابرای تاوانبارکراو دەچێتە دادگا. ● هەر ئێستا کێشەکە لە کۆمیتەی هەڵبژێراوی مەجلیسی نوێنەران هاتۆتە گۆڕێ.

٢٢٦٧/ 874- **چوون بۆ ماڵێک بە مەبەستی بانگ کردنی کەسێک یان وەرگرتنی شتێک:** سبەینێ ج کاتێک بێم لە دووت.

چوون بۆ یارمەتیدانی کەسێک ← بۆ یارمەتی دانی، یان نەجات دانی کەسێک چوون.

چوون بۆ ← سەردان لە.

٢٢٦٨/ 3825- **چوون (بۆ جێگایەک)، وەڕێکەوتن بۆ ...:** بە فڕۆکەکەی دیکە بەرەو مادرید وەڕێدەکەوین. ● لە ماڵێڕا بەرەو ئیستگای قەتاروەڕێ کەوت.

٢٢٦٩/ 6276- **چوون، وەڕێکەوتن بۆ:** بەیانیان ج کاتێک دەچی بۆ قوتابخانە؟

← وەڕێکەوتن.

٢٢٧٠/ 3221- **چوون بەرەو جێگایەک، وەڕێکەوتن بەرەو ...:** بەرەو تورکیە وەڕێکەوتن.

← بەرەو جێگایەک وەڕێ کەوتن.

٢٢٧١/ 491- **چوون دە جێگاوە دەگەڵ ... ئەو کارە دەگەڵ کردن، گاین/گان:** زۆر کچ ئەماون لەم ئیدارەیەدا دەگەڵیان نەچووبێ دەجێگایەوە/ ئەی‌گابێ. "بەڵێ" خۆشم دەوێ بەڵام هەتا ئێستا دەگەڵی نەچووم دەجێگاوە، ئەگەر مەبەستت ئەوەیە.

٢٢٧٢/ 4317- **چوون دە فکرانەوە، بیرلێکردنەوە، لە فکر راچوون:** ئەو لە پێوەندیی دەگەڵ زمان لووسی‌یەکانی ژنە جحێڵەکە لە فکرراچوو بوو.

چوون دە قوولەوە ← بە توندی خەریکی شتێک بوون.

چوون دە کەلێنەی کەسێکەوە ← بەسەرداهاتن.

← چوون دەمێشکەوە.

٢٢٧٣/ 4867- **چوون دە قەبرێیەوە، مردن، دەقەبرنابوون:** لە ئێستاوە پەژارەی بیست ساڵی دیکە دایگرتووم؛ بیست ساڵی دیکە لە قەبری دام.

٢٢٧٤/ 2805- **چوون دە نهێنبوونەوە، ساڵەهای ساڵ لە پەناو پەرەوەیەکانی خەڵک دا ژیان:** وینستۆن چرچیل دەچێ دەمێژووەوە (= بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەبیر خەڵک ناچێتەوە) چونکە لە کاتێک دا یەکیەتی‌و یەکگرتوویی لەنێو خەڵکی وڵاتەکەیدا پێک هێنا کە هەموو کەس پێی‌وابوو شکستیان خواردوە.

٢٢٧٥/ 4449- **چوون لە حاڵەتی بێهۆشییەوە:** ئەو ئەخۆشانەی دەیانخەنە ژێر هیپنۆتیزمەوە، دەچن لە حاڵەتێکی شێوە بێهۆشی‌یەوە.

٢٢٧٦/ 7058- **چوونو هاتنەوە:** ئەگەر مەشرووبێکی بە قەوەتترت لە ئاوی میوەی دەوێ، مانایەکەی چوون بۆ بارو هاتنەوەیە.

٢٢٧٧/ 2808- **چوونە (گەڕان، هەڵگەڕان، هاتنی سوارێو ...):** مێردەکەم چۆتە گەڕانێ (پیاسە کردن)، بەڵام دوای نیو سەعاتی دیکە دێتەوە.

٢٢٧٨/ 2405- **چوونە/ بڕانە/ خەستە (گیرێکی یان دەنەیەکی قوس ترەوە)، لە هێز یان لە سەرعەتی شتێک کەم کردنەوە:** کە گەیشتە سەرپێچەکەی، خستی‌یە گێرێکی قورس ترەوە، بەڵام پێش ئەوەی لە پێنج پێچەکە دەرکەوێ، دەوری هەڵگرتبوو.

٢٢٧٩/ 832- **(لە پڕ) چوونە، هاتنە، پەڕینە نێو قسەی کەسێک:** ئەفسەرێکی ستاد پەڕیە نێو قسەکانیانو گوتی دوژمن تەنیا پێنج مایلی ماوە بانگاتێ.

چوونە، یان هاتنەسەر چۆکان ← داهاتنەوە.

٢٢٨٠/ 3465- **چوونە باڵ، چوونە نێو، بەشداریی تێداکردن:** لە تاقمێک لە تەماشاچی‌یەکانیان داوا کرد لە کایەکەدا بەشداری بکەن. ● کێ گوتی بێیمنێو کایەکەوە؟. ● ئەم یارییە یەکجار خۆشەو هەموو ئەندامانی بنەماڵە دەتوانن تێیدا بەشداری بکەن.

٢٢٨١/ 6942- **چوونە پاڵ، پەنگرتن لەگەڵ:** پاش ساڵها سەرگەردانیی سیاسی، ستیفان چوتە پاڵ ڕێبەرایەتیی تازەی حیزب.
٢٢٨٢/ 2934- **چوونە پاڵ لایەنێک، لە لایەنێک جیابوونەوەو لەگەڵ لایەنێکی دیکە کەوتن:** پاش چەندین ساڵ نارازی بوون لە حیزبی کرێکار ئاغای بلێك چووە باڵ حیزبی پارێزگاران.
• لە ساڵی ١٩٤٤دا، ئیتالیا دەگەڵ وڵاتە هاوپەیمانەکان کەوت.
٢٢٨٣/ 6595- **چوونە باڵ یان ئێو، لێزیاد کردن، خستنەسەر، هاویشتنە سەر، لەگەڵ خستن:** جان، چووە ئاخری ریزی درێژی خەڵك کە لە ئیستگەی پاسان ڕاوەستابوون.
← بوون بە یەك.
٢٢٨٤/ 6435- **چوونە پێش، درێژە هەبوون:** پاش رۆژێك دەریا برین گەیشتینە ئیشکانیکی بەرز کە هەتا ئاسۆیەکی دوورو خۆلەمێشی رەنگ دەچوو پێش.
٢٢٨٥/ 4011- **(بۆ پەسانەوە) چوونە پێش، پێشکەوتن، وەدەست هێنان، ئاوەڵانەوە:** هەر کە جارێك چوویەسەر تەلەفزیۆنی، بۆ پسانەوە پێشکەوتن وەدەست دێنی.
٢٢٨٦/ 7481- **(بە ئەسپایی و ئینابزانە) چوونە پێش، چوونەسەر:** بە ئەسپایی و زیرەکانە چووسەرو بەرپرسایەتی یەکی گرنگی لە دادگا وەدەست هێنا.
٢٢٨٧/ 7462- **چوونە پێش (چاك/ خراپ):** لەوە خۆشحاڵم کە کاروباریان لە ئوستراڵیا هەتا ئەو رادەیە باش دەچێتە پێش.
٢٢٨٨/ 5845- **چوونە پێش، گەشە کردن:** ئەو کۆڕانەی کە تازە هاتوونەتە نێو تیمەکەتان چۆن دەچنە پێش؟
٢٢٨٩/ 2417- **چوونە پێش، وەپێش کەوتن، پێشڕەوت کردن:** هەر دەگەڵ ئەرکی کارە تازەکەی ئاشنا بوو، کارە زۆرباش پێشرەفتی کرد.
٢٢٩٠/ 2420- **چوونە پێش:** کامران دەگەڵ ئەو ماشێنە کۆنەی وەزعی چۆنە؟ (چون دەچێتە پێش، چ دەکا)؟ ئایا وەکاری خستووە؟
٢٢٩١/ 2611- **چوونە پێش، پێشکەوتنێك وەدەست هێنان، بە جێگایەك گەیشتن، لێنزیك بوونەوە:** سام بۆ هێلێن شێت ببوو، بەڵام هەرگیز نەیتوانی هەنگاوێك لێی بچێتە پێش/ لێی‌نزیك بێتەوە.
٢٢٩٢/ 2818- **چوونە پێش، پێشکەوتن:** کاری دروست کردنی نەخۆشخانەکە باش دەچێتەپێش.
٢٢٩٣/ 2753- **چوونە پێش، درێژەدان:** کاتێك سیاسەتەکەما بە جوانی دارێژرا، دەمانەوێ بە هەموو توانامانەوە بچینە پێش.
٢٢٩٤/ 1121- **چوونە پێش، پێشکەوتن وەدەست هێنان، گەشە کردن:** لەو رۆژەوە مامۆستای تازەیان بۆ هاتووە، کوڕەکەم زۆ باش لە یانەی فەرانسەدا چۆتەپێش/ پێشرەفتی کردوە.
٢٢٩٥/ 4185- **چوونە پێش:** نازانم ئالفرێد لە تەمرینە مەمارەسە تازەکەیدا چۆن دەچێتە پێش.
٢٢٩٦/ 4731- **چوونە پێش، پێشڕەوی کردن (لێبڕاوانە):** گارد: پێشەنگ بۆ دەرگیربوون دەگەڵ دوژمن لێبڕاوانە پێشڕەو: کرد.
٢٢٩٧/ 446- **چوونە پێش لە ...دا:** وادیارە لە زەمینەی یاسا: زۆر نەچوویەپێش، وانیە؟ ئەگەر وانیە دەبێ بزانی هە: سێ‌ساڵ لە ڕێکەوتی "ئزدواج" تێنەپەڕێ ناتوانی داوا: تەڵاق بکەی.
٢٢٩٨/ 3044- **چوونە پێش وەهاتن:** وەزعەکە لە کۆنترۆ دەرچوو بوو، ماشێنی شەڕ بێرەحمانە دەچووەپێش ( هەموو شتێکی دەهاڕی).
چوونەپێش ← درێژەدان یان کێشان، ڕوودان، جێبەجێ کردن، هەڵدان، هاتنەپێش، درێژەدان، وەپێش کەوتن پێشڕەوی کردن، چوونە نزیك، نزیك بوونەوە لە گەیشتنە... .
٢٢٩٩/ 3006- **چوونە (ئاهەنگ، شوێن، پایتەخت، شیمال):** دەمەو بۆ ماوەی چەند رۆژێك بچمە شاری. • دایلەو باوکم بە پشوودانێکی چەند رۆژە چوونەتە سکاتلەند.
٢٣٠٠/ 2840- **چوونە جێگایەك ( بەشێوەیەکی کاتی، بۆ ماوەیەك):** بیستوومە خالی سیت ناچار بووە سەرلە نوێ بچێتەوە نەخۆشخانە. وادیارە جاری پێشوو تەواو چاك نەبووە.
٢٣٠١/ 1935- **چوونە جێگایەك ( سەردان):** ئێواران دەچینە یەکێك لە مەیخانەکانی سەر شەقامو بیرەو ساندویچێک بۆ دەخۆین.
٢٣٠٢/ 2803- **چوونە چۆم، دەریا، لە دەریا بۆ شوێن خۆ دابەین کردن:** خدرو جرامێر دەگەڵ چیای چوونە چۆمی بۆ مەلە کردن خدرو جرامێر خنکان. پێت وایە کێ رزگاری بوو؟.
چوونە حەمام ← حەمام کردن.
٢٣٠٣/ 5415- **چوونە خوار لە، بردنە خوارلە، تێرۆ کردن، کەمن کردن، هێرش کردنەسەر، لێهەڵگرتن:** کەڵپی حەیوانەکە لەسەر گۆشتە بۆمان هاویشتبوو چووەخوارێ/ کەڵپی لێ‌داگرت.

← ئاوا بوون.

٣٣٠٤/ 2778- (لە دەریاوانەوەیی دا)، چوونەخوار لە دەریا: یەکێك لە مەلەوانەکان بۆ هێنانی پەرداخێك چای چووە خوارێ.

چوونە خەزا(یە) ←جیهاد کردن.

٣٣٠٥/ 1846- چوونەدەس دەرچوون(ی ئاو): حەمامەکە دوو دانە ئاوەرۆی هەیە کە بەوان دا چڵکاوەکە دەردەچێ.

٣٣٠٦/ 400- (لە کایە، مەیدان) چوونەدەر: داوەری کەنار مەیدان پەرچەمەکەی هەڵێنا بۆ ئەوەی نیشان بدا تۆپ لە مەیدان چۆتەدەر.

٣٣٠٧/ 2908- چوونەدەر: تکایە بچۆدەرو بە منداڵەکان بڵێ هێندە هەلاهەلایە نەکەن.

٣٣٠٨/ 379- چوونەدەر(بۆ گەڕان و سەیران): ماری دەگەڵ یارەکەی چوونەتە دەر.

٣٣٠٩/ 1883- چوونەدەس هاتنەدەر لە، وەرگەڕان لە: کاتێك بە هەڵاتن خۆم بە ژوورێدا کرد، قەتاری لەوێ خەریك بوو لە ئیستگە وەدەردەکەوت.

چوونەدەر ← (بە تووڕەیی یەوە) وەدەرکەوتن، خۆ کێشانەوە لە، ڕۆیشتن، بەجێ‌هێشتن، چوونە پشوودانی کورت ،نایەن.

٣٣١٠/ 2744- چوونەدەرەوەی وڵات: پیرەژنە گەنجەکە هەستی بەوە دەکرد کە پێویستیی بەوە هەیە ماوەیەك لە ماڵ دوورکەوێتەوە. بۆیە بڕیاریدا بۆ پشوودانێکی دوورو درێژ بچێتە دەرەوەی وڵات.

٣٣١١/ 2981- چوونە دەریا (= بۆیەی خۆ لە دەریا/ ڕاو لە دەریا وەدەست هێنان): کوڕەکە لە گەڕان بە دوای ئیش و کارێك دا لە نزیك جێگای ژیانی ماندوو ببوو، بۆیە سەرەنجام بڕیاریدا بچێتە دەریایە.

٣٣١٢/ 980- چوونە دەندەی (گێڕی) بەهێزتر، هاتنە خوار دەندە مەعکووس لێدان یان ڕاژەندن: زوو نەچوومە/ نەمهاویشتە دەندەی/ گێڕی بەهێزترەوەو ماشینەکەم مراند.

٣٣١٣/ 224- چوونە ژێر شتێك (و دزین یان خواردن): سێوی ئەو باغەی هەروا لێدەکرێتەوە. پێم وایە ئەو منداڵانە دەچنە زگیان.

← دەست تێوەردان.

٣٣١٤/ 1505- چوونە ژوور، هاتنەژوور (بە ئەسپایی): کابرای خەتاکار لە سەعاتی یەکی دوای نیوەشەو لە دەرێ دەهاتەوە، کەوشەکانی بەدەستەوەگرتبوو بە ئەسپایی چووە ژوورێ و منداڵەکەی کە خەوی لێ‌کەوتبوو ماچ کرد.

٣٣١٥/ 1532- چوونەژوور (بە زۆرەملێ)، تێهەستاوتن، بە پاڵەو پەستۆ چوونەژوور: هەر کە قەتار ڕاوەستا، نزیکەی ٢٠٠ کەس خۆیان دە چەند کوپەی بەتاڵ پەستاوت.

٣٣١٦/ 6342- چوونەژوور، هاتنەژوور، وەژوورکەوتن: داوایان لێکرد بچێتە ژوورو دابنیشێ.

٣٣١٧/ 7280- (بە سانایی) چوونەژوور، هاتنەژوور، وەژوورکەوتن: لێرە ئەمنییەت/ ئاسایش ئەوەندە لاوازە کە هەر کەسێك دەتوانێ بە هاسانی وەژوورکەوێ و هەرچی بیەوێ بدزێ.

٣٣١٨/ 7295- چوونەژوور، وەژوورکەوتن (لە سەرەتا و ...): فەرموونە ژوورا وەژوورکەون! هەر ئێستا گەورەترین بەرنامەی جیهان دەست پێدەکا!.

٣٣١٩/ 603- چوونەژوور (بە زۆرەملێ)، وەژوورکەوتن: پێیان بڵێ ئەوانەی کە لە ژوورێن لە بەرامبەر ئەو کەسانەی دەیانەوێ بە ملهوڕی بچنەژوور پێویستییان بە پشتیوانی هەیە.

٣٣٢٠/ 2838- چوونەژوور، چوونە ئێو، دەست تێوەرکردن: پەرژینەکە چووە نێو دەرکانەکە. ● یەکێك دەستی دە کەشەوی مێزەکەم ناوە.

٣٣٢١/ 2823- چوونەژوور (لە ماڵ، ئۆتابێ‌هاڵەو ...): ئاتوانین لێرە لەژێرباران ڕاوەستێنو دەربارەی گیروگرفتەکانت باس بکەین. با بچینە ژوورو راحەت بۆی دانیشین.

٣٣٢٢/ 2992- چوونەژێر ئاو، نوقم بوون، لەژێرئاو بوون: ڕاست ئەو کاتەی کە "نەجات غەریق" لە کابرای لەحاڵی خنکان نزیك دەبووە، بۆ سێهەمین جار نوقم بوو، ئیدی هەرگیز نەدیترایەوە.

٣٣٢٣/ 4677- چوونەژێرباری ... بە ملدادان: شیرکەت چووە ژێرباری قەرزێکی قورسترەوە. ● بۆ بەرگری کردن لەو قەیرانە ئابووری یەی ئێستا بە ملمان داهاتووە هیچ ڕێگایەك نەدەهاتە بەرچاو.

٣٣٢٤/ 451- چوونەژێرباری ...ەوە: هەتا ملان چۆتە ژێرباری قەرزی قورسەوە.

٣٣٢٥/ 6533- چوونەژێر تەمسی شتێکەوە: لە ڕۆژی هاتنەوەت دا، لەسەرەخۆ بڕۆ و مەچنە ژێر تەمسیی ترس و خۆفەوە/ ترس و خۆف داتانەگرێ.

٣٣٢٦/ 2979- چوونەژێر چاپ، بەرێکردن بۆ چاپخانە، لە ژێر چاپ دابوون: بۆ زیاد کردنی ڕاگەیەندراوەکە لە ڕۆژنامەی سبەینێ دا زۆر درەنگ بووە. ڕۆژنامەکە ناردراوە بۆ چاپخانە.

۳۲۲۷/ 3589- **چوونەژێر ...، لەژێر ...دا (خـۆ) راگرتـن:** بەندییـە هەڵاتووەکان، کە بە مەلە لە چۆمەکە دەپەڕینەوە، هـەر کات نوورنەفکەنەکە سەرچۆمەکەی دەپشکنی، دەچوونـە ژێر نازێ.

۳۲۲۸/ 5872- **چوونەسەر، وەسەرکەوتن (زۆر بـە خێرایی):** دەبـێ هەرچی لە دەستمان دێ بیکەین بۆ ئەوەی پێشـی دیـان زیاتر چوونەسـەری نرخەکان بگرین.

۳۲۲۹/ 5109- **چوونەسەر، زیاد بوون (لە پڕ):** دەرەجەی گـەرمای دەرەوەی ئاتۆسفێری گۆی زەوی لەپڕ سەدان هەزار دەرەجە دەچێتە سەر.

۳۲۳۰/ 425- **چوونەسەر(ی نرخ)، گران بوون:** بە هۆی بوودجـەی تازەوە (نرخی) سـیگارو ویـسکی چوونەتەسـەر/ سـیگارو ویـسکی گران بوون.

۳۲۳۱/ 2999- **چوونەسەر، گەیشتنە پلەیەکی بـەرزتر:** دەبینـم کـە جیوەکە ( لە گەرما سەنج دا) دەچێتەسەر. رەنگـە چـەند رۆژێك هەواکەی خۆش بکا.

۳۲۳۲/ 2998- **چوونەسەر، زیادبوون:** رادیـارە کـە ئـەم رۆژانـە نرخی هەموو شتێك هەروا دەچێتەسـەر... . ● رۆژنامـەی ئەمڕۆت دیوە؟ »دیـسانیش شـتومەك گـران بـووە/ نرخـی شتومەك چۆتە سەر؟.

۳۲۳۳/ 1333- **چوونەسەر (بۆ قاڵی سەرێ):** تکایـە لـە خـوارێ رامەوەستە؛ تەشریف بێنەسەر.

۳۲۳٤/ 4303- **چوونەسەر، وەسەرکەوتن، پێشکەوتن وەدەسـت هێنـان:** کاتێك سـەلاحییەتەکانی تـەنفید بکرێـن، یـەك دوو پلـە دەچێتەسـەر.

← پێشرەفت کردن.

۳۲۳۵/ 4304- **چوونەسەر، زیاد بوون:** نرخی بەرامبـەری پونـد بە خێرایی چوەسەرو گەیشتە ۲/۹۱ دۆلار.

۳۲۳٦/ 4559- **چوونەسـەر(ی نرخـی ...):** دوای دەورەیـــەکی کورتی پڕ لە ترس‌و خۆفی فرۆشتنی سەهمان، سـەرلەنوێ نرخی سەهم چۆتە سەرێ.

۳۲۳۷/ 2893- **چوونەسـەر بابـەتێکی یـان خـاڵێکی دیکـە:** ئەگـەر هیچ ئیعتیرازێك نیە، دەچینـە سـەر خـاڵێکی دیکـە. ● سـەرۆکی کۆبوونـەوە گوتـی چونکـە وەختمـان کەمـــە، دەچینەسەر خاڵێکی دیکە.

۳۲۳۸/ 2936- **(بەرنامەی رادیـۆ) چوونەسـەر بابـەتێکی دیکـە:** "بەرنامەکان رادەگرین‌و دەچینەسـەر میزی هەواڵەکان".

← باسـی شتێکی دیکە کردن.

۳۲۳۹/ 2885- **چوونەسەر بەرزەك (= بوونە هونەرپیشە):** سـەرەڕای پێناخۆش بوونی دایك‌و باوکی، برۆژیت بڕیـاری دا ببێتـە هونەرپیشە.

۳۲٤۰/ 4757- **چوونەسەر...:** کەوابوو، داخـوا ئیجـازە دەدەن بچینەسـەر مەسـەلەی هەڵبژاردنی کۆمیتەیەك؟.

۳۲٤۱/ 6133- **چوونەسـەر بـە سـەرپێچ، بـە پێچەوخوارەکـە وەسەرکەوتن یان هەڵکشان، تەلۆووردکەیشان:** دووکەڵی سـۆبەکانی نوردووگا بە پێچەوخوارەکە بەرەو ئاسمانی پـاك‌و بێگـەرد هەڵدەکشا.

← چوونەسـەر (کەم کەم) بەرزبوونـەوە، بردنەسـەر، باشـتر بوون، (بە ئەسـپایی‌و فێڵبازانە) چوونەپێش، وەسـەرکەوتن بە.

۳۲٤۲/ 7249- **چوونەسەربانی کەسێك، سەر لە کەسێك دان، سەربانی کەسێك کردن، سەر لە کەسێك هەڵێنان:** لە رۆژەکـانی پشـوودانی ئاخری حەوتوو سەری خزمەکانی مێردەکەم دەدەین.

۳۲٤۳/ 2546- **چوونەسەر کارێك، دەست بە کارێك کردن:** ئەمن لـەو تێئۆریەرستنانە بێزارم، بە بروای تۆ کەنگێ دەتوانین دەسـت بدەینە کارێکی باش؟

۳۲٤٤/ 4048- **چوونە لای کەسێك بۆ داواکارییەك، پەنا بردن بۆ:** بـا ئەوە هوشیار کردنەوەیەك بێ بۆ کەسێك کە بۆ چارەسـەر کردنی کێشەکان پەنا بۆ سیاسەتی تاکەکەسـی دەبـن. ● بۆ یارمەتی وەرگرتن مەچۆ بۆ لای ئەو کابرایە. ● ئەولەو جۆرە پیاوانە نیە کە بکـرێ بـۆ دڵحەسـانەوە پـەنای بـۆ بەرێ.

← قسـە دەگەڵ کردن.

۳۲٤٥/ 2943- **چوونە لای ئەمو ئەو، چوونە ئێرەو ئەوێ.**

← بێرەو بەوێدا گەڕان.

← هەڵوێسـت گۆڕین.

۳۲٤٦/ 188- **(لـە ئـەنگلۆ) چوونـە ماڵێك یـان جێگایـەك، چوونـە ئێوتـسان (بەشێوەیەکی بێئەدەبانـە):** کـامران پێی‌خـۆش نیـە خەڵك بێئاگـاداری بچنـە مـاڵی (= پێی‌خۆشـە خـەڵکی ئەناسیاو لەپڕ لێی وەژوور نەکـەون). ● ئـەرێ ئـەتۆ بـۆ دەبێ هەمیشە بچڕیە نێو قسـەی خەڵکی؟

۳۲٤۷/ 7286- **چوونە سەرەخەسی (گـوت خەیـەن)، چوونـەسەر لـە سەربازخانە:** لـە مـاوەی هـەوڵێن حـەوتووەکانی پـەروەردە کردنی سەرەتایی‌دا ئـاهێڵن سـەربازەکان لـە سـەربازخانە وەدەر کەون.

٢٢٤٨/ 6728- **چوونە مەیدانی کەسێك**: بۆ یەکەم جار کە پێدەنییە نێو پێشبڕکێیان، ناتوانی بۆ کابرایەکی حورفەیی لە تێنیس دا بچێتە مەیدانی.

٢٢٤٩/ 4305- **چوونە مەیدانی عەمەلیاتەوە**: فەوجەکان بۆ بەهێزتر کردنی بەرەی شەڕ، لە تاریکایی شەودا چوونە/ هاتنەنێو مەیدانی عەمەلیاتەوە.

٢٢٥٠/ 2852- **چوونە نزیك، نزیك بوونەوە لە، چوونە پێش لە**: لەو سەگە نزیك مەبنەوە؛ زۆر خەتەرناکە.

٢٢٥١/ 2485- **چوونە نێو**: سێلاوی بەردی تراوەی گرکان لەسەر ڕێگا لێژەکەی دەچووە نێو هەموو کونێو کاژێلێکەوە.

٢٢٥٢/ 2842- **چوونە نێو (لەرتەش، کلیساو ...)**: ژمارەیەکی بەرچاو لەو ئەفسەرانەی بازنشستە دەبن/ تەقاعود دەبن، دەچنە نێو کلیساکان (و دەبن بە ئەندامی کلیساو لەوێ کار دەکەن).

٢٢٥٣/ 3468- **چوونەنێو ئەرتەش**: وەك سەربەل چووە هەنگێکی شارستانەوە.

← چوونەبال... .

٢٢٥٤/ 1188- **چوونە نێو کارێکەوە، دەگەڵ بەرنامەیەك کەوتن**: ئەگەر بتەوێ دەگەڵ کەوێ، دەبێ زۆر ساغ بیوە.

← بەشداری کردن، لادان بۆ ، نرقەی کارێك بوون.

چوونەوە دە قاپیلکی خۆ ←بە پارێزەر بۆ شتێك چوون.

چوونەوەسەر← ڕێچوون.

چوونەدەر ← هاتنەدەر.

چوونەگەڕان ← هاتوچۆ کردن.

٢٢٥٥/ 1046- **چوونەوە دەقاپیلکی خۆ، قوپو قەپ کردن، وێك نان**: کاتێك بازجوو/ مستنطق یارەکەی کابرای بێسەروشوێنی دایە بەر ڕێژنەی پرسیاران کە شەوێك پێشتر کابرا لە کوێ بووە، کچە قوڕو قەپی کردو حازر نەبوو هیچ شتێك بڵێ.

٢٢٥٦/ 5372- **چوونەوەسەر ...، گرتنەوەپێش**: دوای خۆ لەکارکێشانەوەی کۆڕی بەڕێوەبەرایەتیی ئەولەندی باکووری، دەولەتی بریتانیا چۆتەوە سەر سیستەمی ئیدارە کردنی راستەو خۆ لە لەندەن را.

چوونەوەسەر باب و باپیران ← وەتۆزەمەیەك ئەولاتر چوون.

٢٢٥٧/ 2847- **چوونەوەسەر شێوە رەفتاری هەمیشەیی**: هەر کات کابرایەکی دڵپاك، لە دوو پیاوە پیرەی خەلکی ناوایی کە تەمەنیان لە سەد ساڵ تێپەڕ ببوو پرسیاری کردبا "تەمەنتان چەندە؟" هەردوك دەچوونەوەسەر رەفتاری هەمیشەیی خۆیانو یەکیان دەیگوت: 'ئەمن لەوی پیرترم'. ئەوی دیکەش دەیگوت ''وانییە، ئەمن لە هەمووان پیرترم... ''.

٢٢٥٨/ 2448- **چوونەوەسەرکاری گەڕانەوەسەرکار**: دوکتور پێی گوت: بە خۆشحاڵییەوە دەبێ بڵێم کە ئەگەر هەروا بەرەو چاکبوونەوە بچی، لە ماوەی مانگێك دا دەتوانی بچێتەوە سەرکاری خۆت.

٢٢٥٩/ 6896- **چۆنی ئێحتەکەن؟ لەمزەوتان چییە؟**: بیستووتانە نیستیقالەی/ نیستعفای داوە؟ باشە، چۆنی تێدەگەن؟.

٢٢٦٠/ 6362- **چەسپاندن، پێوەنووساندن، لێنان**: منداڵەکان بەیانییەکی بارانییان بە چەسپاندنی تەمران لە ئاڵبۆمەکانیان گوزەراند/ بە لێدانی پوولان، لەنێو ئاڵبۆمەکانیان ڕابوارد.

٢٢٦١/ 6359- **چەسپاندن، چەسپ لێدان**: پێش ئەوەی کە زەرفەکە بچەسپێنی لەبیرت نەچێ حەواڵە پۆستییەکەی تێنێی.

چەوت دەکاری کەسێك خستن ← پێش پێگرتن.

چەرچیایەتی کردن ← وێزتیوری کردن.

چەرچیایەتی کردن ← گەڕانو شتومەك فرۆشتن.

چەسپاندن ← قبوڵاندن، تێپەڕین، پێوەنووساندن، لێنان.

٢٢٦٢/ 4478- **چەسپاندنی بەبەتی تایپ کراو لەسەر کاغەزو ئامادەکردنی بۆ چاپ**

٢٢٦٣/ 1717- **چەقاندن، ئاشتن، تێکەڵ کردن**: دەبێ ئەو نەمامانە کەمێك قووڵتر بچەقێنن، مەگەر بتانەوێ با هەڵیان کەنێ.

← پەروەردە کردن. .

چەقۆکێش ← شەڕانی.

چەقۆلێدان ← لێدان (بە چەقۆ).

٢٢٦٤/ 479- **چەکوچکاری کردن و لەنێو بردن**: ئەم قوڵکە چکۆلە لە سەر گڵکۆکە (چاملخەکە) بە چەکوچکاری نامێنێ.

٢٢٦٥/ 3097- **چەکوچکاری کردن، سافکاری کردن**: ئەم جێقووڕیاوە ئەوەندە گەورە نیە کە پێویستیی بە سافکاری/ چەکوچکاری هەبێ؛ دەتوانین پڕی بکەینەوە.

چەك دانان ← تەسلیم بوون.

٢٢٦٦/ 1038- **چەناگەی کەسێك نەوازش کردن**: بابی چەناگەی کچە چکۆلەکەی بەسەبرایەکی هەڵگلۆفی و گوتی: ئەمڕۆ کچێکی باش بووی؟.

٣٣٦٧/ 7046- **چەند پشتی خۆ ناسین:** ئەو چەند پشتی خۆی دەناسی؟.

٣٣٦٨/ 2888- **چەنەلێدان، درێژدادڕی کردن، زۆر وەدوا کەوتن، زۆر لەسەر رۆیشتن:** "بەڵێ، بەڵێ، قبووڵ دەکەم بە هەڵە چووم کە لە نەخشەکانم ئاگادارم نەکردی، بەڵام زۆری لەسەر مەڕۆ!".

چەنەلێدان، چەنەوەڕی کردن ← درێژدادڕی کردن.

٣٣٦٩/ 486- **چی بەسەر هات، چی لێهات:** ئەری ئەو کۆخەی ڕۆژەکانی پشوودانی هەوتوو دەیچوونێ چی بەسەر هات؟

چیدەوێ؟ ← دەیەوێ چ بڵێ؟

چێشتی سەفەری ← کرینو دەگەڵ خۆ بردن.

٣٣٦٩/١٠ 1011- **چێشە لێپ، "قەس"ێکی گشتی:** پێم وایە دەبێ بچی بۆ لای دوکتور بۆ مرعاینەیەکی/ فەحسێکی گشتی. بە بڕوای من ئەو کۆخینەت شتێکی جیدییە.

٣٣٧٠/ 2924- **چێک کردن، کۆنترۆڵ کردن، چاولێکردن، پێداچوونەوە:** بە راگەیەندراوەکەدا چووەمەوە؛ وادیارە رێکەو پێک بێ. ● ناچار دەبێ حیسابەکان چاو لێبکەینەوە/چێک بکەینەوە/ کونترۆڵ بکەینەوە، بە یەکەوە ناخوێنینەوە.

٣٣٧١/ 94- **حازر بوون لە، چوون بۆ (دادگا لە جیاتی کەسێک):** کاک... بۆ داکۆکی کردن لە بەرامبەر ئەو تاوانانەی کە لەلایەن دەربارەوە خرابوونە ئەستۆی بەناو تاوانبارەکانەوە لە دادگا حازر بوو.

← هاتنە گۆڕێ (لە دادگا).

٣٣٧٢/ 382- **(بە ژمارەیەکی زۆرەوە) حازر بوون، ئامادە بوون:** ئەندامانی حیزبی لۆیال بە ژمارەیەکی زۆرەوە لەخۆپیشاندانەکەدا بەشدارییان کرد (= ئامادە بوون).

٣٣٧٣/ 351- **حازر بوون لە، خۆ گەیاندنە ...:** چەند دەقیقەیەک پاش ئەوەی ئاگادار کران، تاقمی ئاور کوژاندنەوە خۆیان گەیاندە جێگاکە.

٣٣٧٤/ 5310- **حازر بوونی خۆ (لە جێگایە ...) ڕاگەیاندن:** چەند دەقیقە پێش دەست پێکردنی نۆبەکاری شەوانە، حازر بوونی خۆی (لەو جێگایە) ڕاگەیاند.

حازر بە بیستنی شتێک بوون ← گوێ ڕاگرتن.

٣٣٧٥/ 1891- **حازر کردن، ئامادە کردن:** تەرتیباتێکی تازە ئامادە کراوە. ● کۆڕەکە لیستەیەکی وەکوونەوانی دیکەی ئامادە کردوە کە شەش مەرجی تێدایە.

٣٣٧٦/ 4726- **حازر کردن بۆ، ئامادە کردن بۆ:** خەریکە وتارێک بۆ کۆبوونەوەی داهاتووی یەکیەتی ئامادە دەکا.

حازر نەبوون لە ← نەهاتن بۆ.

٣٣٧٧/ 48- **حاشا لەکردن لە، دان پێدانەهێنان بە، قبووڵ کردن:** ئایا قبووڵتە کە ئەو شتانەت هەڵگرتووە بێ ئەوەی پارەکەیان بدەی؟.

٣٣٧٨/ 3237- **حاڵ تێکچوون، وەزعێکی خراپ هەبوون:** زۆر بۆی هەیە جان مەشرووبەکەی تێکەڵ کردبێ. لە ئاشپەزخانەی دیتم حاڵی زۆر خراپ تێکچوو بوو،

٣٣٧٩/ 764- **حاڵەتێک (شلەق، تووڕەیی، پەرۆشی ...، لە ڕێ لە خۆ نیشاندان:** هەر کە ناوی ئەو ژنەت لەلای هێنا، تووڕە دەبێ.

حاڵەتێک بەسەرداهاتن ← دووچاری حاڵەتێک بوون.

٣٣٨٠/ 4183- **حاڵی بوون لە کەسێک، سەردەرهێنان لە، تێگەیشتن:** ئەمن لە کاری ئەو کابرایەی سەردەرناهێنم/ ئەمن دەو کابرایە ناگەم. بۆچی ڕاست ئەو کەسانە نارەحەت دەکا کە دەیانەوێ یارمەتی بدەن.

← تێگەیشتن.

٣٣٨١/ 6581- **حاڵی کەسێک گرتن، نارەحەت کردن:** چوونە میوانیان پیاوەکە دێنێتە سەر حاڵو حاڵی ژنەکە دەگرێ/ پیاوەکەی خۆشحاڵ دەکاو ژنەکە نارەحەت.

← پرینگاندنەوە.

حاڵی کردن ← تێگەیاندن.

حاوانەوە ← هەڵکردن.

حکوومەت کردن بەسەردا ← فەرمانڕەوایی کردن لەسەر.

حەبل لێدان ← سەرمبە لێدان.

٣٣٨٢/ 3688- **حەپسان، شۆکە بوون:** کاتێک هەواڵی مردنی دۆستەکەم بیست بۆ چەند چرکەیەک بە تەواوی حەپەسام/ عەبەسام. ماوەیەکی کێشا هەتا توانیم بێمەسەر ئەو باوەڕە کە ڕووداوێکی ئەوتۆ هاتۆتەپێش.

٣٣٨٣/ 2292- **حەپەسان، سەرسووڕمان، شۆکە بوون، لە جێی خۆ وشک بوون:** خۆشناو لە بیستنی ئەم هەواڵە کە کوڕەکەی دەگەڵ بێوەژنێکی دەوڵەمەند دەژی حەپەسا.

٣٣٨٤/ 5656- **حەجمین لێبڕان، پێ لێ نەهەڵگیران، ئۆقرە لێ نەگرتن:** لە چەند دەقیقەی ئاخری پێش چوونە سەر بەرزەک ئۆقرەی لێ هەڵدەگیرێ. بۆیە سیغارێک هەڵدەکاو لە هەوڵی خۆ جوانکردن دەگەڵ یەکێک کەمێک گەپ لێدەدا/ بە گاڵتە قسە دەکا بۆ ئەوەی بێتەوە سەرەخۆ.

حەرس ← نیگابان.

← حەرەکەت کردن ← ڕۆیشتن.

٣٣٨٤٠١/3078- حەدس لێدان: ئەگەر دەتەوێ دڵ كردەوەی خۆشنار لە بەرامبەر پێشنیارەكەت دا حەدس لێبدەم، دەبێ بڵێم قبوڵی دەكا.
٣٣٨٥/ 3691- حەزف كردن، لەپ كردن: تیمی ئیسپیریچ تیمی فوتبالی لە خولی سێهەم دا حەزف كردو بۆ خۆشی لە دەوری چوارەم دا حەزف بوو.
حەز كردن لە ← كەیف كردن لە.
حەز لێكردن ← خۆش ویستن، پێوەندیی نامەشرووع هەبوون دەگەڵ، ئاشق بوون.
٣٣٨٦/ 7290- حەز لێكردن: ئەو لەوە گەیشتبوو كە كارێكی ئەوتۆ بە روونی بە واتای بانگ هێشتنی بوو، ئامادە بوو حەزی لێبكا.
٣٣٨٧/ 2762- حەز لێكردن، گەڕان دەگەڵ: دەبینم كە ئەوە ماوەی سێ مانگە خۆشنار دەگەڵ ئەو كچە دەگەڕێ.
٣٣٨٨/ 2374- حەساسییەت نیشاندان (لە بەرامبەر): ئەو لە رادەبەدەر لە پێوەندیی دەگەڵ منداڵەكان دا حەساسییەت بە خەرج دەدا. (= نیشان دەدا).
٣٣٨٩/ 6889- حەسانەوە، هاتنەوە سەرەخۆ: پێكێك مەشروب بدە بە میوانەكە بۆ ئەوەی بحەسێتەوە.
← ماندوویی (رووحی) دەركردن، پشوودان، دانیشتن.
٣٣٩٠/ 6699- حەسانەوە، وچاندان، پشوودان: پێویستیت بە پشوودانێك هەیە؛ بۆچی بۆ ماوەی پازدە رۆژێك ناحەسێیەوە، وچان نادەی؟
٣٣٩١/ 6235- حەسانەوە یان ئیجازەی حەسانەوە دان بە: كاتێك دەركەوت كە هیچ هێرشێكی دیكە ناكرێ، ئیجازەی حەسانەوەیان دا بە سەربازەكان.
٣٣٩٢/ 3322- حەسرەتی شتێك خواردن، بە ئاواتی شتێكەوە سووتان: حەسرەتی دیتنی كەسانێك لە دەرەوەی دنیا بەرتەسكەكەی خۆی دەخوارد.
حەشارگە ← پەناگا.
حەقدەستی خالیس ← پارەتی، یان حەقدەستی خالیس.
٣٣٩٣/ 4490- حەقو حیسابی كەسێك دان و لەسەر كار وەلا بردن: لە كۆتایی سەفەرەكەدا، حەقو حیسابی كرێكارانی كەشتییەكەیان داو دەریان كردنو تاقمێكی دیكەیان دامەزراند.
٣٣٩٤/ 7460- حەل كردن: بزانم دەتوانی ئەم جەدوەلە حەل بكەی؟.
٣٣٩٥/ 2556- حەل كردن (ی مەسەلەیەكی حیسابی و...): تەنانەت قوتابییەكی پۆلەكە نەیتوانی مەسەلەكە حەل بكا.
٣٣٩٦/ 1766- حەل كردن، چارەسەر كردن: ئەوە كە كێ بكاتە جێنشینی خۆی، زۆر زوو حەل بوو.
٣٣٩٧/ 4481- حەل كردن (ی كێشەیەك)، چارەسەر كردن: پێش ئەوەی پەنا بۆ پۆلیس بەرن، كێشەكەیان چارەسەر كرد.
← چارەسەر كردن، جێبەجێ كردن.
٣٣٩٨/ 5142- حەڵەق مەڵەق كوتن، هەڕەسەی چەوڵە/ پەڕپووچ سەبارەت شتێكی/ باسی شتێك هێنانەگۆڕ: بەراستی پێم وابوو كە چیا وتاری بە خێرهێنانەكە بدا، بەڵام هێندە دەپەڕێتەسەر ئەم بابەتو ئەو بابەتان كە مەپرسە، وانیە؟
حاڵی بوون لە ← تێگەیشتن لە.
٣٣٩٩/ 2357- حەمام كردن، چەوڵە حەمام، خۆ شوشتن: پێش دەست پێكردنی كۆبوونەوە، دەتوانم خێرا خۆم بشۆم.
← خۆ شوشتن.
٣٤٠٠/ 7103- حەواڵە كردن، لەسپاردن بە: ئێوە دەبێ پرۆژەكە لە پێش دا بە وردی ئامادە بكەن، نابێ حەواڵەی بەختو ئیقبالی بكەن/ بە شانسی بسپێرن.
٣٤٠١/ -
٣٤٠٢/ 2214- حەوسەڵە هەبوون، توانایی لە ئەنجامدانی كارێك هەبوون: نازانم كلوە دەتوانێ كادۆكان بكاتەوە یان نا.
← ئیشتیای شتێك هەبوون.
٣٤٠٣/ 1760- حەوسەڵەی لە ئەنجامدانی كارێك لەبوون: بەو چێشتە قورسەی هەر ئێستا خواردم، حەوسەڵەی كاری جیددیم نیە.
٣٤٠٤/ 767- حەوسەڵەی كەسێك بردن، ئازەحەت كردن، سەغڵەت كردن، جاڕز كردن: ئەوێ بۆ دەبێ وا قسان بكا؟ حەوسەڵەی پیاوی دەبا.
← جاڕز كردن.
٣٤٠٥/ 2829- (لە پاشا نا) حوكم بە قازانجی كەسێك دران: دوای چەندین رۆژ دڵەخورپەو نیگەرانی، لە حاڵێك دا وەزعەكە زۆر تاریك دەهاتەبەرچاو، سەرەنجام بە قازانجی رەفیقەكەم حوكم درا.
٣٤٠٦/ 4762- حوكم دان، ئەزموون لەسەر: لە هەموو جێگایەك هاواری پسپۆڕەكان بەرز بۆتەوە كە لەسەر هەموو شتێك، لە تەنسیری فلووراید لەسەر ئاوی خواردنەوەوە بگرە هەتا داهاتووی ئامرازە ماتۆڕییەكان لە شارەكان ئەزمەر دەدەن.
← بڕیاردان بە قازانجی... .
٣٤٠٧/ 4456- حوكم لەسەر... دان: پێش ئەوەی حوكمت لەسەر بدەم، داخوا شتێك هەیە بیڵێی؟.

٣٤٠٨ 3102- **حوکم دان لەسەر:** دوای ئەوە کە کـــۆڕی داوەران فتوای خۆیان دا، قازی حوکمی فورسی پازدە هەتا بیستو پێنج ساڵی لەسەر هەموو تاوانبارەکان دا.
← بەتاوانبار ناسین.

٣٤٠٩ 329- **حۆل، قیت یان کەر بوون:** دەبێ شێت بێ کـــە بـەو جۆرە پووڵو پارەکەی بە فیڕۆ دەدا.

حیجز کردن ← ریزێـــرو کـــردن، راگرتـــن(ی جێگایـــەك بـــۆ کەسێك).

حیساب، یان حیسێب کردن لەسـەر ← هیوادار بوون بە.

٣٤١٠ 6191- **حیساب پاک کردن دەگەڵ، تۆڵە لێکردنەوە یان لێ‌ئەستاندنەوە:** دەبێ پێش تـــەواو بوونـــی ســـاڵ، حیســـابی بانکیم دەگەڵ رئیسی بانك پاك بکـەم/ تەسـفیە حیسـاب بکـەم. • شـەرێکم دەگـــەڵی نـــەماوە؛ تۆڵـــەی خـــۆم لێکردۆتەوە.

٣٤١١ 1008- **حیساب (لە هوتێل، کافە) دان:** داخــوا ئاغــای جونــز رۆیشـتووە؟ ، بـەڵێ، پێنــج دەقیقــە لەمــــەوپێش حیسابی هوتێلی دا (و رۆیشت).

٣٤١٢ 6189- **حیساب دان، حیساب کردن، پوول دان:** دەتـــوانم بزانم ئەتۆ حیسابەکەی بدەی؟

٣٤١٣ 1374- **حیساب کردن، بەراورد کردن:** کـاتێك شـەریکەی رولزرویس قەرزەکانی چەند ســـەد میلیـــۆن پونـــد بـــەراورد کرد، خەڵك سەریان سوڕما.

٣٤١٤ 7459- **حیساب کردن:** ئێســـتا بـــۆ حیســـاب کردنـــی یارمەتییە مانگانەکان کامپیوتێرمان هەیە.

٣٤١٥ 5405- **حیساب کردن (ی نرخی شتومەك لەسەر ماشێن/ ماکینەی حیساب):** لـــە دوکـــانی گوندەکـــەمان، نرخـــی خواردەمەنییـەکی کـە لـە رۆژەکـانی ئـاخری حـــەوتوو دەمانبرد لەسەر ماشـێن حیسـابێکی زۆر کـۆن حیسـاب دەکرا.

حیســاب کــردن ← لەبــەرچاو گرتــن، پــارە لێوەرگرتـــن، تێگەیستن، جیــاوازیی نێــوان دووشــتان لەبــەرچاو گرتــن، چاوەڕوانی هەبوون لـە، وەکـوو... چـاو لێکـردن، دەگـەڵ خـــتن.

حیســـاب لـــە دەســـت دەرچـــوون ← حیســـابی شـــتێك لەبیرنەمان.

٣٤١٦ 1677- **حیساب کردن لەسەر:** ناتوانن لەسـەر ئــەم خەتــە پاسانە حیساب بکەین. هەرگیز سەری وەخت نایەن.

٣٤١٧ 7265- **حیساب کردن لەسەر کیسە بۆ هەڵدروون:** قــەولی پشـوودان و گـەڕانێکی ئەفسـانەیی بـۆ (دوورگـــەکانی) باهامـای پێـداوم، بـەڵام ئەگـەر لـە جیـاتی تۆیـام زۆرم حیساب لەسەر نەدەکرد/ زۆرم کیسە بۆ هەڵنەدەدروو.

٣٤١٨ 5212- **حیساب لەسەر کردن:** ئــەو هەمیشــە لــە کــاتی پێویســت دا یاریدەمــان دەدا؛ دەتوانــی حیســابی لەســـەر بکەی.

٣٤١٩ 893- **حیساب لێ‌کێشان:** رەنگــە پێیوابــێ کــەس لــەو وردە دزییانەی ئاگادار نەبووە، بەڵام رۆژێك دێ حیســـابی لێ‌بکێشن.

٣٤٢٠ 3835- **حیساب نەکردن لەسەر، لەبەرچاو نەگرتن، لە قەڵەم نەهێنان یان کەوتن:** وردەوریــە کــە هیــچ شــتێك لــە حیسابەکان دا لە قەڵەم نەکەوێ. • لـــە حیســـابەکانیدا، داڵنیشانی هاوکارەکانی رابردووی لەبەرچاو نەگرتبوو.

٣٤٢١ 1465- **حیساب نەکردن، بە حیساب نەهێنان، دەرهاویشتن:** ئەگــەر هــەتا نیوەشــەوێ پاســەکە نەگەڕێتــەوە، ئــــەمن دەرباوێژە.
← لەبەرچاو نەگرتن.

٣٤٢٢ 5822- **حیسابی شتێک دان:** لەو جێگایــە مــاندوو بــووم. وەرن با حیسابەکەمان بدەین و بڕۆین.

٣٤٢٣ 4070- **حیسابی شتێک لە دەست دان/ لە دەست دەرچوون/ نەزانین:** نــاتوانم بڵێـم چــەند جـار راســت ئــەو چیرۆکــەی بۆگێڕاوینەوە، حیسابەکەی لە دەستم دەرچووە.

٣٤٢٤ 5214- **حیسابی... کردن:** حیسـابی خوروخـدە، شـێوەی پەروەردە کرانو عادەتی خۆم نەکردبوو.

٣٤٢٥ 5065- **حیسابی یەک و یەک دەکاتە دوو لە نەجامدان:** پلیـــس دەتوانی حیسابێکی یەکو یەك دەکاتـــە دوو ئـــەنجام بـــدا و زۆر زوو شوێنی هەڵگرێ.

٣٤٢٦ 3360- **حیسێب کران دەگەڵ:** داخــرا کتێبــەکانیش هــەر دەگەڵ قەفــەزەی کتێبــەکان حیســێب کــراون یــان ئــەوان بەجیان؟.
← نووسین وەك.

٣٤٢٧ 2051- **حیمایەکردن، لیسکۆرت کردن، دەگەڵ بوون:** بـــۆ پاراستنی داوەر لـــە مەترســـیی تەماشاچییە توورەکـانی فووتباڵ، چەند کەس لە پۆلیسەکان ناچار بوون حیمایـــەی بکەنو لە مەیدان بیبەنەدەر.

٣٤٢٨ 1681- **خاترجەم بوون، دڵنیا بوون، لەرخەیان بوون:** خاترجەم بە؛ لەوێ دەبم.

← دڵداری دانەوە، باوەڕ پێکردن.

خاتەمکاری کردن ← ڕازاندنەوە.

٢٤٢٩/ 420- **خاوان، دەرهاتن، بلاوهاتن:** سەرۆکی نیـدارە هیـچ لەسەر نـەم بروایـە نـەبوو کوڕەکـەی بنێرێتـە زانسـتگە، چونکـە بـۆ خـۆی لـە مـەیدانی کـردەوەدا دەرهـاتبوو، خارابوو.

خافلاندن ← دەست پێ‌گەرم کردنەوە.

٢٤٣٠/ 7183-(**لە پەیوەندی لەگەڵ کەشتی دا) خاڵی کـردن، بـەتاڵ کردن، پیادە کردن، دابەزاندن:** یـەکێك لـە هۆیـەکانی قـازانج کردنی کەشتیی موسافیر هەڵگر ئەوەیە کە موسـافیرەکان زوو دادەبەزێنن.

٢٤٣١/ 1747- **خاڵی کـردن، بـەتاڵ کـردن، ڕشتن:** لـە دژی ئـەو شەریکانەی زبڵی کارخانان دەڕژێنە نێو چۆمان هـەنگاوی زۆر جیددی هەڵدەگرن.

← بەتاڵ بوون، بەتاڵ کردن.

٢٤٣٢/ 507- ( **لە زەمانی شەڕدا) خامۆش کردنی چراکـان، یـان پێـچـی چوونەوەی ڕووناکیی کردن:** ئۆرلـەر هـامپیتی یەکـەمین شـاری بریتانیا بوو کە بەرنامەی خامۆشی‌یان تێدا بەڕێوەبرد.

← کووژاندنەوە، کووژاندنەوە.

٢٤٣٣/ 794- **خانووبـەرە سـاز کـردن (لەسـەر)، گـران، یـا بـوون بـە خانووبەرە:** ئەو لێرەوارەی بە منداڵی کایـەی تێـدا دەکـرد، هەمووی بۆتە خانووبەرە.

٢٤٣٤/ 4297- **خـانووپێدان، دامەزراندن:** 'شـوورا لـە کوێتـان خانوو دەداتێ؟'، 'لەو ئاپارتمانە تازە دروستکراوانە'؟

٢٤٣٥/ 3814- **خانووچکـەی تەنیشـت ماڵـێ:** ئـەو ئامرازەکـانی باخەوانیی خۆی لە خانووچکەی تەنیشت ماڵێ رادەگرێ.

٢٤٣٦/ -

٢٤٣٧/ 5928- **خـاو بوونـەوە، هاتنەوەسـەرەخۆ، ئامرکانـەوە، ئـارام بوونەوە:** دەقیقەیەك لێی گەڕێ با بێتەوە سەرەخۆ، هەمیشە لە کاتی باسی سیاسی‌دا هەروایە.

← فێنك بوونەوە.

خاوێن بوونەوە ← پاك بوونەوە.

٢٤٣٨/ 5409- (**بە ئاوکێش کردن) خـاوێن کردنـەوە:** وردەوردە کـە بە ئاوکێش کردن کەفی سابوونی پێـوە نـەمێنێ‌و خـاوێن بێتەوە.

٢٤٣٩/ 6538-( **بـە گوونیـی تـەڕ) خـاوێن کردنـەوە:** سـەربازەکان ناچار بوون پێش ئەوەی بێن چاو لە هۆدەکەیان بکـەن بـە تەلیسـی تـەڕ/ گوونـی تـەڕ ئەرزەکـەی بشـۆن/ خـاوێن بکەنەوە.

٢٤٤٠/ 6537- **خاوێن کردنەوە بە گوونی تەڕ:** بە مەلەوانـەکانیان دەستوور دا عەرشـەی کەشتی‌یەکە بە گوونی تەڕ بشۆنەوە.

٢٤٤١/ 6568- **خاوێن کردنـەوە (بـە کەسـێکو خـەڵك لـەقلاز):** دوای تەواوبوونی میوانی‌یەکە، بۆ خاوێن کردنـەوە بـە تـەنیایی بەجێیم مەهێڵن.

٢٤٤٢/ 6990- **خاوێن کردنەوە:** کوڕەکان بەشـێك لـە ئـاخرین ڕۆژی تێرمەکـەیان/ خولەکـەیان بـۆ خـاوێن کردنـــەوەی مێزەکانیان‌و تەحویلدانەوەی کتێبەکانیان تەرخان کرد.

٢٤٤٣/ 6991- **خاوێن کردنەوە:** مـاری، کـە هەمیشـە دەبـوو دوای ڕۆیشـتنی منداڵـــەکان ماڵـــێ خـــاوێن کاتـــەوە/ هەڵوەژێرێ، تا رادەیەك ماندوو ببوو.

٢٤٤٤/ 7421- **خاوێن کردنەوە:** کاتێك ماشـێنەکەت شوشـتە بە چەرمێکی نەرم تەواو خاوێنی بکەوە.

٢٤٤٥/ 5640- (**نیـوی قـتێك) خـاوێن کردنـەوە:** دەتـەوێ نیـوی کوریەی مرەباکە خاوێن کەیەوە؟.

٢٤٤٦/ 7425- (**نیوی قتێك) خاوێن کردنەوە:** دیققـەت بکـە کـە نێو کەتری قاوەکە بە تەواوی خاوێن بکرێتەوە.

٢٤٤٧/ 1075- **خاوێن کردنەوە، ڕێك‌و پێك کردن:** داخـــرا ئاتـەوێ پێش چوونەدەر، ولآتەکە خاوێن بکەینەوە؟

٢٤٤٨/ 1063- **خـاوێن کردنـەوە، پـاك کردنـەوە:** وەختـی ئـەوە هاتووە کە پۆلیس بۆ خاوێن کردنەوەی ئەو شارە هەنگاوی جیددی هەڵگرێ.

٢٤٤٩/ 1611- **خاوێن کردنەوە، ئاوردن:** ئەگەر لەو ئاوە کـە بـۆ خاوێن کردنەوە بەکار دێ کەڵك وەرگرن، دەبینـن زۆر بـە هاسانی پەڵەو مەڵەکان خاوێن دەکاتەوە.

٢٤٥٠/ 1802- **خـاوێن کردنـەوە:** حەمامـەکەی بـە سـابوون‌و ئاوی گەرم یەکجار زۆر خاوێن کردەوە.

٢٤٥١/ 770- **خـاوێن کردنـەوە ( بـە بڕاسـی):** ژاکێتەکـەت هەمووی کۆلکەیە؛ دەبـێ خـاوێنی بکەیـەوە (= بڕاسـی لێدەی).

٢٤٥٢/ 4310- **خـاوێن کردنـەوە، دەربەدان:** هـەموو بـەیانی‌یان سـەعاتی ٦ دەبـێ تەویلـەی ئەسـپەکان خـاوێن کاتـەوە/ دەردا.

خاوێن کردنەوە بە قامکی دەست ← پتە لێدان.

خاوێن کردنەوە بە پەڕۆی ← ئەسترینەوە، پاك کردنەوە.

٢٤٥٣/ 5659- **خاوێن کردنەوە ( بە بڕاس‌و ئـاوو سـابوون)** : پێـش ئـەوەی بـۆ نـانی نیوەڕۆیـە دانیشـی، ئـەو قـوڕەی لـە قامکەکانت خاوێن بکەوە (= بە ئاوو سابوون بیشۆوە).

٢٤٥٤/ 1059- **خاوێن کردنەوە (سەرتاخوار بە تەواوی)**: دایکم هەمیشە لەسەر خاوێن کردنەوەی مانگێ جارێکی سەرتا خوارێی ماڵێ پێدادەگرێ.

٢٤٥٥/ 2926- **خاوێن کردنەوە، پاقژ کردن، چاولێکردن و چاک کردنەوە**: کچەکە بە توزتەکینێکی و زۆر بە خێرایی هۆدەکەی خاوێن کردەوە. ● دەکرێ لوتف بکەی و چارێك لە ماتۆری ئەم ماشینە بکەی (و چاکی بکەیەوە)؟ دەنگێکی سەیری لێوە دێ.

٢٤٥٦/ 5661- **خاوێن یان پاك کردنەوە بە برۆس و ئاو و سابوون**: هەر کە ماڵیان گوێزتەوە، دەستیان کرد بە خاوێن کردنەوەی هۆدەکان ( بە برۆس و ئاو و سابوون).

٢٤٥٧/ 904- **خاو کردنەوەی کەسێك، هێنانەوە سەرەخۆ، ئاگاکاندنەوە**: ئەوە دەرسێك بوو لە توانایی ژنێك لە خاو کردنەوەی پیاوێك دا.

٢٤٥٨/ 1823- **خراپ بزووتنەوە لەگەڵ**: هەمیشە ئیددیعای دەکرد خراپ دەگەڵی دەبزوونەوە، بەڵام خاوەنکارەکانی بە سەخاوەتەوە دەگەڵی رەفتار دەکەن.

٢٤٥٩/ 785- **خراپ بزووتنەوە لەگەڵ، بە چاوی سووکەوە لەگەڵ کەسێك جووڵانەوە**: گوێت لێ بێ، ئەوەی کە دەمەوێ وەڵامێکی سادە و ساکارە بە پرسیارێکی سادەتر. ئاواش بێئەدەبانە مەجووڵێوە/ دەست لەو کەرەکەرەی هەڵگرە.
← بە چاوی سووکەوە دەگەڵ کەسێك رەفتار کردن.

٢٤٦٠/ 1157- **خراپ بوون، هەڵتەقیان**: بەستەزمانە پیرە جورج، لەو کاتەوە کە نابووت بووە، وەزعییەتی ژیانی بەرەو خراپی رۆیشتووە.

٢٤٦١/ 2978- **خراپ بوون، فاسید بوون، رزین**: ماری: "خۆ ئامادە کردنت بۆ ئەو تاقیکارییە شەش مانگ وەختت دەگرێ".
تۆنی: " ساڵێك پاش ئەوەی کە مێشکم لە ئەرتەش دادەرزێ!"
← لە نێوچوون، بۆگەنیو بوون، لەکار کەوتن، تێك شکان.
خراپ پێکردن ← بەگژداهاتن.
خراپ جووڵانەوە دەگەڵ ← توندو تیژ جووڵانەوە دەگەڵ.

٢٤٦٢/ 2819- **خراپتر بوون، قەیرانیتر بوون**: ساڵی ١٩٥٥ بە خێرایی بەسەر دەچوو، وەزعی ناوچەکەش بەرەو شپرزەتر بوون دەڕۆیشت.
← بەرەو لاوازی رۆیشتن.

٢٤٦٣/ 4311- **خراپ کردن، زایە کردن، لێ تێکدان**: هەوا پێشرەودانەکانی ئاخری حەوتووی بەراستی تێك داین.

٢٤٦٤/ 550- **خراپ کردن، شێواندن، تێکەڵ پێکەڵ کردن، دار لەسەر بەرد نەهێشتن**: زۆر بە روونی سیستمی حیسابداریی خۆمان بۆ شی کردەوە، بەڵام لە ماوەی چەند سەعاتێك دا هەموو شتێکی لێ خراپ کردین.

٢٤٦٥/ 1104- **خراپ کردن، تێکدان**: بەرنامەی سەفەرەکەتان بەو دامەزرێن؛ بەرنامەی ئێمەی بە تەواوی خراپ کرد/ بە تەواوی دە بەرنامەی ئێمە رپا.

٢٤٦٦/ 177- **خراپ کردن، شێواندن**: مەهێڵن ئەو شیرکەتە کاری پێڕاگەیشتن بە حیسابەکانتان بگرێتە خۆ. چونکە هی ئێمەیان بە تەواوی خراپ کرد.

٢٤٦٧/ 569- **خراپ کردن ( بە هۆی کەمتەرخەمییەوە) شێواندن**: ئەو کارەی پێ مەسپێرن، بە بێ هیچ ئەم لا و ئەولایەك خرابی دەکا.

٢٤٦٨/ 2348- **خراپ کردن، تێکدان**: کاتێك هەموو شتێك بێ گیروگرفت دەچێتە پێش، بۆ دەبێ ئەو کلکی تێوەردا و هەموو شتێکمان لێ تێك دا؟

٢٤٦٩/ 787- **خراپ کردن، تێکدان**: بەس دەست دەو پلایزو ئامرازانە وەردە. سەرەنجام هەموویان خراپ دەکەی.

٢٤٧٠/ 4270- **خراپ کردن، تێکدان**: داوایان لێ مەکە بەرنامەی سەفەرەکەت بۆ دیاری بکەن/ رێکەو پێك بکەن. هی ئێمەیان بە تەواوی خراپ کرد/ تێکدا.

٢٤٧١/ 5657- **خراپ کردن، تێکدان**: نە دەبوو کارەکان بە کامران بسپێرین. هەموو کارەکەی لە سەرەتاوە هەتا ئاخری خراپ کرد.

٢٤٧٢/ 4087- (زاراوەی لاتی)، **خراپ کردن، شێواندن، تێکدان، گوو تێکردن**: خەریك بووین بە چەند قسەی خۆش ماریەمان رازی دەکرد کە لەپڕ ئەو زارە زەلامەت کردەوەو تێی‌ڕپای.

٢٤٧٣/ 4144- **خراپ کردن، تێکدان، تێکشکان**: کاری رێزنیرو/حیجز کردنی جێگای لە ئێمە بە تەواوی تێك دا.
← تێکدان، تێڕپان.
خراپ کردن ← رووخاندن.دەرهێنان، تێڕپان، تێك دان.

٢٤٧٤/ 3083- **خراپ کردن**: راست ئەو کاتەی کە رادیار بوو سەباتێك لە سنعەت دا هاتۆتەکایەوە، مانگرتنی بەشی خزمەتە گشتییەکان هەموو شتێکی تێك دا.

٢٤٧٥/ 2565- **خراپ لە خەو هەستان**: 'ئەرێ ئەمڕۆ نیچەوان بۆ رادەکا؟ بە هەموو کەس جنێوان دەدا. '، ' نازانم، رەنگە خراپ لە خەوێ هەستابێ، یان شتێکی لەم بابەتە.

٢٤٧٦/ 269- **خراپ هێنان، بەدشانسی هێنان**: کاکە گیان. زۆر بەداخم کە ئاوا بەدشانسی رووی تێکردووی/ چاکت بۆ نایە/ خراپت هێناوە.

**٢٤٧٧/ 6883- خربوونەوە (ی ماشێک لە ئاش)، سەرلێ‌شێوان، تێکچوون، خۆ لێ‌ڕاپڵاندن:** پێش ڕووداوێکی گرنگ، ئەو کچە/ ژنە هەرگیز سەری لێ‌ناشێوێ‌و خۆی نادۆڕێنێ.
← کۆبوونەوە.

**٢٤٧٨/ 5474- خرکردن، پەخ کردن:** نەختێک کاغەز پەرداخ/ سماتە هەڵگرەو لێوارەکانی چوارچێوەکە پەخ کە.
خرکردنەوە ← کۆ کردنەوە، لە یەک جێ وەکۆ کردن، لوولە کردن، قەتکردن، هەڵکردنەوە.
خرمان هەڵگرتن ← کۆ کردنەوە .
خرۆشاندن (ی هەستی کەسێک) ← وەجۆش هێنان).

**٢٤٧٩/ 1585- خرۆجی/ قەتعە، ڕێگای چوونەدەر:** کەمێک پێشتر "خرووجی"یەکەت بەجێ هێشت، بەڵام پێم وایە دە مایل دواتر "خرووجی"یەکی دیکەمان لەپێشە.

**٢٤٨٠/ 5279- خزم بوون لەگەڵ، پەیوەندیی هەبوون لەگەڵ:** شاژنی ئێستامان دەگەڵ زۆربەی بنەماڵە میرەکانی ئورووپا خزمی پشتێ یان خزمی بەرێیە.

**٢٤٨١/ 7272- خزمەت پێکردن (وەک نۆکەرو کارەکەران):** لە ماڵی کورەکان دەستیان لە ڕەش‌و سپی نەدەدا، ئێمەش کچەکان ناچار بووین وەک کلفەتان/ کارەکەران خزمەتیان بکەین.

**٢٤٨٢/ 4109- خزمەت کردن بە، کۆمەک کردن بە:** یارییە جیهانییەکانی فوتباڵ بە پێوەندیی باشی نێوان وڵاتان هەمیشە خزمەت ناکەن.

**٢٤٨٣/ 967- خزمەت کردن بە، پێڕاگەیشتن، پەزیرایی کردن لە:** "شاری‌کاپە" لە هەموو منداڵێک، بە هەر تەمەنێکەوە، پەزیرایی دەکا/ بە هەموو منداڵێک ڕادەگا.
خزمەت کردن لەژێر دەستی کەسێک دا ← لەژێر دەستی کەسێک دا خزمەت کردن.

**٢٤٨٤/ 7267- خزمەتی میوانان کردن، نان‌و چێشت دانان بۆ میوانان:** لە ڕۆژەکانی پشوودان دا کارێکی کاتیم لە میوانخانەکان پەیدا دەکرد. قاپم دەشۆرد‌و نان‌و چێشتم بۆ میوانان دەبرد/ پەزیراییم دەکرد.

**٢٤٨٥/ 2616- خزین بە بن شتێک دا، خۆ بەبن شتێک دا کردن:** کەروێشکەکان نەیاندەتوانی خۆ بە ژێر تۆڕە سیمییەکان داکەن. بۆیە توانیمان هێندێک سەوزی بچێنین.

**٢٤٨٦/ 2718- خزین بۆپێشەوە، ڕابردن، دووڕکەوتنەوە، لێخوڕین:** فڕۆکەوانەکە توانی فڕۆکەکەی بە نەرمی لەسەر باندی فڕۆکەخانە بخزێنێ‌و ڕایگرێ.

**٢٤٨٧/ 1498- خزین، لەسەرخۆ ڕۆیشتن:** حەیوانە بریندارەکە هەر جۆرێک بێ لەوانەی بە دوایەوە بوون خۆی دوور خستەوەو خزییە نێو کونێک.

**٢٤٨٨/ 1504- خزین، هاتوچۆ کردن (بێ‌دەنگ‌ڕۆیشتن)، لەسەرخۆ ڕۆیشتن:** لە خوارەوەی/لەبەر کورتە ڕێیەک، مێروولان ڕیچکەیان بەستبوو بێ‌پسانەوە لە هاتوچۆدابوون.

**٢٤٨٩/ 5991- خزینە ژوور، بە ئەسپایی چوونە ژوور لە...:** بۆ ئەوەی لە خەوتنی منداڵەکان ئەرخەیان بێ، دایکم بە ئەسپایی لە دیوەکەیان چووە ژوور.

**٢٤٩٠/ 1506- خزینە نێو، هاتنەنێو:** دەبێ لەسەرەخۆ قسان بکەین‌و نەهێڵین تەڵەی‌و دڵنیشی بێتە نێو باسەکەمانەوە.

**٢٤٩١/ 657- خستن، کوشتن:** هەر چەند حەیوانە کێوییەکان زۆر توند هەڵدەهاتن، بەو حاڵەش توانیمان یەک دوو سەرێکیان لێ‌بخەین(= لێ‌بکوژین).

**٢٤٩٢/ 733- خستن، شکاندن‌و خستن:** گژەبایەک دارەکانی تێلێکگرالەو دارەبەرییەکانی خستبوو/ شکاندبووو خستبوونی.
← لە ئەرزیدان.

**٢٤٩٣/ 142- خستنە ئەستۆ، وەپاڵنان:** دادگا ڕای‌گەیاند ناتوانێ هیچ تاوانێک بخاتە ئەستۆی ڕانندەی لۆرییەکە.
← باری کەسێک کردن.

**٢٤٩٤/ 3352- خستنەئەستۆی...:** هیچ کەس عەیبی خۆی نابینێ. باکی لەوەی نەبوو کە هۆی شکستی لە ژن هێنان دا بخاتە ئەستۆی ژنەکەی.
← کارێکی زەحمەت خستنە ئەستۆی یان سەرشانی کەسێک.

**٢٤٩٥/ 2087- خستنەبەر مەترسیی شتێکەوە، کەوتنەبەر مەترسیی شتێکەوە:** لە ساڵی ١٩٧١دا خەڵکی بەنگالی ڕۆژهەڵات کەوتبوونە بەر مەترسیی سێلاو، قاتی‌و قڕی‌و نەخۆشی یان شەڕەوە.

**٢٤٩٦/ 703- خستنە بەرچاو، نیشاندان، (بە ڕوونی):** وەسێکی کە لەو پەیکەرەی هەڵگرتووە بە ڕوونی‌و بە وردی هەموو وردە کارییەکانی نیشان دەدا/ دەردەخا.
خستنەبەرباس ← هێنانەگۆڕ.

**٢٤٩٧/ 5949- خستنە پشت گوێ، گوێ نەدان بە:** هەتا چەند حەوتووان سەبارەت بە دەوسییەی من، هیچ هەنگاوێکیان هەڵنەگرت‌و هەروا گوێیان نەدایە.

٧٤٩٨/ 1700- **خستنە خزمەت، دانان لە پێناو:** گاندی هەموو ژیانی خۆی خستبووە خزمەت ئاشتی‌یەوە.
٧٤٩٩/ 4519- **خستنەژێر بارانی ... بەرەبەباران کردن:** خەڵکەکە لە کابرای سوخمزان قەڵس ببوونو دایانبەر هێلکە بزگەنیوان.
٧٥٠٠/ 5009- **خستنەژێر تاقیکاری‌یەکی دژوارەوە:** بەڵێ بە بڕینی ئەو چەشنە تەداروکاتە، خستیانینە ژێر تاقیکاری‌یەکی زۆر دژوارەوە.
٧٥٠١/ 3555- **خستنەژێر چاودێری:** دوا بە دوای هەڵاتنی زیندانی‌یەکان لە بەندیخانە، کاربەدەستان هەموو فرۆکەخانەو بەندەرەکانیان خستۆتە ژێر چاودێری‌یەوە.
٧٥٠٢/ 3567- **خستنەژێر چاودێری، وەدوای پێ‌و شوێنی کەسێک کەوتن، لێپەشکنین:** ئەمڕۆژانە هۆمەر وەدوای پێ‌و شوێنی ژنەکەی دەکەوێ. ئایا پێی‌وایە حەزلێکردوویی دەکا؟
٧٥٠٣/ 3510- **خستنەژێر گوشارەوە، پێش پێگرتن:** جووتیاران لەلایەن هێزی داگیرکەرەوە، کە دەگەڵ چینە خاوەن زەوی‌یەکان یەکیان گرتبوو، زۆر بێرەحمانە کەوتبوونە ژێر گوشارەوە/ فشارەوە.
٧٥٠٤/ 6496- **خستنە ژێر (گوشارەوە/ فشارەوە):** ئەو وەرەقە ئاسنانەیان خستۆتە ژێر فشارێکی یەکجار بەهێزەوە.
خستنەژێر تەنسورەوە ← شوێن لەسەر دانان، نفووز تێدا کردن.
خستنەژێر تاقیکاری‌یەوە ← تاقی کردنەوە.
خستنەژێر دەسەڵاتەوە ← تەسلیم کردن.
خستنەژێر گوشارەوە ← سەرکوت کردن، پێش پێگرتن.
٧٥٠٥/ 2322- **خستنە سەر، دانەسەر، راگرتن لەسەر، بردنەسەر شتێک:** زەحمەتە بتوانی زیاتر لە پێنج دەقیقان هۆشی بخاتەسەر شتێک/ هۆش بداتەسەر شتێک.
٧٥٠٦/ 989- **(لە رانسەندنگی) خستنە دەندەی (گێڕی) سووکترەوە:** کاتێک لە دووی دەچمە سێی، دەندەکان/ گێڕەکان خڕخڕیان لێدێ. داخوا کلاچەکەم خراپ بووە؟.
خستنەسەر ← لێدان (ی شتێک لە شتێکی دیکە)، چوونەپاڵ یان نێو، پێوە لکاندن، لێ‌زیاد کردن،
خستنە سەر زاران ← بلاو کردنەوە (ی دەنگۆ).
٧٥٠٧/ 4934- **خستنە مەترسی‌یەوە:** وەدرەنگی کەوتنی هاتنی سووتەمەنی، چوونە پێشمان بە تەواوی دەخاتە مەترسی‌یەوە.

٧٥٠٨/ 3391- **خستنە نێوان دوو شتان:** ئەگەر بتوانیبا شتێکی عایق/ ئارسانا لە نێوان جەمسەری سیمەکان بخەی، دووشاخەکان زۆر سەلامەت تر دەبن.
٧٥٠٩/ 5294- **خستنەوەبیری شتێک، هێنانەوە بەرچاو:** شێوەی رەفتاری لە کاتی تووڕەبوون دا باوکیم وەبیر دێنێتەوە.
← وەبیر هێنانەوە.
٧٥١٠/ 4930- **خستنە وەزعێکی نالەبارەوە:** یارمەتی دانی کاربەدەستانی ناوچە یاخی‌یەکان، دەوڵەتی خستۆتە وەزعێکی نالەبارەوە.
خستنەوەسەر تایەر ← لەسەرپێی خۆ راوەستان.
خستنەسەر جێگای خۆ لەسەر جێگای خۆ دانانەوە.
٧٥١١/ 6004- **خلۆر بوونەوە، پێوەو بەدوێدا:** دوو دانە گالۆنی ئاوێ لەنێو بەلەمەکەدا بەم لاو بەولا دا خلۆر دەبوونەوە.
← گلۆلە کردن.
٧٥١٢/ 1028- **خنکاندن، لەنەفەس لێبڕین (زۆر بە توندی گوشار بۆهێنان)، بڕست لێبڕین:** دەستی دە گەرووی ژنەکە نابوو دەیەویست بیخنکێنێ. ● دەوڵەت بڕستی لە قوتابخانە ئایینی‌یەکان بڕیوە.
٧٥١٣/ 3370- **(خۆ) خزاندنە نێو:** شەوکەتەکە توانیبووی دوو سێ کەس لە پیاوەکانی خۆی بخزێنێتە نێو لقی لێکۆڵینەوەو گشتپێدانی شەریکەی نەیارو بەم جۆرە لە گشت کارەکانی ئەولا ئاگادار ببوون. ● ئەگەر تەنیا ژمارەیەکی کەم لە کۆماندۆکانمان بیانتوانیبا رەخنە بکەنە نێو خەتی دیفاعیی دوژمن، ئێمکانی ئەوە هەبوو هێرشەکەمان سەرکەوێ
٧٥١٤/ 7250- **خۆئامادە کردن بۆ، ئامادە بوون بۆ، ئاوتەڵەب بوون بۆ:** ئەو بەشە لە خزمەتەکان کە ئەو خۆی بۆ ئامادە کردبوو لەپێش دا بەرادەی پێویست کارمەندیان هەبوو.
← دەورە دیتن.
٧٥١٥/ 117- **خۆئامادە کردن (لە بەرامبەر):** ئەرکی هەموو هاوڵاتی‌یەکە لە مەبەستی ئەو ئانارشیستانەی لەمێژەمان دادەڕژێن تێبگاو لە بەرامبەر بانگەشەی پیلانگێرانەیان خۆ ئامادە بکا.
٧٥١٦/ 6334- **(وەك پزۆڵ) خۆئامادە کردن:** بۆ ئەوەی لە تاقیکاری‌دا " احتمالا "رەت نەبنەوە، وەك پزۆڵی خۆیان حازر کردبوو.
٧٥١٧/ 2631- **خۆئامادە کردن، تاقەت هەبوون، تاقەت دانەبەرخۆ:** پێت وایە دەتوانی ئەوەندە تاقەت بدەیە خۆت کە ئەو نامانە دەگەڵ خۆت بەرێیە ئیدارەی پۆست؟

٧٥١٨/ 6681- **خواحافیزی کردن لە، لێجیابوونەوە، ڕۆیشتن ومرگرتن:** دەنگی تەپلانو، تەقەو تۆقان نیشانەی ئەوە بوو کە چیا بۆ خوداحافیزی کردن لە من کەیوەتەجێ.

٧٥١٩/ 7140- **خواربوونەوە بۆ لای ژێرەوە، خواربوونەوەو لێزیک بوونەوە لێک تر:** قامکی گەورەی پێی بۆلای ژێرەوە (بۆ لای قامکی چوارەمی) خوار بۆتەوە. * چۆکەکانی خواربوونەتەوەو لێک نزیک بوونەتەوە.

٧٥٢٠/ 7111- **(زۆر) خواردن، هەڵڕیشتن، لووشدان:** منداڵەکان بۆ خۆیان پوودنیگێکی چکۆلەی کریسمەسو دەوریەک کولیچەی قیمیان لوور دا.

٧٥٢١/ 4334- **(وردە وردە) خواردن:** پەنیرەکەیان دیسان لەسەر مێزی ئاشپەزخانە بەجێهێشتبوو، وردە وردە خواردبوویان- دیسانیش هەر مشلە.

٧٥٢١٠١/3025- **(لە رادەبەدەر) خواردن:** نیگابانەکان کە لە رادەبەدەر گۆشتو شەرابیان خواردبوو، بە هاسانی تێلە شکانو قەڵاکە زۆر زوو گیرا.

٧٥٢٢/ 1732- **خواردن:** ئەو وەختەی دەستی دەرۆیشت، نیوە مریشکێکو سالادی دەخواردو شەرابی سپیشی لەسەر دەخواردەوە/ بەسەرداد‌ەکرد.

٧٥٢٣/ 1976- **(زۆر باش) خواردن، هەموو... خواردن:** چێشتەکە زۆرەو بەشی هەموان دەکا، کەوابوو زۆرباش بخۆن.

٧٥٢٤/ 2597- **خواردن، خەرج کردن، بەفیڕۆدان، لە لەسەرزیدان:** دەڵێن ئەو پیارەیوە کاتێک لاو بوو سەروەتو سامانێکی زۆری بەفیڕۆ داو پاشماوەی ژیانیشی بە دەست تەنگیو هەژاری بەسەر برد.

٧٥٢٥/ 2794- **خواردن، قووت دان:** ژیلوان لەوە زۆر بە کەیف بو کە دەیدیت دەستاوی ژنەکەی واباش دەخوری.

٧٥٢٦/ .

٧٥٢٧/ 4743- **خواردن، شکار کردن، راو کردن، دانە بەر هێرشی خۆ:** کوند، بوونەوەری جەوەندە، بەتایبەتی مشکان دەخوا/ راو دەکا. * فڕۆکە بۆمب هاوێژەکان ستوونی ئاوارەکانیان دایە بەر هێرشی خۆیان.

٧٥٢٨/ 4883- **خواردن، هەڵڕیشتن، لووشدان، ئاودیو کردن:** نازانم چۆن دەتوانێ ئەو هەمووەی بخوا. * هەتا ئاوڕم داوە، شەش کێکی لوور دا.

٧٥٢٩/ 1975- **خواردن، هەڵڕیشتن:** ئەو دۆستانەی تۆ هەموو شتێکیان هەڵڕیشت. ئەوێ کەنگێ دەرۆن؟.

٧٥٣٠/ 1969- **خواردن:** ئەسیدسولفوریک ئەو جێگایانە لە ئاسنەکە دەخوا کە...

خواردن (زۆرباش) ← زۆر باش خواردن، خەرج کردن، ریشەی کەسێک دەرهێنان، ژیان بە، بەسەردا رووخان، هەڵڕیشتن.

٧٥٣١/ 1912- **خواردنەوە (ئاخرین دڵۆپ):** جانی دەبێ هەتا ئاخرین دڵۆپ شەرەکەت بخۆیەوە. دەنا ئیجازەت نادەین بۆ کایەکردن بچییە دەرێ.

٧٥٣٢/ 3729- **خواردنەوە (بە چاپەچاپ):** ئەو شیرەی دە دەوریکەت کردبوو خواردیانەوە.

← بە سەرەوەنان، بەرەو پاش بردنەوە.

خواردنەوە، خواردنەوە (رقیو قین) ← پێداکردن، زاڵ بوون بەسەر...دا، سەرکوت کردن.

خواردەمەنی بەشینەوە ← خێر کردن.

٧٥٣٣/ 7009- **خوار کردنەوەو بەتاڵ کردن:** سەتڵێکی زۆر کە بە زنجیرێکی درێژەوە هەڵوەسراون لە چاڵاوێ دێنەدەر، خواردەبنەوەو ئاوی نێوریان دەرژێتە نێو جۆگەلەکانی کشتو کاڵ.

٧٥٣٤/ 7007- **خوار کردنەوەو بەتاڵ کردن:** ئاشپەزەکە (کوپەلەکەی خوار کردەوەو) بالی ئاردەکەی دە تاوەکەی کردو دوو هێلکەشی تێکرد.

٧٥٣٥/ 7346- **خوارەو پێچەکە کردن بە فێو... دا:** بە ماتۆرسیکلێت دەچێتە سەرکارو لە کاتی رێبەندانی ترافیک دا بە نێو ماشێنان دا خوارەو پێچەکەی دەکا.

٧٥٣٦/ 6089- **خوازیار بوون، بە ئاوات خواستن:** لەو سەردەمەدا، زۆربەی پیارەکانی خاوەن هەلومەرجی شار خوازیاری ئەو کچە بوون.

٧٥٣٧/ 306- **خوازیاری... بوون:** دەزانم کە خوازیاری کارێکی بەڕێوەبەری لە بەشی خزمەتە گشتییەکانە.

خۆ بۆ هەڵگرتن ← خۆ لێخۆش کردن.

٧٥٣٨/ 1631- **خۆ بەدەستێوە دان:** کە تۆفەکە توندی کرد، شەپۆلە بە تەوژمەکانی دەریا یەک لە دوای یەک خۆیان بە کۆخەکانی کەنار دەریادا دەدا.

خۆ بە ئاور ئاگردا کردن یان دادان ← پەنا بۆ هەموو شتێک بردن.

٧٥٣٩/ 1658- **خۆ بەخت کردن بۆ:** ئەندامانی ئەنجومەنە ئایینییەکان هەموو ژیانی خۆیان بەختی خزمەت بە خودا کردوە.

٧٥٤٠/ 5099- **خۆ بە زل زانین:** ئەو لەو جۆرە کچانە نیە کە بە چوونەسەری پلەو پایەی لە خۆی دەرچێ؛ لەوانەش نیە

کە بۆ خاتری ئەو مەسەلەیە خۆی لە کچە پەرستارەکانی دیکە/ لە سیستەرەکانی دیکە بەمزلتر بزانێ.

٧٥٤١ 6975- **خۆ بەسەردا بڕین، خۆ بەسەردا سەپاندن:** هەستی بەوە دەکرد کە کچەکە دەیەوێ خۆی بەسەردا ببڕێ، چونکە خۆ تێهەڵقورتاندنەکانی زۆر لەوە زیاتر بوو کە واتایەکی دیکەی هەبێ.

٧٥٤٢ 4349- **خۆ بەسەردا سەپاندن، بە زۆرە ملی چوونەژوور:** خۆی بەسەر کۆمەڵەکە دا سەپاندن بوو، لە حالێك دا هیچ کەس لە هەبوونی ئەو دەگەڵیان خۆشحاڵ نەبوو.

← خۆ بەسەردا سەپاندن.

٧٥٤٣ 2191- **خۆ بە شتێك دانان، لە قەڵەمدان:** ئەو لە کارخانە سکرتێر بوو، بەڵام خۆی بە نووسەر دادەنا.

٧٥٤٤ 18- **خۆ بە شتێك راهێنان:** پیاوەپیرەکە وردە وردە بە ژیانی بێهاودەم خۆی راهێنا.

٧٥٤٥ 4379- **خۆ بە قەرزداری ... زانین:** بۆ چوونە سەری رادەی ناردنی شتومەك بۆ دەرەوەی وڵات، خۆمان بە قەرزداری هێزی کارو تێکۆشانی تاقمە فرۆشیارەکانمان دەزانین.

٧٥٤٦ 1613- **خۆ بە کارێکەوە خەریك کردن، خۆ خەڵاڵاندن:** خەری خۆی بەشتێکەوە خەریك کردبوو کە ناوی هونەری لەسەر دانابوو، هەتا بردیان بۆ سەربازیو لەوێ چووە بەشی جاسووسییەوە.

٧٥٤٧ 797- **خۆ بەهێز کردن ( لە باری بەدەنییەوە):** سەرەرای ئەوەش دەبێ ئاگات لە خۆ بێ، ئەسڵەن نابێ دەرهەق بێ. دەبی لەشت بۆ زستان بەهێز بکەی/ ئامادە بکەی.

٧٥٤٨ 3515- **خۆ پاراستن لە، رێگا لێدان بە، نەهێشتن، پێشگری کردن لە:** لە حالێك دا کە ئەوە خەریکی وردە وردە لە نەخۆشییەکەت چاك دەبیەوە، دەبێ لەخۆ تەرکردنو بەم زووانە چوونە سەرکار خۆت بپارێزی. * تکایە مەیەڵە منداڵەکان لە دەریایە مەلەی بکەن. لە قەراغێ شەپۆلی زۆر خەتەرناکی هەیە.

٧٥٤٩ 5263- **خۆ پاراستن لە:** تکایە هەتا کۆتایی هاتنی یارییەکە لە جگەرەکێشان خۆبپارێزن.

٧٥٥٠ 2588- **خۆ پاراستن لە، لادان لە:** ئەو پارێزەرە بەوە ناوی دەرکردووە کە بۆ خۆ لادان لە یاسا، بەتایبەت لە بواری تێکنیکییەوە، زۆر بەتوانایە.

٧٥٥١ 2336- **خۆ پاراستن لە، دەست هەڵگرتن لە:** ئەمە وشیار کردنەوەیەك بوو بۆ ئەوەی لە خۆ تێکەڵاوکردنێکی زیاتر لە کاروباری شەریکە خۆت بپارێزی.

٧٥٥٢ 8- **خۆ پاراستن لە، دووری کردن لە:** تکایە لە سیگارکێشان لەنێو رێستووران دا خۆ بپارێزن.

٧٥٥٣ 3574- **خۆ پاراستن لە، پاراستن لە، دوور کردنەوە لە:** لەماوەی شەری نێوخۆیی‌دا، دایكو بابەکان هەوڵیان دەدا منداڵەکانیان لە هەر چەشنە مەترسییەك بپارێزن: * بۆ گوزەراندنی تەحتیلاتەکەم/ بۆ پشوودانی ئەمساڵم ئەمجارە ئیسپانیا بۆ ئەوەی خۆم لە تاوی ئەو وڵاتە بپارێزم.

٧٥٥٤ 1227- **خۆ پاراستن لە دزۆ یان فریودانی خەڵك، دەست هەڵگرتن لە گوتنی ... بەس کردن:** "بەسە ئیدی پێت وانەبێ بەو قسە قۆڕانە باوەردەکەم".

خۆ پاراستن لە ( خواردنی...، خواردنەوەی...، کێشانی) ← پارێز کردن لە، دوورەپەرێزی کردن لە.

خۆ پاڵاوتن ← ئامزەد بوون، (خۆ دانان بۆ، خۆ کاندیدا کردن).

٧٥٥٥ 1627- **خۆ پێدادان، هێرش بردنە سەر، هەڵکوتانە سەر:** شەپۆلی هێزە پیادەکان ناهومێدانە هێرشیان دەبردە سەر دوژمنی دامەزراو لە نێو سەنگەران دا.

٧٥٥٦ 7260- **خۆ پێدادان، هێرش کردنە یان بردنە سەر، هەڵکوتانە سەر:** بە هەردووك دەستان خۆی بە کورەکەی‌دادا کە لە خۆی زەلام تر بوو. * ئەو دەستی لەسەر دەستی دانەنابوو، چاوەروانی ئەوە بێ کە هەموو کارەکان جێبەجێ بێ: راستەوخۆ هەڵی کوتایە سەری.

٧٥٥٧ 4573- **خۆ پێدادان، هێرش کردنە سەر، هەڵکوتانە سەر:** جان خۆی بە کابرای بەرەورووی دادا و هێندەی نەمابوو لە یەکەم هێرش دا بیخا. * نان حازرە: خۆی پێدادەنا.

٧٥٥٨ 4706- **خۆ پێدادان، بۆ لەوەر بوون، هێرش کردنە سەر، هەڵکوتانە سەر:** شێرو پڵنگ بۆ دەرفەتی لەبار چاوەروان دادەنیشنو، لە کاتی خۆی‌دا لەپڕ خۆ بە نێچیردادەن. * پارتیزانەکان لە هەردووك لای دۆڵە سەختەکەوە هەڵیان کوتایەسەر کاروانی ئەرتەش.

٧٥٥٩ 2839- **خۆ پێدادان بە، وێکەوتن:** دەبێ ماشینەکە بە سورعەتێکی یەکجار زۆرەوە خۆی بە دیواری ماڵەکەدادابێ.

← خۆ لە شتێك دان، هەڵکوتانەسەر. لێدان، تێبەردان.

٧٥٦٠ 1420- **خۆ پێرانەگیران، خۆرانەگرتن:** کاتێك تاتریەکیان (ئەسپێکی وردەڵەیان) دانێ، منداڵەکان بە زەحمەت خۆیان پێرادەگیرا (= لە خۆشیان حاڵیان نەبوو)، بەڵام ئەو هەمراو هوریا خۆشە زۆر زوو تەواو بوو.

٧٥٦١/ 5943- خۆپیشاندان بە دانیشتنەوە: ئەو تاقمانەی لایەنگری سەربەخۆیی کۆمەڵایەتی بوون، هەوڵیان دەدا خۆ پیشاندانی بە دانیشتنەوە وەربخەن.

٧٥٦٢/ 4581- خۆ پێکدادان، تەسادوف کردن دەگەڵ یەک: پاش ئەوەی گوێیان نەدا بەو هوشدارەی کە لە پێوەندی دەگەڵ هەبوونی مژ لەسەر جادەکان پێیاندرابوو، چەند ماشێن خۆیان پێک دادا بوو.

٧٥٦٣/ 4143- خوو پێگرتن، عادەت کردن، کردنە کاری هەموو رۆژێ: بەڵێ، فەرموو لە تەلیفوونەکە کەڵک وەرگرە، بەڵام مەیکە بە کاری هەموو رۆژێ. ● عادەتی کردبوو کە لەبەر پەنجەرە وەرزش بکا. ● عادەتی کرد بوو هەموو رۆژێ دوای نانی نیوەڕۆیە سەرخەوێکی بشکێنێ.

٧٥٦٤/ 19- خوو پێگرتن: هەلو مەرجی ئێرە بە چەشنێک نیە کە ئەو خووی پێ گرتووە.
→ خۆ تولاندنەوە لەبەر، کرنۆش بردنەبەر.

٧٥٦٥/ 2496- خۆتووشی دەردەسەر کردن، گیرەوکێشە بۆ خۆساز کردن، خۆ گرفتار کردن: ژیلران کە هاتبوو هاوکات دوو کچی بۆ بردنەدەر بانگ هێشتن کردبوو، خۆی تووشی دەردەسەر کرد.
→ خۆ گرفتار کردن.

٧٥٦٦/ 6198- خۆ تێ پەستاوتن، خۆ تێ هەڵقورتاندن: شانت وەرسووڕێنەو لاجەولاج خۆی تێراکە.
→ چوونە ژوور.

٧٥٦٧/ 4440- خۆ تێ هەڵگەیاندن بە هاواری کەسێکەوە لە چوون: خەڵکی وڵاتانی فەقیر هەر لەخۆتەو خۆڕایی دەمرن ئەگەر خەڵکی وڵاتانی دەوڵەمەند بە هاواریانەوە نەچن.
→ پشت تێکردن، لەبەرچاو نەگرتن.

٧٥٦٨/ 4280- خۆ تێ وەردان: خۆت لە کارێکی سەیر وەرداوە!.

٧٥٦٩/ 4220- خۆ تێهەڵسوون، خۆ قەیم لکردن لە لای: ئەو لەو جۆرە پیاوانە نیە کە پێیان خۆشە خەڵک خۆیان تێهەڵسوون..

٧٥٧٠/ 2498- خۆ تێهەڵسوون، هەوڵدان بۆ راکێشانی کەسێک بۆ لای خۆ: خانمی سکرتێر وەها سەرگەرمی خۆ تێ هەڵسوون لە سەرۆکی تازەی دایرە بوو کە ئەیدەزانی هەموو کارمەندەکان پێی پێدەکەنن.

٧٥٧١/ 2482- خۆ تێهەڵقورتاندن، پێوەنووسان: زۆرم هەوڵدا خۆ دەکچێکی جوان هەڵقرتێنم کە بە تەنیا لە گۆشەیەک دانیشتبوو، بەڵام، هیچ گوێی نەدامێ.

٧٥٧٢/ 1624- خۆ تێهەڵاویشتنەوە، دەرپەڕین: هەر کە گوێی لە دەنگی پێی باوکی بوو، خۆشەلاو خۆی هاویشتەوە نێو جێگاکەی. ● هەر کە دەرگای قوتووەکەی کردەوە مشکێک بۆی دەرپەڕی.

٧٥٧٣/ 6834- خۆ جوان کردن، ئارایش کردن زۆر خەست: پێموانەبوو ئاوا خەست خۆت جوان دەکەی، چونکە دەچینە میوانییەکی رەسمی نەک مەجلیسی هەڵپەرکێی خوێنداکاران.

٧٥٧٤/ 4749- خۆ جوان کردن، خۆ لە گوڵنیشاندان، خۆ رازاندنەوە: لە مێژە ژنان خەریکە هێندێکی دیکە خۆی جوان دەکا. پێویستیش نیە.
→ خۆ لە گوڵێدان.

٧٥٧٥/ 1772- خۆ جیا کردنەوە، دووری کردن لە، خۆ لە مەسەلەیەک کێشانەوە، خۆ دەرهاویشتن: سەرۆکی کۆبوونەوە خۆی و هاوکارەکانی لەو روانگەیە کێشایەوە کە لە راپۆرتەکەدا هاتبوو.
خۆ حەشاردان → خۆ شاردنەوە.
خۆ خافڵاندن → خۆ بە کارێکەوە خەریک کردن.
خۆ خوار کردنەوە → سەردەرهێنان (لە پەنجەرە).
خودا بە عومری نەنووسێ → (عامیانە) هەزار خۆزگە بە مەرگ.

٧٥٧٦/ 7491- خودا پێدان: خۆتان چاک داپۆشن؛ پێساو لە دەرێ دەیبەستێ.
خودا پێدان → هەبوون.
خودا خودا بوون → وەرەزی کردن.
خودا دانان بۆ → لەدایک بوون بۆ.
خۆدارشتن → قەڵەو بوون.

٧٥٧٧/ 3311- خۆ دەسە پاڵدان، خۆ بەسەردابڕین: ئەوان بۆ کەڵک وەرگرتن لە وەزعییەتی ئەو رۆژە هاتبوون؛ بەو مەبەستە کە خۆیان بەسەر زەماوەندی دووهەمین جاری ماری دابڕن.

٧٥٧٨/ 2821- خودا حافیز کردن، ئەمری خودا بەجێهێنان: بەستەزمانە، پیرە یوسف سەرەنجام ئەمری خودا بەجێدێنێ.
→ (بە تەعبیرێکی باشەوە) مردن.

٧٥٧٩/ 3553- خۆراگرتن لەبەرامبەر...دا: هێلین کێلیر کە زگماک زۆر خراپ کەم ئەندام بوو، سەرەڕای گەوگرفتێکی یەکجار زۆر خۆی راگرتو سەرەنجام بوو بە ئەندامێکی دەرس خوێندو بە کەڵکی کۆمەڵی خۆی.

خۆ دانواندن ← هەڵتروشکان.

٢٥٨٠/ 100- **خۆدانە ژێر کارێک، شان وەبەردان**: ئەگەر بە جیددی خۆ بدەنە ژێر ئەو کارە، زۆر زوو تەواوی دەکەن.

خۆ دزینەوە ← فیزماڵک دان، بە فێڵ و تەڵەکە خۆ رزگار کردن.

خۆ دوچاری دەردەسەر کردن ← دزڕاندن.

٢٥٨١/ 6226- **خۆ دوور خستنەوە**: کابرایەکی فەرماندار دەبێ جاروبار خۆی لە ئیش و کاری رۆژانە دوور خاتەوە بۆ ئەوەی لە پێوەندی دەگەڵ رووداوەکان روانگەیەکی باشتری هەبێ.

٢٥٨٢/ 3059- **خۆ دوور خستنەوە لە، دوور کەوتنەوە لە**: زۆر جار دیترلوە کچێک کە لە سەردەمی مێرمنداڵی دا زۆر لە دایکی نزیک بووە، بە هۆی گرتنی دۆستانی تازەوە و بەرینتر بوونەوەی ناسۆی وێستەو داخوازەکانی، لەمپێ لە دایکی دوورکەوتۆتەوە.

← دووره پەرێزی کردن لە.

٢٥٨٣/ 1587- **خۆ دوور خستنەوە لە خەڵک**: ژنێکی بەکجار سەیرە. گۆشەگیرە. وادیارە کە بە ئەنقەست خۆ لە خەڵکی دوور دەخاتەوە.

٢٥٨٤/ 6224- **خۆ دوور راگرتن**: خۆی دوور رادەگرێ و لێدەگەڕێ رووداوەکان یەک بە دوای یەک دا تێپەڕن.

← کشانەوە، هەڵاتن لەبەر.

٢٥٨٥/ 6500- **خۆ دە خزمەتی کارێک نان**: هیچ کەس ناتوانێ بێتە راهب مەگەر خۆی دەخزمەتی ئایینەکەی نێ.

خۆ دەرهاوێشتن ← خۆ جیا کردنەوە.

٢٥٨٦/ 3343- **خۆ دەکارێک وەردان، دەست هەبوون لە کارێک دا، دەکارێکەوە چوون، تێوەردان (ی کەسێک دەکارێک)**: بەشداری کردنت لەسەر جینایەتەدا خۆی لە خۆیدا شتێکی زۆر خراپە، بەڵام ئەوە کە دەتەوێ کابرایەکی بێتاوانیش تێوەردەی لە خەیاڵ دا ناگونجێ.

٢٥٨٧/ 1144- **خۆ دەکاری کەسێک هەڵقورتاندن، دەست دەکارێک وەردان، دەست تێوەردان**: کوڕەو یارەکەی سوێندیان خوارد رێگا نەدەن هیچ کەس و هیچ شتێک بێتە نێوانیان.

٢٥٨٨/ 4685- **خۆ دەکاری کەسێک هەڵقورتاندن، سەر تێوەردان، راکردن، بە دوای شتێک دا گەڕان**: لەنێو نامەکانی شەخسیی مندا لە چی دەگەڕێی/ بەدوای چ دادەگەڕێی؟

٢٥٨٩/ 3576- **خۆ دەکاری کەسێک هەڵنەقورتاندن**: ئەو ژنە هەرگیز فێر نەدەبوو کە خۆ لە ژیانی خسوسیی کوڕەکەی هەڵنەقورتێنێ، ئەگەرچی هەموو جارێش لەو شتانەی کە بۆی دەردەکەوت نارەحەت دەبوو.

٢٥٩٠/ 855- **خۆ دەکەسێک هەڵسوون، خۆشیرین کردن بۆ**: هەوڵ مەدە لەلای من خۆت شیرین بکەی. ئەمن زۆر لەوە دنیادیدەترم کە بەم چەشنە خۆ تێهەڵسوونانە فریو بخۆم.

٢٥٩١/ 45- **خۆ دەگەڵ ... راهێنان، راهاتن**: پێم وا نیە هەرگیز بتوانم خۆم دەگەڵ ژیان لەو جێگا دوورە پەرێزە رابێنم.

٢٥٩٢/ 1349- **خۆ دیاری کردن بۆ، ناوی خۆ نووسین بۆ، نامزەد بوون بۆ، خۆ پاڵاوتن بۆ**: ئەندامانی زانکۆ هەر بە دوو ساڵ جارێک بۆ هەڵبژێران بۆ ئەندامەتیی کۆڕی بەڕێوەبەریی پەروەردە و فێر کردن خۆیان دیاریی دەکەن/ دەپاڵێورێن.

خۆ دەگەڵ کەسێک رێک خستن ← وەک یەک بوون.

خۆ دەگێژاوی گیروگرفتان هاوێشتن ← خۆ گرفتار کردن.

خۆ دیاری کردن بۆ ← نامزەد بوون.

٢٥٩٣/ 2435- **خۆ راحەت کردن، خۆ رزگار کردن**: ئەمیدەتوانی سەرانسەری رۆژێ چاوەڕوان بێ لە حاڵێک دا کە دەیتوانی جانتاکەی هەڵگرێ و خۆی راحەت بکا.

٢٥٩٤/ 1822- **خۆ رازاندنەوە، خۆ لە کوڵنان**: دەیتوانی باشترین لیباسەکانی دەبەر کا و خۆ لە گەڵێ بدا، بچێتەوە ماڵێ و خۆی رانێ.

← خۆ لە کرلێنان.

٢٥٩٥/ 6268- **خۆ راگرتن لەبەرامبەر، دەوام هێنان لەبەرامبەر**: ئەم میزانەی لەسەر نووسین زۆر پتەو دروست کراون و بە تەواوی دیارە کە لەبەرامبەر کارلێکێشان دا باش خۆ رادەگرن.

٢٥٩٦/ 472- **خۆ راگرتن لەبەرامبەر**: لەبەرامبەر ناهومێدی و رووداوی کوتوپڕ چۆن خۆ رادەگرن؟

٢٥٩٧/ 473- **خۆ راگرتن، بە لەسەرەخۆیی گوێ راگرتن بۆ**: ئەو نە جەماڵی خۆش دەوێ و نە بڕوای پێدەکا، بەڵام ناچارە تەحەممولی بکا ئەگەر بێتوو بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەک گوێ بۆ قسەکانم راگرن، روونی دەکەمەوە.

٢٥٩٨/ 3281- **خۆ راگرتن، موقاوەمەت کردن**: بە تاقمەکە، کە بە هۆی هاتنەسەری ئاوی دەریا کەوتبوونە گەمارۆوە، راگەیەندرا کە خۆیان راگرن؛ بە زووترین کات یارمەتییان دەگەیەنن. ● لە چلمپۆیەی قەیرانی ئابووریدا، تەنیا کارێکی لە دەستیان دەهات ئەوە بوو کە خۆیان راگرن و هومێدوار بن هەلومەرجەکە بەرەو باشتر بوون بچێ.

٣٥٩٩/ 3596- خۆراگرتن (لەسەر ئاو): ئــەو مەلەوانانـەی کـە دەرچوو بوون بۆ ماوەی چەندین سـەعاتان خۆیـان راگـرت هەتا لۆتکەی نەجاتیان گەیشتن و سواری کردن.

← زیندوو مانەوە، تەحەممول بە خەرجدان.

خۆراگرتن لەسەر ← مانەوە لەسەر، کونترۆڵ کردن.

٣٦٠٠/ 5889- خۆ راپسکان، خۆهەڵداڵەوە: "ئـانلری، خۆرانـان بەسە/ هیچ کەس ناچێتەژێر تەنـەوتەوە".

← ژێست گرتن، خۆ هەڵکێشان، وانیشان دان.

٣٦٠١/ 982- خۆ ورد کردنەوە، ورد کردنەوە، گۆڕینـەوە (پـارەی وڵاتێـک بە هی وڵاتێکی تر): دەکرێ ئەم ٥٠ پێنی‌یەم بـۆ بگۆڕی‌یـەوە بە ٥ دانە دە پێنی؟ ● دەتوانی لە فڕۆکەخانە پوندەکـانت بە پارەی ئەو وڵاتە بگۆڕی‌یەوە.

٣٦٠٢/ 608- خۆ ورد کردنەوە، ورد کردنەوە، گۆڕینـەوە: نـاتوانم ئـەو چل سێنتەت بدەمەوە کە پێت قـەرزدارم، مەگـەم ئـەم ٥ پوندەی‌یە ورد کەمەوە. دەکرێ هەتا سبەینێ لێم‌راوەستی؟

٣٦٠٣/ 619- (گەماڕۆ، ئابلۆقە شکاندن و) خۆ ڕزگار کـردن پـان لـە ... کردن: ئەو لەشکرانەی لە ستالینگراد کەوتبوونە گەمارۆوە نەیاندەتوانی (گەمارۆیشکێنن و) خۆ رزگار بکەن.

٣٦٠٤/ 4811- خۆ ڕزگار کردن، چاک بوونـەوە: لـەمێژ سـاڵە کـە هەروا شکست دەخوار، ئێستاش بە هەموو تواناوە هـەوڵ دەدا خـۆی رزگـار بکـا (لـەو وەزعـە). ● بـەڵام، چـاک دەبێتەوە. ئەو، ئەو نەخۆشی‌یەی دەگەڵە، رەنگـە بزانـی، هەرگیز ساغ نەبووە.

← (بە فێڵ و تەڵەکە) گیرو گرفتێک لەخۆ دوور کردنـەوە، خۆکێشانەوە لە.

٣٦٠٥/ 1740- خۆ ڕزگار کردن لە دەستی: هەر کە بتوانین خۆ لـە دەست ئەو قسانە رزگار بکەین، هەموو قـەو باسـێکیش تەواو دەبێ.

٣٦٠٦/ 5833- خـۆ ڕزگـار کـردن لـە دەسـتی: فڕۆکـەوانی فڕۆکەکەمان بۆ ئەوەی خۆ لە چنگی فڕۆکە شـەڕکەرەکانی دوژمن رزگار بکـا، خـێرا خـۆی هاویشـتە نێـو کۆمەڵـە هەورێکەوە.

٣٦٠٧/ 2920- خـۆ (زۆر) زەحمـەتدان: بـۆ ئـەوەی یارمـەتیی دایکی بدا هیچ خۆی زەحمـەت نـەدەدا، تەنانـەت ئەگـەر لەبرسانیش مردبا.

← زەحمەت کێشان.

٣٦٠٨/ 2961- خۆ زەحمەت دان، وەخـۆ گرتنی دەردەسـەری، خـۆ بـە کارێکەوە خەریک کـردن: بـۆ ئـەوەی سـەرۆکی تـازەی ئیـدارە پێی‌خۆش بێ، ئەو ژنە زەحمەتی درێژ دادڕی‌یەکی زۆری بە خۆی دا، بەڵام کابرا دوای مانگێک تـەمێی کـرد (لەسـەر کار لای برد = وەدەری نا).

٣٦٠٩/ 118- خـۆ سـازدان: مـەحکووم کردنـی دەسـەـتدرێژی ناتوانێ بەس بێ؛ دەبێ لە بەرامبەر دەستدرێژی‌دا خۆمـان بە تۆپ، کەشتی و فڕۆکە تەیار کەین.

٣٦١٠/ 3347- خۆ سەپاندن بەسەر کەسێک دا: لەبـەر ئـەوەی کـە هەتا ئێوارە قەتار نەبوو، ناچار بـوو زیـاتر لـەوە کـە لـە نەزەری دابوو، خۆی بەسـەر خانەخوێ‌یەکەی دا بسـەپێنێ.

← هاتنە نێو.

٣٦١١/ 4988- خۆ شاد نیشاندان: خۆش بینی‌یـەکی ئـەوتۆ لـە ئارادا نیە، بەڵام هەر دوولا لە وتووێژەکان دا خۆیان شادو بە کەیف نیشان دەدەن.

٣٦١٢/ 3607- خـۆ شـادو بـە کـەیف نیشـاندان (بـە تایبـەتی لـە هەلومەرجێکی دژوار دا)، لـە خۆ نیشـان کـردن لـە بەرامبـەر هـێز و زەختی ناڕاستە و خۆدا: تەنانەت کـاتێک گـرارێج بەسـەرهاتە سەیرو سەمەرەکانی دەگێڕاوە کە ببوونە هـۆی ئـەوە کـە نەگاتە قەتاری، ئەو هەروا خۆی شادو بـە کـەیف نیشـان دەدا.

٣٦١٣/ 3913- خـۆ شـاردنەوە، خـۆ حەشـاردان: لەسەرانسـەری شەرەکەدا هیچ کەس نەیدەدیت. پێم‌وایە لەنێو کێوان خۆی حەشار دابوو.

٣٦١٤/ 2028- خـۆ شـاردنەوە، خـۆ حەشـاردان، چوون دەپەسـڵاوە: پیاوە پیرە، هەروەک هەمیشـە، لـە گۆشـەیەکی مەیخانـە خۆی حەشار دابوو (= بە چەشـنێک کـە کـەمتر کەسـێک بیبینێ).

٣٦١٥/ 3303- خـۆ شـاردنەوە، خـۆ حەشـاردان: تاقمەکـە لـەنێو کێوان دا خۆیان حەشار داوە. ● لە یەکێک لە مرتیلـەکان دا خۆی شاردبووە.

٣٦١٦/ 3251- خۆشاردنەوە، خۆ حەشاردان: لە جیاتی ئەوەی بـە دیل بگیرێن، بەشی زۆری ئەرتەشەکە خۆیان لەنێو کێوانو دارسـتانان دا شـاردەوە. ● تـاقمی جینایـەتکارەکان گەڕانەوە حەشارگەی نهێنیی خۆیان لە "مەجبوورناوا".

٣٦١٧/ 2968- خۆ شاردنەوە لەژێر ئەرزدا، خـۆ حەشـاردان، ژێـر ئـەرز بوون: کاتێک بەرپرسی تاژی‌یەکان دیتی کە نیچیرەکە خۆی لـەژێر ئـەرزدا حەشـارداوە و تاژی‌یـەکانیش شـوێنیان ون کردووە، بەرنامەی راوەکەی هەڵوەشاندەوە.

(یەکجار) خۆش بوون ← سەرکەوتووبوون.

خۆشبین بوون ← ورەی خۆ بەرز راگرتن، هومێدەوار بوون.

٣٦١٨/ 3978- **خۆشتر کردن:** چەندەی پێ‌خۆشە شەرقەو زەوقێکی زیاتر بدا بە هەموو شتێك! ● ئەگەر دەستێکی دیکە کار بکەن، ئیدی شەوەکەمان بێ ئەندازە خۆش‌تر دەبێ.

٣٦١٩/ 6987- **خۆشحاڵ بوون، پێخۆش بوون (یەکجار زۆر):** کاتێك کە بیستم ژنەکەی دەرگای لێ‌نەکردۆتەوەو هەتا بەیانی لەسەرمان هەڵەرزیوە، یەکجار زۆرم پێ‌خۆش بوو، بەڵام پێم وانیە بۆ خۆی پێی‌خۆش بووبێ.

٣٦٢٠/ 812- **خۆشحاڵ راگرتن، شاد راگرتن، شاد بوون:** فکری ئەوە کە وێدەچوو بتوانم ژن بێنم، خۆشحاڵی راگرتبووم/ کردبووم.

خۆ رانەگرتن ← خۆ پێرانەگەیان.

خۆ راهێنان بە ← خۆراگرتن بە.

خۆ راهێنان ← مومارەسە کردن.

٣٦٢١/ 4527- **خۆشحاڵ بوون، کەیف ساز بوون:** زۆر خەمبار بوو، بۆیە پێشنیارم کرد هێندێك لە پارەکە خەرج بکا. بەو پێشنیارە کەیفی ساز بوو.

← کەیف ساز بوون.

خۆشحاڵی دەربڕین ← شانازی کردن.

٣٦٢٢/ 4432- **خۆش رابواردن، یان بەسەر بردن:** شەوەکەی بە تەماشا کردنی کۆلێکسیۆنی تەمرەکانی/ مەجموعەی پووڵەکانی، بە خۆشی رابوارد.

٣٦٢٣/ 3974- **خۆش رابواردن یان گوزەراندن:** لە لەندەن بووو، بەو پووڵانەی کە لە گرێو کردنەکانی لەسەر یارییەکانی فووتباڵ دەیبردنەوە، زۆر خۆشی رادەبوارد.

٣٦٢٤/ 4861- **خۆش رابواردن:** لەبیرتە ئەو شەوەی عینوانی قارەمانی‌مان سەر لەنوێ بردبووە چەندە خۆشمان رابوارد؟

← کات بە خۆشی تێپەڕ کردن.

٣٦٢٥/ 4524- **خۆش کردن، سەرخۆش کردن:** پێم وایە ئەوانە خەیارشوور بن، راست ئەو شتەی کە ئەوانە دەیانەوێ بۆ ئەوەی خواردەمەنییەکانیان خۆشتر بکا.

٣٦٢٦/ 6390- **خۆش کردنی ئاگری دژایەتییەك، توندوتیژ کردن:** بە هۆی ئەوە کە دوژمنایەتیی نێو ئەتەوان توندو تیژ دەکا، لۆمەی دەکەن.

خۆش کردن ← بوون بە تاور ساو.

خۆش لە شتێك هاتن ← پێخۆش بوون.

خۆش نەهاتن لە ← بە ناحەز لە قەڵەمدان.

٣٦٢٧/ 1066- **خۆ شوشتن (و لیباسی خاوێن لەبەر کردن)، حەمام کردن:** "دەچمەوە ماڵێ خۆم دەشۆم".

← حەمام کردن.

٣٦٢٨/ 3641- **(لە رابردوودا) خۆش ویستن و لە ئاقاردا زیاتر پێگەیاندن:** بە بڕوای ئەو، بۆ ئەوەی ژنێکی باش‌و دایکێکی چاك بێ، میزەکەی پڕپڕ دەکرد لە خواردەمەنی. بەڵام بە هۆی ئەوە کە چێشتەکانی زۆرتر نیشاستەو زۆریش چەور بوون، بەکردەوە دوژمنایەتی دەگەڵ دەکردن (وەك خاڵە ورچە رەفتاری دەگەڵ دەکردن).

٣٦٢٩/ 3146- **خۆش ویستن، پێخۆش بوون، پەسند کردن:** بەڵێ ئەو کچەی خۆش دەوێ. ئەو هەمیشە ئەو کیژۆڵە ئەسمەرانەی کە پێویستی‌یان بە چاودێری هەیە خۆش ویستووە.

٣٦٣٠/ 7306- **خۆش ویستن:** هەستم بەوە دەکرد کە ئەو پیاوە زەلامەم خۆش دەوێ کە ئەو هەمووە یارمەتی‌یەی دابووین.

٣٦٣١/ 6775- **خۆش ویستن، تەماح تێکردن:** لە بەندیخانەی، کابرایەکی سەگباب تەماحی تێ‌کردبوو.

٣٦٣٢/ 1827- **خۆش ویستن، رووداز بە، ئاواڵەوە:** زۆرتر منداڵە چکۆلەکەیان خۆش دەوێ‌و، ئەوانی گەورەش ئێرەیی پێ‌دەبەن.

٣٦٣٣/ 909- **خۆش ویستن، خۆش لێهاتن، پێ‌جوان بوون، حەز لێکردن:** ئەتۆ هێلێنات خۆش ناوێ، دەتەوێ؟ ● پەردە تازەکانم پێ‌جوان نین/ بەدڵ نین.

خۆش ویستن یان خۆشەویستی نیشان دان بە ← بەگەرمی پێشوازی لێ‌کردن، وەبەردڵ کەوتن، پەسند کردن.

خۆشبین کردن بۆ، لاسەلاسم کردن بۆ، خۆشبین کردن لەلای ← خۆ تێهەڵسوون.

٣٦٣٤/ 2013- **خۆشەویست کردن:** ئەوە کە دەیڵێتە نێو قسەی خەڵك لەلای هیچ کەس خۆشەویستی نەکردووە.

٣٦٣٥/ 3375- **خۆشبین کردن لەلای، کلکە سووتە کردن لەبەر کەسێکیشدا بۆ:** پیاو وەخت بوو لە حەیفان بتەقێ کاتێك هۆمەری لاومان دەدی کە چۆن لەبەر پرۆفیسۆردا کلکەسووتە دەکا: ئەوە لە حاڵێك دابوو کە بۆ خۆشی، هەروەك ئێمە، باش دەیزانی کە پرۆفیسۆر چەندەی قین لێ‌یەتی.

← خۆ تێهەڵسوون.

خۆ عادەت دان بە ← خوو گرتن بە.

٣٦٣٦/ 5705- **خۆ فرۆشتن بە دوژمن:** باسی کەسانێکیان دەکرد کە خۆیان بە دوژمن فرۆشتبوو.

٣٦٣٧/ 2886- **خۆ فرۆشی کردن، گلاندن:** پێش ئەوەی هێندێك ناڵۆ گۆڕ لە یاسا دا پێك بێ، جندەکان بە کردەوە لە شەقامەکان دا خۆیان دەفرۆشت.

خۆ فریودان لە ← دەربەڕین لە.

خۆ قایم راگرتن ← توند گرتن.

٣٦٣٨/ 5537- **خۆ کاندیدا کردن، خۆ دیاری کردن بۆ، خۆ پاڵاوتن بۆ:** دوای ئەوە کە ئایزنهاوێر لە ئەرتەش بازنشستە/ تەقاعود بوو؛ بڕیاری دابوو ببێتە کاندیدای سەرۆك کۆماری.

خۆ کردنە قوربانی ← گیانی خۆ بەخشین.

٣٦٣٩/ 5900- **خۆ کرۆشم هەڵێنان:** عادەتی وابوو کە کاتێك خەڵك چاویان لێدەکرد، خۆی کرۆشم هەڵدێنا.

٣٦٤٠/ 3317- **خۆ کرووشم هەڵێنان:** منداڵەکان لەسەر کۆگایەك لە کۆنە جانتایان خۆیان کرووشم هەڵێنابوو.

← گنج بوون.

٣٦٤١/ 481- **خۆ کوشتن، مێشکی خۆ پرش و بڵاو کردن:** هیچ شتێك نیە رێگای کەوتنەخوارم لە قاتی سەرەوە بۆ خوارێ و لێك بڵاوبوونی مێشکم لەسەر ئەرزی بگرێ.

٣٦٤٢/ 530- **(بە دەمانچە لە سەری خۆدان و) خۆ کوشتن:** کاتێك ژنەکەی بە جێی هێشت، پیتر هاتەسەر ئەو باوەڕە کە بێجگە لەوە کە خۆی بکوژێ، هیچی بۆ نەماوەتەوە.

٣٦٤٣/ 4106- **خۆ کوشتن، بە ئیهانی خۆکوژانی هێنان:** 'دایە، پێت وایە ئەو کچە بۆ کوشتنی خۆی هیچ ئەنگیزەیەکی بووبێ؟'.

٣٦٤٤/ 1910- **خۆ کوشتن بە خواردنەوەی مەشرووب:** خۆ کوشتن لە وڵاتی پورتەغال زۆر هاسان، هەرزانو خۆش دەبێ.

٣٦٤٥/ 1630- **خۆ کوشتن، مێشکی خۆ پژاندن:** یەکێك لە گاردەکان بە گۆزاڵێکی کە بە دەستیەوە بوو مێشکی خۆی پژاند.

← کوشتن.

٣٦٤٦/ 6064- **خۆ کۆ کردنەوە پێك خڕ کردنەوە:** منداڵەکە بە بوو کەکەیەوە لەنێو جێگادا خۆی خڕکردەوەو زۆو خەوی لێکەوت.

٣٦٤٧/ 4828- **خۆ کونترۆڵ کردن، ئاگا لەخۆ بوون، ساری:** کوڕە پیتێر، ئاگات لە خۆبێ.

پیتێر: لێم گەڕێ!

← بەسەر ئەعسابی خۆدا زاڵ بوون.

٣٦٤٨/ 4137- **خۆ کەم کردن:** ئاڵفرێد زۆر وشیارو لەسەرەخۆ بوو کە ئەمن بۆ خۆم لێی دەترسام. وەها دەهاتەبە بەرچاو که بە هیچ جوورێك ئیستعدادی ئەوەی نیە خۆی کەم بکا.

٣٦٤٩/ 4372- **خۆ کێشانەوە، بەشداری نەکردن (لە بڕیارێ دانێ دا):** خۆکێشانەوە لەو کاتە ئەستەمەدا، بۆ داکۆکی لێکردن نابێ.

٣٦٥٠/ 575- **خۆ (لە کارێك) کێشانەوە، دەست (لە کارێك) هەڵگرتن:** بەم جۆرە، سێرهارولد، پاش دەورەیەکی سەرکەوتووانە لە بڵاو کردنەوەی بەرنامەکانی رادیۆدا، خۆی لەکار دەکێشێتەوە.

٣٦٥١/ 3113- **خۆ کێشانەوە، دوور پەرێزی کردن، لە ئێکەڵاو بوون دەگەڵ خەڵك خۆ پاراستن:** کاتێك مەئمووڕانی پۆلیس بۆ پرسیار کردن هاتن، پیتەر (لە ترسانو لەبەر لەروو هەڵنەهاتن) دوورەپەرێزی کرد. • منداڵێکی کەنارەگیرە. هەمیشە خۆی لە چالاکیەهەرەوەزیەکان دوور رادەگرێ.

٣٦٥٢/ 1425- **خۆ کێشانەوە، کشانەوە لە:** سەرەنجام بڕیارم داوە کە کارێکم بە گەڵاڵەکەتان نیێ؛ دەکشێمەوە.

٣٦٥٣/ 1754- **خۆ کێشانەوە لە، خۆ رزگار کردن لە:** دوگۆڵ بەو ئاواتەوە بوو کە فەرانسە لە بەسترانەوە بە ئەمریکا لەباری سەربازیەوە رزگار بکا.

٣٦٥٤/ 5331- **خۆ کێشانەوە لە، ئیستیعفادان لە، ئیستیقالە کردن/ دان لە:** ئەو لە کارەکەی/ بەرپرسایەتیەکەی خۆی وەك سکرتێری هەمیشەیی ئیستقالەی کردووە.

٣٦٥٥/ 5645- **خۆ کێشانەوە لە، کشانەوە لە، چوونەدەر:** دوو کەس لە قارەمانەکان بە هۆی هەڵدرانی ماهیچەی لاقیان، لە رقەبەری/پێشبڕکێی غاردانی دەهەزار میتر خۆیان کێشاوەتەوە.

٣٦٥٦/ 6236- **خۆ کێشانەوە، کشانەوە، دەست هەڵگرتن:** ئەگەر ئاڵفرێد ئەو بەرپرسایەتیە داوا دەکا، من دەکشێمەوە. • سکرتێری گشتی پێشنیاری کردووە بە قازانجی یەکێکی گەنج بکشێتەوە.

← ئیستقالەدان، دەست هەڵگرتن لە.

خۆ گرتنەوە ← هاتنەوە سەرەخۆ، چاك بوونەوە، هەستانەوە (سەرپێ).

٣٦٥٧/ 3800- **خۆ گرفتار کردن، گێچەڵ کڕین بۆ خۆ، خۆ تووشی دەردەسەر کردن، خۆ دەگێژاوی گیرو گرفتان هاویشتن:** واوێدەچێ کە خەریك بی خۆت تووشی خراپ ترین گیرۆگرفتی ئابووری بکەی. • ئەو گیرو گرفتانەی بۆ خۆی پێك هێناون، قەت تەواو نابن.

٣٦٥٨/ 2938- **خۆ گرفتار کردن به ...:** دەوڵەت ئەگەر بە نرخی لەنێو چوونی سنعەتی رەزی بەرد بیەوێ خۆی بە تەواوی گرفتاری سروتەمەنیی ناوکی/ئەتۆمی بکا، کارێکی زۆر گەرانە دەکا.

٣٦٥٩/ 2637- **خۆ گرفتاری شتێک کردن، خۆ دەرگیری شتێک کردن:** بەراستی ژیلوان ئەمجارە خۆی گرفتاری چ شتێک دەکا؟

← خۆ تووشی دەردەسەر کردن.

٣٦٦٠/ 4060- **خۆ گەرم کردن، بەدەنی خۆ گەرم داهێنان:** پێش دەست پێکردنی یارییە ئەسڵییەکە، بە چەند حەرەکەتی سووک بەدەنی گەرم داهێنا.

٣٦٦١/ 3928- **خۆ گەرم کردن، داهێنان (بۆ وەرزشی قورس):** هەمیشە پێش یارییەکانی دوای نیوەڕۆ، بەدەنی گەرم دەکا.

خۆ گەیاندنە... ← حازر بوون لە، هاتنە مەیدانێ.

خۆ گێل کردن ← چاوپۆشی لێکردن، خۆ لادان لە.

٣٦٦٢/ 4437- **خۆ گێل کردن و بە هێند نەگرتن:** ئەگەر خۆ لە گیرو گرفتان گێل کەی و بە هێندیان نەگری، لە کۆڵت نابنەوە.

٣٦٦٣/ 474- **خۆ گێل کردن:** ئەگەر هەواڵی خۆشت پێن خۆت گێل مەکە، راست بڵێ چن، خۆ گێل کردن بێفایدەیە.

٣٦٦٤/ 4452- **خۆ لادان لە ...، هەڵاتن لە ... خۆ گێل کردن، خۆ لە کووچەی عەلی چەپ دان:** تەنانەت ئەگەر کەسێکیش مەسەلەی سوخنەرانی/ وتاردانی هێنابا گۆڕێ، ئەو بە هاسانی خۆی لێ گێل دەکرد.

٣٦٦٥/ 6819- **خۆ لادان لە بابەتێک:** هەرچەندە دیسانیش هەڵم خەڵەتێنی، نامەوێ خۆ لە مەسەلەکە لادەی. دەمەوێ قسەی لەسەر بکەم.

٣٦٦٦/ -

٣٦٦٧/ 804- **خولانەوە، گەڕان و خۆ خافڵاندن:** پێم وایە دەیەوێ هەروا بێکار بخولێتەوە و هەتا پارەشی لێبڕا، لە دایک و باوکی بستێنێ.

٣٦٦٨/ 5433- **(بێکار، بێکار) خولانەوە، بەم لاو لەولادا سووڕانەوە:** هەمیشە پیاوێکی بێکار بووەو هەمیشە بەم لاو بەولایدا بێکاردەخولێتەوە. جارجار کارێکی کاتی دەدۆزێتەوەو هەرگیز دانامەزرێ.

٣٦٦٩/ 4705- **خولانەوە، پیاسە کردن، گەڕان:** ئەمڕۆ بۆی دەحەسێمەوە. رەنگە بچمە نێو باخچەی کەمێک بخولێمەوە.

٣٦٧٠/ 4272- **خولانەوە، لێک ئاویشتن، سەرگەردان بوون، لێهەڵاتن:** ئەو کچانەی زۆرتر هاتبوون لە داڵانەکەدا دەخولانەوە. * خەیاڵاتی ئاڵۆز بالۆز دە مێشکیدا لێک دەهاڵان.

٣٦٧١/ 3999- **خولانەوە:** ئەرێ ئەو کابرایەی لە دەرەوە دەخولێتەوەو گومان لێکراو دێتەبەرچاو کێیە؟.

٣٦٧٢/ 3982- **خولانەوە، سووڕانەوە:** وادیارە کە دایک و بابەکان کاتێک کوڕو کچە مێرمنداڵەکانیان دەبینن دەستیان دەگەڕێ فانیان ناوەو بێکار بێکار دەخولێنەوە، زۆر تووڕە دەبن.

٣٦٧٣/ 2377- **خولانەوە:** بەم جۆرە کە خۆشناوە دەخولێتەوە، نازانم چۆن دەتوانێ لە تاقیکاریی کۆتایی ساڵ دەرچێ.

٣٦٧٤/ 6005- **خولانەوە (بە بێحاڵی و تەمبەڵی):** هەوڵم داوە کە ئەو کوڕە بەوە رازی کەم ماڵەکە دیکۆر بکا/ برازێنێتەوە، بەڵام تەنیا کارێکی دەیکا ئەوەیە بە بێحاڵی بخولێتەوەو، هەر دەمەی دەست بۆ وردە کارێک بەرێ و هەرگیزیش بە کارێکەوە نەنووسێ.

٣٦٧٥/ 3074- **خولانەوە:** 'دیکە بەرازێک لەبەر دەرگای باخچەکەمان دەخولایەوەو حازر نەبوو لەسەر رێگاکە رەلاچێ.، 'ئەدی دایکت لەکوێیە؟ رەنگە لەنێو سەوزەجانە یان جێگایەکی دیکە خەریکی خولانەوە بێ.

← دەور لێدان، هاتوچۆ کردن، بەدفەڕی کردن.

خۆ لەبەر راگرتن ← لە عوودە هاتنەدەر.

خۆ لەبەر هەڵکردن ← زمانلووسی کردن بۆ.

٣٦٧٦/ 4941- **خۆ لە جێگای کەسێک دانان:** خۆت لە جێگای ئەو دانێ. ئایا لەو هەلو مەرجەدا ئەتۆ بای بە جۆرێکی دیکەت رەفتار دەکرد.؟

خۆ لە خەڵک دوور خستنەوە ← گۆشەگیری کردن.

← خۆ لە...دان ← بوون بە.

٣٦٧٧/ 5753- **خۆ لە دەستی شتێک رزگار کردن یان راحەت کردن، وەلانان:** لەو وتووێژانەدا خۆیان لە دەستی هەموو تەشریفاتێک رزگار کرد.

خۆ لەسەر پێراگرتن ← وەنەوزی نەکەوتن.

٣٦٧٨/ 4986- **خۆ لەسەر گرتن، ژیست لەسەر گرتن، پۆز لەسەر لێدان:** دیار بوو کە ئەو کچە بۆ چیای زۆر باش بوو، بۆیە ئەدەبووایە چیا خۆی لەسەر بگرێ/ پۆزی لەسەر لێدا.

٣٦٧٩/ 1626- **خۆ لە شتێک دان، خۆ بە شتێک دادان، وەشتێک کەوتن:** تانکیرەکە بە گوشارێکی وەها زۆرەوە خۆی بە

تەپزلکەیەکی دەریایی دادا کە لاتەنیشتی قەڵشێکی گەورەی تێبوو.

خۆ لە کاران دانەو نەدان ← بە پارێزەوە بۆ کاران چوون.

خۆ لە کار کێشانەوە ← مانگرتن، بازنشستە بوون.

٣٦٨٠/ 4341- **خۆ لە کاری خەڵك هەڵقورتاندن، دەم لە کاروباری خەڵك وەردان:** بریا بمتوانیبا نەهێڵم هێندە خۆی لە کاروباری خەڵکی وەردا. نازانم لێرە چ دەکا.

٣٦٨١/ 6383- **خۆ لە کەسێك نزیك کردنەوە، بە کەسێکەوە نووسان:** خۆ لە حیزبێك نزیك بکەوە کە دەزانی دەتوانی بەقای پێ بکەی.

٣٦٨٢/ 2706- **خۆ لە گۆڵ نیشاندان، رازاندنەوە:** 'دایە، ئەوە بۆ ئەمشەو هەموروتان خۆتان لە گوڵ داوە؟'. 'بێدەنگ بە!'.

٣٦٨٣/ 2625- **خۆ لە گوڵ نیشاندان، خۆ رازاندنەوە، خۆ جوانکردن، لیباسی جوان لەبەر کردن:** رەنگە ئەو کچە زۆر جوان نەبێ، بەڵام بەراستی دەتوانی زۆر باش خۆی برازێنێتەوە.

٣٦٨٤/ 6179- **خۆ لە گوڵ نیشاندان، خۆ قەشەنگ کردن:** بڕیارم دا بچمەوە ماڵێ و جلکی جوان دەبەر کەم/ خۆم لە گوڵ دەم. هەتا هەموو کەس بزانێ ژیان بە چۆکی دا نەهێناوم.

← خۆ رازاندنەوە، خۆ لە گوڵێدان.

خۆ لە مەبلەغێك دان ← هەڵگرتن.

خۆ لێ دزینەوە ← هەڵاتن لەژێر.

خۆ لێکدان ← رێك کەوتن.

خۆ لێ گۆڕان ←لەخۆ بایی بوون.

خۆ لێ گێل کردن ← چاوپۆشی لێکردن.

خۆ لێدان ← رابردن و خۆ لە کەسێك دان.

٣٦٨٥/ 5755- **خۆ لێخۆش کردن، لێ تێژ کردن، خۆ بۆ هەڵگرتن:** بەخیلیت پێ دەبا، دەزانی، ئەوەیی بە هەموو ئەو چاکانەی دەگەڵت کردووم. بێگومان خۆی لێخۆش کردووی/ لێی تێژ کردووی.

٣٦٨٦/ 6227- **خۆ لێ لادان، لەبەر هەڵاتن:** رتوورێژەکان یەکجار گرنگ بوون. بۆیە نەیدەتوانی خۆیان لێ لادا.

← لەبەرچاو نەگرتن، لەبەرهەڵاتن، بایخ پێنەدان، دووری لێکردن.

خۆ لێ نەدان ← دوورە پەرێزی کردن لە.

٣٦٨٧/ 7370- **خۆ لێ ون کردن:** لە مەیدانی پێشبڕکێی ئەسپ سواران دا هەرگیز دەگەڵ دەلالە چکۆلەکان مەرج مەبەستن/ گرێو مەکەن، چونکە دوایە خۆت لێ ون دەکەن.

٣٦٨٨/ 7494- **خۆ لێهاڵاندن:** گیاپێچووکە خۆیان لە داربەستەکە/ قاپەکە هاڵاندبوو.

خۆ مات کردن ← هەڵتروشکان.

٣٦٨٩/ 3125- **خومار بوون:** دوای میوانییەکەی شەوی رابردوو، یەکجار خومارە. ● ئەمڕۆ بەیانی بە حاڵەتێکی خوماریی یەکجار خراپەوە لە خەو هەستام.

٣٦٩٠/ 181- **(بە خۆرایی) خۆ ماندوو کردن، ئەو دەمێژینگ کردن:** مەگەر نابینی کە ئەو هەر نایەوێ پارەکەت بداتەوە؟ بە خۆرایی خۆت ماندوو دەکەی.

٣٦٩١/ 6798- **خۆمانە رەفتار کردن، بزووتنەوە دەگەڵ کەسێك:** دەگەڵ دایکە پیرەکەم خۆمانە رەفتار مەکە. با کەمێك رێزی ئەومان لەبەربێ.

٣٦٩٢/ 7483- **خۆ ناڕەحەت کردن بۆ، بۆ کەسێك بە پەژارە بوون، غەمی کەسێك خواردن:** بۆ کچە گەورەکەی ئەوەندە خۆی سەغڵەت دەکا کە نەخۆش دەکەوێ.

← ناڕەحەتی دەربڕین.

٣٦٩٣/ 3071- **خۆ ناسین، بالغ بوون، گەورە بوون:** ئەگەر گەورە بووی دەتەوێ ببییە چی؟ دەمەوێ ببمە پەرستار/ سیستەر. ● سارا تەنیا ١٥ ساڵ تەمەنیەتی، بەڵام زۆر سەیرە بەو بڕواو رەفتارو ئاکاری وەك بەساڵداچووان دەچێ.

← بالق بوون.

خۆ ناسین ← بالق بوون.

خۆ نامزەد کردن ← خۆ دانان بۆ.

خونچە کردن ← گرێ کردن.

٣٦٩٤/ 4194- **خۆ نزیك کردنەوە لە:** ئەگەر لە خۆ نزیك کردنەوە لە کچەکەم دەست هەڵگری، خۆشحاڵ دەبم.

٣٦٩٥/ 6066- **خۆ نوقمی شتێك کردن:** لە ماوەی سەردانە درێژخایەنەکانی لەو هاوینەدا، خۆی نوقمی داب و نەریتەکانی خەڵکی ناوچە کردبوو.

٣٦٩٦/ 4823- **خۆ نەدۆڕاندن، خۆ ون نەکردن، خۆ کۆنتڕۆڵ کردن:** سەرکەوتن و تێشکانی زۆری دیبوو، بەڵام هەرگیز خۆی نەدۆڕاند بوو و رۆژگارێکی خۆشی رابواردبوو.

٣٦٩٧/ 1139- **خۆ نیشاندان، خۆ نواندن:** هارۆڵد ئەو هارۆڵدەی بە کەیف و باوەڕ بە خۆی ساڵۆنی کۆنفرانس نەبوو. بەڵام هەوڵی دەدا خۆیەك بنوێنێ.

٣٦٩٨/ 4444- **خۆ نیشان دان، ناوی ... لەسەر دانان:** چاوی لە کۆگایەك خرتەو پرت کرد کە ناوی چینییان لەسەر

دانـابوون. * لـەلای خـەڵکی ئـەو شـارە چکۆلـەیـە وەك پیاوێکی خاوەن دەسەڵات خۆی نیشان دابوو.

٣٦٩٩/ 6069- **خووسان، جێگای وشك ددان بوون:** ئەو شـەوەی کـە لە مەزرایـە خـەوتبوون، ڕێژنـە بارانـێـك خووسـاندنی/ وەهای تەڕ کردن کە جێگای وشکیان ددانیان بوو.

٣٧٠٠/ 6068- **خووسان، تەڕ بوون:** لەوێ ڕامەوەستن: تەڕدەبن.

٣٧٠١/ 6067- **خووساندن و لێکردنەوە:** لە جیاتی ئەوە ڕەنگەکە لەسەر کاغەزەکە بـدەی، باشـترە کاغەزەکـە بخووسێنیو لێی بکەیەوە.

خووگرتن بە ← بارهێنان. ڕووکردنە کارێك. فێر(ی "مواد مخدر") بوون، فێربوون.

٣٧٠٢/ 2835- **خوو گرتن بە، بە ڕێکەو پێکی لە (جاملدان):** مـن لـەو جۆرە کەسانە نیم کە بە بەرنامەیەکی ڕێکەو پێـك دەخـۆن (ڕێژیم دەگرن). ئەمن خواردەمەنیم یەکجار پێ خۆشە.

٣٧٠٣/ 2675- **خوو گرتن بە، عادەت گرتن:** بـە خـۆ هەڵکێشـان سەبارەت بە شاکارەکانی لە زەمانی شەڕدا خووی گرتووە.

٣٧٠٣/٢٠١- 3433- **خوو گرتـن بـە، ڕاهـاتن بـە، خووپێهێنـان بـە، خـۆ عادەت دان پێ:** کـاتێك مـام یوسـف خـۆی بـە ژیـانی بێـوە مێردیکی سـەڵت ڕاهێنـا، لـەباری سـلامەتیی بـەدەنیو ڕووحی‌یەوە بەرەو باشتر بوون دەچوو. * دەتوانێ خـۆی بـە نیشـودەردی بـەدەنی ڕابێنـێ، بـە نیشـودەردی ڕووحـی هەرگیز.

خۆ ون کردن ← خۆ نەدوڕاندن.

٣٧٠٤/ 3114- **خـۆ وەدوا خستن، ماڵەوە:** دوای تـەواو بوونـی سوخەنرانی/ خیتابەکـە، یـەك دوو کـەس لـە خەڵکەکـە مانەوە بۆ ئەوەی دەگەڵ کابرای نـاتیق/ سـوخەنران قسـە بکەن.

خۆ هەڵاخنینەوە ← زۆر خواردن.

٣٧٠٥/ 6383- **خۆ هەڵاوسین بە کەسێکەوە، خۆ نزیك کردنەوە لە کەسێك:** خۆ لەو حیزبە نزیك کەوە کە دەتوانێ متمانەی پێ بکەی.

٣٧٠٦/ 1523- **خۆ هەڵدانـەوە، بەسـەر کەسێك دا خوێنـدن، بـە خۆ هەڵگوتن:** بەسـەر دوژمنـی شکسـت خـواردوو دا خوێنـدن کارێکی ژیرانە نیە، بەتایبەت لە کاتێك دا کە مەترسیی ئەوە هەبێ کە تووشی چارەنووسێك لەو چەشنە بە دەستی یەکێکی دیکە بێ.

٣٧٠٧/ 6157- **خۆ هەڵخستن لەبەر، درێـژ بـوون لەبـەر:** زۆرم پێخۆشە بۆ ماوەی یەك دوو حەوتووان خـۆم لەبـەر تـاوێ هەڵخەم.

خۆ هەڵدانەوە ← خۆ هەڵکێشان، خۆ ڕانان.

٣٧٠٨/ 6921- **خۆ هەڵـسووڕاندن بەسـەر خـەڵك دا:** کـاتێك دێتـە ژوور وەها خۆی بەسـەرمان دا هەڵدەسـووڕێنێ کە هـەروەك بڵێی کە جەنابی سەرۆکی گەورە تەشریفی هێناوە.

٣٧٠٩/ 547- **خۆ هەڵکێشان، شانازی پێـوە کـردن؛ خۆ ڕانـان بـە ...:** زۆری پێخۆش بوو بە خۆڕانانەوە باسی ڕابردووی خۆی لـە ساڵەکانی شەڕدا بکا.

٣٧١٠/ 6091- **خۆ هەڵکێشان:** نازانم کەنگێ لەخۆ هەڵکێشـان سەبارەت بەو خانووبەرە ئەفسانەیی‌یەی کە دروستی دەکا دەست هەڵدەگرێ.

٣٧١١/ 1522- **خۆ هەڵکێشـان، بـە لـووت بەرزی‌یەوە ئاخـاوتن، بـە لەخۆبایی‌بوونەوە قسە کردن/ دوان:** کـاتێك کـە بـە پێچەوانـەی پێش بینیی ئاژانسەکانی هەڵسەنگاندنی ڕوانگەی خەڵك، پارێزگـاران لـە هـەڵبژاردنی گشـتیی سـاڵی ١٩٧٠دا سەرکەوتن، دەستیان کرد بە خۆ هەڵکێشان.

خۆ هەڵکێشان ← ئیدیعا کردن.

خۆ هیلاك کردن ← لە کەلك خستن.

خۆ هیلاکەو شەکەت کردن ← پشتی خۆ شکاندن.

٣٧١٢/ 3058- **خۆ هێنانـە خوار، سووك کـردن یـان چکۆلـە کردنـەوە:** لەعەنتی خودام لـێ بێ ئەگەر بمەوێ لەلای سەرکرێکارەکە خۆم چکۆلە بکەمەوەو داوای لێبکەم لێم خـۆش بـێ بـۆ ئەوەی کـە تـەنیا یـەکجارو ئـەویش سـەعاتێك درەنـگ هاتوومەتە سەرکار.

خوێڕی کردن ← دەمگلان.

خوێن پیس بوون ← تووڕە بوون.

٣٧١٣/ 3028- **خوێندن تەواو کردن لە:** لە ساڵی ١٩٧٣ دا، لـە ڕشتەی تواناندنەوەی "فلز"ان دا دەرس خوێندنی تەواو کرد (= باکالۆری وەرگرت).

٣٧١٤/ 1156- **خوێنـدن تـەواو کـردن ( بەتایبـەت لـە زانسـتگەی ئاکسفۆرد یان کەمبریج):** کـەوابوو سـاڵی ١٩٦٥ لـە کیمبریج بووی. کەنگێ دەرس خوێندنت تەواو کرد؟.

٣٧١٥/ 174- **(بە یەکـەوە) خوێندنـەوە؛ دروسـت بـوون (ی حیسـاب)، میزان بوون:** لە کۆتایی ساڵی ماڵیدا، حیسابەکانی دروست بوون/ تەوازونیان هەبوو/ میزان بوون.

٣٧١٦/ 4663- **خوێندنـەوە، (بـە زەحمـەت):** هـەموو ئـەو بەڵگانەمان بە زەحمەتێکی زۆرەوە خوێندۆتەوە کە ڕەنگـە تەنسیرێکیان لەسەر پەروەندەکەت هەبێ.

٨٧١٧ 5178- خوێندنەوە (سەرلە نوێ): کاتێك پـەیامێکی بـە تەلیفوون بەڕێ دەکەن، کابرای تەلیفوونچی پەیامەکی بـۆ لایەنەکەی دی سەرلە نوێ دەخوێنێتەوە.

٨٧١٨ 5185- خوێندنەوە: لە سـەرەتاوە هـەتا کۆتـایی دوو دانە نامەی سەرەوەی دەرکێشاو هەر چەند دەمیزانی چیـان تێدا نووسراوە، لەسەرەتاوە هەتا ئاخری خوێندنییەوە.

٨٧١٩ 5186- خوێندنـەوە، بەبڕشـەو یـەك لـە دوای یـەك: کتێبـی "دووڕگەی خەزێنە"م زۆر پێ‌خۆشە. تـێرمی رابـردوو بـە نۆبەو یەك یەك لە کلاسێ دەمانخوێندەوە.

٨٧٢٠ 4046- (زۆر بـە وردی) خوێندنـەوە، چـاو لێکـردن: ئاگاداریییەکەم زۆر بە وردی خوێندەوە.

٨٧٢١ 5181- خوێندنـەوە (لـە رووی کتێب، زیـاتریش بـە دەنگـی بەرزەوە): پێش ئەوەی منداڵەکان بچـن بخـەون، بابیـان لـە کتێبی ئەو چیرۆکانەی کـە زۆریـان پـێ‌خۆش بـوو، چـەند بەشێکی بە دەنگی بەرز بۆ خوێندنەوە.

٨٧٢٢ 1010- خوێندنەوە بە وردی (بـۆ دیتنـەوەی هەڵـەکان): ئـەم پێشنووسانە بە وردی چاو لـێ‌بکە/ بخوێنەوە (بـۆ ئـەوەی هەڵەکان راست کەیەوە).

٨٧٢٣ 6520- خوێندنەوە دەگەڵ، هاتنەوە دەگـەڵ، لـەبار بـوون بـۆ: وشیار بن کە سزادانەکە دەگەڵ تاوانەکـە بێتـەوە. ● بـە راسـتی پێتوایـە ئـەم کـارە بـۆ پۆلێکـی سـەرەتایی مونـاسبە؟.

٨٧٢٤ 90- خوێندنـەوە (دەگـەڵ)، ونجـوون: ئـەم ماشـێنە بـە تەواوی وە ماشێنە دزراوەکە دەچێ.

٨٧٢٥ 5176- (گەڵـە بەیـەکێك) خوێندنـەوە لـە پێوەنـدی دەگـەڵ: دەزانم راسـتە، چونکـە لـە گوزاریشـەکە / راپۆرتەکـە دا هێندێك شتم لـە پێوەنـدی دەگـەڵ ئـەو مەسـەلەیە خوێندۆتەوە.

٨٧٢٦ 5183- (بە دەنگی بلیند یان بـە بـێ‌دەنگی) خوێندنـەوە هـەتا ئاخری: فرانك زەرفی نامەکەی دڕانـد، پەیامەکـەی هـەتا ئاخری خوێندنەوەو، گووشی تەلیفوونەکەی دەست دایە.

خوێندنـەوە دەگـەڵ ← جـوور هاتنـەوە دەگـەڵ، وەك یـەکچوون، هاتنـەوە دەگـەڵ، هاوئاهـەنگ دەگـەڵ، یەکگرتنەوە، وەك یەك هاتنەوە، تێگەیشتن لە.

خوێندنەوە ← دیتن.

خوێندنەوە یان نەخوێندنەوە دەگەڵ ← جوور هاتنەوە یـان نەهاتنەوە.

٨٧٢٧ 4929- خولەك ئیشـاڵڵا: پێنـج دەقیقـە رلوەسـتە - تەنیا بەو مەبەستە خۆت نیشان دابێ- جا ئەو جار بڕۆ بۆ خواردنەوە.

٨٧٢٨ 6473- خـەبات کـردن بـۆ، مووبـارەزە کـردن بـۆ: ئازادیییـە تاکەکەسییەکان بایەخی ئـەومیان هەیـە کـە خـەباتیان بـۆ بکەین.

٨٧٢٩ 723- خەبـەردار راگرتـن، خەبـەرداری: سـەرگرووپان (رئیـس عرفـا) خـێرا خەبـەرداری (قـوت بوونـی) بـە نیگابانەکان داو دەستی بۆ ئەفسەرەکە هەڵێنا.

٨٧٣٠ 1295- خەبـەردار راوەسـتان، قـوت راوەسـتان: کـاتێك ئەفسـەرێك قـسەت دەگەڵ دەکا دەبێ خەبەردار راوەسـتیو هیچ نەجوڵییەوە.

٨٧٣١ 6172- خەبـەردار راوەسـتان، راوەستانو دەست هـەڵێنان بـە نیشانەی رێـز گرتـن، چەست لێدان: کـاتێك ماشـێنی ژێنـراڵ گەیشتە بـەر دەروازەی، نیگابـان/ حـەرەس چەسـتی بـۆ لێدا.

٨٧٣٢ 6263- خەبـەردار راوەسـتان، قـوت راوەسـتان: کـاتێك ئەفسـەرێك قـسەت دەگەڵ دەکا، شەق راوەستە.

٨٧٣٣ 303- خەتای ... بوون، کەتای ... بـوون: "باشـە کـەتنی/ خەتای من بوو ، دەبوو ئاوا لێی توورە نەبام".

٨٧٣٤ 5646- خەت بەسـەر ...دا کێشـان، خـەت لێدان: چاوم لـە لیستەکە/ قایەکە کرد؛ یەکێك خەتی بەسەر ناوی خـۆیدا هێنابوو.

← کووژاندنەوە، بە هێند نەگرتن.

٨٧٣٥ 1518- خەت بەسـەردا کێشان/ پێداهێنان (بـە نیشـانەی هەڵـە بوون): مامۆسـتا بەشـی زۆری نووسـراوەی قوتابییەکـەی خەت پێداهێنابوو.

٨٧٣٦ 7511- خەت بەسەردا کێشـان، دەست لـێ‌هەڵگرتن: شـەریکە خەتی بەسـەر ئەو قەرزانە داهێناوە کـە دوو هـەزار پـاوند دەبێ‌و وادیارە نادرێنەوە.

٨٧٣٧ 6450- خەت بەسەردا کێشـان، لابردن: ئـەو بەشـانە لـە مەقالەکـە کـە تـەوەهێ ئـامێز بـوون، خـەتیان بەسـەردا کێشاون.

٨٧٣٨ 5630- خەت (بەسـەر) کێشان، کووژاندنەوە: نـاوی سـێ کەسیان لە لیستەکەدا خەت کێشابوو.

٨٧٣٩ 6453- خەت لێدان، خـەت بەسـەردا کێشان: دەگـەڵ هـەر شتێکی نووسراوەکەم موخـالیف بـووی، خـەتی بەسـەردا بکێشە.

٢٧٤٠/ 6698- **خەت لێدان لە نــاوی چێشــتێك لــە لیســتەی/ مێنــوی چێشتان:** گۆشتی راستەمان لە کــەمی داوە، ناوەکـەی لـە مێنرودا خەت لێدەین.

٢٧٤١/ 1479- **خەجاڵــەت بوونــەوە، تــەریق بوونــەوە، دەســتو پــێ لــێتێکەڵ بوون، دەستپاچە بوون:** کاتێك بنەماڵــەی مێردەکـەی کوتو پڕ هاتن، ژنە گەنجەکەی نــاڵبێرت کـە هێشــتا لــە خەو هەڵنەستابوو، یەکجار زۆر خەجاڵەت بووە.

٢٧٤٢/ 5895- **خەجاڵەت کردنەوە، خەجاڵەتی خەڵکی کــردن، بــە خۆیا شکاندنەوە:** منداڵــەکانمان بــۆ هــەموو جێگایــەك دەبــەین هەرگیز لەوە باکم نیــە کــە لــە رێســتورانان خەجاڵــەتی خەڵکیم دەکەن.

٢٧٤٣/ 2879- **خەرج کران بۆ:** بەشێکی زۆر لەو پووڵەو پــارەی وەك یارمەتی دەرس خوێندن وەری دەگرم، خەرجی کڕینی کتێبانی دەکەم. بەڵام پێم وایە ئەو پووڵانە بــەجێ خــەرج دەکرێن، وانیە؟.

٢٧٤٤/ 2963- **خــەرج کــردن (ی پووڵێکــی زۆر)، وەلەســتۆ گرتــنی (هەزینەیەك):** ئەرێ لە جیاتی ئەوە پووڵێکـی زۆرو زەوەنـد خەرجی کڕینی دەزگایەك کاروان دەکەن، بۆچی بۆ مــاوەی دوو حەوتووان یەکێکی بەکرێ ناگرن؟.

٢٧٤٥/ 3788- **خەرج کردن، (پووڵ) دان بە:** هەرچی هــەیبوو دای بە بلیتی/ بیتاقەی فڕۆکە.

٢٧٤٦/ 5521- **خەرج هەڵگرتن، مەسرەف کردن، ویســتن، پــەکهەلو زۆر:** گەشــتوگوزار لــە هــەندەران خــــەرجێکی یــەکجار زۆر هــەڵدەگرێ. ● ئــەو ســـۆبە تازانـــە کارەبایــەکی لــە رادەبەدەریان دەوێ.

٢٧٤٧/ 5758- **خــەرج هــەڵگرتن، تــەواو بــوون بــۆ، پــارە چوون بــۆ:** ئەگەر لەوێ نانی شەوێ بخۆن، هــەر نەفــەری پێنــج پونـد (خەرج) هەڵدەگرێ.

٢٧٤٨/ 4125- **خەرج کردن، خواردن:** گیروگرفتــەکانی ئــابووری لەو دواییانەدا بۆتە هۆی خەرج کرانی بەشێك لــە زێــرو نەغدینەکەمان.

→ (لە چوارچێوەیەك دا). خەرج کران، خواردن.

٢٧٤٩/ 4424- **خەرج کردن، بەخشین، چاوپۆشیی کــردن لــە:** واداری کردبوون گوێی بۆ راگرنو تەنانــەت هێندێــك جــاریش بــۆ جێبــەجێ کردنــی نامانجــەکانی لــە پــووڵو پارەکەشــیان چاوپۆشــی بکــەن. ● ئــەو لــەو کەســانە نیــە کــە بــە خۆشحاڵییەوە لــەو دراوانــەی بــە کوێــرەوەری وەدەســتی هێناوە چاوپۆشی بکا.

٢٧٥٠/ 3736- **خەرج کردن بەســەر خۆمدەوە، پووڵێك، پارەیەکی زۆر خــەرجی ... کــردن:** هــەر کــات جــــورج دەچێتــــە ســــەفەرە ئورووپاییەکانی پووڵێکی زۆر خەرجی کڕینی دیاریی بــۆ هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەی دەکا. ● زۆربــەی دایــكو بابەکان نایانەوێ پووڵێکی زۆر خەرجی کڕینی شــتومەکی زیادیی و جلو بەرگی منداڵان بکەن، جــلو بــەرگێك کـە دوای ساڵێك بە هەرحاڵ بۆ بەریان نابێتەوە.

٢٧٥١/ 3599- **خەرجی راگرتنی شــتێك دابــین کــردن:** ئــەو توانــای دابین کردنی خەرجی راگرتنی خانوویــەکی لــە هەوارگــەدا نیە.

٢٧٥٢/ 5066- **خــەرجی شــتێك کــردن:** ئێــوە خــــەرجی ماڵــــێ وەئەســتۆ بگرن، ئەمنیش نیــوەی یارمــەتیی مانگانەکــەم پێشــــکەش دەکــــەم بــــۆ خــــەرجی تەحتیلاتەکـــــەمان/ عوتڵەکەمان/ پشوودانەکەمان.

٢٧٥٣/ 6124- **خەرجی شتێك کردن، بەکارهێنان بــۆ:** مەبلــەغێکی کەم لە نەغدینەی خۆی خەرجی ئیستیعدادی خۆی کردوە.

خەرفان → شێت بوون.

٢٧٥٤/ 2395- **خــەرمان هــەڵگرتن، کــۆ کردنــەوەی بەرهــــەم:** حەوتوویەك باران بــاریو پێش ئــەوەی بتوانــن خــەرمان هەڵگرن، گەڵەکەی لەنێو برد.

٢٧٥٥/ 7245- **خــەریك بــوون، هــاتن:** ئــەو بەرپرســـایەتیی شەریکەیەکی وەئەستۆ گرت کە خەریك بوو/ دەهــات کــۆ بکرێتەوە.

خەریکی دۆزینەوەی شتێك بوون → گەڕان لە شتێك.

٢٧٥٦/ 3123- **خەریکی روودان بوون، لە پێش پێبوون:** ئێســـتا کـە تاقیکاریی بۆ پارێزەران خەریکە بەڕێوەدەچێ ناتەوێ هیچ شتێکی دیکە وەئەستۆ بگرم.

٢٧٥٧/ 2020- **(بە توندی) خەریکی شتێك بــوون، چــوون دەڤوولــەوە، لــە فکری شــتێك راچــوون:** ئــالفرێد بــە چەشــنێك لــە فکــری گیروگرفتەکانی راچووبوو کە نەیزانی کێکەکە دەسووتێ.

٢٧٥٨/ 7450- **خــەریکی کــارێك بــوون (بــە هــەموو توانــاوە):** لـــە کتێبخانــەی دیتــم کــە بــە هــەموو توانــاوە خەریکــە (= خەریکی خوێندنەوەیە).

٢٧٥٩/ 226- **خەریکی کارێك بوون:** قەت تێناگەم کە بەراســـتی خەریکی چییە. دەکرێ بفــەرمووی (بەراســتی) خــەریکی چی؟.

٢٧٦٠/ 208- **خەریکی، بەدوای وەدەست هێنــانی ... بــوون:** بــە دوای دزینی تابلۆکان یان زێڕو زێوی ماڵیەوە نیە.

٣٧٦١/ 448- **خەریکی کارێك(ی جێگای لۆمە) بوون:** ئەو دۆستەی تۆ پیاوێکی سەیرو سەمەرەیە. کەس نازانێ لە بەیانییەوە هەتا ئێستا خەریکی چییە، کاتێك دیتم لەبەر دەرگای پشتەوە دێودەچێ، زانیم کارێکی خراپی بەدەستەوەیە.

٣٧٦٢/ 851- **خەریکی کارێك بوون، خۆ بە شتێکەوە خەریك کردن:** هەمیشە دەتوانێ شتێك بدۆزێتەوە خۆی پێوە خەریك کا.
← سەرگەرمی کارێك بوون.
خەسار بوون ← بەفیڕۆدان.
خەلاس کردن ← (زاراوەی لاتی) بەس کردن.
خەلاسی هاتن ← رزگار بوون.
خەلاسی هاتن لە ← قبوڵ بوون.
خەلك بە قەرزدار زانین ← وەرووی خۆ نەهێنان.

٣٧٦٣/ 1168- **خەڵکی جێگایەك بوون، هی یان بەرهەمی جێگایەك بوون، لە جێگایەك را هاتن:** ئەو خەڵکی لەندەنە. ● ئەو ئامرازانەی کایەی منداڵان لە هۆنگ کۆنگەوە دێن.

٣٧٦٤/ 3092- **خەڵکی ناوچەیەك بوون:** بەلەبەرچاو گرتنی زاراوەکەی/ شێوەی قسە کردنی، دەتوانم بڵێم خەڵکی سکۆتلەندە.
خەمبار بوون ← پەژارەی شتێك داگرتن.
خەم خواردن بۆ ← فرمێسك رشتن.
خەمی شتێك خواردن ← پەژارەی شتێك داگرتن.
خەمی کەسێك خواردن ← خۆ نارەحەت کردن.

٣٧٦٥/ 265- **خەمگین/ بە پەرۆش، پەریشان، هاتنەبەرچاو:** ماڵیاتی/ باجی تازەیان لەسەر بیرە داناوە و ـ کامران زۆر پەریشان دێتە بەرچاو.
← دڵتەنگ.

٣٧٦٦/ 1973- **خەمناك بوون، خەمگین بوون:** لەو کاتەوە یارەکەی بەجێی هێشتووە، ئەو کچە بەستەزمانە یەکجار خەمگینە: ناخەوێ و هیچ دڵخۆشییەکی بە ژیان نەماوە.

٣٧٦٧/ 1604- **خەنجەرێك لە جەرگی ... دان:** لاتاوەکانی هێلێن سەبارەت بەو یارمەتییانەی کە بە خۆی و بنەماڵەکەیم کردووە وەك خەنجەرێك وابوو کە لە جەرگیان دابم.
خەندەق لێدان ← سەنگەر گرتن.
خەوبردنەوە ← وڕێنگ دان و خەو لێکەوتن، خەونووچکە بردنەوە.
خەوتن ← راحەت لێی نووستن.

٣٧٦٨/ 5361- **خەوتن، نووستن، راکشان:** پیرەکان/ بەساڵداچووان بۆ دەست پێوە گرتن بە سووتەمەنی و بەرق/ کارەبا زوو دەنوون/ دەخەون.

٣٧٦٩/ 5980- **خەوتن (لە جێگای نیش و کار):** زۆربەی کارمەندو کرێکارەکانی هوتێل لە جێگای نیش و کارەکەیان دەخەون (= هەر لەوێ دەخەون).

٣٧٧٠/ 487- **خەوتن، نوالدن (لەسەر هەر شتێکی و بە هەر شتێکی کە وەچنگ بکەوێ):** سەربازەکان لە کادێنێك دا بۆی نووستن.

٣٧٧١/ 3645- **(زاراوەی لاتی) خەوتن، نووستن:** لە هاوینێ دا، شەوانە هەزاران لاو لە هەوای ئازادو لە کەنار دەریا دەخەون. ئەو کارە هەم هەرزان بۆیان تەواو دەبێ و هەم پێشیان وایە ئەوعێك ماجەراجووییە.

٣٧٧٢/ 7145- **خەوتن، نووستن:** درەنگە، کاتی ئەوەهاتووە بخەوم.

٣٧٧٣/ 1826- **خەوتن لەسەر حەسیرو تەلیسان، خۆ کروشم هەڵێنان:** ئەشە هەریەکەی پەرداخێك سووپیان دەداتێ و رێگایان دەدا لەژێرخانی کەنیسە دا بخەون.

٣٧٧٤/ 5981- **خەوتن و (لە وەزعێك هاتنەدەر):** دەزانم کە ئێستا زۆر وەڕەزو ئێوچاولان گرژە، وەرن با ئەمشەو دەرفەتی بدەینێ با بخەوێ و لەم وەزعە بێتەدەر، باشە؟
خەوتنەوە ← دەخەو کردن.
خەوشدار کردن ← لێدان.

٣٧٧٥/ 1842- **خەوشدار کردنی ناوی کەسێك یان جێگایەك، ئابرووی کەسێك بردن:** ئەو کورە سەر سەرییەیان بەوە تاوانبار کرد کە ناوی قوتابخانەی خەوشدار کردووە.

٣٧٧٦/ 5188- **(لەسەر کتێب) خەو لێکەوتن، خەوبردنەوە:** دەیزانی کە خەوی لێناکەوێ - لە رادەبەدەر ویسکی خواردبووە- بۆیە هەوڵی دەدا بە کتێب خوێندنەوە خۆی لە خەو کا/خەو بیباتەوە.

٣٧٧٧/ 369- **خەو لێکەوتن، بێهۆش بوون، لە هۆش چوون، بێهۆش بوون (بە هۆی شەکەتییەکی یەکجار زۆر یان زەربە وێکەوتن لە پالەوانەتیی بۆکس/ مشتەکۆلەدا):** عەلی: ئاستۆن بۆی کەوتووە؟.\" بەڵێ، بە تەواوی لە هۆش چووە. دەبێ کاری تەواو بێ".

٣٧٧٨/ 2521- **خەولێکەوتن:** ئەگەرچی بە هۆی سەفەرێکی دوورو درێژ بەراستی رەجلم لێبڕابوو، بەو حاڵەش خەوم لێنەدەکەوت.

٢٧٧٩/ 2855- خەو لێکەوتن، نووستن، خەوتن: وادیاربوو خەوی لێناکەوێ. بۆیە چووە ناشپەزخانە/ مەتبەخ بۆ ئەوەی چایەکی دروست بکا.

٢٧٨٠/ 5935- خەولێکەوتن (زۆر قورس)، دووچار بوون: وادیارە کە یوسف دیسانیش بە هۆی کێشانی "مـواد مخدر" خەوی لێکەوتووە.

٢٧٨١/ 4339- خەونووچکە بردنەوە، خەو لێکەوتن، خەو بردنەوە، چۆرت لێدان: دەبێ خەوم لێکەوتبێ، جارجار ڕۆژەکانی یەکشەممۆ کە ڕۆژنامەی دەخوێنمەوە، خەوم لێدەکەوێ/ خەو دەمباتەوە.

← وڕێنگ دان.

٢٧٨٢/ 6670- خەیاڵێکی وەها لەسەری کەسێک دان، فکرێک هاتنە پێش بۆ...: لە خۆڕا ئەو فکرە لە کەللەی داوە کە گۆیا ژنەکەی دەیەوێ دەرمانداوی کا.

٢٧٨٣/ 6474- خەیانەت کردن لە دژی: ڕاگەیەندراوە ڕەسمییەکان ناتوانن ئەو هەوڵدانانە داپۆشن کە بۆ گەڕاندنەوەی ئەو پێوانەو پێوەرانە ئەنجام دەدرێن کە لە ڕابردوودا سەرکەوتووانە لە دژیان خەباتمان کردووە.

خێرا بوون ← وەخۆ کەوتن.

٢٧٨٤/ 4564- خێراتر ڕۆیشتن، سورعەت گرتن: قەتار لە نیزگە لەسەرخۆ وەڕێکەوت، بەڵام کە گەیشتە دەشتو سەحرا سورعەتی گرت.

٢٧٨٥/ 1051- خێراتر ڕۆیشتن، سورعەت گرتن: کاتێک کەشتییە بازرگانییە تۆپدارەکە چاوی بە کەشتییەکی جەنگیی دوژمن کەوت، سورعەتی گرت.

٢٧٨٦/ 605- خێراتر ڕۆیشتن، لێخوڕین: کاتێک گارانەکە هەستیان بە نزیک بوونی ناو کرد، وەپەلە کەوتن/ بەغار ڕۆیشتن.

← لاق هەڵێنانەوە.

٢٧٨٧/ 5104- خێراتر کردن، سورعەت دان بە: فەرمان هاتەوە کە ئاهەنگی پێشڕەوی/ چوونە پێش خێراتر بکەین.

← سورعەت گرتن.

← خێرا جووڵانەوە، پەلە کردن.

خێراکەن ← زوو کەن.

خێر دیتن لە ← قازانج کردن.

٢٧٨٨/ 1821- خێر کردن، سەدەقەدان، خوارەمەنی بەخشینەوە: ئەگەر ئەوەی ئێوە بە ناوی یارمەتی/ سەدەقە دەیدەن بە کرێکارە دەستەنگو هونەرمەندە هەژارەکان، واباشترە جارێکی دیکەشی بە لێبکەنەوە.

٢٧٨٩/ 4970- دابەزاندن، بە زۆرە ملی دابەزاندن: بە کۆمەک ڕانەندەکەم گوت لە نیزگەی دواتر دامبەزێنێ.

٢٧٩٠/ 4899- دابەزاندن، پیادە کردن: پاسەکە لە نیزگە ڕلومستا بۆ ئەوەی یەک دوو موسافیران دابەزێنێ.

٢٧٩١/ 5761- دابەزاندن: دەکرێ لوتف بکەنو لەسەر پێچەکەی دیکە دامبەزێنن؟.

← هێنانە خوار، خاڵی کردن، داگرتن.

٢٧٩٢/ 3869- دابەزاندن یان دابەزین، پیادە کردن یان پیادە بوون: لە ناخودای کەشتییەکەم داوا کرد لە هەوەڵین بەندەر دامبەزێنێ. ● مەئمووری قەتار نەیدەهێشت هیچ کەس لە نێوان دوو ئیستگەیان دابەزێ.

دابەزاندنی ئامرازی ماشێنو... بۆ ئەوەی کە هاسانتر رابگوێزرێن ← پیادە کردن.

٢٧٩٣/ 1938- دابەزین، پیادە بوون: لەسەر پێچی شەقامی پیرەمێرد دابەزیم.

٢٧٩٤/ 1753- دابەزین، پیادەبوون (لە کەشتی): سەربازەکان دەتوانن لە کەشتییەکی کە لە نزیک وشکانی ڕاوەستاوە دابەزنو بە لۆتکە بێن ... بیانگەیەننە وشکانی.

٢٧٩٥/ 2463- دابەزین (لە ئەسپ)، هاتنە خوار: ئەوەی ڕاست بێ، سوارە مەستەکە داتەبەزی. ئەگەر بڵێین بەربووە ئێردەستی دۆستەکانی دروستتر دەبێ.

٢٧٩٦/ 2456- دابەزین، هاتنە خوار: پشیلەکە هەتا چڵوکی دارەکە وەسەرکەوت، لەوێ دەترسا بێتەوە خوارێ.

٢٧٩٧/ 6345- دابەزین لە، پیادەبوون لە، هاتنەدەر لە: هەر لە فڕۆکەکە دابەزی، ڕێنەگران دەوریان دا.

٢٧٩٨/ 64- دابەزین (لە)، هاتنە خوار (لە): هەر کە پیرێژن لە ماشێنی دابەزی، کوڕێکی سواری سکەیتینگ خۆی لێدا.

٢٧٩٩/ 2509- دابەزین لە، پیادەبوون، هاتنە خوار لە: کابرای پۆلیس بە کوڕەکەی گوت لە تاتۆکە (جۆرە ئەسپێکی چکۆلەیە- وەرگێڕ-) دابەزێ.

٢٨٠٠/ 6599- دابەزین، لاواز بوون، بەرەو کزی ڕۆیشتن: بە ڕوونی دیار بوو کە کۆبوونەوەکە کامرانی گرتووەو، پاش چەند قسەیەک وردە وردە ڕەنگی بەرەو کزی ڕۆیشت هەتا کپ بوو.

← کەم بوونەوە.

خەو لێ‌کەوتن (بەدەم گریانەوە) ← بە دەم گریانەوە خەو لێ‌کەوتن.

خەوێکی قورس لێ‌کەوتن ← بێهۆش بوون.

٧٨٠١/ 2197- دابەستن، قەڵەوکردن: دەمەوێ بەوپەڕی خێراییەوە قەڵەوی بکەم.

٧٨٠٢/ 2130- دابەشکران بە، دابەشبوون بە، پێکهاتن لە، بریتیبوون لە: وتووێژەکان بە سێ بابەت دابەش دەبن/ وتووێژەکان لە سێ بەش پێك دێن.

٧٨٠٣/ 6153- دابەشکردن، کێشان(ی چێشت) بە کەوچکێ: بە کەوچکێکی چەند پاروو برینجەکەی دابەش کردە سەر دەورییەکان.

٧٨٠٤/ 4416- دابەشکردن: هێندێك لە خاوەن موڵکەکان بۆ خۆیان بەشێك لە زەوییەکانیان لەنێو وەرزێرەکان دا دابەش کرد.

٧٨٠٥/ 5846- دابەشکردن، دابەشین: هەموو رۆژێ ئێواران لێك کۆ دەبوونەوە بۆ ئەوەی داهاتەکەیان دابەش کەن.

٧٨٠٦/ 5159- دابەشکردن، بەشینەوە لە نێو، جیە بەندی کردن: پاشماوەی پاشەکەوتی شەوی قوتووییان بەسەر منداڵەکان دابەشکرد. ● ناچار بوون بەنزین جیەبەندی بکەن.

٧٨٠٧/ 636- دابەشکردن، لێك جیا کردنەوە: دەتوانین رستەیەك بە چەند عیبارەتێو هەر عیبارەتێك بە چەند شێوە رستە دابەش بکەین.

٧٨٠٨/ 1786- دابەشکردن (وەخت) لەنێوان: کاتی رۆژانەی بە شێوەیەکی یەکسان لەنێوان کارکردنو حەسانەوەدا دابەشکردبوو.

٧٨٠٩/ 1785- دابەشکردن: دەبێ ئەو میراتە لەنێو چەند منداڵان دا دابەش بکرێ.

٧٨١٠/ 1778- دابەشکردن، بڵاوکردنەوە: لە کۆتایی هەر وتاردانێك دا، نوسخەی تەکسیرکراوی وتارەکەیان بەسەر خوێندکارەکان دا دابەش دەکرد.

٧٨١١/ 1756- دابەشکردن، دابەشین: پێش ئەوەی تاقمەکە بچنەژێر زەمینەکەوە کڵاوخودو لیباسی کاریان دانێ/ بەسەردا دابەشین.

٧٨١٢/ 3106- دابەشکردن، بڵاوکردنەوە، بەشینەوە: وتارەکەیان تەکسیر کردو لەنێو خوێندکارەکان دا بڵاویان کردەوە.

٧٨١٣/ 2669- دابەشکردن، بڵاوکردنەوە لە نێوان، دابەشین بەسەر...دا: کاتێك بەڵگەکانی تاقیکاریی دابەشکران. چاوەدێر زەنگی لێداو قوتابییەکان دەستیان کرد بە خوێندنەوەیان.

٧٨١٤/ 5333- دابەشکردن: ئەرکێکی کە پێمان ئەسپێردراوە دەتوانێ بە سێ پێویستیی بنەرەتی دابەش بکرێ.

٧٨١٥/ 2647- دابەشکردن، پێشکەش کردن: بەراستی پێت وایە تەنیا بۆ دانی شەهادەی یەکەمین پلەی مەلەوانی بەو منداڵانە دەبێ شارەدار رەکێش کەین بۆ ئێرە؟.

٧٨١٦/ 6149- دابەشکردن بە: بۆ دەرسەکانی هونەرو پیشەکان، پۆلەکە بە تاقمی چکۆلە دابەش دەکەن.

٧٨١٧/ 4702- دابەشکردن بەسەر...دا: بەستەی جۆرەبەندیی ستانداردەکە دەبوو بەسەر چاردەکەس دا دابەش بکرێ.

← ئەسپاردن بە ، بەشینەوە.

دابێژ دابێژ کردن ← کون کون کردن.

٧٨١٨/ -

٧٨١٩/ 4768- دابین کردن (ی پێویستییەکانی ژیان): ئەگەر بڕیارتان داوە لێك جیا ببنەوە، دەبێ کارێك بکەی کە ژنەکەت بە باشی (پێویستییەکانی) ژیانی دابین کرابێ.

٧٨٢٠/ 3522- دابین کردن، بەشی... کردن: ئەو کارانەی جارویار دەیان بینێتەوە بە زەحمەت خەرجی سەفارو مەشرووبەکەی دابین دەکەن. ● جایزەی یەکەمی لاتاری بردەوە، جایزەیەك کە بەشی خەرجی یەك ساڵی بووەکەی دەکا.

٧٨٢١/ 4412- دابین کردن: رۆژنامەکان لە رۆژەکانی یەك شەمۆ، لە بواری بابەتە ئێحساسییەکانو شتی شووڕەیی ئەو کەسانە دابین دەکەن کە خوازیاریانن.

٧٨٢٢/ 968- دابین کردن: ئەو کەسانەی وێنەی سێکسی بڵاو دەکەنەوە ئیدیعا دەکەن کە پێویستییەکی رەوانیی خەڵك دابین دەکەن.

٧٨٢٣/ 2203- دابین کردن (پێویستییەکان): بەشی ناوەندیی بی.بی.سی تا رادەیەك پێویستیی رادیۆ ناوچەییەکان دابین دەکا.

٧٨٢٤/ 6207- دابین کردن (لەباری کارمەندەوە): بەڵێ لەباری کارمەندەوە کەمیان هەیەو، ئێمەش کارمەندیان بۆ دابین دەکەین.

٧٨٢٥/ 5810- دابین کردن، پارەمسۆگەرکردن: رەنگە بتوانن ناپارتمانێکی/ شوقەیەکی لە... بۆ بگرێو لەباری ماڵیشەوە دابینی بکا. ● ئەگەر لە گرێو کردنەکانی پێشبڕکێی فووتباڵ سەرکەوتنێکی گەورە وەدەست بێنم (پووڵێکی/ پارەیەکی زۆر بەرمەوە) هەتا ئاخری عومرم لەباری ماڵییەوە دابین دەبم.

٧٨٢٦/ 7474- دابین کردن، (ورده ورده): چەند ساڵێکی کێشا هەتا چیا وردە وردە بازارێکی بۆ بەرهەمەکانی دابین کرد.

٧٨٢٧/ 4679- دابین کردن بۆ، خستنەژێر پەرەستاران: هەر شتێکی کە مانەوەی لە نەخۆشخانە راحەتتر دەکرد بۆیان دابین

کردبوو. ● خزمەکانیان ئیدارەکانی کەشتیوانییان گەمارۆ دابوو، کارمەندەکانیان خستبووە ژێر سێڵاوی پرسیارانەوە.

٢٨٢٨/ 6529- **دابین کردن بۆ:** بۆ هەموویانیان پێوانکار( بەدلە) دابین کردووە.
← ئامرازی خەوو خواردن دابین کردن، (بە سەختی وەدەست هێنان).

٢٨٢٩/ 4768- **دابین کردنی بژێو بۆ، پێویستییەکانی ژیان دابین کردن بۆ:** ئەگەر بڕیارت داوە ژنەکەت تەڵاق دەی، دەبێ کارێك بکەی پێویستییەکانی ژیان بۆ خێزانت بە باشی دابین بووبێ.

٢٨٣٠/ 3516- **دابین کردنی بژێوی بنەماڵە:** لە کەسادیی ئابووری لە ساڵەکانی ١٩٢٠و ١٩٣٠ دا، بەپرسانی بنەماڵەکان، دەکرێ بڵێین مەحاڵ بوو بتوانن بژێوی بنەماڵەکەیان دابین بکەن.

٢٨٣١/ 3958- **دابین کردنی پێویستییەکانی لەو وڵاتەی بۆی دەچی:** ئەو هەموو گۆشتی قوتووە بۆ دەگەڵ خۆت دەبیە فەرانسە؟ میوەو سەوزیو هەرچی دەتەوێ لەوێ دابینی بکە.

٢٨٣٢/ 1264- **داپۆشران، بوون بە:** ماوەیەکی کورت دوای خواردنی قرژاڵی دەریایی بەشێك لە لەشم پەڵە پەڵە بوو.

٢٨٣٣/ 3124- **داپۆشران، هەڵوەسینو داپۆشین:** هەموو دیوارەکان بە جاڵیزەو نیشانان داپۆشرابوون.

٢٨٣٤/ 6332- **داپۆشران بە هەڵم، هەڵم گرتن:** لای ژوورێی شووشەکانی پەنجەرەی ماشێنەکە لەو هەوا شێدارەدا هەر زوو هەڵمیان گرت.

٢٨٣٥/ 4276- **داپۆشران لە (تۆز، مێژ، فرمێسك و ...)، تەر هەڵگەڕان:** چاویلکەکانی بە هۆی کوڵینی مەنجەڵەکە هەڵمیان لێدەنیشت/ بە هەڵم دادەپۆشران.

٢٨٣٦/ 616- **داپۆشران لە، داگرتن، پڕبوون لە:** لەپڕ دەموچاوی پڕ بوو لە زیپکەی سووری پیس.

٢٨٣٧/ 6035- **داپۆشران لە، نوقمی فستێق کردن:** سینگی ژێنراڵەکە بە میداڵو نیشانان داپۆشرابوو. ● کۆمیتەی پێشواز هەمیشە نوقمی بەخێرهاتنیان دەکرد.

٢٨٣٨/ 6439- **داپۆشران لە، پڕبوون لە:** حەوشەی پشتەوە بە ئاشغاڵی داپۆشرابوو/ پڕ لە ئاشغاڵ بوو.

٢٨٣٩/ 3432- **داپۆشین، کەوتنە ژێر ڕەهێڵەی/ سێڵاو:** کاتێك کە چارلی لە گرێو کردن دا ٥٠ هەزار پوندی بردەوە کەوتە ژێر ڕەهێڵەی نامەی سواڵکەران.

٢٨٤٠/ 4415- **داپۆشین، بەشێوەیەکی ئاشیانە:** جیابوونەوە کە بەشێوەیەکی ئاشیانەو بە یارمەتیی گەلە ڕاگمیەندراوێك داپۆشرابوو کە بە زەحمەت یەکتریان دەگرتەوە.

٢٨٤١/ 1851- **داپۆشین:** گلکۆکەیان بە ئاڵای بریتانیا داپۆشی بوو.

٢٨٤٢/ 2005- **داپۆشین، دەستێك گرتن، دەبەر کردن:** سندووقە دارە کۆنەکە دە پەرچەمی گیرابوو. ● شواڵییەکانی سەدەکانی نێوەڕی، کە سەرتا پا زرێیان دەبەر دەکرد، دەبوو بە گوریسان (هەڵیان بێننو) سواری ئەسپیان کەن.

٢٨٤٣/ 6567- **داپۆشین، سەرپۆش لەسەر دانان، شاردنەوە:** ڕووداوە ناخۆشەکانەی ژیانی دادەپۆشن.
← شاردنەوە.

٢٨٤٤/ 2645- **داپۆشین، داگرتن، لە باوەش گرتن:** جەنگەڵێکی چڕو پڕ لە هەر چوار لاوە قەسرەکەی داپۆشیبوو ( لە باوەش گرتبوو).

٢٨٤٥/ 7486- **داپۆشین، داپۆشران، لەبەر چاوان ونبوون:** تابلۆکانی ڕێنوێنیی جاددە لەژێر مژدا لەبەر چاوان ون ببوون/ مژ تابلۆکانی... داپۆشیبوو.

٢٨٤٦/ 4402- **داپۆشین بە رەنگ:** هێندێك جێگای تابلۆ قەدیمییەکان کە جارجار ناحەز دێنە بەرچاوی هونەرمەندان بە رەنگ دایاندەپۆشن.

٢٨٤٧/ 7114- **داپۆشینو ئانکادرە کردن:** بڕۆ نێو جێگاکەت، هەر ئێستا دێمە سەرو دائەدەپۆشمو لێفەو بەتانییەکەت بۆ ئانکادرە دەکەم.

٢٨٤٨/ 5996- **داپۆشین، پێدادان:** ئێوارەکەی سارده، کەوابوو شاڵگەردنێك (= شاڵێك) بەسەر شانو مل دادە.
←پێدادان، تێوەپێچان.

٢٨٤٩/ 4253- **( لە وێنەگری دا ) داپۆشینی بەشێك لە نێگاتیف لە کاتی چاپ کردن یان گەورە کردنەوەدا بۆ ئەوەی کە ئەوێ ون نەکەوێ:** بە داپۆشینی بەشێك لە نێگاتیف لە کاتی شوشتنەوەی فیلمەکەدا، دەتوانین لە دەست ئەو وردەشتانە ڕزگارمان بێ کە لە پێشنوماکە دا هاتوون.

٢٨٥٠/ 519- **داپۆشینی جێگایەك یان چەند جێگا لە ڕەسمێك یان نووسراوەیەك بۆ ئەوەی دووبارە چاپ نەبێتەوە:** ئەو بەشە لەو شتە وردانەی سەرووی ڕەسمەکە بلاك ئاوت بکە/ داپۆشە.

٢٨٥١/ 622- **داپۆشین، داگرتن، بەسەردا ڕژان:** بە ڕواڵەت وا دەهاتە بەرچاو کە شەپۆلی شادیی حەشیمەتەکە لە هەموو لایەکەوە دایگرتبوو (بەسەری دادەڕژا) شەرێنێکی لەسەردانانێ.

٢٨٥٢/ 1942- داپۆشین (ی دەنگێك بە دەنگێكی بەهێزتر)، پێنەدەنگ كردن: دەستم كرد بە هاوار كردن، بەڵام هاواری مایك هەی منی داپۆشی.

٢٨٥٣/ 5460- داپۆشین: بەشێك لە پشت ماڵەكەمیان داپۆشیوە(و سایبانیان لیّ ساز كردووە).

٢٨٥٤/ 1477- داپۆشین: داڵانی نێوان خانووبەرە سەرەكییەكەو ئەوەی دیكەمیان داپۆشی.

٢٨٥٥/ 1478- داپۆشین، پەس كردن، پێنەدان: ئەگەر قوماشێك بەو قەنەفەیە دادەن (= ئەگەر ئەو قەنەفەیە بە قوماشێكی كرلوە داپۆشن)، هێندەكە روونـاكتر دەبێ. ● لۆرییەك بە گومیلكەیەكدا رۆیشتو تەواوی بەدەنی پەس كردن.

٢٨٥٦/ 1480- داپۆشین (وشاردنەوە): زۆرم پێ خۆشە كە پۆلیس پەڵە خوێنەكانی داپۆشیون.

٢٨٥٧/ 3069- داپۆشین: شێلان، تووردانەو كاڵەكەمارانەو هەموو ئەو گیایانەی لێ‌داڵێنو هەڵدەچن‌و پێوە دەنووسێن باخچەكەمیان وەها داپۆشیبوو كە زۆرتر وەجەنگەڵێكی چڕو پڕ دەچوو كە كەسی لێدەرناچێ.

٢٨٥٨/ 2021- داپۆشین بە، وەسەنەخستن، دەشتێك رۆكردن، داگرتن: دوای نیشتنەوەی سێڵاو تەولوی دەوروبەری شاری بە قوڕ داپۆشرابوو.

٢٨٥٩/ 6824- داپەستاوتن، داگرتنەوە، فەیلان، داخنینەوە: مەگەم توتنی نێو پیپەكەت باش داپەستێوی، دەنا خێرا دەسووتێ (و زوو تەواو دەبێ).

٢٨٦٠/ 7072- داپەستاوتن (بە پێ): خاكی دەوروبەری ریشەكانی دەبێ بە پێ باش داپەستێودرێن بۆ ئەوەی باش جێی خۆیان بگرن.

٢٨٦١/ 4619- داتاشین بە رەندە: هەتا نارێكییەكانی ئەو لێوارانە لە بەین دەچن، دەبێ بە رەندە بیانتاشی.
← تاشین.

٢٨٦٢/ 6015- داتەپین، بەرەو داتە پێ چوون: بە بڕوای من بەرەو داتەپین دەچێ _ ئاخرین كتێبی لەوی پێشووی زۆر لاوازترە.

٢٨٦٣/ 1087- داخران، بڕان، قەتع بوون: بە هۆی نەبوونی كڕیار، كارخانەكە داخرا. ● دروست پاش سەعاتی ١١ بەرنامەی تەلەویزیون قەتع بوو.

٢٨٦٤/ 1813- داخران: ئەم كراسە لە پشتەوە دادەخرێ.

٢٨٦٥/ 5905- داخستن، تەعتیل كردن: كۆمیتە دەستووری داوە دوو كانگا لە كانگاكان داخەن.

٢٨٦٦/ 5666- داخستن، بەستن (رێگای هاتووچوو): وا دیار بوو كە پۆلیسەكان بە مێشكیان دا نەهاتبوو رێگـای هاتنەژوور داخەن/ ببەستن، یان دەستوور بدەن كەس وەدەرنەكەوێ.

٢٨٦٧/ 1092- داخستن (بۆ ماوەیەك): سەعاتی ٥ی دوای نیوەڕۆیە، نووسینگەكەی دادەخا...
← دەرگا لەسەر كەسێك داخستن، قفڵ كردن، بەستن، تەختە كردن.

٢٨٦٨/ 4195- داخوازنامە نووسین بۆ: ئەگەر دەتەوێ بۆ كوڕەكەت ناسنامەی تازە وەرگری، دەبێ داخوازنامە بۆ ئیدارەی منداڵانی وەرگیراو بە فەرزەندی بنووسی.

٢٨٦٩/ 4534- داخوازنامە نووسین بۆ: چەندین رێكخراو سەبارەت بە ئازاد كردنی بەندییە سیاسییەكان داخوازنامەیان بۆ دەوڵەت نووسی.

٢٨٧٠/ 6601- داخورپاندن: وەڵامەكە وەهای داخورپاند كە تا چەند چركەیەك قسەی بۆ نەدەهات.
← ترسان.

٢٨٧١/ 5850- داخ و كەسەر دەربڕین سەبارەت بە، بەداخ بوون بۆ، فرمێسك رشتن بۆ: خۆ ناتەوێ بۆ ... بە داخ بی، دەنا نا؟
دادان (ی باران) ← دەست پێكردن

٢٨٧٢/ 1861- داداگرتنەوە، كپ كردن: كەركەرەكانی دادلوە بۆ ئەوەی پێشی نووری رۆژیان بگرن.

٢٨٧٣/ 7401- (سەروو داگرتنەوە) داداگرتنەوە، داكپ كردن: شوروشەی ماشێنەكەی داكێشا و سەری هێنادەرێ ئەوەی سەبارەت بە رێگایە پرسیار بكا.

٢٨٧٤/ 3824- داداگرتنەوە، هێنانەخوار: لەكاتی تاقیكارییەدا، دەبێ هەموو سرێچەكان دادەنەوە.

٢٨٧٥/ 352- دادگایی كردن، موحاكەمە كردن: رێگام بدەن با بە تاوانبارەكە بڵێم كە بۆ ئیعدام دادگایی دەكرێ.

٢٨٧٦/ 2984- دادگایی كـران، موحاكەمە كـران، چوونە دادگا/ مەحكەمە: ئەگەر بمگرن، بەرنامەی خۆم هەیە. دەتوانی لەوە تەرخەیان بێ كە هەرگیز ناچمە دادگا.

٢٨٧٧/ 744- دادگایی كردن، موحاكەمە كردن: ئەو بۆمبەی كابرای پۆستچی كوشت من ناردبووم. ئەگەر بێتوو دادگاییم بكەن، دەڵێم شێت بووم/ ئاگام لە خۆم نەبوو.

٢٨٧٨/ 431- دادگایی كردن، موحاكەمە كردن: دوو خوێندكار، بە تاوانی لەسەر فڕێدانی كڵاوخوودی پۆلیسێك دادگایی دەكرێن.
دارایی كەسێك بوون ← پێوەندی هەبوون بە

دارزین ← نزیك بوونەوە لە هەڵوەشان.

۲۸۷۸۰۱/ 3160- (**چاوێکی بە حوکم، دەستێکی بە هێز، زەوقی ئەتێك) دارا بوون، هەبوون:** ئەو بۆ موسیقا هیچ زەوقی نیە. ● من بۆ پۆشاك هیچ سەلیقەم نیە. ● ئەو نووسەرە چاوێکی وردبینی هەبوو. بۆ دیتنەوەی ئوونەهایەك لە خورافات رۆژنامە نووس دەبێ بۆ وەدەست هێنانی هەواڵ زۆرباش بۆن بکا.

بۆ دیفاع لە بابەتێك قسە کردن ← قسەکردن بۆ داکۆکی کردن لە.

۲۸۷۹/ 7458- **دارشتن، دانان:** کۆمیتەیەکی فەرعیان داناوە کە رێسایەکی تازە بۆ یانەکە دارێژێ.

← ئامادە کردن.

دار لەسە بەرد نەهێشتن ← خراپ کردن

دارووشان ← برینداربوون

۲۸۸۰/ 2074- **داسە پاندن، کەلك وەرگرتن لە کەسانی بەهێز:** دەبێ بزانن کە بە چ شێوەیەك دەسەڵاتی خۆیان بەسەر کەسانی بێدەسەڵاتدا دەسەپێنن.

← ناچار کردن بە ئەنجام دانی کارێك.

۲۸۸۱/ 3666- **داشکاندن، پێداشکاندن، لێ کەم کردنەوە، هێنانە خوار:** هەتا نەتوانێ چەند قرانێك لە لیستەی حیسابەکان کەم کاتەوە، هەرگیز دڵخۆش نابێ... ● توانیم پۆندێك بە ژنە خاوەن ماڵەکە داشکێنمەوە، هۆدەی دانیشتنو خەوتنەکە هەموتووی بە چوار پۆندان بگرم.

۲۸۸۲/ 1603 - **داشکاندن، کەم کردنەوە، هێنانە خوار:** رقەبەریی نێوان فرۆشگە گەورەکان بە چەشنێك بوو کە نرخی شتومەکیان ئەوەندە هێنا بووە خوارێ کە بە کردەوە هیچ قازانجی تێدا نەمابوو.

← هێنانە خوار.

۲۸۸۳/ 3096- **داکوتان:** ئەوارێکی زێویان بۆ پاراستنی کۆڵەکەکە لە سەری داکوتا.

← تێرۆکردن، لێدان (لە ئەمرزی) قایم کردن (بە گوڵمیخان).

۲۸۸٤/ 4320- **داکوتانەوە بە بزمار، بزمار کوت کردنەوە:** سایبانەکە لە بەر بای رادەژاو تەقە تەقی دەکرد. بۆیە هاتینو سەر لە نوێ بە بزماران لە دیوارمان داکوتاوە.

۲۸۸۵/ 6382- **داکۆکی یان دیفاع کردن لە:** ئەگەر جارویار لە خۆت داکۆکی نەکەی، هیچ کەس داکۆکیت لێناکا.

← جورئەت وەبەر خۆتانو گرتن.

۲۸۸٦/ 85- **داکۆکی، دیفاع لە خۆ کردن، وەڵام دانەوە:** بێ ئینسافی دەبێ لە رێگای رۆژنامەوە هێرش بکەنە سەر کەسێك لە حاڵێك دا نەتوانێ وەڵام بداتەوە (= داکۆکی لە خۆی بکا).

← لە مافی خۆ داکۆکی کردن.

۲۸۸۷/ 946- **داکووژاندن:** سەرەنجام گەیشتە ئاخری قۆڵی (ژاکێتەکە)و دایکووژاندو نەفەسێکی راحەتی کێشا.

۲۸۸۸/ 1871- **داکەندن، دەرهێنان:** جان گۆرەوییەکەی داکەندو لاقە بە ئێشەو ئۆفەکانی دەناوێ نا.

۲۸۸۹/ 6691- **داکەندن، لەبەر کردن، لە پێ کردن، دەرهێنان:** کەوشەکانت داکەنە (= لە پێ کە) و لاقت وشك کەوە.

۲۸۹۰/ 6947- **داکەندن، لەبەر کردن، دەرهێنان (بە خێرایی):** دامەنو شەڵوارەکەی داکەندو خۆی دەئاوە ساردەکە هاویشت.

۲۸۹۱/ 6852- **داکەندن، لەبەر کردن، دەرهێنان (ی جلو بەرگە بەتاڵۆکە):** کابرای پاسەوان/ پۆلیس چاکەتەکەی بەتاڵۆکە داکەندو خۆی هاویشتە نێو چۆمی.

۲۸۹۲/ 944- **داکەندنو تووڕهەڵدان، داکەندنو فڕێدان:** لیباسەکانی داکەندو فڕێی دانە لایەکەو بۆ نێو ئاوی ساردی دەریاچە شۆڕەجەی لێدا.

← دەرهێنان، رووت بوونەوە.

داکەوتن ← بوونە مژە

۲۸۹۳/ 4792- **داکێشان، داگیران:** کڵاوەکەی هەتا سەرچاوی داکێشابوو، بەچەشنێك کەس نەیدەتوانی بزانێ کێیە.

۲۸۹٤/ 7135- **داکێشان، هێنانە خوار:** لێواری کڵاوەکەی هێنا خوارێ/ داکێشا بۆ ئەوەی تاو لە چاوی نەدا.

← (سووراندنو) دادانەوە، کەم کردنەوە.

۲۸۹۵/ 7278- (**هەموو جێگایەك یان هەموو وڵات) داگرتن:** لەوێ مەرگو وێرانی هەموو وڵاتی داگرتبوو.

۲۸۹٦/ 7495- **داگرتن، داپۆشران بە:** چرە دووکەڵ، دەوری سەری داگرتبوو.

۲۸۹۷/ 6787- **داگرتن، گرتن، ئیشغال کردن، داگیر کردن:** 'چۆن دەتوانن لێرەدا بجووڵێنەوە؟ ئەم تەختە نیوەی دیوەکەی داگیر کردوە/ گرتوە.

داگرتن ← کەم کردنەوە، هێنانە خوار، داپۆشران لە، داپۆشین، داپۆشین بە، بڵاو بوونەوە لە نێو، هەموو جێگایەك یان هەموو وڵات داگرتن. مست لێدان.

۲۸۹۸/ 5138- **داگرتنەوە، کوتانەوە، داخنینەوە:** لە چەکە سەرپرە ئاگرینەکاندا، ساچمەو باررووتیان دە لوولەکەی دەکردو بە میلەیەکی/ شیشەیەکی پۆڵایین دامان دەگرتەوە.

← داپەستاوتن، پەستاوتن.

٢٨٩٩/ 947- داگیرساندن، بەرەڵدان (لە چاپخانەی گۆڤارەکەو ...دا): بۆ ئەوەی ژاکێتەکە بە ئەندازەی پێویست گرشاد بێ چەند لۆی دیکەشی بەرە دا.

٢٩٠٠/ 3921- داگیرساندن، داگیرساندن(ی سیفار)، هەڵکردن: لەسەر کورسیێکی دەسکدار پاڵی داوەو سیفارێکی داگیرساند.

٢٩٠١/ 3876- دامرکاندنەوە: لەحاڵێکدا هێشتا یەکجار زۆر ناهومێد بووم، دانیشتمو داوای پشوودانێکم کرد، زیاتر بە مەبەستی دامرکاندنەوەی وەزعی خراپی رووحیم.

داگیرکردن ← داگرتن

داڵقە لێدان ← فکر لە شتێک کردنەوە

داماڵین ← پاک یان خاوێن کردنەوە

دامان ← دڵتەنگ بوون، پابڕین

داماو ← دڵتەنگ

دامرکاندن ← ئارام کردنەوە

دامرکاندنەوە ← خاوکردنەوەی کەسێک، ئارام کردنەوە.

٢٩٠٢/ 7403- دامرکانەوە: شەوقو زەوقی فرۆشیارەکان لە کزیی‌داو، بەرنامەکەش بە تەواوی دامرکایەوە.

٢٩٠٣/ 1705- دامرکانەوە، کەم بوونەوە، هاتنە خوار: هەستی (خۆشەویستیی) نێوانیان وردە وردە کەم بۆوە.

٢٩٠٤/ 4533- دامرکانەوە، وردە وردە تەواو بوون: گەشە کردنی گەورە (ی ئابووری) لە ساڵەکانی ١٩٢٠، دەکرێ بڵێین هەر لەو سەردەمەدا دامرکایەوە.

٢٩٠٥/ 5813- دامرکانەوە: هەتا ئەو کاتەی هەراو هوریاکە دادەمرکێتەوە، بۆ یەک دوو رۆژان مەگەڕێوە.

٢٩٠٦/ 531- دامرکانەوە، وردە وردە تەواو بوون: هێشتا گڕە باکە بە تەواوی دانەمرکابۆوە کە گزە بایەکی زۆر سارد گوڵەکانی دایە بەر هێرشی خۆی.

دامرکانەوە← کەم بوونەوە، هاتنە خوار، لە هەتەرەی چاو دەرچوون، خاو بوونەوە، ئارام بوونەوە، لەکوڵچوونەوە،

٢٩٠٧/ 287- دامەزران، کارەهەبوون، کاری خۆ هەبوون: ئەوانەی کە بە شێوەی نیوە وەخت دامەزراون، ئەم جێگایە لە فۆرمەکە پڕ نەکەنەوە. ● بابم هێشتاش کاری خۆی هەیە بەڵام ئەو دوو تازە لاوە زەحمەتە بتوانن کارێک پەیدا کەن.

٢٩٠٨/ 457- دامەزران لە، کارکردن لە: لەوەتی دەرس خوێندنت تەواو کردووە، هەتا ئێستا خەریکی چی بووی؟ ماوەیەکی کورت لە شەریکەی بیمە بووم، بەڵام ئێستا لە شەریکەیەکی کەشتیوانی دامەزراوم.

٢٩٠٩/ 5819- دامەزران: دوای گوێستنەوە/ گواستنەوەی ماڵەکەمان وەزعەکەمان کەمێک شپرێوە. بەڵام دوای ئەوە کە دامەزراین، حەتمەن وەرەو سەرێکمان لێبدە.

٢٩١٠/ 1715- دامەزران لە جێگایەک، جێگیر بوون: وادیارە ژیلوان لە قاتی خوارێ جێگیر بووە.

٢٩١١/ 2263- دامەزراندن، دانان: لە ئاپارتمانە تازەکاندا موردێرنترین ئامرازی نێو ماڵیان دامەزراندووە.

٢٩١٢/ 1426- دامەزراندن (ی پێوەندی)، پێک هێنان (ی پێوەندی): ئەنکم لە تەمەنی پیریدا پێوەندییەکی پتەوی دەگەڵ ئاخودایەکی بازنشستە پێک هێنابوو/ دامەزراندبوو.

دامەزراندن ← لەسەرپێ دانان، وەرگرتن (ی فەرتابی)، دانان، پێک هێنان، جێ‌کردنەوە.

٢٩١٣/ 791- دامەزراندن لەسەر: شۆڕکەتەکە لە ئاخرین پڕۆژەی خۆیدا بناخەی چوونە پێشی خۆی لەسەر پێشکەوتنەکانی رابردووی دامەزراندووە/دارشتووە.

٢٩١٤/ 5346- دامەزراندنەوە، جێگیربوونەوە، گەڕاندنەوە بۆ: چەند ساڵێک دەکێشێ هەتا ئاشتی‌و ئاسایش (لە وڵاتدا) جێگیر دەبێتەوە.

٢٩١٥/ 1918- دامەزراوی گشتی (وەک سینەما، پارک، کتێبخانە، گەشتیاریو... کە خەڵک بە شێوەیەکی دەچنە ئێرەو هەر لە ئێمەو ماڵەکانیاندا کاتی خۆیان بەسەر دەبەن).

٢٩١٦/ 3755- دانان، وەلانان، دەست هەڵگرتنەوە لە: بۆ ئەوەی چاوی بەستێنەوە، گۆزەی چنینەکەی وەلا نا.

٢٩١٧/ 6501- دان (پارە، یارمەتی)، هەمبە کردن: دوو کەس لە بازرگانەکانی شار پارەیەکی زۆریان بۆ دروست کردنەوەی شارەکە داوە.

٢٩١٨/ 1116- دان، دانەوە: پێنج پۆندم پێ قەرزدارە، بەڵام بەداخەوە هەرگیز نامداتەوە.

٢٩١٩/ 3339- دان، کەوتاندن، پێوەکەوتاندن.

٢٩٢٠/ 3109- دان (پووڵو پارەو ..): ئەو رۆژە لە حەوتوو گەیشتبوو کە لە مامە ساندرز چاوەروان دەکرا خەرجی حەوتووانەی ماڵێ بدا.

٢٩٢١/ 141- دان (یەکرینگی) بە: نابێ گرنگی زۆر بدرێ بەو راپۆرتە کە دەڵێ لە رووریتانیا بۆی هەیە شۆڕش بکرێ.

٢٩٢٢/ 1454- (پارە)دان، دەرهێنان: ئێستا کە هیچ پارەیەک نیە، دەرینە! (پارەی دەرێنە = بدە).

٢٩٢٣/ 5853- دان (پووڵ، پارە): دەزانم کاتێک سندووقی یارمەتیی بگاتە من، دەبێ لە هەموو کەس زیاتری بدەم.

٢٩٢٤/ 3862- دان (ی‌ناو)، رتووبەت دان، هاتنەژوور، هێنانە ژوور، رێگادان بە: دیواری ناشپەزخانەکەمان/ متبەقەکەمان ناوی دەدا/ تەرشوح دێنێتە ژوور. * لە رێگای دەریچەکانی هەردوو تەنیشتی ماشینەکەوە با دێتە ژوور.

٢٩٢٥/ 4503- دان (پارە، پوول): دەبێ پارەکە بدەم، بێ چەنە لێدانو بێ ئەم لاو ئەو لا.

٢٩٢٦/ 4924- دانان، لەسەر جێگای خۆدانانەوە، تێنانەوە: چێوپەمبەکە لە جێی خۆی بنێوە.

٢٩٢٧/ 4925- دانان، دیاری کردن: کابرایەکیان داناوە کە چاودێریی ئەو کەسانە بکا کە هاتووچووی عیمارەتەکە دەکەن.

٢٩٢٨/ 102- دانان (ی‌کەسێک لەسەر کارێک)، دیاری کردن: ئاغای پیەرسون کرا بە بەرپرسی کۆمیتە.

٢٩٢٩/ 6360- دانان (لەسەر ئەرزی): دەتوانی جارێ میزەکە لە گۆشەی دیوەکە دابنێی.

٢٩٣٠/ 6950- دانان (گۆرانی یان ئاهەنگ)، سازکردن: ئەو دوو پیاوە لەسەر بوتلێک شەراب دانیشتنو زۆر بە ئاسانی دوو گۆرانییان دانا.

٢٩٣١/ 6957- (لە ئەرتەشدا) دانان، دامەزراندن: فەرماندە خەتێکی باریکی لە هێزەکانی مەترووریزی لە پێش بالێکی (بەرەی شەر) دامەزراند.

٢٩٣٢/ 134- دانان بۆ، ئەسپاردن بە: سەرۆکی ئیدارە بەشێک لە خانووەکەی بۆ میوانی گرنگ دانابوو. * دیفاع لە دامەزراوە ئەوتییەکان بە هەنگی ئێمە ئەسپاردرابوو.

٢٩٣٣/ 1691- دانان بۆ، دامەزراندن بۆ: هەر لە سەرەتاوە، باوکی دایناو بیکا بە پارێزەر.

٢٩٣٤/ 70- دانان بۆ، دیاری کردن بۆ: ئەو کارە چەندی وەخت بۆ داندراوە/ دیاری کراوە؟

٢٩٣٥/ 4985- دانان بۆ تەماشاکردن، پێشاندان: بریار وابوو کە هەر جارەی کارەکانی هونەرمەندێک لەو گالەرییە/ قاعەیە نیشان بدرێ.

٢٩٣٦/ 6222- (خۆ) دانان بۆ، دیاری کردن بۆ، خۆ ئامزەد کردن بۆ، خۆ پاڵاوتن بۆ: داخوا بۆ ئەو جێگا خالییەی کۆمیتەی خۆی نامزەد کردووە؟

دانان ← تەرح کردن، دیاری کردن، بەجێ‌هێشتن، لێ‌زیاد کردن، وەلانان، وەرێخستن، جێگا کردنەوە، دامەزراندن.

دانان بە ئەمانەت ← بە ئەمانەت لە لای کەسێک دانان.

٢٩٣٧/ 5791- دانان بە رێکو پێکی، دامەزراندنەوە: میشێل مۆرەکانی/ داشەکانی زۆر بە رێکو پێکی لەسەر تەختەی شەترەنج دانا. * کرلواتەکانیان زۆر جوان رازاندبووەوە بۆ ئەوەی مشتەری راکێش بن.

← دارشتن.

دانان لە پێناو ← خستنە خزمەت.

دانان لە جێگای کەسێک ← لە جێگای کەسێک دانان.

دانان لە دەرێ ← بەجێ هێشتن لە دەرێ.

٢٩٣٨/ 4980- دانان لەسەر، پێوەبەستن: ئەو جار مالیات (باج) لەسەر چی دادەنێن؟

٢٩٣٩/ 3791- دانانو ئامادە کردن، کەلەک لێوەرگرتن: مەرمارەی ئەمرۆمان دانانی/ ئامادە کردنی ئەو لیباسانەیە کە شەوێ دەیەریان دەکا.

دانان وەک ← چاو لێکردن وەک

٢٩٤٠/ 3763- دانانەوە (بە ژێرزەمین لە مەبەستی گلێداگرتن): پێش دەست پێکردنی شەر، باوم چەند بوتری (شەرابی) چاکی لە ژێرزەمین دانابووە (بۆ ئەوەی بگەن).

٢٩٤١/ 4900- دانانەوە (ی مرکەو شەراب): پیاو کاتێک دەبینێ شەرابی فەرانسەیی بە چ نرخێک دەفرۆشن، خۆشحاڵ دەبم کە پارەکە دوو بەرمیل شەرابی سوورو سێزدە دەرزەن/ جەن شەرابی سپیم داناوە

← سوار کردن (ی دەزگایەک)

٢٩٤٢/ 3379- (رووحێکی تازە) دان بە: باسەکە هەروەک زەلکاو ناخۆشو بێرووح بوو هەتا ئەو کاتەی کە جەمال ئاغای کۆنەکار راست بووەو رووحێکی تا رادەیەک تازەی دا بە باسەکە.

٢٩٤٣/ 1671- دان بە، تەحویلدان، دانەدەستی: بە فەرمانداریان دەستووردا کلیلەکانی قەڵا تەحویل بدا.

٢٩٤٤/ 6498- دان ... بە: هێندێک لە حوێندکارەکان هێشتا وتارەکانیان نەداوە بە مامۆستای راوێژکار.

٢٩٤٥/ 5031- دان بە: دروست کردنی کەمەربەندو قۆلاپەکان ئەیارە دەدەن بە کونتراتچییە چکۆلەکان.

٢٩٤٦/ 5074- دان بە (قەرز): کاتێک ئەو دراوە زۆرو زەوەندەمان خەرج کرد، نیو میلیۆنی دیکەشیان (بە قەرز) داینێ.

٢٩٤٧/ 4891- دان بە، پێشکەش کردن: ئەو پێشنیارانەی سەبارەت بە رێفۆرمی هەمە لایەنە کراون دران بە کۆڕی وەزیران.

٢٩٤٨/ 1376- دان بە سەرکەوتنی ئەیار داهێنان: کاتێک کە لە چوار بەشی دەنگەکان سێ‌بەشیان خوێندرابوونەوە، سەرۆک وەزیران دانی بە سەرکەوتنی حەریف داهێنا.

**٢٩٤٩/ 2702- دان بە شکستی خۆدا هێنان، شکستی خۆ قبووڵ کردن:** 'دەزانی چیە؟ ئەمن نـاوی هـەموو چەشـنە کورسـی‌یەکم بردوە. ئیدی هیچ شتێکی دیکەم پێشك نایـە. شکسـتی خۆم قبووڵ دەکەم. شتەکە چی‌یە؟' . '' نیمکت''ە.

**٢٩٥٠/ 3395- دان (ی پیا) بە کەسێك، وەر وەبەرنان، پێشك هێنـان (ی نازایەتی) لە کەسێك دا:** ئـەوە نازایـەتیی‌و لـە خۆبوردوویـی باوکم بووکە رووحی نازایەتیی وەبەر پیاوەکانی دەنا.

**٢٩٥١/ 1391- دان پێداهێنـان، پێداهێنـان:** هەندێ ســـون حـــازر نەدەبوو پێ لەو راستی‌یە بنێ کە کاتێك لە لـەندەن بـووە چووبێتە ستریپ تیزان (= لەو جێگایەی ژنان خۆیان رووت دەکەنەوە).

دان پێداهێنان ← پاشەکشە کردن، حاشا نەکردن.

دان بە ← کردن، کڕین، پێشـکەش کـردن، خـەرج کـردن، تەیار کردن بە، دانـە دەسـت، تـەحویل دان، بـەرێکردن، فەراهەم کردن بۆ.

**٢٩٥٢/ 191- دانـدران/ دامـەزران لەسـەر، راوەسـتان لەسـەر:** سەرکەوتنی لە کاسبی‌دا لەسـەر هەڵـسەنگاندنی عاقڵانـەی ویستی کڕیاران دامەزراوە.

**٢٩٥٣/ 1350- داندران بـۆ فرۆشتن، هـەراج کـردن، مەزات کـردن:** حەوتووی داهاتوو کۆلێکسیۆنێك لـە چەکـەکانی سـەدەی شازدەهەم هەرراج دەکرێ. ● داخوا بەو زووانە خانووکەی دێتـەسەر فرۆشتن؟.

← دیاری کران بۆ.

**٢٩٥٤/ 3054- داندران لەسەر بناخەی:** دەوڵـەت ئیدیعـای دەکرد کە سیاسـەتەکانی لەسـەر بناخـەی راسـتی‌یەکانی مەوجوود داندراوە نـەك لەسـەر خـەون‌و خـەیاڵ‌و ئـاواتی بێ‌جێ.

داندراندن ← بەردانەوە.

داندو پێکەوە کۆلاَن ← موناسیب بوون بۆ.

**٢٩٥٥/ 7049- دانووستان، کڕین‌و فرۆشتن، مامەڵە کـردن:** لـە ئەفریقای رۆژئاوادا زۆر کەس هەن کە لـە رادەی گـەورەدا لە زەمینەی کڕین‌و فرۆشتنی خورما، کـەکاوو کـانوچۆدا کار دەکەن.

← مامەڵە کردن.

**٢٩٥٦/ 2067- دان‌و وەرگرتن:** زۆر جار دوای بـەرچای دەگـەڵ دراوسێکەمان هێندێك قسان دەکـەین (چـەند هـەواڵێکم پێ‌دەدا و چەند هەواڵێکم لێوەردەگرێ - وەرگێر-).

دانەبەر رەهێڵەی تۆپان ← کەوتنەبەر رەهێڵەی تـۆپ یـان مووشەکان.

**٢٩٥٧/ 6541- دانەبـەر رۆژڵـەی ...، بـە لـووزەو بـەرێکردن:** تەماشاچی‌یە نارازی‌یەکان شەریکەی تەلەفزیۆنیان دابـوون بەر رێژنەی نامەی رەخنەگرانەی خۆیان.

**٢٩٥٨/ 4786- دانەبەر لافاوی رەخنان:** هیچ کارێك لـەوە زیـاتر پیـاوی نـاهومێد ناکـا کـە وتارەکـەت لەبـەر چـاوی خوێندکارەکانی دیکە دەدەنەبەر لافاوی رەخنان.

← هیچ پێوە نەهێشتن.

دانەبەر هێرشی خۆ ← خواردن.

**٢٩٥٩/ 2660- دانـەدەس لێهەستان، لێهەڵـاتن:** دەعباکـە هـەڵ نەدەهات، بەڵکوو لەسـەرجێی خۆی دانیشتبو لووریـەکی لێدەهات. ● لە شەوانی هاوین دا، بۆنێکی ئیشـە بزوێـن لە گوڵان هەڵدەستێ.

**٢٩٦٠/ 6959- دانەدەس لـێهەستان:** دەزگـای تـازەی گـەرمای نـاوەندی/ ئەبرکونیشـنەکە کـە بـە گـاز کاردەکـا زۆر کارامەیەو، گەرمایەکی زۆر دەداتەدەر.

**٢٩٦١/ 5726- دانـەدەس (لـە پێوەندی دەگـەڵ بنەمـیەم/ جیهـاز/ ئامێر...) بەرێکردن:** ئەو ئانتێنە کـە زۆر لـەمێژە کـەلکی لێوەرنـەگیراوە، هـەموو چەشـنە پـەیامێکی وەردەگـرێ‌و بەرێ‌دەکا.

**٢٩٦٢/ 9019- دانـەدەس دان:** لـە سـاڵەکانی شـەڕدا، فرۆکـە شەڕکەرەکان زیاتر لە هەزار تەسپی بوخلر هێزیان دەدا.

← دروست کردن.

**٢٩٦٣/ 2661- دانەدەست، دان بە، تەسلیم کردن:** کێ نـاوی منـی داوە بۆ بەشداری کردن لە هەڵاتنی ماراتۆن دا؟ بـۆ خـۆم کەشتی وام نەکردووە.

← وەدەست هێنان.

**٢٩٦٤/ 7104- (متمانە کردن بە کەسێك‌و شتێك)، دانـە دەستی، لـە ئیختیاری نان، شتێك پێگوتن:** ئەو لەو جۆرە کەسـانە نیـە کـە پیاو بتوانێ (متمانەی پێ‌بکا) و پارەیەکی زۆرو زەوەنـدی بداتە دەستی.

**٢٩٦٥/ 3838- دانە دەستی کەسێك، درانە دەسـتی کەسـێك، ئەسپاردن بە:** ئەو کارە بە من بسـپێرە. ● کـاری خواردەمـەنی بـە دایکم بسپێرن. ● نووسینی یاسـای هـەڵبژاردن دراوەتـە دەستی پارلمانی تازە.

**٢٩٦٦/ 3105- دانە دەستی یان ئەسپاردن بە ئورەمەی ئـایندە:** هـەر تۆرەمەیـەکی کـە دەگاتـە سـاڵی ئـاخری دەبیرسـتان، ئەزموونەکانی رابردووی دەودرێتە دەسـتو ئەویش دەتوانێ بەشی خۆی لـێ‌زیاد دەکا.

۲۹٦۷/ 3110- داناه دهستی ...، ئهسپاردن به: کاتی ئهوه هاتبوو که بهرپرسایهتییهکان به دهولهتی ههلبژێراوی ناوچهیی بسپێرن/ بهرپرسایهتییهکان بدهنه دهستی دهولهتی ههلبژێراوی ناوچهیی.

← تهحویل دان به، ئهسپاردن، بهجێ هێشتن.

دانهسهر ← خستنه سهر.

۲۹٦۸/ 3551- دا ئهکهندن، لا لهبردن (ی کلاو)، ههلنهگرتن: له کلیسا پیاوان کلاوهکانیان ههلدهگرن؛ له کهنیشته داینانێن.

۲۹٦۹/ -

۲۹۷۰/ 5271- دانهوه، بۆ ناردنهوه: زۆر خۆشحال دهبین که پارهی ههناردنی رۆژنامهکانتان بۆ بنێرینهوه (= بدهینهوه).

۲۹۷۱/ 5713- دانهوه (ی کالایهکی خراپ به خاوهنهکهی): یهکێك له قۆلهکانی ئهم بالتۆیه زۆر درێژه، بیدهنهوه به دوکانهکه.

۲۹۷۲/ 4486- دانهوه (ی پوول، پاره): شانسێك دێنهوه پوولهکهت دهدهمهوه. ● ئێستا راست وهختێتی ئهو سهد پوندهی پێم قهرزداره بیداتهوه.

۲۹۷۳/ 4491- دانهوه (ی قهرز): پێش ئهوه که بتوانی وامێکی تازه وهرگری، دهبێ قهرزهکانت بدهیتهوه.

۲۹۷٤/ 4495- دانهوه، پهرداخت کردنهوه: بۆ کرینی بووکهشووشه/ ئهسباب بازی/ ئامرازی کایه کردن، دهتوانن پوولهکانتان له ماوهی سالێدا بدهن به باشگای/ یانهی کریسمس؛ باشگاش له مانگی دیسامبردا پاشهکهوتهکان دهداتهوه.

۲۹۷۵/ 2769- دانهوه، گهراندنهوه: ئهو ماشێنه دهبێ بدرێتهوه بهو دوکانهی لێم کریوه.

۲۹۷٦/ 2653- دانهوه: ئایا کاتی ئهوه نههاتووه گۆڤارهکانی تروسکهی بدهیهوه (به خۆی)؟

۲۹۷۷/ 7426- دانهوه (به تهواوی): قهرزهکانی مهوزهی (عهنتیکهخانه) به تهواوی درابۆوه.

۲۹۷۸/ 3099- دانهوه، گهراندنهوه بۆ، تهحویلدانهوه: تکایه لهبیرتان نهچێ پێش ئهوهی له هوتێل وهدهر کهون، کلیلی دیرهکتان تهحویل دهنهوه.

۲۹۷۹/ 5344- دانهوه به: تابلۆ دزراوهکانیان داوهتهوه به خاوهنهکانیان.

دانهوه ← گهراندنهوه، قهرهبوو کردنهوه.

دانهوه ← بهشدار کردن، قهرزی خۆ به تهواوی دانهوه.

۲۹۸۰/ 5345- دانهوهی پاره و پایه، بهرپرسایهتی و ...: ئهفسهرهکه له دادگایهکی بهرزتر "تبرئه" بووه دهرهجهکهشیان پێداوه.

۲۹۸۱/ 5264- دانهوهی پوول/ پاره به، وهرگرتنهوه: ئهگهر مشتهرییه بهرێزهکان لوتف بکهن و بچنه نووسینگهی رێزبوو کردن (حیجز کردن)، پارهکانیان پێدهدرێتهوه.

۲۹۸۲/ 5274- (سهرلهنوێ) دانهوهی شتێك به کهسێك: به هۆی گۆرانێکی کورتوبری ههوا، جلو بهرگی گهرمیان سهرلهنوێ دلوه به پیاوهکان.

۲۹۸۳/ 5955- دانیشتن (راست): پێم وایه ئهخۆشهکه وهزعی تا رادهیهك باشتر بووه که بتوانێ لهسهر جێگاکهی دابنیشێ. ● لهسهر سفرهی بهرچایهکهت خۆت خوار مهکهوه. راست دانیشه!

۲۹۸٤/ 2518- دانیشتن، حهسانهوه: سهرگۆل وهره کهمێك وهحهسێ.

۲۹۸۵/ 5942- دانیشتن (زیاتر لهسهر کورسی/ سهندهلی): کاتێك وهژوور کهوتم، خهلکهکه دانیشتبوون.

۲۹۸٦/ 5815- دانیشتن بۆ (گارێکی لهسهرهخۆ): بۆ باسێکی ئاراهو لهسهرهخۆ دهربارهی زارلوهی ئینگلیسیی عامیانه، دانیشتن.

← کۆبوونهوه.

۲۹۸۷/ 5954- دانیشتن له ئینتاتر و سینهماو ... ههتا کۆتایی: ئهگهر قهرار بێ پێش دیتنی فیلمهکه، لهپێش دادهبێ پێش پهردهیهکی/ پێشهکییهکی تۆزێ ههتا ئاخری تهماشا بکهم، حازر نیم بێمه سینهما.

۲۹۸۸/ 6713- دانیشتن و حهسانهوه: ئهم کورسییه له ههموان خۆشتره. دانیشه و با لاقهکانت کهمێك بحهسێنهوه.

۲۹۸۹/ 5953- دانیشتن ههتا کۆتایی بهرنامهیهك: به بروای من بهرنامهیهکی ناخۆش بوو، نازانم چۆن تواتنیم ههتا ئاخری دانیشم.

۲۹۹۰/ 4193- دانی شتێك به کهسێك: باشترین زهویی کشتو کالیان دا به برای چکۆله.

۲۹۹۱/ 7078- دانی شتێك به کهسێك بۆ تهشویق کردن: دوای سهردانی سالانهی ئوستاندار له قوتابخانهکه، نیوه پشوودانێکیان دا به ههموو قوتابخانهکه.

۲۹۹۲/ 6737- دانی شتێك له جیاتی کالایهکی گهراوه: کاتێك دهزگاکهم بردهوه، بهرپرسی فرۆشگه پارهکهی نهداهمهوه و له جیاتی ئهو بهلگهیهکی قابیلی فرۆشتنهوهی دامێ.

٢٩٩٢/ 884- **دلوا كردن، ويستن ( له كەسێك بۆ قسە كردن):** ئێستاش لە ئاغای وایت دلوا دەکەین هەستێ و بۆ سوپاس کردن لە کۆمیتەی پێشنیاری دەنگ وەرگرتن بکا.
← ویستن.

٢٩٩٤/ 127- **دلوا کردن، دەرەتسەر بۆ خۆ دروست کردن:** ئەکەی دەست لە سێوی ئەو باخە بدەی؛ ئەگەر دەستیان لێدەی، بە بێگومان دەردیسەر بۆ خۆت ساز دەکەی.

٢٩٩٥/ 126- **دلوا کردن (ی ...)؛ داخوازی ... بوون:** ئەگەر گەورە گرفتێکت بۆ هاتەپێش، لەبەر ئەمێ داوای ڕێنوێنی (لە ئێمە) بکەی.

٢٩٩٦/ 4948- **دلوا کردن بە نامە، نووسین و دلوا کردن:** دەمەوێ (بنووسم) دلوا بکەم لە باکوور یان هەر جێگایەکی دیکە پۆستێکم دەنێ، بەڵام هەرگیز دەستم لێ هەڵناگرن.

٢٩٩٧/ 5323- **(بە شێوەیەکی رەسمی و بەڵگەداری) دلوا کردن لە:** بەرپرسی فرۆش ( لەشیرکەتەکە دا داوای لە هاوکارەکانی نێو بازاڕی کرد کە ئاخرین و تازەترین زانیاریی بدەنێ.

٢٩٩٨/ 885- **دلوا کردن لە:** ناچار دەبین لە دۆستەکانمان داوای یارمەتیی بکەین.

٢٩٩٩/ 4658- **دلوا کردن لە، پاڕانەوە لە:** پاڕانەوە لەبەر ئەو جۆرە کەسانە، بێ‌فایدەیە. *دەتوانی شانسی خۆت تاقی بکەیەوە و لە خاوەن ماڵەکە دلوا بکەی بۆ دانەوەی ئەو کرێ ماڵەی وەپاش کەوتووە دەرفەتت بدا/ ماوەیەکت لێ ڕاوەستێ، بەڵام پێم وانیە سەرکەوی.

٣٠٠٠/ 101- **دلوا کردن ( لە )، (بۆ)، (زۆرتر بە نووسراوە):** خالی ئامادا لە کۆمیتەی بەردە زوخال داوای شوغلێکی کردووە.

٣٠٠١/ 898- **داوای بە هاوارەوە چوون کردن، داوای یارمەتی کردن:** لەوە گەیشتووە کە ئەگەر بیەوێ شکست نەخوا، ناچار دەبێ دلوا لە ئەفرادی زەخیرە بکا بێنە یاریدەی.
← پاڕانەوە لە.

٣٠٠٢/ 895- **داوای بێدەنگی کردن (لە بەشداربوانی کۆبوونەوە):** سەرۆکی کۆبوونەوە لە سەعاتی ٢ داوای بێدەنگی کردو، بەم جۆرە کۆبوونەوەی دوای نیوەڕۆ دەستی پێکرد.

٣٠٠٣/ 3793- **داوای حەقی (مافی) خۆ کردن لەسەر شتێک:** وەسیەتنامەی ئاغای گرین بەبێ هیچ ئەو ئەولایەک دەگەڵ گەورە گرفت بەرەوروو دەبێ؛ کۆنە ژنەکەی بێگومان لە پێوەندیی دەگەڵ ئەو پارە زۆرو زەبەندەی بۆ خزمەتکاری ماڵەکەی بەجێی هێشتووە داوای حەقی خۆی دەکا.

٣٠٠٤/ 268- **داوای خەسارەت/ قەرز کردن لە:** کاتێک هەواڵی نابووت بوونی سیت بڵاوبووەوە ئەوانەی قەرزیان لەسەری بوو هاتنەسەری بۆ قەرزەکانیان.

٣٠٠٥/ 1159- **داوای خەسارەت کردن لە:** ئەو لە کابرای ڕانەندە داوای خەسارەتێکی قورسی دەکرد کە ڕێی کەوتبوو.

٣٠٠٦/ 6516- **داوای شتێک کردن:** ئەگەر بە هۆی کەمتەرخەمیی ئەوانەوە لاقت بشکێ، دەتوانی دلوای خەسارەتیان لێ بکەی.

٣٠٠٧/ 4170- **داوای شتێکی لە توانابەدەر کردن لە ...:** کامران دۆستێکی کۆڵە، بەڵام عیشایە خودای نیە. پێم وایە کە نابێ داوای (یارمەتیی ماڵی) لێبکەم.

٣٠٠٨/ 493- **داوای لێبووردن کردن:** بەڵێنی دابوو زوو بێ و یارمەتیمان بدا، بەڵام لە ئاخرین دەقیقەدا داوای لێبووردنی کرد.

٣٠٠٩/ 92- **داوای لێبووردن کردن لە کەسێک بۆ ...:** چونکە پێی لە قامکە گەورەی پێم نابوو، بە دڵەوە دلوای لێبووردنی لێ کردم.

٣٠١٠/ 6954- **داوای لێبووردن یان بەخشین کردن:** تاوانی کابرای "متهم" ئاشکرا بوو، بۆیە تەنیا کارێکی کە لە دەستی دەهات ئەوە بوو کە لە دادگا داوای لێبووردن بکا.

٣٠١١/ 1045- **داوای وەرگرتنەوەی شتێک کردن:** ژنو پیاوە ئەمیانەکەی/ دایەنەکەی سووزان زۆر بە پەرۆش بوون کاتێ دایکی کچە پاش شەش ساڵان داوای وەرگرتنەوەی دەکرد.

٣٠١٢/ 6936- **داوای هاتنە مەیدان کردن لە کەسێک:** قارەمانی (بۆکس/ مشتەکۆڵە) ناچارە بەم زووانە لە عینوانی خۆی داکۆکی بکا، چونکە نەیارێکی گەنجی ئەمریکایی داوای لێکردووە بۆی بێتە مەیدانێ.
داوای یاریدە کردن ← داوای بە هاوارەوە چوون کردن.
دارتەلەب بوون بۆ ← خۆ ئامادە کردن بۆ.
داوەت لە دڵدا گەڕان ← (لە خۆشیان) فڕین.

٣٠١٣/ 5947- **داوەری کردن، قەزاوەت کردن:** بایز، واخۆت ڕامەنێ کە گۆیا لە مەسەلە ئەخلاقییەکان دا پیاوێکی زانای. بۆ خۆشت باش دەزانی کە لەو پلەو پایە دانی کە لەسەر هیچ کام لە ئێمە داوەری بکەی.

٣٠١٤/ 110- **داوەری کردن (لە نێوان)، ناوبژیوانی کردن:** داوەرێکی بە ئەزموون دلوا کراوە لە نێوانیان دا ناوبژیوانی بکا.

٣٠١٥/ 6612- **داوەری کردن، هەڵسەنگاندن، نرخ بۆ دانان، (بە لەبەرچاو گرتنی رواڵەتی کەسێک):** ئەو خەڵکە رێز لە

هونەرمەندان دەگرن‌و، بە لەبەرچاو گرتنی ڕواڵەتی کابرا داوەری لەسەر دەکەن.
← قەزاوەت یان داوەری کردن لەسەر.
٣٠١٦ 3477- **داوەری کردن لەسەر، قەزاوەت کردن لەسەر:** خەڵک هێشتاش بە لەبەرچاو گرتنی دۆستەکانی هەر کەسێک لەسەری قەزاوەت دەکەن. ● بەلەبەرچاو گرتنی جێی شوێنی قامکەکانی کابرا لە بەشی سەرووی کومێزدەکە دەتوانین بڵێین (داوەری بکەین/ نەزەر بدەین) کە کابرایەکی کەلی‌گەد بووە.
← قەزاوەت کردن لەسەر، رەفتار کردن.
٣٠١٧ 2788- **داوەری کردن لەسەر بناغەی ...:** ئەگەر بێتوو راپۆرتی پسپۆڕەکان بکەینە بناغەی داوەریمان، دەبێ بڵێین قاتی‌و قڕییەکی زۆر خراپ تر ئینگلستان دادەگرێتەوە.
٣٠١٨ 3762- **داوەری یان قەزاوەت کردن لەسەر کەسێک:** باوکم لە یەکەم چاوپێکەوتن داو، دوای ماوەیەکی زۆر کورت لەسەر کەسایەتیی کابرای داوەری دەکا.
٣٠١٩ 5200- **داوێنی کەسێک گرتنەوە، دووکەڵی ... چوونەوە دەچاوی ...، کەوتنەوە لەستۆی، پێی کەسێک گرتنەوە:** ئەو کارە جۆیەجێ مەکە، دووکەڵەکەی دەچێتە چاوی خۆتەوە/ ناکامە خراپەکەی پێی خۆت دەگرێتەوە.
داهات ← دەسکەوت.
٣٠٢٠ 1234- **داهاتن:** موسافیرەکان دەیانەویست پێش ئەوەی شەو دابێ بگەنە موسافیرخانەکە. ● خەریکە زستان دادێ؛ دەکرێ لە رووی هەواوە هەستی پێبکەی.
٣٠٢١ 2458- **داهاتنەوە:** کە دادەهاتەوە بۆ ئەوەی لە چەکمەجەی (کەشەوی) خوارەوە شتێک دەربێنێ، پشتی دێشا.
← هەڵترووشکان.
٣٠٢٢ 1177- **داهات هەبوون:** هیچ کارێک ناکا، بەڵام لەو سەرمایەگوزارییەی کردوویەتی لانی کەم هەزار (پوندی) داهات هەیە/ داهاتە.
داهێزاندن ← پێداهێزان.
٣٠٢٣ 7355- **داهێنان، کووڕ کردن:** 'ئەم بەستە لەسەر پشتم هەڵگرە، کووڕی کردووم.'
٣٠٢٤ 6902- **داهێنان، دۆزینەوە، دیتنەوە، هەڵبژاردن:** هێشتا هەروا خەریکین ناوێکی باش بۆ ئەو کتێبە بدۆزینەوە.
← دۆزینەوە.
٣٠٢٥ 4381- **ددان بە گوناهی خۆ داهێنان، کەمتکی خۆ قبووڵ کردن:** جاروبار هەڵەکانمان زۆر لەوە گەورەتر دەبن، بەڵام ئەوەی

کە گرنگ بێ ئەوەیە کە ددان بە کەمتنی/ گوناهی خۆمان دابێنین‌و داخی کەسەری خۆمان دەربڕین.
٣٠٢٦ 6369- **ددان لەسەر جەرگی خۆ داناان، تەحەممول کردن:** سوێندی خوارد کە ددان بە جەرگی خۆی دادەگرێ و هەتا ئەو ڕۆژەی کە کارێکی باش پەیدا دەکا، هەروا بێکار دەیگوزەرێنێ.
٣٠٢٧ 4271- **دران(ی حوکمێک)، دامەپاڵدن، بەرپۆەبران:** ئەو حوکمەی لەسەر کابرای تاوانبارکرلو دابوویان خەڵکی رازی نەکرد.
٣٠٢٨ 164- **دران بە، پێشکەش کران بە:** خەڵاتی یەکەم درابە گەنج ترین بەشدار لە پێشبڕکێکەدا.
٣٠٢٩ 2962- **دران بە، هەدیە کران بە، بە میرات پێگەیشتن:** جایزەی یەکەمی بیولۆژی درا بە کەم تەمەن ترین قوتابیی پۆلەکە. ● کاتێک تەواوەتی دارایی کابرای پیر (بە شێوەی میرات) بە کابانی/ کەیوانووی ماڵەکە گەیشت، هەموو ئەندامانی بنەماڵە رەخت بوو لە داخان رەزگ دەن.
٣٠٣٠ 1699- **دران بە، لەسپێردان بە، کەوتنەسەر شانی:** کاتێک بالوێزێک دەچێتە پشوودان، ئەرکەکانی بە سکرتێری یەکەم دەسپێردرێ.
٣٠٣١ 5821- **(بە پێی وەسییەت) دران بە، گەیشتن بە، بوون بە:** زۆرترین بەشی داراییەکەی بە سێ کورەکەی گەیشت.
٣٠٣٢ 528- **دڕان، پچڕان:** کاتێک بەو جاددە پڕدەڵانەی کوێستانان دا (بە ماشێن) دەڕۆی، دەبێ چاوەڕوانی چەند جارێک پچڕان(ی لاستیکەکانت) بی.
← کون بوون، رەزگدان، لێک هەڵوەشان.
٣٠٣٣ 6844- **دڕاندن، دڕین، وەک هاران خواردن:** برینەکانی کابرای نەخۆش وەها دەخوران کە کابرا باندپێچییەکەی دەدڕاند.
٣٠٣٤ 6841- **دڕاندن (لە نێوەڕاستێڕا):** بە رادەیەک لە شێوەی بەیانی نامەکە تووڕە بوو کە لە نێوەڕاستێڕا دڕاندی.
٣٠٣٥ 5411- **دڕاندن، دڕبە دڕ کردن:** پێش ئەوەی ئەو بیچوورە پشیلانە ڕۆژنامەکەم دڕ بە دڕ کەن، بۆ خاتری خودای لێیان بستێنمەوە.
٣٠٣٦ 6860- **دڕاندن، دڕبە دڕ کردن:** 'ئایا مەبەستت ئەوە بوو کە رەسیدەکەم راگرتبا؟ بەداخەوە دڕاندم.'
← لەت (بە) لەت کردن.
٣٠٣٧ 5410- **دڕاندن (لە نێوەڕاستێڕا)، لەت کردن:** بێ‌ئەوە کە هیچ بڵێ راپۆرتەکەی لە نێوەڕاستێڕا دوولەت کرد/ دڕاندو دە سەتڵی زبڵی هاویشت.

٣٠٣٨ 6847- **دڕاندن و لێکردنەوە:** دەتوانی ئەم ڕەسمەی (سەر دیواری) ، بە قامکەکانت بدڕێنی و لێی بکەیەوە؛ مۆرکە هەمووی خواردووە. ● گوڕانی باڵتۆکەت دە بزمارێکی ناڵکاو هێندەی نەمابوو بدڕێ و لێ ببێتەوە.
← لێکردنەوە.

٣٠٣٩ 1830- **دڕان لەبەر پێکەنین:** قسەی خۆش ئەوەیە کە کاتێک لەسەر بەرزەک گوترا، تەماشاچییەکان لەبەر پێکەنین بدڕێن.

٣٠٤٠ 5438- **دڕان لە پێکەنینان، بەدڵەوە پێکەنین، بە کەیفی خۆ پێکەنین:** ئەو هونەرمەندە قۆشمانەی فیلمە بێدەنگەکان وێناچێ خۆشەویستیی خۆیان لەلای خەڵک لە دەست بدەن؛ ئێستاش دەتوانن تەماشاچیی فیلمەکانیان بەدڵەوە وەپێکەنین خەن.

٣٠٤١ 4820 - **درانەبەر، کەوتنەبەر شاڵاوی ڕەخنەن، زۆر تووندرەخنە لێگرتن/ لێگیران:** ئەو تیئۆرییەی کە لەم دواییانەدا لە پێوەندی دەگەڵ پەیدا بوونی جیهان هاتۆتە گۆڕێ، کەوتۆتەبەر شاڵاوی ڕەخنەی ژمارەیەکی زۆر لە ئەستێرەناسانی بەناوبانگ.
درانەبەر ← هاتنەدەر لە.
درانە دەستی فەرامۆشی ← وەدواکەوتن.
دڕاو ← کۆنە.

٣٠٤٢ 1520- **دراونە دەستی کەسێک ئاڵ (لە پێوەندی دەگەڵ ئەو کەسانەی گێتیان دەگرنەوە):** پرۆلێکی زێوم دەدەستی ئێوە بێت دەڵێم ئایندەت چۆنە؛ لە قیافەشت را دەزانم ئاغایەکی خۆشبەختی.
دردۆنگ بوون لە ← بە گومان بوون لە.

٣٠٤٣ 2517- **درکاندن، بوغچەی دڵ کردنەوە، هەڵڕشتنی (دەرد و داخ):** لەوێ دامەنیشەو قوڕو قسێ مەکە. ئەگەر شتێکت لە دڵ دایە، بیکە بۆ خاتری خودا بیدرکێنە باباسی لەسەر بکەین.

٣٠٤٤ 544- **درکاندن، لە پڕ بە ئاشکراوی گوتن:** جیمز لە نارەحەتییان زمانی بەستراوبوو، بەڵام لەپڕایەکی بە میوانەکەی گوت، ئیدی پێویست ناکا لەمەودوا بێیە ئەو ماڵە. ● زیندانییەکە وەها نارەحەت ببوو کە لەپڕ هەموو ئەو زانیارییانەی درکاند کە لە بارەیانەوە پرسیاریان لێ دەکرد.

٣٠٤٥ 5153- **درکاندن و بە گوتندان، شت لەسەر گوتن و بە گوتن دان:** بەتایبەتی لەم سەردەمەدا کە زۆر شت بە نهێنیکارییەوە بەستراوەتەوە، هیچ کەس پێی خۆش نیە شتی لەسەر بگوترێ و بە گوتن بدرێ.
← گوتن، ئاشکرا کردن، ئیعتیراف کردن، نهێنیی خۆ لەلای کەسێک درکاندن.

٣٠٤٦ 7160- **دەرگا لەسەر کەسێک داخستن پێ، قفل کردن:** هاوڕێشتیانە ئێو هۆدەیەکی چکۆلەو کاتێک نیگابانەکە دەرگاکەی قفل دەکرد، ئەرخەیانی کردم کە سبەینێ سەرم دەبڕن.

٣٠٤٧ 6519- **دروان بوڵ، پڕیە پێست بوون، بە تەواوی لەشلەن بوون:** ئاڵفرێد کاری باخەوانیی بۆ خۆی دیوەتەوە. ئەو کارە بەکردەوە بە واتای ئیستیعاریی زاراوەکە بۆ ئەو پڕ بە پێستی یەتی.
دروست بوون ← پێکهاتن.

٣٠٤٨ 3000- **دروست کران، چوونەسەر:** چاو لە هەر جێگایەکی دەکەی ئەوە خانووبەرەی زەبەلاحی کۆنکرێتەو شووشەیە کە دەچێتەسەر. ● لە ساڵەکانی ١٩٦٠دا، بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەرەوە خانووبەرەی زانستگاکان دەچوونەسەر (= دروست دەکران).

٣٠٤٩ 5069- **دروست کران:** ئەوانە کەلە خانووبەرەیەک بوون کە لە سەردەمی تیۆدۆر (تەیمەس)دا دروست کرابوون.
دروست کران بۆ ← لەدایک بوون بۆ.

٣٠٥٠ 1685- **دروست کران لە، گیران لە:** مارگارین (کەرەی نەباتی) لە ڕۆنی گیای دەگیرێ.

٣٠٥١ 5423- **دروست کرانەوە، سەربەرز کرانەوە دوای وێران بوون:** پاش دوو سێ ساڵ کارو تێکۆشان بۆ ئاوەدان کردنەوە، زۆر شاری بەناوبانگ دوای وێرانی سەریان بەرز کردەوە/ دروست کرانەوە.

٣٠٥٢ 3696- **دروست کردن، زۆر بە خێرایی:** نامەوێ خۆ رابنێم و بڵێم پیاوێکی بەدەستوبردم، بەڵام ئەگەر پێویست بێ، دەتوانم دەمو دەست مێزێک دروست کەم.

٣٠٥٣ 1897- **دروست کردن، ساز کردن:** هەموو شتێک یەکجار باش هاتەدەر، زۆر باشتر لەوەی کە لە شەقامی... سازمان کردبوو.

٣٠٥٤ 5588- **دروست کردن (لەو شتانەی کە لەبەر دەست دابن):** ئەیتوانیبوو لیباسێکی باشی مەلە کردن کە بۆ سەری ببێ پەیدا بکا. لە ئاکام دا بۆ خۆی دوو دانەی (لەو شتانەی کە لەبەر دەستی دابوون) دروست کرد.

٣٠٥٥ 788- **دروست کردنی شتێک لە (زووریدا):** بۆ کڕینی بۆفیە زەحمەت مەکێشن: دەڵێم لە زووری بۆتان دروست کەن.

٣٠٥٦/ 7167- دروست کردن، دانەدەس، پەروەردە کردن، بڵاوکردنەوە: گرنگترین نەخشی هەر فێرگەیەکی پەرستاری/ سیستەری پەروەردە کردنی ژمارەیەك لە خێزانی پزیشکەکانە.

٣٠٥٧/ 2343- دروست کردن: ئەو شتانە لە تێکەڵ کردنی چەندین شتی ئاوەکی دروست دەکەن کە لەژێر فشارێکی زۆردا رەقیان دەکەن.

٣٠٥٨/ 4215- دروست کردن لە: خەریکن تەختێکی خەوتن لە وردە تەختان دروست دەکەین. * گەردنبەندێکی دە مەل دابوو کە لە پووڵی زێو دروست کرابوو.

٣٠٥٩/ 4201- (لە خۆوە) دروست کردن، سازکردن: ئەو هونەرمەندە قسە خۆشانە، هەروەها کە دێنو دەچن داستانەکانیان (چیرۆکەکانیان) لەخۆوە دروست دەکەن. * ناتوانێ بێیوبچی و چیرۆکێك لەخۆتەوە ساز بکەی کە گۆیا کەسانێك هێرشیان کردۆتەسەرت کە هەر لە بناخەوە وجوودیان نیە.

← دەرهێنان، پێك هێنان ، دەم کردن، هێنانەگۆڕ.

٣٠٦٠/ 1810- دروست کردنەوە، رازاندنەوە: دەمانەوێ یەکێك لەو کەسانەی کاریان رازاندنەوەیە (دیکۆراسیۆن) بێنن بۆ رازاندنەوەی ژووری نووستنی منداڵەکان.

٣٠٦١/ 5599- دروست کردن یان جێبەجێ کردن (بە پەلە): خەیاڵت راحەت بێ؛ بزانم ناتوانم بە هەرجۆرێك بێ چەند دانە ساندویچان بە پەلە دروست کەم.

٣٠٦٢/ 4216- دروون لە: لەم قەوارەیە دەکرێ دوو دانە کراسی درێژی ژنانە بدروون. * دەمەوێ لەم پارچە پەڕۆیە دەستێك کورتەو شەڵوار/ قاتێك بدرووم.

٣٠٦٣/ 5826- دروونەوە و وێك هێنانەوە: برینەکەی قامکیان بە دەزوویەکی باریکی ئاوریشم دروو.

٣٠٦٤/ 4306- درووێنەوە، درووێنە کردن: یەکەمین شەپۆلی سەربازانی هێرش کەر، پێش ئەوەی بگەنە تێلدرووی خۆیان، درووێنە کران.

٣٠٦٥/ 5824- درووێنەوە: لێواری گوڕانەکانی بلووزەکەمیان پێوەدروو بۆ ئەوەی گنج نەبن/ هەڵنەگەڕێنەوە.

← تەقەڵ لێدان.

دروستیی شتێك نیشان دان ← تەمنید کردن.

درۆشم کردن (بۆ) ← دیاری کردن بۆ.

٣٠٦٦/ 356- درەنگ بوون، پێبوون، لە تەمەنێ پیری ... دابوون: هەر چەند ئێوارەیەکی درەنگ بوو، بەو حاڵەش بڕیارمان دا نەختێ خۆمان لە راوەماسیدا تاقی بکەینەوە. * ئێستا دەبێ لە حەفتا ساڵی دابێ.

٣٠٦٧/ 2526- درەنگ بوون، پێ بوون : وردە وردە درەنگ دەبێ؛ کەوابوو دەکرێ هەموتان خۆتان بۆ رۆیشتن حازر بکەن. * سەرۆکی قوتابخانە خەریکە پێ دەبێ، دەنا نا؟.

درەنگ خەوتن ← بەخەبەر مانەوە.

درەنگ لە خەو هەستان ← لە جێگا هاتنەدەر.

٣٠٦٨/ 5957- درەنگ نووستن، بەخەبەر مانەوە، بەخەبەر بوون: هەتا پاش نیوەشەوێ نەنووستن و هەروا خەریکی قسەوباسان بوون.

٣٠٦٩/ 6321- درەنگ نووستن، بەخەبەر بوون، نەنووستن: 'ئیجازە هەیە هەتا ئەو دێ نەنووین؟'، 'بەڵێ' بە مەرجێك زۆر درەنگ نەبێ'.

٣٠٧٠/ 237- درەنگ هاتن، وەدوا کەوتن، وەدرەنگی کەوتن: وادیارە ئەمرۆ بەیانی هەموویان وەدرەنگی کەوتوون.

←وەدرەنگی کەوتن.

٣٠٧١/ 5860- درەوشانەوە: لەنێو پەردەکان لادراندا شەبەقێکی بەهێز لەسەر چەمەنەکە درەوشاوە.

٣٠٧٢/ 2722- درەوشانەوە: بە هۆی هەزاران هەزار هەسارەوە، ئاسمان دەدرەوشایەوە.

٣٠٧٣/ 2713- درەوشانەوە: رۆژ بە توندو تیژییەکی هەرچی بێ‌بەزەییانەتر لەسەر ئەو شەش کەسەی لەسەر تەختەیەك لە دەریادا مابوونەوە، دەدرەوشایەوە.

٣٠٧٤/ 6099- درەوشانەوە: مێزی ناخواردنەکە بە هۆی قاپو کەوچکی زێوو کریستاڵ دەدرەوشایەوە.

← بەرق (بێ) هەڵێنان، گەشانەوە.

دەرهەڵبوون ← تووڕە بوون.

٣٠٧٥/ 6438- درێژ بوون، راکشان: لەسەر ئەرزی (ژوورەکە) راکشاو خەوی لێ‌کەوت.

٣٠٧٦/ 6158- درێژ بوون: لە حاڵێك دا چاومان پێی کەوت کە لەسەر چیمەنی پشت ماڵەکە درێژ ببوو.

٣٠٧٧/ 5079- درێژ بوون لەسەر جێگا بۆ حەسانەوە: لەسەر جێگاکەت درێژ بەو پێنج دەقیقە بحەسێوە؛ حەسانەوە مافی خۆتە.

٣٠٧٨/ 3644- (زاراوەی لاتی) درێژ بوون و نووستن، وەرکەوتن: لە هەوای گەرمی واگۆتنەکە هاتینەدەرو لە سێبەری چەند دارێك لە کەنار جادەدە چەند سەعاتێك وەرکەوتین.

← راکشان.

٣٠٧٩/ 1877- درێژ بوونەوە (رۆژ ...): شوکور بۆ خودای، رۆژ درێژ دەبنەوە؛ بەراستی لە دەست زستانێ جارز بووم.

٣٠٨٠ 5558- درێژدادڕی کردن، درێژەدان، گەڕان، ڕستن: نازانم زمانی ئەو ژنە چۆن ئەوەندە دەگەڕێ! • ئەوەندەی ڕاست کە زۆربەی زۆری خەڵکەکە جاڕز بوون.

٣٠٨١ 5163- درێژدادڕی کردن، چەنە لێدان، ڕستن: هەمیشە هەستاو دانیشتنم دەگەڵ ئەو ژنە پێناخۆش بووە. دەتوانێ چەند سەعاتان بەڕاستی لەسەر هیچ بڕێسێ/ درێژدادڕی بکا.

٣٠٨٢ 6813- درێژدادڕی کردن، چەنە لێدان، چەنە وەڕی کردن: پێتوایە کە وەك کوڕێکی باش لێرە دادەنیشەو بڵێیەگیش لەو سەرە درێژدادڕی بکا؟

٣٠٨٣ 925- درێژدادڕی کردن: کاتێك کەسێك چاوەڕوانی نۆرەیە، نابێ لەسەر تەلیفوون درێژدادڕی بکەی.

٣٠٨٤ 3569- درێژدادڕی کردن، چەنە لێدان، زۆر لەسەر ڕۆیشتن/ ڕۆیشتن، زۆربڵێییکردن: 'بیلو ...! کوڕێکی باشە. بەڵام ئەوی هاوار زۆری لەسەر دەڕوا، مەگەر نا؟'، •' بریا لەسەر ئەو کراسەی دەتەوێ بیکڕی ئەوەندەت درێژدادڕی نەکردبا. دەتوانێ بیکڕی، ئیدی بیبڕەوە'.

٣٠٨٥ 1930- درێژدادڕی کردن، زۆر لەسەر ڕۆیشتن، لێنەبڕانەوە: داخوا هیچ ڕێگایەك نیە بۆ ئەوەی پێش بەو هەمووە درێژدادڕییە بگرین؟

← چەنە لێدان، دەست بە چەنەلێدان کردن.

٣٠٨٦ 6132- درێژ کردنەوە، پەرەپێدان: (خالی) خێزانم هەمیشە دەڵێ نازانێ پارەکەی چۆن پەیدابکەینێ. • ئالبێرت نەیدەزانی قسەکان درێژ بکاتەوە، بۆیە داوای لێستەی ناڤەڕۆکەکەی کرد.

٣٠٨٧ 6164- ( ماوەی لە ئەنجام دانی کارێك ) درێژ کردنەوە: لەسەرۆکی بانك دەپرسم داخوا دەکرێ ماوەی دانەوەی قەرزەکان زیاد بکرێو بکرێتە دوو ساڵ.

٣٠٨٨ 2078- درێژ کردنەوە، درێژدادڕی کردن: چاوت لێیە؟ دیانیش خۆشناو دەستی بە چەنەچەنێ کرد. پێت وایە لەسەر چ شتێکی خەریکە درێژدادڕی دەکا؟

٣٠٨٩ 1841- درێژ کردنەوە، درێژدادڕی کردن: ئایا پێت وانیە باسەکە لێرە تەواو بکەین؟ درێژ کردنەوەی هیچ فایدەیەکی نیە.

٣٠٩٠ 1878- درێژ کردنەوە: لەسەر قەدەبوو کردنەوەی زیانی بنەماڵە هەژارەکان باسێکی دوورودرێژ لەبواری یاسادانانەوە هاتبووە پێش.

٣٠٩١ 4399- درێژ کردنەوە: ئەو بڕگەییان بە ئاماژە کردن بۆ دۆستە شیاوە پۆشەکانی نووسەر یەکجار زۆر درێژ کردبووە.

← مانەوە، زۆر پێچوون.

٣٠٩٢ 6079- درێژە بە خزمەتی سەربازی دان، درێژە بە کار دان: خزمەتی وەزیفەکەم بەم زووانە تەواو دەبێ، بەڵام لە فکری ئەوەدام کە بە خزمەت (ی سەربازییەکەم) درێژە بدەم.

٣٠٩٣ 2869- درێژە بە ڕۆیشتن دان: تاقمی گەڕۆکەکان بڕیاریان دا کە بەتاریکە داهاتنی وڵات ناتوانن درێژە بە ڕۆیشتن بدەن.

٣٠٩٤ 2875- درێژە بە قسە دان دوای هەڵوێستەیەك: 'ئەگەر ئەوە میوانی تۆیە، نازانم بۆ هیچ خۆشت ناوێ'، کاتێك برێژید زوو جوابی نەداوە، درێژەی بە قسەکانی داو بەشێوەیەکی هێرشکارانە گوتی:' بە هەر حاڵ، ئەمن هەموویان دەپەرستم'.

٣٠٩٥ 3464- (بەبێ وازی) درێژە بە کار دان، چووەنە پێش: بە بێ وازی درێژە بە کارەکەی دەداو بێ ئەوەی لە فکری ئەوەدابێ پلەو پایەی بچێتەسەر، ساڵەکان تێپەڕ دەکا.

٣٠٩٦ 2752- درێژەدان، چوونە پێش: دەوڵەت بڕیاری داوە لە پێوەندی دەگەڵ ئاوەدان کردنەوەی باکووری ڕۆژهەڵات نەخشەکانی خۆی درێژە بدا/ درێژە بە نەخشەکانی خۆی بدا.

٣٠٩٧ 4561- درێژە دان، دەست پێکردنەوە: چیرۆکەکەمان لەو نوختەیەدا درێژە دەدەین کە جان لەسەر کارەکەی لە دەفتەری ڕۆژنامە وەلاترا.

٣٠٩٨ 2333- درێژە دان، وەدوای شتێك کەوتن: ئەو تیپە لە فیلم هەڵگران سێریالێکی فیلمی تەلەڤزیۆنیی سەرکەوتوویان بەرهەم بووە، چلۆن درێژەی دەدەن؟

٣٠٩٩ 5559- درێژەدان (بە نووسین یان بە چاپ کردن و ئەهاتنەوە سەرەتای دێڕ یان نەکردنەوەی پاراگرافێکی/ بڕگەیەکی دیکە).

٣١٠٠ 3498- (شێلگیرانە) درێژەدان، دەست لێهەڵنەگرتن: تەنیا ڕێگای نووسینی فەرهەنگێك ئەوەیە کە شێلگیرانە نووسینی درێژە بدەی.

٣١٠١ 3554- (بێ پسانەوە) درێژەدان: ساندرز بێپسانەوە دەڵێ ماڵوێران بووە، بەڵام وەك هەمیشە بۆ حەسانەوە چۆتە باشووری فەرانسە.

٣١٠٢ 2549- درێژەدان بە: ئەو چیرۆکە دانێو کارەکەت درێژە بدە.

٣/١٠٣ 1181- **درێژەدان بە باسێك یان بەشێكی تێدا كردن:** ئێستاش بۆ ئەوەی بزانین ئاغای دالبی لە سەر خولی یەكەمی پێشبڕكێی بۆكس/ مشتەكۆلەی سەنگین وەزن چۆن بیر دەكاتەوە، ئەزمەری چییە، باسەكەی پێ دەسپێرم: فەرموو درێژەی بدە.

٣/١٠٤ 3601- **(بە تونێلی) درێژەدان:** فەرماندەری بۆمباران دەستووری دا هێرش بۆسەر ناوەندە سنعەتییەكان بە تونێلی درێژەی هەبێ.

٣/١٠٥ 3602- **درێژەدان بە، بەردەوام بەرهەم هێنان:** دەبینم كە رادەی فرۆشتان لە ئاخرین سێ مانگ دا زیاتر لە سێ مانگی پێشترە. بەراستی زۆر باشە! بە كاری خۆتان درێژە بدەن.

٣/١٠٦ 2872- **درێژەدان بە (كارێك، پێوەندییەك، دۆستایەتی):** پێم خۆشە درێژە بە سەردەمی مێرمنداڵیم بدەم، چونكە لە هەر دەقیقەیەك لەم سەردەمە لەززەت دەبەم.

٣/١٠٧ 2896- **درێژەدان بە، خەریكی ... بوون:** مامۆستا بە قوتابییەكانی گوت: ئەمن دەچمە دەرو ئێوەش بە بێدەنگی خەریكی حەل كردنی ئەم راهێنانە بن.

٣/١٠٨ 4733- **درێژەدان (لێبڕاوانە):** بۆ گەیشتن بە رێككەوتنێك دەبێ لێبڕاوانە بە هەوڵو تێكۆشانی خۆمان درێژە بدەین.

٣/١٠٩ 922- **درێژەدان بە، درێژە پێدان:** سەگەكانی تر لێیان دەمڕاندم - بێجگە لە بڕاس- كە كلكە ئەستووری جوانەكەی هەڵدەسووڕاندو درێژەی بە كایە كردنەكەی دەدا (= هەر وا خەریكی كایە كردن بوو).
← دەست هەڵنەگرتن لە.

٣/١١٠ 2755- **درێژەدان بە رێگا رۆیشتن:** هەروا دەرۆیشتن لە حاڵێك دا بێ پسانەوە گۆرانییان دەگوت بۆ ئەوەی وورەی خۆیان بەرز رابگرن.
درێژەدان بە ژیان ← زیندوو مان.

٣/١١١ -

٣/١١٢ 6410- **درێژەدان بە مانگرتن:** یەكیەتی(ی كرێكاران) بڕیاری دا تا ئەوكاتەی داخوازەكانیان دابین دەكرێ، درێژە بە مانگرتنەكەیان بدەن.

٣/١١٣ 6317- **درێژەدان بە مانگرتن:** رێبەرانی ئەندازیارەكانی كارەبا دەڵێن هەتا بە سكاڵای ئەندازیارەكان رانەگەن، ئامادەن بە مانگرتنەكەیان درێژە بدەن.
درێژەدان بە كاری كەسێك ← كار یان شوغلی كەسێك درێژەدان.

٣/١١٤ 3495- **درێژەدان بە وەدواكەوتنی ...، لێنەگەڕان لە، وەدوای كەسێك كەوتن:** ئەفسەرەكانی پۆلیس دەستیان لە وەدوو كەوتنی جینایەتكارەكان هەڵنەگرت هەتا سەرەنجام لە شەقامێكی بن بەست دا لە داویان خستن.

٣/١١٥ 4639- **درێژەدان بە یاری:** كۆمەگ داوەر ئافسایدی گرت، بەڵام داوەر گوێی نەدایەو دەستووری درێژەدانی یارییەكەی دا.

٣/١١٦ 6784- **درێژەدان لە ...را، دەست پێكردنەوە:** چیرۆكەكە لە كاتی دەست پێكردنی شەڕ لە ساڵی ١٩٣٩ەوە درێژە دەدا.

٣/١١٧ 2331- **درێژەدان هەتا بە ئاكام گەیاندن:** قسەكانت مەبڕە، پێم خۆشە هەتا بە ئاكام دەگەن، درێژەیان بدەی.
● چەند نەخشەو كەڵاڵەی بەدەستەوەیە، بەڵام ئەو شێلگیرییەی تێدا نیە بە ئاكامیان بگەیەنێ.

٣/١١٨ 924- **درێژەدان یان كێشان، چوونە پێش:** ژیان لەسەر گۆی زەوی مەحاڵ نابێ، بەڵام دەبێ لەحاڵو مەرجێكی زۆر نالەبارتردا بچێتە پێش.

٣/١١٩ 1840- **درێژەكێشان (بە شێوەیەكی ناخۆش):** بەختی خۆ تاقی كردنەوەیەك لە گۆڕێدا نەبوو؛ ئەگەر لە شەڕی نۆرماندی دا شكستمان خواردبا، شەڕ چەندین ساڵ درێژەی دەكێشا.

٣/١٢٠ 2873- **درێژە كێشان بەبێ هیچ چەشنە ئاڵوگۆڕێك:** كچەكە پێیوابوو ئیدی ناتوانێ لەوە زیاتر (بە پێچەوانەی ویستی خۆی) خۆ رابگرێ، نەیدەزانی هەتا كەنگێ ئەم وەزعە درێژەی دەبێ. ● وابێدەچوو كە شەڕی سارد لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا هەروا درێژەی دەبێ.

٣/١٢١ 3600- **درێژەكێشان، درێژەهەبوون:** هەموو كەس دەیانگوت ئەگەر باران هەروا درێژەی هەبێ، هەرچی دەغڵو دانە لە نێو دەچێ. ● خەڵك هیوادار بوون لە ماوەی یارییەكانی ساڵانەدا هەوا (ی خۆش) هەروا درێژەی هەبێ.
← چوونە پێش.
دڕین ← دڕان، كردنەوە.

٣/١٢٢ 5417- **دزین:** ئایا دیتنی خوێندكارانی زانستگە كە خەریكن كتێبان دەدزن جێگای سەرسوڕمان نیە؟

٣/١٢٣ 3676- **دزین، بە زۆر هەڵگرتن:** ئەورادیو ترانزیستۆرییە تازەیەم زۆر پێ جوانە. لەكوێت بوو؟ "لە دووكانێكی شەقامی ... لە كاتێكدا كەس چاوی لێنەبوو دزیم."
← رفاندن.

٣/١٢٤ 5557- دزین و دهگهڵ خۆ بردن: یهکێك کلیلی سندووقو پۆلاکهی دزیوهو دهگهڵ خۆی بردوویه.

٣/١٢٥ 4105- دزین و دهگهڵ خۆ بردن: له حاڵێکدا که خهریکی قاوهخواردنهوه بووین دو کوڕی چکۆله کیفهکانیان دزیو هه‌ڵاتن.

دزینو بردن ← ڕهدووی کهسێك کهوتن.

دزینو هه‌ڵاتن ← تاڵان کردنو هه‌ڵاتن.

٣/١٢٦ 7127- دژایهتی کردن، موخالیف بوون، کردن بـه دژی /موخالیفی ...: 'به بڕوای تۆ چ شتێك ئهوی کرده موخالیفی من/ دژی من؟.

٣/١٢٧ 5165- دژایهتی کردن دهگهڵ، موخالهفهت کردن دهگهڵ: پاشا پهرهی زاڵم زۆر به توندی دژایهتیی نزیکترین دۆستهکانی خۆی دهکردو به گهله جینایهتێك تاوانباری دهکردن که جهلهو مێشکی کهس دانایه.

٣/١٢٨ 2311- دژایهتی کردن دهگهڵ، سهرپێچی کردن له، ملهوڕی کردن له بهرامبهر، کهلهڕهقی کردن له پهیوهندی دهگهڵ: ئهوان که له دوکتور هیگ زیاتر پیاوی کردهوهن، له دژایهتی کردن دهگهڵ یهکیهتیی جیهانی خۆ دهپارێزن.

دژایهتی نهکردن ← ڕهزایهت دان.

٣/١٢٩ 2748- دژایهتی ههبوون، دژبوون به، ئهنگونجان: ههوڵدان بۆ ئهوهی مهئمووره‌کانی زهریبه فریو بدا دهگهڵ پرهنسیپهکانی ئهدهگونجا.

٣/١٣٠ 5528- دژایهتی ههبوون دهگهڵ، موخالیفی ... بوون، نهخوێندنهوه دهگهڵ، سازگار نهبوون دهگهڵ، نههاتنهوه دهگهڵ: ئهو نهتیجهیه/ ناکامه دهگهڵ ئهسڵێکی زۆر بنهڕهتیی زانستی مرۆڤ دژایهتی ههیه.

٣/١٣١ 1396- دژایهتی ههبوون دهگهڵ، نهخوێندنهوه دهگهڵ، ڕاست نههاتنهوه دهگهڵ، یهك نهگرتنهوه: گوزاریشی پۆلیس دهگهڵ ئهو شتانهی کابرای تاوانبار کراو دیانڵێ ناخوێننهوه/ ڕاست نایهنهوه/ یهك ناگرنهوه.

← جوور نههاتنهوه.

٣/١٣٢ 444- دژایهتیی خۆ ڕاگهیاندن، ئیعتیراز گرتن: کاترین بێ سێو دوو لێکردن دژایهتیی خۆی ڕاگهیاند.

٣/١٣٣ 4907- دژ به ... ههڵوێست گرتن، موخالهفهت کردن: ئیزابێل ئارهزووی دهکرد ببێته سهربازێ، بهڵام، له پهر باوکی به توندی موخالهفهتی کرد.

دژدامان ← دڵتهنگ بوون.

دژداماو← دڵتهنگ

٣/١٣٤ 3256- دژکردهوه له خۆ نیشاندان، هێرش به هێرش وهڵامدانهوه: له وتاردانێکی توندو تیژدا که له بهرامبهر ئهندامانی بهرهوهفای حیزب دا کردی، سهرۆك وهزیران هێرشی کرده سهر کهسانێك که 'دیانهوێ سیاسهتی داهاتوو دهرکهوتی دهوڵهت لهبهرچاوی خهڵك سووك کهن'. ههر که بێتوو تۆپخانهیهکی دوژمن دهست بکا به تۆپباران، به فڕۆکه شهڕکهرو بۆمبهاوێژهکان فهرمان دهدرێ دژکردهوه له خۆیان نیشان دهن.

٣/١٣٥ 5339- دژکردهوه له خۆ نیشاندان: ئهو نهخۆشه له بهرامبهر ئهو دهرمانه تازانهدا دژکردهوهی باش له خۆی پیشان دهدا.( وا دیاره دهرمانهکانی پێ دهکهوێ - وهرگێڕ-).

٣/١٣٦ 1608- دژکردهوه نیشاندان، وهك فیعل له خۆ نیشان دان: ئهگهر ئهندامانی باڵی چهپی حیزبی کرێکار ههروا له لایهن ڕێبهرایهتیی حیزبهوه به هیچ نهگیرێن، بۆیان ههیه زۆر به توندی دژکردهوه له خۆ نیشان بدهن.

٣/١٣٧ 5173- دژکردهوه نیشاندان له بهرامبهر ...دا: خهڵك له بهرامبهر دهست پێوهگرتنو ههر لهو کاتهدا خهرجی خۆرایی کردن دژکردهوهیان له خۆ نیشان دا.

٣/١٣٨ 27- دژکردهوه له خۆ نیشاندان، ڕهفتار کردن: ژنه خاوهن ماڵهکه دهیگوت: ئهو خاله گهنجه نازانێ چۆن ڕهفتار بکا، کاتێك که منداڵهکان قهلسی دهکهن.

← تێ ههڵدانهوه.

٣/١٣٩ 2202- دژکردهوهی پێویست له خۆ نیشاندان: مامۆستاکان له نهبوونی دژکردهوهیهکی لهبار له لایهن قوتابیانهوه نارازین.

٣/١٤٠ 204- دژوارتر بوون له ڕادهی تێگهیشتن ...: ئاخرین وتارێکی که له پێوهندیی دهگهڵ تیئۆریی ههڵقرین پێی داین دژوارتر لهوه بوو که من تێی بگهم.

← لێڵ بوون.

٣/١٤١ 4370- دژی یاسا، موخالیفی ... بوون: ئهو دژی پێك هێنانی ههرچهشنه ئاڵوگۆڕێك له یاسای ئێستا دایه.

٣/١٤٢ 1559- دژی ... بوون، نهخوێندنهوه دهگهڵ، نههاتنهوه دهگهڵ: دهنگ وهرگرتن بۆ سهرگهرمیی ڕۆژانی یهك شهممۆ دهگهڵ دابو نهریتو سیاسهتی مهوجوود نهیدهخوێندهوه.

٣/١٤٣ 4096- دڵ وڵ لهکردن، دوو دڵ لهبوون: لهوه دوو دڵ نهبوو که له ڕۆژنامهی تایمزدا ئهو ژنه وهك گۆرانی بێژێکی بێهاوتا بناسێنی.

٣١٤٤# 6614- دڵئێشان، ناڕەحەت بوون: لە شێوەی قسەکردنەکەی دڵم ئەئێشا، بەڵام بڕیارم دا لە ئایندەدا لە لای ئەو زیاتر ئاگام لە خۆم بێ.

٣١٤٥# 6770- دڵئێشان، ناڕەحەت بوون، تووڕە بوون: ئەم ئیستعداده باشەمان یارمەتی داین کە ناوی ئەو ژنە بنێین دۆرماوس (مشکی بەردەرکان). ناوێك کە زۆر پیس پێی ناڕەحەت بوو، بەڵام بە هەرحاڵ جێی خۆی گرت.

٣١٤٦# 5497- دڵئێشان، دڵپڕ[illegible] بوون: زۆر زوو دڵی دێشێ. هەر قسەیەکی بیکەی پێی وایە ئیهانەی پێ دەکەی.
← وەدڵ گرتن، ناڕەحەت بوون، دڵشکان لە.

٣١٤٧# 5077- دڵئێشاندن، ناڕەحەت کردن، تووڕە کردن: ئەگەر بۆ وەرگرتنەوەی وڵامەکە فشارت بۆ هێنابا، تووڕەت دەکرد.
← ناڕەحەت کردن.
دڵ بۆ سووتان ← پشتیوانی نەکردن لە.
دڵبەستە کردن ← عەلاقەمەند کردن.
دڵپاکی بە خەرجدان ← بێ پێچەو پەنا بوون.

٣١٤٨# 830- دڵ تۆقین بۆ، سووتان بۆ، تۆقرە لەیەکچوان بۆ: لە غەمو پەژارەی پارەکەی کە لە سەفەر بوو تۆقرەی لێ هەڵگیرابوو.

٣١٤٩# 941- دڵتەنگ، خەمگین، ئاسوو، دڵئاسوو، وەڕەز: بە هاسانی دڵتەنگ نەدەبوو، بەڵام دەستی ڕۆژگار پەریشانی کردبوو.

٣١٥٠# 2464- دڵتەنگ بوون، وەڕەز بوون، ئاسان، دڵئاسان، بێوازبوون: ئەو لەو جۆرە کەسانەیە کە ناتوانێ تەنیا بێ. هەرکە تەنیا مایەوە، دڵتەنگ دەبێ.

٣١٥١# 1414- دڵخۆش بوون بە، دڵداری دانەوە (خۆ): ڕەنگە لە تاقیکاری دەرنەچوویی، بەڵام لانیکەم دەتوانی بە هێنانە بەرچاوی ئەم ڕاستییە دڵخۆش بی کە ئەوەندەی دەتوانات دابوو کردت.

٣١٥٢# 6709- دڵخۆش کردن، دڵئاسوودە کردن: کەمبوونەوەی سوودێکی کە بانك بۆ پارە بە قەرزدان وەری دەگرت، زۆر قەرز وەرگری چکۆلەی دڵخۆش کردن.

٣١٥٣# 6583- دڵخۆش کردن، کەیف سازکردن، کەیف هاتن بە: هیچ کەیفم بە قسەکانی نایە - دام دەهێنێنن.

٣١٥٤# 1015- دڵخۆش کردن، دڵدانەوە: هەواڵی گەڕانەوەت بۆ ئەم وڵاتە یەکجار خۆشحاڵی کردم. • دەچمە لای باوکم، پاش مردنی دایکم پێویستیی بە دڵدانەوە هەیە.

٣١٥٥# 3918- دڵخۆش کردن، وەجەرز کردنەوە، ڕووحیەی ئازەدان بە: هاتنی ئەو بۆ کۆبوونەوەکە وڕەی هەمووەمانی بەرز کردبۆوە/ هەمووەمانی دڵخۆش کردبوو.
دڵخۆشی دانەوە ← دڵداری دانەوە.
دڵخەبەردان ← بە دڵداهاتن.

٣١٥٦# 1385- دڵداری دانەوە، دڵدانەوە: سروشتییە ئەو کەسانە دڵداری بدەینەوە کە دۆستێك یان ئازیزێکیان لەدەست داوە.

٣١٥٧# 4878- دڵداری دانەوە، خاترجەم کردن، ئەرخەیان کردن، دڵخۆش کردن، دڵخۆشی دانەوە: ئەوە کە دەمزانی ئەوانەی لایەنگری غەیرە ئەرتەشییەکان بوون بۆیان هەیە لە ڕەفتاری من نیگەران بن، زۆرم هەوڵدا بۆ ئەوەی ئەرخەیانیان کەم.

٣١٥٨# 6031- دڵدانەوە، دڵداری دانەوە، لاواندنەوە، هێنانەوە سەر حاڵ، کەیف سازکردنەوە: گوڵی، باوکت یەکجار ئێوەچاوان گرژە. چت لە دەستی دێ بیکە بۆ ئەوەی بیهێنیەوە سەر حاڵ.

٣١٥٩# 2054- دڵسازبوونەوە لە، دڵسازکردنەوە لە، دوورکردنەوە لە، لەبیان بوون، تۆران: ئەمەدەزانی ژیلوان لە ژنەکەی تۆراوە.

٣١٦٠# 2352- دڵسازکردنەوە، تۆراندن: ... ڕێدەمێ ئەنسەریان لێیکەنو دڵساردیان بکەنەوە.
← ئەهێشتن.

٣١٦١# 6603- دڵشکان لە، دڵئێشان لە، وەدڵگرتن، زویر بوون: 'ئەویش هەرومك ئێوە دەچێ، بە هەموو شتێکی دڵی دێشێ'.
دڵشکاندن ←ناڕەحەت کردن.
دڵ کورکاندن بۆ ← یەکجار پێخۆش بوون.
دڵ گوشران ← تێکچوون.

٣١٦٢# 3474- دڵگەرم کردن، تەشویق کردن، هاندان: ئەم کارە لە کاتی خۆیدا ئەولو نابێ مەگەم جارویار بەدانی ئەنعامێك دڵگەرمیان کەی.
← یارمەتیدان.

٣١٦٣# 6646- دڵگەرم بوون دڵخۆش بوون بە، دڵخۆش کردن بە: لێیان گەرێ با (بەوە) دڵیان خۆش بێ. بۆی هەیە وەزعەکە لەوەش خراپتر بێ. هەتا ئێستا نە شەختەیەکمان دیوەو نە بەفرێك بارێوە. ؟

٣١٦٤# 2327- دڵ لە خۆبوونەوە (بە هۆی ئێش و ژان یان لەبەر پێکەنین) : هەرکە هاتە سەر بەرزەك، تەماشاچییەکان

لەبەر پێکەنین، دڵیان لە خۆ بڕوە. * تەنیا مستێکی لە زگم داو دڵم لە خۆ بڕوە.
← بێهۆش بوون، بێحاڵ بوون، لە هۆش چوون.
دڵ لە شتێك بوونەوە ← پێ خەرج کردن.

۲۱۶۵/ 4742- **دڵ نەرم کردن، پیاو بوون:** کابرای دادوەر دڵی نەرم بوو کە لێبووردن لە خۆی نیشان بدا.

۲۱۶۶/ 2242- **دڵ لێ هەڵاتن، لەخۆ ڕاشەنین:** هەرگیز دڵم نایە دایکێك مەحکووم بکەم کە بۆ خاتری منداڵە برسییەکەی دزی دەکا.

۲۱۶۷/ 138- **دڵنیا کردن لە، ئەرخەیان کردن لە:** دەتوانم لە پشتیوانی کردنی خۆم لە گەڵاڵەکە بە تەواوی دڵنیات کەم.
← ئەرخەیان بوون، خاترجەم بوون.
دڵۆپ دڵۆپ ڕژان ← وردە وردە هاتن.

۲۱۶۸/ 709- **دڵ و جورئەت دان بە، شەرم یان ترسی کەسێك شکاندن:** بۆ ئەوەی شەرمی جان بشکێنێ لە سەرەخۆیی و تەگبیری تەواوی دەوێ.
دڵ و جورئەتی پێویست هەبوون بۆ ← ئازادیی پێویست هەبوون بۆ.
دڵویستن ← ئارەزوو کردن.
دڵ وێك هاتن ← تێکچوون.
دڵی خۆ خۆش کردن ← دڵگەرم یان دڵخۆش بوون.

۲۱۶۹/ 1069- **دڵی خۆ لە شتێك پاك کردنەوە:** بە کورتی ڕدێن سپیان گوترابوو کاتێك لەسەر حوکمی دادگا ئەوەر دەدەن، دەبێ دڵی خۆیان/ ویژدانی خۆیان لە هەر چەشنە ناڕەحەتییەك لە کردەوەکانی کابرای تاوانبارکراو پاك کەنەوە.
دڵی خەڵك شکاندن یان ئێشاندن ← پێ لەسەر کلکی خەڵك دانان.
دڵی کەسێك بردن ← بۆ لای خۆراکێشان.
دم بە دم کردن ← دەمەقاڵە کردن.

۲۱۷۰/ 4773- **تێوەردان، وەستان لە کاروباری خەڵك سەرهەڵهێنان:** ئەو ژنە لە رادە بەدەر پێی خۆشە سەر لە کاروباری دۆستەکانی دەربێنێ/ دم دەکاروباری دۆستەکانی وەردا.

۲۱۷۱/ 4687- **دم تێوەردان لە کاروباری** ...: بریا لە دم تێوەردان لە کاروباری من دەستی هەڵگرتبا.
← تەداخول کردن.

۲۱۷۲/ 5131- **دم چەوتانە:** تاقمە دزەکان دەیانتوانی بە یارمەتیی دەلالێکی فێڵباز لە چنگ تاڵانەکەیان ڕزگار بن، بەڵام دەلالەکەش دەمچەوتانەیەکی باشی لێوەردەگرتن.
دم دە دمی کەسێك نان ← دەمەقاڵە کردن لەگەڵ.
دم لە کاروباری خەڵك وەردان ← خۆ لە کاری خەڵك هەڵقورتاندن.

۲۱۷۳/ 2742- **دم دەکاری خەڵکی وەرنەدان:** ئەگەر جارێکی دیکە براکەت بێتە ئێرەو لە شێوەی بارهێنانی منداڵەکانمان ڕەخنە بگرێ، پێی دڵێم دم دەکاری خەڵکی وەرمەدە.

۲۱۷۴/ 1003- **دم لە پەوش کردن، بڕینەش کردن (لە سیهات)، پێشمەی کردن:** پارێزەرێکی بێویژدان ئەو کوڕە بەستەزمانەی بێبەری کرد.

۲۱۷۵/ 845- **دەم و چاوی خۆ (لە شەرمان، لە بەرخەم و پەژاران) داپۆشین:** کابرا دانیشتو دەموچاوی بە لیفەکەی داپۆشی و لە کڵپەی گریانی دا.

۲۱۷۶/ 6020- **دەم لووتی کەسێك تێکشکاندنەوە یان بەهاز کردنی، تێکشکاندن:** ئەگەر دەگەڵ یارەکەم ئاوا بێئەدەبانە بجووڵێیەوە، دەم و لووتت تێك دەشکێنم.
دەمزەرد کردنەوە (ی زانستێك) ← باشتر کردن.

۲۱۷۷/ 6186- **دەمەقاڵە کردن دەگەڵ، دم بە دەم کردن:** هەتا دێیەوە ماڵێ، ئەوە دەگەڵ براکەت دەمەقاڵەتە.

۲۱۷۸/ 180- **دەمەقاڵە کردن (دەگەڵ)، دم بە دەم کردن (دەگەڵ):** هیچ پێم خۆش نیە دم بە دەمت دەگەڵ بکەم.

۲۱۷۹/ 5098- **دەمەقاڵە کردن، بە کێشە هاتن، بەشەڕهاتن، گێچەڵ کردن دەگەڵ:** جورج هەمیشە دەگەڵ ژنەکەی بەشەڕ دێ (ئەمە بەو واتایە نیە کە ژنەکەشی دەگەڵی بەشەڕ دێ. مرقایسە بکەن: جۆرج و ژنەکەی هەمیشە پێکەوە بەشەڕ دێن).

۲۱۸۰/ 1521- **دەمەقاڵە کردن، گێرەوکێشە کردن، بە کێشە هاتن:** هەرکات سەرۆك وەزیران لەو بەرەی مەجلیسەوە دەگەڵ ڕێبەری ئۆپۆزیسیۆن دەمەقاڵەیەکی دەبوو، زۆرتر بە زیانی خۆی تەواو دەبوو.

۲۱۸۱/ 2068- **دەمەقاڵە کردن دەگەڵ، مشتومڕ کردن، دم دەدەمی کەسێك نان:** جۆرج، وەرە با بڕۆینەوە! وەختی خۆ زایە کردنو دم دەدەمدانی ئەو بێ قابیلەتە درۆزنانە بێهوودەیە.

۲۱۸۲/ 115- **دەمەقاڵە کردن (دەگەڵ):** دەمەقاڵەم دەگەڵ مەکە. چت پێ دەڵێم وا بکە.
← تێك چوون دەگەڵ کەسێك.

دەمەو روو وەنەرز کەوتن ← بەرەو دەم بەر بوونەوە.

۲۱۸۳/ 7107- **دەم هێنانە پێش، پڕووپی کردن:** چـاوەڕوانی ئـەوە بوو دەست بێنێ پێشەو لە بناگوێت راکێشێ.

۲۱۸٤/ 1985- **دندان:** منداڵە گەورەکان ئـەوانی چکۆڵـەیان دنە دەدان دزی لە دایکو باییان بکەن.

۲۱۸٥/ 3016- **دنـەدان، فێرکردن (ی کـاری خـراپ) وەسـەر (کـاری خراپ) پەڕاندن:** منداڵە گـەورەکان ئـەوانی چکۆڵـەیان فـێر کرد دەرکەو پەنجەرەی ماڵە چۆڵکراوەکە بشکێنن.
← تەحریك کردن، هاندان.

۲۱۸٦/ 1494- **دنیـا بەسـەردا رووخـان:** کـاتێك دەزگیرانەکـەی تێکیدا، هەموو دنیای بەسەر دارووخا.
دنیا رای لـێ بێ ← وەزعێك بێتە پێش.

۲۱۸۷/ 1933- **دواکـەوتن لـە، وەپاشکەوتن لـە:** بریتانیـــا وەك بەرهەم هێنەری قوماشی کەتانیی هەرزان لە ژاپۆن وەپاش کەوتووە.

۲۱۸۸/ 241- **دواکەوتوو بوون، کۆن بوون، کۆنە پەرستانە بـوون:** بـەو باوەڕیم لەسەر جینایەتو سزادان زۆر کۆنەپەرستانە هاتـە بەرچاو.

۲۱۸۹/ 1231- **دوایە هاتن، وەڕێکەوتن:** واباشـترە هـەر ئێسـتا بەرەو ئیزگەی قەتار وەڕێکەوین. ئەمن دوایە دێم.
دوچار بوون ←خەو لێکەوتن (زۆر قورس)
دوچار کردن ← ڕۆبردن.

۲۱۹۰/ 2688- **دوچاری حاڵـەتێك بـوون، حاڵـەتێك بەسـەردا هـاتن:** بێ‌فایدە بوو؛ هاواری نەدەکرد بەڵام دیار بوو تووڕە بـووەو خۆی دەخواتەوە.

۲۱۹۱/ 2866- **دوچاری حاڵـەتێك بـوون، نیشـانەکانی دۆگرەوەیـەك:** هەرکات منداڵەکە دەسـتی دەکـرد بـە فرێـدانو پـەرشو بڵاوکردنـی چێشـتەکەی، خوشـکەکانی لـە قرقـەی پێکەنینیان دەدا.

۲۱۹۲/ 5045- **دوچاری دەردەسەر کـردن، گـەوگرفت بـۆ پێـك هێنـان:** نازانی کە شووڕا چ گەوگرفتێکی بۆ پێك هێنام.

۲۱۹۳/ 2158- **دوچـاری رۆژگـــی رەش بـــوون:** لـــە ســـەردەمی پاشایەتیی هـانری شەشـەمدا، وڵات دوچـاری چارەڕەشـی ببوو.

۲۱۹٤/ 2136- **دوچـاری دەسـتی و بێحـاڵی بـــوون:** دوای لـــە دەسـتچوونی منداڵـی دووهـــەمی، دوچـــاری ســـتیو بێحاڵێکی ئەوتۆ بوو کە رزگار کردنی زۆر دژوار بوو.

۲۱۹٥/ 6743- **دوچاری فەرامۆشی کردن:** یەکێك لــە لایەنـەکانی سەرسووڕمان یان ترسو خۆفێکی کترپر ئەوەیە کە دەڵێن پیاوی دوچاری فەرامۆشی دەکا.

۲۱۹٦/ 1321- **دوچاری وەزعێکی ناڵـەبار بـوون، گەیشـتنە وەزعێکی ناڵەبار:** وەزعێکی ئەوەندە ناڵەبار هاتۆتە پێـش کـە ئـەو ژنە دەڵێ ناتوانێ هەفتەی بە ۲٥ پۆندان بژی.

۲۱۹۷/ 4931- **دڵراگرتن، خۆ دوچـاری دەردەسـەر کـردن، دەردەسـەر سـاز کردن بۆ خۆ:** ئەوەی دە دڵم دابوو هاتـە سـەرزبانەو، دەبینـن کە بەم جۆرە دەردەسەرم بۆ خۆم ساز کرد.

۲۱۹۸/ 2385- **دڵراگرتن (لـە قوتـاربا):** دوای ئـەوە کـە نیـوەی یارمەتیی مانگانەکەی دۆڕاندو نیوەکەی دیکەشـی دا بـە نارەق، خـەدر ناچـار بـوو بـۆ کرێـماڵو کرێنـی هێندێـك خواردەمەنی لە دۆستەکانی قەرز کا.

۲۱۹۹/ 202- **دوور بوون (لە لۆمەو لەقەم):** کـاتێك لەسـەر کـار بوو، کەڵك وەرگرتنی لە پارەی دەوڵـەت دوور لـە رەخنـە نەبوو.
دووڕە بوون ← دوو ڕەگە بوون.

۲۲۰۰/ 161- **دوورکردنەوە لە** ...؛ زۆرم هەوڵ دا فکری کـابرای نەخۆشو لە حاڵی مردندا لە خۆم دوور کەمەوە.

۲۲۰۱/ 5204- **دوورکەوتنەوە، دوور بوونـەوە لـە، کـەمڕەنگتر بـوون، وەلاچوون:** هـەرچی زیـاتر بلینـد دەبوویـن (بـە فرۆکـە - وەرگێر-)، زەوی دوورتر دەبۆوە.● بە تێپەڕبوونی هەفتەو مانگان، قسـەو نیشـارەکانی لـە خـەیاڵیدا کـەم ڕەنگـتر دەبوون.
دۆزرانەوە ← دیترانەوە.

۲۲۰۲/ 1114- **دۆزینـەوە، دیتنـەوە، پێهێنـەوە، چـاو بـە کەسـێك کەوتن (بە هەڵکەوت)، تووشهاتن:** ئەرێ، ئەتۆ خـەریك بـووی ئەمباری دارانت دەپشکنی. چاوت بـە رەسمـە کۆنـەکانی بنەماڵەکەمان نەکەوت؟

۲۲۰۳/ 3259- **دۆزینـەوە، داهێنـان، هێنانـە گـۆڕ:** سـەرەنجام، کۆمیتە فۆرمولێکی داهێنا کە پەسندی هـەموو لایـەك بوو.

۲۲۰٤/ 5363- **دۆزینەوە:** هێندێك لـە مرسـافیرەکان توانیـان جانتاکانیان لە نێو فرۆکە تێك شکاوەکەدا بدۆزنەوە.

۲۲۰٥/ 1130- **دۆزینـەوە، گەیشتن بـە، وەدەست هێنـان، دیتنـەوە:** مەبەسـت لـەو لێکۆڵینەوەیـە ئەوەیـە کـە ئـەو راسـتییە بدۆزنەوە کە چۆن بوو کەشتییەك لە دەریادا ون بوو.

٣٢٠٦/ 5695- **دۆزینەوە، دیتنەوەی کەسێك)**: را دابنێ کە بێ‌دۆزینەوەو لێی بپرسن کە مەبەستی راستی‌قینەی چی‌یە؟
← دیتنەوە، بزنکردنو دیتنەوە، داهێنان، پەیدا کردن ← کەوتنە شوێنی کەسێلەو گرتن.

٣٢٠٧/ 2991- **دۆستایەتی کردن، پەیکەوە بوون (بە مەبەستی 'ازدواج' کردن)**: کاتێك دیتی ئەوە ماوەی زیاتر لە ساڵێکە پێکەوەن/ بە یەکەوەن، سەری سوورما.

٣٢٠٨/ 3655- **دۆستایەتی کردن دەگەڵ، هاوڕێش بوون دەگەڵ**: دەبێ وشیار بی‌و بزانی دەگەڵ کێ دۆستایەتی دەکەی. لە بوت ئەچێ کە خەڵك بە لەبەر چاوگرتنی دۆستانی هەرکەسێك لە سەری داوەری دەکەن.

٣٢٠٩/ 2522- **دۆستایەتی کردن دەگەڵ، ئاشنا کردن دەگەڵ، ساز کردن (بۆ)**: هەرگیز پێم وانەبوو گورلی ببێتە دۆستی کەس/ حەز لە کەس بکا - بەتایبەتی کابرایەك بە ماشێنێکی جەگوارەوە هەر بە خەیاڵیدا نەدەهات.

٣٢١٠/ 4138- **دۆستایەتی کردن دەگەڵ**: ئەگەر ئەفسەری پێڕاگەیشتن بە وەزعی زیندانی‌یە ئازادکراوەکان بتوانێ دەگەڵ کەسانی لاو دۆستایەتی بکا، لە کاری خۆیدا سەردەکەوێ.

٣٢١١/ 4225- **دۆستایەتی کردن دەگەڵ**: دەبینی کە هەموومان خوازیاری دۆستایەتی (کردن) دەگەڵ تۆین. پێت چۆنە؟/ پێت خۆشە؟

٣٢١٢/ 4404- **دۆست بوون دەگەڵ، بوونە ئاواڵی کەسێك**: دوو سێ کەسان کە ببوونە دۆست، ڕۆژەکانی ئاخری هەفتە دەچوونە دەریایە.

٣٢١٣/ 4721- **دوعا کردن، لەبەر خودا پاڕانەوە بۆ**: جووتیاران دوعا دەکەن باران بباری.

٣٢١٤/ 3991- **دوکان یان گاراژ هەبوون دوور لە ماڵ**: باوکی دووکانێکی چکۆلەی توتنو سیغار فرۆشی دوور لە ماڵە خۆیانی هەیە.

٣٢١٥/ 6648- **(لە تیاتر/ شانۆگەریدا) دووپات کردنەوە (لەسەرڕا)**: هەموو زۆر باش بوون. ئەگەر ئارام بوونەوە، دەکرێ لوتف بکەنو لەسەرڕا دووپاتی بکەنەوە؟

٣٢١٦/ 5139- **دووپات کردنەوە**: بیروبڕواکانی ئەوەندە بۆ دووپات کردووەتەوە کە تەنانەت لە خەویشدا دەیانڵێمەوە.
← وەبیرهێنانەوە، بۆخوێندنەوە.

٣٢١٧/ 7335- **دوو دڵبوون، لە نێوان دوو شتاندا ماڵەوە**: هەرگیز ناتوانی بزانی کە وەزعی ڕووحیی ئەو کابرایە چۆنە _هەمیشە لە نێوان ناهومێدیو دڵخۆشیدا گیری کردووە.

٣٢١٨/ 3266- **دوو دڵبوون، دوودڵ پەرۆزی کردن، بە گومان بوون**: بە هۆی وەزعی نامەعلوومی بازار، مشتەری‌یەکان دوورپەرێزی‌یان دەکرد.

٣٢١٩/ 3143- **دوو دڵ نەبوون، پێشتێك نەبوون، پێ هاسان بوون**: هەڵگرتنی پارەی ئەو کابرایەم هەر زۆر پێ هاسانە.
← دڵاودڵ نەکردن.

٣٢٢٠/ 1832- **دوو دوو بە یەکەوە شەریك بوون**: بیفتەکە کە زۆرەو بەش دەکا. بەڵام بۆ باقلەکە دەبێ دوو دوو بە یەکەوە شەریك بن.

٣٢٢١/ 387- **دوور بوون (یەکچار)**: خاکی فەرانسە لێرە دیار نیە (نابیندرێ)، بەڵام لەو دۆڵێرەوە بە ڕوونی دیارە (زۆر جوان دیارە). ● سەنگەرەکانی دوژمن لە تیرەسی تۆپەکەمەرە قورسەکانی ئێمە دانەبوون (ئەوەندە دوور بوون نەیاندەگەیشتنێ).
دوور بوون لە ← بەرزتر بوون لە.
دوور بوون لە واقعییەت ← لە خەیاڵدا ژیان.

٣٢٢٢/ 6295- **(لە خۆ) دوور خستنەوە، پاشەکشە پێکردن**: تەنیا ڕوانگەی گەیشتن بە ئاسایشو راحەتی ناهومێدی تەواو کەماڵی لێ دوور خستنەوە.

٣٢٢٣/ 2075- **دوور خستنەوە، تەبعید کردن، تەحویز کردن**: زۆر بوون ئەو باخی‌یە سیاسی‌یانەی کە ساڵەکانی کۆتایی ژیانیان دوور لە نیشتمانەکەیان تێپەر کردووە، نیشتمانێك کە یەکجار زۆر بۆیان خۆشەویست بووە.

٣٢٢٤/ 63- **دوور خستنەوە**: کرداری ناڵەباری ئەو پیاوە هەموو دۆستەکانی لێ دوور خستۆتەوە.

٣٢٢٥/ 5759- **دوور خستنەوە لە جادە**: کارگەکانیان لە نزیك جادە دوور خستۆتەوەو ئێستا لە خانووەکان را دیار نین.
دوور ڕاگرتن لە ← دووری کردن لە.

٣٢٢٦/ 3545- **دوور کردنەوە لە خۆ، پێشگری کردن لە**: یەکێك لەو گیروگرفتانەی کە دروستکەرانی جادە لە ناوچەی ئامازۆن دەگەڵی بەرەوڕوو بوون ئەوە بوو کە چلۆن ئەو خەڵکە لە خۆیان دوور کەنەوە کە زەوی‌یەکانیان دەکەوتە ژێر جادەکە.

٣٢٢٧/ 7336- **دوور کردنەوە لە، وەدوور خستنەوە لە، لە مەعکێ کردنەوە، بردنەدەر لە**: دەبێ ئەو خەیاڵە لە مێشکی

کوڕەکەی بەرنە دەر/ دوور خەنەوە کە هەموو شتێك سووڵەو هاسان بۆی جێبەجێ دەبێ.

۳۲۲۸ 4790- دوورکردنەوە لە: مەنموورەکەی ناگرکووژاندنەوە بە لەسەرەخۆیی‌یەکی تەواوەوە ڕانندەکەی لە تاکسی‌یە ناور تێبەر بووەکە دوور کردەوە.

۳۲۲۹ 542- دوورکردنەوەی گیروگرفتێك لە خۆ: کاتێك سندووقدار پاش تەواو بوونی سەعاتی کار لە دیوی خەزێنەی بانلێدا گرتیان، دەیتوانی ڕاستی‌یەکەی بڵێ‌و مەترسیی چوونە زیندان لە خۆی دوور کاتەوە.

← لە خۆ لادان، لە خۆ دوور کردنەوە، دووری کردن لە، تاراندن.

۳۲۳۰ 5440- دوورکەوتنەوە، تێکەڵاڵن، دوورکەوتنەوە: شەنبایەکی کەمێك ترند دەستی پێکردو، دووکەڵە خستەکە بە تێکهاڵان دوور کەوتەوە.

۳۲۳۱ 2510- دوورکەوتنەوە لە: بە منداڵەکانیان گوت لە خەرەچێتەی دەوری خانووەکە دوور کەونەوە.

۳۲۳۲ 1782- دوورکەوتنەوە لە: لەو قۆناخە بە دواوە ژیانی ئەو لە هی فیلیپ دوور کەوتەوە (= ئەوو فیلیپ لێك هەڵبڕان -وەرگێڕ-).

۳۲۳۳ 6301- دوورکەوتنەوە لە: پێم خۆش نیە ئەوانەی کڵاوی سیلەندرییان لە سەرە بێنو لێرە قوتەقوتێ بکەن. پێیان بڵێن لێرە دوور کەونەوە.!

← جیا بوونەوە لە، لادان لە، دووری کردن لە، نەهاتنە پێش.

۳۲۳۴ 4033- دوورنوما، ڕوانگە، دیمەن: بۆ هەموو ئەو کەسانەی خوازیاری وەدەست هێنانی قازانجێکی بە خوایین، ڕوانگە زۆر تاریکە. ● ئەگەر لە سەر وەدەست هێنانی پیشەیەك لە سنعەتی بەردە زوخال دا بەو دەکەیەوە/ ئەگەر لە فکری وەیدای کە پیشەیەك لە سنعەتی بەردە زوخال دا پەیدا کەی، دەبێ بڵێم ڕوانگەکە ڕوون نیە.

۳۲۳۵ 6318- دووره پەرێزی کردن، دووری کردن، دەست پێوانەگەیشتن: چەند ساڵ بوو لێی دەگەڕام، بەڵام هەمیشە دووره پەرێزی دەکرد. (ولە ناکاودا دەستم پێی ڕاندەگەیشت).

۳۲۳۶ 3575- دووره پەرێزی کردن لە، دوورکردنەوە، خۆ دوورخستنەوە لە، خۆپاراستن لە، خۆلێنەدان: نیوەی کارە باشەکان لایەنی سەلبی‌یان هەیەو ئەویش خۆ دوورخستنەوە لە کاری خراپە. ● هەر لە سەرەتای ژیانی‌دا ئەوەی لێ‌حاڵی ببوو کە باشترین کار ئەوەیە خۆ لە کێشەو هەڵڵای خەڵك نەدا. ● بریا ئەو منداڵانەت دوور خستباوە؛ سەرنێشەیان پێگرتووم.

۳۲۳۷ 6221- دووره پەرێزی کردن، خۆ لە خەڵکی دوور ڕاگرتن، دوور خستنەوە: بە پێچەوانەی ناپولئۆن، ویلنیگتۆن، لە لایەك بە هۆی ئەوە کە هەر لە بناخەوە پیاوێکی کەمدوێ بوو، لە لایەکی تریشەوە بە دەلیلی ئەوە کە لە خۆشەویست کردن لە لای خەڵك بێزرابوو، لە سەربازەکانی دووره پەرێزی دەکرد.

← گۆشەگیری کردن، خۆکێشانەوە، پێوەندی برین دەگەڵ، دوور دڵبوون.

۳۲۳۸ 1519- دوور ڕەگە بوون، دووره بوون: ئەو سەگە دیارە دوورڕەیەو لە تۆرەمەی ئالاستیان‌و سپانیێوڵە.

۳۲۳۹ 3503- دووری کردن لە، دوورکردنەوە لە، فاسیلە گرتن لە، دوور ڕاگرتن لە: ئەوە ئەرکی سەرشانی پۆلیسە کە تەماشاچی‌یەکان دوور کاتەوە ( لە یاریزانەکان). ● دەبێ منداڵەکان لە چۆمی دوور کەنەوە. ● ئەگەر جان لەو ژنە دوور نەکەوێتەوە، پەشیمان دەبێتەوە، چونکە مێردەکەی دڵپیسەو زۆریش توندو تیژە.

۳۲۴۰ 1953- دووری کردن لە، لەگەڵ دەرچوون، هەڵاتن، خۆ مالاندن: کاتێك دیتم دێ، بۆێ دەرچووم/ هەڵاتم.

۳۲۴۱ 1676- دووری کردن لە، دوورکەوتنەوە لە: سەرۆك بە ئیجازەدان بە ڕۆژنامەنووسان بۆ هاتن بۆ کۆبوونەوەی شووڕا، لە خەتی هەمیشەیی شووڕا دوور کەوتەوە.

← گۆشەگیری کردن، لە خۆ دوور کردنەوە.

۳۲۴۲ 5540- دووری لێکردن، خۆ لێ‌لادان: دەبوروم بە ئینسانێکی بێ‌عاتیفەی، وشکی، خۆ بە زلزان کە هەموو کەس خۆی لێ‌لادەدەن.

← بایخ پێنەدان، لێپرینگانەوە.

۳۲۴۳ 4169- دووکاری خراپ بە یەکەوە لە نجام دان: ئەمتۆ دەتەوێ پیرێژنێکی هەژاری کە هیچیشی نیە.

۳۲۴۴ 6354- دووکەڵی کارێك چوون دەچاوی خاوەنی‌یەوە، ناکامی کاروکردەوەی خراپ بە چاوی خۆ دیتن: 'بۆ ماوەی چەند مانگان جان هەوڵی دا نیتوانی نیتەمە بشێوێنێ‌و ئێستاش کە پیلانەکانی بۆ لای خۆی گەڕاونەتەوە، پێت وا نەبێ ناچاری کە باری دەردەکانی لەسەر شانی سووك کەی. لێی گەڕێ با ناکامی کارو کردەوە نالەبارەکانی بە چاوی خۆی ببینێ'.

#٢٢٤٥ 5414- دوولـەت كـردن، لـە ئيتوراسـتێوا دڕانـدن: جـان نامەكەی دوولەت كردو دەسزیەكەی هاویشت.

#٢٢٤٦ 6850- دوولـەت كـردن: كونـترۆلچی سـینەما بیتاقەكەمی/ بلیتەكەمی دوو لەت كردو نیوەی دامەوە.

#٢٢٤٧ 5408- دەلاوەهەلكێشان: دوای ئـەوە كـە جلـەكان/ لیباسـەكانت بە سـابوونی شوشـتن، زۆر بـاش دەتاوێیـان هەلكێشە.

دەتاوێ كردن ← پارەی خۆ بە فیڕۆدان.

#٢٢٤٨ 4660- دە ئـەوێ كوتـان، دالـان، (پـوول) دان: كـابرای پۆسـتچی دەیزانـی توزشـی هەركـەس بـن، دەتوانـێ بەستەكانی پۆستی بۆ مـالیلێك پێ هـەلگرێ. دوای ئـەوە، كابرا دەیتوانی بەستەكان لە سـەرجادەی دانـێ. ● ئەگـەر پێت خۆشـە دەتوانـی دەگـەلمان بێـی. بـەڵام دەبـێ لـە خەرجەكاندا بەشدار بی. كەوابوو بدە پوولەكانت بزانم.

#٢٢٤٩ 2320- دەلەسـتۆ پەسـتاوتن، بەسـەر دابڕیـن، دەرخـواردانی نەغد كردنەوە بە: شەریكە بێ‌وێژدانـەكان ئـەو شـتورمەكانە بە كابانە خۆشباوەڕەكان نەغد دەكەنەوە.

#٢٢٥٠ 3584- دەبال خۆدابوون: هیـچ كـەس سـەرمودەری لـە كاری پەلاتە پەوەی ناكا. ئەو زۆرتر دەبال خۆی دایە.

#٢٢٥١ 6768- دەبلوەش گرتن: (بە گاڵتەو بـە كـردەوە) ئایـا ڕێزی لە بـەرازە پـڕ لـە بالۆكـەكان دەگـرتەو حـەزی لـە كەمتیارەكان دەكرد؟ ئایا بانباكەكانی دەبلوەش دەگرت؟

دەبوورەوەچوون ← لە هۆش چوون. بێحاڵ بوون.

#٢٢٥٢ 3184- دەبـەربابوون، پۆشـین، هـەبوون: بـۆی هەیـە باڵتۆیـەكی پۆسـتی دەبـەر دابـێ. ● فرگـوس دیـسـانیش قیافەی مرۆڤە خۆش قەلبەكانی هەبوو. ● نابێ گـەرمات بێ، چونكە هیچت دەبەر دانیە.

#٢٢٥٣ 2484- دەبـەر كـردن، پۆشـین، تـێزاكردن، پێكـردن: لـە كۆتـایی بەرنامـەی هـەڵقرینی ٦ سـەعاتە (بەفرۆكـە) نەمدەتوانی پێلاوەكانم دەبێ كەمەوە.(= پێم دە پێلاوەكانم ڕۆكەم).

#٢٢٥٤ 983- دەبـەر كـردن (ی لیباسـێكی دیكـە)، لیبـاس گۆڕیـن: تكایە، دەقیقەیەك راوەستە؛ شتێكی باشتر دەبەر دەكەم.

#٢٢٥٥ 5994- دەبـەر كـردن (بـەخێرایی) : خێرابـە باڵتۆكـەت دەبەركە؛ خەریكە ساردی دەكا.

#٢٢٥٦ 4975- دەبەركردن، پۆشین: نـازانم چ كراسـێكی دەبـەر كەم.

#٢٢٥٧ 1872- دەبەركردن، پۆشین، هەلكێشان: دەسـتەوانەكانی پۆشی، چەترەكەی هەلگرتەو وەدەركەوت.

#٢٢٥٨ 3649- دەبەركردن، پۆشـین، خۆ تـەیاركـردن: چـاو لـەو ژنومێردە ئالامۆدەی ـئاخرین مـۆدی لیبباسـیان دەبـەر كردوە.

#٢٢٥٩ 5993- (خێرا) دەبـەر كـردن، پۆشـین: لـە جێ‌ویانەكـەی هاتە دەر، پێژامەكەی دەبەر كردو لە پەنجـەرەی ڕا چـاوی لە دەرێ كرد.

#٢٢٦٠ 4804- دەبەركردن لەسەر، پۆشـین لەسـەر: لەسـەر كراسـە خوری‌یەكەی ژاكێتێكی دەبەر كرد.

#٢٢٦١ 5387- دەبـەر... كـردن: بـۆ سـەیرانو وەسـەر كێوان كەوتن، كەوشو شەلواری دەبەر منداڵەكانی كرد.

#٢٢٦٢ 7106- دەبەر (پان دەپێ) كردن بەمەبەسـتی تـاقی كردنـەوە پێش ئەوە كە جووتێك پیلاوی ئەندازەی پێی هەلگرێ، دە جووتی دەپێ كردنو تاقی كردنەوە.

#٢٢٦٣ 766- دەبیری شتێكەوە ڕاچوون، زۆر فـكـر لـە شـتێك كردنـەوە دالقە لێدان لەسەر شـتێك : بـەو هـەموو فكـر لێكردنەوەیـە مەسـەلەكەت بۆ دروست نابێ.

دە جێگایەكەوە چوون ← تێرەچوون.

دەحەوا كردن ← تیژ هەستان.

#٢٢٦٤ 9010- (لە پێوەندی دەگـەڵ تـەلیفوون كـردن دا)، دە تـەماس ئـان: پێـی دادەگـرت كـە دەگـەڵ بەرپرسـی نیشـەكەی دەتەماسی نێژێ (تەلیفوونی كابرای بەرپرسـی بـۆ وەسـڵ بكەینو بۆ خۆی قسەی دەگەڵ بكا).

دەتەنگانەخستن ← راگرتن.

دە تەویلە كردن ← زیندانی كردن.

دەدلو خستن ← بە هەڵە بردن.

دە تەڵە كەوتن ← لە دلو كەوتن.

#٢٢٦٥ 4595- (زاراوەی بێئەدەبانـە) دەخـۆت هـەڵدە، بـەدەلقەدا (جیزۆ)، وڵبە: پێم گوتی دەخۆت هەڵدە دەنا دەتكوژم.

#٢٢٦٦ 5437- دەخەوكـردن (بـە راژانـدن)، نوانـدن، خەولێكـەوتن: نێچیروان لـە باوەشـی دایكـی دا كـە رای‌دەژانـد خـەوی لـێ كەوت.

#٢٢٦٧ 4972- دەخەوكـردن، نوانـدنـەوە، نووسـتنەوە، خەولێكەوتنەوە، خەوتنەوە: دەگەڵ فینجـانێك چـا چۆنـی بـۆ ئەوەی خەوت لـێ‌بهاتەوە؟

#٢٢٦٨ 5732- دەخەوكـردن، خەولـێ‌خستن، نوانـدن: چلپـەچلپی لەسەرەخۆی شەپۆلەكان كە بەمەلـە دەكـەوتن دەخـەویان كرد.

← نواندن.

٣٢٦٩/ 7069- دەلوکەوتن: پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانی بدەمەوە، بە وردی بیریان لێبکەوە؛ رەنگە دە دلو بکەویو زانیاریی زۆر گرنگ بدرکێنی.
← لە دلو کەوتن.
دە داوی شتێك خستن ← دەگیری یان دە داوی شتێك خستن.
دە داوی کەسێك کەوتن ← گرفتار بوون، دە دەروونی خۆدا خەریکی شەر بوون دەگەڵ.
← دەستەو یەخە بوون دەگەڵ.
دەربارەی بابەتێك بوون ← لەسەر بابەتێك بوون، پێوەندی هەبوون دەگەڵ.
٣٢٧٠/ 2437- دەرباز بوون، لە سزادران رزگار بوون: کامران، لایەنی ئەو مەگرە. ئەگەر لایەنگری لەو بکەی، دەزانی چلۆن لە سزادران خۆی رزگار بکا.
← هاتنەدەر.
٣٢٧١/ 2685- دەربڕین، هاوار کردن، (بە دەنگی بەرز) گوتن: ئەگەر رۆژی هەموو شاری گرمانی خۆم لەسەر ئەم نەخشەیە دەربڕیبا، ترووشی ئەم هەموو گیروگرفتانە نەدەبووین.
٣٢٧٢/ 7096- (بیروڕا لێکردنەوە) دەربڕین، راگەیاندن: کاتێك بۆ یەکەم جارو بێوێنەکردنەوە تیئۆرییەکەم دەربڕی، گوتم کەمێکیش ورتناچێ رابێ.
٣٢٧٣/ 2686- دەربڕین: کاتێك هەڵبژاردنی گشتی بەڕێوەچوو، کۆمەڵانی خەڵك سەرەنجام توانیان نارەزایەتیو ناهومێدیی خۆیان لە دەوڵەت دەربڕن.
← گوتن.
٣٢٧٤/ 193- (لە دەریاسوورییەدا) دەربیچەکان بەستن و بۆ تۆفان ئامادە بوون: هەموو کارمەندو کرێکارەکانی کەشتی کۆ کرانەوە بۆ ئەوەی گشت دەربیچەکان داخەنو بۆ تۆفان ئامادە بن.
٣٢٧٥/ 7382- دەرپەڕاندن، دەرکردن: بە رۆژنامەیەکی لوولەکراو زەرگەتەیەکی لەسەر چێشتەکەی دەرکرد.
٣٢٧٦/ 7173- دەرپەڕاندن: پێش ئەوەی کە دوژمن بتوانێ بە ئەندازەی پێویست هێزی زەخیرە کۆ بکاتەوەو بتوانێ دەرمانپەڕێنێ، ئێمە بە باشی دادەمەزرێن.
٣٢٧٧/ 1761- دەرپەڕاندن، هەڵکەندن، دەرکردن، هێنانەدەر: تۆپخانە ناتوانێ دوژمن لە پەناگاکانی کە زۆر باش قایم کراون، دەرپەڕێنێ.
٣٢٧٨/ 5481- دەرپەڕاندن، دەرکێشان: سەعاتی ٣ی بەیانیی بۆ تەمرینی/ مومارەسەی ئاگر دە وڵاتی بەربوون لە جێگاکانمان دەریان پەڕاندین.
← وەدەرنان، هێنانەدەر، کورەگوێ کردن، پاشەکشە کردن.
٣٢٧٩/ 4698- دەرپەڕین، هاتنەدەر: چێوپەمەکە پلتەیەکی لێهاتو دەرپەڕیو شامپاینەکەش بە لووزەو هەڵڕژا.
٣٢٨٠/ 2284- دەرپەڕین، خێرا هاتنەدەر: زەمانی مارمێلکەدە دەرپەڕیو دەعبایەکی گرت.
٣٢٨١/ 6171- دەرپەڕین (لە پشت شتێك را): بەو لەپڕ دەرپەڕینەت، بەراستی زەندەقت بردم!.
٣٢٨٢/ 5870- دەرپەڕین: زەمانی مارمێلکەکە دەرپەڕیو مێشەکەی رفاند.
٣٢٨٣/ 5603- دەرپەڕین، هەڵپا کردنە دەر: بۆ تێك شکاندنی گەمارۆکە خەڵکی شار لەپڕ دەرپەڕینەدەر.
٣٢٨٤/ 6840- دەرپەڕین بە ... دا، هەڵپەڕان، بە پەلە تێپەڕین یان رابردن بە: ئەگەر جارێکیتر ئاوا بە پەلە لە شەقام بپەڕیەوە/ رابڕی، وەبەر پاسێك دەکەوی.
٣٢٨٥/ 1987- دەرپەڕین لە، خۆ فڕێدان لە: کابرای فڕۆکەوان کە دیتی فڕۆکەکەی بۆ کونتڕۆڵ ناکرێ، خۆی فڕێدا دەرێ.
← هاتنەدەر، قوت بوونەوە.
٣٢٨٦/ 5459- دەرچوون (بە هاسانی): ئاڵفرێد بە هاسانی لە تاقیکاریی جوغرافیا دەرچوو.
← قبووڵ بوون، تێپەرکردن، رزگاری هاتن.
٣٢٨٧/ 5062-(لە تاقیکاری) دەرچوون، وەبەرچاوهاتن، خوێندان: سیستەمی بەرگری بە رادار لە شەرەکانی هەوایی ساڵی ١٩٤٠ لە تاقیکاری دەرچوو.
٣٢٨٨/ 7171- دەرچوون، دەرکەوتن: ئەو نیشانانەی کە دابوویانن بە پزیشکی بە درۆ دەرنەچوون.
دەرچوون بە سلامەت ← بە سلامەت دەرچوون.
دەرچوون (ی ئاو) ← چوونەدەر
دەرچوون لە ← هەڵاتن لە.
دەرچوون لە چوارچێوەی یاسا ← مەجاز نەبوون.
دەرچوون لەژێر ← هەڵاتن لەژێر.
٣٢٨٩/ 2244- دەرخستن، تێگەیشتن: سەرەنجام رۆژێك دێ کەسێك لێی بکۆڵێتەوەو دەریخا کە هۆی چ بووە کە ئەو هەمووە پارەمان لەدەست داوە؟
← وەدەرخستن ← روونکردنەوە، نیشاندان.

۳۲۹۰/ 5033 -دەرخوارد دان (ی قسەیەکی درۆ): ئەو لەو تیپە پیاوانە نیە کە بتوانێ درۆی دەرخوارد دەی.
← دەمەستۆ پەستاوتن.
دەرخۆنە لەسەردانان ← شاردنەوە.

۳۲۹۱/ 1060 -دەرمانو خاوێن کردنەوە: ئەویلەکان یەکجار پیسن. ئاخرین جار کەنگێ بوو دەرمانو خاوێنتان کردنەوە؟
← خاوێن کردنەوە.

۳۲۹۲/ 7215 - دەرئەهێناڵ کردن لە لای، باری خەمو پەژارە سووک کردن لە لای، بوخچەی دڵی خۆ بۆ کەسێک کردنەوە: ئاواتی ئەوە بوو کەسێکی دڵسۆز پەیدا بکاو بوخچەی دڵی بۆ بکاتەوە.
دەردی سەگان دان بە کەسێک ← ریشەی کەسێک دەرهێنان.
دەردی کەسێک خواردن ← بە خزمەتی کەسێک گەیشتن (لێدان).

۳۲۹۳/ 5180 - دەرس خوێندن بە مەبەستی ...: بۆ وەرگرتنی لیسانس/ باکالوری لە رشتەی مێژووناسیدا سێ ساڵان دەرسی خوێند.

۳۲۹٤/ 3400 - دەرس گوتن، دەرسی ... گوتن بە ...: کاتێک میرانەکە وەزیری کلاس کەوت، دەرسی جنێو بە تالشی کەم ئەندامەکان دەگوترا.

۳۲۹۵/ 6680 - دەرس وەرگرتن لە، گوێدان بە: هیچ گرێیان نەدا بەو هەموو ئامانەی کە بۆیان دەنووسرا سەبارەت بە قەرزە رەدراکەوتووەکانیان.

۳۲۹٦/ 5624 - دەرسی ... فێر بوون: شای تازە لاو هونەری پێک هێنانی تەعادول لە رێگای تێک بەردانی هێزەکانەوە باش فێر ببوو.

۳۲۹۷/ 4020 - دەرفەت: دەمەویست دەگەڵ ئەو کچە قسان بکەم، بەڵام لەبەر ئەوە کە ژمارەیەکی زۆر لە دۆستان لێرەولەوێ راوەستابوون، دەرفەتم پەیدا نەکرد.

۳۲۹۸/ 2425 - دەرفەتی لە ئەنجامدانی کارێک پەیداکردن: کاتێک سەرەنجام دەرفەتی کرینی کارتی کریسمسم وەدەست هێنا، ئیدی زۆر درەنگ ببوو.

۳۲۹۹/ 363 - دەرکران، وەدەرنران: دەمزانی ئەگەر زۆری بخۆمەوەو شەڕێ ساز کەم، گوێم دەگرنو دەرم دەکەن.

۳۳۰۰/ 6449 - دەرکردن، وەدەرنان: پێش گۆڕانی یاسا، بۆی هەبوو پزیشکەکانی ئینگلیسی بە تاوانی منداڵ لەبەر ژنان بردن وەدەرنێن.

۳۳۰۱/ 6961 - دەرکردن، فڕێدانەدەر: ئێستا کە دەزانی بۆ لێرەم، داخوا ئیجازەم پێ دەدەی بێنمەوە یان دەتەوێ دەرم کەی؟

۳۳۰۲/ 5721 - دەرکردن، دەرکران لە پارێ، وەدەرنان: دەگەڵ داوەر دم بە دەمە مەکە دەنا وەدەرت دەنێن.

۳۳۰۳/ 701 - دەرکردن (چرۆ، خونچە)، دەرهێنان: ئەو هەوا گەرمە بۆتە هۆی هاتنە دەری گوڵی دارەکان/ بۆتە هۆی ئەوە کە هەموو دارەکان گوڵ بکەن.

۳۳۰٤/ 5711 - دەرکردن، وەدەرنان: ئەگەر جارێکی دیکە ئەو کوڕە هاتەوە ئێرەو دەستی کردەوە بە بڵاوکردنەوەی ئامیلکەی بازرگانی، دەری کەنو پێی بڵێن لەمەودوا نەیەتەوە.

۳۳۰۵/ 5728 - دەرکردن، وەدەرنان: 'ژیلوان، لە کاریدۆرێ چ دەکەی؟'، ئاغای ... بە هۆی دروست کردنی تیری کاغەزی وەدەری ناوم.'

۳۳۰٦/ 5014 - دەرکردن، وەدەرنان: ئەگەر جارێکی دیکە دۆستە بە هەراهەراکانی بێنیتە باشگایە/ یانەی، وەدەری دەنێین.

۳۳۰۷/ 4915 - دەرکردن (چرۆ، خونچە): بەهاران، پەرژینەکان چرۆی دەردەکەن.

۳۳۰۸/ 4376 - دەرکردن: منداڵەکانیان لە ئاشپەزخانە دەرکرد، چونکە دایکیان لەوێ کاری هەبوو.

۳۳۰۹/ 1986 - دەرکردن، وەدەرنان، پاڵەوپەستۆدان: ژمارەی ئەو چێشتخانانەی کامرانیان لێوەدەرناوە زۆرترە لە وانەی ئەمتۆ نانت لێ خواردوون.

۳۳۱۰/ 2080 - دەرکردن، وەدەرنان: لە ماڵێکی ئاوا چکۆڵەدا دەرکردنی بۆنی مەتبەق کارێکی زۆر گرنگە.

۳۳۱۱/ 2161 - دەرکردن (لە خەت)، دەرهاویشتن، هاتنەدەر: سەربازەکان لە خەت هاتبوونە دەرو لە کەنار جادەکە راوەستابوون.

۳۳۱۲/ 1746 - دەرکردن، وەلابردن: لە بەشی دژواری ئاسایش وەلایان بردو دایان بە بەشێکی گشتی لە نەخۆشخانە.

۳۳۱۳/ 1762 - دەرکردن: لە دەرەوەی وڵات لە چەند جێگا دەرسی دەگوتەوەو لە هەمووان دەرکرا.

۳۳۱٤/ 2059 - دەرکردن لە، وەدەرنان لە: کاتێک شووڕا کابرایەکی پیری بەو تاوانە لە ماڵەکەی خۆی وەدەرنا کە ئاگای لە باخچەی ماڵەکەی نەبوو، هەموو کرێگرتەکانی دیکە تێکڕا دەنگی ئیعتیرازیان دەربڕی.

٣٢١٥/ 7455- **دەرکردن (تووڕەییو ...) بە کەسێك:** پێویست ناکا نارەحەتیەکەت بە من دەرکەی.

٣٢١٦/ 3775- **دەرکردن لە سەرکار، وەدەرنان:** کارخانە کرێکاران وەدەردەنێ.

← دەرپەڕاندن، وەدەرنـان، کردنەوە، هێنانەدەر، (کـەن، بزغز، تین) بە کەسێك دەرکـردن، کەم کردنەوە (لـە)، دەرهاویشتن، تەپ کردن.

٣٢١٧/ 3808- **دەرکەوتن، بڵاوبوونەوە:** ئیحتیاتێکی زۆریـان کردبوو کە وردەکارییەکانی ئەو ژغرازییە وەدەرنەکەوێ.

٣٢١٨/ 624- **دەرکەوتن، (هەتاو، ڕۆژ، مانگ ...) هەڵهاتن:** لە سەعاتی ١١ی بەیانی، ڕۆژ (لە پشت هەوران) هاتـەدەرو بەرە بەرەو زولمێکی قورسی کە لەسەر گیاوگژ کەوتبوو وشك کردەوە.

٣٢١٩/ 1256- **دەرکەوتن، هاتنەدەر:** بـە بـڕوای مـن واتـای ڕاستەقینەی ئەو پارچە موسیقایە لە لێکدانەوەکەی ئەو کابرایەدا بە ڕوونی دەردەکەوێ.

٣٢٢٠/ 1172- **(بەشێوەیەکی پڕلە داغ وکەسەرەوە) دەرکەوتن، ڕوونبوونەوە:** سەرەنجام بۆ خەڵك ڕوون بۆوە کـە شەڕ درێژو خایە ئەو خوێناوی دەبێ.

٣٢٢١/ 2245- **دەرکەوتن، ئاشکرابوون:** بـەڵێنییت پـێدەدەم سەرەنجام کارە چەوتو چەپەکانی ئاشکرا دەبن.

٣٢٢٢/ 7170- **دەرکەوتن، ڕوونبوونەوە، ئاشکرا بـوون:** دەرکـەوت کە لە شەقامی کالنۆنی لە دایك بووە.

٣٢٢٣/ 2552- **دەرکەوتن، بڵاوبوونەوە:** بەشێوەیەك ئەو هەواڵـە بڵاو بووە کە کاسیوس کلیی لە هوتێلەو... .

٣٢٢٤/ 2817- **(زۆرتر وەیەك لـە ئینجیلدا - وەحـی) دەرکەوتن (ی فەرمانێك)، وەدەرکەوتن، دروست کران:** لـە کـاتی هـیرودەوە فەرمان درا کە هەموو منداڵێکی ساوا دەبێ بکوژرێن.

← ئاشـکرا بـوون، دەرچـوون، دیـتران، ڕوونبـوونەوە، بەراشکاویی گوتن، وەدەرخستن، هەڵاتن.

٣٢٢٥/ 4665- **دەرکێشان، دەرێنان:** داهاتەوەو بـە ددانـی دڕکەی دەرێنا.

٣٢٢٦/ 1720- **دەرکێشان، دەرهێنانەوە لەژێر:** هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەیان لەژێر گڵو بەردی خانووە ڕووخاوەکـە دەرهێنایەوە.

٣٢٢٧/ 2717- **دەرکێشان، لێدەرکێشان، وەدەست هێنـان، لێوەرگرتـن (ی زانیاری):** ئەو هەمیشـە بـەوە خـۆی رادەنـێ کـە گۆیـا زانیارییـەکانی لـە بـەرزترین بەرپرسـان وەردەگـرێ لـە حاڵێکدا لە کارمەندەکانی خوارێیان دەردەکێشێ.

٣٢٢٨/ 5971- **دەرگا لەسەر کەسێك بە توندی پێوەدانەوە، پـاڵ بـە سینگی کەسێکەوەنان:** بـۆ ماوەیـەك فرۆشیارێکی گـەڕۆك (چەرچی) بوو، بـەڵام زۆر زوو لـەوە کـە خـەڵك دەرگـای لەسەر پێوە دەنەوە/ پاڵ بە سینگییەوە بنێن ماندوو بوو.

٣٢٢٩/ 5904- **دەرگا لەسەر خۆ داخستنو پێوەندیی نەگرتن دەگەڵ خەڵك:** ئالفرێد بۆ ماوەی مـانگێك دەرگـای لەسـەر خـۆی داخسـتبوو بـۆ ئـەوەی دواکـەوتوویی خـۆی لـە دەرسـی 'علوم'دا قەرەبوو بکاتەوە.

٣٢٣٠/ 3984- **دەرگا لەسەر کەسێك داخستن یان قفل کردن:** دەرگـای هۆدەی دیلەکانی شەریان بە شەو قفل دەکـرد بـۆ ئـەوەی چیدی هەڵنەیەن.

٣٢٣١/ 3985- **(بە هەڵە) دەرگا لەسەر کەسێك قفل کردن:** دەرکـەی بکەوە، کەرە! قفلت داوە.

٣٢٣٢/ 3987- **دەرگا لێنەکردنەوە:** بابم هەرەشەی لێکردین کـە ئەگەر هەتا نیوە شەوێ لە میوانی نەگەڕێینەوە دەرگامان لیّ ناکاتەوە.

٣٢٣٣/ 5910- **دەرگاو پەنجەرە داخستن:** دەرگـاو پەنجـەرەکانی دیوەکەم جوان داخسـتو کلیلەکانم دا بە دەرکەوانەکە.

٣٢٣٤/ 4362- **دەرگـا (لـە پۆلیس) کردنـەوە:** 'دایـە بیکـەوە ئـەمنم! هاتوومـەوە.' ● 'بـە نـاوی قـانوون، بیکەنـەوە (دەرگاکە بکەنەوە)'.

٣٢٣٥/ 3986- **دەرگـای هاتنـە ژوور لەسـەر کرێکـاران داخسـتن:** دەرگای کارخانەمان لەسەر کرێکاران داخستووە (وناهێڵین بێنە ژوور) هەتا مل بۆ مەرجەکانی خاوەنکار ڕانەکێشن.

٣٢٣٦/ 6945- **دەرگیر بوون، بەرەوڕوو بوون:** دیسانیش هـەوڵی دا (بە ورەیەکی بەرزەوە) دەگەڵ ژیان بەرەوڕوو بێ.

٣٢٣٧/ 6826- **دەرگیر بـوون دەگـەڵ، بـەگژدا چـوون:** نابـێ هـەوڵ بـدەی بـەگژیدابچی - لـە تـۆ هـەم زەلامتـرو هـەم چوارپەلقایمترە.

← تێك هەڵچوون، بەرەوڕوو بوون دەگەڵ، دەست پێکـردن (بە شەڕ).

←تێوەردان.

٣٢٣٨/ 7076- **دەرمان کردن، چاك کردنەوە، معالەجە کـردن:** پزشـك ماوەیەکە خەریکی معالەجـە کردنـی سـەرئێشـەی خـاڵی جونزە. بۆخۆشـی پێـی وایـە کـە دەبـێ نارەحەتییـەکی جیددی هەبێ.

٣٢٣٩/ 7150- **دەرهاتن بە شـکڵی شـتێك، بـوون بـە شـتێك، گـۆڕانو بوون بە ... لێدەرهاتن:** حەیوانێکی کە لە بەر کونەکەی خـۆی

به شێوەیەکی سەیر دێو دەچن، (گوڵێزەکە/ گوڵچرپەکە) لە پڕ بوو بە مەیموونێکی بە هەڵبەز هەڵبەز.
← خاران، بە تەواوی فێر بوون.
دەرهاویژران ← وەلانران.

٨٢٤٠ 3834- **دەرهاویشتن، لە قاڵب هەستان، لە بیر چوون:** دەتوانن ئەمن دەرباوێژن. ناممەوێ دەگەڵ کەوم. * کاتێك بانگهێشتن نامەکانت دەنووسی، هیچ کەست لە بیر نەچوو؟

٨٢٤١ 2071- **دەرهاویشتن، مەعاف کردن:** چونکە تا دەرمنگانێکی کارت کردووە، لە بەشداری کردن لە کۆبوونەوەی سبەینێ بەیانی دەرمانهاویشتی.

٨٢٤٢ 3315- **دەرهاویشتن، دەرکردن لە:** بە راستی دەتەوێ بۆ هەمیشە ئەمن لە خزمەتگشتییەکان دەرکەی.

٨٢٤٣ 6710- **دەرهاویشتنی فکرێك لە مێشك:** بە ورمڤان کایەی دەکرد، کتێبی دەخوێندەوە، دەچۆوە گەرانێ _ بە کورتی هەموو کارێکی دەکرد بۆ ئەوەی کە فکری بریارێکی کە دەبوو بیدا لە مێشکی خۆی دەرباوێژێ.

٨٢٤٤ 2072- **دەرهاویشتن لە، مەعاف کردن:** خۆشناویان بە هۆی "کاری لە پێشدا رێزێزو کراو" لە چوون بۆ سەربازی مەعاف کرد.
← دەرکردن (لە خەت)

٨٢٤٥ 5425- **دەرچەی ئەفسەری وەرگرتن:** پێش شەری دووهەمی جیهانی دیتنی ئەفسەرێك کە لە گرووبانییەوە بووبێتە ئەفسەر شتێکی ناناسایی بوو.

٨٢٤٦ 3310- **دەرئەنجامێکی خێر بە ئاوات خواستن بۆ:** نازانم وتووێژەکان چۆن دەچنە پێش. تەنیا کارێکی کە ئێمەمانان لە دەستمان دێ ئەوەیە کە پاڵ دەینەوەو سەرئەنجامێکی خێر بە ئاوات بخوازین.

٨٢٤٧ 3449- **دەرهێنان (بەشێکی نەوەك تەرز):** ئەگەر درووت ڕەقامکی راچوو، بە دەرزی دەری مەهێنە. * ئەو تیلایە هەڵمەسووریتە. چاری یەکێکی دەردێنێ.

٨٢٤٨ 4806- **دەرهێنان، لێکردنەوە:** ئەخشەکە بە پشتی کتێبەکەیەوەیەو بۆ هاسان بوونی کار دەکرێ لێی کەیەوە.

٨٢٤٩ 2090- **دەرهێنان:** دیتنەوەی ئەوت مەسەلەیەکەو، دەرهێنانی (لەژێرزەوی) مەسەلەیەکی تر.

٨٢٥٠ 4801- **دەرهێنان، دەرکێشان، داکەندن:** 'وەرە، یارمەتیم دە ئەو چەکمانە داکەنم.' 'بزانە بێئەوەی ئەو پەرداخانە تێك دەی، دەتوانی سفرەکەیان لەژێر دەرکێشی؟.

٨٢٥١ 1880- **دەرهێنان، کێشانەوە:** کاتێك دەیەویست بزمارێك لە داری دەربێنێ دەستی خۆی کوڵەوار کرد.

٨٢٥٢ 2559- **دەرهێنان، دەرکێشان، وەدەرخستن، هێنانەدەر:** دەبوو رێگایەك بدۆزینەوە بۆ ئەوەی ئێرسەکە لە ماڵێ بێنینە دەر.

٨٢٥٣ 3201- **دەرهێنان، کێشان:** دای لەوزەکانی دەربێنن، ئەوەش عەمەلێکە خەتەرناك بۆ پیاوێکی پیری وەك ئەو.

٨٢٥٤ 2512- **دەرهێنان، لابردن:** قامکی وەها ئەستوور ببوو کە نەیدەتوانی ئەنگوستیلەکەی دەربێنێ. * ئەو حەیوانە بزگەنیوەی لەسەر مێزەکەی لابەو دە قەفەزەکەی نێوە.

٨٢٥٥ 6368- **دەرهێنان، قامك لێراوەشاندن بۆ هەرەشە:** بەکێلك لاقی دەرهێناو لاقی وەبەر لاقم دا. * قامکم لێرامەوەشێنە - بە باوکت دەڵێم.

٨٢٥٦ 5418- **دەرهێنان، برین و دەرکێشان، خراپ کردن، تێکوەگلان، تێکرووخاندن:** بەرنامە دارێژەرانی شارسازی هەموو خیابانو کوچەو کۆڵانە پڕ لە خوارەو پێچەکانی نێوەراستی شاریان تێکرووخاند.

٨٢٥٧ 1589- **دەرهێنان، لێکردنەوە:** پێش ئەوەی کابرای پێلاو درووی رووبەی پێلاوەکە لێیکاتەوە/ دەربێنێ، چەرمەکەی بە وردی هەڵسەنگاند.

٨٢٥٨ 7478- **دەرهێنان بە شکڵی ...، دروست کردن لە:** لە قوورە سوورەکە پەیکەرەیەکیان دەرهێنا/ کە باڵی دابزوە.

٨٢٥٩ 6739- **دەرهێنان لە، بەرهەڵست کردن لە، هەڵگرتن لە:** پاکەتێکم سیغار دەرهێناو هەرپیاوەی دانەیەکم ڕاداشتە کردن.

٨٢٦٠ 5039- **دەرهێنان وەك پەزاڵ، وەك پەزاڵ لێکردن، بە گاڵتەو بارهێنان:** ئەفسەرەکانی ئێستای وەك پەزاڵ بار هێناون. ئەو ئامووزیشی رەزمی/ ئامووزیشی نیزامی زۆر لە ئامووزیشی زانکۆ بە نرختر دەزانێ.
دەرهێنان ← داکەندن، هەڵکەندن، وەخەبەر هێنان، هەڵێنجان، دەرکردن (چرۆ، خونچە)، (پارە) دان، کێشان، هەڵبژاردن (بە زۆر) هەڵکەندن.

٨٢٦١ 2257- **دەرهێنانەوە:** هەموو مانگێ چەند ماشێنی فرێدراو لە کاناڵەکە دەردێننەوە.

٨٢٦٢ 1726- **دەرهێنانەوە، لە قەبری دەرهێنانەوە:** پۆلیسان تەرمی ژنە گەورەکەیان دەرهێناوەتەوە.
دەرهێنانەوە لە دەستی ← ئەستاندنەوە.
دەرهێنانەوە لە ژێر ← دەرکێشان.

دەرگیر کردن ← گرتن.
دەزووری کردن ← زیندانی کردن.

٣٣٦٣ 2659- **دەست لاواندە کردن، مەیدان دان بە، رێگادان بە:** زۆر سەیرە کە تەنیا لە کاتی شەڕ دایە کە لاوەکان دەستیان ئاواڵە دەکرێن بۆ هەرچەشنە ماجەراجوویی‌یەك.

٣٣٦٤ 3208- **دەست بردن بۆ، پەنا بردن بۆ:** هیوادار بوون کە بە بێ پەنابردن بۆ قانوون، بتوانن بۆخۆیان کێشەکە حەل کەن.

دەست برین ← فریودان.

٣٣٦٥ 3366- **دەست بۆ کارێك بردن، لەئەزموون بردن لە، زیادەڕەوی کردن لە کارێکدا:** کاتێك ئاغای سیلاس پێشنیاری کرد بە بێ سووت پرولێکمان بە قەرز بداتێ، زۆرمان پێ سەیر بوو، چونکە زۆر لەوەی دوورە کە خۆی تێکەڵاوی ئەو جۆرە کارانە بکا.
← دەست دانە کارێك.

٣٣٦٦ 7189- **دەست بۆ کارێك بردن:** دەزانم هەمیشە لەسەر ئەو بڕوایە بووی کە دەست بۆ هەر کارێك بەری دەتوانی ئەنجامی دەی و لە زۆربەی کارەکانیشدا وابووە.

٣٣٦٧ 4103- **(لە پڕ) دەست بۆ لای ... درێژ کردن:** بێجگە لەوە کە لە پڕ دەستم بۆ لای درێژ کەم، هیچی دیکەم پێنەدەکرا.

٣٣٦٨ 6357- **دەست بۆ هەموو کارێك بردن:** 'خۆشی بوێ؟' بێگومان خۆشی ناوێ. دەست بۆ هەموو کارێك دەبا بۆ ئەوەی لە سەرزنی خۆی لابیا.

دەست بۆ هیچ کارێك نەبردن ← بێکار بوون.

٣٣٦٩ 2254- **دەست بە پرسیار کردن:** 'دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم.' ، 'فەرموو، دەست پێ بکە (بە پرسیارکردن).'

٣٣٧٠ 838- **(لەئەنگلو) دەست بە پێکەنین یان گریان کردن:** چاوی دەگێراو دیار بوو دەیەوێ بگری. ● پاش ئەوەی ڕووداوەکەم بۆ دۆستێکم کە بەرگدرووە گێڕاوەو ئەویش لە قاقای پێکەنینیدا.

٣٣٧١ 4368- **دەست بە تیرهاوێژی کردن:** لە سەنگەرێکی داپۆشراوەوە تیربارێك دەستی بە تیرئەندازی کرد.

٣٣٧٢ 334- **دەست بە چەند لێسان کردن، درێژدادڕی کردن:** ئەی خودایە گیان، دیسان دەستی بە درێژدادری کرد. ئەری کەس نیە بێدەنگی کا؟.

٣٣٧٣ 3764- **دەست بە دروست کردنی ... کردن:** لە تینی سایدێ دەستیان کردووە بە دروست کردنی چەند ئەوتکێشی مۆدێلی تازە.

٣٣٧٤ 5795- **دەست بە دەمەقاڵە کردن:** هەرکات ئەو دوو ژنانە دەست دەکەن بە دەمەقاڵە، لێیان دەبێتە شەڕ.

دەست بەردار نەبوون ← پێداگرتن لەسەر.

دەست بەردان لە ← پشت تێکردن.

٣٣٧٥ 7451- **دەست بەسەرداگرتن (ی دامەزراوێکی لەلایەن کرێکارانەوە):** لە ماوەی دەست بەسەر داگیرانەکەی بارتەندازەکانی کلایدبەنك، کۆمیتەیەکی هەڵبژێراوی کرێکارەکان، ڕۆژ بە ڕۆژ بڕیاری پێویستی دەدا.

٣٣٧٦ 6213- **(جیاکردنەوە بە سینگانەو) دەست بەسەر داگرتن:** دەچینە لای باکووری کوتەزمەوییەك (ی بە سینگان جودا دەکەینەوە) دەیکەینە هی خۆمان.
← دەست درێژی کردن، زەوت کردن.

دەست بەسەرداهێنان ← جوان جوولانەوە دەگەڵ.

٣٣٧٧ 1394- **دەست بەسەر کردن، پێنگی چووڵەدەری کەسێك گرتن:** دوای ئەسادوفەکە بۆ ماوەی ٦ هەفتان مناڵەکەیان دەست بەسەر کرد (= نەیانهێشت لە ماڵێ وەدەرکەوێ).

٣٣٧٨ 5580- **دەست بەسەری خۆداهێنان، دەست دەمووی سەری خۆ وەدان:** لە شێوەی دەست تێوەردانی لە مووی سەری زانیم کە ئەو دەرفەتە گەورەیە ڕەحمیەجانی خستووە.

٣٣٧٩ 4593- **دەست بە قسان کردن (بە دەنگێکی زیرو بڵند):** لە پڕا بە دەنگە زیق زیقەکەی دەستی بە قسان کردو گوتی: 'تکایە، بڵێن هاریی چییە؟'. (هاریی جانەوەرێکی ئەفسانەیییە کە بەدەنو ڕوخساری ژنەو باڵو چەنگوڕکی وەك باڵندانە وەرگێڕ).

٣٣٨٠ 6801- **دەست بە قسە کردن دەربارەی:** برتلێکی ریسکی دەرتێنا و دەربارەی رابردووەکان دەستی بە قسان کرد.

٣٣٨١ 6346- **(لە لەرزەکەشیدا)، دەست بە تەمەرۆ کردن، دەست بە مەشق کردن:** ئێستا کە دەست بە مەشق کردن دەکەن، هەنگاوی تەولو ٧٥ سانتی‌میتری باوێژن.

٣٣٨٢ 2974- **(بە هەموو هێزەوە) دەست بە کاربوون:** یاڵلا جان! بە هەموو هێزەوە دەست پێ بکە. ئەو جار دەتوانی ڕێکۆردەکە بشکێنی.

٣٣٨٣ 2465- **دەست بە کاربوون، قۆڵ هەڵماڵین:** لە یەکەم ڕۆژی قوتابخانە ... هەروەها فێریان کردین بۆ بەڕێوە بردنی ئەرکی پیرۆزی شکستدانی یەکتر دەست بەکار بین.

٣٣٨٤ 7186- **دەست بەکاربوون:** مناڵەکان دەست بە کاربوونو قاپەکانیان کۆ کردەوە.

٣٣٨٥ 6673- **دەست بەکاربوون، بۆ خۆم/ بۆ خۆی ...:** بە ڕوونی دیار بوو کە مودیری قوتابخانە بۆ خاترجەم بوون لە درانی

'مەدمەعاش'ی من هیچ کارێك ناكا، بۆیە بۆ خۆم دەست بە كار بووم‌و چوومە لای كەسێك لە نیـداری پەروەردە‌و فێركردن.

٢٣٨٦ 6660- **دەست بە كـار بوون، هەڵتە ئیـوکاركـەوە:** ئـەو چەرچی‌یە/ وێزیتۆرەکە لە شـاری نیوتـون دا دەگـەڕێ زۆر لەوە زرینگ ترە كە كلكی بە تەڵەی پاسـاوە بـێ. دیـارە هەتا ئەو كاتەی كە ناغای وات دەست بە كار دەبێ.

٢٣٨٧ 377- **دەست بەكار بوون، وەخۆكـەوتن:** وەك زۆر كەسـی‌تر كە سەروكاریان دەگەڵ ئـەو مەسـەلە بـوو، ئـەویش بـۆ وەدەست هێنانی پووڵ دەست بەكار بوو.

٢٣٨٨ 2988- **دەست بـەكار بـوون:** مـەئموورەكانی ناسـایش دەست بەكار بوون‌و زۆر زوو هۆی كەیشـتنی نهێنی‌یـەكان بە دەستی دوژمنیان دۆزیەوە.

٢٣٨٩ 5790- **دەست بـە كـار بـوون بـۆ:** كـاتێك بەراسـتی بـۆ ناگابوون لە كەسێك دەست بەكار دەبم، هەمیشە كارەكـەم باش ئەنجام دەدەم.

٢٣٩٠ 7244- **دەست بـەكار بـوون بـۆ كـارێكی (ئەنجـامدان):** بـەم هیوایە كە دیـسانیش جێگای تازەی دیكـە بدۆزنـەوە، بـۆ سەفەرێكی دیكەی دەریایی دەست بەكار بوون.

٢٣٩١ 3152- **دەست بەكار بوون بۆ:** لە یاری‌یەكانی داهاتوودا، دەیەوێ بۆ شكاندنی ڕێكۆردی ٥هەزار میتر دەست بـەكار بێ. ● ئەگەر وەزعەكە هەر ئاوا بچێتەپێش، پێم خـۆش نیە بۆ تەعمیر كردنی خانووەكە دەست بەكار بم.

٢٣٩٢ 6278- **دەست بەكار بوون بۆ:** ماشێنێكی نیرمتـازم بـە نرخێكی دەكڕێ بڵێین زۆر گـران لـە دوكتورێكـی جحێـڵ كڕی‌و بۆ دۆزینەوەی ژانیت دەست بەكار بووم.

٢٣٩٣ 4117- **دەست بە كار بوون بۆ گەیشتن بـە ...:** ئێسـتا ئـەوە ساڵێكە خۆشناو لەو شیركەتەی كار دەكا. بـە بـڕوای تـۆ هەتا ئـەو ڕۆژەی كـە بیـەوێ بـۆ گەیشـتن بـە بـەرزترین بەرپرسایەتی دەست بەكار بێ چەند دەخایەنێ؟

٢٣٩٤ 2766- **دەست بەكار بوون، دەست پێكـردن:** لادێی‌یـەكان بـۆ دروست كردنی سـەدێك دەست بەكار بوون.

← دەست پێكردن (لێبڕاوانە)، وەخۆ كەوتن.

٢٣٩٥ 2907- **دەست بەكاری ... بوون بە هەموو توانـاوە:** بە هـەموو تواناوە دەست بە كاری شوغلێك بوو كـە بەوەدەركـەوتنی سەرەتای كەسادیی ئابووری لەنێو نەچێ.

٢٣٩٦ 41- **دەست بـە ... كـردن، بەسـەر لـە ... هـەڵكردن:** كـاتێك باوكی كۆچی دوایی كرد، خەر بۆ دابین كردنـی كەرەسـەی ژیانی باسـكی لێ‌هەڵكرد (دەست بەكار بوو).

٢٣٩٧ 6781- **دەست بە كارێك كردن، كارێك دەست پێكـردن:** چـارلی كارەكەی خۆی بەجێ هێشت بۆ ئـەوەی كـارێكی باشـتر‌و ئابروومەندانەتر دەست پێ‌بكا.

٢٣٩٨ 5798- **دەست بـەكار كـردن پـان بـوون:** دوای نـان‌و چـای بەیانی، دەست بەكار بووین‌و قەفەزێكمان بۆ چووالووەكـە دروست كرد.

← وەكار كەوتن، چوونە سەر كارێك.

٢٣٩٩ 227- **دەست بە یەخە بوون:** لەوسەرو بـەندەیدا دەگـەڵ نەخۆشی‌یەك دەست بـە یەخـە بـوو كـە پـاش ماوەیـەك كوشتی.

دەستپاچە بوون ← خەجاڵەت بوونەوە، نارەحەت بوون.

٢٤٠٠ 1805- **دەست پێداهێنان، سەرلەنوێ جوان كردنـەوە:** نـابینی ڕەنگی دیوارەكان چۆن هەڵدەوەرن؟ پێویستی‌یان بە ڕەنـگ لێدانەوەیەكی باش هەیە؟

٢٤٠١ 2426- **دەست پێڕاگەیشتن:** پیاوی ژیر پاشەكەوتی خـۆی لە بانك دادەنێ نەك لـە ماڵـێ كـە دزان دەسـتیان پێـی ڕابگا.

٢٤٠٢ 2533- **دەست پێڕاگەیشتن، دەست گەیشتن بـە:** دیسـان ئـەو پشیلانە نەیانهێشت دوێنێ شەوێ بنـووم. ئەگـەر دەسـتم پیانگاتێ، دەیانكووژم.

٢٤٠٣ 3207- **دەست پێڕاگەیشتن:** كاغەكە هۆدەیەكی گەورەیـە كە دەرگای لەسـەر شەقامەر، خەڵك دەستیان پێی‌ڕادەگا.

٢٤٠٤ 2607- **دەست پێڕاگەیشتن:** پۆلیس نازانێ دزەكان چلـۆن دەستیان بە سندووقە پۆلاكە ڕاگەیشتووە.

٢٤٠٥ 3784- **دەست پێڕاگەیشتن:** ڕووسـەكان دەستیان بە هـەر چەشنە دەزگایەك‌و زەخیرەیەك گەیشتبا هەڵیان دەگرت‌و بەرەو ڕۆژهەڵات بەرێیان دەكرد.

← گرتن.

٢٤٠٦ 2520- **(بلێ) دەست پێكردن:** كابرای دەوڵەمەندە زۆر چـاك دەستی پێكرد‌و واوێدەچوو ڕێكۆرد بشكێنێ.

٢٤٠٧ 3631- **دەست پـێكردن، كردنـەوە:** قـەرارە موسـابەقە/ پێشبڕكێ لە سـەعاتی ٢/١٥ دەست پێ‌بكا. ● یەكێك لـە كەسـایەتی‌یە ناسـراوەكانی تەلـەڤزیۆنیان بـۆ كردنـەوەی یاریی كۆتایی بانگ هێشتن كردبوو.

٢٤٠٨ 6041- **دەست پێكـردن، خێرا وەرێكـەوتن:** گوێتبـووم ئـەو كەرەسانە لێرە لابەن. دەست پێ‌بكـەن، دەی! ● هـەموو ڕۆژەكەمان وەخت نیە. خێرا وەرێكەون. بجووڵێنەوە.

٢٤٠٩ 3168- **دەست پێكردن:** نابێ بۆ ئامرازە كارەبایی‌یـەكان نیگەران بێ: ئێمە هـەتا پێش مـانگی جولای كارەكـە دەست پێدەكەین/ بەدەسـتەوە دەگرین.

٣٤١٠ 2610- دەست پێكردن، دەست كردن بە: پیاوەكان بە كۆمەڵ لە پاسەكە دابەزینو دەستیان كرد بە خواردنی چیشتێك كە بۆیان ئامادە كرابوو.

٣٤١١ 7035- دەست پێكردن، هەڵایسان، وەرێكەوتن: نائارامیی تازە كاتێك هەڵایسا/ دەستی پێكرد كە پۆلیس بۆ بڵاوەپێكردنی خەڵك هاتە مەیدانێ.

٣٤١٢ 7233- دەست پێكردن، راگەیاندن: رێو رەسمی زۆر شادی خەڵكی شاری رێلز ئەوەیە كە سەرەتای ساڵی نوێ بە ئۆركێستریكی موسیقای شتراوس دەست پێدەكەن.

٣٤١٣ 2035- دەست پێكردن: ترووسكە دەیدی ئەو كابرایەی لە بەرامبەری دانیشتووە بۆ دەست پێكردن بە قسان دەگەڵ ئەو ئاوری تێبەربووە.

٣٤١٤ 556- دەست پێكردن، سەرهەڵدان، وەرێكەوتن: لەسەر ئەوە كە بۆ پێشوازی كردن لە میوانەكانی مەی دەبێ چ كەسێك ئەفەری یەكەم بێ ملۆمەقۆ دەستی پێكردوە.

٣٤١٥ 2040- دەست پێكردن: كاتێك سەرۆك كۆماریێ خۆی دەست پێكردەوە، هەموو كەس چاوەڕوانی ئەوە بوون كە ئەمجارە لە جاری پێشوو ژیرانەتر رەفتار بكا.

٣٤١٦ 291- دەست پێكردن: ویراستاری (پێداچوونەوەی) نوسخە دەستییەكە دەستی پێكراوە/ بەدەستیانەوەیە.

٣٤١٧ 3003- دەست پێكردن (ی هێرشی گەورە لە شەڕدا): بۆ ئەوەی پێش دەست پێكردنی هێرشی گەورە بە ئورووپا چاوم بە بیل بكەوێ، بێئەوەی شەرمێك بگرێ بیستو چوار سەعاتی دیكەم مەرەخەسی لە ئیدارە وەرگرت.

٣٤١٨ 3483- دەست پێكردن (لە زاراوەی لەشكرییدا): هێرشەكە، بێ بۆمبارانی پێشەكی دەستی پێكرد. *ژێنراڵ دەستووری دەست پێكردنی هێرشێكی زووی دابوو.

٣٤١٩ 1235- دەست پێكردن، داهان (باران): راست ئەو كاتەی كە یەكجار كەیف خۆش بووین، باران دەستی پێكردو هەموو شتێكی تێك دا.

٣٤٢٠ 1233- دەست پێكردن: گەرووم ویشكەو كەمێكیش گەرم دایسێ؛ پێم وایە هەڵامەتەكەم دەیەوێ دەست پێبكا.

٣٤٢١ 1996- دەست پێكردن: نازانم چ شتێك هانی دا بەرنامەیەكی ئەوتۆ دەست پێ بكا؟ بێچارە دەبێ.

٣٤٢٢ 330- دەست پێكردن، وەرێكەوتن: ئەسپەكان لەسەر خەتی دەست پێكردنی پێشبڕكێ راوەستاون، ئاها ئەوە ئامادە بوونو، ئەوە دەستی پێكرد!.

٣٤٢٣ 5768- دەست پێكردن، بووبە مۆد: ئەو مەعجەرانەی كە مابوونەوە وایان لێدیار بوو كە دەستیان بە رزین كردووە. * شێوە كڵاوێكی دیكە بۆتە مۆد.

٣٤٢٤ 5773- (بێ سەروبەرییەی، فەسادە) دەست پێكردن، گەندەڵی شتێك دەرهاتن، وەزع شێوان: لەو كاتەوە هەمەفری بۆتە مودیری قوتابخانە، گەندی دەرهاتووە/ وەزعەكە شێواوە.

٣٤٢٥ 4179- دەست پێكردن: لە دیوەكەی خۆی چاوەڕوانی بوو. واباشترە هەر ئێستا بچێو دەست پێبكا.

٣٤٢٦ 782- دەست پێ كردن (لێبڕاوانە)، دەست بەكار بوون بۆ... (بە شێوەیەكی جیددی)، هەڵكوتانە سەر كارێك: ناتوانێ ئەو مەئموورییەتە سەرسەری بگرێ. ئەوە ئەركێكە كە دەبێ لێبڕاوانە بۆی دەست بەكار بێ./ لێی وەخۆ كەوێ.

٣٤٢٧ 3803- دەست پێكردن: كردنەوە، ئالفرێد، سەرنووسەر، بە پێداچوونەوەیەكی گشتی بە سەر ئامانجەكاندا بەرنامەكەی دەست پێكرد. * تیپی موسیقای شارەداری بە لێدانی سروودی نەتەوایەتی بەرنامەكەی كردەوە (دەست پێ كرد).

٣٤٢٨ 3802- دەست پێكردن (بەرنامە)، پێشەكی: لەسەرەتادا پێشەكییەكی دووروودرێژیان بە پیانۆ لێدا و ئینجا سازە سیمدارو بایییەكان دەستیان پێكرد.

٣٤٢٩ 4725- دەست پێكردن بە: ئەگەر رێگام بدەن، پێم خۆشە قسەكانم بە كورتە پەسنێك (ستایشێك) لە مامۆستای كورسیمان دەست پێ بكەم.

٣٤٣٠ 1922- دەست پێكردن (لە كایەی گۆڵف دا).

٣٤٣١ 2176- دەست پێكردن بە: سەرلە نوێ دەستی كردەوە بە فكر كردنەوە لەوە كە ئەمجارە دەبێ درۆزمنی كێ بێ.

٣٤٣٢ 6280- (قسەكانی خۆ) دەست پێكردن: بە ئاماژە كردن بۆ ئەو مەترسییانەی كە لە شاخەوانیدا هەیە، قسەكانی خۆی دەست پێ كرد.

٣٤٣٣ 6281- دەست پێكردن: قوتابییەكانی ئەو پۆلە زۆر بە هۆشن: لە ساڵی دووهەم را دەتوانم دەرسی ئاڵمانیان دەگەڵ دەست پێبكەم.

٣٤٣٤ -

٣٤٣٥ 5746- دەست پێكردن، دەست بە كاربوون بۆ: جا ئەوجار دەستمان كرد بە كاری دەسندووق نانی حەیوانەكان بۆ راگوێزتنیان.

٣٤٣٦ 1094- دەست پێكردن (بە قسەپ)، دەرگیر بوون: دوای تۆپبارانێكی درێژخایەن، هێزی پیادەمان دەستی دایە

پێشڕەوی شەڕی دەستەویەخە دەگەڵ دوژمن دەستی پێکرد.

٣٤٣٧ 1297- دەست پێکردن (بەشەڕهاتن پێشبڕکێ): بە کردەوە ململانەکەمان دەست پێ نەکرد، بەڵام باقی ڕۆژەکە لە پەنجەرەکەمانەوە لە دەرێ ڕامابووین/ چاومان لە دەرێ دەکرد.

٣٤٣٨ 3751- دەست پێکردن (بە گێڕانەوەی، بە دوورو درێژی قسە کردن دەربارەی): ئاغای نیکسۆن دەستی کرد بە گێڕانەوەی داستانێکی دووروودرێژی دیکەی.

٣٤٣٩ 7116- دەست پێکردن (بە نان خواردن)، هەڵکووتانە سەر خواردەمەنی، هێرش کردنە سەر خواردەمەنی: نانمان دانا لەسەر میزەکە؛ دەستی پێبکەن.

٣٤٤٠ 6454- دەست پێکردن و لێدان: ئۆرکێستری ڕووسەکان دەستی بە لێدانی ئاهەنگی والس کرد.

دەست پێکردن ← بەدەستەوە گرتن، هەڵگرتانەسەر، وەرێکەوتن، هەڵپیسان.

دەست پێکردنەوە ← درێژەدان...بە، گەڕانەوە لای.

٣٤٤١ 5365- دەست پێکردنەوە: پاش ماوەیەکی کورت بە ڕێگای ڕاست دا ڕۆیشتن (شەرافەتمەندانە ژیان بەسەر بردن) سەرلەنوێ دەست دەکاتەوە بە وردە دزییان.

٣٤٤٢ 3470- دەست پێکردنی شەڕ، بەگژ (یەک) داچوون: کەمێک پێش سەعاتی ١٠ی بەیانی شەڕ دەگەڵ پێشەنگەکانی دوو لەشکری دوژمن دەستی پێکرد.

٣٤٤٣ 2864- دەست پێکردنی کارێک پێش کاتی لەباری خۆی: بانگەشە سەبارەت بە مۆدێلی تازەی ئەو ماشێنە پێش لە وەختی لەباری خۆی و دوای ئەوە کە هێندێک زانیاری دەربارەی لایەنە باشەکانی بڵاوببووە دەستی پێکرد.

٣٤٤٤ 803- دەست پێکردنی کایە (لە هەنگیدا) بە لێدانی دوو تۆپەکان: دوای فێڵ کردنەکە، یاری دەستی پێکردەوە.

٣٤٤٥ 2295- دەست پێگەرم کردنەوە، لاس دەگەڵ لێدان: زۆر بە جیددی مەگرە؛ دەستت پێگەرم دەکاتەوە.

٣٤٤٦ 7043- دەست پێگەرم کردنەوە، خەڵەتاندن. کایە پێکردن: لەکن خەڵکی وادەنوێنێ کە ئەو کچەی خۆش دەوێ — ڕاست بەو مەبەستە کە نیشان بدا بە تەواوی دڵڕەق نییە— بەڵام لە ڕاستیدا دەستی پێگەرم دەکاتەوە.

٣٤٤٧ 4654- دەست پێگەرم کردنەوە، گاڵتە پێکردن: لەو جۆرە ژنانە نییە کە بێڵێ دەستی پێگەرم بکەنەوە (= گاڵتەی پێبکەی).

٣٤٤٨ 1615- دەست پێگەرم کردنەوە، کایە پێکردن: بۆ ماوەیەک دەستی بە کچەکە گەرم دەکردەوە (= دەگەڵی ڕادەبوارد) و کاتێک کچە خوازیاری پێوەندییەکی پتەوتر بوو، پشتی تێکردو بەجێی هێشت.

دەست پێ لەکار کێشانەوە ← مان پێگرتن.

دەست پێهەڵگرتن ← گێڕانەوە، دەست هەڵگرتن لە.

٣٤٤٩ 1980- دەست پێوەگرتن: ژێلوان عادەتی وابوو کە دراوێکی زۆر بدا بە خواردەمەنی، بەڵام بۆ کڕینی شەراب دەستی بە پووڵییەوە دەگرت- دەتکوت دەرزییەوە دەچوو، لە دەروازەی نەدەهاتەژوورا.-

دەست تەنگ بوون ← ڕووتو ڕەجاڵ بوون.

دەست تیژکردن ← چوونە ژوور.

دەست تێکەڵ کردن دەگەڵ ← کەمێنو بەمێن پەیدا کردن دەگەڵ.

٣٤٥٠ 31- دەست تێوەردان، کۆلێن، لێکۆڵینەوە تێدا بۆ شتێک لەبار کردن بۆ، وێکڕا پێک کردن بۆ: ناچار دەبێ بە گوێرەی پێویستییەکانی ژیانی ئەو بەسالاچووانەی کە دەیانەوێ تێیدا بژین، ناچار دەبێ دەستێک لەو ماڵە وەربێنن/ کەمێک ئاڵوگۆڕی تێدا پێک بێنن.

٣٤٥١ 3420- دەست تێوەردان، خۆ تێوەردان: کێنێدی کە دەیهەویست دەست لە کاروباری کوبا وەردا، لە کەنداوی بەرازان زەربەیەکی سەختی وێکەوت. ● هەر کەس خۆ لەو کێشەو هەڵایە وەردا، سەرەنجام بۆی دەردەکەوێ ناتوانێ زۆر قووڵ تێوە نەچێ.

٣٤٥٢ 4258- دەست تێوەردان، کلک تێوەردان: لە دەست تێوەردانی لە کێشەی نێو بنەماڵەکان زۆری لێتووڕەم.

٣٤٥٣ 7080- دەست تێوەردان، دەست درێژی کردنەسەر: ئاغای ئالفرێد گرتی هیچ پێی خۆش نییە دەست دەکاری من وەردا، بەڵام گرتیشی ڕاهەست دەکا کە دەبێ ئاماژە بۆ یەک دوو شتان بکا کە لە ڕاپۆرتەکەی من دا لە قەڵەم کەوتبوون.

٣٤٥٤ 7006- دەست تێوەردان: ئەگەر دەتوانی چاوێک لەم ماشێنە بکە. بەڵام دەستی تێوەمەدە. ئەگەر بەڕاستی عەیبێکی هەبێ دەیبەمە گاراژ.

دەست تێوەردان ← تەداخول کردن، دەست لێدان، سەرگەردان کردن، دەسکاری کردن، کەم و زیاد کردن.

دەست وەردان لە کاروباری یاسادا ← وەک کاربەدەستانی یاسا هەڵس و کەوت کردن.

٣٤٥٥ 7270- **دەست راگرتن، سەبر کردن، پەلە نەکردن، چاوەروان بوون:** 'دەزانم دوایە چ بوو: جان لەسەر تەختەکەی بەربووە'، 'پەلە مەکە، دەکری؟ کێ دەبێ جوزکەکە بگێرێتەوە، ئەمن یا ئەنتۆ؟'
٣٤٥٦ 3116- **دەست راگرتن، راوەستان:** خانی راس گرتی کەمێك دەست رادەگری. ● 'باب، شەمچەت/ شقارتەت پێیە؟'، باب وەلامی داوە: 'دەقیقەیەك راوەستە'
← وەپاش خستن یان کەوتن، وەدرەنگی کەوتن یان خستن.
٣٤٥٧ 513- **(بەبێ‌راوەستان) دەسرێژ لێکردن، دایانبەر باران...:** پۆلیسەکان بە دیتنی تاوانبار بێ سێ‌و دوو دەسرێژیان لێکرد/ دایانبەر دەسرێژ.
٣٤٥٨ 4540- **دەسرێژ لێکردن، دایانبەر رێژنەی گوللان:** ئەفسەرەکانیان یەك یەك دایە بەر دەسرێژ بەو مەبەستە کە هێرشەکە تێك دەن.
← تەوئەندازی لێکردن.
دەست شۆرشتن لە کەسێك ← ناهومێد بوون لە زیندوو مانی کەسێك.
٣٤٥٩ 6793- **دەست دانە چەك لە دژی، شەر دەگەل کردن:** ئەگەر بیتەوو هەر کام لە ژنەو لە کچەکەی بکوژێتن، خەلکەکەی‌و شا چارلز لە دژی دەست دەدەنە چەك/ شەری دەگەل دەکەن.
٣٤٦٠ 6205- **دەست دانە دەستی یەکتر لە دژی کەسێك:** چیا هەمیشە ئیدیعای دەکرد کە هەر لە سەرەتاوە هەموو شتێك لە دژی ئەو هاتۆتە کایەوە، بەلام ئاخر ئەو لەوجۆرە کەسانەیە کە هەموو شتێك دەخاتە ئەستۆی هەلکەوتو تەسادف.
← پیلانگێران لە دژی، هاوکاری کردن، پشتی یەکتر گرتن.
٣٤٦١ 5335- **دەست دانە کارێك، پەنا بردن بۆ، دەست بردن بۆ:** تیرۆریستەکان وەك رێگایەك بۆ گەیشتن بە مەبەستە سیاسی‌یەکانیان دەستیان دایە بۆمباران کردنی شار.
٣٤٦٢ 6628- **دەست دانە کارێکی دژوارو خەتەرناك، دەگژ کارێکی سەخت راچوون:** بڕوام پێی نەبوو بتوانێ بڕیاردەر بێ. بەلام دەگژ کارێکی دژوارو خەتەرناك راچووەو، کەسیش ناتوانێ پێشی پێبگرێ.
٣٤٦٣ 2006- **دەست درێژی کردن، دەست بەسەر داگرتن، وەختی کەسێك گرتن، فوشتنەوە:** ئەگەر ناوی دەریا چیدی ئەم لێوارە بشواتەوە، خانووەکانی سەری دەکەونە مەترسی‌یەکی جیدی‌یەوە. ● بۆ ئەوەی وەختی زۆر بەنرختانم گرت داوای لێبووردن دەکەم.
٣٤٦٤ 6162- **(بە نیشانەی سەرسووڕمان یان داماوی) دەست دڕێژ کردن:** بەشێرمیەکی دراماتیکی دەستەکانی هێنا پێشێ‌و گوتی: 'لەم بارەوە چم لەدەست دێ؟'.
٣٤٦٥ 5170- **دەست درێژ کردن (بۆ هەلگرتنی شتێك):** داوود دەستی درێژ کردو کتێبێکی بەرگ چەرمی چکۆلەی هێناخوارێ.
← دەست هێنانە پێش.
٣٤٦٦ 5169- **دەست درێژ کردن بۆ، دەست بردن بۆ:** یەك دوو جار هوشیار کردنەوەی بە درۆ پیادەکانی رادار کرد دەست بۆ تفەنگەکانیان درێژ کەن/ دەست بۆ تفەنگەکانیان بەرن.
٣٤٦٧ 4115- **دەست درێژ کردن بۆ لای:** دەکری دەستت درێژ کەی‌و کتێبەکەم دەیەی؟ لەسەر تاقەکەی پشت سەرتە؟
٣٤٦٨ 3410- **دەست درێژکردنە سەر ژنێك بە زۆری:** بۆ روون کردنەوەی ئەو مەسەلە کە کچە کوژراوەکە بەشێرمیەکی درندانە دەست درێژیی کراوەتەسەر لەباری پزیشکی‌یەوە ئازمایشیان کرد.
دەست درێژیی کردنەسەر ← دەست تێوەردان.
٣٤٦٩ 7033- **دەستکاری کردن (و جوانتر کردن):** پەیکەرەکەی دەستی راستی رەسمەکە وادیارە کە دواتر کەمێك دەستکاری‌و جوانتر کرابێ.
٣٤٧٠ 6825- **دەستکاری کردن، دەست لێدان:** مەیەلە ئەو کابرایە کارەباکە دەستکاری بکا.
٣٤٧١ 4259- **دەستکاری کردن، دەست لێدان، دەست تێوەردان:** رەسمەکانم رێك‌و پێك کردبوون، بەلام یەکێك دەستی لێداون/ دەستی تێوەرداون/ دەستکاری کردوون.
دەستکرد ← بۆ ساز کردن.
٣٤٧٢ 2606- **دەست کردن بە، داهاتن (بە مێشك دا):** لە حالێك دا لەنێو جێگاکەم راکشابووم‌و خەوم لێنەدەکەوت، لەپڕ بە مێشکم داهات (دەستم کرد بە بیرکردنەوە) کە زۆرباش دەبێ بڕۆم بۆ دەرەوەی ولاتو لە جێگایەکی دیکە ژیانێکی نوێ دەست پێبکەم.
← دەست پێکردن.
٣٤٧٣ 3052- **دەست کوتان لە شتێك، بە دەستەکوتە لە شتێك گەڕان:** لە تاریکایی شەودا بە دەستەکوتە لە لایتەکەم دەگەڕام کە دەمزانی لە جێگایەکی ژوورەکەم داناوە.
دەستکورت بوون ← فەقیر بوون، بێبەشبوون.

**٢٤٧٤** 3625- **(زاراوەی لاتی/ قــــەڵـاوەیی) دەســـتکەوت، داهـــات:** سەردەستەی لاتەکان بە کابرای تـازەواریدی گـوت: 'هـەر شرغلەی دەسـتکەوتی خۆی هەی. ئێمەش لەمەودای نێوان فرۆکەو گومرگ دا لە جانتاکانی موسـافیران هێندێك وردە شت پاشلول دەدەمین‌و، ئەگەر ئەتۆش بتەوێ دەگەڵ کەوی، دەبێ پێنج پوندان بدەی'.

**٢٤٧٥** 2672- **دەست کێشـانەوە، خۆکێشـانەوە، بێدەنـگ بـوون، قرتێنەپ کردن:** دووانەکان پێکەوە گوتیان: "هێلکەی کـوڵاو دەخۆین". دایکیان گوتی: بێدەنگ بن مەگەر نابینن... .

**٢٤٧٦** 7487- **دەست کێشانەوە لە، دەست هەڵگرتن لە، کـۆ کردنـەوە:** ' باشە، پێم وایە راست کاتی ئەوە هاتووە ئەمڕۆش دەست لەکار بکێشینەوە.

دەست کێشانەوە لە ← وەلانـان، دانـان، پاشەکشـەکردن، بێبەشکردن، دەسـت هەڵگرتن لە، بەجێ‌هێشـتن، بێدەنـگ بوون.

دەستگیر بوون ← وەگیر کەوتن.

دەستگیر نەبوون ← وەگیر نەکەوتن.

**٢٤٧٧** 6712- **دەست لە پێکەنین هەڵگرتن یان تەواو کـردن:** دەسـت لەو حیلکە حیلکە هەڵگرە، دەنا پێت تەواو دەکەم!.

**٢٤٧٨** 7423- **دەست لـە پێکـەنین یـان زار پانکردنـەوە هـەڵگرتن:** ئەگەر بێتوو دەست لەو زار پانکردنەوانـە هـەڵگری زۆرت سوپاس دەکەم.

**٢٤٧٩** 1433- **دەست لـە ئـاینێك هـەڵگرتن و چوونەسـەر ئـاینێکی دیکە، دەست هەڵگرتن لە شـتێك و شـتێکی دیکـە کـردن:** دەسـتی لـە ئـاینی مەسـیحییەت هـەڵگرت بـۆ ئـەوەی مێرد بـە کابرایەکی موسوڵمان بکا. ● لە فکری ئـەوەداین دەسـت لە سووتەمەنی "جـامد" هـەڵگرین‌و بیکـەین بـە گـازی سروشتی.

دەست لە رەش‌و سپی نەدان← بێکار بوون.

دەسـت لەسـەر دەسـت دانان‌و هیچ نەکردن ← بێ‌لایەن، یـان بێ‌خەیاڵ دانیشتن.

**٢٤٨٠** 3672- **دەست لەکار کێشانەوە:** ' دوای تەواو بوونی کار، لەبەر دەرگـای کارخانـە چـاوەروانت دەبم.'، ' زۆر باشـە، ئێوە کەنگێ دەسـت لەکار دەکێشـنەوە؟.

**٢٤٨١** 361- **دەست لە کار کێشانەوە، مـانگرتن:** پـاش ئـەوە کـە دوێنێ شەوێ کرێکاران هەڕەشەیان کرد زیاتر لـە وەختـی قانوونی کارناکەن، ئێسـتا مانیان گرتووە.

←هاتنەدەر، مانگرتن، راوەستان خۆ(لەکارێك) کێشانەوە.

**٢٤٨٢** 4484- **دەسـت لێـدان، دەســت تێـوەردان:** نامـــەوێ تەماتەیەکی بکڕم کە لە پێشدا کڕیـارێ دیکـە دەسـتیان تێوەردابوە.

**٢٤٨٣** 3409- **دەست لێدان، دەست تێوەردان، چوونە ژێر شتێك بـە بێ لێهـاتوویی خاوەنەکـەی:** کـێ چۆنـە ژێر شـەرابەکەم؟ کەسـێك ویستوویە بە سیفۆنی بی‌کێشێ، بەڵام هەمووی بە ولاتـی دارشتووە.

**٢٤٨٤** 7334- **دەست لێراتلەکاندن و دەرکـردن:** جـان دەیەویسـت لـە نزیکـەوەو بـە وردی چـاو لـە ماشـێنە رولزرۆیسـیە زێوینەکە بکا، بەڵام، رانەندەیەکی ئونیفۆرم لەبەر دەستی ...کی راتلەکاندو دەری کرد.

**٢٤٨٥** 6573- **دەسـت لــــێراست کردنــەوە یــان بــەرز کردنــەوە:** نەمدەویسـت شەڕێ ساز کەم. قسەیەکی لەسەرە خـۆم بـە کابرایەکی پشت بارەکە گوتو ئەویش دەسـتی لـێ‌ڕاست کردەوە.

**٢٤٨٦** 2698- **دەسـت لــێ‌شوشتن، هیوا بڕیــوون لـە هـەموو کـەس:** دوکتورەکـان، نێرسـەکان‌و، ئـەندامانی بنەماڵەکـەی، دەستیان لـێ‌شوشتبوو.

← خەت بەسەر داکێشان.

**٢٤٨٧** 3787-**دەسـت لێـدان، ئازار گەیانـدن، لـێدان:** ئێمـە دیسـیپلینێکی سـەختمان هەیە، بـەڵام هیـچ کـام لـە کارمەندەکانمان هەرگیز دەسـت لـە منداڵـەکان نـادەن. ● کەس دەسـتی لێنەداوم.

**٢٤٨٨** 3549- **دەسـت لێـدان:** کـاتێك کـامران دەیەویسـت دەسـتی بە پرچی کچێك داهێنـێ، کچـە قیژانـدی‌و گوتـی "ئەو دەستە پیسانەت لە من مەدە"

← لە جێگـای (بـەرزی) خۆهێشـتنەوە، بـەجێ هێشـتن، نەبزاوتن.

دەسـت لـێ‌هەڵگرتن ← بەجێ‌هێشـتن، پشـت تـێ‌کردن، وەدوونەکەوتن،.

**٢٤٨٩** 1082- **دەسـت لــێ‌هەڵنەگرتن، بەردەوام، پەیوە نووسـان:** ئاوارەکان ئەو هیوایـەیان بەرنـەدا کـە سـەرەنجام رۆژێـك دەگەڕێنەوە بۆ ولاتی خۆیان هەرچەند ...

← راگرتن (ونەفرۆشتن)، نەگۆڕین،(شێلگیرانە) درێـژەدان، بە... وەنووسان.

**٢٤٩٠** 12- **دەست نیشـان کـردن، هێنانـەوە:** نـەیتوانی بـۆ کەمبوونی لەنگەری (موازنە) حسێبی بـانکیی شـیرکەت هۆیەکی باش دەسـت نیشان بکا.

← جیاکردنەوە، (ناوی کەسێک) یادداشت کردن.

٧٤٩١ 6994- **دەستو باڵ بەستن:** زۆرم پێخۆشە کارێک لە دەرەوەی وڵات پەیداکەم، بەڵام لێرە شتهایەکی یەکجار زۆر هەن کە دەستو باڵیان بەستووم.

٧٤٩٢ 866- **دەستو باڵ بەستن، بەستنەوە:** ئەو حەیوانە زۆر خەتەرناکە؛ دەبێ بیبەستنەوە.

٧٤٩٣ 2216- **دەستو باڵی کەسێک بەستن:** هەستی دەکرد کە ژیانی بنەماڵەیی، بەرنامەی کاری رۆژانەی لە ٩ی بەیانییەوە هەتا ٥ی ئێوارێو، پێویستییە کۆمەڵایەتییەکانی شارنشینی بە تەواوی دەستو باڵیان بەستووە.

٧٤٩٤ 3239- **دەستو باڵی کەسێک بەستن (= مەحدوود کردنەوە) پێش لە کەسێک گرتن:** دابو نەریتان دەستو باڵیان بەستبوو هیچ دەسەڵاتێکیان بۆ نەهێشتبوو. ● هەستی بەوە دەکرد کە مەسەلەی ماڵێ دەستو باڵیان بەستووە.
← باری کەسێک قورس کردن.

٧٤٩٥ 1422- **دەستو پەنجە نەرم کردن لەگەڵ، وەلەستۆ گرتن:** بە ئەندازەی خۆم گرفتاریم هەیە کە دەستو پەنجەی دەگەڵ نەرم کەم، بێ ئەوەی خۆم دەگەڵ ئەوانی تۆ پێوە کەم.
دەستو پێ لێ تێکەڵ بوون ← خەجاڵەت بوونەوە.
دەستوور پێدان ← فەرمان دان لەسەر.

٧٤٩٦ 878- **دەستووری هێنانەوەی قسە تێهەڵدان:** ئەرتەش دەستووریدا هەر تەقەمەنییەکی پێویست نییە بیهێننەوە.
دەستبەر کردن ← لە دەسترەس دابوون.

٧٤٩٧ 2344- **دەستە دەستە کردن:** منداڵەکانیان دەستە دەستە کردبوو کە بە ماڵاندا دەگەرانو پارەو جلو بەرگی کۆنەیان کۆ دەکردەوە.

٧٤٩٨ 2387- **دەستەساز کردن لە دژی:** دیتنی ژمارەیەکی زۆر لە لاوەکان کە لە دژی کەسانی کارلێهاتووتر - هەرچەند پیرتر- لە خۆیان، دەستەساز دەکەن، شتێک نیە پیاو پێی خۆش بێ.

٧٤٩٩ 1974- **دەستەمۆ کردن، رام بوون، رام کردن، هێنانە ژێر چۆک:** بە هۆی پلەوپایەی گرنگی پۆڵ، ژنەکەی هەموو کەسی، تەنانەت پۆلیسەکانی شاری، هێناوەتە ژێر چۆکی خۆی.

٧٥٠٠ 93- **دەستە ودامێنی کەسێک بوون، پاڕانەوە لەبەر:** کابرای مەحکووم لە دادگا دەپاڕاوە بیبەخشن.

٧٥٠١ 4168- **دەستەوەستان مانەوە:** لایەنێکی شەخسیەتی ئەو ژنە وای لێکرد کە لە رۆژێکی رەشدا دەستەوەستان بمێنێتەوەو هیچی پێ نەکرێ.

٧٥٠٢ 7498- **دەستەوەیەخە بوون لەگەڵ، لە دەروونی خۆیدا خەریکی شەڕ بوون لەگەڵ:** ئەو هێشتاش لە دەروونی خۆیدا لە پێوەندی دەگەڵ بیروبڕوای ئایینی شەرعیتی (نازانێ پێی راست بێ یان نا).

٧٥٠٣ 3031- **دەستەوەیەخە بوون لەگەڵ، لەگژ یەکێک راچوون:** پۆلیس رایگەیاندبوو دەگژ کابرای هەڵاتوو راچوون کارێکی خەتەرناکە چونکە کابرا چەکدارو بێرەحمە.
← بە کێشە هاتن دەگەڵ.
دەست هەبوون لە کارێکدا ← خۆ دە کارێک وەردان.

٧٥٠٤ 4808- **دەست هەڵگرتن (لە تەنبەڵی و تەوەزەلی):** ناچارە هەتا کۆتایی ئەم مانگە کاری نووسینو تایپ کردنی لێکۆڵینەوەکەی تەواو کا. بۆیە دەبێ لە تەنبەڵیو تەوەزەلی دەست هەڵگرێ.

٧٥٠٥ 4395- **دەست هەڵگرتن (بە یەکجاری):** ئەگەر نازانی بۆ کوێ دەچی، دەبێ بە یەکجاری دەست هەڵگری.

٧٥٠٦ 7200- **دەست هەڵگرتن، تەواو کردن:** تەواوی کە/ دەست هەڵگرە، ئەو کچە بەستەزمانەت ناڕەحەت کردووە.

٧٥٠٧ 166- **دەست هەڵگرتن (لە داخوازی، زەبرو زەنگێک)، کشانەوە، واز هێنان لە:** دوای ئەوە کە دەگەڵ بەڵگەکانی ئێمە بەرەوروو بوو، ئەندامانی لایەنەکەی دیکە پاشەکشەیان کرد/ دەستیان هەڵگرت. تەنانەت ئەو کەسانەش کە دەلیلی باشیان پێ بوو بۆ رەخنە گرتن، پاشەکشەیان کرد/ کشانەوە/ دەستیان هەڵگرت/ وازیان هێنا.

٧٥٠٨ 6310- **دەست هەڵگرتن (لە خواردنەوە یان کێشانی سیگار):** خێزانی هادی زۆر بە کەیفتر دەبوو ئەگەر مێردەکەی بیتوانیبا دەست لە بۆتری (تارەق خواردنەوە) هەڵگرێ.
دەست هەڵگرتن ← خۆ کێشانەوە، بەجێ هێشتن، وەلانان، خۆپاراستن، فڕێدان، تەواو کردن، بێدەنگ بوون، بڕینەوە، تەرخ کردن، رۆیشتن، بەس کردن، دەست کێشانەوە، تەسلیم بوون.

٧٥٠٩ 4387- **دەست هەڵگرتن لە، دەست لێکێشانەوە:** سیگار کێشان بۆت باش نییە، وەختی ئەوە هاتووە دەستی لێ هەڵگری.

٧٥١٠ 1940- **دەست هەڵگرتن لە، دەست کێشانەوە لە:** دەستی لە سیاسەت هەڵگرتووە.

٣٥١١ 7139- **دەست هەڵگرتن لە، وەلانان**: لێرەدا لە مرتالا دەست هەڵدەگرینو دەچین کە بەری لێبکەینەوە.

٣٥١٢ 882- **دەست هەڵگرتن لە، دەست کێشانەوە لە**: پێداگرتن لە سەر چوونە سەیران، ئەویش لە هەوایەکی ئەوتۆدا هیچ بە باشی نازانم. با دەستی لێ هەڵگرین.

٣٥١٣ 3774- **دەست هەڵگرتن لە، بەربوون، دەست کێشانەوە لە**: سەختی مەگرەو، ئەویش دەستت لێ هەڵدەگرێ. ● کراواتەکەم بەردە، ماچێکم دەیە.

٣٥١٤ 2704- **دەست هەڵگرتن لە (کارێکی ناڕەوا)**: دوای زۆر ساڵان هەوڵدان بۆ ئەوەی بڕیسی خۆی لەسەر چەند دوڵە زەوییە دابین بکا کە بە میرات پێی گەیشتبوو، سەرەنجام دەستی هەڵگرتو....

٣٥١٥ 3756- **دەست هەڵگرتن لە، خۆکێشانەوە لە، وەلانان**: ئێستا کە کوڕەکانی گەورە بوون دەتوانێ خۆ لە هێندێک لە بەرپرسایەتییەکان بکێشێتەوە.

٣٥١٦ 3826- **دەست هەڵگرتن لە، دەست لێبەردان، پشت تێکردن، بەجێ هێشتن (ووەستاو یەکی دیکە کەوتن)**: دەستی لە بازرگانی هەڵگرت بۆ ئەوەی کارێکی کۆمەڵایەتیی دیکە بدۆزێتەوە. ● لە تەمەنی ٤٥ ساڵیدا بە جێیان هێشت بۆ ئەوەی کابرا ڕەدوای یارێکی لاوتر بکەوێ.

٣٥١٧ 6846- **دەست هەڵگرتن لە، بەجێهێشتن، دەست پێنەگرتن**: دیتم کە بەرنامەکە بە ڕاستی یەکجار سەرنج ڕاکێشە - تەنانەت بۆ نووسینی نامەیەکی بە پەلەش نەمدەتوانی بەجێی بێڵم.

٣٥١٨ 6940- **دەست هەڵگرتن لە**: دوای ئەوە کە چەند جار زۆر خراپی بۆ هات، چیا کە دیتی زۆری دۆڕاندوە بڕیاری دا دەست لە قومارکردن هەڵگرێ.

٣٥١٩ 2167- **دەست هەڵگرتن لە خۆشەویستی یان پشتیوانی کردن لە کەسێک**: سارا بێوەفا نیە. ئەو لە تەمەنێک دایە کە لەودا کچان زۆر زوو ئاشق دەبنو زووش دەست لە یارەکەیان هەڵدەگرن.

٣٥٢٠ 1939- **دەست هەڵگرتن لە خوێندن**: دەست لە خوێندن هەڵگرتن لە گەڕەکە هەژارنشینەکانی شاران زۆرترە.

٣٥٢١ 2935- **دەست هەڵگرتن لە کارێکو دەست پێکردن، یان دەست دانە ...**: سارا دەستی لە پیانۆ لێدان هەڵگرتوو فلووتی هەڵگرتووە.

دەست هەڵگرن ← بەسە، بێدەنگ بە.

٣٥٢٢ 5081- **دەست هەڵێنان، بەرز کردنەوە (بە نیشانەی تەسلیم بوون)**: چەکەکانتان فڕێ دەنو دەستتان هەڵێنن.

٣٥٢٣ 1424- **دەست هەڵنەگرتن لە، درێژەدان بە**: مامۆستا بە قوتابییەکانی گوت کاتێک دەچیتە دەرێ، دەبێ ئەوان کاری خۆیان درێژە بدەن.

٣٥٢٤ 434- **دەست هەڵێنان (بە مەبەستی سەرنج ڕاکێشان)**: کامران، دەستت بۆ هەڵێناوە؟ گوتبووم کە هیچ کەس نابێ لە کلاس بچێتە دەر.

٣٥٢٥ 6381- **دەست هەڵێنان**: 'هەمووتان، دەستتان هەڵێننو بگەڕێنەوە بەر ئەو دیوارە'.

٣٥٢٦ 5080- **دەست هەڵێنان، بەرز کردنەوە**: ئەگەر پێتان وایە جوابەکەی دەزانن، دەستتان هەڵێنن/ بەرز کەنەوە.

٣٥٢٧ 6436- **دەست هێنانە پێش، دەست درێژکردن**: منداڵەکە بۆ گرتنی ئەسباب بازییەک دەستەکانی درێژکرد.

٣٥٢٨ 3169- **دەست یان نەخش هەبوون لە ... دا**: سێرۆژی دەڵێ دەوڵەتەکەی هیچ نەخشێکی لەو بڕیارەدا نەبووە.

٣٥٢٩ 3472- **دەستی برایەتی/ یەکبوون/ هاوکاری دانەدەستی یەکتر**: سەربازانی پێشتازی ئەرتەشی بریتانیا دەستی برایەتییان دادەستی باڵی ڕاستی ئەرتەشی پێنجەمی ئەمریکا.

دەستێک پێداهێنان ← هەڵوێژاردنو خاوێن کردنەوە.

٣٥٣٠ 5831- **دەستی کەسێک گوشین (بە نیشانەی ڕێز لێگرتن یان سوپاس کردن)**: زۆرم پێخۆشە دەستی تۆو هەموو پیاوەکانت بگوشمو لە بەرامبەر ئەو گشتە زەحمەتەی بۆتان کێشاوە لە نزیکەوەو لە یەک یەکتان سوپاس بکەم.

٣٥٣١ 6716- **دەستی کەسێک ماچ کردن، نۆکەریی کەسێک کردن (هەروەها زۆرەوە زیاتر بە واتای ''مجازی'' یەکەمیان)**: هەرکەس بتوانێ چەندین ساعەت/ بۆ ماوەیەکی دوورودرێژو هەموو ڕۆژێ لە ژێرزەوییدا کار بکا دەستی ماچ دەکەم.

٣٥٣٢ 1538- **دەستی کەم گرتن، بە کەمگرتن**: نۆرپۆزیسیۆن گشت هەوڵو کوششی دەوڵەتی لە پێناو باشتر کردنی ژیانی کرێکاراندا بە کەم دەگرت.

٣٥٣٣ 513- **دەسرێژلێکردن، تۆفەلەتیکردن، تەیلەنداری لێکردن، دانەبەر ڕێژنەی گوللە**: کوڕەکان تووڕەوە تەنەکەکەیان دایە بەر ڕێژنەی گوللەو بە تەواوی کون کونیان کرد.

٣٥٣٤ 5970- **دەسەرشتێک کوتان**: بەستەی ئەسکیناسەکانی دەسەر مێزەکەی کوتاو لە دوکانەکە دەرکەوت.

٣٥٣٥ 5974- **دەسەر شتێک کوتان و شڵپە لێهێنان**: کابرای ماسی فرۆش ماسییە ڕفێدمیەکی زۆر گەورەی هەڵگرت لەسەر مێزەکە شڵپەی لێهێنا.

٢٥٣٦ 1175- دەسەڵات بە دەستەوە گرتن، بە دەسەڵات گەیشتن، هاتنەسەرکار، هاتنە سەر حوکم: کاتێك ئەم دەوڵەتە هاتە سەر کار، وڵات لە وەزعێکی شپرزێی ئابووری دابوو.
دەسەڵات بەسەر دابوون ← فەرمانڕەوایی کردن لەسەر.

٢٥٣٧ 1047- دەسەڵات بەکارهێنان، پێشگری کردن لە: راست کاتی ئەوە هاتووە پێشی بڵاو بوونەوەی فیلمی پڕ لە زەبروزەنگو بێرەحمی بگرن.
← بڕیاردان بە قازانجی یان بە زیانی.

٢٥٣٨ 2120- دەسەڵات لە دەست دان، لەسەر حوکم لاچوون: ئەو دەوڵەتە بە هۆی شێوەی هەڵسو کەوتی دەگەڵ قەیرانی ئابووری لەسەر دەسەڵات وەلاچوو.

٢٥٣٩ 3182- دەسەڵات هەبوون بەسەر ... دا، لە دەست خۆدابوون: یاسای بنەرەتی دەبێ هاوڵاتیان لەوە تەرخەمیان کا کە چارەنووسی خۆیان لە دەستی خۆیان دایە. ● ئەو ژنە دەسەڵاتێکی ئەوتۆی بەسەر منداڵەکانیدا نیە. وادیارە منداڵەکان بۆخۆیان بڕیار دەدەن چۆن بجووڵێنەوە.
دەسەڵاتی خۆپاراستن ← پاراستن (ی دەسەڵات بەسەر کەسانێکدا).
دەسەڵاتی سیاسی بە دەستەوە گرتن ← بە دەسەڵات گەیشتن.

٢٥٤٠ 6547- دەشتێکەوە پێچان: زیلوان، لە حاڵێکدا خۆی لە خاولییەکەوە پێچابوو لە حەمام هاتەدەر.
← داپۆشین (بە).

٢٥٤١ 314- دەمەو یان تەسادوف کردن دەگەڵ، وێککەوتن، لێکدان: وانێتێك دەگەڵ لۆرییەکی بەدەك کێش تەسادوفی کرد.
← ڕێککەوتن.
دەقایل نان ← هەڵگرتن.
دەقاپان کردن ← تێکردن (ی چێشت).

٢٥٤٢ 5000- دەقو دوغری گوتن، کورت و کرمانجی گوتن: دەقو دوغری با پێت بڵێم، کاری ئێمە پێکەوە تەواو بوو، هەموو شتێك هەڵوەشاوە - کەیشتووینە ئاخری خەتێ.

٢٥٤٣ 5511- دەڵوڕچەقین، خۆ لە شاخدان و لێکگیران: لەو ئەوتکێشەی لە نزیك شاخی "حەوت بەردان" (لە نێوان دەریا) تێ‌گیراوە، نەفت دێتە دەر/ هەڵدەڕژێ.

٢٥٤٤ 7066- دەقی وشەیەك بە ئیملای زمانێکی دیکە نووسین: سپۆتنیك ئەورونەیەکە لە وشەی رووسی کە بە ئیملای لاتینی نووسراوە.

دەکاریکەوە چوون ← خۆ دەکارێك وەردان.
دەکاغەزییەوە پێچان ← بەستەبەندی کردن.
دەکاسبییەك هاویشتن ← سەرمایەگوزاری کردن.
دەکەلەکەی کەسێك وەژاندن ← سیخورمە لێدان.

٢٥٤٥ 1330- دەگەڕ ژراچوون: ئەوە موشکیلەیەك بوو کە هەرگیز بە شێوەیەکی جیددی دەگەڕی رانەچوو.
← دەست دانە کارێکی دژوارو خەتەرناك، دەستەویەخە بوون دەگەڵ.

٢٥٤٦ 459- دەگەڵ ... بوون، پشتیوانی کردن لە: ئەگەر بەراستی بڕیار بدەی مرخالەفەتی بکەی (لە بەرامبەری راوەستی)، ئێمەش تاسەر دەگەڵتینا.

٢٥٤٧ 6503- دەگەڵبوون، موافیق بوون: پیاو چۆن دەتوانێ دەگەڵ یاسای ئاوا دژی ئینسانی بێ؟
← بە دواوە بوون، چوونە نێو کارێکەوە.

٢٥٤٨ 6259- دەگەڵ بەرنامەیەك بوون: وا دانـدراوە کە مەسەلەی دابین کردنی ژیان بۆ ئەو خەڵکە دەگەڵ بەرنامەی ئاوەدانکردنەوە نەبێ.

٢٥٤٩ 5676- دەگەڵ چوون، هاتن: بە پیاوێکی بڵێن هەتا سەرجاددەی سەرەکیت دەگەڵ بێ.
← بەرێکردن هەتا....

٢٥٥٠ 1461- دەگەڵ خستن، لەبەر چاو گرتن، حیساب کردن لەسەر، بە حیساب هێنان: ئەگەر خەرجی ئەو سەفەرە لە ٥ پۆندان زیاتر نابێ، ئەمنیش دەگەڵ خەم.
← بە حیسێب هێنان ، گرتنەوە، هێنانە نێرگەرێ.

٢٥٥١ 1839- (بە زۆرە ملی) دەگەڵ خۆ بردن: ژنەکەی بە زۆرە ملی دەگەڵ خۆی دەبا بۆ میوانیان. ژنەکەش لە حاڵێکدا تێدەکۆشێ زۆر نەیەتە بەرچاوان سەرانسەری شەوێ لە گۆشەیەك دادەنیشێ.

٢٥٥٢ 6610- دەگەڵ خۆ بردن یان خستن: دەستی کردووە بەوە کە کاری بازرگانی فێری کورەکەی بکاو، کاتێك دەچێ سەر لە مشتەرییەکی بدا، سواری ماشێنی دەکاو دەگەڵ خۆی دەبیا.

٢٥٥٣ 6736- دەگەڵ خۆ بردنە دەر بردنەدەر بۆ گەڕان: 'ئێمە وابوو پەرستارەکە/ سیستەرەکە ئەمڕۆ ئاگای لە تزیە.'، 'نا، منداڵەکانی بردۆتە گەرانێ.'

٢٥٥٤ 6604- دەگەڵ خۆ بردنە هەندەران: ئەو مەحدوودییەتەی لەسەر بردنە دەری پارە بۆ هەندەران بۆ ئەو کەسانەی دەچن بۆ گەڕان هەبوو کەمتر بۆتەوە.

← (بە زۆرە ملی) دەگەڵ خۆ بردن.

**٢٥٥٥** 672- **دەگەڵ خۆ خستن، هێنانە ئێو گەمەی، ڕۆڵێك بە كەسێك لەسپاردن:** بۆچی جانتان دەگەڵ خۆتان خست؟ بۆ یارمەتیدان بە ئێوە هیچی لە دەست نایە.

**٢٥٥٦** 711- **دەگەڵ خۆ خستن، هەڵوێست بە كەسێك گۆڕین:** ڕێبەری یاخییەكان لە پەر هەڵوێستی گۆڕی و زۆربەی هاورێ ناودارەكانی دەگەڵ خۆی خست.

**٢٥٥٧** 912- **دەگەڵ خۆ گێڕان، پێ بوون:** ئەری بۆ دەتەوێ ئەو بەڵگانە بۆ هەموو جێگایەك دەگەڵ خۆت بگێری؟ بێ هیچ ئەم لاو ئەولایەك ونت دەكردن. • كاتێك لە هوتێل وەدەركەوی، دەبێ پاسپۆرتەكەت پێ بێ.

**٢٥٥٨** 710- **دەگەڵ خۆ هێنان، گەڕانەوە:** ساڵێكە لەو وڵاتە خەریكی دەرس گوتنەوەیە و دەیەوێ ساڵی داهاتوو بنەماڵەكەی لە ئەمریكاوە دەگەڵ خۆی بێنێ.

**٢٥٥٩** 647- **دەگەڵ خۆ هێنان:** سەعاتی یازدە دەگەڵ كارمەندان لە دیوی خۆم كۆبوونەوەم هەیە. داخوا دەكرێ تاسۆش دەگەڵ خۆت بێنی؟

← ڕێنوێنی كردن.

**٢٥٦٠** 3616- **دەگەڵ زەمان چوونە پێش:** ئەگەر بە هیوا بی بێ پێك هێنانی ئاڵوگۆر لە شێوەی كاسبیدا دەتوانی درێژە بە كار بدەی، بە هەڵە چووی. ئەگەر دەگەڵ زەمان نەچێ پێش، بەجێ دەمێنی.

**٢٥٦١** 4250- **دەگەڵ غەیرە دین ئیزدواج كردن:** بە پێی وردترین لێكدانەوە، ئەگەر كەسێكی كاتولیك دەگەڵ غەیرە كاتولیكێك ئیزدواج بكا و هاوسەرەكەی حازر نەبێ بە پێی شەریعەتی كلیسای كاتولیك لێك مارە بكرێن، بە بێ هیچ ئەم لاو ئەو لایەك دەگەڵ غەیرە دین ئیزدواجی كردووە.

**٢٥٦٢** 6457- **دەگەڵ كەسێك بوون یان مانەوە:** ڕێنوێنییەكان قبووڵ كە - دەگەڵ خۆم بە. ئەمن لە بنەچەو بناوانی ئەو كارە باش دەگەم.

**٢٥٦٣** 3008- **دەگەڵ كەسێك كەوتن (بۆ خواستن یان بۆ سێرە پێكردن):** لە كەنگێوە خەزاڵ دەگەڵ سیامەندی كەوتوە؟ پێم وابوو پێلات دۆستێتی.

**٢٥٦٤** 2756- **دەگەڵ كەسێك كەوتن:** لەبەر ئەوە كە تێكرا دەچوون بۆ مەیخانە، ئەمنیش بڕیارم دا دەگەڵیان بكەوم.

← پێرە بوون دەگەڵ كەسێك، ڕێنوێنیی كردنی كەسێك.

**٢٥٦٥** -

**٢٥٦٦** 2145- **دەگەڵ كەوتن، هاوئاهەنگی كردن دەگەڵ:** چارلز هەتا ئێستە شەقامێ وەدوای كەوتو لەوێرا دەگەڵی كەوت. • ئەو شەرخوازانەی كە لە كۆڕی بەڕێوەبەریی دان، زۆر وێدەچێ دەگەڵ ڕێبەرەكانیان- كە بە بڕوای من لە رادەبەدەر ئاشتیخوازن- هاوئاهەنگی نەكەن.

**٢٥٦٧** 942- **دەگەڵ ... كەوتن، چارەنووسی خۆ دەگەڵ ... گرێدان:** دوای ماوەیەك دوو دڵی، دەگەڵ یاخییەكان كەوت.

**٢٥٦٨** 1191- **دەگەڵ كەوتن:** ئەگەر ٥٠٠ پۆندان بدەی، دەتوانی دەگەڵمان بكەوی.

**٢٥٦٩** 2125- **دەگەڵ كەوتن، تێكەڵ بوون دەگەڵ:** تەماشاچییەكان پیادەرەویان (رەسیفیان) بەجێ هێشت و دەگەڵ خۆپێشاندەران كەوتن.

**٢٥٧٠** 6783- **دەگەڵ كەوتن، دەگەڵ گوتن، هاودەنگ بوون دەگەڵ:** ئەوە پۆپ بوو كە لە پێشدا ئەو گۆرانییەی دەست پێكرد و دوایە هەموو بەو دەنگە زیق زیقەیانەوە هاودەنگیان دەگەڵ كرد.

← هاوئاهەنگی كردن دەگەڵ.

**٢٥٧١** 3867- **دە... گرتن:** ڕەحەكەیان لەسەر قەنەفەزەیەك كە دەدیولر گوابوو دانابوو.

دەگەڵ گوتن ← دەگەڵ كەوتن.

**٢٥٧٢** 440- **دەگەڵ گیروگرفتان بەرەوڕوو بوون:** پاش بە چۆك داهاتنی فەرانسە، بریتانیا دەگەڵ زۆر گیروگرفتی تایبەتی بەرەو ڕوو بوو.

**٢٥٧٣** 4257- **دەگەڵ موشەخەساتێك هاتنەوە:** لەباری بەدەنییەوە، كابرا دەگەڵ موشەخەساتێكی هەمان بوو دەهاتەوە. باڵابەرزو كەمێك كووڕ بوو.

دەگەڵ نیما ← (بۆ نیشاندانی سەرسوڕمان) بروبایە!

**٢٥٧٤** 5830- **دەگەڵ یەك تێكەڵ بوون، تێكەڵاو بوون:** لە "طیف" ی ڕەنگاندا، ئەوەی كە پێیان دەگوترێ ڕەنگی جۆراوجۆر كەم كەمە بێ ئەوەی بە زەقی هەستی پێ بكرێ تێك دەڵوێن دەبن.

**٢٥٧٥** 3611- **دەگەڵ یەكتر هاتنەوە، هاوئاهەنگ بوون، وەك یەك زیاد یان كەم بوونەوە، بەرابەر بوون:** یەكێك لە هۆیەكانی نائارامی لە ناوەندە سنعەتییەكان ئەوەیە كە زیادبوونی داهاتی كرێكاران دەگەڵ چوونە سەری رادەی نرخەكان دەگەڵ یەك نایەنەوە.

← هاوئاهەنگ بوون، بەشێك لە شتێك بوون.

دەگیانی كەسێك بەربوون ← تێبەردان.

**٢٥٧٦** 4585- **دەگیرخستن، بەربەست لێبڕین:** وادیار بوو كە لاقەكانی لە ژێر شتێكی قورسدا برستیان لێبڕاوە. •

٣٩١٩/ 3007- ڕۆیشتن دەگەڵ، دەگەڵ کەوتن: منداڵە چکۆلەکان لە لای مامیان مانەوەو گەورەکانیان دەگەڵ بابەو دایکیان کەوتن بۆ ئیسپانیا.

٣٩٢٠/ 2853- ڕۆیشتن لە جێگایەک، واڵێنەک، ساڵێنەک، فۆنەجێهەک: ماڵەکەیان فرۆشتەو ڕۆیشتن کە لە کانادا دەگەڵ کچە بەمێردەکەیان بژین.

٣٩٢١/ 4300- ڕۆیشتن لە ساڵێنەک، گوێزتنەوە، گواستنەوە: کرێگرتەکان لە ماڵە دەست بەسەر داگیراوەکان دەرزانەو دەچنە ماڵەکانی شوورا.

٣٩٢٢/ 4388- ڕۆیشتن لە ئای یەکێک، بەجێهێشتن، پێوەندیی دەگەڵ کەسێک پچڕاندن: کچەکە تەنیا هەفتەیەک بوو کە بۆ ئاغای ... کاری دەکرد کە بە جێی هێشت، هەمان چیرۆکە کۆنەکە بوو؛ ئەو کابرایە دەستی ناسەرەوێ.

٣٩٢٣/ 4775- ڕۆیشتن و دووکەڵ کردن، هەڵم یان دووکەڵ لە خۆ وەدەرنان، دووکەڵ هەڵستەدەر: قەتارەکەمان دە دەقیقە درەنگتر لە حاڵێکدا دووکەڵی بڵاو دەکردەوە گەیشتە نیزگە. ● لە کونێکی لە ئاسنەکەدا هەڵم دەهاتە دەر.

٣٩٢٤/ 6711- ڕۆیشتن و کەسێک بەجێ هێشتن: بۆ ناچی بۆ سینەمایەو بەجێم بێڵی هەتاکوو ئەو نامانە تەواو کەم؟

٣٩٢٥/ 4119- ڕۆیشتنەوە، گەڕانەوە، چوونەوە ماڵی خۆی: بەراستی کاتی ئەوە هاتوە کە بگەڕێینەوە ماڵێ. بۆ ئەم شەوە خۆشە سوپاستان دەکەین.

٣٩٢٦/ 1449- "ربط" دان، پێوەندی هەبوون: بە گشتی ناتوانین بڵێین فێربوونی ماتماتیک دەگەڵ فێربوونی زمان یان مێژوو پێوەندییان هەیە.

ڕەپ ڕاوەستان ← سەرهەڵێنان (بە لە خۆبایی بوونەوە).

٣٩٢٧/ 5053-ڕەوینەوە، هەڵاتن: سەربازەکانمان بە دژەهێرشێکی توندوتیژ دوژمنیان ڕەمێنا/ لە ئاکامی دژەهێرشێکی توندوتیژی سەربازەکانمان دوژمن هەڵات.

٣٩٢٨/ 4100- ڕەوینەوە، کەوتنە سەر: کەروێشکەکە لە کونێ دەرپەڕیو دوو سەگ کەوتنە سەری.

← وەدوای کەسێک کەوتن.

٣٩٢٩/ 192- ڕەوتان، ووچان نەمان؛ ڕاوەستان و هات و چۆ کردن: لێم گەڕێ؛ لە بەیانییەوە بە بێ وچان دەخولێمەوە، ئەوە دەمرم/ هێزم لەبەردا نەماوە/ ڕەجەلم لێبڕاوە. "خێرا بڕۆ چاوێک بە دووکانەکاندا بگێڕە بزانە هیچت وەگیر دەکەوێ".

٣٩٣٠/ 4843- ڕەتاندن، فەرمان بەسەردا ئیندان، دەستووردان بە، ئەمرو نەهی کردن بە: ئیدی ناتوانی فەرمانم بەسەردا لێبدا. ● بریا لە فەرمان دان بەسەر خەڵکیدا دەستی هەڵدەگرت؛ هەمووی بڵێین ئەو خەڵکە منداڵن.

٣٩٣١/ 5554- ڕەتان، ڕەتاندن: لە ڕۆژە فەرمبالغەکانی پێش جێژنێ، ئەو کچانەی لە فرۆشگە گەورەکان لە بەشی پۆشاک دا کار دەکەن لە بەیانییەوە بەوەو بەرێدا دەڕەتێن.

← فەرمان بەسەردا لێدان.

٣٩٣٢/ 2177- ڕەت کرانەوە، شکست خواردن، وەڵەری کەوتن: ئەو تیئۆرییە شکست دەخوا، سەرناکەوێ چونکە....

٣٩٣٣/ 7405- ڕەت کردنەوە: ئەگەر دوای هەڵگرتنی ڕەسمێک (کێشانی عەکسێک) فیلمەکە، ڕەت نەکەی، لەسەر یەک فیلم دووچار ڕەسم دەگیرێ.

٣٩٣٤/ 6038- ڕەت کردن: زۆر خۆشبینی ئەگەر پێت وابێ دەتوانی هەشت لیتر شەراب لە گومرکێ ڕەت کەی.

٣٩٣٥/ 7252- (بە دەنگ وەرگرتن) ڕەت کردنەوە: یەکێک پێشنیاری کرد ئەوەی کە لە کۆبوونەوەکەدا دەگوترێ تەسجیل بکرێ، بەڵام ئەو پێشنیارە بە دەنگ وەرگرتن ڕەت کرایەوە.

٣٩٣٦/ 3461- ڕەت کردنەوە، قبووڵ نەکردن: بەرنامەی تازەی کار بۆ کارمەندەکان گرینگ نیە، بەڵام کەمبوونەوەی حەقدەستەکان قبووڵ ناکەن.

٣٩٣٧/ 6956- ڕەت کردنەوە، قبووڵ نەکران: ئەو پێشنیارەی پێوەندی بە درێژەدانی جادەی ماشێن هەتا ناوەندی شارەوە هەبوو لە کۆمیتەدا ڕەت کرایەوە.

٣٩٣٨/ 7136- ڕەت کردنەوە، قبووڵ نەکردن: ناغای پلیکان لە کۆبوونەوەی کۆڕی بەڕێوەبەریی بە زۆرینەی دەنگ ڕەت بۆوە.

← پشت تێکردن، لە خۆ دوور کردنەوە.

٣٩٣٩/ 6061-ڕەجەل لێبڕان، هێزوتوانا نەمان، برست لێ بڕان: لەو کاتیدا بە هۆی داخوازیی لە ڕادەبەدەر بۆ یارمەتیی دەرمانی هێزو توانامان لێبڕابوو.

← شەکەت بوون، ماندوو بوون، لە لاق کەوتن، لە پێکەوتن.

ڕەجل لێبڕین ← لە پێ خستن، ماندوو کردن.

ڕەخنە کردن بۆ نێو جێگایەک یان تاقمێک ← (خۆ) خزاندنە نێو.

٣٩٤٠/ 4539- ڕەخنە گرتن لە، ئەزموونی خراپ هەبوون لەسەر: ڕەخنە گرتن لە بەرنامەکەمان بۆ کەسانی غەیرە کارێکی

هاسانە. بەڵام شتێکی کە ئێوە نایزانن گیروگرفتێکی تیکنیکیە کە دەگەڵی بەرەو رووین.

٣٩٤١ 2889- رەخنە گرتن لە، بۆڵە بۆڵ بەسەردا کردن: ئەری بۆ هەمیشە لەو کچە بەستەزمانە رەخنە دەگری؟ ئەو بە هەموو توانایەوە تێدەکۆشێ.

٣٩٤٢ 6776- رەخنە گرتن لە، سەرزەنیش کردن، سەرکۆنە کردن: بێ گومان دەرگای ئەسڵیی ساختومانەکە قفڵ نەکرابوو. نیگابانی/ حەرەسی شەوانە بۆ ئەو کارە سەرکۆنە دەکەین.

٣٩٤٣ 3057- رەخنە (ی بێجێ) گرتن لە: ئەو لەو کەسانەیە کە هەمیشە شتێک دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی رەخنە بگرن. گرنگیش نیە کە کارەکان چۆن ئەنجام درابن.

٣٩٤٤ 6822- رەخنە گرتن لە، قسە هەڵگەڵ کردن: ئەم تەلەویزیۆنە عەیبێکی هەیە. ناچارم دەگەڵ خاوەن دوکانەکە قسان بکەم/ رەخنەی لێ بگرم.

٣٩٤٥ 5320- رەخنە گرتن لە کەسێک بۆ هەڵەیەک، هەڵەیەک ...: ناتوانن بە هۆی ئەوە کە گۆیا دەوڵەت لە پێوەندی دەگەڵ ئەو کەسانەی داهاتی ئەگۆریان هەیە کەمتەرخەمی کردووە رەخنەی لێ بگرن.

٣٩٤٦ 4716- (بە توندی) رەخنە لێگرتن، گاڵتە پێکردن، سەرزەنیش کردن: ئێستا کە ئەوڵە، بۆتە خەتی سەرەکیی لە ستراتیژی دیفاعیدا؛ دەبێ زۆر بە توندی ئەو کەسانە سەرزەنیش بکرێن کە نەخشەی مووشەکی ئەمبۆتیان دارشت.

رەخنە گرتن (بە دەنگی بەرزەوە، بە ئەوپەڕە ئەوپ) ← ئەوپراندنو رەخنە گرتن.

رەخنە گرتن لە ← وتارێکی رەخنەگرانە نووسین لەسەر، پرتەو بۆڵە لەسەر کردن.

٣٩٤٧ 266- رەخنە لێگرتن (زۆر توند)، دالەبەر هێرشی رەخنان: نووسەرێکی زۆر خراپەو هێندێک لە رەخنەگران داویانەتە بەر لافاوی رەخنان.

٣٩٤٨ 6279- رەخنە گرتن، سەرکۆنە کردن: هێشتا ئەندامانی تیپەکە بە تەواوی نەگەیشتبوونەوە هۆدەی لیباسان، کە سەرپەرشتەکەیان، بە هۆی یارییەکی تێکەڵ پێکەڵو دیفاعی کە کردبوویان، دەستی کرد بە سەرکۆنە کردنیان.

٣٩٤٩ 6875- رەخنە لێگرتن: دە دەقیقە درەنگ گەیشتمێو ئەویش لەبەر چاوی هەمووان رەخنەی لێ گرتم.

رەخنە گرتن ← لۆمە کردن، سەرزەنیش کردن، سەرکۆنە کردن، بۆڵەبۆڵ لەسەر کردن، مەحکووم کردن (بە توندی).

٣٩٥٠ 4346- رەخنە هەبوون لە، رەخنەگرتن لە: ئەو هەمیشە رەخنەی هەیە، بەڵام، نە لە شتێکی مەعلوومو مووشەخەس.

رەد بوون ← تێپەر بوون.

٣٩٥١ 1993- رەدوو کەوتن: کاتێک دایکم کچێکی حەڤدە ساڵە بوو، رەدووی بابم کەوت.

٣٩٥٢ 5556- رەدوو کەوتن: ئەو پێی وابوو کە ئاسۆ تەنیا کەسێکە کە ماری رەدووی کەوتووە.

٣٩٥٣ 2867- رەدووی کەسێک کەوتن، دزین و دەگەڵ خۆ بردن، دزینو بردن: گیروگرفت ساز بوو/ گاڵ ساز بوو، مێر رەدووی پەیژت کەوتووە. ● دوای بیست ساڵ خزمەت کردنی دڵسۆزانە، سندووقدارەکە دوو هەزار پۆندی لە پووڵی شیرکەتەکە هەڵگرتو دەگەڵ خۆی بردی.

٣٩٥٤ 6507- رەدەبەندی کردن، لەژێر پەیک عینوان دا نووسین: هەموو ئەو کارو شوغڵە جۆراوجۆرانە دەتوانن لە ژێر عینوانی 'دابەشکەر'دا بنووسن/ رەدەبەندی بکەن.

رەدی فیعل لە خۆ نیشان دان ← دژ کردەوە لە خۆ نیشان دان.

٣٩٥٥ 132- رەزایەت دان، رازی بوون بە: پێش ئەوە کە تەمەنم بگاتە شازدە ساڵی، باوکم هەرگیز رەزایەت نادا پشوودانێکم لە دەرەوەی وڵات بگوزەرێنم.

٣٩٥٦ 1410- رەزایەت دان، رەزایەتی لەکردن: دایەلەو بابی کچەی بە نابەدڵییەوە رەزایەتیان دا مێردی بکا.

← قبوول کردن، هاتنە سەرێ.

٣٩٥٧ 6247- (لە رادەبەدەر) رەسمی بوان تەشریفاتی بوون: لە جێژنێکی نارا ساکاردا، لە رادە بەدەر تەشریفاتی بوونم پێ خۆش نیە.

٣٩٥٨ 4028- رەفتار کردن، داوەری کردن لەسەر، چاو لێکردن، نەزەر هەبوون لەسەر ...: پێم بڵێ ئەو خەڵکە لەسەر ئەو نەزەریان چییە؟

٣٩٥٩ 2863 - رەفتار کردن، هەڵس و کەوت کردن، جووڵانەوە، بزووتنەوە بە شێوەیەکی (پێشەرمانە، جینایەتکارانە، ناپەسەند، دژ بە ئەخلاقی کۆمەڵایەتی).

٣٩٦٠ 2790- (بە شێوەیەکی رێکوپێک) رەفتار کردن، جووڵانەوە، هەڵس و کەوت کردن: ئەگەر بە شێوەیەکی تەواو ئیداری رەفتار بکەی، هەرگیز دەگەڵ بەرپرسانی سەروو تووشی گیروگرفت نابی.

رەفتار کردن ← دژکردەوە لە خۆ نیشان دان، بە فێزەوە دەگەڵ خەڵک هەڵس و کەوت کردن.

رەفتار کردن دەگەڵ (بە ناحەزی) ← (خراپ) جوولانەوە دەگەڵ.

٣٩٦١ 2878- **رەفتار کردن بە گوێرەی**: ئەگەر لەسەر بناخەی ڕێنوێنییەکانی دەوڵەت دەگەڵ رووسەکان وتووێژ بکەن، کارێکی هەڵەیە، چونکە لانی کەم ئەو ڕێنوێنییانە تەواو نین.

← بە گوێرەی پێویست رەفتار کردن.

٣٩٦٢ 784- **رەفتاری ناشایست لە خۆ نیشان دان، گەمرەبازی دەرهێنان، جرپەو جوپ کردن، گەمژەگەمژە کردن**: چارلی، دەست لەو جرپەوجۆپە هەڵگرە، ئەمن کارم هەیە.

٣٩٦٣ 3020- **رەفتاری نالەبار، خراپ**: باوکی فرید لە رەفتاری نالەباری ئەو بە رادەیەك تووڕە بوو کە خەرجی گیرفانی رۆژانەی لیّ بڕی.

٣٩٦٤ 4135- **رەفتاری نالەبار لە خۆ نیشاندان بۆ راکێشانی زەینی خەڵك**: داخوا ئەتدەتوانی ئەو رەفتارە نالەبارانە لەو میوانییەکەدا لە خۆت نیشان نەدەی؟ ئەتۆ بۆ دەبێ هەمیشە زەینی خەڵك بۆ لای خۆت راکێشی؟

٣٩٦٥ 2775- **رەکێش کردن، بردن، بانگ کران (بۆ لێپرسینەوە)**: لە سەردەمی ئێمەدا، ئەگەر کوڕێکیان دیبا سیگاری دەکێشێ، بۆ لای مودیری قوتابخانە رەکێشیان دەکرد، بۆی هەبوو لێشی دەن.

رەکێش کردن بۆ لای ← برانە لای

رەگی مل هەستان ← تووڕە بوون.

رەگی مل هەڵنەستان ← تووڕە نەبوون.

رنجاندن ← نارەحەت کردن.

رەنج کێشان لە دەستی ← پێوە ناڵین.

رەندە لێدان ← (ڕێکولووس کردن) بە رەندە لێدان.

رەنگ بە رووەوە نەمان ← رەنگ پەڕین.

٣٩٦٦ 4405- **رەنگ پەڕین، رەنگ بزرکان، رەنگ بە رووەوە نەمان، مۆی هەڵگەڕان**: بەستەزمانە، هەرچەند ترسەنۆکیش نەبوو، بەڵام هەر ناوی دەرزی لیّ دانیان هێنا، رەنگی بە رووەوە نەما.

٣٩٦٧ 4401- **رەنگ کردن پێدان کران**: دەرگاو پەنجەرەکانی ماڵەکەیان رەنگ کردبوو.

٣٩٦٨ 4400- **رەنگ لێدان**: پاش ئەوەی کە باقی رەسمەکە تەواو بوو، ئەو پەیکەرەی لای راست کە بە پێوە بوو رەنگیان لێدا.

٣٩٦٩ 6010- **رەنگ لێدان، پێدا تێهەڵسوون**: مەترسێ هێندێك زیاتر رەنگی رەوشەن تێهەڵسوو.

٣٩٧٠ 347- **رەواج پەیدا کردن، لەبەر دڵ پەیدا کردن لای کۆمەڵانی خەڵك/ و بەبەر دڵی کۆمەڵانی خەڵك کەوتن**: پێشەرکێی بازیسازدێن بە ئەسپان/ پەڕیشی ئەسپان، بە هۆی بڵاو بوونەوە لە تەلەویزیۆن، رۆژ بە رۆژ لایەنگری زیاتر دەبێ/ زیاتر وەبەر دڵی کۆمەڵانی خەڵك دەکەوێ.

← بوونە مۆد، سەرلەنوێ بوونەوە باو، پەرەپێدان.

رەونەق پەیدا کردن ← گەرم بوون.

رەها کردن ← وەدوونەکەوتن.

ڕێبەندان ← ڕاوەستان.

ڕیتاڵ ڕیتاڵ کردن ← وردو ورد کردن.

٣٩٧١ 5492- **ڕێخستن و پاك کردنەوە**: ئەگەر قاوەت بەسەر فەرشی دارشت دەبێ زوو بە پەڕۆیەکی تەڕ ڕێی خەی و پاکی کەیەوە.

ریزاڵ ریزاڵ کردن ← لە نێو بردن.

ڕێز دانان بۆ یاساو ڕێسا ← مل بۆ یاساو دابو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان راکێشان.

ریزش کردن ← رووخان.

ریز کردن ← (خێرا خێرا) گرتن.

٣٩٧٢ 1664- **ڕێز گرتن لە، ڕێز دانان بۆ**: بە گشتی، لاوەکان دەبێ بۆ بەوبەرەوای بە ساڵداچووەکان ڕێز دابنێن.

٣٩٧٣ 5338- **ڕێز گرتن لە، ڕێز لێنان، ڕێز لێگرتن**: ئەو سفەتانەی کە بە بۆنەی ئەوانەوە خەڵك ڕێزی لێدەگرن بریتین لە بە توانا بوونی لە بڕیاردانی بە خێراو لێبراوانە بەڕێوە بردنی.

٣٩٧٤ 1807- **ڕێز گرتن لە، ڕێز دانان بۆ**: ئەوە کە سەعاتێك پێشتر نانمان خواردبوو، بەو جۆرەی کە پێویست بوو نەمانتوانی ڕێز بۆ دەستاوەکەی دانێین.

← کڕنۆش بردنەبەر.

٣٩٧٥ 3566- **ڕێز گرتن لە قانوون، بەڕێوەبردنی قانوون**: 'چار! هەتا ئەو جێگایەی یاسا بەڕێوە بچێ/ پێشێل نەکرێ، بۆم گرنگ نیە ئەو زانیارییانە چۆن وەدەست دەخەن.

← بەڕێوە بردن.

٣٩٧٦ 3732- **ڕێزی خۆ لە دەست دان، لەبەرچاو کەوتن**: ئاکۆ بە هۆی نووسینی وتاری یەکجار رەخنەگرانە لە ڕێبەرانی حیزبەکەی و بڵاوکردنەوەیان لە رۆژنامەدا شانسی خۆی بۆ چوونە سەری پلەو پایەی لە دەست دا، کاتێك ڕێزو حورمەتی لە دەست چوو ئێدی بۆی مەشکیل بوو بتوانێ خۆشەویستیی جارانی وەدەست بێنێتەوە.

٣٩٧٧ 565- رێزپێوو کردن، جیهەز کردن، جێگرتنەوە: ئەگەر بتانەوێ بچن بۆ ئەورووپا، دەبێ هەر لە ئێستاوە جێگا رێزێرو بکەن/ جێگا بگرنەوە.
← راگرتن (جێگایەکی بۆ کەسێك).
٣٩٧٨ 7172-(لە ئەرتەش دا) ڕیزی سەربازی گرتن لە (بەڕێزو تفەنگ لەسەر شان) راوەستان: ژێنەراڵە میرانەکە بە هێزی دەستەو بردێکی تەواو کە بۆ بەجێگەیاندنی ڕیزی سەربازیگرتنی لەو ئەنهام درابوو ئەفسەر نیگابانی تەشویق کرد.
٣٩٧٩ 6248- ڕێزی کەسایەتیی خۆ پاراستن: وەك هونەرپیشەیەکی ژن کە داهاتوویەکی باشی لە پێشە، ڕێزی کەسایەتیی خۆی دەپارێزێ.
ڕێژیم گرتن ← پارێز کردن.
ڕیسوا کردن ← ئابروو بردن.
ریشاڵ ریشاڵ کردن ← ورد ورد کردن.
٣٩٨٠ 5769- ریشە داکوتان، جێگیر بوون: ئەو بەد عەمەلە وەها لە خوو گرتن بە مەشروب خواردنەوەی ئیوەرۆیانی لە مەیخانەی گرینیزدا ریشەی داکوتابوو کە بە بێ ئەو دەمرد.
٣٩٨١ 5462- ریشەکێش کردن، لەناو بردن: هێندێك پیاوی خۆیان ناردن بۆ ئەوەی نەیارانی ڕێژیم لە نێو بەرن/ ریشەکێش کەن.
← لەنێو بردن.
٣٩٨٢ 2773- ریشەدەبوون لە ...دا، گەڕانەوە بۆ: سەدەی پازدەهەم! بە خودای سەیرە، ئەمدەزانی نازناوی ئەو کابرایە هەتا ئەو رادەیە دەگەرێتەوە بۆ رابردوو.
← سەرچاوەگرتن لە.
٣٩٨٣ 7045- ریشەی شتێك لە شتێکی دیکەوە زانین: ریشەی ترسی غەیرە مەنتیقی خۆی لە باڵندان لە رووداوێکەوە دەزانێ کە لە سەردەمی منداڵێتیدا بۆی هاتبۆ پێش.
٣٩٨٤ 4656- ریشەی کەسێك دەرهێنان، چاودەرهێنان، خەوانەوە، دەردی سەگلێ دان بە کەسێك: ئەگەر بابم بزانێ تەسجیلە جوانەکەت لێشکاندووە، چاوت دەردێنێ.
٣٩٨٥ 6082- ڕێك خستن، ڕێکوپێك کردن: سەرانسەری دوای ئیوەرۆیە خەریکی ڕێکوپێك کردنی سکەو تەمرەکانی بوو.
٣٩٨٦ 3778- ڕێکخستن، تەرتیب دان، گرتن (ی جێژن): ڕۆژی لەدایك بوونێتی. هەر بۆیەش جێژنم بۆ گرتووە. ● بەزیرایی لە سالۆنی شارەداری باش تەرتیب درابوو.

ڕێکخستن ← یەکگرتوو کردن، هێنانەسەر خەتی.
سازماندان←هاوناهەنگ کردن.
ڕێکخستنەوە ← ئاشت کردنەوە.
ڕێککەوتن ← یەکگرتن.
٣٩٨٧ 1095- ڕێککەوتن (لەسەر نرخێك): دوای ماوەیەك قسەکردن لەسەر نرخی تابلۆکە سەرەنجام لەسەر نرخێکی باش، دەگەڵی ڕێککەوتم.
٣٩٨٨ 315- ڕێککەوتن بە شێوەیەکی دژ بە یاسا: راوێژکاری حقووقیی بە پارێزراوەکەی راگەیاند کە ئەگەر بە پێچەوانەی یاسا دەگەڵ ژنەکەی ڕێککەوتبێ، ناتوانێ تەڵاقی بدا.
٣٩٨٩ 1041- ڕێککەوتن دەگەڵ، بوون بە دۆست دەگەڵ: جان لە فکری ئەوە دابوو کە داخوا ئەگەر بۆ سەیران بچێتە گوندی راوچیان، دەتوانێ باشی رابوێرێ یان نا، بەڵام زوو زوو دەگەڵ منداڵانی راوچیان بوو بە دۆستو ئەو ماوەی زۆر خۆش رابوارد.
٣٩٩٠ 5820- ڕێککەوتن لەسەر: دوای کەمێك وتووێژ، لەسەر ڕێکەوتێکی ئاخرو ئۆخری مانگی ژوونییە ڕێککەوتن.
← پێکهاتن لەسەر.
٣٩٩١ 4330- ڕێککەوتن لە ڕێگای وتووێژەوە: وا راگەیەندرا کە شەریکەی کەشتی سازی ... لەسەر مامەڵەیەکی سێ میلیۆن پۆندی دەگەڵ شیرکەتێکی گەورەی ئەوانی ڕێککەوتوون.
٣٩٩٢ 1654- ڕێککەوتن لەسەر بڕیاردان بۆ: سەرەنجام لەسەر قوماشێکی خەت خەتی زەرد ڕێککەوتن.
ڕێککەوتن دەگەڵ ← هاوناهەنگی کردن دەگەڵ، یەکگرتن دەگەڵ، پێکەوە سازان، وەك یەك بوون، هاوناهەنگ بوون دەگەڵ.
٣٩٩٣ 1331-ڕێککەوتن دەگەڵ، سازان دەگەڵ، چاران: ئینسان ناچارە دەگەڵ ژینگە بسازێ.
٣٩٩٤ 74- ڕێککەوتن (دەگەڵ)، بوون بە هاوپەیمان (دەگەڵ): چەندین سەدەیە بریتانیا دەگەڵ پورتەغاڵ هاوپەیمانە.
٣٩٩٥ 389- ڕێککەوتن، لەهاتنەوە دەگەڵ، بێجێ بوون: جلوبەرگو رەفتارو کردەوەی دەگەڵ ئەو رێو رەسمە گرینگە نەیاندەخوێندەوە. بە بڕوای بابم/ بابم پێی وابوو قسەکردنی منداڵەکان لەسەر نانی بێجێیە/ ناحەزە.
٣٩٩٦ 3790- ڕێکو پێك (کردن)؛ ژێرسیفارە خاوێنەکانیان بە شێوەیەکی یەکجار ڕێکوپێك لەسەر مێزی چکۆلە

دانابوون. * به تەحسین کردنەوە تەماشی دیراوە ریلەو پێکەکانی گوڵاڵیان دەکرد.

٣٩٩١/ 4231- **ڕێکوپێک کردن، ڕێکخستن:** پێش ئەوەی دەستوور بدەین ئامرازەکانمان بۆ حازر کەین، دەبێ بەرنامەی سەفەرەکەمان بە روونیو لەسەر کاغەز ڕێکوپێک کەین.

٣٩٩٨/ 4202- **ڕێکوپێک کردن، مونتاژکردن (ی ڕۆژنامەو کتێبو...)**: بەم شێوە کە لاپەرەی یەکەم مونتاژ کراوە، دەبێ چەند جار بگۆردرێ.

٣٩٩٩/ 5244- **ڕێکوپێک کردن، سەروسامان دان بە:** حیسابدارێکی دامەزراند بۆ ئەوەی وەزعییەتی مالییەکەی کەمێك بۆ ڕێکوپێك بکا./ سەروسامانێك بدا بە وەزعی مالییەکەی.

٤٠٠٠/ 5772- **ڕێکوپێک کردن، سەروسامان دان بە:** پێش ئەوەی کارسالتی سەرچاوە گرتوو لە بێسەروبەرەیی ڕوویان تێ بکا، خاوەن چاپەمەنییەکان دەبێ سەروسامانێك بدەن بە وەزعی کەسپو کاریان.

٤٠٠١/ 121- **ڕێکوپێک کردن (بۆ) ئامادەکردن:** ئەو پارچە مۆسیقا جوانەی شوێنێنی بۆ تیپێکی تەواو (ی مۆسیقا) ئامادە کردووە.

٤٠٠٢/ 5842- **ڕێکوپێک کردن، هێنانە ژێر تەنزیمەوە:** ئەوەی کە ئەو سەربازە تازانە پێویستیانە ئەوەیە کە هەموو ڕۆژێ نیو سەعات لە مەیدانی مەشق تەدریبیان پێ بکەن. ئەم کارە دەیانهێنێتە ژێر تەنزیمەوە.

٤٠٠٣/ 7004- **ڕێکوپێک کردن، کۆکردنەوە:** دەبێ بەرپرسایەتیی ڕێکخستنەوەو ڕێکوپێك کردنەوەی دەوڵەتی ناوچەیی بخرێتە ئەستۆی ئەو.

٤٠٠٤/ 4937- **ڕێکوپێک کردن؛** هۆدەی مۆتالای بە تەواوی شپرزەیە: لەمێژە کابانی ماڵێ لە هەوڵدان بۆ ڕێکوپێك کردنی دەستی هەلگرتووە.

٤٠٠٥/ 4822- **ڕێکوپێک کردن، لەنێوان ئەوانەی لێك نزیك کردنەوە:** یەکیەتییەك بە ناوی ئاتۆ هەیە، کە ئەگەر ڕێکوپێك نەکرێ، لەبەریەك هەڵدەوەشێ.

٤٠٠٦/ 6864- **ڕێکوپێک کردن، تەرتیب دان، ئامادە کردن:** ئێستا ئیدی بۆ سەفەری هۆلەند هەموو شتێك ئامادە کراوە.
← شکڵ پێدان، ساف کردن، ئامادە کردن، دەست تێوەردان.

٤٠٠٧/ 1803- **ڕێکوپێکو خاوێن کردنەوە:** دەبێ چەکمەجەی مێزەکەت خاوێنو ڕێکوپێك کەی؛ پڕە لە وردە کاغەزو نامەی وەڵام نەدراوە.

٤٠٠٨/ 977- **ڕێگەی بڕینە سەرپان گەیاندن:** تاقمێك بریتانیایی بە چوونە خولی لە ئەشکەوتێکی باشووری فەرەنسە هەتا قووڵایی چوار هەزار پێ، ڕێکۆردەکانی بریتانیایان بردە سەر.

٤٠٠٨/١ 4343- **ڕێکۆرد شکاندن، ڕێکۆرد بە سەبت گەیاندن:** لە ڕۆژنامەدا بە کوشتنی دوو کەرزێشکان ڕێکۆردمان شکاند. * تیمەکانمان لە پێشبڕکێ دەگەڵ تیمە میوانەکان زۆر سەرکەوتنیان بە سەبت گەیاندوە.

٤٠٠٩/ 6422- **ڕێکو لووس کردن، ڕاست کردنەوە:** ئەو تێلاتە ڕێکو لووس کە بزانین بتوانین لێکیان جیا بکەینەوە.

٤٠١٠/ 6030- **ڕێکو لووس کردن (بە دەست پێداهێنان)، ساف کردن:** جان کراواتەکەی میزان کرد، مووی ئاڵۆزی سەری ساف کردو بۆ پێشوازیی کردن لە یەکەم میوان چووە دەرێ.
← سافکردن، لێکو لووس کردن.

٤٠١١/ 6032- **ڕێکو لووس کردن، ساف کردن:** دایکم وردکە نانەکانی بە براسی پاك کردەوەو، سفرەکەی ڕێکو لووس کردەوە.

٤٠١٢/ 6570 - **ڕێگا، پلان بریاری خۆ گۆڕین:** پێویست ناکا خۆتان زەحمەت دەنو هەوڵ بدەن قانعی کەن. ئەو کە بریاریدا، ناکرێ بریارەکەی پێ بگۆڕن.

٤٠١٣/ 1582- **ڕێگا بەستن:** هەرچەند ڕێگای پاشەکشەیان لێ بەسترابوو، بەحاڵەش سەربازەکان هەتا ئاخری درێژەیان بە بەربەرەکانی دا.
← پێشگرتن بە.

٤٠١٤/ 47- **ڕێگا پێدان، وەرگرتن، وەرگێران:** بە ئەندامەتیی یەکیەتیی پاراستنی باڵندان وەرگیرا.
ڕێگا پێنەدان ← پێشگری کردن لە.

٤٠١٥/ 72- **ڕێگا دان (بۆ کردنەوەیەك)؛** پلەو پایەی بەرپرسایەتیی ئەو ڕێگای پێنادا کە لەبەرچاوی خەڵك هیچ کردەوەیەکی نالەبار لە خۆی نیشان بدا.

٤٠١٦/ 3865- **ڕێگادان بۆ هاتنە ژوور، چوونە ژوور:** بە کەڵك وەرگرتن لە کلیلێکی زیادی چۆە ژووری کتێبخانەی. * ئەگەر ویستیان بیتاقە/ بلیت بکڕن، ڕێگایان مەدە.

٤٠١٧/ 4528- **ڕێگا دان بە، لێبوردن بە، هەڵگرتن:** ئەم سەردەمەی کە ئێمەی تێدا دەژین ڕێگا بە دەستو پێسپیلکەییو بێدەرەیی نادا/ دەستو پێسپیلکەییو بێ وەرەیی هەڵناگرێ.
← دەست ناواڵە کردن.

**٤٠١٨/ 2787- ڕێگا پێگرتنەوە بە یارمەتیی ... :** هیچ قیبلەنومایەکمان پێ نەبوو. بۆیە ناچار بووین بە یارمەتیی دەنگی تۆپخانەی ڕێگای خۆمان بدۆزینەوە.

**٤٠١٩/ 6078- ڕێگا ساڵفکردن (بۆ پێڵەرووی)، لەرم کردن:** دیترۆتانە، دەمیەوێ نەرمم کا بۆ ئەوەی کاتێک کچە گەیشتن تەمایۆم هەبێ.

**٤٠٢٠/ 1599- ڕێگا کردنەوە:** زیندانی‌یەکان توانییان بۆ نێو تێلدرۆکانی دەوری ئۆردووگاکەدا ڕێگایەک بۆ خۆیان بکەنەوە.

**٤٠٢١/ 2741- ڕێگا گۆڕین:** فەرماندەری کەشتی دەستووری دا بۆ دۆزینەوەی کابرای ونبوو کەشتی‌یەکە ڕێگای خۆی بگۆڕێ.

**٤٠٢٢/ 643- ڕێگا گۆڕین، ئەمەت گۆڕین:** سەرکانداری کەشتی ڕێگای گۆڕی‌و لە ناکام دا لە مەسیرێکی دیکەوە درێژەمان بە ڕۆیشتن دا.

**٤٠٢٣/ 4068- ڕێگا گۆڕین:** فەرماندەری کەشتی (ناخودا) بۆ لادان لەژێر دەریایی‌یان کە بە پێی گوزاریش لەو ناوچەیە دیترابوون، ڕێگای نیمەی گۆڕی.

← شرێنە ونکە کردن.

**٤٠٢٤/ 1695- ڕێگالەدان بە، نەهێشتن:** چەندین هۆکار هەن کە ناهێڵن پیشەسازیی نوێ بێتە کورنەوال.

**٤٠٢٥/ 1646- ڕێگالەدان بە، بەربەست کردن:** بە پێی یاسا، شێت ڕێگایان پێ نادرێ لە هەڵبژاردندا بەشداری بکەن.

← خۆ پاراستن لە، نەهێشتن.

ڕێگا ونکردن ← بە هەڵەچوون.

ڕێگای خۆ جیاکردنەوە ← جیابوونەوە لە.

**٤٠٢٦/ 3550- ڕێگای خۆ درێژ کردن:** لە نێو شاخەوانەکاندا باسێکی دوورو درێژ هەبوو؛ هێندێک لەسەر ئەم باوەڕە بوون کە بگەڕێنەوە بۆ لای پێگەی سەرەکیانو هێندێکیشیان پێیانوابوو کە ئەگەر ئاخرین هەوڵی خۆیان بدەن دەتوانن ڕێگای خۆیان درێژە بدەنو بگەنە ترۆپکی کێوەکە.

**٤٠٢٧/ 1113- ڕێگای خۆ گۆڕین، (مەسیر، شێوەی کار، سیاسەت) گۆڕین:** ڕێگامان گۆڕی‌و شێوە کارێکی دیکەمان هەڵبژارد.

**٤٠٢٨/ 1989- ڕێگای خۆ لەنێو جەماوەردا کردنەوەو چوونە پێش:** مەئموورەکانی ئامبولانس ناچار بوون بە زەحمەت ڕێگای خۆیان لە نێو ئاپۆرایەکی گەورەدا بکەنەوە کە لە دەوری ماشێنە دەعم کردووەکان کۆ ببوونەوە.

**٤٠٢٩/ 7534- ڕێگای فرۆشتنی بەستن:** ڕێگای هاتووچوو بۆ ناوەندە بازرگانی‌یەکانو بازاڕی نێوەڕاستی شارمان بەستووە. هاتووچووی ماشێنە شەخسی‌یەکان قەدەغەیەو ئەو پیکابانەی باردێنن دەبێ لە کاتو ساتی دیاری کراودا هاتوچوو بکەن.

**٤٠٣٠/ 5282- ڕێڵە کردن، ووتەوە بڵاوکردنەوە:** لە هەموو تیزگە فەرعی‌یەکانیان داوا کرد پەیامەکە سەرلە نوێ بڵاو بکەنەوە بۆ هەموو ئەو کەسانەی گوێ دەدەنە شەبەکەکەیان.

ڕێ لێ ونکردن ← فریودان.

**٤٠٣١/ 648 - ڕێنوێنی کردن، لەگەڵ خۆ هێنان، پێ‌ڕان بردن:** دەشەوێکی خالەکەت دەگەڵ خۆت بێنە بۆ ماڵی ئێمە. بەڕاستی ئارەزووی دیتنی دەکەم.

**٤٠٣٢/ 6820- ڕێنوێنی کردن (لە سینەما/ شانۆگەری/ ئەنجومەنێکدا):** دەست ڕاگرن، دەڵێمیەک سەحنەکە ڕاگرن- دەمەوێ ماری دەگەڵ بیل ڕێنوێنی بکەم.

**٤٠٣٣/ 3079- ڕێنوێنی کردن:** سەگی پۆلیس مەئموورەکەی هەتا سەر ئەو جێگایەی "مراد عمر"ەکەی لێ شاردابۆوە ڕێنوێنی کرد.

**٤٠٣٤/ 964- ڕێنوێنی کردن، ئاشکرا کران:** ئەمانە ئەو لیباسانەن کە دەتوانی لە رووی نەخشەی زۆر جوانی ئەمریکایی پیاندرووی، بەڵام، ئەگەر خەیاتی ناکەی، دەتوانی لەو بەری ئاتلانتیک (ئەمریکا) ڕێنوێنی وەرگری.

**٤٠٣٥/ 7372- ڕێنوێنی کردن بۆ:** 'ئەفەری دوایە لە لیستەکەدا کێیە، خانم جونز؟'، 'کابرایەکی بە ناوی ئاغای دەیویس.'، 'باشە، ڕێنوێنی کە بۆ ژوورێ'.

**٤٠٣٦/ 7235- ڕێنوێنی کردن بۆ دەرێ:** دەرگاکەی کردەوەو بۆ دەرێ ڕێنوێنی کرد.

**٤٠٣٧/ 5890- ڕێنوێنی کردن بۆ دەرێ، بەرێ کردن:** 'پێم وایە ئیدی لێرە قسەکانمان تەواو دەبێ. خاتی جۆنز، تکایە ئەم میوانەمان بەرێ کە'.

**٤٠٣٨/ 7234- ڕێنوێنی کردن بۆ نێو، بردنە نێو:** بردیانینە نێو ژوورێکی چاوەڕوانیی کە دەورتادەوری کورسی زۆر ناخۆشیان لێ دانابوو.

**٤٠٣٩/ 5886- ڕێنوێنی کردن بۆ (نێو):** 'ئەگەر میوانەکان هاتن، تکایە بۆ هۆدەی دانیشتن ڕێنوێنی‌یان بکەن'.

**٤٠٤٠/ 52- ڕێنوێنی کردن:** ئایا ئەتۆ هیچ کات بۆ باشتر کەڵک وەرگرتن لە توانایی خۆت وەک گۆرانی بێژێک ڕێنوێنی کراوی؟

← فێرکردن.

ڕێگا گرتن ← بەستن (ی ڕێگا).

٨٠٤١ 6759- **ڕێنوێنی کردنی کەسێك لە جێگەیەك، دەڵاڵی کەسێك کەوتن بۆ نیشاندانی جێگەیەك:** وەزیری چاپەمەنی کورێکی نوێنەرایەتیی چین بۆ دیتنی زانستگە ڕێنوێنی دەکا.

٨٠٤٢ 4353- **ڕێوڕەسم (ی ئاینی) بەڕێوە بردن:** لە زەماوەندی دوێنێ شەوێ یانی شەم دەگەڵ ئاغای ... جەنابی پیترماستەرز، باوکی بووکێ، ڕێوڕەسمە ئاینییەکەی بەڕێوە برد.

٨٠٤٣ 7020- **ڕێو ڕەسمی تەواو بوونی خاڵوویەرەیەك:** لە ڕێوڕەسمی تەواو بوونی بورجی نیدارەی پۆستی لەندەندا سەرۆك وەزیران بەشدرا بوو.

ڕێهاڵاندن ← پێدادان.

٨٠٤٤ 2330-

٨٠٤٥ 2332-

٨٠٤٦ 7031-

٨٠٤٧ 4927-

٨٠٤٨ 3931-

٨٠٤٩ 6246-

٨٠٥٠ 279-

٨٠٥١ 2330-

٨٠٥٢ 4634-

٨٠٥٣ 4978-

٨٠٥٤ 4901- **زاربەستن، پێنەنگ کردن:** ئەگەر نارەوشکی (سەرنووسەرو ڕەخنەگر) نووسەرانی کۆنەپەرست سەخڵەت دەکا، دەبێ بڵێین کەمێك بە پارێزەوە هەڵسوکەوت بکا. نابێ بە تەواوی وسکوتی کەن.

٨٠٥٥ 4155- **زارخوار کردنەوە لە، لاساکردنەوەیەکی ناحەز، گاڵتە کردن:** شێوەی بەڕێوە بردنی هەڵبژاردن گاڵتە پێکردنی بە ئاشکرای دیمۆکراسی بوو. ● دەست تێوەردانە پەیتاپەیتاکانی قازی گاڵتە کردن بە عەدالەتە.

٨٠٥٦ 412- **(لە وەرزشدا)، (بەتەواوی) زاڵ بوون بەسەر ...دا:** تیمی میران هەر لە دە دەقیقەی سەرەتادا بە تەواوی بەسەر تیمەدا زاڵ بوو.

٨٠٥٧ 594- **زاڵ بوون بەسەر ...دا، شکست دان:** لە پێوەندی دەگەڵ گەلاڵەی تەقاعوددا دەگەڵ بەرهەڵستکارییەکی زۆر بەرەورو بووین، بەڵام بە لەسەرەخۆیی بەسەر هەموویدا زاڵ بووین.

٨٠٥٨ 626- **زاڵ بون بەسەر ...دا، کۆنتڕۆڵکردن:** پیاو هەر چەندە تێبکۆشێ بێ هێنیتەدەر عاڵە بتوانێ بەسەر دوورەپەرێزییەکەیدا زاڵ بێ.

٨٠٥٩ 581- **زاڵ بوون بەسەر ...دا، پێنهارە کردن، شکستدان:** سەرناشپەز وەختی نەبیوو کە چێشتە هەرە تایبەتییەکانی دروست کا بۆ نموونە هەرکەس بێ چێشتێ، سەری سوڕمێنێ.

٨٠٦٠ 2224- **زاڵ بوون بەسەر ...دا، کۆنتڕۆڵ کردن، مەهار کردن:** گەورگرتنەکەی پێ گرتم. سەرەنجام توانی بە سەریدا زاڵ بێو، دوای چەند دەقیقەیەك هاکەسەر ئەم باوەڕە کە سەردەکەوێ.

← بەسەردا زاڵ بوون.

٨٠٦١ 2579- **زاڵ بوون بەسەر ...دا، چارەسەر کردن:** هەردوو لایەنی وتووێژەکان لە بواری چارەسەر کردنی گەورگرتنی شێوەی نووسینی ڕێککەوتننامەکە دەگەڵ دەردەسەرێکی زۆر بەرەورو بوون.

٨٠٦٢ 2582- **زاڵ بوون بەسەر ...دا:** ئاخرین جار کە چاوم بە مارگرێت کەوت، دەکرێ بڵێین بەسەر دەستو پێ لێ تێکەڵ بوونەکەی لە لای خەڵکی بێگانەدا زاڵ ببوو.

٨٠٦٣ 3511- **زاڵ بوون بەسەر ...دا خواردنەوە (ی تووڕەیی) پێشی ... گرتن:** کاتێك بیستم دەگەڵ کابرای میران چلۆن ڕەفتار کراوە، بە زەحمەت توانیم پێشی تووڕەییەکەم بگرم.

٨٠٦٤ 1272- **زاڵ بوون بەسەر شەرمێونی خۆدا، شەرم شکان:** دەبێ ماوەیەکی دووروودرێژ دەگەڵت بێ، بۆ نموونەی شەرمی بشکێ/ بەسەر شەرمێونی خۆیدا زاڵ بێ.

٨٠٦٥ 2503- **زاڵ بوون بەسەر ...دا، شکست دان:** زۆر سروشتییە کە کامران بۆ نموونەی بتوانێ شکستم بدا، دەبێ نەهێڵێ یەك دەرفەتیش بە فیڕۆ بروا.

← بەسەر کەسێك دا زاڵ بوون.

زلن ← هێنانە سەر دنیا.

٨٠٦٦ 5535- **زانیاری (پێدان):** بە ئاغای فیلیپم گوتوە بۆ کۆبوونەوەکە کە دەگەڵمان بێ چونکە دەتوانێ ئاخرین زانیاریمان سەبارەت بە هەلومەرجەکە بداتێ.

٨٠٦٧ 3034- **(زانیاری جینایەتکاران)، زانیاریدان بە پۆلیس سەبارەت بە کەسێك، شەیتانی و شەیتانی کردن لە دژی کەسێك:** کابرای تاوانبارکراو دەیگوت: ناسەوێ بڵێن لەسەر دۆستەکانم زانیاریم داوە بە پۆلیس.

٨٠٦٨ 5011- **زانیاریدان لەسەر کەسێك، ئاشکراکردن:** دەرمنگ یان زوو لە شەقام دەیبینن و پۆلیس ئاگادار دەکەن.

٤٠٦٩/ 5190- (لە ڕێگای کتێب خوێندنەوە) زانیاریی خۆ بڕەو پێدان: لە پەیوەندی دەگەڵ پەرەستاندنو گەشە کردنی ئەو بەشە دەبێ لە ڕێگای کتێب خوێندنەوە زانیاریی خۆم بەرەو سەر: خەریکە وردە وردە پێوەندیم دەگەڵی دەپسێ.

٤٠٧٠/ 3053- زانیارییەکی قووڵ هەبوون لەسەر بابەتێکی زانستی: هەر مرۆڤێکی دەرس خوێندوو لە سەدەی نۆزدەهەمدا، زانیارییەکی تەواوی لەسەر دوو زمانی لاتینیو یونانی هەبوو.

٤٠٧١/ 3230- زانین، ناسین، بیستن: 'دەزانی نایلۆن چییە؟'، 'بەڵێ، بافتێکی دەستکردە.' 'پاتەرسۆن دەناسی؟'، 'نا، هەرگیز ناویم نەبیستووە.'

٤٠٧٢/ 2507- (پێ) زانین، بۆنکردن: ئەگەر بمانزانیبا/ بۆمان کردبا کە بەستەیەکی گەورەی ئەڵماس لە ئەفریقاوە بۆ ناغای ... یان دۆستەکانی دەچێ، لەمێژەمان ئاگادار دەکرد.

← تێگەیشتن، وەدەست هێنان.

زایە کردن ← خراپ کردن.

٤٠٧٣/ 1951- زیان گەیاندن (لە شتێک ...): زیانم گەیاند، بەڵام زۆر بە خێرایی واداری کردم لەسەر خۆ قسان بکەم.

٤٠٧٤/ 4650- زمانلووسی کردن، چاپلووسی کردن: ئەو لەو جۆرە پیاوانەیە کە لە چاپلووسی بۆ کردن نارەحەت دەبێ، پیاوی راستو دروستی خۆش دەوێ.

٤٠٧٥/ 2198- زمانلووسی کردن بۆ، کەیفخۆشکردن بۆ، خۆ لەبەر هەڵکردن، لاسە لاسە لەبەر کردن، پاککردنەوە بۆ، پاڵە پاڵە کردن لە بەرامبەر: بۆ هەر کەسێکی پلەوپایەیەکی هەبێ زمانلووسی دەکا. ● هەوڵ مەدە بەم شێوە پشتیوانیی ئەو بۆ لای خۆت راکێشی - لامەلامەی پێخۆش نیە.

٤٠٧٦/ 6492- زمان هەڵگوتن، تێکەڵ پێکەڵ کردن: دەنگی کابرای تا رادەیەک باش نەدەهاتو، لە گرنگترین بەش لەو شتانەی کە دەبوو بیانڵێ زمانی هەڵدەگوتو، بۆیە لەوەی کە هەبووین ناقڵتر نەبووین.

٤٠٧٧/ 2391- زراو چوون، سەرسووڕمان: خەڵک ئەوەندیان شتی ترس هێنەر لە تەلەویزیۆندا تەماشا کردووە کە ئەوەی ئێستا بە بێ تەفاوەتییەوە چاوی لێدەکەن، دە ساڵ لەمەو پێش زراوبردووی دەکردن.

← ترسان، ترساندن (زۆر بە توندی تۆقاندن).

٤٠٧٨/ 5643- زەوقی ئاشناییەک پێک هێنان: توانیم دەگەڵ هێندێک لەو موسافیرانەی سەڵت/ رەبەن بوون، زەوقی ئاشناییەک پێک بێنم، بەڵام ئەوانەی رەبەن نەبوون، دوورە پەرێزییان دەکرد.

زرینگانەوە ← دەنگدانەوە.

٤٠٧٩/ 6724- زگ بە کەسێک سووتان، جەرگ بۆ کەسێک سووتان: سەگی بەرماڵای دێنانەوە ماڵێ، چونکە زگی پێیان دەسووتا.

٤٠٨٠/ 3189- زگ بە کەسێک سووتان، بەزەیی بە کەسێکدا هاتن، لوتف هەبوون دەگەڵ کەسێک، نەرمی لوتف هەبوون دەگەڵ: شێرزاد جارجار نەرمەرێکی لوتفەت دەگەڵم هەبێ. ● کلیسا لە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە رەفتاریان دەگەڵ دەرسە ئەخلاقییەکانی مەسیحییەت نایەتەوە بە لەتفو مەرحەمەتەوە دەبزووێتەوە.

٤٠٨١/ 2639- زگ پڕ کردن: خەبەر ئەوە خەریکە پێش خواستنی ئەو کچە زگی پڕ دەکاو دوایەش ناچارازێن.

٤٠٨٢/ 3704- زگ پڕ کردن، ئاوس کردن: ئاخر بۆچی ڕێگای پێدا زگی پڕ کا؟ هەروەک تۆ بڵێی ،هەرگیز ناوی حەبی زگ پڕنەبوونی نەبیستبێ! ئێستا دەبێ کورتاژ بکا/ لەبەرخۆی بەرێ.

زگ پێ سووتان ← پشتیوانی نەکردن لە.

٤٠٨٣/ 1971- زگ لەسەر دانان، هەڵخلیسکانەوە: منداڵەکان سەعاتێک لەمەوپێش لە پیادەڕەوییە دوورو درێژەکەیان گەڕانەوەو ئێستا ئەوە خەریکن هەڵیدەخلیسکێنەوە.

٤٠٨٤/ 6827- زگ لەسەر مەشرووب دانان: یەک دوو نەفەر لە لای بارەکە بوون کە زگیان لەسەر مەشرووبی دانابوو.

٤٠٨٥/ 3779- زل کردنەوە، گەورە کردنەوە: تەنیا گوناهێکی کە ناچار بوو دەلنی پێدابێنێ، لە خۆبایی بوون بوو، ئەویشی زۆر گەورە دەکردەوە.

٤٠٨٦/ 975- زنجیر کردن، بە زنجیر بەستنەوە: دەبێ ئەو سەگە زنجیر کەن (ببەستنەوە)؛ خەتەرناکە.

زۆر بڵێیی کردن ← درێژەدادری کردن.

زۆر بوون ← کەڵەکە بوون.

زۆر لەسەر گرتن ← درێژەدادری کردن، چەنە لێدان.

زوڵم بەستن ← سێخوار لەسەر کەوتن.

زوڵم لێکردن ← جیاوازی دانان، خراپ جووڵانەوە دەگەڵ.

زوو دیتنەوە ← (خێرا) پێزانین.

زوو کردن ← پەلە کردن.

٤٠٨٧/ 3024- زۆر خواردن، خۆ هەڵاخنینەوە، تا مڵان خواردن: تووشی تیمساحێک بووین کە وەها خۆی لە گۆشتی منداری هەڵاخنیبۆوە کە بە حاڵە حاڵ دەیتوانی ببزوێ.

٤٠٨٨/ 1120- زووکەوتن، خێرا کەوتن، رابوون: کامران، زووکە، ناکرێ هەتا نێوارێ چاوەروانت بین.
زوو وەرنەخستن ← پەلە کردن.
زوو هاتن ← پەلە کردن.
زەبت کردن ← تەسجیل کردن.

٤٠٨٩/ 6755- زەحمەت کێشان، خۆ زەحمەت دان: رێکخستنەوەی تەواو کەمالی ئەو دوو بەشەو یەکگرتنەوەیان زەحمەتەکەی دێنێ.

٤٠٩٠/ 3717- زەحمەت کێشان لەسەر: وێراستار/ ئیدیتور هەتا کازیوەی بەیانی لەسەر نووسراوەکە زەحمەتی کێشا (= خەریکی نووسراوەکە بوو).

٤٠٩١/ 7016- زەحمەت کێشان لەسەر کورەوەی دیتن دەگەڵ: وادەزانم چەندین هەفتەیە لەسەر ئەو دەرمانانەی تاقیکاری زەحمەت دەکێشم. واش دیارە کە هەرگیز تەواو نابێ.
زەخت لەسەر دانان ← گوشار (= فشار) بۆ هێنان.

٤٠٩٢/ 3770- زەختیرە کردن، پاشەکەوت کردن: کاتێک لە هاوینێدا نرخەکان لە خوارێ بوون، رادەیەکی باشیان بەردە زوخاڵ پاشەکەوت کرد.

٤٠٩٣/ 7281- زەربە خواردن یان وێکەوتن (بە هۆی کەمتەرخەمی): بۆ چرکەیەک هۆشی لە خۆی نەبوو، زەربەیەکی هەورکی باشی خوارد.

٤٠٩٤/ 3699- (بەرەو ژوور) زەربە لێدان: کاتێک کابرای ناشناس بە چەقۆوە هێرشی بۆ هێنام، مستێکم (بەرەو ژوور) لە باسکی داو ئاورکێشەکەم دەزگی کروتا.

٤٠٩٥/ 6451- زەربە لێدان یان وەشاندن (لە پڕ): ئەگەر ئەو حەیوانە هەست بەوە بکا کە دەدلو کەوتووە زۆر بە توندی و لە پڕ زەربە دەوەشێنێ.

٤٠٩٦/ 6725- زەربەیەکی توند وێکەوتن، لەبەر دەمان (هەم بە کردەوەو هەم بە شێوەی مەجازی): لەو کاتەوە کە کونترۆڵی ماڵی هاتۆتە کایەوە، سنعەتی ئێمە چەند زەربەیەکی پیسی خواردووە/ وێکەوتووە.
زەرگ لێدان بۆ نێو ئاو ← شیرجە لێدان.
زەرەر کردن ← زیان دیتن.

٤٠٩٧/ 1273- زەرەر کردن یان نەکردن: شتی بە نرخی هەرزان دەفرۆشت، بەلام بە هەر جۆرێک بێ، هەرگیز زەرەری نەدەکرد.
زەرەر لێدان ← تەلەفات لێدان.

٤٠٩٨/ 7339- زەعیف بوون، بەرەو کزبوون رۆیشتن: لە ژێر ئەو هەموو گوشارەی کە دایک و باوکی بۆیان دەهێنا، ئیرادەی سەربەخۆ ژیانی تێدا زەعیف کرد.

٤٠٩٩/ 4794- زەعیف بوون: کەمێک کزبووی، مەگەر نا؟ دەزانی، هێندێک زەعیف بووی.
← کەمبوونەوە، لە هەتەرەی چاو دەرچوون.
زەعیف کردن ← بێ‌هێز کردن.

٤١٠٠/ -

٤١٠١/ 252- زیاتر لە ... بوون: هەتا ئێستا ٢٧ کەس عەمەل کراون. (بە خۆشییەوە) چاک بوونەوەیان هەر زۆر دوور لە چاوەروانی بوو.

٤١٠٢/ 505- زیاتر لە توانایی خۆ، کەوێک وەئەستۆ گرتن، پاروو لە زاری خۆ زیاتر/ گەورەتر هەڵگرتن: کاتێک دایکم لە گەورگرتنەکام لە کاری تازەمدا ئاگادار بوو، گوتی: رۆڵە پاروویی لە زاری خۆت گەورەتر هەڵگرتووە.

٤١٠٣/ 3947- زیاتر لە توانایی خەرج کردن، زیادە خەرجی کردن، ئیسراف کردن: بە چوونە سەری نرخی هەموو شتێک بەم جۆرە کە دەیبینین، هەمیشە زیاتر لە توانایی خۆمان خەرج دەکەین.
زیاد بوون ← باشتر بوون، چوونە سەر.
زیاد کردن ← بەهێز کردن، پێوەلکاندن، کەڵەکە بوون، لێ‌زیاد کردن، بردنە سەر.

٤١٠٤/ 35- زیاد کردن، بردنە سەر: زەری هەڵکۆڵینەکانی ئەم دواییانە، زانیاریی ئێمەی لەسەر ژیان لە بریتانیا لە سەردەمی بەرد (عهد حجر) دا یەکجار زۆر بردۆتە سەر.

٤١٠٥/ 3452- زیادکردن، بردنە سەر: دەزانین کە ئەو مندە پارەیەی وەری دەگرن رازی نین. پێمان وایە دەکرێ کەمێکی زیاد کەین.

٤١٠٦/ 6353- زیاد کردن، باشترکردن، بردنە سەر: وەزعییەتە کۆمەڵایەتییەکەیان زۆر باشتر ببوو. ● ئەو داهاتانەی بۆ ئەو بەرنامەیە تەرخان کراون دەبێ زیاد بکرێن.

٤١٠٧/ 5618- زیاد کردن، بردنە سەر: یارمەتیی مانگانەی مامۆستایان دەبێ بەرنە سەر بۆ ئەوەی دەگەڵ یارمەتیی ئەو کەسانە بتوانن بەراورد بکرێن کە کاری وەک مامۆستایانیان هەیە.

٤١٠٨/ 4981- زیاد کردن لە (سەرویس، موسائیدەی): هەرێمی باشووری رۆژهەلات، بۆ ئەوەی دەبەستی ترافیکی تەحتیلات/ عوتلە بێن، دەقەتاریان لە سەرویسی خۆیان زیاد کردووە.

٨١٠٩/ 7453- زیاد کردن لە: ئەگەر هێندێك لایەنی باشی ئینسانی لە چوارچێوەکە زیاد کەی، ئەوسا ناتوانی چاکی کەی.

٨١١٠/ 5977- زیاد کردن لە، بردنە سەر: پێش ئەوەی دەرفەتی ئەوەمان وەچنگ کەوێ لە ئاخرین چوونە سەری نرخەکان رزگاریان بێ، شیرکەتەکانی خانووبەرە دروست کردن دەرسەدێکی دیکەیان لە نرخی سووتی قەرزەکانیان زیاد کرد.

٨١١١/ 95- زیاد کردن لە، لێیزیادکردن، پێوە لکاندن: لە پێوەندی دەگەڵ دابەشکردنی داراییەکاندا، خاڵێکی گرنگ لە رێککەوتننامەی سەرەکیی نێوانیان زیاد کرابوو.

٨١١٢/ 2876- زیاد کردن لە قسەکانی خۆ: سەرۆکی ئیدارە پاش ئەوەی پێشنیارەکەی ئێمەی بە وردی خستە بەر رەخنە، بۆ ئەوەی ئەرخەیانمان کا، لە قسەکانی زیاد کردو گوتی روانگەکانی من هیچ لایەنێکی خسووسیو شەخسییان تێدا نیە.

زیاد کردن هەتا ... ← گەیاندنە....

زیادەخەرجی کردن ← زیاتر لە توانایی خۆ خەرج کردن.

٨١١٣/ 4889- زەمان (کات) گەڕاندنەوە دواوە، گەڕانەوە بۆ رابردوو: رۆژنامەی 'مهر' نووسیویەتی هیچ کەس ناتوانێ زەمانە بەرەو دواوە بگێڕێتەوەو لە دەست سیستمی دەدەیی/ئەعشاریی دراو رزگاری بێ.

٨١١٤/ 4439- زەمانە تێپەڕ دەبێ: وادیارە لە تێپەڕبوونی زەمانەو بێ ئەوەی بتوانی بە تەواوی بەهرەی لێوەرگری بە داخ بی.

زەمانەتی کەسێك کردن ← بەرپرسایەتیی کەسێك وەئەستۆ گرتن.

٨١١٥/ 5765- زەمینە (= رێگا) بۆ کارێك خۆش کردن: کاتێك لە کۆتایی مانگی مارسدا لایەکمیان بۆ پرسو رای دووهەم هێناوە بۆ مەجلیس، زەمینە بۆ هەڵاو بگرێکی یەکجار زۆر ئامادە کرابوو.

زەندەق بردن ← ترساندن (زۆر بە توندی).

زەندەق چوون ← ترسان.

٨١١٦/ 5394- زەنگ (= جەرەس) لێدان: دەکرێ لوتف بکەیو بۆ کەمێکی دیکە ئاوی گەرم زەنگێك لێدەی؟

زەنگ بۆ لێدان ← تەلەفوون کردن.

زەنگ لێدانەوە ← تەلەفوون کردنەوە.

٨١١٧/ 4316- زەوت کردن، دەست بەسەر داگرتن: کاتێك بیر لەوە دەکەمەوە کە یەکێك دەیەوێ بە زۆر یان بە فێڵو تەڵەکە دەست بەسەرماڵم دابگرێ، شێت دەبم.

٨١١٨/ 15- زەوقو سەلیقە دەلیلی روونی نیە: پیاو ناتوانێ بە هاسانی زەوقو سەلیقەی کەسێك روون بکاتەوە/ هۆیەك بۆ زەوقو سەلیقەی کەسێك بدۆزێتەوە.

زەوین دانە سەر... ← کوێ لە قسەی کەسێك راگرتن.

٨١١٩/ 568- زەوین راکێشان بۆ لای، تێکشکاندن لە: کەم کەم لە خراپ بوونی وەزعەکە گەیشت (خراپ بوونی وەزعەکە زەوینی بۆ لای خۆی راکێشا).

٨١٢٠/ 2969- زیادەڕەوی کردن: ئەو لەو جەشنە پیاوانەیە کە ناتوانێ هیچ کارێك وەکوو خەڵکی دیکە جێبەجێ بکا؛ کاتێك مەشرووب دەخواتەوە، یەکجار زۆری دەخواتەوە؛ ئەگەر ماشێن لێ دەخورێ، یەکجار توند دەروا؛ ئەگەر لە دەری نان بخوا، دەچێتە گرانترین هوتێلان. لە هەموو شتێکدا هەمیشە زیادەڕەوی دەکا.

٨١٢١/ 4065- زیان دیتن، زەرەر کردن: بۆ دەگەڵ ئێمە ناکەوی؟ بەڵێنیت پێدەدەم زەرەر ناکەی. ● لەو تێکەڵ بوونەوە چەندە زەرەر دەکەن؟

٨١٢٢/ 1309- زیان دیتن، زیان پێگەیشتن، قوڕی کاری خراپ بوون، بەدحەمەل بوون: دەبێ بێ هیچ ئەم لاو ئەو لایەك دەگەڵت بڵێم، تەنانەت ئەگەر تەنیا لەبەر ئەوەی بێ ئەرخەیان بم کە شتێکی خراپت بەسەرنایە. ● زۆربەی دایکو بابان لەسەر ئەو بروایەن کە ئەگەر منداڵەکانیان بچنە دیسکۆی فێری کاری خراپ نابن.

٨١٢٣/ 1586- زیان گەیاندن (بە خۆ): ئەگەر یەکێتییە کرێکارییەکان حازر نەبن بۆ چوونە ژێر پۆششی یاسای پێوەندییە پیشەسازییەکان ناونووسی بکەن، زیان بە خۆیان دەگەیەنن.

زیان گەیاندن بە ← ئەسەری خراپ دانان لەسەر.

زیپی شتێك کێشان یان داخستن ← بەستن، یان داخستن (ی زیپ).

٨١٢٤/ 4410- زێڕ وەچنگ هێنان، زێڕ لێ پەیدا کردن (لێدۆزینەوە): دە رۆژ بوو کە لە نێو ئەو رووبارەدا کارمان دەکرد بەڵام زێڕێکمان لێ نەدۆزیبۆوە.

٨١٢٥/ 240- زیندانی بوون: ئاخرین کەس لە دزەکانی بانك، ئێستا ئەوە بە سەلامەت لە زیندان دایە.

٨١٢٦/ 3353- زیندانی کردن: تازە بووکەکە کلەیی دەکرد کە لە خزمو دۆستەکانی دووریان خستۆتەوەو لە کاخێکی

سەردەمی ڤیکتۆریادا زیندانی یان کردووە. ● زۆر کەس لەسەر ئەم باوەڕەن کە دروست نیە جینایەتکاران بۆ ماوەی دووروودرێژی هەتا سی ساڵ زیندانی بکەن.

٤١٢٧/ 3337- زیندانی کردن (لە چوارچێوەی ساڵێکدا): سیلاسی بە ساڵداچوو خەرفابوو خۆی لە نێو هۆدەی ژێر شیروانی‌دا زیندانی کردبوو؛ ساڵی جارێکیش وەدەرنەدەکەوت.

٤١٢٨/ 3993- زیندانی کردن: "ئێستا لە کوێیە، زیندانی‌یە؟"، "نا، مردووە".

٤١٢٩/ 4956- زیندانی کردن، دەستبەسەرکردن، دەرپەڕاندن کردن: بە تاوانی بە زۆر چوونە نێو ماڵی خەڵک، دەرپەڕاندنیان کردووە.

٤١٣٠/ 4894- زیندانی کردن، خستنە بەندیخانەوە: ئێستا کە ئەو جینایەتکارە/ پیاوکوژە خەتەرناکەیان زیندانی کردووە، دەبێ بە ئاسوودەیی بژی بنووین.

٤١٣١/ 5912- زیندانی کردن، هەڵگرتن لە جێگەیەک بۆ لەوەی خەڵک دەستیان پێ ڕانەگا: کەوابوو لێی گەڕێ با لە قەڵای کیمبرلتۆن زیندانی بێ، کە دەڵێن دەخەرێ لەوێ دەرماندراوی کەی.

٤١٣٢/ 1048- زیندانی کردن، خستنە بەندیخانە (بێ دادگایی کردن): ئەو خەڵکەیان بێ هەرچەشنە دادگایییەک خستنە زیندانو بۆ ماوەی چەند مانگان ڕایان گرتن.

٤١٣٣/ 3968- زیندوو بوونەوە، هاتنە سەر دنیا: ئەگەر زیندوو بیامەوە، هەگیز لە جێگای سارد نەدەژیام.
← هەبوون.

٤١٣٤/ 5424- زیندوو بوونەوە، لە قەبری هاتنەوە دەر: جۆنز هەفتەیەک پێشتر لە سەر دەریا ون ببوو - وئێستاش سەرو کەللەی وەدەرکەوتۆتەوە، هەروەک تۆ بڵێی لەسەرا زیندوو بۆتەوە.

٤١٣٥/ 654- زیندوو کردنەوە: بەهەرحاڵ مردبوو؛ نەمانتوانی زیندووی کەینەوە.
← گەڕاندنەوە.

٤١٣٦/ 5135- زیندوو کردنەوەی دوژمنایەتییەکان: دوژمنایەتی‌یەکانی ڕابردوویان زیندوو کردەوەو، پێش ئەوەی بزانم لە کوێم، ناچار بووم بکەومە شەڕە مستان.

٠١-٤١٣٦/3961- زیندوومان، بە ژیانی خۆ درێژەدان: ئەو دەمرێ بەڵام ناوی باشی زیندوو دەمێنێ.

٤١٣٧/ 2455- زیندوومان بە، سەری خۆ ڕاگرتن بە: لە یەکێک لە گۆڤارە...کاندا کار دەکەی، دەنا نا؟ بژیە، دەتوانی بۆ

دەست پێکردنی ژیانی هاوبەشمان چارێ بە داهاتی ئەو کارەت سەری خۆمان ڕاگرین.

٤١٣٨/ 3738- زیندوو مانەوە، دەوام هێنان، خۆ ڕاگرتن، لە کاتی تەنگوچەڵەمەدا: دەبێ هەرچی زووتر پشوودانێک رابگەیەنن. هێندێک لە منداڵەکان ئەوەندەیان تاقەتو پشوو نەماوە کە هەتا بە تەواوەتی وەسەر دەکەون خۆ ڕاگرن. ● ئەوانەی لە دەوری جێگاکە کۆببوونەوە دەیانزانی کە پیاوە پیرە بە خێرایی بەرەو مەرگ دەڕوا؛ وا وێدەچوو کە هەتا کۆتایی ئێوارە زیندوو نەمێنێ.
← چاکبوونەوە.

٤١٣٩/ 5600- زین کردن: ئەسپەکان زین کرابوونو ئامادەی وەرێکەوتن بوون.

٤١٤٠/ 7217- ژاکان، سیس هەڵگەڕان: لەو ڕۆژەوە لە مێردەکەی جیا بۆتەوە کز بووەو ژاکاوە.
← سیس بوون.

زیادی مانەوە ← مانەوە.

زیان پێگەیشتن ← زیان دیتن.

زیان پێگەیاندن ← تەلەفات لێدان.

٤١٤١/ 4345- (زاراوەی لەشکەری) ئامادەی خۆ ڕاگەیاندن: سەربازەکانی ئەندامی دەستە لە ڕاستەوە بۆ چەپ ژمارەی تایبەتیی خۆیان ڕاگەیاند.

٤١٤٢/ 3414- ژن بە ژن کردن، ژن و ژنخوازی کردن لە یەکتر: زۆر لە عەشیرەکانو بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان بە ژنو ژنخوازی لە لایەنە نەیارەکانیان خۆیان پاراستووە/ توانیویانە خۆیان ڕاگرن. ● تورتووی مەلایان وتورتووی جەنگاوەران ژنو ژنخوازی بەیەکەوە ناکەن.

٤١٤٣/ 5816- ژن هێنان یان مێرد کردنو دامەزراندن: دەزانی، ئەو کابرایە ڕەبەنە. نازانم لەبەرچی، بەڵام زۆربەی نووسەران وەک خەڵکی دیکەنین کە ئیزدواج بکەنو دابمەزرێن.

٤١٤٤/ 3952- ژیان لە جێگای کار کردندا: کابانێکمان ڕاگرتبوو کە بۆ ماوەی شەش مانگان لە ماڵی ئێمە دەژیا (واتە لە ماڵی ئێمە کاری دەکردو هەر لەوێش دەژیا). ● چ عەیبێکی هەیە خزمەتکارێک ڕابگرین کە هەر لێرە بژی؟ بۆ نەفەرێکی جێگامان هەیە.

٤١٤٥/ 6504- ژیان بە، گوزەراندن بە: خەڵکی زۆر گوندان هەن کە بە ڕەشە چێشتو شیرێک دەژین کە ڕێکخراوە فریاگوزارییەکان دەیاندەنێ.

٤١٤٦/ 3950- ژیان بە، (- بۆ خەڵاتی)، زیندوومان بە: ئەو بە هومێدی ئەو ڕۆژەوە دەژی کە تەقاعود بێ و بتوانێ گوڵی

رۆژ بارینێ. * ئەوانە تەنیا بۆ خۆش گوزەرانـی دەژیـن‌و هیچی دی.

٤١٤٧/ 3962- **ژیان بە، گوزەران کردن بە:** ناتوانم بەو حەقدەستە بژیم. * ئەدی دەزانی دەتوانن بە چەندی بژین؟.

٤١٤٨/ 3959- **ژیان بە، خواردن:** ئەری ئەو خەڵکە بە گۆشـتی ئینسانی دەژین/ گۆشتی ئینسانی دەخۆن؟

٤١٤٩/ 3963- **ژیان بە تەنیایی:** پێم وانیە تازە بوێرم بە تـەنێ بژیم. * ژیان بە تەنیایی بێ هیچ ئەم لاو ئەو لایەك باشترە لە ژیان دەگەڵ پیاوێك کە ئینسـان ناتوانێ وێی هەڵکا.

٤١٥٠/ 3969- **ژیان بەسەر بـردن لـە ...دا:** ئـەو لـە خراپترین ساڵەکانی رکوودی ئابووریدا ژیانی بەسەر بردبوو.

٤١٥٠-١/ 3965 - **ژیان (ی خۆ) بەسەربردن/ بردنەسـەر، عومـری خـۆ رابواردن:** بێگومان هەموو ژیـانی خـۆی لـەو دۆڵـەی رێلـز دەباتەسەر.

٤١٥١/ 3965- **ژیان بەسەر بردن یان تەواو کردن:** ئـەو دوو پـیرە پیاوە ژیانی وەك کرێکاری سـنعەتی‌یان، بەسـەر بـردووە/ هەموو ژیانی خۆیان وەك کرێکاری سنعەتی گوزەراندووە.
← گوزەراندن (سەرکەوتووانە)

٤١٥٢/ 1903- **ژیان بەسەر بردنێکی بێ ئامانج:** وادیـارە جۆرێـك بە خێو کراوە کە ناتوانی بە هیچ کارێکەوە بنووسێ. بـێ هیچ چەشنە ئامانج‌و مەبەستێك رایدەبوێرێ.

٤١٥٣/ 7177- **(بە شێوەیەکی تازە) ژیان دەست پێکـردن:** دەمـەوێ ( دەست لەسەر گەردانی هەڵگرەو) دابمەزرێم‌و بە شێوەیەکی نوێ ژیان دەست پێ بکەم.

٤١٥٤/ 3951- **ژیـان لـە، مـاڵ لـە جێگایـەك بـوون:** ماڵیـان لـە گرانترین بەشی شارە (= لـە گرانتریـن بەشـی شـار دەژین). * ئەو ماڵانەی ناچارن تێیان دابژیـن، پڕپـڕە لـە مشـك.

٤١٥٥/ 5637- **ژیـانێکی مـەمرە مـەژی/ ئـەمر نـەژی بردنـە سـەر:** درێژترین وەختی ژیانمان زستان بوو، کە لەودا ناچاربووین پارەی هەموو قایەکانی/ حیسابەکانی سووتەمەنی بدەین، بەڵام توانیمان بە ژیانێکی مەمرەمەژی بیبەینە سەر.

٤١٥٦/ 1988- **ژیانێکی ئەمر نەژی بۆ خۆ دابیـن کـردن، پێـك هێنـان:** لـە هێندێـك لـە وڵاتـان بـە هـەزاران کـەس لەوانـەی زانستگەیان تەواو کردووە ناچارن بۆ دابین کردنی ژیانێکی ئەمر نەژی کاری زۆر سووکەڵە بکەن.

٤١٥٧/ 6904- **ژیرانـە فکـر کردنـەوە لـە ...:** ئـەو زۆر لـەوە ئاقڵانـەتر فکـری خـۆی کردبـۆوە کـە بیـەوێ خـۆ لـە وەزعییەتێك وەردا کە بۆی هەبوو هەرپێنا بتەقێتەوە.

ژێر ئەرز بوون ← سەنگەربەندی کردن، خۆشاردنەوە لە ژێر ئەرزدا.

٤١٥٨/ 4662- **ژێـر گـڵ کـردن، ژێرخـاك کـردن:** ئـەو سـاڵە جووتیارەکان نەیاندەتوانی کەڵەمەکانیان بە نرخێکی باش بفرۆشن بۆیە ناچار بوون ژێرخاکیان کەن.

٤١٥٩/ 5670- **ژێـر و روو کـردن، بـە تـەواوی پشـکنین، زۆر بـە وردی خوێندنەوە:** دەتوانی ژیانـامەکەی نووسـراوی خـۆی زۆر بـە وردی بخوێنییەوە، بێ‌ئەوەی سـەبارەت بـە کۆنـە ژنەکـەی چاوت بە تاقە رشەیەك بکەوێ.

٤١٦٠/ 5071- **ژێست گرتن، پـۆز لێـدان، خـۆ رانـان، قیافـە گرتـن:** بەڵێ، لە بنەچەکەی شازادانە، بەراستی زۆر وێ‌و دەچـێ باپیری هونەرمەندێکی لە برسـان مـردوو بووبێـت، بـەڵام کاتێك خۆی رادەنێ پیار ناتوانێ تەحسینی نەکا.
ژمارەی ... بردنە سەر ← بە هێزتر کردن.

٤١٦١/ 1277- **ژێست گرتن، بە فیزەوە رەفتار کردن:** کاتێك دەبینـم ئەو کەرە لەسـەر کەسانێك ژێست دەگرێ کە دەبەرامبەری خۆی لێهاتووترن رەختە شەق بەرم.

٤١٦٢/ 1892- **ژێست گرتن، بە فیزێکـەوە راوەسـتان:** کـاتێك کـە نێر ماشێنەکەیم پیس کردبوو داوای لێبووردنم لێکرد، بـە فیزێکەوە راوەستا و چاوی دەچاوی بڕیـەو گوتـی: 'ئاغـا، سەعاتێکە راوەستاوم'.
ژێست لەسەر گرتن ← خۆ لەسەر گرتن.

٤١٦٣/ 6072- **سابوون لـە خـۆدان:** پـاش یاری‌یـەکی سـەخت، سابوون لە خۆدان‌و دوایەش دووشێکی/ فوارمیـەکی ئـاوی گەرم گرتن، بەراستی زۆر خۆشە.
ساختار ← تەنزیم.

٤١٦٤/ 5566- **سـاردبوونەوە، دامرکانـەوە، کـەم بوونـەوە، لـە گۆڕکەوتن:** مەگەم بتوانین واحیـدە پێشـتازەکان بەرێکەینـە پێشێ، دەنا پێشڕەوی کەوتۆتە مەترسـیی لـە گـوڕ تـێن کەوتنەوە.

٤١٦٥/ 3976- **سازان دەگەڵ، قبووڵ کردن، راهاتن دەگـەڵ:** هـەموو پرۆڵەکانت دۆڕاندووەو، ئێستا دەبێ دەگـەڵ ئـەم وەزعـە بسازێی.
سارێژ بوونەوە ← چاکبوونەوە.
سارێژ کردنەوە ← قەرەبووکردنەوە.
سازان بە (بە هۆی نەبوونی شتێك) ← لە شـتێکی دیکـە کەلك وەرگرتن.
سازان بە یەکەوە ← بەیەکەوە سازان.

سازان دەگەڵ ← ڕێککەوتن دەگەڵ.
سازانەوە ← مەسڵەحەت کردن.
سازبوون، یان کردن ← هەڵایساندن.
ساز کراو ← بۆ ساز کردن.
٤١٦٦/ 2624- **سازکردن، پێک هێنان:** چ ڕێگایەکی پڕ لە چارەڕەشییە کە ناچار بێ بۆ وەچنگ خستنی نانێک لە شارەکان، ئەویش بەسەر پێوە (نەک لە نێو سالۆن و...) شانۆگەریی پێک بێنێ.
٤١٦٧/ 999- **سازکردن (ی کچێک):** ئەوێ ئەو کچە کێ بوو کە دوێنێ شەوێ لە کافەی/ گازینۆی خەرێک بووی سازت دەکرد؟
٤١٦٨/ 3636- **سازکردن، وەڕێخستن:** زیندانییەکان، بە پێی قەرارو مەدارێکی لە پێشدا دیاریکراو، هەڵاو بگرێکی عەجابییان ساز کرد بۆ ئەوەی سەرنجی ئەو خەڵکە بۆ لای خۆیان ڕاکێشن کە لە نزیک بەندیخانەکە تێدەپەڕین.
٤١٦٩/ 1438- **سازکردن:** نیوەشەوێ کە گەیشتەوە ماڵێ داستانێکی ساز کردبوو کە گۆیا هەتا دەرەنگانێکی لە ئیدارە ڕایانگرتووە.
ساز کردن (ی چای) ← دەم کردن.
٤١٧٠/ 4623- **سازگار بوون دەگەڵ، سازان دەگەڵ، هاوکاری کردن:** حیزبە کەمایەتییەکان/ کە مایەتییەکان دەبێ هان بدرێن هاوکاریی بکەن.
٤١٧١/ 11- **سازگار بوون لەگەڵ، خوێندنەوە (دەگەڵ)، هاوئاهەنگ بوون دەگەڵ، یەک گرتنەوە، هاتنەوە:** زانیاریی من دەگەڵ ئەوشتانەی لەو گوزاریشە داهاتوون ناخوێنێتەوە.
سازگار بوون (دەگەڵ دەروون، سلامەتی، ئیشتیا) ← پێکەوتن.
سازگار نەبوون دەگەڵ ← دژایەتیی هەبوون دەگەڵ، پاشەکشە کردن لە.
سازگار کردن ← هاوئاهەنگ کردن.
سازمان ← تەنزیم.
٤١٧٢/ 6084- **سازمان دان، ڕێک و پێک کردن، ڕێکخستن:** هەفتەیەکت دەرفەت دەدەمێ بۆ ئەوەی ئەفرادەکەت ڕێک و پێک کەی، دوایەش چاوەڕوانی ئەوە دەبم کە کارەکان بێ گرێ و گۆڵ بچنە پێش.
← تەرتیب دان.
٤١٧٣/ 5827- **سازمان دان، ئامادە کردن، جێبەجێ کردن، تەرتیب دان:** جێگرێکی باشم دەوێ، ئەمنیش لە ماوەی شەش مانگاندا جێگاکەتان بۆ ئامادە دەکەم. * سەوداکەیان لەسەر میزی (مەشرووب) خواردنەوە لە هوتێل جێبەجێ کرد.
ساخ دەرچوون ← بە ساغی دەرچوون.
٤١٧٤/ 6314- **ساغ و سلامەت مانەوە، دەسەڵاتی خۆ پاراستن:** مامۆستای قوتابخانە دەبێ سەر زیندوو بێ، داهێنەر بێ بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو شاگردو قوتابییە لاوانە کۆنتڕۆڵ بکا.
سافکاری کردن ← چەکوچکاری کردن، لێک و لووس کردن.
٤١٧٥/ 4479- **ساف کردن، ڕێک و پێک کردن:** دەستی بە یەک دوو لیسپی ناڵۆز لە پرچی داهێناو ڕێک و پێکی کردن.
٤١٧٦/ 6032- **ساف کردن، لاچوونی چین و چرووک، گرژی، مۆنی:** لە پڕ دەم و چاوی گەڕایەوە سەر تافی لاوەتیی و، ئەو چین و چرووکانەی کە لە ترسان لە سەر دەم و چاوی پەیدا ببوون، نەمان.
٤١٧٧/ 3890- **ساف کردن، ڕێک و لووس کردن:** بە سماتەی/ بە کاغەزیەرداخی زۆرکەی بسوونەوە هەتا ساف و لووس دەبێ.
٤١٧٨/ 5484- **ساف کردن (بە سوونەوە)، لێک و لووس کردن:** دەرگاکان لە پێشدا بە توونە لێیدە، جا ئەوجار پێش ئەوەی ڕەنگی کەی زۆر باش (بە سوونەوە) سافیان کە/ لێک و لووسیان کە.
٤١٧٩/ 7476- **ساف کردن:** بۆ پیاسەیەکی کورت خایەن و خۆش چوومەدەر بۆ ئەوەی بۆ نانی نیوەڕۆیە ئیشتیای خۆم ساف کەم.
← ڕێک و لووس کردن.
٤١٨٠/ 6887- **سپاس کردن لە کەسێک بۆ کارێک، "تەشەکور" کردن لە:** پێم خۆشە بۆ ئەو یارمەتییەی کە لەکاتی تەنگانەدا بەمنتان کرد لە هەمووتان سپاس بکەم.
سپی کردن ← پاک کردن.
سپی هەڵگەڕان ← ڕەنگ پەڕین.
٤١٨١/ 1226- **ستاندارد زێڕ وەلانان:** کاتێک لە ساڵی ١٩٣١دا، بریتانیا زێڕی وەک پشتیوانەی دراوی کاغەز وەلانا، ئابووریی زۆر وڵاتی دیکەش کەوتنە ژێر تەنسیرەوە.
٤١٨٢/ 5972- **ستۆپ کردن (کتوپڕ)، ترموزگرتن (لەپڕ):** ژیلوان ڕاست ئەو کاتەی گەیشتە سەر پێچێکی توند لە جادەکە، ستۆپی کردو هەڵخلیسکا بۆ سەر ڕێگای ماشێنێک کە لەولاڕا دەهات.

٤١٨٢/ 1448 - **سەرکەوت کردن، پێش بە دەستی کەسێك گرتن، خۆخواردنەوە:** خۆ خواردنەوە، ئەویش بەم جۆرە، کارێکی باش نیە. ئەگەر بتوانن هێندە سەخت لە خۆتان نەگرن، باشتر دەبێ.

٤١٨٤/ 5897- **سروشتی کەسێك دەرخستن:** ئایا دەکرێ چاوەڕوانیی ئەوەمان لێی هەبێ ئەوەی دەربارەی خۆی راستە پێمان بڵێ، تەنانەت ئەگەر ئەو راستییە سروشتی راستەقینەی خۆی دەرخا کە ئینسانێکی فەقیرو دەستوپێ سپیلکەیە.

٤١٨٥/ 6264- **سروشتییە، مەنتقییە، دیارە کە...:** ئینسانێکی دڵناسکەو هێشتاش مێرمنداڵێکە. سروشتییە کە شێوە ڕەفتاری دواکەوتووانەی پێ قبووڵ ناکرێ.

سڕینەوە ← وشك کردنەوە.

٤١٨٦/ 1757- **سزادان، تەمبێ کردن:** منیش دەتوانم زیان بە خەڵك بگەیەنم. منیش دەتوانم زۆر کەسان سزا بدەم.
← مەحکووم کردن بە.

٤١٨٧/ 2438- **سزادران (سووك):** پارێزەرەکە گوتی: 'چونکە ئەوە یەکەم تاوانێتی، پێم وایە بە جەریمە کردنێك سزای بدەن.'

٤١٨٨/ 4488- **سزا کێشان بۆ:** جارجار بۆ ئەو هەڵانەی کردوونن، سزای قورست کێشاوە.

٤١٨٩/ 1689- **سزاواری ڕەفتارێکی باشتر بوون لە:** ئەو لە لایەن خاوەنکارەکانییەوە لەوە سزاوارتر بوو کە بە پارەمەتییەکی چەند پۆندی لە هەفتەدا تەقاعود بکرێ.

سزای خۆ دیتن ← بە سزای خۆ گەیشتن.

٤١٩٠/ 5936- **(دڵ) سست بوون:** بە راستی ئەوە ئەو کچە بوو کە ئەو دەیەویست شەوەکەی دەگەڵ رابوێرێ؟ دڵی کامران سست بوو. کچە یەکجار درێژو هەر نەبێ چاردە بەرد (١٨٢کیلۆ) وەزنی بوو.

٤١٩١/ 3858- **سستی بەسەر ...داهاتن:** پاش ساڵانێکی زۆر بە تواناوە هەڵسووران، ئەوەێك سستی بەسەرداهاتبوو.● کاتێك پێیان گوتن شکستمان خواردوە، بەراستی سست بووین.

٤١٩٢/ 3363- **سفارش دان، راسپاردە کردن:** لەبەر ئەوە کە جێبەجێ کردنی داخوازێك ماوەیەکی دەوێ، ئێوە دەبێ هەمیشە ماوەیەك پێشتر بۆ دابین کردنی پێویستییەکانی ئیدارەی خۆتان سفاریش بدەن/ راسپاردە بکەن.
← راسپاردە کردن بە پۆست دا.

سفرە راخستن ← تێکردن (ی چێشتو...).

٤١٩٣/ 3996- **سکاڵاکردن لە، شکایەت کردن لە:** دوای تەقینەوەکەی ئەم دواییانە، سکاڵایەکیان لە دژی کۆڕی بەڕێوەبەریی شەریکەی گاز نووسیوەو بە کەمتەرخەمی تاوانباریان کردوون.

٤١٩٤/ 1367- **سکاڵاکردن لە، ناڵاندن لەبەر:** شەوێك پێش ئەوەی کە ئەو ژنە تووشی راوەستانی دڵ بێ، لەوە دەیناڵاند/ سکاڵای دەکرد کە خواردەمەنی بۆ هەزم ناکرێ.

٤١٩٥/ 1366- **سکاڵاکردن لە دژی، شکایەت کردن لە، گلەیی کردن لە:** ئەگەر ئاغای پەرسون لە شتێك نارازی نەبێ، بێ هیچ ئەم لاو ئەو لایەك لە شتێکی دیکە شکایەتی هەیە (= هەرگیز بێ شکایەت نیە).

٤١٩٦/ 4386- **(لە یاری رەگبیدا)؛** سکرووم کردن (= ئەو کاتەی یاریزانەکانی هەر دوو لا لە دوو خەت دار بەرەورووی یەکتر رادەوەستنو سەریان دادەنوێنن.

٤١٩٧/ 5804- **سلامەت یان سەرزیندوو کردنەوە:** 'ئالێن دەڵێ هەوای دەریا ئەمن ساغو سلامەت تر دەکاتەوە، بەڵام ئەمن نازانم (وایە یان نا).

٤١٩٨/ 2975- **سلامەت/ توانایی رووحی/ کۆنترۆڵی خۆ لە دەست دان:** کاتێك سام هەواڵی مەرگی کورەکەی بیست، سلامەتیی رووحیی خۆی لە دەست دا.

٤١٩٩/ 1486- **سلامەتی بەدەنی یان رووحی لە دەست دان، وەڕە بوون:** ئەگەر چیا هەروا درێژە بە کار کردن بداو غەمی بۆ بخوا، درەنگ یان زوو سلامەتی بەدەنیو رووحی لەدەست دەدا.

٤٢٠٠/ 5292- **سلاوی ... گەیاندن بە:** سلاوی من بە هەموو ئەندامانی بنەماڵە بگەیەنن.

٤٢٠١/ 6985- **سلولی، ماڵگاز:** ئەگەر موتورێك سلولی/ ماڵگازی لەسەرێ یان لە خوارێ بێ دەبێ کاربراتۆرەکەی میزان کەن.

سلەمینەوە ← پێچەقاندن.

سنوور بۆ دانان ← بەرتەسك کردنەوە لە چوارچێوەیەکی دیاری کراودا.

٤٢٠٢/ 2782- **سنووری دەسەڵاتی خۆ بەزاندن، لە بەری خۆ زیاتر پێ راکێشان:** بە روونی دیار بوو کە ئاغای ... کاتێك دەستووری دابوو چرای شەقامەکان بگۆڕنو هی تازە دانێن، سنووری دەسەڵاتی خۆی بەزاندبوو.

٤٢٠٣/ 1858- **سنوورێك دیاری کردن بۆ:** ستیفان پێی خۆش بوو خۆی وەك پیاوێکی لە سەرخۆ بناسێنێ، بەڵام تازە

نەیدەویست جارێکی دیکە ڕێگا بدا ئەو ژنە مێردە بێنەوە ماڵێ. هەموو شتێك دەبێ سنوورێکی هەبێ.

٤٢٠٤/ 131- **سوڵاڵ پێچ کردن، دەپرسیاران گرتن، داڵسە بەبەر لافاوی پرسیاران:** کاتێك گەڕاوە ماڵێ، دایکو باوکی لە پێوەندی دەگەڵ وتووێژەکەی دا دایانە بەر لافاوی پرسیاران.

٤٢٠٥/ 867- **سواغ دران بە، داپۆشران لە:** کاتێك لە پێشبڕکێ گەڕایەوە، لە تەپڵی سەری هەتا بەری پێی بە قوڕێ سواخ درابوو.

٤٢٠٦/ 2622- **سوار بوون (ی ئەسپەو ...)، سوار کردن:** 'دەتوانی بۆ خۆت سوار بی، یان کۆمەکت بکەم؟' 'سپاس، بۆ خۆم سوار دەبم'.

٤٢٠٧/ 2542- **سوار بوون:** کاتێك پاسەکە لە بەردەرگای قوتابخانە ڕاوەستا پڕ بوو، منداڵەکانیش نەیانتوانی سوار بن.

٤٢٠٨/ 2736- **سوار بوون (ی فڕۆکە، کەشتی، قەتار):** کەشتییەکە دوای نیو سەعاتان وەڕێ دەکەوێ، کەوابوو واباشترە زووتر سوار بین.

٤٢٠٩/ 3929- **سوار کردن، خستنە سەر تەگەر (ی تۆپ بۆ ئامادە بوون):** بە سەربازەکانی فەرمان دا تۆپەکان سوار کەنو وەڕێکەون.

٤٢١٠/ 5063- **سوار کردن، مونتاژ کردن:** ئەو دەزگایەت بۆ خۆت لەبەر یەك هەڵوەشاندوە/ پیادەت کردووە، بۆ خۆشت سواری کەوە/ مونتاژی کەوە.

٤٢١١/ 5800- **سوار کردن (ی دەزگایەك)، دانان:** کامێراکەم لە پەلە سێپەرێکی دانا.

٤٢١٢/ 4550- **سوار کردن:** دەتوانی یەك دوو مایلان بە پێ یان بە ماشێنی بڕۆی هەتا دەگەیە سەر چوارڕێیانەکەو لەوێ پاسی قوتابخانە سوارت دەکا.

٤٢١٣/ 6602- **سوار کردن یان بوون، بارکردن، لێنان:** ناچار بوون ئەو بارانەی کە لە لیوڕپول لێیان دابوون دە دەریایەیان باوێژن.

٤٢١٤/ 1111- **سواری (کەشتی یان فڕۆکە) بوون:** بۆ هەڵفڕاندنی تەیارەکە بۆ سەنگاپوور، لە فڕۆکەخانەی بەیروت تاقمی فریاگوزار سوار بوون.

٤٢١٥/ 2871- **سواری (ئەسپ، وشتر و ...) بوون بە مەبەستی کەیف کردن:** منداڵەکان لە نومایشگاکە سواری هەموو شتێك ببوونو تازە پێیان زانیبوو پووڵی سواربوونی پاسیان پێ نەماوە.

٤٢١٦/ 6421- **(بە دزی، بە قاچاخی) سواری فڕۆکە یان کەشتی بوون:** لە تەمەنی شازدە ساڵیدا، بە قاچاخی سواری کەشتییەکی باری بوو کە دەچوو بۆ ئامریکا.

٤٢١٧/ 6717- **سواری کەشتی یان فڕۆکە کردن، لێنان، هەڵگرتن:** فڕۆکەوانەکە، کە هیچ کەسی دیکە سوار ناکا لەبەر ئەوەیە کە بەڕاستی بۆ هەڵگرتن باری قورسە.

سواری یەك کردن ← وەسڵ کردن.

٤٢١٨/ 1369- **سوپاس کردن لە:** بە بۆنەی ئەو جلکانەی کە بۆ دەستە خوشکەکانی (ئەدیبەکانی) بووکێ کڕیبوون سوپاسیان لە خاڵی هانت کرد.

٤٢١٩/ 821- **سووتاندن، سووتان و پێچکە لە قاپێرك لێ ئەملاندەوە:** لۆرییی سووتاو لەم بەرو ئەوبەری جاددەکە کەوتبوون.

سوجدە بردنە بەر ← سەر دانواندن لە بەرامبەر.

سورعەت دان بە ← خێراتر کردن.

سورعەت کەم کردنەوە ← سەبر کردنەوە.

سورعەت گرتن ← خێراتر ڕۆیشتن.

٤٢٢٠/ 6120- **سورعەت گرتن، خێراتر کردن:** ئێستا سیستەمێکی تازە هاتووە کە لێکۆڵینەوە لە بەشە جۆراوجۆرەکانی کارخانە خێراتر دەکا.

٤٢٢١/ 6013- **سورعەتی خۆ کەم کردنەوە، هێواش کردنەوە:** لە سەرەتادا ترند دەڕۆیشت، بەڵام، دوایە سورعەتی کەم کردەوەو هێنایە سەر خزینێکی بە ئارام.

٤٢٢٢/ 6919- **سورعەتی ... کەم کردنەوە، لەسەرەخۆ لێخوڕین یان ڕۆیشتن:** لە سەر ئەو پێچە تونداندە لەسەرەخۆ لێخوڕە - تایەرەکانی پشتەوەت هەڵدەخلیسکێن.

٤٢٢٣/ 5979- **سوزانی، سووزمانی (لەو کچە/ ژنەی کە هەرکەسەی دەگەڵ پیاوێك بکەوێو بیداتێ):** ڕەنگە پیاوی ئێستا لەسەر ئەوە پێداگرن کە دەبێ بووك بنی هەبێ، بەڵام، ئێستاش لە کچی سۆزانی/ سووزمانی دووری دەکەن.

٤٢٢٤/ 4228- **سولح کردن دەگەڵ:** دەوڵەتی هەڵبژێراو جێگای خۆی دا بە دەوڵەتی کاتی، کە حازر بوو بە هەر نرخێك دەگەڵ هێرشکەران سولح بکا.

٤٢٢٥/ 4818- **سمبە لێنان، شیشە لێنان، حەبل لێنان:** تفەنگ دەبێ هەموو جارێ بە فلانێل/ قوماشێکی لۆکە سومبەی لێ بدرێ.

٤٢٢٦/ 2370- **سۆن گرتن، غەیر گرتن:** لەو ئاوچانەی ئاوەکەیان قسڵی هەیە مەنجەڵو کەتری سۆن دەگرن.

٤٢٢٧/ 7338- **سووان:** پۆتینەکانت بدە بە پینەچی بزماری ئاسنت بۆ لێدا بۆ ئەوەی ئاوا زوو نەسوێن.

← شۆڕانەوە.

٤٢٢٨/ 7337- **سووڵاندن، لووس کردن:** باو بــاران لێــواری تیــژی ئەو رەوەزانەیان سوواندوە.

٤٢٢٩/ 816- **سووتان، سووتاندن:** ئــەمباری داری کــووران لــە ماوەی نیو سەعاتان دا بە تەواوی سووتا.

٤٢٣٠/ 819- **سووتان، لە کارکەوتن (ئامرازی کارەبایی):** زۆر لــەو دینە مریانەی دەسووتێن سیـپیچی دەکرێنەوە.

← ئاور گرتن بۆ، دڵ تۆقین بۆ.

٤٢٣١/ 818- **ســووتاندن و پــاك کردنــەوە:** رەنگــە کۆنەکــە بســووتێنن، کــرنو کاژێڵــە وردەکــان لەســـەر ئــامرازە تەختەیییەکان پڕ کەنەوەو بە سماتە باش لێــلەو لووســیان کەن.

٤٢٣٢/ 824- **ســووتاندن (وەك رەنگ لێکــردن، کردنــە خۆڵــەمێش):** خۆرشتەو سێرکەکانت سووتاندوەو کردووتن بە رەژی.

٤٢٣٣/ 827- **سووتاندن (وخــۆلــە دەستی ... رزگــار کــردن):** ئــەو خرتەو پرتانە دەسزیەکەی باویەو بیانســووریێنە.

← هەڵکردن.

٤٢٣٤/ 825- **سووتاندن و کوشتن، سووتان و مردن:** دوێنێ شەو، لــە رانیت بارێکدا کە هــەڵدێرا بــوو، ئــاوری گرتبــوو، ســێ کەس سووتان و مردن.

سووتان لە ئاواتی شتێکدا ← ئارەزووی شتێك کردن.

٤٢٣٥/ 828- **سووتان و لەنێوچوون (لە پەیوەندی لەگــەڵ لــەو شــتانەی دێنە نێو ئاتموسفێری گۆی زەوی):** کاتێك ئەستێرەیەك دێتــە نێــو ئاتموســفێری گــۆی زەوی دەســووتێ و خــەتێکی راســتەو نوورانی لە دوای خۆی بەجێ دێڵێ.

٤٢٣٦/ 820- **(لــە زاڵــەتی ئــەرزانیدا) ســووتەمەنی تــەواو کــردن:** کاتێك سووتەمەنیی راکێتێ یەکەم تــەواو بــوو، مووتــووری قۆناخی دووهەم هەڵدەبێ.

٤٢٣٧/ 6394- **سووتەمەنی تێکردن:** کارەکــەی ئەوەیــە کــە شەوانە چاو لــێ بکاو بزانــێ کــە مەنجەڵــەکانی هــەڵم سووتەمەنییان تێکراوە.

٤٢٣٨/ 4204- **سووتەمەنی تێکردن:** ســۆبەکە پێویســتی بــە نەفت/ سووتەمەنی هەیە؛ دەکووژێتەوە.

٤٢٣٩/ 5377- **سووڕان لە دەوری، گەڕان لە دەوری:** ماری لە مــاڵی خۆی بە دەر، دڵی بە هیچ خۆش نیە. هــەموو ژیــانی لــە دەوری مێردەکەی و منداڵەکانی دەگەڕێ.

٤٢٤٠/ 2941- **سووڕان، گەڕان، دەگێڕژەوە هاتن:** ئەوە ئەوێنــە کــە جیهان هەڵدەسووڕێنێ. * پــاش یــەك دوو پیــك ویســکی سەری دەگێژەوە هات. لە بیری نەبوو کە بە میعدەی خاڵی مەشرووبی دەخواتەوە. * پێــی وابــوو ســەری دەســووڕێ. بۆیە خۆی بە نزیکترین رێبوارەوە گرتەوە.

← دەور لێدان.

٤٢٤١/ 5984- **ســووڕاندن، وەرســووڕاندن:** وەرســـــووڕاندنی تۆیەکان و میزان کردنیان لەســەر هەدەفە تازەکــان وەختــی گرتم.

٤٢٤٢/ 7457- **ســووڕاندن و لــێ بەستن:** کاتێــك دەمەوێســت مرووەکە لە تەشییەك ببەستێ، بەنەکانی پساند.

٤٢٤٣/ -

ســـووڕانەوە ← دەور لێــدان، خولانــەوە، (بێکــار بێکــار) خولانەوە.

٤٢٤٤/ 1109- **سوور هەڵگەڕان، گەشانەوە:** خــانم مردیــــر بــە توورەیییەوە لە کوڕەی پرسی: "ئاوت چییــە؟". کــوڕەش کە لە شەرمان سوور هەڵگەڕابوو، وەڵامی دایەوە: "ئــەمن خانم؟".

٤٢٤٥/ 3924- **ســوور هەڵگــەڕان (ی دەمو چــاو لــە خۆشــیان، توورەیی ...) سوور بوونەوە:** بــە هــۆی هەمیــەجانێکی لەنــەکاو سوور هەڵگەڕابوو.

٤٢٤٦/ 1967- **سووکتر بــوون، سەرســووکتر بــوون، کــەم بوونــەوە:** ئێستا کارم زۆرە، بەڵام هەر کەمێك سەرم سووك بێ، دێم دەتبینم.

سوێ بۆ هاتنەوە ← ئیشتیا لــێبوون. (یەکجار زۆر).

سوێ چــوون ← ئیشــتیا لێبــوون (یــەکجار زۆر)، بێتــابی کردن.

٤٢٤٧/ 6549- **سوێند خواردن:** بە هــــەرچی پــاکە موقەدەســـە سوێندی خوارد کە لەو کاتەدا لە جێگایەکی دیکە بووە.

٤٢٤٨/ 6553- **سوێند خواردن:** بە هەرچی ئینجیلی ســەر ئــەم دنیایەیــە ســوێندی دەخــوارد کــە نەیویســتووە پــارەت لــێ بدزێ.

٤٢٤٩/ 345- **سوێند خواردن و بەڵێنی ...دان:** لــە بیرتــان نــەچێ، ســوێندتان خــوارد/ بــەڵێنتان دا هــەتا خــانی جۆنــز دەگەڕێتەوە بێدەنگ دابنیشن.

٤٢٥٠/ 6551- **ســوێندان، ئــەحلیف کــردن:** لــە رێوڕەســـی سوێندانی ئەندامێکی تازەدا، دەبێ هــەموو ئــەندامانی کۆمیتە لەوێ بن.

٤٢٥١/ 6555- **ســوێندانی کەســێك بــۆ پاراســتنی نهێنییــەك:** هەرکەس دەگەڵ نەخشەکە پێوەندی هەبوو ســوێندرا کــە نهێنییەکەی بپارێزێ.

سەبت کردن ← نووسین، نووسینەوە.

سەبر کردن ← دەست راگرتن.

٤٢٥٢/ 1963- سەبرگرتنەوە، سووعەت کەم کردنەوە: پردێکی باریکمان لە پێشە؛ بۆیە راباشترە سەبرتر برۆی/ لەسەرەخۆ لێی خوری/ سەبری کەیەوە.

٤٢٥٣/ 4989- سەبر کردنەوە: ئەو سەربازانەی کە دەبوو لە وشکانی دابەزن لە هێزی ئەلیکساندر لە ئیتالیایان هەڵگرتبوون. ئەوەش کارێك بوو کە بوو بە هۆی سەبر بوونەوەی عەمەلیاتی ئەو کابرایە/ بوو بە هۆی ئەوە کە عەمەلیاتی ئەو کابرایە وەك جاران بە خێرایی نەچێتە پێش.

سەح (صح) کردن ← تیك کردن.

٤٢٥٤/ 4667- سەخت کارکردن لەسەر: 'دەگەڵ زمانی فەرانسەکەت چۆنی؟'، 'زۆر سەخت خەریکیم = سەخت کاری لەسەر دەکەم'.

٤٢٥٥/ 7262- سەخت کارکردن لەسەر شتێك: لە پشوودانی ئاخری ئەم هەفتەدا ناتوانم وەدەر کەوم، چونکە شەش تاقیکاریم لە پێشە کە دەبێ سەخت کاریان لەسەر بکەم.

سەخڵەتکردن ← حەوسەڵەی کەسێك بردن، تووڕە کردن، نارەحەت کردن.

سەدەقەدان ← خێر کردن.

سەدەمە گەیاندن بە ← لێدان.

سەرباری کەسێك بوون ← لەسەر زگی خەڵك ژیان.

٤٢٥٦/ 3358- سەربرنە پێش، بەرەو لایەنێك چوون: بە بەرز بوونەوەی هەڵاو گرمە لە دەرەوەی هۆڵەکە، هەموومان سەرمان لە رتەبێژەکە بردبوو، پێشەوە هەڵمان دەدا لە قسەکانی بگەین.

٤٢٥٥-١/ 1616- سەد لێدان لەسەر: کاتێك لە زارکی دۆڵێك سەددێك لێدەدەن، ئەو ئاوەی کە لە پشت دیواری سەددەکە کۆ دەبێتەوە، دەبێتە دەریاچەیەکی دەستکرد.

سەر لێدەرهێنان ← پێزانین، تێگەیشتن.

سەرلێشێوان ← گێژ بوون، نارەحەت بوون.

٤٢٥٧/ 1558- سەربڕ لێدان: کاتێك گیا و گوڵ بەرەو وشك بوون دەڕۆیشت، منداڵەکان لە جیاتی ئەوە کە بە جادەی دابڕۆن، بە نێو مەزراکاندا سەربڕ لێیان دەدا.

سەربەردان ← ڕاێشتن.

سەربە ... بوون ← بەشێك بوون لە.

سەربەرز کردنەوە (دوای وێران بوون) ← دروست کرانەوە.

٤٢٥٨/ 1407- سەربە .. بوون، لەنێوانی .. بوون: "ببوورە، کاکە، ئەری ئەتۆ سەر بەو سووکە نی کە تازە هاتووە؟"....

٤٢٥٩/ 4014- سەربەرزانەوە، چاو لە خوار کردن: ماری لە شەرمان سەری بەرداوە. ئەری ئەو کابرایە پڕرووییە کەنگێ دەست لە قسەکردن دەگەڵ ئەو کچە هەڵدەگرێ.

٤٢٦٠/ 7041- سەربەرزکردنەوە، بەرزبوونەوە: لەسەر ماڵو دووکانەکانی مۆدێلی سەردەمی ویکتوریا خانووسەرە غوولپەیکەرەکانی ئیداران سەریان بەرز کردبووە.

سەر بێرەو بەرێداکردن ← هاتووچوو کردن.

سەرپۆش لەسەردانان ← شاردنەوە، داپۆشین، نهێنی راگرتن، سەرکوتکردن.

سەرپۆش لەسەرهەڵدانەوە ← ئاشکرا کردن.

٤٢٦١/ 6659- سەرپەرستی، پالن سەرپەرشتی کردن: 'بۆ ناچی قوتابخانەیەکی باش؟'، 'ئەمن هەرگیز نەچوومە قوتابخانەی، ئەتۆ دەبێ سەرپەرشتی بکرێی'.

سەرپێچی کردن لە ← دژایەتی کردن دەگەڵ.

٤٢٦٢/ 4427- سەرچاوەگرتن، ئێنەبوون: ئاتوانم پێم وانەبێ کە دەست ناواڵە بوونەکەی لە هەستێکی سەرپەرست بوونەوە سەرچاوە دەگرێ.

٤٢٦٣/ 4756- سەرچاوەگرتن لە: لەو هەڵە چکۆڵەیەوە زۆر دردۆنگیی زیانبار سەرچاوەیان گرتووە.

٤٢٦٤/ 1994- سەرچاوە گرتن لە: هێزو دەسەڵاتی کۆنگرەی یەکێتییە کرێکارییەکان لە پشتیوانیی میلیونها کەس لە کرێکارانەوە سەرچاوە دەگرێ.

٤٢٦٥/ 3068- سەرچاوە گرتن لە: پیلانی کوشتنی سەرۆك کۆمار لە خۆپەرستیی لە رادە بەدەری چەند کەس لە سەرهەنگەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو.

٤٢٦٦/ 3061- سەرچاوە گرتن لە، هاتن لە ...وە: کەشتی خۆش ویستنی ئەو کوڕە لە باوکییەوە سەرچاوە دەگرێ کە هەمیشە ئارەزووی دەکرد دەریانەوەردی بکا.

٤٢٦٧/ 6336- سەرچاوەگرتن لە، ریشە ... گەڕانەوە بۆ: ئەو شەپۆلە تازەی مانگرتنان لە هەبوونی ئارەزایی لە نێو ئەو کەسانەوە سەرچاوەی گرتووە کە حەقدەستیان لە خوارێیە.

٤٢٦٨/ 6169- سەرچاوەگرتن لە: ئەو شێوە لە تەداخول کردنەکەی لەو راستییەوە سەرچاوە دەگرێ کە پێی خۆشە کچەکانی بە ئاسوودەیییەوە مێردی بکەن.

٤٢٦٩/ 116- **سەرچاوەگرتن لە:** زیانی ئەو شۆکەتە لەم ساڵەدا دەگرێ بڵێین بە تەواوی لە ماڵیاتی تازەوە سەرچاوەی گرتووە.

سەرخستنە سەر ← گاڵتە پێکردن.

٤٢٧٠/ 3812- **سەرخوارکردنەوە، هێنانە پێش:** پۆژ؟ سەری هێنا پێشەو شتێکی بە گرێچکەی چیا داچرپاند.

٤٢٧١/ 3422- **سەرخۆش بوون، سەرمەست بوون، مەستی کردن بە:** کاتێک تام بیستی کە سەرەنجام لە زانستگە دانشنامەی وەرگرتووەو لەمەودوا دەتوانێ لەباری ماڵییەوە لەسەر پێی خۆی راوەستێ، لە خۆشیان سەرمەست ببوو.

← مەست بوون، مەستی کردن.

٤٢٧٢/ 4024- **سەردان لە، سەرهەڵێنان لە:** دەبێ لەسەر رێگای گەڕانەوە بۆ ماڵێ سەرێک لە گاراژ (تەعمیرگا) بدەمەو بۆ ماشێنەکەم نۆبە بگرمەوە.

← هاتن، بازرەسی کردن.

٤٢٧٣/ 6395- **سەردانواندن بۆ:** بۆ ئەوەی کارەکەی بچێتە پێش ، لە بەرامبەر هەموو شتێکدا سەر دادەنوێنێ.

← تەمکین کردن لە بەرامبەر ...دا.

٤٢٧٤/ 2960- **سەردان لە، چوون بۆ:** پیرێژنەکە هەموو رۆژێ بۆ فرۆشتنی هێلکەکان دەچوو بۆ بازار.

← چوونە سەردانی کەسێک.

٤٢٧٥/ 3716- **سەرداوانەدن لە بەرامبەر کەسێکدا، سوجدە بردنەبەر، کڕنۆش کردن لە بەرامبەر، لاسە لاسە لەبەر کردن:** کرێکارانی کانگا ژێرزەوییەکانی بریتانیا لەو جۆرە پیاوانە نین کە لە بەرامبەر کاربەدەستانی دەوڵەتدا کرنۆش بەرن. ئەوان سەبارەت بە کارەکەیان بە خۆیان شانازی دەکەن. ● ئەو وەک خاوەن کەشتییەک رەنگە پووڵو پارەیەکی زۆری وەسەر یەک نابێ، بەڵام، ئەمە بەو مانایە نیە کە دەبێ خەڵک کرنۆشی بۆ بکەن.

٤٢٧٦/ 7415- **سەرەدەرهێنان لە، کاری کەسێک، کێشانە** ...: زۆر دەم لە کاروباری مەن وەرمەدە، دەنا کارت دەکێشێتە نەخۆشخانەی (واتە لێت دەدەمو بریندارت دەکەمو ناچار دەبی بچی بۆ نەخۆشخانە. -وەرگێر).

٤٢٧٧/ 3811- **سەرەدەرهێنان (لە پەنجەرە)و خۆ خوارکردنەوە:** لە موسافیرە بەرێزەکان داوا دەکەین سەر لە پەنجەرەی قەتار مەهێننە دەر.

← قووتبوونەوە.

٤٢٧٨/ 2009- **سەرەدەرهێنان لە، گەیشتنە:** رێچکەکە وردە وردە کوێر دەبۆوە هەتا دەگەیشتە زەلێنێک کە کەس لێی دەرنەدەچوو.

٤٢٧٩/ 7461- **سەردەرهێنان لە (کاری) کەسێک:** لەو ماوە دووردرێژەی دا کە دەگەڵ مارتین ناشنایەتیم هەبووە، هەرگیز نەمتوانیوە سەر لە کاری دەربێنم.

سەردەرهێنان لە ← هاتنە خوار لەسەر، بوون بە، گەڕانەوە بۆ، تێگەیشتن، تێگەیشتن لە، قووت بوونەوە، حاڵی بوون لە کەسێک.

سەردێرەودەوێ راکردن ← خۆ دەکاری کەسێک هەڵقورتاندن.

٤٢٨٠/ 5568- **سەرپێژ کردن، لێبزاوان:** واباشە بچی لوولەکێش بێنی‌ئەنباراوەکە سەرڕێژ دەکا.

٤٢٨١/ 4655- **سەرزارەکی باس کردن، کایە پێکردن:** زۆر جاران سەرزارەکیی باسی کۆچ کردن بۆ کانادای هێناوەتە گۆڕێ، بەڵام بێجگە لە خەیاڵ پڵاو شتێکی دیکە نەبووە.

٤٢٨٢/ 360- **سەرزەمەهاتن، لەنەکاو هاتن:** بارانەکان دەستیان پێ کردو هەوای سارد لێوارەکانی ئوقیانووسی ئەتڵەسی داگرت. هێشتا لە بەرێوەبردنی رێوڕەسمی جێژنەکانی لە دایک بوون خەڵاسیمان نەهاتبوو کە کریسمس گەیشتن/ لەنەکاو هات.

٤٢٨٣/ 1900- **سەرزەنشت کردن، سەرکۆنە کردن، رەخنەگرتن:** هەستاو لەسەر کابرای راوەستا، هەروەک کاریکاتێری ژنە شیرکەرێک دەستی دەنێو قەدی نابوو و هەروەک تۆ بڵێی دەیەوێ یەکێک سەرکۆنە بکا.

← سەرکۆنە کردن، رەخنەگرتن لە، لۆمە کردن.

٤٢٨٤/ 7090- **سەرسم خواردن، دەشتێک هەڵنگوتن:** لە تاریکایی سینەمادا لاقی دەلاقی کابرایەک هەڵنگوتو هێندەی نەمابوو بکەوێ.

← تێهەڵنگوتن.

٤٢٨٥/ 4252- **سەرسوورمان:** لە سەدا نەوەدو هەشت (لەو خەڵکە) سەریان سوور دەمێنێ لە وردبینی ئێمە کە توانیومانە دەستخەتەکانیان بناسینەوە.

← حەپسان.

سەر سووکتر بوون ← سووکتر بوون.

سەرسەری ← شەرانی.

سەرسەری بوون ← لەم گوێیە وەرگرتن و لەو گوێیە دەرکردن.

٤٢٨٦/ 3285- **سەرسەختانە بەرگری (موقاوەمەت) کردن:** لە ڕوانگەی نیزامییەوە، موقاوەمەت لە باکووری ئەفریقا، ئەویش لە کاتێکدا کە خەتی مارس تێک شکابوو، هەرگیز ناتوانێ پاساو بدرێ. ● بەرگریی سەرسەختانەی هێزێکی ئاوا چکۆلە لە بەرامبەر ئەو هەموو مەشکیلاتەدا، بێگومان نیشانەی ئەوپەری ئازایەتییە.

٤٢٨٧/ 3807- **سەرسەری چاو لێکردن، چاوێک پێداخشاندن، هەڵدانەوە(ی کتێبێ ...):** ناتوانم بڵێم کە ئەسڵەن ئەو وتارەم خوێندۆتەوە. تەنیا چاوێکم پێدا خشاندوە. ● مارس، لە حاڵێکدا چاوەڕوانی تاکسی بوو، گۆڤاری کۆنی هەڵدەدایەوە و چاوی پێدادەخشاندن.

٤٢٨٨/ 7044- **سەرسەری گرتن، جیددی نەگرتن:** ئەو دەمی هێشتا دەیتوانی بچێ بۆ ئوسترالیا. ئەوە مەسەلەیەک بوو کە هەمیشە سەرسەری دەیگرت و هیچ کاتێک هەنگاوێکی باشی بۆ هەڵنەدەهێنایەوە.

٤٢٨٩/ 4954- **سەرف کردن، تەرخان کردن بۆ:** ئەخشەدارشتنێکی دوور و درێژ و زۆر ورد سەرفی ئەوە کرا کە ڕۆژەکە بکەینە ڕۆژی سەرکەوتن.

٤٢٩٠/ 4522- **سەرکوت کردن:** ئەنگیزەکانی بە توندی کرنترۆڵ و ئیحساساتەکەی سەرکوت کراوە.

٤٢٩١/ 571- **سەرکوت کردن، سەرپۆش لەسەر دانان، سەرکوێر کردنەوە، پێشی پێگرتن ... گرتن:** زۆر باشترە جاروبار تووڕەیی خۆت بڕێژی، نەک هەر سەرپۆشی لەسەر دانێی/ دەری نەبڕی و سەرەنجام تووشی تەقینەوەیەکی یەکجار گەورە بی.

٤٢٩٢/ 3295- **سەرکوت کردن، خستنە ژێر گوشارەوە، گوشار بۆ هێنان:** پەنابردن بۆ بەوریاوەری (پەناو) نیشتمانپەروەرانە، هێندێک ئەنگیزەی ئابووریە، لە هەر جێگایەک پێویست بێ، زەبر و زەنگ، ئەو وڵاتەی خستۆتە ژێر گوشارەوە.

٤٢٩٣/ 3270- **سەرکوت کردن، خستنە ژێر گوشارەوە:** تاقمێکی چکۆلە لە بەکرێگیراوان هەتا کەنگێ دەتوانن هەموو ئەو خەڵکە بخاتە ژێر گوشارەوە؟

٤٢٩٤/ 3041- **سەرکوت کردن:** لە سەدەی شازدەهەمدا هێرشکەرانی ئورووپایی سوورپێستەکانی ئەمریکایان بێڕەحمانە سەرکوت کرد و دەستیان کرد بە چەوساندنەوەیان.

٤٢٩٥/ 6984- **سەرکۆنە کردن، سەرزەنش کردن، لۆمە کردن:** ئەگەر ئەو جارە لە ڕادە بەدەر توند ڕۆیشتبام، حازر بووم بانگم کەن و سەرکۆنەم کەن.

٤٢٩٦/ 5320- **سەرکۆنە کردن (بە هۆی):** ئەو ژنە هیچ و پووچ یان قین لە زگ نیە، هەر ناکرێ بەم تاوانانە سەرکۆنە بکرێ.

سەرکۆنە کردن ← لۆمە کردن، ڕەخنە گرتن، سەرزەنیشت کردن، بەچاودادانەوە، ڕەخنەگرتن لە.

٤٢٩٧/ 3846- **سەرکۆنە کردن، مەوعیزە بۆ کردن:** 'قسەم دەگەڵ ناکا. مەوعیزەم بۆ دەکا'.!

٤٢٩٨/ 5150- **سەرکۆنە کردن (بە نووسراوە)، ئەمویخ کردن:** ڕاپۆرتەکەم لە هێندێک جێگا کەمێ کورتیی هەبوو، ئەویش زۆر بە جێ سەرکۆنەی کردم.

٤٢٩٩/ 6856- **سەرکۆنە کردن:** لەمێژە دەگەڵ سەرۆکی ئیدارە کار دەکەی. هەتا ئێستا سەرکۆنەی نەکردووی، کردووی؟.

٤٣٠٠/ 1158- **سەرکۆنە کردن، (زۆر بە توندی) ڕەخنە لێگرتن (زۆرتریش بە هەڕەشە):** ئەگەر بێتوو کەسێک بە باشی فەرمانی بەڕێوە نەبردبا، سەرگرووپان (ڕئیس عرفا) بەسەری دادەڕووخا/ بە توندی سەرکۆنەی دەکرد.

٤٣٠١/ 1222- **سەرکەوتن:** گەڵاڵەیەکی باش بوو هێندەی نەمابوو سەرکەوێ.

٤٣٠٢/ 80- **سەرکەوتن، پێشکەوتن، بە جێگایەک گەیشتن، (لە ڕێگادا):** جیمی نازانی لە کۆنگرەدا چ دەکا؟ هیچ کارێکی ناکا و هەرگیز بە هیچ ناگا.

٤٣٠٣/ 7279- **(بە هاسانی) سەرکەوتن، بردنەوە:** زۆر خراپ بوو دۆڕاندیان، دەبوو زۆر بە هاسانی بیانبردباوە.

٤٣٠٤/ 7395- **سەرکەوتن، سەرکەوتوو هاتنەدەر:** ئەو بە دڵێکی پاکەوە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی خۆی دەست بە کار بوو، بە یارمەتیی ئەو، ئێمە سەرکەوتین.

٤٣٠٥/ 7291- **سەرکەوتن (سووک و هاسان):** ئەمجارە سەرکەوتن بە هاسانی وەدەست نایە. قارەمانەکە ململانێیەکی دژواری لە پێشە.

٤٣٠٦/ 5426- **سەرکەوتن، پێشڕەفت کردن، پێشکەوتن وەدەست هێنان:** کابرای ئەفسەری پۆلیس دەیگوت کە لە پێشدا ئەندازیاری کارەبا بووە، بەڵام تێگەیشتن لەو مەسەلەیە کە بە لەبەرچاوگرتنی پێوانە و پێوەرەکانی ناوچەیی، ڕوونکردنەوەی ئەوە کە ئایا لەو کارەدا سەرکەوتبوو یان تێشکابوو، هاسان نەبوو.

٤٣٠٧/ 4802- **سەرکەوتن (لە ...دا):** 'بردمانەوە، سەرکەوتین، بردمانەوە.'

٤٣٠٨/ 2595- **سەرکەوتن، تێپەڕین لە:** لە تاقیکاری کەتبیدا سەرکەوتم، بەڵام لە ''شفاهی'' دەرنەچووم.

← قبوڵ بوون.

٤٢٠٩/ 1274- **سەرکەوتن، وەسەر هەمووان کەوتن:** وەك خاوەن کارخانەیەك، لە سەرەتادا گەورگرفتێکی زۆری بۆ هاتە پێش بەڵام، ئاخرییەکەی وەسەر هەموویان کەوت.

← سەرێك لە نێو سەران دەرهێنان.

٤٢١٠/ 7093- **سەرکەوتن بەسەر ...دا، فەلەستەن، تێپەڕ کەلاندن:** ئەو خەڵکە شەر لێدراوە بەسەر هەر کارێکدا دوژمن لە دژی کردبوون سەرکەوتبوون.

٤٢١١/ 4160- **سەرکەوتن بەسەر...دا:** (لە پێشبڕکێی ئەسپ سواریدا): ئەو کچە دور لێدەداتەوەو بەسەر ئەو پەرژینەشدا باز دەدا؛ دیارە بە هاسانی سەردەکەوێ.

٤٢١٢/ 693- **سەرکەوتن لە ...دا:** ئەگەر بە دڵەوە هاوکاریمان کردبا، قسەی خۆمان بێ، لە کودیتایەکی راستەقینەدا سەردەکەوتین.

٤٢١٣/ 4926- **سەرکەوتن لە هەڵبژاردندا:** لە ئاخرین هەڵبژاردنی گشتیدا، حیزبی کرێکار بە زۆربایەتییەکی گەورەوە سەرکەوت.

٤٢١٤/ 4165- **سەرکەوتن وەدەست هێنان لە ...دا:** پارەکە ئەو کارەیان دایەو لەو کاتەوە هەتا ئێستا سەرکەوتنێکی زۆری تێدا وەدەست هێناوە.

٤٢١٥/ 5786- **سەرکەوتنەکانی خۆ مسۆگەر کردن:** ئەگەر پیاوێك ئەتۆ بەرازێ، دژوارە بتوانم وەك هاوڵاتییەکی ساکار چاوی لێبکەم. ئەو ئیدی سەرکەوتنەکانی خۆی مسۆگەر دەکا.

٤٢١٦/ 1318- **سەرکەوتنێکی ئەوتۆ وەدەست لەهێنان:** وەك هونەرمەندێك ناتوانی سەرکەوتنێکی ئەوتۆ وەدەست بێنێ.

٤٢١٧/ 4863- **سەرکەوتنێکی زۆر هاسان:** پێشبڕکێی رۆژی شەممۆ بۆ تیمی لیدز سەرکەوتنێکی زۆر هاسان دەبێ؛ ئەوان (تیمەکەی دیکە) لە دەستەی چوارەمی یانەکاندا یاری دەکەن.

٤٢١٨/ 5789- **سەرکەوتنێکی یەکجار بەرچاو وەدەست هێنان، شۆڕەو زۆرێکی یەکجار زۆر وەرنەستن:** 'چاو لە جیفری لاوکە، هەرگیز پێت وانەبوو لەو جۆرە کوڕانەیە کە بتوانێ سەرکەوتنێکی بەرچاو وەدەست بێنێ، وانیە؟

٤٢١٩/ 1326- **سەرکەوتووانە تەواو بوون، گەیشتنە ئاکامێکی سەرکەوتووانە:** ئەو تونێژانەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی شیلات (شەریکەی ماسی) لەگۆڕێدا بوو بە ئاکامێکی سەرکەوتووانە نەگەیشت.

سەرکەوتوو بوون ← لە بەرامبەر تەماشاچییاندا سەرکەوتوو بوون.

٤٢٢٠/ 3011- **سەرکەوتوو بوون (بە تەواوی)، یەکجار خۆش بوون:** فیستیڤاڵی موسیقای پاپ لە ... بە تەواوی سەرکەوتووبوو. • کاتێك سەعاتی ٩ گەیشتینە جێ، میوانییەکە دەستی پێ کردبوو، یەکجار خۆش بوو.

٤٢٢١/ 3668- **(لە بەرامبەر تەماشاچییاندا) سەرکەوتوو بوون:** ئەگەر تەماشاچییەکان دژکردەوەیەکی باش لە خۆیان نیشان دەن، ئەوە "خەڵکن"و، ئەگەر دژکردەوەیەکی جوان لە خۆیان نیشان نەدەن، ئەوە دەبنە "ئەوان"و ئەگەر ئەو بەرنامەیەش نەتوانێ (لە بەرامبەر تەماشاچییەکان)دا سەرکەوتوو بێ، قوڕیان بە دەمی!

٤٢٢٢/ 4493- **سەرکەوتوو بوون، ئاکامێکی باش بە دەستەوەدان، ئاکامێکی باش بە دواوە بوون:** جاروبار، پشکنین ئاکامێکی باشی بە دواوە دەبێ، ئەویش هەیە جارێکەکە لە رەچێ نانو دەستگیرکردن بەسەر پیاوی دادێ.

سەرکەتوو هاتنەدەر ← سەرکەوتن.

سەرکێشی کردن ← سەرلێدان.

سەرگرتن ← بەڕێوە چوون.

سەرگەردان بوون ← خوولانەوە.

٤٢٢٣/ 4289- **سەرگەردان بوون، خوولانەوە:** ناتوانێ فکرو بیری ئەو کچە لەسەر ئەو کوڕە کەڵەی وەلابەرێ؟ سەرانسەری رۆژەکانی ئاخری هەفتە لێرە سەرگەردان بووە.

٤٢٢٤/ 7300- **سەرگەردان بوون، ئاوارە بوون، بەرەڵا بوون:** ئەمن بروم کە دیتم کوڕە چکۆلەکەت لە پشت حەشیمەتەکە سەرگەردانەو بردم بۆ پاسگای پۆلیس.

٤٢٢٥/ 4308- **سەرگەردان کردن، هەڵاڵ کردن، دەست تێوەردان:** چەندین رۆژە ئەو دەڵاڵە سەرگەردانی کردووم. هیچ هومێدێکم نیە بتوانم وڵامێکی باشم بداتەوە.) • دەست دەو تەسجیلە ستریۆیە وەرمەدە؛ تازە ٢٠ پۆندم لە تەعمیر کردنەکەی داوە.

سەرگەرم بوون دەگەڵ ← کایە کردن بە.

٤٢٢٦/ 7- **سەرگەرمی شتێك بوون:** منداڵەکان وەها سەرگەرمی کایە بوون کە ناگایان لە وەخت بڕابوو.

← کار کردن (زۆر بە توندی).

٤٢٢٧/ 3318- **(بە تەواوی) سەرگەرمی کار بوون:** کارخانەکە، کە بە شێوەیەکی زانستیو ساکار دروست کرابوو، بە جوانی کاری دەکرد.

/٨٣٢٨ 2017- سەرکەوتی کارێک بوون، خەریکی کارێک بوون: ئەو پیاوانە زۆر سەیر دێنو دەچن. لە ژێرەوە خەریکی کارێکن.

/٨٣٢٩ 216- سەر لە ... دان، بۆ دیتنی کەسێک چوون، هاتن: بەڵێ، ئەوپەرەکەی هەتا سەعاتی ٩ دێم (= سەرت لێدەدەم).

/٨٣٣٠ 3841- سەر لەسەر هەڵگرتنو بەجێ هێشتن: سەری لەسەر هەڵگرتەو بەجێ هێشتین، بۆی گرنگ نەبوو کارەکەی چۆن تەواو دەبێ، بەڵکوو بۆ ئەو وەختەی بەڵێنیان دابوو تەواو بێ.

/٨٣٣١ 868- سەر لە کەسێک دان (بۆ بەلەس کردن دەرباوەی ...): خانم، ببوورن، سەرۆکی ئیدارەکەمان ناردوومی سەبارەت بە قەرزە دواکەوتووەکان سەرتان لێبدەم.

/٨٣٣٢ 1278- سەر لە کەسێک دان، سەرهەڵێنان لە کەسێک، چوون بۆ دیتنی کەسێک _زیاتر لە رێگای دوورەوە): ئەگەر بتوانی ئیجازە وەرگری، لە پشوودانی ئاخری حەوتوودا سەرێکمان لێبدە/ سەرێکمان لێ‌هەڵێنە.

/٨٣٣٣ 4695- سەر لە کەسێک دان پسان هەڵێنان: ئەمشەو کۆبوونەوە هەیەو، منیش لە فکری ئەوە دابووم کە بۆ ئیو سەعاتێک سەرێکت بدەم/ لێهەڵێنم.

← چوونە سەردانی کەسێک.

/٨٣٣٤ 217- سەر لە سەر کەسێک هەڵشەکاندن، پرتەو بۆڵە کردن بەسەرداکردن، لێ‌هەڵپەڕان: ئەمەو، چاوت لێیە، دیسان تێی هەڵپێچاوم!

سەرلە مەبلەغێک دان ← هەڵگرتن.

/٨٣٣٥ 1956- سەر لەنوێ بانگ کرانەوە بۆ خزمەت: ئەوانەی سەر لە نوێ بۆ خزمەت بانگ دەکرێنەوە، ئەو کەسانەن کە تازە لە نەخۆشیی هەستاونەتەوە، منداڵن کە لە ژێر بۆمبارانەدا خۆ راناگرن.

/٨٣٣٦ 1135- سەرلە نوێ بوونەوە پساو، رەواج پەیدا کردنەوە: لە مێژەو داوێنی درێژ باویان نەمابوو، بەڵام وادیارە ئەمساڵ دەبنەوە مۆد.

/٨٣٣٧ 2654- سەرلە نوێ کەلک لێوەرگرتن، وەگەر خستنەوە: بۆ ئەوەی بتوانم سەر لە نوێ قاچەکانم وەگەر خەمەوە (= قاچەکانم چاک بنەوە) دەکتوورەکان هیچیان لە دەست نەهات.

/٨٣٣٨ 1934- سەر لێنان (لە ئەنگاو)، سەر لێهەڵێنان: وەختەو بۆ وەخت بۆ دانیشتن سەرێکمان لێ‌هەڵدێنین.

/٨٣٣٩ 6400- سەر لێنان، سەر لێهەڵێنان: داوای لێبوردنیکەوە لە کەرانەوەدا سەرێکمان لێهەڵێنیو هەمەوو شتەکان باس بکا.

/٨٣٤٠ 4023- سەر لێنان، سەر لێهەڵێنان: دەبێ سەفەرێک بۆ وڵاتانی رۆخی دەریای سپی بکەم کە سەربازانی بریتانیا لەوێ دامەزراون. هەروەها سەرێکیش لە ئۆردۆن بدەم. * پێم وایە ئەگەر دوکتور وەختی هەبێ، سەرێکمان لێبدا.

/٨٣٤١ 871- سەر لێنان (لە کەسێک بۆ قسەیێک): داخوا سەعاتی ٥ی دوای نیوەڕۆ لە ماڵ دەبێ؟ ئەگەر لە ماڵێ بێ‌و ئیشکالی نەبێ، سەرێکت لێدەدەمو مشارەکەو ئامرازەکانی دیکە دەگەڵ خۆم دەبەم.

/٨٣٤٢ 883- سەرلێنان (زۆرتر بۆ کاری بازرگانی پسان ئیداری): لە هەفتەی داهاتوودا، نوێنەرەکەمان سەرتان لێدەدا/ دێتە لاتان.

/٨٣٤٣ 892- سەرلێنان، سەرهەڵێنان لە: ئەگەر وەختت هەبوو، سەرێکمان لێ‌هەڵێنە/ بدە! زۆربەی شەوەکان لە ماڵین.

/٨٣٤٤ 2945- سەر لێنان، سەردان لە ...: با بچین سەرێک لە ماری بدەین. ئەو هەمیشە بۆ قسەوباسان ئامادەیە.

/٨٣٤٥ -

/٨٣٤٦ 2355- سەرما بردن (وەرزی) هەموو مالات تووشی کزێوە بوونو هەموو سەرما بردنی.

/٨٣٤٧ 4661- سەرمایە گوزاریی دووبارە (ی سوودی وەدەست کەوتوو): دەبێ نرخی بەهرەی سەرمایەگوزاریی دووبارە بەرینە سەرو، ئەو پوولانەی بەم جۆرە کۆدەبنەوە بکەینە خەرجی تازەکردنەوەو پەرەپێدان.

/٨٣٤٨ 7002- سەرمایەگوزاری کردن لە، تەکلەیبی هێنیشتن: هەموو پوولو پارەکەت دەکاسپییەکی بارێزی کارێکی ژیرانە نیە./ کارێکی ناقڵانە نیە، ئەگەر هەموو پوولو پارەکەت لە شتێکدا سەرمایەگوزاری بکەی.

/٨٣٤٩ 3438- سەرمایەگوزاری کردن لە ...دا: لە هەرشتێکدا سەرمایەگوزاری دەکەی، بە گشتی پێوەندی بە نیازی خۆتەوە هەیە- واتە ئێوە دەتانەوێ رادەی داهاتتان بەرنە سەر یان سەرمایەکەتان زیاد بکەن.

سەرمەست بوون ← سەرخۆش بوون.

سەرنجدان بە ← ورد بوونەوە لە، گوێ دان بە.

سەرنج راکێش بوون بۆ ← جالب بوون بۆ.

سەرو بن کردن ← سەنگو سووژن دان.

٨٢٥٠/ 4938- **سەروسامان دان بە:** لە حـاڵی حـازردا (١٩٥٨) ناتۆ وەزعێکـی تێکـەڵی هەیـەو، هـەتا هەلومەرجەکـە باشە، دەبێ سـەروسـامانێك بە وەزعی بدا.
← شکڵ پێدان، ڕێکوپێك کردن.
سەرو سوراغێك نەبوون لە ← شـوێنەوارێك دیـار نـەبوون لە.

٨٢٥١/ 7077- **سەروکلر هەبوون لەگەڵ، بەسی ... کردن:** دەهەمین جلدی ئەو کتێبانـە باسـی ئـاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتی‌یـەکانی نێوان ئەو دوو شەڕە دەکا.

٨٢٥٢/ 4729- **سەرلێکیەتی کۆبوونەوەیەك وەئەستۆ گرتـن، سـەرۆکی کۆبوونەوان بوون:** سیاسـەتمدارێکی یەکجار لێهاتوو بـوو کـە لە ڕێوڕەسمەکانی میوانداری لە شەخسییەتە بیانی‌یەکاندا دەبـوو بـە سـەرۆکی کۆبوونـەوەکانو وەك شـازادان میوانەکانی سەرگەرم دەکرد.

٨٢٥٣/ 5215- **سەروکەللە لێدان لەگەڵ، چارە کردن:** کـاتێك پیـاو هـەموو ئـەو نارەحەتی‌یـە چکۆلانـەو کـەمو کوورییانـە دێنێتە بەرچاو کە ناچار بـوون سـەروکەللەیان دەگـەڵ لێ دەن،پیاو سەری سوور دەمێنێ کە چۆن توانیویانـە هـەروا ڕووخۆشو قسە خۆش بێننەوە.

٨٢٥٤/ 4699- **سـەروکەللەی کەسـێك پەیدا بـوون، وەدەرکـەوتن، قووت بوونەوە:** ژیلـران بـەك سـاڵی ئـەولو بـێ سـەروشـوێن بوو، لە پڕ زیاد لە هەموو جێگایـەك سـەروکەللەی لـە بۆلیوی وەدەرکەوت.
← هاتن.

٨٢٥٥/ 6220- **سەرو گـەردنێك بـەرزتر بـوون، کارلێهاتووتر بـوون، کارامەتر بوون:** دیارە کـە ناچـار بوویـن دەگـەڵ ئـەو کچـە وتووێژ بکەین. بـە پێـی دەوسـییەکە سـەروگەردنێك لـە هەموو خوازیارەکان بەرزترە.
سەر وەرگێران ← ڕوو وەرگێران.

٨٢٥٦/ 1335 —**سەر وەدەرنـان لـە گـەڵ، شین بـوون:** سـێ هەفتـە لەمەو پێش کـەمێکم لووبیـا چـاند، بـەڵام هێشـتا شـین نەبوون.

٨٢٥٧/ 4541- **سەرهاویشتنە سەر:** گوێی نەدا بە پاڕانـەوەکانی ژنەکـەی کـە داوای دەکـرد چیـدی سـەر نەخاتـە سـەر کچەکەی،و، دەستی بـەرز کـردەوە کـە مسـتێکی لێـداو بێدەنگی کا.

٨٢٥٨/ 6747- **سـەرهاویشـتنە سـەرکەسـێك، قـەڵس کردن:** ئـەو بەراستی نەیدەویست بڵێ ئەتۆ ڕانەندەیەکی خراپی. تـەنیا دەیەویسـت قەڵسـت کا.

٨٢٥٩/ 3933- **سەرە گرتن، نۆبە گرتنـەوە:** لایـەنگرانی فوتبـاڵ بۆ کڕینی بیتاقەی یارییەکانی حـەوزی لـە بـەیانیی زووەوە سـەرەیان گرتبوو.
← بە خەت ڕاوەستان.

٨٢٦٠/ 2776- **سەرنجامی لـە خۆیـایی بـوون لێهـەڵکەلە:** هەفتـەی ڕابردوو سیامەند سەبارەت بـە یارمەتی‌یـە زۆرو زەبـەندە مانگانەکـەی خـۆی هەڵدەکێشـاو، ئێسـتا بێکـارە.
سـەرئەنجامی لە خۆ بایی بوون هەر تێك شکانە.

٨٢٦١/ 7120- **سەرهگری بوون، بەربوونەوە:** تۆزنگیەکی گـەورە لە سـەر تاقەی ڕابەر بـۆوەو ئـەوەی تێیـدا بـوو لـە سـەر ئەرشان بڵاو بۆوە.
← بەربوونەوە.

٨٢٦٢/ 4146- **سـەرەو دەرە لێ کـردن:** هێندێـك یادداشـتی هەڵگرتبوون بەڵام، دوایە نەیدەتوانی سـەرەو دەرەیـان لێ بکا.
← تێگەیشتن.

٨٢٦٣/ 3491- **سەرەو لەوون بوون، (بـەر) لـەوەژوو بوونـەوە:** کۆنـە کەشتیی مەلەکـەی ئـەلیزابێت، لـە حـاڵێکدا کـە لـە ژانویـەی سـاڵی ١٩٧٢ لـە بـەندەری هۆنـگ کۆنـگ لەنگەری هاویشتبوو، ئـاوری تێبـەربوو ئـەولو سـووتاو سەرەوژێروون بوو.
← وەرگەڕان.

سـەرهەڵدان ← دەست پێکردن، هەلکردن یـان دەسـت پـێ کردن، وەدەرکەوتن.

٨٢٦٤/ 6970- **سەرهەڵدانی ... دیتن:** کـەم وا هەڵدەکـەوێ کـە تۆڕەمەیەك سـەرهەڵدانی ناهەنگـازێکی بلیمـەتی ئـەوتۆ ببینێ.

٨٢٦٥/ 2289- **سەرهەڵێنان (بە لە خۆیایی بوونـەوە)، ڕەپ ڕاوەسـتان، بـە فیزەوە ڕاوەسـتان:** 'ئـەو چەپۆکـەی لـە پێرەنـدی دەگـەڵ بنەچەکەی شاهانەی خۆت دا گرتـت، درۆیـە، دەنا نـا؟' لێرەدا، کـاوە بـە فیزێکـەوە سـەری هـەڵێناو بـۆ چەند چرکەیەك پێی وابوو گەورەیی‌یەکەی پلەپلە بـەرەو ژوور هەڵدەکشێ.

سـەرهەڵێنان لـە ← سـەرلێدان، چـاو لـە سـەرێ کـردن، سەردان، سەر لە کەسێك دان.

٨٢٦٦/ 3356- **سـەرهێنانـە پێش:** بـەرە بـەرە کـە دەنگـی پیرێژنەکـە نـەرم تـر دەبـوو، ڕاوێژکـاری حقووقـی، کـە دەیەویست ئاخرین قسەکانی گوێ لـێبێ، سەری هێنابۆوە پێش.

٤٣٦٧/ 1491- **سەرهێنانە پێش:** کاتێك کابرای چاو بەست گەیشتبووە حەساسترین بەشی چاوبەندی‌یەکەی، تەماشاچی‌یەکان رێکرا سەریان هێنابووە پێشەوە.

سەری خۆ پێوە نیشاندن ← بیرکردنەوە لە شتێك.

سەری خۆ راگرتن ← لەسەر پێی خۆ راوەستان، زیندوومان بە.

٤٣٦٨/ 6986- **سەری خۆ راگرتن، بەرێچوون، گوزەران (بەهەمەر جۆرێك بێ):** ئیزابێل پرسیاری کردو گوتی: کاروبارت چۆنە؟'، 'زۆر خراپ نیە؛ سەری خۆم راگرتووە'.

٤٣٦٩/ 3493- **سەری خۆ راگرتن (لەسەر ئاو):** ئەگەرچی مەلەم نەدەزانی، بەو حاڵەش توانیم بە پەلەقاژە سەری خۆم لەسەر ئاوەکە راگرم، هەتا کابرایەکم گەیشتێ و کێشامیە کەنار چۆمەکە. ● بە هۆی مانگرتنی کرێکاران و کارمەندانی بارئەنداز، گرفتاری‌یەکی زۆر بۆ شیرکەتەکەمان پێك هات بەڵام لە سایەی زەخیرەیەکی کە هەمان بوو بە بازارمان دەفرۆشت، هەرجۆرێك بوو توانیمان سەری خۆمان راگرین.

٤٣٧٠/ 4121- **سەرێك لە نێو سەران دەرهێنان، سەرکەوتن لە ژیاندا:** ئەو نەوادەیەکی ئەوتۆی نیە کە بتوانێ سەرکەوێ/ سەرێك لە نێو سەران دەربێنێ.

٤٣٧١/ 4945- **سەرینی خاترجەمی وەبن سەرنان:** ئەمن نابە کاتۆلیك، کەوابوو دەبێ سەرینی خاترجەمی وەبن سەریان دەنێو باسی نەکەمەوە.

٤٣٧٢/ 5764- **سەفەرکردن بۆ (بە کەشتی)، وەرێکەوتن بۆ، چوون بۆ:** کەشتی رۆژی پازدەهەم دەروا، بەڵام پێش ئەوەی کە بەرەو نیویۆرك وەرێکەوین، دەبێ چەند رۆژێك لە سکاتلەند رابوێرین.

٤٣٧٣/ 2922- **سەفەرکردن بە دەریادا (بەتایبەتی بۆ جێگای دوور):** دە ساڵ لەمەوبەر، کورەکەم (بە رێگای دەریادا) چوو بۆ/ سەفەری کرد بۆ ئوستralیا.

٤٣٧٤/ 2868- **سەفەرکردن بە مەبەستی ...؛** لەم سەردەمەدا تەنیا دەوڵەمەندەکان دەتوانن بە مەبەستی گەشت و گوزار/ ئیکتیشافات سەفەر بکەن.

سەگم تێی ریاند ← (عامیانە) هەزار خۆزگە بە مەرگ.

٤٣٧٥/ 3552- **سەلاحیەتی کەسێك خستنەوە بەرچاوی، وەبیر هێنانەوەی سەلاحیەتی کەسێك:** ئەوانە تیکنیسیەنی زۆر باشن، بەڵام دەبێ وەبیریان بێنیەوە هەتا کوێ سەلاحیەتیان هەیە.

سەپاندن ← قەبووڵاندن.

سەلیم چل کرچ بوون ←ماڵ لە کۆڵبوون.

٤٣٧٦/ 1621- **سەما کردن و دوورکەوتنەوە، بە سەما کردنەوە دوور کەوتنەوە:** بەسەما کردن دوور کەوتەوەو لەو حاڵەدا ئەوەی لە بیری نەبوو تاڵیکاری قرتابخانە بوو.

٤٣٧٧/ 4483- **سەنگفەرش کردن، بەبەرد تێکردن:** جاددەکەیان بە خیزی درشت سەنگفەرش کردووە.

٤٣٧٨/ 6842- **سەنگ و شووێن دان، سەرەوین کردن:** ئەو بەڵگەیەی دەمەوێ هەر دەیبینمەوە، تەنانەت ئەگەر هەموو ماڵەکەم سەرەوین کردبێ.

← بەراوەژوو کردنەوە.

٤٣٧٩/ 1714- **سەنگەربەندی کردن، ژێرئەرز بوون:** هەرکە سەنگەرەکانی دوژمنیان گرت، هێزە پیادەکان بە زووترین کات ژێرئەرز بوون.

٤٣٨٠/ 860- **سەهمی کارخانەکان کڕین:** ژمارەیەك لە شیرکەتە بریتانیایی‌یەکان خەریکن لە شیرکەتە ئورووپایی‌یەکان سەهمان دەکرن.

٤٣٨١/ 3329- **سەهۆڵ بەستن:** کاتێك لە سەرجاددەیەك سەهۆڵ دەیبەستێ، زۆر خەتەرناکە، چونکە رانەندەکان نازانن ئەوە سەهۆڵەو تەراییی نیە.

٤٣٨٢/ 3330- **سەهۆڵ بەستن:** پێش پەیدابوونی سیستەمی پێشگری لە سەهۆڵ بەستن، هەموو فڕۆکەوانێك ناچار بوو لە کاتی زۆر بەرز بوونەوەدا ئاگای لە فڕۆکەکەی بێ، چونکە مەترسی ئەوە هەبوو کە لە نێو باڵەکانی فڕۆکەکە سەهۆڵ ببەستێ.

٤٣٨٣/ 2363- **سەهۆڵ بەستن، بەستن، لە سەهۆڵدا پێچران:** جووتیارەکان سەهۆڵی سەر گۆلەکەیان شکاند کە سەرانسەری داپۆشیبوو.

٤٣٨٤/ 2356- **سەهۆڵبەندان:** لە ماوەی سەهۆڵبەندانی پاردا لە سەرانسەری جاددەی ماشێنرەودا هاتووچوو بڕابوو.

٤٣٨٥/ 7199- **سەیر و سەمەرە، بۆ بروا کردن نەبوون، بڕوا نەکردن:** فکری لێ بکەنەوە کە چلۆن جونز پاش عومرێك جینایەت کردن کارێکی یەکجاریی وەدەست هێناوە-بەراستی پیاو باوەر ناکا.

٤٣٨٦/ 3175- **سەیر لێکردن، شێت و شەیدا کردن، وشك کردن:** 'باشە، باشە، رۆڵە بە سێ، سیامەند بە تەواوی شێت و شەیدای کردووی. ● لە ماوەی بیست دەقیقەی هەوڵی نیوە دووهەمدا، فووروارەکانی بریزیل، تەواوی

تەماشاچی‌یەکانی نێو ستادیۆمیان لەسەر جێگای خۆیان وشك کردبوو.

٤٣٨٧/ 2362- **سەهۆڵ لە سەرکەوتن، زوقم (= زوقم) بەستن، بەستن:** دوای سەرمای سەختی درێژی شەوێ، شووشەی پەنجەرەکان بەستبوویان.

٤٣٨٨/ 1716- **سیخورمە لێدان، دەکەلەکەی کەسێك وەژاندن:** لە سەرانسەری شانۆکەدا هەرکەسێك قسەیەکی ترسەقاڵێك خۆشی کردبا، سیخورمەیەکی لێدەدا.

٤٣٨٩/ 7056- **سێرە گرتن لە:** چەکی دژی تانکییان لە هەرشتێکی لە پردێ نزیك بێتەوە سێرە گرتووە.

٤٣٩٠/ 61- **سێرە لێگرتن، رووی قسە لە ... بوون:** ئاغای ... سێرەی لە کەروێشکێکی گرت، بەڵام باڵندەیەکی نەنگاوت. ● نازانم ئاغای وەزیر رووی قسەکانی دەکێ بوو.

٤٣٩١/ 3938- **سێرە لێگرتن (زۆر بە وردی):** بۆ چرکەیەك، زۆر بە وردی سێرەی لە کەڵە کێوییەك گرت - دوایە لەبەرچاوی ونبوو.

← (لە ئەرتەشدا) هەدەف گیری کردن.

٤٣٩٢/ 5585- **سیس بوون یان هەڵگەڕان، ژاکان:** دەبێ قەدیم ژنێکی جوان بووبێ، بەڵام تا رادەیەك ژاکابوو.

٤٣٩٣/ 9901- **سیس بوون، چرچ بوون، چرچ هەڵگەڕان، ژاکان، ژاکاندن:** گەڵای داران سیس بوونو هەڵوەرین.

٤٣٩٤/ 1704- **سیس هەڵگەڕان:** گوڵە کەوکەبەکان لە یەکەمین شەختەدا سیس هەڵگەڕان.

← ژاکان.

٤٣٩٥/ 2119- **سیقە لە دەست دان، بێ‌متمانەبوون، بێ‌متمانە بوون:** خۆ تێوەردانی بێکەس لە کاروباری دنیایە بۆتە هۆی لەدەست چوونی سیقەی لە لای خەڵك.

سیم کێشی کردن ← وایەر کێشان.

٤٣٩٦/ 4780- **سینگ هێنانە پێش، رەپ راوەستان، خۆ بە فش زانین:** ئەو رۆژەی میدالیان دەدایە، بە لەخۆبایی بوونەوە سینگی هێنا بووە پێش.

٤٣٩٧/ 6188- **سینگ هێنانە پێش بۆ شەڕێ، بەپیداخ هەڵگرتن، بە شێوەیەکی جیددی دەگەڵ کەسێك یان کارێك بەرەوڕوو بوون:** ئەو خووی بەوە نەگرتووە کە کەسێك بۆ شەڕێ سینگی لێ‌بێنێتە پێشێ. ئەگەر بزانێ زۆر وەڕێ، بۆی هەیە بڕیارەکەی (بۆ شەر) بگۆڕێ.

سینەمای تایبەتی ← دامەزراوی گشتی.

شادبوون ← کەیف ساز بوون.

شادراگرتن ← خۆشحاڵ راگرتن.

٤٣٩٨/ 2724- **شادی کردن (بەشێوەیەکی قین لە زگانە):** 'نازانم بۆچی ئەتۆ لەوە کە خۆشناو لەسەر کار وەلابراوە، ئاوا قین لە زگانە خۆشحاڵی...'.

٤٣٩٩/ 2093- **شادی کردن، لە خۆشیان هەڵپەڕین:** کەم کەسێك دەتوانێ پەیدا بێ کە لە هەڵبژاردنی ئەو داروودەستەیە لەسەر حوکم لە خۆشیان هەڵنەپەڕێ.

← هەروکیف لێدان.

٤٤٠٠/ 1945- **شار بە دەر کردن، لە ئاوایی وەدەرنان، بە دەنگی تەپڵ دەرکردن:** رەفتارو کرداری ئەومندە ناحەزە کە دەبێ شار بەدەر بکرێ.

٤٤٠١/ 1884- **شاردنەوە، داپۆشین، دەرخۆنە لەسەر دانان:** رادیاربوو کە دژکردەوەی ئەو لادێیانەی کە دەگەڕانەوە سەر ماڵی تێك رووخاویان شاردرابۆوە.

٤٤٠٢/ 3328- **شاردنەوە، سەرپۆش لەسەر دانان:** ناتوانی مەسەلەیەکی ئەوتۆ بشاریەوە.

٤٤٠٣/ 1481- **شاردنەوە، سەرپۆش لەسەر دانان:** هەوڵ مەدە بروات پێ بکەم کە هیچ نەگەوماوە. دەزانم هەموو شتێك دەشاریەوە.

٤٤٠٤/ 1375- **شاردنەوە لە:** پزیشك هاتە سەرئەو بڕوایە کە ئیدی ناتوانێ چیدی راستی‌یەکە لە کابرا پەردەی بشارێتەوە.

٤٤٠٥/ 4814- **شاردنەوە، داپۆشین (ی راستییەکان):** بەداخەوە، پیاو ناتوانێ راستی‌یەکان لە مەئموورەکانی مالیات/ باج وەرگرتن بشارێتەوە. زۆر رێگا پێ دەزانن بیدۆزنەوە.

← نهێنی راگرتن، داپۆشین.

شاڵاو هێنان ← (وەك سێلاو) هاتن.

شامیل بوون ← گرتنەوە.

٤٤٠٦/ 4748- **شانازی کردن بە:** ئەو هەمیشە بە کارلێهاتوویی خۆی لە هەڵسوکەوت کردن دەگەڵ ئەو جۆرە قەیرانانە شانازی کردووە.

٤٤٠٧/ 3981- **شانازی پێدان:** لە حاڵێکدا کە کاتکارت ئەواوی ئەو شانازی‌یانەی پێ درابوو کە وڵاتەکەی دەیتوانی بیداتێ، دەیەویست لە چالاکی‌یە سیاسی‌یەکانی خۆی بکشێتەوە.

٤٤٠٨/ 2094- **شانازی کردن، شادی کردن، خۆشحاڵی دەربڕین:** دیتنی سیاسەتمەدارێکی سەرکەوتووکە لە تێك شکانی

نەیارەکەی و لەبەرامبەر مەردو ڕەفتی ئەودا شادی بکا شتێك نیە پیاو پێی خۆش بێ.

٤٤٠٩/ 6664- **شانازی کردن بە، ڕازی بوون لە:** گوڵی زۆر جوان لیباسی دەدروون و شانازیشی بە کارەکەی خۆی دەکرد.

٤٤١٠/ 2725- **شانازی کردن بە، شادمان بوون لە، خۆشحاڵ بوون بۆ ماوەی چەند سەعاتێك:** کابرای هونەرمەند شانازی بەوەوە دەکرد کە لە بەرامبەر خەڵکی لەندەندا سەرکەوتنی وەدەست هێناوە، بەڵام....

٤٤١١/ 2690- **شانازیی لە ئەنجامدانی کارێك بە هی کەسێك زانین/ دانان:** شانازیی سەرکەوتنی کونسێرتەکە دەبێ بە هی ئەو ڕێبەر بزانین کە بەڕێوەی برد.

٤٤١٢/ 6636- **شانازیی سەرکەوتنێك گەڕاندنەوە بۆ کەسێك:** هەڵبەت کە نومایشگاکە بە تەواوی سەرکەوتووبوو. ئەو شانازییەش دەبێ بگەڕێتەوە بۆ لای تۆ.

شان تێکوتان ← تەنەڵێدان.

٤٤١٣/ 293- **شانس هێنان، بەخت گوڵ کردن، بۆنیشتن:** بەختت گوڵی کردووە/ بۆت نیشتووەو بۆیە دەبێ چاوەڕوانی هەفتەیەکی یەکجار خۆش بی.

٤٤١٤/ 6028- **شانس هێنان، بەخت ڕوو تێکردن:** ئەو لەو جۆرە کەسانەیە کە بە دەگمەن بەخت ڕووی تێدەکا.

٤٤١٥/ 3293- **شان لە شانی کەسێك دان، ڕکابەری کردن لەگەڵ، ململانێ کردن لەگەڵ:** لە بواری کارامەیی و خێرابوون لە تەحویلدانی کالاوە، ئێمە ناتوانین دەسکان لە دوای هاوتا ئورووپاییەکانمان بکەین.

٤٤١٦/ 4643- **شانۆ لەسەر ساز کردن، نیشاندان:** پێوەندییە عاشقانەکەیان لە زەمینەیەکی غەیرە ڕۆمانتیکی یەکێك لە شارەکانی کەنار دەریای بریتانیا نیشان درا.

شان وەبەردان ← خۆ دانە ژێر کارێك.

شانە خاڵی کردن لە ← هەڵاتن لە ژێرباری.

٤٤١٧/ 5579- **شانە کردن، شانە لێدان (بە خێرایی):** دەبێ بچمە (قاتی) سەرێ و خێرا شانەیەك لەسەرم دەم.

٤٤١٨/ 1110- **شانە لێدان پێ کردن:** کچە چکۆڵەکە پێی خۆش نەبوو سەری شانە کەن، چونکە دایکی بە توندی شانەی دەکرد و ئێشی پێ دەگەیاند.

٤٤١٩/ 471- **شایەدی دان بۆ:** گوندەکە بە زمانی بێزمانی شایەدی دەدا کە گژە بایەکە بەوێدا ڕابردووە.

٤٤٢٠/ 6886- **شایەدی دان سەبارەت بە، گەواهی کردن:** ئامادەم سەبارەت بە جێی متمانە بوونی شاهیدەکە شایەدی بدەم/ گەواهی بکەم.

شایی دەدڵدا گەڕان ← (لە خۆشیان) فڕین.

شپرزە بوون ← نزیك بوونەوە لە هەڵوەشان، لەت (بە) لەت کردن.

شپرزەتر بوون ← خراپتر بوون.

٤٤٢١/ 490- **شتڵ لێدان:** ئێستا بۆ شتڵ لێدان باشترین هەوای هەیە. زۆر باش دەبوو هەتا شتڵەکانم لێدەدا شەختە نەهاتبا.

٤٤٢٢/ 4746- **شتڵ لێدان، چەقاندن، ناشتن:** دەمەوێ ئەو شتڵە کەلەمانە بچەقێنم.

شتێك بە هی کەسێك زانین ← بەکاری کەسێك دانان.

٤٤٢٣/ 4475- **شتێك دانە دەستی کەسێك کە لە جێگایەکی بڵندترەوە:** 'سەتڵی ڕەنگەو فڵچەکەم بدەیە هەتاکوو ئاستەرێکی دیکە لە میچی دەم.

شتێك دەنەستۆی کەسێك پەستاوتن ← فریودان.

٤٤٢٤/ 6505- **شتێك لە جیاتی شتێکی دیکە بەکار بردن:** کتێبی چێشت لێنان دەڵێ دەبێ کەرە بەکار بەرن. بەڵام، ڕۆنی نەباتیش دەتوانی بەکار ببەی. کەوابوو لەم قۆناخەدا لە جیاتی کەرە ڕۆنی نەباتی بەکار بەرن.

٤٤٢٥/ 169- **شتێك لە پشتەوە بوون، پشت بە شتێکەوە بوون:** کابرای دز، توانی بە ئەهارخۆرییەکەدا هاتبێتە ژوورێ. ئەهارخۆرییەکەمان پشتی بە چەند ماڵانەوەیە.

٤٤٢٦/ 927- **شتێك لەگەڵ سەر داسەپوون لەگەڵ، پێوەندییەکی نائاسایی هەبوون لەگەڵ، نێوان هەبوون لەگەڵ:** بەڕاستی عەیب نیە؟ هەموو کەس دەزانێ مێردی ماری دەگەڵ ژنی جوانەکەیان نێوانی هەیە. لەمێژساڵە بوو بە دزی نێوانیان هەبوو، بەڵام ژنەکەی نەیدەزانی.

شتێك زانین ← ناسین.

٤٤٢٧/ 6937- **شتێك داپۆشتنە سەر شتێکی دیکە، بێ ناوا کردنی پارچەیەکی زیادی:** ئەگەر بەڕاستی دەتانەوێ خانووەکە بکڕن، فەرش و پەردەکانیش دەخەینە سەری و هیچیشمان لێتان ناوێ.

٤٤٢٨/ 6431- **شریت پێچ کردن، بە شریتی بەستن:** هەموو جانتاکانیان شریت پێچ کردبوو و بۆ بەڕێکردن بۆ ئیزگەی قەتار ئامادەیان کردبوون.

٤٤٢٩/ 5467- **شریت پێچ کردن:** بۆ ئەوەی ئەرخەیان بوونێکی زیاتر جانتاکانیان شریت پێچ کردبوو.

شقارتە لێدان ← هەڵکردن.

شکان (ی نرخەکان) ← هاتنە خوار، کەم بوونەوە.

٨٤٢٠/ 1125 - شکان، لەبەریەك هەڵتەکان، ورد بوون: هەرجاری یەکەم کە ئەو کامێرایەم بەکارهێنا، لەبەریەك هەڵتەکا.

٨٤٢١/ 635- شکاندن، لەبەریەك هەڵوەشاندن: کەشتییەکەیان لەبەریەك هەڵوەشاندو پارچە پارچە فرۆشتیان. ● دارەکانیان بۆ سۆبەی شکاندووە.

٨٤٢٢/ 3628- شکاندن و کردنەوە، بە پێلاقان (شکاندن و) کردنەوە: دەرگا داخرابوو دەنگی کەسێکم دەبیست کە بە هاوار هاوار داوای کۆمەگ دەکا. بە پێلاقان دەرگەم شکاندو خێرا چوومە ژوور. ● هێندێك لەو دزو جەردانەی نێو شاران، ئەگەر لە بەرامبەریان رابوەستێ، دەتوانن دەو ددانی کابرای تێك بشکێنن.

شکاندن = تێك شکاندن ← پاشەکشە پێکردن، تەحقیر کردن.

شکاندن و خستن ← خستن.

٨٤٢٣/ 1034 - شکاندن و ورد کردن: ئەم مۆبلاتە/ قەنەفانە ئەوەندە کۆن بوون کە باشترە بیانشکێنی، وردیان کەی و وەك سووتەمەنی کەلکیان لێوەرگری.

شکاندنەوە ← تەحقیر کردن.

شکانەوە ← ورد بوون (لەباری رووحییەوە)، تێك شکان.

٨٤٢٤/ 3049- شکایەت کردن لە، رەخنە گرتن لە (بەشێوەیەکی نەبوو مەنتیقی): ئەوە بە جێگای خۆی کە مەرجەکانی رێککەوتننامەکە چەندە جوامێرانەیە، بەڵام، هەمیشە یەکێك هەڵدەکەوێ بە ناحەق رەخنەیان لێبگرێ - دەتوانی ناوی ئەو جۆرە کەسانە بنێی بە پرتەوبۆڵە.

← سکاڵا کردن (لە دژی)

٨٤٢٥/ 7321- شکست، ئاهومێدی: ئەگەر ئێستا، کە خەڵك پووڵێکی زۆر کەمیان بە دەستەوەیە، جالاکی بۆ هەراج کردنی شتومەك دەست پێ بکەن، ئەمن شکستێکی بێئەملاو ئەولاتان زەمانەت دەکەم.

شك بردن ← ناسین.

٨٤٢٦/ 2152-شکست خواردن، لەگەڵ شکست بەرەورووبوون: پێت وانەبێ لە دەمەتەقەدا پێی دەوێری. هەتا ئێستا زۆر کەسی لە تۆ بە ئەزموونتر لە دەمەقاڵە دەگەڵ ئەودا شکستیان خواردووە.

٨٤٢٧/ 2508- شکست خواردن: پیاوە گەنجەکە هەتا ئەودەمی بە لەسەرەخۆییەوە هەڵس و کەوتی دەکرد، بەڵام بەرای من تێیدا شکستی خواردبوو.

٨٤٢٨/ 2116- شکست خواردن: نامەوێ کارە ببێتە سەرۆك وەزیر یان شتێکی لەو بابەتە، چونکە تێیدا شکست دەخوا.

٨٤٢٩/ 2115- شکست خواردن، قەڵب دەرچوون: وەڵامی شوورا بە زیادبوونی حەشیمەت، دروست کردنی ئاپارتمان لە ژمارەیەکی زۆر دایە. ئەمەش شتێکە کە ئەخشەکەیان شکستی تێدا دەخوا - کێ ئامادە دەبێ تێیاندا بژی؟

٨٤٣٠/ 2985- شکست خواردن، نابووت بوون: کاتێك ماشێنە تازەکانی کایە کردنی منداڵان هاتنە بازاری بریتانیا، چەند شەریکەی دروست کردنی ئەو جۆرە ماشێنانە نابووت بوون.

٨٤٣١/ 2993- شکست خواردن، نابووت بوون، وەرشکست بوون: بەستەزمانە داناڵسون سەری لە کاسبی دەرنەدەچوو. هەبۆیەش هێندەی پێنەچوو نابووت بوو.

٨٤٣٢/ 4690- شکست خواردن، نابوود کران، لە نێو چوون: حەریفەکانی لە قۆناخی یەکی حەزفیدا بە خێرایی شکستیان خوارد.

٨٤٣٣/ 2912- شکست خواردن لە بازرگانی/ کاسبیدا، خۆ کێشانەوە/ دەست هەڵگرتن لە بازرگانی: لەوەتی فرۆشگە گەورەکان هاتوونەتە گۆڕێ، ژمارەیەکی زۆر لە خاوربارفرۆشەکان دەستیان لە کاسبی هەڵگرتوە.

٨٤٣٤/ 2802- شکست خواردن، بەزین لە بەرامبەر ...دا: پاڵەوانی بۆکس/ مشتەکۆڵە بە هۆی مستێکی قورس کە لە روندی دوازدە دا وێی کەوت شکستی خوارد. ● ئیمپراتووری رۆم سەرەنجام لە بەرامبەر بەربەرەکاندا شکستی خوارد.

٨٤٣٥/ 2113- شکست خواردن لە ژیان دا: زۆر سەیرە، بەڵام تەنانەت باشترین کەسانی ئێمە بۆیان هەیە لە ژیاندا شکست بخۆن؛ جا ئێوەش هەروا.

٨٤٣٦/ 6941- (لە یاری بۆکس 'مشتەکۆڵە'دا، خاولی یان لیستەفنج فڕێدانە سەر رینگ بە نیشانەی) شکست خواردن، مل بۆ شکست راکێشان: دزانم خولێکی زۆر دژوارت تێپەر کردووە، بەڵام قبووڵ کردنت کەمێك زووە.

← لە نێو چوون، رەت کرانەوە.

٨٤٣٧/ 6609- (زۆر خراپ) شکست دان، تێك شکاندن، زۆر توند رەخنە لێ گرتن، تەمبێ کردن: لە جاری یەکەمی بەرەنگاربوونی دەگەڵ کەسێك زۆری وێ کەوت. دوایە کەوتە بەرامبەر یەکێکی خاوەن ئەزموون و حەریفێ کە لە دوو خولاندا زۆر خراپ شکستیدا.

٤٤٤٨/ 1590- **شکست دان، وەلاندن:** سام بە ماشینە ماویسەکەی زۆر باش دەرۆیشت هەتاکو یەکێك لە باشترین دۆستەکانی بە ماشینێکی سپۆرتی تازە گەیشتە سەری و شکستی دا.

٤٤٤٩/ 965- **شکست دان یان خواردن، گۆڕین یان شێوێن دانان لەسەر دەموچاو یان شێوەی ئیفادە:** زەردەیەکی هاتن و گرتی لە مێرد کردنەکەیدا شکستی خواردووەو لە چاوی ڕا دیار بوو کە دەیویست هاودەردی دەگەڵ بکەم.

٤٤٥٠/ 7257- **شکست دان یان خواردن لە هەڵبژاردندا:** ئەگەر ئەم دەوڵەتە لە هەڵبژاردندا شکست بخوا، بە هۆی شێوەی بەڕێوەبردنی ئابووریيەوە دەبێ.

شکست دان ← سەرکەوتن بەسەر...دا، کشاندنەوە، زاڵ بوون بەسەر...دا، شکست دانی دوژمنی بالادەست، وەرەق هەڵگەڕاندنەوە یان هەڵگێڕانەوە.

٤٤٥١/ 1911- **شکست دانی کەسێك لە مەشروب خواردنەوەدا:** زۆر بە خۆتان دەنازن بەڵام ئەو هەمووتان لە خواردنەوەدا شکست دەدا.

شکست لە نێوچاوان نووسران ← مەحکووم بە شکست بوون.

شکستی خۆ قبووڵ کردن ← دان بە شکستی خۆ داهێنان.

٤٤٥٢/ 3893- **شکڵ پێدان، ڕێك و پێك کردن، سەروسامان دان:** تالێکی جێگای میوانین، بەڵام زۆر زوو ڕێكوپێکیان دەکەین. ● ...، ڕەنگە بتوانین سەروسامانێك بەم کاسبی‌یە بدەین.

٤٤٥٣/ 5951- **شلەو گومان هەبوون، غاوەلی بڕیاردان نەبوون، لە شلەو گومان دابوون:** ئەمن ئەزەرم وابوو کە ئەو کابرایە هەمیشە لە شلەو گومان دابووەو هەرگیز خۆی پێبەند بە شتێك نەکردووەو قەت بڕیاردەر نەبووە.

٤٤٥٤/ 5969- **شل بوونەوە، سست بوونەوە، کەساد بوون:** لەم ڕۆژانە لە ساڵدا کاسبی کەساد دەبێ.

٤٤٥٥/ 6140- **شلپە شلپ کردن یان گرتنەوە:** منداڵەکانم لە حەمامێ بەجێ هێشت کە بە خۆشحاڵیيەوە شلپەشلپیان گرتبۆوە/دانابووە.

← وەرسووڕان.

شلەم شلەم ← کۆنە.

شل کردنەوە ← فورس کردن.

شلەژاندن ← شێواندن.

شلووق بوون ← قەرەباڵغ بوون.

شلەقاندن ← لێکدان.

شلیك کردن ← هاویشتن.

٤٤٥٦/ 6185- **شناسایی کردن:** چەند پێشەنگی لە پێشدا بەڕێکردن بۆ ئەوەی ناوچەکە شناسایی کەن.

شڕپهاندن ← وەك کەسێك شڕپهاندن.

شۆخی پێکردن ← گاڵتە پێکردن.

٤٤٥٧/ 253- **شۆخی هەڵنەگرتن؛ جیددی بوون:** بە تەواوی جیددیيە. دەرگەی بکەوە با بڕۆم.

٤٤٥٨/ 7313- **شۆڕانەوە، سووان، لە نێو چوون:** خوارەوەی ئەو شاخانە (ی کەنار دەریا) بە هۆی تۆفانی یەك لە دوای یەك شۆڕاونەوەو، ئاو بن کلۆڵی کردوون.

٤٤٥٩/ 6008- **شۆڕبوونەوە بۆ لای:** لە پشت ماڵەکە باخچەیەکی گوڵان بەرەو ڕیزێك لە سپیداران شۆڕ دەبێتەوە/ دەچێتە خوار.

٤٤٦٠/ 111- **شۆڕبوونەوە بەسەر...دا:** لەو بەشە لە چۆمەکە، دار و درەخت لە هەردوو لا بەسەر ئاوەکەدا شۆڕ بوونەتەوە.

٤٤٦١/ 3141- **شوورەیی شۆڕی کەسێك بوون، خەتە بەسەر لەسەر ڕەخنەدان:** سەرۆك وەزیران گوتی: کەوتنە بەر لێشاوی ڕەخنان لە کۆڕی وەزیران خۆی لە خۆیدا ئەزموونێکی تازە بوو. ● 'ئەری ئەو هەڵاو بگرە چ بوو؟'، 'هیچ، ئەو پەرە پیاوە بوو کە چونکە ماشینەکەم بە ئەمانەت وەرگرتبوو، شوورەوشۆڕی بردم.

٤٤٦٢/ 7318- **شۆشتن، شۆشتنەوە:** پێش ئەوە کە بڕۆیە سەر مێزی نان خواردن، ئەو قامکە پیسانەت بشۆرە.

٤٤٦٣/ 3313- **شۆشتن، شووشتن (سەرتاپا خاوێن بە تەواوی، زۆر جوان):** هەموو بەیانی ڕۆژانی یەك شەممۆ ماشینەکەم دەشۆم.

٤٤٦٤/ 7323- **شۆشتن و خاوێن کردنەوە:** پێش ئەوە کە ڕەنگی تازەی لێبدەی، براسەکەت/ فڵچەکەت بشۆرەو ئەم ڕەنگە ئاسمانی‌یەی لێبکەوە.

٤٤٦٥/ 7315- **شۆشتن و خاوێن کردنەوە:** ڕۆژانی یەك شەممۆ، ماشینەکەی بە سوندەی/ شیلانگی باخچەی دەشوا (خاوێنی دەکاتەوە).

٤٤٦٦/ 4409- **شۆشتنەوە:** کابرای کانگا دۆزەرەوە خەریکی شۆشتنەوەی خیز و ڕەملێکی بوو کە لە بن چۆمەکە هەڵیکەندبوو.

٤٤٦٧/ 7319- **شۆشتنەوەی (نێو قتێلە):** دوای ئەوە کە ددانەکانت خاوێن کردنەوە، نێو زارت بە ئاوی خاوێن بشۆرە.

٤٤٦٨/ 1968- **شوشتنەوە:** لەمێژ ساڵە کە ئاوی دەریا لێوارەکانی خۆی دەشواتەوەو، ئێستا ئەو خانووانەی کە لەسەر بەرزایی لێواری دەریا دروست کران کەوتوونەتە مەترسییەوە.

٤٤٦٩/ 6016- **شوشتنەوە، خاوێن کردنەوە بە ئاو:** ئەگەر لوولەکە بگیرێ، بە ئاوی گەرم خاوێنی کەوە. ● ئەویلەکانیان بە سۆندەی ئاوێ شوشتەوە.

← کرووستنەوە، لەبەین بردن.

شۆکە بوون ← حەپسان.

٤٤٧٠/ 2714- **شووشە تێکردن، شووشە بەند کردن:** ئەگەر دەرگای پشتەوەمان شووشە تێ‌گرتبا نێستا ستبەقەکەمان ئاوا سارد نەدەبوو.

٤٤٧١/ 4151- **شوو لێهەڵکێشان، بێتام کردن:** فیلیپ، دەتوانی چەند کەس لە دۆستەکانت بۆ کایە کردن بێنیتە ماڵێ، بەڵام، نابێ شووی لێهەڵکێشی/ بێتامی کەی.

← بێ‌تام کردن.

٤٤٧٢/ 3348- **شوێن دانان لەسەر، پێ قبووڵاندن، لێ حاڵی کردن:** لایەنی باشی راستگۆیی‌یان لە منداڵەکانیان حاڵی کردبوو و پێیان قبووڵاندبوون.

٤٤٧٣/ 4196- **شوێن دانان لەسەر، ئاڵوگۆڕێك پێك هێنان:** کارە نهێنی‌یەکەم لەسەر پێوەندیی دۆستانەم دەگەڵ مزگو هیچ شوێنێکی دانەنابوو.

٤٤٧٤/ 4177- **شوێن دانان لەسەر، تەئسیر لێکردن/ لەسەردانان:** بە ئاشکرا دیار بوو کە رووسەکان دەیانەویست (لەسەر بریتانیایی‌یەکان) تەئسیرێکی باش دابنێن. ● تیپی میوان تەئسیرێکی باشی لێ‌کرا.

٤٤٧٥/ 3341- **شوێن دانان لەسەر، تەئسیرکردنە سەر:** ئەم بەناو شۆڕشە وادیتە بەرچاو کە لەسەر دابو نەریتو شێوەی ژیانی دەوڵەمەندان تەئسیرێکی زۆر کەمی کردبێ. ● لە وەزعێکی خەوالوودا کە تێیدا بوو، دەنگی ماشێنێکی کە لە دەرگای ماڵەکەیان نزیك دەبۆوە تەئسیرێکی ئەوتۆی نەبوو کە وەخەبەری بێنێ.

٤٤٧٦/ 5174- **شوێن دانان لەسەر، تەئسیردانان لەسەر:** پیاوی بەتوانا تەئسیر لەسەر خەڵك دادەنێ، لە حاڵێکدا پیاوی بێ‌دەستو بێ‌تەئسیر وەردەگرێ.

←قسە رۆیشتن، کارکردن لە، تەئسیردانان لەسەر.

٤٤٧٧/ 3346- **شوێن لەسەر دانان، خستنە ژێر چووکە ژێر تەئسیر:** گوێ، نابێ لە بەرامبەر هەموو کەس ئاوا بەخشەندە (= دەست ئاوەڵە) بی. ئەمیی ئەوەی زۆر تەئسیری هەموو کەسەوە.

٤٤٧٨/ 4635- **شوێن لەسەر دانان، لەخۆ گێڕان:** ئەو ئەخشە چالاکانەی کە پەکیەتی‌یە بازرگانی‌یەکان گێڕاویانە بێگومان لەسەر باشتر ناساندنی پێویستی‌یە ئابووری‌یەکانی سکوتلەند تەئسیرێکی باشیان هەبووە.

٤٤٧٩/ 6878- **شوێن لەسەر دانان، تەئسیردانان، تەئسیر لێکردن یان لەسەردانان:** بە روونی دیارە کز بووە. هەموو ئەو شەوو شەوخوونی‌یانە خەریکن تەئسیری لەسەر دادەنێن.

٤٤٨٠/ 2431- **شوێن لەسەر دانان، تەئسیر لێکردن یان لەسەردانان:** لە رابردوودا هێندە دژی مەزهەب نەبووی، کێ تەئسیری لەسەر داناوی؟

٤٤٨١/ 6446- **شوێن لەسەر دانان، ناڕەحەت کردن:** بێ‌تەفاوەتیی ئەو کابرایە، بۆ یەکەم جار بەراستی ناڕەحەتی کردووم.

٤٤٨٢/ 4436- **شوێن لەسەر دانان، بەرزێك پێنەگرتن:** ئەو لە وەنەستۆ گرتنی هەر ئەرکێك دەترسا/ لەوە دەترسا شتێك وەنەستۆ گرێ، هیوادار بوو کارە پڕ مەترسی‌یەکانی ژیانی بەرزکی پێ نەگرن.

٤٤٨٣/ 7324- **شوێن لەسەر دانان، بەخەیاڵ لەسەر دانان:** منداڵەکان هەڵاو بگرێکی سەیریان ساز کردبوو، ئەویش لەوێ دانیشتبوو بە لە سەرەخۆیی راپۆرتەکەی تایپ دەکردو هەر بە خەیاڵیشی دا نەدەهات.

شوێن لە کەسێك ونکردن ← هەڵە کردن.

شوێنەوار بەجێ‌هێشتن ← نیشاندان.

٤٤٨٤/ -

٤٤٨٥/ 468- **شوێنەواری خراپ دانان لەسەر، بوونە هۆی دەردیسەر، زیان گەیاندن بە ...:** چوونە سەری نرخەکان لەم دوایی‌یانەدا زیانێکی زۆری بەو کەسانە گەیاندووە کە مانگانەی سابیت وەردەگرن.

٤٤٨٦/ 4069- **شوێنەوارێك دیار نەبوون لە، سەروسۆراغێك نەبوون لە:** هیچ شوێنەوارێك لەو تاقمە شاخەوانانە دیار نیە کە لە پشوودانی حەوتووی رابردووە ون بوون.

٤٤٨٧/ 4073- **شوێنەواری ... ونکردن، یان ونبوون:** دەتوانم هەتا ساڵی ١٩٥٨ وەدوای چلۆنایەتیی ژیانی ئەو کابرایە بکەوم. لەوێرا شوێنەواریم لێ ون دەبێ. ● دوای دوو سەعاتان کە فڕۆکەکەی لە فڕۆکەخانەی لەندەن هەستابوو، شوێنەواری ون بوو.

٤٤٨٨/ 4973- **شوێنە وتکە کردن، ڕێگا لە ... گرتن، بەهەڵە بردن:** چەند سەد یاردێك بە سواری لە چۆمەکە وەسەر کەوتینو ڕێمان لەو کەسانە گرتی کە بە دوامانەوە بوون.

٤٤٨٩/ 3542- **شوێن هەڵگرتن:** ئەوەندە لەتکە فلز بە دەوری ئەرزی دادەگەڕێن کە تەنیا کامپیوتێر دەتوانن شوێنیان هەڵگرێ.

٤٤٩٠/ 4227- **شوێن یان تەئسیری باش لەسەر ... دانان:** کچەکەم، کوڕی، داوای لێ‌کردم زۆرت سڵاو بگەیەنم - تەئسیرێکی باشت لەسەر کردووە/داناوە.

٤٤٩١/ 7356- **شوێنی خراپ لەسەر دانان، ورەی کەسێك زەعیف کردن:** ئەو ناهێڵن گرفتاریی بنەماڵەیی شوێنی خراپی لەسەر دانێ/ ورەی زەعیف بکا.

٤٤٩٢/ 6205- **شوێنی خراپ لەسەرداناں، دەست ناڵە دەستی یەکتر لە دژی:** جان هەمیشە ئیدیعای دەکرد کە هەموو شتێك لەدژی ئەو وەگەڕ کەتووە، بەڵام لەڕاستیدا ئەو لەو جۆرە کەسانە بوو کە گوناهی هەموو تێشکانێکی خۆی داوێشتە ئەستۆی قەزاو قەدەر.

→ پێنەکەوتن، بە زیانی شتێك تەواو بوون.

٤٤٩٣/ 283- **شەکەت بوون، ماندوو بوون، وەجەل ئەسپان:** دوای شەش هەفتە، سەربازە تازە واریدەکان بە تەواوی شەکەت ببوون/ لە پێ کەوتبوون.

٤٤٩٤/ 7013- **شەکەت بوون، وەیەو خاش بوون:** بەو لە داهاتوو دەکەمەوە، ئیدی ناەوێ بە شەوڕۆژ خەریك بوون دەگەڵ چارسەرکردنی کەندو کۆسپان وردوخاش بم.

→ ماندوو بوون، لە لاق کەوتن.

شەکەت کردن → لە پێ خستن، لە کەلك خستن، ماندوو کردن.

شەمچە لێدان → هەڵکردن.

شەقاو کردن → پێوان بە هەنگاو.

شەیتان بانگ کردن → بانگی شەیتان کردن.

٤٤٩٥/ -

٤٤٩٦/ -

شەیزل لێدان → دەنگدانەوە.

٤٤٩٧/ 3331- **شەخسییەتی خۆ لە شتێکدا بەدیکردن:** شانۆکەم پێ خۆش نەبوو، چونکە لە هیچ کام لە کاراکتێرەکاندا - چ قارەمانی چەواك، چ ئەوەی دژی قارەمان بوو- لایەنێك لە شەخسییەتی خۆم بەدی نەدەکرد ڕەنگی دابێتەوە.

٤٤٩٨/ 6845- **شەڕانی، لات، سەرسەری، شەڕخواز:** خەڵکی ئەو دەوروبەرە پێیان وایە هەر کوڕێکی سواری موتورسیکلێت بوو سەرسەرییە.

شەر دەگەڵ کردن → دەست دانە چەك لە دژی....

شەر فرۆشتن بە → لە شەرگەڕان.

٤٤٩٩/ 2986- **شەر کردن، جەنگ کردن:** هیچ ڕێبەرێکی ژیر ئەگەر بزانێ شکست دەخوا، شەڕ ناکا. بەڵام هەموو ڕێبەرێك ئاقڵ نیەنا

٤٥٠٠/ 1531- **(بە دڵو گیان) شەڕ کردن، خەبات کردن (لە دژی):** لە بریتانیا هێندێك دەستەوتاقم هەن کە بە گیانو بە دڵ لە پێناو ریفۆرمی خەیاڵیو لە دژی دیاردەی خراپ خەبات دەکەن.

٤٥٠١/ 699- **شەرم شکاندن:** کچێکی شەرمێونو گۆشەگیرەو ئەو کورە هەوڵ دەدا شەرمی بشکێنێ.

٤٥٠٢/ 1876- **شەرم شکاندن:** زەمناکۆ هونەری شەرم شکاندنی کەسانی شەرمێون لە دایکی فێر ببوو.

شەرمسار کردن → بە خۆداشکاندنەوە.

شەرم شکان → زاڵ بوون بە سەر شەرمێونی خۆدا.

٤٥٠٣/ 5913- **شەرم گرتن یان داگرتن لە:** ماری لە هەست پێ کردن بەوە کە ئێستا ئەلی دەیەوێ دەست لەسەر شانی دابنێ، شەرم دایدەگرێ.

٤٥٠٤/ 6966- **شەرمە حزووری یان لیحتیات وەلانان:** پاش ئەوە کە میوانەکان چەند پێکیان مەشروب خواردەوە، شەرمە حزووریان وەلانا و جا ئەوجار گەلە دەنگۆیەکی ( غەیبەت کردنێکی) دوژمنانە دەستی پێ کرد.

٤٥٠٥/ 5060- **شەرمەزار کردن:** ئەو پیاوە خرکەلەیە بەو هەموو شوێنکارییانەو ناهەنگی مۆسیقا جۆراوجۆرەکانییەوە، زۆربەی ئەو بەناو فەرهەنگە شازانەی شەرمەزار کردووە.

شەرم یان ترسی کەسێك شکاندن → دڵوجورئەت دان بە.

شەرو کێشە کردن → کێشەو هەڵلا کردن.

٤٥٠٦/ 849- **شەرو هەڵلا:** لە دیوەکەی تەنیشتمان را دەنگی شەرو هەڵلا بەرز بۆوەو هەر شووشەو چینی بوو کە بە ئەرزیان دادە دان.

٤٥٠٧/ 4840- **شەرە مست کردن، بەمستان لیکدان:** ئەگەر لە نێوان ئەو دووانەدا شەرەمستێك ساز بێ، لێرە دەبێ؟

شەقاوە → شەڕانی.

شەق بردن → لە حەیفان قەڵشان.

٤٥٠٨/ 3023- **شەقتوق لێدان و کوشتن:** ماتادۆرەکە زۆر جاران لە مەترسیی مردن رزگار ببوو (= لە چنگ مەرگ هەڵاتبوو)، بەڵام سەرەنجام، لەو رۆژەدا کە دەیویست دەست بکێشێتەوە، گا شەقۆنێکی لێداو کوشتی.

٤٥٠٨٠١/ 6877- **شەیتانی کردن لە:** تازە هەرگیز وا ناکەم. سۆیندت بۆ دەخۆم. تکات لێدەکەم شەیتانیم لێ مەکە.

٤٥٠٨٠٢/ 6147- **شەیتانی لێکردن:** 'شەیتانیم لێ مەکە، نێرەم مەبە!'.

٤٥٠٩/ 2335- **شەیتانە رەفتار کردن، کەرانە جووڵانەوە:** هەموو کەس دەزانێ کە لە ئیدارەدا زۆر کەرانە دەگەڵ کچێک دەجووڵێتەوە.

٤٥١٠/ 2915- **شێت بوون، خەرفان، تێکچوون:** کاتێک ئەو ژنە جحێڵە هەواڵە وەحشەتناکەکانی بیست بە تەواوی شێت بوو.

٤٥١١/ 2860- **شێت بوون، وەک شێتان جووڵانەوە، لەسەرچوون:** بەستەزمانە خەرە پیرە لەسەری داو هەر پوولێ پارەیەکی هەیبوو لە ماوەی شەش مانگاندا خەرجی کردو سەرەنجام دەستی بە سواڵێ کرد.

٤٥١٢/ 5736- **شێت (وەشار) کردن، وەکێوان خستن، کافر کردن، مێشکی سەری کەسێک بردن:** هەتا کەنگێ ئەو کرێکارانە لەو درێڵە سەگبابە خێوە کەللە وەردەگرن؟ ئەو گرمە گرمەو تەقەو رەقە پیاوی کافر دەکا/ پیاوی شێتەو هار دەکا.

شێت بوون ← گێل بوون، حۆل بوون، هاتنە شێت بوون بە هۆی نارەحەتی و ....

٤٥١٣/ 1926- **شێت کردن، کفری کەسێک دەرهێنان، کافر کردن، تووڕە کردن:** ئێوە بەراستی کفرم دەردێنن، دەزانم بەو زووانە شێت دەبم.

٤٥١٤/ 1925- **شێت کردن، کافر کردن، تووڕە کردن، قەلس کردن:** هەموویان ماندوو مردوو دەهاتنە بە چار - دەتگوت ئەو ژنە دەیویست وەهایان تووڕە بکا بتەقن.

شێت کردن ← تووڕە کردن.

٤٥١٥/ 3021- **شێتەو شەیدا بوون، عاشق بوون، دوچاری وەسوەسە بوون:** جان شێتەو شەیدای کچێک بووە کە کاتی پشووەدان لە پاریس چاوی پێی کەوتبوو.

← جادوو کردن، سیحر لێکردن.

٤٥١٦/ 2004- **شێتەو شەیدای کەسێک بوون:** کورە لاوەکە شێتەو شەیدای ژنێکی یەکجار جوان ببوو.

٤٥١٧/ 3190- **شێتەو شەیدای کەسێک بوون:** ئەوە داستانی ئەو کچە قرتابیە بوو کە بۆ کابرایەکی پیر شێتەو شەیدا ببوو. ● دەبێ ئاشقی کەسێکی دیکە بێ - ئەو پیاوە ژنەو پێنج منداڵی هەیە.

٤٥١٨/ 3367- **شێتەو شەیدای ئاشق بوون بە کەسێک بوون:** پاشی سێ ساڵان ژیانێکی بەختەوەرانە دەگەڵ ژنەو منداڵەکانی، ئالفرێد ئاشقی کچێکی نۆزدە ساڵە بوو، بنەماڵەکەی بەجێ هێشتەو دەگەڵ ئەو کەوت.

٤٥١٩/ 4674- **شیرجە لێدان، بەسەرەوە خۆ هەڵداوێن هاویشتن، زەرگ لێدان بۆ نێو ئاو:** وانیتەکە/ پیکابەکە دیوارەی جاددەکەی تێک شکاندو بە سەرەوە دەناوێ کەوت کە بیست پێ قووڵ بوو.

٤٥٢٠/ 1780- **شیرجە لێدان (بۆ نێو ئاوێ)، بە سەرەوە خۆ هەڵداوێن هاویشتن:** نەتۆ لە پێشدا شیرجەیەکی لێدەو بزانە ئاوەکە (گەرمی و ساردییەکەی) چۆنە.

٤٥٢١/ 7027- **شیرو خەت کردن:** لە دەست پێکردنی پێشبڕکێی فوتباڵدا، داوەر شیروخەتێ دەکا بۆ ئەوەی دیاری بکا کە کام تیم دەبێ یارییەکە دەست پێبکا.

٤٥٢٢/ 7024- **شیرو خەت کردن:** 'کێ دەبێ لە تەختەکەی سەرەوە بخەوێ؟ شیروخەتێ بکەین'.

شیشە لێدان ← سەرمە لێدان.

شیفتەی خۆ کردن ← بۆ لای خۆ راکێشان.

٤٥٢٣/ 6043- **شیکردنەوە، ئەوزیحدان (بە دەنگێکی بەرزو ناخۆش):** سەرهەنگ بە دەنگێکی بەرزو ناخۆش زانیارییەکەی شی کردەوە.

← روون کردنەوە.

٤٥٢٤/ 7220- **شیکردنەوە بۆ، پەیدە لابردن لەسەر:** کاتێک پیلانەکەیان زۆر بە وردی بۆ شی دەکردنەوە، ئەندامانی کۆڕەکە بە بێدەنگیی گوێیان راگرتبوو.

شیلە کردن ← خۆ لە گوڵێ دان.

٤٥٢٥/ 7060- **شێلان، پان کردنەوە:** مێگەلێک چوو بوونە نێو باخچەکەی و گوڵە جوانەکانیان شێلابوو.

← داپەستاوتن.

شین بوون ← سەر وەدەرنان لە گڵ.

شین گێران ← گریان.

شێران ← تێکچوون.

٤٥٢٦/ 1043- **شێواندن، شڵەژان، پرژانەوەن:** هەرچی کەشتییەکە خێراتر دەڕۆیشت، پەروانەکانی ئاوەکەیان توندتر دەپرژاند.

شێواندن ← تێکدان، تێکەڵ کردن، خراپ کردن، تەقەی هەوایی کردنو شار، یان گوندان شێواندن.

عادەت گرتن بە ← راهاتن بە، خوو پێگرتن،
عایق کردن جیاکردنەوە (لە) (بە).
عەفوو کردن ← لە گوناهی کەسێك بووردن یان خۆش بوون.
عەلاقە پەیدا کردن بە ← وەبەردڵکەوتن.
٥٠١٧/ 3407- عەلاقەمەند کردن، دڵبەستە کردن بە: ئاغای جیمز مامۆستایەکی یەکجار کارامەی ئابووری بوو توانیبووی قوتابییەکانی بە هەموو لایەنەکانی ئەو رشتەیە عەلاقەمەند بکا.
٥٠١٨/ 6090- عەلامەت دان (بە زووڕنا، لە پێلو ...) "لێی دە لە تەپڵ، لە پێژەنی".
٥٠١٩/ 4369- عەمەل کردن، نەشتەرگەری کردن، جەرراحی کردن: ئاغای ئالفرێدیان لەبەر تەنگ بوونەوەی ڕیخۆڵەی عەمەل (ی جەرراحی) کرد.
عەمەلییات دەست پێکردن ← هێرش پێکردن.
٥٠٢٠/ 189- عەیبی گرتن، بە خۆرایی بە گومان بوون لە کەسێك: ئەگەر پۆلیس پێی وایە ئەمنیش لە بڕینی قەتارەکەدا بەشدار بووم، عەوەزییان گرتووە (= بە خۆرایی لێم بە گومانن).
عیبرەت وەرگرتن لە ← پەند گرتوو بوون لە.
٥٠٢١/ 6452- غارێدان بەرەو، هەڵاتن بۆ لای: بێ سێ و دوو لێکردن بەرەو کەنار دەریا غاری دا. ✱ پێش ئەوەی کە بۆ لای نیزگەی پاسەکان هەڵێن، راوەستا و ئەم لاو وەو لای چاوێك لێکرد.
غاردانە سەر ← هەڕا کردنە سەر، هەڵاو بۆ بردن.
غایب بوون لە ← نەهاتن بۆ، نەچوون بۆ جێگایەك.
٥٠٢٢/ 3336- غەرقی شتێك بوون، نوقم بوون لە کارێکدا چوونە خوار لە: کاتێك شتێك لە ئاودا نوقم دەبێ، بەرواڵەت بەشێك لە قورسایی خۆی لە دەست دەدا. ✱ کاتێك نێچیروان سەروەتو ماڵی باوکی بە میرات پێ گەیشت، نوقمی خۆشگوزەرانی بوو، دوای ماوەیەك دیتی پوولێکی ئەوتۆی نەماوە. ✱ چونکە زۆربەی مرتاڵاو دیتم ئاغای جانسۆن وەك هەمیشە غەرقی نووسینە.
← نوقم بوون.
٥٠٢٣/ 4064- غەم خواردن بۆ، خەفەتبار بوون بۆ، بە پەرۆش بوون بۆ: پێویست نیە بۆ فرۆکەکە خەفەتبار بی. بۆی هەیە ویستبێتی بنیشێ.

٥٠٢٤/ 6802- غەیبەتی کەسێك کردن، لە پشت، باسی کەسێك کردن: بۆ دەگەڵ ئەو کابرا نێسك گرانە دەگەڕێی؟ خەڵك خەریکن وردە وردە پشت ملە باسی دەکەن.
← باسی کەسێك کردن (بە خراپی).
فاسیلە گرتن لە ← دووری گرتن لە.
٥٠٢٥/ 6225- فاسیلەی هەبوون لە، دوور هەبوون لە، دوور لە: خانووبەرەی فرتابەکە مەودایەکی باش لە شەقامی قەرەباڵغی شار دوورە.
٥٠٢٦/ 2230- فایل کردن، بایگانی کردن: خالی براون، دەکرێ ئەم نامانە لە ژێر سەردێڕی "پێشبینیی فرۆش"دا فایل کەی؟
← هەڵگرتن.
فرکە کردن ← هەڵقرتێن.
٥٠٢٧/ 1545- فرمێسك رشتن، خەم خواردن بۆ، گریان: وەك هەمیشە مێنام دی کە لە مۆزەکەی خۆی بۆ بەدبەختییەکانی دەگری - ئەو بەدبەختییانەی کە هێندێکیان خەیاڵین و هێندێکیشیان راستن. پێم گوت: هێندێك غیرەت وەبەر خۆت نێ. ✱ بۆ ئەم زەرەرو زیانانە زۆرمان خەم خواردووە، بەڵام زۆر بە دەگمەن توانیمانە وەزعەکە باشتر بکەین.
← گریان بۆ، داخی کەسێ دەربڕین سەبارەت بە.
٥٠٢٨/ 1628- فرمێسك سڕینەوە، پاك کردنەوە: سەیران بە خێرایی فرمێسکەکانی پاك کردەوە.
٥٠٢٩/ 516- (بە چاوتروکاندن) فرمێسك شاردنەوە، پێشگیری لە هاتنە خوارەوەی فرمێسك کردن: دەنگی هەروا بلیندتر دەبوو/ دەکرد، و تێدەکۆشا فرمێسکەکانی بشارێتەوە. سەیران بزەیەکی هاتێ و فرمێسکەکانی شاردەوە.
فرمێسکی شادی رشتن ← لە خۆشییان گریان.
فرۆشتن ← لەدەستچوون.
٥٠٣٠/ 1768- فرۆشتن: کاتێك قەیرانی توندوتیژی ئابووریی وڵاتی داگرت، ئەو بنەماڵەیە ناچار هەموو شتێکی خۆیان فرۆشت.
٥٠٣١/ 7040- فرۆشتن (بە پەلە)، گۆڕینەوە: ئەگەر بە قسەم دەکەی، ئەو پارانە لە جێگایەکی و بە پەلە دەفرۆشی. ئەگەر لێرە رلوەستی، پۆلیس بە تاوانی دانوستان (مامەڵە) لە بازاری رەشدا دەتگری.
٥٠٣٢/ 5706- فرۆشتن (ی ماڵ، دووکان و دارایی): پێش ئەوەی ماڵەکەیان ... بفرۆشن، هەوڵیان دا بوو پارەیەك قەرز کەن.

٨٠٤٣/ 5702- **فرۆشتن بە نرخێک:** "لە فکری فرۆشتنی، ماشێنەکەم دام."، "راستی، بە چەندی؟".

٨٠٤٤/ 5356- **فرۆشتن بە نرخی وردە فرۆشی:** فرۆشگە گەورەکان دەتوانن بە یەک دوو پێنی کەمتر لە دووکانی سیغار فرۆشەکان سیغاری خۆیان بفرۆشن.

٨٠٤٥/ -

٨٠٤٦/ 5700- **فرۆشتن بە نرخێک:** بە چ نرخێک دەیانفرۆشن؟/ بە چەندیان دەدەن؟

← ورد کردنەوە.

٨٠٤٧/ 2813- **فرۆشران بە ...، ... کران:** کۆخە کۆنەکەمان، کە وەزعێکی زۆر خراپی هەبوو، بە ٥هەزار پۆند فرۆشرا. (= ٥ هەزار پۆندی کرد).

٨٠٤٨/ 1595- **فرێدان (ی شتی زیادی)، وەلانان:** پێش ئەوە کە هیوادار بین ئەو سنعەتە کارامەیی پەیدا بکا، زۆر شتی زیادیی هەن کە دەبێ فڕێی بدرێن.

٨٠٤٩/ 939- **فرێدان، رەتکردن، وەلانان، دەست هەڵگرتن لە:** ئەمڕێ ئەم عەینەکە هی تۆ نیە کە لە کاتی تووڕە بوونەکەتدا فڕێت دابێ؟ * هەر کە باوکی مرد، هەموو دۆستەکانی وەلانا/ دەستی لە هەموو دۆستەکانی هەڵگرت.

← بەجێهێشتن، تەرک کردن، لەدەستدان.

٨٠٥٠/ 7512- **فرێدان:** ماشێنەکە وەها تێک شکابوو کە فڕێیان دا.

٨٠٥١/ 6931- **فرێدان، تووڕ هەڵدان، هاوێشتن (ی پەرەمو ...):** لەسەر تەختەکەی دانیشت و پێخەفەکانی فڕێدا.

٨٠٥٢/ 6955- **فرێدان:** لێرە هێندێک بەستەی گۆڤارە کۆن هەن کە دەمەوێ فڕێیان دەم.

٨٠٥٣/ 6926- **فرێدان:** ئێستا بەوەی لە جۆرە قووتوویەلەدا دەفرۆشن کە دەکرێ (دوای خواردنەوە) قووتووەکە فڕێ دەی.

٨٠٥٤/ 4971- **فرێدان، وەلانان:** شەڕ تەواو ببوو بەڵام هارولد هەروا جلوبەرگی سەربازی دەبەر دابوو؛ کاتێک ئەو جلوبەرگەی وەلانا، هەرگیز ئاوا جێنتلمەن نەهاتبوە بەرچاو.

فڕێدانە خوار بە شەق ← تێهەڵدان و فڕێدانەخوار لە پلیکانان.

فڕێدانەدەر ← وەدەرنان بە پالەپەستۆ، دەرکردن.

٨٠٥٥/ 6930- **فرێدانەوە، هاوێشتنەوە، تووڕ هەڵدانەوە، لێدانەوە:** بەستەی کاغەزەکانی فڕێداوە ئەو سەری مێزەکە.

٨٠٥٦/ 7074- **(لە خۆشیان) فڕین، لەسەر ئاسمان بەند نەبوون، داوەت یان شاییی دەڵدا گەڕان:** بەم جۆرەو، سەرەنجام کابرای لاو/ گەنج عەلاقەی پەیدا کردبوو (بە کچەکەی)و دەیویست ئەوێ رۆژێ پاش نوێژێ بێ لە دوای کچەی. بۆیە، شەپۆل سەرانسەری دوای نیوەڕۆیە شایی دەدڵ دا دەگەڕا.

٨٠٥٧/ 5674- **فریودان، رێ لێونگرتن، هەڵفریواندن:** دەوڵەتی تازە دوو نەفەر وەزیری لە حیزبە میانەڕەوەکان هەڵبژاربوو. ئەوانە بە هۆی هێزی راکێشەری وەزارەت هەڵفریوابوونو پشتیان لە بۆ حیزبەکەی خۆیان کردبوو.

٨٠٥٨/ 4094- **فریودان، هەڵفریواندن:** سەبارەت بە زۆر ترێژەری لاو کە هەڵیان فریواندوونو دوایەش دیتوویانە کە زۆریان زەرەر کردووە زۆرم بیستووە.

٨٠٥٩/ 3437- **فریودان، هەڵفریواندن، لە داوخستن، هەڵخەڵەتاندن:** بە روونی دیار بوو کە تاوانبارە بەتەمەن ترەکە هەڤاڵەکەی خۆی فریوداوە بۆ ئەوەی لە بڕینی نیدارەی پۆستدا یاریدەی بدا.

٨٠٦٠/ 2321- **فریودان، فێڵ کردن، کڵاو لەسەر نان، بە کەر زانین، دەست بڕین:** رێگام بدە با کورتو کرمانجی پێت بڵێم کە نەچارە فریو ناخۆم.

٨٠٦١/ 1672- **فریودان، هەڵخەڵەتاندن:** لەمێژساڵە فریویان داوین کە چاوەڕوانی باشتر بوونی وەزعی ئابووری بین.

٨٠٦٢/ 1650- **فریودان، کڵاو لەسەرنان، هەڵخەڵەتاندن ... دەلەستی کەسێک پەستاوتن:** فریویان دایەن و خانوویەکیان پێ فرۆشتین کە دەبوو بڕووخێندرێ.

٨٠٦٣/ 1024- **فریودان، کڵاو لەسەر کەسێک نان، فێڵ لێکردن:** ئاگات لەو کابرایە بێ. ئەگەر وشیار نەبی، فێڵت لێدەکاو هەموو پارەکەت لێدەخوا.

فریودان ← کەڵکی خراپ وەرگرتن لە، هەڵخەڵەتاندن، کڵاولەسەر کەسێک نان، رازی کردن (بە قەولو بەڵێنی)، وەسەر پەراندن.

٨٠٦٤/ 4738- **فشاردان، بە فشار (بەکلیوفشار) دەرهێنان:** بەشە جۆراوجۆرەکانی مۆدیلی ماشێنەکەیان لەسەر کارتۆنەکەی چاپ کردووە. تەنیا کارێکی دەبێ بیکەی ئەوەیە کە بە فشار دەریان بێنیو سواری یەکتریان کەی.

← پانو فلچ کردنەوە.

فشار لەسەر بوون ← فشار (= گووشار) بۆ هێنان.

فشار هێنان بۆ ← گووشار هێنان بۆ، گووشار خستنە سەر.

٤٥٦٥/ 5008- فشار (= گوشار) هێنان بۆ، فشار خستنە سەر...: فشاریان بۆ شوورای شار هێناوە بۆ ئەوەی سیاسەتی ماڵ دروست کردنەکەی بگۆڕێ.

٤٥٦٦/ 2461- فشار هێنان بۆ خۆ، گوشار خستنە سەر دەمار، تێکشکاندن: مەیڵە کارەکەت فشارت بۆ بێنێ. کاتێک لە دایرە دێیەدەر، هەوڵ بدە کارەکەت فەرامۆش کەی.

٤٥٦٧/ 3883- فش کردنەوە، گوشاد کردنەوە: ئەوەندە قەڵەو بووم کە دەبێ بدەم بە بەرگدروو چەند ئینچ شۆرتەکەم بۆ گوشاد کاتەوە.

٤٥٦٨/ 5092- فکر کردنەوە لە، بیر لێکردنەوە: چەندین سەعات فکری لە حیسابەکان کردوە بێ ئەوەی سەرەودەرمیەکیان لێ بکا.
← لە فکری شتێک دابوون، بیر کردنەوە.
فکر کردنەوە لە رابردوو ← کەوتنە بیری رابردوو.
فکر لە شتێک کردنەوە ← لە فکری شتێک دابوون، دەبیری شتێکەوە راچوون.

٤٥٦٩/ 6909- فکر لێکردنەوەو بەسەرداچوونەوە، وردبوونەوە: بە دەست پێکردنی رۆژێکی دیکە، ناچار بوو بەسەر مەسەلەکان دابچێتەوەو وردیان بداتەوە، وەزعییەتی خۆی هەڵسەنگێنێ و بزانی لە چ حاڵێک دایە.

٤٥٧٠/ 1018- فکر لێ کردنەوە، بیر لێکردنەوە: وەختێکی زۆرت هەبوو بیری لێ بکەیەوە: هەرئێستا وەڵامەکەم دەوێ.

٤٥٧١/ 1017- فکر لێکردنەوە، بیر لێکردنەوە: هەتا سبەینێ دەرفەتت دەدەم فکر لە پێشنیارەکەم بکەیەوە. دەتوانی قبووڵی بکەی یان نەیکەی.
← بیر کردنەوە.

٤٥٧٢/ 6908- فکر لێکردنەوەو نەخشە دارشتن بۆ: بۆ فکر لێکردنەوەو دارشتنی نەخشەیەک کە چ شتێک دەتوانێ رێگا چارەیەکی درێژخایەن بێ، دەرفەتێکی زۆر کەمان هەیە.

٤٥٧٣/ 6907- فکر لێکردنەوە: 'مەشکیلەیەک نیە، هەر فکریشی لێنەکەوە.'

٤٥٧٤/ 3196- فکر و بیری کەسێک بە خۆیەوە خەریک کردن، فکری هاتن دە مێشکەوە: مەسەلەیەک فکر و بیری بە خۆیەوە خەریک کردووی، بەڵام هێشتا نیگەران نی، وا نیە؟

٤٥٧٥/ 7276- فکر یان بیر لە وەزعی خۆ کردنەوە، هۆش هاتنەوە بەرخۆ، وەهۆش هاتنەوە، وەخەبەر هاتنەوە: ئەوانە دەبێ وەخەبەر بێن و ئەو گیروگرفتانە ببینن کە پەخەیە گرتوون.

٤٥٧٦/ 6895- فکر یان بیر لێکردنەوە (ئیستلاحی، زیاتر 'پێویست ناکا زیاتر فکری لێ بکەیەوە، مەگەر نا؟ ئەگە پێشنیارەکە قبووڵ نەکەی، مەسەلەیەک نیە'.

٤٥٧٧/ 5055- فکری خۆ دانە سەر، فکری خۆ خستنە سەر شتێ: ئەگەر هەموومان فکرمان بدەینە ئەو مەسەلەیە بێگومان دەتوانین چارەسەری کەین.

٤٥٧٨/ 6899- فکری شتێک کردنەوە، لە فکری ... دابوون: سازماندەرێکی/ رێکخەرێکی زۆر باشە، چونکە فکری هەموو شتێک دەکاتەوە.
فکری شتێک لەسەر دان ← لە فکری شتێک دابوون.
فکرێک هاتنە پێش بۆ کەسێک ← خەیاڵێکی وەها لە سەری کەسێک دان.

٤٥٧٩/ 1777- فکری کەسێک لەسەر شتێک وەلا بردن: هاتنی یەکێک لە دراوسێکان فکری لەسەر ئەو مەسەلە پڕ لە داخە کەمێک وەلا برد.

٤٥٨٠/ 7359- فکری یان مێشکی کەسێک راحەت نەبوون: لە بارگرانی: بە هۆی ئەو هەموو کارەی هەیەتی فکری پەرێشانە.
فەخر فرۆشتن ← بەخۆ نازین.

٤٥٨١/ 4876- فەرامۆش کردن، وەلانان، چاوپۆشی لێکردن: لە کاتی ئەمرانی ئەمڕۆدا، دەبێ تێبکۆشین هەموو دژایەتی و ناکۆکییە حیزبایەتی و چینایەتییەکان فەرامۆش کەین/ وەلا نێین.
← لە بیرچوونەوە، لەبیر خۆ بردنەوە، بیر لێنەکردنەوە، وەلانان.

٤٥٨٢/ 3534- فەرامۆش نەکردن، لە بیر نەکردن، لە بیرنەچوونەوە، لەبیر نەبردنەوە: هەتا ئەو کاتەی مەبەستی سەرەکیت لەبیر ناچێتەوە، هیچ هۆیەک نابینم کە بۆچی نابێ هێندێک سەرگەرمی لە ژیان دا پێک بێنی؟
← لە بیر نەکردن، لەبیر بوون.

٤٥٨٣/ 2371- فەراهەم کردن بۆ، ئامادە کردن بۆ، دان بە: ئەو شەریکەیە بەرەندەی کونتراتی فەراهەم کردنی پۆتین بۆ ئەرتەش بوو.

٤٥٨٤/ 1370- فەرمان بەڕێوە بردن، لەبەرچاوگرتن: کاتێک دەبی بە ئەندامی یانەیەک دەبێ بەڵێنی بدەی رێسای نێوخۆیی ئەو جێگایە بەڕێوە بەری.

٤٥٨٥/ 1311- فەرمان بەرێوە بردن، بە قسەکردن: تەنیا قسەیەك بەس بوو بۆ ئەوەی سەگەکەی بە قسەی بکا.
← وەلامدانەوە.
٤٥٨٦/ 4373- فەرمان بەسەردا ئینان، رەفتارکردن: دەمەوێ بڵێم/ مەبەستم ئەوەیە کە بڵێم ئەو مافی ئەوەی نیە کە لەو کاتەدا فەرمانم بەسەردا لێبدا.
٤٥٨٧/ 1702- فەرمانداان لەسەر دەستوور پێدان، ئاغایەتیی لەسەر کردن: نامەوێ دەستوورم پێبدا/ ئاغایەتیم لەسەر بکا.
٤٥٨٨/ 4377- فەرمان دان بە سەربازان بۆ ئەوەی لە خەتی پشتەوە را بەرەو خەتی پێشەوەی بەرەی شەر بچنە پێش: بۆ بەهێزتر کردنی ئوختەیەك لە خەتی پێشەوە، فەرمانیان بە دوو گرووردانان دا بەرەو خەتی پێشەوەی بەرەی شەر پێشرەوی بکەن.
٤٥٨٩/ 5503- فەرمانرەوایی کردن لەسەر، حکوومەت بەسەر داکردن، دەسەلات بەسەردابوون: هێزە ئورووپایی‌یەکان ئیدی هیچ دەسەلاتێکیان بە سەر وڵاتانی ژێر دەستیان دا نەماوە.
٤٥٩٠/ 5270- فەرمانرەوایی کردن لەسەر، حکوومەت بە سەرداکردن: ناچار بوو ئەو وڵاتەی بیست ساڵ فەرمانرەوایی بەسەردا کردبوو بەجێبێڵێ.
٤٥٩١/ 872- فەرمان پێدان دەستووردان بە (تۆپخانە، هێزی هەوایی بۆ هێرش کردنە سەر دوژمن): ئەگەر دوژمن بەرەو رووتەن بێتە پێش، لە رێگای بێتە لەوە دەستوور دەدەم بە پێی بەرنامەی دارێژراو تۆپبارانی کەن.
٤٥٩٢/ 1242- فەرموونە (ژووری/ سەری/ خواری/ دەری): فەرموو وەرە ژوورێ کەمێك قسەی خۆشی بۆ بکەین. ● فەرموو وەرە سەری؛ دەرگاکە ئاوالەیە.
فەرق دانان ← جیاوازی دانان.
٤٥٩٣/ 435- فەقیر بوون، دەستکورت بوون، دەستەنگ بوون، هەژاربوون: باوکی مامۆستایەکی فەقیر بوو.
٤٥٩٤/ 6202- فیچقە کردن: بە سەرهەڵدنێیەك توند لە توتۆکەی داو لە ناکاودا شەربەتەکە بە سەر ژاکێتەکەیدا فیچقەی کرد.
٤٥٩٥/ 2656- (لە بەرامبەر...دا) فیدا کردن، بەخشین، دان: لە بەرامبەر دەستێك لیباسی هەڵپەرکێ (باڵە)دا، سەیران حازر بوو چاریشی بدا.
فیدا کردن ← نەزر کردن، گیانی خۆ بەخشین.
فێر (ی کاری خراپ) کردن ← دنە دان.
٤٥٩٦/ 6335- (بە تەواوی) فێر بوون، دەرهاتن، کارامە بوون: سەربازێکی پەروەردە کراو کە پشکنینی جۆرەی غەزایی و رێژە رۆیشتن بە تەواوی فێر بووبێ، دەکرێتە بەرپرسی سەربازە تازەکان.
٤٥٩٧/ 40- فێر(ی "مواد مخدر") بوون، خوو گرتن بە، موعتاد بوون: هەر لە تافی لاوەتی‌یەوە فێری کێشانی "مواد مخدر" بوو.
٤٥٩٨/ 5189- (لە رێگای کتێب خوێندنەوە، قسە) فێربوون: پێویستە بۆ دەرسە نەزەرییەکان بچن سەر کلاس. دەشتوانی لە کتێبخانە (لە رێگای کتێب خوێندنەوە) فێریان بی.
٤٥٩٩/ 2487- فێر بوون، خوو بە شتێك گرتن: منداڵەکان فێر ببوون هەر کە لە قوتابخانە دەگەرانەوە، تەلەویزیۆنەکەیان هەڵدەکرد.
٤٦٠٠/ 6592- فێربوون (بە پێداچوونەوە یان خوێندنەوە): لە ماوەی پشوودانەکەدا دەبێ فیعلە بێقاعیدەکان فێر بی.
٤٦٠١/ 3730- (بە شێلەو زاڵەوە) فێربوون، وەرگرتن: ئێرما بە بەکارهێنانی نەفامانەترین زاراوەی وەك "خەزێنەکەم" یان "کۆترە باریکەکەم"و شتی لەو بابەتە بانگی دەکاو، ئەویش هەمووی ئەوانە فێر دەبێ. ● ئەو هەموو دەستوورەکانی تۆ بەرێوە دەبا. لەراستیدا بە دڵخۆشی‌یەوە وەریان دەگرێ.
فێربوون لە ← پەند وەرگرتن لە، ئامادە کردن، بەجێگەیاندن، تێگەیشتن، هەڵمژین.
٤٦٠٢/ 2408- فێر کردن، رێنوێنی کردن، پێگوتن: یەکێك لە قوتابی‌یەکانی پۆلی دووهەم براکەی رێنوێنی کردبوو کە سەرۆکی قوتابخانە گۆچانەکەی لە کوێ دادەنێ و، ئەویش لە وەختی نوێژیدا چووبوو نێو هۆدەی متالای سەرۆکەو گۆچانەکەی دزیبوو.
٤٦٠٣/ 3364- فێرکردن، تەلقین کردن: بە روونی دیار بوو کە ئەو بەوبروا سەیرو سەمەرەیە بە میوانەکانمان تەلقین کراوە کە گۆیا دنیا لە ساڵی ١٩٨٤دا تەواو دەبێ.
٤٦٠٤/ 5086- فێرکردن: کابرایەکی پسپۆر ببیننەوە کە لە کەمترین ماوەی گونجاودا ئەو کارەی فێرکا.
٤٦٠٥/ 1906- فێر کردن (بە راهێنانێکی زۆر): رستە نموونەکانی زمانیان بە راهێنانێکی زۆر فێر کردن.
فێری کار خراپ بوون ← زیان دیتن.
٤٦٠٦/ 5995- فێزەماڵك دان، بە دزی رۆیشتن، خۆ دزینەوە: پێشنیاری بە خۆشنار کرد پێش نانی نیوەڕۆیە خۆیان بدزنەوەو مەشرووبێك بخۆنەوە.

← بۆی دەرچوون، بەپەلە ڕۆیشتن، دووری کردن لە.

٤٦٠٧/ 5989- **فیزماڵەکەدان، بە دزی ڕۆیشتن، (بۆی) دەرچوون، بە لەسپایی ڕۆیشتن، خۆ دزینەوە:** ئەگەر دەتەوێ فیزماڵکی بدەیەی، ئێستا وەختێتی. هەموو خەریکی هەڵپەرکێن.

٤٦٠٨/ 1001- **فێڵ کردن، گزە کردن:** کاتێک پێیان زانی کە لە تۆمارێدا فێڵان دەکا، داوایان لێکرد لە ئەندامەتی یانە/ باشگا دەست هەڵگرێ.

٤٦٠٩/ 3186- **فێڵ لێکردن، کڵاو لەسەر کەسێک نانان:** خەریکی بە جێگەیاندنی ئەو کارە بوو کە حەقدەستیان دابوویە، بەڵام هەستم دەکرد کە نیوەی وەختەکە فێڵم لێدەکا. ● پێم وابوو کە کابرای سەوزی فرۆش فێڵمان لێدەکا. بۆیە لە ماڵێ سەوزییەکانمان دەکێشاوە.

٤٦١٠/ 6572- **فێڵ کردن، لێدەرفرتاندن، لێدەرهێنان:** لێی گەڕێ با خۆش بێ. سێ پۆندیان لێدەرفرتاندووە (= سێ پۆندیان فێڵ لێکردووە).

فێنک بوونەوە ← هاتنەوە سەرەخۆ.

٤٦١١/ 1439- **فێنک بوونەوە، هاتنەوە سەرەخۆ:** شوکور بۆ خودای، هەواکەی فێنک کردووە؛ ناتوانم زۆر لە هەوای گەرمدا بژیم. ● ئەو دوو پیاوە لێک دوور کەنەوە؛ با بێنەوە سەرەخۆ.

٤٦١٢/ 1440- **فێنک بوونەوە، هاتنەوە سەرەخۆ، خاو بوونەوە:** شەپۆل گوتی "دەمەوێ بێمەوە سەرەخۆ. دەمەوێ جەنگەڵی فێنک بمەوە."

٤٦١٣/ 7326- **قاپ شووشتن یان شۆردن:** لە ڕۆژی پشووەدانی خزمەتکاردا، ئەو بۆ قاپ شوشتن یاریدەی سەمیرانی دابوو.

٤٦١٤/ 5191- **قازانج کردن، خێر دیتن لە:** بەو جۆرە کە بە هیوا بووین، لە پەیکەرەکانی چینی قازانجمان نەکرد.

٤٦١٥/ 4173- **قازانج کردن یان بردن/ وەرگرتن:** شێرزاد حازر بوو ماشینەکەیم هەر بەو نرخە پێ بفرۆشێتەوە کە پێی دابوو. دەمیگووت نایەوێ قرانێک/ فلسێک قازانج وەرگرێ.

٤٦١٦/ 3180- **قازانج کردن (یەکجار زۆر) زەوەر کردن، لە ڕادە بەدەر:** دەتوانی لەوە ئەرخەیان بێ کە کاتێک قازانجە باد ئاوەردەکە دابشکەین، فیلیپ قازانجێکی زۆری لە دابەشکردنەکە وەدەست دەکەوێ.

← وەدەست هێنان.

قازانجێکی زۆر وەچنگ کەوتن ← کاتێک کاروانی... بگاتە جێ.

٤٦١٧/ 5985- **قاش کردن، برین:** کاتێک کێکێک لە فێر/ فڕنی دەردێنن، پێم خۆشە زوو بیبڕم.

٤٦١٨/ 3746- **قاقا پێکەنین بە، بە دەنگی بەرز پێکەنین بە:** کاتێک لە ئەرزی هەڵدەستاوە، دیتی کە دوو کوڕ قاقا پێی پێدەکەنن.

قاڵ کردن ← تواندنەوە.

قامک دانان لەسەر ← ئەنگوست یان قامک دانان لەسەر، ئاماژە کردن بۆ.

٤٦١٩/ 4994- **قامک دەمچاوی کەسێک نان:** کاتێک زانی ئۆریەتی قامکی دەمچاوی نێن، ڕەنگی بە ڕوویەوە نەما.

٤٦٢٠/ 5697- **قامک لەسەر دانان، قۆستنەوە:** زۆر بە خێرایی کەمێ کوورییەکی لە باسەکەدا قۆستەوە.

٤٦٢١/ 4993- **قامک لەسەر دانان:** هەروەک هەمیشە لە ئەزمەرەکانی چیا دا ناتەبایی هەبوو؛ لەسەر ئەو بڕوایە بووم کە لە جێگایەکدا نارێکییەک هەیە، بەڵام نەمدەتوانی قامکی لەسەر دابنێم.

← تێگەیشتن قامک لەسەر دانان.

قامک لێڕاوەشاندن ← دەرهێنان.

٤٦٢٢/ 6479- **قامکی گەورەی پێ لە شتێک کوتان، دەست تێ هەڵسوون:** قامکی گەورەی لاقم دەپلیکانی پێشەوەی ماڵەکەتان کوتا. یەکجار زۆر ئێشا.

٤٦٢٣/ 6029- **قانگدان (وەدەرپەڕاندن):** بۆ دەرپەڕاندنی مشکان، لوولەیەکمان لە ئێکزۆزی ماشینەکە وەسڵ کردو قانگمان دان.

٤٦٢٤/ 4514- **(لە ئەرزی) قایم کردن (بە گوڵمیخان)، داکوتان و قایم کردن:** لە باو باراندا داکوتانی چادرەکە کارێکی دژوار بوو.

٤٦٢٥/ 3282- **قایم کردن، پێوەلکاندن، ڕاگرتن:** پاژنەی کەوشەکانی تەنیا بە چەند تەقەڵانەوە ڕاگیرابوون. ● ئەو کارە چەسپی تایبەتی دەوێ. ● ئەو چەسپە مەعمووڵییانە ناتوانن ئەو دەستەکە ڕاگرن.

٤٦٢٦/ 7039- **قایم و پتەو بوون:** بۆ ئەوەی بەدەنی قایم و پتەو بێ پێویستیی بە گۆشت خواردن و وەرزشی سەخت هەیە.

٤٦٢٧/ 5641- **قبووڵ بوون، تێپەڕکردن، سەرکەوتن (بە حاڵە حاڵ):** لە جانەوەر ناسیدا زۆر هاسان قبووڵ بوو، بەڵام لە گیاناسی بە حاڵە حاڵ سەرکەوت/ قبووڵ بوو.

٤٦٢٨/ 4854- **قبووڵاندن، سەلماندن، چەسپاندن، بردنە پێش:** داخوازەکەی خۆی لەسەر ئەوە کە میراتگرێکی قانوونییە بردە پێش.

٦٦٢٩/ 5638- **(به حاڵه حاڵ) قبووڵ بوون، دەرچوون بۆ:** ئەگەر توانیویتی به هەزار حاڵه حاڵ بۆ دەبیرستان قبووڵ بێ، دەبێ شانسێکی زۆر بێنێ بۆ ئەوەی بتوانێ جێگایەك لە زانستگه وەدەست بێنێ.

٦٦٣٠/ 4447- **(له ڕێگای تاقیکارییەوە، لێهاتوویی ناسانەوە) قبووڵ بوون:** به لانی کەمی نومرەی تاقیکارییەوە بۆ ساندەورت قبووڵ بوو.

٦٦٣١/ 2453- **قبووڵ بوون، تێپەڕ بوون، خەلاسی هاتن لە، ڕزگار بوون لە پشکنین:** چیا جاکێتی تایبەتی میوانێتی دەبەر دابوو، بەڵام، پێیان گوت ئەگەر جلو بەرگێکی رەش دەبەر کا، دەتوانێ تێپەر بێ و/ لە پشکنینو لێ پرسین رزگاری بێ و ژوور.

٦٦٣٢/ 5094- **قبووڵ بوون لە تاقیکاری، دەرچوون:** لە شاری لەندەن لە تاقیکاری بۆ گرتنەوەی دەرسی ئینگلیسی لە هەندەران دەرچوو.

٦٦٣٣/ 2806- **قبووڵ کران، گیران، پەسند کران:** (بە دزی) گوتم ئەلوم جێنسی براکەوزەو زۆر باش گرتی. ● شێرو ڕێزی‌یەکانی کامران سەبارەت بە دەرەنگ هاتنەوەی قبووڵ نەکرا (= نەیگرت). چونکە ژنەکەی هەر زۆر زوو زانی چ باسە.

٦٦٣٤/ 498- **قبووڵ کردن، مل ڕاکێشان بۆ:** ئەو کچە ناتوانێ قبووڵ کا باوکو دایکی بچن بۆ میوانی‌و بۆ خۆی لە ماڵێ بێنێتەوە.

← (بە هاسانی) ئەنجامدان.

٦٦٣٥/ 3815- **(بە خێرایی) قبووڵ کردن، بێ سێ و دوو لێکردن ومرگرتن، قۆستنەوە:** ئەگەر بەشێکی چکۆلە لە بەرهەمی تازەی پێشکەش بکا، دەیلۆزمەوە. ● دەرفەتیان خستە بەردەستی‌و ئەویش زوو قۆستی‌یەوە.

٦٦٣٦/ 3332- **قبووڵ کردن، وەك یەك چاو لێ کردن، وەك یەك بەراورد کردن:** بە نزیك بوونەوەی هێزەکانی دوژمن، فەرمانداری شار رایگەیاند کە سیاسەتی دەوڵەتی ناوەندی قبووڵ نیە. ● ڕێبەرانی خوێندکاران کاربەدەستانی زانستگەو هێزەکانی کۆنەپەرستیی وەك یەك چاو لێدەکەن.

٦٦٣٧/ 58- **قبووڵ کردن (لە):** زەحمەتە بتوانم مەرجەکانی تۆ قبووڵ کەم.

قبووڵ کردن ← سازان دەگەڵ، تەئیید کردن، وەدەستو گرتن، بەدەستەوە گرتن، پێ قبووڵ کردن، تەسلیم بوون لە بەرامبەر، (ئازایانە) بەرەوروو بوون دەگەڵ، وەئەستۆ گرتنی ئەرکێك.

٦٦٣٨/ 2680- **قبووڵ نەکردن، بەرپەرچدانەوەی قسەی کەسێك:** باسەکە لەسەر ئەوە بوو کە چۆن دەکرێ پێشی ئەو دەنگۆیە بگرنو بەرپەرچی بدەنەوە.

← رەت کردنەوە.

قڕ کردن ← بە کوشتدان.

قڕوقەپ کردن ← دەست کێشانەوە.

٦٦٣٩/ 4964- **قسە بە زیانی (= بەرژاری) کەسێکەوە کردن:** 'تێ دەگەم کە بۆ من جێگاتان نیە.'، 'کێ دەڵێ نیمانە؟ سەیران، بۆ بە زبانی منەوە قسان دەکەی؟'

قسە پێ برین ← ڕاگرتن (لەنەکاو).

٦٦٤٠/ 3174- **قسە ڕاوێشتن، قوڵێ نانان، تەنشیر دانسان، لەسەر...:** ئەوانە لە سەر دیاریکردنی داهاتووی خۆیان تەنسوریکی تەواویان هەیە. ● نوێنەرانی ساکاری پارلمان بۆیان هەیە پێیان وابێ کە لە سەر دیاریکردنی سیاسەتەکان تەنسوێکی ئەوتۆیان نیە.

٦٦٤١/ 6804- **قسە کردن (بە هەرهەڵەو گوێرەڵەوە هەر دەسەی قسێك گوتن):** لەسەرەتادا دەوڵەت بەڵێنی دەدا نرخەکان بێنێتە خوارێ، دوایەش لە بەرامبەر داخرلز بۆ بردنە سەری پارەمەتی‌یە مانگانەکان، کە دەبێتە هۆی ئاوسانیی درلو، تەسلیم دەبێ - بەوەی دەڵێن پیاوی قسەی خۆی بوونا

٦٦٤٢/ 2393- **(پس پس) قسە کردن، درکاندن:** کابرای لە حاڵی ئاریلکاندا چەند وشەیەکی درکاندو لە باوەشی‌دا تەولو بوو.

٦٦٤٣/ 2376- **(یەك پشوو) قسە کردن، بێ‌نێوبڕ قسەکردن؛** لە حاڵێکدا ژنە کارەکەرەکە خەریك بوو مێزو سفرەکەی خوارێن دەکردەوە، ئەو دوو ژنە یەك پشوو قسەیان دەکرد.

قسە کردن (بێ‌نێوبڕ) ← یەك پشوو قسە کردن، بێ‌نێوبڕ قسە کردن.

قسە کردن (بە دەنگی بەرز) ← بانگ کردن، گوتن.

قسە کردن لە دژی ← ئەزمردان، یان قسەکردن لە دژی.

٦٦٤٤/ 6105- **قسە کردن بۆ داکۆکی کردن لە، دیفاع کردن لە:** هێندێك لە نوێنەرانی مەجلیس خۆیان ئامادە دەکەن کە بۆ داکۆکیی کردن لە هێنانە گۆڕی سزای مەرگ لە بەرامبەر ئەو جینایەتانەدا قسە بکەن کە بە هۆی تەقینەوە دێنە پێشێ.

٦٦٤٥/ 4367- **قسە کردن بە ئازادی‌و بە بێ‌شاردنەوەی شتێك:** تەنیا کاتێك چەند پێك مەشرووبی خواردبۆوە، توانی بە ئازادی‌و بێ شاردنەوەی هیچ شتێك قسەکانی بکا.

٤٦٤٦/ 6103- **قسە کردن بە دژی یان لە دژی بابەتێك**: لە پێشدا لە دژی هێنانە گۆڕی ئەو یاسایە قسەی دەکرد، ئێستاش پێی خۆشە پشتیوانی لێبکا.

٤٦٤٧/ 6104- **قسە کردن بە نوێنەرایەتیی یان لە جیاتی**: کاتێك کە دەڵێم سوپاسی خانەخوێ دەکەم، بە نوێنەرایەتیی هەموومان قسە دەکەم.

٤٦٤٨/ 6110- **قسە کردن دەربارەی، وتارێك لەسەر**: لە کۆبوونەوەی داهاتوودا، ئاغای مەك دونالد لەسەر گەشە کردنو هەڵدانی چاپ قسان دەکا.

٤٦٤٩/ 6811- **قسە کردن دەربارەی، باسکردن**: هەواڵنێرەکانی بی‌بی‌سی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، چەند هەفتەیەك بوو کە بێجگە لە مەسەلەی واترگیت کەمتر باسی شتی دیکەیان دەکرد.

← دەست پێکردن بە گێڕانەوە.

٤٦٥٠/ 104- **قسە کردن دەگەڵ (کەسێك سەبارەت بە ...) چوونە لای کەسێك (بۆ داواکارییەك)**: داخوا بۆ وەرگرتنی ئیجازەی ڕۆژێك پشوودان چوویە لای سەرۆکی ئیدارە؟

٤٦٥١/ 6112- **قسە کردن دەگەڵ**: هێندێك دایە گەورە بڕوێنە؛ ئەو زۆر کەم دەرفەتی وای دەست دەکەوێ کە دەگەڵ لاوەکان قسان بکا.

٤٦٥٢/ 1432- **قسە کردن دەگەڵ**: ئەگەر دەتانەوێ دەگەڵ خەڵکی ژاپۆن قسان بکەن، بۆ زمانی ژاپۆنی فێر نابن؟

← تێگەیاندن.

٤٦٥٣/ 357- **قسە کردن دەگەڵ، چوونە لای کەسێك بۆ قسە کردن سەبارەت بە**: هەر ئێستا لە لای کارمەندانی حیسابداری بووم (قسەم دەگەڵ کردن). پێم وایە بتدەنێ (ئەو پووڵە).

٤٦٥٤/ 3218- **قسە کردن دەگەڵ، باسکردن دەگەڵ**: 'ئاغا، دەتوانم یەك دوو مەسەلە همن دەگەڵتان باس بکەم؟'. • سەرکۆلی دیسانیش هۆزەکەی بە شپرزەیی بەجێ هێشتووە. گیانە، قەراربوو لەم بارەوە قسەی دەگەڵ بکەی.

٤٦٥٥/ 6806- **قسە کردن دەگەڵ کەسێك (بە گوێرە گەوریان بە لووت بەرزییەوە)**: بە سەرم دامەگووڕێنە، قسەم دەگەڵ بکە. ئێستا ئیدی لە کلاسی دەرسی نین.

٤٦٥٦/ 6113- **قسە کردن دەگەڵ کەسێك سەبارەت بە شتێك**: ئەو بۆڕییانە کەهو کووڕییەکیان هەیە، دەبێ دەگەڵ خاوەنمولکەکە لەم بارەوە قسە بکەم.

٤٦٥٧/ 6596- **(بە ڕاشکاوی/ دەقو دۆغری/ بێ پێچو پەنا/ رووقەو راست/ ساف و پووست کەندە) قسە کردن دەگەڵ کەسێك**: ئەو کابرایە هەمیشە دە نگی رادیۆکەی هەتا ئاخرین دەرەجە بلیند دەکا. وەختی ئەوە هاتووە لەم بارەوە دەقو دۆغری قسەی لەگەڵ بکەین.

٤٦٥٨/ 6102- **قسە کردن لە، باسی بابەتێك کردن**: کاتێك هاتنە ژوور، باسی چتان دەکرد؟

٤٦٥٩/ 3624- **قسە کردن لەسەر شتێك بە شێوەیەکی گشتیو ڕەسمیو بە مەبەستی لێ‌ئەزموون وەرگرتن**: دوای تاقیکارییە پزیشکییەکان، پزیشکی راوێژکار خوێندکارەکانی بانگ کرد بۆ ئەوەی بیروڕوای خۆیان لەسەر چلۆنایەتیی نەخۆشییەکە بڵێن، بەو مەبەستە کە بۆ وەدەست هێنانی ئەزموونێکی باش وەڵامیان بێنن.

٤٦٦٠/ 6814- **قسە کردنو لێنەبڕینەوە، ڕستن**: پێکەومان لە سیاسەتدا سەردەکەوێ -دەتوانێ قسان بکاو قەت لێی نەبڕێتەوە./ هەر بیڕیسێ.

(بێ پسانەوە) قسە کردن ← ڕستن.

٤٦٦١/ 6812- **قسە لە شتێك کردن، هێنانە گۆڕی باس لە شتێك**: لە قۆناخێکدا، باسی دەست هەڵگرتن لە کارەکەی لە شەریکەی بانگەشە دامێنایە گۆڕێ بەڵام هیچی لێ شین نەبووە.

← باسی شتێك هێنانە گۆڕ.

٤٦٦٢/ 6803- **قسە لێکردن**: بەڵێ، لەمێژساڵ بوو باسیان لەوە دەکرد کە بچنو لە دێی بژینو لە چنگ فشاری ڕووحیی ژیان لە شار ڕزگاریان بێ، بەڵام لەو هەموو قسانە هیچ شین نەبووە.

٤٦٦٣/ 1054- **قسە لێك هەڵبەزینەوە، بەگژ یەکدا چوون، تووڕەی دەمەقاڵە بوون، لێك هەڵبەزینەوە**: لەسەر میللیی کردنی سنعەتی پۆلاسازی ئاغای ویلسون دەگەڵ سوئالێك تووشی دەمەقاڵە بوو.

← بە گژ داهاتن، نێوان تێکچوون.

٤٦٦٤/ 6821- **قسە و باس دەگەڵ کردن**: هەمیشە لەوە گلەیی دەکا کە کەسیان لێ‌نزیك نیە کە بتوانێ قسەوباسانی دەگەڵ بکا.

٤٦٦٥/ 6522- **قسە و کردەوە وەك یەکبوون**: سیاسەتمدار/ پیاوی سیاسی دەبێ قسەو کردەوەی وەك یەك بێ.

قسەی باش بۆ کردن ← ناوبژیوانی کردن.

قسەی چاك بۆ کردن ← ناساندن.

٤٦٦٦/ 4932- **قسەی چاك کردن بۆ، بە قازانجی کەسێك شتێك گوتن**: کاتێك کە کابرای پۆلیس دەگەڵ خۆی دەبرد گوتی: 'وەرە، ماری، بە قازانجی من شتێك بڵێ دەیلێی؟'.

قـــەی خۆ بڕین ← بێدەنگ بوون.
قـــەی خۆ خواردنەوە ← پاشگەز بوونەوە.
قـــەی سـووك گرتن بە ← جنێودان.
٦٦٦٧/ 1000- **قـــەی قۆر کردن (بـۆ وەخـت گوزەرانـدن):** ســەرەرای دوو مانگ ترس‌و خۆف، وەها دەستی کردبوو بـــە قـــەی قۆڕ کە هەروەك تۆ بڵێی هـــەموو ئـــەو ڕووداوانـــە گەمـــەو گاڵتە بوون.
٦٦٦٨/ 3316- **قـــەی کەسێك بڕین (بـە هـەرا‌و هوریـا):** قـــەکانی کابرای میوانیان بە هەرا‌و هوریا بڕی‌و ماوەیەکی پێنجـــوو هەتا سـەرۆکی کۆبوونەوە وەزعەکەی هێور کردەوە.
٦٦٦٩/ 6786- **قـــەی کەسێك بڕیـن، پەرینـە نێـو قـــەی کەسێك:** 'پێم سەیرە کە ئەوەتان پێ خۆشە'، قـــەکانی بڕیـەو بـە توندی گوتی: 'ج تەغارەتێکی دەکا'.
← پەرینە نێو قسان، پەرینە نێو قـــەی کەسێك.
٦٦٧٠/ 6642- **قـــەی کەسێك قبووڵ کردن، ئەتۆ کە دەڵێـی وایـە، بـۆ من بەسە:** کامران، خۆت بەو تەوزیع دانەوە ماندوو مەکـە. ئەتۆ کە دەڵێی وایە، بۆ من بەسە.
٦٦٧١/ 5992- **قـــسەیەك نێو‌ناخن کـردن:** لـە وتـاری کردنـەوەی ڕێنو ڕەسمەکەدا یەك دوو داخوازی بۆ " اعتباری" مـــاڵی نێو ناخنی قـــەکانی کرد.
٦٦٧٢/ 2477- **قـــسەیەك نێـو نـاخن کـردن، قـــتێك گوتـن:** لەزمـــەو لەقەم، گاڵتـــەو گەمـــە، نیهانـــەو هەرەشـــە وەك بارانـــەی پەڵەی بە سەری دادەرژاو دەرفەتی ئـــەوەیان پـــێ نـــەدەدا قـــسەیەکی نێو ناخن بکا/ ڕاگەیاندنێك بداتە....
٦٦٧٣/ 5097- **قـــسەیەك هـەبوون لەسەر، گومـان لەســـەر هـــەبوون:** لەســـەر هەڵسەنگاندنەکەت لە خەرجەکان قـــسەیەکم نیە؛ بە ئەندازەی پێویـــست ماقووڵ دێتە بەرچاو.
٦٦٧٤/ 3989- **قفـڵ کردنـی دەرگـاو پەنجەرە:** کـاتێك شـــەوانە کاری تەواو دەبێ، دەرگاو پەنجەرەکان قفڵ دەکا. ● پێـــش ئەوەی بچن بۆ پشوودان دەرگـــاو پەنجـــەرەکان قفـــڵ کـــەن/ دەن.
قوتار بوون ← تەواو بوون.
٦٦٧٥/ 4699- **قوت بوونەوە، سەرهەڵهێنان:** کـامران بـــۆ مـــاوەی ســـاڵێکی تەواو بێ ســـەرو شـــوێن بـــوو، لـــە پـــڕ زیـــاد لـــە هـــەموو جێگایەکی سەری لە بۆلیوی دەرهێنا.
٦٦٧٦/ 548- **قوت بوونەوە؛ دیسان هاتنەوە (بە پێچەوانەی ئـــەوەی کـــە خەڵك پێیان ناخۆشە):** لەو جێگایانەی کە قەت فکرت بـــۆی نەدەچوو، قوت دەبێوە.
٦٦٧٧/ 3490- **قوت بوونەوە، دەرپەڕین:** چەنەگەی لە رادەبـــەدەر دەرپەڕیوە.
٦٦٧٨/ 4700- **(لە پێوەندی لەگەڵ شکڵی بەرجەستەی حـەیوان‌و شـتی لـەم بابەتـە) قـوت بوونـەوە:** 'ها، چاوت لـــێ بێ. هەرکـــە لاپەرەی کتێبەکە فشار بدەی حەیوانەکان قوت دەبنەوە.
٦٦٧٩/ 6168- **قـوت بوونـەوە (لـە پـڕ):** بەراســـتی بـــە کـــوێدا کتوپڕ قوت بوویەوە؟
قـــوت بوونـــەوە ← لـــە پـــڕ پـــەیدا بـــوون، هەڵتروشـــکان، وەبەردان‌و ڕاگرتن، سەروکەللەی کەسێك پەیدا بوون.
قوت ڕاوەستان ← خەبەردار ڕاوەستان.
٦٦٨٠/ 1103- **قوت کردنەوە، هەڵێنان:** چـــەند چرکەیـــەك پێـــش ئەوەی هیچ شتێکم گوێ لـــێ بێ، ئەســـپەکەم گوێـــی قـــوت کردبوو. ● سەگەکە بۆ ئـــەوەی مـــیزی بـــە داری کارەبـــای دابکا، لاقی هەڵێنا.
قوڕ پێوەدان ← بۆنیشتن.
٦٦٨١/ 7357- **(لـە وەرزشدا) قـورس بـوون:** کـابرای بۆکســـوور/ پالـەوانی مشـتەکۆڵە زیـاتر لـە رادەی دیـــاریکراو بـــۆ وەزنەکەی قورس‌تر بوو، بۆیە ناچار بوو بـــە تارەقـەکردن چەند پاوند لە وەزنی خۆی کەم کاتەوە.
٦٦٨٢/ 1086- **قـورس کـردن، شـل کردنـەوە:** ئەگـەر لـــە رادەی پێویـست زیاتر ڕازی لەم دەزگا ناسڵەو دەمێلە بکەن، بـــۆی هەیە کار کردنەکەی قورس بکا/ شل بکاتەوە.
٦٦٨٣/ 7410- **قورمیش کـردن:** مشـکە ناســـەکەی قورمیـش کردو لەســەر فەرشەکان بەری دا.
← هێنانە سەر شەوق.
قورو قەپ کردن ← چوونەوە دەمقاپێلکی خۆ.
٦٦٨٤/ 5699- **(بـە هـەرەوو 'گ' نەستان) قۆستنـەوە:** ئێرەمنیســـت نیویـــن دەرفەتەکـــەی قۆســـتەوەو مـــانگێك دواتـــر کۆنفرانســێکی لە پاریس پێك هێنا.
٦٦٨٥/ 3481- **قۆستنەوە:** ئەگەر کاری گەسك لێدانی تیـاترم پێ پێشنیار بکا، بێ سێ‌و دوو لێکردن دەیقۆزمەوە.
٦٦٨٦/ 4707- **قۆستنەوە، فاعك لەسەر داڵان:** ئەو منداڵـــە هـــەر هەڵەیەکی کردبا، هەرچەندە چکۆلەش، مامۆستاکەی دەی قۆستەوەو لەبەرچاوی هـــەموو قوتابییـــەکان گاڵتـــەی پـــێ دەکرد.
٦٦٨٧/ 5697- **قۆستنەوە:** کـەمێ کوورتێکـی کـە لـە شـێوەی هێنانە گۆری باسەکەم دا بوو زۆر بە خێرایی قۆستییەوە.
٦٦٨٨/ 3032- **قۆستنەوە:** کـاتێك خاوەنکارەکـان ســـەفەری هۆنگ کۆنگیان بە کچەکەم پێشـــنیار کـــرد، بێ‌ســـێ‌و دوو لێکردن قۆستییەوە.

٤٦٨٩/ 6045- **قوستنەوە، كڕين (خێرا)، پێشدەستی كـردن لـە (ئاونووسين، ناسەزران، ئۆ خواستن پـلان سێرد كـردن)**: لـەو دەورەی چلەكێشانی ئـابووریدا، هەركـە گزرەويـی پياوانـەی پلاستيكی هاتـە بـازاڕ، خـەڵك بـە پەلـەو بـە خۆشـی كڕيان. ● ئەو پێی خۆشترە لەگەڵ من بێنيتـەوە هـەتاكوو مێرد بە هونەرمەندێكی شارستانی ئەسپيۆن بكا.

قوڵت دان ← بڵقە بلق كردن.

٤٦٩٠/ 1712- **قوڵكـە بـۆ هەڵكەندن، لـە قوڵكـاندا قـارنەوە**: تانكەكانيان وەها لـە خـەندەقاندا شـاردبۆوە كـە تـەنيا لوولەی تۆپەكانيان ديار بوون.

٤٦٩١/ 5457- **قۆڵ لێهەڵماڵين**: كاتی ئەوە هاتووە كـە قۆڵـی لێهەڵماڵی و تاقە رۆژێك شەرافەتمەندانە هەڵسووڕێ.

← دەست بەكار بوون.

قوم بوون ← چوونە ژێرئاو

٤٦٩٢/ 3081- **قـوم قـوم خواردنـەوە**: مەئموورەكـەی ئاگركوژاندنـەوە فينجانێك سـووپی گـەرمی قـوم قـوم خواردەوەو دوو دەقيقەيەك هەڵوێستەی كرد. ئينجا چـووە شەڕی ئاگرەكەی.

٤٦٩٣/ 6320- **قوم نەبوون**: ئەگەر لـە بەلەمەكـەدا دە ئـاوێ بكەوی، ژاكێتی ئەجات پارمـەتيت دەدا هـەتا لـە ئـاوێ دەرت دێننەوە، قوم نەبی.

قۆنتەرات بەستن دەگەڵ ← بە قەباڵ هەڵگرتن.

قۆرت بردن ← بەلاداهاتن.

قوت دان ← خواردن، ونبوون، كێشانە ژوور.

٤٦٩٤/ 558- **قـوت دان، رۆهێنان، بە پەلـە خـواردن، هەڵڕشتن**: ئەگەر بەم چەشنە رۆی هێلێ، ميعدەت هەڵدەتەكێ.

٤٦٩٥/ 2460- **قوت دان، ئاودیو كردن (بەزەحمەت)، خواردن**: كـوڕە چكۆڵـە دەرمانەكـەی دەگـەڵ نيـو كـەوچك مرەبـا (بـە زەحمەت) قوت دا.

٤٦٩٦/ 3017- **قـوت دان، هەڵلووشين، هەڵڕشتن (ی خواردەمەنی)**: دەوڵەتـە گـەورەكان هەميشـە ويسـتوويانە دراوسـێ چكۆلەكانيان قوت دەن.

قوون تلوور كردن ← پان بوونەوە.

قوونی خۆ دڕاندن ← پشتی خۆ شكاندن.

٤٦٩٧/ 5157- **قەبڵاندن (بۆ زەوییە ئێجارگرتن)**: كرێـی سـاڵانەی خانووەكەيان ٣٠٠ پۆند قەبڵاند.

← هەڵسەنگاندن.

قەتع بوون ← بڕان، رۆیشتن (ی كارەبا)، بڕين (ی وتووێژی تەلەفونی)، داخران.

قەتع كردن ← بڕين.

قەد كردن ← پێچانەوە.

قەدری كەسێك گرتن ← ئافەرين گوتن بە.

٤٦٩٨/ 7133- **قەد كردن**: رووپۆشی جێگاكـەی قـەد كـردو لەنێو مەلافەكاندا بۆی نووست.

٤٦٩٩/ 2324- **قەد كـردن، خڕكردنـەوە**: لـە تـاوو بـانێكی زۆر خۆشدا ماشـێنيان لێدەخـوڕی و چـادری ماشێنەكەشـيان خڕكردبۆوە.

٤٧٠٠/ 1811- **قەد كـردن، بەسـتەبەندی كـردن، پێچانـەوە**: دەبـێ كەمێك لەو ليباسـانە بـۆ بـازاڕی كەنيسـە بەسـتەبەندی بكەين.

٤٧٠١/ 373- **قەدەغـە بوون**: ئێسـتا يارییـەكی خـۆش و جێدەيـان دەبـێ، بـەڵام هەرچەشـنە پاڵپێوەنـانو تەنـە لێدانێك بە توندی قەدەغەيە.

٤٧٠٢/ 4761- **قەدەغـە لێكردن، لـێ قەدەغە كـردن**: فرۆشـتنی سيغار بە منداڵانيان لـێ قەدەغە كردووە.

٤٧٠٣/ 5500- **قەدەغە كردن، مەمنوع كردن**: سـەرۆكی مـەجليس هاتنی رۆژنامەنووسانی بۆ كۆبوونەوەكە قەدەغە كرد.

قەدەم لێدان (بە خێرايی) ← پياسە كردن.

٤٧٠٤/ 1071- **قەرەی خۆ بـە ئـەوەوە دانـەوە، دانـەوە**: ئەگـەر لـە گرێو كـردن لەسـەر پێشـبڕكێی فووتبـاڵ پووڵێكـی بـاش بەرمـەوە، يەكـەمين كـارێكی دەيكـەم دانـەوەی هـەموو قەرزەكانم دەبێ.

٤٧٠٥/ 795- **قەرەباڵغ بوون، قەرەباڵغ بوون، پڕ بوون لە**: لـە شـەوی جێژنی پاكدا سەرانسـەری ئەو جادەيە پڕ دەبێ لە ماشێن.

٤٧٠٦/ 5777- **قەرەبوو كردنەوە، تێهەڵێنانەوە**: بـەڵێ، جاروبـار كابرايەكی دێزەيە، بەڵام دەبێ ئەوەشت لەبەرچاو بـێ كـە يارمەتیيەكـەی لـە كـاتی تەنگانـەدا بـە ئێمـە، دێـزە بوونەكەی قەرەبوو دەكاتەوە.

٤٧٠٧/ 139- **قـەرەبوو كردنـەوە، تێهەڵێنانـەوە**: كورەكـەت بـە هـەموو توانـاوە هـەوڵ دەدا كـردەوەی نالـەباری شـەوی رابردووی قەرەبوو كاتەوە.

٤٧٠٨/ 2655- **قـەرەبوو كردنـەوە، دانـەوە، تۆڵـە لـێسەندنەوە، دانەوە**: كـاتێك ژيلـوان كاسـبییەكەی دەسـت پێكـرد، پارەيەكی زۆری لە براكەی قەرز كرد، بەڵام كە كاتی خۆی گەيشت هەمووی بە قازانجەوە دايەوە.

٤٧٠٩/ 2058- **قـەرەبوو كردنـەوە، تێهەڵێنانـەوە، وەك يـەك هێنانەوە**: پارەكە ئێمە بوترییەكمان جێ دا بـە بنەماڵـەی

حیت، بۆیە ئەوانیش ئەمساڵ بوتریەکیان ویسکی بۆ ناردووین بۆ ئەوەی تا رادەیەك قەرەبوویان کردبێتەوە.

٤٧١٠/ 1362- **قەرەبوو کردنەوە، تێهەڵێنانەوە، سارێژ کردنەوە:** هیچ شتێك ناتوانێ ئەو برینانەی سارێژ کاتەوە کە لە ئەسادوفەکەیدا وتی کەوتوون. ● شەرکەتێك کە لە بەر زۆر بوونی ژمارەی کارمەندەکانی کەسێك وەدەر دەنێ، دەبێ زیانی لەدەستچوونی کارەکەی بۆ قەرەبوو کاتەوە.

٤٧١١/ 4199- **قەرەبوو کردنەوە، جێگەی ... پڕ کردنەوە:** دەبێ جێگای کوژراوەکانمان بە سەربازە تازەکان پڕ کەینەوە.

٤٧١٣/ 4212- **قەرەبوو کردنەوە، تێهەڵێنانەوە:** دەمو چاوم کەمێك داڵکۆشتە، بەڵام باقی بەدەنم تێی هەڵێنێتەوە. ● چوونە سەری حەقدەستەکان هەمیشە هەڵو مەرجی خرابی جێگای کار قەرەبوو ناکاتەوە.

٤٧١٢/ 5305- **قەرەبوو کردنەوە، وەڵامی چاکەیەك دانەوە:** دەبێ کارێك بکەین کە وەڵامی یارمەتییەکانی بە باشی بدەینەوە.

٤٧١٤/ 5304- **قەرەبوو کردنەوە، تێهەڵێنانەوە، وەڵامدانەوە:** 'پێت وایە وەڵامی میواندارییەکانمان چۆن دەدەنەوە؟ بە خواردنەوەی هەموو ویسکییەکانمانو هەڵکردنی رادیۆ هەتا بەیانی.'

٤٧١٥/ 4213- **قەرەبوو کردنەوە:** ئەو چۆن دەیتوانی هەموو ئەو کوێرەوەرییانە قەرەبوو کاتەوە کە بۆ خاتری ئەو کێشابوونی؟

٤٧١٦/ 4221- **قەرەبوو کردنەوە بۆ، تێهەڵێنانەوە بۆ:** زۆر بەداخم ئەو سەیرانەت لەکیس چوو. لە جێژنی کریسمسدا بۆت تێ‌هەڵێنینەوە.

→ تێ‌هەڵێنانەوە.

٤٧١٧/ 4214- **قەرەبووی رابردوو کردنەوە، تێهەڵێنانەوە:** کەوابوو، ئێستا کە بە تایبەتی دراوسێین، دەبێ رابردوو قەرەبوو کەینەوە. تکایە سەرمان لێ‌بدەن.

قەرەنتینە کردن → گەمارۆدان.

٤٧١٨/ 5597- **قەزاوەت کردن یان داوەری کردن (بە پەلە):** 'درێنی شەوێ ئەتۆ لەوێ بووی. کڵاو بالتۆکەتم دی'، 'جارێ، زوو قەزاوەتی مەکە.'

٤٧١٩/ 6525- **قەزاوەت کردن لەسەر، داوەری کردن لەسەر، لەزەربان لەسەر، گوتن:** داوەری کردن دەربارەی ئەو کابرایە زۆر دژوارە، پیاو قەت ناتوانێ بزانێ چ بیروباوەڕێکی هەیە.

→ داوەری یان قەزاوەت کردن لەسەر کەسێك.

٤٧٢٠/ 3226- **قەڵاپەچن کردن، کەڵەکە کردن، لەسەر یەك کۆ کردنەوە:** دەوروێکەمیان وەها قەڵاپچن کردبوو کە بۆم نەدەخورا.

→ ئەولو بار کردن، لەسەر یەك کەڵەکە کردن.

قەڵب دەرچوون → شکست خواردن.

٤٧٢١/ 2488- **قەڵس بوون، هەڵچوون، تووڕە بوون:** نابێ لە خۆتەو خۆرایی هەڵچی (= قەڵس بی).

→ تووڕە بوون.

٤٧٢٢/ 2630- **قەڵس کردن، تووڕە کردن:** قوتابییەکان بە زۆر پرسیارکردنو پرسیاری نامەربووت، مامۆستاکەیان بە تەواوی تووڕە کرد.

→ سەر هاوێشتنە سەر کەسێك، شێت کردن.

٤٧٢٣/ 2528- **قەڵسەگوزان:** 'ژیلوان، ئەمڕۆ درەنگ هاتوویە سەرکارێ'، 'چاو ترخوا، ئەتۆش قەڵسەمان لێدەگیری؟'.

→ نارەحەت کردن.

قەڵشان → لەحەیفان قەڵشان.

قەڵشت تێکردن → کەمکردنەوە.

٤٧٢٤/ 5058- **قەڵەم لەسەر کاغەز دانەنان:** قوتابییەکانی قەڵەم لەسەر کاغەز دانانێن/ هیچ نانووسن.

٤٧٢٥/ 2055- **قەڵەم لێدان، قەڵەم پێداهێنان:** ئەگەر چەند نووکە قەڵەمێکت بە کۆتشەی چەپی رەسەکەت داهێنابا بۆ ئەوەی لەنگەرێکت لە تەواوەتیدا پێك هێنابا، زۆر جوانتر دەبوو.

٤٧٢٦/ 5584- **قەڵەو بوون، چاغ بوون:** دایکی دەوڵەمەندبوو بەڵام خەمی زۆر دەخوارد. بە خێرایی قەڵەو دەبوو، و چونکە ئەش دەجوولاوە، خەریك بوو قیافەشی دەگۆڕا.

٤٧٢٧/ 2236- **قەڵەو بوون، خۆ دارشتن:** بەو خواردنە باشەی دەیخوارد بەو وەرزیشە رێکو پێکەی دەیکا زۆر باش خۆی دارشتووە.

قەڵەو کردن → دابەستن.

٤٧٢٨/ 7377- **قەمچی لێدان، تێڕاخوڕین:** ئەسپەکان کە کەوتبوونە ژێر رەهێڵەی بێ بەزەییانەی قەمچیی سوارەکە، بە تەنیشت پاسگەکەدا تیژ تێپەڕین.

٤٧٢٩/ 5197- **قەناعەت پێ هێنان:** ئایا هەوڵتان داوە قەناعەتی پێ بێنن؟

→ رازی کردن.

٤٧٣٠/ 6818- **قەناعەت پێ هێنان، رازی کردن:** پێی رابوو هەروەك جاری پێشوو کە واداری کردم دەنگ بدەم بە

پالێوراوێك/ كاندیدایەك كە خۆشی كێشایەوە، ئەوجارەش دەتوانێ رازیم بكا/ قەناعەتم پێ بێنێ.
قەناعەت كردن ← رازی بوون بە.

٨٧٣١/ 4996- قەولی شەرەف وەرگرتن لە، لەباری ئەخلاقیەوە پەیمانبەند بوون بە: زیندانی‌یەكی كە بە زەمانەت ئازاد دەبێ، لەباری ئەخلاقی‌یەوە پێبەند دەبێ كە لە كاتی دیاریكراودا بگەڕێتەوە بەندیخانە.
قەومان ← ڕوودان.

٨٧٣٢/ 3334- كات بە بێكاری تێپەڕ كردن، گەوزەراندن: سەربازەكان هیچ كارێكیان نەبوو بیكەن، بێجگە لەوەی لە حاڵێكدا چاوەڕوانی هاتنی كەشتی‌یەك بوون كە بیانبەنەوە سواریان كا، وەختەكەیان بە بێكاری دەگەوزەراند.

٨٧٣٣/ 3705- كاتی خۆ گەرم داهێنان پێش دەست پێ كردنی یاری تەنیس: لە حاڵێكدا تەماشاچی‌یەكان وردە وردە دەهاتن و لە جێگای خۆیان دادەنیشتن، یاریزانەكان خەریكی خۆ گەرم كردن بوون.

٨٧٣٤/ 1164- كاتێك مەسەلەی ... لە گۆڕێ دابێ، كاتێك قسە ... بكرێ: ئەگەر تەنیا لە هێزی بەدەنی قسە بكرێ/ ئەگەر لەباری هێزی بەدەنی‌یەوە بێ، هیچ جانەوەرێك ناتوانێ شان لە شانی فیل بدا.
كارامە بوون ← بە تەواوی فێر بوون.
كارامەتر بوون ← سەروگەردنێك بەرزتر بوون.
كاربە كەسێك دان ← پێ ئەسپاردن (ی بەرپرسایەتی بە كەسێك).
كار پێ نەمان ← تەولو كردن.

٨٧٣٥/ 7317- كار بە شتێك نەبوون: جان هەستا سەرپێ و لە پەنجەرەوە چاوێكی لە دەرێ كرد و گوتی: "زۆر باشە، ئیدی ئەمن كارم پێی نیە. ئەگەر ئەتۆ و چیاش دەتانەوێ لەسەر ئەو باڵندە سەگبابە خێرە بیكەنە هەڵا، مەیلی خۆتانە".

٨٧٣٦/ 6652- كار بۆ خەڵك كردن (بە حەقدەست و لە ماڵی خۆ)، جۆرەوی كردن: ئێران خانم كە بێوەژنە و چەند منداڵی سەرو پێنچكەی هەیە، بۆ بردنە سەری یارمەتیی مانگانەكەی، (لەماڵی خۆی) شیور كوڵی خەڵكی دەكا.

٨٧٣٧/ 3216- كار بە (كاری) كەسێك یان شتێك نەبوون، پەیوەندی بە ...وە نەبوون: ئەو كاری بە هونەرو ئایین نیە. بە بڕوای ئەو هەر شتێكی قابیلی ئەندازەگرتن نەبێ، دەبێ لێی بە گومان بێ.

٨٧٣٨/ 1571- كارت كێشان (بۆ دیاری كردنی ئەوانەی دەبێ یاری بكەن یان نەكەن): چونكە ٥ كەس بوویـن كارتمان كێشا بۆ ئەوەی یەكێكمان لە یاری كردن وەلاچێ.

٨٧٣٩/ 3200- كار تێكردن (تەئسیر دانان لەسەر)، شوێن لەسەر دانان: ئەو هەنگاوانەی وەزیری دارایی هەڵی‌هێناوەتەوە شوێنێكی باش لەسەر داهات و دەركەوتەكان دادەنێ.
← زاڵ بوون بەسەر ...دا، بەسەر داهاتن، نفووز تێدا كردن.

٨٧٤٠/ 300- كار دەست پێكردن: خەتێكی موسافیركێشی لە دەریای رەش دەستی بە كار كردووە.
كاری كەسێك تەولو كردن ← كوشتن.

٨٧٤١/ 5160- (بە خرتەخرت) كار كردن: شەش نەفەر تایپیست لە گۆشەیەكی نووسینگەكە بە خرتەخرت كاریان دەكرد.

٨٧٤٢/ 223- كاركردن (زۆر بە توندی) سەرگەرمی كارێك بوون: كاتێك گەیشتینە جێگای بەربوونەوەی فڕۆكەكە، تاقمی فریاكەوتن زۆر بە توندی سەرگەرمی كاربوون.

٨٧٤٣/ 3040- (زۆر سەخت) كاركردن: "چراكانو یوی چیا هەروا دایسێن، ئەگەرچی سەعات ٢ی بەرەبەیانی‌یە". "بەڵێ، رۆژی هەینی تاقی‌كردنەوەی بیولۆژی هەیەو دەیەوێ زۆر سەخت كار بكا بۆ ئەوەی رابردوو قەرەبوو كاتەوە.

٨٧٤٤/ 7470- (لە چوارچێوەیەكدا) كار كردن، خەرج كردن: هەوڵ بدەن و ئاگاتان لەخۆ بێ كە لە چوارچێوەی بودجەكەدا پارە خەرج كەن.
كاركردن، بە پێی ڕیسا ← بە پێی ڕیساكار كردن یان هێلسو كەوت كردن.

٨٧٤٥/ 25- كاركردن لە، تەئسیر دانان لەسەر، شوێن لەسەر دانان، كارتێكردن: ئەو حەبانە تەنیا لەسەر جەرگ دادەنێن.

٨٧٤٦/ 7449- كاركردن لەسەر، هۆش دانەسەر: ئەگەر بێتوو هۆشت بدەیە سەر ئەو مەسەلەیە، حەلی دەكەی.
كاركردن ← (لە چوارچێوەیەك دا) كاركردن.

٨٧٤٧/ 4513- (زۆر بە توندی) كاركردن لەسەر: لە نێوان یاری‌یەكاندا، كابرای بۆكسور/ پاڵەوانی مشتەكۆلە، لەسەر راهێنانی سەرجادەو نێو ساڵۆن یەكجار سەخت كاری دەكرد.

٨٧٤٨/ 2427- كاركردن لەسەر، راگەیشتن بە: بریا بەفرەكە تراباوەو بمتوانیبا بە باخچەكەی رابگەم.

٨٧٤٩/ 6002- (توندوتیژ، سەخت) كاركردن لەسەر شتێك، هیممەت كردن: نیچیر لە بەیانی‌یەوە خەریكە بە هەموو هێزی‌یەوە

لەسەر "جدول ضرب" کاردەکا. ● هیممەتی بکە!/ هیممەتت بێ! دەکرێ بڵێین پشتی مەسەلەکەت شکاندووە.

٤٧٥٠/ 6356- **کارکردن لەسەر شتێک، بە هەموو توانەوە:** هەموو رۆژێ پێنج هەتا شەش سەعاتان بە هەموو تواناوە کار لەسەر رەسم کێشان دەکەم. هیچیشی لێ پەیدا نابێ.

٤٧٥١/ 7447- **کارکردن لە نێو:** ئەو لە ئیست ئێنستیی لەندەن لە نێو فەقیرو هەژاراندا کار دەکا. ● سەرەتای ژیانی لە رێگای کارکردن لە نێو گولاندا بەسەر برد.

٤٧٥٢/ 502- **کار لە کەسێک خراپ کردن (زۆرتر لە رێگای دەنگ دژ لێ دانەوە):** دوای کێشەکەیان ئاشتمان کردبوونەوە، بەڵام لە پڕ ئەو کابرایە هاتو هەموو شتێکی لێ خراپ کردینەوە.

٤٧٥٣/ 1185- **(ئەگەر/ بێتوو) کاروانی بگاتە جێ (=ئازا نەبێکی باش وەدەست کەوێ):** کاتێک کاروانیان بگاتە جێ، رەنگە بتوانن ئەو کورسییە دزێوانە بگۆڕنەوە بە هی جوانتر.

کار، یان ئیشی کەسێک گەیشتنە ... ← سەرەدەرهێنان.

کاری خراپ وەبەرنان ← بەد عەمەل کردن.

کاری خۆ کردن ← بە کاری خۆوە نووسان.

کار لێکێشان (یەباشی) ← کەلک لێوەرگرتن (بەباشی).

کارلێهاتووتر بوون ← سەروگەردنێک بەرزتر بوون.

کارەبا کێشان بۆ ← وایەر کێشان بۆ.

٤٧٥٤/ 7414- **کاری خۆ رێکو پێک کردن:** لە ئاخرین مانگدا، خەریک بوو کارەکانم لە ئینگلستان رێکو پێک دەکردو لە هەموو دۆستەکانم خوداحافیزیم دەکرد.

٤٧٥٥/ 2956- **کاری رەش و دژوار لە ئەنجامدان:** باشترین کەس بۆ هەڵسووراندنی کاروباری سنعەت ئەو کەسانەن کە ئیشو کاری رەشو دژواریان کردبێ.

٤٧٥٦/ 906- **(لە قالۆنگەریدا) کاری قێزو ناشیرین لە ئەنجام دان:** ئەگەر ئەو شانۆیە خۆی لە خۆیدا شتێکی بێمانایە، هەرگیز ناتوانن بەوجۆرە کارە قێزو ناشیرینانە بە سەرکەوتنی بگەیەنن....

٤٧٥٧/ 721- **(بە ئیزالییەوە) کارێک لە ئەنجامدان. بەرێوەبردن یان کردن:** ئەو "طراح"ە بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە ئەزموونێکی دوورو درێژی خۆی بەکار دێنێ.

٤٧٥٨/ 4380- **کارێک بۆ خاتری کەسێک لە ئەنجامدان:** هاتنەوەم بۆ ماڵێ لە بەر دایکو بابە، چونکە هەم ماندوو دەبێو هەم پەرێشن.

٤٧٥٩/ 225- **(زۆر بە وردی) کارێک کردن یان لە ئەنجام دان:** کۆمیتەی داهاتەکان تێدەکۆشا زۆر بە وردی بۆمان روونکاتەوە کە بەرێوەچوونی "طرح"ی تازە بە قازانجمان تەواو دەبێ یان نا.

٤٧٦٠/ 7328- **کاری کەسێک تەواو بوون، تێکچوون:** ئەمنو سەمیران ئیدی یەکترمان خۆش ناوێ. سینەماچییەکان گرتمنی، کارمان تەواوە.

٤٧٦١/ 4892- **کارێکی بێئەنجام/ بێفایدە/ بێسوود بوون:** قسە کردن لەوە کە دەبێ لە هەموو جیهاندا تاقە زمانێک هەبێ، کارێکی بێفایدەیە.

٤٧٦٢/ 3752- **کارێکی تر/ فوڕساتێکی تر پەیدا کردن:** ئەتۆ دەبێ کارێکی تر بە یارمەتییەکی باشترەوە پەیدا کەی.

٤٧٦٣/ 3728- **کارێکی زەحمەت خستنە ئەستۆی، یان سەرشانی کەسێک، ئەسپاردنی کارێکی سەخت بە کەسێک:** نوەمەردان بە یەک سێری دیکە لە وەرەقەکانی تاقیکارییان خستۆتە ئەستۆی من. ● کاری پڕ لە دەردەسەری رێزبەندی کردنی هۆدەکانی هوتێل بۆ میوانانیان خستۆتە سەرشانی من/ بەسەر دابڕیوم.

کارێکی واکردن ← تەرتیب دان.

٤٧٦٤/ 4147- **کارێکی هاسان (=ساکار) دژوار نیشان دان:** خەریکی حیسابێکی هاسان زۆر دژوار نیشان دەدەی/ خەریکی کارەکە لە خۆت سەخت دەکەی.

٤٧٦٥/ 2329- **کاری یان شوێنی کەسێک درێژەدان:** یەکێک لە زانستنامە (شەهادە) کانم لە ماتماتیک دابوو، بۆیە خێزانم بڕیاری دا کە دەبێ رێگای باوکی خوالێخۆشبووم درێژە بدەم.

کاسپی کردن لە...دا ← چالاکی هەبوون لە پیشەیەکدا.

٤٧٦٦/ 3413- **کاغەزی سپی لە نێو لاپەرەکانی کتێبێک نان، لە نێو شتێکدا جێگا کردنەوە:** کاتێک دیارییەکەم دایە، ژیلەوان زۆر لەوە خۆشحاڵتر بوو کە چاوەڕوانیم دەکرد، دیارییەک کە بێجگە لە کتێبێکی چکۆلە نەبوو کە لە نێو هەردوو لاپەراندا کاغەزێکی روونی تێدا بوو بۆ رەسم کێشانەوە.

کافر بوون ← تووڕە بوون.

کافر کردن ← تووڕە کردن، شێت کردن.

کاکەو براڵە کردن لە دژی کەسێک ← پیلان گێڕان لە دژی.

٤٧٦٧/ 1269- **کاڵ بوونەوە، لە بەین چوون، پاک بوونەوە:** رەنگی ئەو قوماشانە زەمانەت کراوەو هەرگیز کاڵ نابێتەوە.

٤٧٦٨/ 488- **کا لە ژێر پێی... بڵاوکردنەوە:** ئەسپەکانیان ئاوو تفاق داو کای وشکیان (لە تەویلەی) لەژێر پێ بڵاو کردنەوە.
کاڵانەوە ← وێچوون.

٤٧٦٩/ 3403- **کامل کردن، تێکەڵ کردن، کردن بە یەک:** ئەو ئاپارتومانە تازانەی کە بۆ ماڵ دروست کرابوون دەگەڵ ساختومانی زانکۆ کرابوون بە یەکەو تێکرا "مجتمع"ێکی جوانو تەواویان پێک هێنابوو. * یەکێک لە لایەنباشەکانی بەرنامەی دەرسەکان تێکەڵ کردنی کردەوەو تیئۆریی بوو.
کاندیدا بوون← نامزەد بوون.

٤٧٧٠/ 5132- **کای کۆن بەبا کردن:** گروڵی، نامەوێ کای کۆن بەبا کەم، بەڵام، بەراستی لەو دواییانەدا هەواڵێکت لە چیای بە دەست نەگەیشتووە؟

٤٧٧١/ 4657- **کایە بە ئاور کردن، دەست دانە کاری خەتەرناک:** ئەگەر دەگەڵ ئەو تاڵمە تێکەڵ بێ، دەردەسەر بۆ خۆی پێک دێنێ. بەڵام هێندێک کەس کایە کردن بە ئاوریان پێ خۆشە.

٤٧٧٢/ 5960- **کایە بە ئاگر کردن، دەست دانە کارێکی خەتەرناکەو ئاسا:** ئەگەر لە جیاتی تۆ بام، ئەدەهاتە ئێرەو بەو کارمەندە بەئەزموونانە بڵێم دەبێ چۆن کارەکانیان بەرێوەبەرن. لەراستیدا خەریکی کایە بە ئاگر دەکەی.
کایە پێکردن ← دەست پێ گەرم کردنەوە، سەرزارەکیی باس کردن.

٤٧٧٣/ 7042- **کایە کردن بە:** لە حاڵێکدا لە سەر کورسی‌یەکەی پاڵی دابۆوەو، لاقەکانی خستبووە سەر میزەکەی، بە کاغەزگرێک خەریکی کایە بوو.

٤٧٧٤/ 7204- **کایە کردن بە:** دەتوانێ بە خۆشحاڵی‌یەوە چەندین سەعاتان بە پێچەکانی رادیۆ کایە بکا.

٤٧٧٥/ 1614- **کایە کردن بە:** ماوەیەکە کۆڕی بەرێوەبەرایەتیی کارەبا بە فکری دانانی کارخانەیەکی کارەبا لێرە کایە دەکەن. ئەمنیش پێم وایە هەرگیز هیچی لێ ساغ نابێتەوە.

٤٧٧٦/ 4653- **کایە کردن بە، یاری کردن بە، سەرگەرم بوون دەگەڵ:** 'ئیچیوان لە کوێیە؟'، 'لە سەرێ، لە هۆدەی ژێرشیروانی سەرگەرمی قەتارە چکۆلەکەیەتی'.
← پێ لێکردنەوەو گنخاندن.

٤٧٧٧/ 338- **کایە کردن بە تۆپ لە یاریی کریکێت دا.**

٤٧٧٨/ 3478- **کایە کردن بە چەند شتێکەو لە کەوتنیان بەرگری کردن، لەهەوای شتێک راگرتن:** برا گەورەکەی سواری دووچەرخەیەک ببوو بە دەوری بەرزەکدا دەخولاوە، لەحاڵێکدا برا چکۆلەکەی لەسەر قەڵاندزشی بە چەند حەڵقان کایەی دەکرد(ئەیدەهێشت هیچیان بکەون).

٤٧٧٩/ 3479- **کایەن کردن بە وشان، بە جیناسان:** خۆشناو کایە کردن بە وشانی زۆر پێ خۆشە، بە چەشنێک پیاو زۆرجاران سەری کەڵاڵی قسەکانی یان چیرۆکەکانی لێ ون دەبێ.
کتوپڕ پەیدا بوون ← لەپڕ هاتن.
کتوپڕ راگرتن ← لەنەکاو ستۆپ کردن.

٤٧٨٠/ 700- **(بۆ یەکەم جار) کچێک دەگەڵ خۆ بردنە نێو کۆمەڵ/ میوانی یان رێوڕەسمان:** خالی... لە وەرزی داهاتوودا کچەکەی خۆی دەگەڵ خۆی دەباتە میوانیو رێوڕەسمان.
کردنەوە ← دەست پێکردن، وەرێخستن، دەست پێکردن.
کردنەوە بە هیچ ← لەنێو بردن.
کردنەوەو ئامادە کردنی (گوریس، شریت، تەناف و...) ← وەگەرخستن.

٤٧٨١/ 5631- **کراندن و پاک کردنەوە:** زۆر بە وردی هەموو ئەو سێوکەی بە بنی تاوەکەوە نووساوە بکرێنەو پاکی کەوە.

٤٧٨٢/ 4358- **کرانەوە بەرەو، روو بوون لە ...:** دەروازەی پشتەوە بەرەو جادەیەکی تایبەتی دەکرێتەوە.

٤٧٨٣/ 4361- **کرانەوە، پشکووتن:** لە هەوای گەرمی ژووری/ ژوورەکەدا، گوڵە رۆزەکان لە ماوەی چەند رۆژێکدا پشکووتن.

٤٧٨٤/ 2598- **کردن، لە ئەجامدان، بەرێوەبردن، جێبەجێ کردن:** سکرتێرە تازەکەم زۆر ئرندو تۆڵە. کۆڵێک کار لە بەیانی‌یەکدا ئەنجام دەدا/ جێبەجێ دەکا.

٤٧٨٥/ 3852- **کردن، پێبەخشین، قایل... کردن، دان بە:** ئەو شێوە پێشبینی‌یانەیە کە گرنگێکی تایبەتی دەدەن بە کۆنگرەی ساڵانە، ئەمرۆ لە شاری سیدنی دەکرێتەوە.

٤٧٨٦/ 5238- **کردن بە، تەجزیەی کردن بە:** دەزگای هاڕین کولکە دارەکان دەکا بە ئارد. * بە یارمەتیی کارەبا، دەکرێ ئاو بە ئۆکسیژێنو هیدرۆژێن تەجزیە کەن.

٤٧٨٧/ 4190- **کردن بە:** ژێرزەمینەکەیان/ ژێرخانەکەیان کردووە بە کارگا.

٤٧٨٨/ 4124- **کردن بە، پێرهێنان:** ئەو هەرگیز ملهوڕ نەبوو؛ ئەتۆ کردت بە ملهوڕ.
کردنەوە بە ← بە شکلی ... دەرهێنانەوە، گۆڕینەوە، وەرگێرانە سەر (زمانێکی دی)

٤٧٨٩/ 7064- **كردن بە، لێهەرهێنان، بارهێنان:** ئەو فێرگەیە ژمارەیەك لە كەسانی تا رادەیەك بێنیـستیعداد سەنعەتكاری زۆر دەستڕەنگین دەردێنێ/ باردێنێ.

٤٧٩٠/ 4150- **كردن بە پیاو:** چەند ساڵ كار كردن لەسەر دەریایە دەیكا بە پیاو.

كردن بە دژی... ← دژایەتی كردن.

كردن بە سلو ← بوون بە تاوو سلو.

كردن بە گاڵتەجار ← مەسخەرەكردن.

٤٧٩١/ 3768- **كردن بە لەوەرگە:** كابرای جووتبەندە بڕیاری دا دەجەریب لە زەوییەكانی بكاتە لەوەرگە.

٤٧٩٢/ 1097- **كردن بە هەوێر:** ڕاست ئەو دەمەی كە خۆمان لەبەر تاوێ هەڵخستبوو كردی بە هەوروو هەڵیكردە بایەكی ساردیش.

٤٧٩٣/ 5118- **كردن بە یاسا، بڕیار لەسەر دان لە مەجلیس:** لایەنەی ئەسپاردنی دەسەڵات بە حكوومەتی نیزامی، بە بێ لەبەرچاوگرتنی ڕێوڕەسمە جێگرتووەكانی پارلمان، بڕیاری لەسەر دراو بوو بە قانوون.

٤٧٩٤/ 3361- **كردن بە یەك، گونجاندن:** دەوڵەت ژمارەیەكی زۆر لەو پێشنیارانەی ئۆپۆزیسیۆن كردوونی لە لایەكەدا گەنجاندوونی.

٤٧٩٥/ 4090- **كردن بە یەك، تێكەڵ كردن، لەسەریەك دانان:** بەمەبەستی (دانی پوولێكی كەمتر بە) مالیات، داهاتەكانیان لەسەر یەك دادەنێن (= دەیان كەن بە یەك داهات). ● ئەو دوو گەرەكە تێكەڵ دەكەنو دەیاخەنە ژێر ئیدارەیەكی واحیدەوە.

← كامیل كردن.

كردنە بلاو ← پەرە پێدان.

٤٧٩٦/ 7208- **(بڵاو) كردنەوە:** 'ئەنتۆ سەری ئەو تۆنگەیە (بادەو) و بیكەوە، ئەمن دەستم لیچقە.'

٤٧٩٧/ 841- **كردنەوە، دڕین:** بۆ گرتنەوەی شكافێكی كە دوژمن كردبوویەوە هەوڵو كۆششێكی زۆر سەخت درا.

٤٧٩٨/ 3885- **كردنەوە، بەتاڵ كردن، دەركردن، بردنەدەر، وەدەرنان:** كێ بای تایەرەكانی ماشێنەكەی بەتاڵ كردووە؟ ● ئەمن لێرە بەرنە دەرا ببەنە دەرا

٤٧٩٩/ 4363- **كردنەوە (ی بەستەیەك/ قفڵێك/ دەرگای هۆدەیەك بۆ كەلك لێوەرگرتن):** سندووقی پشتەوەی ماشێنەكەت بكەوە با چاو لە نێوی كەم. ● هێندێك لە هۆدە چكۆڵەكانی ئەو كۆشكە لەمێژساڵە نەكراونەتەوە.

٤٨٠٠/ 943- **كردنەوە (ی شریتێك كە بەلەمی، قەیقی پێ دەبەستنەوە):** فەرمان درا شریتەكان بكەنەوەو هێندەی پێنەچوو كە كەشتییەكە وەڕێكەوت.

٤٨٠١/ 4545- **كردنەوەی ڕەنگی شتێك بە لەبنبردن/ كردنی ڕەنگێكی دیكە:** دیوارەكە لە ئەسڵدا ڕەنگی قاوەیی لێدرابوو بەڵام ئەو ڕەنگەیان بە پێداهێنانی خەتان، نارنجی كردبووە.

٤٨٠٢/ 4364- **كردنەوەی ڕێگایەك بە نێو ...دا/ كونێك لە دیوارێكدا:** هێزی پیادە ڕێگایەكیان لە مەیدانی چێنراو بە مەیندا كردەوە بۆ ئەوەی هێزی زرێهی پیێدا بڕوا.

كردنە هەڵا ← بە خۆڕایی هەڵاو بگر وەڕێ خستن.

كردەوەی خراپ فێر بوون ← بەدعەمەل بوون.

٤٨٠٣/ 4499- **كرنۆش بردنە بەر، لەوپەڕی ڕێز لێگرتن:** ... بۆ خۆی شایەكی دیكە بوو. كاتێك لێم دەڕوانی، دەمدیت كە هەموویان ئەوپەڕی ڕێزی لێ دەگرن. ● سەرم سوور مابوو ئەمدەزانی كە چلۆن هاتووەو ئالیسی بە هاوسەر هەڵبژاردووە.

٤٨٠٤/ 1499- **كرنۆش بردنە بەر، كلكەسووتە كردن لەبەر خۆ نواندنەوە لەبەردەمی:** كاتێك كارمەندەكان كلكە سووتەی مەردیریان لە بەرامبەر سەرۆكی ئیدارەدا چار پێكەوت هیچ ڕێزێكیان بۆی نەما.

٤٨٠٥/ 576- **كرنۆش بردنە بەر:** پاش تەواو بوونی كۆبوونەوەی شووڕای سەڵتەنەتی، ئەندامی مەجلیسی لۆردان بە كرنۆش كردن چوونە دەر.

٤٨٠٦/ 577- **(بۆ كریارێك یان میوانێك كە دەیەوێ بڕوا) كرنۆش كردن:** دوای خەر كردنەوەی ئەو شتانەی كڕیبوومانن، خاوەن دووكانەكە بە كرنۆش كردن بەرێی كردین.

← سەردانواندن لە بەرامبەر.

٤٨٠٧/ 2382- **كروووستنەوە، قوفستنەوە:** ساڵ بەساڵ، ئۆقیانووس كەنارەكانی خۆی دەشووشتەوەو، سەرەنجام زیانێكی گەورەی لەو خانووانەدا كە مایەی شانازیی شارەكە بوون.

٤٨٠٨/ 3165- **كرێكار لە ماڵی خۆیا هەبوون:** بەداخەوە ناتوانم ڕاتگرم، چونكە ژمارەیەك دیكۆراتور بۆ ماوەی حەوتوویەك لە ماڵەكەمدا خەریكی كار دەبن.

٤٨٠٩/ 864- **(بە تەواوی) كڕین، كۆنترۆڵی ماڵیی تەواو بەسەر ... دانە پاڵدان:** یەكێك لە دامەزراوە ماڵییەكانی شاری لەندەن پێشنیاری كردووە ئەو شەریكەیە بە تەواوی بكڕێ.

٤٨١٠/ 4557- **كڕین، وەگیركەوتن:** هێشتاش لە فرۆشگەی ... هێندێك شتومەكی زۆر جوانی لێیە كە دەكرێ زۆر بە هەرزان بیانكڕی.

٨٨١١/ 3439- گرتن، دان پێ‌نان به: کوڕه خوێندکارەکە بڕیاریدا هەموو داراییەکەی (٥٠پۆند!) بدا بە ماشێنە کۆنێك.

٨٨١٢/ 859- گرتن و پەلامارکوت کردن: بە پێشبینیکردنی ئەوە کە بۆی هەیە سەهمیبەندی/ بایع بێتە گۆڕێ، خەڵکەکە گۆشتێکی زۆری فرتوویان کری (و هەڵیان گرت).

٨٨١٣/ 6621- گرتن و دەگەڵ خۆ بردن، چنگڵتی سەقەرێ: لێرە ئۆملێتی گۆشتەو بیبباری زۆر باش دروست دەکەنەوە، ئەگەر بتەوێ دەتوانی بی‌کڕی و دەگەڵ خۆتی بەری.

٨٨١٤/ 7052- گرتن و فرۆشتن: ئەو کەسانەی تفەنگو دەمانچە کۆنان دەکڕنو دەفرۆشن هێشتاش بازاری ئامادە بۆ ئەو شتانە دەدۆزنەوە.

← دانوستان.

٨٨١٥/ 862- گرتنەوە، بلاوکردنەوە کردن: ئەوانەی ژیانی ئێرەیان پێ خۆش نیە، دەتوانن لە هەفتەی هەشتەم هەتا دوازدەیەم بە دانی ٢٠ پۆندان خۆیان بکڕنەوە.

٨٨١٦/ 4590- کز بوون، لاواز بوون، لەڕو لاواز بوون: لەو ڕۆژەوە کە یارە گەلەکەی لێی جیا بۆتەوە سەیران یەکجار زۆر کز بووە.

٨٨١٧/ 6696- کز بوون: لە "ناوەندی لەش ساغی" لە هەر خولێکی کەم کردنەوەی وەزندا بەوردێك (واتە ٦٣٠٠ گرام) پیاوی بە زەمانەت کز دەکەن.

٨٨١٨/ 4848- کشانەوە: دەستوور درا سالۆنەکە چۆل کەن: هەموو ئەو کەسانەیان بە پاڵەپەستۆ کشاندەوە کە لەوێ ڕاوەستابوون.

٨٨١٩/ 5306- کشانەوە، پاشەکشە پێکردن: پێش ئەوەی سەربازە هێرشکەرەکان بتوانن پردەبازێك دروست کەن، لە لێواری ڕۆژئاوای چۆمەکە پاشەکشەیان پێکرا.

٨٨٢٠/ 4849- کشانەوە، پاشەکشە پێکردن: هێرشکەرەکانیان هەتا پشتی سنوورەکانی خۆیان کشاندەوە.

٨٨٢١/ 4732- کشانەوە، گەڕاندنەوە: ئەفسەرانی پۆلیس خوێندکارەکانیان بە زۆرە ملی کشاندەوە بۆ پشتی مانیعەکان.

٨٨٢٢/ 1923- کشانەوە، شکستخواردن: هێرشی تێکەڵاوی هێزەکانی تانك و پیادە بە تەڵەفاتێکی قورسەوە پاشەکشەیان پێکرا/ شکست دران.

٨٨٢٣/ 1914- کشانەوە، پاشەکشە پێکردن: هێزی هێرشکەریان هەتا جێگای هەوڵیی کشاندەوە.

٨٨٢٤/ 6932- کشانەوە، پاشەکشە پێکردن (زۆر بە توندی): دوای چەند دەرگیرییەکی یەکجار توندو تیژ، هێرشکەرەکانیان بە توندی کشاندەوە.

٨٨٢٥/ 3504- کشاندنەوە، کشانەوە، دوورکردنەوە: حەشیمەت ئەوەندە زۆر بوو کە کاتێك گەیشتنە مانیعەکان، بەرپرسیارانی خۆپیشاندانەکە نەیاندەتوانی بیانکشێنەوە.

٨٨٢٦/ 1917- کشانەوە بۆ لای هێزی سەرەکی: وەك پێشەکییەك بۆ هێرشی هەموو لایەنەی دوژمن تاقمە چکۆلەکانی ئێمەیان بەرەو دواوەو بۆ لای هێزی سەرەکییەکانیان کشاندنەوە.

٨٨٢٧/ 4301- کشانەوە (کەمێك)، کە مێك بکشێرە: نیوەی زیاتری جێگاکەت داگیر کردووە؟

٨٨٢٨/ 2107- کشانەوە، پاشەکشە کردن، گەڕانەوە: ڕووسەکان لە نێوان جەنگی هێرشکارانەو پڕ هەرجۆڵ دەگەڵ شەڕی ساڵەکانی ١٩٤١و ١٩٤٢دا جیاوازییەکی زۆریان دەدی؛ گەلە تێك هەڵچوونێك کە لەواندا دەیانتوانی بکشێنەوە بۆ پەناگاکانو نیزگەکانی قەتلار.

٨٨٢٩/ 2442- کشانەوە، کشاندنەوە: پۆلیسەکان بۆ کشاندنەوەی خەڵکەکە بۆ تێپەڕ بوونی ئامبۆلانسەکە دەگەڵ گیروگرفتێکی زۆر بەرەوڕوو بوون.

٨٨٣٠/ 1510- کشانەوە، لێکشانەوە، پڕێنگانەوە: سەگ لە کەسێکی داری بە دەستەوەی دەپڕینگێتەوە./ سەگان لەو کەسانەی داریان بە دەستەوەیێ دەپڕینگێنەوە.

٨٨٣١/ 6338- کشانەوە (لاترسان، بەسەر سووڕمانەوە): لە حاڵێکدا ئەوەی کە بیستبووی بۆی باوەڕ نەدەکرا، دەکشاوە.

٨٨٣٢/ 6223- کشانەوە: لە خەڵکەکەی سەر پیادەڕەویان داوا کرد بۆ ڕێگاکردنەوە بۆ ڕێژەی (سەربازەکان) بکشێنەوە.

٨٨٣٣/ 1859- کشانەوە: بۆ ماوەیەکی کورت دەتگوت دەیەوێ بکشێتەوە؛ هەروەك لە کوتە کاغەزێکی چەورو پیس ترسابێ.

٨٨٣٤/ 2905- کشانەوە، گەڕانەوە، نیشتنەوە: دەریا، لە هێندێك لە قەراخەکان، ئەوەندە دەکشێتەوە کە نیدی نابیندرێ.

٨٨٣٥/ 5899- کشانەوە، کشاندنەوە: کامران خۆی کشاندەوە؛ تاقەتی دەنگە دەنگی زۆر توندو تیژی نەبوو.

٨٨٣٦/ 5442- **کێشانەوە (یەك بەدوای یەك دا)**: شەپۆلەکان یەك بەدوای یەکدا کێشانەوەو سندوقێکی تەختەی رەش وەدەرکەوت کە هەتا نیوەی دەخیزی دابوو.

٨٨٣٧/ 4628- **(لە پاڵی کرێکێشدا)**: کێشانەوە بۆ زەربە لێدان.

٨٨٣٨/ 5443- **کێشانەوەو چوونە پێناو**: بەرەی شەر دەچۆوە پێشەوە دەکشاوە بێ ئەوەی کە هیچ کام لە دوو لایەنەکان بتوانن ئیددیعای سەرکەوتن بکەن.

٨٨٣٩/ 168- **(کەمێك) کێشانەوە، پێش کێشانەوە (لەسەر ئۆزێکی سوڵی)**: داخوا دەکرێ کەمێك بکشێیەوە؟ (ماشێنەکەت کەمێك بکشێنەوە).

کێشانەوە ← ئەهاتنە پێش، پاشەکشە کردن، خۆ کێشانەوە لە، پاشەکشە پێکردن، لاچوون، هاتنە خوار، کشاندنەوە.

کێشانەوە لە ← پاشەکشە کردن لە، خۆکێشانەوە.

کفن دڕین ← چاك بوونەوە.

کفری کەسێك دەرهێنان ← شێت کردن.

٨٨٤٠/ 3863- **(لە پاشەملەدا) کڵاو بەرچاو**: ئالفرێد، کلاچەکە بەردەو بۆ مارمێلك بە لەسەرەخۆیی‌و جوان لێخوڕە.

٨٨٤١/ 4872- **کڵاو لەسەر کەسێك نان، فریودان**: واباشە هەوڵ نەدەی کڵاوی لەسەر بنێی.

← فریودان، بە کەر زانین.

٨٨٤٢/ 6640- **کڵاو نان لەسەر کەسێك، فێڵ کردن لە کەسێك، سەلەف کردن**: ئەگەر ئەو ماشێنەت بە ٥٠٠٠ پۆندی زیاتر کڕیبێ، کڵاویان لەسەر ناوی.

← فێڵ لێکردن.

کلك تێوەردان ← دەست تێوەردان.

٨٨٤٣/ 1511- **کلکە سوتە کردن**: سەروسیمای پیاوێکی زەبەلاح کە لە بەرامبەر یەکێك لە ئەندامانی دەرەبەگایەتیدا کلکە سوتەی دەکا بۆ زۆربەی خەڵك بێزهێنەرە.

کلکە سوتە کردن لەبەر ← مەرایی کردن لەبەر، خۆ شیرین کردن لە لای کەسێك، کرنۆش بردنە بەر.

کلکی کەسێك لەبەر دەست دابوون ← ئاسێك لە دژی کەسێك بە دەستەوە بوون.

کللۆر کردن ← جوون.

٨٨٤٤/ 2296- **کۆبوونەوە**: هەزاران سکوتلەندی بۆ تەماشای پێشبڕکێی جامی جیهانی (ی فوتبال) لە شاری بارسیلونا کۆ ببوونەوە.

٨٨٤٥/ 2613- **کۆبوونەوە، بە یەکەوە دانیشتن**: 'سڵاو، زۆر لەمێژە نەمدیوی؟'، 'راستە با بەیەکەوە دانیشین‌و بە وردی باسی رابردوو بکەین.'

← هاتن.

٨٨٤٦/ 6545- **کۆبوونەوە**: حەشیمەتێکی زۆر لە پیادەرەو کۆببوونەوە بۆ ئەوەی چاوێکیان بە ماشێنی سەرۆك کۆمار بکەوێ.

٨٨٤٧/ 184- **کۆبوونەوە، کەڵەکە بوون، فربوونەوە**: لە لێوارەکانی ئەو چۆمە قەوزەیەکی زۆر وەخۆ دەبێ.

٨٨٤٨/ 2397- **کۆبوونەوە بۆ پارێزی کەسێك، لە پشت ... راوەستان**: هەر کە یەکێك لە ئەندامەکانیان لە لایەن یاساوە کەوتە مەترسییەوە، ئەندامانی نهێنیی مافیا لە دەوری کۆ دەبنەوە.

٨٨٤٩/ 1378- **کۆبوونەوە لە**: خۆپێشاندەران لە مەیدانی ئەسلیی شار کۆ بوونەوە.

٨٨٥٠/ 1525- **کۆبوونەوە لە، لێ پەستاوتن**: سەدان کەس لە هۆڵی گوندەکە کۆ ببوونەوە بۆ ئەوەی گوێ بۆ قسەکانی نوێنەری ناوچەکە راگرن. ● دوازدە سەر مەڕیان لە پیکاپێکی چکۆلە پەستاوتبوو.

٨٨٥١/ 1431- **کۆبوونەوە لە**: شەش دەستە لە سەربازانی بە تایبەتی فێرکراو، بە بێدەنگی، لە ستادی نهێنیی یاخییەکاندا کۆبوونەوە.

٨٨٥٢/ 2396- **کۆبوونەوە لە دەوری ...**: شاگردی دووکاندارەکە توانی دەستییەکی چکۆلە لەو خەڵکەی رادەبردن لە دەوری خوانچەکەی کۆ کاتەوە.

٨٨٥٣/ 3055- **کۆبوونەوە لە دەوری، کۆچیلە کردن لە دەوری**: لە دەوری رێبەرەکەمان کۆ بووینەوە بۆ ئەوەی پێش وەرێکەوتن ئاخرین رێنوێنییەکانیمان گوێ لێ بێ.

کۆییە کردن ← تەکبیر کردن.

٨٨٥٤/ 4709- **کوتان، تۆپ‌هاوێژی کردن، کارکردن**: تۆپخانەی سەنگین لە دوور را بە بێ پسانەوە دەیکوتا/ کاری دەکرد/ تۆپهاوێژی دەکرد.

٨٨٥٥/ 3383- **کوتان، مەیدەکوتی کردن**: ئێرسەکانی خاچی سوور بۆ کوتانی دەیان هەزار خەڵك بە دژی وەبا رۆژانە هەژدە سەعاتان کاریان دەکرد. ● داخوا بە دژی گرانەتا کوتاریانی؟

٨٨٥٦/ 3108- **کوتان، لێدان**: سیت بە هەموو توانایەوە هێرشی دەکردە سەر حەریفەکەی‌و بە هەر دوو دەستان دەی‌کوتا.

← لێدان، هارین.

کوتانەوە ← پاچاندنەوە، داگرتنەوە.

٨٨٥٧/ 7412- **کۆتایی پێ هێنان، تەواو کردن**: هەروا کە پیاسەمان دەکرد، ئالفرێد چیرۆکەکەی کۆتایی پێ هێنا/ تەواو کرد.

٨٨٥٨/ 2012- **کۆتایی پێ هێنان، تەواو کردن**: میوانی‌یەکەمان بە میوەو چایی تەواو کرد.

٨٨٥٩/ 3129- **کۆتایی پێهێنان، بڕینی قسەی کەسێک لەسەر تەلیفۆن**: دەرفەتی ئەوەم نەبوو داوای لێبووردنی لێ بکەم. قسەکانی بڕی‌و تەلیفوونەکەی دانا.

← تەواو کردن.

٨٨٦٠/ 414- **(بۆ جارێکەو بۆ هەمیشە) کۆتایی هاتن، تەواو بوون**: کێشەو هەڵلاو لێک دڕدۆنگ بوونیان (بۆ جارێکەو بۆ هەمیشە) تەواو بووە. ئێستا ئیدی هیچ شتێک ناتوانێ دۆستایەتی‌یەکەیان تێک دا/ لێکیان بکا. ● ئەوە پێوەندی بە ژیانی رابردوومانەوە هەیە، تەواو بووەو رۆیشتووە، بەڵام ئەوە شتێکە کە ئەو لە بیری کردووە/ لەبیری چۆتەوە.

٨٨٦١/ 5681- **کۆتایی هاتنی مەسەلەیەک بە چاوی خۆ دیتن**: شێلگیرانەترین ئەیارەکانی دوکتوور... ئاواتیان ئەوەیە/ ئاواتەخوازی ئەوەن کە تەواوبوونی زەبروزەنگ لە ئەفریقا بە چاوی خۆیان ببینن.

٨٨٦٢/ 5562- **کۆتایی هاتن، تەواو بوون**: ئیجارەی ئاپارتمانەکەیان لە لەندەن دوای چەند مانگی دیکە تەواو دەبێ.

← تەواو بوون، (ترپە ترپ کردنی)، کووژانەوە، بڕان، بەڕێوەچوون.

٨٨٦٣/ 7413- **کۆتایی هێنان بە**: رێکخراوی قاچاخچی‌یەکان چالاکی‌یەکانی خۆی کۆتایی پێ‌هێناو ئامادە بوو کە خۆی هەڵوەشێنێ.

٨٨٦٤/ 729- **کۆتایی هێنان بە، تەواو کردن (پەشتێکی ناخۆش)، بڕینەوە**: رێبەرایەتیی حیزب بە نیگەرانی‌یەوە هەوڵی دەدا هەرچی زووتر بە مەسەلەی رۆیشتنی ئەندامان کۆتایی بێنێ.

٨٨٦٥/ 5057- **کۆتایی هێنان بە، تەواو کردن**: بە زەبریەک دەمری، مردنێک کە بە هەموو فکرەکانت لە پێوەندی دەگەڵ (چوون بۆ) ئوسترالیا کۆتایی دێنێ.

٨٨٦٦/ 5050- **کۆتایی هێنان بە، کۆتایی پێ هێنان، تەواو کردن، پێش ... گرتن**: راست کاتێ/ وەختی ئەوە هاتووە کە بە بڵاو بوونەوەی زانیاری‌یەکان کۆتایی بهێنرێ.

← تێکدان.

کوجیلە کردن لە دەوری ← کۆبوونەوە لە دەوری.

٨٨٦٧/ 2001- **کۆچ کردن**: ویستی لارەکان بۆ کۆچ کردن لە سکۆتلەندەوە بۆ ئینگلیستان هیچ نیشانەیەک لە هەڵگەرانەوە لە خۆ نیشان نادا (= نیشانەیەک لەوە دیار نیە کە ئەم رەوتە ببێتە پێچەوانە- وەرگێڕ-).

کۆرپە کردن ← هەرس کردن.

٨٨٦٨/ 1865- **کورت بوونەوە (ی رۆژ)، لە کورتی‌دان**: رۆژەکان ئەوە وردە وردە کورت دەبنەوە، ئەدی، ناتوانم ئێواران چیدیوا دەگەڵ باخچەی خەریک بم.

٨٨٦٩/ 1088- **کورت بوونەوەی رۆژ**: هەر رۆژێک کە لە پاییز تێپەر دەبێ، رۆژ کورت تر دەبنەوەو ماوەی رووناکیش لێی دەبێتەوە.

٨٨٧٠/ 1160- **کورت کرانەوە، بە کورتی**: مەسەلەکە لە دوو شتاندا کورت دەبێتەوە/ مەسەلەکە بە کورتی دوو شتە (بە کورتی دوو رێگات لە پێشە): یان لێرە دەمێنی‌یەوەو هەرچی پێت دەڵێم دەبێ بی‌کەی، یان دەبێ لێرە بڕۆی‌و هەرگیز نەگەڕێیەوە.

٨٨٧١/ 1967- **کورت کردنەوە**: ئەو کورە بەستەزمانە زۆر بەداخەوە دەزانێ کە تەنیا کەسێکە شەڵواری کورتکراوەی باوکی لەبەر دایە.

٨٨٧٢/ 5243- **کورت کردنەوە لە ... دا**: پێم وایە دەکرێ قسەکانی لە یەک دوو خاڵی سەرەکی‌دا کورت بکرێنەوە.

کورت کردنەوە ← هەڵپەرتاوتن.

کورت کردنەوە لە...دا ← تێپەستاوتن.

٨٨٧٣/ 6867- **کورت‌و چکۆلەکردنەوە**: خاوەن چاپەمەنی‌یەکان ئەم فەرهەنگەیان کورت‌و چکۆلە کردۆتەوە بۆ ئەوەی خوێندکارەکان بتوانن کەلکی لێوەرگرن.

کورت‌و کرمانجی گوتن ← راستی‌یەکەی گوتن، دەق‌و دوغری گوتن.

٨٨٧٤/ 3581- **کورت یان کەم کردنەوە هەتا رادەی گونجاو**: سەرۆکی کۆبوونەوە داوای لە نوێنەرەکان کرد هەتا رادەی گونجاو قسەکانیان کورت کەنەوە/ لە کورتی ببڕنەوە بۆ ئەوەی بۆ هەمووان دەرفەتی ئەوە هەبێ بیروڕای خۆیان دەربڕن.

٨٨٧٥ 5683- **گەوە گەوز کردن، دەرپەڕاندن:** ئەگەر دوژمن نەیتوانی لە کەنار دەریا دەرمان پەڕێنێ، هەوڵ دەدا لە نێو خۆی وڵات گەمارۆمان بدا/ ئابلۆقەمان بدا.
← بە کورتی گێڕانەوە.

٨٨٧٦ 2814- **(زاراوەی عەسکەریە) کوژران، گیان لە دەست دان:** کاتێك دەرکەوت لە هێرشی هەوایی شەوی پێشتر چەند نەفەر لە رەفیقەکان کوژراون، غەمێکی گەورە بەسەر کافەکە داهات.
کۆسپێو تەگەرە خستنە سەر رێگای... ← دەگەڵ کەوتن، پێش گرتن بە، پێشگری کردن لە، بوون بە کۆسپ لەسەر رێگای کەسێك.

٨٨٧٧ 3084- **کوشتن (بە تفەنگ و لە حاڵێکدا کە ئەبرای کوژراو بێچەکو بێدیفاع بووە):** کەس ناتوانێ هەرگیز بزانێ چەندە وەرزێری بێگوناهو بێدیفاعی ڤیەتنامی کوژراون.

٨٨٧٨ 5493- **کوشتن، کوژران:** دوو کەس لە جینایەتکارەکان لە دەرگیری دەگەڵ مەئموورانی پۆلیسدا کوژران.

٨٨٧٩ 9061- **کوشتن، تۆپاندن:** باش تێکەرەکە/ سەرەتێمەر سەگەکەی خۆی دەرماندلو کرد. ئەوە شێوەیەکی دروست بۆ کوشتنی سەگان نیە.

٨٨٨٠ 1565- **کوشتن، کوژران:** لەسەر تاقەی سۆبەکە رەسمی گەورەی بنەماڵەکەیان داندرابوو کە لە هەرەتی لاوەتیدا لە شەری دووهەمی جیهانیدا کوژرابوو.

٨٨٨١ 1791- **کوشتن:** سروودی ئایینی وەها خوێندرا بوونەوە کە وایان لێ کردبووی کە دەهاتی خۆت بکوژی. ● ئەسپەکە لە هەوەڵین بازدانیدا لاقی شکاو بە ناچار دەبوو بیکوژن.

٨٨٨٢ 1800- **کوشتن، خۆ کوشتن:** بە تەواوی هیوابڕ ببووم و چی وای نەمابوو خۆم بکوژم.

٨٨٨٣ 1808- **کوشتن، کاری کەسێك تەواو کردن:** نیگابانەکان زیندانییەکانیان لە یەکێك لە مێشەکاندا کوشت.

٨٨٨٤ 806- **کوشتن (بە تفەنگ یان دەمانچە):** ئەتۆ ئەو کابرایەت کوشت بۆیە دەبێ خوێنەکەی بدەی یان بکوژرێیەوە.

٨٨٨٥ 3640- **کوشتن، لەنێو بردن:** خەڵکی گوندەکە نەیاندەزانی لە پشت دیوارەکانی/ لە ژووری شێتخانەکەدا چ رادەبرێ. ئایا جاروبار شێتە خەتەرناکەکانیان دەکوشتن؟

٨٨٨٦ 3675- **(زاراوەی لاتان) کوشتن:** لەم سەردەمەدا، دزان لە کاتی تاوانکارییەکانیاندا بوو لە کوشتنی دەرکەوانە

پیرەکان ناکەنەوە، کە بە بڕوای من بۆخۆپاراستن لە سزای مەرگە.

٨٨٨٧ 4903- **کوشتن، لەنێو بردن:** هەوڵماندا مشکەو داعبا مووزییەکان بە ژەهری تایبەتی لە نێو بەرین.
← خستن، تۆپاندن.

٨٨٨٨ 534- **کوشتن یان کوژران بە بۆمب:** هێندەی نەمابوو لە تەقینەوەی راکێتەکاندا بکوژرێن.

٨٨٨٩ 5249- **کۆکردنەوە:** کاتێك بایەکی توند (گژەبایەك) هەڵ دەکا بۆ پێشگری لە وەرگەرانی بەلەمەکە دەبێ بادبانەکان کۆ کەنەوە.

٨٨٩٠ 5253- **کۆکردنەوە (بەتایی قولاپی ماسی گرتن لەسەر قەرقەرە):** شتێك لەسەر قولاپەکەیە؛ کۆی کەوە.

٨٨٩١ 5478- **کۆکردنەوە، خڕکردنەوە:** بانگی ئەندامانی کۆمیتە کۆکەوە.

٨٨٩٢ 3934- **کۆکردنەوە، ئێك وەخڕکردن:** بۆ نامەنگەکەی ئێمە، ژمارەیەك لە باشترین هونەرمەندەکانیان کۆ کردۆتەوە.

٨٨٩٣ 2399- **کۆکردنەوە، خڕکردنەوە:** بە منداڵەکان بڵێن شتەکانیان کۆکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانن بۆ قاوە خواردنەوە میوانەکان بەرینە دیوی حەسانەوە.

٨٨٩٤ 2389- **کۆکردنەوە (ی بەرهەم)، لەمبارکردن، لە لەمبار نان، هەڵگرتن:** دوای کۆ کردنەوەی سێوکەکان، ئەرزەکەیان کێڵاوە بۆ چاندن.

٨٨٩٥ 2472- **کۆکردنەوە، کۆکردنەوەو هێنانە ژوور، خەرمان هەڵگرتن:** جووتیارەکان خۆشحاڵ بوون کە توانیبوویان وا زوو خەرمانەکانیان هەڵگرن/ بەرهەمەکانیان کۆ کەنەوە.

٨٨٩٦ 1468- **کۆکردنەوە:** ئەو پوولانەی وەدەستت هێناون کۆیان کەوەو دەگەڵ ئەوانەی لەسەر مێزەکەن لەبەر یەکیان دانێو بزانە لە نێوانی زیاترت هێناوەتەوە یان کەمتر.

٨٨٩٧ 1549- **کۆکردنەوە، کوڵچین کردن، گوڵبژێرکردن:** ژێنراڵ واول کۆمەڵە شیعرێکی لە ''باخچەی شیعری شاعیران'' کۆ کردبۆوە.

٨٨٩٨ 6700- **کۆکردنەوە:** دوای ئەوە کە نووسەری شانۆکەیان بەوە تاوانبار کرد بووختانی بە کەسێك کردووە، شانۆکەیان کۆ کردەوە.

٨٨٩٩ 6206- **کۆکردنەوە، کۆمەڵکردن، کەڵەکە کردن، هەڵڕژان لەسەر یەك:** بۆ دیوێکی تۆزاوییان رێنوێنی کرد کە لە

تەنیشت دیوارێك پەروەندەكانیان لەسەریەك كەڵەكە كردبوو.

٨٩٠٠/ 6967- كۆكردنەوە (بە پەلە)، تێكمشتنەوە: پێنج دەقیقەم دەرفەت دەیە كە هێندێك جلك/ لیباسان كۆ كەمەوە، ئینجا وەرێ دەكەوین.

٨٩٠١/ 6989- كۆكردنەوە (وەكەكاندو چەكەجەقان): ئەو كاغەزانەت كۆ كەوە. سەرمیزەكەت زۆر شپرزەیە.

٨٩٠٢/ 276- كۆكردنەوە، خەرمان هەڵگرتن: میوەكە لە دەساڵی رابردوودا وێنەی نەبووە، بە بێ هیچ گیروگرفتێك كۆ كراوەتەوە.

٨٩٠٣/ 37- كۆكردنەوە (لە جیهانێدا)؛ هەتا ئەو رەقەمانە كۆ دەكەمەوە، هەر جارێ جرابێك وەدەست دێنم.

٨٩٠٤/ 7029- كۆكردنەوە: هەردوو حەوترو جارێك مامۆستاكان دەبوو نومرەكانی قوتابیەكان كۆكەنەوەو لە لیستەی پێشبركێدا بیاننووسن.

٨٩٠٥/ 4578- كۆكردنەوە لەسەر كەڵەكە كردن لەسەر: هەتا ئەو كاتەی ناورەكە گرفەی لێ هەستا، هەروا داریان لەسەر كەڵەكە دەكرد. ● نازانم بۆچی هەرچی كاری زیادییە لەسەر شانی منی كۆ دەكەنەوە/ دەملی منی دەپەستێون.

٨٩٠٦/ 960- كۆكردنەوەو بەستن: قژی/ پرچی لەسەر سەری كۆكردبۆوەو، بە دەرزییەكی گەورە بەستبووی.

كـو كردنـەوە ← دەسـت كێشـانەوە لـە، تێپەسـتاوتن، هـەلگرتن/ كـۆ كردنـەوە(ی خەلەوخـەرمان)، رێلەرێـلە كردن، پێچانەوە، لێك وەخركردن، بردنەدەر.

٨٩٠٧/ 6594- كۆك گرتن: بەری ئەو جلكە زۆر شلو شەرێق كۆك گیراوە - تەقەڵەكانی هەروا دەرمۆێنەوە.

٨٩٠٨/ 6705- كـول كـردن، دڵنەڵـەوە، برسێتی شكاندن: ئەگەر بیترو لەو نەسكەنەیە/ لێسكەیە وەك پێنج بادەر هەروا كەلك وەربگری، دەمەكەی كول دەكەی.

٨٩٠٩/ 525- كوڵ و كۆی دڵی خۆ رشتن: ساڵی تازە دەستی پێ كردووەو هەڵپەركێ ساز بۆوە؛ ئێستا وەختی ئەوەیە كوڵو كۆی دڵمان برێژین.

٨٩١٠/ 7389- كۆڵین: مەروە دارێكی هێناو ئێرەكەی كۆڵی و، وەك مەردێلی قیاغێكی چكۆڵەی لێكرد.

٨٩١١/ 5327- كۆڵینەوە لە: ئەو لە گیروگرفتی منالانی كەم تەمەن لە كتێب خوێندنەوەدا دەكۆڵێتەوە.

← پشكنین، پێراگەیشتن.

كۆمەگ كردن بە ← یارمەتیدان ، خزمەت كردن بە.

٨٩١٢/ 6851- كونـاودیو كـردن، كـون كـردن، هـەڵدڕین، قـووت دان: گوللـە تـۆپ دیـواری قەلاكـەی كونـاودیو كردبـوو/ هەڵدڕیبوو.

٨٩١٣/ 6019- (بـە زەبـەندێكی توند) كـون، برینداریـان وردوخـاش كـردن: تەقینەوەكـە هـەموو پەنجـەرەكانی دیـوە عەرزەكییەكانی وردوخاش كردبوو.

٨٩١٤/ 7343- كـون بـوون، دڕان، لـە كـەرەم كـەوتن: لیباسـی منداڵەكان هەر زوو كۆن دەبن، چونكە ناگایان لێ نییە.

← دواكەوتووبوون.

٨٩١٥/ 424- كۆنترۆڵ كردن، رام كردن، مەهار كردن: ئەو ناورەی ئەمرۆ بەیانی بازاری شاری خەتبۆرە مەترسییەوە، ئێستا بە تەواوی مەهار كراوە.

٨٩١٦/ 3528- كۆنـترۆڵ كـردن، خـۆ راگرتـن لەسـەر...، راوەسـتان: ئەگەر هەمووومان لەسەر جێگای خۆمان راوەستێن زۆر خێراتر لە گومرگ تێپەر دەبین.

٨٩١٧/ 3561- (زۆر توند) كۆنترۆڵ كردن: مەگەر زۆر بە توندی داهاتەو دەرگەوتی ماڵ كونترۆڵ بكرێ، دەنا كابرای خاوەماڵ زۆر زوو بۆی دەردەكەوێ كە خەرجی لە داهاتی زیاترە. ● ئەم كورانە یەكجار بەدفەرن - پێویستە زۆر بە توندی كونترۆڵ بكرێن.

٨٩١٨/ 2531- كۆنترۆڵ كردن (خۆ): گرێت لـێ بێ، خۆشنار؛ دەبێ خۆت كونترۆڵ كەی، نابێ بێڵی خێزانت لەم وەزعەدا بتبینێ.

٨٩١٩/ 4077- كۆنترۆڵ لە دەستدان: هێندێك لە دایكو بابان حازر نابن كونترۆڵی خۆیان بەسەر منداڵەكانیان لە دەست بدەن. هەرچی زیاتر كونترۆڵیان بەسەر ئەواندا لە دەست دەدەن، زیاتر تێدەكۆشن، لە رێگای ناعادلانەوە بەسەریاندا زاڵ ببنەوە.

٨٩٢٠/ 3523- كۆنترۆڵ كـردن، پێشـی... گرتـن: ئەگەر پێشی واریدات نەگرین وەزعییەتی لە باری پارسەنگی بازرگانیمان دەكەوێتە مەترسییەوە. ● ئەگەر پێشی زمانی خۆم نەگرتبایە، بۆی هەموو شتێك بڵێم كە دوایە پەشیمانی بكێشم.

← بەرێوە بردن.

٨٩٢١/ 2849- (لە پێوەندی لەگەڵ فرۆكە) كۆنترۆڵ لە دەست دان ...: هەوەڵین جار كە فرۆكەوانە تازەكارەكە بە تەنیایی پەروازی دەكرد، كۆنترۆڵی فرۆكەكەی لە دەستداو تەنیا كاتێك توانی بیخاتە ژێر كونترۆڵ كە ٥٠٠ پێی مابوو بگاتە ئەرزی.

کونترۆڵی خۆ لەدەستدان ← هەڵچوون.

٨٩٢٢/ 309- **کونترۆڵی کەسێك/ شتێك بەدەست بوون:** ئاخر ئەو کە ناتوانێ خۆی کونترۆڵ بکا، چۆن دەتوانێ کلاسێك کونترۆڵ بکا/ بەرێوە بەرێ؟

٨٩٢٣/ 6838- **کۆنفرانسی پەروەردە:** یەکیەتیی شەریکەکان لە رۆژەکانی پشوودانی حەوتوودا کۆنفرانسێکی پەروەردەیی سەبارەت بە پاراستنی ژینگە لە لادێ پێك هێناوە.

٨٩٢٤/ 6294- **کون کردن، کوناودیو کردن:** لە نەخۆشخانە وەریان گرت لە حاڵێکدا دوودانە پەراسووی کوناودیو/ کون ببوون.

٨٩٢٥/ 5581- **کون کردن (بە چەقۆ یان هەرشتێکی تووك تیژ):** بە نارنجۆکان هێرشی کردە سەر پاسگاکەو بەدەنی ئەوانەش کەزیندوو مابوون بە سەرنیزە کون کونی کردن.
← کوناودیو کردن، چوونە خوار لە، نفووز کردن لە.

٨٩٢٦/ 5382- **کون کون بوون، پڕ بوون لە:** ئەری تیرتاسەکانی ژێر ئەرزی حەمامەکەت دیوە؟ پڕیە لە کوونی زۆر وردن. ● بەڵێ راپۆرتەکەم خوێندۆتەوە، پێم شتێکی وانیە. پڕیە لە هەڵەیە.

٨٩٢٧/ 5381- **کون کون کردن، دابێژدابێژ کردن:** باڵۆنەکە بە گوللەی پەدافەندی هەوایی/ زیدەی جەو دابێژ دابێژ کرابوو.
← بڕین، ناژن ناژن کردن.

٨٩٢٨/ 260- **کۆنە، دڕاو، شلم شلم، دلتەنگ:** زۆر دڵتەنگو غەمگین دیتە بەرچاو. داخوا گەوگرفتێکی بۆ هاتۆتە پێش یان هەروا شلم شلمە؟. ● حەمباڵێکی شلم شلم جانتاکانی بۆ هەلگرتین.
کۆنەپەرستانە بوون ← دواکەوتوو بوون.
کووڕ کردن ← داهێنان.

٨٩٢٩/ 5022- **کووژاندنەوە، خاموش کردن:** ... پەردەکانی دادلوە، چراکانی کووژاندنەوە.

٨٩٣٠/ 1517- **کووژاندنەوەی ناوێك لە لیستەیەکدا)، خەت لێدان، خەت بەسەرداکێشان:** دیتم ناویان لە لیستەی یاریزانەکاندا خەت کێشاوەو کەسێکی دیکەیان لەجێ داناوم.

٨٩٣١/ 7152- **کووژاندنەوە، بەستنەوە، هەلبڕین، بێدەنگ کردن:** پێش ئەوەی بۆ خەوتن بێیە سەرێ، لەبیرت نەچێ چراکان بکووژێنیەوە.

٨٩٣٢/ 7163- **کووژاندنەوە، کووژانەوە:** پێش ئەوەی بێیە سەرێ بۆ خەوتن، بزانە هەموو چراکان کووژاونەتەوە یان نا.

٨٩٣٣/ 6480- **کووژاندنەوەی سیفلار لەسەر شتێك:** جگەرەکەت لەسەر سۆبە دیوارییەکەم مەکووژێنەوە.

٨٩٣٤/ 4779- **کووژاندنەوە:** بایەك کە لە پەنجەرە ناوالەکەوە هات، شەمەکەی/ مۆمەکەی کووژاندەوە.
← خەت (بەسەردا) کێشان.

٨٩٣٥/ 2286- **(پرتە پرت کردنو) کووژانەوە:** شەمەکان یەك لە دوای یەك (پرتەپرتێکیان کردو) کووژانەوە.
← رۆیشتن (ی کارەبا)، بڕین.

٨٩٣٦/ 526- **کووژانەوە، خاموش بوون:** یەکێك وەژوور کەوتو چراکە کووژاوە. ● پێش ئەوەی بنووی/ راکشێی، شەمەکە بکووژێنەوە.

٨٩٣٧/ 370- **کووژانەوە، نەدانیسان:** کاتێك لە تیاتر گەراینەوە، چراکان نەدایسان؛ وادیار بوو دایکم خەوتووە.

٨٩٣٨/ 2903- **کووژانەوە:** هەر چاوەروانی ئەوە بووین بگەرێینەوە مالێ، بەلام کاتێك گەیشتینەوە سۆبەکە کووژابۆوە.

٨٩٣٩/ 6182- **(ترپە ترپ کردنو) کووژانەوە، بە لەسەرەخۆیی کۆتایی هاتن یان تەواو بوون:** ئاخرین دەنگە شەمچە پرتەیەکی لێهاتو کووژایەوەو لە تاریکیدا بەجێی هێشتین. ● خۆپێشاندانەکە دوای یەك دوو وردە دەرگیری دەگەل پۆلیس، بە لەسەرخۆیی تەواو بوو.

٨٩٤٠/ 822- **کووژانەوە (بە هۆی تەواو بوونی سووتەمەنی):** کاتێك لە تیاتر گەراینەوە، دیتمان سۆبەکە (بە هۆی تەواو بوونی نەوت) کووژاوەتەوە.

٨٩٤١/ 1594- **کووژانەوە:** کاتێك گەرمای هۆدەکە بگاتە ٧٠ دەرەجە، سۆبە گازییەکە لە خۆیەوە دەکووژێتەوە.
کوێرەوەری دیتن دەگەڵ ← زەحمەت کێشان لەسەر.

٨٩٤٢/ 5213- **کۆی شتێك حیساب کردن:** کابرایەکی میکانیك کۆی ئەو پارانەی کە دەبێ خەرجی چاك کردنەوەی ماشێنەکەم بکرێ حیساب کرد.
کەبس کردن ← پەستاوتن.

٨٩٤٣/ 7202- **کە پۆ هەلترچاندن لە، بە سووکی چاو لە کەسێك کردن، لووت لێ بادان:** دەزانم پەتاتەو سووسیسمان هەیە، بەلام، پێویست ناکا لووتی لێ بادەی.

٨٩٤٤/ 3769- **کەلتی (گوناحی) شتێك خستنە لەستۆی کەسێك:** هیچ کەسێکی واحید نەبوو کە بکرێ گوناحی کارەکەی بخەنە ئەستۆی. دەبوو کەلتی ئەو تێشکانە وەك یەك بەسەر هەموان دابەش بکرێ.

← کەتنی... بوون ←خەتای ... بوون.
کەتنی خۆ قبووڵ کردن ← ددان بە گوناهی خۆداهێنان.
٨٩٤٤/ 4594- **کەرانە بزووتنەوە، کەربازاری دەرهێنان:** 'چوار، تەنیا پێنج دەقیقان لەو کەربازارییە دەست هەڵگرە. کارم هەیە.'
٨٩٤٦/ 2364- **کەرانە جووڵانەوە، کەرەکەرە کردن:** کەنگێ دەیەوێ دەست لەم کەربازارییەی هەڵگرێو شەرافەتمەندانە کاری خۆی بکا؟
کەربازاری ← مەست بوون.
کەربازاری دەرهێنان ← رەفتاری ناشایست لە خۆ نیشان دان.
کەر بوون ← حۆل بوون.
کەرەکەرە کردن ← کەرانە جووڵانەوە.
کەساد بوون ← شل بوونەوە.
کەسایەتیی خۆ چەسپاندن ← نیشاندانی (کەسایەتی، توانایی).
٨٩٤٧/ 1304- **کەسایەتییەکی گرنگ پەیدا کردن:** کاتێک کە سیاسەتیی بریتانیا بەرەو لاوازی دەرۆیشت، ئەو کەسایەتییەکی گرنگی پەیدا کرد.
٨٩٤٨/ 5807- **کەسەبو کارێک دەست پێکردن، دوکانی ... دانان:** خۆشناو لە شەقامی... دوکانێکی وردە فرۆشی بۆ سیغارو تووتنی دانا.
کەسێی تەکلیف کردن ← پرسیار کردن لە.
٨٩٤٩/ 1155- **کەسری قسان:** پاش ئەوەی کە لەمێژساڵە دوکانی خۆی هەبوو، ئێستا کە ناچارە بۆ کابرایەکی دیکە کاربکا، بەراستی بۆی کەسری شانە.
٨٩٥٠/ 256- **کەسری هەبوون، کەم بوون، کەم هێنان:** داخڵەکەم چاو لێکرد. چل پۆندی کەمە.
٨٩٥١/ 6635- **کەسێک لە جیاتی کەسێکی دیکە گرتن، پێ وابوون، هەوەی گرتن:** ببوورە زۆر خۆمانە قسەم دەگەڵ کردی؟ پێم وابوو یەکێک لە هاوڕێ نزیکەکانمی.
٨٩٥٢/ 5266- **کەسێک دەشتێک گرتن، بەسەردا باراندن:** پێت وانەبێ کاتێک بۆ کاری بازرگانی دەچێ وڵاتانی دیکە، ئیدی مشتەرییەکانمان دەشامپانی و جگەرانت دەگرن.
٨٩٥٣/ 940- **کەشتی لێشکاو، تەنهاو تەنیا:** ئەگەر کەشتی لێشکاوێک بایەو بە تەنیایی لە دوورگەیەک مابایەوە، داخوا دەتوانی بحاوێیەوە؟

٨٩٥٤/ 4470- **کەشکەشە بۆ گێڕان، ئەوجێ کردن بۆ، یارمەتی کۆ کردنەوە بۆ...:** کاتێک جۆرج مرد، بۆ ناڵەی گوڵی سەر قەبرەکەی کەشەفیان گێڕا/ پوولیان بۆ کۆ کردەوە.
← یارمەتی کۆکردنەوە بۆ.
٨٩٥٥/ 6760- **کەشکەشە (= سینی) گێڕان بۆ، یارمەتی کۆکردنەوە:** رێبەرانی کرێکاران لە خەڵکەکەیان داوا کرد یارمەتی بدەن بە سندووقی مانگرتنەو، دوو سێ کەس لە سەنەووڕانی ئەداروکات کەشەفیان گێڕا (= یارمەتییەکانیان کۆکردەوە).
٨٩٥٦/ 2318- **کەف هەڵخڕاندن:** یەکێک لە نیشانەکانی هار بوون کەف هەڵخڕاندنە.
٨٩٥٧/ 5495- **کەڵتە کردنەوە، تازە کردنەوە، بەسەر... داچوونەوە:** ئەگەر قەرار بێ دوو هەفتان لە ئیتالیا بم، وا باشترە زمانی ئیتالیاییەکەم کەمێک کەڵتە کەمەوە.
٨٩٥٨/ 5740- **کەڵک لێوەرگرتن وەک، بەکارهێنان لە جیاتی:** کۆڵکەیەکی کوڵدراوی وەک کەوچکەو سەدەفێکی پانی وەک دەوری بەکار دەبرد.
٨٩٥٩/ 2566- **کەڵک لێوەرگرتن (بە باشی)، بەکار هێنان (بە باشترین شێوە)، کەڵک لێ هەڵگرتن (بەباشی):** کاتێک دەگەڵ ئەو پیاوانە وەک تاقمێک مرۆڤی نەفام دەجووڵێیەوە، ناتوانی زۆر بە باشی کەڵکیان لێوەرگری.
٨٩٦٠/ 2851- **کەڵک لێوەرگرتن، هێنانە کایەوە، هێنانە ژێر کار، وەگەڕخستن:** پێش ئەوەی کارمەندانی شەرکەتی هەوایی لەسەر سیستەمی تازەی یارمەتیی مانگانە رێککەون، فرۆکە ئیس ٧٤٧ەکان نەیاندەتوانی وەگەر کەون.
٨٩٦١/ 158- **کەڵک وەرگرتن:** بۆ فێر بوونی ئینگلیسی، دەبێ لە هەموو دەرفەتێک کەڵک وەرگری.
٨٩٦٢/ 4736- **کەڵک وەرگرتن لە:** خاوەنکارەکان ئامادە بوون لە سەر زیاد کردنی حەقدەستەکان وتووێژ بکەنو لە ئیمتیازێکی کە بەو جۆرە وەدەستیان کەوتبوو کەڵکیان وەرگرتو مەسەلەی بەرهەم هێنانیان هێنایە گۆڕێ.
٨٩٦٣/ 7531- **کەڵک وەرگرتن لە:** ناوەندی مالیی لەندەن بۆ کەڵک وەرگرتن لە دەرفەتی ناوا گەورە هەرگیز تەنەخی ناکا.
٨٩٦٤/ 6675- **کەڵک وەرگرتن لە (بە باشی):** لەو ساڵانە ئەمیار کراوەی وەرزش باش کەڵک وەرناگیرێ.
← بەکارهێنان، وەگەر خستن.

٤٩٦٥/ 4166- **کەڵك وەرگرتن لە، داسەپاندن:** لە کلیسا چکۆلەکان گەلە ئەشیەك کاریان دەکرد کە دەرس خوێندووەی ناکفورد نەبوون. لەو کلیسایانە لە واعیزی غەیرە رووحانیشیان کەڵك وەردەگرت.
← پێشدەستی کردن.

٤٩٦٦/ 194- **کەڵك(ی خراپ) وەرگرتن لە، پووڵو پارە وەسەرپەك نان (بە کەڵك وەرگرتن لە کارو کۆششی خەڵکی دیکە):** ئەو بە دۆستە بازرگانەکانی دەگوت ناگایان لە خۆ بێ کە هێندێك کەس هەروەك گیا کەڵە بەرهەمی کارو کۆششی ئەوان دەخۆنو قەڵەو دەبن.

٤٩٦٧/ 4642- **کەڵك(ی خراپ) وەرگرتن لە:** قەیسەر لە ترس و خۆفی دراوسێکان سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی هێزی سەربازیی ئەو کەلکی (خراپی) وەرگرت بۆ ئەوەی ئیمتیازی بازرگانیان لێ بستێنێ.

٤٩٦٨/ 3798- **کەڵك وەرنەگرتن لە، وەلاسان:** ناچار بوو ماشێنەکەی وەلانێ - ناتوانێ حەقی بیمەی بۆ بدا.

٤٩٦٩/ 7051- **کەڵك خراپ وەرگرتن لە:** هەتا کەنگێ دەتەوێ لە بێچارەیی و داماویی خۆت کەلکی خراپ وەرگرێو، هەمیشە بتەوێ خەڵك دەستت بەسەردا بێننو بتلاوێننەوە؟

٤٩٧٠/ 6676- **کەلکی خراپ وەرگرتن لە، فریودان یان بەلاڕێ دابردن (ی ژنێك):** ئەو کەسانەم هیچ خۆش ناوێ کە هەر رووم وەرگێرا کەلکی خراپ لە مالی من وەردەگرن. یاللا ئەو پارانە بدەوە.

٤٩٧١/ 4580- **کەڵەکە بوون:** بە هۆی مانگرتنی مەئموورەکانی گومرك، ئەو کالایانەی زوو خراپ دەبنو دەرزێن، لەبار ئەندازەکاندا لەسەریەك کەڵەکە بوون.
← کۆبوونەوە.

٤٩٧٢/ 4291- **کەڵەکە بوون، زیاد کردن، زیاد بوون، زۆر بوون:** هەموو هەفتان پۆندێك پاشەکەوت کە. دوای ماوەیەك سەرت سوور دەمێنێ کە پاشەکەوتەکەت چلۆن زیاد دەکا.

کەڵەکە کردن لەسەر شانی کەسێك ← بار کردن، کۆ کردنەوە لەسەر، قەڵاپەچن کردن.

کەڵەوە کێشی کردن لە پێوەندی دەگەل ← دژایەتی کردن دەگەل.

٤٩٧٣/ 1848- **(وردە وردە) کەم بوونەوە:** بۆ بەشێك لە ئیدارە نەقل دەکرێ کە پیاوی بە زەوقو قسەخۆشی زۆر لێ کەم بۆتەوە.

٤٩٧٤/ 5530- **کەم بوونەوە، هاتنەخوار:** هێزی کاری کشتوکاڵ هەروا بێ پسانەوە لێی کەم دەبێتەوە.

٤٩٧٥/ 2910- **کەم بوونەوە، هاتنە خوار، دامرکانەوە:** کاتێك دەرکەوت کە بێجگە لە سەردەستەکان هیچ کەسی دیکە باس کردن لە مەسەلەکەیان پێخۆش نیە، لە توندو تیژی باسەکە کەم بۆوە.

٤٩٧٦/ 2098- **کەم بوونەوە (و تەواو بوون)، وردە وردە تەواو بوون:** دەنگی سێ ئەسپان وردە وردە تەواو بوو.

٤٩٧٧/ 2106- **کەم بوونەوە، هاتنەخوار، دابەزین، شکان:** کاتێك دەستووری بەرتەسك کردنەوەی رادەی هێنانو بردنی بەردە زوخاڵ بەڕێوە چوو، رادەی بەرهەمی کارەبا لە کارخانەکان هاتە خوار.

٤٩٧٨/ 2796- **کەم بوونەوە، هاتنە خوار:** زۆر سەیرە، نرخی شتومەك هەمیشە دەچێتە سەرو هەرگیز نایەتە خوارێ.

٤٩٧٩/ 1936- **کەم بوونەوە، هاتنە خوار:** لە سەرەتای مانگی سێپتامبردا، رادەی فرۆشی بەستەنیو ساردی کەم دەبێتەوە.

٤٩٨٠/ 1965- **کەم بوونەوە، کەم کردنەوە، لە توندوتیژیی ... کەم کردنەوە:** نێوان ناخۆشیی ئەو دوو وڵاتە کەم بۆتەوە.

٤٩٨١/ 532- **کەم بوونەوە، دامرکانەوە:** ئەتۆ بەراستی هەڵلایەکی عەجایبت بۆ ساز کردین. بەڵام گرنگ نیە؛ مەسەلەکە لە ماوەی یەك دوو رۆژاندا تەواو دەبێ/ دامرکانەوە.

٤٩٨٢/ 1979- **کەم بوونەوە، بەرەو کزی رۆیشتن:** ناغای چالتون پێی وابوو هێزی ژیانی بەرەو کزبوون دەروا.

٤٩٨٣/ 7388- **(وردە وردە) کەم بوونەوە:** لە مانگی ئوکتوبردا یارمەتییە مانگانەکانیان بۆ زیاد کردین، بەڵام بە چوونە سەری نرخی سووتەمەنیو خواردەمەنی، ئەو پارە زیادییە وردە وردە لێی کەمۆوە، بە چەشنێك کە گەیشتووینەتەوە ئەو جێگایەی لێی بوون.

٤٩٨٤/ 7138- **کەم بوونەوە، هاتنە خوار، زەعیف بوون:** وال ستریت هاتنە خواری نابووریی گوزاریش کردوە.

٤٩٨٥/ 1225- **کەم بوونەوە لە، کەم کرانەوە لە:** هەتا رۆژی بوودجەی دەست رادەگرم بۆ ئەوەی بزانم داخوا شتێك لە نرخی ماشێنان کەم دەبێتەوە یان نا.

٤٩٨٦/ 815- **کەم بوونەوە بە هۆی نەیەسان، سووتان و لە بەین چوون:** نیوەی ئەوتی چراکە سووتاوە/ تەواو بووە. * کاتێك فرۆکەوانەکەیان گەیاندە نەخۆشخانە، دەرکەوت پێستی دەمو چاوی سووتاوەو لەبەین چووە.

٤٩٨٧/ 2798- کەم بوونەوە(ی توندو تیژیی، توانایی شتێك): ئەگەر هە تا پێش سەعاتی ٣ لە هێزی با کەم نەبێتەوە، ناتوانین ئەمڕۆ هەستین (بە فڕۆکە).

٤٩٨٨/ 1151- کەم بوونەوە، هاتنە خوار، دابەزین: زۆر وێ دەچێ نرخەکان بچنە سەر نەك دابەزن.

← هاتنەخوار، دامرکانەوە، لە کەمیدان.

کەمتربوون ← لە خوارتر بوون.

٤٩٨٩/ 5490- کەمرەنگ بوون، کەم بوونەوە: بە تێپەڕبوونی زەمان، شۆقو زەوقی ئەو سەرکەوتنە کەم بۆتەوە.

٤٩٩٠/ 4942- کەمرەنگ بوون بە کەوتنە ژێر تەلیسمی ... بەشی یەکەمی بەرنامەکە لەژێر تەئسیری هاتنی ژنە ستارەکەی/ فەننانەکەی سینەمادا کەمرەنگ بوو.

کەمرەنگ تر بوون ← دوورکەوتنەوە.

کەمرەنگ کردن ← روون کردنەوە(ی شتێکی خەست).

٤٩٩١/ 4120- کەم کردنەوە، لەلەشت لێکردن: ئەو هەمەوو خەرجانەی بۆ تەعمیری ماڵەکەمان کردوە بەشێکی بەرچاویان لەو پووڵە کەم کردۆتەوە کە بۆ پشوودان دامانئابوو.

٤٩٩٢/ 7137- کەم کردنەوە، داگێشتن: گازەکەم کەم کردەوە. ● دەنگی بێسیمەکەم کەم کردەوە.

٤٩٩٣/ 6879- کەم کردنەوە: دەوڵەت بەو چەند ئیمتیازەی کە داوێ بەو کەسانەی زەریبە/ مالیات دەدەن، هیوادارە کە کەمێك لەباری ناخۆشیی کارەکانی ئەم دواییانەی کەم کاتەوە.

٤٩٩٤/ 6741- کەم کردنەوە، هەڵگرتن لە: حەقی بازنشستەگی/ تەقاعود لە یارمەتیی مانگانەی مامۆستایان کەم دەکەنەوە.

٤٩٩٥/ 1970- کەم کردنەوە، بەناچار خەرج کردن، بەناچار خواردن: خەرجی جێبەجێ کردنی ئەو کارە لە ڕێگای یاساوە لە پاشەکەوتەکەی زۆر کەم کردەوە. ● لە ڕێگای خەرج کردنی دەستمایەکەیەوە توانیویتی وەزعی خۆی (بەرواڵەتیش بووبێ) باش نیشان بدا.

٤٩٩٦/ 1568- کەم کردنەوە، هێنانە خوار: ئەوانەی جگەرەکێشان کەم دەکەنەوە، زۆربەیان زۆری دەخۆنو قەڵەویش دەبن.

٤٩٩٧/ 1566- کەم کردنەوە: دەبێ لە خەرجەکانمان کەم کەینەوە. ئەمن سیغارکێشان وەلا دەنێم ئەتۆش پارەیەکی کەمتر بدە بە بیرە.

٤٩٩٨/ 1563- کەم کردنەوە، هێنانە خوار(ی رادەی شتێك): بە هۆی وەزعی ناڵەباری ئابووریی وڵات، سەنعەتی ماشێنسازیی وڵات ناچار بووە هەتا ١٥ لە سەدی بەرهەم هێنان بێنێتە خوارێ.

٤٩٩٩/ 3889- کەم کردنەوە، هێنانەخوار: ئایا کەم کردنەوەی رادەی پاداشو ئیمتیازەکانی دەوڵەمەندان لە سەریەك بە قازانجی (خەڵکی) وڵاتە؟

٥٠٠٠/ 4329- کەم کردنەوە، بەرتەسك کردنەوە: کاری لێگەڕان بۆ دۆزینەوەی منداڵە ونبووەکەیان بە چەند شەقامی دەوروبەری قوتابخانەکەی بەرتەسك کردەوە.

٥٠٠١/ 4420- کەم کردنەوە، هێنانە خوار: کۆمیتە خەرجی سەفەرانی هەتا ئەو جێگایەی بۆیان لوا کەم کردۆتەوە.

٥٠٠٢/ 3506- کەم کردنەوە، راگرتن: ئەمە بە تەواوی سروشتییە کە دە لە سەدی نرخی خانوویەك راگرن بۆ ئەوەی کە نەکا کەمو کوورییەکی هەبێ.

٥٠٠٣/ 5281- کەم کردنەوە، هێور کردنەوە یان بوونەوە: دەورەیەکی خۆش کە لە پێشە، مومکینە ببێتە هۆی ئەوە کە " صدراعظم" کۆنتڕۆڵی خۆی لەسەر ئابووری هێور کاتەوە.

٥٠٠٤/ 3673- کەم کردنەوە، تەخفیف دان: کابرای سەوزی فرۆش هەمیشە بۆ ئەو کەسانەی تەقاعوودن/ بازنشستەن هێندێك لە نرخی میوەکانی کەم دەکردەوە.

٥٠٠٥/ 6508- کەم کردنەوە: لەو تەمەنەدا دەبێ بتوانێ عەددێك لە عەددێکی دیکە کەم کاتەوە.

٥٠٠٦/ 6411- کەم کردنەوە: هەموو حەوتووان بیست پۆندی داوەو لەو پارەیە سێ پۆندی بۆ مالیات/ زەریبەو بیمەی ئەتەوایەتی کەم کراوەتەوە.

٥٠٠٧/ 6620- کەم کردنەوە(لە)، دەرکردن لە: ئەو رەقەمە لە وەیان دەرکەو بڵێ چەندی دەمێنێتەوە.

٥٠٠٨/ 6645- کەم کردنەوە: هاتنی بۆ نێو خەڵکەکە بە ڕووبەڕووشامەوە/ پێڕاما کۆنو دراوەکەیەوە لەو تەئسیرەی کەم کردەوە کە دەیەویست وەك کاربەدەستێکی بە زیپك دایبنێ.

٥٠٠٩/ 6748- کەم کردنەوە: بزمیەکی کە بە دوای رەخنە گرتنەکانی هاتە سەر لێوی تا رادەیەك لە توندو تیژییەکەی کەم کردەوە.

٥٠١٠/ 7087- کەم کردنەوە لە: کاتێك ماری جلوبەرگی زستانی رابردووی خۆی دەبەر کرد لێیحاڵی بوو کە دەبێ چەندە لە وەزنی خۆی کەم کاتەوە.

ە٠١١/ 7390- كەم كردنەوە، هێنانە خوار: بۆ ئەوەی پێویستیی بەرنامەكانی دیكە لە بواری كارمەندەوە دابین كەن، لە گرنگترین تاقمی لێكۆڵینەوە یان بە رادەیەكی بەرچاو كەم كردۆتەوە.
ە٠١٢/ 1661- كەم كردنەوە: ئێستا مالیاتی/ زەریبەی حەقدەستان پێش دران لێیان كەم دەكرێتەوە.
ە٠١٣/ 5617- كەم كردنەوە لە ... كەم كردنەوە، هێنانە خوار: بۆ بردنە سەری سادرات دەبێ واریدات كەم كەینەوە.
← هێنانە خوار، هەڵپەرتاوتن، داشكاندن، لە خواری ڕاگرتن، تواندنەوە.
كەم كردنەوە لە زەریبە (مالیات) ← هێنانە خواری نرخی شتومەك.
ە٠١٤/ 6892-كەم كردنەوە لە ژمارەی: سێلاوە گەورەو جاربەجارەكان (لە ژمارەی) حەشیمەتیان كەم كردبۆوە.
← نەهێشتنو تەوالو كردن.
ە٠١٥/ 4535- كەم كەم تەواو بوون، بڕان: گرووهانی دژی تانك زۆرتر تۆپی ٧٥ میلی‌میتری هەبوو، هەرچەند بەرهەم هێنانی/ دروست كردنی ئەو جۆرە چەكانە لە ساڵی ١٩٤٢دا كەم كەم تەواو بوو.
ە٠١٦/ 3064- كەم كەم دڵگیر بوون: كاتێك كە بۆ یەكەم جار چوومە گلاسكو بۆ مانەوە، تا رادەیەك لێی دڵتەنگ بووم، بەڵام پاش ماوەیەكی هاتمە سەر ئەم باوەڕە كە جێگایەكی دڵگیرە/ خۆشە.
ە٠١٧/ 7038- كەمو زیاد كردن لە، دەست تێوەردان: ئەو رەسمانە بە لێزیاد كردنو لێ‌كەم كردنەوەیەكی زۆرەوە لە لاپەرەی یەكەمی رۆژنامەكاندا چاپ ببوون/ لە چاپ درابوون.
ە٠١٨/ 1860- كەمو كووڕی: گەلاڵەكەت دوو كەمو كوورپی گرنگی هەیە.
ە٠١٩/ 3731- كەم هێنان، هەڵخلیسكانو لادان: ئەگەر هەڵوێستێكی مەعنەویی ئاوا بەرز بگری، نابێ سەرت سوور بێنی، تەنانەت ئەگەر جاروبارێش دوچاری هەڵخلیسكانێك بی.
ە٠٢٠/ 5589- كەم هێنان، هاتنە پێش(قەرزو قۆڵە)، (قەرزو ...): ئەم كۆمەگە ماڵییە زیادییە تەنیا بەشی ئەو كەسرییە دەكا كە هێناومانە.
← كەسری هەبوون.
ە٠٢١/ 3776- كەمێك پێشتر یان پاشتر نیشانە گرتن: كەمێك پێشتر نیشانەم لێگرتنو چوار كەروێشكم وەسەریەك گێرا.

كەوتن (لە جێگادا) ← مانەوە لە ...دا، ئاك داون بوون، راكشان، بەربوونەوە.
ە٠٢٢/ 272- كەوتن، لە جێگادا كەوتن، نەخۆش بوون بە هۆی: بە هۆی نەخۆشی ئانفلۆنانزاوە هەردووكیان كەوتوون.
ە٠٢٣/ 1262- كەوتن، لەسەر كەوتن، لەسەر وەستان: ئەگەر بۆ سەد دانان پۆنێك بدەن هەردانەی پینییەك دەكەوێ.
ە٠٢٤/ 1307- كەوتن، بەربوونەوە: دووكەڵكێشەكە لە نێو تەپووتۆزێكی تونددا بەر بۆوە.
ە٠٢٥/ 3914- كەوتن لە جێگادا، بەستەری بوون: دەبێ ئالفرێد چەند حەوتوویەك لە جێگادا بكەوێ هەتاكوو لاقی جۆش دەخواتەوە.
ە٠٢٦/ 2114- كەوتن، بەربوونەوە، هاتنە خوار، تێكڕووخان: قەرەچیوە پۆلاكە هاتە خوارو هێندەی نەمابوو چەند كەسێكی وەبن كەوێ.
ە٠٢٧/ 2795- كەوتن، بەربوونەوە، وەلەرزی كەوتن: پۆلیسەكە بە باتوونەكەی زەربەیەكی لە كابرای داو ئەویش وەك شێفەلتەی وەلەرزی كەوت.
ە٠٢٨/ 2807- كەوتن (بە هۆی نەخۆشییەوە): ئاغای ئارم سترانگ رۆژی دوو شەممۆ نەیتوانی بچێتە ئیدارە، چونكە بە هۆی گرتنی ئانفلۆنانزا كەوتبوو.
ە٠٢٩/ 6766- كەوتن، لە جێگادا: نیوەی منداڵەكان بە هۆی ئاهۆی سەرمابوون لە جێگادا كەوتبوون.
ە٠٣٠/ 523- كەوتن، خەلتان، وەلەرزین، كەوتن لە لەرزیندان: دارێكی تازە گوڵ كردوو كەوتەو گیاو گوڵی ژێرخۆی پان كردەوە.
← بە دەمەوە كەوتن.
كەوتنە... ← بوون لە.
كەوتنە ئەستۆی ← داوێنی كەسێك گرتنەوە.
ە٠٣١/ 3877- كەوتنە بەر تەخفیفی سزادان: ئالفرێد كەوتە بەر تەخفیفی سزادان چونكە ئەوە یەكەم جار بوو كە تاوانێكی كردبوو.
ە٠٣٢/ 179- كەوتنە بەر دەمو زاوان، باس لێكردن: زۆر كەس باسی ئەو كابرایە دەكەن• ئاغای پەرسۆن پێی خۆش نیە، بەتایبەتی لە نێو خەڵكدا، زۆر باسی كچی پاكداوێن بكرێ.
ە٠٣٣/ 4012- كەوتنە بیری رابردوو، لە رابردوو فكر، یان بیر كردنەوە: خەڵك زۆر زوو دەكەونەوە بیری رابردووو رێژیمی كۆن.

←کەوتنە بەر رەهێڵەی/ سێلاوی .
کەوتنە حاڵەتێکەوە ← بەسەرداهاتن (ی وەزعێك، حاڵەتێك).
کەوتنە خوار ← بەربوونەوە.
٥٠٢٤/ 2310- (بە ئیهتالی) کەوتنە خوار، بەربوونەوە، رژانە نێو: چەندین تۆن شریتی تیلگراف لە پەنجەرەی ئیدارەکانەوە فڕێ دەدرانو تلپە تلپ بەر دەبوونەوە نێو شەقامی پێنجەم.
٥٠٢٥/ 1150- کەوتنە خوار، بەربوونەوە (بە هۆی لەنگری ڕێی هەوایی یان خراپ بوونی موتۆر): دوو فەرموند فڕۆکەی دوژمن بەر بوونە نێو سەنگەرەکانی ئێمە.
٥٠٢٦/ 2170- کەوتنە خوار، بەربوونەوە (ی شتێك): دەستێك زرێ بە دەنگێکی بەرزەوە کەوتە خوارێ.
٥٠٢٧/ 2164- کەوتنە خوار: خۆشحاڵم کە لە کاتی کەوتنە خوار لەسەر تەختی خەوتنەکەت هیچ ئازارێکت پێ نەگەیشت.
٥٠٢٨/ 1218- کەوتنە خوار لە، بەربوونەوە لە: لە یەکەم پەرژین ئەسپەکەم جڵەوی گرتو لەسێرەدا بوو کە بەربوومەوە.
٥٠٢٩/ 5374- کەوتنە دەستی، بوون بە مڵکی: ئەگەر بەرێزو میراتگری نەبێ، مڵکەکانی دەبن بە مڵکی دەربار/ شای.
کەوتنە ژێر ← وەبن کەوتن.
٥٠٤٠/ 777- کەوتنە ژێر حاڵەتێکی (خۆش یان ناخۆشی) رووحییەوە: نیچەوانیشیان دەگەڵ هاوسەفەر بوو کە وەخت بوو لە خۆشیان باڵ بگرێ.
٥٠٤١/ 562- کەوتنە ژێر رەهێڵەی، یان سێلاوی داخوازان، رەخنان ... لەسەر: لە سەرانسەری هەفتەی رابردوودا کەوتبوینە بەر سێلاوی داخوازان بۆ مرودێلی تازە؛ بەداخەوە ماوەیەکی دەوێ کە بتوانین وەڵامدەری رادەی داخوازان بین.
٥٠٤٢/ 6373- کەوتنە سەر، هاتنەسەر بابەتێك، بەشتێکەوە نووسان، راوەستان لەسەر بابەتێك: وتارەکەی گێڕۆی کردووم - هەرگیز بە ئەسڵی بابەتەکەوە نانووسێ.
٥٠٤٣/ 2155- کەوتنەسەر شانی یان ئەستۆی کەسێك، روو دەکەسێك بوون: هەر شتێکی خراپ بێتە پێش، تاوانەکەی دەکەوێتە ئەستۆی برا چکۆڵەکەی. ● تەواوی خەرجی زەماوەندەکە کەوتە سەرشانی من.
← دران بە.

٥٠٤٤/ 3899- کەوتنەسەر شانی، یان ئەستۆی ...، روو لە کەسێك بوون: بەرپرسایەتیی سەبارەت بە قەیرانی ئەم دواییە دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت.
٥٠٤٥/ 2179- کەوتنە سەرشانی یان ئەستۆی کەسێك: پێك هێنانی کۆڕی وەزیران کەوتە سەرشانی من.
کەوتنە سەر ← وەدوای ... کەوتن، رەپێنان.
کەوتنە سەرزارو زبانان ← بڵاوبوونەوە.
٥٠٤٦/ 2761- کەوتنە سەر زاران، بڵاوبوونەوە: وا بڵاو ببۆوە کە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ خەریکە دێتە پێش. بۆیە خەڵکێکی زۆر لە کۆبوونەوەکەدا بەشدارییان کردبوو.
← بڵاوبوونەوە.
٥٠٤٧/ 2501- کەوتنە سەر دەور، دەور هەڵگرتن: کاتێك مەلا کەوتە سەر دەور، زانیمان "موعظە" یەکی دووڕو درێژمان لە پێشە.
کەوتنە سەر قازانج ← بەرەو باشتر بوون رۆیشتن.
کەوتنە سەرێك ← تەماس پەیدا کردن دەگەڵ.
٥٠٤٨/ 3323- کەوتنە شوێنی کەسێکەو گرتن، دۆزینەوەو گرتن: ئەو تاڵمە چکۆڵانەی کە لە حەشارگەی خۆیان هاتبوونە دەر لە لایەن پیاوەکانەوە دۆزرانەوەو گیران.
٥٠٤٩/ 6062- کەوتنە گەماڕۆی بەفرەوە: بۆ ماوەی سێ مانگان لە کۆخەکەمان لە نێو کێوان کەوتبووینە گەماڕۆی بەفرەوە.
کەوتنە مەترسییەوە ← لە مەترسی دابوون.
کەوتنە نێو ← تێکەوتن.
٥٠٥٠/ 969- کەوتنە (نێوانی)، گیرکردن لە: بۆ ماوەیەك باوکمو ژنە جحێڵەکەی کەوتبوونە ناو کۆڕێکەوە کە زۆر کەسی ناو بەدەرەوەی تێدابوو.
کەوتنە نێو داوی ← گرفتار بوون.
٥٠٥١/ 289- کەوتنە نێو کاڵون (ی مەندەسی)، بە جوانی دیار بوون، روون بوون: باڵی حەشەرەکە بە تەواوی و بە وردی (لەژێر میکرۆسکۆبدا) دیار بوو/ دەبینرا. ● دوو لایەنی گرنگی مەسەلەکە ئێستا بە روونی دەرکەوتوون.
٥٠٥٢/ 2173- کەوتنە نێو دەریا (لەسەر کەشتییا): مەودای نێوان رێڵەکانی جێگای پیاسە لەسەر کەشتی ئەوەندە زۆرە کە منداڵێك دەتوانێ بە هاسانی تێوەبچێ و بکەوێتە نێو دەریا.
کەوتنە نێو قەرقەشەوە ← گرفتار بوون.

٥٠٥٣/ 1315- کەیف سازبوون، گوڵ کردن، گەشانەوە: دەگەڵ ئاژەڵ ماری رەفتارت باش نیە، بەڵام دەگەڵ ئالیس کەیفت ساز دەبێ.(= دەگەشێیەوە).
٥٠٥٤/ 1014- کەیف ساز بوون، خۆشحاڵ بوون: کاتێک بیستی دایکی سلامەتە، کەیفی ساز بوو.
٥٠٥٥/ 3620- کەیف ساز بوون: ئەمڕۆ بەیانی کە براکەم لە ماڵی دەردەکەوت، بە تەواوی کەیفی ساز بوو. چەند حەوتوو بوو کە بەشداری کردن لە تاقیکارییەدا دڵی مێشکی داگرتبوو.
٥٠٥٦/ 5275- کەیف ساز بوون، خۆشحاڵ بوون، شاد بوون، پێخۆش بوون: خەڵکی بریتانیا لە هەواڵەکانی جەژنی مەندی/ بایع یەکجار خۆشحاڵ بوون چونکە ئەوە قۆناخێکی گرنگ بوو بەرەو لاچوونی بەرنامەی دەست پێوە گرتن.
← وەجۆش هاتن یان هێنان، هەڵدان، گەرم داهاتن، هاتنەوە سەرحاڵ، خۆشحاڵ بوون، پێخۆش بوون، دڵدانەوە.
٥٠٥٧/ 1909- کەیف کردن، لەززەت بردن لە: لەسەر هەیوانێ دانیشتبووین و لە رووناکایی زۆر جوانی ئەو کاتە ساتە لەززەتیان دەبرد.
٥٠٥٨/ 3860- کەیف کردن، لەززەت بردن: پێی گوتن: 'درێژە بدەن. کەیفێ بکەن، شادی بکەن'.
٥٠٥٩/ 5369- کەیف کردن لە، حەز کردن لە، پێخۆش بوون: کاتێک خوێندکاری زانستگە بوو لە بەدفەڕی تا رادەیەک خەتەرناکی وەک بەشەر لە ساختومانەکانی/ خانووەکانی زانستگەوە سەرکەوتن کەیفی دەکرد/حەزی دەکرد.
کەیف هاتن بە ← دڵخۆش کردن.
٥٠٦٠/ 3153- کەین و بەین پەیدا کردن، داوانلێن، دەست تێکەڵ کردن دەگەڵ: لەو ماوەیەدا کە سیت بۆ کاروباری بازرگانی چووبووە لای باکوور، جوێز دەگەڵ ژنەکەی دەستی تێکەڵ کردبوو. ● چۆن بزانێ هەرکە پشتی کردەوە، ژنەکەی نایلەرزێنێ.
← پێوەندی نامەشرووع هەبوون دەگەڵ.
کەوە خۆڵە کردن ← کات، یان رەخت بە فیڕۆ دان.
کیسە بۆ هەڵدروون ← حیساب لەسەر کردن.
کیسە کێشان بۆ کەسێک ← خۆ شیرین کردن لە لای کەسێک، چاپلووسی کردن بۆ، مەرایی کردن لەبەر، زمانلووسی کردن بۆ.
٥٠٦٠٠١/ 7386- کیسە بۆ هەڵدروون، چاوەڕوانی کردن، بەتەمابوون: خۆشنار دوو کتێبی بە ئەمانەت لێوەرگرتووەوە، هەتا ئەو جێگایەی پێوەندیی بەو برادەرەوە هەیە، بە تەمانیم وەگەڕم کەونەوە.
٥٠٦١/ 5937- (دەر) کێشان (ی سەیەنێک لە جێگایەک بە قەڵاڵ/ سۆڵند): ئەگەر بەنزینت کەمە، دەتوانی گالۆنێک لە ماشینەکەی من بکێشی.
٥٠٦٢/ 4805- کێشان، دەرهێنان: دەترسام یەکێک لەو خلێنە زەلامانەم بکێشن.
٥٠٦٣/ 1961- کێشان (بە لە سەرەخۆییەوە): ئێستا کە بە رادەیەکی باش بلیند بووین، پیداڵی گازەکە بە ئەسپایی بۆ لای خۆت بکێشە(= واتە گازی کەم کەوە/ پێ لەسەر گازی هەڵگرە -وەرگێڕ-).
٥٠٦٤/ 1962- (بە لەسەرەخۆیی) کێشان، تیژ لاکردن، دوور خستنەوە، کشاندنەوە: پێم زۆر دێشان، بەڵام هەرچۆنێک بوو دەجووتە نەعلێکی گەورەم رۆ کردن.
٥٠٦٥/ 7360- کێشان (بە تەرازوو)، هەڵکێشان، وەزن کردن: هەموو ئەو شتانەی کە کێکەکەیان پێ دروست کرد بە وردیی وەزنیان کردبوو/ کێشابوویانن.
٥٠٦٦/ 7524- کێشان، (ئەمڕ) دەرهێنان: ناچارم بچمە لای پزیشکی ددانانەوە، چەند ددانم بکێشم.
٥٠٦٧/ 7517- کێشان، نووسین (چێکی بانکی)، پارەی نەغدم پێ نیە، بەڵام دەتوانم چێکێکت بۆ بکێشم/بۆ بنووسم.
٥٠٦٨/ 1550- کێشان بۆ لای، بوون بە، لێ پەیدا بوون: هەموو کەس لەوە دەترسان کە کێشەی نێوخۆیی لێیەیدا بێ.
٥٠٦٩/ 1928- کێشان بۆ لای ئارەق خواردنەوە: دەزانین کە هەلومەرجی ئەوتۆ دێتە پێش کە پیاو بۆ لای ئارەق خواردنەوە دەکێشێ.
کێشان ← بەستن، تێکردن (ی چێشت)، دەر هێنان، دیتن (ی دەردو رەنج)، دادانەوە، هەڵێنجان.
٥٠٧٠/ 1857- کێشانە یان بردنە گۆشەیەک (بۆ قسە کردن): سەرۆکی ئیدارە کێشامێ لایەک بۆ ئەوەی هێندێک شتم لەباری ئەمنییەتەوە پێ بڵێ.
← هێنانە خوار.
٥٠٧١/ 6769- کێشانە دادگا: ئەگەر دەگەڵ کابرای میعمار لەسەر چلۆنایەتیی خانووەکە رێک کەوتوونەوە ئێستا ئەو حازر نیە بەرێوەیان بەرێ، بی‌کێشە دادگایە.
٥٠٧٢/ 3212- کێشانە دادگا، بانگ کردن لە دادگا: ئەگەر جارێکی دی ببینم لێرە بێکار دەخولێیەوە بە تاوانی درەنگ هاتن دەتکێشمە دادگا. ● ئەوە دووهەمین جارە

که به تاوانی ماشێن خراپ لێخوڕین بانگی دەکەنە دادگایە/ دەیبەنە دادگایە.

٥٠٧٣/ 6513- **کێشانە ژێر، قووت دان:** تەندوورلو هەر شتێکی لەسەر ئاوێ بێ قووتی دەدا.

کێشانە سەر هەتا...← هێنانە سەر.

٥٠٧٤/ 1868- **کێشانە نێو:** لەسەرەتادا کێشەکە هەر لە بەشی ڕەنگ کردن دابوو، بەڵام کەم کەم باقی، تاقمە کرێکارەکانیش کێشرانە نێو کێشەکەوە.

٥٠٧٥/ 976- **کێشانەوە، دیاری کردن (بە گێچ):** کابرای میعمار بۆ نیشاندانی پرۆژەکەی، نەخشەیەکی چکۆلەی بە گیچ کێشاوە.

← نووسین، دەرهێنان.

٥٠٧٦/ 716- **کێشانی وتووێژێک بۆ لایەنی تایبەتی:** لە قسەکردن دەربارەی سکوتلەندەوە، ئاغای بەراون باسەکەی هێنایە سەر ڕاوی ماسیی تازە - کە سەرگەرمیی خۆیەتی.

٥٠٧٧/ 7203- **کێشە کردن لەگەڵ، بەرەنگار بوون لەگەڵ:** پێش ئەوەی بتوانێ کچەکەی بێنێتەوە لای خۆی/ سەرپەرستیی کچەکەی بێنێتەوە ژێر دەستی خۆی ناچار بوو چەندین ساڵ لەگەڵ پارێزەرەکان بەرەنگار بێ.

← کێشە هەبوون دەگەڵ، مشتومڕ کردن دەگەڵ.

٥٠٧٨/ 7484- **کێشە و هەڵا کردن، شەڕ و کێشە کردن، قیڕە قیڕ کردن، هەڵا کردن:** ئەو بنەماڵەیە هەمیشە لەسەر شتێکی کێشە و هەڵایانە.

٥٠٧٩/ 4222- **کێشە یان ناکۆکیی خۆ لەگەڵ کەسێک چارەسەر کردن، کێشەی نێوان ... بەیەکەوە چارەسەر کردن:** نازانم فیلیپ کێشەکەی دەگەڵ ڕوزماری چارەسەر کردووە یان نا (= نازانم فیلیپ و ڕوزماری کێشەی نێوان خۆیان چارەسەر کردووە یان نا؟

٥٠٨٠/ 1724- **کێڵان:** باخچەی پێش ماڵەکەیان بە مەکینەی تایبەتی دەکێڵا.

٥٠٨١/ 4664- **کێڵان و دەرهێنان:** لە هێندێک لە بەشەکانی باکووری فەرانسە، ئێستاش جووتیاران کە زەوییەکانیان دەکێڵن، کەللەسەر، چەکو چۆڵ و ئامرازی جۆراوجۆر لە ئەرزی دەردێنن.

٥٠٨٢/ 4906- **گازدان:** فکری لێ مەکەوە. کاتێک گەیشتینە جاددەی ئەسلی، دەتوانێ (بە کەیفی خۆت) گاز بدەی. (خەلەسەبر ڕۆیشتنو پەیتا پەیتا دەندە/ گەڕ گۆڕین ڕزگار دەبێ).

٥٠٨٢/ 6349- **گازدان (بە خێرا لێخوڕین):** بە ڕانندەکە بڵێ گازی بدا؛ ئامانەوێ وەدرەنگیی بکەوین.

← دەوری موتور زیاد کردن.

٥٠٨٤/ 3473- **گاڵتە پێکردن، شۆخی پێکردن، بە هەڵە گرتن:** ئەگەر جان لەسەر کارەکەی وەلا برابێ، ئیدی ئەوە شتێك نیە گاڵتەی پێ بکرێ. دەبێ کەمێك هاودەردی دەگەڵ بکەن.

٥٠٨٥/ 4686- **گاڵتە پێکردن، مەسخەرە کردن:** لەبەر ئەوە کە لیباسی کۆنی دەبەر دابوو زۆر جاران لە قوتابخانەی گاڵتەیان پێدەکرد.

٥٠٨٦/ 3299- **گاڵتە پێکردن، مەسخەرە کردن، گەپ پێدان:** لەجیاتی ئەوە کە ئالترناتیوێکی جیددی پێشنیار بکەن، زۆرتر گاڵتە بە سوسیالیزمی دێموکراتیك دەکەن.

٥٠٨٧/ 3639- **گاڵتە پێکردن:** ئەگەر هاتو پێی گوتی کە لە پێشبڕکێدا جایزەی یەکەمت وەرگرتووە، باوەڕی پێ مەکە؛ ڕەنگە گاڵتەت پێبکا.

٥٠٨٨/ 3741- **گاڵتە پێکردن، گاڵتە کردن بە، مەسخەرە کردن، سەرخستنە سەر:** منداڵی بەدفەر زۆر جاران گاڵتە بە سواڵکەر و پیاوی فەقیر دەکەن.

٥٠٨٩/ 5735- **گاڵتە پێکردن، مەسخەرە کردن:** لە ئاخرین بەرنامەی گەپەو گاڵتەیاندا ئەو ژنە جحێڵانەیان مەسخەرە کردبوو کە دەگەڵ دامەزراوە خێرخوازەکان هاوکاری دەکەن.

٥٠٩٠/ 4139- **گاڵتە پێکردن، مەسخەرە کردن:** هەموومان گاڵتەمان پێدەکرد، دیارە پاشەملە. * کچەکە گوتی: ئەوتۆ گاڵتەم پێدەکەی، بەڵام ئەمن بە تەواوی جیددیم.

٥٠٩١/ 5488- **گاڵتە پێکردن، کردن بە گەپجاڕ، مەسخەرە کردن:** لە پێشدا بەڵێنی دابوو بێتە لام، بەڵام دوایە بەڵێنییەکەی شکاند. ئەمنیش ناوی ئەو کارەم نابوو گاڵتە پێکردن.

٥٠٩٢/ 2641- **گاڵتە پێکردن، گەمە پێ کردن، گەپ پێدان:** منداڵان جارو بار زۆر بێرەحمانە دەجووڵێنەوە و گاڵتە بە خوشلەو برا چکۆلەکانیان دەکەن....

← مەسخەرە کردن، دەست پێ گەرم کردنەوە، گەپجاری دەستی خۆ کردن، زارخوار کردنەوە لە.

گان ← چوون دەجێگاوە دەگەڵ.

گاندان ← خۆ فرۆشی کردن.

گایین ← چوون دەجێگاوە دەگەڵ.

٥٠٩٣/ 1052- **گران کردن، نرخی شتێك بردنە سەر/ زیاد کردن:** ڕاست ئەو ڕۆژەی بڕیارمان دابوو بۆ پشووردان بچینە

دورگەکانی کاناری، شیرکەتە هەواییەکان لە سەدا ٢٥ نرخی بلیتەکانیان بردە سەر.

← بردنە سەری نرخی شتێك.

٥٠٩٤/ 4243- **گرانبوون، بەرز کردن**: دوای چوونە سەری نرخەکان کە لە بودجەدا راگەیەندرابوو، مەشرووبات گران بوون. ● کابانەکان لە گران بوونی هێندێك شتومەکی ماڵ تا رادەی دە لە سەدا سکاڵایان کردووە.

← چوونە سەر (ی نرخ).

٥٠٩٥/ 3283- **گرتن، پێوەنووسان، بەرنەدان**: "مەترسێ. ئەو گا بەردەی توند بگرە/ بەرمەدە. ئێستا دەتگەمێ و دەتهێنمە خوارێ." کاتێك مەنسوورانی ئەور کوروژاندنەوە خۆیان گەیاندێ، لە ترسی گیانی، خۆی بە لێواری پەنجەرەکەوە هەڵواسیبوو (= لێواری پەنجەرەکەی گرتبوو بەری نەدەدا).

← راگرتن، پڕکردنەوە، بازداشت کردن، رامکردن، جێگای خۆکردنەوە.

٥٠٩٦/ 7297- **گرتن، دیوارکێشان لە پێش، بەستن بە دیوار**: کاتێك ئەمیر کورنیشیان دانا، پێشی سۆیە دیوارییەکەیان گرت.(= دیواریان لە پێش کێشا).

٥٠٩٧/ 809- **گرتن (ی رێگای لووت و لوولەو ...)**: تڵتەچای دە دەستشۆریی مەکەن؛ بەری دەگرێ.

٥٠٩٨/ 7122- **گرتن (رادیو)**: لە بیرتان نەچێ هەفتەی داهاتوو لەم کاتەدا رادیۆ بگرن....

٥٠٩٩/ 707- **گرتن، بەسەرداهاتن**: مەهێڵە قەڵس بێ، دەنا کەشکەی دەگرێ.

٥١٠٠/ 639- **گرتن (ی پەنجەرە، دەرگا، جێ سۆیەی دیوار) بە خشت/ بەرد**: لە زەمانی قەدیمدا خەڵك هێندێك لە پەنجەرەی ماڵەکانیان دەگرتن بۆ ئەوەی ناچار نەبن باجیان بۆ بدەن.

٥١٠١/ 5667- **گرتن، مۆروموم کردن**: قەڵشتەکانی پەنجەرەکەیان گرت بۆ ئەوەی پێش بە هاتنەژووری بای سارد بگرن.

٥١٠٢/ 3772- **گرتن، پڕدانە شتێك، پڕ پێدانکردن**: گوریسەکەمان گرت و بە هەموو هێزمانەوە رامانکێشا. ● یەخەی میکانیلیان گرتبوو، وەهایان رادەتڵەکاند کە ددانەکانی رێك دەکەوتن.

٥١٠٣/ 6039- **(گازلێ) گرتن، قووستنەوە**: دەبێ پێشی سەگەکەی بگرێ و نەهێڵێ میوانان بگرێ. ● ئەو دەرفەتی چوونە دەر لە وڵات لە جیاتی ئێمە دەقۆزێتەوە.

٥١٠٤/ 517- **گرتن (ی جێگایەك/ کونێك بە تێئاخنینی شتێك)**: کاتێك سیستمی گەرمای ناوەندی/ هیتێری ناوماڵ دامەزرا، خاوەن ماڵەکە هەموو سۆیەکانی بەرناواڵەی نێو دیواری گرت/ ئێوناخن کردو گرتنی.

٥١٠٥/ 4553- **گرتن، گیران، بازداشت کردن، دەزگیرکردن**: لە جینایەتێك/ پیاوکوشتنێکدا دەستی هەبووە و درەنگ یان زوو دەگیرێ/ دەیگرن.

٥١٠٦/ 3786- **گرتن، دەزگیر کردن، دەست پێڕاگەیشتن**: ئەو گەرەکە پڕ بووە لە پۆلیس کە چاوەروانی ئەوەن دەستیان بە چەند نەفەرێکمان رابگا/ چەند نەفەرێکمان لێ بگرن.

٥١٠٧/ 6629- **گرتن (ی لەدەمی/ جێگایەکی شتێك)**: چەقۆکە لە لای دەمەکەیەوە مەگرە؛ دەسکەکەی بگرە.

٥١٠٨/ 6517- **گرتن (ی لەخۆشی)**: لە هاوینێدا گرانەتای گرتبوو.

٥١٠٩/ 3416- **گرتن، بازداشت کردن، راگرتن لە ...، لە زیندان بەندیکردن**: لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٢دا، ژمارەی گیراوەکان/ بازداشت کراوەکان گەیشتبووە ٦٠٠ کەس.

٥١١٠/ 1029- **گرتن (ی لەوەڕ)، گیران**: کورنی ئەوالێت بە کەڵایان گیراوە.

٥١١١/ 4669- **گرتن (ی کوونێك، قەڵشتێك) بە**: هەر قەڵشتێکی لە میزەکە دایە بە تەختەی پلاستیکی بیگرە.

گرتن (ی رێ و رەسم) ← رێکخستن.

گرتن (ی ناوچەیەك) ← تەسلیم کردن.

٥١١٢/ 1101- **گرتن پێش یا پۆشینی جێگایەك، داپۆشین**: بەستەی رێنە و کتێبە کۆنەکان رێگایان گرتبوو. ● لە ناکامی زۆر زانیاریی قورس و بێهوودەدا فکرو بیری شێوابوو.

٥١١٣/ 3592- **گرتنە ژێرچاوەدێرییەوە**: بە ئەفسەرەکانی پۆلیسی نهێنی دەستوور درابوو کە بە بێ ئێوەر کابرای گومان لێکراو بخەنە ژێر چاودێرییەوە.

٥١١٤/ 6654- **گرتنەوە**: ئەو تاوانەی دەیهێنا گۆزێ نەك هەر خالی کاری بەڵکوو خالی کرادوك - یشی دەگرتەوە.

٥١١٥/ 98- **گرتنەوە، بەرپێوەچوون لە پێوەندی لەگەڵ**: ئایا ئەم رێسایە ئەمنیش دەگرێتەوە؟ بەڵێ، بێ جیاوازی هەموو کەس دەگرێتەوە.

٥١١٦/ 5257- **گرتنەوە، شامیل بوون**: مەسەلەیەکی دەمەوێ بیڵێم هەمووتان دەگرێتەوە.

٥١١٧/ 2811- **گرتنەوە، هاتنە نێو، لەگەڵ خستن**: "بە پیاوەکان بڵێ نیو سەعات پشوو بدەن"، "ئەمنیش دەگرێتەوە؟".

٥١١٨/ 2499- **گرفتار بوون، پێوه بـوون، کەوتنـه نێـو تەرتەڵـەوه:** کارمەندە گەنجەکە بە هۆی ئەوه کە بێ رەســید وەرگرتــن بەڵگەیەکی دابوو بە کەسێك کەوتبۆوە نێو تەرتەشەوه.

٥١١٩/ 2500- **گرفتار بوون:** کاتێك خۆشناو گەیشتە تەمـەنی چل ساڵی دیتی کە زۆر باش گرفتار بووەو بۆ رزگار بـوون لەو وەزعە هیچ رێگایەك شك نابا.

٥١٢٠/ 2486- **گرفتار بوون، بە قتێکەوه بوون:** گرفتــاری قـەرزو قۆڵە بوون زۆر هاسانترە لە رزگار بوون لە دەستی!

٥١٢١/ 2025- **گرفتار بوون، دەگـیری کەسێك کـەوتن، دەداوی کەسێك کەوتن، کەوتنە نێو داوی:** پێش ئەوەی گرفتــاری پێـچو پـەنای یاسـا بێ....

← تووشی دەردەسەربوون، تێوەچوون، تێوەردان، ڕاوبردن.

٥١٢٢/ 6483- **گرفتار بە دەسـتی کارێکەوه:** گرفتــاری نووســینی هەزار نادرێس لەسـەر پاکەتەکانیان ببووین کە دەبوو هەتا سبەینێ تەواویان کەین.

٥١٢٣/ 1556- **گرفتاری بەڵایەك بوون، دوچاری شـتێکی خـراپ بـوون:** گرفتــاری بــەڵای پرخــه پرخێــك ببـــوو کــه ماڵەکــەی دەلەرزاندەوه.

٥١٢٤/ 2275- **گرگرتـن، هـەڵچوون، لـه پرتـووه بـوون، بەوپـەڕی تووڵووتێژی گەیشتن:** وادیار بوو کـاوه زۆر تووڕەیــەو دەیــەوێ پێم بڵێ کارت بە کاری خەڵکی دیکە نەبێ. ● ئاوری شەر سەرلەنوێ هەڵدایسێتەوەو ئەمجارە زۆر خراپتر لــه پێشـوو دەبێ.

← ئاور گرتن.

گرمەو هەرا ساز کردن ← هەڵڵاو بگر وەرێخستن.

٥١٢٥/ 7364- **گرنگ بوون، لەبەرچاو موهیـم بـوون بـۆ:** زەمینـەی کۆمەڵایەتیی خوازیارەکان بۆ کۆری وتووێـژ هـەر گرنـگ نیه.

٥١٢٦/ 4998- **گرنگی بەخشین بـه (= دان بـه)، هێنانـه نێـو خەڵك:** بارباراگولن، کە ئێستا خانێکی ماڵـه خۆیـەتی، پیشـەی مانکێنی بە خەڵك ناساند.

گرنگیی پێدان ← جەخت کردن یان دانان لەسەر.

گرنگیی پێنەدان ← بە گرنگ نەزانین، پشت تێکردن، بــه هێند نەگرتن.

٥١٢٧/ 3173- **گرنگیـی تایبـەتی هـەبوون، جێگایـەکی تایبـەتی هەبوون:** لەو گوزاریشەیدا کە تازە چـاپ کـراوه، دروسـت کردنی زانستگەی تازە جێگایەکی تایبەتی هەیە.

٥١٢٨/ 5003- **گرنگیی زیـاتردان بـه:** سروشــتی ژیـانی چینـی کرێکار لەم سەردەمەدا گرنگیی زیاتر بە خـۆش رابـواردن دەدا....

٥١٢٩/ 4870- **گرنگیی زیاتردان بە:** دەبــێ بــه ئاسایشـی ئـەو کەسانەی لەسەر ئەو دەزگایانە کار دەکەن گرنگیی زیــاتر لە خەرجەکانیان بدرێ.

٥١٣٠/ 5760- **گرنگیی زیاتر دان بە، بە گرنگتر زانین:** مــارتین لـه من زیاتر شانازییە رەسمییەکان بە گرنگ دەزانێ.

٥١٣١/ 4879- **گرنگیی یەکجار زۆر دان بە:** مرتتەکی بوونـان بـه بـازاری ئامریکـــا، گرنگێکـــی یــەکجار زۆر دەدا بـــه کارامەیی و کارلێهاتوویـیمان لە بواری ســنعەتی ســادرات دا.

گریوگرتن بۆ ← گریان بۆ شتێك.

٥١٣٢/ 1540- **گریوو گرتن بۆ ماڵێك (= داوای شـتێك کـردن یـان ئـاواتی شـتێك خواسـتن کـه ئیمکـانی نـەبێ):** هەمیشــه بــه ئاواتــەوەن کۆخێکیان لە ساردینا هەبێ، یان بــه کەشتی بــه دەوری دنیادا بگەرێن، یان شتی لەو بابەته- داخوازی مەحاڵ.

٥١٣٣/ 1543- **گریان، قین گێران:** بەســتەزمانە کچـه چکۆلـه کاتێك بابی پێی گوت ســەگەکەیان وەبەر ماشــێن کـەوتوه هێندە گریا وەخت بوو دڵی بتۆقێ.

٥١٣٤/ 7353- **گریـان بـۆ، فرمێسـك رشـتن بـۆ، بـەداخ بـــوون بـۆ:** فرمێسـك رشتن بۆ رابردوو بە خۆڕایییە. ● ئەگەر سبەینێ جانسۆن دەرکەن، زۆر کەس بۆی بە داخ نابن.

٥١٣٥/ 1539- **گریان بۆ، گریووگرتن بۆ:** ئەو منداڵە بۆ شــتێکی دەگری. ئەوجار چی دەوێ؟

٥١٣٦/ 3747- **گریان بۆ حاڵی خۆ:** "هەرچــەندە دڵـت دەیــەوێ بێیکەنە. هێندێکم هەواڵ پێن پێیە کە ئەگەر پێت بڵێــم بۆ حاڵی خۆت دەگری!"

گریان لە خۆشییان ← لە خۆشییان گریان.

٥١٣٧/ 5247- **گریاندن، وەگریـان خسـتن:** قســه بزوێنــەرەکانی زۆر کەس لە تەماشاچییەکانی کە لە دەرێ راوەســتابوون وەگریان خست.

٥١٣٨/ 6047- **گرێ خواردن، تێکەڵ پێکـەڵ بـوون، گـیر کـردن:** لــەو جادانەی دەچوونە بارمەندازەکانی کەنار دەریا ترافیك گیری کردبوو.

٥١٣٩/ 3706- **(لێـك) گرێـدان:** بـه لێـــك گرێدانــی چـــەند مەلافانو وەك گوریسێك کەڵك لێوەرگرتنیان، توانیمان لە هوتێلە ئاگرتێبەربووەکە هەڵێین.

← یەکگرتن.

٥١٤٠/ 573- **گرێدران بە ... وە، بەستراونەوە بە:** هەڵوێستی سیاسیی ئەوان بە هەڵوێستی ئەو کابرایەوە گرێدراوە.

٥١٤١/ 7003- **گرێدران بە:** بەشی زۆری سنعەتی ماشێن سازیی بریتانیا بە سنعەتی ئەوروپاوە گرێدراوە.

٥١٤٢/ 4205- **گریم کردن، ئارایش کردن:** زیاتر لە سەعاتێ نیوێکی کێشا بۆ ئەوەی لورێن ئولیور بۆ یاریکردن لە نەخشی ئوتیلۆدا خۆی گریم کا. ● مۆکانی زەردی کەمرەنگ کردوەو بە خەستیش ئارایشی کردووە.

٥١٤٣/ 4982- **گرێو کردن، داناندن، مەرج بەستن لەسەر:** چەند پۆندێکم لەسەر ئەسپی "شای کوردستان" مەرج بەستووە/ شەرت بەندی کردووە.

٥١٤٤/ 6210- **گرێو کردن لەسەر، مەرج کردن یان بەستن لەسەر:** ئامادە نیم لەسەر ئەسپێك گرێو بکەم کە لەم وەرزەدا سێ جار دۆڕاندوویەتی.

← مەرج کردن دەگەڵ ... لەسەر....

٥١٤٥/ 7264- **گرێو کردن لەسەر، مەرج بەستن لەسەر:** لەو پێشبڕکێی ئەسپ سوارییەدا شتێکی وای تێدا نیە کە حازر بم لە چەند پێنییەك زیاتر گرێوی لەسەر بکەم.

٥١٤٦/ 6723- **گرێو لەسەر کردن، مەرج بەستن:** ئەو هەموو قەرزەکان دەداتەوە. بە هەرحاڵ، ئامادەم گرێوی لەسەر بکەم.

٥١٤٧/ 1143- **گرنگتر بوون لە، لە پێشتر ... بوون:** سازکردنی ماڵەکان دەبێ لە دروست کردنی خانووبەرەی ئیدارەکان وەپێش کەوێ.

گزك لێدان ← گەسك لێدان.

گزەکردن← فێڵ‌کردن.

٥١٤٨/ 5177- **خوێندنەوە دەربارەی، موتالا کردن لەسەر:** تەنیا ئەوە کە بەرهەمەکانو ژیاننامەی ئەو شاعیرە بخوێنییەوە کافی نیە، بەڵکوو دەبێ لەسەر ئەو مەسەلەیە موتالا بکەی هەتا بزانی کە ئەو شاعیرە هەتا چ رادەیەك بزووتنەوە گشتییەکانی لە بەرهەمەکانی خۆیدا گونجاندووە/ باسیان دەکا/ هێناوە.

گلۆڵە بوون ← پووچانەوە، لێکهاڵان.

٥١٤٩/ 580- **گلۆڵە کردن، خلۆر کردنەوە، وەسەر یەك گێڕان، گەوزاندن:** تفەنگەکەی ڕێدام؛ دوو گوللەی هەوەڵم هەروا رۆیشتن، بەڵام دوایە بە چوار گوللان سێ کەروێشکم وەسەر یەك گێڕان.

٥١٥٠/ 1960- **گڵ وەسەر کردن، گڵ ویهەڵدان:** باخەوان بە تۆبینییەکی تەواوەوە گڵی وە خەڵقەکان هەڵدەدا.

گلەیی کردن لە ← سکاڵاکردن لە دژی.

٥١٥١/ 1553- **گنج بوون، خۆ کرووشم هەڵێنان:** پەڕەکانی کتێبەکە بە هۆی گەرمای سۆبە گنج ببوون. ● تەنیا یادی ئەو کاتەی دەهاتەوە بیر کە لە نێو مەلافە کەتانییە خاوێنەکانیدا خۆی کرووشم هەڵێنا.

٥١٥٢/ 4631- **گنخاندن:** کەمێکی دیکەم گنخاند، بەڵام سەرەنجام پێی سەلماندم کە دەتوانم دەگەڵی بچمو هەروەها ناچاریش نەبووم هەتا رۆژی دواتر بگەڕێمەوە.

٥١٥٣/ 667- **گواستنەوە یان بردن (ی کۆنە حیسابێك بۆ لاپەڕەی دواتر):** لەنگەری "اعتبار"ی بانکیی هەی مانگی سپیتامبەری کابرا، کە ٥٠ پۆند بوو، گوێزرایەوە (بۆ لاپەڕەی دواتر).

٥١٥٤/ 5938- **گواستنەوە:** لەم رۆژانەدا بۆ گواستنەوەی دەوسیەکانی سەربووت بە رووداوەکانی رانەندەگی بۆ دادگایەکی تایبەتی گوشارێکی زۆریان هێناوە.

٥١٥٥/ 1255- **گوتران، بە زماندا هاتن، لە زار دەرپەڕین:** هەر کە قسەکانم لە زاری دەرپەڕین، لەوە کە بە پارێزەوە نەمگوتبوون پەشیمانیی خۆم راگەیاند.

٥١٥٦/ 4434- **گوتران لە نێوان دوو کەس دا:** هەرگیز نەمبیست لە نێران ئەو دووانەدا قسەیەکی خۆش بگوترێ.

٥١٥٧/ 6139- **(خێرا) گوتن، دەربڕین:** "دەتەوێ چ بڵێی؟ یاللا، دەی کابرا، خێرا بیڵێ".

٥١٥٨/ 1455- **گوتن، دەربڕین:** دەزانم شتێکت لە دڵ دایە. بریا دەرت بڕیباو زیاتر لەوە نەتشاردباوە.

٥١٥٩/ 3050- **(بە ناڵە ناڵ) گوتن، بە ناڵاندنەوە گوتن:** کابرای پەیام هێنەر کەوتە ئەرزیو بە ناڵە ناڵ هەواڵی تەسلیم بوونەکەی راگەیاند.

٥١٦٠/ 7259- **(بە ئەرخەیانییەوە) گوتن:** بە ئەرخەیانییەوە پێتان دەڵێم کە رابێرتو یارە ئیتالیاییەکەی دەستیان لێك بەرداوە.

٥١٦١/ 1202- **(بەراشکاوی) گوتن، بە ئاشکرایی راگەیاندن، ئاشکرا بوون، دەرکەوتن:** بۆ بەراشکاوی ناڵێی چت دە دڵی دایە؟● ئەگەر براکەی هەر لە تەمەنی مێرمنداڵییەوە بنەماڵەکەی بەجێ نەهێشتبا، رقو بوغزێکی کە لێی بوو زۆر پێشتر دەردەکەوت.

٥١٦٢/ 5254- **(پەیتا پەیتا) گوتن، یەك لە دوای یەك گوتن:** بە روالەتو بێ هیچ جۆرە زەحمەتێك هەموو ئەو کەسانەی

له سەرمتاوه پێوەندی‌یان دەگەڵی هەبوو پەیتا پەیتا ئاوی بردن.

٥١٦٣/ 704- گوتن، دەربڕین، بە زمان دەهاتن، درکاندن: قسەکەی تەواو نەکرد؛ ئەگەر هاتبا بە تەواوی دەری بڕیبا، بێگومان کابرای وەگریان دەخست.

٥١٦٤/ 2554- گوتن، بە زمان دەهاتن، بەسەرزار دەهاتن، قسە کردن: ئەو ژنە وەها خەجاڵەت‌بوو کە نەیدەتوانی قسان بکا.

٥١٦٥/ 837- گوتن (لە پڕ)، راگەیاندن: بە توورەیی‌یەو لە ئەکاو گوتی "ئەرێ بۆچی دەست لە خۆرانان/ خۆ هەڵدانەوە هەڵناگرن؛ هەروەک بڵێی هەموو وڵامەکان دەزانن؟"

٥١٦٦/ 5152- (لە پڕ) گوتن، کتوپڕ راگەیاندن: لە پڕ فەرمانی داو گوتی "بێ حەرەکەت" بە گوڕاندنێکی وەها کە سەربازەکان لە جێگای خۆیان وشک بوون.

٥١٦٧/ 1276- گوتن، درکاندن، بە زمان دەهاتن: زەنبوو میەمەک قسەی وەها پیسی بە زاری داهات کە ئەو چەند ژنە بە ساڵدا چووانەی لە رق بوون لە شەرمان سوور هەڵگەران.

٥١٦٨/ 5161- (خێرا خێرا) گوتن، ئاوبردن، ریز کردن: ئالفریدی "بالقوە" جینایەتکارم کێشا بۆ لای باس کردنی مەئموووران، ئەویش خێراخێرا چەند ناوێکی بۆ ریز کردم.

٥١٦٩/ 6138- (بەسەر پەرەی توورەیی‌یەوە) گوتن: بەسەر پەری توورەیی‌یەوە گوتی؛ جارێکی دیکە لێرەت ببینمەوە، دەڵێم فرێت دەمەدەرێ.

٥١٧٠/ 3046- (بە دەنگێکی بەرزو ناخۆش) گوتن، راگەیاندن: سەرگوروویان بۆ دەهەمین جار لە بەیانی‌یەوە ناوی ئامرازەکانی دزشکەی بە دەنگێکی بەرزو ناخۆش دووپات دەکردەوە.

←راگەیاندن، ئاوبردن، هێنانە گۆ، دەگەڵ دەربڕین، پێڕاگەیاندن.

٥١٧١/ 981- گۆڕان و بوون بە ...؛ دایکە فریشتە هەر کە گۆچانەکەی راوەشاند مشکەکان (گۆڕانو) بوونەوە بە چوار ئەسپی یەکجار جوان.

←جێگای خۆدان بە، دەرهاتن بە شکڵی شتێک.

٥١٧٢/ 5931- گۆرانی گوتن (بە دەنگی بەرز): دۆستان، بە دەنگی بەرزەوە گۆرانیان بڵێن؛ قەرارە ئەمرۆ جێژن بێ نەک مردوو ناشتن.

گورج و گۆڵ بوونەوە ← هاتنەوە سەرحاڵ.

گۆڕاندن ← نەڕاندن، قیژاندن.

گوریس پێچ کردن ← بە گوریس بەستن.

٥١٧٣/ 5398- گۆڕین، هەربەسەی شتێک داوا کردن/ پەڕینەسەر شتێکی دیکە: پاش هەفتەیەک مانەوە لە هوتێل، هەر چێشتێکی لە لیستەی هوتێلەکە دابوو داوام کردبوو/ هەر یەکەم گۆڕیبووو یەکی دیکەم داوا کردبوو.

٥١٧٤/ 984- گۆڕین (لیباس): زۆر باشە، هەر ئێستا ئەم لیباسە کۆنانە دەگۆڕم.

٥١٧٥/ 985- گۆڕین، شتێکی تازە هەڵگرتن: لەم دوایی‌یانەدا، بریتانیا سیستەمی دەدەیی بۆ دراوی خۆی قەبووڵ کردووە. ئەو گۆڕانە بێ گەڕو گرفت بەڕێوە چوو.

٥١٧٦/ 1601- گۆڕین، چوونە بەشێکی دیکە: ئەگەر هاتوو کابرای پیاو کووژ ویستی بە رێگای مەزرایەدا هەڵێ، ئێمەش (بەرنامەکەمان) دەگۆڕینو سەگە شوێن هەڵگرەکان وەگەر دەخەین بۆ ئەوەی شوێنی هەڵگرن.

٥١٧٧/ 1434- گۆڕین: دەندە/ گێڕی ئەو ماشێنە لە شێوەی دەستیی گۆڕدراوەو کراوە بە ئوتوماتیک.

٥١٧٨/ 6579- گۆڕین، ئاڵوگۆڕ پێ کردن، جێگە ... گۆڕین: دایلەر بارکی هەمیشە دیکۆری دیوەکان تازە دەکەنەوەو جێگای مۆبلەکان دەگۆڕن. ناچار ئەمانەکەمیان قەت دوو مانگان لەسەر یەک حاڵەت دا نیە.

٥١٧٩/ 6575- گۆڕین (ی بیروبۆچوون یان رێگا): بابەکە رێی گۆڕیو ئەوجار لە جیاتی ئەوە کە دەگەڵی بەربەرەکانی بکەین، ئەو پاڵی پێوە دەناین.

٥١٨٠/ 1435- گۆڕین و کردن بە: کۆنە تەویلەیەکیان (گۆڕیەو) کردە خانوویەکی چکۆڵەو خۆش.

گۆڕین (ی بەرنامەی کار) ← بەرنامەی کار

٥١٨١/ 6544- گۆڕینەوە: بۆ ئەوەی باشتر بۆ بەرمان بێن، منو چیا جاکێتەکانمان گۆڕینەوە.

٥١٨٢/ 5239- گۆڕینەوە، وردە کردنەوە (ی پووڵ/ پارە)، کردن بە: دەتوانن بە زەوەب کردنی پۆندەکانتان لە سەدی بیانکەنە پێنجی‌یە تازەکان.

٥١٨٣/ 7050- گۆڕینەوە: ئەو کابرایە ماشێنێک بۆ ماوەی دوو ساڵان رادەگرێو، دوایە دەیگۆڕێتەوە.

گۆڕینەوە(ـی دراوی وڵاتێک بە هی وڵاتێکی دیکە) ← خورد کردنەوە.

٥١٨٤/ 6542- گۆڕینەوە دەگەڵ: کێ حازر دەبێ ساندویچی گۆشت بەرازی دەگەڵ ساندویچی پەنیرو تەماتە بگۆڕێتەوە؟

٥١٨٥/ 7048- گۆڕینەوە دەگەڵ: هەرمێن موسافیرە ئورووپایی‌یەکان کە دەچوونە باکووری کانادا، شتوومەکی

دەستکردی کارخانەکانیان دەگەڵ کەرلی حەیرانان دەگۆڕییەوە.

٥١٨٦/ 2066- **گۆڕینەوە لەگەڵ، ئاڵوگۆڕ پێکردن:** چیا بە گۆڕینەوەی کڵاوەکەی دەگەڵ هی مێری لە نێو ماشێنەکەدا منداڵەکانی سەرگەرم کردبوو. ● پێت خۆشە جێگامان بگۆڕینەوە؟ لەوێ زۆر راحەت نی، دەنا نا؟

٥١٨٧/ 2366- **گۆڕی خۆ ون کردن، ڕۆیشتن، چەقەڵدەم بوون:** ئەگەر هاتەوەو نارەحەتی کردی پێی بڵێ گۆڕی ون کاو بڕوا.

گوزاریش دان لەسەر ← راپۆرت یان گوزاریش دان لەسەر.

گوزو گومبەد گرتن ← راستییەکەی گرتن.

٥١٨٧٠١/ 4535- **گوزاریش، راپۆرت:** داوام لە ئاغای ... کردوە کە بێتە کۆبوونەوە، چونکە دەتوانێ لەسەر ئاخرین رووداوەکان راپۆرتێکی باشمان بداتێ.

٥١٨٨/ 2454- **گوزەراندن (سەرکەوتووانە)، ژیان بەسەر بردن، رابواردن:** ئەو خانە پەرە وا ئەدەهاتە بەرچاو کە دەوڵەمەند بێ، بەڵام سەرکەوتووانە رایدەبوارد، هەرچەند نازانم چۆن.

٥١٨٩/ 6791- **گوزەراندن، رابواردن لە، بەسەر بردن:** شا ژن، بەشێك لە ساڵێ لە کاخی ساندرنیك هام دەگوزەرێنێ.

٥١٩٠/ 9636- **گوزەراندن، گوزەران کردن بە:** ئەو مەبلەغە پوولەی/ پارەیەی کە وەك مەدەد مەعاش لە دایکەو بابی وەری دەگرت سێ ساڵ لە زانستگە گوزەرانی پێکرد.

گوزەران ← تێپەڕین.

گوزەران (بەسەر هۆیەك بێ) ← سەری خۆ راگرتن.

گوزەراندن ← ژیان.

گوزەران کردن بێ ← بردنە سەر بێ....

٥١٩١/ 417- **گوزەراو ...، لێزابردن، بەسەرچوون:** ئەوەدەمی کە جحێڵ بوو شتێکی عەجیب بوو بۆ کچان، ئێستا لێی گوزەراوە، مەگەر نا؟

گۆگرد لێدان ← هەڵکردن.

٥١٩٢/ 1982- **گوڵ بەلەتوون لێدان:** دایە گەورە هەمیشە عادەتی وابوو کە لێواری لێفەکانی گوڵبەتوون لێ بدا.

٥١٩٣/ 5964- **گوڵ بژێر کردن، هەڵبژاردن، گوڵچین کردن:** کارامەترین کەسانی هێزی کاریان بۆ گوردانی کرێکاران گوڵبژێر کرد.

← کۆ کردنەوە.

٥١٩٤/ 1250- **گوڵ کردن، خونچە دەرهێنان پیان کردن:** ئەمساڵ بە هۆی ئەو هەوا خۆشەوە، زەعفەرانەکان زوو گوڵیان کردووە.

٥١٩٥/ 1196- **گوڵ کردن، گوڵ دەرکردن:** ئەمساڵ دار درەنگتر گوڵ دەکەن.

٥١٩٦/ 285- **گوڵ کردن:** لە هەر دوو بەری جادەکە دار هەنار گوڵیان کردبوون.

٥١٩٧/ 834- **گوڵ کردن (بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو):** دەتگوت باخەکان تەنیا لە ماوەی شەوێکدا گوڵیان کردووە.

← کەیف ساز بوون، لە گوڵێدابوون، پشکوتن.

گوشاد کردنەوە ← فش کردنەوە.

٥١٩٨/ 6427- **گوشار خستنە سەر، فشار هێنان بۆ:** مەلەوانەکان بە هەموو هێزیانەوە گوشاریان دەخستە سەر سەوڵەکان بزنەوەی بەلەمەکە لە نێو تاشە بەردەکان رزگار کەن.

٥١٩٩/ 3279- **گوشار خستنە سەر، پێش پێگرتن، هێرشی کەسێك دەفع کردن:** هێزێکی چکۆڵە بۆ ماوەی چەند رۆژان پێشی بە دوژمنێك گرتبوو کە لەباری ژمارەی ئەفەراتەوە یەکجار زیاتر بوون. ● ئەوە بۆ ماوەی چەند ساڵە ئەو ژنەی خستۆتە ژێر گوشارەوە. بەڵام، درەنگ یان زوو، ناچار دەبێ دەست هەڵگرێ.

← فشار هێنان بۆ.

٥٢٠٠/ 349- **گوشار (فشار) لەسەر ... بوون:** دەوڵەت کەوتۆتە ژێر فشارەوە/ دەوڵەت فشارێکی زۆری لەسەرە بۆ ئەوەی نیستیقاله بدا/ لەسەر کار وەلا چێ.

٥٢٠١/ 4734- **گوشار هێنان بۆ:** بۆ دەست پێکردنەوەی وتووێژ فشارمان (بۆ دەوڵەت) هێناوە.

← پانوفلچ کردنەوە.

٥٢٠٢/ 4576- **گوشار هێنان، فشار هێنان:** مامۆستاکانی راوێژکار هەر لە سەرەتای تیرمەوە گوشارێکی زۆریان هێنا. ● لە نیوەی دووهەمی یارییەکەدا، فوروارده فەرانسییەکان فشارێکی زۆریان هێنا.

٥٢٠٣/ 4852- **گوشار (فشار) هێنان بۆ، خستنە ژێر فشارەوە، زەحمەت لەسەر دانان:** تاقمێکی چکۆڵە بۆ وتووێژی تازە فشار دێنێ. ● بۆ رێگا چارەیەك مەچە ژێر فشارەوە.

٥٢٠٤/ 4865- **گوشار هێنان بۆ بە پەسند گەیاندن:** هەوڵ دەدەین پێش پشوودانی کریسمس بە پەسندکرانی بگەیێنین.

٥٢٠٥/ 6426- **(بۆ ئەنجامی دانانێکی زیاتر) گوشار یان فشار هێنان بۆ:** پەیامەکە بە شێوەیەکی نامایی بجوێنەوە، بەڵام بۆ ئەوەی تەنسیرێکی زیاتر دابنێی، فشار (بۆ خۆت) مەیێنە.

٥٢٠٦/ 7148- **گۆشەگیری کردن، خۆ لە خەڵك دوور خستنەوە، دووری کردن لە، دووره پەرێزی کردن:** هیچ شتێك دروست نەدەکرا، هەمور چالاکی‌یەك ولاندرابوو، لادێ‌یەکان بە نارەحەتی‌یەوە، دووره پەرێزی‌یان دەکردو بێجگە لە نانو ناسایشی فکری هیچ شتێکی دیکەیان چاوەروانی نەدەکرد.

٥٢٠٧/ 7501- **گوشین (وچوزانلەوە):** چەند پارچە لیباسی هەیە دەبێ بیانکوشێ‌و هەڵیان خا.

گوناحی شتێك خستنە ئەستۆی کەسێك ← کەتنی (گوناحی) شتێك خستنە ئەستۆی کەسێك، تاوانبار کردن.

گونجان ← نووسران لە... دا.

گونجاندن ← کردن بە یەك.

٥٢٠٨/ 4987- **گوناحی/ تاوانی/ بەرپرسایەتیی شتێك خستنە ئەستۆی کەسێك یان شتێك:** کارەسات بە دوای کارەساتدا رووی دەخەڵکی ئەو گوندە کردبوو، بەڵام خەڵکی لە رادە بەدەر کۆنەپەرست/ خورافات پەرست گوناحی ئەو کارەساتانەیان دەخستە ئەستۆی...

٥٢٠٩/ 6600- **گونجاندن لەگەڵ:** سیاسەتی بیمە کردنی شیرکەتی ئێمە، بەتایبەتی را داندراوە کە دەگەڵ داهاتی ئەو کەسانەی خۆیان بیمە دەکەن لە قۆناخە جۆراوجۆرەکانی ژیانیاندا بگونجێ.

گونی خۆو گێزەر لێك نەکردنەوە ← هەرە لە بەرە نەکردنەوە.

گوو تێکردن ← (زاراوەی لاتی) خراپ کردن.

٥٢١٠/ 6684- **گوێ دان بە، سەرنجدان بە:** هیچ گوێ مەدەنە رەخنەو رێنوێنی‌یەکانی دۆستەکانتان.

← دەرس وەرگرتن لە.

٥٢١١/ 1908- **گوێدان بە، گوێڕاگرتن بۆ (بە دڵەوە):** خەڵکەکە بە دڵەوە گوێیان بۆ قسەکانی راگرتبوو.

٥٢١٢/ 148- **گوێ دان (بە)، گوێڕاگرتن (بۆ):** ئەگەر گوێی دابا قسەکانی دایکی، ئێستا وا گرفتار نەدەبوو. ● ئەگەر بە وردی گوێڕایەڵی (مامۆستاکەت) نەبی هەرگیز هیچ فێر نابی.

٥٢١٣/ 24- **گوێ دان بە، لەبەرچاو گرتن، بە قسەی کەسێك کردن:** ئەگەر رێنوێنی‌یەکانی منیان لەبەرچاو گرتبا، شیرکەتەکە تێیدا نەدەچوو.

٥٢١٤/ 3944- **گوێ دانە رادیۆ، رادیۆ گرتن:** پێی خۆشە شەوانە هەتا درەنگ وەخت رادیۆ بگرێ. ● هیچ بەرنامەیەك نابینمەوە کە بایەخی ئەوەی هەبێ گوێی بدەمێ.

← گوێدانە شتێك هەتا ئاخری، بوون بە دۆستی کەسێك.

٥٢١٥/ 3130- **(بە وردی) گوێ دانە کەسێك، چاو لە زاری کەسێك بوون، چاوەڕوانی کەسێك بوون:** هەموویان چاویان بریبووە زاری رێبەرەکەیان. ● بێگومان باش دەیزانی کە چلۆن ئەوما بکاتە کویلەی خۆی. دیار بوو کە کچەکەش چاوی لە زاریەتی.

گوێ دەچەرمەوە بردن ← گوێ قوت کردن.

٥٢١٦/ 6324- **گوێ راگرتن بۆ کەسێك (بۆ روون بوونەوەی ...):** تەنیا دەقیقەیەکی دیکەم گوێ بۆ راگرە گومانم لەوە دانیە دەتوانم قەناعەتت پێ بێنم کە هۆکارێکی ژیرانەمان بۆ ئەو کارە هەیە.

٥٢١٧/ 4498- **گوێ راگرتن لە، هۆش لە لای کەسێك بوون:** خانم، تکایە هۆشت لە لای ئەو بێ/ گوێت لەوی بێ.

٥٢١٨/ 3233- **گوێ راگرتن بۆ شتێك هەتا ئاخر، گوێ دانە شتێك هەتا ئاخری:** باقی ئەندامانی شەریکە بە عەلاقەوە هەتا ئاخری گوێیان بۆ قسەکانی ... راگرت. ● بە بێدەنگی‌و هەتا ئاخری گوێیان بۆ قسە کانی راگرت.

← خۆڕاگرتن.

٥٢١٩/ 3232- **گوێ رانەگرتن بۆ، حازر بە بیستنی شتێك نەبوون، حازر بە گوێدان بە شتێك نەبوون، ئامادە نەبوون بۆ بیستنی ...:** یانی سیت پاش ئەو هەموو خزمەتەی چەندین ساڵە، بە جێمان بێڵێ؟ حازر نیم گوێم لە شتی وابێ.

٥٢٢٠/ 4295- **گوێزستنەوە (ی ماڵ):** ئەو بنەماڵەیە رۆژی یەکەمی مانگ دەگوێزنەوە بۆ ئەو خانووە.

← رۆیشتن لە ماڵێك.

٥٢٢١/ 4747- **گوێ قوت کردن؛ گوێ دەچەرمەوە بردن:** ئەسپەکە... سەری وەرگێرا، گوێیەکانی قووت کردو، چاوی گێڕا.

٥٢٢٢/ 354- **گوێ قولاخ بوون، ئاگا لە خۆ بوون:** ئەگەر لە جیاتی/ جێگای تۆ بام، زۆرم ئاگام لە خۆم دەبوو؛ ئەوە لەو تیپە پیاوانە نیە کە بکرێ متمانەت پێی بێ/ لێی ئەرخەیان بی.

← وشیار بوون.

٥٢٢٣/ 458- **گوێ لە قسەی کەسێك راگرتن، زەین دانە قسەی کەسێك:** ئەرێ ئەو بەشە حاڵی بوون؟ داخوا گوێت لێیە- یان دەبێ لەسەرا بیڵێمەوە؟

٥٢٢٤/ 4555- **گوێ لێ بوون، بیستن، گۆ کردنەوە:** هێندێك قسەی سەبارەت بە کەم کرانەوەی یارمەتی‌یەکانمان گوێ لێبووە. ● هەمیشە خەریکی کۆ کردنەوەی دەنگۆیانە.

← گەیشتنە گوێ.
گوێ نەدان بە ← گوێی خۆ ناخنین لە، پێشگری کردن لە.

/٥٢٢٥ 1978- **گوێ هەڵخستن، بە دزیەوە گوێ راگرتن:** ئەتۆ چۆن دەزانی خانی هێل منداڵی دەبێ؟ بێ هیچ ئەم لاو ئەولایەك دەبێ گوێت لە قسەی ئێمە هەڵخستبێ.

/٥٢٢٦ 1182- **(لە قسەکردن لەسەر تێلەفۆن) گوێم لێیە:** ئەلۆ، ویکتور! ئەلۆ، ویکتور!، فەرموو گوێم لێیە.

/٥٢٢٧ 7188- **گوێی خۆ ئاخنین لە، گوێ لەدان بە:** داوەر (ی یاریی فووتبال) لە بەرامبەر هەموو رەخنەو گوڕە کردنە خۆراییەکاندا پیاوانە گوێی خۆی ئاخنی.
گوێ یەك بۆ راگرتن ← چاوێك لێبوون.

/٥٢٢٨ 7085- **گە پەڕاوی دەستی خۆ کردن، گاڵتە کردن بە:** بە ئیحساساتی ئێمە گاڵتە مەکە.
گەپ پێدان ← گاڵتە پێکردن.

/٥٢٢٩ 4621- **گەچ لێدان، گێچ لێدان، بە گێچ گرتن، گەچکاری کردن:** ئەو قەڵشتانەی میچی دەبێ پێش رەنگ کردن، بە گێچی بیانگری. (گێچکاری بکرێن).

/٥٢٣٠ 207- **گەڕان ... لە، بە دوای ... بوون:** زۆر کەس بە دوای کارێکی لەو چەشنەدا دەگەڕێن/ لە کارێکی را دەگەڕێن.

/٥٢٣١ 4765- **گەڕان، گەلنزا دۆزینەوە:** لە حاڵێکدا کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا کەسانی گەڕۆدەی ماڵی دنیا بۆ دیتنەوەی زێڕ دەگەڕان، لەم سەردەمەدا زەویناسە پسپۆڕەکان لە کانگاکانی نەوت، ئورانیۆم و فلزە سنعەتییەکان دەگەڕێن.

/٥٢٣٢ 2409- **گەڕان، هەڵتوچوو کردن، هامووشۆ کردن:** بە لەبەرچاوگرتنی تەمەنی ئەو پیرە پیاوە، دەکرێ بڵێین تا رادەیەکی زۆر دەگەڕێ.

/٥٢٣٣ 2383- **گەڕان (بۆ سەیران)؛** بەیانان کۆببوونەوە بۆ قاوەخواردنەوە، شەوانە چوون بۆ شانۆو، هەموو رۆژیش بە ماشێن گەڕان- ئەگەر ئەو ژنە کاتێکی زیاتری بۆ پێراگەیشتن بە بنەماڵەکەی تەرخان کردباو کەمتر گەڕابا، هەموو لایەك زۆر خۆشبەختتر دەبوون.

/٥٢٣٤ 4017- **گەڕان بە شوێن شتێکدا، لێگەڕان، وەدوای شتێك کەوتن، بە دوای شتێکدا گەڕان:** "لە چی دەگەڕێی؟"، "لە تۆسقاڵێك دڵسۆزی." * ئەو دەرفەتەی بە دوایدا دەگەڕا، ئێستا بە مفتە پێی پێشنیار کراوە.

/٥٢٣٥ 5634- **گەڕۆك بوون، پشکنین، بە دەستە کوتە لە شتێك گەڕان:** بۆ ماوەی دەقیقەیەك بە دەستەکوتە بن مێزەکەی پشکنی و سەرەنجام بوتریەکی دیتەوە.
← خولانەوە، پشکنین، هاتوچۆ کردن.

/٥٢٣٦ 5343- **گەڕاندنەوە، هێنانەوە چۆنی خۆی، زیندوو کردنەوە:** ئەو هەنگاو هەڵگرتنانە یارمەتییان داوە بە زیندوو بوونەوەی/ بە هێز کردنەوەی باوەڕیان بە خۆیان بۆ بەرێوەبردنی کاروبارییان.

/٥٢٣٧ 4629- **گەڕاندنەوە:** تۆزێکی بلێندی بۆ لای باوکی گەڕاندەوە.
← وەدەرنان، بانگ کردنەوە، دامەزراندنەوە، کشاندنەوە، دانەوە.

/٥٢٣٨ 4888- **گەڕاندنەوە بۆ، گەڕانەوە بۆ:** وشکە ساڵی بەرنامەی کشتو کاڵەکەمانی گەڕاندۆتەوە ئەو نوختەی کە دەستمان پێ کرد (دەبێ لەسەر را دەست پێ بکەینەوە - وەرگێڕ).

/٥٢٣٩ 4886- **گەڕاندنەوە بۆ دواوە (سەعاتێك)، گەڕانەوە بۆ دواوە، وەپاش خستن:** دەبوو شەوی رابردوو سەعاتەکان سەعاتێك بۆ دواوە بگێڕینەوە/ وەپاش خەین.

/٥٢٤٠ 6935- **گەڕاندنەوە بۆ لای:** شکستی ئەو سیاسەتە رێبەرانی حیزبی گەڕاندەوە بۆ لای تەرحێکی کە پێشتر هاتبووە گۆڕێ.

/٥٢٤١ 651- **گەڕاندنەوە، دانەوە، هێنانەوە، گێڕانەوە:** ئەو لەم ماڵە رۆیشتووەو ئیدی هیچ کەس ناتوانێ بیگێڕێتەوە/ بیهێنێتەوە.
← بەشدار کردن.
گەڕان دەگەڵ ← حەز لێکردن.

/٥٢٤٢ 5694- **گەڕان لە ...، بە دوای شتێکدا گەڕان:** ئەتۆ دەبێ لە نێو ئەو قسانەی کە پارەکە کردوونی بە شوێن بەڵگەیەکدا بگەڕێی.

/٥٢٤٣ 5101- **گەڕان لە، پشکنین:** موسافیرەکان بۆ گەڕان لە شوێنەواری ژیانی ئینسان، چوونە نێو دوورگەکەوە.

/٥٢٤٤ 5134- **گەڕان لە، گەڕان، پشکنین:** مەئموورانی پۆلیس بۆ چەکەکان هەموو حەشارگەیەکیان پشکنی.

/٥٢٤٥ 998- **گەڕان لە شتێك، خەریکی دۆزینەوەی شتێك بوون:** لە حاڵێکدا چیا خەریکی دارشتنی نەخشەی بابەتی سەرەکیی چیرۆکێك بوو، کامران بە توندی خەریکی دۆزینەوەی بەڵگەی کوژرانی کەسێك بوو کە ٥٠ ساڵ پێشتر لە گوندەکەدا کوژرابوو.

٥٢٤٦/ 950- **گەڕان لە شتێك، لە بیانوویەك**: لە بیانوویەك دەگەڕام بۆ ئەوەی میوانەكانم بەجێ بێڵم.

٥٢٤٧/ 1679- **گەڕان لەسەر بە پاڵپشتی شتێك گەڕان**: ژیانی لەسەر ئەو داهاتە دەگەڕێ كە لە رێگای سەرمایەدانانەوە وەچنگی دەكەوێ.

← سووڕان لە دەوری.

٥٢٤٨/ 2207- **گەڕان لە شتێك (بە دەست یان بە ئاوێك)**: لە ئەوەرمۆزەكەدا، بە داردەستێكەوە لە قرژاڵان دەگەڕا.

٥٢٤٩/ 3842- **لێ گەڕان لە كەسێك، بۆ ئەوەی بە تەنیایی موشكیلەی خۆی چارەسەر بكا**: ئەگەر بە تەنیایی بە جێی بێڵن بۆ ئەوەی بۆ خۆی گیروگرفتەكانی چارەسەر بكا، من لەوەدا بە گومانم كە بتوانێ حەفتەیەك لەسەر كارەكەی دەوام بێنێ. ● هەوڵ مەدە هەموو جارێ كایەی منداڵەكان رێكخەی؛ لێیان گەڕێ با بۆ خۆیان گیروگرفتی خۆیان چارەسەر بكەن.

← بەجێ‌هێشتنی كەسێك بۆ ئەنجامدانی كارێك.

٥٢٥٠/ 4005- **گەڕانەوە چاوگێڕان، هەڵسەنگاندن، پەرەسەی كردن**: "ئاغا شتێكی تایبەتیت پێویست بوو؟"، "نا، ئەمڵا، تەنیا چاو لێدەكەم." ● "هێشتا كارێكت نەدۆزیوەتەوە؟"، "نا، هەوڵ دەدەم پێش ئەوەی شتێك وەئەستۆ بگرم وەزعەكە باش هەڵسەنگێنم.

گەڕانەوە خۆ خافڵاندن ← خولانەوە.

٥٢٥١/ 5633- **گەڕانەوە ویستنەوە (دۆزینەوە)**: بڕۆ بگەڕێ چەند چڵێك دار بۆ سۆبەكە/ ئاورەكە بدۆزەوە.

٥٢٥٢/ 7070- **گەڕانەوە فرۆشتن، فرۆشتن، چەرچیەتیی كردن**: مێردەكەی شێوە فرۆشیارێكە. پێم وایە دەگەڕێو ئامرازی نووسینی ئیداران دەفرۆشێ.

٥٢٥٣/ 1138- **گەڕانەوە (سەركەوتووانە)**: دوای ئەوەی كە لەمێژساڵ بوو ناوێكی نەمابوو، هونەرمەندی بەناوبانگی سینەما بە شێوەیەكی چاوەڕواننەكراو سەركەوتووانە هاتەوە گەڕێ.

٥٢٥٤/ 2770- **گەڕانەوە**: كاتێك بڕیارمان دا كۆچ بكەین، ئیدی گەڕانەوەمان نیە.

٥٢٥٥/ 2820- **گەڕانەوە بۆ (نیشتمان، ماڵ)**: یەكجار درەنگە! دەبێ بڕۆمەوە/ بگەڕێمەوە بۆ ماڵێ. بابم زوو تووڕە دەبێ ئەگەر دوای نیوەشەو بچمەوە.

٥٢٥٦/ 2441- **گەڕانەوە، هاتنەوە**: ئەگەر كاوە گەڕاوە بڵێ شەهلا تەلەفوونی كرد.

٥٢٥٧/ 7375- **گەڕانەوە (وەك قەمچی)**: كاوە راست لە پێش منەوە بە نێو لێڕەوارەكەدا دەڕۆیشت كە لە پڕ لقێكی باریك وەك قەمچی گەڕاوەو زۆر چاوی بریندار كردم.

٥٢٥٨/ 7132- **گەڕانەوە**: یەكێك لە ئەندامانی تاقمەكە بۆ یارمەتیدان بە یەكێكی دیكەیان كە چۆكی وەرگەرابوو گەڕاوە.

٥٢٥٩/ 3806- **گەڕانەوە بۆ، كەیشتنە ...، سەرەوەرهێنان لە**: راپۆرتەكە/ گوزارشەكە باسی وتووێژێك دەكا كە گەیوەتە چارەسەركردنی مەسەلەكە/ ناكامەكەی بۆتە چارەسەركردنی مەسەلەكە. ● هەموو رووداوەكانی ژیانی شێرزاد دەگەنەوە ئەرختیەی.

٥٢٦٠/ 6167- **گەڕانەوە (بۆ جێگەی خۆ)**: كاتێك كەسێك لە دەرگاكە (پێش تۆ) وەژوور دەكەوێ، وشیار بە دەرگاكە نەگەڕێتەوەو، وەدەمەوچاوت نەكەوێ.

٥٢٦١/ 232- **گەڕانەوە، هاتنەوە**: بە یەك دەقیقە بە چایەوە دەگەڕێمەوە. ● لەكاتی خۆیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بیاننوێنێ.

٥٢٦٢/ 5199- **گەڕانەوە، كەماڵە كردن**: تەوەكە وەتەختەكەی كەوتو بەرەو دوایە كەمانەی كرد.

٥٢٦٣/ 2450- **گەڕانەوە بۆ سەركاری دۆخی پڕ لە گیروگرفتە ناخۆش**: لە پشووان ئەچێ، دوای سێ رۆژی دیكە پشوودانەكەمان تەواو دەبێو ناچارین بگەڕێینەوە سەر ئەو كارە ناخۆشەمان.

٥٢٦٤/ 5277- **گەڕانەوە بۆ، چوونەسەر ... بە سەرداهاتنەوە**: پاش شادیو خۆشحاڵییەكی كورت خایەن، هەمان حاڵەتی سستیو بێ‌حاڵیی جارانی بەسەر داهاتۆتەوە.

٥٢٦٥/ 1633- **گەڕانەوە بۆ (دواوە)**: هاوئاهەنگی لە كارخانەكاندا دەگەڕێتەوە بۆ رێككەوتنێكی ژیرانە كە لە براری حەقدەستەو كارامەییدا جێبەجێ كرا.

٥٢٦٦/ 143- **گەڕانەوە بۆ، لەسەبەب دان بە**: بەشی زۆری شانازیی سەركەوتنی حیزب لە هەڵبژاردنی گشتیدا دەگەڕێتەوە بۆ لەسەرەخۆیی‌و بڕوا بە خۆ بوونی سەرۆكی حیزب.

٥٢٦٧/ 1163- **گەڕانەوە بۆ جیهانی راستییەكان**: عاشقان لە جۆرێك دنیای خەونو خەیاڵان دادەژین، بەڵام سەرئەنجام رۆژێك دەگەڕێنەوە بۆ جیهانی راستییەكان.

٥٢٦٨/ 2278- **گەڕانەوە بۆ رابردوو، بۆ دواوە**: بەشی سەرەكیی فیلمەكە، ژیانی قارەمانەكەی لەو سەردەمەدا نیشان دەدا

کە ببوو بە پیاو و هێندێک دیمەنیش دەگەڕانەوە بۆ ڕابردوو.
← زەمان/ کات گەڕاندنەوە دواوە، بەرەو پشت یان بەرەو دواگەڕانەوە.

۵۲۶۹/ 650- گەڕانەوە (و بیرەوەری لەگەڵ خۆهێنانەوە): بیرەوەریی خۆش و ناخۆشمان لە سەفەری ئیسپانیا دەگەڵ خۆ هێنایەوە.
← وەبیر هێنانەوە.

۵۲۷۰/ 1134- گەڕانەوە: لێرە دەڕۆم و ڕێدەچێ هەرگیز نەگەڕێمەوە.
← ڕۆیشتنەوە، کشانەوە، هاتنەوە، ڕیشە هەبوون لە... دا.

۵۲۷۱/ 979- گەڕانەوە سەر (ڕەنگی، شکڵی، لە خاڵی جاران): کاتێک شازادە خانم چرو بەشەوێ، دیتی کە بۆقەکە گەڕاوەتەوە سەر شکڵی شازادەیەکی زۆر جوان.

۵۲۷۲/ 5364- گەڕانەوە سەر، هاتنەوە سەر بابەتێک: لە درێژەی قسەکانمدا چەند جار دەگەڕێمەوە سەر ئەو ڕاگەیەندراوە.
گەڕانەوە سەر کار ← چوونەوەسەر کار.
گەڕانەوە سەر وەزعی ئاسایی ← جێبەجێ بوون.

۵۲۷۳/ 2449- گەڕانەوە لای ...، دەست پێکردنەوە، گەڕانەوە بۆ سەر: دوای پشوودانێکی کە زۆر دوور و درێژ دەهاتە بەرچاوی، کورە قوتابییەکە زۆر خۆشحاڵ بوو کە دەگەڕاوە لای کتێبەکانی.

۵۲۷۴/ 2 01- گەڕانەوەی جەریان (ی کارەبا و ...): بەشێک لەو دەنگەی ئامپلیفایر بەرێی دەکا دەگەڕێتەوە و، بەجۆرە لە خراپ بوونی دەنگەکە پێشگری دەکا.

۵۲۷۵/ 3314- گەرم بوون، ڕەونەق پەیدا کردن، گەشە کردن: پاش ئەوەی کە یەکیەتیی مەسافەبەری دەستی بە کار کرد، ڕقەبەری لەسەر بازاری دەریانەوەردیی بریتانیا زۆر بە خێرایی گەرم بوو.

۵۲۷۶/ 7308- گەرم بوون (ی دەزگایەک): لە هەوای سارددا، پێش ئەوەی وەڕێکەوی، ساساتی ماشینەکە بکێشە هەتا مەتۆڕەکەی گەرم بێ.
← گەرم کردنەوە.

۵۲۷۷/ 6888- گەرم بوونەوە، تواندەوە، نەرم بوونەوە: دەقیقەیەکەم دەرفەت بدەنێ با لە کن سۆبەکە گەرم بمەوە جا ئەوجار قسان دەکەین.

۵۲۷۸/ 7305- گەرم داهاتن، کەیف سازبوون، وەشۆق کەوتن: کاتێک کە سەرۆکی کۆبوونەوە شۆق و زۆقی تەماشاچییەکانی هەست پێکرد کەیفی ساز بوو و، ڕاکێشەرترین و سەلمێنەرترین وتاری ئەو شەوەی دا.
← گەرم کردنەوە.

۵۲۷۹/ 7309- (خۆ) گەرم کردن (بۆ وەرزش): سەرپەرستی تیپی ئاڵمان خەریکە یەکێک لە یاریزانە جێگرەکان لە تەنیشت مەیدان گەرم دەکا/ گەرم دادێنێ.

۵۲۸۰/ 7307- گەرم کردنەوە، گەرم بوون یان داهاتن: کەمێک ڕاوەستە هەتا هێندێک شیر لەسەر گازەکە گەرم دەکەمەوە. ◆ ئەرێ ئەو دیوە بۆچی وا دەرەنگ گەرم دادێ؟

۵۲۸۱/ 3234- گەرم کردنەوە (ی چێشت): چێشتی تازە لێنراوم پێخۆشە- چێشتێکی گەرم کراوەی گۆشتەو سەوزیم ناوێ.
← برژاندنەوە.

۵۲۸۲/ 6565- گەسک دان، گسک دان: ئەو دیوە پێویستە زۆر باش گەسک بدرێ.

۵۲۸۳/ 5113- گەسک لێدان، گسک لێدان، ماڵین، ڕاماڵین: گێژەبایەک گەسکی لە گوندەکەدا و هەرچی دار بوو هەڵیکەند و هەرچی کشتوکاڵ بوو لە بەینی برد.

۵۲۸۴/ 2728- گەشانەوە، دروەشانەوە: مناڵەکان بە هەڵاتن لە دەریارا گەڕانەوە ماڵێ لە حاڵێکدا بە هۆی سلامەتیی و خۆشحاڵییەوە وەک گوڵ گەشابوونەوە.
← هەڵدان، ڕوون بوونەوە، کەیف ساز بوون.

۵۲۸۵/ 2940- گەشت لێدان، گەڕان: لەم ماوەدا کە لێرەن، پێتان خۆشە گەشتێک لێدەن؟

۵۲۸۶/ 2060- گەشەکردن و هەڵدان، دەرهێنان، دروست کردن: کابرای داهێنەر ئەو دەزگا سەیر و سەمەرەی لە ڕووی ئامرازێکی زۆر سادە و ساکار دروست کردوە.

۵۲۸۷/ 4411- گەشە کردن: کەس نازانێ لە چەند ساڵی داهاتوودا، ئابووریی وڵات چۆن گەشە دەکا.
← هەڵدان، چوونە پێش.

۵۲۸۸/ 6922- گەمارۆ/ ئابلۆقەدان، قەرەنتینە کردن: دەوڵەتی هەرێم بۆ پێشگری لە بڵاوبوونەوەی ئەو ئاهۆیە، ناوچە ئالوودەکەی گەمارۆ دابوو.

۵۲۸۹/ 1099- گەمارۆدان، ئیحاتە، دەورەدان، دەورگرتن، ڕژانە سەر: هەواڵنووسان میوانە پایە بەرزەکەیان دەورە دابوو.
گەمارۆدان ← پێوەندیی کەسێک دەگەڵ ... بڕین، لە جموجۆڵ خستن، دەوری شتێک گرتن، لە جێگایەکی چکۆلەدا مانەوە.

٥٢٩٠/ 5906- گەمارۆدان، ئابلۆقەدان یان دران: هەموو ساڵی چوار مانگان بەفر ڕێگایان دەگرێو بەم جۆرە دەکەونە گەمارۆوە.
گەمە پێکردن ← گاڵتە پێکردن.
٥٢٩١/ 2733- گەندەڵ بوون، جووران، هەڵپرووکان، ڕزین: بەشێك لە کۆڵەکەی خانووەکە گەندەڵ ببوو، پێویستی بە چاك کردنەوە هەبوو.
گەواهی کردن ← شایەدیی‌دان سەبارەت.
٥٢٩٢/ 5871- گەورە بوون، هەڵدان (خۆرا) : لە چاوی پیس بە دوور بی، لەو ڕۆژەوە کە نەمدیوی یەکجار گەورە بووی.
٥٢٩٣/ 1122- گەورە بوون، هەڵدان: ئەو نەمامانە لە گوڵخانەدا باش هەڵدەدەن....
← خۆناسین، هەڵدان.
٥٢٩٤/ 3067- گەورە بوون و تەرخ کردنی هەلەتێك: لە جەنەگرتنەکانی جانی نارەحەت مەبە. گەورەبێ تەرخی دەکا. منداڵ هەموو وان. ● ئێستا گەورە بووەو ئەو کردنی جێگاکەی تەرخ کردووە.
٥٢٩٥/ 3073- گەورە بوون و لێبەرهەاتن: کارەم تەمبێ کرد چونکە ڕاستی نەگوتبوو. نامەوێ (گەورە بێ‌و) پیاوێکی درۆزنی لێ دەربێ.
گەورە بوونەوە ← پەرە پێدان.
٥٢٩٦/ 3066- گەورەتر بوون لە: گەورەتر بوونی لاقی شیلا بەراستی شتێکی عەجایبە. هەر سێ مانگان جارێك دەبێ سایزێکی گەورەتری کەوش بۆ بکرم.
٥٢٩٧/ 3667- (لە پارەی کرێکێشدا) پووڵ وەدەست هێنان.
گەورە کردن ← بەخێو کردن.
٥٢٩٨/ 4575- گەورە کردنەوە: جان شتی زۆر گەورە دەکاتەوە؛ پیاو وادەزانێ کە هەر ئەو گەورگرتنی بنەماڵەیی هەیە/ لە ماڵێدا گەورگرتنی هەیە.
٥٢٩٩/ 2572- گەورە کردنەوە: "ئەگەر خەری ببینمەوە پێی دەڵێم بیروبروام لە سەری چۆنە"، "مەسەلەکەی گەورە دەکەمەوە!".
← لێ‌گەورە کردنەوە، زل کردنەوە، لە کایەك کێوێك دروست کردن.
٥٣٠٠/ 540- گەورە کردنەوە (ی وێنە/ هەڵکس): ئەو ڕەسمانە وا دێنە بەرچاو کە داهاتوویەکی باشیان هەبێ. بۆ پسپۆڕێك نادۆزییەوە کەمێکیان گەورە کاتەوە؟
٥٣٠١/ 4574- گەورە کردنەوەی ئێش و دەرد: کاتێك دەچێتە لای پزیشکی ددانان، ئێش و دەردەکەی زۆر لەوە گەورەتر دەکاتەوە کە هەیە؛ دەنگی پڕکردنەوەی ددانی دەردێنێ هەر وەك تۆ بڵێی عەمەلێکی جەرراحی گەورە کرابێ.
گەوزاندن یان گەوزین ← گلۆڵە کردن.
٥٣٠٢/ 7298- گەوزین لە.. دا، خۆ تێوەدان، نوقمی ... بوون: کەرگەدەنەکان لە نێو قوڕو لیتەی کەنار چۆمەکەدا دەگەوزێن.
٥٣٠٣/ 5034- گەیاندن، باش تێگەیاندن، پێگوتن: ئەوشەوە کابرا نەیدەتوانی چەلەکەی باش لە گوێگرەکانی بگەیەنێ.
٥٣٠٤/ 740- گەیاندن بە سەر ئەنجامێکی یان چارەنووسێکی ناخۆش، تووشی چارەنووسێکی ناخۆش کردن: ئەوە ئەتۆ بووی کە بە خراپ بەڕێوەبردنی کارەکان وات بەسەر هێناین/ تووشی ئەو وەزعەت کردین.
٥٣٠٥/ 2429- (ئاواستەوخۆ) گەیاندن: نازانم بە وردی دەتەوێ بڵێی چی؛ ئەگەر دەتەوێ بڵێی براکەم فێڵبازە، واباشترە جارێکی دیکەش فکری لێبکەیەوە.
٥٣٠٦/ 4219- گەیاندن، زیاد کردن هەتا، لێ‌زیاد کردن: ئەگەر ئەتۆ چەند پێزنەی دیکە بدەی، ئەمن دەیگەیەنە ئەو مەبلەغەی کە پێویستە.
٥٣٠٧/ 720- گەیاندنە ....، بەرابەر کردن لەگەڵ: ئەگەر ئەو کۆتەو شەڵوارە بکرم، خەرجەکانم دەگەیەنێتە زیاتر لەو بوودجەیەی بۆم دیاریی کردووە.
٥٣٠٨/ 760- گەیاندن یان گەیشتن بە رادەی ...؛ دەبێ دەرسی ماتماتیکیشی بگاتە رادەی ئەوانی دیکە.
← ڕوون کردنەوە، تێگەیاندن، بەرێکردن.
گەیاندنەوە (ی کەسێك بۆ ماڵی خۆی) ← گەیشتنەوە ماڵێ.
٥٣٠٩/ 5006- گەیاندنە لێکدان: لە گەڕانەوەدا تایەرێکم پەنچەر بوو، دیتم زاپاسەکەشم/سپێرەکەشم پەنچەرە. ئیدی ئەوە گەیاندیە ئیسکانم.
٥٣١٠/ 1090- گەیشتن، داهاتن (بە هەرەشە لێکردنەوە): کاتێك زستان بە بارانی بێ‌پسانەوەو، قوڕو چڵپاوی بێ‌لەزەتی گەیشتە سەرمان/ داهات، ناردم دەستێك لیباسی دژی ئاوێم بۆ بکڕن.
٥٣١١/ 5172- گەیشتن (ی دەنگ هەتا ...)، ڕاگەیشتن: دەنگت ناگاتە ئاخری سالۆنەکە؛ دەبێ بلیندگۆیەك دابنێین.
٥٣١٢/ 1314- گەیشتن، نزیکگەیشتن: "بیستوومە کە بەستەزمانە ئاغای سمیت، کە پیر بووە، لە ئەندامەتی

کۆڕی بەڕێوەبەرایەتیی خۆی کێشاوەتەوە."، "بەڵێ، پێم وایە ئێمەش نۆرەمان دێ".

٥٢١٣/ 2636- **گەیشتن بە، چوونە سەر هەتا**: کوڕەکە بۆ گەیشتن بە دەرەجەیەکی بەرز بۆ چوونە زانستگە هیوابڕ ببوو.

٥٢١٤/ 2412- **گەیشتن بە، گەیشتنەسەر گەیشتنەوە، گرتنەوە**: زۆری نەخایاند کە چینییەکان لە بواری مووشەکییەوە گەیشتنەوە رووسەکان و ئەمریکاییەکان.

٥٢١٥/ 2599- **گەیشتن، بەدەست گەیشتن، هاتن**: ئەگەر خواردەمەنییەکی زیاتر نییە، هەزاران کەس لە ئاوارەکان لە برسان دەمرن.

← هاتن، بوون بە، وەدەست هێنان، (بە پێی وەسیەت) دران بە.

٥٢١٦/ 4187- **گەیشتن بە ئاکامێک**: ئەتۆ دەڵێی لە ماوەی سێ ساڵی داهاتوودا ئێمە هەر زەرەر دەکەین. باشە، ئەتۆ چۆن بەو ئاکامە گەیشتووی؟

٥٢١٧/ 2972- **گەیشتن بە ئەسڵی مەسەلە، لە بنی کوولەکەی دان**: "دەتەوێ مێردی بکەی؟"، "بەڵێ"، خۆشناو کە دەیەویست لە بنی کوولەکەی بدا، پرسی "بە کێ؟".

٥٢١٨/ 1310- **گەیشتن بە جێگایەکی یان ئاکامێکی ئەستەم یان ئاسان**: لە یەکەم کۆبوونەوەی پارلمانیی حیزبی کرێکار، رەنگە مەسەلەکە بگاتە جێگایەکی ئەستەم.

٥٢١٩/ 3975- **گەیشتن بە**: ناتوانین بگەینە ئەو مەعنەوییاتەی کە ئیدیعای دەکەین. ● ئەو کابرا گوێ درێژە توانیویتی بگاتە ئەو دەرەجەیە لە کەرێتی کە پێی ناسراوە.

← دۆزینەوە.

٥٢٢٠/ 1293- **گەیشتنە ... بوون بە ...، هەڵگرتن، تێپەڕین**: حیسابەکەمان گەیشتە پێنج پۆندو ئێوان. ● پێم وانەبوو ئەو چەند شتە هێندەی هەڵگرێ.

← هاتنەسەر هەتا، گەڕانەوە بۆ، گەیشتن بە.

٥٢٢١/ 2605- **گەیشتنە (جێگایەک، شتێک، مەبەستێک، خۆشترین بەشی بابەتێک)**: هەتا ئێرەشەوێ، نەگەیشتینە هەرتێلەکە.

گەیشتنە جێگایەکی باریک ← وەکوڵ هاتن.

گەیشتنە چڵەپۆپە ← بەرپەڕی خۆ گەیشتن.

٥٢٢٢/ 2804- **گەیشتنە (رێکەوتێک لە رابردوودا)**: ئەو کتێبە بە دەردی من ناخوا/ بە کەڵکی من نایە؛ تەنیا دەگاتە هەڵبژاردنی گشتیی لە ساڵی ١٩٥١دا.

٥٢٢٣/ 2008- **گەیشتنە**: ئەوکی کلکی درویشک دەگاتە چوزمیەکی خەتەرناکەوە، منداڵەکەش بە زیرەکییەوە بڕیاری دا کاری پێی نەبێ.

٥٢٢٤/ 2601- **گەیشتنە ...، هاتنە سەر هەتا**: تیپی شاهین شانسی هێنا کە توانی هەتا خولی پێنجەمی کاسەکە/ جامەکە بێتە سەرێ.

٥٢٢٥/ 5536- **گەیشتنە، چوونە پێش هەتا، رۆیشتن هەتا**: زەوییەکانی هامپتون کورت هەتا لێواری ئاوەکە دەچنە پێش/ دەگەنە لێواری ئاوەکە.

٥٢٢٦/ 123- **گەیشتنە (جێگایەک)**: راست ئەو کاتە قەتار دەیەویست وەڕێ کەوێ، گەیشتنە ئیستگە/"محطە".

٥٢٢٧/ 1355- **گەیشتنە**: سوارەکە گەیشتە ژمارەیەک لە خەڵک کە بە پێیاندا جوونە زیارەتێ.

٥٢٢٨/ 1406- **گەیشتنە ...، گەیاندنە ...**: یەکەمین پاس دەگاتە ئەتاری سەعاتی ٨/٣٠.

٥٢٢٩/ 554- **گەیشتنە ئاستی تێوێن/سەترسی/ تەقینەوە**: پەلها لە سەدی پۆلیسی فەلەستینی لە توانایی پێویست بەهرەمەند نەبوون و ئەوەش لە کاتێک دابوو کە وەزعییەتەکە زۆر بە روونی بەرەو تەقینەوە دەچوو/ دەگەیشتە تەقینەوە.

٥٢٣٠/ 3115- **گەیشتنە ئەستەمترین/ گرنگترین/ حەساسترین نوختە**: کاتێک مەسەلەکە دەگاتە حەساسترین نوختە، ئەگەر دڵوجورئەتی خۆت لەدەست بدەی، ئەیارەکەت دەیباتەوە.

گەیشتنەجێ ← هاتنە ژوور.

گەیشتنە یان گەیاندنە ئەوپەڕی خۆی ← بەوپەڕی خۆ گەیاندن، یان گەیشتن.

٥٢٣١/ 776- **گەیشتنە ئەوپەڕی خۆ، گەیشتنە چڵەپۆپە، بەوپەڕی خۆگەیشتن، وەجۆش هاتن**: خەریک بوو وەجۆش دەهات و گوتی: "ژیان بەراستی زۆر شیرینە، وانییە؟".

گەیشتنە ترۆپکی شتێک ← بە چڵەپۆپەی/ ترۆپکی شتێک گەیشتن.

٥٢٣٢/ 4784- **گەیشتنە تەنیشتی شتێک**: مۆتۆرسوارێک گەیشتە تەنیشتمان و بە ئیشارە تێی گەیاندین کە دەرگای تەنیشتی ماشینەکەمان باش دانەخراوە.

٥٢٣٣/ 4799- **گەیشتنە جێگایەک**: قەتارەکەمان راست لە کاتی خۆیدا گەیشتە ئیزگەی پارمینگتن.

٥٢٣٤/ 2479- **گەیشتنە جێگایەک، گەیاندنە جێگایەک**: پەروازی (= فڕۆکەی) ژمارە ٢٠٥ لە ئیستونرا کەنگێ دەگاتێ؟

٥٢٢٥/ 2222- **گەیشتنە جێگایەك**: هەمورومان بە یەكەوەو هاوكات گەیشتینە یەك نوختەی.

٥٢٣٦/ 254- **گەیشتنە جێگایەك كە هیچ بۆ ... گرنگ نەبێ**: پێت وانیە دەبێ مامۆستایەكی موسیقای دیكە بۆ كامران بدۆزینەوە؟ لەمن مەپرسە، گیانە.( گەیشتورمە جێگایەك كە) هیچم بۆ گرینگ نیە.

٥٢٣٧/ 78- **گەیشتنە رادەیەك**: قەرزداریی بریتانیا لە رادەی نەتەوایەتی‌دا دەگاتە دەیان میلیارد پۆند.

٥٢٣٨/ 5548- **گەیشتنە رادەیەك، سەر لە ... دان**: ئەو پارەیەی قسەی لەسەر دەكرێ، سەر لە دەیان هەزار پۆند دەدا.

٥٢٣٩/ 38- **گەیشتنە رادەیەكی ...**: زانیاریی ئەوان لەسەر شێوەی ژیانی خەڵكانی دیكە ناگاتە رادەیەكی زۆر، وانیە؟

گەیشتنە سەر ← لێ‌نزیك بوونەوە.

٥٢٤٠/ 1729- **گەیشتنە گوێ، گوێ لێبوون، دەنگدانەوە**: تەنانەت كاتێك دەرگاو پەنجەرەكانیشی پێوە دابوو، هێشتا گرێی لە دەنگی ترافیك هەر دەبوو.

٥٢٤١/ 5546-**گەیشتنە نێو، پێ نانە نێو ...**: كە وەسەرتر كەوتین گەیشتینە نێو مژێك كە ڕێگاكەی لێداپۆشینو ونی‌كرد.

٥٢٤٢/ 966- **گەیشتنەوە، گرتنەوە**: ئێوە زووتر وەرێ كەون؛ دەتانگرمەوە (= دەتانگەمەوە).

٥٢٤٣/ 2469- **گەیشتنەوە ماڵێ، گەیاندنەوە**: دەتوانی شەوێ گەیشتیەوە ماڵێ؟* ئەگەر لوتف بكەیو بێیی قاوەیەكمان دەگەڵ بخۆیەوە، بەڵێنیت پێ‌دەدەم بتگەیەنمەوە (ماڵێ).

گیاندان بۆ ← لەبار بوون بۆ.

گیان لەدەستدان ← كوژران.

٥٢٤٤/ 738- **گیان وەبەر ... نان، خۆش كردن، رووح وەبەرهێنان**: نەی‌دەتوانی نەخشی خۆی باش بگێڕێ، بەڵام، بە بڕوای من هەر ئەوەش بوو كە رووحی وەبەر ئەو شانۆ قۆزە هێنابوو.

٥٢٤٥/ 6175- **گیانێكی تازە هاتنەوە بەر**: زۆربەی لقە غەیرە چالاكەكانی حیزب گیانێكی تازەیان هاتۆتەوە بەر.

٥٢٤٦/ 3767- **گیانی خۆ بەخشین/ فیداكردن، خۆكردنە قوربانی**: لاوەكان لەبەر دەرگای ئیدارەی سەربازگیری كۆبوونەوەو ئامادەی چوونە شەڕێ بوونو، ئەگەر پێویست با حازر بوون گیانی خۆشیان بدەن/ ببەخشن.

٥٢٤٧/ 6662- **گیانی خۆ خستنە مەترسیەوە/ خەتەرەوە**: رەنگە زوو ئەم راستی‌یە وەدەركەوێ ئەگەر بڵێین ئەتۆ بە چوونت بۆ سەر خەتی سەریعی جادەكە گیانی خۆت دەخەیە مەترسی‌یەوە.

٥٢٤٨/ 6512- **گیانی خۆ لە دەست دان لە بەرامبەر ... دا**: شاخەوانان ناچارن دەگەڵ ئاڵوگۆری زۆر توندو تیژی ئاووهەوا بەرەورووو بن، ئاڵوگۆرێك كە زۆر كەسیان لە بەرامبەری‌دا گیانی خۆیان لەدەست داوە.

گێچ لێدان ← گەچ لێدان.

گێچەڵ كرین بۆ خۆ ←خۆ گرفتار كردن.

٥٢٤٩/ 6488- **گێران (ی لووت بە هەنگی سەرماخواردن)**: لێم مەیە پێش- ئەمرۆ لوتم زۆر عەجایب گیراوە.

٥٢٥٠/ 5884- **گێڕان (و جێگای خۆشی شار نیشانی كەسێك دان)**: ئەگەر سەعاتی ٢ی رۆژی هەینی بیكار بن، پێم خۆشە لە نێو شاردا بوورگێڕم (جێگا خۆشەكانتان نیشان دەم).

٥٢٥١/ 5891- **گێڕان، نیشاندان (ی جێگایەك بە كەسێك)**: بەڵەدێكتان بۆ دەهێنمەوە دەگەڵتان بكەوێو بە كارخانەكەدا بتانگێڕێ.

گیران ← بازداشت كران، هاتنەوە، دروست كردن لە، گرتن (ی ناوەرۆ).

٥٢٥٢/ 503- **گێرانەوە (ی قسەیەك كە نابێ بگوترێ)، پەنای زمانی خۆگرتن**: هێندەی نەمابوو كە جان وەك هەمیشە هێرش بەرێتە سەر كلیسا، بەڵام كە زانی بنەماڵەی مارسێل كاتۆلیكن قسەكەی گێڕاوە/پێشی زمانی خۆی گرت.

٥٢٥٣/ 1773- **گێرانەوە، پەشیمان كردنەوە، پەشیمان پێكردن**: سەرەنجام پۆلیس خۆپیشاندەرانی لە چوونە نێو وایت هاڵ گێڕاوە.

٥٢٥٤/ 1666- **گێرانەوە، لاچوون لەسەر**: زۆربەی لێژی ئەو تانكانە مووشەكی دژی تانك دە گێرنەوە.* بە هۆی تەقەی دەرگا، بۆ ماوەیەكی كورت، زەینی لەسەر باسەكە وەلاچوو.

٥٢٥٥/ 4627- **گێرانەوە (نەوار/ شریت) بۆ گوێ دانەوە بە**: دەمەوێ (شریتەكە بگێرمەوەو) گوێ بدەمەوە بە بەشێك لەو قسانەی بە پۆلیست گوتوون.

٥٢٥٦/ 7400- **گێرانەوەی شریتی فیلم ...)**: فیلمەكە كەمێك بگێرەوە، دەمەوێ هێندێك بەشی سەر لە نوێ چاو لێ بكەمەوە.

٥٢٥٧/ 5525- **گێرانەوە، هەڵكردنەوە (ی شریتی فیلم یان گۆرانی)**: تكایە، ئەم بەشە هەڵبژاردەیە بگێرەوە بۆ سەرەتاكەیو جا ئەوجار بە دەوری لەسەرەخۆ نیشانی دەوە.

/٥٢٥٨ 2771- گێڕانەوە بۆ دواوە، وەپاش خستن(ی سەعات): ئەمساڵ لە چ ڕۆژێکدا سەعاتەکان دەگێڕنەوە؟.

/٥٢٥٩ 5196- گێڕانەوە لە: هەوڵمان دەدا لە کارە ناپەسندەکانی بیگێڕینەوە، بەڵام نەمانتوانی.

/٥٢٦٠ 4885- گێڕانەوە سەر جێگای خۆ، بردنەوە سەر جێگای خۆ، لە جێگای خۆ دانانەوە: داعباکەم گرتەوەو بێ ئەوە کە هیچ مرقاوەمەتێك بکا لە نێو سندوقەکەی خۆیم نایەوە.

/٥٢٦١ 1552- گێڕانەوە لە، پێ تەرك کردن، دەست پێهەڵگرتن: ئەو مستەی کە دوێنێ شەوێ وەچاوی جۆ کەوتو رەشو شینی هەڵگێرا، دەبێ ئیدی خۆ دەکاری خەڵك هەڵگرتاندنی پێتەرك کا.

گێڕانەوە ← بردنەوە، وەرگرتنەوە، گەڕاندنەوە بۆ، ڕاگرتن.

/٥٢٦٢ 5698- گێرپاچ کردن: ئەگەر خۆت زەحمەت نەدەیەو مۆتۆڕەکەت گریسکاری نەکەی، هەڵبەت کە گێرپاچ دەکا.

گێرسانەوە ← ڕاوەستان.

گیرکردن ← تێهاڵاندن، گرێ خواردن، لە قورچەقێ تێگیرسان.

/٥٢٦٣ 3997- گیرکردن لە ...دا: وردە ئاسنێك لە مێشکیدا گیری کردبوو بە ئاوەندی جوولانەوەی سەدەمە گەیاندبوو.

/٥٢٦٤ 970- گێژەی شتێك بوون: ئینسان لە تافی تازە لاویدا، زووتر دەبێتە گێژەی خەونو خەیاڵان.

/٥٢٦٥ 4067- گێژەی ... بوون: زۆر زوو گێژەی خۆشییە تازە دۆزراوەکانی ئەم یارییە بووم. ● چیا گێژەی ریزەکارییەکانی مۆتۆڕە کارەبا تازەکە ببوو.

← تێکەڵاو بوون دەگەڵ کەسێك.

/٥٢٦٦ 2182- گێژەی کەسێك بوون: کاتێدا لاوەکە بۆ لێی ژنان قسەی کرد: هەموو بەشدارانی کۆبوونەوەکە گێژەی بوون.

← ئاشقی کەسێك بوون.

گەوگرفت بۆ پێك هێنان ← دوچاری دەردە سەرکردن، پێش پێ گرتن.

گیرە کردن (لەسەر) ← لەسەر ڕۆیشتن.

گیرە کردن دەگەڵ ← دەمەقاڵە کردن.

/٥٢٦٧ 3288- گیرە کردن لەسەر، پێداگرتن لەسەر، چەقە گرتن: ئاغای سمیت مەعامەلەیەکی زۆر باشی قبووڵ نەکردو ئێستا لە سەر تەواوی سەوداکە گیرەی دەکا.

/٥٢٦٨ 1083- گیرە لێدان، بەستن بە گیرە: تەختەیەکی نیشان دا کە سکرتێرەکە هەموو بەڵگە گرنگەکانی لەسەر دانابوونو گیرەی لێدابوون.

گێرەو کێشە بۆ خۆ ساز کردن ← خۆ تووشی دەردەسەرکردن.

/٥٢٦٩ 4279- گێژ بوون، سەرلێشێوان: پێم وایە یەکجار گێژ بووەو....

/٥٢٧٠ 5515- گێژو وێر کردن: ئەندامانی تیپی میوان بە چەشنێك لە گشت بارێکەوە کارامە بوون کە ئەندامانی خانەخۆییان گێژوویر کردبوو.

/٥٢٧١ 506- گێژوویژ بوون: کاتێك تەیارەکە دیواری دەنگی شکاند، فڕۆکەوانەکە (بۆ ماوەیەك) تەواو گێژ ببوو.

/٥٢٧٢ 397- گێل بوون، قێت بوون، گەو بوون: ئەگەر پێت وایە ئەمن قەت کارێکی ئەوتۆ دەکەم، دەبێ زۆر گەو بی.

/٥٢٧٣ 1190- گێلۆکە بوون، بێئەقڵ بوون: پێت وایە پیاوێکی زانایە، تەنیا لەبەر ئەوەکە چەند کتێبی دەستخەتی قەدیمی دەخوێنێتەوە. ئاخر چۆن دەتوانی زانایەکی گەورەبێ لە حاڵێکدا یەکجار بێ ئەقڵە؟

/٥٢٧٤ 4378- (وە) لابردن (کێوپەر): لە ناکامی مانۆڕدانەکانی لەسەر حیسابی ئەیارەکانی، لە پەر ئالفرێدیان لەسەر پۆستی شالیاری وەلابرد.

/٥٢٧٥ 5298- لابردن (ی کەسێك لەسەر کارێك)، لێخستن: ژێنەراڵ تیمرشینکۆیان بە بێدەنگی لێخستو ناردیان بۆ بەرەی شەڕ لە باکووری ڕۆژئاوا.

لابردن ← هەڵگرتن، خاوێن کردنەوە، دەرهێنان.

لات ← شەڕانی.

/٥٢٧٦ 6836- لاتاو پێدادان، تانەو توانج لێدان، تەمەڵێ لێدان: ڕەخنەگرانی دەستەڕاستی بە هۆی ئەوە کە لە سەرەتای ژیانی (سیاسی)دا ئەندامی حیزبێکی شۆڕشگێڕ بووە لاتاوانی پێدا دەدەن.

/٥٢٧٧ 2577- لاچوون، کشانەوە: ئەگەر لەسەر ئەو ڕێگایە لانەچی، زۆر وێدەچێ دووچەرخەیەك یان شتێکی دیکە وەبەرت دا.

← وەلابردن.

/٥٢٧٨ 2575- لاچوون لەبەرچاوی کەسێك: لەبەر چاوم لاچۆ، ئیسك گران! ئیدی هەرگیز نامەوێ چاوم پێت بکەوێتەوە.

/٥٢٧٩ 7301- لاچوون لەسەر، لادان لە (باسێك): مەهێڵە فکرت لەسەر خاڵی سەرەکیی باسەکە لابدا.

٥٣٨٠/ 1856- **لادان، وەلابردن:** دراوسێیەکی "کنجکـاو" پەردە تۆڕییەکەی لادا بۆ ئەوەی بزانێ لە دەرێ چ باسە.

٥٣٨١/ 4813- **لادان (بۆ کەنار جادە)، کشانەوە بۆ کەنار جادە:** بە دەنگی بەرز بە ڕانەندەی تراکتۆرەکەم گوت لادا بۆ کەنار جادە بۆ ئەوەی ئەمن تێپەڕم.

٥٣٨٢/ 7134- **لادان بۆ، چوونەناو (جادەیەکی فەرعییەوە):** نزیکەی مایلێك بە شەقامی "های" دا برۆ پێشەوە لەوێ بە دەستی چەپدا لادە بۆ جادەیەکی فەرعی.

٥٣٨٣/ 4351- **لادان لە، لەبەرچاو نەگرتن، لەژێر پێنان:** رادیـارە ئەو کابرایە بە وەژێر پێنانی ئەو ڕێسایانەی هەموو کەس قبوڵیانە کەیفی ساز دەبێ.

٥٣٨٤/ 6432- **لادان لە:** خەریکین لە مەسەلەکە لادەدەین، ئەویش ئەمەیە کە ماریا چ ڕێگایەك هەڵدەبژێرێ.

٥٣٨٥/ 1783- **لادان لە:** بۆ ماوەی شەش مـانگی دواتـر بە مەبەستەکەیەوە نووسـابوو؛ هیـچ کـەس و هیـچ شـتێك نەیتوانی لەو مەبەستە لایدا.

٥٣٨٦/ 1698- **لادان لە، دوورکەوتنەوە لە:** لـە خـەتی ئـەو نۆرێنەرایەتییەی کە خەڵك لە هەڵبژاردندا پێیاندابوین بە قەرا نووکی دەرزیێ لانادەین.

لادان (لـە) ← پـەردە لەسـەر... وەلانـان، فڕێـدان، وەدەرکەوتن (لە جادەیەك)، خۆ پاراستن لە.

لار بوونەوە ← لاسەنگ بوون.

٥٣٨٧/ 3612- **لاسایی کردنەوە، چاولێکەری کردن، ڕەقەبەری کردن لەگەڵ، بۆ وەك یەك هاتنەوە:** لەو کۆمەڵە پڕ لە چاولێکەرییەدا، زۆربەی زۆری خەڵکی پێیانوایە دەبێ لاسای دراوسێکانیان بکەنەوەو وەك ئەوان بێنەوە.

٥٣٨٨/ 4624- **لاسا کردنەوە (بە قسـان):** کـوڕی چکۆلـە پێیانخۆشە بە گەمە لاسـای سـەربازان بکەنـەوەو کچـی چکۆلەش لاسای نێرسان یان دایکان.

٥٣٨٩/ 3298- **لاسایی کردنەوە، لەسەر کەسێك دەرهێنان:** بریـا بـۆ ڕقەبەریکردن دەگەڵ برا گەورەکـەی لاسـای کردەوەکـانی ئەوی نەکردباوە.

← چاو لێکەریکردن، زارخوارکردنەوە لە.

٥٣٩٠/ 6704- **لاسای کەسێك کردنەوە، لەسەر کەسێك دەرهێنـان:** بیل یەکجار باش لاسـای وینسـتون چیرچیلی دەکردەوە.

٥٣٩١/ 6745- **لاسای کەسێك کردنەوە، وەك کەسێك (ڕەفتـار) کـردن:** مامۆستا تازەکە لاسـای هاوکارەکەی کردەوەو لـە جیـاتی ئەوە کە دەرسێکی تازە بڵێ لە قوتابییەکانی داوا کرد بە بێدەنگی بە دەرسەکانیاندا بچنەوە.

لاس دەگەڵ لێدان ← دەست پێگەرم کردنەوە.

٥٣٩٢/ 1622- **لاسە لاسە لەبەر کردن:** ژمارەیـەکی زۆر لـە خوازبێنیکەرانی داهـاتوو لەبـەر جوانـترین کچـان لاسـە لاسەیان دەکرد.

٥٣٩٣/ 6515- **لاسە لاسە کردن، خۆشیرین کردن لە بەرامبەر:** ئـەو شێوە لاسە لاسە کردنەی خەریم لە بەرامبەر گـەورەکاندا پێ تەحەمول ناکرێ.

← چاپلوسی کردن بۆ، زمانلووسی کردن بۆ.

٥٣٩٤/ 3240- **لاسەنگ بوون، بە لایەکدا خوار بوونەوە، لار بوونەوە:** بە هۆی بایەکی بە هێز کـە بـەرەو لای سـەرووی کاناڵەکە دەهات، بەلەمەکە لاسەنگ ببوو.

لانە بردن (ی کلاو) ← دانەکەندن.

لاولز بوون ← کز بوون.

لاراندنەوە ← دڵدانەوە، خۆش ویستن.

٥٣٩٥/ 5930- **لایەلایە بۆ کردن و نواندن:** هـەرکات منداڵەکـە نەدەحاوایەوە، لە باوەشی دەکرد و بە لایەلایە دەینواند.

لایەنگر بۆ پەیدا بوون یـان پـەیدا کـردن ← جێگـای خـۆ کردنەوە.

لایەنگر پەیدا کردن ← ڕەواج پەیدا کردن.

٥٣٩٦/ 5916- **لایەنگری کردن لە، پشتیوانی کردن لـە، پشتی لایەنێك گرتن:** لـە بەرامبـەر ڕێبـازی ڕەسمی و دامـەزراودا هەمیشە لە کەملسی پشتیوانی دەکا.

← پشتیوانی لە کەسێك کردن.

٥٣٩٧/ 3894- **لەتکەوە:** پۆشـشی کەکاری سەر کولیچەکانیان هەموو لستبۆوە.

٥٣٩٨/ 5272- **لغاو یان هەوسار کێشان لە .... ڕاگرتن:** کـوڕە پێشەنگەکە ئەسپەکەی ڕاگـرت، دابـەزی و بـە غـار پەیامەکەی بۆ هێنایین.

٥٣٩٩/ 4348- **لوتف کردن، چاکەیەك دەگەڵ کردن و ...:** "داخـوا دەکرێ لوتف بکەی و بۆ کڕینی کونتۆرێکی گازی ٥ پۆندم دەیەی؟". ● لێم پرسـی: "داخـوا دەتوانـێ چاکەیـەکمان دەگەڵ بکەی و هەتا نزیکترین گاراژ سوارمان کەی"؟

← زگ بە کەسێك سووتان.

لۆتکە ← بەلەم.

٥٤٠٠/ 5451- **لۆتکەیەکی گەورە یان قەپیالەیەك کە بە سیم یان بە گوریسان لە نێوان دوو لێواری چۆمێکی گەورەدا هاتووچوو دەکاو ئەتۆمۆبێل و لۆرییان بە بارەوە دەپەڕێنێتەوە.**

٥٤٠١/ 197- **لووفە کردن (زۆر بە توندی)، سەرکۆنە کردن:** ڕقەبەری پاڵەوانەتیی سەنگین وەزن، بە هۆی ئەوە کە لـە نێـو قـەد بەرەو خوار مستی وەشاندبوو، بە توندی سـەرکۆنە کرا.

٥٤٠٢/ 5321- **لۆمە کردن، سەرزەنشت کردن، رەخنە لێگرتن:** خەڵکی باشوور (لە لایەن باکوورییەکانەوە) بە هۆی سستی و بێحاڵییەکی کە لەباری ئەخلاقییەوە هەیانە لۆمە دەکرێن.

٥٤٠٣/ 5319- **لۆمە کردن، سەرزەنشت کردن، سەرکۆنە کردن:** ئەتۆ کارێکت نەکردووە کە لۆمەی خۆت بکەی/ خۆت سەرکۆنە کەی.

٥٤٠٤/ 771- **لۆمە کردن، سەرکۆنە کردن:** لەبەر ئەوەکە نەهاتبوو بۆ مەرمارەسە، سەرپەرشتی پێشبڕکێکان بە توندی سەرکۆنەی کرد.

٥٤٠٥/ 2516- **لۆمە کردن، رەخنە گرتن:** ئەو ملهوڕە ماوەیەکە زۆرەملی دەکا. کاتی ئەوە هاتووە کەسێك لۆمەی بکا.

٥٤٠٦/ 6114- **لۆمە کردن، رەخنە لێگرتن، سەرزەنشت کردن، سەرکۆنە کردن، بەسەر راژەنین:** هاتری، کەمێك بەسەر ئەو منداڵانە بڕۆ، گوێ نادەنە هیچ قسەیەکی من.
← سەرکۆنە کردن.

لووت لێبادان ← کەپۆ لێهەڵقرچاندن.

٥٤٠٧/ 6587- **لوور بوون بۆ، پەلامار، هێرش کردنە سەر:** ژمارەیەك کاراگا/ پۆلیس هێرشیان کردە سەر گازینۆیەکی قومار/ قومارخانەیەك و چەند کەسێکیان گرت.
← خۆ پێدادان.

لووردان ← هەڵاوردن، خواردن.

لووس کردن ← سرواندن.

٥٤٠٨/ 5441- **لوولە کردن، پێچانەوە، خڕکردنەوە:** ئەو ماشینە میچێکی نەرمی هەیە کە دەتوانی لە هەوای خۆشدا خری کەیەوە.

٥٤٠٩/ 5454- **لوولە کردن:** رەسمەکانیان لە چوارچێوەکانیان دەرهێنا و بۆ ئەوەی هەڵیانگرن لوولیان کردن.

لە ئاشی کردن ← ورد کردن.

٥٤١٠/ 2930- **لە ئاو هاتنەدەر، وەرگێران، دەرچوون:** وتووێژی جان دەگەڵ رامەزراوی ئافرەتان چۆن دەرچوو؟
← هەڵدان.

٥٤١١/ 6094- **لە ناوی سەوزو/سەرکەوتوو/ سۆزدا دانانەوە:** هەرشتێکی دەیەوا دە سۆزی تەماتەدا دایدەنێتەوە.

٥٤١٢/ 2462- **لە ئەرزیان، خستن، هێنانە خوار:** چەند کەس لە نێرسەکان کابرای مەزاحیمیان گرتو لە ئەرزیان دا. جا ئەوجار سێ کەسیان لەسەری دانیشتن و ئەوانی دیکەش چوون پۆلیس ئاگادار کەن.

٥٤١٣/ 3661- **لە ئەرزیدان، خستن، بەرداڵەوە، ئاك داون کردن:** تەنیا یەك دوو بۆکسەر توانیویانە محمدعلی کلیی ناکداون بکەن.
← خواردن و کەوتن.

٥٤١٤/ 5330- **لە ئیختیاری ... دابوون:** بەرزترین سەلاحییەتی قەزایی لە ئیختیاری دیوانی داوەریی بەرزی وڵات دایە.
← هەبوون.

٥٤١٥/ 3853- **لەبار بوون بۆ، ئالین بۆ، مونامسب بوون بۆ:** ئەو ژێرخانانە بۆ دروست کردنی کارگەو ئەمبار دەناڵن.
← هاتنەوە دەگەڵ.

لەبار کردن بۆ ← دەست تێوەردان.

٥٤١٦/ 5233- **لە بەرتە دەرهێنان، گرێنەوە:** تەنیا دەستە لیباسەکەی بۆ بەشداریکردن لە زەماوەندا لە گرێو دەرهێناوە.

٥٤١٧/ 2865- **لە باسێکەوە بە خێرایی چوونە سەر باسێکی دیکە، لە قسەیەکەوە چوونە سەر قسەیەکی دیکە:** خەریك بووین باسی نرخی پەتاتەمان دەکرد کە لە پڕا جان باسی ئەوەی هێنایە گۆڕێ کە لە ئینگلیستان شەراب دروست کردن دەستی پێ کردۆتەوە.

٥٤١٨/ 3960- **لە باشترین ئیمکاناتی ژیان بەهرەمەند بوون:** کۆمەڵێ هەزاری خەڵك لە برسان دەمردن، لە حاڵێکدا ژمارەیەکی زۆر کەم لە باشترین ئیمکاناتی ژیان بەهرەمەند بوون.

٥٤١٩/ 2913- **لە باو کەوتن، باو نەمان:** ئەخلاقی باش باوی نەماوە. ئێستا بێبەندوباری جێگای هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

٥٤٢٠/ 2015- **لەباوەش گرتن، پەل کردن:** کاتێك منداڵە فڕێدراوەکەی لە بەردەرگای ماڵی خۆیان چاو پێکەوت هەڵی گرتەوەو دەباوەشی گرت.
← داپۆشین.

٥٤٢١/ 1169- **لە بنەماڵەیەکی ... بوون:** ئەو لە بنەماڵەیەکی زۆر رەسەنە/ لە بنەماڵەیەکی نەجیبدا هاتۆتە سەردنیایە.

٥٤٢٢/ 5867- **لە بنی گوولەکەدان، لەقاودان:** هیواداربووین میوانییەکەمان نهێنی بێنێتەوە. مەبەستمان ئەوە بوو کە ماری غافلگیر کەین. چ شتێك هانی دای کە بڕۆی و لە قاوی دەی؟
← گەیشتن بە ئەسڵی مەسەلە.

٥٤٢٣/ 450- **لە بەرپرسیاریەتی ... دابـوون، پەیوەنـدی بـە ... هەبوون:** پەیدا کردنی کەسێك کە پرۆژەی لـێ‌قەرز کـەی، (شتێکە) پێوەندی بە خۆتەوە هەیە.

٥٤٢٤/ 4071- **لەبەر چاوان ونبوون، ونکردن:** لە نێو مێشـەیەکی چڕوپڕ، کە نێو مایل لێمان دوور بـوو، دوژمنمـان لەبـەر چاوی ونبوو.

← داپۆشین.

٥٤٢٥/ 6134- **(خێرا) لەبـەر چاوان ونبـوون:** ئێمـەیان بـۆ سـەر مـێزێك لـە نێوەراسـتی رێسـتورانەکە رێنوێنـی کـردو، بالتۆو کڵاوەکانمان خـێرا لەبـەرچاوان ونبـوون (زوو بۆیـان هەڵگرتین).

٥٤٢٦/ 1744- **لەبـەرچاوان ونبـوون، دیـار نـەبوون:** کـاتێك لــە پێچەکە وەرسووڕاینەوە، دیتمان کە لۆرییەکە دیار نیە.

٥٤٢٧/ 7239- **لەبەرچاوان ون بوون:** کـابرای ئەسـپ سـوار لـە پشت دارستانێکی لەبەر چاوان ونبوو.

٥٤٢٨/ 4003- **لەبەرچاو بـوون (ی رابـردوو):** دەتوانـی لــەو گەرەکە خانووبەرەیەکی چەند قـات پـەیدا کـەی. دیـارە، ئەمن کە ئەوە دەڵێم پێنج ساڵ لەمەوپێشم لەبەرچاوە.

٥٤٢٩/ 301- **لەبـەرچاوان ونبـوون، دیـار بـوون:** لەسـەر کرێستانەکان را تەواوی ناوچەکە بە جوانی دیار بوو.

← (هەمیشە) لە بیر بوون.

٥٤٣٠/ 4969- **لەبەرچاو خستن:** رەفتـاری نالـەباری گرووپـانی مەیدانی مەشق، ئەرتەشـی بـۆ هەتاهەتایـە لەبـەرچاوی خستم.

٥٤٣١/ 2856- **لەبەرچاو کەوتن:** وادیارە منداڵەکانیان بۆ چای بەیانان گوڵەدانیان لەبەرچاو کەوتووە.

٥٤٣٢/ 328- **لەبەرچاو کەوتن:** لەو کاتەوە بیستوومە سـیغار کێشـان دەگـەڵ شـێرپەنجەی سـیپەلاك پێوەنـدی هەیـە، سیغارم لەبەر چاو کەوتووە.

٥٤٣٣/ 2121- **لەبەرچاو کەوتن:** خەلر لەبەرچاوی رێبەرایـەتیی حیزب کەوتووە./رێبەرایەتیی حیزب خـەلری لەبـەر چـاوی کەوتووە.

لەبەرچاو کەوتن ← رێزی خـۆ لـە دەسـتدان، هاتنـە نێـو لیستەی رەشی کەسێکەوە، بێزار بوون.

٥٤٣٤/ 350- **(احتیـاط) لەبـەرچاو گرتـن، لەبـەر/ بـۆ خاتری "احتیاط":** چـارێکی لـە سـەعاتەکەی کـردو گوتـی لەبەر "احتیاط"، باشترە بڕۆین.

٥٤٣٥/ 4110- **لەبەرچاو گرتن:** لە کۆڕی داوەرانیان داوا کـرد کە تەمەنی تاوانبارەکە لەبەرچاو بگرن.

٥٤٣٦/ 71- **لەبەرچاو گرتـن:** لـە بیوتـان ئـەچن کـاتێك ئـەو قوماشە/ پارچە یە دەدروون کەمێك بۆ (شۆرانی) کـورت بوونەوەی/ تێکچوونی لەبەر چاو بگرن.

٥٤٣٧/ 4500- **لەبەرچاوگرتن، بایەخ پێدان:** زۆر بە قازانج دەبـێ ئەگەر بێتوو حیزبی پارێزگـاران بـایەخێکی زۆرتـر بـدا بـە دەنگی توێژەکەی لاو.

٥٤٣٨/ 6668- **لەبەرچاو گرتن، حیساب کردن:** سێهەمین هـۆ کـە بۆچی جیا بە هەڵە چوو ئەوە بوو کە هێندێك شـتی وردی دیکەی لەبەرچاو نەگرتبوو.

لەبەرچاو گرتن ← پەیرەوی کردن لە، گرێدان بە، پێبەسـتد بـوون بـە، دەگـەڵ خسـتن، وەك یـەك بـوون، یادداشـت هەڵگرتن لە.

٥٤٣٩/ 3264- **لەبەرچاو گرتنی/ حیساب کردنی شـتێك بـە کەسـێك:** ئەوە کە سێ ساڵ زیندانی بووە بـە زیـانی ئـەو لەبـەرچاو ناگرم.

٥٤٤٠/ 2037- **لەبـەرچاوگیران، هاتنـە نێـو، پێشبینـی کـردن:** ئیمکانی هێرشی هەوایی لە لای رۆژئاوا لە لایەن سـتادی ئەرتەشەوە لەبەرچاو گیرابوو.

← لەبەرچاوم لاچۆ، برۆ.

٥٤٤١/ 769- **لەبەرچاو نـەگرتن، وەلانـان:** بـۆ کـارکردن دەگـەڵ خـەلکی بێگانـە ناچـار بوویـن خـۆ رابێنـینەو، زۆر پێوروانگەی خۆمان لەبەرچاو نەگرین/ وەلانێین.

٥٤٤٢/ 5217- **لەبەرچاو نەگرتن، حساب لەسـەر نـەکردن:** وا دیـار بوو کە بەرێوەبەرانی گاردون پارتییەکە حیسـابی توفـانەو هەورە بریـسکەیەکی کتوپڕیان نەکردبوو.

٥٤٤٣/ 3820- **لەبەرچاو نـەگرتن، وەلانـان، حیسـاب نـەکردن، خۆ لـێ لادان، بەسـەردا بـازدان، چاوپۆشـی کـردن لــە:** ئەگـەر لــە مەسـەلەی خەرجەکەی چاوپۆشی بکەین، ناچـار دەبـێ لـە کارەکانی دیکەمان وەختی بێکاری پەیدا کەین. ● نـازانم ئەتۆ چۆن لە کەمتەرخەمیی ئـەو کابرایـە لـە بەرامبـەر بنەماڵەکەیدا چاوپۆشی دەکەی.

٥٤٤٤/ 2789- **لەبـەرچاو نـەگرتن، لەوبنەماڵـەوە سـەیر، خۆ تێنەگەیاندن:** تەنانەت کاتێك کـە بنەماڵـەی خـۆم خۆیـان تێنەدەگەیاندم، خۆشنار زۆر بە فیزەوە وەریگرتم.

لەبـەرچاو نـەگرتن ← حیسـاب نـەکردن لەسـەر، بەسەردابازدان، چاوپۆشی لێکردن، پێشـگیری کـردن لـە، لادان لە.

٥٤٤٥/ 3533- **لەبـەرچاو ون نـەکردن:** دەریانـەوەردێکی بـاش نەبوو، بۆیە هەرکات لە بەندەرێك بـۆ بـەندەرێکی دیکـە دەچوو، قەراخ دەریای لە بەرچاو ون نەدەکرد.

لەبەرچاوی کەسێك لاچوون ← لاچوون لەبەرچاوی کەسێك.

٥٤٤٦/ 5975- **لەبەرپەیدان، وسکوت کردن:** هەرکەس بۆ یەوەی لە لای ئەو پیرەمێردە (باوکم) بە بێ ئۆبە قسە بکا، وسکوت دەکرێ.

٥٤٤٧/ 4940- **لەبەرەم دان:** هەر خوێندکارێکی ساڵی سێهەمی زانستگە بیویستبا بە هی لە خۆی سەروتر دەستوور بدا، لەبەر دەمیان دەدا.

٥٤٤٨/ 297- **(شتێك) لەبەر دەستی کەسێك دابوون (زیاتر بە شێوەی کاڵی):** نازانم ئەو بەڵگە ونبووانە چۆن کەوتنە بەردەستی ئەو.

٥٤٤٩/ 4152- **لەبەرکردن، بە مێشك لەسپاردن:** ئەو عیبارەتەم بەتایبەتی لەبەر کرد. ● ئەمە ئوکتەیەکە کە دەبێ هەمیشە بە مێشکتی بسپێری.

٥٤٥٠/ 3817- **لەبەرکردن، بە مێشك لەسپاردن:** ئەو وشانە لەبەر کەن. ● دەتوانن ئەخشی خۆتان هەتا پێش کۆتایی ئەم حەوتووە لەبەرکەن؟

٥٤٥١/ 4314- **لەبەر کردن، بە مێشك لەسپاردن:** ئەوەی کە کابرای داوتوڵەب توانی بیهێنێتە گۆڕێ/ نیشانی بدا چەند فاکتێك بوون کە پێش تاقیکاری لە بەری کردبوون.
← ئامادە کردن، داکەندن.

لەبەرهەستان ← هەستانەسەرپێ.

لە بەرەی خۆ زیاتر پێڕاکێشان ← سنووری دەسەڵاتی خۆ بەزاندن.

لەبەریەك رانان ← بەراورد کردن دەگەڵ.

٥٤٥٢/ 2102- **لەبەریەك هەڵتەکان، تێکڕووخان، لە گرێژە ئەچوون:** زۆر زوو ئەو ژیانە ناواهو بچکۆلانەی کە بۆ خۆی پێك هێنابوو لەبەر یەك هەڵتەکا.

٥٤٥٣/ 2104- **لەبەریەك هەڵتەکان، لە ئرێژەنە چوون، تێك ئەچوون، لە کارکەوتن:** نازانم خەر چلۆن ئەو ماوە دوورو درێژە ماشێنەکەی راگرتبوو. بەڵام سەرەنجام بە کردەوە لەسەر جادەی لەکار کەوت.
← شکان، تێك شکان.

٥٤٥٤/ 6608- **لەبەریەك هەڵوەشانن:** چیا کرنتۆری بەنزینی لەبەریەك هەڵوەشاندبوو ئامرازەکانی لە سەر فەرشان بڵاو کردبووە.

٥٤٥٥/ 6767- **لەبەریەك هەڵوەشانن:** تەسجیلەکەی لەبەریەك هەڵوەشاندوە. ئێستا پرسیار ئەوەیە: داخوا دەتوانێ دروستی کاتەوە؟

← شکاندن.

٥٤٥٦/ 2088- **لەبەین بردن، پاك کردنەوە، فەوتاندنەوە:** تێپەربوونی رۆژگار بیرەوەریی گشت رووداوە سامناکەکانی لە مێشکی پاك کردبۆوە (= لەبیر بردبووە).

٥٤٥٧/ 4264- **لە بەین چوون، تەواو بوون، مەحو بوونەوە:** هەرکە رۆژهەڵات، مژەکە تەواو بوو. ● کاتێك دەستی بە قسان کرد دردۆنگێکەی تەواو بوو.
← پاك یان خاوێن کردنەوە، کاڵ بوونەوە، لێبوونەوە.

٥٤٥٨/ 3527- **لە بێخەبەریدا راگرتن/ هێشتنەوە:** لە سەدەکانی ئێوەندیدا، سیاسەتی کلیسا ئەوە بوو کە خەڵك لە بێخەبەریدا راگرێ. دەرس خوێندن بۆ وەزعییەتی جێگر بوونی کلیسا مەترسییەکی گەورە بوو. ● ناکرێ منداڵەکان بۆ هەتاهەتایە سەبارەت بە راستییەکانی ژیان لە بێخەبەریدا راگرن.

٥٤٥٩/ 5002- **لە بیربردنەوە، فەرامۆش کردن، وەلانان:** وەرن با ترسان لە یەکتر، کە لە رابردوودا بیبوو بە هۆی دوور کەوتنەوە لە یەکتر، فەرامۆش کەین.

٥٤٦٠/ 4895- **لەبیربردنەوە (چوونەوە):** ناکامی تاقیکارییەکەی ئۆزناخی "ئو"ی یەکجار دڵساردی کردبۆوە بوو، بەڵام ئێستا هەموو شتێکی لەبیر چۆتەوە.

٥٤٦١/ 934- **(هەمیشە) لە بیربوون، هەمیشە لەبەرچاو بوون:** دەمو چاوی ئەشکەنجەکراوی ئەو منداڵە هەمیشە لەبەرچاوم دەبێ.

٥٤٦٢/ 3529- **لەبیربوون، لەبیرنەکردن، فەرامۆش نەکردن:** دەبێ لەبیرمان نەچێ کە چلۆن رووداوێکی نالەباری چکۆلە - چکۆلە لەباری ئەستێرەناسییەوە- دەتوانێ ئێمە بە تەواوی لە بەین بەرێ. ● ئەگەر هاتوو لە شوێکەتەکەتان جێگایەك خالی بوو، کورەکەمت لەبیرنەچێ. باش؟

٥٤٦٣/ 4274- **لەبیر چوون، لەقەڵەم کەوتن:** بە هۆی کەمتەرخەمی، ناوی لە لیستی میوانەکاندا لە قەڵەم کەوتبوو.
← دەرهاوێشتن.

٥٤٦٤/ 2341- **لەبیرچوونەوە، لە بیرکردن، فەرامۆش کردن:** کاتێك لە دەرسی فیزیك یارمەتی کورەکەی خۆی دەدا، زۆر لەو شتانەی کە لە مێژ بوو فەرامۆشی کردبوون وەبیری دەهاتنەوە.

٥٤٦٥/ 4072- **لەبیر چوونەوە، فەرامۆش کردن:** هۆی سازبوونی شەر لە نێوانیان زۆر زوو لەبیر چۆوە.

٥٤٦٦/ 3949- لەبیر چوونەوە یان بردنەوە: هەرگیز نەتوانین هومێدوار بین کە ئەو کەموکوورییانە لە بیر بچنەوە.
← وەدواکەوتن.
٥٤٦٧/ 2576- لەبیر خۆ بردنەوە، وەلانان، فەرامۆش کردن: "پێت وایە بتەوێ بۆ ژیان بگەڕێیەوە بۆ ئینگلستان؟"، "فکرێکی وام نیە. ئەو فکرەم بە تەواوی لەبیر خۆ بردۆتەوە/وەلاناوە."
٥٤٦٨/ 2916- لەبیرکردن، لەبیر چوونەوە، لەبیرنەبوون: بەداخەوە کە لە بیرم نەبوو بێمە کۆبوونەوە. بەراستی دەمەویست بەڵام هەر لەبیرم چووبۆوە.
٥٤٦٩/ 6559- لەبیرکردن، لەبەرچاو نەگرتن: وەها سەرگەرمی نەخشەکانی خۆی بوو کە تەنانەت شلەیر گرمانی ژیرانەشی لەبەرچاو نەدەگرت.
٥٤٧٠/ 5203- لەبیرمان، وەبیرهاتنەوە: پاش ئەو هەموو ساڵانە، زۆر زەحمەتە بتوانم ناوەکانیانم وەبیر بێتەوە.
٥٤٧١/ 6365- لەبیرمان (بە روونی): چەند برگەیەك لەو شانۆیەدا هەن کە دوای بیست ساڵ لە بەرێوەچوونی، هێشتاش بە روونی لە بیرم ماون.
← وەبیرهاتنەوە.
٥٤٧٢/ 466- لەبیر نەکردن، لەبیر بوون: نوێنەرانی مەجلیسی هان دەدا ئەو ئیهانەتانە لە بیرنەکەن کە هێندێك لە لاوەکان پێیان دەکردن.
٥٤٧٣/ 1609- لە پاش خۆ بەجێهێشتن: مرۆسا پیرە هەتا خودا حەز دەکا چرووکە، بۆیە ئەگەر یەك میلیۆن پۆندی لەپاش بەجێبێنێ، پێم سەیر نابێ.
٥٤٧٤/ 609- لە پاشەکەوت خواردن: تاقمی گەمارۆ/ ئابلۆقەدراو دەستیان کرد بە خواردنی پاشەکەوتی ئاوو خواردەمەنی.
٥٤٧٥/ 6193- لە پاڵ یەکتردانان یان دانیشتن، لەباخنین: ئێمە کە چوار کەس بووین لەسەر یەك جێگا لە پاڵ یەکیان ناخنیبووین.
٥٤٧٦/ 391- لە پڕ پەیدا بوون، قوت بوونەوە، لە پڕ دەربڕین: هاتنەوەکەی زۆر جێگای خۆشحاڵی بوو، چونکە کتوپڕ لە نەکاو بوو.
٥٤٧٧/ 4511- لە پڕ دەرکەوتن، هەڵتەدەر: لە پڕ تاو لە پشت هەوران وەدەرکەوت.
٥٤٧٨/ 757- لە پشت پشتەوە هاتن: بە فاسیلەیەکی کەم پێتۆیەك دەهات و ماشینێکی بینزی سوورەمەیی لە پشت پشتەوە دەهات.
٥٤٧٩/ 6204- لە پشتەوە را خەنجەر لێدان: وەزیری دیفاع لەوە سکاڵای دەکرد کە سەرۆکی ستادی ئەرتەش لە پشتەوە خەنجەری لێداوە.
لە پشتی یەکتر رالومستان ← یەکگرتن.
٥٤٨٠/ 1354- لە پلەیەکی خوارتر دابوون، لۆمەتر بوون، لەفۆڵ کەسێك دانەکاندن، بە کەمتری کەسێك دانەپیشاندن: خالی وایت لە بەراورد دەگەڵ مێردەکەی لە پلەیەکی زۆر خوارتر دایە، بەو حاڵەش گۆمانێك لەوە دانیە کە کامیان کوێخای ماڵێن • هێندێك کەس پێیان وایە کە ویلیام... لەباری شاعیرییەوە تۆزی بروانینگ ناشکێنن.
٥٤٨١/ 423- لە پێش بوون، وەپێش کەوتنەوە: ئەگەر باسێك هاتە پێش، لایەنی کەسێك بگرن کە (ئەوانی دیکە) وەپێش دەکەون.
٥٤٨٢/ 3896- لە پێش بوون، تووش بوون، لەسەر رێگا بوون: بەری لە نەخۆشێکی دەکردەوە کە بۆی هەبوو تووشی بێ.
← گرنگتر بوون.
٥٤٨٣/ 234- لە پێش تر بوون لە: پالم پێوە مەنێ. ئەمن لە سەرەدا لە پێش تۆم. • لە بووت ئەچێ لە نۆبەی ئەو رۆژنامەیەدا من لە پێشترم.
٥٤٨٤/ 4241- لە پێشدا دیاری کردن: ئەو گولە جەرگەی سەرۆکی ئیدارەیە. پیاو دەتوانێ هەر ئێستا بڵێ کە چۆنە سەری پلەو پایەی پێشەکی دیاری کراوە.
٥٤٨٥/ 2870- لە پێشدا رۆیشتن، لە پێشەوە درێژە بە رۆیشتن دان: ئاغای هوود گوتی ناچارە زووتر/ لە پێشدا بروا، چونکە لە سەعاتی ١١ کۆبوونەوەی هەبوو. ئەوانی دیکە دەیانتوانی پەلەی نەکەن و دوایە برۆن.
٥٤٨٦/ 6289- لە پێشدا، پێش هەموو شتێك، بەر لە هەموو شتێك: زۆر باشە، پێش هەموو شتێك دەبێ ئەم خەیاڵە لە مێشکی خۆتان دەرباوێن کە دەتوانن لە رێگای دەرس گوتنەوە پارە پەیدا کەن.
٥٤٨٧/ 5710- لە پێشدا ناردن، بەرێ کردن لە پێشدا: زرێپۆشەکانیان لە پێش بەشی سەرەکیی لەشکرەکە بەرێکرد بۆئەوەی جموجۆڵی سەربازەکانی دوژمن شناسایی بکەن.
٥٤٨٨/ 2754- لە پێشەوە رۆیشتن: لە حاڵێکدا بەشی زۆری هێزەکە لە دۆڵێکدا خۆیان حەشار دابوو، چەند کەس لە پیاوانی هەڵبژاردە لە پێشەوە دەرۆیشتن.
٥٤٨٩/ 7283- لە پێ خستن، شەکەتکردن، رەحەت لێبڕین، ماندووکردن، تاقەت لێبڕین، بڕست لێبڕین: لێم گەڕێن کەمێك دانیشم-منداڵەکان بە رێگا رۆیشتن بڕستیان لێبڕیوم.

← ماندوو کردن.
لەبن‌کردن ← داکەندن.
٥٤٩٠/ 4517- **لە پێکەوتن، لە لاق کەوتن، ڕەجل لێبوان:** لە ناخری مەسیری پێشبڕکێی هەڵاتندا، چەند کەس لە دەوەندەکان لە لاق کەوتن.
٥٤٩١/ 600- **لە پێکەوتن، لە لاق کەوتن:** سەلامەتیی خۆی لە دەست دابوو، ئەگەر گوشار/ فشاری ڕووحیی‌یەکەی درێژەی کێشابا، بە یەکجاری لە لاق دەکەوت.
← ماندوو بوون.
لە تاریکی‌دا ڕاگرتن ← بێ‌خەبەر ڕاگرتن (= هێشتنەوە)
٥٤٩٢/ 1662- **لە تا قەیەك جیا بوونەوە و چوونە لای تەنافەیکی تر:** بە هەواڵی ناخۆشیی جیابوونەوەی دوو کەس لە نوێنەرەکانو چوونە پاڵ لایەنەکەی دیکە، ساڵی تازەمان دەستی پێ کرد.
٥٤٩٣/ 4819- **لەت بە لەت کردن، هەڵدڕ هەڵدڕ کردن:** بەبر لە لە ماوەی چەند دەقیقاندا کەڵە کێتروویەکی هەڵدڕ هەڵدڕ دەکا.
← ورد کردن.
٥٤٩٤/ 3698- **لە ترسان لەبەر لەرزە گرتن، وەك مێژڵکە لەرزین:** کاتێك چوومە نێو هۆدەی سەرۆکی نیدارە لە ترسان وەك مێژۆکەی دەلەرزیم. (لە بەرخۆمەوە دەمگوت) داخوا لەوە ئاگادار بووە کە نامەکانم لە پاکەتی عەوەزی ناومیان نا؟
٥٤٩٥/ 5538- **لە ترسی گیانی خۆ هەڵاتن:** کاتێك بوومەلەرزەیەك ناوەندی شاری لەرزاندەوە، کارمەندانی نیداران لە ترسی گیانی خۆیان هەڵاتن.
لەت کردن ← دراندن (لە نێوەراستی‌ڕا).
٥٤٩٦/ 628- **لەتلەت بوون، پارچە پارچە بوون، لێك بڵاو بوون، لێك هەڵوەشان:** کەشتی‌یەکە کەوتە نێو گژەبای باشووری ڕۆژهەڵاتەوە، وشاخی بن دەریا کەوتو لێك بڵاو بوو.
٥٤٩٧/ 936- **لەتلەت کردن، لەجزیە کردن:** هێزە سەرکەوتووەکان وڵاتە شکست‌خواردووەکەیان بێ‌بەزەییانە لەتلەت کردو هەر یەکەی بەشێکی بەرامبەر بەوانی دیکەی هەڵگرت.
٥٤٩٨/ 5615- **لەتلەت کردن بە مشار:** هەموو تەختە زیادی‌یەکانیان بە مشاری بۆ سۆبەی/ کوورەی ورد کرد.
٥٤٩٩/ 5987- **لەتلەت کردن، قاش قاش کردن:** نانە درێژەکانیان بۆ دروست کردنی ساندویچ لەتلەت کرد.

٥٥٠٠/ 5411- **لەت (بە) لەت کردن، دڕاندن، دڕ بە دڕ کردن، قەیچە بوون:** بۆ خاتری خودا، وتارەکەم لەو توڵە سەگانە بستێنەوە پێش ئەوەی دڕبەدڕی کەن. ● سیم‌کێشیی کاربای ماڵەکەمان دەبێ بگۆڕی. دەشتوانم بڵێم بەو کارە وەزعی ماڵەکەمان بە تەواوی شپرزە دەبێ.
← برین.
٥٥٠١/ 1577- **لەتوکوت کردن، برین:** کاتێك کچە چکۆلە دەستی برد کێکی ڕۆژی لەدایك بوونی ببڕێ، هەموو تێکرا هوورایان کێشاو لە چەپڵەیان دا.
٥٥٠٢/ 255- **لە تەحەممولی ... دەرچوون:** ڕەفتارەکەی دەگەڵ دایکی تەحەممول ناکرێ.
٥٥٠٣/ 318- **لە تەماسدابوون (و بە تێلێفۆن و بە نامە):** ئاخرین جار کەنگێ دەگەڵ دایلەو باوکی خێزانت لە تەماس دابووی/ تەماست گرت؟
← پێوەندی هەبوون دەگەڵ.
لە تەمەنی ... دابوون ← درەنگ بوون.
٥٥٠٤/ 9- **لە تەنیشت ... بوون:** ماڵی مەتران لە تەنیشت دیواری سەدەکانی نێوەڕاستیی شارە.
٥٥٠٥/ 6199- **لە تەنیشت یەکتر پەستاوتن:** لە گزشەیەك لە مەیدانەکە سەدان کەسیان لە تەنیشت یەکتر پەستاوتبوو.
٥٥٠٦/ 6459- **لە تەنیشت یەکتر دانانی چەند وشە و قسەیەك لێ‌سازکردن:** ئەوەی کە لە دەستی دەهات ئەمە بوو کە چەند وشەیەکی فەرانسەیی لە تەنیشت یەك دانێ‌و قسەیەکیان لێ‌سازکا.
٥٥٠٧/ 2633- **لە تەنیشت کەسێك ڕاوەستان، دانیشتن، هەڵتروشکان:** منداڵەکە لە تەنیشت ڕادیاتۆرەکە هەڵتروشکابوو بۆ ئەوەی گەرمی بێتەوە.
٥٥٠٨/ 3247- **لە جموجۆڵ خستن، دەگیر خستن، گەمارۆ دان:** کابرا، هەروەك حەیوانێك کە کەوتبێتە گەمارۆی ئاگرەوە ناهومێدانەو بە وەحشەتەوە چاوی لە دەوروبەری خۆی دەکرد.
٥٥٠٩/ 6995- **لە جموجۆڵی ... کەم کردنەوە:** ئەو پارتیزانانەی لە کوردستان را چالاکی‌یەکانی خۆیان بەڕێوە دەبەن، دەتوانن لە جموجۆڵی سێ لەشکران کەم کەنەوە/ جموجۆڵی سێ لەشکران بەرتەسك کەنەوە.
لە جەرەیانی شتێك دابوون ← ئاگادار بوون لە.
٥٥١٠/ 1683- **لە جیاتی کەسێك کارکردن:** لە ماوەی سەفەری دەرەوەمدا ئاغای جۆنز لە جیاتی من کار دەکا.

٠٠١١/ 6343- **لە جیاتی کەسێك کارکردن، جێگای کەسێك (بە شێوەی کاتی) گرتنەوە، بوون بە جێنشین:** کاترین بە دڵێکی زۆر ناواڵەوە جێگای کابرای گرتەوە.

٠٠١١/ 6242- **لە جیاتی هونەرپیشەی ئەسڵی یاری کردن:** لە ماوەی بە ماشێن رەپێنانەکەی کۆتایی فیلمەکە، پیاوێك (ی بەکرێگیراوی دیکە) لە جیاتی هونەرپیشە ئەسڵییەکە بازی دەکا.

٠٠١٢/ 5023- **لە جێ چوون:** لە پلیکانان کەوتە خوارو پشتی لەجێ چوو.

٠٠١٤/ 5308- **لە جێگادانان:** ماشێنی ئاخرین مودێلی پارچە بافی/ قوماش چنین کە لە ئەمریکا هێناویانن لە جێگای ماشێنە کۆنەکانیان داناون.

٠٠١٥/ 3907- **لە جێگا نەهاتنەدەر، درەنگ لە خەو هەستان:** ئیجازەیان دابووین درەنگ لە خەو هەستین، بەڵام ئەمن بۆ نانو چای بەیانی هەستام.

٠٠١٦/ 335- **(هەر) لە جێگای خۆ بوون:** خەتەری بەستران/ داخران(ی کارخانە) هەروا لە جێگای خۆیەتی، بەڵام رێبەرانی یەکیەتیی (کرێکاران) تێدەکۆشن پێشی مانگرتن بگرن.

٠٠١٧/ 489- **لە جێگای خۆ چەقین (=جێگیر بوون):** پاش هاوێشتنی چەند گوللە بۆ تاقیکاری، تۆپەکان لە جێگای خۆیان بە باشی جێگیر بوون/چەقینو جا ئەوجار زۆر بەباشی تۆپهەندازییان دەست پێکرد.

٠٠١٨/ 6307- **لە جێگای خۆ مانەوە، لە سەر دەرەجەی خۆ راوەستان:** خەفەکونەکە لەسەر دەرەجەی خۆی دەمێنێتەوەو نایەڵێ هەوایەکی زۆر بچێتە ژوور، بەڵام سۆبەکەش ناکوژێتەوە.

لە جێگای خۆ وشك بوون ← واقو ورمان.

لە جێگای خۆ هەستان ← هەستانە سەرپێ/پا.

٠٠١٩/ 3843- **لە جێگای (بەرز) خۆ هێنانەوە، دەست لێنەدان:** دەتوانن دیکۆرەکە رۆژێکی دیکەش لە جێگای خۆی بێڵنەوە.

٠٠٢٠/ 4091- **لە جێگای ژیان یان کار نانی نیوەڕۆ خواردن:** ئەو خوێندکارانەی دەیانەوێ لێرە نانی نیوەڕۆیە بخۆن دەبێ هەتا پێش سەعاتی دە کۆری بەڕێوەبەریی مالی ئاگادار کەن.

٠٠٢١/ 6233- **(دوای شایەدی دان) لە جێگای شایەدان هاتنە خوار:** "مەگەم پرسیارێکی دیکەتان لەو شایەدە هەبێ، دەنا دەتوانی بێتە خوار.

٠٠٢٢/ 6506- **لە جێگای کەسێك دانان:** کاتێك دەرکەوت کە برینی چۆکی چیا لە توانایی ئەوی کەم کردۆتەوە لە سەرەتای بەشی دووهەمی یارییەکە، کاوەیان لە جێگای دانا.

٠٠٢٣/ 6344- **لە جێگای کەسێك دانیشتن، جێگای کەسێك گرتنەوە:** باوکم دەستی لە کاری کونتڕۆڵ هەڵگرتەو جەفری بە هیوا بە خۆ بوونی کابرایەکی کە بۆ وەرگرتنی بەرپرسایەتییەك توانایی کار لێهاتوویی خۆی باش هەڵسەنگاندبێ، جێگای مودیری گرتەوە.

٠٠٢٤/ 23- **لە جێگای کەسێك کارکردن، پاش لە کەسێك بەڕێوەبردن:** لەو کاتەوە کاخەری پیر نەخۆش کەوتووە، کورەکەی لە جیاتی ئەو هەموو کارەکانی بەڕێوە دەبا.

٠٠٢٥/ 200- **لە جێگایەك بوون، (هەر چەند پیاو لەوێ نی راست لە کوێ):** "سەیران لە کوێیە؟ هەر لەوانەیە/ لەم دەوروبەرەیە"، "گە بەیانییەوە کامرانم نەدیوە"، "ئەمن دیومە، لێرە لە ماڵێ بەو هەر لەم دەوروبەرانەیە".

← هەبوون.

٠٠٢٦/ 1133- **لە جێگایەك ونبوون، بە جێ هێشتن (ی کەسێك، جێگایەك):** بەو هەستە تاڵەوە کە ژیانی هاوبەشیان خراپە لە ماڵەکەیان وەدەرکەوتن.

لە جێگایەك کار/ ئیش کردن ← دامەزران.

٠٠٢٧/ 383- **لە جێگایەك وەدەرکەوتن، هاتنەدەر:** بەداخەوە ناتوانن ئەمڕۆ سەرۆکی ئیدارە ببینن؛ لە شار وەدەرکەوتووەو هەتا دووشەمە ناگەڕێتەوە. * ئەو تووتییە لە کەنگێوە لە قەفەسەکەی هاتۆتە دەر؟

٠٠٢٨/ 583- **لە جێگایەکی چۆڵدا مانەوە، گەمارۆدران:** سەدان ساڵە کە ئەو خەڵکە لەو دوورگەیەدا ماونەتەوەو پێشیان وایە لە هەموو شتێك ناگادارن.

٠٠٢٩/ 3685- **لە چاووزار بە دوور بێ!:** "بیستوومە چیار شنە رۆژی هەینی، سێزدەی مانگ، لێك مارە دەکرێن"، "بەڵێ، لە چاووزار بە دوور بن".

٠٠٣٠/ 2189- **لە چوارچێوەی ... دابوون:** دانانی بوودجە بۆ گەڵاڵەی لێکۆڵینەوە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەم کۆمیتەیە دانیە.

٠٠٣١/ 405- **لە چوارچێوەی دەسەڵات، بەرپرسایەتیی، و ...) دانەبوون:** لە پێوەندی دەگەڵ ماڵ دروست کردندا ناتوانم هیچ رێنوێنییەکت بکەم. ئەوە لە سەلاحییەتی من دانیە.

٥٥٢٢/ 2168- **لە چوارچێوە... دالەبوون:** گەورە کردنەوەی خانووبەرەی قوتابخانەی ناوەندیی لە چوارچێوەی ئەم لێکۆڵینەوەدا نیە.

٥٥٢٣/ 1393- **لە چوارچێوەی شتێکدا هێشتنەوە، راگرتن، گوتن، نووسین:** بریا قسەکانت تەنیا لە چوارچێوەی ئەو مەسەلەیەدا دەهێشتەوە کە ئێستا لەگۆڕێ دایە.

٥٥٢٤/ 4963- **لە چوارچێوەی وشاندا بەیان کردن، بە زمان گوتن:** نەیدەتوانی ترس و خۆفی خۆی لەو بووکە شووشە جادووییەی کە لە کۆمۆدەکە دابوو بە زمان بەیان بکا/ بە قسە بیڵێ.

٥٥٢٥/ 3590- **لە حاڵەتی بێهۆشی یان بێ حەسیدا راگرتن:** پیاوە بەستەزمانەکە ئەوەندەی ئێش و ئازار هەبوو کە بە لێدانی دەرزیی مۆرفین لە حاڵەتی بەنجدا رایاندەگرت.

٥٥٢٦/ 3568- **لە حاڵی ئامادەباشدا راگرتن، بە تەواوی وشیار بوون، گوێ بە زەنگ بوون:** سەر گرووپان خوێندکارەکانی زانکۆی ئەفسەری لە ئامادەباشی تەواودا راگرتبوو. ئەسلەن نەیاندەزانی چرکەیەک دواتر چ بکەن. ● ئەمڕۆ سەرۆکی ئیدارە دێ و سەر لە ئەمبارەکان دەدا، بۆیە دەبێ بە تەواوی وشیار بن و بۆ وەڵامدانەوەی هەر پرسیارێک ئامادە بن.

٥٥٢٧/ 261- **لە حاڵی نوقم (غەرق) بوون دابوون:** کاتێک کۆپتێری نەجات گەیشتن، کەشتییەکە لە حاڵی غەرق بوون دابوو و بە خێرایی دەچووە ژێر ئاوێ.

لە حاڵی مردن دابوون ← لە گیانەڵڵا دابوون.

٥٥٢٨/ 6707- **لە حەیفان تەقین، شەق بردن، زۆر ناڕەحەت بوون:** کاتێک بۆ رابواردن دەگەیە شارێک و دەبینی ئەو دیوانەی لە هوتێل رێزێروت کردوون داویانن بە کەسێکی دیکە وەخت دەبێ لە حەیفان شەق بەری/ بتەقی.

لە خاڵە رەشەکە دان ← نەنگاوتن.

٥٥٢٩/ 242- **لە خوارتر بوون، کەمتر بوون:** رادەی بەرهەم لە بەراورد دەگەڵ/ لە چاو ساڵی رابردوو کەمترە.

٥٥٤٠/ 3967- **لە خوارەسەنی نێو قوتوو خواردن:** ماڵەکەیان کۆخێکی چکۆلە بوو کە لەسەر زەوییەکی بێ خاوەن دروست کرابوو، بێجگە لە گۆشتی قوتووی چی دیکەیان نەدەخوارد.

٥٥٤١/ 243- **لە خوارووی کەسێک بوون (لە بواری پلە و پایەدا):** سەرگورد لە باری دەرەجەوە دروست لە سەرهەنگ ٢ لە خوارترە. ● کاتێک چیا لەو شیرکەتە دامەزرا، لەباری پلە و پایەوە لە خۆشناو لە خوارتر بوو، بەڵام زۆر بە خێرایی پۆستێکی تری پێدرا کە لە باری بەرپرسایەتییەوە دەگەڵ هی ئەو بەرامبەر بوو.

٥٥٤٢/ 244- **لە خوارووی عەرشەی کەشتی بوون:** بەشە هەرە زۆری تەختەکانیان لە ئەمباری ژێر عەرشە نابوو و بەشێکی کەمیش لە ئەمباری پشتەوە.

٥٥٤٣/ 3269- **لە خوارێ راگرتن، کەم کردنەوە لە:** لە بەر ئەوە کە نەیانتوانیبوو لە رادەی خەرجەکان کەم کەنەوە/ خەرجەکان لە رادەیەکی کەمدا راگرن، سەرکۆنەیان کردن. ● پارەکە لەبەر ئەوەکە یارمەتیی خەڵک برابوو، ناچار بووین لە رادەی وەرگرتنی خوێندکاران کەم کەینەوە.

٥٥٤٤/ 2411- **لە خۆبایی بوون، لە خۆدەرچوون، خۆ لێگۆڕان:** ئەو پیاوە جحێڵە زۆر لە خۆبایی بووە؛ تەنیا دوو هەفتەیە لەو شەریکەیە کار دەکا و ئێستا بەوانی زۆر لە خۆی پایەبەرزتر دەڵێ کارەکانیان چۆن ئەنجام بدەن.

٥٥٤٥/ 6482- **لە خۆبایی بوون، لە خۆ دەرچوون:** نازانم ئەوانە چیان هەیە کە ئاوا پێی لە خۆبایی بوون.

٥٥٤٦/ 2103- **لە خۆ بوونەوە (لەبەر پێکەنین)، وەخۆ نەهاتنەوە:** سایلە چکۆلە بە قۆشمەیی لە دایک بووە؛ هەر کە چاوت پێی دەکەوێ، لە بەر پێکەنینێ وەخۆ نایەوە.

٥٥٤٧/ 2643- **لە خۆ بەستن، لە خۆدان:** شوالیە گەنجەکە شمشێری بارکی لە خۆی دا و رۆیشت تۆڵەی خوێنی بستێنێتەوە.

لە خۆ پرسیار کردن و نەزانین ← تێنەگەیشتن.

لە خۆدان ← لەخۆبەستن.

٥٥٤٨/ 6044- **لە خۆ دوور کردنەوە، فڕێدان:** گیانە! ئەو هەموو زگ بە خۆ سووتانە بۆ؟ ئەو بەراستی دەبێ ئەو وەزعە لە خۆی دوورخاتەوە.

٥٥٤٩/ 2219- **لە خۆ دوور کردنەوە، لە خۆ لادان:** زۆر بە گورجی مستێکی کە حەواڵەی سینگی کرابوو لە خۆی دوور کردەوە.

٥٥٥٠/ 6973- **لە خۆ دوور کردنەوە، رەت کردنەوە، تێهەڵاخەیتن، تێهەڵدان:** بە نیشارەیەکی بێزارانەی دەست، چێشتەکەی لە خۆی دوور کردەوە. ● لە حاڵێکدا دەستی دەگیرفانی نابوو بە ناڕەحەتییەوە لە نێو دیوەکەدا دەهات و دەچوو.

٥٥٥١/ 3501- **لە خۆ دوور کردنەوە، دووری کردن لە:** لە خاڵی جوێنی خۆت دوور خەوە. خراپ ترین ژنی بە باس و خواسی ناوەدانییە/ خراپترین ژنی دەنگۆ سازکەری ناوەدانییە.

٥٥٥٢/ 4781- **له خۆدەرچوون:** مامە ساندیزز کابرایەکی لە خۆرازی‌و بە هەراهەراو کەرەو، ئێستا کە دراوێکی زۆری هەیە لە خۆی دەرچووە.
← لە خۆ بایی بوون.

٥٥٥٣/ 4098- **لە خۆرا ... بوون، خۆ ... کردن:** دایك‌و بابی ماری لە خۆرا خۆیان نارەحەت کردبوو کە بۆ دەبێ ماری هێشتا نیوەشەوێ نەیەتەوە ماڵێ.
لە خۆڕا خۆ دەشتێك هەڵقورتاندن ← بە ناحەق تەداخول کردن.
لە خۆڕادیتن ← ئامادە بوون.
لە خۆرانەدین ← دڵ نەهاتن.
لە خۆشیان هەڵپەڕین ← شادی کردن.

٥٥٥٤/ 7352- **لە خۆشیان گریان، فرمێسکی شادی رشتن:** هەواڵی ئازاد بوونی ئەو وەها خۆش‌و کتوپڕ بوو کە لە خۆشیان دەستی کرد بە گریانێ.

٥٥٥٥/ 7304- **لە خۆلادان، لە خۆ دوور کردنەوە:** بۆ ئەوەی ئەو هەستە ناخۆشە لە خۆم دوور کەمەوە، ویسکی‌یەکەم بە خێرایی خواردەوە.
← لە خۆ دوور کردنەوە.

٥٥٥٦/ 5072- **لە خۆ نیشاندان، کردن:** کابرای قاچاغچی مرقاوەمەتێکی لە خۆی نیشاندا/ مرقاوەمەتێکی کرد، بەڵام سەرەنجام بەزۆر گرتیان‌و بردیانە زیندانێ.
لە خەڵك جیاکردنەوەو دوور راگرتن ← پێوەندیی بڕین دەگەڵ خەڵك.
لە خەو راست کردنەوە ← هەستان (لە خەو).

٥٥٥٧/ 429- **لە خەو هەستان، لە جێگا هاتنە دەر:** ئەو دەگەڵ دەنگی کەڵەبابان وەخەبەر دێ/ لە خەو هەڵدەستێ.

٥٥٥٨/ 445- **لە خەیاڵدا ژیان؛ لە واقعییەت دوور بوون:** بێگومان، دەگەڵ راستی‌یەکانی ژیان زۆر بێگانەیە/ یەکجار زۆر بە خەیاڵ/ دەخەیاڵدا دەژی. * بەڕێوەبەری پارێزگارانەی لە ئایەندا وایلێکردووە کە پێی‌وایە ئێمە دەتوانین لە گشت بوارێکدا گەڕی گەردوون بەرەو دواوە بگێڕینەوە.

٥٥٥٩/ 2030- **لە داو خستن:** ئەو کابرا فێڵبازە بۆ ئەوەی خەڵکی بە تەماح بخاتە نێو داوی نەخشەکانی‌یەوە هیچ مشکیلەیەکی نیە.
← فریودان.

٥٥٦٠/ 5427- **لە داو کەوتن، دە تەڵە کەوتن:** ژنە عەترە/ بۆنە تازەکەی لە خۆی دەدا؛ ئەوەش داوێك بوو کە لە رابردوودا زۆرجار ئەو پیاوە تێی‌کەوتبوو.

٥٥٦١/ 3486- **لە داوێندا پەلە کردن:** دەزانم کاتێك گەڕایەوە نێو دوکانەکە ئەمن لەلای داخڵەکەی پووڵی راوەستابووم، بەڵام لە قەزاوەتدا پەلەی مەکە.

٥٥٦٢/ 1597- **لە دایك بوون بۆ، دروستکران بۆ، خولقان بۆ:** دەڵێی پیتێرو سۆزان خودا بۆ یەکتری دروست کردوون.
لە دایك بوون ← هاتنە سەر دنیا.

٥٥٦٣/ 4294- **لە دەرگای قەتار/ پاس دوور کەوتنەوەو چوونە لای سەری:** (مەئمووری قەتار/ کۆمەك رانەندە دەڵێ:) "تکایە بچنە ژوور؛ بچنە لای سەرێ".

٥٥٦٤/ 114- **لە دژی ... بوون، بە پێچەوانەی ... بوون:** هەموو شتێك دژی ئەو تیئۆری‌یە بوو کە ئەو نەخۆشی‌یە بە هۆی ئاوەوە بڵاو دەبێتەوە.

٥٥٦٥/ 1261- **لە دژی ... راوەستان، مەخالەفەتی ... کردن:** لە وتاری خۆی لە مەجلیسدا، سەرۆك وەزیران دەگەڵ هەرچەشنە ئاڵوگۆڕێك لە یاسای ئێستادا بە راشکاوی موخالەفەتی کرد.
لە دژی ... قسە کردن ← دەلیل هێنانەوە لە دژی...

٥٥٦٦/ 5143- **لە دژی کەسێك کۆبوونەوە، لە هەموو لایەکەوە هێرش کردنە سەر:** ژمارەیەکی زۆر لە یەکانەکانی چەندین لەشکر هێرشیان کردبووە سەرمان.

٥٥٦٧/ 3700- **لە دەرگادان و وەخەبەر هێنان:** چونکە دەمەوێ بگەمە قەتاری یەکەمی لەندەنێ، دەکرێ بەیانیی زوو لە دەرگا بدەی‌و وەخەبەرم بێنی؟

٥٥٦٨/ 3172- **لە دڵدا بوون، لە نەزەردابوون:** لە پێوەندیی دەگەڵ نەخشەیەك کە لە نەزەرت دایە متمانە بە کەسانی دیکە مەکە. * ئەو چەکە بوو کە وەزیری دیفاع لە نەزەری دابوو.

٥٥٦٩/ 7153- **لە دڵدان، بێزەوستاندن، ئیشتیای کەسێك کوێر کردنەوە، بێزار کردن:** موسیقای پاپ رەنگە کەیفی تۆ سازکا/ بتبزوێ، بەڵام ئەمن بێزار دەکا.

٥٥٧٠/ 3748- **(بەوە پێکەنین خستن) لە دڵ دەرهێنان:** دەیزانی کە ژنەکە زۆر خەمبارە، بۆیە تێدەکۆشا وەپێکەنینی خاو خەم‌و پەژارەکەی لە دڵ دەربێنێ.

٥٥٧١/ 6634- **لە دەم دان، پووچاندنەوە، دەمکوت کردن:** لە ژیانمدا قەی ئاوا قسەی لەخۆرازی‌یانەم نەبیستووە؛ پێویستە کەمێك ئەو کابرایە دەمکوت کەن.

٥٥٧٢/ 5707- **لە دەم دان:** زۆر زوو وەدەرم نا. هەر زوو لە دەمیم دا.

٥٥٧٣/ 1027- **لە دەجلان، ئیموزوکردنی کەسێك، بە دەلالەتەوە:** جورج بە تەواوی لە مەسەلەکە نەفرەتی پەیدا کردبوو، پێی خۆش بوو لەم بارەوە باسێکی لێوە نەکرێ. بریاری دابوو ئەگەر سەیران تەلەفوون بکا بە دەمی دابێتەوە.

٥٥٧٤/ 3629- **لە دەم دانەوە، تەوهین کردن بە:** خاڵە پیرەکە لەوە نارەحەت بوو (سکالای دەکرد) کە فدراسیۆنی تینیسی حوفسیی کە حازر نەبووە یارییەکان لە ستادیۆمی وەبلی بەرێوەبەریی تەوهینی بەو خەڵکە کردووە.

← بە خۆ داشکانەوە، پرینگاندنەوە.

٥٥٧٥/ 870- **لە دوای کەسێك ناردن، کەسێك بردن بۆ کارێك:** بەداخەوە دکتور لە ماڵێ نیە/ لێرە نیە. چەند دەقیقە لەمەوپێش بردیان (بۆ سەر نەخۆش).

٥٥٧٦/ 2809- **لە دووی کەسێك چوون، وەدوای شتێك کەوتن:** دایکی منداڵەکە کاتێك دیتی دوای دوازدە سەعاتان هێشتا منداڵەکەی نۆبەتییەکەی زۆر توندە، چوو بە دوای دوکتوردا.

٥٥٧٧/ 6685- **لە دەرفەت کەلك وەرگرتن، هەل بە لەبار زانین:** رەنگە ئاغای کامکار هەلەکە بە لەبار بزانێ و بلێ ناکامی رەفتاری چین یەکگرتنی ئاسیا و هەموو جیهانە.

٥٥٧٨/ 3964- **لە دەرەوە (ی جێگای کار) ژیان:** لە هەموو ئەو خوێندکارانەی کە ژن و منداڵیان هەیە دوای دوو تێرمان ئیجازە دەدەن لە دەرەوەی زانکۆ بژین.

٥٥٧٩/ 3573- **لە دەرێ راگرتن، نەهاتنە ژوور:** لەسەر میلەکانی دەوری کارخانەی کارەبا تابلۆیەك هەڵواسرابوو لێی نووسرابوو: مەیەنە ژوور، ٢٠ هەزار ڤۆلت.

٥٥٨٠/ 6409- **لە دەرێ مانەوە:** ئەگەر دەتەوێ نیوەی شەوەکان لە دەرەوە بێنێیەوە، هاتنەوەت بۆ ماڵێ واتایەکی نیە.

٥٥٨١/ 1526- **لە دەرێ مانەوە، کۆنەبوونەوە:** ژمارەیەکی تا رادەیەك زۆر لە ژنی دووگیان لە دەرەوەی ریلادەکان/ زایینگەکان ماونەتەوە.

٥٥٨٢/ 3988- **(کلیل ون کردن و) لە دەرێ مانەوە:** لە دەرێ مابووەو، ناچار بوو پەنجەرەیەکی بشکێنێ و بچێتە ژوورێ.

٥٥٨٣/ 1733- **لە دەرێ (= دەرەوەی ماڵێ) نان خواردن:** ئەمشەو هیچ ساز مەکە؛ لە دەرێ نانی دەخۆم.

٥٥٨٤/ 545- **لە دەرێ نان خواردن؛ نان دان بە کەسێك لە دەرەوەی مەدرەسە، زانکۆیان جێگای کار:** زۆربەی خوێندکارەکانی زانکۆ ئێستاش پانسیۆن دەکرێن، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە رۆژ زیاتر لە دەرێ نانی دەخۆن.

٥٥٨٥/ 6316- **لە دەرێ هێشتنەوە یان راگرتن:** بێگومان بێجگە لە تەمبەڵی شتێکی دیکە نیە. بەڵام، بەهەرحاڵ ناتوانم ماشێنەکەم بەرمە نێو گاراژێ. ناچارم ئەمشەو لە دەرێ رایگرم.

(بە سانایی، بە هاسانی) لە دەستدان ← (بە) هەرزان فرۆشتن.

٥٥٨٦/ 3955- **لە رابردوودا ژیان:** "کامران، زەمان تێپەر دەبێ و ئەتۆش هەروا لە رابردوودا دەژی". ● "چۆن دەتوانم لە رابردوودا بژیم لە حاڵێکدا ئەتۆ و سیامەند ئاوا دەگەڵم چاکن".

لە رادە بردنە دەر ← بێتام کردن.

٥٥٨٧/ 392- **لە رادەی تێگەیشتنی ... زیاتر بوون/ دژوارتر بوون/ لەسەرتر بوون:** دەگەڵ چەند کەسێك لە عاشقانی ماشین خەریکی خواردنەوە بووم، بەڵام هیچ لە قسەکانیان حاڵی نەدەبووم/ قسەکانیان لە رادەی زانیاری من لەسەرتر بوون.

٥٥٨٨/ 6805- **لە رادەی تێگەیشتنی ... بەرزتر، دژوارتر قسە کردن:** رتارەکە یەکجار تیکنیکی بوو-بەشی هەرەزۆری وەختەکە، کابرای وتاربێژ زۆر لە سەرووی رادەی تێگەیشتنی ئێمە قسەی دەکرد.

٥٥٨٩/ 3597- **لە رادەیەکی بەرز دامانەوە:** سەرەرای مانگرتنەکان، بەرهەمی نەتەوایەتیی هەروا لە رادەیەکی بەرزدا مایەوە. تەنانەت کەمێکیش لە بەرهەمی پارەکە وەسەرتر کەوت.

٥٥٩٠/ 811- **لە رادەیەکی بەرز و دوور لە مەترسی راگرتن:** دڵنیا بوونی خەڵك نرخی سەهمەکانی لە پلەیەکی دوور لە مەترسی و بەرزدا راگرتوە.

٥٥٩١/ 452- **لە رادەیەکی قابیلی قەبووڵدا بوون:** کورێکی دەگەڵ بوو کە بۆی هەبوو دەزگیرانی بێ یان نەبێ، بەڵام (هەرچی بوو) شتێکی وا نەبوو (لەرادەیەکی قابیلی قبووڵ دانەبوو)/ رێچوو و لەبەر دڵان نەبوو.

لەراندنەوە ← راتلەکاندن.

٥٥٩٢/ 6917- **لەرزین (لە خۆشیان):** کاتێك گوێی لە دەنگی پێی کابرای بوو کە لە پلیکانان وەسەر دەکەوت، لە خۆشیان دەلەرزی.

٥٥٩٣/ 5106- **لەرزین (لە حەیفان، لە تووڕەییان و ...) :** سیامەند لە تووڕەییان کە نەیدەتوانی بیشارێتەوە دەلەرزی.

٥٥٩٤/ 7329- **لەپرولاولازبوون:** ناخرین جار کە سامرەندم چاو پێ کەوت، پیاو لێی دەترسا. هەر پێستو ئێسقان بوو.
← کز بوون.
٥٥٩٥/ 5464- **لە رەگو ریشە دەرهێنان:** دارە گەورەکانیان بڕیو کۆلکەکانیان لە رەگوریشە دەرێنا.
← لەنێو بردن.
٥٥٩٦/ 4810- **لە ریز هاتنەدەر بە مەبەستی وەپێشکەوتنەوە:** ماشێنەکەی پێش من راست ئەو کاتەی دەمەویست وەپێشی کەومەوە بۆ وەپێشکەوتنەوە لە ماشێنی پێش خۆی لە سەفەکە/ ریزەکە هاتە دەر.
٥٥٩٧/ 5154- **لە ریزی کەسانێک دابوون، یەکێک لە کەسانێک بوون:** ئەو یەکێک لە باشترین پالەوانەکانی مشتەکۆلە/ بۆکسۆرەکانی سەنگین وەزن لە ماوەی پەنجا ساڵی رابردوو دایە.
٥٥٩٨/ 5147- **لە ریزی ... دابوون:** ئەم شەرابە لە ریزی باشترین شەرابەکانی بورگوندی دانانێم (لە هەموان باشترە). * ئەو ئەفسەرە لە ریزی باشترین فەرماندەرەکانی شەری تاکتیکیی شەری دووهەمی جیهانییە.
٥٥٩٩/ 1457- **لە ریزی ... دابوون یان بە حیساب هاتن:** لەو رۆژەوە ئاغای پاترسۆن حازر نەبوو مەکینەی چیمەن برینەوەم وێدا ئیدی لە ریزی دۆستەکانم بە حیساب نایە/ وەک دۆست چاوی لێناکەم.
٥٦٠٠/ 3277- **لە رێزو حورمەتێکی زۆر یان کەم بەهرەمەند بوون، لە لای خەڵک بە قەدرو قیمەت یان بێ قەدرو قیمەت بوون:** خەڵکی ئەوەندەیان رێزو حورمەت بۆ زانستگە هەیە کە هەمیشە ژمارەی ئەو کەسانەی دەیانەوێ بچنە زانستگە بۆ خوێندن لە گونجایشی زانستگەکان زیاترە.
٥٦٠١/ 1126- **لە رەحمە چوون، پرووپۆ لێبوونەوە، پەک کەوتن:** بەستەزمانە ئاغای سمیت، ئەو پیاوەی جاران نەماوە. پرو پۆی لێبۆتەوە.
لە زار دەرپەرین ← گوتران.
٥٦٠٢/ 5107- **لە زمانی کەسێک شتێک گێڕانەوە:** شیکسپیر رەنگە لە هەموو نووسەرانی دیکە زیاتر قسەی لە زمانی گێردراوەتەوە.
لەززەت بردن ← کەیف کردن، تام لێکردن، دەست بۆ کارێک بردن.
٥٦٠٣/ 3956- **لە زەمانی حالدا ژیان:** وا دیارە ئەم کابرایە ناتوانێ لە زەمانی حالدا بژی، چونکە هەمیشە ئارەزووی رابردوویەکی پڕ لە جەلالو شکۆ دەکاتەوە کە لە راستیدا تەنیا بۆ ژمارەیەکی زۆر کەم لە کەسانی خاوەن دەسەڵات وجوودی هەبووە.
٥٦٠٤/ 3482- **لە زەوقی کەسێک دان، بەکۆڵدادان:** "بەس بۆ خۆت بپارێزە"، "خەر، لە زەوقم مەدە".
٥٦٠٥/ 4114- **لە زیندان رزگاربوون، هەڵاتن لە زیندان:** بە بێ پسانەوە ئاگای لە کچە بوو، بۆ ئەوەی کە خاترجەم بێ کاتێک ریستی رابکا، بیگرێتەوە.
٥٦٠٦/ 320- **لە ژووری (زیندان) بوون:** "داخوا پەرسۆن هەر لە ژوورێیە (لە زیندانێیە)؟"، نەخێر، ماوەیەکی کورتە ئازاد کراوە.
٥٦٠٧/ 1898- **لەژێر ئەو هێندە دەر، جوولان گردن:** کەشتییەکی شکاویان لە ژێر ئاوی بەندەرگا دەرکێشا/ هێنادەر.
لە ژێر باری کارێکدا پشت چەمانەوە/ شکان ← نوقمی کارێک بوون.
٥٦٠٨/ 5701- **لە ژێر پێنان (ی بەرژەوەندیی خەڵک) پشت لە قازانجی خەڵکی خۆ کردن:** لە کۆبوونەوەیەکی گشتی کە لە لایەن سەرپەرشتانەوە پێکهاتبوو رێبەرایەتیی ئیدارە بەوە تاوانبار کرابوون کە پشتیان لە قازانجی کرێکارانو کارمەندان کردووە.
٥٦٠٩/ 5929- **لەژێر پێنان، شکاندن (ی رێسایەکی لە خلالی یان مەزهەبی):** ئەوە کام یاسایە کە ئەو برادەرمیان تاوانبار کردووە لە ژێر پێی ناوە؟
← لادان لە، پشت لە قازانجی خەڵک کردن.
٥٦١٠/ 7473- **لە ژێر چاودێری یان سەرپەرشتیی کەسێکدا کار کردن:** موودیری تازە پیاوێکی زۆر باشە کە پیاو لە ژێر چاودێریی ئەودا کار بکا.
لە ژێر دەرچوون ← دووری کردن لە.
٥٦١١/ 5743- **لە ژێر دەستی کەسێکدا خزمەت یان کار کردن:** ئەو لەوجۆرە پیاوانە نیە کە پێم خۆش بێ لەژێر دەستیاندا خزمەت بکەم.
لەژێر دەستی یان دەسەڵاتی ... دەرهێنان ← ئازاد کردن.
٥٦١٢/ 3972- **لە ژێر دەسەڵاتی کەسێکدا ژیان، لە سەردەمی دەسەڵاتی کەسێک ژیان:** ئێستا وڵات لە ژێر دەسەڵاتی دیکتاتۆریی نیزامی دایە.
٥٦١٣/ 2181- **لە ژێر سەرپەرشتیی ... داهاتن:** ئایا خەرجی سەرگەرم کردنی میوانەکانیش لەژێر سەردێری خەرجە جۆراوجۆرەکاندا دێ؟

له ژێر شتێك دەرچوون ← به فێڵ و تەڵەکە خۆ رزگار کردن.

٥٦١٤/ 170- **لەژێر قەوڵی خۆدان: پاشگەز/ پەشیمان بوونەوە، پەژیوان بوونەوە لە وادەو بەڵێنی خۆیان:** کاتێك به ڵێنیت دا نابێ لێی پاشگەز بیتەوە. ● پاشگەز بوونەوە لە قسەکانت هیچ فایدەیەکی نیه. به گوێی خۆم قسەکانتم گوێ لێبوون.

٥٦١٥/ 302- **لەژێر کونترۆڵدا بوون، مەهار کران/ کردن:** دەیگوت هیچ جێگای نیگەرانی نیه چونکه وەزعییەتەکه به تەواوی لەژێر کونترۆڵ دایه/ مەهار کراوە.

٥٦١٦/ 3177- **لەژێر کونترۆڵی ... دابوون:** سیامەند تێدەکۆشا وا بنوێنێ که وەزعییەتەکەی به تەواوی لەژێر کونترۆڵ دایه.

٥٦١٧/ 3973- **لەژێر میچێکدا ژیان:** پێرمەندییەکی زۆر باشمان هەبوو لەژێر میچێکدا بەیەکەوە دەژیاین. لێك جیا بوونەوەمان هەروا هاسان نەبوو.

٥٦١٨/ 2514- **له سزادران هەڵاتن، کەسێك له سزادران رزگار کردن:** به لەبەرچاوگرتنی رابردووی زۆر شانسی هێنا که به ٦ مانگ رزگاری بوو.

٥٦١٩/ 810- **لەسەر ئاوێ راگرتن:** دەستی به کوتە تەختەکه گرتو هەر ئەو تەختەیه هەتا به هاواری گەیشتن لەسەر ئاوێ رایگرت.

٥٦٢٠/ 5560- **لەسەر بابەتێك بوون، دەربارەی بابەتێك بوون:** قسەکانی لەسەر گەشەکردنی ئەم دواییانەی سنعەت بوو.

٥٦٢١/ 5341- **لەسەر بناخەی ... راوەستان:** ناوبانگی کیتز، وەك شاعیرێك زۆرتر لەسەر بناخەی بەیتی ئۆدیەو غەزەلەکانی دوایەی راوەستاوە.

٥٦٢٢/ 5448- **لەسەر پووڵ و پارە نووستن، لە نێو پووڵ و پارەدا گەوزین، دەوڵەمەند بوون (پەکھاو):** ئەمریکاییەکان دەیانەوێ ٢٥٠ پۆندی چ لێبکەن؟ ئەوان که لەسەر پووڵی دەنوون.

٥٦٢٣/ 3558- **لەسەر پێی خۆ راوەستان:** یەکێك له سەرمایەدارە گەورەکانی چاپەمەنی ئەو رۆژنامە شەقو شڕەی کڕی و بەڵێنی دا که لانی کەم بۆ ماوەی دوو ساڵان له سەر پێی خۆی راوەستێ.

٥٦٢٤/ 4992- **لەسەر پێی خۆ راوەستان:** تەنیا بۆ خاتری ئەوە که بازارێك بۆ بریتانیا پێك بێ یان بۆ ئەوەی زەربەدەرانی بریتانیایی رزگار کەن، موافقی ئەو روانگەیه نەبوون که دەبێ ئاڵمان بتوانێ لەسەر پێی خۆی راوەستێ.

٥٦٢٥/ 5857- **لەسەر پێی خۆ راوەستان (لە پێوەندیی دەگەڵ دابین کردنی گەزەستەی ژیاندا):** ئەگەر لە دوورگەیەك گرفتار بی، ناتوانم یارمەتیت بدەم. ناچار دەبێ لەسەر پێی خۆت راوەستێ.

٥٦٢٦/ 6251- **لەسەر پێی خۆ راوەستان، سەربەخۆ بوون:** ئەگەر نەتوانێ لەم تەمەنەدا لەسەر پێی خۆی راوەستێ، هەستی هیوا به خۆبوونی تێدا دەمرێ.

٥٦٢٧/ 3588- **لەسەر پێی خۆ راوەستان، سەری خۆ راگرتن، بژێوی خۆ به هەرجۆرێك بێ پەیدا کردن:** به میلیون کەس له بێکارانی دەیەی ١٩٣٠ به هەر جۆرێك بێ سەری خۆیان راگرتبوو، دیارە به کەمترین رادەی جیرەی خواردەمەنییەوە.

٥٦٢٨/ 4829- **لەسەر پێی خۆ راوەستان:** لەو وڵاتانەی که دەگەڵ گەورەگرتنی برسێتی و نەخۆشی بەرەوڕوون ناتوانێ چاوەڕوانی ئەوە بێ که بتوانن لەسەر پێی خۆیان راوەستن.

٥٦٢٩/ 2218- **لەسەر پێی خۆ راوەستان:** ئەو ژن و پیاوە پیرە کەسیان نیه شیریان بۆ بکا یان ماڵیان بۆ خاوێن کاتەوە. بۆیە ناچارن لەسەر پێی خۆیان راوەستن.

٥٦٣٠/ 5781- **لەسەر پێی خۆ راوەستان، هەستانەوە سەر لاقی خۆ:** داخوا دەزانی چەندەت پێویستی به یارمەتی هەیه بۆ ئەوەی بتوانی لەسەر پێی خۆت راوەستێیەوە.

لەسەرتر بوون ← له رادەی تێگەیشتنی... زیاتر بوون.

٥٦٣١/ 2443- **لەسەر جێگای خۆ دانانەوە، گێڕانەوە سەر جێگای خۆ:** فەنەری سەعاتەکەی دەرهێنا و ئێستا ناتوانێ لەسەر جێگای خۆی دانێتەوە/ناتوانێ تێی خاتەوە.

← دانان.

لەسەر جێگای خۆ راگرتن ← کونترۆڵ کردن.

٥٦٣٢/ 6322- **لەسەر جێگای (پلەی) خۆ مانەوە:** راگەیەندراوەکەتان هەتا هەفتەیەك دەتوانێ لەو سەرە (به دیوارێیەوە) بێنێتەوە، دوایه بەداخەوە، دەبێ بێتە خوارێ بۆ ئەوەی جێگای هی دیکه خاڵی بێ.

٥٦٣٣/ 6405- **لەسەر جێگای خۆ وشك بوون یان وشك هەڵاتن، لە پڕ راوەستان:** که دەرگاکەم کردەوە، شتێکم چاو پێکەوت که لەجێی خۆم وشك هەڵاتم.

٥٦٣٤/ 5463- **لەسەر جێگای خۆ وشك بوون:** له ترسان له جێگای خۆی وشك بوو/ وشك هەڵات.

لەسەر جێگای خۆ وشك کردن ← هەڵڕێسته پێکردن.

لەسەر حاڵ بوون ← بە کەیف بوون.
لەسەر حوکم وەلاچوون ← دەسەڵات لەدەست دان.
لەسەر حیساب نووسین ← نووسران لە سەر.
٥٦٣٥/ 993- لە سەر حیسابی (قەرزی) کەسێک نووسین: تکایە پارەی ئەو شتانە بە حیسابی مێردەکەم بنووسن.
٥٦٣٦/ 1734- لەسەر حیسابی کەسێکی تر نان خواردن: دەچوو ە شارێو، لەسەر حیسابی ئەو چێوکە نانی دەخوارد کە....
٥٦٣٧/ 7316- لەسەر خواردنەوە: سوورسیسمان هەبوو، ویسکیمان لەسەر خواردەوە.
٥٦٣٨/ 4671- لەسەر... دانان، (گورج)؛ گورج منداڵەکەی لەسەر پێشخوانەکە داناو دەستی کرد بە گەڕانی کیفە دەستییەکەی/ جانتا دەستییەکەی.
٥٦٣٩/ 6752- (کاڵی خۆ) لەسەر دانان: داخوا کار کردنی بۆ وەرگرتنی دەرەجەی دەکتۆری هەرگیز تەواو دەبێ؟ هەتا ئێستا سێ ساڵ لە وەختی خۆی لەسەر داناوە.
لەسەر دان ← بەسەر داهاتن، شێت بوون.
لەسەر دانان ← بەسەر داسەپاندن.
٥٦٤٠/ 5825- لەسەر... دوون: ئەوەی میدالیایان لە لای سەرەوەی گۆڤاری چەپی چاککەتەکان دەدروون.
٥٦٤١/ 6303- لە سەر دەرەجە یان گەرمی خواردنەوە راگرتن/مانەوە: ئەگەر بتانەوێ هەم رادیاتۆرەکەو هەم سیلەندری ئاوی گەرم نەکوژێنەوە، دەبێ هەردووک سویچی سەر مەنجەڵی هەڵمی لەسەر دەرەجەی خوارێ بێننەوە:
٥٦٤٢/ 6260- لەسەر راوەستان، کونترۆڵ کردن: کاتێک خەریکم کارێک ئەنجام دەدەم، زۆرم پێ ناخۆشە یەکێک بێو لە سەرم راوەستێ.
٥٦٤٣/ 3091- لەسەر رۆیشتن، گیرە کردن (لەسەر): وەرن با لەسەر چەند پۆندی زیادی لە قیمەتەکەدا گیرەی نەکەین. چۆنە بیکەینە ٢٥٠ پۆندی راستو سەوداکە ببڕینەوە؟
← درێژەداری کردن، رستن.
لەسەر رێگا بوون ← لەپێش بوون.
٥٦٤٤/ 6033- لەسەر رێگا وەلابردن یان هەڵگرتن، چۆیەجێ کردن: سەرۆکی ئیدارە هێندێک لە گیروگرفتەکانی لەسەر رێ وەلابردوە....
لەسەر رێگای ... کۆسپ و تەگەرە دروست کردن ← پێش گرتن بە.
٥٦٤٥/ 147- لەسەر رێگای ... بوون، تەنیا بوون: سەفەری دەریایی سێرفرانسیس کە بە تەنیا کردی، گیروگرفتو مەترسیی زۆری تێدا بوو.

لەسەر رێ وەلا بردن ← بەسەردا زاڵ بوون.
٥٦٤٦/ 6152- لەسەر رێگەی خەڵک ژیان، سەرباری کەسێک بوون: حیسابی دەکرد کە ئەگەر بێتو هەڵومەرجەکە بەرەو خراپی بڕوا، ئەویش بۆ ماوەی شەش مانگان بێکار بێ، دەتوانێ سەرباری دایکو باوکی بێ.
٥٦٤٧/ 3537- لەسەر فۆرم راگرتن، لە حاڵی لەشساغییدا راگرتن: کچەکە بەو هیوایە کە هاوینێ بە مەلە لە دەریای مانش بپەڕێتەوە لە سەرانسەر ساڵیدا خۆی لەسەر فۆرم راگرتبوو.
٥٦٤٨/ 7399- لە سەر قامکان سووڕاندن: ئەو کچە زۆر باش لەوە گەیشتووە کە دەتوانێ باوکی لەسەر قامکان هەڵسووڕێنێ.
٥٦٤٩/ 7207- لەسەر قامکان هەڵسووڕاندن: بە بڕوای من، ئەگەر ئەو کچە بیویستبا دەیتوانی هەر کەسێکی بوێ لەسەر قامکانی بسووڕێنێ.
٥٦٥٠/ 198- لەسەر کار بوون، لە کاردا بوون: سەعات ٨ (ی بەیانی) بوو، زۆربەی خەڵکی شار چووبوونە سەرکاری خۆیان/ لە کاردا بوون.
٥٦٥١/ 5286- لەسەر کار لابردن، وەلانان: فەرماندەریی گشتیی هێزە چەکدارەکانیان بە هۆی ئەوە خۆی تێکەڵاوی هێندێک کار کردووە کە پێوەندیی بە سیاسەتمەدارانەوە هەبووە لەسەر کار لابرد.
٥٦٥٢/ 3435- لەسەر کار وەلابردن، بە هۆی ئەخۆشییەوە: کاتێک براون بیستی کە لە ئەرتەش وەلانراوە یەکجار پەریشان بوو، چونکە ئەیدەتوانی بەبێ دۆستانو هاوکارەکانی بەو لە هیچ چەشنە ژیانێک بکاتەوە.
٥٦٥٣/ 3271- لەسەر کاری خۆ مانەوە، درێژەدان بە کار: زۆر لە کورەکانی بوروستال ئەیانتوانیوە لەسەر شوغلی خۆیان بێننەوە.
٥٦٥٤/ 5808- لەسەر کاری... دانان: ئەوەندەیان پووڵ هەبوو کە بتوانن کورە هەرە چکۆلەکەیان لەسەر شوغلی وێنەگری دابنێن.
٥٦٥٥/ 1462- لەسەر (پشتیوانیی) کەسێک حیساب کردن، پاڵپشت بوون: بۆ هەموو شتێک خوشکی وەک پاڵپشت وابوو؛ ئاگاداریی کردن لە منداڵەکان، خزمەتکردنی دایکی نەخۆشیو تەنانەت سەرگەرمیی شەوانەش. ● ئەو خانووە... تەنیا داراییەکە کە دەتوانم حیسابی لەسەر بکەم.

لەسەر کەسێك دانان ← باری کەسێك کردن.

٥٦٥٦/ 7274- **لەسەر کەسێك دانیشتن و لە خەوتن**: دایکەو بابە پیرەکەم هەمیشە سەعاتی دە دەخەوون؛ هەرگیز لەسەرم دانانیشن.

٥٦٥٧/ 7424- **لەسەر گۆی زەوی یان لە نەخشەی جوغرافیا لەمەان**: بە تۆڵەی ئەو بورجی‌یانەی کە دەگوترا کراون، زۆر گوند لەسەر نەخشەی جوغرافیا نەماون.

لەسەر لاقان بەند نەبوون ← (لە خۆشیان) فڕین.

لەسەر من ← بە حیسابی من.

٥٦٥٨/ 4897- **لەسەر مێز یان لە قەسەللان ئاپەردن**: دەرزییە خەیاتی‌یەکەی لەسەر کورسی‌یەکی نزیك پەنجەرەی دانابوو. ● پێش ئەوەی کەسێك بریندارکەی، ئەو چەقۆیەی لابە.

٥٦٥٩/ 1049- **لەسەرنان (زۆر بە خێرایی)**: بە پەلە کڵاوەکەی لەسەر ناو بە تووڕەیی وەدەرکەوت.

لە سەرووی هەموان بوون ← وەپێش‌کەوتن.

لەسەر وەستان ← هەڵگرتن، کەوتن.

٥٦٦٠/ 6288- **لە سەرەتادا، هەوەڵ**: هەوەڵێ زۆر توند گوریسەکەم دەکێشا، بەڵام دوایە وازم لێی بەسەرچوور، بەرم دا.

٥٦٦١/ 494- **لە سەرەتادا، هەوەڵ، بۆ دەست پێکردن**: لەسەرتادا، کەمتر کەسێك پشتیوانی لێدەکردین، بەڵام پاشان خەڵکەکە لە دەورەمان کۆ بوونەوە/ پشتیان گرتین.

٥٦٦٢/ 1905- **لەسەرەخۆ دوور کەوتنەوە**: چرە دوورکەڵەکە وردە وردە دوور کەوتەوەو، خانووە رەش هەڵگەڕاوەکە وەدەر کەوت.

لەسەرەخۆ ڕۆیشتن ← خزین.

٥٦٦٣/ 6014- **لەسەرەخۆ کار کردن**: ئەتۆ بەراستیی دەبێ لەسەرخۆ کار بکەی- ئەو دەرمەنگ نووستنانەی شەوانەت، بۆ (سلامەتی)ت باش نیە.

٥٦٦٤/ 4659- **لەسەرەخۆ کار کردن**: ئەو لەو جۆرە کەسانە نیە زۆر بە خێرایی لە کارەکەدا بچێتە پێش؛ زۆر لەسەرەخۆ کار دەکا.

لەسەرەخۆ لێخورین، یان ڕۆیشتن ← سورعەتی... کەم کردنەوە.

٥٦٦٥/ 4505- **لەسەرەخۆ، بە پارووی چکۆلە ... خواردن، بەشێك لە خواردەمەنی‌یەك خواردن**: زۆر بە جوانی و کەم کەم سالادەکەی دەخوارد. ● بەبێ ئیشتیایی‌یەوە بەشێك لە بەرچایی‌یەکەی خوارد.

٥٦٦٦/ 6122- **لەسەرەخۆیان بە جێنجەیی خوێندنەوە**: گوێ ڕاگرتن بۆ ئەو کابرایە کە لاپەرەیەك لە کتێبی پیرۆز یەکەم بە جێنجەیی بخوێنێتەوە بەراستی ناخۆش بوو.

٥٦٦٧/ 6528- **لەسەر یەك خستن، خستنە سەر فستێك**: فیلمە نیگاتیڤەکە نیشانی دەدا کە یەکێك لەو رەسمانەی بە پەل هەڵگیرابوون کەوتبۆوە سەر رەسمێکی دیکە.

٥٦٦٨/ 5388- **لەسەر یەك دانان، دامەزراندن، پێکەوەنان**: پاشا دەزگای تەسجیلەکەمان هێنا و لە نزیك کونی مار زەنگی‌یەکە دامانمەزراند. ● لە گۆشەیەکی هۆدەکە بارێکیان پێکەوە نابوو.

← کردن بە یەك.

٥٦٦٩/ 5704- **لەسەر یەك فرۆشتن**: بەداخەوە، هەموو ڕۆژنامەکانی یەکشەمۆ تەواو بوون. لەسەر یەك فرۆشتمانن.

لەسەر یەك کۆ کردنەوە ← قەڵاچن کردن.

٥٦٧٠/ 7246- **لە سەلاحییەتی کەسێك دابوون، بە دەست کەسێك بوون**: لە ئەمریکا، ڕاگەیاندنی شەڕ لە سەلاحییەتی مەجلیسی سەنا دایە/ بە دەستی مەجلیسی سەنایە.

٥٦٧١/ 461- **لە سەلاحییەتی ... دابوون**: ڕەنگە باشتر ئۆرگانێکی دیکە بەو مەسەلەیە ڕابگا. ئەوە لە سەلاحییەتی ئەم کۆمیتەیەدا نیە.

٥٦٧٢/ 6461- **لە سێدارەدان، لە داردان، هەڵواسین، لینچ کردن**: بۆ چاوترسێن کردنی یاخییەکان، دوو کەس لە ڕێبەرەکانیان لە دارێ دان.

٥٦٧٣/ 5048- **لە سێدارەدان، کوشتن**: لەسەر داربەستێك لە . بۆ یەکەم جار ڕاهیبەکانی ئینگلیسی‌یان بە فەرمانی شـ لە سێدارە دا.

٥٦٧٤/ 402- **لە سێبەری دەرکەوتن (= وەلاچوون)**: زۆربەی زۆر ئەو لوکوموتیوانەی بە هەڵم ئیش دەکەن و لە ڕابردوو لەسەر ئەو خەتە کاریان دەکرد، ئێستا لە سێبەرە وەلانراون.

٥٦٧٥/ 4035- **(بە ورەی) لە شتێك گەڕان، بە دوای شتێکەوە بوون، وشیار بوون**: پۆلیسان خەریکن لە دزان دەگەڕێن. ● ئالفرێ بەم زووانە دەگاتە تەمەنێك کە بتوانێ بچێتە قوتابخانەی "شبانەروزی". دەبێ بگەڕێین و یەکێك لەو قوتابخانانە بدۆزینەوە. ● زۆر باش ئاگات لە ئالفرێد بێ.

لە شانەپیل کەوتن ← ماندوو و مردوو بوون.

٥٦٧٦/ 3658- **(بە مستی) لە شتێك دان**: گومانم لەوەدانیە کە هەر ئێستا کەسێك لە پەنجەرەی دەدا.

٥٦٧٧/ 5141- **له شتێك کوتان، تێکوتان:** زۆر تونـد بـای داوەو ماشینەکەی لە چوارچێوەی دەروازەیەك کوتا.

٥٦٧٨/ 4230- **(بە هۆی نەبوونی شتێك) لـە شتێکی دیکـە کەڵك وەرگرتن، ملزان بە:** ناتوانین کەرەســتەی خـاوی تـازە بێنـین، بۆیە ناچارین لە هی ناوچەکەمان کەڵك وەرگرین.

له شۆخی دەرچوون ← جیددی بوون.

٥٦٧٩/ 4568- **لـە شـەرگەڕان، شەرفرۆشـتن بـە:** ســـەرەنجام شانسێکمان هێنا. بۆ دەتەوێ شـــەڕم پـێ بفرۆشـیو ئـەو شانسـەش لە بەین بەری؟

٥٦٨٠/ 4018- **لە شەڕ گەڕان:** لـە دەمو چـاوی‌را دیـارە لـە شەڕێ دەگەڕێ.

٥٦٨١/ 1443- **لە هووده هالتەمەس جۆنیـەجۆ کـردن، هەڵسووڕاندنی خۆ لەبەر راگرتن:** مەرگی دایـکو بـابی داخێکـی گەورەیـە' بەڵام ئەوە ڕووداوێکە کە دەبێ خۆی لەبەر ڕاگری.

٥٦٨٢/ 4398- **لەتلەت، پلن لۆکە لە هێندێك جێگـای لیبـاس دەرهێنان:** لۆکەکەیان لــە سەرشـانەکانی بلووزەکـەی ئـاخنیبوو بـۆ ئەوەی ساف دیار بن.

٥٦٨٣/ 606- **لە فرتـەی پێکەنینداهاتن، هوریـا کێشـان، شـادی کـردن، پێکەنین (لە پڕ):** کاتێك ماشێنی ســـەرکۆمار وەدەرکـەوت، خەڵکەکە کەوتنە هوریا کێشانو شادی کردن.

٥٦٨٤/ 833- **لە فرتەی پێکەنین دان، لە گـابۆڕ دان، تێهـەڵکردن (ی گریانی):** پوورە ئانابێل، کـە لـەم دواییانـەدا زۆر دڵناسـك بووەو زوو هەڵدەچێ، لە نەکاو لە پرمەی گریانێیدا.

له فکرڕاچوون ← چوون دەفکرەوە.

٥٦٨٥/ 6108- **لە فکری خۆدابـوون لـە خـەمی ئـەو گـەڕان:** "پێـم وایـە بـە ئـەندازەی پێویسـت بـۆ ئەمشـەو مەشـرووبمان خواردەوە؛ ئیدی بەسـە"، "خۆشناو، ئەتۆ لە فکری خـۆت دابەو لە ئێمە گەڕێ".

٥٦٨٦/ 2684- **لە فکری شتێك دابوون، فکر لە شـتێك کردنـەوە، بیر لە شتێك کردنەوە:** داخوا هیچ بیرت لەوە کردۆتەوە کــە دوای تەواو کردنی دەبیرســتان دەچییە کام زانستگە؟

٥٦٨٧/ 3188- **(هەمیشـە) لـە فکـری شـتێك دابـوون:** کـامران بـە لۆمەوەو بە دەنگێکی بلیند گوتی: "هەتیوە، هەمیشە لە فکری ژنان دای".

٥٦٨٨/ 6900- **لە فکری شتێك دابوون، فکر کردنەوە لە، فکـری شـتێك لەسەر دان:** تروسکە، لە فکری ئەوە دای مێرد بە کۆسـاری بکەی؟

← بیر کردنەوە لە، (بە تونـدی) خـەریکی شـتێك بـوون، فکری شتێك کردنەوە.

٥٦٨٩/ 2830- **لـە فکـری گیـانی خـۆ کـەوتن:** هـەر جـارێ کـە مێردەکەی مەشرووبێکی یەکجار زۆری دەخواردەوەو جـار لەگەڵ جاریش رەفتارو کرداری توندو تیژتـر دەبـوو، ژنـی بێچـارە کـەوتبووە فکـری گیـانی خۆیـــەوە (= دەترســـا بیکوژێ).

٥٦٩٠/ 6905- **لە فکـری پـاش بـەری شـتێك دانـەبوون، (فکرینك) بـە مێشك دانەهاتن:** ئەو هەرگیز بە مێشکی دانایە کە ڕێگا بدا بە کوڕەکەی بۆ خۆی بڕیاری خۆی بدا.

٥٦٩١/ 3878- **لە قاو دان، ئاشکرا کردن، بە خـەڵك راگـەیاندن:** بـە هیـچ کـەس مـەڵێ کـە ئـەمن لایەنـە نهێنییـەکانی کەسایەتیی ئەوم لەقاو داوە.

٥٦٩٢/ 3886- **لـەقاودان، ئاشـکرا کـردن:** دەمەویســـت دیارییەکەی بۆ دایکم هێناوە وەك سوورپرێزێك بێنێتـەوە. ئێستا ئێوە ئاشکراتان کردووە.

← ئاشکراکردن، تێکدان، تێکدانی نەخشەی کەسێك.

٥٦٩٣/ 2751- **لـە قـوڕ چەقین، گیرکردن (لەبـەرە، لـەمێز، زیـخ):** کەشتییە مەسافیرهەڵگرەکە لە یەکەمین ســـەفەری خـۆی ... لە قوڕچەقی.

٥٦٩٤/ 7146- **(لە پێوەندی لەگەڵ مردوواندا)، لـە قـەبرێدا عـەزاب کێشـان:** "ئـەندامی ئـەو حیزبـە یـــان هـــەر حـــیزبێکی پارێزکارانی دیکە بم، ئەگەر بابم بزانێ، لە قەبرێدا ڕوحی عەزاب دەکێشێ.

٥٦٩٥/ 5967- **لە قەراغو بیجادی شتێك دان:** وەرن با لە قـــەراغو بیجادی ئەو مەسـەلە دژوارانـــە نـەدەین - بـا تێبکۆشـین وەڵامیان بدەینەوە.

لەقە لە بەختی خۆدان ← بە زیانی خۆ بڕیاردان.

لە قەڵەم خستن، لە قەڵەم کەوتن ← دەرهاویشتن، حیســـاب نەکردن لەسەر، لە بیرچوون.

٥٦٩٦/ 156- **(باش، خراپ) لە قەڵـەم دان، پێشبینـی بـاش و خـراپ کردن (بۆ)، ئاکـامی خـراپ/ چـاك بـە دواوە بـوون:** هـاتنی هـێزی زەرەبەت بۆ ناوچەی شەڕێ بۆ دوژمن ئاکـامی خراپـی بـە دواوە دەبێ.

٥٦٩٧/ 2047- **(وەك پـەك) لـە قەڵـەم دان، هەڵســەنگاندن، چـاو لێکردن:** لە وتارەکەیدا، هەڵوێستی دەوڵەتی لـە بەرامبـەر ئـەو کەســانەی پارمــەتیی مانگانــە وەردەگــرن (وەك تـەقاعود/ بازنشـــتە) هـەروەك کـردەوەی ئـەو عێـــلو عەشـیرە کۆنانـە لـە قەڵـەمدا کـە کـاتێك کەســانی بـــە ساڵداچوو کەڵکیان دەبڕا، بەجێیان دەهێشتن.

← ئەرزیابی کردن.

٥٦٩٨/ 5028- **لە کار خستن، تێکشکاندن و لە کار خستن:** ئاوری تۆپخانە سێ دانە لە تانکەکانی ریزی پێشەوەی لە کار خستبوو.

← لە نێو بردن.

٥٦٩٩/ 1513- **لە کار کەوتن، لە کار خستن:** لەم سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک زوو لە کار دەکەون. ئەو مەسەلەیە لە ژیانی مودێرن و کاری بێ هەڵسوورانو خواردەمەنی باشەوە سەرچاوە دەگرێ.

٥٧٠٠/ 1593- **لە کار کەوتن (موتور یان ماشێن):** کاتێك دەمانەویست بنیشینەوە لە ئاسمانی فرۆکەخانە دەسوورایەنەوە، موتوری فرۆکەکەمان لەکار کەوت.

٥٧٠١/ 6444- **لە کار کەوتن، پەك کەوتن، لە چالاکی کەوتن:** زۆر کەسی پسپۆڕو بە هەڵسوور لەکاتێکدا کە لە چڵەپۆپەی کارو تێکۆشانیان دابوون بە هۆی راوەستانی دڵەوە پەکیان کەوتوە/ لەکار کەوتوون.

٥٧٠٢/ 996- **لەکار کەوتن، راوەستان:** ماشێنەکەی چیا لە کارکەوت.

٥٧٠٣/ 390- **لەکار کەوتن، خراپ بوون، تێك شکان، تێك رووخان:** ئاغا، دوودانە لە پەناگاکان تێك رووخان/ وێران بوون. بە هۆی پەدافەندی هەواییەوە سێ فەرووند لە فرۆکە هێرشکەرەکان لە عەمەلیات وەدەرکەوتن (بەردرانەوە/ تێکشکان).

٥٧٠٤/ 398- **لەکار کەوتن، خراپ بوون:** ئاسانسۆر خراپ بووە، تکایە بە پلیکانەکاندا برۆن.

← لەبەریەك هەڵتەکان، سووتان، مردن، راوەستان.

٥٧٠٥/ 4668- **لە کار بەستان:** رادیۆکەی لە بەرقیداو هەڵیکردو دیسان هەمان وزەوزی ئاشنامان!

٥٧٠٦/ 449- **لەکاری (خراپی) کەسێك سەردەرهێنان، بەکاری (خراپی) کەسێك زانین:** بەرپرسانو پۆلیسی گومرك دەبێ لە گشت فێڵو تەڵەکەیەك بگەن/ سەردەربێنن.

٥٧٠٧/ 5029- **لە کامپی/ لەکەمپو کار کەوتن:** ئەگەر خاوەن کارخانەیەکی گەورە بە شێوەیەکی جیددی دوچاری گیروگرفتان بێ،ئەوانەی کەرەستەی خاوی بۆ دێننو ئەو کونتراتچییانەی بەو بەستراونەتەوە رەنگە لە کەمپو کار بکەون.

٥٧٠٨/ 2958- **لە کاناڵی پێویست تێپەڕ بوون:** داوا کردنت لە من بۆ ئەوەی پلەو پایەت بەرمە سەرێ، بێ فایدەیە. دەبێ لە کاناڵەکانی خۆی تێپەڕێ.

٥٧٠٩/ 4189- **لە کایەك کێوێك دروست کردن، پەنگاو گەورە کردنەوە:** گیروگرفتەکە لەوە دابوو کە لە کایەك کێوێکمان ساز کردبوو.

٥٧١٠/ 5940- **(بە گاڵتە) لە کلاسی دەرسی کەسێك حازر بوون:** سەردەمایەکی سوور بووم (کومونیست بووم)، تەنانەت لە کلاسی دەرسی واترمەن یش حازر دەبووم. ئەگەر پێتان ناخۆش نەبێ، دەبێ بڵێم بوە پیاوێکی خەرفاو بوو.

لە کن خۆ بوون ← بڵاو نەکردنەوە.

٥٧١١/ 304- **لە کوتایی کارێك (ی ناخۆش)دا، حازر بوون :** ئەو تاژییەی تۆ عەجەب خوێنخۆرێکە، هەمیشە لە کاتی کوشتنی نێچیردا حازرە.

٥٧١٢/ 551- **لە کورتی برینەوە، بە کورتی گوتن/ بەیانکردن:** هەوڵم دەدا گرنگترین خاڵی ناکۆکییەکە بەکورتی نیشان بدەم.

٥٧١٣/ 4936- **لە کورتی برینەوە، بە کورتی گەیاندن، گوتن:** ئالفرێد لە کورتی بڕێوە؛ لە دەست دانی دەسەڵات وەحشەتناکترین روانگەیەکە کە سیاسەتمەدارێك دەتوانێ بیری لێبکاتەوە.

٥٧١٤/ 552- **لە کورتی برینەوە ...، خاڵە گرینگەکانی ... نیشان دان:** هەموو ئەو شتە قۆڕانەی نووسیبووی مامۆستا لە یەك دوو دێڕان دا نووسیوە/ کورتی کردەوە.

لە کورتێ دان ← کورتبوونەوە.

لەکۆڵ بوونەوە ← رۆیشتن.

٥٧١٥/ 2861- **لە کوڵ چوونەوە، دامرکانەوە:** گیانە، مەیەڵە پەتاتەکان لە کوڵ بچنەوە. ● راست ئەو رۆژەی کە کرێکاران دەیانەویست مان بگرن، ژنەکانیان رایانگەیاند کە بۆ جێژنی کریسمەس پووڵو پارەیەکیان نیە. بزووتنەوەکەش دامرکاوە.

٥٧١٦/ 2585- **لە کۆڵ خۆ کردنەوە:** ئەگەر ئەمڕۆ دەبێ سەری دایلەو بابت بدەی، با زوو بچینو لە کۆڵ خۆمانی کەینەوە.

٥٧١٧/ 6708- **لە کۆڵ کردنەوە:** ئەوە شەش مانگە تەنانەت یەکێك لەو ئاپارتمانانە بەکرێ نەچوون. زۆر خوشحاڵ دەبووم ئەگەر کریارێك هاتباو هەمووی لە کۆڵ کردباینەوە.

← (بەگاڵتە) بۆ هەڵگرتن.

٥٧١٨/ 3594- **لە کۆڵ کەسێك نەبوونەوە:** ئای لەبەر ئەو پشیلە سەگبابە خێرەی ! دیسانیش پێمڵێنا. لە بەیانییەوە هەتا شەوێ لەکۆڵم نابێتەوە.

٥٧١٩/ 395- لە کۆنتڕۆڵ دەرچوون، کۆنتڕۆڵ لەدەستدان: منداڵەکانیانت دیوە؟ بە هیچ جۆرێك کۆنتڕۆڵ ناکرێن.

٥٧٢٠/ 2570- لە کۆنتڕۆڵ دەرچوون: هەوڵی دا شیرکەتەکەی بە خێرایی پەرە پێبدا. بەڵام، کارمەندەکانی بێ ئەزموون بوون، بۆیە بەرهەم هێنان لە کۆنتڕۆڵ دەرچووو، کابرا نابووت بوو.

٥٧٢١/ 5959- لە کەسایەتیی کەسێك کەوشتن و داوەری کردن لەسەری: دەمەویست لە کەسایەتیەکەت بگەم و داوەریت لەسەر بکەم، بەڵام نەمتوانی چونکە وەهیچ کام لەو جۆرە کەسانە ناچی کە دەیانناسم.

٥٧٢٢/ 823- لە کەلك خستن، لە کەرەم خستن، لەکەکەت کردن، خۆ هیلاك کردن: ئەگەر لەو شەوکارییانە دەست هەڵنەگری، خۆت لە کەرەم دەخەی.

٥٧٢٣/ 6671- لە کەللەدان (خەیاڵێك): ئەگەر بیترو لە کەللەم بدا و بیڵێم چم بیستووە، هەڵلایەکی عەجیب ساز دەبێ.

٥٧٢٤/ 2797- لە کەمیدان، کەم بوونەوە: ئەگەر لە رادەی ئەو تفاق و دانەوێڵەی داماخستوون دیسانیش کەم بێتەوە زستانێکی زۆر سەختمان لە پێش دەبێ.
→ هاتنە خوار.

٥٧٢٥/ 1804- لە کیس دان، لەدەست لەستاندن: بەڵێ کە تووڕەم: هەر ئێستا سەفەری هاوینیی بۆ هێندی رۆژئاوای لە کیس داوم.
لە گابۆرێ دان ← لە فرقەی پێکەنین دان.

٥٧٢٦/ 6211- (ئیعتیباری خۆ) لە گرێوی کارێك نان یا لەسەر کارێك دانان: ئەو سیستەمە ناتوانێ زۆر وردو کارامە نەبێ، دەنا دەوڵەت نەدەهات بە پشتیوانی لێکردنی ئابرووی خۆی لەسەر دابنێ.

٥٧٢٧/ -

٥٧٢٨/ -

٥٧٢٩/ 6843- لە گرێژە نەچوون، لێهات و سەکلن دران: بە هۆی شەڕو کێشەی درندانەی عەشیرەیی، وڵاتەکەمان لە گرێژ نەچووە.
→ لەبەریەك هەڵتەکان.
لە گوڕ کەوتن ← سارد بوونەوە.

٥٧٣٠/ 455- لە گۆڕێ نابوون، رووبان: هەرچاوم بە چاوی کەوت زانیم شتێك قەوماوە/ رووی داوە/ شتێك لە گۆڕێ دایە.

٥٧٣١/ 7429- لە گۆڕێ هەڵگرتن، نەهێشتن: ئێستاش زۆر کەس لەسەر ئەم بڕوایەن کە دەکرێ شەڕ، مانگرتن و جینایەت - وەك تۆ بڵێی بە گزێهانێکی سیحراوی- لە گۆڕێ هەڵگیرێن.

٥٧٣٢/ 286- لە گوڵ نابوون، پشکووتن، گوڵ دەرکردن، گوڵ کردن: رەزەکان ئەمساڵ زۆر زوو گوڵیان کردووە.

٥٧٣٣/ 7314- لە گوناهی کەسێك بووردن یان خۆش بوون، بەخشینی کەسێك، عەفوو کردن: ئەگەر بە دڵەوە تۆبەی بکەی، خودا لە گوناهەکانت خۆش دەبێ.

٥٧٣٤/ 1417- لەگەڵ کەوتن (بۆ کارێکی خراپ): پۆلیسێکی لاو بەوە تاوانبار کرابوو کە لەگەڵ تاقمێك لە جینایەتکارەکان کەوتووە.
لە گیان بێزار کردن ← جاڕز کردن.

٥٧٣٥/ 3898- لە گیانەڵا دابوون، لە حاڵی مردندا بوون: بابم بۆ ماوەی چەند هەفتان لە حاڵی مردن دابوو.

٥٧٣٦/ 2786- لە دەست چوون (ی دەرفەت): ئاغای ... لە پێوەندیی دەگەڵ بەشداری کردن لە شەریکەکەدا زۆری ساوە ساو کردو کاتێك هەتا سەر ئەو بڕوایە قبووڵی بکا، دەرفەتەکە لە دەست چووبوو.

٥٧٣٧/ 2693- لە دەست چوون، فەوتان، لەدەست دان: هیچ شتێك نەیدەتوانی بەوە رازی بکا ماڵەکەی لە دەست بدا.

٥٧٣٨/ 4476- لەدەست چوون، لە کیس چوون: نابێ ئەوەندەش "متواضع" بی، دەنا زۆر مامەڵەت لە کیس دەچێ.
← بێبەش بوون یان کران، پارەیەکی زۆر لەدەست چوون.
لە دەست دابوون ← هەبوون.

٥٧٣٩/ 6927- لە دەست دان، بە فیڕۆ دان: تیمی میوان لە نیوەی یەکەمدا بە تەواوی بەسەریاندا زاڵ بوو، بەڵام لە نیوەی دووهەمدا ئەو باڵادەست بوونەی بە هۆی دیفاعی شل و شەوێق لە دەست دا.

٥٧٤٠/ 4466- لە دەست دان: هەلومەرجێك کە هاتە پێش دەرفەتێکی باشی بۆ زیاتر قسە کردن فەراهەم کرد، دەرفەتێك کە پاتریك... پێیوابوو ناتوانی لە دەستی بدا.

٥٧٤١/ 2138- (رێزو خۆشەویستی) لە دەستدان، کەم کردنەوە، لەدەستدان، هێنانە خوار: دەمگۆیەکی خوێرییانەو بێمانا ناتوانێ رێزو خۆشەویستیی ئێوە لە لای دۆستەکانتان کەم کاتەوە.

٥٧٤٢/ 5876- لەدەست دان: ئەو چیرۆکە ئەو لایەنانەی لەدەست داوە کە شێوەی بیروباوەری تاکەکەسی باس دەکەن و ....

٥٧٤٣/ 2649- لەدەست دان، لەدەست چوون، بە فیڕۆدان، فڕێدان: بە هۆی تەوەزەلی یان بێمێشکی، سام ئاخرین شانسی خۆی بۆ ئەوەی کە ببێتە هونەرمەند لە دەست دا.

له دهست دان (به هاسانی، به سانایی) ← له دهست چوون، بێبەشکردن، به فیڕۆدان، (به) ههرزان فرۆشتن، بێبەش بوون/ کردن.

له دهستدانی ئهندام ← ئهندام لهدهستدان.

٥٧٤٤/ 5436- له دهست دهرچوون، لهدهست دان: (تیمی فوتبالی) ئارسینال له ئاخرین دهقیقهی یارییهکهدا سهرکهوتنی لهدهست دا.

٥٧٤٥/ 462- له دهسترس دابوون، نزیك بوون، نزیك بوونهوه: بهیهکگرتنهوه سوپاکانی هاوپهیمانهکان، پهرشو بڵاوکردنی هێزی دوژمن نزیك ببۆوه.

لهدهست نهدان ← نهفرۆشتن، راگرتن.

لهدهستی خۆدابوون ← دهسهڵات ههبوون بهسهر... دا.

له دهستی کهسێك دهرهێنانهوه ← ئهستاندنهوه.

٥٧٤٦/ 1527- له دهوری شتێك کۆبوونهوه: ئهری، بۆ ههتا تهسادوفێك روودهدا خهڵك کۆ دهبنهوهو ئاشیانه چاو له شتهکه دهکهن؟

٥٧٤٧/ 5137- له دهوری کهسێك کۆبوونهوه، پشتی کهسێك گرتن: کاتێك یهکگرتوویی حیزبێك دهکهوێته مهترسییهوه، له بهدهنه چاوهڕوانیی دهکرێ که پشتی رێبهرهکهیان بگرن.

← لێك کۆبوونهوه.

له عۆده (ی کارێك) هاتنهدهر ← ههڵکردن.

له لاق خستن ← ماندوو کردن.

٥٧٤٨/ 2274- له لاق کهوتن، رهجل لێبڕان، برست لێبڕان، شهکهت بوون: دوای رۆیشتنی میوانهکانو کۆ کردنهوهی قاپو کهوچکهکان، به شهکهتیی لهسهر قهنهفهکان (مۆبلهکان) دانیشتین.

٥٧٤٩/ 1053- له لاق کهوتن، له پێ کهوتن، رهجل لێبڕان، پهك کهوتن: ههڵبهت دهیانتوانی ئاغای شاهۆ که بازنشسته بوو بانگ کهن که میوانهکان بهخێر هاتن بکا، بهڵام ئهو بهستهزمانه وهها پیر بووه که به تهواوی پهکی کهوتووه.

له لاق نهکهوتن ← زیندوو مانهوه.

لهلای خۆ راگرتن ← بڵاونهکردنهوه.

٥٧٥٠/ 1154- له لهندهن یان باکووری بریتانیاوه چوون یان هاتن: کچێك ( له لهندهن) هاتۆوه مێردهکهی رهسامه.

٥٧٥١/ 5211- له لیستهکهدا نووسین: کاتێك تهلهبهکانت داوا دهکهی، لهبیرت نهچێ ئهو پارهیهی خهرجی بهنزین کراوه له لیستهکهدا بنووسی.

٥٧٥٢/ 325- له لیستی خواردهمهنی (مینۆ) دانهمان، پاك کرانهوه: "کولیچهی ستیکمان نیه" (له لیسته دهرهاوێژراوه).

٥٧٥٣/ 6376- له مافی خۆ داکۆکی کردن: ئهگهر پێت وایه حهق به تۆیه، تهسلیم مهبه؛ له مافی خۆت داکۆکی بکه.

٥٧٥٤/ 6299- له ماڵ بوون، وهدهرنهکهوتن: ئاغای ... وهزعی باشه... کچهکانی مێردیان کردووهو کورهکانی ژنیان هێناوهو، بۆ خۆشی ههمیشه له ماڵه.

٥٧٥٥/ 6309- له ماڵ مانهوه، وهدهرنهکهوتن: له حاڵێکدا بێنێوبڕ باران دهباری، سهرانسهری ئهو ههفتهیه له ماڵ ماینهوه.

← وهدهرنهکهوتن.

٥٧٥٦/ 3492- لهمهێری خۆ له دهست دان و کهوتن، بهربوونهوه: جان به لهقه لهق هاته ژوور، چاوێکی له من بڕیو به پلتهپلت ئهو چهند کهلیمهیهی گوت: "ئهمهوێ که ...و لهمهێری خۆی له دهست داو لهبهر پێمکهوتو بێهۆش بوو".

٥٧٥٧/ 2831- لهم گوێیهوه وهرگرتنو لهو گوێوه دهرکردن، سهرسهری بوون، کهر بوون: چاوهڕوانیت له خهر بۆ ئهوهی پهیامهکانت بگهیهنێ چاوهڕوانییهکی خۆڕاییه. ههرچی پێی دهڵێی لهم گوێیهوه وهری دهگرێو له گوێیهکهی دیکهی وهدهری دهنێ.

٥٧٥٨/ 6882- له "مناقصه" دا بهشداری کردن: دهڵێن چهند شهریکهی گهوره له "مناقصه" بۆ دروست کردنی فرۆکهخانهی تازهدا بهشدارییان کردووه.

٥٧٥٩/ 6647- لهمن ببیهن؛ له من ببیسن؛ کهوگرفتهکهتان هێندهی نهماوه تهواو بێ.

٥٧٦٠/ 374- له مۆد کهوتن: ئهم شێوه/ فۆرمه له مۆد کهوتووه؛ دهبێ له مهسهلهی مۆد به وردبینییهکی زیاترهوه بروانی.

٥٧٦١/ 2904- له مۆد کهوتن: ئاتوانی ئهوهی دهبهر کهی. مینیژۆپ (داوێنی زۆر کورت) لهمێژساڵه له مۆد کهوتووه.

← بهکار نههاتن.

٥٧٦٢/ 292- له مهترسی دابوون، کهوتنه مهترسییهوه، ههڕهشه لێکران: به هۆی کهم بوونهوهی خوازیارانی ئهو کالایه، بێکاری ههڕهشه له ههزاران کهس دهکا. ● به هۆی شکانی ئاگربهسهکه، ئاشتی کهوتۆته مهترسییهوه.

له مهمکی کردنهوه ← دوور کردنهوه له.

٥٧٦٣/ 2917- له مهیدان (ی یاری کردن) چوونه دهر: فهرهاد تۆپێکی زۆر توندی بهرهو دهروازه شووت کرد، بهڵام، تۆپهکه بێ ئهوهی مهترسییهك پێك بێنێ، له مهیدانهکه چووه دهر.

٥٧٦٤/ 2914- **لە میزان دەرچوون:** راست ئەو کاتەی دەمانەویست لە "سلوول"ە نەخۆشەکە رەسم هەلگرین میکرۆسکۆپەکە لە میزان دەرچوو.

٥٧٦٥/ 3362- **لە میشك رۆ کردن:** کابرای کەشیش پێویستیی ژیانێکی پاکداوێنانەو شەرافەتمەندانەی لە میشکی خەلکی ناوچەکەی خۆی رۆ کردبوو.

٥٧٦٦/ 7178- **لە میشکی خۆیدا بیر کردنەوە لە:** وەك پیاوێکی دەچوو کە لە میشکی خۆیدا بیر لە ژمارەیەك لە مەسەلان دەکاتەوە.

٥٧٦٧/ 2571- **لە میشکی خۆ دەرهاویشتن:** بریا بمتوانیبا فکری ئەو رووداوە وەحشەتناکە لە میشکی خۆم دەرباوێژم.

٥٧٦٨/ 6304- **لە میعدەدا راگرتن:** وا دیار بوو کە منداڵەکە میعدەیەکی خراپی هەبێ. دایکی هەموو چەشنە خواردەمەنێکی تایبەتی لەسەر تاقی کردەوە، بەلام میعدەی هیچ کامیانی رانەدەگرت.

٥٧٦٩/ 6245- **لەنگەر هاویشتن، راوەستان (مەودایەك دوور لە ویشکانی):** هەتا هەستانەوەی ئاوی دەریا (مەد)، ئەو کەشتییانەی لە ویشکانی سەرباز دادەبەزێنن، ناچار بوون دوور لە ویشکانی لەنگەر باوێژن (= راوەستن).

٥٧٧٠/ 3897- **لەنگەر هاویشتن:** ناوگانەکە نیو مایل دوور لە بەرتگاکە لەنگەری هاویشتبوو.؟
← راوەستان، راگرتن.

٥٧٧١/ 2826- **(لە یاری کریکێتدا) لە نۆبەی خۆدا یاری کردن:** مامم بۆ یاری کردنی نۆبەی خۆی زۆرتر نەفەری چوارەم دەبوو.

٥٧٧٢/ 6862- **(لە یاری گۆلف دا) لە نوختەی دەست پێکردندا لێدان (لە تۆپ):** یەکەمین یاریزان روو بە بایەکی زۆر توند تۆپەکەی لێدا.
لە نووستنی کەسێك پێشگری کردن ← بەخەبەر راگرتن.

٥٧٧٣/ 7293- **(لە پێشبرکێی سوارانێدا):** لە نەبوونی رقەبەر یان رقەبەرانێکدا سوارێك بە مەسیرەکەدا دەرواو داوەران حوکم دەدەن کە بردوویەتەوە.

٥٧٧٤/ 4238- **(بە وردی هێنێنەك فت) لە نەخشە زیاد کردن:** سنووری بەخشەکان/ ناحییەکانیان بە قەڵەمێکی وردی نەخشەکێشان لە نەخشەکە زیاد کردووە.
لە نەزەر گرتن بۆ ← وەلانان بۆ کەسێك.
لە نەفەس کەوتن ← تەواو کردن.

٥٧٧٥/ 3455- **لە نەکاو سەوز کردن، لە پڕ تووەسز کردن، کتوپڕ راگرتن:** بۆ ئەوەی نەهێلم دوو قوتابیی رەبەرکەوەن لە پڕ تووەوزم کرد.
لە نەکاو سەرو کەللەی کەسێك پەیدا بوون ← لە پڕ هاتن.

٥٧٧٦/ 3536- **لە نێوان ترس و هیوادا راگرتن:** تکایە، لە نێوان ترس و هیوادا رام مەگرە. ئەگەر ناکامی تاقیکارییەکە دەزانی پێم بلێ.

٥٧٧٧/ 7236- **لە نێوان دوو ئاگران یان دوو کاراندا مانەوە یان گیر کردن:** دلتەنگی تەواو کەماڵو خۆش بینییەکی کەمرانە- ئەو دوو حاڵەتە رەوانێن کە لە نێوانیاندا گیری کردووە.
← دوو دڵ بوون.

٥٧٧٨/ 7427- **لە نێو بردن، کردنەوە بە هیچ:** هێرشێك بۆ سەر بەرەی ناوەراست سەرکەوتنەکەی شەڕی زستانی رابردووی کردووە بە هیچ.

٥٧٧٩/ 3512- **لە نێو بردن، پێشی زیاد بوونی ... گرتن:** بۆ پێشگری لە زیاد بوونی مێش لە هاوینیدا هیچ رێگا چارەیەکی تەواو نیە. • ئەگەر دەتەوێ گوڵەکانت باش بن، دەبێ ئەو بژارانە لە نێوبەری.

٥٧٨٠/ 7428- **لە نێو بردن:** ئەگەر لە هاوینیدا ئاور دە لەوەڕگەیەك بەربێ، هەموو گیاو گژڵێك لە نێو دەچێ.

٥٧٨١/ 6733- **لە نێو بردن، لە کار خستن:** ئەگەر ئیسرائیل دەست پێشخەر بوویا، هێزی هەوایی ٤٨ سەعاتی هەوڵیی بۆ هێرش کردنە سەر فرۆکەخانەکان تەرخان دەکردو شەبەکەی مووشەکەکانی لە کار دەخست.

٥٧٨٢/ 4902- **لە نێو بردن، قەدەغە کردن:** بۆ لە نێو بردن، یان هەر نەبێ بەرتەسك کردنەوەی قومار هێندێك هەنگاویان هەلگرتن.

٥٧٨٣/ 5419- **لەنێو بردن، ریزاڵ ریزاڵ کردن، زۆر بە توندی داتەپەر شالاوی وەختیان:** تۆفان ماڵەکانی ریزی پێشەوەی کە بە تەختەو دار دروست کرابوون ریزاڵ ریزاڵ کرد.

٥٧٨٤/ 6216- **لە نێو بردن، ریشەکێش کردن، لە ریشە دەرهێنان:** پۆلیس و بەشی دەرمانی هەوڵ دەدەن ئەو شەپۆلە رۆژ لە رۆژ بە تەوژمترەی "اعتیاد" بە "مواد مخدر" کە لە نێو لاوەکاندا سەری هەڵداوە ریشە کێش کەن.

٥٧٨٥/ 4145- **لەنێو بردن، تێکدان، تێکچوون:** ئەگەر بانك پارەکە نەنێرێ، پشرودانەکەمان لە ئەورووپا تێك دەچێ.

٥٧٨٦/ 4154- **لە نێو بردن، بە تەواوی، وردو خاش کردن:** هێزی پیادەمیان بە تۆپخانەی بە تەواوەتی لە نێو برد.

٥٧٨٧/ 1767- **لە نێو بردن، لە نێو چوون:** بەشی زۆری تۆپزۆزیسیۆن لە نێو چوون.

٥٧٨٨/ 6619- **لە نێو بردن، تەولو کردن:** "ئێستا هێندێك حەبت دەدەمێ کە ئێشو نازارەکەت لە نێو بەرێ/ تەولو کا".

لە نێو بردن ← بە بادان، تەولو کردن، ریشەکێش کردن، کوشتن، وەلابردن، وەلانان.

٥٧٨٩/ 5167- **لە نێو بردن (بە تەواوی)، وێران کردن:** ئاور لە گەرەکەکانی کەنار شار بەربوو ماڵەکانی، کە زۆربەیان لە دارو تەختە بوون، بە تەواوی لە نێو دەبرد.

٥٧٩٠/ 1710- **لەنێو چوون:** تەنیا ئەوانەی کە توانای ئەوەیان هەبوو کە دەگەڵ هەلو مەرجی لە حاڵی گۆڕاندا خۆ رێك خەن، توانیان بێننەوە. ئەوانی دیکە لە بەین چوون.

٥٧٩١/ 1306- **لە نێو چوون، خراپ بوون، تێکچوون:** کەشتی‌یەکە وشاخێکی ژێردەریایە کەوتەو لە نێو چوو. ● بە هۆی ئەوە کە گرنگترین کەس لە میوانەکان هەتا ماوەیەك دوای دەست پێکردنی بەرنامە نەهاتبوو، هێندەی نەمابوو میوانی‌یەکە تێك چێ.

٥٧٩٢/ 5734- **لە نێو چوون:** ستوونێك لە لۆریەی نەوتکێشەکان بە درێژایی مایلێك لە نێو گڕی ئاگردا لە نێو چوو.

٥٧٩٣/ 3001- **لە نێو چوون، تەقینەوە، بوون بە بڵقی سەر ئاو:** ئەمباری ژێلاتین لە ژێر تەنسیری راستەوخۆی گەرمادا بە گەرمەیەکی وەها گەورە تەقیوە کە لە چەندین کیلەمیترەوە گوێیان لە دەنگەکەی بوو.

٥٧٩٤/ 2996- **لە نێو چوون، شکست خواردن، تێدا چوون:** زیاتر لە نیوەی هەموو کەروێشکەکانی بریتانیا بە هۆی نەخۆشیی ...وە لە نێو چوون.

٥٧٩٥/ 7439- **لەنێو چوون (وردە وردە):** کۆمۆنیستەکان باسی وردە وردە لە نێو چوونی دەوڵەت لە کۆمۆنیزمدا دەکەن.

← نەمان، شکست خواردن.

٥٧٩٦/ 250- **لەنێو خۆمان بێ (و نەچێتە دەر):** بە جیددی لە نێو خۆمان دابێ ، دەزانی داود حەتووی داهاتوو پلەوپایەی دەچێتە سەر؟

لە نێو کەشەو نان ← لەنێو چەکمەجە نان.

٥٧٩٧/ 4933- **لە نێو گیزەمدا نووسین:** ئەو لە وشەی ئەوین ئەوەندە شەرمی دەکرد کە ناچار بوو لە نێو گیزەمەدا بی‌نووسێ.

٥٧٩٨/ 1708- **لەو بەری (نارەحەتی، لە سەرەزووکردن، تووڕەیی‌دا) بوون:** بۆ ئەوەی بزانێ مەسەلەکە چی‌یە لەوپەڕی نارەحەتی دابین (= وەختە شەق بەرین/ وەختە دیق بکەین).

٥٧٩٩/ 3205- **لە وەزعێکی باشتر دابوون، ئیمتیاز هەبوون بەسەر ...دا:** لە بەراورد دەگەڵ فەرانسە، ئالمان وەزعێکی زۆر باشتری هەیە.

٥٨٠٠/ 2900- **لە هۆش چوون، دەبووریەوە چوون، بێهۆش بوون، دڵ لە خۆبوونەوە:** دوای کاری یەکجار زەحمەتو دوورو درێژی رۆژانە لەسەر تەختەکەم راکشام و لە خۆچووم.

← خەو لێ کەوتن.

٥٨٠١/ 1703- **لە هەلمەتی چاو تروکاندن، لە هەڵمەتی چاو تروکاندن، ئاسەوار نەمان، ...، وردە وردە تەواو بوون:** هەورە برووسکە لە نێو رێژنەبارانەدا وردە وردە تەولو بوو.

٥٨٠٢/ 3535- **لە هەلمەتی چاوان دوورتر نەکەوتنەوە، لە دیدرەس دا راگرتن، لە دیدرەس لە چوونەدەر:** بە منداڵەکانیان گوتبوو نابێ لە دەریادا لە هەلمەتی چاوان دوور بکەونەوە؛ نەکا تووشی توفان بن.

٥٨٠٣/ 2822- **لە هەماهەنگی، وەهەماهەنگ کەوتن، هە... بەلەنگی چاودروانکراو کەوتن:** رادفۆرد لە دەمەقاڵەدا زۆر بە هێز بوو لاتارەکانی راست وەهەماهەنگ کەوتن.

← تێکەیاندن.

لە هەڵمەدابوون ← بە هەڵەچوون.

٥٨٠٤/ 6277- **لە هەیچەوە یان لە سفرەوە دەست پێکردنەوە:** شەریکەکە هەموو کارخانەکانی بە هۆی بۆمبارانی دوژمن لە نێو چوون، بە چەشنێك کە لە ساڵی ١٩٤٥دا لە سیفرەوە دەستیان پێ کردەوە.

٥٨٠٥/ 6308- **(لە یاری گۆریکێتدا) لە یاری دامانەوە، دەرنەکران:** شێرزاد وەك یەکێك لە دوو کەس بە هەڵسووڕترین هێرشکەرانی دوو لایەنە کە هەرچوار سەعاتەکە کایەی کرد.

٥٨٠٦/ 3586- **لە یەك جێ وەکۆ کردن، راگرتن، خڕکردنەوە:** کامران، بریار سەدبریا شتەکانت هەموو لە یەك جێ وەخڕ کردبان و لە ماڵێدا بڵاوت نەکردبانەوە.

٥٨٠٧/ 2229- **لە یەك خەتدا رۆیشتن، پشتی سەری یەکتر رۆیشتن:** پیاوەکان بە خەت/ یەك لە دوای یەك بەسەر پردە باریکەکەدا رۆیشتن.

٥٨٠٨/ 7500- **(بە زۆر) لێ ئەستاندن:** ئایا هەموڵت داوە یارمەتی‌یەکی بە زۆر لێ ستێنی؟ راست وەك ئەوەیە کە لە ئاوێ کەرەی بگری.

٥٨٠٩/ 2089- لێئەستاندن، لێدەرکێشان، بە زۆرەملێ لێوەرگرتن، لێدەرهێنان، بە کەڵکەڵگایی لێئەستاندن: تاقمی جینایەتکارەکان لە بە کەڵەگایی وەرگرتنی پووڵەو پارەیەکی زۆر لە کەسانی پایەبەرزدا پسپۆڕن.

٥٨١٠/ 2061- (بە زۆرە ملێ) لێئەستاندن، لێوەرگرتن، لێ دەرکێشان: ئەگەر دەوڵەت هەروا بە زۆرە ملێ ئەو گشتە دراوە لە باجدەران بستێنێ، ناتوانێ زۆر لەسەر کار وەمێنێ.

٥٨١١/ 6197- لێئەستاندن، لێدەرکێشان، لێوەرگرتن (بە زۆرە ملێ): دەوڵەت ئەگەر بتوانێ ئاخرین فلس/ پەناباد لەو خەڵکە بە زەبرییەو بە زۆرە ملێ وەردەگرێ.
← لێدەرکێشان.

٥٨١٢/ 1771- لێئەستاندنەوە: بە هۆی ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە وردە وردە لە کۆمەڵدا روو دەدەن، بۆی هەیە لە چینو توێژەکانی سەرووی کۆمەڵ هێزو دەسەڵات بستێندرێتەوە.

٥٨١٣/ 6466- لێئەستاندنەوە: دوای ئەوە کە هەمەوو پلەو پایەیەکیان لێئەستاندەوە ئیدی ئەدەهاتە نێو خەڵکی.

٥٨١٤/ 6618- لێئەستاندنەوە، وەرگرتنەوە: دوا بەدوای ناناراميیەکانی ئەم دواییانە، چەلەو چۆڵیان لە یەکێك لە یەگانەکانی ئەرتەش ئەستاندنەوە.
← لێوەرگرتنەوە.

٥٨١٥/ 4218- لیباس دروون (لە پارچەیەك، قوماشێك): یەکێك لە دۆستان خەریکە لە قوماشێکی کە سەیران لە مەرەخەسیدا کڕیبووی لیباسی دەدروێ.

٥٨١٦/ 1655- لیباس لەبەرکردن (لە /بۆ رێزو رەسمێکی تایبەتی): میرانە ژنەکان لیباسی ساتەنیان دەبەرو کڵاوی گوڵداریان لەسەر کردبوو.
لیباس گۆڕین ← دەبەر کردن (ی لیباسێکی دیکە).
لیباسی جوان دەبەر کردن خۆ لە گوڵێدان.

٥٨١٧/ 1901- لیباسی رەسمی لەبەرکردن: هەفتەی داهاتوو لە کۆمیسارياى بەرز میوانییەکی رەسمی بەڕێوە دەچێ. واتە دەبێ لیباسی رەسمی دەبەر کەین.
لێبڕان ← بڕان.

٥٨١٨/ 4845- لێبراوانە دژبەرێژهدان، چوونە پێش: ئێستا کە گیروگرفتەکە نەماوە، هیچ شتێك ناتوانێ ببێتە کۆسپی سەرڕێگای لێبراوانە چوونە پێشمان.

٥٨١٩/ 2612- لێبراوانە دەست بە کار بوون، باسك لێهەڵماڵین: هەرکات ژیلوان لێبراوانە دەست بە کار دەبێ بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەیەك، هەتا حەلی نەکا دەست هەڵناگرێ.

٥٨٢٠/ 4325- لێبراوانە رواڵگەی خۆ دەربڕین: وەزیری نێوخۆیی لەسەر چەکدارکردنی هێزی پۆلیس لێبراوانە نەزەری خۆی دەربڕی.

٥٨٢١/ 1061- لێبڕین، تەواو کردن، لەدەست بڕین: قرانێکم/فلسێکم پارە نەماوە. کڕینی ئەو هەمووە کتێبە پارەی لێبڕیم.
لێبڕین ← هەڵپەرتاواتن.
لێبووردن ← چاوپۆشی لێکردن، بەخشین.

٥٨٢٢/ 2070- لێبووردن، چاوپۆشی لێکردن، بەخشین: ببوورە کە بێ ئیجازە لە تەلەفوونەکەتانم کەڵك وەرگرت.
لێبوون ← هێنانە سەردنیا.

٥٨٢٣/ 5416- لێبوونەوە، هەڵکەندران: کاتێك فڕۆکەکە وەشەرز کەوت/ بەرپۆوە هەردووك باڵی هەڵکەندران /لێبوونەوە.
← هەڵکەندران، جیابوونەوە.

٥٨٢٤/ 611- (شکانو) لێبوونەوە، هەڵکەندران، لێبکرانەوە: دەکەلی بەلەمەکە لە پایەوە شکابوو/ لێبۆوەو لە قەراخ دیوارەی بەلەمەکە کەوتبوو. * تۆزێکی لە شۆکۆلاتەکە لێکردەوەو راداشتەی منی کرد.

٥٨٢٥/ 322- لێبوونەوە، هەڵکەندران: "ئێوەی دووگمەی کراسەکەم لێبوونەتەوە؛ دەتوانی لێیانێیەوە؟"

٥٨٢٦/ 1220- لێبوونەوە، هەڵگیران: داخوا ئەو دووگمانە لێدەکرێنەوە؟ نا، لێناکرێنەوە. * سەری ئەم قوتووەم بۆ هەڵناگیرێ؛ دەکرێ بۆم هەڵگری؟

٥٨٢٧/ 7340- لێبوونەوە، پاك بوونەوە، لە بەین چوون: ئەو میدالیایانە مسۆرە، دەنا کەم کەم رەنگی متەلاکەیان لێدەبێتەوە.
لێپەتاڵ کردن ← لێڕێز کردن.

٥٨٢٨/ 3150- لێپەرەق داچوون: جان هێندە بازداشت کرابوو کە هاتبووە سەر ئەم باوەڕە کە مودیری فوروم (قوتابخانەی سەرەتایی) لێی بەرق داچووە.

٥٨٢٩/ 6130- لێپاولێپ بوون، لە رادەبەدەر پڕ بوون لە: بۆ ماڵدان بەو خەڵکە زیادییەی ئەو شارۆچکانەی کە لە رادەبەدەر لە حەشیمەت پڕبوون، دەبێ شاری تازە ساز بکرێن.
لیپاو لیپ کردن ← پڕ کردن، پڕپڕ کردن.
لێپچکرینەوە ← ئەستاندنەوە.

٥٨٣٠/ 6159- لێپرژاندن: باخەوانەکە خەریك بوو سەمی دژی حەشەرانی لە گوڵە رۆزەکان دەپرژاند.

٥٨٣١/ 5851- لێ پرینگانەوە، دووری لێکردن: ئەگەر ئەندامانی مەجلیسی لوردان لە نێو خەڵکدا ناخۆشەویست بان، خەڵک دووری‌یان لێ دەکردن و کچیان لێ نەدەخواستن.

لێ پەیدا بوون ← کێشان بۆ لای، وەگیر کەوتن.

لێ تیژ کردن ← خۆ لێ خۆش کردن.

٥٨٣٢/ 4281- لێ تێک چوون، لێ نەکۆڵین دەگەڵ: ئەو هەمیشە منو براکەمی لێ تێک دەچین.

٥٨٣٣/ 4278- لێ تێک چوون، لێ نەکۆڵین: خەڵک هەمیشە ئەویان دەگەڵ برا دووانەکەی لێ دەگۆڕین.

لێ تێکدان ← وەسەر هەڵە پەراندن، بەرنامەی کەسێک تێکدان، خراپ کردن، ئاڵۆز کردن.

٥٨٣٤/ 4323- لێ تێگەیشتن، ناسین، رووناکر بەس کردن بەلن ئەوەیە دان: هارولد باشی ناسیبوو، هەرچی ئەهێنی بوو لێی دەرکێشا. ● ئایا دەکرێ ئەم روانگەیە کەمێک روونتر بکرێتەوە؟

٥٨٣٥/ 2827- لێ نەتێگەیشتن، لێ حاڵی بوون، چوون دەمێشکەوە: ئەو بەشەی پێوەندی هەیە بە دەوری ژیانی ئەو چەشنە ماسی‌یە کە لە چۆمان دا دەژی گەلێک جارو خوێندوێتەوە بەڵام ناچێ دەمێشکەوە.

لێ چوون ← لێ دەرکێشان، رژان، هاتنە دەر.

٥٨٣٦/ 1508- لێ چوونە پێش (بە ئەسپایی)، لێ نزیک بوونەوە (بەئەسپایی): بە ئەسپایی لێیان چوونە پێش و دیتمان خەریکی سەیرانن.

٥٨٣٧/ 1115- لێ حاڵی بوون، وەرگێران، تێگەیشتن لە: کابرای "موعظە" چی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ قسەی کرد، بەڵام بەداخەوە کەس هیچی لێ تێ نەگەیشت.

← تێگەیشتن، وەدەست هێنانی.

لێ حاڵی کردن ← تێگەیاندن.

لێ خستن ←لابردن (ی کەسێک لەسەر کارێک).

٥٨٣٨/ 6272- لێ خوڕ بوونەوە، چاو لێ بڕین: بۆ دیتنەوەی پشتیوانێک چاوی بە دیوەکەدا گێرا، بەڵام خەڵکەکە تێکرا بە قەتیس ماوی چاویان تێ بڕیبوو.

← تێرامان، رامان لە، چاو تێبڕین.

٥٨٣٩/ 578- لێ خوڕین، رۆیشتن بە خێرایی و بە ئەرمی: هەتا گەیشتنە گوندەکە، ماشێنەکە بە نەرمی و لەسەریەک ناهەنگ دەرۆیشت.

٥٨٤٠/ 1854- (لە تەنیشت کەسێکەوە، شان بە شانی کەسێک) لێ خوڕین: پۆلیسێکی گەشتی (گەیشتە سەرمان) شان بە شانی ئێمە لێی دەخوڕی و پێی گوتین رایگرین.

لێ خەفتان ← خستنەژێر چاوەدێری.

لێ داگرتن ← چوونە خوار لە.

٥٨٤١/ 3693- (زاراوەی لاتی)، (پەکخەر زۆر) لێدان، بە قەستی کوشتن لێدان، ویەوغاش کردن: دەیکوژم، ریشەی دەردێنم.

٥٨٤٢/ 6831- لێدان: پەیامنێرێکی لێزان دەتوانێ بە کەڵک وەرگرتن لە ئامرازی مۆرس پەیامێک زۆر بە خێرایی لێ بدا.

٥٨٤٣/ 7467- لێدان، (زۆر باش) کوتان، تێهەڵدان، لەشکە لەجە کردن: دوو کەس لە کورەکان لە کۆڵانێکی تاریکدا زۆر باشیان کوتا.

٥٨٤٤/ 6830- لێدان: ئەوە کرێیە وا توند لە پەنجەرەی دەدا.

٥٨٤٥/ 6203- لێدان (بە چەقۆ): کابرا زلەکە بە چەقۆی لە گاردەکەی داو پەراسووی بریندار کرد.

٥٨٤٦/ 3466- لێدان (ی شتێک لە شتێکی دیکە)، وەسڵ کردن، لێ نزیک کردن، خستنە سەر: لە نیستگای دوون کاستر سێ واگۆنی دیکەیان وەسڵ کرد (لە قەتارەکە)

٥٨٤٧/ 3654- لێدان، کوتان: ژنە جحێلەکە هەوڵی دەدا چاوە بریندارەکەی لە پشت چاویلکەکەیدا بشارێتەوە، بەڵام، هەموو کارمەندەکان باش دەیانزانی دیسانیش مێردەکەی لێی داوە.

٥٨٤٨/ 3657- لێدان، تێکوتان: تام سەری لە لوولە ئاسنێکی کوتا کە لە دیوار هاتبووە دەرو سەری شەش تەقەڵی خوارد. ● ئاگام لە خۆم نەبوو، دولکەکەم دەشێرەی کوتاو شکاندم.

٥٨٤٩/ 3662- لێدان و خستن: دوژنی شەوێ راننەدیەکی نامەرد لە کابرایەکی داو کوشتی.

٥٨٥٠/ 3669- لێدان، داکوتان: کورە چکۆلەکە بە هەموو توانای هەوڵی دەدا، بەڵام نەیدەتوانی بزمارەکەی لێ بدا. ● تەختەکانیان بە ئەندازەیەک جوان بڕیبوو کە بە هاسانی لێک دەدران.

٥٨٥١/ 3677- (زاراوەی لاتی) لێدان، کوتان، تێهەڵدان: ئەگەر جارێکی دی ئەو کورە لە نێو رەزەکانم دابیینم، زۆر چاک تێی هەڵدەدەم.

٥٨٥٢/ 1806- لێدان، بریندار کردن، کوتان، کوتەکێکی باش لێدان، تێهەڵدان: بەستەزمانە خەرە پەرە، دوای تەواو بوونی پێشبڕکێی فوتباڵ چەند کەسی سەرسەری زۆریان لێدا.

٥٨٥٣/ 6443- لێدان، سەدەمەگەیاندن بە، خەوشدار کردن: ئۆپۆزیسیۆن هەمیشە لەسەر ئەو بڕوایە بووە کە لایەنەی

قانوونیی پێشنیار کراو ئازادییە بنەرەتییەکانی هاووڵاتیان خەوشدار دەکا.

٨٨٥٤/ 6978- لێدان (ی ئامەنگێک) بە توندی: کابرایەک لە گۆشەیەکی مەیخانەکە ئاهەنگێکی زۆر بە توندی لە سەر پیانۆ لێدەدا.

٨٨٥٥/ 4838- لێدان، هەڵکەندن: ئەو ماشێنە سەعاتی سەدان سکە لێدەدا.

٨٨٥٦/ 3045- (بە دەنگێکی بۆرو ناخۆش) لێدان، بڵاوکردنەوە: لە هەوای دووکەڵاویدا خەم هێنەری قاوەخانەکەی کەنار دەریا، گرامافۆنێکی یەکجار کۆن ئاهەنگێکی قەدیمی بە دەنگێکی بۆرو ناخۆش بڵاو دەکردەوە.

٨٨٥٧/ 5149- لێدان (لە پڕ): لە پڕ بە پشتی دەستی لە میزەکەی داو هەموو (کەس لە نێو هۆڵەکە) بێدەنگ بوون.

٨٨٥٨/ 6142- لێدان (رەنگ بە قەڵەمی لە جێگایەک): شەرمن مەکە. فڵچەکەی هەڵگرەو رەنگەکەی لێدە.

٨٨٥٩/ 5544- لێدان، وێکەوتن، خۆ پێدادان (زۆر بە توندی): کونترۆڵی ماشێنەکەی لەدەست دەرچووو خۆی بە دارێکی کارەبا دادا.

٨٨٦٠/ 5976- لێدان، تێهەڵسوون: تانکێری نەفتەکە ژەنگی دێنێ، مەگەم بۆ پاراستنی کارێک بکەی. دەبێ یەک دوو جار سوورەنی لێدەی/ بۆیاغی ئاسنی لێدەی.

٨٨٦١/ 54- لێدان (ی شتێک لە شتێکی دیکە)، پێوە نووساندن: نامەکان بە پۆستی زەمینیدا بەرێ دەکرێن، مەگەر ئەوە کە تەمری دروستیان لێبدرێ.

٨٨٦٢/ 485- لێدان، کوتان: لە هێرشی دزێنی شەوێ بۆ سەر بانکێ، سەرۆکی بانک لێدانێکی باشی وێ کەوت.

لێدان ← بازجوویی کردن، بە خزمەتی کەسێک گەیشتن.

٨٨٦٣/ 5531- لێدان و خستن، وێکەوتن: پێش ئەوەی بەرێ نەیگەیشتمێ. لۆرییەک لێیدا بوور خستبووی.

٨٨٦٤/ 3671- لێدان و فڕێ دانە خوار: هەرکات دەچمەدەر، دەبینم ئەو مەیموونە لەسەر میزەکە هەڵترووشکاوە. دارێک هەڵگرە، لێی دەو فڕێی دە خوارێ.

٨٨٦٥/ 5575- لێدانەوە یان نیشان دانەوە (ی فیلمێک/ فیلمێک): دەکرێ ئەو بەشە لە شریتەکە لێدەیەوە؟ جاری هەوەڵێ گوێم لێنەبوو.

← فرێدانەوە.

٨٨٦٦/ 1612- لێدان یان تێهەڵسوون (بە لێوانلێوییەوە): رەسامەکە دیمەنەکەی کێشاوەو هێندێک جێگای وردی بە لەسەرخۆیی رەنگی سەوزو ئاسمانی لێدا.

٨٨٦٧/ 140- لێدانی ... لە ...، هەڵواسین: ئایا دەکرێ ئەو رەختەیە لە دیوار دەی؟ دۆستەکانی زلوا ژمارەیەکی زۆر کەوشە کۆنەو قوتووی لەسی بەتاڵیان بە ماشێنی زاولوە هەڵاوەسیوە.

٨٨٦٨/ 4504- لێدرێن، هەڵکەندنەوە: بە نیشانەی رەدەرنانی هێزەکانی "محور" لە میسر، زەنگی کلیساکان لێدران.

لێدروست بوون ← پێک هێنان.

٨٨٦٩/ 4217- لێدروست کردن: دەتوانی لەو پارچە کۆنە زێرانە تۆقێکی دروست کەی. ● لەو کارخانەیەدا، داران ورد دەکەنەو دەیانکەنە هەویری کاغەز. لە هەویرەکەش کاغەز دروست دەکەن.

٨٨٧٠/ 6391- لێدەمیدن، پێوەدان: یەکێک لە قۆڵەکانی ژاکێتەکەیان زۆر خراپ پێوە دابوو.

← لێنان.

٨٨٧١/ 5435- لێدزین، لێدان: گورفانبڕێک جەلدەستی هەفتەیەکی لێدزی.

لێدزینەوە (ی کەسێک لە کەسێکی تر) ← هەڵفریواندن.

لێدەربەرین ← لێهاتنەدەر.

لێدەرفڕاکاندن ← دەرکێشان لە، فێڵ لێکردن، لێدەرهێنان، لێدەرێنان (پووڵو پارە لە کەسێک) دەرهێنان.

لێدەرکردن (ی سەگ لە کەسێک) ← بانگ کردنەوە.

٨٨٧٢/ 5611- لێدەرکەوتن، لێدەهاتن، بۆلی ... لێهاتن: قسەکانی وتاربێژ/ سەرخەنران بۆنی داماویان لێدەهات.

٨٨٧٣/ 6384- لێدەرکێشان، دەست لەدەستاندن: لە رۆژی مشتەکۆڵەدا لە بریتانیا، شەرفرۆشو ئاشغاڵی دینو لە هەر کەسەی یەک-دوو پۆندان دەستێنن.

٨٨٧٤/ 6828- لێدەرکێشان، لێدەستاندن، لێدەرفڕاندن: بزانە دەتوانی لە پیرەندیی دەگەڵ چاوپایەتی تاقیکارییەکەمان هێندێک شت لە ئاغای یانگ دەرکێشی.

٨٨٧٥/ 5182- لێدەرکێشان (گەلە بابەتێک لە نووسراوەیەک کە نووسەر مەبەستی نەبووە)، سازکردن لە: ئەدی ئەتۆش شتی را لە نووسراوەکەم ساز مەکە کە بۆ خۆم نەمنووسیون.

← هێنانەدەر، دەرهێنان، دەرپەڕاندن، جیاکردنەوە، هەڵێنجان.

٥٨٧٦/ 7419- لێدەرکێشان (ی زانیاری)، لێوەرگرتن: "بزانە هیچ زانیارییەکی لە ژنەکە دەرناکێشی، ئەمنیش لە مێردەکەی پرسیار دەکەم".

٥٨٧٧/ 4834- لێدەرکێشان: هەموو داستانەکەمان کەم کەمە لێدەرکێشا.

٥٨٧٨/ 1882- لێدەرکێشان: بەهەر جۆرێك بێ، توانیان چلۆنایەتیی هەڵاتنی لە زیندان بە تەواوی لێدەرکێشن.

٥٨٧٩/ 7482- لێدەرکێشان، لێدەرهێنان: ئەو نهێنی زۆر شوورەیی دەربارەی بنەماڵەی تیمپلاری لێدەردەکێشا.

٥٨٨٠/ 2564- لێدەرکێشان: کابرای بازجوو (= مستنطق) سەرەنجام توانی هێندێك زانیاریی لە کابرای زیندانی دەرکێشێ.

لێدەرکێشان ← دەرکێشان، (بە زۆرە ملی) لێ‌ئەستاندن، لێ‌کێشان، (پوول و پارە لە کەسێك) دەرهێنان یا ئەستاندن.

لێدەرهاتن ← بوون بە، گەورە بوون و لێدەرهاتن، دەرهاتن بە شکلی شتێك.

لێدەرهاویشتن ← وەلابردن.

٥٨٨١/ 2563- لێدەرهێنان، لێدەرێنان، وەدەست کەوتن، دەرکێشان: زۆر کەس هەن کە لە جیاتی ئەوەی شتێك بدەن بە خەڵك هەر لە فکری ئەوە دان کە چۆن لە خەڵکی دەرکێشن.

٥٨٨٢/ 2091- لێدەرهێنان، لێدەرفڕاندن: کاتێك توانی هەرچی ویستی لە ئاشنا تازەکەی دەرفرتێنێ، هەروەك قونچکە جغارەیەك فڕێی دەدا.

← (بە فێڵ و تەڵەکە) لێ‌ئەستاندن، فێڵ لێکردن.

٥٨٨٣/ 7032- لێدەرێنان، بە قەرز وەرگرتن (و نەدانەوە): کەمێك چرووکە؛ لەو جۆرە کەسانە نییە کە بکرێ فلسێکی/ قرانێکی لێدەرێنی.

لێرژان ← پڕ بوون، سەرریژ کردن.

٥٨٨٤/ 6051- لێرفاندن: پێش ئەوەی بتوانم نامەکەم بخوێنمەوە، لێیان رفاندم.

لێروانین ← چاو لێکردن، چاو تێ‌بڕین، تێ‌فکرین.

٥٨٨٥/ 6829- لێرژ کردن، بەتاڵ کردن (بە شێوەی بەرمیلێك): شەرابی سووری خۆماڵی لە ژێر زەمینەکە/ ژێرخانەکە دادەنێتەوە و هەموو رۆژێ دوو لیتری لێ‌بەتاڵ دەکا.

٥٨٨٦/ 3418- لێرەو لەوێ بڵاوبوونەوە، لێرەولەوێ هەبوون، هەر بەینابەینێك پەیدا بوون/ بوان، قەتع بوون: دەوەنی هەمیشە سەوز بە شێوەیەکی نارێکو پێکەوە بڵاو لە مەودای نێوان دارەکاندا روابوون. ● بەستەزمانە کاتێك گەیشتەوە ماڵێ جێگای نیشکی نەمابوو، کاتێك خەریکی گێرانەوەی ئەوە بوو کە چۆن دەچۆوەسی کەوتبوو، هەرجار ناچارێك پشەوێ قسەکانی دەبڕی.

٥٨٨٧/ 6118- لێرەو لەوێ قسەیەك پچڕاندن و گێڕانەوە: لە پێوەندی دەگەڵ ئەو مەسەلانەدا، لێرەولەوێ/ لەم و لەو شتێك گێڕانەوە بێ فایدەیە؛ ئەوەی کە پێویستە زانیارییەکی وردو قووڵە.

لێرەو لەوێ فڕێدان ← بڵاو کردنەوە، پەرش و بڵاو کردن.

لێزانین ← بە ئەزموون بوون.

٥٨٨٨/ 4922- لێ‌زیاد کردن، ناسان: نیشانەکانی نرخەگوزاری دروست دانێ.

٥٨٨٩/ 1472- لێ‌زیاد کردن، خستنە سەر: چەند دەزگا کەلابەی هەلگری رەژیی ئاسن لە نیزگەی .../ لە قەتارەکە زیاد کران؟

٥٨٩٠/ 6943- لێ‌زیاد کردن، هاویشتنە سەر...: داخوا دەکرێ ئەم بابەتەش لە مەسەلەکان زیاد کەم و بڵێم کە هەموو تەرتیباتەکە دەبێ هەتا هەفتەی داهاتوو تەکمیل بێ؟

٥٨٩١/ 34- لێ‌زیاد کردن، هاتنە سەر (شتێك): فەرموو ئاغا، ئەوە حیسابەکەت ١٠٪ سەرویسیشم لێ زیاد کردووە.

٥٨٩٢/ 7508- لێ‌زیاد کردن: سەرنووسەر لە کەنار نووسراوەکە یەکجار زۆر شتی لێ‌زیاد کردبوو.

٥٨٩٣/ 2022- لێ زیاد کردن: ئەگەر بۆ باشترکردنی زەوییەکانی یانە/ کلووب هێندێکت لە پێشنیارەکانت زیادکردبا زۆر مەمنوونت دەبووم.

٥٨٩٤/ 789- لێ‌زیاد کردن، زیاد کردن لە: خانەخوێیەکە پێی چەقاندووە لە سەرزیاد کردنی خاڵێك لە رێککەوتننامەکە بۆ ئەوەی ئەتوانێ بەشێکی ماڵەکە بەکرێ دەینەوە.

لێ‌زیاد کردن ← لێدان (ی شتێك لە شتێکی دیکە)، چوونە باڵ یان نێو، تێکردن، گەیاندن.

٥٨٩٥/ 4570- لێ‌زیادکردن و تەواو کردن: دەتوانن لە مێشکی خۆتاندا هێندێك شت لەم چیرۆکە زیاد کەن و بیکەنە چیرۆکێکی تەواو.

٥٨٩٦/ 36- لێ‌ساغ بوونەوە، ئاگادار بە دەستەوە دان، لێ پەیدا بوون: ئەوەی کە ئاشکرا بوو ئەوە بوو کە کابرایان لە ژووری ماڵەکەدا کوشتبوو، بەو حاڵەش، بەفری دەورووبەری ماڵەکە مۆری ئەشکابوو هەر بۆیەش هیچی لێ‌ساغ نەبۆوە.

← وەگیر کەوتن، بوون بە.

٥٨٩٧/ 79- لەنەکاو بوونەوە، لێ پەیدا بوون: ئەو هەمیشە زۆری قسە هەیە، بەڵام کاتێك لێی ورد دەبیتەوە هیچی لەنەکاو نابێتەوە.

٥٨٩٨/ 1165- لەنەکاو بوونەوە: زۆرم هیوا بە وتارەکەی دوێنێ شەوی بوو، بەڵام هیچ تازەی لەنەکاو نەبۆوە.

٥٨٩٩/ 3514- لێشاردنەوە، نەگوتن: وەزعەکە هەر ئەندازەش خراپ بێ، نابێ راستییەکان لە خەڵك - خەڵك بە گشتی- بشاردرێنەوە.

٥٩٠٠/ 6644- لێ قبووڵ کردن: زۆر زیاتر لە توانایی خۆم لەو دوو کەسەم قبووڵ کردووە.

٥٩٠١/ 533- لێك بڵاوبوون، پارچە پارچە بوون: بە جۆرە تەقەمەنییەکی زۆر بەهێز، تانکەکان لێك بڵاوبوون/پارچەپارچە بوون.

← لەتلەت بوون، نزیك بوونەوە لە هەڵوەشان.

٥٩٠٢/ 1473- لێك بەستن، لێك خران، لێك خستن: کاتێك هەموو واگۆنەکان تێك خران، قەتارێکیان لێدروست بوو کە سێ سەد میتر درێژ بوو.

٥٩٠٣/ 5739- لێك جودا کردنەوە: لە لێك جوودا کردنەوەی دوو بەشی باسەکەتاندا تووشی گیروگرفت بووم.

لێك جۆش کردن ← لێك وەسل کردن.

٥٩٠٤/ 6148- لێك جیابوونەوە: کێ پێی گوتی ئێمە ماری لێك جیا بووینەوە؟

٥٩٠٥/ 6087- لێك جیاکردنەوە "تشخیص"دان: مەشکیلەی ئەم برادەرە ئەوەیە کە ناتوانێ ئەوەی کە "راستە" لەوەی کە "سروشتی"یە لێك جیا کاتەوە.

٥٩٠٦/ 6873- لێك جیاکردنەوە: ئەمن وەك چیا بە توانا نەبووم کە بتوانم راستو درۆیان لێك جیا کەمەوە.

٥٩٠٧/ 1788- لێك جیاکردنەوە، لێك هەڵاواردن: خەردا دەریاو وشکانی لێك جیا کردەوە.

٥٩٠٨/ 6331- (بە هەڵمی) لێکردنەوە: پێش ئەوەی بتوانی تەمرەکان دە ئالبۆمەکەت نێی، دەبێ لە پێشدا وەبەر هەڵمیان دەیو لە پاکەتەکانیان بکەیەوە.

٥٩٠٩/ 632- لێك دابڕان، هەڵبڕان، جیابوونە (بۆ ماوەیەك)، بڵاوە لێکردن: کەنگێ بۆ جێژنی پاك بڵاوەی لێدەکەن؟

← تێکدان (ی دۆستایەتی).

٥٩١٠/ 7384- لێکدان، شلەقاندن: بۆ دروست کردنی سۆسی هێلکەی پێویستە لە پێشدا سپێنەی چەند هێلکان زۆر باش بشلەقێنن.

٥٩١١/ 7380- لێکدان، تێك وەردان: هێلکەکانو ناردەکەی ئەوەندە لێك دەن هەتا (گرێو گۆڵی لێ دەبڕێ) وەك رەنگی مەنگرینی لێ‌دێ.

لێکدان ← لێك وەسل کردن، تێك وەردان، تێکەڵ کردن، رێك کەوتن، دەمی (تەسادوف) گرەو دەگەل.

٥٩١٢/ 4991- (لە [illegible]) [illegible] دەکرێ شانۆییەك بۆ دوو کەس تەماشاچی بەرێوەبەرن. هەرکام لەو دو کەسە لە روانگەی خۆیەوە لێکی دەداتەوە.

لێکدران ← تێکەڵ بوون.

٥٩١٣/ 1904- لێك دوور کەوتنەوە: ئەوو ژنەکەی هەرگیز دەمەقاڵەی جیددییان نەبووە، بەڵام بە هۆی بێتەفاوەتییەکی دوو لایەنە، کەم کەم لێك دوور کەوتوونەتەوە.

← بڵاو بوونەوە.

٥٩١٤/ 2226- لێك دەرکردن: لە گێرەو کێشەی نێوان ژنو مێرداندا خۆ تێوەرمەدەن- لێیان گەرێن بۆ خۆیان لێکی دەرکەن.

٥٩١٥/ 195- لێك دەرکردن، حسێبات کردن/ بەرهەنگاوی پەیکار بوون (هەتا گەیشتن بە ئەنجام)؛ لە رۆژەکانی پێشوودانی ئەم هەفتەیەدا ٨٠ تیم لە قۆناخی یەك چوارەمی کۆتاییدا لێکی دەردەکەن.

٥٩١٦/ 5869- لێك دەرکردن: چونکە یەکێك لە پیارەکان دەمانچەی پێ نەبوو، لەسەر ئەوە ساغ بوونەوە کە بە سوارییو بە تفەنگان لێکی دەرکەن.

٥٩١٧/ 1748- لێکردنەوە، جیاکردنەوە: کاتێك کلاج دەگرێ، مۆتۆر لە دەزگای "حەرکە" جیا دەبێتەوە.

٥٩١٨/ 6690- لێکردنەوە: گەرمای زۆر بە حوکم بەشی زۆری رەنگەکەی لێکردۆتەوە.

٥٩١٩/ 4620- لێکەو لووس کردن (ی مووی سەر): تاقمە جەردەکە جاکێتی چەرمیان دەبەر دابوو و مووی سەریان هەتا سەرگوێیان لێکەولووس کردبوو.

٥٩٢٠/ 5607- لێکەو لووس یان رێکەو لووس کردن، ساڵاکاری کردن: پێش ئەوە کە هیچ رەنگێك لەو رووبە بدەی، دەبێ زۆر باش بە کاغەز سماتە رێکەو لووسی کەی.

← ساف کردن (بە سوونەوە).

٥٩٢١/ 3387- لێکۆڵینەوە، پێراگەیشتن: بە پۆلیسەکەم گوت دەنگە دەنگێکی کە لەو ماڵە چۆڵەی دراوسێکەمان را دێ، نارەحەتی کردووم. ئەویش گوتی لێی دەکۆڵمەوە.

٥٩٢٢/ 1006- لێکۆڵینەوە، تەحقیق کردن: دەمەویست بزانێ منداڵەکان باڵتۆکانیان دەبەر کردوون یان نا؛ بۆ لێکۆڵینەوە لەم بارەوە چووە ژێر دیوی لیباسان.

٥٩٢٢/ 6058- **لێکۆڵینەوە (بە لێبڕینی):** ئەو کابرایە لە وەزارەتەکانەوە هاتووە بۆ ئەوەی بە دزی لەوە بکۆڵێتەوە کە داخوا ئێمە گەواهی/ شەهادەمان بۆ منداڵێکی چکۆلە وەرگرتووە!

٥٩٢٤/ 7456- **لێکۆڵینەوە، کارکردن لەسەر:** بۆ وەرگرتنی دانیشنامەی/ شەهادەی دوکتوری، لەسەر شێوەی قسەکردن لە سەردەمی ڤیکتوریا کار دەکا.

٥٩٢٥/ 1012- **لێکۆڵینەوە لە رابەردووی کەسێک، لە راست بوون درۆ بوونی شتێک:** بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە رادەی متمانە پێکردن بەو پێوەرانە، تاقیکارییەکی باش بەڕێوە چوو.

لێک وەخر کردن ← مۆڵدان، کۆکردنەوە، لێک کۆبوونەوە.

٥٩٢٦/ 2614- **لێک وەخر کردن، کۆکردنەوە، دەنگدان:** خوازیارە ئینگلیزییەکانیان دەنگ دان بۆ ئەوەی لە ماوەی هاویندا روخەکانی دەریا خاوێن راگرن.

٥٩٢٧/ 3467- **لێک وەسڵ کردن، لێک جۆش کردن، لێکدان:** ئەو جۆشکارییە ئەوەندە لێهاتوو بووە کە رەنگە بە زەحمەت بزانی ئەو دوو لوولەیە لە کوێ جۆش کراون.

٥٩٢٨/ 4785- **لێک/ لەبەریەک هەڵوەشاندن:** ئەو مێزە جۆرێک سازکراوە کە دەکرێ بە هاسانی لە بەریەک هەڵوەشێ.

٥٩٢٩/ 4579- **لێک راهاتنەوە، لێکرا هاتنەوە:** هەموومان پێکەوە/ لێکرا لە پشتی ماشێنەکە هاتینەوە بۆ ئەوەی دەستەو لاقە تەزیوەکانمان بحەسێنینەوە.

لێکردن ← هاڕین.

٥٩٣٠/ 5412- **لێکردنەوە، وەلابردن، داماڵین، هەڵدانەوە:** هەموو پەردە کاڵ بۆوەکانی بە توندی لە دیوارەکان کردەوە. ✱ ماسکی ریاکاریی لەسەر هەڵدانەوە، ماسکێک کە کارو کردەوەکانیانی شاردبۆوە.

٥٩٣١/ 6468- **لێکردنەوە:** دزان سەرپۆشی قورقوشمی بانی کەنیسەکەیان لێکردبۆوە.

← برینو دەرهێنان، پیادە کردن (ی ماشێنو دەزگاو ...).

٥٩٣٢/ 3090- **لێکردنەوە (بەزەبرە)، پەڕاندن:** ئاشپەزەکە تۆزێکی گۆشتی کەلاکە سوور کراوەکەی لێکردەوەو لە حاڵێکدا بە دوو قامکان گرتبووی دای بە من.

٥٩٣٣/ 4256- **لێکردنەوە (پارچە/ قوماش/ دار/ تەختە):** دەستیاری خاوەن دووکانەکە بە ئەندازەی کراسێکی بۆی لە تۆپەکەی کردەوە. ✱ چەندت بۆ لێکەمەوە؟

٥٩٣٤/ 6462- **لێکردنەوەو خاوێن کردنەوە:** بە کەلک وەرگرتن لە دەرمانی تواندنەوەو بە باڵتراشێکی چوار لایە رەنگی لێکردەوەو خاوێنی کردەوە.

٥٩٣٥/ 5413- **لێکردنەوەو داماڵین، بڕینەوە:** خەڵکەکە پۆستێری رەسمی ئەیارەکانیان لێکردنەوەو دڕاندنیان.

٥٩٣٦/ 861- **لێکردنەوە، بەدەڵی پووڵێک، کەسێک لە کڕینی شتێک کشاندنەوە:** ئەگەر دەتەوێ پارەیەکم دەیەیو لە بەشداریکردن لەو سەودایەدا بکشێمەوە دەبێ بڵێم بە هەڵە چووی/ لێت تێکچووە؟

٥٩٣٧/ 863- **لێکڕینەوە:** بە کڕینەوەی سەهمی ئەندامانی شیرکەت بە نرخی ئەمڕۆی بازار، دەتوانن جێگایان بگرنەوە.

لێ کشانەوە ← کشانەوە.

لێک کۆبوونەوەو لێکۆڵینەوە ← وتووێژ کردن.

٥٩٣٨/ 4360- **لێک کردنەوە:** نەخشەی جادەکانی لێک کردەوەو لەسەر رانی دانا.

٥٩٣٩/ 1774- **لێک کردنەوە:** ناتوانی شتێکی ئەنتیکەو مردێلە تەزوویرەکەی لێک (جیا) کاتەوە.

٥٩٤٠/ 4269- **لێک کۆبوونەوە، لێک وەخربوون، لە دەوری یەک کۆبوونەوە:** لە ئاسایشگای سەربازان، هەموو ئەفسەرەکانی گوردان/ بەتالیۆن لێک کۆدەبنەوە (بۆ نانخواردنو ...).

٥٩٤١/ 2297- **لێک کۆبوونەوە، لە دەوری یەک وەخر بوون:** شاری بریکتون پڕ بوو لە ئەندامانی حیزبی پارێزگاران کە بۆ کۆنفرانسی ساڵانە لێک کۆببوونەوە.

لێک گەربوون ← تێکهەڵچوون.

٥٩٤٢/ 4302- **لێک نزیک بوونەوە:** پیاوە سیاسییەکان لە هەڵوێستی دژ بە یەکتر دووردەکەنەوەو بۆ رێک کەوتن لێک نزیک دەبنەوە. ✱ خەریکین بە "تفاهم" ێکی باشتر لە نێوان دوو وڵاتەکەماندا نزیک دەبینەوە.

٥٩٤٣/ 68- **لێک نزیک بوونی (دوو شت):** خۆشەویستیو نەفرەت لێک نزیکن.

لێک نزیک کردنەوە ← رێکەوتنێک کردن.

لێک هاتن ← پێکەوە هاتنەوە.

لێک هاڵان ← تێکەڵاو بوون دەگەڵ کەسێک، خولانەوە.

٥٩٤٤/ 6577- **لێک هاڵان، لێک هاوێشتن:** تۆزو خۆڵێکی یەکجار توند لێک دەهاڵاو دەچووە دەناو خواردەمەنییەکانمانەوە.

٥٩٤٥/ 7209- **لێک هاڵان، گلۆلە بوون:** هەتا جووڵابارەوە، لەبەر ئێشو ژانان لێک دەهاڵا/ گلۆلە دەبوو.

٥٩٤٦/ 247- **لــێ ... کەم کردنــەوە، هەوڵــدان لــەبوون**: پێــم وایــە ئەگەر تۆزێك ئــەو باغچەیــە بژارکــەی، هیچــت لــێ‌کەم نابێتەوە.
← داشکاندن.
لێك هەڵبەزینەوە ← قــە لێك هەڵبەزینەوە.
٥٩٤٧/ 2180- **لێــك هەڵوەشــان، دڕان**: لێـــك هەڵوەشـــانی ماشێنەکە سەیر نیە، قەت دیوتە چۆنی لێ دەخوڕی؟
←لەتلەت بوون.
٥٩٤٨/ 7378- **لــــێ‌کێشان، لــــێ‌هەڵکێشان، لێدەرکێشـــان، لێدەرهێنان، دەرهێنان**: ئەگــەر کەســێك بێتــە نێــو دوکانی‌و دەمانچەت لــێ‌بکێشێ، چۆن دژکردەوە لــە خــۆت نیشــان دەدەی؟
٥٩٤٩/ 5963- **لێگرتن (ی سەرقەپ یــان چەورییەو ...)**: شــۆرباوەکە زۆر چەورە. پێش ئەوەی تێی کەی، ڕۆنەکەی سەری بگرە.
٥٩٥٠/ 1399- **لێگۆڕان دەگەڵ ...**: ئەمن هەمیشە جان ریــت‌ــم دەگەڵ جان رایت لێدەگۆڕێ.
← لــێ‌تێکچوون.
٥٩٥١/ 4031- **لێگەڕان‌و دیتنەوە**: رەنگە لە یــەکێك لــە کۆنــە پارەکانی بگەڕێ‌و بی‌دۆزێتەوە.
٥٩٥٢/ 541- **لــێ‌گەورە کردنــەوە، گــەورە کردنــەوە**: ڕووداوەکــە وا نەبوو؛ لە گشت بارێکەوە گەورە کراوەتەوە.
٥٩٥٣/ 394- **لێــڵ بــوون، ڕوون نــەبوون، لــە گــاڵۆن حالــێبوون (بــۆ تێگەیشتن) دژوار بــوون**: شــتەکە کــەمێك لێڵــە؛ دەبــێ‌ عەدەسیەکە کەمێك لە کانوون وەلاچووبێ/ لای دابێ. ● ئەم چیرۆکە بۆ من کەمێك دژوارە/ باش تێی ناگەم.
٥٩٥٤/ 2716- **لێــڵ بــوون، لێــڵ هەڵگــەڕان**: کــابرای لـــە سەرەمەرگدا هــەرچی زیــاتر بــەرەو گیانــەڵا دەڕۆیشــت چاوەکانی زیاتر لێڵ هەڵدەگەڕان.
٥٩٥٥/ 4277- **لێڵ بوون یان لێڵ هەڵگەڕان**: بارەشــێنێك هــەوای گەرم بەرەو شووشــەی پێشــەوەی ماشێنەکە بەرێ دەکــا بــۆ ئەوەی نەهێڵێ (هەڵمی بگرێ‌و) لێڵ هەڵگەرێ.
ماندوو بوون ← وەڕەز بوون لە.
٥٩٥٦/ 2527- **لێمان گەڕێ! بڕۆ بابە!**: "ئەگــەر گرتــت دوێنــێ‌ چەندە بە پێیان ڕۆیشتم؟"، "دە مایل؟"، "نا، سی‌و دوو مایل!"، "بڕۆ بابە!".
٥٩٥٧/ 2419- **(لە بواری موخالەفە کردنێکی نــەرم، دۆستانە) لێمــان گەڕێ بابە!**
٥٩٥٨/ 2270- **لــێ‌مۆڕ بوونــەوە**: دەســتیــاری قوتابخانـــە لـــە کامەران مۆڕ بۆوە.
← بە تووڕەییەوە چاو لێکردن.
٥٩٥٩/ 2265- **لێنان، لێدروون، چەسپاندن**: زیــپێکــی تــازەم بــۆ لــێ‌نێ - کۆنەکەی خراپ بووە.
٥٩٦٠/ 1089- **لــێ‌نزیك بوونەوە، گەیشتنە سەر**: وادیار بــوو کــە دەنگی هاوەنان/ خۆمپاران هەروا نزیك دە بێتەوە. ● پێش ئەوەی بتوانین هیــچ ســەنگەرێکی دیفــاعی ســاز کــەین، دوژمن گەیشتە سەرمان.
٥٩٦١/ 2380- **لــێ‌نزیك بوونــەوە**: بەلــەمی پۆلیســـەکان لـــە قەپاغەکە نزیك دەبۆوە کە لــە قەپاغەکــەرا گوللەیــەکیان هاویشت.
← لــێ‌چوونە پێش (بە ئەسپایی) چوونە پێش، بە پارێزەوە لــێ‌نزیك بوونەوە.
لــێ‌نەبڕینەوە ← درێژ دادری کردن.
٥٩٦٢/ 4842- **لێوکردن، لێوهــەڵقرچاندن**: کــاتێك کــابرا داستانەکانی را دەگێڕاوە کە زۆر ئەبنە هۆی دڵە خورپــە، ژنە لێوی هەڵدەقرچاندو بۆی دادەنیشت.
٥٩٦٣/ 5110- **لێوەدەرکەوتن، لێ‌هەســتان**: تیشــکی خەتــەرناك لە پلوتونیۆم وەدەر دەکەوێ/ پلوتونیوم تیشکی خەتــەرناك لە خۆی وەدەر دەنێ/ دەدا.
← هاتنە دەر.
لێوەرگرتن ← لێدەرکێشان (ی زانیاری)، لــێ‌ئەستاندن.
٥٩٦٤/ 6617- **لێ‌وەرنەگرتــەوە، لێ‌ئەســتاندنەوە**: نــاکرێ ئــەو پیاوە تاوانبار بکەین کە بە ناڕەوا منداڵەکەی لــە دایکــی وەرگرتۆتەوە. بە زۆر هێز، ئەو ژنە ناتوانــێ، ناگــای لێــی بێ.
٥٩٦٥/ 6576- **لێوشاندن**: هەمــوو جارێ کــە بــە توندی لــە مێشــەکان دەوەشــێنێ، شووشــەی مرەباکــەی دەخــەی/ وەردەگێڕی.
← مــت لێدان.
لێوە لەرزە گرتن لە ترسان ← لە ترسان لێوە لەرزە گرتن.
لێوە هاتن ← دانەدەر.
لــێ‌هاتن ←هاتنەدەر، بەیەکەوە هاتنەوە.
لــێ‌هاتنە پێش ← نزیك بوونەوە لە.
٥٩٦٦/ 4776- **لــێ‌هاتنەدەر لە ماڵێ دەرپەڕین**: دووکــەڵ کێشــی کارخانەکان دووکەڵیان لێدەردەپەڕێ.
لێهاتوویی هەبوون ← توانایی هەبوون.
٥٩٦٧/ 1106- **لــێ‌هاڵان**: مارە بووناکە خــۆی لــە نێچیرەکــە هاڵاند، تێکی شکاندو کوشتی.

→ گەمارۆدان.

٥٩٦٨/ 7397- لێهاڵاندن، پێهاڵ لە: هۆشی لە جێگایەکی دیکە بوو؛ هەروا دەزوویەکی لە قامکی دەهاڵاند.

٥٩٦٩/ 1105- لێهاڵاندن: سیمەکەیان لە کۆیلەکە هاڵاندو کارەباکەیان هەڵکرد.

٥٩٧٠/ 7205- لێهاڵاندن: کاتێک ئەو قسەی دەکرد، سەیران لیسپێکی خوری لە قامکی دەهاڵاند.

٥٩٧١/ 2666- لێهەستان: بەردە رەژییەکە دووکەڵێکی وەهای لێ‌هەڵدەستا کە هێندەی پێنەچوو هەواکە بۆ نەفەس کێشان نەدەبوو.

→ دانەدەر، لێوەدەرکەوتن.

٥٩٧٢/ 2019- لێهەڵکەندن: لە لایەکی کاپەکە ناوی تیپەکانی بەشدار لە پێشبڕکێی پاڵەوانەتیدا هەڵکەندرابوو.

لێهەڵکێشان → لێکێشان.

لێهەڵگرتن → وەلابردن.

لێگەڕان → گەڕان بە شوێن شتێکدا.

لێهەڵوەرین → لێدەرکێشان.

٥٩٧٣/ 1870- لێهەڵێنجان، لێدەرکێشان: گۆشاری نێو یەکێک لە بەرمیلەکان زیادی دەکرد. بۆیە دەبوو هێندێک لە ناوەکەی دەرکێشن.

٥٩٧٤/ 5242- لێهێشتنەوە، زەعیف کردن (لە باری بەدەنیەوە/ رووحییەوە): چەندین هەفتە لەسەر لۆتکەیەکی/ قەیاغێکی سەرئاواڵە مانەوەیان، لە مەلەوانە زیندووماوەکانی بێجگە لە ئێسکو پێست هیچی دی نەهێشتبووەوە.

٥٩٧٥/ 2550- لێی گەڕێن بزانین چ دەکا: ئەگەر سیاسەتمەندو سەرچڵ پێیان وایە ئەو بووتیکە باشتر بەڕێوە دەبەن، زۆر باشە، تەنیا پێیان دەڵێم: باشە، بزانین چ دەکەن.

ماتڵ کردن → چاوەڕوان هێشتنەوە یان راگرتن.

٥٩٧٦/ 3647- ماچ کردن و پاک کردنەوە: چاو چت کردووە! خۆم حازر کردبوو بچمەدەرو ئەتۆش ماچت کردمو هەموو ماتیکەکەت پاک کردمەوە! لەوەش خراپتر هەمووت دە دەموچاوی خۆت هەڵسووە!

٥٩٧٧/ 3646- ماچ کردن و وەلابردن: ئالفرێد، لە حاڵێکدا کە نیشانەی غەمو پەژارەیەکی زۆر لە نێوچاوانی دەباری/ دیاربوو هاتە ژوور. ژنەکەی لە داکەندنی/ دەرهێنانی پاڵتۆکەی یارمەتی داو دەیویست بە ماچان غەمو پەژارەکەی وەلابەرێ.

ماچ کردنی دەستی کەسێک → دەستی کەسێک ماچ کردن.

٥٩٧٨/ 4235- مارکی هاتنەخواری نرخ لێدان، ڕیکەوتن: زۆربەی ئامرازەکانی ماڵ لە هاوینە هەرزاجی فرۆشگە گەورەکانی لەندەن مارکی هاتنە خواری نرخیان لێدەدرێ.

٥٩٧٩/ 5506- ماشێنی چکۆلە: لە دەست ئەو واگۆن ستەنشێنیە زەلامە جارز بووین. لە هیچ کوێ پارک ناکرێ. ماشێنێکی کە بۆ ئێمە باش بێ، یەکی چکۆلەیە کە بتوانێ بە نێو ترافیلدا بە جوانی خوارەو پێچەکەی بکا.

٥٩٨٠/ 3209- مافی/ حەقی داراییوڵی شتێک هەبوون، مافی بەهرەمەند بوون لە شتێک هەبوون: فەرانسەش بە قەرا بریتانیا مافی ئەوەی هەیە چەکی ناووکی/ ئەتۆمی هەبێ.

→ بەهرەمەند کردن لە مافێک.

٥٩٨١/ 2042- مافی ... پێدان: نازانم ئایا پلەو پایەی ئەو کابرایە مافی ئەوەی پێ دەدا کە لە لایەن دادگاوە بە شێوەیەکی تایبەتیی رەفتاری دەگەڵ بکرێ یان نا؟

٥٩٨٢/ 463- مافی (بەرزوەبردنی) کارێک هەبوون: ئەگەر لەو خزمەتانەی پێت دەکرێن رازی نەبی، دەتوانی پەیمانەکە هەڵوەشێنیەوە.

٥٩٨٣/ 4284- ماکێت: دەمەوێ لە گرووپان نیلسۆن بۆ ئەو ماکێتە باشەی کە لە بەلەمێکی دروستی کردووە سوپاس بکەم.

٥٩٨٤/ 1795- ماڵداری کردن، ماڵ بەڕێوە بردن: ناتوانن کارەکەری بگرن، بۆیە ناچارن بۆ خۆیان ماڵێ بەڕێوەبەرن.

→ ماڵداری کردن.

ماڵگاز → سلۆلی.

ماڵ لە جێگایەک بوون → ژیان لە.

٥٩٨٥/ 3966- ماڵ لە کۆڵ بوون، سەلیم چل کۆچ بوون: کاری ئێمە لەوە زویاتر نیە؛ ماڵ لە کۆڵی.

٥٩٨٦/ 4908- ماڵو حاڵێک پێک هێنان: هەرکە ژنم هێنا، ماڵو حاڵێک پێک دێنمو شێوەیەکی دیاری کراو لە ژیاندا رەچاو دەکەم.

ماڵی کەسێک بوون → پێوەندی هەبوون بە.

٥٩٨٧/ 4054- ماڵی کەسێک دیتنەوە: قەولم پێ‌داوە ئەگەر ئەوجار بچمە لەندەن ماڵەکەی ببینمەوەو سەری لێ‌هەڵێنم/ سەری بدەم.

ماڵین → گەسک لێدان.

٥٩٨٨/ 1642- **مامەڵە کردن، دانوستان کردن دەگەڵ، سەروکار هەبوون دەگەڵ:** لەمێژساڵە دەگەڵ ئەو شەریکەیە مامەڵە دەکەین و دەتوانین زۆر چاک بە ئێوەی بناسێنین.

٥٩٨٩/ 7175- **مامەڵە کردن، دانوستان کردن:** لەو کاسبییەدا کە ئەمن دەیکەم، مامەڵە کردن/ دانوستان دەتوانێ بە شێوەیەکی بەرچاو کەم و زیاد بێ- بۆی هەیە لە ساڵێکدا یەك میلیۆن پۆند مامەڵە بکەم و ساڵێکی دیکە سەدهەزار.

٥٩٩٠/ 1815- **مامەڵە کردن دەگەڵ، دانوستان کردن دەگەڵ:** پیاو هەر پێی خۆشە دەگەڵ شەریکە بریتانیاییەکان مامەڵە بکا....

٥٩٩١/ 4224- **مامەڵەیەك دەگەڵ کردن:** مامەڵەیەکت دەگەڵ دەکەم. ئەگەر بێتو قازانجەکەمان دەگەڵ بکەیە دوو بەش، دەتوانی نەخشەکانمان لێوەرگری.

٥٩٩٢/ 3286- **مان، هەبوون:** هەتا ئەو کاتەی زەخیرەی ئاو و خواردەمەنیمان مابێ، لێرە دەمێنینەوە.

٥٩٩٣/ 4053- **مانەوە وەك (کەلەپەمان) لە فەرهەنگدا بیتەوە، لە مانەوە ... لە فەرهەنگدا گەڕان:** فەرهەنگێکی گەورە و بە دەستەوە دەگەڕێتەوە، بۆی دادەنیشێ و لە مانای وشان دەگەڕێ.

٥٩٩٤/ 891- **مان پێ گرتن، وادار کردن بە دەست کێشانەوە لە کار:** لە پێوەندی دەگەڵ داواکارییەکانیان سەبارەت بە پارەمەتییە مانگانەکانیان، بۆی هەیە ڕانەندەکانی پاسەکان وادار بکرێن دەست لە کار بکێشنەوە.

٥٩٩٥/ 698- **مان پێ گرتن، دەست پێ لە کار کێشانەوە:** شاگردەکانی مرەمەنییسی هانلوە مان بگرن.

٥٩٩٦/ 7322- **ماندوو بوون (لە باری بەدەنییەوە یان لە باری ڕووحییەوە):** "پێم وابوو مایك کەمێك ماندووە"، "سەیر نیە، دوای ئەو هەموو درەنگ خەوتنانە".

٥٩٩٧/ 1824- **ماندوو بوون، لە پێ کەوتن، لە لاق کەوتن، ڕەجەل لێ بڕان، ڕەجل لە بەر دانەمان، شەکەت بوون:** ناسترن، هەرکات پێت خۆش بوو، برۆ بنوو. دیویس: پێم وایە بەوێ، کەمێك ماندووم.

٥٩٩٨/ 422- **ماندوو بوون لە، وەڕەز بوون لە، جاڕز بوون لە:** لە خولانەوە (لە نێو شاردا) لە بەیانییەوە هەتا ئێوارێ و هەروا چاوەڕوانی هاتنی ئەو بوون، بە تەواوی وەڕەزی کردووم.

← وەڕەز بوون، شەکەت بوون.

٥٩٩٩/ 567- **ماندوو کردن، شەکەت کردن، ئالۆز کردن (ی مێشك):** نامەوێ بە بیرکردنەوە لەو ڕۆژانە خۆم ماندوو کەم.

٦٠٠٠/ 3703- **ماندوو کردن، شەکەت کردن، لە پێ خستن، لە خۆش خستن:** تکایە هەوڵ مەدەن بە ڕۆژێك هەموو باخچەکە بکێڵن، خۆتان شەکەت دەکەن.

٦٠٠١/ 6744- **ماندوو کردن، تێك شکاندن لە باری ڕووحییەوە:** لە ئیزدواج کردندا کە شکستت خواردووە، دەبێ لە باری ڕووحییەوە تێك شکابێ.

٦٠٠٢/ 2101- **ماندوو کردن، لە پێ خستن، لە لاق خستن، ڕەجەل لێ بڕین:** سەرانسەری ڕۆژێ لەسەر پێ ڕاوەستان، بەراستی پیاوی ماندوو دەکا.

← لەپێ خستن.

٦٠٠٣/ 5534- **ماندوو و مردوو بوون، ڕەجەل لێبڕان، لە پێکەوتن، وردو خاش بوون، شەکەت بوون، لە شان و پەل کەوتن:** کاتێك لەو وەزعییەتە پڕ لە کرێوەرییە ڕزگاری بوو، ڕەجلی لێبڕابوو/ وردو خاش ببوو.

٦٠٠٤/ 522- **ماندوویی (ڕووحیی) دەرکردن، حەسانەوە:** زۆر لەمێژە خۆت لەو هۆدەیەدا زیندانی کردووە. شتێکی کە زۆر بۆ تۆ پێویستە ئەوەیە کە یەك - دوو هەفتە بچێ دەرێ و بۆی وەحەسێی.

٦٠٠٥/ 7287- **مانگرتن، خۆ لە کار کێشانەوە، دەست لە کار کێشانەوە:** کرێکارانی خانووسازی بۆ دەربڕینی نارەزایەتی لە بەرامبەر دەرکرانی بەننایەك دەستیان لە کار کێشاوە.

٦٠٠٦/ 46 **مانگرتن (لە شوێنی کار):** یەکێك لە شەرکەتەکان لەم هەفتەیەدا دانی بەوە داهێنا کە سەبارەت بەو کرێکارانەی کە لە کارخانەدا مانیان گرتبوو ڕاپۆرتی داوە بە دایرەی تایبەتی.

٦٠٠٧/ 6441- **مانگرتن لە دژی:** ئەو ئاڵوگۆڕەی لە پێوەندی دەگەڵ کاری بە کونتەراتدا پێشنیار کراوە بێگومان شتێکە کە کرێکارەکان لە دژی مان دەگرن.

٦٠٠٨/ 6445- **مانگرتن بۆ:** کرێکارانی سەنعەتی مونتاژ بۆ خاتری باشترکردنی حەقدەستی کاری زیادیان دیانەوێ مان بگرن.

← دەست لە کار کێشانەوە، هاتنە دەر.

٦٠٠٩/ 3463- **مانۆڕدان، پاڵ پێوەدان:** لە خولی یەکەمدا، دەوەندەکان بۆ ئەوەی خۆیان بگەیەننە خەتی ژووری پاڵیان پێکەوە دەنا و پێچەو خوارەکەیان دەکرد.

٦٠١٠/ 6302- **مانەوە، نەڕۆیشتن:** پاش تەواو بوونی وتاردانەکە چەند کەس لە خوێندکارەکان بۆ پرسیارکردن

مانەوە. ● دەکرێ یەکێکتان بێنێنەوە بۆ یارمەتیدان بۆ شوشتنی قاپەکان.

٨٠١١ 6313- مانەوە (لە قوتابخانە پاش جێگای گەورە): لە قوتابخانەی سەرەتایی دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی کە گەواهیی "پلەی یەکەم" وەرگرێ.

٨٠١٢ 6399- مانەوە، نەرۆیشتن: لە تەماشاچییەکانیان داوا کرد بۆ باسکردن لەسەر شانۆکە دەگەڵ نووسەرەکەی بمێننەوە.

٨٠١٣ 6408- (لە جێگای دەرس خوێندن) مانەوە: بۆ وەرگرتنی یارمەتیی دەرس خوێندن، چیا ساڵێکی دیکەش لە پۆلی شەشەمدا مایەوە.

٨٠١٤ 6404- مانەوە (لە قوتابخانە بۆ تەمبێ)؛ ئەگەر جارێکی دیکە گوێم لەو قسە خراپانە بێ، هەموو پۆلەکە دوای سەعاتی چوار دەبێ بمێننەوە.

٨٠١٥ 6402- مانەوە (بۆ نانخواردن لە ماڵی کەسێک): بۆچی بۆ نانی شەوێ نامێننەوە؟ بێگومان تاسکەبابەکە بەشی چوار کەسان دەکا.

٨٠١٦ 407- مانەوە، زیاتر مانەوە: دوای تەواو بوونی کارەکەت، ئەگەر ژیلوان ماوە بۆم راگرە.

٨٠١٧ 3836- مانەوە (ی بەشێک لە شتێک)، پاشماوە، بەرماو: ئەو هێزە هەرچی پێویستی بێ، دەبێ بیدرێتێ، باقی لەشکرەکان دەتوانن بەوەی کە ماوەتەوە هەرچی لە دەستیان دێ بیکەن. ● منداڵە گەورەکان زۆرترین بەشیان وەبەرکەوت و ئەوانی چکۆلەش ناچار بوون بە پاشماوەکە رازی بن.

٨٠١٨ 3940- مانەوە، نەرۆیشتن، درێژکردنەوە (ی مانەوە/ قسەکردن): شەماڵ هەر نەدەرۆیشت و تەنانەت سێهەمین نیو بوتریشی خواردەوە.

٨٠١٩ 5288- مانەوە، نەرۆیشتن: هێندێک لە ئەندامانی کۆمیتە پێشنیاریان کرد دوای تەواو بوونی کۆبوونەوە بۆ یاریدەدان بە خاوێن کردنەوەی جێگاکە بمێننەوە.
← نەرۆیشتن، خۆ وەدواخستن.

٨٠٢٠ 6305- مانەوە بۆ نانخواردن: بریاریان دابوو بۆ شێو بمێننەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە خواردەمەنییان بە ئەندازەی پێویست نەبوو، ترووسکە دەستی کردبوو بە بۆڵەبۆڵ.

٨٠٢١ 6298- مانەوە لە، ژیان لە: بە باکووری ئینگلیستاندا دەگەڕاو، هەرجارەی بۆ ماوەی چەند شەو رۆژان لە هۆتێلێک دەماوە.

٨٠٢٢ 6396- مانەوە لە: بۆ ماوەی دوو هەفتان لە کەمپێکی هەڵکەوتوو لە باشووری دەریاچەی گالرا ماینەوە.

٨٠٢٣ 3579- مانەوە لە ... دا، گیرکردن: رەفیقەکەم بە هۆی ئەوە کە نزیمەتیی هاتبوویە لە جێگاکەیدا گیرابوو.

٨٠٢٤ 6311- مانەوە لەسەر خۆراگرتن لەسەر: ناتوانن هیچ بارێکی گەورە لە سەر باربەندی بارکەن. لە بای توندا، یان ئەگەر توند لێیخوڕێ، بارەکە خۆ راناگرێ.
← لە جێگایەکی چکۆلەدا مانەوە.

٨٠٢٥ 381- ماوەیەک لە کێشان، ماوەیەکی دیاریکراو نەرۆیشتنی رووداوێک هاتنە پێش: هێشتا نیو سەعات نەبوو کە فڕۆکەکەمان لە فرودگای ... هەستا بوو کە مۆتۆرەکەی تووشی گڕوگرفت بوو.

٨٠٢٦ 4943- مایەدانان (بۆ باشتر کردنی شتێک)، شادتر و خۆشتر کردن: ئەگەر دەتانەوێ حەشیمەتێکی زۆرتر بۆ لای بەرنامەکەتان راکێشن، دەبێ زیاتر لە خۆتان مایە دانێن/ بەرنامەکەتان شادتر و خۆشتر بکەن.
مایەکووپی کردن ← کوتان.
مر بوون ← پەنگاو (پێ) خواردنەوە.
مردن ← ئەمری خودا بەجێهێنان، چوون دەمەبرییەوە.

٨٠٢٧ 7102- متمانە پێکردن، بروا پێ هەبوون یان پێ کردن: پێم گوتی باوەڕی پێناکەم- ئەوە دیسانیش ناهومێدی کردین.

٨٠٢٨ 6669- متمانە پێکردن: هاتبۆوە سەر ئەم بروایە کە متمانە بە چیای بکار دەربارەی وەزعی ناڵەباری خۆی پرسوڕای پێبکا.
← باوەر پێکردن، بروا پێکردن، ئەسپاردن بە کەسێک.

٨٠٢٩ 183- متمانە کردن بە، لەرخەیان بوون (لە): دەتوانی لەو خوریە سپیانە ئەرخەیان بی. ● ئەگەر ناچار بن لە ناکاو راوەستێن، ناکرێ لەو تورمەزانە/ برێکانە ئەرخەیان بن.

٨٠٣٠ 1392- متمانە کردن بە، نهێنی لە لای کەسێک درکاندن: کچی ئەم سەردەمە زۆر کەم نهێنییەکانی خۆیان لە لای دایکیان دەدرکێنن.

٨٠٣١ 3166- متمانە کردن بە، متمانە هەبوون بە، بروا هەبوون بە: ئەو کورە بروایەکی ئەوتۆی بە خۆی نیە. ● دەنگەکان دەری دەخەن کە مەجلیس متمانەیەکی بە دەوڵەت نیە.
← بروا کردن بە قسەی کەسێک.
عەللەق لێدان ← وەرگەڕان.

٨٠٣٢ 4066- متمانەی خۆ سەبارەت بە لە دەست دان: مشتەرییەکان سەبارەت بە توانایی ئێمە لە پێوەندی

دەگەڵ تەحویلدانی بەوەختی شتومەك متمانـەی خۆیـان لەدەست دلوە.

٨٦٠٣٣ 4696- مردن: لە قسەکردن دەربارەی دراوەکانم دەست هەڵگرن؛ جارێ نامرم.

٨٦٠٣٤ 4433- (بە تەعبیرێکی بەڵشـەوە) مردن. لـەمری خودا بـەجێ هێنان. لەم جیهانە بەجێ هێشتن. خودا عەفوو کردن: گوتـی "ئەگـەر بزانێ ئاغای ... ئەمری خوای بەجێ هێنـاوە، زۆر بـەداخ دەبێ".

٨٦٠٣٥ 1709- مردن، لە نێو چوون، تەواو بوون (یەك لـە دوای یـەك): کەم ناوبیی نارچەکـەی داگرتبـوو، حەیوانـە کێوییـەکان یەك بە دوای یەك دا دەمرن.

٨٦٠٣٦ 1404- مـردن، لـەکـار کـەوتن: بـۆی دژوارە بچێتـە سەرکارێ؛ لە مانگی نوامـبردا لەبەر ئـەو کـە هەنگـەی هێندەی نەمابوو بری.

٨٦٠٣٧ 514- مـردن (بـە هـۆی خوێـن لەبـەر رۆیشـتنەوە، خوێنرێژییەوە): رەگـی ملـی پسـابوو، بـە هـۆی خوێنرێژییەوە لە نێو گوڵە وەنەوشاندا مرد.

٨٦٠٣٨ 5122- مردوو زیندوو کردنەوە: لە نێو ردێن سـپییەکانی تیلەکەدا کابرایەك بوو کە دەیـانگوت دەتوانـێ مـردووی زیندوو کاتەوە.

٨٦٠٣٩ 1707- مـردن بـە هـۆی، پێـمردن: ئـەو نەخۆشـییەی پێی‌مرد لەو سەردەمەدا دەرمانی نەبوو.

٨٦٠٤٠ 2901- (بە تەعبیری جوان) مردن، رۆیشتن: سـارا، شـتێك کە بۆتە هۆی ئەوە کە بە دڵێکی ناسـوودەوە بـمرم ئەوەیـە کـە دەزانم دوای مـن ئێـوە لـەباری ماڵییـەوە دوچـاری گیروگرفت نابن.

← ئەمری خودا بەجێ‌هێنان.

٨٦٠٤١ 4789- مۆ لێدان (زۆر توند): پیرە پیاوە کـە لـە فکـران راچووبوو، مۆی زۆر قووڵی لە پایەکەی/ پیپەکەی دەدا.

٨٦٠٤٢ 4777- مۆ لێدان: بە بێزارییەوە مۆی لە سـیغارەکەی دەدا.

← هەڵمژین.

٨٦٠٤٣ 6514- مژین و هەڵکێشان: (هـەرجارەی) بەشـێکی زۆر لە دەغڵو دانەکە بە سـۆندەی گـەورە هەڵدەکێشـنە نێـو ئاسانسۆرەکە.

٨٦٠٤٤ 4708- مست لێدان، داگرتن بـە مستان، وەبەرمسـتان دان: ئەرێ ئەو کابرایە بۆ ئەوەی مەسـەلەکانی گرنـگ نیشـان دا، دەبێ هەموو جارێ مێزەکە وەبەرمسـتان بدا؟

٨٦٠٤٥ 2475- مست لێدان، زەربـە لێـدان، لێهێنانی (قاڵب لێکردنەوە (بە زیاتر)): رەشبەری پاڵەوانەتیی ئەوەندە لە خولیێ بوو کە تەنانەت نەیتوانی مستێکیش بوەشێنێ.

٨٦٠٤٦ 3686- مست لێدان و بێبەزەیی کوتان، لـە کـۆڵ نەبوونەوە: جـۆ فریزیر لە خولی یەکەمی یارییەکەدا ئەمبارە تازە کارەکەی ناك ئەوت کرد.

٨٦٠٤٧ 2689- مستەکەر کـردن، قورسـاییەکی زیاتر دان بە: ئـەو مەسـەلەکە لە سـەعاتی ١٠ی شـەوێ رادیـۆ تەلـەفیزیۆنی داوەتەوە قورسایەکی زیاتر دەدا بەو ئیددیعایـە کـە لـەو شەوەدا لە ماڵ وەدەرنەکەوتووە.

٨٦٠٤٨ 6475- مشتومڕ کردن دەگەڵ، لێك هـەبوون دەگـەڵ: پێـش ئەوەی مەبلەغە سـازکراوەکەی لـە دەفتـەری حیسـاباندا بنووسێ، ماتیوس دەگەڵ وەکیلانی خۆی کورتە کێشەیەکی بوو.

← دەمەقاڵە کردن دەگەڵ.

٨٦٠٤٩ 2845- "مشرب"ی مەدەنیك دە مەدەنیکی دیکەدا هەبوون.

معالجە کردن ← دەرمان کردن.

معامەلە کردن ← دانوستان کردن.

مفت نەستاندن ← لێدەرکێشان.

مل بۆ شکست راکێشان ← شکست خواردن.

٨٦٠٥٠ 3564- مـل بـۆ یاسـا و داب و نەریتـە کۆنە ئەخلاقییـەکان راکێشان، رێز لە یاسا و رێسا گرتن، رێز دانان بـۆ یاسـا و رێسا: ئێمـە هـەمووەمان رێزمـان هـەبووە بـۆ یاسـا و ریسـاکان. لـە بنەماڵەی ئێمە هەرگیز قەباحەتێك رووی نەداوە، هیچ کام لە ئێمە دادگایی و زیندانی نەکراوین، هیچ کەس لە ئێمـە نەچۆتە مەحکەمە بۆ تەڵاقدان و تەڵاق وەرگرتن.

٨٦٠٥١ 4254- مل بە ملە کردن، بەرامبـەری کـردن: خـۆی ئامـادە کردووە کە لە زەمینەی هێزو لێزانییەوە دەگەڵ ئەوانـەی تازە دێن مل بە ملەی بکا.

٨٦٠٥٢ 6476- مل بە ملـە کـردن دەگـەڵ کەسـێك لەسەر شتێك: دوو پیاو لەسـەر قوتوویـەکی چکۆلـەی جەواهێرات مـل بـە ملەیان بوو.

مل دەبەر ملی کەسێك نان ← بەشەڕ هاتن دەگەڵ.

مل راکێشان بۆ ← قبووڵ کردن.

٨٦٠٥٣ 21- مل راکێشـان بـۆ، رازی بـوون، هاتنەپێشـەوە: دەیگـوت هەرگیز بەوە رازی نابێ کە دوژمنە لە مێژینەکەی ببێتـە سەرۆکی شیرکەت.

٨٦٠٥٤ 5885- ملمالانە، بەرەورووی یـەك بوونـەوە، تـاقی کردنـەوەی هێز: لەسـەر بـەرەورووی یـەك بوونـەوەی دەوڵـەتو

یەکیەتی‌یە (کرێکاری‌یە) کـان ڕۆژنامـەکان زۆریـان شـت نووسیوە.

٦٠٥٥ 7248- **ململانە کـردن، ڕەقەبـەری کـردن دەگـەڵ، ڕق بـە ڕقـە کردن:** دوو شەریکەی ئەندازیاریی بۆ گرتنـەوەی بـازارێکی ئاوا بە نرخ رق بە رقەیان دەکرد.

٦٠٥٦ 1421- **ململانـە کـردن بـۆ:** ئەمسـاڵ چـەند تیـم بـۆ بردنەوەی کاپی قارەمانەتیی ململانە دەکەن.

٦٠٥٧ 1364- **ململانە کردن بۆ:** هەموو یانەکانی/ باشـگاکانی ئەندامی یەکیەتیی فوتبال دەتوانـن بـۆ بردنـەوەی کـاپی نیف نی ململانە بکەن.

ململانێ کردن دەگـەڵ ← شـان لـە شـانی کەسـێك دان، ڕەقەبەری کردن دەگەڵ، چاولێکەری کردن.

٦٠٥٨ 3766- **ملهوڕانە قسە کردن:** سەربازان ئەو مافەیان پـێ نەدراوە لە مەسـەلە سیاسـی‌یەکاندا ملهوڕانە قسـە بکەن.

ملهوڕی کردن لە بەرامبەر ← دژایەتی کردن دەگەڵ.

٦٠٥٩ 4328- **منداڵێك بە ناوی کەسێك کـردن:** منداڵەکـەیان بـە ناوی دایکیان کردو ناوی ماری‌یان لەسەر دانا.

٦٠٦٠ 10- **موافەقەت کـردن (دەگـەڵ) قبـووڵ کـردن:** بەداخـەوە، کۆمیتە ناتوانێ دەگەڵ داخوازەکەت سەبارەت بە مانگێك پشوودانی بێ یارمەتی موافەقەت بکا.

٦٠٦١ 2144- **موافەقـەت کـردن:** کـاتێك بەرپرسـی کۆڕەکـە پێشـنیاری کـرد بوودجـەی "تـسـهیلات" کـەم کەنـەوە، زۆربەی ئەندامانی کۆڕ موافەقەتیان کرد.

← هاتنە سەرێ.

موافیق بوون ← پێ‌خۆش بوون، دەگەڵ بوون.

موافیق بوون دەگەڵ ← هاوبیر بوون (دەگەڵ).

٦٠٦٢ 6484- **موتاڵا کـردن:** ئـەو لـە کـاتی بێکـاری‌دا بـۆ وەرگرتنی لیسـانسـی ئابووری موتالا دەکا.

٦٠٦٣ 6591- **موتاڵا کردن، خەریکی موتاڵا بوون (زۆر بـە توندیـی):** هەموو شەوێ زۆر بە توندی خەریکە بۆ بەشداری کردن لە تاقیکاری بۆ هەڵبژێران بۆ پارێزەریی موتالا دەکا.

٦٠٦٤ 399- **موجـاز لـەبوون، لـە چوارچێـوەی یاسـا دەرچـوون:** بـە بـڕوای دادوەر/، دادسـتان کـە باسـی ژیـانی تایبـەتیی تاوانباری هێنا بووە گۆڕێ لە چوارچێـوەی یاسـا دەرچـوو بوو.

٦٠٦٥ 6253- **موخالیف یان دژی ... بوون (زۆر بە توندی):** حـیزبی یەکیەتی بە تەواوی دژی ئەو سیاسـەتەیە کە بە بڕوای ئەو بۆی هەیە سەرەنجام لـە یەکگرتنـەوەی بـاکوورو باشـوور سەردەرێنێ.

موحاکەمە کردن ← دادگایی کردن.

موحاکەمە کران ← دادگایی کران.

موحتاجی ... بوون ← پێویستیی هەبوون بە.

موخابەرە کردن ← ناردن.

موخالەفە کردن ← دژ بە مەسـەلەیەك ڕاوەستان، دژایەتی کردن دەگەڵ... ڕاوەسـتان.

٦٠٦٦ 6341- **موداخەلـە کـردن (بـۆ یارمەتیدان یـان پێشـگرتن):** یەکیەتی (ی کرێکاران) موداخەلەی کردو مانگرتنەکـەی کردە ڕەسمی.

٦٠٦٧ 288- **مۆد بـوون:** ئـەو شـێوە لیبـاس (یـان کـارو کردەوانەی) کە ئێسـتا وەك تازە دێنە بەرچاو، بۆیان هەیە سی ساڵ لەمەوپێش زۆربەیان مۆدی ڕۆژ بووبن.

← باو بوون.

مود کردن ← بەرە پێدان.

مۆدی ڕۆژ بوون ← تازە بوون.

٦٠٦٨ 4620- **موو (پرچ) ساف بەرەوبالەوە:** ئـەندامانی باندەکـە ژاکێتی چەرمیان دەبەر دابووو پرچەکانیان سـاف بەسـەر گوێدا بەردابۆوە.

٦٠٦٩ 4648- **موزاحیم بوون، نارەحەت کردن، بەدفەڕی کـردن:** ئـەو شانەم زۆرم نارەحەت دەکـا. ● منداڵـەکان هـەتا توانیـان بەدفەڕی‌یان کرد.

٦٠٧٠ 4161- **(قیژەقیژ کردن و) موزاحیم بوون:** منداڵـەکان بـەو قیژەقیژەی وەڕێیان خستووە بەراستی موزاحیمن.

٦٠٧١ 2618- **موزاحیم بوون، وێڕان:** نازانم ئەو کابرایە چیتـی کە هەمیشە ڕێم دەگرێ.

٦٠٧٢ 4968- **موزاحیمی کاری کەسێك بوون، پێش بـە کـاری کەسێك گرتن:** دەیەویسـت بنووسـێ، بـەڵام هـەراو هوریـای بەرپەنجەرەی نەی‌دەهێشت کارەکەی بکا.

٦٠٧٣ 4944- **موزاحیمی کەسێك بوون، بـوون بـە ملـوزم لـە کەسێك:** ژنەکە نەیدەبەخشی و ئەگەر پیاوەکە ئەو تۆسقاڵە هیوا بە خۆبوونەشی لـە دەسـت دابـا، ژنەکـە پێی‌خـۆش دەبـوو. بەهەرحاڵ دەکرێ بڵێین ژنە لێی‌ببوو بە ملۆزم.

٦٠٧٤ 4007- **موعاینە کردن، چاو لێکـردن:** دەبـێ بـەدەی ئـەو ماشێنەی چاو لـێ‌کەن.

موعتاد بوون ← فێر (ی "مواد مخدر") بوون.

موقاومە کردن ← توند گرتن، خۆ ڕاگرتن.

٦٠٧٥ 436- **موقەدەر بوون، هـەر پێـدا ڕوودان:** وێدەچـوو شـتێك ڕوو بـدا. ڕەسـتووڕانی هوتێلـەکان پـر بـوو لـە دەنگـۆی ناڵوگۆڕێکی گرنگ کە بە دەستەوە بوو.

٨٠٧٦ 3248- **مۆڵدان، لێك وەخەر كردن:** مەیلە ئەو پیاوانە لە دەوری بارەكە كۆ ببنەوە. * قوتابیییەكانیان لێك وەخەر كردبوونەو دوایەش بۆ سوار كردنیان لە كەشتی ڕێنوێنیییان كردن.

٨٠٧٧ 7294- **مومارەسە كردن، تەمرین كردن، تەدریب كردن:** دوای نانی نیوەڕۆیە، دەمەوێ برگەی دێرەزمە مومارەسە بكەم.
مومارەسە پێكردن ← ڕاهێنان.

٨٠٧٨ 7463- **(لە وەرزشدا، بەتایبەتی لە وەرزشی بۆكسدا) مومارەسە كردن، تەمرین كردن، تەدریب:** محەمەدعەلی كلیی ئەمڕۆ بەیانی دوای تەمرین كردن، دەگەڵ هەواڵنووسان وتووێژی كرد.
مومارەسە كردن (لە شانۆگەریدا) ← بۆ خوێندنەوە، پێداچوونەوە، بەڕێوە بردن.

٨٠٧٩ 348- **مومكین نەبوون، موجاز نەبوون:** بە ئاغای وەزیرم گوت كە لە چوارچێوەی بەرتەسكی ٦٠٠ میلیۆن پۆندا ناكرێ پێشنیار بدەین -مومكین نەبوو (زیادتر بكرێ).

٨٠٨٠ 6521- **موناسب بوون بۆ، هاتنەوە دەگەڵ، بۆ یەك بوون، دەڵێی پێكەوە كوڵاون:** لێك جیا بوونەوەی ئالفرێدو ماری-م هیچ پێ سەیر نەبوو. هەرگیز پێم وانەبووە كە ئەو دووانە بۆ یەك دەبن.
← لەبار بوون بۆ،خوێندنەوە دەگەڵ.
موناقەشە كردن ← باس‌كردن.
مونتاژ كردن ← وەسڵ كردن، ڕێكوپێك كردن.
مونج دانەوە ← وەكوڵ هاتن.
موهیم بوون ← گرنگ بوون لەبەرچاوی.

٨٠٨١ 748- **مەهار كردن، هێنانە ژێر كونتڕۆڵەوە:** لە ماوەی كەمێك زیاتر لە سەعاتێكدا، پێنج دەزگا ماشێنی ئاگركوژاندنەوە، ئاگرەكەیان مەهار كرد.

٨٠٨٢ 2617- **مەهار كردن، هێنانە ژێر كونتڕۆڵ:** تاقمی ئاگر كوژاندنەوە لە ماوەی چەند دەقیقە دوای ڕاگەیاندنی مەترسییەكە، زۆر بە خێرایی ئاگرەكەیان مەهار كرد.

٨٠٨٣ 3593- **مەهار كردن، پێشی بڵاوبوونەوەی ... گرتن:** لە ئاكامی هەنگاوە خێراو بەجێیەكانی كاربەدەستان دا، پێشی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی خورژێكەیان گیرا.
← كونتڕۆڵ كردن، پێشگری كردن لە، لەژێر كونتڕۆڵ دابوون، زاڵبوون بەسەر...دا.

٨٠٨٤ 1693- **مەئموورییەت دان بە، ئەسپاردنی كارێك بە:** كاری نیگابانیان بە شەش كەس لە پیاوەكان ئەسپارد.

← ناردن.

٨٠٨٥ 62- **مەبەستێكی تایبەتی هەبوون، نیازی شتێك بوون:** لەو هەڵسوكەوتی ئەو كچە سەردەرنایەنم، مەبەستی چییە؟ (چی دەوێ).

٨٠٨٦ 3930- **مەحدوود كردن، بەرتەسك كردنەوە:** لەبەر مەسەلە ئەمنییەتییەكان، ژمارەی ئەو كارتانەی دابوویان ئەیان هێشتبوو لە دەیان تێپەڕێ.
مەجبوور كردن ← ناچار كردن.
مەحدوود كردن (ی كەسێك) ← دیوار كێشان لە دەوری، بەرتەسك كردنەوە.

٨٠٨٧ 2340- **مەحكووم بە شكست بوون، شكست لە نێو چاوان نووسران:** گەڵاڵەكە هەر لە پێشدا مەحكووم بە شكست بوو/ هەر دەبوو شكست بخوا چونكە كۆمپانییە گەورەكان پشتیوانیان لێ نەكرد.

٨٠٨٨ 1383- **مەحكووم كران بە:** ئەو دوو پیاوە بە هۆی جەردەیی گوناهبار ناسرانو بە چوار ساڵ زیندان مەحكووم كران.

٨٠٨٩ 5737- **مەحكووم كردن بە، سزادان بە:** دادگا بە دە ساڵ زیندان بەكاری دژوارەوە مەحكووم كرد.

٨٠٩٠ 2368- **مەحكووم كردن (بە توندی)، ڕەخنە لێگرتن (زۆر توند)، بەسەر داڕووخان:** ئێمە لە هەموو مینبەرێكەوە گوناه كردن بە توندی مەحكووم دەكەین.

٨٠٩١ 1436- **مەحكووم كردن:** ژنەیان بە تاوانی كوشتنی دایكی مەحكووم كرد.
مەحو بوونەوە ← لەبەین چوون.

٨٠٩٢ 1555- **مەرایی كردن لە بەر، كاكە سووتە كردن لەبەر، كڕنۆش كێشان بۆ:** ئەگەر نەتوانم بۆ خۆم شتێك وەدەست بێنم، دەگەڵ نەبوونەكەی دەسازێم. نامەوێ مەرایی لەبەر كەس بكەم.
مەربووت بوون بە ← پێوەندی هەبوون دەگەڵ.

٨٠٩٣ 4999- **مەرج بەستن لەسەر، گومان نەبوون لە ... دا:** زۆر كەس لە پسپۆڕان، كاتێك باسی سیناریایەكی دیكە دێتە گۆڕێ، لەسەر جانی ماتیس مەرج دەبەستن/ گرێو دەكەنو، گومانیان لەوە دانیە كە جانی ماتیس جێگای دەگرێتەوە.

٨٠٩٤ 2386- **مەرج بەستن لەسەر، دوای خۆ خستنە مەترسییەوە:** تەنیا كابرایەكی نەفام پاشەكەوتی هەموو ژیانی خۆی لە بازاری بۆرسدا دەخاتە مەترسییەوە بەو هیوایە كە پارەیەكی زۆرو بێ دەردەسەر وەدەست بێنێ.

← گرێو کردن لەسەر.

٨٠٩٥ 337- **مەرج کردن لەگەڵ ... لەسەر ...، گرێو کردن لەگەڵ ... لەسەر...**: "لە پێشبرکێی داهاتوودا، لەسەر هەر پێشبرکێیەك پێنج پۆند لێت دەوێ لەسەر (تەسپی) گرلدن لەو"، " زۆر چاکە، بەستمان/ کردمان".

٨٠٩٦ 5095- **مەرجی پێویست هەبوون**: ئەتۆ بۆ دەنگدان مەرجی پێویستت هەیە/ تێ دایە/ دەتوانی دەنگ بدەی، بەڵام براکەت هەتا ١٨ ساڵەی مەرجی پێویستیی نابێ.

٨٠٩٧ 3871- **مەرەخەس کردن، ئیجازە دان**: "ئەمڕێ ئەمشەو نۆبە ئێگابانیتی؟"، "نا، ئیجازەی حەسانەومیان داوە".

مەرەکەب لێدان ← بە مەرەکەب نووسین.

مەزات کردن ← هەراج کردن ، داندران بۆ فرۆشتن.

مەزهەب یان ئایین گۆڕین ← دەست لە دینێك هەڵگرتن و چوونە سەر دینێکی دیکە.

٨٠٩٨ 231- **مەست بوون، سەرخۆش بوون**: کاتێك گەیشتینە میوانییەکە/ ڕێوڕەسمەکە، چیا بە تەواوی مەست بوو/ سەرخۆش بوو.

٨٠٩٩ 2350- **مەست بوون، سەرخۆش بوون، گەربازاری**: ماددەی "خەمر"ی ئیل سی دی کێشابوو، بە تەواوی سەرخۆش بوو. • میوانییەکەی ئاخری هەفتەی شێتانە بوو- گەربازارییەکی تەواو.

← سەرخۆش بوون.

٨١٠٠ 3945- **مەستی کردن، سەرخۆش (بوون)**: کە چراکانی لەندەن هەڵبوون، دەمانەوێ خۆمان سەرخۆش کەین (= ئارەقی بخۆینەوە). • ژن و مێردێکی خۆشگوزەران و سەرخۆش بە تە نیشتماندا رابردن.

٨١٠١ 6746- **مەسخەرە کردن، گاڵتە پێکردن، کردن بە گاڵتەجاڕ**: کامران کە دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو، چاوەکانی زەق ببوونەوە، گوڕیاندی و گوتی: ناتانەوێ گاڵتەم پێبکەن؟.

← گاڵتە پێکردن.

٨١٠٢ 6540- **مەسرەف بوون، بوونەوە بە هیچ، لەناو چوون**: زیادبوونی یارمەتیی مانگانە ئەگەر بێتو بە چوونەسەری نرخەکان بێتەوە بە هیچ، کارێکی خۆڕاییە.

← خەرج هەڵگرتن، تەواو کردن.

٨١٠٣ 1332- **مەسلەحەت کردن، سازانەوە**: پێم وانییە تازە بسازێنەوە، تەنانەت ئەگەر بۆ خاتری منداڵەکانیشیان بێ.

٨١٠٤ 1373- **مەسلەحەت کردن، سازان لەگەڵ**: دەکرێ بڵێین هەموو مانگرتنێك بە سازانی خاوەنکارەکان لەگەڵ کرێکارەکانیان چارەسەر دەکرێ.

٨١٠٥ 4129- **مەسەلە جیاوازەکانی ژیان بە یەکەوە سازاندن، ئاشت کردنەوە/ تێکەڵ کردن**: هێندێك کەس هەوڵیان داوە لایەنە جیاوازەکانی ژیان، بۆ وێنە مەسیحیەت و ئیسلام، بە یەکەوە بسازێنن.

٨١٠٦ 988- **(لە پێوەندی لەگەڵ باوە) مەسیر گۆڕین، ڕێگا گۆڕین**: لەپڕ با لە ڕۆژئاواوە بۆ باکوور مەسیری گۆڕی، ئاڵوگۆڕێك کە مەترسیی بەفر بارینی بەدواوە بوو.

٨١٠٧ 592- **(لە کایەی کریکێت دا) مەسیری تۆپ گۆڕان**.

٨١٠٨ 3721- **مەشرووب تێکەڵاو کردن**: لە کێشکی شەوانە، مەلەوانەکان چای گەرمیان دەگەڵ ئارەقی نیشەکەر تێکەڵ دەکرد و دەیانخواردەوە.

٨١٠٩ 2850- **مەشوەرەت کردن، راو تەگبیر لەسەرکردن، کۆبوونەوە کردن بۆ لێکۆڵینەوە لە شتێك**: مامۆستاکان لێك کۆبوونەوە و بڕیاریان دا ناکرێ لە یاساشکێنیی خوێندکارەکان چاوپۆشی بکرێ.

← پرس پێ کردن.

مەعاف کردن ← دەرهاویشتن.

مەنموور کردن ← کلاوونان لەسەر کەسێك.

٨١١٠ 4347- **مەمنوونی خۆ کردن**: ئەگەر ئەم مەسەلەیە لەلای خۆت بێنیتەوە' زۆر مەمنوونی خۆتم دەکەی.

مەنتیقییە ← سروشتییە.

٨١١١ 6095- **مەودادان، بە فاسیلەدانان، بە فاسیلەیەکی لەبار لە یەکتر دوور دانان/ دروست کردن**: ئەو ڕەفتەمانەت زۆر پێکەوە نووساندوون؛ کەمێك فاسیلەیان بدەیە. • شێوەی پێشگری (لە زگ پڕبوون) بۆ ژن و مێردان ئیمکان دەدا بەشێوەیەك و بە ئیرادە منداڵیان ببێ بۆ ئەوەی کەمتر دووچاری کورتەمەری بن.

مەودا هەبوون ← فاسیلە هەبوون.

٨١١٢ 3497- **مەودایەکی کەم لە پێشەوەی ... بوون**: هیچ کام شتێکی وایان لە زمانی ئیتالیایی نەدەزانی و تەنیا مامۆستاکەیان بوو کە هەنگاوێك لە شاگردەکان لەپێش بوو.

٨١١٣ 4722- **مەوعیزە بۆ کردن، وەعزدادان**: ویرجینیا گوتی: ' مەوعیزەم بۆ مەکە، هاتوومەتە ئێرە بۆ یارمەتی وەرگرتنێك'.

مەوعیزە بۆ کردن ← سەرکۆنە کردن.
مەیدان دان بە ← دەست ناواڵە کردن.
مێرد کردن ← بە مێر دان.
مێروولە کردن ← بڵقە بلق کردن، وەکوڵ هاتن.
میزان بوون، میزان کردن ← هاوناهەنگ بوون، (باش) جێگیر بوون.

٨/١١٤ 7537- میزان کردن (کامێرا لە نزیکەوە بۆ دوور): کامێرای ژمارە ٢، دەمەوێ دوورکەوێتەوە تا ئەو کاتەی سەرو شانی چیاو ئەو کچە دەبینێ.

٨/١١٥ 682- میزان کردن (کامێرا، تێلسکۆپ و ...): بۆ هەرچی باشتر میزان کردنی "عەدەسی"یەکە ئەم دوگمەیە بسووڕێنن.

٨/١١٦ 7536- (بە سووڕاندنی عەدەسی) میزان کردنی کامێرا: پاش هەڵگرتنی رەسمێك بە مەبەستی تاقیکاری لە خزمەتکارێکی کە لەسەر سینییەك مەشرووبی دەبرد، کامێراکە لەسەر ژنو مێردێك میزان کرا کە لە پێش بارەکە دانیشتبوون.
مێشك ناڵۆز کردن ← هێرش هێنان بۆ مێشك.
مێشکی باش هەبوون بۆ ←ئاگا لەخۆ بوون.

٨/١١٧ 480- مێشکی خۆ بە کارێکەوە ماندوو کردن: چاوت لێیە چۆن مێشکی خۆم دەگەڵ ئەو حیسابانە ماندوو دەکەم؟ داخوا کەس هەیە سوپاسێکم لێبکا؟
مێشکی خۆ پژاندن ← خۆ کوشتن.
مێشکی سەری کەسێك بردن ← هەراسان کردن، جاڕز کردن، شێت (و هار) کردن.

٨/١١٨ 6490- مێشکی کەسێك لە ... داخنین: چۆن دەتوانی چاوەڕوانیی ئەوەت لەو منداڵانە هەبێ کە مێشکیان وەگەڕ خەن؟ دڵێو مێشکی ئەوانە لە تۆرپیاتی تەلەفزیۆن ئاخنراوە.

٨/١١٩ 5514- مێشە سەگلانە، مێشە کەرە: شیلا لێی بۆتە مێشەکەرە (دەستی لە گۆڵناکاتەوە)و ئەویش نازانێ چ دەکا، لە کوێیەو لە کوێ نیە.
میوان بە پارە راگرتن ← پانسیۆن کردن.

٨/١٢٠ 3157- میوانداری کردن لە (کەسانی خەڵکی لەندەن یان شیمال): ئەوە بەرنامەڕێژی دەکەن بۆ ئەوەی لە منداڵەکانیان (کە لە شیمال رادێن) میوانداری بکەن.
← پێراگەیشتن.

٨/١٢١ 5166- میوانیی، جێژن یان سەیرانی پڕ لە هەراو هوریا: بۆ جێژنێکی پڕ لە هەراو هوریا ئەمڕۆ رۆژێکی خۆشە....

٨/١٢٢ 529- میوانی (یەکی باش و خواردنەمەنییەکی زۆر): تەنانەت لەو رۆژانەشدا کە وەزعیەت زۆر خراپ بوو، میوانی (و خواردەمەنی زۆرو چەوڵ بە ولادەی پێویست هەبوو.

٨/١٢٣ 6323- میوانی کەسێك بوون: ئەو بنەماڵەیەی کە میشێل لەو کاتەدا میوانیان بوو، بیست ساڵ پێشتر باوکی میوانیان بوو.

٨/١٢٤ 396- نائاسایی بوون لە خەسڵەت(ی ...) کاتان، وەك ... (ی هیچ کەس) لەچوون: دەبێ بڵێم بە بڕوای من رەفتارو کردەوەت لە کۆبوونەوەکەدا نائاسایی بوو. کاتێك پێشنیارت کرد کە دەبێ پێوەندییەکی بازرگانی زیاترمان دەگەڵیان هەبێ، پێم وابوو لە خەت لات دلوە.
نابووت بوون ← تێك شکان، شکست خواردن.

٨/١٢٥ 7216- نابەجێ بوون، بێجێ بوون، جێگای خۆ لەبوون، پێویست نەبوون: ئەو قسانەی لەو هەلومەرجەدا کردنی بەجێ نەبوون.
نابێ قسەی لێبکەی ← بێنەملاونەولا.

٨/١٢٦ 2359- ناچار کردن، وادار کردن (بە هەڕەشەو گوڕەشە): سەربازە مەستەکان، بە هەڕەشەو گوڕەشە، خەڵکی گوندەکەیان ناچار کرد هەرچی هەیان بوو بیاندەنێ.

٨/١٢٧ 3340- ناچار کردن، وادار کردن: ئەو هەستە کە کاتی دەست بەکار بوون هاتۆتە پێش، حیزبی وادار کرد کە دەبێ دیسانیش زۆرتر هەوڵ بدا.

٨/١٢٨ 5829- ناچار کردن بە لە نجامدانی کارێك، ناسە پاڵنان: پزیشکی بنەماڵە هەوڵ دەدا رێگای باش بۆ دەرمانکردنی/ بۆ چاك کردنەوەی نەخۆشەکەی بدۆزێتەوە، بەڵام ئەگەر بێتوو نووسینەوەی مەشڵی دەرمان بەسەر نەخۆشەکەدا بسەپێنن، ئیدی کابرای پزیشك ناتوانێ بەباشی ئاگای لێیان بێ.

٨/١٢٩ 1845- ناچار کردن، مەجبوور کردن: باوکی بە زۆر ناچاری کرد ببێ بە پۆلیس.
← پێکردن.

٨/١٢٩٠١ 3022- ناحەز کردن، وەحشەتناك کردن، تێزییان: نووسەر نەك هەر قارەمانەکانی چیرۆکەکەی لەسەریەك سێری رووداوی ناخۆش دروست کردوە بەڵکوو زمانەکەشی ناحەز کردوە.

٨/١٣٠ 953- ناخافڵ گرتن: پۆلیس دزەکانی ناخافل گرت.
خەریك بوون گاوسندووقی کارخانەکەیان دەکردەوە.

٨/١٣١ 7028- نادیار، دیار نەبوون، نامەعلووم: ئەوە کە کامیان لەو دوو بەلەمانە زووتر دەگەنە خەتی کۆتایی پێشبڕکێ دیار نیە.

٦١٢٢/ 6876- **ناردن، دیاری کردن بۆ، مەشمووڵیەت دان بە:** زرینگترین سەربازەکانیان بۆ نیگابانی لە ماڵی دەوڵەت دیاری کرد.

٦١٢٣/ 7067- **ناردن، بەڕێکردن، موخابەرە کردن:** لە کەشتیڕا دەتوانن پەیامی تەلەفوونی بە بێتەل بۆ وشکانی بەڕێکەن.
← بەڕێکردن.

٦١٢٤/ 753- **ناردن، بەڕێکردن (بۆ بەرەی شەڕ):** ناچار دەبێ ڕێگایەك لە کەنار دەریا بکەینەوە، پردەبازێك بۆ خۆمان دروست کەین پێش ئەوەی دوژمن بتوانێ هێزی زەخیرەی بە ئەندازەی پێویست بنێرێ.

٦١٢٥/ 5861- **(بە کەشتی یان فڕۆکە) ناردن، بەڕێکردن:** هەفتەی ڕابردوو دوازدە سندووقیان بە فڕۆکەدا بەڕێکرد.

٦١٢٦/ 5719- **ناردن، بەڕێ کردن، پۆست کردن، دە پۆست هاویشتن:** چما نامەکەت پێ نەگەیشتووە؟ هەفتەی ڕابردوو بەڕێم کرد.

٦١٢٧/ 5718- **ناردن، دان (ی بەڵگە، داخوازنامەو ...):** ئەگەر ویزاتان دەوێ، هەوڵ بدە داخوازنامەکەت لە کاتو ساتێکی لەباردا بنێری.

٦١٢٨/ 5717- **ناردن (ی بەڵگەو ...):** زەحمەتی ناردنی دەستنووسەکە بە خۆم نادەم. گومانم نیە ڕەت دەکرێتەوە/ قبووڵ نابێ.

٦١٢٩/ 5708- **ناردن بۆ ئەوبەری چۆمی، کاڵاڵ یان ئەوپاچە:** "ڕۆژنامەی ئێواری نەگەیشتووە"، "باشە، میشێلی بنێرە بۆ ئەوبەری چۆمی بیهێنێ.

٦١٤٠/ -

٦١٤١/ 5047- **ناردن بۆ چاپخانە (لە پێوەندیی دەگەڵ ڕۆژنامەدا):** پێم وایە ڕۆژنامەی ... تان ناردۆتە چاپخانەی.

٦١٤٢/ 4882- **ناردن بۆ شێتخانە (= تیمارستان):** بە تاوانی هێرش کردنە سەر منداڵان، ناردیان بۆ تیمارستان/ شێتخانە.

٦١٤٣/ 5715- **ناردن لە دووی کەسێك (بۆ شتێك):** ناردوومانە لە دوای لوولوکێش/ بەلووعەچی. هەتا ئەو دێ، وەرە ئەو چلکاوە خاوێن کەینەوە.

ناردنە قوتابخانە ← ئیمکاناتی دەرس خوێندن بۆ کەسێك دابین کردن، وەبەر دەرس خوێندن نان.

٦١٤٤/ 5259- **ناردنە لای کەسێکی دیکە، حەوالە کردنە لای کەسێکی دیکە:** کابرایەك کە لە پشت مێزی "ڕێنوێنیی" دانیشتبوو حەواڵەی لای کارگێری کردم.

٦١٤٥/ 5295- **(لە ڕێگای بانکەوە) ناردنەوە، بەڕێ کردنەوە:** ئەو سەربازانەی لە هەندەران خزمەت دەکەن بەشێك لە پارەمەتیی مانگانەکانیان بە بانکێدا/ لە ڕێگای بانکانەوە بۆ ژنو منداڵەکانیان بەڕێ دەکەنەوە/ دەنێرنەوە.

٦١٤٦/ 5289- **ناردنەوە بۆ ئەزاوە (بازداشتگە):** کابرای تاوانبار کراویان بۆ ماوەی هەفتەیەکی دیکە ناردەوە زیندانی کاتی هەتا ناکامی لێکۆڵینەوەی پۆلیس لە هەراو هوریایەکی "مراد غەدر" کە دەڵێن ئەویش دەستی تێدابووە، ڕوون دەبێتەوە.

٦١٤٧/ 722- **ناردن یان بەڕێکردن (ی کەسێك) بۆ نەجات دانی/ یارمەتی دانی ...:** بە هۆی پەیامێکی ڕادیۆییەوە، تاقمی فریاگوزار بۆ نەجاتدانی ئەوانەی کەوتبوونەبەر سێلاو بەڕێکران.

٦١٤٨/ 5863- **ناردن یان بەڕێکردن (بە کەشتیدا):** هەفتەی داهاتوو شەریکەی نەوت لوولە/ بەلووعەو ئامرازی قورس بە کەشتیدا بەڕێدەکا.

٦١٤٩/ 5724- **ناردنی کەسێك بۆ جێگایەك بۆ کارکردن لە جیاتی خۆ:** مودیری بازار دیتنەوە کاری زۆر گرنگی لە لیدز هەبوو. بۆیە لە جێگرەکەی دلوا کرد لە شاری ... بە جێگای ئەو کار بکا.

٦١٥٠/ 1607- **ناڕەحەت بوون، تێکچوون:** کاتێك خالی ... بیستی کە دۆستەکەیان وەدەر ناوە زۆر تێکچوو.
← تێکچوون، دڵ ئێشان، وەڕەز گرتن.

٦١٥١/ 249- **ناڕەحەت بوون، یەکجار زۆر:** مودیر یەکجار زۆر ناڕەحەت بوو چونکە خەڵکەکانی قوتابخانە کەوتبوونە ژێر دڵۆیان.

٦١٥٢/ 3128- **ناڕەحەت بوون، خەوزڕان کردن، دەستپاچە بوون، سەراسیمەبوون:** بە هۆی دەستو پێ سپیلکە بوونی دایرەی "مراسلات"ەوە بە ڕاستی تووشی گرفتاری بووین. ● کاتێك دەگەڵ خەڵکی غەریبە بەرەو ڕوو دەبێ، خۆی ون دەکا.

٦١٥٣/ 1016- **ناڕەحەت کردن، ڕەنجاندن:** لە دیسیپلینی ئەرتەش بێزار بووە، هەرکات چاوم پێی دەکەوێ، دەڵێ زۆر ناڕەحەتم.

٦١٥٤/ 7036- **ناڕەحەت کردن، دڵ شکاندن:** لە ڕووی خۆشەویستییەوە قەڵسی دەکردم، بەڵام، بە ڕادەیەك ناڕەحەتی کردبووم کە بە زەحمەت توانیم خۆم ڕاگرمو وەڵامی نەدەمەوە.

٨١٥٥ 2539- **ناڕەحەت کردن، قەڵسە لێنگیران:** سەرۆکی دایرە بەو وەخت ڕاگرتنانەی بەراستی نارەحەتم دەکا/ قەڵسەم لێدەگیرێ.

٨١٥٦ 2415- **ناڕەحەت کردن، دڵ شکاندن، دڵ ئێشاندن، ڕەنجاندن:** ئەو دوو پیاوانە لە بواری ئەخلاقیەوە ئەوەندە لێك دوورن کە بێگومان هەر دەبوو یەکتری نارەحەت کەن.

٨١٥٧ 1977- **ناڕەحەت کردن، ئازاردان:** لە شێوەی ڕەفتارت را دەزانم گیروگرفتێکت بۆ هاتۆتە پێش. چ شتێك ئازارت دەدا؟ (= لەچی نارەحەتی)؟

٨١٥٨ 5788- **ناڕەحەت کردن:** ئەتۆ قسەی وا دەکەی کە خەڵکی نارەحەت دەکەی. وا لەو خەڵکە دەکەی کە پێیان وابێ بۆڵەبۆڵیان لەسەر دەکەی.

٨١٥٩ 5499- **ناڕەحەت کردن، تووڕە کردن، تێکدان، ئاڵۆز کردن:** ئالفرێد، هەر ئێستا مۆکانیان بۆ ڕێڵەو پێلە کردووم. تەحەمول ناکەم لێم ئاڵۆزکەی. ● تا رادەیەك ئاڵۆز دیاری. ئایا شتێك رووی داوە کە نارەحەتی کردووی؟"، "ترسناکیکیش ئاڵۆز/ تووڕە نیم. هەرگیز لە ژیانمدا ئەوەندە بە کەیف نەبووم".

٨١٦٠ 3456- **ناڕەحەت کردن، سەغڵەت کردن، ئازاردان، جەلەز کردن:** دەنگی ئەو دڕێلە بە شێوەیەکی وەحشەتناك مێشکی پیاوی ئازار دەدا. ● ناتوانم چیدی دەگەڵ ئەو ژنە هەڵکەم. هێشتاش زیلەی ناخۆشی هەروا گوێم ئازار دەدا.

نارەحەت کردن ← تووڕە کردن، حاڵی کەسێك گرتن، مزاجیم بوون، تووڕە کردن.

نارەحەت نەکردن ← دەست لێنەدان.

ناشتن ← بە خاك ئەسپاردن، چەقاندن.

ناك نووت کردن← بە زەربە لێدان، بێهۆش کردن، مست لێدانو بێهۆش کردن.

٨١٦١ 3035- **ناڕەحەت کردنی خەڵك بە دەنگی ناخۆش:** دەنگی ناخۆشی کوندان لە نێو داراندا وەها مێشکی نارەحەت کردبوو کە سەرانسەری شەوێ خەوی لێ نەکەوت.

٨١٦٢ 1368- **ناڕەحەتی دەربڕین لە:** بە دەگمەن هەڵدەکەوێ کە پیاو تووشی ژنێك بێ دوو یان سێ منداڵی هەبێو لە بێکاری نارەحەت بێ.

٨١٦٣ 6726- **ناڕەحەتی دەربڕین، خۆ ناڕەحەت کردن:** ڕۆڵە گیان نابێ خۆت وا نارەحەت کەی. ئێستا تێی ناگەی، بەڵام زۆر باش بوو خودا رووحی پێکرد.

٨١٦٤ 1367- **ناڕەحەتی دەربڕین لە:** شەوێك پێش ئەوەی تووشی راوەستانی دڵ بێ، دەیگوت شتم باش بۆ هەزم ناکرێ.

٨١٦٥ 5126- **نازناوی ئەشرافییەت بە کەسێك دان، بە ئەندامەتی مەجلیسی لۆردان وەرگیران:** سرپیتێرستامیز لە ڕۆژی لە دایك بوونی شاژندا بە ئەندامی مەجلیسی لۆردان وەرگیرا.

٨١٦٦ 5919- **(بە نووسراوە) ناساندن:** دانی حەقی ئەندامەتی بۆ شەوێك ئەرزیشی ئەوەی نیە بیدەی. ئەمن لە کارتەکەی خۆم بە نووسراوەو بە ئیمزا دەتناسێنم.

٨١٦٧ 4951- **ناساندن (بە یەکتر)، ئاشناکردن:** بارکەی دەگەڵ کابرایەك ئاشنا کرد کە کە شتی عەنتیکەی کۆ دەکردەوە.

٨١٦٨ 3427- **ناساندن بە:** گوڵی، کە زیاتر لە دە دەقیقەیەك بوو گوێی دابووە قسەکانیان، گوتی: "ناتەوێ ئەمن بە دۆستەکەت بناسێنی؟"

٨١٦٩ 1688- **ناساندن وەك:** ئەو خۆی وەك مودیریکی بازرگانی دەناسێنێ، بەڵام لەراستیدا سکرتێرە.

٨١٧٠ 4453- **(بە درۆ) ناساندن وەك ...:** خۆی وەك کەرو لاڵان ناساندووە. ● بە درۆ ژنەکەی وەك کادرێکی حیزبی ناساند.

٨١٧٠٫١ 5223- **ناساندن، قسەی چاك بۆ کردن، راسپاردە کردن، "توصیە" کردن:** بە ئەرخەیانییەکی تەواوەوە، بۆ پڕکردنەوەی جێگای خاڵیی جێگری بەرپرسی لێکۆڵینەوە، کاك چیا بە ئێوە دەناسێنم.

٨١٧١ 4441- **ناسران بە ناوی:** لەو قۆناخە لە ژیانی پڕ لە جینایەتیدا بەناوی بلاگۆز دەناسرا.

٨١٧٢ 3714- **ناسراوبوون لە لای، ئێو هەبوون لە لای:** ئەو کەسانەی لە لای پۆلیس ناویان هەیە/ پۆلیس بە خراپیان دەناسێ، ئەگەر لە نزیك جێگای ڕوودانی جینایەتێك ببیندرێنو، نەتوانن بڵێن لەبەرچی لەوێ بوون، پۆلیس لێیان بەگومان دەبێ.

ناسراو بە ← ناوبران.

ناسین ← لێ تێگەیشتن.

٨١٧٣ 3709- **ناسین (پێ ئاشنا بوون):** "ئایا هەرگیز دەگەڵ پرۆفسۆر جەیمز دانیشتووی؟"، "نا، بەڵام زۆر چاکی دەناسم هەرچەند ئاشنایەتییەکمان نیە.

٨١٧٤ 3713- **ناسین و لێ تێگەیشتن، تێگەیشتن لە کەسێكو بە زمانی زانین:** ماری منداڵی باش دەناسێو چاکیان

لـێ‌تێده‌گه‌یشت. ئاخر ئه‌و شـه‌ش منداڵـی خـۆی بـه‌خێو کردبوو.

٨١٧٥ 3712- ئامێن، تـا رادەیـەک ئاشـنا بـوون لەگـەڵ شـتێک لێزانین/ شک بردن: بۆ سه‌رکه‌وتن له‌ تاقیکاریدا تـه‌نیا یـه‌ك رێگام پێ شك دێ، ئه‌ویش زۆر به‌ توندی تێکۆشانو بـاش ئاماده‌ بوونه‌. ● ئه‌رێ بلێی رێگایه‌کی سـه‌رپڕ بۆ ... شـك به‌ری/ پێ بزانی؟ ● داخوا که‌س هه‌یه‌ بچێتـه‌ مه‌لاقـاتی مامه‌ تامی له‌ نه‌خۆشخانه‌؟ نا، هه‌تا ئه‌و جێگایـه‌ی مـن بزانم.

٨١٧٦ 5220- ئاسین وەک، چاو لێکردن: له‌ سـالانی داهـاتوودا، (خـه‌ڵك) ئـه‌وی وه‌ك یـه‌کێك لـه‌ گـه‌وره‌ دامه‌زرێنـه‌رانی بزووتنه‌وه‌ی ئێمه‌ ده‌ناسن/ چاو لـێ‌ده‌که‌ن.

٨١٧٧ 4543- ئاسینەوە، تەشخیس دان: هه‌وڵی ده‌دا له‌نێو ئـه‌و خه‌ڵکه‌ی که‌ ده‌یانه‌ویست به‌ پاڵـه‌و په‌ستۆ لـه‌ ده‌رگاکـه‌ بێنه‌ ژوور (قیافه‌ی) کچه‌ بناسێته‌وه‌. ● ماڵه‌کـه‌یان زۆر هاسان ده‌ناسرێته‌وه‌؛ ده‌رگایه‌کی گه‌وره‌ی شینی هه‌یه‌.

٨١٧٨ 4544- ئاسینەوەی دەنگی کەسێک/ شتێک: هـه‌وڵی ده‌دا ئه‌و ئاهه‌نگه‌ بناسێته‌وه‌ که‌ له‌ رادیۆی بیستبوو.

٨١٧٩ -

٨١٨٠ -

٨١٨١ 263- ئـاگ داون بـوون، کـەوتن و هـەتا ژمـارەی ... هەڵنەستانەوە: قاره‌مانی سه‌نگین وه‌زنی بریتانیا لـه‌ رۆنـدی پێنجـه‌مدا ئـاگ داون بـوو/ کـه‌وتو هـه‌تا ژمـاره‌ی ٦ هه‌ڵنه‌ستاوه‌.

ئاگ داون کردن ← له‌ ئه‌رزیدان.

ئاگ داون نه‌بوون ← وه‌ئه‌رزی‌نه‌که‌وتن.

٨١٨٢ 4229- ئـاکۆکی لێـوان خـۆ چارەسـەر کـردن: "ئایـا ناکۆکیـیه‌کانت ده‌گـه‌ڵ خـێزانت چاره‌سـه‌ر کـردووه‌؟"، "نه‌من به‌راستی زۆرم هه‌وڵ داوه‌، بـه‌ڵام ئـه‌و حـازر نیـه‌ قسه‌م ده‌گه‌ڵ بکا.

٨١٨٣ 3051- ئاڵاندن: کاتێك فریاگوزاره‌کـان کـابرای لـه‌ حاڵی مه‌رگیان راده‌گوێست، له‌به‌ر ئێشـو ئـازاری خـۆی ده‌ی‌ناڵاند.

← سـکاڵا کردن له‌.

٨١٨٤ 808- ئالایی، گلاو لـێ‌ئەهاتوو: ئاغای سمیت ده‌یه‌ویـست ده‌گـه‌ڵ سـه‌رۆکی ئیداره‌ی خـۆی قـسه‌ بکـا. ئـه‌و لـه‌ سندووقداره‌ ئالایقه‌که‌ (که‌ له‌ خۆرا پله‌و پایه‌یان بردبـووه‌ سه‌ر) نارازی بوو.

٨١٨٥ 1544- ئالێن بۆ: لێواری ئـه‌و ده‌ریایه‌ بـۆ چـالاکی پیشه‌سـازی، ئابووری‌و خانووبه‌ره‌ دروست کردن ده‌ناڵێ.

← له‌بار بوون بۆ.

٨١٨٦ 5084- ئامزد بوون، خۆ ئامزد کردن، بوون بـه‌ کـاندید، خۆ دیاری کردن بۆ هەڵبژاردن، خۆ پاڵاوتن: جان خۆی بـۆ هـه‌ڵبژارده‌ن پاڵاوتووه‌/ ئامزه‌د کردووه‌/ بۆته‌ کاندید.

← پێشنیار کردن.

٨١٨٧ 4148- ئاموسی ژنێک کرینەوە دوای ئـەوە کـە ماوەیـەک بـە حەرامی دەگەڵی بوون: با بچینه‌ کلیسایه‌و ئامووست بکرمه‌وه‌ (= مارەت کەم).

٨١٨٨ 2212- ئامۆیی کردن: نا، ئامزیی نا کا، هه‌ر لـه‌ بـاری سروشتی‌یه‌وه‌، کچێکی که‌مدوێیه‌.

٨١٨٩ -

٨١٩٠ 6735- نامە دەسەر کردن: پۆلیسی رێگـاو بـان بریـاری داوه‌ نامه‌ ده‌سه‌ر هه‌ر دوواک ئـه‌و رانه‌ندانـه‌ بکـا کـه‌ لـه‌ تەسادوفەکەدا بەشدار بوون.

٨١٩١ 7504- نامە نووسین بۆ شتێک، بە نامە داوای شتێک کردن: بـۆ ئه‌و ئاڵبۆمه‌ که‌ به‌ هه‌موو ئه‌وانه‌ی نابوونه‌ن بـه‌ خۆرایـی ده‌یاندەنێ نامه‌ بنووسه‌.

٨١٩٢ 7510- نامەی سکاڵا نووسین: ته‌ماشاچی‌یه‌ نارازی‌یـه‌کان بۆ سـکاڵا کردن لـه‌ دژی نێرمزکی ئـه‌خلاقیی شـانۆکان نامه‌یان نووسیون.

٨١٩٣ 2204- ئـالقوایەو: میوانـه‌کان لـه‌ ده‌وری مـێزێکی ئـه‌وی دانیشـتبوونو له‌سـه‌ر ده‌وریـی پـانی زێـو نانیـان ده‌خوارد.

٨١٩٤ 1731- ئـالقوایەو (لە ماڵێ): چـاو پێکه‌وتنه‌کـه‌م تێکچوو؛ به‌هه‌رحاڵ نانه‌که‌م له‌ ماڵێ ده‌خۆم.

٨١٩٥ 1972- ئـالقوایەن لە دەرێ: جاروبـار لـه‌ ده‌رێ نـان خـواردن کـارێکی باشـه‌ چونکـه‌ ئـاڵوگۆڕکردنی جێگـاو خوارده‌مه‌نی بۆ پیاوی زۆر باشه‌. باسی ئه‌وه‌ش ناکه‌ین که‌ هه‌موو کاره‌کان که‌سێکی دیکه‌ بۆت ده‌کا.

٨١٩٦ 4092- ئـالی ئیـوەڕۆ لـە دەرێ خـواردن: به‌رێوه‌بـه‌ریی شـه‌ریکه‌ زۆر خۆشـحاڵ ده‌بێ کـه‌ بـۆ ئـه‌و که‌سـانه‌ خوارده‌مه‌نی به‌سته‌به‌ندی کراو ئاماده‌ بکـا کـه‌ لـه‌ ده‌رێ نانی نیوه‌ڕۆیه‌ ده‌خۆن.

٨١٩٧ 2791- ئـاوێران، ئاسراو بـە، پـێ‌گوتران: ئـه‌و گوڵـه‌ کێوی‌یه‌ پێی ده‌ڵێن ریشی مامه‌ پیره‌.

٨١٩٨ 2036- ئاوێران، گوتن: هیچ پێویست ناکا باسـی ئـه‌و ورده‌ شتانه‌ بکه‌ی. ئه‌و ئاکته‌ سـه‌ره‌کی‌یانه‌ی پێوه‌ندی‌یـان به‌ کێشه‌که‌وه‌ هه‌یه‌ به‌ دادگایان بڵێ.

/٦١٩٩ 3406- **ناوبزپوالی کردن، قسەی پاش بۆکردن:** تاقمێك لە نوێنەرانی پارلمان بەڵێنیان دا کە لە لای وەزارەتی نێوخۆ بە قازانجی ئەو کچە قسە بکەن کە بە هۆی رەوانییەوە لەبەندیخانە دایە.

/٦٢٠٠ 686- **ناو بەرز بوونەوە:** بە هۆی ئەوە کە ژمارەیەك لە هونەرمەندانی خۆشەویستی خەڵك لە دژی راوەستاون، ناوی بەرز بۆتەوە.

/٦٢٠١ 1207- **ناو دەرکردن، بوون بە کەسایەتییەکی گەورە:** کاتێك لە قبوڵ کردنی رێبازی حیزب لە پێوەندی دەگەڵ میللی کردنی سنعەتی پۆلاریژی خۆی پاراست، لە پڕوەك کەسایەتی یەکی گەورە ناوی دەرکرد.

/٦٢٠٢ 4949- **ناونووسی کردن بۆ:** دەمانەوێ ئێچەوانی بۆ بەشداری کردن لە دەوی/ هەڵاتنی سەدمیترو هاوێشتنی دیسك ناونووسی بکەین.

/٦٢٠٣ 5926- **ناونووسی کردن بۆ خولێك، بوون بە ئەندامی پاڵنیەك:** یانەی ئارسینال ژمارەیەك لە لاوە بە ئیستیعدادەکانی ناونووسی کردووە/ وەك ئەندام وەرگرتوون.

/٦٢٠٤ 5269- **ناونووسی کردن لە:** ماوەیەکی کورت دوای هاتنیان بۆ ئەو وڵاتە، خوێندکارە بیانی یەکان لە ئیدارەی پۆلیس ناونووسی دەکەن.

/٦٢٠٥ 2033- **ناونووسی کردن لە، هێنانە ئێو، هاتنە ئێو:** پێم خۆشە بزانم ج مەسخەرەیەك بۆ بەشداری لە پێشبڕکێی کێك دروست کردندا ناونووسی کردووم؟

/٦٢٠٦ 262- **ناونووسین/ نووسران (بەتایبەت لە خوێندنگەی سەرەتایی یان ئەولەتیدا):** لە رۆژی لەدایك بوونی یەوە ناوی لە خوێندنگەی باوکیدا نووسراوە.

/٦٢٠٧ 2024- **ناونووسین (بۆ سەربازی)، بردن بۆ سەربازی، لە لیستەدا نووسین:** هێندێك لە لاوەکان لە حاڵێکدا لە زانستگە دەخوێنن بۆ سەربازی ناونووسی دەکەن.

/٦٢٠٨ 2027- **ناونووسین لە:** خانمی جونز ناوی کچەکەی بۆ کلاسی (هەڵپەرکێی) باله نووسیوە.

/٦٢٠٩ 4912- **ناونووسین لە:** پێم وانیە ئاوسانیی دراوی لەسەر رادەی ناونووسین لە قوتابخانە گشتی یەکان شوێنێکی ئەوتۆی دانابێ.

/٦٢١٠ 4116- **ناوونابانگ دەرکردن:** سەرۆك وەزیر گاتی زۆر خۆش دەویست چونکە لە سەحرای ئافریقا ناوو ناوبانگێکی باشی دەر کردبوو.

/٦٢١١ 5922- **(لە بریتانیا) ناوی خۆنووسین یان ناونووسی کردن لە ئیدارەی کار (بێکاری):** دوا بە دوای داخرانی کانگاە گەورەکە، ژمارەیەکی زۆر لە کرێکاران لە ئیدارەی کار ناونووسیان کرد/ ناوی خۆیان نووسی/ ناویان نووسی.

ناوێك لە ... نەبردن ← باسێك لە ... نەهێنانە گۆڕ.

/٦٢١٢ 5056- **ناوێك لەسەر ... دانان:** لە پڕ بێدەنگی بوو بە دەنگە دەنگ، زیڕەو هەڵایەك کە نەدەکرا هیچ ناوێکی لەسەر دانێی- تەقەتەق، رەقەرەق یان زیڕەزیڕ؟

/٦٢١٣ 887- **(بە دەنگی بەرزەوە) ناوی کەسانێك خوێندنەوە (سرانگەیاندن):** هەتا ناوی ئەو کەسانە دەخوێنمەوە کە لە پێشبڕکێدا سەرکەوتوون، تکایە بێدەنگ بن.

/٦٢١٤ 564- **ناوی کەسێك یان کەسانێك لە دەفتەر(ی هوتێل)دا نووسین:** هەتا من ناوی میوانەکان لە دەفتەردا دەنووسم، ئێوە ئەو جانتایانە بەرنە سەرێ.

ناوی ... لەسەر دانان ← بە ناوێك وەڵامدانەوە.

/٦٢١٥ 1690- **ناهومێد بوون لە:** دوای ئەوە کە دوو هەفتان پێوەندییان دەگەڵ حیزبی سەرەکیی برا بوو، لە یەکگرتنەوە دەگەڵ دۆستە کۆنەکانیان ناهومێد ببوون.

/٦٢١٦ 3827- **ناهومێد بوون لە زیندوو مانی کەسێك، دەست شوشتن لە کەسێك بەو بڕوایە کە مردووە:** بەو خەیاڵە کە لە مەیدانی جەنگدا مردووە لێی هیوابڕ بوون، بەڵام، دوایە لە نەخۆشخانەی پایگا سەری دەرهێنا.

/٦٢١٧ 2705- **ناهومێد بوون' دەست شوشتن لە:** کاتێك دوای سێ رۆژان، شاخەوانەکان نەگەرانەوە شوێنی دیاریکراو، دەستیان لێ شوشتن.

← هیوا بڕ بوون.

/٦٢١٨ 1927- **ناهومێد کردن، بێهیوا کردن:** هەلومەرجی ئێستای بازار، دەکرێ بڵێم، ناهومێدی کردووم.

/٦٢١٨٠١ 3856- **ناهومێد کردن، هیوا بڕ بوون:** ئاتبەنە بەندیخانە. ئەوەم جێبەجێ کردووە. ناهومێدم نەکردووی. ● لە رابردوودا ئەوەندە لە کەسانی دیکە ناهەمێد بووە کە ئیدی بە قا بە کەس ناکا.

/٦٢١٩ 3861- **ناهومێد کردنی دۆستان، هاوکارانو ...:** ئەگەر کارێکی وەك پەنجەرە خاوێن کردنەوە هەڵبژێری، ئەمە راست بە واتای ناهومێد کردنی دۆستەکانتە.

ناهومێدی ← شکست.

نرخاندن ← هەڵسەنگاندنو داوەری کردن، بەراورد کردن.

نرخی شتێك بردنە سەر ← گرانکردن.

٨٢٢٠ 7237- **نرخی شتێك دیاری كردن یان لەسەر دانان:** نرخی ماڵەكەیان ٢٠ هەزار پاوند دیاری كردووە.

٨٢٢١ 5473- **نرخی شتێك هێنانە خوارو، راست كردن:** هێندێك لە دووكانداران قینیان لە نێو پێنیی‌یەو ئەگەر نەتوانن نێو پێنی نرخەكە بەرنە سەرێو راستی كەن، نێو پێنی نرخەكە دێننە خوارو راستی دەكەن.

٨٢٢٢ 1686- **نزم بوون (ی كەسایەتی)** : هەرگیز پێم وانەبوو ئەوەندە نزم بێ كە لە بەر چاوی خەڵك بە هاوكارە قەدیمی‌یەكانی خۆی نیهانە بكا.
← لە پلەیەكی خوارتردا بوون.

٨٢٢٣ 3509- **نەزم راگرتن، پێشگری كردن لە چوونە سەری ...:** وا دێتە بەرچاو كە دەوڵەت بۆ پێشگری كردن لە چوونە سەری خەرجی ژیان هەوڵێكی ئەوتۆ نادا.

٨٢٢٤ 460- **(ئەوەندە) نزیك بوون (كە دەنگ ... بگاتێ، ببیندرێو ...)، بە چاو دیتران، بە گوێ بیستران، كەوتنە بەرسێرە، لە مێزە دابوون:** ئەگەر بچینە پێشتر دەكەوینە بەر تەیرەسی (تۆپخانەی) دوژمن.

٨٢٢٥ 109- **نزیك بوون، پان بوونەوە لە:** نەخشەی ئەم درایەت لەو شتەی كە ئەمن لە خانووەكە لە زەینم دابە زۆر نزیكە.

٨٢٢٦ 1874- **نزیك بوونەوە:** بە نزیك بوونەوەی زستانێ، نەبوونی رێگایەكی باشم بۆ گەرم داهێنانی ماڵەكەمان هەست پێ‌دەكرد.

٨٢٢٧ 2541- **نزیك بوونەوە لە، دەوروبەری كاتێك بوون:** سەعات چەندە؟ دروست نازانم، بەڵام دەبێ دەوروبەری نیوە شەوێ بێ.

٨٢٢٨ 1351- **نزیك بوونەوە لە، لێهاتنە پێش، هاتنە پێش لە:** كابرای گەدا، لەحاڵێك دا دەستی بە نیشانەی پاڕانەوە بۆ لای من درێژ كردبوو، لێم دەهاتە پێش.

٨٢٢٩ 6329- **نزیك بوونەوە لە (بە ئەسپایی)، چوونە پێش لە، بەسەرداهاتن، بەسەردا زاڵ‌بوون، دەستەوژێر تەنەسەی خۆ:** نابێ بێڵم كەرێتی بەسەرمدا زاڵ‌بێ‌و خافڵگیرم كا.

٨٢٣٠ 2891- **نزیك بوونەوە لە تەمەنێكی:** ئەگەر چاوی لێ‌یەكەی باوەر ناكەی، بەڵام ئەو پیاوە لە تەمەنی ٧٠ ساڵ نزیك بۆتەوە.

٨٢٣١ 2892- **نزیك بوونەوە لە كاتێك:** "هەك قەرەم بەسەری، سەعات لە یەكی نزیك بۆتەوەو منیش قەولم دابوو/ بەڵێنیم دابوو لە سەعاتی دوازدەونیو كابرای ببینم".

٨٢٣٢ 2980- **نزیك بوونەوە لە هەڵوەشان/ داڕزین/ لە بڵاو بوون/ لەبەرزە بوون:** وەزعی ماڵەكە گەییوە لێك هەڵوەشان. پووره فاتێ بە لەسەرخۆیی دەیپرسی: نازانم بە ناشپەزێلەو كلفەتێلەو خزمەتكارێكی كە بە رۆژ كارمان بۆ دەكەن، چۆن دەكرێ چاوەروانی ئەوە بێ وەزعەكە بەرەو باشی بەرێن؟

٨٢٣٣ 762- **نزیك بوونەوە (ئەوەندە كە چاو هەندەی لێ‌نزیكا، دەنگ بیگاتێ، گوللە بیگاتێ):** دوای پێنج دەقیقەی دیكە، ئەو فرۆكە ئەوەندە نزیك دەبێتەوە كە دەگاتە مەیدانی وشیاركردنەوەی دیفاعی دژی هەوایی ئێمە.
← بە ئەسپایی چوونە پێش، چوونە نزیك.
نزیك كردنەوە لە ← هێنانە پێش.

٨٢٣٤ 2971- **نقووم تێدا كردن، خستنە ژێر تەنەسیەوە، كار تێكردن:** شەرابەكە كاری تێكردبوو، تێكەڵاو دەگەڵ گەرمای ژوورێ بوو بە هۆی ئەوە لەسەر مێزەكە دڵی لەخۆ بێتەوە.

٨٢٣٥ 623- **نقووم كردن لە، كون كردن‌و چوونە ژوور:** بۆ دەست راگەیشتن بە سندووقی پۆڵای بانك، دزان دیوارو تیغەی پۆڵای بانكیان كون كردو چوونە ژوور.

٨٢٣٦ 4244- **نمرە زیاد كردن بۆ قوتابی‌یەك:** ئەگەر لە دوو سێ وەرەقاندا لەرێ بۆ خەر زیاد كەمین، بە حاڵە حاڵ قبووڵ دەبێ/ دەردەچێ.

٨٢٣٧ 4236- **نمرە كەم كردنەوە لە:** ئەو كورە قوتابی‌یانەی كە لە تاقیكاریی فۆرمدا زۆر لە سەرێ بوون لەرمیان لێ‌كەم كرایەوە چونكە فاسیلەی ئەوان دەگەڵ باقی قوتابی‌یەكان پێشاندەری ئیستیعدادی راستەقینەی ئەوان نەبوو.

٨٢٣٨ 5730- **نواندن، لە جێگادا درێژ كردن:** جان لە بەیانی‌یەوە زگێشەیەتی. بێ‌نەرێنەو بنێرە بە دوای دەكتوری.
← دەخەو كردن (بە راژاندن).

٨٢٣٩ 4088- **نواندن، دەخەو كردن (بە راژاندن)؛** بۆی هەیە راژانی قەتارەكە دەخەوی كردم.
← دەخەو كردن.

٨٢٤٠ 6800- **نۆبە كردن، بە نۆبە كارێك لە نجام دان:** بە رۆژێكی بە ماشێنی چووینە باشووری فەرانسە. لە رێگایە بە نۆبە ماشێنمان لێدەخوری.

٨٢٤١ 76- **نۆبە كردن، بە نۆبە روودان:** كاتێك چووبوون بۆ پشوودان، هەوا جارێك تاوو ساوو جارێك هەورو هەڵا بوو.

نۆبە گرتنەوە ← بەخەت راوەستان، سەرە گرتن.

نۆبە گەیشتن ← گەیشتن.

نوستن ← خەوتن، خەو لێکەوتن.

٨٢٤٢ 4197- **نووستن لەگەڵ (-گەڵ):** هەرگیز ئارەزووم نەدەکرد دەگەڵ خانمی ... بنووم. بەڵام، بێگومان لەسەر جێیەشم فرێ نەدەدا.

نوسخە هەڵگرتن لە ← روونووس هەڵگرتن لە، تەکسیر کردن.

٨٢٤٣ 1831- **نوشتاندنەوە، بەسەر ... دا نوشتاندنەوە:** کابرایەک مستێکی وەهای لە زگیدا کە بەسەر خۆیدا نوشتاوە.

٨٢٤٤ 2793- **نوقم بوون، غەرق بوون:** کەشتییەکە وشاخێکی نادیاری ژێردەریا کەوتەو بە هەموو سەرنشینەکانییەوە نوقم بوو.

٨٢٤٥ 261- **نوقم بوون، غەرق بوون:** کاتێک کەشتیی نەجات گەیشتن، "دیسکاوێری" لە مێژ بوو غەرق ببوو.

٨٢٤٦ 4670- **نوقم بوون لە ... دا (بە خێرایی):** چاوێکی بە هۆزە پڕ لە خەڵکەکە داخشاندو بە خێرایی لە تەنیا کورسی/ سەندەڵیی دەستەداردا نوقم بوو.

٨٢٤٧ 4083- **نوقمی ... بوون:** لە بەرامبەر سەرکەوتنەکانی ئەودا نوقمی ستایش ببووین.

← چوونە ژێرئاو، غەرقی شتێک بوون، گەوزین لە...، پڕبوون لە.

نوقمی شتێک کردن ← داپۆشران.

٨٢٤٨ 6481- **نوقمی کارێک بوون، بە تەواوی سەرگەرمی کارێک بوون:** کابرای نەققاش نوقمی کارەکەی بوو؛ زەریەی سوولەو وردبینانە، بۆ تۆسقاڵێک رەنگ خەسار کردن، دەستەکانی ئەرخەیانو کارامە.

٨٢٤٩ 7492- **نوقمی کارێک بوون، چوونە نێو ...:** ئیزابێل چوو بووە نێو ئەزموونێکەوە کە ئەندامەکانی خۆیان وەقفی پاراستنی حەیوانان کردبوو.

٨٢٥٠ 7350- **نوقمی کارێک بوون:** ئەو زۆربەی شەوەکان لە ئیدارە کار دەکا. پیاو دەتوانێ بڵێ نوقمی کارەکەی بووە.

٨٢٥١ 846- **نوقمی کارێک بوون:** هەر پاش فراوین دەچووە ژووری کارو نوقمی نووسین دەبوو.

٨٢٥٢ 813- **نوقمی کارێک بوون، هەتا ملان پێوەبوون، لە ژێر باری کارێک دا پشت شکان:** جارێ ناتوانم خۆی تێ هەڵقورتێنم/ لێی نزیک بەمەوە: کۆڵێک وەرەقەی ئەزموونی بەسەردا ماوەتەوە/ لەژێر باری وەرەقاندا ئەوە پشتی دەشکێ.

٨٢٥٣ 4675- **نوقمی ... کردن:** کوژانەوەی کارەبا لە پڕ ماڵەکەی نوقمی تاریکی کرد.

نۆکەریی کەسێک کردن ← دەستی کەسێک ماچ کردن.

٨٢٥٤ 26- **نوشیکردن، وەنەوزدان، (هەستێک):** چاوی بریبووە کورەکەی کە وای نیشان دەدا دڵ برینداره. هەتا ئەو کاتەی کورەکەی سەری بەرداوە، چاوی لە سەر هەڵنەگرت.

٨٢٥٥ 43- **نووسان بە شتێکەوە، دەست لە ... هەڵنەگرتن:** سەرەرای ئەوە کە هەوای ناخۆش بوو، بڕیاریان دا لە نەخشەی سەرەکی دەست هەڵنەگرن.

٨٢٥٦ 42- **نووسان بە شتێکەوە:** ئەو رەنگە بە هەموو شتێکی زوور یان لووسەوە دەنووسێ/ هەموو شتێکی زوور یان لووس دەگرێ.

٨٢٥٧ 258- **نووسران، یادداشت کران:** ئایا رێکەوتی کۆبوونەوەی داهاتوو لە دەفتەرەکەت دا نووسراوە؟* هەوڵ مەدە حاشا لە قسەکانت بکەی. هەرچی گوتووتە زۆر بە روونی لێرەدا یادداشت کراوە.

٨٢٥٨ 1453- **نووسران، گوتران:** ئەگەر داواکەت بۆ دامەزران بە زمانێکی دوور لە فێزو هەولوە نووسرابا، زۆر وێدەچوو بۆت جێبەجێ بووبا.

٨٢٥٩ 2800- **نووسران، یادداشت کران:** هەر وشەیەکی لە دادگادا دەگوترا یادداشت دەکرا بۆ ئەوەی بتوانن لە داهاتوودا بچنەوە سەری.

٨٢٦٠ 1998- **نووسران لە ... دا، هەڵکەنران لە ... دا، گونجان:** مافەکانی وڵاتانی ئەندامی بازاری هاوبەشی ئەورووپا لە پەیماننامەی رۆمادا هاتوون.

٨٢٦١ 978- **نووسران لەسەر، لەسەر حیساب نووسین، بە حیساب گرتن:** "ئاوتیان لەسەر تابلۆی راگەیاندراوەکان نووسیوە...". * دوو ویسکیی دووبڵ و... بەڵێ، تکایە لەسەر حیسابەکەمی بنووسە.

٨٢٦٢ 2029- **نووسران لە شتێکدا، دیاریکران:** مافی مرۆڤ لە "منشور"ی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بە روونی نووسراوە.

٨٢٦٣ 259- **نووسران وەک:** شۆرەتەکەیان (وەک) "یەزدانی" نووسیوە لە حاڵێکدا"، "یەزدانی پوور"ە.

٨٢٦٤ 378- **نووسرانی، دەرچوونی (دەستووری بازداشت، دەستبەسەر کردنی ...):** بڕیاری دەستبەسەر کردنی ئەو دوو کەسەی پیاویان کوشتووە دەرچووە.

٦٢٦٥/ 6853- **نووسین، (بە پەلە پڕووزە، بە تالووکە)**: لە کاتێکدا لە سالۆنی فرۆکەخانە چاوەڕوان بوو، بە پەلە پرووزە نامەیەکی بۆ ماڵێ نووسی.

٦٢٦٦/ 2231- **نووسین، یادداشت کردن، پڕکردنەوە(ی فۆرمو ...)**: وردە شتی زۆر هەبوون کە دەبوو بنووسرێن و گەڵاڵەیەکیش ئامادە بکرێ.

٦٢٦٧/ 2039- **نووسین، یادداشت کردن (لە دەفتەرێکی تایبەتیدا)**: نووسینی چەندێتی داوو دەرمانی ژەهراوی لە کاتی فرۆشتنیان لە دەفتەرێکی تایبەتیدا کارێکی یەکجار گرنگە.

٦٢٦٨/ 2034- **نووسین، یادداشت کردن**: هەموو شەوێ، پێش خەوتن گولێ ڕووداوەکانی ئەوێ ڕۆژێی لە دەفتەری یەومیەیەکانیدا دەنووسێ.

٦٢٦٩/ 4904- **نووسین، یادداشت کردن**: ڕێکەوتەکەی لە دەفتەری یادداشتی ڕۆژانەتدا بنووسە هەتا لە بیرت نەچێ.

٦٢٧٠/ 4839- **نووسین، یادداشت کردن**: نرخی خاروبارەکەی لەسەر سندووقی پووڵ ئەژمێری نووسی.

٦٢٧١/ 4344- **نووسین، یادداشت کردن**: هەرچی دەمگوت یادداشتی دەکرد. ● ڕێکەوتی چاو پێکەوتنەکەیان بە وردی نووسیبوو/ یادداشت کردبوو.

٦٢٧٢/ 4180- **نووسین، نووسران**: داخوازنامەکان دەبێ لە سێ نووسخاندا بنووسرێن. ● لیستی لیباسشۆرییەکەی هەلگرت کە لە پشتی پاکەتێك نووسرابوو.

٦٢٧٣/ 1502- **نووسین بە حیسابی کەسێك، ڕاستی دەحیسابی کەسێکەوە**: ئەو قوماشانەی کە لە فاکتۆری ژمارە ١٠٨٤ی ئێوە دانووسراون بۆتانیان دەنێرینەوە چونکە دەگەڵ مورشەخەساتی دیاریکراو ناخوێننەوە. تکایە پارەکەمان بە حیسابی بستانکارمان بنووسن.

٦٢٧٤/ 7506- **نووسین لە ...دا، یادداشت کردن**: پێش ئەوەی لە بیرت بچێتەوە، ژمارەی تەلەفوونەکەم یادداشت کە.

٦٢٧٥/ 7503- **(وتار، لێکدانەوە) نووسین لە دژی یان بە دژی**: چەندین کەس لە چیرۆك نووسانیان - بۆی هەیە بە هۆی نووسینی گەلە بابەتێك بە دژی دەوڵەت- داوا کردووە تەوزیع بدەن.

٦٢٧٦/ 7502- **نووسین لەسەر بابەتێك**: ئەو لە بەخێو کردن/ پەروەردە کردنی سەگاندا پسپۆرە چەند کتێبی لەسەر ئەو بابەتە نووسیوە.

٦٢٧٧/ 4909- **نووسین وەك، حیساب کردن وەك**: کاتێك ئالفرێد دەچێتە سەفەری دەرەوەی وڵات، خەرجی خۆشگوزەرانییەکانی بە حیسابی خەرجی سەفەر دەگرێ. ● ئەو کچە لە دەفتەری هوتێلان وەك خالی جونز خۆی دەنووسێ (= بە ناوی خالی جۆنز خۆی دەناسێنێ- وەرگێڕ).

٦٢٧٨/ 6361- **نووسین، یادداشت کردن**: ناوی خۆتان لە سەرەوەی فۆرمەکە بنووسن. ● فۆرمەوولەکەی لە پشتی پاکەتەکە کۆنێك یادداشت کردبوو.

← بە حیسێب هێنان، کێشان (چەکی بانکی).

٦٢٧٩/ 1629- **نووسین (بە پەلە)، کێشانەوە**: وا دیار بوو شتەکەیان بە پەلە نووسیبوو، بەڵام تەنیا ژمارەی دروستی خەتەکانی تێدا بوو.

← یادداشت کردن بە خێرایی.

٦٢٨٠/ 1444- **نووسینەوە، یادداشت کردن**: هەواڵنووسەکان قسەکانی سەرۆك وەزیرانیان بە وردی نووسیوە.

٦٢٨١/ 2459- **نووسینەوە، یادداشت کردن، سەبت کردن**: تەواوی وتووێژەکەم وشە بە وشە نەنووسیوە، بەڵام بەشی هەرە زۆریم یادداشت کردوە.

← یادداشت کردن.

٦٢٨٢/ 7507- **نووسینی ناوی پاڵێوراوێك/ کاندیدایەك لە لیستی هەڵبژاردندا**: لە سیستیمی هەڵبژاردنی گشتی لە بریتانیا نووسینی ناوی پاڵێوراوێك کە لە لیستەی تایبەتییدا ناوی نەبێ باو نیە.

٦٢٨٣/ 6238- **نوێنەرایەتی کردن، پێشاندەری ... بوون، لە جیاتی شتێك بەکار هاتن یان دانران**: لەو پیاوەو هەرشتێکی کە ئەو نوێنەرایەتیی دەکا بێزارم. ● دووهەمین پیتی ئیمزاکەت لە جیاتی چی بەکار هاتووە؟

نەبا پێداهاتە نە باران ← وەرووی خۆ نەهێنان.

نەبان بوون لە ← دڵسارد بوونەوە لە.

٦٢٨٤/ 3543- **نەباریین، نەهاتن (ی بەفروباران)**: هەوری چڕ بەسەرماندا ڕابردن، بەڵام لە سەرانسەری ڕۆژەکەدا باران نەباری.

٦٢٨٥/ 3828- **نەبزاوتن، دەست لێنەدان**: خەفەکونەکەمان نەبزاوت بۆ ئەوەی سۆزیەکە نەفتی تەواو نەبێ و نەکووژێتەوە.

٦٢٨٦/ 7219- **نەبوون بۆ، توانایی کارێك لە دەستدان**: بەداخم کە هەڵسوکەوتی لە بەرامبەر کاربەدەستانی سەرەوەدا وای لێ کردووە کە بۆ ئەوە نابێ لەسەر ئەو پرۆژەیە کار بکا.

نەبوونە هۆی بەدگومان بوونی... ← بە گومان نەکردن.

٨٢٨٧ 6799- **نەبوونی ئیمکانات تەحەممول کردن لە بەرامبەر خۆشییەکانی شووا:** ئەگەر دەتەوێ لێرەو دوور لە هەڵاّ هەڵاّی شار، لە خۆشییەکانی ژیان بەهرەمەند بی، دەبێ کەمێکیش نەبوونی ئیمکاناتو زەحمەت قبووڵ کەی.

٨٢٨٨ 7435- **نەبوونی شتێك یان کەسێك بە ئاوات خواستن، بە ئاواتی نەبوونی یان ئەوەو بوونی شتێك بوون:** ئاکرێ بە خۆ گێلکردن یان بە بە ئاوات خواستن نەبوونی خوازیارانی دەرس خوێندن لە زانستگەکان ئەم موشکیلەیە چارەسەر کەی، خوازیارانێك کە ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەیان زیاد دەکا.

٨٢٨٩ 7223- **نەبیستراو، وێنە نەبوون:** هەتا ئێستا کەس نەیبیستووە کە کوڕێکی هاوتەمەنی ئەو لە زانستگە وەرگیرابێ.

نەبەساندن دەگەڵ ← پێوەندیی خۆ ڕاگرتن دەگەڵ.

نەبیستران ← لە هەتەرەی چاو دەرچوون.

نەجات بوون، یان پەیدا کردن لە دەستی ← ڕزگار بوون لە دەستی.

٨٢٩٠ 6694- **نەجات دان:** سەرنشینەکانی نەوتکێشەکەیان کە دوێنێ شەوێ دەفەوتێ چەقیبوو بە هێلیکۆپتێر نەجات دا.

٨٢٩١ 4551- **نەجات دان:** دوای ئەوە کە پەیامی "بەفریامان بکەن" یان پێ گەیشت، تاقمی فریاگوزاریی هەوا - دەریا کابرای فڕۆکەوانیان کە فڕۆکەکەی بەربووە لە دەریا نەجات دا.

٨٢٩٢ 5326- **نەجات دان:** تاقمی ئاگر کوژاندنەوە سێ منداڵیان لە قاتی سەرووی خانووەکە نەجات دا.

٨٢٩٣ 932- **نەجات دان:** ئەو (خودا) نەجاتتان دەدا/ ڕزگارتان دەکا. ● هەبوونی باوەڕی ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر بە ڕێبەرە تازەکان، سەربازەکانی نەجات دا.

← ڕزگار کردن، بوونە هۆی چاك بوونەوەیان زیندووەمانی.

٨٢٩٤ 6300- **نەچوون، نەهاتن:** لەو تێرمە (ی دەرس خوێندن) دا ژیلوان زۆر جارانو هەرجارەی بۆ ماوەی چەند هەفتان نەدەچووە قوتابخانەی.

٨٢٩٥ 3906- **نەچوونە ژێر باری...:** بە هیچ جۆرێك ناچێتە ژێرباری ئەو تاوانبار کردنانە.

٨٢٩٦ 6315- **نەچوونەوە ماڵ، نەهاتنەوە ماڵ، لە دەرەوەی ماڵێ مانەوە:** دوێنێ شەوێ، هەتا ئێوەشەوێ نەهاتۆوە ماڵێ. چت بۆ هاتبوە پێش/ چت لێقەومابوو؟

٨٢٩٧ 1178- **نەخشگێڕان، نەخش یاری کردن:** بەڵێ، لە نەخشەکە دەگەم، بەڵام نازانم ئەمن لە کوێو کەنگێ نەخشی خۆم بگێڕم.

٨٢٩٨ 2227- **نەخش گێڕان وەك، لە نەخشی کەسێکدا یاری کردن:** زۆربەی ئەو کەسایەتییانەی لە کتێبی ... بالزاك داهاتوون لە چەرۆکی دیکەشدا نەخش دەگێڕن.

٨٢٩٩ 4617- **نەخشە دانان، بەرنامە دارشتن:** ژینەراڵێك ڕەنگە چەند مانگ پێشتر نەخشەی خۆی دابنێ/ دابڕێژێو ئەفسەرێکی فەرماندەی دەستە چەند سەعات پێشتر.

٨٣٠٠ 5623- **نەخشە کێشان بۆ:** بە شێوەیەکی خەتەرناك لەو مەبەستەی نەخشەیان بۆ کێشابوو نزیك ببوونەوە.

٨٣٠١ 5471- **نەخشەی گشتیی ... کێشان:** بەم جۆرە نەخشەی گشتیی داهاتووی خۆیان کێشابۆوە. ئالفرێد دەچووە دە ئەرتەشێو ڕابرت دەچووە هێزی دەریایی.

٨٣٠٢ 5470- **نەخشەی گشتیی ... کێشانەوە:** بۆ ئەوەی ئیدمیەك لە ڕەوتەکە نیشان بدەم نەخشەی گشتیی دوو ئینسانم کێشاوە.

٨٣٠٣ 5962- **نەخشەی گشتیی یان پێشنووسی شتێك کێشانەوە یان نووسین:** تەڵەمیتەو ...م بدەنێ هەتا نەخشەی گشتیی ئەو شتە بکێشمەوە کە لە مێشکم دایە.

٨٣٠٤ 7285- **(لە شانۆگەریدا) نەخشی یان ڕۆڵی کەسێك وەئەستۆ گرتن، بۆ ماوەیەکی زۆر کورت هاتنە سەر بەرزەك:** کریستۆفەر لەوە خۆشحاڵ بوو کە بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ، بێتە سەر بەرزەك ... ە دەوری باشتۆزکەرداو چ لە نەخشی پۆلیسێکدا.

نەخۆش بوون ← کەوتن.

نەخۆش خستن ← ماندوو کردن.

٨٣٠٥ 1428- **نەخوێندنەوە دەگەڵ، نەهاتنەوە دەگەڵ، یەکتر نەگرتنەوە:** هەڕەشەو گوڕەشەکانی دەگەڵ ئەو لە سەرەخۆیییەی کە لە کاتی بەرەوڕوو بوون دەگەڵ نەیارەکەی لە خۆی نیشان دەدا ناخوێنێتەوە/ نایەتەوە.

← دژایەتی هەبوون دەگەڵ، دژی ... بوون، نەهاتنەوە دەگەڵ بە پێچەوانەی شتێك بوون.

←نەخەوتن، نەنووستن، درەنگ نووستن.

٨٣٠٦ 7440- **نەدان، ڕاگرتن:** ئەو مامۆستایانەی قوتابخانان کە یارمەتیی مانگانەیان نەداونێ/ لێ ڕاگرتوون خەریکن بەرنامەیەکی ئیعتیراز گرتن ڕێك دەخەن.

٨٣٠٧ 3583- **نەدرکاندن، باس نەکردن:** دواتر هەر ئەوێ ڕۆژێ، لە فکری ئەوە دابوو کە چەند جۆکی خۆش کە بۆ

خۆی سازی‌کردبوون، بۆ خەلکەکە بگێڕێتەوە. بەلام جارێ نەیدەدرکاندوون.

← نهێنی راگرتن، بلاونەکردنەوە.

٦٢٠٨/ 1050- **نەبینین، چاو پێنەکەوتن:** چەند مانگە چاوم بە ... نەکەوتووە. چی بەسەر هاتووە؟

نەردە لێدان ← پەرژین لێدان.

نەڕاندن ← هاوار کردن.

٦٢٠٩/ 5434- **نەڕاندن، گوڕاندن:** پێم خۆش نیە بەسەرتدا بگوڕێنی، خۆ سەربازی نێو سەفی رێزە نیم!

٦٢١٠/ 6980- **نەڕاندن و رەخنە گرتن لە، رەخنە گرتن لە (بە دەنگی بەرزەوە):** یەکێك لە نوێنەرانی ریزی پشتەوەی مەجلیس بەدەنگی بەرزەوە لەوەی کە بۆ خۆی ناوی نابوو زیادەرویی کردن لە خەرجی خزمەتە گشتی‌یەکاندا بە دەنگێکی بەرز رەخنەی دەگرت.

٦٢١١/ 6059- **نەڕاندن یان گوڕاندن بەسەر کەسێکدا:** جان بەسەر دەرکەوانەکەیدا گوڕاندو گوتی: ئەتۆ ناتوانی بێیەژوورێ. زۆر زوو بەو کارەت رادەگەی.

٦٢١٢/ 4061- **نەرم بوون:** کاتێك پێم گوت براکەم لە ئوستڕالیارا هاتووم، نەرم بوو، بردمی دیوی میوانان.

٦٢١٣/ 7017- **نەرم کردنەوە:** فلیمینگ ناچار بوو هێندێك لە روانگە رەخنەگرانەو توندو تیژەکانم نەرمتر کاتەوە.

نەرم کردن ← رێگا ساف کردن (بۆ پێشڕەوی)

٦٢١٤/ 7268- **نەرزیشتن، مانەوە:** کامران، کاتێك کلاس تەواو بوو، بێنەوە؛ چەند قسەیەکم پێتە.

← مانەوە.

٦٢١٥/ 5543- **نەریتی (- سونەتی) بنەمالەییەك بوون):** چاوەڕوانیی ئێمە لەو کوڕە ئەوەیە کە بچێتە هێزی دەریایی‌یەوە - ئەمە نەریتێکی بنەمالەییمانە.

نەزارە ← بازداشتگە.

نەزانران ← دیار نەبوون.

نەزانین ← تێنەگەیشتن.

٦٢١٦/ 1409- **نەزر کردن، فیداکردن، پێشکەش کردن:** پیارەکان زۆر بە کەرامەتەوە گیانو مالی خۆیان پێشکەش بە رزگاریی نیشتمان کرد. ● لەبەر دەمی حەشیمەتێکی گەورە، کەنیسە تازەکە نەزری خودای گەورە کرا.

نەزری خودا کردن ← بە بارەگای خودا پێشکەش کردن.

نەزەرتان چی‌یە؟ ← چۆنی تێدەگەی؟

٦٢١٧/ 6524- **(کورت کردنەوەو) نەزەردان لەسەر دەوسیەیەك:** لە سالۆنی پڕ لە حەشیمەتو بێدەنگی دادگادا، دادوەر دەستی کرد بەکورت کردنەوەی باسەکەو نەزەردان لەسەر پەروەندەکە.

٦٢١٨/ 6118- **نەزەردان (بێ هەبوونی زانیاری‌یەکی تەواو):** لە پێوەندی دەگەڵ ئەو جۆرە مەسەلانە هەر لە خۆوە نەزەردان کارێکی بێ فایدەیە.

٦٢١٩/ 4455- **نەزەردان لەسەر:** خوێندکارەکە کە خەریکی لێکۆلینەوەی زانستی بوو لەسەر پەرشتەکەی داوا کرد کە سەبارەت بەو شتانەی کۆی کردبۆوە نەزەری خۆی بدا.

٦٢٢٠/ 6111- **نەزەردان یان قسە کردن لە دژی:** زۆر خۆشحالم کە دەبینم یەکێك ئەو نازایەتی‌یەی هەبووە کە لە دژی ئەو دەستدرێژی‌یانە قسە بکا.

٦٢٢١/ 6687- **نەزەر هەبوون لەسەر:** زۆربەی ئەو کەسانەی لە جادەکە کەللە وەردەگرن، سەبارەت بە رانەندە شەخسی‌یەکان نەزەرێکی سەختگیرانەیان هەیە.

٦٢٢٢/ 5616- **نەزەر هەبوون لەسەر:** سەروتاری رۆژنامەی تایمز سەبارەت بە روانگەیەك بۆ دۆزینەوەی رێگایەك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی قەتار نەزەری چی‌یە؟

٦٢٢٣/ 6903- **نەزەر هەبوون لەسەر:** دەزانم کە برای خۆشەویستم نەزەرێکی ئەوتۆ باشی لەسەر من نیە.

← رەفتار کردن.

٦٢٢٤/ 6092- **نەزەری کەسێك وەرگرتن، لە بیروڕای کەسێك گەیشتن:** داخوا هەتا ئێستا نەزەری خێزانت لەسەر چوونتان بۆ ئوستڕالیا وەرگرتووە/ لە نەزەری گەیشتووی؟

٦٢٢٥/ 3149- **نەزەرێکی تایبەتی هەبوون لەسەر (- سەبارەت):** سەبارەت بە پێشنیارەکەت بە هیچ لایەك دا نەزەرێکی تایبەتیم نیە. ● ئەشرافییەت مەسەلەیەك نەبوو کە ئەو لە سەری نەزەرێکی تایبەتی هەبێ.

نەسرەوتن ← خزین.

نەغد کردنەوە ← دەمەستۆ پەستاوتن.

٦٢٢٦/ 3284- **نەفرۆشتن، راگرتن، لە دەست نەدان:** ئەوە بە هیچ جۆرێ کافی نیە کە رێبەرایەتی‌یەکە بە دەستەوە بگرین. دەبێ لە دەستی نەدەین!● دەبێ ئەو بەلگە بەهادارانە لە دەست نەدەم/ نەیانفرۆشم؛ بە شێوەیەکی بەرچاو نرخیان دەچێتە سەر.

نەفەس لێبڕین ← خنکاندن.

٦٢٢٧/ 7062- **نەقل بوون، راگوێزران:** بە سازماندرانەوەی دایرەی لێکۆلینەوەو پەرەپێدانی ئیدارەی پۆست، ناچار بوون ژمارەیەکی زۆر لە کارمەندان بۆ ناوەندێکی تازە لە سوفۆلك نەقل کەن.

٨٤٢٨ 5672- نەقڵ كران (بۆ)، راگوێزران (بۆ): سەرگورد شێرزادیان بۆ لای ئێمە نەقڵ كردووە بۆ ئەوەی شێوەی گەیاندنی زانیارییەكانمان فێركا.
٨٤٢٩ 4703- نەقڵ كران یان كردن (بۆ جێگایەكی دیكە): بەداخەوە سەروان جونز لێرە نەماوە؛ بۆ جێگایەكی دیكە نەقڵ كراوە.
٨٤٣٠ 3832- نەكوژاندنەوە، ئەیهالێن: هەتا بەیانی سۆبە كارەباییەكەیان نەكوژاندبووە. ● دەتوانن چرای سالۆنێ نەكوژێننەوە.
نەگرتن ← لێ شاردنەوە.
٨٤٣١ 3291- نەگلێپین، دەست لێ هەڵنەگرتن، چاوپۆشی نەكردن لە: ئێمە لەو خاڵانەی كە لە قەراردادەكەدا لەسەریان رێككەوتووین دەست هەڵناگرین/ چاوپۆشی ناكەین.
نەگونجاندن ← دژایەتی هەبوون.
نەگەیشتن بە هیچ كوێ ← بە هیچ كوێ، یان بە هیچ جێگایەك نەگەیشتن.
٨٤٣٢ 2909- نەمان، لە نێوچوون: هەرچی زەمان تێدەپەڕی و كابرا پیرتر دەبوو لە توورەیی و توندوتیژیی قسەكانی لە پارلمانێدا كەم دەبۆوە.
٨٤٣٣ 4450- نەمان، لە نێو چوون، تەواو بوون: مینسكالێن دەرمانێكی تەواو بێ زەرەرەو ئەسەرەكەی بە هەشت هەتا دە سەعاتان تەواو دەبێ.
← لە نێو چوون، هەڵگەڕان، تەواو بوون.
٨٤٣٤ 7222- نەناسراوبوون، نەناسین: هەتا پێش ئەوەی كە بۆ یەكەم جار لە تیاتری وێست ئێند بێتە سەر بەرزەك بە تەواوی نەناسراو بوو/ كەس نەیدەناسی.
٨٤٣٥ 428- نەنووستن، رانەكشان، نەخەوتن: زیاتر لە نیوەی شەوەكە نەخەوتەو ئاگای لە منداڵە نەخۆشەكەی بوو.
٨٤٣٦ 6398- نەهاتن بۆ، غایب بوون لە، حازر نەبوون لە: ع شتێك بوو بە هۆی ئەوە كە نەهاتی بۆ وتاردانەكەی؟ یەكێك لە باشترین وتارەكانی بوو.
← نەچوون.
٨٤٣٧ 3544- نەهاتنە پێش، دووركەوتنەوە، كشانەوە: دوودانە تابلۆی گەورە كە لە سەریان نووسرابوو؛ " مەینە پێش" لە هەردووك تەنیشتی قیاغەكە درابوون. ● لە چیمەنەكە دوور كەونەوە (= بەسەر چیمەنەكە دا مەڕۆن).
٨٤٣٨ 1741- نەهاتنەوە دەگەڵ، نەخوێندنەوە دەگەڵ، جوور نەهاتنەوە دەگەڵ، یەكتر نەگرتنەوە: كۆی ئەوەی ئەمن وەدەستم هێناوە دەگەڵ كۆی لیستەی تۆ نایەتەوە.

نەهاتنەوە دەگەڵ ← رێك نەكەوتن، دژایەتی هەبوون دەگەڵ، پاشەكشە كردن، نەخوێندنەوە دەگەڵ، هاوئاهەنگ نەبوون، دژی ... بوون، بە پێچەوانەی شتێك بوون.
٨٤٣٩ 1749- نەهێشتن، پێش پێگرتن، رێگالێگرتن، دڵنیا كردنەوە: مەهێڵە ئەمشەو بە ماشێنی بگەڕێتەوە بۆ لەندەنێ. ● ئەوەندە خراپی دەرس پێ دەگوتین كە بە تەواوی لە یانەی ماتماتیك دڵسارد بووینەوە.
٨٤٤٠ 907- نەهێشتن و تەواو كردن، كەم كردنەوە، هێنانە خوار (تا رادەی سیفر): سیاسەتی بە ئەوزمی سەرمایەگوزاری، قەرزەكانیانی هەتا رادەی سیفر كەم كردۆتەوە.
٨٤٤١ 6403- نەهێشتن: بریا نەتهێشتبا ئەو ترومپێتەی لێبدا.
← لە گۆڕێ هەڵگرتن، رێگا نەدان بە، خۆپاراستن لە.
نەهێنان ← بەجێهێشتن.
٨٤٤٢ 7214- نهێنی خۆ بە كەسێك گوتن، دركاندنی شتێك لە لای كەسێك: ئەو كەسێك بوو كە ئەو ژنە دەیتوانی لە لای ئەو ئازادانە قسان بكا، كەسێك كە دەیتوانی نهێنییەكانی خۆی پێ بڵێ.
٨٤٤٣ 858- نهێنی راگر بوون، نهێنی پارێز بوون: تەنانەت یەك وشەشی لە نەخشەی ئێمەی نەدركاندووە؛ پیاوێكی نهێنی پارێزە.
٨٤٤٤ 3505- نهێنی راگرتن، شاردنەوە، سەرپۆش لەسەر دانان، نەدركاندن: سەرۆك كۆمار بڕیاری دا چیدی راقیعییەتەكانی وتووێژە نهێنییەكە نەشارێتەوەو لە رۆژی ٢٥ی ژانویە رای گەیاند.
٨٤٤٥ 4163- نهێنی راگرتن، شاردنەوە: ئەتۆ دەتزانی كە ئەمن لەو یانەیە/ باشگایە ئەو كارەم دەكردو، هەرگیز نەشم دەشاردەوە.
← پێش بە بڵاو بوونەوەی ... گرتن.
٨٤٤٦ 3868- نهێنییەك لە لای كەسێك دركاندن: ئەو شتە لە لای ئالفرێد مەدركێنە، چونكە ماوەیەكی ئەوتۆ نهێنی نامێنێتەوە. ● با نهێنییەكت پێ بڵێم؛ دەمنێرن بۆ دەرەوەی وڵات.
← متمانە كردن بە.
٨٤٤٧ 124- (بە) نیسبەت دان، بە هی كەسێك زانین: سەركەوتنی وەك چیمۆكنووس دەكرێ بە فورمولی سادی سێكس و خوێنرێژی و تانەو تەشەر نیسبەت بدرێ.
← گەڕانەوە بۆ.

٦٢٤٨ 340- **نیشاندان، هاتنە سەر پەردە**: لەم هەفتەیەدا فیلمێکی باش لە سینەما پلازا نیشان دەدەن.

٦٢٤٩ 1203- **نیشاندان(ی کەسایەتی، تووڕەیی)**: ئەو سەردەمە دێنمە بەرچاوم کە ئەو ژنە دەگاتە تەمەنی چل - پەنجا ساڵەیی، وەك دایكی بنەماڵەیەك پلەو پایەی خۆی دادەمەزرێنێو کەسایەتیی خۆی نیشان دەدا.

٦٢٥٠ 2665- **نیشاندان، پیشاندانی ... بوون**: کاتێك سەرکرێکار چاوی لە کارتۆنەکان کرد، کارتۆنەکان وایانیشان دەدا کە دەستکاری کراون.

٦٢٥١ 5887- **نیشاندان، خستنە بەرچاو**: دادڕاویی داوێنی کراسەکەی بەدەنی بەوپەڕی جوانیی نیشان دەدا.

٦٢٥٢ 5888- **نیشاندان**: پێش ئەوەی ئەو چاو بەستنە نیشانی خەڵك دەی، دەبێ کەمێك زیاتر تێکراری کەیەوە.

٦٢٥٣ 5318- **نیشاندان، نواندن**: لەو ڕەسمە سەرەتاییەدا، شازادەکەیان وەك شەرکەرێکی یونانیی نیشان دەدا.

٦٢٥٤ 5261- **نیشاندان، فەوتی دانان لەسەر، شوێنەوار بەجێهێشتن**: ناگاتان لە خۆتان بێو کارێکی وا نەکەن لەسەر ناوبانگی باشیی دایرەکەمان شوێنەواری خراپ بەجێبێڵێ.

٦٢٥٥ 4916- **نیشاندان، وەدەرخستن، ڕاناندن**: ڕۆژێکی یەکجار خۆش بوو، زانکۆش هەموو جوانییەکانی خۆی دەرخستبوو.

٦٢٥٦ 4680- **نیشاندان**: کابرای ڕێنوێن بەناوبانگترین ڕەسمەکانی نیشان داین.

٦٢٥٧ 3093- **نیشاندان بە شێوەیەکی خراپو زیاتر لە ئەندازە گەورە کراوە**: بۆ دەبێ لە هەر بەرنامەیەکی کە لە تەلەویزیۆن بڵاو دەبێتەوە بەشێك لە شانۆکانی شیکسپیر بڵاو بکرێتەوە بەڵام بە شێوەیەکی خراپ؟

٦٢٥٨ 3030- **نیشاندان بە نموونەدار**: کاتێك ناکامی چالاکییە بازرگانییەکانی شەریکە لە ماوەی شەش مانگی ڕابردوو بە ئەوودار نیشاندرا، بە ڕوونی دەرکەوت کە شەریکە بە خێرایی بەرەو نابووتی دەڕوا.

٦٢٥٩ 6794- **نیشاندان یان دەرخستن (بە کردەوە)**: بێجگە لەوەش، "دەتوانم بە قەرا تۆ بەوەی بخۆمەوە"، " دەبێ بە کردەوە نیشانی بدەی".

نیشاندان ← جەخت دانان لەسەر، نیشانەی ... بوون، شانۆ لێساز کردن، گێڕان، هێنانە گۆڕ، خستنە بەرچاو.

٦٢٦٠ 1238- **نیشاندران(ی فیلم، شانۆ، ئۆپێرا)** : فیلمە سەرەکییەکە هەتا سەعاتی ۹ نیشان نادرێ. کەوابوو بۆ گەیشتنە سینەما وەختێکی زۆرمان هەیە.

٦٢٦١ 5145- **نیشانەوەی کردن، لەسەر هەدەف میزان کردن، لەئەندازە گرتنی سەودا**: هێشتا لەسەر ئێمەیان هەدەفگیری نەکردبوو (بۆ تاقیکردنەوەو بۆ ئەوەی سەوداکە بەلۆزنەوە چەند تۆزێك داوێژرێ- وەرگێڕ).

← هەدەفگیری کردن.

٦٢٦٢ 4240- **نیشانەگوزاری کردن**: مەیدانی وەرزش لە لایەن بەرپرسانی مەیدانەوە بۆ بەڕێوەبردنی یارییەکانی پاڵەوانێتی نیشانەگوزاریی کراوە.

نیشانە لێدان ← تێلەکردن.

٦٢٦٣ 4683- **نیشانەی ... بوون، نیشاندان، واگەیاندن، وادەرخستن**: هەموو ئەو نیشانانەی بەدەستەوەن وادەردەخەن کە بەم زووانە شەڕ دەست پێدەکاتەوە.

← هێزی شتێك بوون.

٦٢٦٤ 3859- **نیشتن، هاتنەخوار**: دوای یازدە سەعاتان کە لە پاریس هەستا، فڕۆکەی ئەیرفرانس لە شاری ریودوژنەیرو نیشت.

٦٢٦٥ 7030- **نیشتن، کەیشتنە وشکانی/ کەناردەریا**: لە فڕۆکەخانەی گاڵینا نیشتینەوە....

٦٢٦٦ 4898- **نیشتن، هێنانە خوار، دابەزاندن**: فڕۆکە بێمۆتۆڕەکەی لە نێو زەوییەکی گەنمشامیدا هێناخوارێ.

٦٢٦٧ 65- **نیشتن لەسەر**: ماسیگرەکان هەموو ئێواران لە ڕاوگە دەگەڕانەوە، لەسەر شاخەکان دەنیشتنو بۆ شەوێ لێی دەمانەوە.

نیشتنەوە ← کشانەوە، لەکوڵ چوونەوە.

٦٢٦٨ 6141- **نیشتن یان هاتنەخوار لەسەر دەریا**: قەرارە کەیهانەوەردانی ئاپۆلۆ سەعاتی ۳ی دوای نیوەڕۆ بەکاتی مەحەللی لە سەر دەریا بنیشن.

٦٢٦٩ 844- **نیشتەجێ بوون لە جێگایەکی دوور لە شاران**: چ شتێك بوو بە هۆی ئەوە لە دێ نیشتەجێ بێ؟

٦٢٧٠ 4032- **نیگابان، ئێشکچی، دیدەبان، پۆستی دیدەبانی، پێگەی دیدەبانی**: لەخەتی پێشەوەی بەرەی شەڕ دیدەبانیان دانابوون. ● لە یەکێك لە پێگەکانی دیدەبانی لە خەتی پێشەوەی بەرەی شەڕ دیدەبانیان دانان.

٦٢٧١ 1380- **نیگەران بوون، ناڕەحەت بوون**: پێویست ناکا خۆت ناڕەحەت کەی کە ئەمن دوێنێ شەوێ لە کوێ بووم.

٨٢٧٢ 2199- **نیگەران بوون:** ئەو کرێکارانەی لە کانگاژێرزەوییەکەدا دەدلو کەوتوون بنەماڵەکانیان بۆیان نیگەرانن.
← ترسان لە.
نێوناخن کردنی قسەیەک ← قسەیەک نێوناخن کردن.

٨٢٧٣ 2634- **نێوان تێکچوون، قسە لێک هەڵبەزینەوە:** تەنیا حەوتوویەک بوو لە هوتێلەکە کارم دەکرد کە دەگەڵ سەرۆکی مەیتەرەکان نێوانم تێک چوو.

٨٢٧٤ 1916- **نێوان تێک دان:** جیاوازیی روانگەکان بۆی هەیە پێوەندیی نێوان تاقمە میللییەکانی پێکهێنەری تیپەکە تێک بدا.

٨٢٧٥ 2421- **نێوان خۆش بوون، بە یەکەوە سازان، جووت بوون:** ئەمن و دایکم هەمیشە نێوانمان خۆش نیە، بەڵام بڕواشم بەو قسەیە هەیە کە دەڵێ: ماڵ ئەو جێگایەیە کە دڵت لێی خۆش بێ.

٨٢٧٦ 5498- **نێوان خۆش بوون، دۆستانە بە یەکەوە هەڵسوکەوت کردن:** ئەوە لەو جۆرە باشگایانە/ یانانە نیە کە دەوڵەمەندەکان و فەقیرەکان خۆ بە گەورەتر یان چکۆڵەتر لە یەکتر نەزانن/ کە بەیەکەوە دۆستانە رەفتار بکەن.
نێوان ناخۆش بوون دەگەڵ ← پێوەندییەکی نالەبار پەیدا کردن دەگەڵ، تێک چوون دەگەڵ کەسێک.
نێوان هەبوون دەگەڵ ← شتێک لەمێژ سەردا هەبوون دەگەڵ.

٨٢٧٧ 4260- **نێوبژیوانی کردن:** کاتێک دوو لایەنی کێشەیەکی گرنگی ئابووری دەگەنە بنبەست، وەزیری نێوخۆیی رەنگە هەوڵ بدا لە نێوانیاندا نێوبژیوانی بکا.

٨٢٧٨ 3419- **نێوبژیوانی کردن:** ژنەکە تێدەکۆشا لە نێوان مێردەکەی و کورەکەیدا نێوبژیوانی بکا، بەڵام، زۆر بە توندی پاڵیان پێوە نا.
← داوەری کردن (لە نێوان).
نێوبژیوان ← دەڵاڵ.
نیوەزەرکردن ← لە دەدان.

٨٢٧٩ 3178- **نییەتی خراپ هەبوون دەگەڵ کەسێک:** ئەوان (مەئموورەکانی پۆلیس) دەگەڵ شێرزادە چاوشینەکەی تۆ نییەتی خراپیان هەیە.

٨٢٨٠ 3369- **وا تێگەیشتن، بە ئاکامێک گەیشتن، وا لێ حاڵی بوون:** لە شێوەی وەژووورکەوتنی وا تێگەیشتم کە وتووێژەکەی باش نەبووە. ● داوەرەکە لە وەڵامی شاهیدەکان وای لێ حاڵی بوو کە کابرا شتێک دەشارێتەوە.

٨٢٨١ 5179- **وا تێگەیشتن (نووسراوێیەک):** لە نامەکەی وا تێگەیشتم کە کابرای وەدەر ناوە.
← بردن، یان چوون دەمێشکی کەسێکەوە.

٨٢٨٢ 4167- **واجیبێک کردن بە خەسڵەتێکی باش:** کلیساکان رۆژوو بە خەڵک دەگرن تا رادەیەک بۆ خاتری ئەوە کە واجبێک بکەنە خەسڵەتێکی باش، تا رادەیەکیش دەوڵەمەندەکان دەگەڵ ئەو وەزعە دژوارە ئاشنا کەن کە برا هەژارەکانیان ناچارن تەحەمولی کەن.

٨٢٨٣ 3499- **وادار بە کارێک کردن:** مامۆستا پیرە زۆر سەختگیر بوو قوتابییەکانی وادار دەکرد دەرسەکانیان بخوێنن، لە حاڵێکدا ئەوان پێیان خۆش بوو بچنە دیسکۆی. بەڵام لە ئاخرێدا سوپاسیان لێ دەکرد.

٨٢٨٤ 5594- **وادار کردن (بە پەلە):** مەهێڵن هیچ کەس بە پەلە وادارتان کا بچنە باڵیان. زۆر باش بیری لێ بکەنەوە.

٨٢٨٥ 4742- **وادار کردن، بە زمانی خۆش کارێک بە کەسێک کردن، رازی کردن:** لەسەر مێزی نانخواردن بە زمانی خۆش رازی کرد شەرابی بخواتەوە؛ کارێکی هاسان نەبوو.

٨٢٨٦ 4516- **وادارکردن بە، پێشنەند کردن بە:** زەحمەتە بتوانی وادارى کەی لە رێککەوتێکی دیاریکراودا کارەکەی تەواو کا.

٨٢٨٧ 5779- **وادار کردن بە (گوتنی چیرۆک، پێکەنینەوە ...):** " جان هیچ مەڵێ. دەنا واداری دەکەی دیسانیش دەست بکاتەوە بە گوتنی داستانە تێکەڵ پێکەڵەکانی زەمانی شەڕی."

٨٢٨٨ 6810- **وادار کردن، بە قسان کەسێک رازی کردن بۆ لە ئەنجامدانی کارێک:** دەزانم زمانت زۆر لووسە. کەوابوو بە زمانلووسی وادارم مەکە بیکەم.
← ناچار کردن، پێکردن، مان پێگرتن.

٨٢٨٩ 6638- **وادانان کە کەسێک بە کارێک رازییە و لە ئاکامدا بێنەوەی پرسیکی پێبکەن کارەکە لە ئەنجام بدەن:** پێش ئەوەی ئەرتیبی رێککەوتنەکان بدەن دەتوانن مەشوەرەتم دەگەڵ بکەن. ئەمن بەراستی زۆرم پێ ناخۆشە بێ ئەوەی ئەزەرم لێوەرگرن. وای دابنێن کە ئەمن بە تەواوی رازیم.
← هێنانە بەرچاو.
وادەرخستن ← نیشانەی ... بوون.

٨٢٩٠ 3344- **وارید کردن، هێنان (ی کاڵا و شتومەک):** پۆلیس ژن و مێردێکی جحێڵی دەزگیر کرد کە دەیانەویست هێرۆئینێکی یەکجار زۆر لە جێگایەکەوە لە ناوچەی دەریای سپی وارید کەن. ● لە هەموو وڵاتێک کەسانێک

هەن کە تێدەکۆشن پێشی هێنانی وشەی بێگانە بۆ نێو زمانی وڵاتەکەیان بگرن.

٨٣٩١ 4489- **واریز کردن، خستن (لەحیسابی بانک)**: یارمەتیی مانگانەی لە لایەن خاوەنکارەوە دەخرێتە نێو حیسابی بانکێکەیەوە.

٨٣٩٢ 1004- **واڕۆ کردن، ئیمزاکردن (ی دەفتەری هوتێل یان حازرو غایب)**: کەنگێ دەفتەرەکەیان واژۆ کرد؟ لە ڕێگایە تەسادوفیان کردبوو، هەربۆیەش هەتا لای ئێوەشەوێ نەیانتوانی دەفتەری هەتێل واژۆ بکەن.

٨٣٩٣ 5921- **واژۆ یان ئیمزا کردن (ی ڕێککەوتننامە)**: ئەو کەسانەی کە وەک داوتەڵەب هاتبوون، حازر بوون بۆ ماوەی شەرەکە ڕێککەوتننامەیەک واژۆ کەن.
← ئیمزا کردن.

٨٣٩٤ 5918- **واژۆ کردنی بەڵگەی دەست هەڵگرتن لە ...**: بە نووکە قەڵەمێک بەڵگەی دەست هەڵگرتن لە سەربەخۆیی وڵاتەکەی بۆ ماوەی دە ساڵان واژۆ کرد.

٨٣٩٥ 3687- **واڵەو بوون، لە جێگای خۆ ویشک بوون، زۆر جوان بەکجار خۆش**: لیباسە تازەکانی ماری لەسەر جێگای خۆم ویشکی کردم. بە حەیاتی خۆم شتی وا جوانم نەدیبوو. ● ئەو کچە بە هەر حاڵ زۆر جوانە، بەڵام بەو کڵاوەیەوە ئەوە نەی دیکە جوان بووە.
← ڕاگرتن (لەنەکاو).

٨٣٩٦ 3708- **واقیعەتی شتێک لەسەلماندن، قبووڵ لەکردن**: "ئاسکێ کچێکی جوانە، دەنا نا؟"، "جوان، چ عەرز کەم، بەڵام یەکجار دەوڵەمەندەو هەر ئەوەش بە هەرحاڵ زۆر جوانی کردووە".
واگمیاندن ← نیشانەی ... بوون.
وا لێ‌حاڵی بوون ← واتێگەیشتن.
وانێت بار ← پیکاپ.
وانیشان دان ← ئیدیعا کردن.

٨٣٩٧ 5809- **وانیشاندان، خۆ وانیشان وەک، پێوابوون**: نەمدەویست وا بنوێنم کە لە هەموو کەس باشترم. ● ئەو کابرایە ئەو باوکە ژیرو زانایە نیە کە پێی وایە هەیە.

٨٣٩٨ 7433- **وایەرکێشان، سیمکێشی کردن، کارەبا کێشان بۆ، بەرق کێشان بۆ**: داخوا ستودیۆکەت بۆ دەنگ سیمکێشی کردووە؟

٨٣٩٩ 3847- **وتاردان بۆ، سوخەنرانی کردن بۆ**: ئەو لەسەر شانۆگەری لە سەردەمی ئێلیزابێتدا بۆ قوتابییەکانی دەورەی باکالۆریی وتار دەدا.

٨٤٠٠ 7521- **وتارێکی ڕەخنەگرانە نووسین لەسەر، ڕەخنەگرتن لە**: پاشان دەتوانێ بچێتەوە ماڵێ‌و وتارێکی ڕەخنەگرانە لەسەر فیلمەکەی بۆ ڕۆژنامەی بنووسی.

٨٤٠١ 2591- **وتووێژکردن، لێک کۆبوونەوەو لێکۆڵینەوە**: ئەوانەی مانیان گرتووە داوا دەکەن ئەو کەسانە بێننەوە سەر کاری خۆیان کە دەرکراون‌و هەتا ئەوانە نەهێننەوە سەرکار، دەڵێن دەگەڵ هیچ کەس وتووێژ ناکەن.

٨٤٠٢ 7079- **وتووێژ کردن دەگەڵ**: هەرچەند ئەو وڵاتە چکۆلە، دەکرێ بڵێین، بە چۆک داهاتبوو، بەو حاڵەش لە فکری ئەوە دانەبوو کە دەگەڵ هێرشکەران وتووێژ بکا.

٨٤٠٣ 4422- **وتووێژ کردن (دەگەڵ)، (بەمەبەستی گۆڕینەوەی دیلان/ زیندانیان/ ئاگر بەس)**: ئەفسەرێک بە ئاڵایەکی سپیی بە دەستەوە هاتە پێش بۆ وتووێژ (دەگەڵ ژێنەراڵەکەمان).
وچاندان ← حەسانەوە.

٨٤٠٤ 7344- **ورد بوون**: ترووسکە، کە بە هێزی گوشارو ماندوویی رووحی بە تەواوی وردبیوو، هەروا ئەوماڵەوماڵی دەکرد.

٨٤٠٥ 629- **ورد بوون (لە باری رووحییەوە)، تێک شکان، شکانەوە**: جارێکی دیکەشم چاو لێکرد، ئەگەر لە هەموو ژیانمدا تەنیا جارێک چاوم بە کەسێک کەوتبێ کە لە باری رووحییەوە تێک شکابێ، هەر ئەو جارە بووە. ● دەزانم چ دەکێشێ، بەڵام هیچ وا نیشان نادا کە لە ژێر گوشاری رووحیدا خەریکە ورد دەبێ/ تێک دەشکێ.
← شکان، تێک شکان، سلامەتیی بەدەنی، یان رووحی لە دەست دان.

٨٤٠٦ 2927- **ورد بوونەوە لە، لێخور بوونەوە، سەرنج دانە ... بیر لێکردنەوە، تاقی کردنەوە**: لە گشت لایەنەکانی چوزکەکەی ورد بووینەوە بەو مەبەستە کە بزانێ ڕاست دەکا یان نا.
وردبینی بە خەرج دان ← هەوڵدان بۆ.

٨٤٠٧ 1605- **ورد کردن**: دەبێ سەوزییەکە ورد کەیو، دەناری کرلیوی هاوێژی.

٨٤٠٨ 598- **ورد کردن، بە وردی نیشان دان**: گەڵاڵەکە بەم جۆرە بە وردی نیشان دەدرێ/ ئاوا دابەش دەکرێ: یارمەتیی مانگانە ١٠ میلیۆن پۆند، کارخانە ٤ میلیۆن پۆند، کەرستەی خاو ٥ میلیۆن پۆند.

٨٤٠٩ 5299- **ورد کردن، لەت بە لەت کردن، هەڵدڕ هەڵدڕ کردن**: کوڵکەدارەکان دەزارکی دەزگاکە ڕۆ دەکەن‌و دەزگاکەش لە ماوەی چەند چرکەیەکدا ورد وردیان دەکا.

٨٤١٠ 3043- وړد کردن، له نقلی کردن، هارین: کاتیك بهردهکانیان هاڕیو کردیاننه پۆدرێکی نهرمو ورد، ئهمجار بۆ جوان کردنی خانووبهران کهلکی لێوهردهگرن.

٨٤١١ 6858- ورد ورد کردن، ریشاڵ ریشاڵ یان ریتاڵ ریتاڵ کردن: قوماشێکی/ پارچهیهکی که بهو ده زگایهدا دهچێته ژوور به تیغهی یهکجار به هێزم ریشاڵ ریشاڵ دهکرێ.

٨٤١٢ 5420- وردورد کردن، لهنجنین: ئهو دهزگایه کۆنه پهڕۆیان دهنجنێو دهیانکاتهوه به دهزوو بۆ قوماشی تازه.

٨٤١٣ 1535- ورد کردنو لیکرتن: قامیشه شهکرهی دهبهنه کارخانهی قهندو لهوێ وردی دهکهنو شیرهی قهندی لێدهگرن.

٨٤١٤ 5703- ورد کردنهوه، زایه کردن، فرۆشتن و له کۆڵ خۆ کردنهوه: دهمانهوێ بهشێك له کاڵا بازرگانییهکانمان که ئهمبارهکهمانی لێگرتووین، ورد کهینهوه (= بیانفرۆشینو له کۆڵ خۆمانیان بکهینهوه- وهرگێڕ)
وردو خاش بوون ← شهکهت بوون.
وردو خاش کردن ← تێك شکاندن، له نێو بردن.

٨٤١٥ 4537- ورده پارووی لێنان: "ئهرێ، دێستیره برینجهکهی خولارد"، "نا، چهند قاپووچکهیهکی لێدار، دهورێیهکهی وهلانا".
ورده فهرمایش ههبوون لهسهر ← بیوورا دهربڕین لهسهر.
وره بهرز کردنهوه ← دڵخۆش کردن.

٨٤١٦ 1019- وره له دهست دان: لهوه دهترسان که هاوپهیمانهکانیان له ئاخرین دهقیقه ورهی خۆیان لهدهست بدهن.

٨٤١٧ 3158- وره له دهست دان، وره بهرز بوون: سهربازهکان ورهیان لهدهست دابوو هیچ متمانهیهکیشیان به فهرماندهریی نهمابوو. * پاش بردنهوهی جامی سهرۆك کۆمار، تیمهکه بۆ بهشداری کردن له یارییهکانی قارهمانیدا ورهیان زۆر له سهرێ بوو.

٨٤١٨ 972- وره له دهست دان، تهسلیم بوون: لهژێر بازجوویییهکی ورددا، کابرای بهدکار تهسلیم بوو، ددانی به گشت کاره دزێوهکانی داهێنا.

٨٤١٩ 3606- ورهی خۆ بهرز راگرتن، خۆشبین بوون، هیوادار بوون: "پێم وانیه ههرگیز بتوانم له تاقیکارییهکاندا سهرکهوم." ، "به هیچ چهشنێك نابێ نیگهران بی. ههرکارێکی لێیان ویستووی ئهنجامت داوه. بۆیه نابێ هیوا له دهست بدهی (= دهبێ هیوادار بی). ههموو شتێك جێبهجێ دهبێ.

٨٤٢٠ 3598- ورهی ... راگرتن، پێش هاتنه خواری ورهی ... گرتن: له نه خۆشخانهکان به ژنی نهخۆش دهڵێن بۆ ئهوهی پێشی هاتنهخواری ورهیان بگرن، دهبێ خریان جوان کهن.

٨٤٢١ 3694- ورهی کهسێك تێك شکاندن: وا دیار بوو که هیچ بۆمبارانێك - ههرچهند قورسیش- ناتوانێ ورهی پارتیزانهکان تێك بشکێنێ....
وره وهبهرخۆ نان ← جورئهت به خۆدان.
ورهی کهسێك زهعیف کردن ← شوێنی خراپ لهسهر دانان.

٨٤٢٢ 219- وریا بوون، خهبهردار راوهستان، قوت بوون: کاتێك ئهفسهری پشکنهر به نێو سهفهکاندا دهڕۆیشت، پیاوهکان خهبهردار راوهستابوون.
وست به ← بێدهنگ به.

٨٤٢٣ 5246- وسکوت کردن، بێدهنگ کردن: شهخسییهتی بهرزی ئهو تهنانهت به ههراو هوریاترین رهخنهگرهکانی وسکوت کرد/ بێدهنگ کرد.
← بێدهنگ کردن. لهبهردم دان.

٨٤٢٤ 5485- وشك (نیشك) کردنهوه: پاش مهلهکهت خۆت زۆر باش نیشك کهوه؛ نامهوێ سهرمات بێ.

٨٤٢٥ 1948- وشك بوون، نیشك بوون: رووباره چکۆلهکانو جۆبارهکان له هاویندا وشك دهبن.
← حهپهسان.

٨٤٢٦ 5432- وشك کردن، لهسهر جێگای خۆ: گرمهی کتوپڕی فرۆکهیهك که زۆر نهوی دههات ههموومانی لهسهر جێگای خۆمان وشك کرد.
← سیحر لێکردن.

٨٤٢٧ 7432- وشك کردنهوه(ی قاپی شۆراو)، لهسترینهوه: دهکرێ بۆ وشك کردنهوهی ئهو قاپانه یاریدهم بدهی؟

٨٤٢٨ 1947- وشك کردنهوه، یان بوونهوه: سێلاو کشاوهو خۆرهتاوی گهرم خانووه دارهکانی وشك کردهوه.

٨٤٢٩ 1949- وشك کردنهوه: دوای فراوین یاریدهم بده قاپهکان وشك کهینهوه.

٨٤٣٠ 6081- وشك کردنهوه: خاولێکی بێنهو پێش ئهوهی ئهو ئاوه به ئهرزی دیوهکهدا بڵاو بێتهوه وشکی کهوه.

٨٤٣١ 4273- وشیار بوون، ئاگا له خۆ بوون: وشیاربه، چێشتهکه داغه! * ئهگهر وشیار نهبی، پێ له پشیلهکهی دهنێی.

٨٤٣٢ 343- وشیار بوون، گوێ قوڵاغ بوون: زۆر وشیاری کاری خۆی نیه. ههروا دهرفهتهو له دهستی دهدا.

٨٤٢٣ 7311- (لە مەترسیی شتێك) وشیار كردنەوە: ئەو موسافیرانەی دەچنە وڵاتانی گەرمەسێر لە مەترسیی ئاوی نەكوڵاو تەسفییە نەكراو وشیار دەكرێنەوە.
وشیار بوون ← ئاگا لە خۆ بوون، لەحاڵی ئامادەباشیدا راگرتن، ئاگا لە خۆ بوون، ئاگادار بوون، بە وردی لە شتێك گەڕان.
وشیار بوونەوە ← تێگەیشتن لە.
٨٤٢٤ 7008- وشیار كردنەوە: ئاغای ئالفرێد حاشای لەوە دەكرد كە سەبارەت بە هەبوونی پیلانێك بۆ تاڵان كردنی قەتار پێشتر ئیدارەی پۆستی وشیار كردۆتەوە.
٨٤٢٥ 4995- وشیار كردنەوە: قسەكانی وشیاریان كردمەوە كە لە كاتی تەلەفۆن كردندا ئاگام لە قسەكانم بێ.
٨٤٢٦ 742- وشیار كردنەوە، ئاگال كردن: هەموو هیوایەكم بەوەیە كە تەسادوفی/ دەعمی ئەم دواییانەی وشیاری بكاتەوە.
وشیار كردنەوە ← لە مەترسیی شتێك وشیار كردنەوە، وەخەبەر هێنان، راپەراندن.
وشیاری خۆ بوون ← ئاگا لە خۆ بوون.
٨٤٢٧ 5175- وەڵام دانەوە، هەڵس و كەوت كردن، جوولانەوە: منداڵ لە بەرامبەر مامۆستایەكی شادو رووخۆشدا زۆر جوان دەجووڵێنەوە.
← قەرەبوو كردنەوە.
٨٤٢٨ 5309- وەڵام دانەوە (بە نووسراوە یان بە قسە): دوای كۆتایی قسەكانی، كابرای میوان دە : مقیقان وەڵامی پرسیارەكانی ئەو خەڵكەی داوە كە لەوێ بوون.
٨٤٢٩ 6807- وەڵام دانەوە، جواب دانەوە: رەوان قسە كردنی كابرا كە لە هیوا بە خۆبوونێكی تەواوەوە سەرچاوەی دەگرت، رێگایەكی بۆ ژنە نەهێشتبۆوە كە وەڵام بداتەوە.
٨٤٤٠ 88- وەڵام دانەوە، فەرمان بەڕێوەبردن: هەر بە ئاسایی جڵەوەكەی راكێشێ، ئەو ئە سپە فەرمان بەرێوە دەبا.
٨٤٤١ 5313- وەلامدەر بوون لە بەرامبەر كەسێكدا، راپۆرت دان بە كەسێك: ئەتۆ دەنێرم بۆ باكوور بۆ لێكۆڵینەوە. كارت بە كاری مودیرەكانی وێندەری نەبێ. راستەوخۆ راپۆرتەكانت بۆ من لە لەندەن دەنێری.
٨٤٤٢ 89- وەڵامدەر بوون، بەرپرسیار بوون لە بەرامبەر كەسێكدا: ئەگەر شتێك بەسەر ئەو منداڵە بێ، دەبێ لە بەرامبەر مندا وەڵامدەر بێ.
← بەرپرسیار بوون سەبارەت بە، جوابگۆ بوون لە بەرامبەر.
وەڵامی چاكەیەك دانەوە ← قەرەبوو كردنەوە.
٨٤٤٣ 1258- وەڵامێكی دروست دانەوە، دروست دەرهاتن: دەكرێ لەو حیسابانەدا یارمەتیم بدەی؟ دروست دەرنایەن/ نایەنەوە.
٨٤٤٤ 7505- وەڵامی نامەی كەسێك دانەوە: بۆ سوپاس كردن لە كامران كە لوتفی كردووەو بانگهێشتنی كردووم وەڵامی نامەیەكم نووسیوە.
٨٤٤٥ 6539- ونبوون، فەوت دان: تەنیا ماوەیەكی زۆر كەم رۆیشتبوون كە لە نێو دەوەنو گیاوگۆڵدا ونبوون. ● بە ئەندازەیەك شەرمی دەكرد كە پێی خۆش بوو ئەرز بلەڵشێتەوەو فرووتی بدا.
٨٤٤٦ 2824- ونبوون لە پشت هەوران، چوونە پشت هەوران: راست ئەو چركەیەی كە بۆ رەسم گرتن ئامادە ببووین و، وشەی "پەنیر" گوترابوو بۆ ئەوەی بزەمان بێتە سەرلێوی، رۆژەكە چووە پشت هەوران.
٨٤٤٧ 2919- ونبوون لەبەرچاو: مژ وەك پەردەیەكی ئەستوور هاتە خوارو لە ماوەی چەند چركەیەكدا كەنار دەریا لە بەرچاوان ونبوو.
← رۆیشتن.
ون كردن ← لەبەرچاو ون بوون.
٨٤٤٨ 6077- (ئەوەین ئەمیز) ون بە، جەهەننەم بە: چاوەروانی ئەوە مەبە دەردەسەرێكی دیكەتان بۆ دروست كا. پێی بڵێ جەهەننەم بێ.
٨٤٤٩ 3308- (زۆراوەی مەجیالە) ون بە!، بە دۆڵدا، جەهەننەم بە :"پێش ئەوەی گوێیەكت هەڵمسێ، بە دۆڵدا".
ووچان نەدان ← رەتان.
٨٤٥٠ 4862- وەلەرزی كەوتن، پەل پێوەنان و هەستان: بە هێزی هەشیمەتێكی منداڵان كە لە دەرگاكانی قوتابخانە وەك سێڵاو هاتنەدەر، وەخت بوو وەلەرزێ كەوم.
← كەوتن، رەتكرانەوە.
٨٤٥١ 3559- وەلەرزی نەكەوتن، خۆ لە سەر پێ راگرتن: پاڵەوانە تازە كارەكە لە بەراورد دەگەڵ قارەمانەكە زۆر لە خوارتر بوو، بەڵام سەیر ئەوە بوو كە هەتا سێ روندان خۆی لەسەرپێ راگرت.
٨٤٥٢ 6719- وەئەستۆ گرتن، قبووڵ كردن: وردە وردە خەریكم پەشیمان دەبمەوە كە بۆچی ئەو كارەم وەئەستۆ گرت. هەموو شەوێ زیادە لە بەرنامەی خۆم كار دەكەم.
٨٤٥٣ 6678- وەئەستۆ گرتن، بەدەستەوە گرتن: ئایزنهاوەر پێی گوتم بەرپرسایەتیی تەواوو كەماڵی شەڕی زەمینی وەئەستۆ بكرم.

٨٤٥٤ 3864- **وەئەستۆ گرتنی بەرپرسایەتییەک، قبووڵ کردنی ئەرکێک:** "هیوادارم باش بزانی کە چ بەرپرسایەتییەکت وەئەستۆ گرتوە."، "ئەرکی زیادیی دیکەشی وەئەستۆ گرتوە.

٨٤٥٥ 3582- **وەئەستۆ گرتنی کارو زەحمەت:** تەنیا بە وەئەستۆ گرتنی کارو زەحمەتی لەرادە بەدەرە کە پیاو دەتوانێ هیوادار بێ لە ژیاندا بە نایسوودمییەکی زیاتر بگا.

٨٤٥٦ 4824- **وەبن کەوتن، کەوتنە ژێر:** لەو نوختەیە بای دەریا بە شێوەیەکی فریوکارانە بە هێز بووە؛ هیچ کەس لە ترسی وەبن (شەپۆلان) کەوتن، نەیدەوێرا مەلەی بکا.

٨٤٥٧ 5383- **وەبەر ئەسپەدان، بە سواری هێرش کردنە سەر:** مرخالیفەکانی ئەو لایەنە هەوڵ دەدەن خۆپیشاندانی لایەنگران بدەنە بەر هێرشی سواران.

٨٤٥٨ 5569- **وەبەردان، وەبەرکەوتن:** مانگی رابردوو لە چواررێیانەکە دوو منداڵ وەبەر (ماشێن) کەوتن.

٨٤٥٩ 6497- **وەبەردان، خستنەژێر...:** میوانە وتاردەرەکەیان دابوە بەر بارانی پرسیاری زۆر وردەوە.

٨٤٦٠ 6771- **وەبەردڵ کەوتن، مەئاڵە پەیداکردن بە:** ئەو پیاوە گەنجەم لە قەتاردا چاو پێ کەوتو زۆر وەبەر دڵم کەوتووە.

٨٤٦١ 6765- **وەبەردڵ کەوتن، خۆش ویستن:** هەر زۆر زوو وەبەر دڵم کەوت/ خۆشم ویست.

→ پەسند کردن.

٨٤٦٢ 5729- **وەبەر دەرس خوێندن نان، ناردنە قوتابخانە:** ناردنی کورەکان بۆ قوتابخانەی گشتی ئەدەبوو شەئەو گومانی تێدا بێ.

وەبەر کەوتن ← پێگەیشتن.

وەبەرمستان دان ← مست لێدان.

وەبەرهاتن ← وەدیهاتن.

٨٤٦٣ 916- **وەبیر خستنەوە، وەبیرهێنانەوە:** دەنگی ماسیگرەکان سەیرانی کەناردەریای لە سەردەمی منداڵیدا وەبیرهێنامەوە.

٨٤٦٤ 652- **وەبیر خستنەوە، وەبیرهێنانەوە:** بۆنی رووبارەکە شەوێکی وەبیرهێنانەوە کە چەندین ساڵی لێ تێپەڕیبوو.

٨٤٦٥ 6625- **وەبیر خستنەوە یان هێنانەوە، وەبیر کەوتنەوە:** کە چاوم بە مایلەک کەوتەوە، وەبیر ساڵەکانی سەرەتای مامۆستایەتیم لە هەمندەران کەوتەوە.

٨٤٦٦ 5251- **وەبیر قسەیێک خستنەوە، بۆنی قسەیێک لێ هاتن:** قسەکانی بۆنی جیهانی ئەدەبیاتیان لێدێ.

٨٤٦٧ 5232- **وەبیرهێنانەوە، هاتنەوە بەرچاو:** زۆر جار بیرەوەریی ئەو رۆژانەی بەیەکەوە بووین دێتەوە بەرچاوم/ ئەو رۆژانەم وەبیر دێتەوە کە بە یەکەوە بووین.

٨٤٦٨ 6901- **وەبیرهاتنەوە، لەبیربوون:** ناوەکەیم وەبیر نایەتەوە/ لەبیر نییە، بەڵام پیاوێکی کەڵەگەت بوو، عەینەکی دەچاوی دابوو.

٨٤٦٩ 5444- **وەبیر هاتنەوە، وەیاد کەوتنەوە، وەبیر... کەوتنەوە:** هەروا کە باوکی قسەی دەکرد، جان وەبیر ساڵەکانی رابردوو کەوتەوە کە کورە چکۆلەیەک بوو لەسەر خیزەکانی کەنار دەریا لە ساندگیت کایەی دەکرد.

٨٤٧٠ 894- **وەبیر هێنانەوە، لە بیر مان، هاتنەوە سەر مێشک:** ئەو کچەی باسی دەکەی، بێ هیچ ئەم لاو ئەولایەک دیومە، بەڵام هەرچی دەکەم وەبیرم نایەتەوە.

٨٤٧١ 1136- **وەبیر هاتنەوە، هاتنەوە سەر مێشک:** لە پێشدا نەمدەزانی بۆ هەموو شتێک بۆم ناشنایە، بەڵام دوایە بە تەواویی وەبیرم هاتەوە.

٨٤٧٢ 1899- **وەبیرهاتنەوەی بیرەوەریی زۆر کۆن، دەرکەوتنی بیرەوەریی فەرامۆش کراو لە کەلێن و قوژبنی مێشکەوە:** باپیرەی چەند ژیرێکی زۆر بە توانا بوو؛ هەموو ئەو جێگایانەی چووبوو ئەو رووداوانەی لە سەرەتای ژیانیدا دیبوونی زۆربەی لەبیر بوون.

٨٤٧٣ 5202- **وەبیرهێنانەوە، وەبیری قسەیێک خستنەوە:** ئەو مەترسییانەی سەریان هەڵدابوو، وەبیر بەرپرسایەتییەکانیان خستەوە/ بەرپرسایەتییەکیان وەبیر خستەوە.

٨٤٧٤ 3135- **وەبیر هێنانەوە، ئاوڕدانەوە بۆ، گەڕانەوە بۆ:** بۆ تێگەیشتن لەو مەسەلەیە پێویستە ئاورێک بدەینەوە سەر ئەو شتانەی بۆ روون کردنەوە لە پێشدا عەرزم کردن.

٨٤٧٥ 899- **وەبیر هێنانەوە، هێنانەوە بەرچاو:** دەنگی ماسیگرەکان سەیرانەکانی سەردەمی منداڵییی وەبیر هێنایەوە.

٨٤٧٦ 4935- **وەبیرهێنانەوە، خستنەوە بیر:** کتری پێ نانە ئێو هەوای دێهاتو بێدەنگییەکەی دەخاتەوە بیری....

٨٤٧٧ 1730- **وەبیرهێنانەوە (زۆرجاران)، دووپات کردنەوە:** بێگومان ژمارەی کوردەکان دەزانم؛ زۆریان بۆ دووپات کردوومەوە.

٨٤٧٨ 5293- **وەبیرهێنانەوە یان خستنەوە:** زۆر باش بوو چاو پێکەوتن دەگەڵ سەیرانت وەبیرهێنامەوە/ زۆر باش بوو کە

وەبوت هێنامەوە/ خستمەوە کە دەگەڵ سەیران چاوپێکەوتنم هەیە.

٦٤٧٩ 1474- **وەبیرهێنەرەوەی ... بوون:** زۆر سروشتی‌یە کە "ستراتفورد ئان ئاون" وەبیر هێنەرەوەی ناوی شکسپیر بێ.

وەبیر یان وەیادی رابردوو کەوتنەوە ← بیر یان فکر لە رابردوو (ان) کردنەوە.

٦٤٨٠ 6933- **وەتورەمەیەک لەوەلاتر چوون.** "تەناوب" لە "توراپ"دا. **چوونەوە سەر بەنەوبابیان:** لە هەر بنەماڵەیەکدا "تناوب" لە "توارث"دا هەیە.

٦٤٨١ 3268- **وەپاش خستن یان کەوتن، دەست راگرتن، وەدرەنگی خستن، وەپاشلان:** رێنوێنی‌یان دلوە بە ئازمایشگاکە کە بۆ بڵاوکردنەوەی هەرچەشنە داهێنانێک جارێ دەست راگرێ. • ئەگەر دانی یارمەتیی مانگانە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ وەدوا بخرێ، رقەو توورەیی‌یەکی زۆری بە دولوە دەبێ.

وەپاش خستن ← گەراندنەوە بۆ دواوە، گێرانەوە بۆ دواوە.

وەپاشلان ← وەدواخستن یان کەوتن.

٦٤٨٢ 2451- **وەپاش کەوتن، وەدواکەوتن:** بە هۆی نەخۆشی‌یەوە، کامران نەیدەتوانی شان بە شانی قوتابی‌یەکانی تر بچێتە پێشەو زۆر خراپ وەپاش کەوت.

٦٤٨٣ 2109- **وەپاش کەوتن، وەدواکەوتن، بە جێمان:** ئەم وڵاتە لە بواری بەرهەم هێنانی شتومەکی کەتانیی هەرزان لە هێندێک لە رقیبەرەکان وەدواکەوتوە.

← دواکەوتن لە، وەدواکەوتن.

٦٤٨٤ 2194- **وەپاڵ کەسێک نان، (کەسێک وەک باوکی کەسێکی تر، نووسەری کتێبێک، سەرچاوەی شتێک) ناساندن:** هەوڵ مەدە ئاوانی ئەو کارە وەپاڵ من بنێی (= بیخەیە ئەستۆی من) من کارێکم بەو کارە نەبروە. برۆ ئەو شتە وەپاڵ کەسێکی دیکە بنێ.

وەپاڵدان ← هێنانە گۆر (خێرا).

وەپاڵنان ← خستنە ئەستۆی.

وەپشت گوێ خران ← وەدواکەوتن.

٦٤٨٥ 4501- **وەپشت گوێ خستن:** یەکێتیە کرێکاری‌یەکان پێویستیی لێکۆڵینەوە زانستی‌یەکان هەروا وەپشت گوێ دەخەن.

٦٤٨٦ 666- **وەپێش خستن:** لەبەر ئەوە کە بۆی هەیە رووداوێکی دیکە دەگەڵ سەیرانەکەیان هاوکات بێ، بریاریان دا سەیرانەکە وەپێش خەن....

وەپێش خستن ← هێنانە ریزی پێشەوە، هێنانە پێش.

وەپێش کەوتن ← گرنگ تر بوون لە، چوونە پێش.

٦٤٨٧ 2064- **وەپێش کەوتن، لە سەرووی هەمووان بوون:** جان لە دەورەی خوێندندا هەرگیز نومرەیەکی باشی وەرنەگرت، بەڵام لە خۆ کەرکردندا لە هەمووان وەپێش کەوتبوو.

٦٤٨٨ 3005- **وەپێشکەوتن لە ژیان، لە ئەرپیوالی پێشکەوتن وەسەرکەوتن:** کاتێک چیا کچی کابرای میلیونێری خواست، بێگومان لە ژیاندا وەپێش کەوت.

٦٤٨٩ 4783- **وەپێش کەوتنەوە:** ئەو ماشێنە دەیەوێ سبقەت بگرێ. تۆسقالێک سەبری کەوە با وەپێش کەوێ.

٦٤٩٠ 483- **وەپێش کەوتنەوە:** هیوادار بوون مۆدێلە تازەکەیان لەم ساڵەدا بنێرنە بازاری، بەڵام شەریکەیەکی رقیبەر پێشدەستی لێکردن.

٦٤٩١ 1574- **وەپێش کەوتنەوە (بە شێوەیەکی خەتەرناک):** ئەو رانندە بە پەلانەی‌مە کە بە پێی عادەت، بە شێوەیەکی خەتەرناک وەپێش دەکەونەوە، درەنگ یان زوو دەبنە هۆی تەسادوفێک.

٦٤٩٢ 230- **وەپێش کەوتنەوە، بەرەوپێش چوون:** لە پێشبرکێی سەعاتی ٣/٥دا، ئەسپی شازێ هەر لە سەرەتادا زۆر چاک وەپێش کەوت. • بە (کەڵک وەرگرتن لە) ئاوبانگی بابی‌و پروڵۆ پارەی دایکی کاوەی تازە لاو دەتوانێ زۆر چاک بەرەوپێش بروا (سەرکەوێ).

٦٤٩٣ 210- **وەپێش کەوتنەوە لە:** ئامریکا لە زۆربەی بوارەکانی یەکجار گرنگی تێکنۆلۆژی فەزایی‌دا زۆر وەپێش کەوتووە.

← چوونە پێش، سەرکەوتن.

٦٤٩٤ 2381- **وەپێش کەوتنەوە لە، وەپێش کەوتن:** سێ کەسی پێشەوە هەروا لە دەوەندەکانی دیکە وەپێش دەکەوتن بە چەشنێک کە هێندەی پێ‌نەچوو نیو مایلیان بەجێ هێشتن.

٦٤٩٥ 1853- **وەپێش کەوتنەوە:** پۆلیسێکی موتورسوار بە تەنیشتماندا هات، پەیامێکی داینێ‌و وەپێش کەوتو رۆیشت. • لە نزیکترین رقیبەرە ئورووپایی‌یەکان وەپێش کەوتووینەوە.

← لە پێش بوون، باشتر بوون لە.

وەپێش هەموو شتێک خستن ← لە هەموو شتێک بە گرنگتر دانان.

٦٤٩٦ 2065- **وەپێش هەموو کەس کەوتن، هەموو کەس بەجێ هێشتن:** چەرچیل کە سیاسەتمەدارو نووسەرێکی بە توانا

بوو، لە سەردەمی دەرس خوێندنیدا لە هیچ ڕشتەیەکدا لە پێش هەموو کەس نەبوو.

٨٤٩٧ 5696- **وەجۆش‌و خرۆش کەوتن**: ئێستا ئیدی مەیدانەکە یەکپارچە ڕووناکی بوو بە هۆی تێکهەڵانو تێکهاوێشتنی خەڵکی شادو سەرخۆش پڕ لە جۆش‌و خرۆش بوو.

٨٤٩٨ 7156- **وەجۆش هاتن یان هێنان، کەیف پێ ساز بوون، هێنانە سەرحاڵ**: بە بڕوای من کچێکی یەکجار ڕاکێشەرە - بەراستی وەجۆشم دێنێ.
← گەیشتنە ئەوپەری خۆ.

٨٤٩٩ 915- **وەجۆش هێنان، هەست بزواندن**: کاتێک دەست بە گۆرانی‌یان دەکا، پیاو بە جۆرێک وەجۆش دێ کە ناتوانێ خۆی کۆنتڕۆڵ کا.

٨٥٠٠ 7381- **وەجۆش هێنان، هەستی کەسێک بزواندن یان خرۆشاندن**: خەتیبی/ سەرخەتوەری حیزب هەستی حەشیمەتەکەی وەها وەخرۆش هێنابوو کە کەس ئاگای لە خۆی نەمابوو.

٨٥٠١ 662- **وەجۆش هێنان (ی خەڵک)، تەهەمەت کردن**: ... کۆبوونەوەیەکی بەراستی خۆشمان هەبوو. هەموو بەپێوەرلەوەستابووین‌و تێکرا گۆرانیمان دەگوت. زۆر جاران بەم جۆرە خەڵکمان وەجۆش دەهێنا.

٨٥٠٢ 3459- **وەجۆش هێنان، هێنانە سەرحاڵ**: بڕۆ دەرێو کەمێکی دیکە مەشرووب بکڕە. میوانی‌یەکەمان پێویستی بە کەمێک وەجۆش هێنان هەیە.

٨٥٠٣ 1130- **وەچنگ خستن، دیتنەوە، پەیدا کردن**: مەبەست لەو لێکۆڵینەوە ڕەسمی‌یانە وەچنگ خستن/ وەدەست هێنانی بەڵگەیەکە کە هۆی ونبوونی کەشتی‌یەکە ڕوون کەنەوە.

٨٥٠٤ 5642- **وەچنگ خستن، پەیدا کردن، جێبەجێ کردن، (بە هەر جۆرێک بێ)**: ناچاری لە هەر ڕێگایەکەوە کە بۆت دەکرێ/ بە هەر جۆرێک بێ، پارەکە پەیدا کەی. کاتێک مەسەلەی نابڕووچوون هاتە گۆڕێ، نامەوێ یارمەتیت بدەم.

٨٥٠٥ 5192- **وەچنگ کەوتن، وەدەست کەوتن، وەگیر کەوتن**: لە هەموو ئەو کۆڕ و مەڕی‌یانەی لە ڕابردوودا کێشابووی، قازانجێکی زۆر باشی وەگیر کەوت.

٨٥٠٦ 1722- **وەچنگ هێنان، خستن، وەگیر کەوتن**: ئەو زانیاری‌یانەی لە کوێ وەگیر کەوتوون؟ بە زەحمەتێکی زۆر لە کتێبخانە تایبەتی‌یەکان وەچنگی خستوون.

وەچنگ هێنانەوە ← بە زەحمەت گەڕانەوە.
وەحشەتناک کردن ← ناحەز کردن.

٨٥٠٧ 3905- **وەخت بە فیڕۆدان، کەوەخۆڵە کردن**: ناکرێ بڵێین ئەو کرێکارانە کەوەخۆڵەی دەکەن- بێ‌پسانەوە تێدەکۆشن بۆ ئەوەی کارەکەی تەواو کەن.

٨٥٠٨ 6096- **وەخت پەیداکردن، تەرخان کردن**: پێم خۆشە لە فەرانسە بتگرمەوە/ بێمە لات، بەڵام ناتوانم وەختێک بۆ پشوودان پەیدا کەم.

٨٥٠٩ 408- **وەخت تەرخان کردن بۆ، بە کارێکەوە بوون**: وەختێکی زۆر بە ئانو چارە مەبە؛ دەمەوێ هەرچی زووتر دەست پێ بکەین.

وەخت خەسار کردن ← هێز خەسار کردن لە .
وەخت دیتنەوە بۆ ← جێگا دیتنەوە بۆ.

٨٥١٠ 2259- **وەخت هەبوون بۆ، وەخت دیتنەوە بۆ**: بەداخەوە، وەختم نیە هیچ کەسی دیکە ببینم.

٨٥١١ 7001- **وەختی کەسێک گرتن، وەختێک بۆ کەسێک تەرخان نەکردنەوە**: هەتا ئەو جێگایەی ئەمن تێی دەگەم، ئەم ویراستاری‌یە (پێداچوونەوە بە کتێبی تازە نووسراوو چاپ نەکراوی کەسێکدا) هەتا دوو حەوتووی دیکە وەختم دەگرێ.
← دەستدرێژی کردن.

٨٥١٢ 607- **وەختی ... گرتن**: ناتوانم هیچ کاری زیادی وەئەستۆ بگرم. پشوودانی حەوتوانەشم گیراوە.
← زۆر پێچوون.

وەخۆ بوون لە دەوری یەک ← لێک کۆبوونەوە.
وەخۆ خستن ← هێنانە مەیدان.

٨٥١٣ 282- **وەخۆ کەوتن، دەست بەکار بوون**: سەعاتێک دوای ئەوەی گەیشتینە بەرەی شەڕ، هێزەکانی ئێمە دەست بە کار (ی شەڕ) بوون/ وەخۆ کەوتن.

٨٥١٤ 2535- **وەخۆ کەوتن، خێرا بوون، خێرا جووڵانەوە وەرێکەوتن**: ئەگەر زوو نەجووڵێیەوە، ناگەیە ئاخرین پاسی.

٨٥١٥ 1288- **(دوای ماوە ساوێکی زۆر) وەخۆ کەوتن، دەست پێکردن**: کاتێک سەرەنجام بۆ نووسینی نامەکە وەخۆ کەوت دیتی کە دەربڕینی هەستی بەوی زۆر لەوە ساناترە کە بیری لێدەکردەوە.
←دەست بەکار بوون، دەست پێکردن (لێبراوانە).

وەخۆ گرتنەوە(ی مێردێک یان یارێک) ← هێنانەوە(ی ژنێکی تەڵاقدراو یان یارێک).

وەخۆ نەهاتنەوە ← لەخۆ بوونەوە (لە بەر پێ‌کەنین).

٨٥١٦ 162- **وەخەبەر هاتن (لە)، (لە خەوێکی پەرێشان):** وەخەبەر هاتەو دیتی هەمور ترس‌و خۆفەکەی بە خۆرایی بووە.

وەخەبەر هاتنەوە ← فکر یان بیر لە وەزعی خۆ کردنەوە.

٨٥١٧ 119- **وەخەبەر هێنان (لە):** ژنی ئاغای مەواری ئەوی وەخەبەر هێناو بە ئەسپایی بە گوێی داچرپاندو گوتی: لەخورای دزی لێیە.

٨٥١٨ 7275- **وەخەبەر هێنان یان هاتن:** "هەرا هەرایە مەکەن - منداڵەکەی وەخەبەری دێنن."

٨٥١٩ 6285- **وەخەبەر هێنان، دەرهێنان، وشیارکردنەوە:** پەیدا بوونی سەروکەللەی مامۆستاکەی لە تەنیشتی، لە خەیاڵ پڵاوەکەی وەخەبەری هێنا.

← ئەغیار کردنەوە.

وەدرەنگی خستن ← وەپاش خستن یان کەوتن.

وەدرەنگی کەوتن ← درەنگ هاتن.

٨٥٢٠ 3278- **وەدرەنگی کەوتن یان خستن، درەنگ هاتنەوە، دەست ڕاگرتن:** بارانە وەرزییەکان وەدرەنگیی کەوتن، بەڵام لە پڕ وەک گوزەی سەرەوژێر دەستیان پێ کرد.

٨٥٢١ 5527- **وەدرەنگی کەوتن:** تکایە بە خالی ویلیامز بڵێ چاوپێ‌کەوتنەکەیان بۆ سەعاتی یازدە هەڵوەشێنێتەوە. هەروەک دەبینێ چارەگە سەعاتێک وەدرەنگی کەوتووین.

٨٥٢٢ 6772- **وەدڵ گرتن، دڵ‌ئێشان، ناوەحەت‌بوون:** وەرە، بابە، ئێمە زۆر لەمێژە پێکەوەین. ڕووداوێکی ئاوا چکۆلە تا ئەو رادەیە وەدڵ مەگرە.

← دڵشکان لە.

٨٥٢٣ 4887- **وەدوا (وەپاش) خستن:** لە حاڵێکدا کە سەرۆک عەشیرەکە چاوەروانی گوزارشێک سەبارەت بە خۆش بوونی هەوا بوو، هێرشەکەیان بیست‌وچوار سەعات وەپاش خست.

٨٥٢٤ 5757- **وەدواخستن، پەک خستن:** کاری دروست کردنی خانووبەری تیئاتری تازە سێ مانگ وەدوا کەوتووە. ● نەبوونی کەرەستەی باش پەکی خستووین.

٨٥٢٥ 3290- **وەدواخستن، هەڵگرتن بۆ دوایە:** ئاخرین بابەتی دەستووری کۆبوونەوەکەمان هەڵدەگرین/ هەڵدەگیرێ بۆ کۆبوونەوەی داهاتوو.

٨٥٢٦ 4965- **وەدواخستن، وەپاشدان:** شتەکەم وەدواخستووەو بیریشی لێ‌ناکەمەوە، بەو هیوایە کە شتێک بێتە پێش.

٨٥٢٧ 2110- **وەدواخستن، درەنگ ناردنەوە:** ناردنی شترومەکی راگرت چونکە دانەوەی قەرزەکەم وەدواخستبوو.

٨٥٢٨ 4081- **وەدوا کەوتن، وەپاش کەوتن، بەجێمان:** لە بەرامبەر بەرهەم هێنەرانی بیانی‌دا هەروا بەخێرایی وەپاش دەکەوین‌و، دەبێ بۆ پێشگری لەو رەوتە کارێک بکەین.

٨٥٢٩ 6261- **وەدواکەوتن یان خستن هەفتا، هەڵگرتن بۆ:** ئەم مەسەلەیە پەلەیەکی نیە؛ دەکرێ بۆ هەفتەی داهاتوو هەڵبگیرێ.

٨٥٣٠ 2846- **وەدواکەوتن، دواندەستی فەرامۆشی، وەلانان، لەبیرچوونەوە، وەپشت گوێ خران:** "هیچ کەس نابێ بێ دادگایی کردن بخرێتە بەندیخانەوە" ئەوە پرەنسیپێکە کە کاتێک ئەمنییەت‌و ئاسایشی خەڵک دەکەوێتە بەر مەترسیی تەزوریستانەوە وەپشت گوێ دەخرێ.

٨٥٣١ 3723- **وەدواکەوتن، وەپاش کەوتن، بەجێمان:** لە زەمینەی بەرهەم هێنانی پۆڵادا لە باقی وڵاتانی ئورووپا وەدواکەوتووین.

← درەنگ هاتن، وەپاش کەوتن، ڕاوەستان، بەجێمان.

٨٥٣٢ 2334- **وەدوای پێنج‌و شوێنی شتێک کەوتن:** بڕیارم دا وە وەدوای یەک دوو قسان کەوم (و لێیان بکۆڵمەوە) کە بە هەڵکەوت درکێندرابوون.

← خستنە ژێرچاوەدێری.

٨٥٣٣ 5727- **وەدوای شتێک خستن، کەسێک ناردن بۆ شتێک:** قاوەیەکی کە لە شەقام دروستی دەکەن زۆر لەو شتە بۆن ناخۆشەی باشترە کە ئێمە لە کومۆدەکەدا دایدەنێینەوە. بۆ، یەکێک نەنێرین کەمێکی بکڕێ؟

٨٥٣٤ 2747- **وەدوای شتێک کەوتن:** ئەگەر کامران بیویستبا شتێک وەچنگ خا هەتا ئاخری وەدووی دەکەوت.

← گەڕان بە شوێن شتێکدا.

٨٥٣٥ 3012- **وەدوای کەسانی دیکە کەوتن:** لە پێوەندی دەگەڵ هەر مەسەلەیەکی گرنگدا، ماکس هیچ ئیرادەیەکی لە خۆی نیە. ئەو وەدوای خەڵکی دیکە دەکەوێ.

٨٥٣٦ 5709- **وەدوای کەسێک خستن، بەدوای کەسێک دا ناردن (زۆرتر کەسێک کە شتێکی لێ‌نە جێمابێ):** ئاغای سمیت چەترەکەی بەجێ‌هێشتبوو. بۆیە یەکێک لە کوڕەکانم بە دوای دا نارد.

← لە دووی کەسێک چوون.

٨٥٣٧ 6597- **وەدوای کەسێک کەوتن، بە شوێنەوە یان بەدواوە بوون:** ڕێبەرانی ئەو سێ حیزبە بۆ هەر کوێ چوویان ژمارەیەک

هەواڵنووسی ڕۆژنامەکانو تەلەویزیۆنەکان بە دوایانەوە بوون.

٨٥٢٨ 2746- وەدوای ... کەوتن: پۆلیس خەڵکی ئاگادار کردووە وەدوای زیندانییە هەڵاتووەکە نەکەون چونکە چەکدارو خەتەرناکە.

٨٥٢٩ 1118- وەدوای ... کەوتن، ڕەوپێنان، کەوتنە سەر ...: هەر کە ویستمان بە مەزراکەدا تێپەڕین، کابرای جووتیار بە گۆپاڵ هەڵسووراندن ڕەیتی نابین.

٨٥٤٠ 997- وەدوای کەسێک کەوتن، بەدوای کەسانێکەوە بوون: ئەگەر هێندە وەدوای کچان نەکەوتبا، شانسی ئەوەی هەبوو بتوانێ لە تاقیکاری/ ئەزموونی کۆتاییدا سەکەوێ.

← بەدوای ... وەبوون.

٨٥٤١ 5509- وەدوای کەسێک کەوتن (بۆ سازکردنی): ئەو کچە هەرگیز وەدوای هیچ پیاوێک نەکەوتبوو، لەو کارەش زۆر سەری دەرنەدەچوو.

← پێوەبوون دەگەڵ کەسێک، پێوەنووسان، درێژەدان بە وەدواکەوتنی کەسێک.

وەدرۆ خستنەوە لە ← دوور کردنەوە لە.

٨٥٤٢ 2701- وەدوونەکەوتن، دەست لێ‌هەڵگرتن، ڕەها کردن: کابرای کارمەندی دایرەی باج وەرگرتن بە چەشنێک شێتەو شەیدای جوانیی کچە بوو کە ئیدی وەدوای ئەو فکرە نەکەوت کە زانیارییەکی زۆرتری لێوەرگرێ.

٨٥٤٣ 688- وەدەرخستن، دەرکەوتن: هەرکە هەورەکان وەلاچوون، فرۆکەخانە وەدەرکەوت؛

← دیتنەوە، دەرهێنان، ئاشکراکردن.

٨٥٤٤ 876- وەدەرخستن، دەرخستن، ئاشکراکردن، بە ڕوونی نیشاندان: ڕۆژە ڕەشەکانی ساڵی ١٩٤٠ باشترین لایەنە ئەخلاقییەکانی خەڵکی بریتانیای بە جوانی دەرخست.

٨٥٤٥ 706- وەدەرخستن: ڕۆژی تەنگانەو کارەسات هەموو ئەو لایەنە باشانەی وەدەرخست کە لەو بنەماڵەیەدا هەبوون.

٨٥٤٦ 1078- وەدەرخستن، هێنانەدەر (لە گومرک)، ئیجازە وەرگرتن بۆ: داخوا ئەو کامێرایانە لە گومرک هاتوونە دەر. (= گومرگیان بۆ دراوە)؟● واباشترە لە ئاسایش ئیجازە بۆ میوانەکان وەرگری.

٨٥٤٧ 1042- وەدەرخستن، وەدەرنان (بە خێرایی و بە چۆنیەتییەکی خراپەوە): هێندێک لە نووسەرانی بازاریی هەموو ڕۆژێ دوو هەتا سێ هەزار وشان (دەنووسن) دەدەنە دەر.● هێندێک کارخانە هەن کە شەوو ڕۆژ کار دەکەنو فەرمانی هەرزان بۆ خەڵکی کەمداهات وەدەر دەخەن.

٨٥٤٨ 7154- وەدەرکەوتن (لە چەشنێک چێوەیە سەر چەشنێکی دیکە)، ئاڵان، چوونەدەر: لە خرووجی/ لە ئەلقەی ژمارە ٣١ لە جادە وەدەرکەوتن.

٨٥٤٩ 1210- وەدەرکەوتن (وەبیرهاتن)، هاتنە بەرچاو: کاتێ فرۆکەکەمان لە هەوران هاتەدەرو ئەوی بوو، سەوزایی سەوزو خانووبەرەی سپی وەدەرکەوتن.

٨٥٥٠ 1257- وەدەرکەوتن، سەرهەڵدان: لە کاتی تاقیکردنەوەی ئەوتۆدا بوو کە هەمیشە لایەنە باشەکانی وەدەردەکەوت نەک لایەنە خراپەکانی.

٨٥٥١ 1254- وەدەرکەوتن، دیتران، هەڵدان، (ڕوون) دیار بوون: وردەکارییەکانی ئەو لێکهەڵکەندراوە لەو ئەوورە لا بە لایەدا زۆر جوان وەدەردەکەوێ.

٨٥٥٢ 2291- (بە توورەییەوە) وەدەرکەوتن، چوونەدەر: دوای دەمەقاڵەیەکی توندو تیژ دەگەڵ سەرۆکی مەجلیس، جۆنز کاغەزەکانی کۆ کردەوەو بە توورەییەوە وەدەرکەوت.

٨٥٥٣ 1263- وەدەرکەوتن، چوونەدەر، هاتنەدەر (بۆ گەڕانو دڵخۆش بوون): منداڵەکان وەرنە دەرێ؛ وەختی کایە کردنە، مانگەشەو وەک ڕۆژێ وایە.

٨٥٥٤ 4059- وەدەرکەوتن، بلیند بوون، سەرهەڵدان (بە شێوەیەکی ئاشکرا): تاوەرێکی دیکە بلیند بوو، کەمێکی مابوو وێیان کەوێ.

٨٥٥٥ 836- وەدەرکەوتن (لە پڕ)، پەیدا بوون: ئیسکۆرتی/ حیمایەی سواران تێپەڕینو بە دوای ئەواندا، لە پڕ کالیسکەی میری دەگەڵ یاوەران وەدەرکەوتن.

٨٥٥٦ 5998- وەدەرکەوتن، تێپەڕاندن لە، لە دەست دەرچوون، لە قەڵەم کەوتن: پێشگری لەو شتانەی کە شکاوەنو لە دەستمان دەردەچن بۆمان دژوارە.● گەلە زانیارییەکی زۆر گرنگ لە ڕاپەلکەی ئاسایش وەدەرکەوتووە/ بڵاو بۆتەوە.

٨٥٥٧ 2899- وەدواکەوتن لە ماڵ: حەیفێ نیو سەعات زووتر نەهاتی، ماری بۆ نەسپ سوارییی وەدەرکەوتووە هەتا سەعاتی ٦ ناگەڕێتەوە.

٨٥٥٨ 6566- وەدەرکەوتن یان چوونەدەر (بە فیزو ئیفادەوە): بێ‌ئەوەی قسەیەکی بکا، بە فیزێکەوە وەدەرکەوت.

٨٥٥٩ 3235- وەدەرکەوتن لە ئاسۆ، دیتران: کەشتییەکی بادبانی لە ئاسۆ دەرکەوت.

← روون بوونەوە.
وەدەرکەوتن ← چوونە مەرەخەسی (کورت خایەن)، بۆ فرۆش داندران، تێپەر کردن، هاتووچوو کردن، هاتنەدەر لە، هاتنە سەر ئاو، دەرکەوتن (ی فەرمانێک)، هەڵاتن، چوونە دەر.

٨٥٦٠ 1267- وەدەرکەوتن لە، هاتنەدەر لە: لە نێو سێلاوی خەڵکێکدا کە لە ستادیۆمی فوتبال دەهاتنە دەر گوم‌مان کرد.

← بەجێ‌هێشتن.

٨٥٦١ 5868- (زاراوەیەک لە یاری کریکێتدا): (خێرا) وەدەر نان، دەرکردن.

٨٥٦٢ 3315- وەدەرنان، دەرکردن، دەرپەڕاندن: دەتەوێ بە یەکجاری لە خزمەتە کۆمەڵایەتی‌یەکان وەدەرم نێی؟

٨٥٦٣ 4374- وەدەرنان، دەرکردن لە یاری، تەپ کردن: دوای ئەوە کە ئالفرێد لە نیوەی دووهەمدا لەسەر فەرووارەی تیمی نەیار فۆڵی کرد، وەدەریان نا.

٨٥٦٤ 1924- وەدەرنان، دەرکردن، دەرپەڕاندن: سەفیرەکانی رووسیە بە زۆری چەک لە ئەفغانستان دەرکران.

٨٥٦٥ 6738- وەدەرنان، بردنەدەر: دەکرێ ئەو سەگە زوو بەریە دەر؟ خەریکە ئەرشەکەی دەجوێ.

٨٥٦٦ 1387- (بە زۆرە ملی) وەدەرنان، دوور کردنەوە: لەسەر داوای سەرۆکی مەجلیس، پۆلیس پرسیارکەرە چەنەبڕەکانی بە زۆرەملی وەدەر نا.

٨٥٦٧ 1037- وەدەرنان، دەرکردن: بە ویستی خۆی ئەرزیشت؛ وەدەریان نا.

٨٥٦٨ 7131- وەدەرنان، گەڕاندنەوە: "تاقمی فریاگوزار" دڵیان نایە هیچ کەس لە میراتخانەکانی خۆیان وەدەرنێن.

٨٥٦٩ 3632- وەدەرنان (بە زۆرە ملی)، بێبەش کردن، مەحروومیەتی لە کەسێک ئەستاندن: لەو شەریکەیەدا تەنیا جارێک هەڵە کردنت لێ قبووڵ دەکەن، هەرکە کردت بە دوو جار، بێ سێ و دوو لێکردن دەرت دەکەن.

٨٥٧٠ 7125- وەدەرنان/ فڕێدانەدەر (بە پاڵەو پەستۆ): کۆبوونەوە بە هەرا هەرایە تێکچووبوو، بۆیە سەردەستەی ئاژاوەگێرەکانیان بە پاڵەو پەستۆ لە سالۆنەکە دەرکرد.

٨٥٧١ 5714- وەدەرنان لە زانستگە: پاش ئەو رووداوانەی کە هاوکات دەگەڵ هاتنی سەرۆک وەزیرانی وڵاتێکی بێگانە هاتنە پێش، چەند کەس لە خوێندکارەکانیان وەدەرنا.

٨٥٧٢ 2555- (لە یاری کریکێتدا) وەدەرنان، وەلانان.
← تەپ کردن، دەرکردن لە، دەنگانان.

٨٥٧٣ 5563- (لە یاری کریکێتدا): وەدەرنانی پالەوانێک بە تەنگاوتنی ... کەی لە حاڵی غلۆربوون دا.

٨٥٧٤ 6406- وەدەرنەکەوتن، لە ماڵی مانەوە: لە بەیانی‌یەوە هەتا شەوێ باران لێی نەکردەوە،/و ناچار بووین لە ماڵێ بێنینەوە.

٨٥٧٥ 3541- وەدەرنەکەوتن لە ماڵ: لە رۆژێ ئاوا تەروش کە وەک گزەی سەرموژتر دەباری‌و دەرەجەی گەرما نزیک لە سیفرە، باشترین کار ئەوەیە کە لە ماڵێوە دەرنەکەوی.

٨٥٧٦ 3517- وەدەرنەکەوتن، لە ماڵێ مانەوە: مەگەم بۆ پەیدا کردنی بژێو بچێ دەرێ، دەنا لەم هەوا ساردەی کە ئاوا چۆتە ژێر سیفر، باشترین کار ئەوەیە کە لە ماڵێ بێنینەوە.
← لە ماڵێ بوون، لە ماڵێ مانەوە.

٨٥٧٧ 1205- وەدەست کەوتن، وەگیرکەوتن: پۆلیسەکان لە کابرای گوماویان پرسی ئەو دەمانچەیەی چلۆن وەگیر کەوتبوو.
← دۆزینەوە، جیاکردنەوە.

٨٥٧٨ 2000- وەدەست کەوتن: لە راگەیەنراوی هاوبەشی وەزیرانی دەرەوەی ئەو وڵاتانە بەروونی دەردەکەوێ کە وێناچێ هیچ رێککەوتنێک وەدەست کەوێ.

٨٥٧٩ 2306- وەدەست کەوتن، وەگیرکەوتن: ئەوە داهێنانێکی گرنگی تیکنیکی‌یە کە سەنعەتەکان دەتوانن قازانجێکی زۆری لێ وەگیر خەن.

٨٥٨٠ 7497- (بە سەختی) وەدەست هێنان، دابین کردن: لێرە، پیاو تووشی چەند وەرزێرێک دەبێ کە بە زەحمەت ژیانی خۆیان لە زەوی‌یە رژدەکانیان دابین دەکەن.

٨٥٨١ 145- وەدەست هێنان، گەیشتن بە: ئەو لە ژیاندا زۆر لە بلیندان ئاروانی‌یەو، دەیەوێ بە شێوەیەکی ئاسایی سەرکەوتن وەدەست بێنێ‌و نایەوێ بگاتە پلەو پایەی زۆر بەرز.

٨٥٨٢ 7142- وەدەست هێنان، دان، پێشکەش کردن: ئەو نووسراوەی چەند رۆژ لەمەوپێش پێشکەشت کرد شتێکی زۆر زۆر خراپ بوو. نەمدەتوانی بڕوا بکەم هی تۆیە.

٨٥٨٣ 6732- وەدەست هێنان، ئابوونە کردن: بە هۆی خەرجی پۆستی، ئێستا ئابوونە کردنی گۆڤارێک یان رۆژنامەیەک لە کڕینی لە نوێنەری چاپەمەنی گرانتر تەواو دەبێ.

٦٥٨٤/ 2428- **وەدەست هێنان، وەدەست کەوتن، تێگەیشتن، لێ حاڵی بوون، زانین:** ئەوەی کە هەوڵی بۆ دەدەم تێی بگەم ئەوەیە کە داخوا بۆ خاتری پوولە پارەی ئەو کچە دەخوازی یان خۆشت دەوێ؟

٦٥٨٥/ 2505- **وەدەست هێنان، تەماس دەگەڵ گرتن:** نیشانییەکەت چلۆن وەدەست هێنا؟... . ● ئەگەر مەسەلەکە بە پەلەیە، دەتوانم لە سەر نانی نیوەڕۆ دەگەڵ دوکتور تەماس بگرم.

٦٥٨٦/ 2532- **وەدەست هێنان، وەگیرکەوتن، وەدەست کەوتن، پەیدا کردن:** ئەگەر چەند سەد پۆندێکم وەگیر کەوتبا، ژنم دێنا.

٦٥٨٧/ 1864- **وەدەست هێنان:** نازانم چۆن دەتوانم ئەو راستییە خۆشحاڵی وەدەست بێنم (= خۆشحاڵ بم) کە هەر دە ڕۆژ جارێك دراوم دەدەنێ.

٦٥٨٨/ 1796- **وەدەست هێنان، وەدەست خستن، پەیدا کردن:** دانیشتووانی بەلەمێکی سەرناوەڵە ئاوی خواردنەوە لە کوێ پەیدا دەکەن.

٦٥٨٩/ 1727- **وەدەست هێنان- پەیدا کردن:** دەڵێن جێفری لە نێوان ساڵەکانی ۱۹٦۰ و ۱۹٦۷دا لە بریستول ژیاوە. بزانە دەتوانی چ زانیارییەك دەربارەی ئەو ساڵانە وەدەست بێنی.

٦٥٩٠/ 2553- **وەدەست هێنان، پەیدا کردن، قازانج کردن/ بردن:** لە زۆربەی کاسبییەکاندا هەرچەندێکی زەحمەت بکێشی، ئەوەندە قازانج دەبەی.

٦٥٩١/ 4556- **وەدەست هێنان (ی زانیاری لێرەو لەوێ):** لەسەر چاوەی جۆراوجۆرەوە هێندێکم زانیاریی وەدەست هێناوە.

٦٥٩٢/ 671- **وەدەست هێنان، پەیدا کردن:** جوانییەکەی/ خۆش سیما بوونەکەی پارەی بۆ پەیدا دەکا (= دەبێتە هۆی ئەوە کە پارەیەکی زۆری وەگیر کەوێ).

٦٥٩٣/ 1684- **وەدەست هێنان لە ڕێگای:** ماری لە ڕێگای دەرس گوتنەوە قازانجێکی زۆری وەدەست هێناوە/ قازانجێکی زۆری کردوە.

٦٥٩٤/ 1147- **وەدەست هێنان، پەیداکردن (لە ئاکامی تێکۆشاندا):** هیوادارم ئەو پووڵانەت لە ڕێگایەکی شەرافەتمەندانەوە پەیدا کردبێ.

← دۆزینەوە، دەرکێشان.

٦٥٩٥/ 7529- **وەدەست یان وەچنگ کەوتن، ئاشکرا بوون:** لەو ساڵە بە پیتەو بەرەکەتەدا، ماسییەکی یەکجار زۆر وەدەست کەوت.

٦٥٩٦/ 1305- **وەدیهاتن، وەجێهاتن:** ئاواتەکانیان بۆ پێکهێنانی ژیانێکی هاوبەشی بەختەوەرانە هەرگیز وەدی نەهاتن.

٦٥٩٧/ 299- **وەرز (فەسڵ)... بوون، لە بازاڕدا وەدەست کەوتن:** تووەڕکی وڵاتانی دیکە مەگرە زۆر گرانە. راوەستە هی خۆمان بێتە بازار.

٦٥٩٨/ 401- **وەرز ... نەمان، تازە وەگیر نەکەوتن:** تووەڕکی تازە وەگیر ناکەوێ؛ وەرزی نەماوە/ فەسڵی تەواو بوە.

وەرزیدە بوون لە کاردا ← خاولن.

وەرسووڕان ← هەڵگەڕانەوە، وەرگەڕانەوە.

٦٥٩٩/ 7126- **(لە ئەرتەشدا) وەرسووڕان (و ڕوو لە پشتەوە کردن):** گرووهانەکە وەرسووڕاو دە هەنگاو بۆ پشتەوە کشاوە.

٦٦٠٠/ 6912- **وەرسووڕان، جینگڵدان، شلپەشلپ گرتنەوە پێدان کردن:** خۆشنەلو بە هێزی تاوتۆیەکی توند هەروا لە نێو جێگاکەیدا جینگڵی دەدا. ● منداڵەکانمان لە تەنکاوی حەوزە گەورەکە بەجێ هێشت بۆ ئەوەی بە کەیفی خۆیان شلپەشلپێ بگرنەوە.

٦٦٠١/ 6574- **وەرسووڕان بۆ پشتەوە:** خێرا وەرسووڕاوە، بەرەو ڕووی کابرایەکی ڕەقەڵە ڕاوەستاو پرپەدا پەخەی/ یەخەی گرت.

٦٦٠٢/ 4815- **وەرسووڕاندن:** دەستێکیان لەسەر شانی دانا، وەریان سووڕاند بۆ ئەوەی دەگەڵ دوو چاوی زەق بەرەوڕوو بێ.

٦٦٠٣/ 7174- **وەرسووڕان (دن)، وەسەرپێك کەوتن:** منداڵەکە لەسەر دەم خەوتبوو، دایکی وەری سووڕاندو مەلافەکەی بۆ ڕێکوپێك کرد. ● فرۆکەکە وەعەرزی کەوتو چەندین جار وەسەرپێك گەڕا.

وەرکەوتن ← درێژ بوونەو نووستن.

وەرگرتن ← (بە شۆقەو زۆڵەوە) فێر بوون.چاولێ کردن، تێگەیشتن، پێراگەیشتن.

٦٦٠٤/ 4549- **وەرگرتن (مانگانە، پارەتی، حەقدەست):** هێندێك کرێکار لەو کارخانەیە کار دەکەن کە هەفتەی ٦۰ پۆندان وەردەگرن.

٦٦٠٥/ 4796- **وەرگرتن:** پارەتییەکی مانگانەی مورەتەب وەردەگرێ. ● لەو کارە/ شوغڵەدا ئیزافەکارێکی زۆر وەردەگرن.

٦٦٠٦/ 4128- **(لە شتێکی خراپ ئاکامێکی باش) وەرگرتن:** بە نا بە دڵییەوە لێك مارە کرابوون، بەڵام، بڕیاریان دابوو ژیانی هاوبەشیان بە سەرئەنجامێکی خۆش بگەیەنن.

/٦٦٠٧ 4554- **وەرگرتن (ی پەیامی رادیۆیی رەسمی تەلەویزیۆن/ رادیۆ)**: دەبوو ئێمەکانی ئەوە هەبایە دەربارەی مانگ هێندێك نیشانە وەرگرین.

/٦٦٠٨ 6718- **وەرگرتن (ی ئۆتۆبی)، دامەزراندن**: شەش ئەفسەران بۆ شەش مانگ تاقیکاریی وەردەگرن و پاش ئەو شەش مانگە سێ کەسیان هەڵدەبژێرن بۆ دامەزراندنی هەمیشەیی.

/٦٦٠٩ 30- **وەرگرتن/ وەرگێران لە**: ئەو شانۆیە بە شێوەیەکی وەستایانە لە ئەسڵەکەی وەرگێڕاوە.

/٦٦١٠ 5206- **وەرگرتن لە**: لە خاوەنکارەکانی مانگانەیەکی بازنشەستەیی (تەقاعودی) باشی وەردەگرت.

/٦٦١١ 2880- **وەرگرتن (لە)، یارمەتی وەرگرتن**: ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی کە هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد رۆژێك بێکار بن، ئێستا ناچار بوون یارمەتیی مانگانەی بێکاران وەرگرن.

/٦٦١٢ 5628- **(ئیمتیاز/ پەیمان) وەرگرتن یان وەدەست هێنان**: هەتا ئێرەوێیە پەنهای وەدەست هێنابوو -دیارە دەزانن، کارتەر، وەك ماوڵێر، کەسێك نییە بە هاسانی ئیمتیازی لێوەربگیرێ.

وەرگرتن لە ← بە هێزی... زانین.

وەرگرتن یان وەرگێران ← رێگا پێدان.

/٦٦١٣ 5205- **(دووبارە وەك ئەندام) وەرگرتنەوە**: بە هۆی ئەوە کە لە شارەکەدا پێوەندیی ئەوروپیکی بەرپلاوی هەبوو، حیزب خۆشحاڵ بوو لەوە کە وەك ئەندام وەری گرتەوە.

/٦٦١٤ 6623- **وەرگرتنەوە (ی شتێکی فرۆشراو)**: ئەو ماشێنە عەیبێکی گرنگی هەیە. بە پێی زەمانەت، فرۆشیارەکان ناچارن وەری گرنەوە.

/٦٦١٥ 5230- **وەرگرتنەوە، هەڵگرتنەوە، دیتنەوە**: تۆپەکەی لەسەر چەمەنی ماڵی دراوسێکەیان دیتەوە. ◆ چەند دانە لە سکەکانیان لەنێو چۆمیدا دیتەوە.

/٦٦١٦ 3154- **وەرگرتنەوە، پێگەیشتنەوە**: دەتوانی لە تایپەکەی من کەڵك وەرگری، بەڵام، دەبێ لە ئاخری حەوتوودا پێم بگاتەوە/ بگاتەوە دەستم.

/٦٦١٧ 2444- **وەرگرتنەوە، دانەوە**: چەترەکەت وەکامرانی مەدە. دەنا هەرگیز وەری ناگرێتەوە (= ناتداتەوە).

/٦٦١٨ 2434- **وەرگرتنەوە، هێنانەوە، گێڕانەوە**: ئەری چۆن دەتوانین تۆپەکەمان لەو سەگەی بستێنینەوە؟.

← ئەستاندنەوە، دووبارە وەك ئەندام وەرگرتنەوە.

/٦٦١٩ 2700- **وەرگەڕان، دەست هەڵگرتن لە (ئایین و بیروبڕوا)**: تەنیا لەبەر ئەوە کە کابرای خوازیاری ماری خوا نەناسە، پێویست ناکا ئەو ژنە دەست لە بیروباوەڕی خۆی هەڵگرێ.

/٦٦٢٠ 2293- **وەرگەڕان، تەقڵە لێدان، مەعلەق لێدان، سەرئەوبن بوون**: فرۆکەکە لە پڕ راوەستاو هەڵگەڕایەوەو خۆی بە پەرژینەکان دادا.

/٦٦٢١ 7128- **وەرگەڕانەوە، وەرەسووڕان (دوە)، گەڕانەوە**: وەرەسووڕاو دیتی کە پۆلیسێك بە گومانەوە چاوی لێدەکا.

وەرگێران ← لێحاڵی بوون، تەرجومە کردن.

/٦٦٢٢ 5301- **وەرگێڕانە سەر، تەرجومە کردن بە، کردن بە**: شانۆکانی شەکسپیر بە چەند زمان تەرجومە کراون؟/ وەگێردراونەتە سەر چەند زمانان؟

/٦٦٢٣ 2149- **وەرنەگێران، ئاوڕ نەدانەوە سەر، لۆکە دەگوێ ئاخنین، خۆلێنەبان کردن، خۆلێنەکەر کردن**: زۆر وێدەچێ کە لە بەرامبەر داوای ٢٠ لە سەد بردنە سەری یارمەتیی مانگانە، هەموو لایەك خۆکەر کەن.

/٦٦٢٤ 587- **وەربوون، خۆ نەهێشتن، لە باو پێنداهاتن لە باران، خەڵك بە تەنزماراکێشان**: شێرزاد دانیشتبوو هەروەك تۆ بڵێی نە بای پێداهاتبێ و نە باران.

/٦٦٢٥ 1124- **وەرە، وەرن**: وەرە با بچینە مەیخانەو لیوانێکی بۆ تەر کەین.

/٦٦٢٦ 1240- **(ئێویمەك لە چاو لێکردن کە بە رووئی دەڵێ) وەرە**: چاوەکانی زۆر گەورەو جوان بوون، بەڵام لەو کەسانە نەدەچوو کە هەڵیاندەگرن و لە چاوەکانیشی "وەرە" نەدەخوێندرایەوە.

/٦٦٢٧ 7345- **وەڕەز بوون لە، لێ بێزار بوون**: ماوەیەکی لە رادە بەدەر درێژ لەسەر کارێك بووەو لە ناکاودا کەم کەم لێی وەڕەز بووە.

/٦٦٢٨ 7011- **وەڕەز بوون، ماندوو بوون**: وا دیارە کە هەرگیز لە دەنگی خۆی ماندوو نابێ.

← دڵتەنگ، دڵتەنگ بوون، ماندوو بوون لە.

/٦٦٢٩ 6150- **وەرزی کردن، ئاوانەخوازی بوون، خودا خودا بوون**: سەربازەکانمان زۆر باش بارهێناوە؛ خودا خودایانە بچنە شەرێ.

/٦٦٣٠ 1243- **وەرە ژوور، خۆی تێهاوێ (بۆ ئێو لاو یان کارێکی بە قازانج)**: ئەگەر دەتەوێ ببی بە رۆژنامەنووس، ئەمن ئاخرین کەس دەبم هانت دەمو بڵێم: خۆی تێکە! مەلەکەی خۆشە!

٨٦٢١ 7161- وەرمێ هەڵگەڕانەوە یان هەڵگێڕانەوە، دواندنی باڵا دەست شکست دان: ئەگەر چاودێرانی هێرشەکە نەدەبوو، دەکەوتە بەر هێرشێکی کتوپڕ، بەڵام چونکە چاودێرانیی دەکرد، وەرمێیە زیانی هێرشکەر هەڵگێڕاوە.
→ هەڵدانەوە.

٨٦٢٢ 6286- وەرنیشتن، دان، کردنەوە: شەرکەتێکی ماشێن بەکرێدانی کردەوە.

٨٦٢٣ 5771- وەرنیشتن، وەگەڕخستن: بە ئامرازی پێوەندی گرتنی وەها کارامە کە ئێستا هەن، دەکرێ چەند ئەرتەشی دوور لە یەکتر هاوکات وەگەڕخەن.

٨٦٢٤ 5775- وەرێ خستن، بوون بە هێزی سەربەخۆیی: هاتنە خواری بایی پۆند بەو جۆرەی کە ئەمڕۆ گوزاریش کراوە، شەپۆلێکی تازەی لە فرۆشی پۆند لە بازاڕی لەندەن وەرێخستووە.
→ هەڵایساندن، ساز کردن، بوون بە هێزی.

٨٦٢٥ 6284- وەرێ کەوتن: تاقمە چکۆلەکەی پشکنە رەکان بە هیوایەکی بەرزەوە وەرێکەوتن.

٨٦٢٦ 1921- (لە پێوەندی دەگەڵ ماشێنەوە ...) وەرێکەوتن، رۆیشتن، بردن: لە پێشبڕکێی ماشێن لێخوڕین لە مونت کارلۆ، دەست پێکەرانی خولی یەکەم، لە کرێسەرەو باکرتیەیەکی تونددا وەرێکەوتن.

٨٦٢٧ 5778- وەرێکەوتن: ماشێنەکان لە نێو تۆزو خۆڵێکی زۆردا وەرێکەوتن.

٨٦٢٨ 4857- وەرێکەوتن، دەست پێکردن، پاڵ پێوەنان بۆ وەرێکەوتن: هەرکە ئامادە بووی، وەرێکەوە.

٨٦٢٩ 2536- وەرێ کەوتن(ەوە): پاش ئەو دەعمە خەتەرناکانەی کە لە تەمو مژەکەدا روویان دا، وەرێکەوتنەوەی ترافیك چەند سەعاتێکی کێشا.

٨٦٤٠ 2511- وەرێکەوتن، رۆیشتن، چوون: "سبەینێ کەنگێ دەڕۆن"، "دەمانەوێ پێش سەعاتی حەوت وەرێکەوین".

٨٦٤١ 2305- وەرێکەوتن (بە تێکڕایی): داخراز بۆ بەتانی، چادرو دەرمان بەرەو ئیدارەکانی رێکخراوە فریاگوزارییەکان بە لووزەو وەرێکەوتوون.

٨٦٤٢ 5793- وەرێکەوتن بۆ، رۆیشتن بۆ: هەواڵدەرەکان بە ورەیەکی بەرزەوە وەرێکەوتن.

٨٦٤٣ 4099- وەرێکەوتن بەرەو/ بە ...دا: دوای سەعاتەو نیوێك، کەمێك زیاتر یان کەمتر، گرووهانەکە بەرەو ئێزگەی فرستەندە وەرێکەوت.

وەرێکەوتن → دەست پێکردن، وەخۆکەوتن، رۆیشتن بۆ، چوونەدەر لە، چوون بەرەو جێگایەك، سەفەر کردن بۆ.
وەرین → بارین.

٨٦٤٤ 4910- وەزاندن، هاتنە بەرچاو: کاتێك دەبینم وەك ئەرتەشیان دەجووڵێتەوە، وەدەزانم ژێنەراڵێکی بازنشستەیە/ تەقاعوودە یان: وەك ژێنەراڵێکی بازنشستەم دێتە بەرچاو.
وەزع شێوان → (بێ سەروبەرەیی، فەساد)، دەست پێکردن.

٨٦٤٥ 7129- (لە بازرگانی و ماڵیدا) وەزعی پێچەوانە پەیدا کردن یان بە خۆوە گرتن: نزیکەی هەفتەیەك لەمەوبەرێش، بازاڕی ئەمریکا وەزعێکی پێچەوانەی بە خۆیەوە گرت (ئەگەر باش بوو بەرەو خراپی رۆیشتو بەپێچەوانە).

٨٦٤٦ 595- وەزعی رووحی خراپ بوون، کۆنترۆڵی خۆ لە دەست دان: زۆر لە سەرەخۆ دیار بوو، بەڵام، جار جار کۆنترۆڵی خۆی لە دەست دەداو دەستی دەکرد بە گریان.

٨٦٤٧ 1327- وەزعێك بێتە پێش، دنیا وای لێ بێ: هەرگیز پێم وا نەبوو دنیا وای لێ بێ کە ئەتۆ داوای رێنوێنی لە من بکەی.

٨٦٤٨ 1798- وەزعێکی باش یان خراپ هەبوون، باش، یان خراپ هێنان: ئەو ماوەی کە مانگرتنی کرێکارانی کانزای بەردی زوخاڵ لەگۆڕێدا بوو وەزعێکی خراپیان نەبوو.
وەزعێکی خراپ هەبوون → حاڵ تێکچوون.
وەزگلان → وەگیان هاتن.

٨٦٤٩ 2086- وەزگلان، تەقین (لە حەیفان)، دڕان (لە حەیفان): کاتێك ئیورشەوێ گەڕامەوە، دیتم بابم سوور سوور هەڵگەڕاوەو، هێندەی نەماوە لە حەیفی میوانەکانی بتەقێ کە لە وەختی خۆیدا نەڕۆیشتبوون.

٨٦٥٠ 4977- وەزن زیاد بوون/ چوونە سەر/ زیاد کردن: لە ماوەی ئەو یەك مانگەی کە دەگەڵ ئەوان بووە، وەزنی هیچ نەچۆتە سەر.
وەزن کردن → کێشان (بە تەرازوو).

٨٦٥١ 2279- وەژوور کەوتن، لە نەکاو پەیدا بوون، هاتنە بەرچاو: باڵندەیەکی چکۆلەو زۆر جوان لە پڕ هاتە بەرچاو.
وەژوور کەوتن → چوونە ژوور لەسەرلەو ...، (بە سانایی) وەژوور کەوتن، چوونە ژوور، هاتنە ژوور.
وەژێر باڵی خۆدان → پاراستن.

٨٦٥٢ 1665- وەسف کردن، تاریف کردن، پەسن گوتن: پیاو چۆن دەتوانێ جوانیی وەسف بکا؟

٦٦٥٣/ 6586- **وەسڵ کردن (کەسێك کە لە دەرەوە را تەلەفوون دەکا بە تەلەفوونێکی تری):** "خانم جیفری، کەسێك لە لەندەن را تەلەفوون دەکا"، "باشە، وەسڵی کە".

٦٦٥٤/ 1405- **وەسڵ کردن:** لە ئاپارتمانە تازەکەمان دەزگایەکی تەلەفوونی لێیە، بەڵام بە بەداڵە وەسڵ نەکراوە.

٦٦٥٥/ 4571- **وەسڵ کردن، موتەسڵ کردن، سواری یەك کردن، موتەسڵ کردن:** پارچە ئاسن و تەختەیان لێك دابوون و میچەکەیان پێدروست کردبوون.

٦٦٥٦/ 5040- **وەسڵ کردن (ی تەلەفوونی کەسێك بە کەسێکی تر):** "ئاغای، مەردووخ، لە دەرەوەرا تەلەفوون دەکەن"، "باشە، وەسڵی کە.

← هەڵکردن ، لێدان (ی شتێك لە شتێکی دیکە).

وەسڵ کردن بە ← بوون بە یەك.

وەسەر ئاوێ کەوتن ← هاتنە سەر ئاوێ.

وەسەر پەراندن ← بە فێڵ و تەڵەکە کارێك بە کەسێك کردن.

٦٦٥٧/ 6880- **وەسەر پەڕاندن:** ئەوە لەو چەشنە کارانە بوو کە نەدەکرا ئەو کابرایەی وەسەر پەڕێنێ.

٦٦٥٨/ 7081- **وەسەرپەڕاندن، فریودان:** ئەو کچەیان فریودا بۆ ئەوەی مێرد بە کابرایەکی گەنج و جوان بکا کە لە راستیدا یەکجار خراپ بوو.

٦٦٥٩/ -

وەسەر خستن لە ← وەسەر کەوتن لە.

وەسەرکاری خراپ پەراندن ← بەرێی خراپدا بردن، دنەدان، باش/ خراپ دەست پێکردن.

وەسەر کەوتن ← تێپەڕین لە، چوونە سەر.

٦٦٦٠/ 7477- **وەسەرکەوتن، چوونە سەر، بەرەو ژوور رۆیشتن:** سەرۆکی شەریکە ئیددیعا دەکاو دەڵێ کە لە کرێکارێکی بەردەستانەوە هاتۆتە سەر (و بۆتە سەرۆك).

٦٦٦١/ 5859- **وەسەرکەوتن بە ...دا:** را وێ دەچێ کە دزەکان بە لوولەی ژێر پلووسکدا وەسەرکەوتبن و بە زۆر پەنجەرەکەیان کردبێتەوەو لە ماڵەکە وەژوور کەوتبن.

وەسەرکەوتن بە پێچەو خوارەکە ← چوونە سەر بە مارمێچ.

٦٦٦٢/ 2621- **وەسەرکەوتن لە، وەسەرخستن لە:** ماشێنەکەت هەرگیز ناتوانێ لەو تەپۆلکەیە وەسەرکەوێ.

٦٦٦٣/ 2997- **وەسەرکەوتن لە، پێنجەلهوون، چوونە سەر لە:** لەو رۆژەوە ئەو خانە پیرە بەربۆتەوە، نەیتوانیوە لە پلیکانان وەسەر کەوێ. • سۆرەکە وەك بەرق لە دارەکەی وەسەر کەوت/ بە دارەکەی هەڵچوو.

٦٦٦٤/ 6960- **وەسەر هەڵە پەڕاندن، بە هەڵە بردن، لێشێواندن:** بۆ گیتارەکەت لە جێگایەکی لێیدە. چی وام نەماوە ئەو حیسابانە رێك و پێك کەم و ناممێنێ بە هەڵەم بەری/ لێشێواندەی.

وەسەر یەك گەڕان ← وەرسووڕان (دن).

وەسەریەکنان (پووڵ و پارە) ← پووڵ و پارە وەسەر یەك نان.

وەشۆق کەوتن ← گەرم داهاتن.

وەغز دادان ← مەوعیزە کردن بۆ.

وەسەر یەك گێڕان ← کڵۆڵ ـە کردن.

٦٦٦٥/ 6232- **وەفادار بوون پێی مانەوە بە، راوەستان لەسەر پێیەمان نەبوون بە:** دەبێ بەو شتەی گوتوومە وەفادار بمێنمەوە.

٦٦٦٦/ 6358- **وەفادار مانەوە بە:** ژنەکەی لە رۆژانی خۆش و ناخۆشدا پێی وەفادار ماوەتەوە.

٦٦٦٧/ 3617- **وەفاداری نیشاندان لە بەرامبەر ...دا، ئیمەیبەت بە کەسێك وەفادار مانەوە:** ئێمە بە چوونە یارمەتیی دۆستانمان کە لە رۆژێلدا دەکەونە بەر هێرش، وەفاداریی خۆمان نیشان دەدەین.

وەفازانج کەوتن ← بەرەو باشتر بوون رۆیشتن.

٦٦٦٨/ 4322- **وەقسە هێنان:** وەقسە هێنانی چیا کارێکی زۆر سەختە؛ پیاو هەرگیز ناتوانێ سەبارەت بە هیچ مەسەلەیەك لە بیر و برِوای راستەقینەی تێ بگا.

٦٦٦٩/ 6282- **وەقسە هێنان، دەست پێ بە قسە کردن:** "بۆ خاتری خوا وەقسەی مەهێنن کە دیسان گێڕانەوەی یەکێك لە داستانەکانی لە پیوەندیی دەگەڵ یاریی گۆلفدا دەست پێ بکا".

٦٦٧٠/ 6250- **وەك ئاوی خواردنەوە، لەسەر قامکان، بە هاسانی یان بە ساناهی:** ئاغای ویکام، کە لەمێژساڵە نوێنەریان بوو، گوتی ئەگەر بڕێ، خێزانی دەتوانێ زۆر بە هاسانیی ماڵەکەی بەرێوە بەرێ.

٦٦٧١/ 6672- **وەك کاربەدەستانی یاسا هەڵس و کەوت کردن، دەست تێوەردان لە کاروباری یاسا:** لەو جێگایانەی کە هێزەکانی سەربازو پۆلیس بە یەکەوە لە دژی پارتیزانان وەگەر دەکەون، زۆر دژوارە پێش بە بەشێك لە خەڵك بگرن و نەهێڵن وەك کاربەدەستانی یاسا عەمەل بکەن.

٦٦٧٢/ 2384- **وەكو لەخستن (غزوا)، وەكو خستن (زۆر زوو)**: دەنگی تفەنگێك بەرز بۆوەو، خێرا نیگابانەكانی وەگەر خست.
← وەگەر خستن، جێ‌كردنەوە.
٦٦٧٣/ 1194- **وەكار كەوتن، دەست بەكار كردن**: پێش ئەوەی دەزگا شوێنهەڵگرە چەور كراوەكە وەكار كەوێ، چەند چركەیەك رابرد.
٦٦٧٤/ 4560- **وەكار كەوتنەوە، هەڵبوونەوە**: مۆتۆری كارەبای بەندەر پرتە پرتێكی كردو دەهات بكوژێتەوە، بەڵام، لە پڕ وەكار كەوتەوە .
٦٦٧٥/ 687- **وەكار كەوتن یان خستن، وەگەڕ كەوتن**: خەتی ڤیكتوریا، وەك بەشێك لە قەتاری ژێرزەویی لەندەن، بۆ وەسڵ كردنی گەرەكە گرینگەكانی شار، وەكار كەوتووە.
وەك پاڵپشت بوون بۆ ← پاڵ ڕێدان.
وەك خۆرەی مێشكی كەسێك خواردن ← ئازار دان.
وەك خۆ لێهاتنەوە ← هاتنەوە سەرخۆ.
وەك خۆی ڕاگرتن ← ڕاگرتن.
٦٦٧٦/ 5347- **وەك رابردوو لێكردنەوە، هێنانەوە سەر ... رابردوو**: باخەكانی ئەو كاخەیان/ قەسرەیان وەك رابردوو رازاندۆتەوە/ جوانی‌و رازاوەیی باخەكانی ئەو كاخەیان وەك رابردوو لێ‌كردۆتەوە.
٦٦٧٧/ 5366- **وەك رابردوو لێهاتنەوە، بوونەوە بە ...**: جووتیارەكانی ئافریقای ڕۆژئاوا مەرەكینە هەر یەك دوو ساڵ جارێك پارچە زەوییەك لە جەنگەڵ دابڕێنو زەوییەكی كە لە پێشدا كێڵگە بووە بەجێ بێڵن بۆ ئەوەی ببێتەوە بە جەنگەڵ.
٦٦٧٨/ 6370- **وەك ڕۆژ ڕوون بوون، بە ئاشكرایی دیار بوون**: دەیەویست مەبەستی خۆی لە هاتنەكەی بشارێتەوە، بەڵام مەبەستی ڕاستەقینەكەی وەك ڕۆژی ڕوون وابوو.
٦٦٧٩/ 6252- **وەك ڕۆژ ڕوون بوون، بە تەواوی دیار بوون**: وەك ڕۆژێ ڕوونە كە دەبێ چ بكەێ.
وەك سێڵاو هاتن ← بەلووزەوە هاتن.
وەك شێتان جووڵانەوە ← شێت بوون.
وەك كەسێك (رەفتار) كردن ← لاسای كەسێك كردنەوە.
٦٦٨٠/ 1360- **وەك كەسێك شووبهاندن، وەك یەك دانان**: كاتێك مێردەكەی پێی گوت دەو چاوی وەك سەڵەی سووتاو دەچێ، زۆر نارەحەت بوو.
٦٦٨١/ 3610- **وەك كەسێك هاتنەوە**: كەسانی میانە ساڵ زۆر سەیرو سەمەرەن كاتێك دەیانەوێ بە ئاهەنگی مۆسیقای پاپ هەڵپەڕن؛ ئەو جۆرە كەسانە هەرچی بی‌كەن ناتوانن وەك لاوەكان بێنەوە.
٦٦٨٢/ 5978- **وەك كوێلان كاركردن**: بۆ دەبێ بە درێژایی نیوەی تەمەنم لەسەر ئەو سۆبە گەرمە وەك كوێلان كار بكەم؟
٦٦٨٣/ 5787- **وەك مەبەستێك دیاری كردن**: مەسەلەكە بەم جۆرە نەبوو كە پێمان وابێ ویرجینیا عاشقی كاركردن لە گۆڤارێكی ئافرەتان دا بووبێ. ئەو لەبەر ئەوە كارێكی ئەوتۆی وەك مەبەستی خۆی دیاری كردبوو چونكە لەوێ نیمكانی ئەوە هەبوو كارێك وەچنگ بخا.
وەك گوێزی ئازا بوون ← بە كەیف بوون.
وەك مێژۆكە لەرزین ← لە ترسان لێوە لەرزە گرتن.
٦٦٨٤/ 4027- **وەكوو ... چاو لێكردن، حیساب كردن**: ئەمن وەك خائینێكی چاو لێدەكەم كە لە یەكێك لە رەشترین رۆژەكانی ژیانی نیشتمانەكەی خیانەتی كردووە.
٦٦٨٥/ 6531- **وەكوڵ هاتن، مۆنج لێدان**: هەستی بەوە كرد كە مەیلی گریان دەدەروونی‌دا مۆنجان دەدا.
٦٦٨٦/ 1298- **وەكوڵ هاتن، هێرووله كردن، كەڵەكەبوو توڕەیی هەڵڕشتن، یان جێگایەكی بەتاڵ** ڕاست ئەو كاتەی دەمەقاڵەی وتاربێژەكان دەچوو بگاتە جێگایەكی باریك، سەرۆكی مەجلیس داوای لێ‌كردن ئەزمی كۆبوونەوە بپارێزن.
٦٦٨٧/ 726- **وەكوڵ هێنان**: ئاوەكەی وەكوڵ بێنە، برینجەكەی تێ‌كەو، هەتا ئاوی لێ‌دەبڕێ، لێی گەڕێ بكوڵێ.
وەك هارلن خولردن ← درانشی.
وەكێولان خستن ← شێت (وەلی) كردن.
٦٦٨٨/ 1397- **وەك یەكبوون، خۆ دەگەڵ كەسێك ڕێك خستن، لەبەرچاو گرتن و بەرزبوون، ڕێككەوتن دەگەڵ، جووڵانەوە دەگەڵ**: یووسف هەروەك یاغی‌یەك لە دایك بووەو ناتوانێ (دەگەڵ یاساكانی كۆمەڵ) خۆی ڕێك بخا.
← بەرامبەر بوون دەگەڵ.
٦٦٨٩/ 1057- **وەك یەك چاو لێكردن**: ئەمن پیاوێكی بازرگانم. بۆیە لەوە كە دەگەڵ كرێكارە ساكارەكان وەك یەك چاوم لێدەكەن بە توندی رەخنەم هەیە.
← قبووڵ كردن.
٦٦٩٠/ 1451- **وەك یەكبوون، خوێندنەوە دەگەڵ، یەكگرتنەوە**: قسەی شاهیدەكە دەگەڵ ئەوەی كابرای پۆلیس دەكرێ بڵێین وەك یەك بوون/ بە تەواوی دەی‌خوێندەوە.
٦٦٩١/ 3056- **وەك یەك دانان، حیساب لەسەر كردن، وەك یەك لە قەڵەم دان**: هە موو پیاوكوژەكان وەك یەك لە قەڵەم دان كە

گۆیا هەموویان لە بیرەحمی و دڵڕەقیدا وەك یەكن كارێكی ناژیرانەیە.
وەك یەك زیاد بوون یان كەم بوونەوە ← دەگەڵ یەكتر هاتنەوە.
وەك یەك لە قەڵەم دان ← تەشبیه كردن.
٦٦٩٢/ 135- **وەك یەك لێكردن، تواندنەوە لە نێو ...، تێكەڵ بوون/ كردن لەگەڵ:** لە ماوەی كەمتر لە نیو سەدەدا پەنابەرە هۆگونەكان بە تەواوی لە نێو خەڵكی وڵاتدا توانەوە.
٦٦٩٣/ 6190- **وەك یەك هاتنەوە، پەككرتنەوە، خوێندنەوە، پەسناودان، تەوجیه كردن:** سەرم سووڕماوەو نازانم ئەو رەفتارانەی دەگەڵ ئەو رەخنانەی لە دەولەتی دەگرێ چۆن پاساو دەدا. * لەو دەوسیەیەدا هێندێك شت هەن كە دەگەڵ قسەكانی یەك ناگرنەوە.
← جوور هاتنەوە دەگەڵ، یەككرتنەوە، هاوئاهەنگ بوون.
وەك یەك نەهاتنەوە ←جور نەهاتنەوە.
٦٦٩٤/ 6527- **وەگەر خستن، كەڵك وەرگرتن لە:** بە كەڵك وەرگرتن لە ئاخرین توانایی خۆی، خۆی فڕێ دا سەر خەتی كۆتایی (پێشبركێ).
٦٦٩٥/ 974- **وەگەر خستن، لێ دانە سەر:** بۆ ئەوەی ئیمكانی دەست ڕاگەیشتن بە بازار پێك بێنن، سنعەتە تازەكان هەموو هێزی خۆیان لەسەر كێشانی جادەیەك وەگەر خستبوو.
٦٦٩٦/ 9020- **وەگەر خستن، نیشان دان:** دوای داوا كردن لە كرێكاران بۆ وەگەر خستنی هەموو هێزو توانایان لە رۆژەكانی هەڵبژاردندا وتارەكە كۆتایی هات.
٦٦٩٧/ 6792- **وەگەر خستن، كردنەوەو ئامادە كردن (ی كۆبوونەوە، فرۆشگا، تەنەكەو ...):** هەنگاوێكی ئەوتۆ دەبێتە هۆی وەگەرخستنەوەی ئابووری كە ستی بەسەرداهاتوە.
٦٦٩٨/ 677- **وەگەر خستن، وەكار خستن:** بە هۆی چلۆنایەتیی ئەرزەكە، ناكرێ هەروا زوو تۆپخانە وەگەر خەن.
← هێنانە مەیدانێ، كەڵك لێوەرگرتن، وەكار خستن (خێرا) وەڕێ خستن.
٦٦٩٩/ 1209- **وەگەر كەوتن (بۆ خزمەتی خەڵك):** جۆرێكی تازەی پاس لە كۆتایی ئەم مانگەدا وەگەر دەكەون.
٦٧٠٠/ 4565- **وەگەر كەوتنەوە، هاتنەوە گەڕێ:** دەبێ بزانن كە پێنج ساڵە لەو كارە دوور كەوتوومەوە. ماوەیەكی كەمم دەوێ كە بێمەوە گەڕێ/ وەگەر كەومەوە.
٦٧٠١/ 6477- **وەگیان هاتن، جارز بوون، وەڕەز بوون:** لەوەی كە ناچار بوو لەو هەموو میوانیو جێژنانەدا بەشداری بكا، جارز ببوو.

← جارز بوون.
٦٧٠٢/ 1170- **وەگیر كەوتن، لێ پەیدا بوون، لێ ساغ بوونەوە، دەستگیر بوون:** نازانم لە میوانیی ئەمڕۆ ئێوارە شتێك ساغ دەبێتەوە/ شتێكمان دەستگیر دەبێ.
وەگیر كەوتن ← هەبوون، وەدەست كەوتن، وەدەست هێنان، وەچنگ كەوتن، هەبوون، كڕین.
٦٧٠٣/ 2574- **وەگیر نەكەوتن لە، دەست گیر نەبوون لە:** "ئەو كابرایە رەخنەگرێك بوو كە زۆر خۆی لە ژنە چیرۆك نووسان هەڵدەسوو. پێم وەبیرت دێتەوە؟"، كوڕی وەڵامی داوەو گوتی:"باش لە بیرمە، بەڵام، هیچی لە من وەگیر نەكەوت".
٦٧٠٤/ 1668- **وەلابردن، لاچوون، پاك كردنەوە:** كاتێك دیكتاتۆرێك جێگای دیكتاتۆرێكی دیكە دەگرێتەوە، دەبێ هێندێك ناوی دیكە لە مێژوو پاك بكرێنەوە.
٦٧٠٥/ 6561- **وەلابردن، لەنێو بردن:** دەولەتە یەك لە دوای یەكەكانی باڵی چەپ بەڵێنیان داوە كە پاشماوەی جیاوازی دانان لە پەروەردەو فێر كردندا لە نێو بەرن.
٦٧٠٦/ 1591- **وەلابردن، پاك كردنەوە، لێ سانسۆر كردن، لێ بەرهەڵوێستی:** پێش ئەوەی بتوانن ئەو كتێبە چاپ كەین دەبێ هەموو ئەو جنێوو قسەو قسەڵۆكانەی تێیدا بە بنەماڵەی پاشایەتی گوتراون، لێی دەربازێنن.
٦٧٠٧/ 7374- **وەلابردن (بە خێرایی):** كابرای چاو بەست خێرا سەرپۆشەكەی وەلابردو دوو كەروێشكی زیندووی وەدەرخست.
← لێكردنەوە، لادان، دەركردن.
٦٧٠٨/ 768- **وەلابردن لەسەر ڕێگا:** هێزەكانی دوژمن هێزی بەرگریی ئێمەیان لەسەر ڕێ وەلابردو بەرەو باشوور پێشڕەوییان كرد.
وەلا بردنی شك و گومان ← روون كردنەوە.
٦٧٠٩/ 6337- **وەلاچوون:** دەكرێ كەمێك وەلاچی بۆ ئەوەی ئەم خالە بتوانێ دابەزێ؟
← دوور كەوتنەوە.
٦٧١٠/ 4788- **وەلادان:** پەردەیەكی تەوەرەنگمان وەلادا بۆ ئەوەی زنجیرە پلیكانێك دەركەون كە دەگەیشتە تەبەقەی/ قاتی خوارێ.
٦٧١١/ 2699- **وەلانان، لادان، قەدەغە كردن (سیگارو ...)، دەست هەڵگرتن لە:** هەمیشە لە بازاری دراو گۆڕینەوەدا دەیدۆڕاند بەڵام نەیدەتوانی تەرخی كا.

٨٧١٢ 7519- (لە سینەما، تەلەفزیۆن، فۆتۆگرافیدا) وەلانان: هونەرمەندێك كە بۆ یەك سەریالی دوورو درێژی تەلەویزیۆنی ڕێزێرو كراوە، ڕەنگە لەوە نیگەران بێ نەگەر بزانێ دەیانەوێ وەلای بنێن.

٨٧١٣ 5751- وەلانان: كامران وەرەقەكانی كە دەیویست چاكیان كا وەلای نانو دەستی درێژ كرد بۆ سیغارو شەمچەكەی.

٨٧١٤ 3757- وەلانان، پاشەكەوت كردن، هەڵگرتن بۆ داهاتوو: هێندێكیان پووڵ پاشەكەوت كردووە بۆ كاری گرنگەو پێویست.

٨٧١٥ 6463- وەلانان: نێوە دەبێ ڕەفتارو قسەكانی ڕواڵەتیی ئەو كابرایە وەلا نێن بۆ ئەوەی سروشتی ڕاستەقینەی ئەوتان بۆ دەركەوێ.

٨٧١٦ 1992- وەلانان، لە نێو بردن: كاتێك هزریە ڕواڵەتیەكانی مەرگ وەلا دەنێن، بەداخەوە دەبێ پیاكوژێتان لەبەرچاو بێ.

٨٧١٧ 1765- وەلانان: پێشنیار دەكەم تەشریفات وەلانێینەو بە شێوەیەكی ساكار باسەكەمان درێژە بدەین.

٨٧١٨ 5604- وەلانان، پاشەكەوت كردن: چەند پزشكێكی بۆ ڕۆژانی بازنشستەیی پاشەكەوت كردووە.

٨٧١٩ 4997- وەلانان (بەشێوەیەكی كاتی): سەرۆك وەزیر(ان) بە جۆرێك قسان دەكا كە دەڵێی دەیەوێ بە هانی بە ناوبانگی ئاشتی بە شێوەیەكی كاتی وەلا بنێ.

٨٧٢٠ 7144- وەلانان، هەڵگرتن، دەست هەڵگرتن لە، دەست كێشانەوە لە، تەرك كردن: ژیلوان ڕۆژنامەی ئێوارێی وەلانا، چونكە دەیزانی مەشتێكی زۆری هەیە كە دەبێ تەواوی بدا.

٨٧٢١ 6964- وەلانان، فەرامۆش كردن: هیچ كەس نازانێ ئەو باسانە دەبێ چۆن بەرێوە بچن - رادیارە كە پەیرەوی نێوخۆیی بە یەكجاری وەلاندرابێ.

٨٧٢٢ 6984- وەلانان، دەست هەڵگرتن لە: بریا ئەو ڕەفتارە/ هەڵس‌وكەوتەی وەلادەنا كە یەكجار بەوردی پێكی هێناوە.

٨٧٢٣ 4874- وەلانان، هەڵگرتن: گۆزەوی چنینەكەی وەلاناو دەستمان بە قسان كرد.

وەلانان ← چاوپۆشی لێكردن، فرێدان، پەردە لەسەر... وەلادان، باس نەكردن، خۆ لە دەستی شتێك ڕزگار كردن، بەسەردا زاڵ بوون، لەبەرچاو نەگرتن، بە هێند نەگرتن، بێبەش كردن، لە بیر خۆ بردنەوە، دانان، كەلك وەرنەگرتن لە، تەرخ كردن، فەرامۆش كردن، فرێدان، دەست هەڵگرتن لە

← تەمب كردن.

٨٧٢٤ 1959- وەلانان بۆ، دانان بۆ، هەڵگرتن بۆ: چاپ كردنی وتارەكەتان، كە لەسەر نەخۆشییەكانی وڵاتانی گەرم نووسراوە بۆ ژمارەی داهاتوو هەڵگیراوە.

← ڕاگرتن بۆ، هەڵگرتن بۆ، دیاریكردن بۆ.

٨٧٢٥ 3404- وەلانان بۆ كەسێك، لە نەزەر گرتن بۆ، دانان بۆ، هەڵگرتن بۆ: لە سەدەی نۆزدەهەمدا، كوڕانی مێرمنداڵو تازە لاویان بۆ كلیسا، ئەوتەش یان میتینگەكان (موستەعمەرات) لە نەزەر دەگرت. ● "ئەو كراوتەم بۆ دایكت لە نەزەر گرتبوو، بەڵام ئێستا كە لە ماڵ نیە، زۆر خۆشحاڵ دەبم ئەگەر ئەتۆ لێم وەرگری".

وەلانان بە هۆی نەخۆشییەوە ← لەسەركار وەلا بردن.

٨٧٢٦ 3829- وەلانانو دەبەر نەكردن: كاتێك هەوا گەرم دەبێ، دەبێ ژاكێتەو لیباسە پەشمییەكان وەلانێینەو دەبەریان نەكەین.

٨٧٢٧ 6693- وەلانان یان لابردن لەسەر سیرویس: بە هۆی كەم بوونی ڕانەندە ناچار بوون دووداتە لە پاسەكان لە سیرویسی شەوانەی ئەو خەتە وەلانێن.

٨٧٢٨ 6244- وەلانان یان دەركردن (دەركردنیان لە كاتی كەسادیی ئابووریدا) بێكار كردن یان بوون: ئەگەر ئەو كەسادییە درێژەی هەبێ، دیسانیش ژمارەیەكی زۆرتر كرێكار بێكار دەكرێن.

٨٧٢٩ 1595- وەلانانی شتی زیادی: پێش ئەوەی بتوانین ڕادەی كارامەیی ئەم سنعەتە بەرینە سەرێ، زۆر شتی زیادی هەن كە دەبێ وەلاندرێن.

٨٧٣٠ 2911- وەلاندران، دەرهاوێژران لە بەرنامەی عەمەلییات: وا دیارە فڕۆكە جەنگییەكانی دوژمن لە بەرنامەی عەمەلییات دەرهاوێژراون/ وەلا ندراون.

٨٧٣١ 2671- وەلاندران، تەمب كران: (لە یاریی كریكیت دا).

٨٧٣٢ 368- (دۆڕاندنو) وەلاندران (لە پێشبڕكێ)، تەمب كران: تیمی هیندوستان كە میوان بوو بە ٢٦٠ پوانەوە لە پێشبڕكێ وەلاندرا.

٨٧٣٣ 2918- وەلاندران لە خزمەت/كار: فڕۆكە جێتە تەمبەڵەكانی ساڵەكانی ١٩٦٠ لە خزمەت وەلاندرانو لە جێگای ئەوان فڕۆكەی زۆر موددێرنیان هێنانە مەیدانێ.

وەللا بابە خراپ نیە! ← (بە نیشاندانی سەرسوورمان) برۆ بابە!.

٦٧٣٤ 3953- **وەمالآن چوون، مالێك كە بۆ ژیان رێكوپێك كرابێ:** جێگای ژیانیان بەراستی وەمالآن دەچێ- هیچ شتێکی گران قیمەتو مۆدپەرستانەی لێ‌نیە کە بۆ خۆڕانان لە لای خەلك بێ.

٦٧٣٥ 1291- **وەهۆش هاتنەوە:** کاتێك وەهۆش هاتەوە، بۆ چرکەیەك نەیدەتوانی دەوروبەری خۆی بناسێتەوە.

٦٧٣٦ 1284- **وەهۆش هاتنەوە، هۆش هاتنەوەبەر:** شوکور بۆ خودای گیانە، ئەوە وەهۆش دێیەوە، دەزانی دڵت لە خۆ بۆوە؟
← فکر، یان بیر، لە وەزعی خۆ کردنەوە.

٦٧٣٧ 4816- **وەهۆش هاتنەوە، یان هێنانەوە:** پاش عەمەل، چەندی پێدەچێ وەهۆش بێتەوە.

٦٧٣٨ 713- **وەهۆش هێنانەوە:** جۆرج لە گەرمان لە هۆش چوو، بەلآم هەر زوو وەهۆشیان هێناوە.
وەهەدەف کەوتن ← لە هەدەف دان.

٦٧٣٩ 4414- **وەهەناسە برکە کەوتن، بە هەناسەبرکەوە قسەکردن:** کابرای پەیك/ پەیام هێنەر بۆ حەسانەوە دانیشتو بە هەناسە برکەوە داستانە خەماوی‌یەکەی گێرایەوە. ● کابرای لە حالی مردن دا، بە هەناسە برکەوە ئاخرین ئارەزووەکانی دەربڕی.

٦٧٤٠ 512- **وەهەوا خستن، بەرزکردن ( بەرەو ئاسمان ):** مووشەکی تایلۆ سەعاتی ۱۰ی بەیانی (بەرەو ئاسمان) بەرزدەکرێ. ● پیاو ناتوانێ لە هەستو بیری ئەو سێ کەسە بگات کە (بەرەو ئاسمان) بەرز دەکرێن.

٦٧٤١ 6606- **وێچوون، چوونەوە سەر، کالآنەوە:** "لە کار کردن خۆشت نایە/ پێت خۆش نیە کار بکەی، مەگەر نا؟"، "نەخێر، چوومەوە سەر تۆ (= وەتۆ دەچم).
← خوێندنەوە دەگەڵ.

٦٧٤٢ 470- **وێ چوون:** خوور رەوشتی تێنسی ویلیام - هیچ وە خوور رەوشتی ئەو کەسانە ناچێ کە لە چیرۆکەکانی‌دا هێناونی. ● تونیفۆرمی فەرانسەوی‌یەکانو ئۆنیفۆرمی چینی‌یەکان بە زەحمەت وێك دەچوون.

٦٧٤٣ 2708- **وێخشان:** گوللەکە لە دەرەجەی سەرشانی سەربازەکە خشاو وەدارێکی لەو نزیکانە کەوت.

٦٧٤٤ 3909- **وێران بوون، تێك رووخان، لە نێو چوون:** بەشی زۆری ناوچەی سنعەتیی باکووری فەرانسە وێران بووە.

وێدان ← بە نەمانەتدان.
وێران بوون ← تێك رووخان.
وێرانکردن ← لەنێو بردن.
وێرزان ← مەزاجیم بوون.
وێرزین ← تووشی (نەخۆشی) بوون.

٦٧٤٥ 2887- **وێزیتۆری کردن، چوونە چەرچیایەتی، سەفەرکردن بە مەبەستی بازرگانی:** بەداخەوە ناتوانی مەردیری شەرکەت ببینی، چونکە بەمەبەستی بازرگانی بە سەفەر چۆتە ئورووپا.

٦٧٤٦ 1937- **وێژنگدان، چۆرت لێدان، خەونووچکە بردنەوە:** لە نیوەی پەردەی دووهەمی شانۆکەدا، هەستم کرد کە وێژنگان دەدەم.

٦٧٤٧ 1835- **وێژنگ دانو خەو لێکەوتن، خەو بردنەوە:** دوای فراوینێکی تێرو تەسەل، خەوبردێوە.

٦٧٤٨ 273- **(بە هەموو توانەوە) وێستان، هەوڵدان:** ئەو بە هەموو توانایەوە هەوڵ دەدا کە هەرچی بیەوێ لە شەریکەی بستێنێ بەلآم هیچ نەدا بە شەرکەت.

٦٧٤٩ 5325- **وێستان، داوا کردن:** ئەرتەش بۆ تەیار کردنی قەتاری باروبنە، داوای ئەسپی لە جووتیاران دەکرد.
← پرسیار کردن، خەرج هەلگرتن.

٦٧٥٠ 1212- **وێکەوتن، لێکدان، دەمم کردن، تەسادوف کردن، خۆ لێکدان:** لەسەر چوارڕێیانێك ماشێنەکەیو پاسێك خۆیان لێکدا.
وێکنان ← بێدەنگبوون، چوونەوە دەقاپیلکی خۆ، بێدەنگبوون (زاراوەی لاتی) بەس کردن، تەواوکردن.
وێك هاتن ← پووچانەوە.
وێکەوتن ← لێدان، خۆپێدادان دەگەڵ.

٦٧٥١ 5162- **وێکەوتن (بە تۆپەڵە):** بارانی وردکەو گاشە بەردان زۆر بە توندی وەبانی پەناگاکە دەکەوت.
وێك هێنان ← تەنگ کردنەوە.
وێکی نێ ← بێدەنگ بە.
وێنە نەبوون ← نەبیستران.

٦٧٥٢ 3132- **(لە پڕ) هاتن، کتوپڕ پەیدابوون، لەنەکاو سەرو کەللەی کەسێك پەیدا بوون:** ئەو بە ئاشکرایی نارەحەت ببوو لەوەکە منداڵەکەیان لە نەکاو (لەدایك) ببوو. ● راست ئەو دەمەی کە خەریك بووین هەموو مەسەلەکان بە خۆشی چارەسەر کەین، لەنەکاو سەروکەللەی پەیدا بوو.

٨٧٥٢ 7083- (ورده ورده) هـاتن، دلـۆپ دلـۆپ ڕژان: چـاوەدێرانی هـەڵبژاردن یـەك یـەك هـاتوونو چـاوەروانی گەیشـتنی سندووقەکانن.
٨٧٥٤ 1123- هـاتن (لـە ڕێگـای نزیکـەوە): سـبەینێ بـۆ لای نێوارە چەند میوانێکمان دەبێ. ئەگەر کارت نیە، تێوەش وەرن (= تەشریـف بێنن).
٨٧٥٥ 1127- هـاتن، سەردان، سەرلێدان (لـە کەسێك یـان لـە جێگایەکەوە زۆرتـر لـە نێـو ڤـارێکدا): زۆرمـان پـێ‌خۆش بـوو ئەمشەو بێێنو سەرێکتان لـێ‌بدەین.
٨٧٥٦ 1119- هاتن، بۆهاتن، روو تێکردن: هـەتا بـەخت رووی تێ‌دەکرد، دەچوو بۆ لەندەن. "کچەکـەت هێشـتا مێردی نـەکردووە؟"، نـا، هـەروا چـاوەروانی هـاتنی خوازێینی‌کەرێکی باشە.
٨٧٥٧ 4710- (وەك سێلاو) هـاتن، هاتنـەوە، رووکردنـە ....، شـالاو هێنان: لە مانگـەکانی هـاوین جیهانگـەردان وەك سـێلاو روویان لە لەندەن کردبوو. ● تەماشاچی‌یەکان بە شالاو لـە ستادیۆم وەدەر کەوتن.
٨٧٥٨ 409- هاتن (لە ڕێگای دوورەوە بۆ دیتنی کەسێك): هەفتـەی رابردوو لە لیدز نەبووم. چووبوومە لیورپـوول بـۆ دیتنـی/ سەردانی دایلەو باوکم.
٨٧٥٩ 6518- هاتن (بە مێشك دا یان بە فکردا): لەو کاتـەدا دوو ئیمکان بە مێشکم داهـاتن. یـەکیان ئـەوە بـوو کـە لـە هەموو ئەو ماوەیەدا ئیمەی بە لاڕێ دابردووە.
٨٧٦٠ 5456- هاتن، هیـتران (بـە پـێزەوە): ئەگـەر بـەم پـێزو ژێستەوە لە نێـو ماشـینەکەمان دابـان بینـن، نرخـەکان دەبنە سـەر/ گرانمان پێ‌دەفرۆشن.
٨٧٦١ 7164- هاتن، حازر بوون، کۆبوونەوە: حەشـیمەتێکی زۆر بۆ پێشوازی کردن لە میوانەکانی شا هاتبوون.
٨٧٦٢ 7193- هاتن، پەیدا بوون، گەیشتن، سەروکەللە ... پـەیدا بوون: سەرەنجام پەیدا دەبێ‌و ئەگەر هەتا سبەینێ نە گاتـە ئێرە، دەپرسین بزانین چ بووە.
٨٧٦٣ 7059- (بە هەنگاوی سەنگینەوە) هاتن، رابـردن و هاتنـە ژوور، رۆیشتن: کابرای کرێکار بە جانتایەکی پڕ لە سێرك لە سـەر شانی، بە هەنگاوی سەنگین وەژوور کەوت.
٨٧٦٤ 1334- هـاتن (بـۆ لـەندەن یـان بـۆ بـاکووری بریتانیـا): سـالێکی دی ئەگەر هاتی‌یە بریتانیا، وەرە بۆ ئێدین برۆیە.
٨٧٦٥ 5896- هـاتن، پـەیدا بـوون: بـۆ نـانی ئێوەڕۆیـەو، هەروەها بۆ نانی شەویش جێگایان بـۆ راگرتبـوو. بـەڵام، پەیدای نەبوو/ نەهات.
٨٧٦٦ 7535- (بە گەرمـەگەرم) هـاتن، رۆیشتن، تێـهەوین: تـاقمێك فرۆکەی شەرکەر زۆر نەوی‌و بە گەرمە گەرم بەسـەر جێگـای سانو ڕێژەدا ڕۆیشتن.
٨٧٦٧ 5447- هـاتن، گەیشتن (پـەکەیەر زۆر)، بـە لێشـاو بەسـەردا رژان: لەو ڕۆژەوە کە بانگەوازەکەیان بلاو کردۆتەوە، چەندەو حەواڵەی پۆستی‌و پارەی نەقد بە لێشاو بۆمان هاتووە.
٨٧٦٨ 211- هاتن (لە فاسیلەیەکی زۆر کورتەوە): ئەگـەر وەخـت هـەبوو، وەرە هۆدەکـەی ئێمـە، "زۆر باشـە، هـەتا نیـو سەعاتی دیکە دێم".
٨٧٦٩ 1271- هاتن، (لە پڕ، کتوپڕ) پـەیدا بـوون: راسـت ئـەو کاتەی دەیانەویست، پەیدا بوو.
٨٧٧٠ 1279- (وەك کۆچەر) هاتن (بۆ بریتانیا، ئـەمریکا): باپـیرە گەورەکانمان دەگەڵ نورمانەکان هاتن (بۆ ئەمریکا).
٨٧٧١ 3304- هاتن بەرەو ....، بەرەو شتێك هاتن: بـە تایبـەت لە تەم‌و مژان، یان بە شەو، فرۆکەیەکی کە نزیـك دەبێتـەوە، بەرەو ئـووری رادار دێ‌و بـەم‌جۆرە بـەرەو ئـەو جێگایـەی دەیەوێ بچێ، ڕێنوێنی دەکرێ.
٨٧٧٢ 4482- (خێرا) هاتن‌و رۆیشتن/ چوون: کرێمان لە دەنگـی مشکان دەبوو کە لە هۆدەی زۆر شەوانی لە سەرمان خێرا خێرا دەهاتن‌و دەچوون.
( لە ئەگەل) هاتن ← سەرزەدە هاتن، خەریك بـوون، وردە وردە هاتن، گەیشتن، وەدەرکەوتن.
هاتن لە جێگایەکدا ← خەلکی جێگایەك بوون.
٨٧٧٣ 1208- هاتنە بازار: لە ئیتالیا زۆر زووتر لە بـاکووری ئورووپا تەماتە دێتە بازارێ.
٨٧٧٤ 277- هاتنە بازار (ی میوە ...): ئـەرێ کاکـە، هلـووت هەیە؟ "نا، کاکە، بەداخەوە هێشتا نەهاتۆتە بازاری".
٨٧٧٥ 6442- هاتنەبەرچاو: ئاغـای کنیـك بـۆ خـەلکی غەریبە نەك وەك پیاوێکی یەکجار مەزهەبی بەڵکوو وەك رێبەرێکی رووحانی دێتـە بـەرچاو کـە بـۆ پێـك هێنـانی رێفۆرمی کۆمەڵایەتی هەوڵ دەدا.
٨٧٧٦ 3235- هاتنە بـەرچاو، وەدەرکـەوتن، هیـتران: بەلـەمێکی دوو دەکەلی لە ئاسۆ وەدەرکەوت.
هاتنە بەرچاو ← وەدەرکـەوتن، وەژوور کـەوتن، چـاو بـە شتێك کەوتن.
هاتنە بەردەست ← لە دەسترەس دابوون.
٨٧٧٧ 2955- هاتنە بەردەست: بایی زیاتر لـە یـەك میلیـۆن پۆند ئەڵماس هاتـە بەردەسـتی‌و ئـەویش چـل میلیۆنـی پاشقول دا.

٦٧٧٨ 2640- **هاتنە بەر هەنگەری چاو پان بەر سەودای گوللە، دەست پێراگەیشتن:** وردە وردە کەوتینە بەر هەنگەری تۆپخانەی دوژمن.

هاتنەبن ← کەم هێنان.

٦٧٧٩ 2307- **هاتنە پێش، روودان:** شەرو هەللای مندالەکان نارەحەتی ناکا. زیقەزیق‌و شەرەمستیان زۆر بە سانایی لە دەوروبەری رووددەدەن‌و باشی بۆدانایە.

٦٧٨٠ 2524- **هاتنە پێش، چوونە پێش، چاک بوونەوە، بەرەو باشتر بوون رۆیشتن:** زۆر باشە خانی... باش بەرەو پێش دەچی. حەبەکانت بخۆو دوای مانگێك وەرەو چاوم پێت بکەوێ.

٦٧٨١ 1341- **هاتنە پێش، پەیدا بوون:** ئێستا هیچ جێگایەکی خالیمان نیە، بەلام هەر جێگایەك پەیدابێ، ئاگادارتان دەکەم.

٦٧٨٢ 1359- **هاتنە پێش، هاتنەبەر هەنگەری چاوان، کەوتنە بەر بوونی ئەفەرنگ، نزیك بوونەوە:** تاقمێکی گەشتی هاتە بەر هەنگەری چاوان.

٦٧٨٣ 1509- **هاتنە پێش، لەنزیك بوونەوە، (کاتی بریارێك، لێك جیابوونە، ئاشکرابوونی ...وهتد):** سال رادەبرێ‌و بۆسەیتی وان رۆژی تەقاعود بوونی بۆیەزیانە لێی‌نزیك دەبۆوە.

٦٧٨٤ 7358- **هاتنە پێش (بۆ یاریدەدەران):** هەموو ئەندامانی بنەمالە بە پێشنیاری یاریدە دانەوە هاتنە پێش.

٦٧٨٥ 1166- **هاتنە پێش، خۆناساندن:** پۆلیس لەو کەسانەی شاهیدی رووداوەکە بوون داوا دەکا بێن‌و خۆیان بناسێنن‌و یارمەتی بە لێکۆلینەوەکە بدەن.

٦٧٨٦ 4632- **(لە یاریی کریکتدا):** هاتنە پێش بۆ لێدانی تۆپەکە لە نۆبەی خۆیدا.

٦٧٨٧ 6340- **هاتنە پێش، ئامادەیی خۆ راگەیاندن:** کاتێك بانگەواز بۆ یارمەتیدان بە بەرنامەی بە هاواری خەلکەوە گەیشتن بلاو بۆوە، چەند کەسێك هاتنە پێش.

هاتنە پێش ← بە وجوود هاتن، روودان، نزیك بوونەوە لە، هاوکاریکردن ( بە پوول، پارە).

هاتنە نێو ← گرتنەوە.

٦٧٨٨ 1619- **هاتنە خوار، کونترۆل کردن:** بە هۆی بلاوبوونەوەی ئەو هەوالە کە هەموو پشووداێنێك هەلوەشاونەوە، وورەی ئەندامانی حیزبی هاتە خوار.

← زالبوون بەسەر... دا.

٦٧٨٩ 2146- **هاتنە خوار، کەم بوونەوە:** لەم وەرزەی سالدا ژمارەی تەماشاچیی جێژنەکان زۆر کەم بۆتەوە.

٦٧٩٠ 2147- **هاتنە خوار (ی چۆنیەتیی شتێك):** چلۆنایەتیی چێشتی مالێ بە رادەیەکی بەرچاو هاتبۆوە خوارێ‌و، لە بۆیە کە چەند جاران بۆ نانخواردن دەچووینە چێشتخانەی.

٦٧٩١ 2105- **هاتنە خوار (بە سەرەو لێژکەیەکی رۆ دا):** لەوبەری باخچەکە، سەرەولێژییەکی رۆدی لێرەوارەکە بەرەو لێواری چۆمەکە دێتەخوارێ.

٦٧٩٢ 257- **هاتنە خوار، شکان (ی نرخەکان) کەمبوونەوە:** لەو کاتەوە کە بۆ کەم کردنەوەی رادەی مەسرەف ئیقداماتێکی تازە هاتۆتە کایەوە، رادەی بەرهەم هێنان هاتۆتە خوار.

٦٧٩٣ 376- **هاتنە خوار، کشانەوە:** کاتێك دەریا کشاوە، دەتوانی بچی بۆ کێوی میشل بێ ئەوەی لاقت تەڕ بێ.

٦٧٩٤ 5446- **هاتنە خوار، هەلرژان:** دەگەل بەرز بوونەوەی دەنگی کابرای، سێلاوی فرمێسکان بەسەر رووەمتیدا هاتە خوار/ هەلرژا.

٦٧٩٥ 6433- **هاتنە خوار، رژان:** ئارەقە بە بەدەنی کرێکارانی کانگا ژێرزەوییەکاندا دەهاتە خوار. ● لە دیوارەکانی ژێرخانەکە ئاو دێتە خوار.

٦٧٩٦ 1847- **هاتنە خوار، کەم بوونەوە، دامرکانەوە:** کامران بارێشکێکی هاتێ‌و، وادیار بوو نارەحەتییەکەی دامرکاوە.

٦٧٩٧ 6598- **هاتنە خوار لە کەمێنان، کەم بوونەوە:** چاوەروانی ئەوەین کە لەم وەرزە لە سالدا رادەی بەرهەم لە کەمێ بدا.

٦٧٩٨ 6833- **هاتنە خوار، کەم بوونەوە، لە کەمێنان:** دوای چوونە سەری نرخەکان، لە رادەی "تقاضا" کەم بۆتەوە.

٦٧٩٩ 4715- **هاتنە خوار، رژان:** دوای چەند دەورە لە پێشبرکێی غاردان، ئارەقە لە سەرانسەری بەدەنی دەوەندەکان دەرژا.

٦٨٠٠ 1162- **هاتنە خوار:** هەرگیز پێم وانەبوو ئەوە ئەدە بێتە/ خۆی بێنێتە خوار کە بۆ کاروباری خۆی داوای رێنوێنی لە من بکا.

٦٨٠١ 1079- **هاتنە خوار لە:** بۆ پشیلەی بۆهەلچوون بە دارێ لە هاتنە خوار هاسانترە.

٦٨٠٢ 2111- **هاتنە خوار لە:** رادەی بەرهەم هێنان لەم سالدا لە بەراورد دەگەل پار دێتەخوارتر.

٦٨٠٣ 3727- **هاتنە خوار لە سەر، سەر نەوەهێنان لە:** کلاوەکەی با بردی‌و لە سەر لۆرییەك هاتە خوار/ گوەسارە. ● پاش

چەند ساڵان خوولانەوە بە دەوری دنیادا، سەرەنجام لە شوغڵی دەرس گوتنەوە لە شاری خۆی سەری دەرهێنا.

٦٨٠٤ 2457- (لە پەیوەندی لەگەڵ منداڵان)، **هاتنە خوارلە سەرکورسییەکانەوە**: منداڵەکان لە سەرانسەری کاتی ناهەواردندا بێدەنگ بوون و تەنیا قسەیەکی کە کردیان ئەوە بوو کە دەیانەویست لە کورسییەکانیان بێنە خوار/ دابەزن.

هاتنە خوار ← دابەزین، کەوتن، کەم بوونەوە، دامرکانەوە، نیشتن، تێك رووخان، خراپ بوون.

٦٨٠٥ 5952- (لە هەڵپەرکێ) **هاتنە دەرو دانیشتن**: وەرە با ئەو خولە دانیشین، دەکرێ؟ بە داخەوە، هەڵپەرکیی تانگۆ باش نازانم.

٦٨٠٦ 1248- **هاتنەدەر( لە زیندان)، ئازاد بوون**: جان بە سێ ساڵان مەحکووم بووە، بەڵام رێدەچێ بە هۆی کردەوەی باشی زووتر ئازاد بێ.

٦٨٠٧ -

٦٨٠٨ -

٦٨٠٩ 1247- **هاتنە دەر، دەست لە کار کێشانەوە، مانگرتن**: کرێکارانی بارنەندازەکان تێکرا دەستیان لە کار کێشاوەتەوە.

٦٨١٠ 2558- **هاتنەدەر، دەرباز بوون، چوونەدەر**: دۆزینەوەی کورسییەکی باش لە تیاتر کارێکی هاسانە، بەڵام ئەگەر بتەوێ، کەمێك زووتر بچییەدەر ئەوەندە هاسان نییە. ● پۆلیسەکان ئەوە دەگەنێ. باشتر وایە بۆی دەرباز بەهنە خێراش.

٦٨١١ 3690- **هاتنەدەر، دەرپەڕین**: چەندین دانەی کورە چکۆلەکە لە دەعمەکەدا دەرپەڕین.

٦٨١٢ 365- **هاتنە دەر(ی مانگ، رۆژ لە پشت هەوران)**: ئێستا کە تاوەکە وەدەرکەوتووە/ هاتۆتە دەر، دەتوانم کەمێك بە باغچەی رابگەم و ئەتۆش لەسەر ئەم کورسییە راحەتە دانیشە.

٦٨١٣ 384- **هاتنە دەر**: زۆر باشە، وردە شووشەکە لە قامکت هاتە دەرو ئێستا دەتوانی بچی کەمێکی تایبەتی لێدەی.

٦٨١٤ 6129- **هاتنەدەر، دەرپەڕین (بە شاڵاو یان بە لووزەوە)**: قەتاری سەیران گەیشتە نێزگەی و دەیان منداڵە قوتابی بە لووزەو/ بە شاڵاو دەرپەڕینە سەر سەکۆکە.

٦٨١٥ 6351- **هاتنە دەر(بۆ شەر کردن)**: "وەرە دەرو پێم بڵێوە چت گوت!".

٦٨١٦ 6367- **هاتنە دەر**: جووتە لاقێکم چاو پێ کەوت کە لە ژێر بەتانییەکە هاتبوونە دەر.

٦٨١٧ 7084- **هاتنەدەر(وەك هەودایەك)**: لە نزیك گوێی راستی هەودایەکی باریکی خوێن دەهاتە دەر.

٦٨١٨ 5766- **هاتنە دەر، وەدەرکەوتن**: [حەزرەتی] داوود بۆ بەرەنگاربوون دەگەڵ گولیات، ( لە چادر) هاتە دەر.

٦٨١٩ 839- **هاتنەدەر، خۆ رزگار کردن**: لە پڕ دەروازە کراوەو حەشیمەتێکی تووڕە لە حەوشەکە وەدەرکەوتن.

٦٨٢٠ 620- **هاتنەدەر، لێوەدەرکەوتن، لێهاتن**: لە پڕ سرووەکرانێکی زۆری لە لاتێو لەتەری هاتن.

٦٨٢١ 4356- **هاتنەدەر، لێهەون**: لە قەڵشتێکی چکۆلە لە جەعبەی مرتووەکە رۆنێکی رەش دەهاتە دەر.

٦٨٢٢ 3446- **هاتنەدەر لە، وەدەرکەوتن لە، دزانەدەر لە**: لە پەنجەرەکانی قاتی سەرووی خانووەکە دووکەڵێکی رەش دەهاتە دەر.

٦٨٢٣ 2799- **هاتنەدەر لە زانستگە**: (لەکۆتایی خولێك یان بە یەکجارییەو دوای تەواوکردنی دەرس خوێندن).

هاتنەدەر( خێرا) ← دەرپەڕین، دەرکردن (لە خەت)، لەبەر دەرکەوتن، دەرکەوتن، تێپەرکردن، هەڵتروکان.

هاتنە دەر ← هەڵکەندران، چوونەدەر لە.

هاتنە دەست ← روونبوونەوە.

هاتنە دەست... ← تێگەیشتن لە.

هاتنە روو ← دەرکەوتن.

هاتنە رەداپە ← مل راکێشان بۆ.

هاتنە ژوور ← (بە سانایی) چوونە ژوور، چوونە ژوور.

٦٨٢٤ 1187- **هاتنە ژوور، وەژوور کەوتن**: دەرگاکە کرایەوەو جیا وەژوور کەوت.

٦٨٢٥ 524- (بە هەراو هوریا) **هاتنە ژوور، وەژوور کەوتن**: لە سەر رێگای ماڵێ، بۆ هێندێك گەپو گاڵتە، جیا بە هەرا هەرا لێمان وەژوور کەوت.

٦٨٢٦ 1867- **هاتنەژوور گەیشتنە جێ**: راست ئەو کاتەی گەیشتمە جێگای کونترۆلی بلیتان، قەتاری لەندەن دەگەیشتنە نیستگە.

٦٨٢٧ 831- **هاتنە ژوور(لە پڕ)، وەژوور کەوتن، لە ئەکاو وەژوور کەوتن**: لە نەکاو ئاغای شاهز بە کراسێکی قۆڵکورتەوە لە دیوی میوانان وەژوور کەوت.

٦٨٢٨ 6420- **هاتنە ژوور، وەژوور کەوتن (بە هەراو هوریا)**: راست ئەو کاتەی کە پێمان وابوو مەسەلەکەمان بە جوانی

جێبەجێ کردووە، چان بە هەمراو هوریا وەژوور کەوتەو دەیگوت دەنگ وەرگرتنەکە دروست نەبووە.

٦٨٢٩ 2478- **هاتنە ژوور، چوونە ژوور:** دزەکان بە ڕێگای نەغمەیەکیدا کە بۆ ژێر ئەرزی دیوەکە لێیاندابوو، چووبوونە ژوورێ.

٦٨٣٠ 441- **هاتنە سەر، هەستان، گەیشتنە:** ناوی چۆمەکە هەستاوە* گوڵە بەرزۆکان گەیشتوونەتە سەر چوارچێوەی پەنجەرەکان.

٦٨٣١ 5430- **هاتنە سەر ئاو، وەسەرئاو کەوتن، ئاشکرا بوون، وەدەرکەوتن، ڕوون بوونەوە:** کە کەشتییەکە هەستاوەو وەسەر ئاو کەوت، شەپۆلی گەورە گەورە ساز بوونو بە هەموو لایەکدا بڵاو بوونەوە. * هێندێك لایەنی ناحەزی ئەو مەسەلەیە وردە وردە خەریکن وەدەردەکەون.

٦٨٣٢ 1340- **هاتنە سەر (ئاوێ)، وەسەر ئاوێ کەوتن:** وەك مەلەوانێك نەفەس دەکێشێ کە بۆ نەفەس هەڵکێشان دێتەوە سەر ئاوێ.

٦٨٣٣ 2466- **هاتنە سەر ئەسڵی باسەکە:** کاتی ئەوە هاتووە کە ژیلوان دەست لە تیئۆری ڕستن هەڵگرێو بێتە سەر ئەسڵی باسەکەو...

٦٨٣٤ 2467- **هاتنە سەر ئەسڵی مەسەلەکە:** هیوادارم نارەحەت نەبی ئەگەر یەکراست بێینە سەر ئەسڵی مەسەلەکە. چونکە دەبێ بگەمە قەتاری سەعات چواری.
هاتنە سەر ← لێ‌زیاد کردن.
هاتنە سەر بابەتێك ← کەوتنە سەر.

٦٨٣٥ 1237- **هاتنە سەر بەرزەك:** کاتێك لورێنس ئولیویر بۆ یەکەم جار هاتە سەر بەرزەك، تەماشاچییەکان دەستیان بە چەپڵەڕێزان کرد.

٦٨٣٦ 1348- **هاتنە سەرتا ... هەڵکشان هەتا ...:** ئاوەکە هەرگیز ئەوەندە هەڵناستێ بگاتە جاددەی، هەرچەند (لە کاتی ئاسایی‌دا) ئاوەکە چەند پێیەك لە جاددەکە لە خوارتر نیە. * ئاوی حەوزەکە دەگاتە چەناگەم.

٦٨٣٧ 1352- هاتنە سەرتا...، گەیشتنە، هەڵکشان هەتا.
هاتنە سەر حوکم ← بە دەسەڵات گەیشتن.

٦٨٣٨ 1211- **هاتنە سەر دنیا، لە دایك بوون:** یەکێك لە ڕوانگەکانی لایەنگرانی پێشگری کردن لە منداڵ بوون ئەوەیە کە ڕێگا بدرێ تەنیا ئەو منداڵانە بێنە سەر دنیا کە پێویست بن.
← هاتنە مەیدانێ.

٦٨٣٩ 1320- **هاتنە سەر ئەسڵی بابەتەکە:** وەزیری نێوخۆیی هەم توندو تیژو هەم بەشێوەیەکی زیرەکانەو وردبین بوو. هەر بۆیەش بێ سێ‌ودوو لێکردن هاتە سەر ئەسڵی بابەتەکە.

٦٨٤٠ 1128- **هاتنە سەر ڕێ، موافەقەت کردن، ڕەزایەت دان:** جارێ چیا دژی بەوورای ئیمەیە، بەڵام سەرەنجام دێتە سەرڕێ.

٦٨٤١ 6563- **هاتنە سەرکار، دەوڵەت پێك هێنان (بە هۆی سەرکەوتن لە هەڵبژاردندا):** حیزبی کرێکار بە هۆی نارازی بوونی خەڵك لە چوونە سەری نرخەکان، زۆر بەهاسانی هاتە سەر کار.
← دەسەڵات بەدەستەوە گرتن.
هاتنە سەر هەتا ← گەیشتنە....

٦٨٤٢ 3004- **هاتنە شێت بوون بە هۆی ئاڵۆسکاوییەوە، کاری پەکەوتن زۆر ئاڵۆسکاو بوون...:** کاتێك گەڕامەوە دیتم دایکم وەختە شێت بێ؛ سۆبەکە کوژابۆوە، منداڵەکە دەگریا، چیا چۆکی خۆی بڕیبووەو، بۆی هەبوو میوانەکان هەر ئێستا، یا تاوێکی دیکە بگەنێ.

٦٨٤٣ 1204- **هاتنە کایەوە:** کاتێ مەسەلەی مانو نەمانی نەتەوەیەك دێتە گۆڕێ، هێزی یەکجار جۆراوجۆر دێنە کایەوە.

٦٨٤٤ 290- **هاتنە کایەوە، بەرێوەچوون (ی یاسا، ڕێسا...):** ڕیسایەکی تازە بۆ خاوەن هوتێلەکان هاتۆتە کایەوە.

٦٨٤٥ 1201- **هاتنە کایەوە، بەڕێوەچوون:** لە پێشرەفتەی دەگەڵ ڕاننەدی ماشێنە گەورەکاندا بەم زووانە یاسایەکی نوێ بەڕێوە دەچێ.

٦٨٤٦ 430- **هاتنە گۆڕێ، لە گۆڕێدا بوون:** لە کۆبوونەوەی داهاتوودا، سیاسەتی خانوو دروست کردنی شوورا بۆ باس لەسەر کردن دێتە گۆڕێ.

٦٨٤٧ 1514- **هاتنە گۆڕێ:** لە ژاپۆن دەچوومە هەر کوێ، ناوی هارولد پالمر دەهاتە گۆڕ.

٦٨٤٨ 655- **هاتنە گۆڕێ، هێنانە گۆڕێ:** واباشترە کەمێك قسان بکەین! مەسەلەکە سبەینێ لە شوورا دێتە گۆڕێ.
← چوون بۆ دادگا.

٦٨٤٩ 1167- **هاتنە گۆڕێ:** مەسەلەکە لە کۆبوونەوەی دوێنێ ئێوارێ وەدواخرا، بەڵام لە کۆبوونەوەی داهاتوودا دێتەوە گۆڕێ.

٦٨٥٠ 1336- **هاتنە گۆڕێ:** مەسەلەی کێشانی "مراد محمد" لە کۆنفرانسی داهاتوودا دێتە گۆڕێ.

٦٨٥١ 1337- هاتنه گۆڕێ (له دادگا)، حازر بوون (له دادگا): رۆژنامه ئەو پەروەندانەی کە دەبوو رۆژی دواتر لە دادگا بێنه گۆڕێ راگەیاندبوو.

٦٨٥٢ 2157- هاتنه گوێ، بیستران، گوێ لێبوون: کاتێك چووینه نێو مەعبەدەکەوە، دەنگی سروودێکی زۆر سەیرمان گوێ لێبوو.

٦٨٥٣ 1241- هاتنه مەیدان، خۆ گەیاندنه جیهانەوە، هاتنه سەر دنیاوە: کاتێك منداڵی نۆبەرمیان هاته سەر دنیاوە، ناچار بوون شێوەی ژیانیان بە تەواوی بگۆڕن. ● چەندین سەعات دوای ئەوە کە خەزێنەکەیان بریبوو خۆم گەیاندە ڕێ/ گەیشتمە ڕێ....

٦٨٥٤ 2481- هاتنه نێو، پێویست بوون بە، خۆ سەپاندن: مەهێڵە کامران بزانێ خەریکی دروست کردنی ئەنجوومەنێکی تازەین - هەوڵ دەدا ژنەکەشی بەسەرمان دابسەپێنێ و دوو بە دوو بەرێوەی بەرێ.

٦٨٥٥ 5602- (بە حەزلێکردنەوە، بە جەنجاڵکردنەوە) هاتنه نێو بەسێك، وتووێژێك: راست ئەو کاتەی پێمان وابوو باسەکە شۆڕو زۆڵی لە دەست داوە، ئاغای هاگر هاته نێوێ.

٦٨٥٦ 7277- هاتنه نێو خەڵك، بە نێو خەڵکدا بە پێیان گەڕان: خەڵکی زیلاندی نوێ بەوە شانازی دەکەن کە وڵاتەکەیان یەکەم وڵات بوو کە لەوێ یازدە ساڵ لەمەوپێش مەلەکەی بریتانیا بە پێیان بە نێو خەڵکدا گەڕا.

٦٨٥٧ 601- هاتنه نێو قسەی...، بڕینی قسەی...: یەکێك لە کرێکارەکانی کانگای ژێرزەوی هاته نێو قسەکانمانەوە گوتی: "چمان بەسەر دێ؟".

٦٨٥٨ 1578- هاتنه نێو قسان: جان بە دەنگە ناخۆشەوە قژەکەیەوە هاته نێو قسەکانی.
→ پەڕینه نێو قسان، پەڕینه نێو قسەی کەسێکەوە.
هاتنه نێو → خزینه نێو، لەبەرچاو گیران، ناونووسی کردن لە.
هاتنەنێو کارێکەوە → دەست بەکار بوون.

٦٨٥٩ 1236- هاتنه نێو کایەوە: یاریزانێکی تازە هاتە نێو کایەوەو ....

٦٨٦٠ 2494- هاتنه نێو لیستەی رەشی کەسێکەوە، لەبەر چاوی کەسێك کەوتن: هەرکە گوتم لایەنگری حیزبی کرێکارم لەبەرچاوی خالی ... کەوتم.

٦٨٦١ 4232- هاتنه نێو مەیدانی سان و رێژە: لە سەرەتای رێژمیەکی تەشریفاتیدا، گرووپان یەکەمی هەنگ دەستووری هاتنه مەیدانی واحیدەکەی دەدا.

هاتنه یارمەتیی کەسێك→ یارمەتی دان بە.
هاتنەوە (دەگەڵ مرشەخساتێك) → دەگەڵ مرشەخساتێك هاتنەوە.

٦٨٦٢ 1283- هاتنەوە، گەڕانەوە(ی بەهار، جێژن، وەرز)، دووبارە پەیدا هاتن، دووبارە بەرێوەچوون، گێڕان: کۆنفرانسی سەرۆك وەزیرانی وڵاتانی قازانج هاوبەش مانگی داهاتوو (دووبارە) بەرێوە دەچێ.

٦٨٦٣ 1260- هاتنەوە، بوون بە: کاتێك زانیان کورەکەیان لە تاقیکاریدا بۆتە ئاخرین کەس، زۆر بە پەرۆش بوون.
→ بوون بە، گەڕانەوە.

٦٨٦٤ 1176- هاتنەوە، بوون بە (لە وەرزشدا): لە بەشی زۆری رێگایەدا، لە پێش پێشەوە بوو، بەڵام لەبەر رەجلی لێبڕاو بوو بە ئاخرین کەس/ ئاخرین کەس هاتەوە.
هاتنەوە بەرچاو → وەبیر هاتنەوە.
هاتنەوە پێش → چاکبوونەوە.

٦٨٦٥ 2909- هاتنەوە دەگەڵ، لێك هاتن، هاوئاهەنگ بوون لەگەڵ: ئایا پێت وایە ئەو باڵتۆیە و ئەو کڵاوە لێك دێن؟

٦٨٦٦ 5227- هاتنەوە دەگەڵ، جووت هاتنەوە دەگەڵ، یەکتر گرتنەوە: ئەوەی لێرە دەیانڵێ دەگەڵ ئەو شتانەی لە سەرەتای کتێبەکەدا هاتووە یەکتر ناگرنەوە.

٦٨٦٧ 2261- هاتنەوە دەگەڵ، خوێندنەوە دەگەڵ، جووت هاتنەوە دەگەڵ: ئەو وڵامە نارەحەتت دەکا، یان دەگەڵ سروشتت نایەتەوە؟

٦٨٦٨ 2757- هاتنەوە دەگەڵ، هاوئاهەنگ بوون دەگەڵ: ئەگەر پارەکەی بدەی، ئەنفەزمیەکی زۆر جوان دەگەڵ ئەو ئەنسیکلۆپیدیایە باش دێتەوە.

٦٨٦٩ 2779- هاتنەوە دەگەڵ، گونجان، لەبار بوون بۆ: ئەو دیمەنە بۆ هەڵاوسین لە نێوان رەسمەکانی دایکم بابت زۆر لەبارە.

٦٨٧٠ 3127- هاتنەوە دەگەڵ، جووت هاتنەوە، خوێندنەوە دەگەڵ یەکتر، یەکتر گرتنەوە: کابرای پشکنەر گوتی:" دوو بەشی قسەکانی زۆر باش یەکتر ناگرنەوە، دەنا نا؟ ناچارین سەر لە نوێ پرسیاری لێبکەینەوە.
(جووت) هاتنەوە دەگەڵ → هاو ئاهەنگ بوون دەگەڵ، جووت هاتنەوە دەگەڵ، خوێندنەوە دەگەڵ، باش جێکەوتوو بوون، یەککرتنەوە، سازگار بوون دەگەڵ.
هاتنەوە سەر بابەتێك → گەڕانەوە سەر.

٦٨٧١ 1285- هاتنەوە سەرحاڵ، کەیف ساز بوونەوە: زۆر دڵتەنگە چونکە دایکم بابی ئیجازەی نادەن بچێتە سینەما. بەڵام، زۆر زوو کەیفەکەی ساز دەبێتەوە.

٨٨٧٢/ 7018- **هاتنەوە سەرحاڵ، کەیف ساز بوونەوە، گورج و گۆڵ بوونەوە:** وەرزشێکی زیاترو ئاڵوگۆڕێك لە بەرنامەی خواردنتدا- ئەمە ئەو شتەیە کە بۆ گورج و گۆڵ بوونەوەت/ بۆ هاتنەوە سەر حاڵەت پێویستیت پێیەتی.

٨٨٧٣/ 779- **هاتنەوە سەرحاڵ، کەیف ساز بوون:** بە هۆی نارەحەتی لە وەزعی کارەکەی، زۆر خەمگین بوو، بەڵام کاتێك وەبیری هاتەوە کە بەم زووانە دەچێتە پشوودان، کەیفەکەی ساز بۆوە.

هاتنەوە سەرخۆ ← حەسانەوە، ئارام بوونەوە، خەلو بوونەوە.

٨٨٧٤/ 2580- **هاتنەوە سەرخۆ، وەك خۆ لێ هاتنەوە، خۆ گرتنەوە:** پاش بیوەژنیی سیاەمەندی هەرگیز نەیتوانی لەباری رووحییەوە خۆی بگرێتەوە.

٨٨٧٥/ 1324- **هاتنەوە سەرخۆ، ئاقڵ بوون:** سەبارەت بە هاوکاری نەکردنی جیا دەگەڵمان نارەحەت مەبە؛ هێندەی پێناچێ ئاقڵ دەبێ/ دێتەوە سەر ئەقڵ.

هاتنەوە سەر دنیا ← زیندوو بوونەوە.

هاتنەوە سەر مێشك ← وەبیر هاتنەوە.

٨٨٧٦/ 1319- **هاتنەوە سەر وەزعی ئاسایی، وەخۆی هاتنەوە هاتنەوە سەرخۆ:** نەمدەزانی چەند نەخۆش بووەو چەندە لە وەزعی ئاسایی دەرچووە هەتا ئەو کاتەی لە هۆدەی جوانەو تاوگرەکەت دانیشتەو، وەهۆش هاتەوە.

٨٨٧٧/ 1137- **هاتنەوە کایەوە:** کەسانێك هەن کە پێیان خۆشە لێدانەو کوتان بۆ هێندێك کاری خراپ بێتەوە کایەوە.

٨٨٧٨/ 2447- **هاتنەوە گەڕێ:** دەتوانی دەهو چاوت هێندێك نەشتەرگەری بکەیەو سەرلەنوێ بێیەوە گەڕێ.

← وەگەڕکەوتنەوە، جوور هاتنەوە یان نەهاتنەوە.

٨٨٧٩/ 2837- **هاتوو چوو کردن، سەر بێزویەوێنەکردن:** بریا ئەو منداڵە لەو هەموو سەر بێزەویەوێ داکردنە دەستی هەڵدەگرت. هەر دەڵێی سەگی نێو پێشانگەیە.

٨٨٨٠/ 2737- **هاتوو چۆ کردن، گەڕان، پیاسە کردن، خولانەوە:** کاتێك کە دەبارێ، پیاسە کردن بە سەری رووت کارێکی باش نییە.

٨٨٨١/ 2906- **هاتووچۆ کردن، چوونەدەر، چوونە گەڕان، لەیزەوو لەوێ کردن، وەدەرکەوتن (لە ماڵ):** خۆشحاڵم کە دەبینم باوکت سەرلە نوێ بۆ دەرەوەی ماڵ هاتو چوو دەکا.

٨٨٨٢/ 4384- **هاتووچۆ کردن:** جیا، ئەو هاتووچوویەت تەواو کە، دەڵێی بەبری نێو قەفەزی. قەتار هەتا دەقیقەیەکی دیکە دەگاتێ.

٨٨٨٣/ 4678- **هاتووچۆ کردن:** بەلەمە تایبەتییەکانی ترانزیت هەموو رۆژێ بۆ پەڕاندنەوەی موسافیرو کامیۆنەکانی هەڵگری کاڵای بازرگانی لە نێوان دوو بەندەری هووڵو روتێرەدا هاتووچوو دەکەن.

٨٨٨٤/ 6478- **هاتووچۆ کردن (بە فڕینەوە):** هەرکە بۆ سەرپەرشتیی تیپەکە دیاری کرا، وەك جووچکە فیلدمارشاڵیك /"مهیب الرکن" یەك دەهاتوودەچوو.

٨٨٨٥/ 7261- **(بە نهێنی لەو بەیان لووچیرانە) هاتووچوو کردن، لێهاتن، رۆیشتن:** تاڵمە یاریدەدەرەکان بە نێو قوورو چڵپاوی نێو شەقامەکاندا کە هەتا چۆکیان دەهات هاتووچوویان دەکرد.

٨٨٨٦/ 4292- **هاتووچوو کردن:** ریزیتۆرەکان بێ پسانەوە هاتووچووی شاران دەکەن.

٨٨٨٧/ 850- **هاتووچوو کردن، هەڵسووڕان:** لە حاڵێکدا کاوە خەریك بوو مەشرووبێکمان بۆ سازکا، شەهلا لە ئاشپەزخانە هەڵدەسووڕا.

٨٨٨٨/ 3653- **هاتووچوو کردن بۆ چێکەیەك، خولانەوە:** کاتێك منداڵ بوو، هەمیشە لە نێو بازاڕی دەخولاوە، بۆ ئەوەی کارێکی لاپەرسەنی بدۆزێتەوەو چەند قرانێکی پەیدا کا.

٨٨٨٩/ 2309- **(بە دەستە پاچەییەوە) هاتووچوو کردن:** ژنی خانەخوێیەکە بەو دەستەپاچەییەوە دەهاتو دەچوو، بە نیگەرانییەوە مژی لە سیگارەکەی دەدا.

← خزین، گەڕان.

٨٨٩٠/ 1493- **هاتووچوو کردن و تەقو تۆق گرتنەوە:** بریا کاتێك لە قرتابخانە دەگەڕێیەوە، ئەو هەموو هاتووچوو تەقو تۆقەت نەکردبا.

٨٨٩١/ 312- **هاتووچوو کردن (ی ...):** ئەتۆ کە رانەندەی شیرکەتی بەرێکردنی سادراتی، دەبێ یەکجار زۆر هاتووچۆی گشت بارنەندازە ئەسڵییەکانی وڵات بکەی.

٨٨٩٢/ 2743- **هاتووچووی کەسێك کردن (بە مەبەستی مێرد پێکردن/ خواستن):** زۆر بەداخم کە کچەکەت هاتووچووی پیاوێك دەکا کە لە تەمەنی باوکی دایە.

هارووژاندن ← توورە کردن.

٨٨٩٣/ 1537- **هاوین، کوتان، وردکردن:** ریشەی زەنجەفیل دەبێ باش بکوترێو، جا ئەوجار دەرمەبیاکەی کەن.

٨٨٩٤/ 1533- **هەڵپڕین، ورد کردن، لێکردن:** بەردەکانیان بە چەکوچێکی یەکجار گەورە دەهاڕی.
← وردکردن.

٨٨٩٥/ 6740- **هاسانترین رێگا هەڵبژاردن، ئاسانترین رێگا دیتنەوە:** کاتێک کە دیتی نارەحەتیی میوانەکان هەروا قووڵتر دەبێتەوە، هاسانترین رێگای دیتەوەو پێکێکی دیکەی مەشرووب دا بە هەموان.

٨٨٩٦/ 7398- **هاڕان لە:** کاتێک ماشینەکەت رادەکێشن، گوریسەکەی توند بکێشن، دەنا بۆی هەیە لە تایەرەکانی/ چەرخەکانی پێشەوە بالێ.

٨٨٩٧/ 7485- **هاڵاندن لە، بەستن لە دەوری:** پەرۆیەکی خاوێنی لە دەوری چوکی هاڵاند.

٨٨٩٨/ 4101- **هاڵاوبۆبردن، هێرش کردنە سەر، خۆ پێدادان، هەڵپەلاماردانە سەر:** خەتکێشێکی لەسەر میزەکە پردایەو غاری‌دا سەر کابرای. ● سەگی خاوەن ماڵەکە لە حاڵێکدا ددانی دەچیڕەوە دەبرد خۆی بە کابرای پۆستچی دادا.

٨٨٩٩/ 4283- **هامووشۆکردن، تێکەڵاوی هەبوون لەگەڵ:** دایکو بابی ددانی خێریان بەو کەسانەدا نەدەهێنا کە ئەو هامووشۆی دەکردن.
← گەڕان، هاونشینی کردن دەگەڵ.

٨٩٠٠/ 2642- **هاننان، هاندان:** بە تەواوی روونە کە حیزبی لیبراڵ دەبێ (بۆ زیاتر هەڵسووڕان) هان بدرێ، دەنا لە نێو دەچێ.

٨٩٠١/ 6180- **هاننان بۆ، (بە سامرەی) تێوەگلاندن:** ترس لە شکست خواردن، هەمیشە هانی دەدا (بۆ هەوڵدانێکی زیاتر).

٨٩٠٢/ 6782- **هاندان پشتیوانی لێکردن:** هونەرمەندێکی لاو زەحمەتە بتوانێ رێگای خۆی بۆ سەربەرزەکی تیاترەکانی لەندەن بکاتەوە، مەگەر هونەرمەندێکی بەناوبانگ هانی بداو پشتیوانی لێبکا.

٨٩٠٣/ 1013- **هاندان:** کاتێک دەوەندەکان گەیشتنە دەوری کۆتایی پێشبرکێ، خەڵکەکە دەستیان بە هاندانیان کرد.
← پارمەتیدان.

٨٩٠٤/ 313- **هاوئاهەنگ بوون، لەگەڵ... خوێندنەوە:** ئەو بەڵگەیە زەحمەتە بتوانێ دەگەڵ رێککەوتنەکەمان بخوێنێتەوە.

٨٩٠٥/ -

٨٩٠٦/ -

٨٩٠٧/ -

٨٩٠٨/ 1021- **هاوئاهەنگ بوون لەگەڵ، جووت هاتنەوە لەگەڵ، خوێندنەوە لەگەڵ، یەکبوون لەگەڵ:** ئەوەی کە ئەو گوتی دەگەڵ دژکردەوەیەکی ئیزائیل لە خۆی نیشاندا راست دەهێنرێتەوە.

٨٩٠٩/ -

٨٩١٠/ 317- **هاوئاهەنگ بوون لەگەڵ، لەیەک تەبابوون، هاوتەبا بوون:** پاش چەند جار هەڵوێست گۆڕین، ئێستا دەگەڵ باقی ئەندامانی حیزب لە یەک خەت دایە.

٨٩١١/ 3539- **هاوئاهەنگ بوون لەگەڵ:** لە یارمەتیی مانگانەی پۆلیسان/ پاسەوانانەدا ئاڵوگۆڕێکی زۆر هاتۆتە پێش کە لە سەرێک دەگەڵ یارمەتیی مانگانەی کارمەندانی بەشی سنعەت هاوئاهەنگ بووە.

٨٩١٢/ 1214- **هاوئاهەنگ بوون لەگەڵ، رێککەوتن لەگەڵ:** ئەو لەو جۆرە کەسانە نیە کە بە هاسانی دەگەڵ هاوکارەکانی رێککەوێ/ تێکەڵ بێ.

٨٩١٣/ 3136- **هاوئاهەنگ بوون لەگەڵ، لەگەڵ یەک هاتنەوە، وەک یەک هاتنەوە، لەگەڵ یەک جووت هاتنەوە:** ئەو نۆژتانە دەگەڵ یەک جووت نایەنەوە/ هاوئاهەنگ نین.
هاوئاهەنگ بوون ← دەگەڵ یەکتر هاتنەوە، پێکەوە هاتنەوە، بەیەکەوە هاتنەوە، هاتنەوە دەگەڵ، سازگار بوون لەگەڵ، هاتنەوە دەگەڵ.

٨٩١٤/ 3587- **هاوئاهەنگ(ی) کردن:** ئەو هەشت کەسە، هەروەکوو بڵێی تاکە کەسێکن، لە سەرانسەری پێشبڕکێی قایقرانیدا هاوئاهەنگیان دەکرد.

٨٩١٥/ 515- **هاوئاهەنگ کردن، تێکەڵکردن (بە جوانی):** بۆ هاوئاهەنگ کردنی ئەو ئاپارتمانە تازە دروست کراوانە دەگەڵ ساختمانە ڤیکتۆریاییەکان هیچ هەوڵێک نادرێ.
هاوئاهەنگ کردن ← هێنانە سەرخەتێ.

٨٩١٦/ 7124- **هاوئاهەنگ کردن، میزان کردن، کۆک کردن:** ئەندامانی ئۆرکێستر تازە خەریک بوون ئامرازەکانی خۆیان هاوئاهەنگ دەکرد کە گەیشتینە هۆڵەکە.

٨٩١٧/ 154- **هاوئاهەنگ کردن، سازگار کردن، رێکخستن(ی شتێک لەگەڵ شتێکی دیکە):** تی‌ئێس ئێلیت زمانی (نووسراوەکانی) خۆی دەگەڵ ئەو سەردەمەی تێیدا دەژیا هاوئاهەنگ کردبوو.

٨٩١٨/ 1055- **هاوئاهەنگ نەبوون، نەهاتنەوە لەگەڵ:** رەنگی سووری مل پێچەکەی دەگەڵ رەنگی پەمەیی کڵاوەکەی نەدەهاتەوە.

٨٩١٩/ 2260- هاوئاهەنگ کردن لەگەڵ، ڕێککەوتن لەگەڵ: بەراستی ئەوانە لەو وڵاتە تازەدا چۆن ڕێك دەکەون؟

٨٩٢٠/ 2493- هاوئاهەنگی کردن لەگەڵ، لەگەڵ کەوتن: هەرکات جێژنی لەدایك بوونێك لە ژێر بنەماڵەکەدا بەڕێوە دەچوو، گۆرانیی "لەدایك بوونت پیرۆزبێ" یان دەخوێندەوە، سەگەکەشیان بۆ هاوئاهەنگی کردن دەوەڕی.
← دەگەڵ کەوتن.

٨٩٢١/ 6106- (لەوەندە ڕوونە کە بۆ خۆی) هاوار دەکا: ئەو بەڵگەیە پێویستی بە هیچ لێکدانەوەیەك نیە؛ زۆر بەجێیە ئەگەر بڵێین ئەوەندە ڕوونە کە بۆ خۆی هاوار دەکا.

٠١/٨٩٢١ 5880- هاوار کردن، گوێڕاڵەن: ئەگەر جوابەکەی دەزانی، مەگوێڕێنە- ڕاوەستە هەتا پرسیارت لێدەکەم.

٨٩٢٢/ 7526- هاوار کردن، بە دەنگی بڵند لەوێران: هەرکات گرووپانەکەمان بە دەنگی بەرزەوە ناوی دەبردم، ناچار بووم هەڵێمە پێشێ.

٨٩٢٣/ 1542- هاوار کردن، قیژاندن: کاتێك گاشەبەردەکان بەرەو جادە خلۆر بوونەوە ئەو خەڵکەی دەدلو کەوتبوون لە ترسان هاواریان دەکرد.

٨٩٢٤/ 3880- هاوار کردن، قیژاندن، نەڕاندن: لەبەر ئێشەو ئازاری خۆی هاواری دەکرد.

٨٩٢٥/ 889- هاوار کردن، بە دەنگی بەرز داوا کردن: جووتیارە برسییەکان هاواری نانو خواردەمەنییان دەکرد، بەڵام ئەو خەڵکەی چووبوون بۆ سەردانیان هیچیان پێ نەبوو بیاندەنێ.
← دەربڕین.
هاوباش بوون دەگەڵ ← دۆستایەتی کردن دەگەڵ.

٨٩٢٦/ 59- هاوبیر بوون (لەگەڵ)، موافیق بوون (لەگەڵ): بە تەواوی موافیقم؛ ئەو جاددەیە زۆر خەتەرناکە.

٨٩٢٧/ 5693- هاوبیرو بڕوا بوون، لەسەر یەك بیروبڕوا بوون: ئەویش ئەندامی حیزب نیەو هەرگیز دەگەڵ ئالفرێد هاوبیرو بڕوا نین.

٨٩٢٨/ 228- هاوبیروبڕوا بوون، لەسەر یەك بیروبڕوا بوون: لەسەر ئەو بڕوایەمە کە ئەو ڕێگایەی بۆ وەدەرکەوتنی کێشەکە هەڵیان بژاردووە باشترین ڕێگایە.
هاوخەت بوون ← هاوئاهەنگ بوون.

٨٩٢٩/ 2208- هاودەردی کردن لەگەڵ: هاودەردیی کردن دەگەڵ هەژاران کارێکی سادەیە؛ ئەوە کە گرنگە ئەمەیە کە بە کردەوە هەنگاوێکیان بۆ هەڵگری.

هاودەردی نەکردن دەگەڵ ← پشتیوانی نەکردن لە.
هاوئاهەنگ بوون دەگەڵ ← دەگەڵ کەوتن.
هاودەنگی کردن دەگەڵ ← دەگەڵ کەوتن.

٨٩٣٠/ 2758- هاوفکر بوون، هاوبیر بوون، ڕاست وەك کەسێکی دیکە ڕەفتار کردن: بە پێویست نازانم لە پێوەندیی دەگەڵ هەموو ئەو شتانەی دەربارەی سیاسەت دەیانڵێی هاوفکرت بم.

٨٩٣١/ 1382- هاوفکر بوون، لەسەر یەك بیروڕا بوون: لەسەر ئەو بڕیارە کە زیندانییە هەڵاتووەکان وەك پەنابەری سیاسی بناسرێن ئۆپۆزیسیۆن دەگەڵ دەوڵەت هاوبیر بوو.

٨٩٣٢/ 5064- هاوفکری کردن، فکرەکان... کردن بە یەك: دەبێ وەختێك دابنیشینو هاوفکری بکەین بۆ ئەوەی ڕێگایەك بۆ بژێوی خۆمان بدۆزینەوە.
هاوفکر نەبوون ← جیا بوونەوە لە.
هاوفکری کردن دەگەڵ ← پرس کردن بە.

٨٩٣٣/ 1056- هاوکات بوون لەگەڵ: ناتوانن کۆبوونەوەکە جەژنە ڕۆژی هەینی چونکە دەگەڵ بەرنامەی وەرزشی پاش نیوەڕۆی من هاوکات دەبێ.

٨٩٣٤/ 1023- هاوکاری کردن (بە پووڵو پارەدان)، هاتنە پێش: وەك هەمیشە جۆرج بێ پووڵ بوو، نەیتوانی بۆ کڕینی دیارییەك بۆ ئاغای... کە بازنشستە ببوو، هاوکاریمان بکا (= پووڵێك بدا).

٨٩٣٥/ 4821- هاوکاری کردن، دەست دانەدەستی یەکتر: ئەگەر هەمووومان بەیەکەوە هاوکاری بکەین، دەتوانین وڵات لەو ئاڵۆزییە ڕزگار کەین.

٨٩٣٦/ 1442- هاوکاری کردن لەگەڵ: ئەگەر لوتف بکەیو بۆ بەڕێوەبردنی جێژنەکە هاوکاریمان بکەی، بەرنامەکەمان زۆر سەرکەوتووتر لەوە دەبێ کە هەر کەسە بە تەنیایی بەڕێوەیبەرێ.

٨٩٣٧/ 5379- هاوکێش (هاوتاییە) بوون: بەردنو مەرد هاوکێشنو دیکتەکەشیان لێك نزیکە.

٨٩٣٨/ 1415- هاونشینی کردن لەگەڵ، هەستانو دانیشتن (هەبوون) لەگەڵ، تێکەڵاوی کەسانێك بوون، هاوڕێی کەسانێك کردن: ئاغای بلاگز زۆر لەوە نارەحەت بوو کە بیستی کچەکەی ماوەیەك دەگەڵ ئەوانەی "مراد عنر" دەفرۆشن تێکەڵاوی هەیە.

٨٩٣٩/ 136- هاونشینی کردن لەگەڵ، تێکەڵاوی هەبوون لەگەڵ: گشت ئەو کەسانەی ئاغای سارت تێکەڵاوی دەگەڵیاز هەیە، جێگای ڕێزی خەڵکن.

٨٩٤٠ 3872- **هاویشتن، فڕێ کردن، تەقاندنەوە، لەواندن:** تۆپێکی برۆنزی‌یان بە شێوەیەکی خەتەرناکەوە بە بارووتی راستەقینە ئاوردا. ● منداڵە چکۆلەکان چەند دانە تۆق تۆقەیان تەقاندەوە.

هاویشتنە سەر ← لێ زیاد کردن.

هاویشتنەوە ← فڕێدانەوە.

٨٩٤١ 3903- **هۆ، هۆکاری ... بوون:** هۆی گۆڕانی کابینە لەم دوایی‌یانەدا رزگار بوون لە دەستی هێندێک لە وەزیرە ناخۆشەویستەکانە.

٨٩٤٢ 5879- **هوریا لێکێشان (وێنەدەنگ کردن):** هەشیمەتەکە کاتێک کە یەکێک لە ئەندامانی کۆمیتە کە دەیەویست بە بڵێندگۆ قسەیان بۆ بکا، بە هوریا لێکێشان بێدەنگیان کرد.

٨٩٤٣ 3460- **هوریا لێکێشان:** کاتێک پۆلیسەکان کابرای گومان لێکراویان سواری ماشێن دەکرد، خەڵکەکە هوریایان لێدەکێشا.

٨٩٤٤ 3307- **هوریا لێکێشان:** هەرکات ئەو وەزیرە دەیەوێ لە بەرامبەر خەڵکدا سیاسەتەکانی شی بکاتەوە، خەڵکەکە هوریای لێدەکێشن.

٨٩٤٥ 3255- **هوریا لێکێشان و لە سەر بەرزەک وەدەرنان:** لە یەکەمین جاردا کە هاتە سەر بەرزەک لە ئەختەشی هونەرمەندێکدا، تەماشاچی‌یە دڵرەقەکان هوریایان لێکێشاو، لەسەر بەرزەک وەدەریان نا.

هۆش دانە سەر ← چاو تێبڕین، کارکردن لەسەر.

٨٩٤٦ 1379- **هۆش و بیری خۆ دان بە:** ئەگەر ئەو هەڵا و هوریایە درێژەی هەبێ، ناتوانم هۆشم بە تەواوی بدەمە کارەکەم.

هۆش هاتنەوە بەر ← وەهۆش هاتنەوە، فکر، یان بیر، لە وەزعی خۆ کردنەوە.

٨٩٤٧ 5797- **هۆشی خۆ دانە سەر کارێک:** هۆشی خۆم بدەمە سەر هەر کارێک دەتوانم ئەنجامی بدەم.

٨٩٤٨ 239- **هۆکار یان ئەنگیزە (ی ...) بوون:** نازانم ئەوە کە جان لە نە کاو کەوتۆتە بیری خۆشبەختی ئێمەوە لەبەر چی‌یە/ چ هۆکارێکی دەبێ هەبێ/ چ شتێک بۆتە ئەنگیزەی.

٨٩٤٩ 3954- **هومێدەوار بوون، خۆشبین بوون:** ئەو زیندانی‌یە هومێدەوارە کە زوو ئازاد بێ. ● ناکامی تاقیکاری‌یەکانیان هێشتا رانەگەیاندوە، بەڵام ئەمن خۆشبینم.

← هیوادار بوون بە.

٨٩٥٠ 4588- **هومێدەوار بوون بە:** هێندێک هیوادارن رێبەرێکی ئەتەوایەتی پەیدا بێ و هێندێکیش بە زیندوو بوونەوەی ئایین/ مەزهەب.

٨٩٥١ 3674- **(زۆر بە خێرایی) هۆنینەوە، نووسین:** ئێدواردلیر مێشکێکی عەجایبی هەبوو. وادیار بوو کە زۆر بە هاسانی دەتوانێ لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا پارچە شێعرێکی قۆڕ بهۆنێتەوە.

٨٩٥٢ 13- **هۆی شتێک بوون، ئیشانەی شتێک بوون:** کاوە ئەخۆشە. هۆی رەفتاری سەیرو سەمەرەشی هەر ئەمەیە.

٨٩٥٣ 6865- **هەبوون (وەک خوڵێن)، پڕ بوون لە:** لە خاکی بە پیتو بەرەکەتی دەوروبەری ریشەی ئەو دارەدا کرمو دەعبای ورد وەک خوڵێن هەنە.

٨٩٥٤ 1769- **هەبوون، لە دەست دابوون، لە ئیختیاردابوون:** تۆپخانەی ئەرتەشی رووسیە ٢٠ هەزار دەزگار تۆپی هەبوو کە لەوانە ٦ هەزاریان ٧٦ میلیمیتری و دژی تانک بوون.

٨٩٥٥ 284- **هەبوون:** لەو سەرو بەندەدا هیچ چەشنە رێگایەک نەبوو بۆ ئەوەی کە کارەکەی پێ جێبەجێ کەین.

٨٩٥٦ 201- **هەبوون، وەدەست کەوتن، وەگیر کەوتن:** دەبێ زۆر شانست هەبێ کە بتوانی ئەو مۆبلانە لە ئەنتیکەفرۆشی‌یەکان وەچنگ خەی، ئێستا ئەو شتانە کەم پەیدا دەبن.

هەبوون ← مان.

هەبوون (لە رادەیەکی زۆردا) ← پڕ بوون لە.

٨٩٥٧ 3623- **هەبوون، زیندوو بوون، لە جیگایەک بوون:** "ئێی، خۆ ئەوە کامرانە! لە کەنگێوە لێرەی؟ پێم وابوو لە ئەمریکایەی؟". ● یانی دەتەوێ بڵێی جانسۆنی پیر هێشتا هەر زیندووە؟ بە خودای هەر ئەبێ سەد ساڵ دەبێ.

٨٩٥٨ 2014- **هەبوون، خودا پێدان:** زۆر کەمن ئەو کەسانەی مێشکی ئەنیشتەنیان هەبێ/ زۆر کەمن ئەو کەسانەی خودا مێشکی ئەنیشتەنی پێدابێ.

٨٩٥٩ 843- **هەبوون (یەکجار زۆر) ... بوون:** خانی ئیمیلی و جەنابی گایلز هەم زۆر جوانن و هەم یەکجار دەوڵەمەندن.

٨٩٦٠ 1174- **هەبوون، وەگیر کەوتن (لە وەرزی خۆیدا)، پەیدا بوون:** هەتا پێش مانگی فیوریە ماسی ئازاد (لەبازار) نابێ/ وەگیر ناکەوێ، وا نیە؟

٨٩٦١ 3994- هەبوون لە ... دا: لە شێوەی بەرهەم هێنانی نێمەدا، لە هەر دەنکێك لە خواردەمەنییەکانی نانی بەیانانەدا چەندین پۆند نینەوژی هەیە.

٨٩٦٢ 3179- (ترس) هەبوون لە ...: ئەو کچە بە هیچ خۆرایی لەو خانوە بە تاڵەی دراوسێمان دەترسێ/ ترسی هەیە لەو خانووە بەتاڵە.

٨٩٦٣ 2249- هەتا ئاخرین پارووی خواردن، هەتا ئاخرین دڵۆپی خواردنەوە: خەرە یوە سەری لێ هەڵێناو ریسکییەکەی هەتا ئاخرین دڵۆپ خواردەوە.

٨٩٦٤ 6003- هەتا بەئەنگام گەیاندن بە ئەنجامی پای موسارەزە دوژمن: لە کاتێکدا قارەمانەکانی سەنگەر وەزن خەریك بوون لە رۆندی کۆتایی بۆ وەدەست هێنانی ئاکامی نیهایی سەخت لێکیان دەدا، خەڵکەکە وەها هەڵچووبوون کە تۆقرمیان/ حەجمینیان لێبرابوو.

٨٩٦٥ 3970- هەتا تەمەنی پیری ژیان: باپیرم هەتا تەمەنی ٩٠ ساڵی ژیا. ● پێم وانیە هەتا تەمەنی پیری بژی؛ سیغاری زۆر دەکێشێ.

٨٩٦٦ 4646- هەتا کۆتایی یاری پایەداری کردنو گۆڵ نەخواردن.
هەتا مەلان پێوە بوون ← نوقمی کارێك بوون.

٨٩٦٧ -

٨٩٦٨ -

٨٩٦٩ -

٨٩٧٠ 6952- هەتلە کردن، بە هەتلە بردن، هێرش لە کەسێك وکردن: باندی پیاو کوژەکان بوون بە چوار دەستە بۆ ئەوەی پۆلیس بە هەتلە بەرن.
← دەنگدان.
هەجە (لێکردن) ← تێڕاخوڕین.
هەدەر دان ← بە فیڕۆ دان.

٨٩٧١ 7530- (لە ئەرتەشدا)؛ هەدەفگیری کردن، نیشانەروی کردن لەسەر: هەر کە هەوا رووناك بوو، تۆپەکان لەسەر چوارڕێیانەکان هەدەفگیرییان کردو....
هەدیە کردن بە ← دران بە.

٦٩٧٢ 155- هەراج کردن، بە مەزات دانان: هەر بەمینا بەمینێك، ئەرتەش شتورەکی لە کەڕ کەوتوو بە مەزات دەفرۆشێ.

٨٩٧٣ 2995- هەراج کردن، مەزات کران: تەواوی دارایی کامرانیان هەراج کرد بۆ ئەوەی قەرزەکانی بۆ بدەنەوە.

٨٩٧٤ 5085- هەراج کردن، مەزات کران، بە هەراج دانان: ئەو پارچە زەوییەی قونیچکێ هەفتەی داهاتوو هەراج دەکرێ.

٨٩٧٥ 3664- هەراج کردن، مەزات کردن: دەڵاڵەکە چەکوچەکەی لە میزەکە راکێشاو گوتی؛ ئاخری کەیمەتی، سێ پۆند، سێ پۆند یان داوە، کەس هەیە زیادی کا؟ هەراج، هەراج، سێ پۆند- بۆ ئەو ئاغایەی عەینەکی رەشی لێداوەو لە پشتەوە راوەستاوە- ئایا قەت بووە شتێکی ئاوا باش بە سێ پۆندان فرۆشرابێ؟.
← بە هەراج فرۆشتن.

٨٩٧٦ 3570- هەراسان کردن، مێشکی سەری کەسێك بردن، لەسەر شتێك پێ چەقاندنو داوا کردن: منداڵەکان مێشکی سەری دایکیان بردبوو بۆ ئەوەی بیانباتە لوناپارك، بەڵام، دایکی هەمیشە زۆر ماندوو بوو.
← هەڵا هەڵا کردن.

٨٩٧٧ 2373- هەراو هوریا کردن، هەڵاو بگر ساز کردن/ وەرێخستن: هەڵا هەڵایە مەکە؛ تاکسی لە کاتی خۆیدادێو دەشگەینە قەتاری.

٨٩٧٨ 7392- هەراو هوریا گرتنەوە: کافە کە هەتا درەنگ وەختانێك لە شەو هەروا ئاواڵە بوو، ئەوانەی جێژنیان گرتبوو دوای نیوەشەویش هەروا هەراو هوریایان گرتبۆوە.
هەردەنێو دەڵێن شازدەی مانگییە ← هەرە لە برە نەکردنەوە:
هەر دەمەی پەرپنە سەر شتێکی ← حەللەق مەللەق گرتن.

٨٩٧٩ 5513- هەردەمەی حەز لە یەکێك کردن: ئەرێ ئەو کورە کەنگێ دەمیرێ دەست لەوە هەڵگرێ کە هەردەمەی حەز لە یەکێکی بکاو بە کچێکی رۆکەوێ؟

٨٩٨٠ 1031- هەردەمەی قسەیەك کردن، هەردەمەی لەسەر هەوایەك بوون، لەو چڵ بۆ ئەو چڵ پەڕین: جارێك دەڵێی دەتەوێ ببی بە پزشك، جارێکی دیکە دەڵێی دەبی بە مامۆستای قوتابخانە؛ ئەوجار دەڵێی دەبی بە ئەرتەشی؛ بریا هەردەمەی لەسەر هەوایەکی نەبای.

٨٩٨١ 5516- هەڕا کردنە سەر، هەڵکوتانە سەر، هێرشانە سەر، بازدان بەسەر ...دا: پیاوێکی زلحۆل بە چەقۆوە غاری دا سەرم. ● ئەسپەکەی بۆ بازدان بەسەر پەرژینەکەدا تاودا.

٨٩٨٢ 4108- هەڕا کردنە سەر: دوو کەس لە نیگابانەکان بە شمشێری رووتەوە هەڕایان کردە سەری.

← تێبەردان.

٦٩٨٢ 186- (بە) هەرزان فرۆشتن، بە سانایی لە دەست دان، بە فیڕۆ دان: لە ماوەی چەند دەقیقەدا هەموو ئەو ئیمتیازانەیان هەرزانفرۆش کرد کە بۆ وەدەست هێنانیان ساڵانێکی زۆر زەحمەتیان کێشابوو.

هەرزان فرۆش کردن ← (بە) هەرزانفرۆشتن، بە خۆرایی دان.

هەرکەسە بۆ لایەك چوون ← بڵاوە لێکردن.

٦٩٨٤ 3134- هەر گوێی بدەیە، هەتا دەرزیی گوێی بدەیە: "دەیدەی، هەر گوێی بدەیە- هەموو کەس پێی وایە ئەو خاوەنی ئەم جێگایەیە!"

٦٩٨٥ 311- هەر لە سەرەتاوە لە کارێك دا بەشدار بوون: بەخت رووی تێکردووی. ئەم کاسبییە هەر لە ئێستاوە دیارە بەرەو پێشکەوتن و پەرەستاندن دەروا، ئەتۆش هەر لە سەرەتاوە دەگەڵ کەوتووی.

٦٩٨٦ 1189- هەر لە سەرەتاوە دەگەڵ کارێکی پڕ لە مەترسی کەوتن: ئەوانەی هەر لە سەرەتاوە دەگەڵ ئەو سەرمایەگوزارییە پڕ لە مەترسییە کەوتن، لە ماوەی کەمتر لە سێ ساڵاندا سەرمایەکەیان بوو بە دوو بەرامبەر.

هەروا ڕۆیشتن ← درێژەدان بە ڕێگا ڕۆیشتن.

هەروا ڕاگرتن ← پاراستن.

٦٩٨٧ 2095- هەروگێف لێدان، هەڵتێز هەڵتێز کردن، قسەی کردن: خێرا دوور کەوتمەوە و ڕۆیشتم، چونکە نەمدەویست چاوم لە لەت و پەت کردنی کابرای بەدبەختی ڕێگر بێ کە گرتبوویان و خەڵکەکەش دەوریان دابوو و شادییان دەکرد.

٦٩٨٨ 1033- هەرەس کردن، کۆرپەکردن، هەڵپەرتاوتن، بڕین، تەکەیش کردن: ئەو لقە دارانە جادەکەیان گرتووە؛ واباشترە هەڵیان پەرتێنن. ● لە هێندێك وڵات دەستی دزان دەبڕن.

هەڕەشە لێکران ← لە مەترسی دابوون.

٦٩٨٩ 4058- هەڕەشە لێکردن: بەرەی دووهەمی شەڕ لە نۆرووپا، هێرش بە دەریای مانشدا هەڕەشەی لێدەکردن.

٦٩٩٠ 4983- هەڕەشە لێکردن، گوشار هێنان: دەڵێی خۆت بۆ شەڕێ حازر کردووە. دیسانیش پیاوە پیرە (مێردەکەت) هەڕەشەی لێکردووی/ فشاری بۆ هێناوی؟

٦٩٩١ 6916- هەڕەشە لێکردن بە: بە هۆی ئەوە کە نەمانتوانیبوو لە کاتی خۆیدا حازر بین، هەڕەشەیان لێکردین کە زۆر توند سزا دەدرێین.

٦٩٩٢ 3711- هەرە لە بڕە نەکردنەوە، هەر دەترپێنو دەلێی قسانەی ماڵکرێیە، گوێی خۆ کێزەرلێ نەکردنەوە: لە پێرەمێردی دەگەڵ مەسەلەی ماڵی لە کامرانی ڕێنوێنی مەخولزە. ئەو هەرچی لەبیری ناکاتەوە.

هەر یەکبوون ← بەرامبەر بوون.

٦٩٩٣ 5450- (مەسەلە) هەزار خۆزگە بە مەرگ، خۆزگە هەر نەبێ سەگم تێی ڕیاند، خودا بە مەوسری نەخوێسی: ئەگەر ئەو چەند مانگەی دادێ هەروا ناخۆش بێ، خۆزگە هەر نەبێ!/ سەگم تێی ڕیاند.

هەژار بوون ← فەقیر بوون.

٦٩٩٤ 5429- هەستان، هەستانەسەرپێ، لە جێگای خۆ هەستان، ڕاست بوونەوە: بە لەقە لەق لە جێگای خۆی هەستا بۆ ئەوەی وەڵامی وتاری بەخێرهێنان بداتەوە.

٦٩٩٥ 2619- هەستان (لە خەو)، لە خەو هەستاندن (و لە جێگا هێنانە دەر)، لە خەو ڕاست کردنەوە: زوو هەستان زۆر خۆشە، بەڵام لە نێو جێگادا مانەوە خۆشتریشە. ● ئایا وەختی نیە منداڵەکە لە خەو هەستێنی بۆ شوێەکەی؟

٦٩٩٦ 1303- هەستان، هەستانە سەرپێ، ڕاست بوونەوە: چەند کەس لە ئەندامانی مەجلیس خێرا ڕاست بوونەوە بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو تاوانانە بدەنەوە کە هاتبوونە گۆڕێ.

٦٩٩٧ 281- هەستان (ی ئاوی دەریا) هەتا ئاوپەیی خۆی: کاتێك مەلەی دەکەی، ئاگات لە خۆ بێ و بزانە کە ئاوی دەریا هەتا ئاخرین رادەی خۆی هەستاوە یان نا.

← هاتنە سەر هەتا.

هەستان (لە ئەرزی) ← هەڵفڕین.

هەستانەسەرپێ ← ڕاست کردنەوە.

هەستان و دانیشتن (هەبوون) دەگەڵ ← هاونشینی کردن دەگەڵ.

٦٩٩٨ 5193- هەستانە سەر پێڵوون: لە ترس و خۆرایی، ئەسپەکە هەستا سەر پاشووان و هێندەی نەمابوو سوارەکەی بخا.

٦٩٩٩ 2529- هەستانە سەرپێ: کاتێك نوێنەری شار... هەڵدەستێتە سەرپێ، کەس نازانێ کەنگێ دادەنیشێتەوە.

٧٠٠٠ 2620- هەستانە سەرپێ، لە جێگەی خۆ هەستان: کاتێك سەرۆکی مەجلیس گوتی کەس پرسیاری نیە، بێ سێ و دوو لێکردن چوار کەس هەستانە سەرپێ/ ڕاست بوونەوە.

٧٠٠١ 2635- هەستانە سەرپێ: نۆ مانگ بوو ئاغای... لە مەجلیسی نوێنەران بوو کە سەرئەنجام غیرەتی وەبەرخۆی نا و هەستایە سەرپێ و یەکەمین وتاری خۆی پێشکەش کرد.

ڕاست بوونەوە.

٧٠٠٢ 6266- **هەستانە سەرپێ، لەبەر هەستان:** کاتێك مردیبری قوتابخانە دەهاتە ژووری پۆلەکە، بە نیشانەی ڕێـز لێنـان، هەڵدەستانە سەرپێ.

٧٠٠٣ 4563- **هەستانەوە (سەرپێ):** لە کێشمەکێشـەکەدا کەوت، بەڵام زوو هەستاوە (سەرپێ)و خۆی تەکاند.

٧٠٠٤ 344- **هەستانەوە سەرپێ/ پا، لە جێگای خۆ هەستان:** هەرکە نـاوی ئـەو میوانـەی دەیەویـست قسـە بکـا ڕاگەیاندرا، دەکرێ بڵێین نیـوەی حەشیمەتەکە هەستانە سەرپێ‌و دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان‌و شادی کردن.

٧٠٠٥ 2150- **هەستانەوە (سەرپێ)، خۆگرتنەوە:** کاتێك لە شەڕ گـەڕاوە هیـچ پـووڵ‌و پارەیـەکی نـەبوو، بـەڵام زۆر زوو کارێکی باشی پەیدا کرد. بەڵێ، ئـەو کابرایـە هەمیشـە دەتوانێ زوو خۆی بگرێتەوە.
←چاکبوونەوە.

٧٠٠٦ 2213- **هەست بە ناجۆور بوون کردن، هەست بـە نەهاتنـەوە کردن:** زۆر کەس لە ئێمەمانان لە دیوی "چاوەڕوان بوونی" درۆك هەست بە ناجۆور بوون دەکەین (= لەبەرخۆمانـەوە دەڵێین ئێمە بۆ ئێرە نابین- وەرگێڕ)
هەست پێکردن ← تێگەیشتن، دیتران، بوون.

٧٠٠٧ 5578- **هەستو نیستی خۆ خەرج کردن، هـەرچی هـەبێ خەرج کردن:** کاتێك لە زانستگە بوو، هـەرچی هـەیبوو خـەرجی کرد.

٧٠٠٨ 5004- **هەستو نیستی خۆ لە سەردانان، هـەرچی پووڵـی هـەبێ لەسەر... دانان:** بۆ نموونە لـە پێشـبڕکێی (ئەسـپ سـواری) ئـەمجارەدا بیبەمـەوە، هـەرچی هەمـەو نیمـە لەسـەر "شاگردی شەیتانی" (ناوی ئەسپە) دادەنێم.

٧٠٠٩ 1809- **هەستی توندو تیژی کەسێك بزاوتـن (= تـووڕە کـردن، ئاورەحەت کـردن، دڵـەدان):** گوێـم لـە کۆخینەکـەی دەبـێ. کۆخەیەکی ناوا لە سەرەخۆش تووڕەم دەکا.

٧٠١٠ 617- **هەستی خۆ لـە پـڕ، لـە نـەکاو) دەربڕین:** دەنگـی بلاوێنی موسیقای جاز ڕاست وەك کەسانێك دەچوو کە لە جێگایەك زیندانـی کرابـن کـە لـە نـەکاو هەسـتی‌خۆیان دەربڕن‌و) پێ‌بکەنن‌و لە پڕ بە دەنگی بەرز بگرین.

٧٠١١ 6389- **هەستی خۆشەویستی بزووتـن:** ئـەمن هـەر لـەوە نەدەگەیشتم کە بۆ دەبێ ئـەو پیـاوە سـاکارانەی کـە لـە شەقامان بە تەنیشتیاندا ڕادەبرن بە دیتنی منداڵانی ساوا تا ئەو ڕادەیە هەستی خۆشەویستی‌یان ببزوێ.

٧٠١٢ 6333- **هەستی کەسێك بزوانـدن:** بـۆ ئـەوەی هەسـتیان ببزوێنی، بە ئێوە ڕووتـی دێیـە لایـان. کـەوابوو کـاتێك سەرکەوتووی ئەو بۆڵـە بزۆلـەت لـە چییـە/ گلـەییت لـە چییە؟

٧٠١٣ 1251- **هـەڵاتن (ئـاو)، وەدەرکـەوتن، هاتنـە دەر:** سەرلەبەیانی ئاسمان گرژ بوو، بـەڵام، دوای نیوەڕۆیـە تـاو هەڵات.
هەڵاتن(ڕۆژ، مانگ)، هەڵاتن بە دزی، هەڵاتن لە زیندان، هەڵاتن لە، دەرکەوتن، بۆی دەرچوون، لە زیندان ڕاکـردن، خۆ لادان لە، هەڵاتن لە دەست مەرگ.

٧٠١٤ 1346- **هەڵاتن، وەدەرکەوتن:** لەو وەختەی سـاڵەدا، ڕۆژ سەعاتی پێنـج هـەڵدێ‌و سـەعاتی ٨/٣٠ی ئێـوارە ئـاوا دەبێ.

٧٠١٥ 5665- **هـەڵاتن (بـە پەلـە پـڕووزە):** ڕێژنـەبارانێکی لەنەکاو هـەمووانی وادار کـرد کـە بـە پەلـە بـەرەو پەناگایەك/ پەسیوێك هەڵێن.

٧٠١٦ 5539- **هـەڵاتن، ترتاچـاندن، ئنتـەقاندن:** هـەوەڵێ کەمێك دوو دڵ بوو، بەڵام لەبەر ئەوە کە نەکا حەیوانەکـە هێرشی بکاتێ، تێی تەقاند.

٧٠١٧ 6774- **هـەڵاتن، ئنتـەقاندن:** بـە ڕێگـای خـۆم داگەڕامەوە بۆ شەقامی ...و، لەوێڕا تێیتەقاند.

٧٠١٨ 437- **هـەڵاتن (ی ڕۆژ)، تـاو هـەڵاتن، ڕۆژ دەرکـەوتن:** پێـش ئەوەی کە تاو هەڵبێ/ پێش تاو هەڵاتن، ئـەو لـە مـەزرا خەریکی کارێیە.

٧٠١٩ 588- **هـەڵاتن، بـۆی دەرچـوون:** کـاتێك دەیانـبردە زیندانێکی دیکە، کابرای زیندانی هەڵات/ بۆی دەرچوو.

٧٠٢٠ 3920- **هـەڵاتن، ئنتـەقاندن، بـۆی دەرچـوون:** تـاقمی جینایەتکارەکان وەختێ خۆیان بۆ خوداحـافیزیی بـەخێوێ ئەدا؛ خێرا جانتاکانیان بەستو لە شاری هەڵاتن.

٧٠٢١ 2932- **هەڵاتن لە، بەجێ هێشـتن، دەرکـەوتن لـە جێگایـەکی بەرتەنگو ناخۆش:** خەڵکی جیهان زۆرتر سـەرنجیان بـۆ ئـەو ڕاهیبانە ڕادەکێشـرێ کـە جێگـای تەنگبـەرو ناخۆشـی خۆیان بەجێ دێڵـن هـەتا ئـەو هـەزاران ڕاهیبەیـەی کـە دەمێننەوە.

٧٠٢٢ 1070- **هەڵاتن، بۆی دەرچوون:** کاتێك کابرا پۆلیسەکەی چاو پێ کەوت، وەك گوللەی هەڵات.

٧٠٢٣ 5108- **هـەڵاتن بـۆ ئـەولاو ئـەولا:** منداڵـەکان لـە بەیانی‌یەوە بۆ کۆ کردنەوەی واژۆ/ ئیمزا بۆ داخوازنامەکە بۆ ئەملاو ئەولا هەڵاتوون.

٧٠٢٤ 4113- **هەڵاتن بۆ لای، هەڵاتن لە زیندان:** لە تێپەر بوونی زەمان ئاگادار بووم/ دەمزانی وەختەکە درەنگ دەبێ، بۆیە لە پڕ هەستاو بەرەو پاسەکەم هەڵاتم.
← غاردان بەرەو.

٧٠٢٥ 5508- **هەڵاتن بە دوای ...دا:** "خێراکە، بە دوایدا هەڵێ/ وەدوای کەوە. کیفی پوولەکەی لەسەر مێزەکە بەجێهێشتووە".

٧٠٢٦ 5519- **هەڵاتن لەگەڵ:** جانو کچی سەرۆکی ئیدارە پێکەوە هەڵاتوون/ جان دەگەڵ کچی سەرۆکی ئیدارە هەڵاتووە.

٧٠٢٧ 2432- **هەڵاتن لە، دەرچوون، بۆی دەرچوون:** هیچ کەس نازانێ چلۆن زیاتر لە ١٠٠ کەس لە تێهەڵچووەکان لە بەندیخانە هەڵاتوونو کەس نەیدیوون.

٧٠٢٨ 2050- **هەڵاتن لە، دەرچوون لە، ڕاکردن لە:** تەنیا لە ماوەی سێ هەفتاندا، پێنج نەفەر زیندانی لە بەندیخانەیەکی یەکجار پارێزراو هەڵاتن.

٧٠٢٩ 5517- **هەڵاتن (لە دەستی ژیانێکی ناخۆش):** کاتێک شازدە ساڵە بوو لە ماڵێ هەڵاتو بوو بە دەریاوانەوە.

٧٠٣٠ 3- **هەڵاتن لە:** دادرەس گوتی: ئەتۆ تا ئێستا دوو جار لە زیندانی ئازاد هەڵاتووی، زیندانێک کە هەموو پێداویستییەک بۆ ژیانێکی باش، هەرچەند بەرتەسکی، هەبوو. ئێستا ناچارم بتنێرمە زیندانێکی داخراو.

٧٠٣١ 5518- **هەڵاتن لەبەر، خۆ دوور کردنەوە یان خستنەوە لە:** دوور مەکەوە/ خۆت دوور مەخەوە. ئاگرم ٭ نابێ لەبەر گیروگرفتان هەڵێی؛ دەبێ لێبڕاوانە دەگەڵیان بەرەو ڕوو بی.

٧٠٣٢ 2287- **هەڵاتن لە ژێر، خۆ لێدزینەوە:** نابێ لە ڕاستییەکان خۆ بدزییەوە. ٭ بڕیارێکی ناخۆشە بەڵام، نابێ لە ژێری هەڵێی.

٧٠٣٣ 2561- **هەڵاتن لە ژێر، دەرچوون لە ژێر:** کوڕەکانی بۆ هەڵاتن لە ژێر کاری دژوار زۆر پسپۆڕ بوون.

٧٠٣٤ 7499- **هەڵاتن لە ژێرباری ...، شانە خاڵیکردن لە:** دەزانم کە دەیەوێ لە دانی بەشی خۆی بۆ ماشێنەکەی جلک شوشتن هەڵێ/ شانە خاڵی کا.

٧٠٣٥ 5903- **هەڵاتن لە ژێرباری بەرپرسایەتییەک، بەرپرسایەتیی خۆ خستنە ئەستۆی کەسێک:** ئەوە هەڵدێ، چونکە بۆ دەرچوون لە ژێرباری بەرپرسایەتی ئەمە تەنیا ڕێیە.

٧٠٣٦ 5590- (لە وەرزیشدا) هەڵاتنو سورعەت گرتن بۆ لای ئوختەی بازدان.

٧٠٣٧ 4- **هەڵاتنو ڤتێک یان کەسێک لەگەڵ خۆ بردن:** حیسابداری شیرکەتەکە، پاش بیستو چەند ساڵ خزمەتی وەفادارانە، هەڵاتو دەهەزار پۆندو سکرتێرە جوانەکەی سەرۆکی شیرکەتیشی دەگەڵ خۆی برد.

٧٠٣٨ 5520- **هەڵاتنو ڤتێک لەگەڵ خۆ بردن:** کەسێک نەخشەی موتوورە تازەکەی دەگەڵ خۆی بردووەو لە ئیدارەی هەڵاتووە.
هەڵاخنینەوە ← زگ لەسەر دانان.

٧٠٣٩ 948- **هەڵاوردن، جیاکردنەوە:** حەیوانە پیرەکانیان لە مێگەلەکە هەڵاورد.

٧٠٤٠ 7351- (ئینگ) **هەڵاوردن:** ناچارین مێگەلەکە هەڵاوێرین (= چاکەکان لە خراپەکان جیاکەینەوە).

٧٠٤١ 6379- **هەڵاوەسین، بەڵشتێکەوەدان:** لایەنگرانی سەرۆک وەزیران ڕەسمەکەیان بە پەنجەرەی ماڵەکانیانەوە هەڵاوەسیبوو.

٧٠٤٢ 6535- **هەڵاوەسین، لەسێدارەدان کردن:** گوڵدانەکەیان بە زنجیرێکی لە میچیڕا هەڵاوەسیبوو.

٧٠٤٣ 5067- **هەڵاوەسین، لێدان:** وەختی ئەوە هاتووە دێکۆرەکانی کریسمس هەڵاوەسین.

٧٠٤٤ 6460- **هەڵاوەسین:** لە نێوان چادرەکانو لە سەرووپانەوەش ڕیزێک ئاڵای خۆشڕەنگی هەڵدلاوەسی.

٧٠٤٥ 7442- **هەڵاوێشتن، وەک هەڵان خواردن، لووشدان:** بە شێرێن خواردەمەنیدا خۆی کەیاندە ئاشپەزخانەیو کولیچەیەکی گۆشتی لووشدا.
← خواردن (زۆر) قووت دان.

٧٠٤٦ 615- **هەڵبەسان، بڵاوبوونەوە(ی ئاگر)، دەست پێکردن:** لە پڕ شەڕو هەڵا ساز بوو لێدانو کوتان لە گشت لایەکەوە دەستی پێکرد.
← دەست پێکردن.

٧٠٤٧ 6098- **هەڵبەساندن، وەڕێخستن، هەڵگیرساندن:** شەڕە ناوچەیییەکان دەتوانن ئاوری شەڕی گەورە هەڵایسێنن.

٧٠٤٨ 7086- **هەڵبەساندن، وەڕێخستن، سازبوون یان کردن:** ئەو شەڕو هەڵلایەی ئێستا ئەو دەنگۆیەی وەڕێ خستووە ئەومیە کە گۆیا هێندێک کرێکار بێکار دەبن.

٧٠٤٩ 2764- **هەڵبڕان، خراپ ڕەفتار کردن:** سەگێکی باشی هەرگیز ڕێگا نادا تاقە مەڕێک هەڵبڕێ.
هەڵبڕان، هەڵبڕین ← بڕان، بڕین.

٧٠٥٠ 1560- **هەڵبڕین، بریندار کردن:** زۆر بە توندی تێدەکۆشا پەتەکە هەڵبڕێو لاقی ئازاد کا.

٧٠٥١ 6580- **هەڵبڕین، قەتع کردن (کارەبا):** پێش ئەوەی بچین بۆ پشوودان، دەبێ کارەبای ماڵێ لە فیوزی ئەسڵیڕا هەڵبڕین.

← کووژاندنەوە.

٧٠٥٢ 5932- **هەڵبژاردن، دیاری کردن یان گرتن:** بە بڕوای من هەڵبژێران لە لایەن ناخوداوە (فەرماندەی کەشتی) بۆ ئاهەواردنی خوداحافیزی بەراستی شانازییە.

٧٠٥٣ 1990- **هەڵبژاردن، هەڵبژێران:** ئایزنهاوەر بۆ دووهەمین خولی سەرۆك کۆماری هەڵبژێرا.

٧٠٥٤ 4371- **هەڵبژاردن:** شوورا بۆ هاتووچووی ترافیکی سەنگینو دوور کردنەوەی لە ناوەندی شار، جادەیەکی لاوەکی هەڵبژارد.

٧٠٥٥ 5817- **هەڵبژاردن، دامەزران لەسەر:** ئەو کابرایە یەکێك لە مەبەستەکانی ئەوەیە کە لە سەرکارێکی بێ خەتەر دابمەزرێ.

٧٠٥٦ 4542- **هەڵبژاردن، جیاکردنەوە:** گوڵدانێکی زۆری لە گوڵی چالید هەبوو. یەکێکی گەورەو سوورم جیا کردەوە کە لە گوڵێ دابوو.

٧٠٥٧ 6643- **هەڵبژاردن، دەرهێنان (بابەتێك لە نووسراوەیەك):** قەشەی ناحییە مەوعیزەیەکی کورتو زۆر بەکەلکی دادا. ئەم مەوعیزەیەی لە ئینجیلی حەزرەتی مارك دەرهێنابوو(= وەرگرتبوو).

٧٠٥٨ 6649- **هەڵبژاردن:** لیستەیەکیان/ قایمەیەکیان دایە دەستیو پێیانگوت لەو مەشرووبانەی کە هەیانە هەڵبژێرێ.

٧٠٥٩ 6780- **هەڵبژاردن (وەك کارێکی زەوقی، بۆ خۆشی، نەك وەك کارو پیشە):** دەبوو گۆرانی گرتنم هەڵبژاردبا - هەموو کەس وای پێ دەگوتم.

٧٠٦٠ 4672- **هەڵبژاردن، لێبڕاوانەو بە ئەرخەیانییەوە:** ئەمن ماشێنە سوورەکەم دەویست، بەڵام، ماری ئەوی شینی نێو خۆڵەمێشی لێبڕاوانە هەڵبژارد.

٧٠٦١ 4546- **هەڵبژاردن بە دەست لێدان و چاو لێکردن:** کابانەکان میوەکان بەجوانیی چاو لێدەکەنو هەڵیان دەبژێرن.

٧٠٦٢ 2833- **هەڵبژاردن وەك (کار، پیشە):** کورەکەم دەیەوێ شوغڵی خواردەمەنی گەیاندن بە خەڵك هەڵبژێرێو، بەشێك لە دەورەکەشی لە ئەرانەیە.

هەڵبژاردن ← داهێنان، پەیدا کردن یان هەڵبژاردن (ی کارێك، ئیشێك).

٧٠٦٣ -

٧٠٦٤ 2480- **هەڵبژێران:** پارێزگاران بە زۆربایەتییەکی لاوازەوە/ کەمەوە هەڵبژێران.

٧٠٦٥ 278- **هەڵبژێران بە ئەندامێکی دەوڵەت دیاری کران:** دەزانی کە نوێنەری ئێمە بە ئەندامەتی دەوڵەت دیاری کراوە؟

٧٠٦٦ 2882- **هەڵبوون:** ئەمشەو چراکان کەنگێ هەڵدەکەن.

٧٠٦٧ 2280- **(لە پڕ) هەڵبوون:** کەسێك کلیلی کارەباکەی لێداو لە پڕ هەموو گڵۆپەکانی داری کریسمس بە یەکەوە هەڵبوون.

٧٠٦٨ 2836- **هەڵبوونو کووژانەوە:** گڵۆپە ئینتۆنییەکان مورەتەب هەڵدەبوونو دەکووژانەوە؛ بۆ چرکەیەك مەیدانەکەیان وەك ڕۆژ ڕووناك دەکردو چرکەیەك دواتر دەیانبردە نێو تاریکاییەوە.

هەڵبوون، هەڵبوونەوە ← ئایسان (ی ئاور، چرا، رادیۆ)، وەکار کەوتنەوە.

٧٠٦٩ 5958- **هەڵبەزاندنەوەو تێکەیاندن:** "کەمێك سەبرکە/ دەست ڕاگرە. لە ڕۆژی ساڵی تازەدا لە پڕو ئەخافڵ موردیلە وەرزشییە تازەکەمانیان بۆ وەدەر دەخەین. ئەو کارە هەڵیاندەبەزێنێتەوە (و تێیاندەگەیەنێ).

← ڕاپەراندن.

٧٠٧٠ 4720- **هەڵبەز هەڵبەزکردنو جیقڕە لە خۆدان:** کاتێك ناکامی ئاتیکارییەکانیان ڕاگەیاند، لە دالانەکاندا هەراو بەزمو جیقڕە لە خۆدان ساز بوو.

هەل بە لەبار زانین ← لە دەرفەت کەڵك وەرگرتن.

٧٠٧١ 6056- **هەڵپاچین:** بەرگدروو بە سەر لیباسی درواودا دەچێتەوەو دەزووە زیادییەکان هەڵدەپاچێ.

هەڵپرووکان ← گەندەڵبوون، ڕزین.

٧٠٧٢ 7088- **هەڵپەرتاوتن، تاشین، لەنبڕین، کەم کردنەوە، کورت کردنەوە:** پێش ئەوەی کە لە وتووێژەکەتدا بەشداری بکەی، دەبێ بەدەی ئەو مروانەت کەمێك بۆ کورت کەیەوە.

٧٠٧٣ 1561- **هەڵپەرتاوتن، بڕین، پەڕاندن:** نەشتەرگەر بە لێزانیی تەواوەوە لوورەکەی بڕی (و دەری هێنا). ● ناتوانن چیمەنێکی باشتان هەبێ مەگەم ئەو لقو پۆپە دارانەی بەسەری دا شۆڕ بوونەوە هەڵپەرتێون.

٧٠٧٤ 1562- **هەڵپەرتاوتن، تەکمیل کردن:** هێندێك باخەوان لەسەر ئەم بڕوایەن کە دەبێ بنەگوڵی ڕۆز یەکجار زۆر تەکمیش بکرێ-تەنانەت دەگەڵ ئەرزی تەخت بکرێ.

→ هەرەس کردن، پەراندن.
هەڵپەرتاوتن → برینەوە.
٧٠٧٥ 6536- هەڵپەساردن: دوو کەس لە کارمەندانی ئیدارەی ماڵیاتیان/ زەریبەیان هەتا لێکۆڵینەوە لە تاوانی دزیتییەکەیان هەڵپەساردوون.
→ بازنشستە کردن.
٧٠٧٦ 3507- هەڵترووشکان، خۆ دانواندن، خۆ مات کردن، قووت نەبوونەوە، دەهاتنەوە: "یەکێك دێ خۆ مات کەن و دەنگە دەنگی مەکەن". ● کاتێك گەیشتینە پردەکەی سەر کاناڵەکە داوەرنەوە دەنا سەر و رێی دەکەوێ.
٧٠٧٧ 6194- هەڵترووشکان: لەسەر هەمیوانی پێشەوە هەڵترووشکابوو، دەیگوت کەس ناتوانێ لێرە وەلام بەرێ.
→ لە تەنیشت کەسێك راوەستان.
هەڵتۆز هەڵتۆز کردن → هەروگیف لێدان.
هەڵتەکان لەبەر یەك → شکان.
هەڵچنین → هەڵدرین.
٧٠٧٨ 553- هەڵچوون: باشترە گازەکەی داکێشی/ کەم کەیەوە، دەنا (هەڵدەچێ و) سەوزییەکان دەرژێنە دەرێ.
٧٠٧٩ 2315- هەڵچوون، کوتکۆڵی خۆ لە دەست دان: هەتا تووشی گیروگرفتێك دەبی، زوو هەڵدەچوو.
→ تووڕە بوون، بەسەرداروخان.
٧٠٨٠ 3120- هەڵخستن، بە تەنهایی دانان: تەنیا یەك - دوو کراسی شووراوم هەیە کە دەبێ بە تەنافیان دادەم- جا ئەوجار دەتوانین بچین بۆ شتروەك کرین.
هەڵخلیسکان و لادان → کەم هێنان.
٧٠٨١ 6456- هەڵخەڵەتاندن، فێڵ لێکردن: پێم وایە ئەو کورە دەیەوێ فێڵمان لێ بکا. چارێك لە شەهادەکەی بکە.
٧٠٨٢ 6657- هەڵخەڵەتاندن، فریودان یان خواردن: بەداخەوە، ئێوە زۆر زوو هەڵدەخەڵەتێن.
٧٠٨٣ 3805- هەڵخەڵەتاندن، فریودان: لە پێشدا بەو جۆرە وادەو بەڵێنییانە فریویان داوین.
→ فریودان، رازی کردن، هەڵفریواندن.
هەڵداشتن → هەڵقرتین.
٧٠٨٤ 2378- هەڵدان، گەورە بوون، قەڵەو بوون: لەو کاتەوە کە ئاخرین جار چاوم پێت کەوتووە هەتا ئێستا زۆر هەڵت داوە.

٧٠٨٥ 2379- هەڵدان، گەشە کردن (لە باری مەعنەوییەوە): خەبەر کەسێکە کە وا نایەتە بەرچاو لە باری تێگەیشتووییەوە هەرگیز هەڵبدا.
٧٠٨٦ 6918- هەڵدان، بە قورەت بوون، کەیف پێ ساز بوون، گەشانەوە: بە مارمیلك گۆشتی خالیس خواردن زۆر باش هەڵی‌دا/ بە قورەت ببوو.
٧٠٨٧ 7165- هەڵدان، گەشە کردن، چوونە پێش، لە لەو هاتنەدەر: نەدەبوایە نیگەران بووباین. سەرەنجام هەموو شتێك باش لە ئاو هاتەدەر.
٧٠٨٨ 840- هەڵدان، گەورە بوون (بە چەشنێك کە پۆشاك بۆ بەری گەورە نایێتەوە): منداڵەکان راپان هەڵداوە/ وەها بەخێرایی گەورە بوون کە ئونیفۆرمەکانی/ سەدرییەکانی قوتابخانەیان بۆ نایێتەوە.
٧٠٨٩ 3062- هەڵدان لە بوونی ...دا: جان بن‌گرمان لەبارەی هێز و تاقەتەوە زۆر هەڵیداوە، بەڵام، بەداخەوە، نە لەباری ئاقڵبوونەوە.
هەڵدان → گەورە بوون، پەیدا کردن، بەسەرمردان، پەرمێدان، (تیر) هەستان، (چادر یان رەشماڵ) لێدان.
٧٠٩٠ 6977- هەڵدانەوە، وەرچ لێ‌هەڵدان: خەمرێك بووم نووسخەیەکی کۆنی رێنووێنی رەنگاوڕەنگم وەرچ لێ‌ دەدا کە سکرتێرێك هاتە ژوورو گوتی ئاغای سایتوس ئامادەیە ببینی.
٧٠٩١ 2285- هەڵدانەوە (خێراخێرا) لە حاڵێکدا نەخۆشەکان چاوەڕوانی خوێندرانەوەی ناویان بوون، خێراخێرا گۆڤارەکانیان هەڵدەداوە.
→ لێکردنەوە.
٧٠٩٢ 3002- هەڵدرانەوە (ی پەردەی شانۆ)، رووناك بوون: لە هەوەڵێن بەرنامەی شانۆ پەردە لەسەر ماڵێکی مام ناوەندی و نیوەجیاوازی ئینگلیسی هەڵدرایەوە.
٧٠٩٣ 7191- هەڵدرانەوە، هەڵدانەوە: لە بەرامبەر بایەکی سارددا کە دەهات، یەخەی بالتۆکەی هەڵدابۆوە.
هەڵدر هەڵدر کردن → ورد کردن.
هەڵدرین → کوتاودیو کردن.
٧٠٩٤ 6006- هەڵدران (ی چلکاو و ئاوی پیس): ئاوەیەك دە دەستشۆرییەکە کەوتو چلکاو هەڵڕژا سەر ئەرزی ئاشپەزخانەی.
→ هاتنە خوار.

٧٠٩٥ 2002- **هەڵرژانە نێو، رژانە نێو:** چەمی گەنگ هەڵدەرژێتە نێو کەنداوی بەنگال.

٧٠٩٦ 4713- **هەڵرشتن:** لە کابرای بێچارە گەڕاین دەردو داخی خۆی هەڵڕێژێ.

← بەتاڵکردن، درکاندن.

هەڵسوکەوت کردن ← بە شێوەیەکی رێکوپێك رەفتار کردن، خراپ جوولانەوە دەگەڵ.

هەڵسووڕان ← هاتووچوو کردن، لە عۆدە هاتنەدەر.

٧٠٩٧ 4063- **(بە فیزەوە لەگەڵ خەڵك) هەڵسوکەوت کردن، رەفتارکردن، جوولانەوە:** دەبوو بە شازنێك کە بە فیزەوە دەگەڵ خزمەتکارەکان رەفتاری دەکردو لە زەرقوبەرقدا دەژیا.

٧٠٩٨ 7109- **هەڵسەنگاندن، تاقیکردنەوە:** پێش ئەوەی لەسەر داهاتووی خۆشناو بریارێك بدرێ، لە بەشی بازار دیتنەوەدا تاقیان کردەوە.

٧٠٩٩ 6688- **هەڵسەنگاندن:** سێ رۆژ بوو لە دەرێ خەریکی هەڵسەنگاندنی وەزعی کۆخەکانو قایم کردنیان بووین.

٧١٠٠ 2053- **هەڵسەنگاندن، قەبلاندن:** پۆلیس ژمارەی خۆپێشاندەرانی دووهەزار کەس هەڵسەنگاندووە، لە حاڵێکدا بەرێوەبەرانی خۆپێشاندانەکە دەیانگوت ٥هەزار کەسە.

٧١٠١ 5027- **هەڵسەنگاندن(ی وەزعێك)؛** دەوڵەتەکەیان بە هۆی کۆرێکی نوێنەرایەتیی وڵاتێکی بێ لایەن خەریکە وەزعەکە هەڵدەسەنگێنێ....

٧١٠٢ 7361- **هەڵسەنگاندنو داوەری کردن، لەسەرزیابی کردن، تەخمین لێدان، نرخاندن:** ئاغای چارلتون بە چرکەیەك هەموو شتێکی هەڵسەنگاند.

هەڵسەنگاندن ←بیرکردنەوە لە، بەراورد کردن، گەڕانو چارگێران.

٧١٠٣ 5472- **هەڵشێلانو بیرەوەری دانان:** تاقمێك کوڕە جحێڵە لە دەرەوەی مەیخانەیەك زۆر باش بیرەوەرییان دادار هەڵیان شێلا.

٧١٠٤ 6701- **هەڵفڕین، پەروازکردن، هەستان(لە لەوەڕ):** فڕۆکەی سەرۆك وەزیران ئەمڕۆ بەیانی بەرەو برۆکسێل پەرواز دەکا/هەڵدەفڕێ.

٧١٠٥ 2317- **(زۆر نەوی) هەڵفڕین، بە هەوادا رابردن:** کاتێك تاقمێك فڕۆکە زۆر نەوی بەسەر جێگای رێو رەسمەکە رابردن، حەشیمەتەکە چاویان لە ئاسمان کرد.

٧١٠٦ 2313- **هەڵفڕین بەرەو، نیشتن لە، گەیشتنەجێ:** هاوکارەکەم هەر ئێستا لە لەندەنرا گەیشتەجێ. کە رابوو دەتوانن وتووێژەکەمان دەست پێبکەین.

٧١٠٧ 2041- **هەڵفریواندن، هەڵخەڵەتاندن، لێ دزینەوە(کەسێك لە کەسێك)، لێ پەشیمان کردنەوە:** خالی براون دەگەڵ خالی گرین نێوانی نیە چونکە لە بەری ئەچۆتەوە کە ناوبراو باخەوانەکەی لێفریودلوە.

← بەهەڵە بردن، فریودان.

٧١٠٨ 6155- **هەڵقولین:** رۆنێکی چڵکن لە کارتێلی ماشێنەکەی هەڵدەقولی.

٧١٠٩ 3086- **هەڵقولین، هەڵدەشتن، فرکە کردن:** لەسەر ئەو پیاوەی کە لەسەر دەکەلەکە بوو هاواری لێ بڵیند بوو دوای چرکەیەك دیتمان ئاو بە بڵیندایی ٥٠ فوت لە چاڵاوەکەوە فرکەی دەکا.

٧١١٠ 527- **هەڵقولین، هەڵتەقین:** گاز بە کەنار مەتەکەدا چۆرچۆر دەهاتو پاش ماوەیەك دەستی بە هەڵقولین کرد.

٧١١١ 6181- **هەڵقولین، هەڵتەقین، هەڵرژان:** برینکار نەشتەری لە کوانەکە داو چڵکو خوێن هەڵقولی.

٧١١٢ 1819- **هەڵکردن، بەنیازمەندیی کەسێك لە هۆدەی کارێك هەڵتەقین:** دەبێ شوێنیاتەکان بە پارەی گوفانی خۆت بکری. یان دەبێ بە بێ شوێنی بیگوزەرێنی.

٧١١٣ 6582- **هەڵکردن(ی دەزگای کارەبایی):** هاتبوو چراکان هەڵکاو سۆبەکان داگیرسێنێ.

٧١١٤ 7155- **هەڵکردن، وەسڵ کردن:** پێم وایە دەبێ یەکێك لە میلەکانی سۆبە کارەباکە هەڵکەین- ئەمشەو هەواکەی کەمێك سارد کردووە.

٧١١٥ 4976- **هەڵکردن:** لەماوەی نیو چرکەدا چراکەی هەڵدەکەم.

٧١١٦ 3257- **هەڵکردن، پێکەوە حاوانەوە، هەڵسوکەوت کردن دەگەڵ:** ئەوو مردیری ئیدارەکەی چۆن پێکەوە دەحاوێنەوە؟ (ئەو دەگەڵ مردیری ئیدارەکەی چۆن هەڵ دەکا؟).

٧١١٧ 7117- **هەڵکردن:** قۆڵی هەڵکردو داهاتەوەو دەستی دەناوەکە نا.

٧١١٨ 5054- **هەڵکردن، سووتاندن، شەمچە لێدان، شقارتە لێدان، گوگرد لێدان:** دارەکانم دە ئاورگێ ناوە. تەنیا کارێکی کە دەبێ بیکەی ئەوەیە کە شەمچەیەکی لێدەی.

٧١١٩ 2623- **هەڵکردن(ی با) توندو تیژتر بوون:** هەرچەند بە روونی دیار بوو کە با خەریکە توندو تیژتر دەبێ، بەو

حاڵەش ئەو ژنو مێردە کەرە بە بەلەمە شەقو شڕەکەیان بەرەو دەریا وەڕێ کەوتن.
هەڵکردن دەگەڵ، هەڵکردن (بۆ هەبوونی شتێك) ← تەحەمول کردن، (بۆشتێك) هەڵکردن.
٧١٢٠/ 7404- هەڵکردنەوە: بە دەرفەت دان بە ماسی بۆ ئەوەی کەمێك شریتەکە دەگەڵ خۆی بەرێ فریوی دەدەیەو، دەبێ لە پڕا شریتەکە هەڵکێشیەوە.
٧١٢١/ 6788- هەڵکردنەوە، خڕکردنەوەی (قەرێت): ماسوورەکەی/ غەرغەرەکەی زەبتەکەم شریتەکە هەڵناکاتەوە. شریتەکە لەسەر فەرشەکان پێچی خواردووەو بڵاو بۆتەوە.
٧١٢٢/ 1107- هەڵکردنەوە: مەلەوانەکان شریتەکەیان بە ڕێنلەو پێکی هەڵکردەوەو لە گۆشەیەکی "عەرشە" دایاننا..
٧١٢٣/ 6176- هەڵکردن یان دەست پێکردن، کەشەکردن، سەرهەڵدان: لە بەرەبەری ئێواری هەڵیکردە بایەکی سارد. ● دۆستایەتی لە نێوان خەڵکدا گەشە دەکا.
٧١٢٤/ 3923- هەڵکردنی چرای ماشێن: سەعات حەوتەو هێشتا یەك-دوو ماشێن چراکانیان هەڵنەکردون.
هەڵکشان بە پێچەو خوارەکە ← چوونە سەر بە ماربێچ، تەندوورەکێشان، هاتنەسەرتا....
٧١٢٥/ 1219- هەڵکەندران، لێبوونەوە: کاتێك گۆزەڵەکەم هەڵێنا، دەسکەکەی لێ بۆوە.
٧١٢٦/ 1268- هەڵکەندران، هاتنەدەر، دەرهاتن: ددانی کچە چکۆلەکە بە قەپاڵێکی کە لە سێوی دا هاتەدەر.
٧١٢٧/ 1132- هەڵکەندران، جیابوونەوە، لێبوونەوە: ئەگەر مریشکەکە باش بکوڵێنی، گۆشتەکەی بەهاسانی لە ئێسکەکانی دەبێتەوە.
← لێبوونەوە، شکانو لێبوونەوە.
٧١٢٨/ 1725- هەڵکەندن، هەڵقەندن: دەبێ ئەو دەوەنانە هەڵکەنین؛ بەرچاویان گرتووین.
٧١٢٩/ 7496- (بەزۆر) هەڵکەندن، دەرهێنان: دزێك بە تیژکردنی لوولەیەکی ئاسن لە لای سەرەوەی دەرگای ماشێنەکە، توانیبووی دەرگاکە هەڵکەنێ.
٧١٣٠/ 3075- هەڵکەندن (وگیانی خۆ ئازاوو ئەواوی کردن): ئاخرین جارێکی کابرا پیرەیان بە زیندوویی دیبوو کاتێك بوو کە خەریکی هەڵکەندنی دڕوو لە داوێنی کێوی بوو.
٧١٣١/ 7523- هەڵکەندن، دەرهێنان: بەدەستی کە دەتگوت گورەی ئاسنە، پڕیدا دەستەو هێندەی نەمابوو هەڵیکەنێ.

٧١٣٢/ 3026- هەڵکەندن، دەرهێنان: کچی لەوشای لەوێ راوەستابوو کە چاویان دەردێنا.
٧١٣٣/ 7192- هەڵکەندن، دەرهێنان لە لەوێ: کاشییەك کە هی ماڵێکی سەردەمی رۆمی قەدیم بوو لە ئەرزیان دەرهێناوە.
٧١٣٤/ 5644- هەڵکەندن، پشکنین (بە شتێکی نووك تیژ): چۆلەکە خە ریك بوون ئەرزی شێداری زەوییەکەیان بۆ کرمان دەپشکنی.
٧١٣٥/ 1719- هەڵکەندن (وەدەرهێنان): ئەو بەردە ئاسنانەی کە لەو کانزایەی سەرئەرز هەڵیان دەکەن، راستەوخۆ باری لۆرییەکانیان دەکەن.
٧١٣٦/ 3389- هەڵکەندن لەسەر: کاتێك ئاغای... بازنشستە بوو، سەعاتێکی زێڕیان پێشکەش کرد کە ناوو دەورەی خزمەتی لەسەر هەڵکەندرابوو.
٧١٣٧/ 1721- هەڵکەندنو هێنانەدەر: ئەگەر نەتوانین مشکەکان قانگ بدەین، ناچار دەبێ ئەرزەکە هەڵکەنینو دەریان بێنین.
← دەرپەراندن.
٧١٣٨/ 2175- هەڵکوتانەسەر دەست بە (خواردن، خەبات کردن، دەست پێکردن)؛ چێشتێك ئامادە کرابوو- وەك هاران هەڵیان کوتایە سەری.
٧١٣٩/ 2154- هەڵکوتانە سەر، پڕپێداکردن: هێزی دووهەمی سوارە قامیشەلانەکانی چزمەکەیان دەپشکنیو هەڵیان دەکوتایە سەر تالمە تاقو لۆژەکانی ئاڵمان.
٧١٤٠/ 2810- هەڵکوتانەسەر، خۆپێهەڵدان، هێرش کردنەسەر، هێرش کردنەسەر (بەشێوەی هێزێکی پان بەڵاسە): کاتێك چارلی بۆ جارێکی دیکەش بە مەستی گەڕاوە ماڵێ، ژنەکەی بە وەردێنە هێرشی کردەسەر.
٧١٤١/ 1718- هەڵکوتانەسەر (خواردن)؛ زۆر ساوماوێ مەکە: هەڵکوتە سەری!
٧١٤٢/ 1779- هەڵکوتانەسەر خواردن: چاوەڕوانی ئێمە مەبن بێینە سەر سفرەی، هەڵکوتنە سەری.
← دەست بە ناخواردن کردن، خۆ پێدادان، دەست پێکردن، هەڕا کردنە سەر، هێرش کردنەسەر.
٧١٤٣/ 4835- (بە ترومپا، بە پۆمپ) هەڵکێشان؛ ئەوتی لە کانگا ژێرزەمینییەکانەوە بە پۆمپ/ بە ترومپای هەڵدەکێشن.
٧١٤٤/ 7409- هەڵکێشان (بە سوورالدن)؛ هەموو شرشەکانی ماشێنەکەیان هەڵکێشابوو، لێیان دەخوری.

← کێشان، بە تەرازوو.

٧١٤٥ 3262- هەڵکێشانی دەلینگی شەلوار، پانتۆڵ: لەسەر کورسیی ناشپەزخانە دانیشت و دەلینگی شەڵوارەکەی هەڵکێشا بۆ ئەوەی نەکا ئرتۆزەکەی کە وەک دووحی رابوو بشکێ.

٧١٤٦ 4547- هەڵگرتن، هەڵگرتنەوە: نامە نیوە نووسراوەکەی/ ناتەواوەکەی هەڵگرت و لەسەر تاقەی سەر سۆبەکەی دانا.

٧١٤٧ 4552- هەڵگرتن، ئاشنا بوون دەگەڵ: دەگەڵ ئەو کچەی کە لە میوانییەکە هەڵیگرتبوو چووە ماڵێ.

٧١٤٨ 4880- هەڵگرتن، بایگانی کردن، فایل کردن، دەفایل نان: هەموو بەڵگەکانی نامە نیگارییان لە پەروەندەی/ فایلی ژمارە داردا هەڵگرت/ بایگانی کرد.

٧١٤٩ 670- هەڵگرتن، کۆکردنەوە (ی خەڵەو خەرمان): دەتوانن لەوە ئەرخەیان بن کە بۆ ماوەی چەند رۆژی دیکەش هەوا هەروا خۆش دەبێ و لەو ماوەدا دەتوانن خەڵەو خەرمانیان هەڵگرن.

٧١٥٠ 1881- هەڵگرتن (لە حیسابی بانک)، بەرهاشت کردن: نەیدەزانی کە خۆشنلو بۆ ئارەق خواردنەوەو رەدووی ژنان کەوتن و "مراد عەدر" چ مەبلەغێکی لە حیسابەکەی هەڵگرتووەو بە فیڕۆی داوە.

هەڵگرتن (بۆ)، هەڵگرتن لە، هەڵگرتن بۆ دەرفەتێکی تر، هەڵگرتن لەسەر سەرویس یان خزمەت ← (بە چەقۆ) برین، پاشەکەوت کردن، دەرهێنان لە، رفاندن، رێگادان بە، سواری کەشتی یان فڕۆکە کردن، کۆ کردنەوە (ی بەرهەم)، گەیشتنە...، لابردن لەسەر بەرپرسایەتییەک، وەدواکەوتن یان خستن هەتا...، وەلانان، وەدواخستن، بردن، کەم کردنەوە لە، هێنانەوە.

٧١٥١ 5564- هەڵگرتن، کردن، سەر لە مەبلەغێک دان، خۆ لە مەبلەغێکدان: تازە کردنەوەی ئەو خانووبەرەیە چەندە خەرج هەڵدەگرێ/ سەر لە چەندی دەدا؟

٧١٥٢ 7325- هەڵگرتن، بردن، راماڵین و دەدەریا هاویشتن: شەپۆلێکی بە تەوژم یەکێک لە مەلەوانەکانی کەشتی لەسەر عەرشەی هەڵگرتوو دەدەریایەی هاویشت.

٧١٥٣ 7112- هەڵگرتن (و لەبەردەستان لابردن): ئەو کراسەی کە لە رۆژی ناولێنانی دەبەریان کردبوو هێنادەرو پاش ئەوەی کە شریتە جوانەکەیان چاو لێکرد، لەسەرڕا بە وردی لە نێو کاغەزەکەی داپێچایەوەو دەجانتایەکی گەورەدا هەڵیگرتەوە.

٧١٥٤ 7376- هەڵگرتن (هێزا): کە کابرای سەرۆک وەژوور کەوت، پیاوەکان خێرا کڵاوەکانیان هەڵگرت و بە سەرلێشێواوییەوە رەق راوەستان.

٧١٥٥ 5130- هەڵگرتن، بەرهاشت کردن لە قازانج: پێتوایە لە رۆژی ئاخری هەفتە دەتوانی چەند لە قازانجی هەڵگری؟

٧١٥٦ 6416- هەڵگرتن، لە ئەمباردانان: جۆری بژێوییان لە سندووقی شیهەڵنەگر لە ئەمباردا هەڵگرتووە.

٧١٥٧ 6293- (بەدزی) هەڵگرتن، پاشەکەوت کردن، شاردنەوە: فاتێ هەمیشە بەستەی خواردەمەنییەکانی لە پشتی کەرمەدە قفڵ دارەکەی بە دزی هەڵدەگرێ بۆ ئەوەی بەشی کەس نەدا.

٧١٥٨ 6154- هەڵگرتن (و بۆ زۆری بردن) بە کەوچک، بە کەوچکان خواردن: سووپەکەی بە کەوچکان خواردو هاتەوە بۆ ئی دیکە.

٧١٥٩ 6050- هەڵگرتن، لابردن: زۆرم پێ ناخۆشە پێش ئەوەی نیوەی چێشتەکەم خواردبێ، دەورییەکەم لە پێش هەڵگرن.

٧١٦٠ 218- هەڵگرتن، چوونە زگ (فتی مندال)، ناخوێندنەوە نەدان: دیسان مشکان چوونەتە زگ پەنیرەکە؛ لە جێگایەکی باشتری دانێ.

٧١٦١ 3660- هەڵگرتن، تەواو بوون، لەسەر دەستان، بۆ کەوتن، پێدان یان پێدران: ئەو تەسجیلە ستوویزیەم زۆر پێ جوانە، دەبێ دووسەد پۆندێکت پێدابێ.

٧١٦٢ 5754- هەڵگرتن بۆ، وەلانان بۆ، تەرخان کردن بۆ، راگرتن بۆ: هەموو گۆشتە قرتووەکان مەخۆن. کەمێکیان بۆ رۆژی مەبادا هەڵگرن.

٧١٦٣ 930- هەڵگرتن بۆ، راگرتن بۆ: پێشنیار دەکەم هێندێک لەو مەسەلە چکۆلانە بۆ کۆبوونەوەی داهاتوو هەڵگرین/ راگرین و لەوێ بیاندەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

٧١٦٤ 44- هەڵگرتن بۆ...، راگرتن بۆ...؛ باشە، بەڕێزان، ئەگەر هەمووتان کارتان تەواو بووە، ئایا دەکرێ کۆبوونەوەکە راگرین و بچین قاوەیەکی (بۆ) بخۆینەوە؟

٧١٦٥ 6607- هەڵگرتن بۆ ئاسمان، لە ئەرزێ بڵیندکردن: لانیکەم دوو جار شتێکی وا رووی دا کە سەربازان لە ترسان خۆیان بە بەرزگی فڕۆکەکەیەوە یان بە چەرخی لای کلکییەوە هەڵاوەسیوەو فڕۆکە لە ئەرزی بڵیند کردوون.

٧١٦٦ 346- هەڵگرتن بۆ داهاتوو: کاری کتێبەکەم بۆ وەختێکی دیکە هەڵگرتووە، ئێستا کارم یەکجار زۆرە.

٧١٦٧ 3837- هەڵگرتن بۆ داهاتوو، راگرتن بۆ داهاتوو: بەداخەوە، دەبێ ئەو مەسەلانە بۆ کۆبوونەوەی داهاتوو هەڵگیرێن.

٧١٦٨ 106- هەڵگرتن بۆ خۆ: کاتێك کەس و کاری کابرای مردوو زانیان کە سەرومــــی ماشێنە ڕۆلزرویزەکەی بۆ خۆی هەڵگرتووە زۆر تووڕە بوون.

٧١٦٩ 7113- هەڵگرتن و شاردنەوە: دەلالی شتومەکی عەتیکە هەمیشە هومێدوارن شاکارێکی فەرامۆش کراو کە لە بەیتوونەی/ دیوی ژێر شیروانی پیرێژنێکدا هەڵگیراوەو شاردراوەتەوە بدۆزنەوە. جارجاریش شانس دێنن.

٧١٧٠ 4385- هەڵگرتن و لەبەردەستان لابردن: منداڵینە، کتێبەکانتان هەڵگرن/ وەلانێن، کاتی پشوودانە.

٧١٧١ 1735- هەڵگرتن یان دەرهێنانی (دراو) لە: بانك ناچار بوو لە حیسابی خۆی لە دەرەوەی وڵات هەڵگرێ بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی لە دەستی قەیرانی نابووریی لە نێوخۆی وڵات رزگار کا.

٧١٧٢ 6695- هەڵگرتنی کەسێك لەسەر کارێك و کارێکی دیکە پێئەسپاردن: دوو ئەفسەر خوفیە/کاراگایان لەسەر کاری لێکۆڵینەوە هەڵگرتووو کاری یارمەتیدان بە دەوسییەی پیاو کوشتنێکیان پێئەسپاردن.

هەڵگرتن بەخۆدا ← خۆهەڵدانەوە.

٧١٧٣ 2858- هەڵگەڕان، ترشان، خراپ بوون: ئەو شیرە بەیانی تازە بوو، بەڵام ئێستا هەڵگەڕاوە.

٧١٧٤ 7184- هەڵگەڕانەوە (بە شێوەیەکی نالەبار): لێرەدا خاوەن ماڵەکە هەڵگەڕایەوەو گوتی ناتوانن ماڵەکەمان بداتێ چونکە بەقسەی خۆی دابووی بە رەفیقێکی خۆی.

٧١٧٥ 5453- هەڵگەڕانەوە، وەرسووڕان، ئەم کەلەکەو لەو کەلەکە کردن، جینگڵدان: هەر جارەی کە لە نێو جێگادا جینگڵێکی دەدا بەشێکی لە لێفەکەی بۆ لای خۆی رادەکێشا.

٧١٧٦ 1790- هەڵگیران، نەمان، نەهێشتن: لە زۆربەی وڵاتانی ئورووپایی سزای مەرگ هەڵگیراوە.

٧١٧٧ 229- هەڵگیران، وەلاندران: نازانم دەتوانم نامەکان بدۆزمەوە یان نا. لە قوتووی پێڵاوانم ناون و لە هۆدەی ژێرشیروانی هەڵگرتوون.

هەڵگیران ← بەکار نەهاتن، لێبوونەوە.

هەڵگێڕانەوە (ی کۆتێك، لیباسێك) ← بەراوەژوو کردنەوە.

هەڵگوسانتن ← هەڵپسانتن.

٧١٧٨ 826- هەڵگیرسانەوە، هەڵپسانەوە، گڕسانێکی تازە وەبەرهاتنەوە، وەخۆکەوتنەوە: کۆلکەیەکی هاوێشتە نێو سۆبەکەو ئاورەکە بە ترپە ترپ هەڵگیرسایەوە/هەڵبۆوە.

٧١٧٩ 5802- هەڵاو بگر وەرێخستن، دەست کردن بە هەراو هوریا: هەرکە پێی نایە سەر بەرزەلە تەماشاچییەکان هەراو هوریایەکی ئەوتۆیان وەرێخست کە بە ناچاری بەرنامەکەیان بڕی.

← هەراو هوریا کردن.

٧١٨٠ 3312- هەڵاو بگر وەرێخستن، هەڵا هەڵا کردن، گرمەو هەرا وەرێخستن: پاش تەواو بوونی یارییەکە، هەراهەرایەکی سەیر لە دیوی لیباسان وەرێکەوت.

٧١٨١ 4335- (بە خۆرایی) هەڵاو بگر وەرێ خستن، کردنە هەڵا: "نازانم بۆ دەبێ بۆ خاتری ئەو چەند پۆندەی کە دەیدەن بە سندووق (ی خێراتان) بە خۆرایی بیکەنە هەڵا. خودا دەزانێ کە چەندە دەوڵەمەندن.

٧١٨٢ 923- هەڵاو گێچەڵ ساز کردن، هەڵا هەڵا کردن: مامە پیرە بۆ قەڵەمەکەی دەگەڕاو هەڵاو گوڕەمیەکی وەهای ساز کردبوو کە دەتگوت زەنی لێون بووە.

٧١٨٣ 4097- هەڵا هەڵا کردن، هەراسان کردن: لەسەر یەکێك لە وەرگیراوەکان هەرا هەرای بوو.

← کێشەو هەڵا کردن، تووڕەیی نیشاندان.

هەڵلووشین ← قووت دان.

٧١٨٤ 6070- هەڵمژین، هەڵهێنجین: ئەگەر مەرەکەب بە ئەرشیدا رژا، خێرا بە ئیسفەنجێکی هەڵیمژنەوە.

٧١٨٥ 6071- هەڵمژین، فێربوون: بۆ پێشکەری کردن لەو کورە هیچ رێگایەك نیە. هەروەك ئیسفەنج زانیاریی تازە هەڵدەمژێ (= فێردەبێ).

٧١٨٦ 6779- هەڵمژین، مژین، هەڵهێنجین: ئەو پەڕۆیە تەواو تەڕ بووە، ناتوانێ چیدیکە لەم ئاوە هەڵمژێ.

٧١٨٧ 6569- هەڵمسان، ئەستوور بوون: ئەو گرانەی برینندار مەکەن، لێی گەڕێن ئەستوور بێ و بگاو بۆخۆی دەڕێ.

هەڵمساندن ← با تێکردن.

هەڵم گرتن ← داپۆشران بە هەڵم.

هەڵمیسین ← هەڵمژین.

هەڵنەستان ← بەردانەوە.

هەڵنەگرتن (ی کڵاو) ← دانەکەندن.

٧١٨٨ 4526- هەڵنیشتن لەسەر: ئەو کۆترانە دەستەمۆن؛ ئەگەر راوەستێو نەبزوون، دێن و لەسەر شانتان هەڵدەنیشن.

٧١٨٩ 5469- هەڵوەرین: ئەرزەکە لە چڵەداری وشک کە دوای وشک بوونی دارەکان هەڵوەریبوون داپۆشرابوو.

٧١٩٠ 2273- هەڵوەرین، لێبوونەوە: ئامرازە تەختەیی یەکانی مالیمان کە دەکڕاندن، رەنگەکەیان هەر بۆ خۆی هەڵدەوەری.

← لێبوونەوە.

هەڵوەشاندن ← تێکدان، بڵاوە لێکردن.

٧١٩١ 6234- (لە ئەرتەشدا) هەڵوەشاندنەوە، هەڵوەشاندنەوە: هێندێک لە هەنگەکان پێیان باشتر بووە هەڵوەشێنەوە هەتاکو تێکەڵ بە یەکانەکانی دیکە بکرێن.

٧١٩٢ 7320- (لە وەرزشدا) هەڵوەشاندنەوە، تەعتیل کردن: بارانی قورس و لەدوای یەک ٥ پێشبڕکێی باشگاکانی/ یانەکانی هەڵوەشاندەوە.

٧١٩٣ 5421- هەڵوەشاندنەوە، تێکدان، لەناو بردن، تێکدانەوە: ئەگەر بتوانن پێش ئەوەی مەرەکەبی رێککەوتننامەکان وشک بێتەوە تێکیان دەنەوە، ئیدی زۆر زەحمەت پێلو بتوانن هیچ بەرپاوەرێکی بەوجۆرە مامەڵاتە ببێنن.

٧١٩٤ 5752- هەڵوەشاندنەوە: حوکمی دادوەریان باتڵ کردووەو مەحکومییەتەکانیشیان هەڵوەشاندەوە.

٧١٩٥ 2174- هەڵوەشانەوە، بەهیچ جێگایەک نەگەیشتن، هیچ لێ ساغ نەبوونەوە، تێکچوون: بە هۆی چەند کاری گرنگ کە دەبوو کاوە وەمێنێ و پێیان رابگا، نەخشەکەمان بە هیچ کوێ نە گەیشت.

٧١٩٦ 324- هەڵوەشانەوە، بەڕێوەنەچوون: پێم گوت: شایی یەک نابێ، هەڵوەشاوەتەوە.

٧١٩٧ 5662- هەڵوەشانەوە، هەڵفاییونەوە، تێکچوونەوە: هەموو مانۆڕەکان/ تەدریبەکان هەڵوەشاونەتەوە. بەم زووانە فەرمانی تازەمان پێدەگا.

← (بە هۆی بارینی بەفر و ...) وەدوا کەوتن، بڕان.

٧١٩٨ 1062- هەڵوەژاردن و خاوێن کردنەوە، دەست پێداهێنان: ئێستا کە کایە کردنمان تەواو بووە، پێت چۆنە ماڵەکە هەڵوەژێرین و خاوێنی کەینەوە؟

٧١٩٩ 1282- هەڵوێست گۆڕین، چوونە لایەکی دیکە، هاتنە لایەکی دیکە: لە قۆناخێکی زۆر ئەستەمی شەڕدا، یەکێک لە بەهێزترین هاوپەیمانەکانی دوژمن (هەڵوێستی گۆڕی و) هاتە بەری ئێمە. ● پێت چۆنە بێیە لای ئێمە؟ لە ماوەی ساڵێکدا پارەمتریەکەت دەبێتە دوو بەرامبەر.

← دەگەڵ خۆ خستن.

٧٢٠٠ 755- هەڵوێستە پێکردن، راگرتن، لەسەر جێگای خۆ وشک کردن: هاواری لە نەکاوی دۆستەکەمان (لەسەر جێگای خۆمان) وشکی کردین.

هەڵوێستەیەک کردن ← چاوەڕوان بوون.

٧٢٠١ 6790- هەڵوێستی دیفاعی گرتن: شەرێک پێشتر، ویلینگتۆن لە درێژایی و لە پشتی باسکەکەی سەنگەری دیفاعی گرتبوو/ لێدابوو.

٧٢٠٢ 6730- هەڵوێستێکی سەرسەختانە گرتن: دەوڵەت ناچارە لە پێوەندی دەگەڵ کێشەی بڕیو/ خەرجی ژیان هەڵوێستێکی سەرسەختانە بگرێ.

٧٢٠٣ 67- هەڵوێستی یەکسان گرتن دەگەڵ، بوون بە هاوپەیمان دەگەڵ: حیزبی کۆمۆنیست بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو دەگەڵ حیزبی سۆسیالیست هەڵوێستێکی یەکسانی گرت. ● ئەو وڵاتە چکۆڵە بۆتە هاوپەیمانی گەورە هێزێک.

هەڵە کردن ← بوونە هۆی هاتن پێشی هەڵەیەک.

هەڵەنگوتن ← سەرسم خواردن.

هەڵە هەڵ کردن ← هەوڵدان (بە هەڵەهەڵ).

٧٢٠٤ 4753- هەڵێنان، هەڵکەندن، لابردن (بە ئوسە، تالیۆر، تالیەرو ...): سەری سندوقەکانمان بە تالیوێر/ تالیبەر لابرد/ هەڵکەند. ● تەپاخەکەی بە قامکی هەڵێنەو لایبە.

٧٢٠٥ 3917- هەڵێنان: ئەگەر هەڵم بێنی، دەتوانم لاقێکم باوێژمە سەر دیوارەکە. ● پێت هەڵێنە؛ لەسەر داوێنی کراسەکەم راوەستاوی.

٧٢٠٦ 3139- هەڵێنان (هێلکە): قوڕی گەرمی کەنار جۆمەکە هێلکەکانی هەڵێنا.

٧٢٠٧ 3140- هەڵێنان: مریشک بە داپۆشینی هێلکەکان بە پەڕو باڵە گەرمەکانی هەڵیان دێنێ.

هەڵێنان ← بڵیندکردن، جەک لێدان، قورت کردنەوە.

٧٢٠٨ 5626- هەڵێنجان، هەڵگرتن (بە کەوچک یان هەر قەستێکی ئەو قووڵ): دەستی کردنە کۆزیلکەو مستێکی ئاو هەڵگرت. ● بە کەوچکێک چەند دەنک خاکی زێڕی هەڵگرت.

٧٢٠٩ 1850- هەڵێنجان، بەتاڵ کردن، دەرکێشان، دەرهێنان، کێشان: یەکێک لە نێرسەکان بۆ کێشانی چلکی سووروە کوانەکە نەشتەری لێدا.

٣٣١٠ 4928- **هەموو پارەکەی خۆ لە گیرفانێک نان:** ناتوانی بۆ هەتا هەتایە دەگەڵ تاقە ژنێک ژیان بەسەر بەری- واتە نابێ هەموو پارەکەی دەگیرفانێک بنێ.

٣٣١١ 1492- **هەنجیل لێدان:** باترییەکە مردووە، بەداخەوە، دەبێ هەنجیلی لێبدەی.

هەنگاوتن ← لە هەدەف دان.

هەنگاو کردن ← پێوان بە هەنگاو.

٣٣١٢ 7098- **(بە پەلە) هەنگاو هەڵگرتن، هاتن، ڕۆیشتن، دوورکەوتنەوە:** لەسەرەتای پاش نیوەڕۆدا یەکەمین نەفەراتی بریندارەکان بە پەلە هاتنە ڕاکێشی برین پێچانێ.

٣٣١٣ 6722- **هەنگاو هەڵگرتن، ئیقدام کردن:** دەوڵەت بەڵێنی داوە لە پێوەندی دەگەڵ قەیرانی وزە بەخێرایی هەنگاو هەڵگرێ.

٣٣١٤ 6350- **هەنگاو هەڵهێنانەوە، خێراتر ڕۆیشتن:** بەوانی پێشەوە بڵێ لاق هەڵێننەوە (= خێراتر بڕۆن)- دەنا هەرگیز لە کاتی خۆیدا بۆ نانی شەو ناگەینەوە.

٣٣١٥ 4893- **هەنگاو هەڵهێنانەوە/ هەڵگرتن، بە ڕێگا داڕۆیشتن:** لەبەر دامەنێکی کورت و تەنگ کە هەتا سەروەی چۆکی هاتبوو بە حاڵەحاڵ دەیتوانی هەنگاو هەڵگرێ.

٣٣١٦ 4755- **هەنگاوی قانوونی هەڵگرتن لە دژی کەسێک:** پێش ئەوەی دەردەسەرو خەرجی ئیقدام کردن لە دژی ئەو کابرایە وەئەستۆ گرین، دەبێ لەوە ئەرخەیان بین کە ئەو تاوانانەی خراونەتە ئەستۆی ڕاستن یان نا.

٣٣١٧ 125- **هەواڵی (سلامەتیی کەسێک) پرسین:** لە بەوت بێ هەواڵی (سلامەتیی) مامت بپرسی.

٣٣١٨ 3229- **هەواڵێک (بەتایبەتی لە ڕێگای نامەوە) لە کەسێک بە دەست گەیشتن:** دایکم ماوەیەکە هیچ هەواڵێکی لە تۆ پێ نەگەیشتووە، وردە وردە هاتۆتە سەر ئەو بڕوایە کە ڕەنگە نەخۆش بێ.

٣٣١٩ 3231- **هەواڵێک دەربارەی کەسێک هەبوون، گەیشتن پێ، بەدەستەوە بوون:** بۆ ڕۆیشتن بە دەشتی ئەفریقادا بە ماشێن وەرێ کەوتن، بەڵام، لەو کاتەوە هەتا ئێستا هیچ هەواڵێکیان نەبووە.

٣٣٢٠ 3137- **هەوسار کردن، دەشتێک کردن، بەستنەوە، بەستن لە، تەرخان کردن بۆ:** کابرای جووتبەندە جووتێک گای دەعارەبەکەی کرد.

هەوسار لەسەر داماڵین ← دەنگدان.

٣٣٢١ 2171- **هەوڵدان، تێکۆشان، بە دڵەوە هەوڵدان:** بە بڕوای من هەموو کەس بە دڵەوە هەوڵ دەدەن دەگەڵ پزیشکی ژن جوان بجووڵێنەوە.

٣٣٢٢ 2304- **هەوڵدان:** لۆرییەکی قورس لە سەرەتای گۆڕایی پێش عیمارەتەکە هەوڵی دەدا لە قوڕەکە خۆی ڕزگار کا.

٣٣٢٣ 3813- **هەوڵدان، تێکۆشان:** بەرپرسانی تاقیکاریی هەوڵیان دەدا بۆ قبووڵ بوونی کابرای داوتەڵەب لایەنی باشی وەرەقەی تاقیکارییەکەی بلۆزنەوە.

٣٣٢٤ 2663- **هەوڵدان، تێکۆشان:** ئەمڕۆ ئەگەر هەمووتان بە هەموو تواناوە تێبکۆشن، بێگومان کاپەکە دەبەنەوە.

هەوڵدان ← تێکۆشان، (بەدڵ و بەگیان) تێکۆشان.

٣٣٢٥ 4807- **(بە هەموو تواناوە) هەوڵدان بۆ ئەوەی ...:** دەوڵەت بە هەموو توانا(یە)وە هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی کە لایەنی پێوەندیی سنعەتییەکان لە یەک کۆبوونەوەی پارلەماندا پەسند بکرێ.

٣٣٢٦ 81- **هەوڵدان بۆ ڕاکێشانی زەینی خەڵک بە شێوەیەکی ناشیاو:** بریا ئەو ژنە ئاوا بە ئاشکرایی بۆ ڕاکێشانی زەینی خەڵک هەوڵی نەدابا.

٣٣٢٧ 6913- **هەوڵدان (بە هەلەهەل)، هەلەهەل کردن:** جیا لە نووسینەوەی مەشقی حیسابەکەی بە تەواوی جارز ببوو، بۆ دیتنەوەی وەڵامی پرسیارێکی زۆر ئاسانا بە هەلەهەل هەوڵی دەدا/ هەلەهەلی بوو.

٣٣٢٨ 6428- **هەوڵدان، تێکۆشان، گوشار هێنان:** هیوادار بووین بتوانین ئەو زانا گەنجانە لە لای خۆمان ڕاگرین، بەڵام ئەوان هەوڵیان دەدا کاری باشتر بدۆزنەوە.

٣٣٢٩ 4162- **هەوڵدان بۆ، تێکۆشان بۆ، ووزەیەکی بە خەرج دان، ئیقدام کردن:** ئایا بۆچوونە سەرکار و چارەسەرکەوتن دەگەڵ خەڵک هەوڵ دەدەی سەری وەختی دیاریکراو بچی؟

٣٣٣٠ 5635- **هەوڵدان بۆ:** ئەو بنەماڵانەی کە تۆزەمەیەک لەمەوپێش دەوڵەمەند ببوون، تێدەکۆشان/ هەوڵیان دەدا بۆ ئەوەی پلەوپایەو مەقامی (دەوڵەتی) وەدەست بێنن.

٣٣٣١ 4174- **هەوڵدان بۆ شکاندنی ڕیکۆردێک:** دەوەندە کینیاییەکە لە هاوینی ئەوساڵەدا دوو جار هەوڵیدا ڕیکۆردی ٥ هەزار میتری بشکێنێ.

٣٣٣٢ 4175- **هەوڵدان بۆ کوشتنی کەسێک:** دوێنێ شەوێ، دیسانیش هەوڵیان دا جێگری شا (ولیعهد) بکوژن/تێرۆر کەن.

هەوەڵێ ← لە سەرەتادا.
هەیها پێ‌گوتن ← تێراخوڕین.
هیچ بۆ نەکران ← بێچارە بوون.

٧٢٣٣ 6859- **هیچ پێوە نەهێشتن، دانە بەرشاڵاوی ڕەخنەوە:** گەیشتبۆوە ئەو ئەنجامەی کە نیدی نەیدەتوانی لەبەرچاوی خۆی ئوستادی ڕێنوێن بەشێکی دیکە لە کارەکانی بێرەحمانی بداتە بەر ڕەخنانو هیچی پێوە نەهێڵێ.

٧٢٣٤ 1825- **هیچ ڕێگایەک لە پێش نەبوون بێجگە لە ...:** نەخشەکەی بۆ کێشانی جادەیەکی پان بە سەحرای ناوەندیدا هیچ چارەنووسێک بێجگە لە شکستی لە پێش نەبوو.
هیچ شتێک نەشاردنەوە ← ڕاستی‌یەکەی گوتن.

٧٢٣٥ 6357- **هیچ شتێک مەنزوور نەبوون، دەست لە هەموو شتێک هەڵگرتن:** "خۆشی دەوێ؟ بێ‌گومان خۆشی ناوێ. ئەو دەست لە هەموو شتێک هەڵدەگرێ بۆ ئەوەی ئەتۆ لەسەر ڕێگای خۆی وەلابەرێ".

٧٢٣٦ 2112- **هیچ کام نەبوون، لە ئەم بوونو لە ئەو:** ئەو پێشانگەیە نە پێشانگەیەکی مێژوویی‌یەو نە پێداچوونەوەیەک بەسەر هونەرەکانی ئەم سەردەمەدا- لەڕاستیدا لە هیچ کام لەو دووبارەوە سەرکەوتوو نیە.
هیچ لێ ساغ نەبوونەوە ← هەڵوەشانەوە.

٧٢٣٧ 271- **هیچ نەمان بێجگە لە ...:** پادگانەکە بۆ ماوەی مانگێک بەرپەرەکانیان کردووەو ئێستا بێجگە لە ئاخرین دەراغەکانیان هیچ شتێکیان نەماوە.

٧٢٣٨ 1129- **هێرش بردنە سەر یان کردنە سەر، پەلاماردان:** کابرا شێتەکە بە بیروی قەسابی پەلاماری دام.
← خۆ پێدادان.

٧٢٣٩ 2848- **هێرش دەست پێکردن، عەمەلییات دەست پێ کردن:** لەحاڵێکدا دەمو چاوی خۆیان ڕەش کردبوو بۆ ئەوەی دیار نەبن، کۆماندۆکان شەوانە عەمەلیاتیان دەست پێ کرد.

٧٢٤٠ 3261- **(بە توندی) هێرش کردنە سەر (لە ڕۆژنامەدا یان لەسەر تەلەفزیۆن):** مەتران/ئوسقوف زۆر بە توندی هێرشی کردە سەر فەرهەنگی هیپیان.

٧٢٤١ 3771- **هێرش کردنە سەر، بەتوندی:** ژیلوانم دی کە هێرشی کردە سەر کابرایەکی کە دوو هێندەی خۆی دەبوو.

٧٢٤٢ 3735- **(بە زمان یان بە کردەوە) هێرش کردنە سەر/ بردنەسەر:** وا دەهاتە بەرچاو کە دەیەوێ هێرشی بکاتە سەر، بەڵام خۆی ڕاگرت.

٧٢٤٣ 3724- **(زۆراوەی لاتینی)، (بە دەستان یان بە قسە) هێرش کردنە سەر:** لە ڕوندی/ خولی ئاخردا سمیت زۆر توند هێرشی کردە سەر حەریفەکەی. ● کابرای بێچارە چی‌گوت کە ئاوا هێرشت کردە سەری؟

٧٢٤٤ 5747- **هێرش کردنە سەر، هەڵکوتانەسەر:** خالی فاونتین گرتی: ئەگەر گەورگرفتێکمان بۆ بێتنە پێش، بەم مەلاقیە/ ئەسکۆرییە هێرشیان دەکەمە سەر.

٧٢٤٥ 7157- **هێرش کردنە سەر (بە قسە یان بە کردەوە)، بەسەرداڕووخان:** تەنیا بە هۆی ئەوە کە باران سەیرانەکەی لێ تێک داوین بەسەرم دا هەرووخێن.

٧٢٤٦ 991- **هێرش کردنە سەر، هەڵکوتانە سەر:** لە حاڵێکدا سەری دانواندبوو و مستی داوێشتێ هەلیکوتا سەرم.

٧٢٤٧ 4598- **هێرش کردنە سەر، بە تووندییەوە دەست پێکردن بەکاری، هەڵکوتانە سەر خواردن:** دیسانیش سوپاس بۆ یارمەتی‌یەکی کە لە کاتی هاتنە پێشی ئاڵماندا بە ئیمەت کردو بە توندی هێرشت کردە سەریان. ● دوای ڕۆژێک کارکردن لەمەزرایە، بە ئیشتیایەکی ئەدیترلوەوە هەڵیان کوتایە سەرخواردن.

٧٢٤٨ 3436- **هێرش کردنە سەر (بە نووسراوە، یان بە قسە):** زۆر کەس هەن کە بۆ هێرش کردنە سەر ئەو شتەی بۆخۆیان پێی دەڵێن هاتنە خواری "مەعنویات"، هیچ دەرفەتێک لە دەست نادەن.

٧٢٤٩ 3260- **هێرش کردنە سەر باولینگ (لە یاری کریکێتدا).**

٧٢٥٠ 2765- **هێرش کردنەسەر، هەڵکوتانە سەر:** ئەو دوو پیاوە یەکجار تووڕە بوونو بە هەموو توانەوە هێرشیان کردە سەر یەکتر.
← بەرەو ... پێشڕەویی کردن، هەڵکوتانە سەر، خۆ پێدادان، هالاویز بردن، لووو بوون بۆ.

٧٢٥١ 1687- **هێرش کردنەسەر یان بردنە سەر:** تاقمە ئەسپ سوارە تالانچی‌یەکان هێرشیان دەبردە سەر سەیتەرە تەریلە کەوتووەکانی بازرگانی.

٧٢٥٢ 7005- **هێرش کردنەسەر یان بردنەسەر دوژمنی خەیاڵی:** کەوابوو ئیجازە بدەن لە کێشەو هەڵلا لە نێو خۆمان دەست هەڵگرین. هێرش کردنە سەر دوژمنانی خەیاڵیش کۆتایی پێ بێنین.
هێرش کردنەسەر نان ← دەست بە ناخواردن کردن.
هێرش کردنەسەر، یان کرانە سەر ← لە بۆ سەرا تیرئەندازی لێکردن، خۆ پێدادان.

٨٧٢٥٣ 1524- **هێرش هێنان بۆ مێشک، مێشک لەناوچوون کردن:** ڕووداوەکانی ژیانی ڕابردووی هێرشیان کردبووە سەر مێشکی کابرای ناوبردوو.

٨٧٢٥٤ 2081- **هێز خەسارکردن لە، وەخت خەسارکردن لەسەر:** ئەگەر بتانەوێ بگەڕێنەوە، ڕازاندنەوەی ئەو خانووە بابەتی ئەوەی نیە هێزو توانای خۆتانی لێ‌خەسار بکەن.

٨٧٢٥٥ 973- **هێزی خۆ لەسەر شتێک کۆکردنەوە یان وەگەڕ خستن:** ماوەیەکە هەموو توانای خۆم بۆ لێکۆڵینەوە لە شێوەکانی کشتوکاڵی خەڵک وەگەڕ خستووە.

٨٧٢٥٦ 3471- **هێزی خۆکردن بە یەک، یەکگرتنەوە:** ئەو هێزەی کە بۆ پێشڕەوی لە جەناحی دوژمندا ناردرابوو، دوای دوو ڕۆژان دەگەڵ هێزی ئەسڵیی خۆمان یەکی گرتەوە.

٨٧٢٥٧ 7219- **هێزی کارێک نەمان، توانایی لە دەستدان:** بە هۆی لەدەستدانی لاقەکانی توانایی هەڵفرینی (بە فڕۆکە) لە دەست داوە.

→ ڕەجل لێبڕان.

هێشتنەوە → ڕاگرتن.

هی کەسێک بوون → پێوەندی هەبوون بە.

٨٧٢٥٨ 5549- **هیلاکو شەکەت کردن:** لە حاڵێکدا ئاڵمانییەکان لەشکرەکانیان بە هۆی کار لێ‌کێشانی لەڕادەبەدەرو تەلەفاتێ بەرسیایەتی هیلاکو شەکەت کردبوو، ئەرتەشی سوور ئەرتەشێکی یەکجار گەورەی زەخیرەی ئامادە کردبوو.

٨٧٢٥٩ 4331- **هیلاکە کردن (لە ...دا):** کاتێک خەریکی خاوێن کردنەوەی هۆدەی ژێر شیروانی بووین، بنەماڵەیەکمان مشک وەدەرخست کە لە ژێر کۆمایەک ڕۆژنامەکۆنەدا هیلانەیان کردبوو.

٨٧٢٦٠ 3424- **(بۆ یەکەم جار) هێنان ... هاتن بۆ:** هێندێک کەس دەڵێن سێر واڵتر ڕالی یەکەم جار تووتنی لە ئامریکاوە هێنا بۆ بریتانیا. ● کەس نازانێ کە نەخۆشیی گەڕۆشکان چلۆن یەکەم جار هاتۆتە بریتانیا.

→ وارید کردن، بردن.

هێنانە خوار → داکێشان، داشکاندن، بڵیند نەکردن، کەم کردنەوە، بەردانەوە، بێ بایخ کردن، لە ئەرزدان، ڕاگرتن، کەم کردنەوە، دادانەوە.

٨٧٢٦١ 5127- **هێنان یان هاتنە سەرئاوێ:** مەلەوانان لە هەر پارچەیەک لەو شتانەی کە لە دەریادا نوقم بوون ژاکێتێکی جیلیان دەبەست. دوایە ژاکێتەکەیان با دەکردو بەو جۆرە پارچە شتەکە دەهاتەسەر ئاوێ.

٨٧٢٦٢ 702- **هێنانە بازاڕ، بڵاوکردنەوە:** کارخانەی بریتیش لەیلان مانگی داهاتوو مۆدێلێکی تازەی ماشێنی سواریی سپۆرت دێنێتە بازاڕ.

٨٧٢٦٣ 4569- **هێنانە بەرچاو، وادانان:** خوێنەرانی بەڕێز دەتوانن وادانێن کە ئەگەر ئەو حەشیمەتەیان لەو شەقامە تەنگانە قەڵاچۆ کردبا، چ هەڵات هەڵاتێک ساز دەبوو.

٨٧٢٦٤ 1402- **هێنانە بەرچاو:** قسەکانی کابرای وتار بێژ دنیایەکی بێ‌کەموکووڕی دەهێنایە بەرچاو، دنیایەک کە لەودا خەڵک دراوسێکانیان خۆش دەوێ.

→ بیرکردنەوە لە، وەبیرهێنانەوە، خستنەوە بیری شتێک.

٨٧٢٦٥ 1889- **هێنانە پێش، نزیک کردنەوە:** مێزەکەیان لە دیوارەکە نزیک کردەوە.

٨٧٢٦٦ 6974- **هێنانە پێش، دەلەی ... وەلاخستن:** تکایە چەترەکەت بۆ لای من مەهێنە پێش؛ ئەعسابم ناڕەحەت دەکا.

٨٧٢٦٧ 4919- **هێنانە پێش، بردنە پێش، وەپێش خستن:** ئەمشەو لە سەرەتای دەست پێکردنی هاوین، دەبێ سەعاتەکان یەک سەعات وەپێش خەن.

→ هێنانە گۆڕێ.

٨٧٢٦٨ 6631- **هێنانە خوار:** نووسەخەی "کتێبی مردووەکانی تەبەت"م هێنایەخوارو هەروا لێکم کردەوە.

٨٧٢٦٩ 1696- **هێنانە خوار، کەم کردنەوە لە:** دەنگی بەرزو سەرو گوڕلاکی نالەباری لە تەئسیری ئەو وەک وتار بێژێک کەم دەکەنەوە.

٨٧٢٧٠ 5284- **هێنانە خوار، چکۆلە کردنەوە:** ئەو هەرگیز کارمەندە پایەبەرزەکانی لە بریاردان دا بەشدار ناکا؛ ئەوانیش هەست بەوە دەکەن کە هەتا ڕادەی نامەبەرێک چکۆلە کراونەتەوە.

٨٧٢٧١ 4795- **هێنانە خوار:** وا دەهاتە بەرچاو کە بۆ بردنەوەی میدالیای زێڕ بە تەواوی ئامادەیە، بەڵام چالاکییەکەی لە خولی سێهەمدا ئەوی هێنا خوارێ.

٨٧٢٧٢ 660- **هێنانە خوار، کەم کردنەوە، داشکاندن:** وشکە فرۆش حازر بوون نرخی چەند شتومەکی زۆر پێویست داشکێنن.

٨٧٢٧٣ 5168- **هێنانە خوار، داگرتن:** دەکرێ لوتف بکەیو "بافتنی"یەکەم کە لەسەر تاقەی سەرەوەیە بۆم بێنی‌خوارێ؟

٨٧٢٧٤ 3915- **هێنانە خوار، کێشانە خوار، داگرتن:** ئەو جەعبەیە قورس دێتە بەرچاو، ڕاوەستە بۆت داگرم.

٣٣٧٥ 3855- **هێنانە خوار**: دایکو بابی کچە نێستانداردی ئەرزیشەکانی خۆیان پاراستبوو، بەڵام ئەو هێنابوونی خوارێ.

٣٣٧٦ 2312- **هێنانە خوار، دابەزاندن**: فڕۆکەوانەکە فڕۆکە بۆمب هاوێژەکەی، کە بە تەواوی لە کار کەوتبوو، تەنیا مەتۆرێکی کاری دەکرد، بە سەلامەت هێناخوار.

٣٣٧٧ 6808- **هێنانە خوارەی فڕۆکەیەک بە ئاوردانی پەیامێک بۆ فڕۆکەوانەکە)**: کاتێک چاو باش هەتەر ناکا، یان چەندین فڕۆکەی دیکە دەیانەوێ بنیشن، هێنانە خواری فڕۆکەیەک دەبێتە پێویستی‌یەکی بێ‌ئەملاوئەولا.

٣٣٧٨ 5248- **هێنانە خوار (لە پلەیەک بۆ پلەیەکی خوارتر)، کەم کردنەوە**: کاتێک دەگەنە ئاوەدانی، سوورعەتی ماشێنەکانتان هەتا سێ مایل لە سەعاتدا بێننە خوارێ/ کەم کەنەوە.

٣٣٧٩ 661- **هێنانە خوارەی مەوە لە لێکدان و دابەش کردندا)**: کاتێک دوو یان چەند رەقەمان تێکدا "ضرب" دەکەین کە سیفریان لە پێش بێ، باشترە لە پێشدا سیفرەکە بێنینە خوار.

٣٣٨٠ 476- **هێنانە خوارەی نرخی ... بە کەسێک)، پێداشکاندن**: داوای ٨٠٠ پۆندی بۆ ماشێنەکەی دەکرد، بەڵام هێنامە سەر ٦٠٠ پۆند/ ٢٠٠ پۆندم پێ داشکاند.

٣٣٨١ 5241- **هێنانە خوار تا رادەی، توشی وەزعێک کردن**: هاتنەخواری بێ پسانەوەی رادەی بەرهەمی دەغڵودان، جووتیارە چکۆلەکانی دوچاری هەژاری‌و دەستەنگی کرد.
→ دوچاری وەزعێک کردن.

٣٣٨٢ 5245- **هێنانە خواری پلە و پایە**: لە ئەرتەشی بریتانیادا، تەنیا دادگای نیزامی دەتوانێ پلەوپایەی ئەفسەرانی کادر بێنێتەخوارێ.
→ بە پێلاقە خستنە خوار.

٣٣٨٣ 1618- **هێنانە خواری دەرەجەی گەرما**: ئەو بۆیلەرانە گۆشارێکی زۆر دروست دەکەن: دەبێ دەرەجەی گەرماکەیان بێنینە خوارێ.

٣٣٨٤ 6697- **هێنانە خواری نرخی ...، کەم کردنەوە لە مالیات/ زەریبە**: بۆ کەم کردنەوەی مالیات/ زەریبە لەسەر گرێوکردنان هیوایەکی ئەوتۆمان نیە.
هێنانە دەر → دەرپەڕاندن، دەرهێنان.

٣٣٨٥ 5015- **هێنانە دەر، دەرکردن**: ئەمامەکان لق‌و پۆیان دەرکردووە.

٣٣٨٦ 2433- **هێنانە دەر، دەرکێشان، راحەت کردن لە دەستی**: گوڵ میخەکە ژەنگی هێنابوو، ئەمدەتوانی دەری بێنم. ● ئەو ژنە بەستەزمانە دەبێ بۆ ماوەیەک لە دەستی منداڵداری راحەت بکرێ‌و زۆر باش بحەسێتەوە.

٣٣٨٧ 708- **هێنانە دەر**: ژێرخانەکەی پشکنی‌و کۆڵێکی بەڵگە هێنا دەر.

٣٣٨٨ 4754- **هێنانەدەر، دەرکێشان (بە زەحمەت)**: هێندێک وردەبەردی زۆر تیژمان لە لاستیکی ماشێنەکە هێنا دەر.

٣٣٨٩ 7418- **هێنانەدەر، دەرپەڕاندن**: سەربازەکانی دوژمن کە لە ژێرخانانەدا خۆیان حەشاردابوو، دەبوو یەک یەک -و بە زەحمەتێکی زۆر- بیانهێننە دەر.

٣٣٩٠ 1879- **هێنانە دەر لە**: دەرگای سندووقە پۆڵاکەی کردەوەو قوتووی دراوەکانی هێنادەر.

٣٣٩١ 4375- **هێنانەدەری سەربازان/ پۆلیسان (زیاتر بە مەبەستی کۆنترۆڵ کردنی خۆپیشاندان و ناڵارامی)**: لەبەر ئەوە کە هەلو مەرجێکی خەتەرناک دەیەویست بێتە گۆڕێ، دەستووریان بە هێزەکانی ئاسایش دا بۆ کۆنترۆڵی وەزعەکە بێنە دەر.

٣٣٩٢ 731- **هێنانە ریزی پێشەوە، وەپێش خستن**: هەلومەرجی ساڵەکانی دوای شەڕ، هەموو ئەو کەسانەی بە دڵیو جورئەت بوون (دڵو جورئەتی سەرمایەگوزارییان هەبوو) هێنایە ریزی پێشەوەی کۆمەڵ.
هێنانە ژێر بار → رام کردن.
هێنانە ژێر چۆک، هێنانە ژێر رکێف، هێنانە ژێر کار، هێنانە ژێر کونترۆڵ، هێنانە ژێر ئەنزیەوە → (زاراوەی جینایەتکاران) چاوترسێن کردن، دەستەمۆ کردن، کەڵک لێوەرگرتن، مەهار کردن، رێکو پێک کردن.

٣٣٩٣ 6495- **هێنانە ژێر دەسەڵاتی یان ژێر رکێفی خۆ**: لە دوو شەڕی یەکجار باش دارێژراودا، رۆمی‌یەکان نیوەی ئەو وڵاتەیان خستە ژێر رکێفی خۆیان.

٣٣٩٤ 3530- **هێنانە ژێر دیسیپلینەوە**: کاتێک بەرپرسی قوتابخانە دیتی ئەو کلاسەی لە بەدفەڕیدا بە ناوبانگ بوو ئاوا هاتۆتە ژێر دیسیپلینەوە، ئەویش بە هێزی مامۆستایەکی کچۆڵەی لەڕو لاوازەوە سەری سووڕما.

٣٣٩٥ 747- **هێنانە ژێر کونترۆڵ، رام کردن**: دوای کەلە رووداوێک کە پۆلیس پێشی پێ‌نەدەگیران ئاژاوەگێرەکان سەرئەنجام هاتنە ژێر کونترۆڵەوە/ کونترۆڵ کران.

٣٣٩٦ 3591- **هێنانە ژێر کونترۆڵ، سەرکوت کردن، زاڵبوون بەسەر...دا**: ئەرتەش بۆ ماوەی چەند مانگان توانی خەڵکی

وڵاتە داگیرکراوەکە بخاتە ژێــر کونــترۆڵی خۆیــەوە، بــەڵام دوایە گیروگرفتان سەریان هەڵدا.

٨٢٩٧ 759- **هێنانە سەر، گەیاندنە سەر هەتا...:** گۆمبایەکی بە تەوژم ساوی چۆمەکەی هەتا شەقامی سەرەکیی شار هێنابووە سەر.

هێنانە سەر تەقل ← بە زۆرە ملی ئاشتکردنەوە.

٨٢٩٨ 4960- **هێنانە سەر بــاوەڕ، قەناعەت:** دڵنیم کــە ئــەمن عاشقی کەژاڵێ بووم، چ شتێك دەتوانێ ئەوی هێنــا بێتــە سەر ئەو باوەڕە.

هێنانــە ســەرحاڵ ← وەجــۆش هــاتن/ هێنــان، دڵدانــەوە، وەجۆش هێنان.

٨٢٩٩ 691- **هێنانــە ســەر خەتی، هاوئاهەنگ کــردن، ڕێك خستن لەگەڵ:** وادیارە کە هیچ شتێك ناتوانێ دەگــەڵ هاواڵــەکانی ڕێکی خا.

٨٣٠٠ 689- **هێنانــە ســەر دنیــا، (منــداڵ) بــوون، زان:** "خودایــە گیان، ڕوحێلە، ئەوە یەکی دیکەشم دەبێ!"

٨٣٠١ 2676- **هێنانە سەر دنیا، (منــداڵ، بێچوو، بێچوو' تووتك) بوون، ترەکین، زان:** کــاتێك بــە بــاوکی منداڵــەکانیان گــوت خێزانت ٦ منداڵی بە زگێکی بووە، گوتی: "ئــەوە ئیــدی یەکجار زۆرە!"

٨٣٠٢ 3156- **هێنانە سەر دنیــا، لــە دایك بوون، زان:** ئــەو ژنــە لــە مێردی یەکەمی کچێك و لە مێردی دووهەمی دوو کــوڕی بوون.

٨٣٠٣ 3670- **هێنانە سەر ڕێگای ڕاست:** لەمێژسالە هــەوڵ دەدەم کچە هەرە چکۆلەکــەم تــا رادەیــەك بێنمــە ســەر ڕێگــای ڕاســت، بــەڵام ئــەو هــەروا لەســەر درێژەدانــی شــێوەی هەڵسوکەوتی خۆی پێ دادەگرێ.

٨٣٠٤ 7310- **هێنانە سەر شەوق:** کابرای کۆمیدیەن بۆ ئــەوەی خەڵکەکە بێنێتــە ســەر شــەوق، چــەند نوکتــەی/ جۆکــی خێراخێرا گوتن.

٨٣٠٥ 7411- **هێنانە سەر شەوق، تووڕەیش کردن:** هەتا پێش ئــەو کاتە، خەڵکەکەی هێنابووە سەر ئەوپەری شەوق و زۆقەوە.

٨٣٠٦ 5627- **هێنانەکایەوە (ی ئامرازێك یان چەند ئــامرازی موسیقا لە ئاهــەنگێك/ پارچــە موسیقایەکدا...):** ســەمفۆنی پێنجــەمی بتهۆوەن یەکەمین ســەمفۆنی گەورە بوو کە لەودا ترومبــۆن/ ترومپێت بۆ یەکەم جار هاتە کایەوە.

هێنانە کایــەوە ← بــەڕێوەبردن، بەرقــەرار کــردن، کــەڵك لێوەرگرتن.

٨٣٠٧ 4905- **هێنانە/ خستنە ژێر دەســتووری کۆبوونــەوەوە:** ڕەنگــە پارێزگاران گەڵاڵەیەك بۆ ســانســۆر دانــان لەســەر شــێوەی کارکردنی دەوڵەت لە پێوەندی دەگەڵ مەســەلەی... بێننــە ژێر دەستووری کۆبوونەوەی پارلەمانەوە.

٨٣٠٨ 668- **هێنانــە گــۆڕێ:** تکایــە لــە ســەرەتای مــانگی داهاتوو ئەو نامەیە بێننەوە گۆڕێ.

٨٣٠٩ 6785- **هێنانەگۆڕێ/ پێش:** بەر لەوەی کە بچینە پێش، یەك دوو بابەتی وورد هەن کە دەبێ بێنە گۆڕێ.

٨٣١٠ 765- **هێنانە گۆڕێ، باس کــردن لەگــەڵ:** مەســەلەی ئــەوە کە لە ئەمریکا کارێك وەرگرێ دەبوو دەگەڵی باس بکەم.

٨٣١١ 642- **هێنانە گۆڕێ، پــێك هێنــان، دروست کــردن:** ڕێناچــێ ئەو سیاســەتمەدارانە بتوانن حزبی پێکهاتنی هیــچ جەشــنە ئاڵوگۆڕێك.

٨٣١٢ 5043- **هێنانە گۆڕێ، پرسین لە، گوتن بە:** لــە میوانــە بــــەڕێزەکان دڵوا دەکــــەین پرســــیارەکانیان دەگــــەڵ سوخنەرانە/وتاردەرە میوانەکە بێننە گۆڕێ.

٨٣١٣ 5073- **هێنانە گۆڕێ:** لەو کێشــەیەی کــە زاناکــان لــە واشنگتۆن هێنابوویانە گۆڕێ پشتیوانی دەکرد.

٨٣١٤ 2664- **هێنانە گۆڕێ، پێشنیار دان، نیشــان دان:** دادســتان(= مدعی العموم) پێش دەســت پێکردنــی کــاری دادگــا، بەڵگەی پێویستی سەبارەت بە کەسایەتیی تاوانبــار هێنــا گۆڕێ.

٨٣١٥ 665- **هێنانــە گــۆڕێ:** پێشــــنیارلە کۆبوونــــەوەی داهاتوودا، دەکا بەرین کردنەوەو چاککردنی ناوەندی شــار بێنێتە گۆڕێ.

٨٣١٦ 664- **هێنانەگۆڕێ (زیــاتر بــە گاڵتــە):** پێــم وایــە ئــاکو نایەوێ بــۆ باشــتر کردنــی بەرهەمــەکانی پێشــنیاری زۆر زانایانە بێنێتە گۆڕێ.

٨٣١٧ 751- **هێنانە گۆڕێ، خســتنە بــەرباس:** پێــم وایــە لەســەر خاڵە ســەرەکییەکان ڕێك کەوتووین. داخوا کەس دەیــەوێ مەســەلەیەکی دیکە بێنێتە گۆڕێ؟

٨٣١٨ 735- **هێنانە گۆڕێ، هاتنە گۆڕێ، هێنانە پێــش، هاتنــە پێ:** لەدایك بوونی چوارەمین منداڵ مەسەلەکەی لە نێــوان ژن و مێردەکە زۆر بە جیدی هێنایە گۆڕێ؛ پیاوەکە ناچار بــوو کارێکی دیکە پەیدا کا کە یارمەتیی مانگانــەی زیــاتری تێدابێ.

٨٣١٩ 5767- **هێنانە گــۆڕێ، ڕاگــەیاندن، بــاس کــردن، ڕێنــوێنی کردن:** ســەرۆك وەزیر(ان) لە وتارەکەی خۆی بۆ کۆ بێکــارانی حیزبی، مەبەســتەکانی دەوڵەتی هێنا گۆڕێ.

٨٣٢٠ 1759- **هێنانە گۆڕێ، نیشاندان:** خۆشناو لە ئاخرین وتاری خۆیدا تێکەڵاوێك لە بیروبڕوای کۆنەپەرستانەو کردەوە نالەبارە خورسی‌یەکان دینێتە گۆڕێ.
٨٣٢١ 1838- **هێنانە گۆڕێ:** ئەرێ ئەوە بۆچی پەیتا پەیتا باسی میدالیاکانی دێنیتەوە گۆڕێ؟...
٨٣٢٢ 653- **هێنانە گۆڕێ، هێنانەوە کایەوە:** ئەو یەکجار زۆر لایەنگری سەر لە نوێ هێنانەوە گۆڕی حوکمی ئیعدامە.
٨٣٢٣ 2288- **هێنانە گۆڕێ (خەزا)، وەپاڵدان (خەزا):** رەنگە راباشتر بێ کە لە پێشدا چارێك بە دەلیلەکانت دابشێنینەوەو جا ئەوجار تاوانی فەساد وەپاڵ ئێوە لە ئەندامانی کۆڕی بەرێوەبەری بدەی.
٨٣٢٤ 6795- **هێنانە گۆڕێ دەگەڵ، باسکردن دەگەڵ، راگەیاندن بە، ئاگادار کردن لە:** مەسەلەکەم دەگەڵ ئاغای کولیت باس کردو ئەویش پێی گوتم لەو پێوەندی‌یەدا هیچ سکاڵایەکی پێ نەگەیشتووە.
٨٣٢٥ 5128- **هێنانە گۆڕێ دەگەڵ، باسکردن دەگەڵ:** ئەو مەسەلانە، پێشتر، بەتایبەت دەگەڵ کانادایی‌یەکان باسکراون/ هاتوونەتە گۆڕێ.
٨٣٢٦ 685- **هێنانە مەیدان، وەخۆ خستن، وەگەڕ خستن:** لە ململانێ بۆ بەدەستەوە گرتنی ئەخشی رێبەرایەتیی، دوژمنایەتیی لەمێژینەکانیان هێناوەتەوە گۆڕێ.
٨٣٢٧ 697- **هێنانە مەیدان، هێنانە کایەوە:** پاش پشووەدانەکە، سەرلە نوێ یاریزانە گورجو گۆڵەکانیان هێناوە مەیدانێ.
٨٣٢٨ 4984- (لە یاری کریکێتدا) **هێنانە مەیدانێ**
هێنانەنێو ← ناونووسی کردن لە.
٨٣٢٩ 1639- **هێنانە نێو کایەوە، هێنانە نێو گەمە:** چیا بۆ کۆبوونەوەی قوماری بریج درەنگ هات. بەڵام، یەکێك لە کورەکان پێکێکی بۆ تێکردو ئێمەش هێنامانەنێو گەمێ.
٨٣٣٠ 1575- **هێنانە نێو گەمێ، دەگەڵ خستن:** جارێکی دی ئەگەر ویستتان سەندیکایەکی دیکە دروست کەن، لە بیرتان نەچێ ئەمنیش دەگەڵ خەن.
← دەگەڵ خستن.
٨٣٣١ 3155- **هێنانەوە (ژنێکی لە ڵاتدراو یان یارێکی وەلانراو)، وەخۆ گرتنەوە (ی مێردێك یان یارێك لە لایەن ژنێکەوە):** ئەو ژنە تازە مێردەکەی وەخۆ ناگرێتەوە. تەنانەت ئەگەر پیاوێك لە دنیا دانەمێنێ.
٨٣٣٢ 663- **هێنانەوە، گەڕاندنەوە بۆ جیهانی راستی‌یەکان:** لە دەست چوونی منداڵێك هێنانییەوە سەر جیهانی راستی‌یەکان/ واقعییەتەکان.
٨٣٣٣ 4548- **هێنانەوە، هەڵگرتن، لێدان، بارکردن:** لە بیرت نەچێ، لە سەرڕێیە بستەنییەکان هەڵگری/بێنی‌یەوە. ⁕ چەند بارە سیغارمان لە ئەنبارێ لێدا (= سوارکرد).
هێنانەوە ← رشانەوە، وەرگرتنەوە، دەست نیشان کردن، بردنەوە، گەڕانەوە.
هێنانەوە سەرەخۆ ← ئارام کردنەوە، زیندوو کردنەوە.
٨٣٣٤ 1736- **هێندێك شت خوێندنەوە لەسەر...:** ناتوانم بڵێم دەربارەی رەسمی (= ئەقاشی) مودێرن زۆری دەزانم؛ تەنیا هێندێك شتم لە یەك دوو کتێبان خوێندۆتەوە.
٨٣٣٥ 2697- **هیوابڕ بوون، نائومێدبوون (لە حاڵەتی کەسێك):** "پێم وایە هاتبوونە سەر ئەو بڕوایە کە ئێمە بڕیارمان داوە نەچین"، "ئەگەر راستی‌یەکەت دەوێ، هێندەی نەمابوو هیوابڕ بن".
٨٣٣٦ 2703- **هیوابڕ بوون:** دوای سێ رۆژان گەڕان بەسەر ئۆقیانووسی ئەتلەسیدا، لە دیتنەوەی فڕۆکەونبووەکە بە تەواوی هیوابڕ بوون.
← دەست لێ‌شۆرشتن.
٨٣٣٧ 2079- **هیوا پێ بوون، چاوەڕوانیی لێکردن، چاوەڕوانیی هەبوون لە:** دایکو بابی کورە زۆریان هیوا پێی بوو، بەڵام....
٨٣٣٨ 182- **هیوادار بوون بە، پشت بەستن بە، حیساب کردن لەسەر:** بێ عەقڵیم کرد، چونکە تەنیا لە سەر گرتنی چەند پەلەوەرێك حیسێبم کردبوو، نەمکرد قەفەزێکی تەواو گەورە دەگەڵ خۆم بێنم.
٨٣٣٩ 792- **هیوادار بوون بە، هومێد بەستن بە:** تاقمێك لە ئەندامانی حیزبی پارێزگاران هەموو هیوایەکیان بە ئاغای مارلینگ بوو.
← ورەی خۆ بەرز راگرتن.
هێواش کردنەوە ← سورعەتی خۆ کەم کردنەوە.
هێوور بوونەوە ← چاك بوونەوە.
هێوور کردنەوە ← کەم کردنەوە.
٨٣٤٠ 1084- **یادداشت کردن، نووسینی کاتی هاتن و رۆیشتن:** نووسینی کاتی هاتن‌و چوونە دەر، دەبێتە هۆی نارەحەتیی کرێکاران، بەڵام ئەو کارە بۆ دەرخستنی رادەی دڵسۆزی‌و کارامەیی کرێکاران شتێکی پێویستە.
٨٣٤١ 5762- **یادداشت کردن، نووسین:** هەتا لە بیرم نەچۆوەتەوە، یەك-دوو خاڵێن یادداشت دەکەم.
٨٣٤٢ 6633- **یادداشت کردن، نووسینەوە:** هەرچی بیڵێی دەنووسرێ‌و رەنگە دوایە لێت بکەنە بەڵگە.

٨٣٤٣ 3475- **یادداشت کردن بە خێرایی، بە پەلە نووسین:** ژمارەی شارەکەی زوو بە خێرایی یادداشت کرد. ● با ئەو کاتە یادداشت کەم بۆ ئەوەی لە بیرم نەچێ.

٨٣٤٤ 4234- **(ناوی کەسێك) یادداشت کردن (رەنگە بۆ سزادان)، دەست نیشان کردن، داڵان بۆ:** گۆمان لەوە دانەبوو کە کابرا ناوی یادداشت کردووەو بۆیە بۆی چوە پێش بۆ ئەوەی ملی وردکا. ● بە ماشێن هەتا کاخی... رۆیشتم، ئەوکاخەی کە بۆ ستادی تیپم دەست نیشان کردبوو.

٨٣٤٥ 2459- **یادداشت کردن، نووسینەوە (بە زەحمەتەوە):** هەموو وشەکانم یادداشت نەکرد، بەڵام، بێگومان بەشێکی باشم لە وتوێژەکان نووسیوە.

٨٣٤٦ 4911- **یادداشت کردن بە ناوی، نووسین:** "چەند بلیتان بە ناوی تۆ بنووسم؟"، "شەش دانە".

← نووسین لە ...دا، نووسین، نووسینەوە، نووسران.

٨٣٤٧ 6683- **یادداشت هەڵگرتن لە، لەبەرچاوگرتن:** کاربەدەستانی سەرێ هەرکام لە داخوازەکانی مامۆستاکان کە کام قوتابخانەیان پێ خۆشە کاری تێدا بکەن لەبەرچاو دەگرن، هەرچەند ناتوانن بەڵێنی بدەن هەموو مامۆستاکان بۆ ئەو جێگایانە بنێرن کە بۆخۆیان پێیان خۆشە.

٨٣٤٨ 4159- **یادداشت هەڵگرتن لە، بە مێشك لەسپاردن:** چارلز هەر ئەدەهاتو خەریك بوو لە خوور خدە سەیرو سەمەرەکانی ناوچە یادداشتی هەڵدەگرت.

٨٣٤٩ 3998- **یادداشت هەڵگرتن لە سەفەری خۆ:** فڕۆکەوانی ئەو فڕۆکەی کە بەر ببۆوە چەند سەد سەعات لە بەرنامەی هەڵفڕینی خۆی یادداشت کردبوو.

٨٣٥٠ 645- **یارمەتیدان، هاندان، تەشویق کردن:** هەوڵ دەدەین یەك-دوو کەس لە مەلەوانە گەنجەکانمان تەشویق بکەین (بۆ ئەوەی باشتر بچنە پێش).

٨٣٥١ 913 - **یارمەتیدان، هاندان، پشتیوانی لێکردن، پشت گرتن، لە پشت راوەستان، لە پشتیوانیی خۆ دڵگەرم کردن:** تیپە فوتباڵە ناماتۆرەکە، کە لە پشتیوانیی لایەنگرانی بە تەواوی دڵگەرم بوو، توانی تیمێکی پرۆفیسیۆنیل، کە یەکجار بەهێز بوو شکست بدا.

٨٣٥٢ 7201- **یارمەتیدان بە، هاتنە یارمەتیی کەسێك:** ئەگەر پارەی کەم بێنین، ئەرخەیان بە ژیلوان یارمەتیمان دەدا.

٨٣٥٣ 1429- **یارمەتیدان بە، بەهێزتر کردن:** هاتنی شاژن بۆ کۆبوونەوەکە یارمەتیدا بە بەرنامەیەکی کە ئەگەر ئەو نەهاتبا شتێکی ئاسایی دەبوو.

٨٣٥٤ 5236- **یارمەتیدان بە، بەرەو سەر بەرزتر کردنەوە:** سەرکەوتنەکانی تۆ ناوبانگی باشی، قوتابخانەکە بەرزتر دەکاتەوە.

٨٣٥٥ 3107- **یارمەتیدان بە یەکتری/ قوربانی... ...:** سەرۆك کۆمار یارمەتیی خواردەمەنیو پۆشاکیدا بەو ئەوانەی لە کەشتییە شکاوەکە رزگاریان ببوو.

٨٣٥٦ 646- **یارمەتیدان بە هەڵدان/ بە پشکووتن، پشکووتنەوە:** ئەم هەوا خۆشەی مارمیەکە درێژەی هەیە بە هەڵدانی شیناوردەکەمان یارمەتی دەدا.

٨٣٥٧ 7379- **یارمەتی کۆ کردنەوە، ئەوجێ کردن بۆ، کەشف کردنی گیراو بۆ:** دەگەرێینەو چەند پۆندێك پارە بۆ جێژنی ئیدارەمان کۆ دەکەینەوە.

← کەشف، یان سینی، بۆ گێران.

٨٣٥٨ 6650- **یارمەتی یان حەقدەستی خالیس:** دوای ئەو پوولانەی کە لێیاندەگێرنەوە، ئەو کرێکارانە کە ئەو هەموو سەعاتە دووروو درێژانە لەژێر زەوی‌دا کاردەکەن، هەفتەی ٣١ پۆند حەقدەستی خالیس وەردەگرن.

٨٣٥٩ 5513- **یار یان دۆست گۆڕین؛ پەیتا پەیتا:** کەنگێ لەو پەیتا پەیتا یار گۆڕینە دەست هەڵدەگریو بە یەکجاری یەکێکی هەڵدەبژێری؟

٨٣٦٠ 4641- **یاری بە وشان کردن، یاری بە کەلیمان کردن:** زیانی بەشی زۆری راگەیەندراوە بازرگانییەکان یاری کردن بە وشەو زاراوانە.

٨٣٦١ 3241- **یاریدەدان بە، کۆمەك کردن بە چوونە پێشی کارێك:** کردنەوەی دەرگایەك لە لایەن کامرانەوە، ئەویش راست لە ناسلەترین کاتدا، هیچ یاریدەیەکی بە چوونە پێشی تاقیکارییەکە نەدا.

٨٣٦٢ 3244- **یاریدەدانی/ یارمەتیدانی کەسێك بۆ رزگار بوون لە گرفتارییەك:** دیسانیش بۆ خاتری ئەوەیە کە دەست بەکار بوویەو بۆ رزگار کردنمان لەکاتی هێرشی ئاڵماندا هاتی یارمەتیمان سوپاستان دەکەم.

٨٣٦٣ 3242- **یاریدەدانی کەسێك بۆ داکەندنی لیباسێك:** ئیجازە بدەن لە داکەندنی باڵتۆکەتاندا یاریدەتان بدەم.

٨٣٦٤ 3243- **یاریدەدانی کەسێك لە دەبەرکردنی لیباسدا:** بە خێرایی بارانییەکی هەڵبژارد کە لە هەموان کەمتر چڵکن بووو بۆ دەبەرکردنی یاریدەی دام/ یاریدەی دام دەبەری کەم.

٧٣٦٥ 2834- یاری کردن، وەك سەرگەرمی هەڵبژاردن: بۆچی وەك سەرگەرمی کۆکردنەوەی شتومەکی عەنتیکە هەڵنابژێری؟

٧٣٦٦ 4637- یاری کۆتایی بەرێوەچوون: هەفتەی داهاتوو لە نێوان چیاو کاوە یاری کۆتایی بەرێوە دەچێ.

٧٣٦٧ 5198- یاغی بوون لە: یاسا تازەکانی زەریبە بوون بەهۆی ئەوە کە عەشیرەتەکانی وڵات لە دەوڵەتی ناوەندی یاغی بن.

٧٣٦٨ 2890- یاڵلا بۆ پێشەوە!: وەرێ کەون سەربازەکانی مەسیحییەت! وابزانن بۆ مەیدانی شەڕ دەچن، خاچی حەزرەتی مەسیح بە دەستەوە، یاڵلا بۆ پێشەوە.

٧٣٦٩ 6554- یەقین هەبوون: ئایا دەنگێکی گوێ لێبوو؟ ئێستا، کە بێدەنگێکی تەواو بوو، یەقینی نەبوو(کە دەنگی شتێك بەرز بووبێتەوە).

یەکبوون دەگەڵ ← هاوئاهەنگ بوون دەگەڵ.

٧٣٧٠ 1463- یەك بەیەك بژاردن (ولە سەر شتێك داناندن): پیرێژن پازدە پینی‌یەکەی یەك یەك بژارد، کیفە دراوەکەی دەست دایەو، دایخستەوەو گوتی "فەرموو! تەواوە؟".

٧٣٧١ 5572- یەکپارچە ... بوون: ئەو منداڵانە یەکپارچە ئینوژێن- ناتوانم پێنج دەقیقە بێدەنگ رایانگرم.

٧٣٧٢ 3294- یەکپارچەیی/ یەکگرتوویی خۆ پاراستن: لە ماوەی ئەو قەیرانەدا حیزب توانیویە زۆر سەیر یەکپارچەیی خۆی بپارێزێ. * چ شتێك یەکپارچەیی دێموکرات مەسیحی‌یەکانی پاراستووە؟.

یەك پشوو قسەکردن ← (یەك پشوو) قسە کردن.

یەکگرتنەوە ← هاتنەوە دەگەڵ، دەگەڵ یەکتر هاتنەوە، جووت هاتنەوە دەگەڵ، بوون بە یەك، هێزی خۆ کردنەوە بە یەك، وەك یەك چوون، سازگار بوون لەگەڵ، بەسەر کەسێك داکەوتن.

٧٣٧٣ 7224- یەکدەنگ بوون، یەکگرتوو بوون: رێبەرایەتیی یەکیەتی‌یە بازرگانی‌یەکان لە دەربڕینی داخو کەسەری خۆیان سەبارەت بە چوونە سەری نرخی خواردەمەنیدا یەکدەنگ بوون.

٧٣٧٤ 4112- یەکڕاست بۆ لای ... چوون/ رۆیشتن، هێرش کردن: یەکڕاست چۆوە ژوور بۆ ئەوەی بزانێ کاوە چ دەکا. * خەڵککە یەکڕاست بەرەو باشترین جێگاکان غاریان دا.

یەکسان بوون ← بەرامبەر بوون.

٧٣٧٥ 2057- یەکسان دابەش کردن: هیچ کەس پێی خۆش نیە دراوێکی زۆر لە سەرێك بدا بە کارەباو گاز. زۆر باشتر دەبێ کە ئەو دراوەی دەبێ بدرێ بە شێوەیەکی یەکسان دابەش بکرێ‌و مانگانە یان حەوتووانە بیدەن.

٧٣٧٦ 6378- یەکگرتن، پشتی یەکتر گرتن، لە پشتی یەکتر راوەستان: ئێمە زۆر وەزعییەتی لەوە ناخۆشتر و دژوارترمان دیوە. ئەگەر پشوومان لەسەرەخۆبێ‌و پشتی یەکتر بگرین، هەموو شتێك جێبەجێ دەبێ.

٧٣٧٧ 6839- یەکگرتن، بوون بە یەك، رێککەوتن؛ یەکجار زۆر هێندێك کەسم پەیدا کردو یەکمان گرتوو پێکەوە دەستمان کرد بە گۆرانی دانان.

٧٣٧٨ 7225- یەکگرتن، بوون بە یەك: سکاتلەند لە ساڵی ١٧٠٧دا دەگەڵ ئینگلیستان بوو بە یەك (سکاتلەندو ئینگلیستان لە ساڵی ١٧٠٧دا یەکیان گرت).

٧٣٧٩ 6265- یەکگرتن، پشتی یەکتر گرتن: چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵ، کە لە پێوەندیی دەگەڵ بەرژەوەندی‌یەکاندا دژایەتی‌یان هەیە، ئەگەر مەترسی‌یەك لە دەرەوەرا هەرەشەیان لێ بکا، بۆی هەیە هەموویان بەرەوپیری بانگەوازی یەکگرتنەوە بچن‌و یەك بگرن.

٧٣٨٠ 5136- یەکگرتن: هەڵگرتنی رەمزی هەنگ (ناتۆ) لە مەیدانی جەنگدا، مەبەستێکی تایبەتی تێدابوو؛ لەکاتی تەنگانەدا سەربازەکان لە دەوری کۆ دەبوونەوە.

٧٣٨١ 783- یەکگرتن، پشتی یەکتر گرتن: کاتێك دایکیان مرد، منداڵەکان ناچار بوون پشتی یەکتر بگرن‌و کارەکانی ماڵێ بەیەکەوە بەرێوەبەرن.

٧٣٨٢ 3651- یەکگرتن، یەکگرتنەوە، گرێ گرتن، تێکئاڵان: جەرراح گوتی یەکگرتنەوەی ئەو دوو بەشە لە ئێسکی رانی شەش مانگان دەگرێ. * شەڕ لە هەموو شتێك زیاتر دەبێتە هۆی یەکگرتوویی چینو توێژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵ. هەرکە ئەمنییەت‌و ئاسایش هاتەوە گۆڕێ، ناکۆکی‌یەکانیش دەگەڵ خۆی دێنێتەوە.

٧٣٨٣ 178- یەکگرتن، لێك وەخۆ بوون/کردن: گوندنشینەکان، بۆ پاراستنی ماڵو حاڵیان لە بەرامبەر چەتە چەکدارەکاندا لێك وەخۆ بوون/ یەکیان گرتبوو.

٧٣٨٤ 3936- یەکگرتن دەگەڵ، رێککەوتن دەگەڵ: لە نێو حیزبدا دەگەڵ کۆنەپەرستترین کەسان رێك دەکەوێ.

یەکگرتن، یەکگرتنەوە، یەکگرتوو بوون ← تێکەڵ بوونەوە، چوونە باڵ، وەك یەك هاتنەوە، یەکدەنگ بوون.

٨٣٨٥ 3010- **یەکگرتنەوە، خوێندنەوە لەگەڵ، هاتنەوە لەگەڵ، جووت‌هاتنەوە لەگەڵ**: کاتێك دەچێتە ژێر تەنسیری ئەلکولەوە (مەستی دەکا) رەفتاری دەگەڵ پێوەرە ئەخلاقی‌یەکانی هەمیشەیی نایەتەوە.

٨٣٨٦ 6823- **یەکگرتنەوە، جووت هاتنەوە، وەك یەك هاتنەوە، خوێندنەوە لەگەڵ**: ئەو قسانەی ئێستا دەیانکەی دەگەڵ ئەو شتانەی بە ئەفسەرە پۆلیسەکەت گوتوون یەك ناگرنەوە/ جووت نایەنەوە/ ناخوێننەوە.

٨٣٨٧ 4251- **یەکگرتنەوە**: سەربازانی ئەرتەش‌و پارتیزانەکان کە لە کێوەکانرا دەهاتنەخوار یەکیان گرتەوە. ● دوو بەشی ئەو پرۆژەیە یەکتر ناگرنەوە.

← جووت هاتنەوە، یان نەهاتنەوە.

٨٣٨٨ 7368- **یەکگرتووکردن، ڕێکخستن**: ڕژێم لە یەکگرتووکردنی توێژە جۆرلەجۆرەکانی وڵات -ئایینی، نەژادی‌و زیمانی- دا سەرکەوتووە.

٨٣٨٩ 3202- **یەك لا کردنەوە (قسە کردن لەگەڵ کەسێك بە راشکاوی هەتا لەگەڵدە لەکانێك)**: ئەوە دەچمە لای کاوە. ئێستا ئیدی دەبێ بە راشکاوی مەسەلەکەی دەگەڵ یەك لا کەمەوە.

یەك نەگرتنەوە ← دژایەتی هەبوون دەگەڵ، نەخوێندنەوە دەگەڵ، نەهاتنەوە دەگەڵ، جووت نەهاتنەوە.

٨٣٩٠ 6347- **یەکەم هەنگاو لەدروست هەڵێنانەوە**: لە پێوەندیی دەگەڵ کچاندا، یەکەمین چاوپێکەوتن زۆر گرنگە؛ هەنگاوی یەکەم خراپ هەڵمەهێنەوە.

٨٣٩١ 5148- **یەکێك لە باشترین یان خراپترین ... بوون**: ئەو یەکێك لە باشترین سەرۆك کۆمارە بەناوبانگەکانی ئەم سەردەمەیە.

## پیشگفتار

همهء کسانی که با ترجمهء فرهنگ لغاتی از یك زبان به زبانی ـ یا چند زبان ـ دیگر سروکار داشته‌اند، نیك می‌دانند که انجام یك چنین کار مشکلی به ندرت می‌تواند از عهدهء شخص واحدی برآید در واقع نیز چنین است. از این رو، اثری که هم اینك پیش روی دارید، نمی‌تواند عاری از کاستی‌ها و نارسایی‌ها باشد، حقیقتی که علت اساسی آن از کمبود امکاناتی ریشه گرفته که از هرسو گریبانگیر مترجم بوده است.

در پرتو یك چنین واقعیتی است که از کلیهء گرانمایه صاحبنظرانی که به هر دلیلی با آن سروکار پیدا می‌کنند انتظار می‌رود که ضمن آنکه آن را به دقت بررسی می‌نمایند، کاستی‌ها و نارسایی را به دیدهء اغماض بنگرند؛ موارد نادرست را تصحیح نمایند و در صورت امکان مترجم را مطلع سازند. باشد که چنانچه فرصت و امکانی دیگر دست دهد، در چاپ بعدی تذکرات دریافت شده مراعات گردد.

همانگونه که ملاحظه می‌کنید در بخش فارسی، پیش از هر اصطلاحی دو شماره وجود دارد. شمارهء دست راست، شمارهء ترتیب فارسی‌و دیگری که لاتینی است مربوط به فرهنگ انگلیسی است. برای یافتن معادل یك اصطلاح فارسی در بخش انگلیسی می‌توان ـ بدون استفاده از جدولی که بلافاصله پیش از بخش فارسی به چاپ رسیده ـ مستقیما" آن را در فرهنگ انگلیسی پیدا نمود. مثلا" اصطلاح "سرك کشیدن..."، که شمارهء ردیف آن ۴۷۷۲ است شمارهء معادل آن در قسمت انگلیسی ۳۸۱۱ می‌باشد. اما چنانچه عمل عکس مورد نظر باشد، باید به جدول مراجعه شود.

در ترجمهء اصطلاحات انگلیسی به فارسی فقط یك ـ یا حداکثر دو ـ مثال ترجمه شده‌است. علت این کار نیز صرفا" اجتناب از قطور شدن زیاد از حد فرهنگ مورد نظر بوده است و لاغیر.

مترجم

